# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی هەشتەم

تەفسیری سوورەتی ( التوبة )

عەلی باپیر

# تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

بەرگی هەشتەم

تەفسیری سوورەتی (التوبة)

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نووســـەر : عەلـی باپـیـر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدين محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٨ ك- ٢٠١٦ز.

تـــیـراژ : ١٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان!

هیچ گومانی تێدانییە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - كە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین كتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی لە

[1] ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد، پێش هەر قسەیەكی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبة)و... هتد، وە ئەم وتارە، هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین‌و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ‌و ، خاوەنەکەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی‌و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم‌و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم‌و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم‌و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان‌و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی‌و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب‌و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم‌و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان‌و چۆنیەتی جێبەجێکردن‌و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك‌و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم‌و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم‌و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون‌و ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان : هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفسِّر بعضُهُ بعْضاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾

النحل، واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسولمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بومشێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو ، دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی‌یەوە ، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردداربوونی تواناو بڕستم ، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕووێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشم ویستوە کە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە ؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بە

١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو ، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانو، سەرجەم هەشت بەرگو دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.
شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا ، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

سەرجەم بەرگەكانی ئەم تەفسیرە كێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر ساڵحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواكارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە كوڕانو كچان ، لەنێو گەلەكەماندا ، زۆر بكات .

شایانی باسیشە كە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەكانی قورئانو دابەشكردنەكانی دیكەی وەك: - (حزب) - ناكەین، چونكە هەر سووڕەتێك بۆخۆی شتێكی سەربەخۆیەو ، سەرجەم ئایەتەكانی وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك پێكەوە پەیوەستن‌و، ئاشكراشە كە دابەشكرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێكە لەلایەن زانایانەوە كراوە، بۆ ئاسانكاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشكردنی بەرگەكانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەكان (أجزاء)ی ناكەین‌و ، بە گوێرەی سووڕەتەكان ، بەرگەكانی دیاریی دەكەین

دوا قسەشم ئەوەیە كە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس‌و وتار پێشكەش كراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستكارییم كردوە، دیارە هەموو دەرسێكیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێكردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەكانەوە ، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەكییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەكانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سووڕەتی (یونس)، سەرگەرمی سووڕەتی (هود)ەو عەزمیشی جەزم كردوە ، كە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ ، هەتا كۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی كارەكەی بێ .

# پێشەکی ئەم بەرگە

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

الحَمد لله رَبّ العَالَمِين ، وَالصَلاةُ والسلام والبَرَكاتُ عَلى مُحَمَّدٍ المَبعُوث نَبِيّاً ورَسولاً الى الإنسِ والجنّ ، وآلِهِ أجْمَعِين، مِنَ الصَّحْبِ والأَزْوَاجِ وَالقَرَابَةِ وَالتابعِينَ لَهُمْ بإحسَان وَ يَقين.

خوێنەری سەنگینو شیرین!

سوپاسو ستایش بۆ خوای میهرەبانی بەخشەر کە یارمەتیی داین سوورەتی (التوبة)ش تەفسیر بکەین، هەر بەپێی هەمان نەخشەو شێوازی پێشوو.

شایانی باسیشە کە ئێمە لە (ڕێ خۆشکردن) دا لە هەشت بڕگەدا ئەوەی بە پێویستمان زانیوە لەبارەی سوورەتی وەك دەستپێك بیڵێین، گوتوومانە، بۆیە لێرە بەم چەند دێڕە وازدێنین.

خوای بە بەزەییش پیتو پێزی زیاتر بخاتە نیەتو قسەو کردەوەو حاڵو باڵی هەموو لایەکمانەوە.

١٩ ی صفر ١٤٣٨ ك

٢٠١٦/١١/١٩ ز

# ڕێ خۆشكردن :

# پێناسەی سوورەتی (التوبة) و بابەتەكانی لە هەشت بڕگەدا

**بەڕێزان !**

**خوا پشتیوان بێ، لەمڕۆوە كە (٢٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٦)ی كۆچییەو، (١٢)ی تەمووزی (٢٠١٥)ی زاینییە، دەست دەكەین بە تەفسیركردنی سوورەتی (التوبة) كە بە (براءة)ش مەشهوورە.**

**سەرەتا وەك دەستپێكو ڕێ خۆشكردنی تەفسیركردنی ئەم سوورەتە موبارەكە، پێناسەیەكی سوورەتی (التوبة) دەكەین، وە تیشك دەخەینە سەر چەند لایەنێكی ئەم سوورەتە: ناوەكانی، كاتی دابەزینی، نێوەڕۆكی، وە پەیوەندیی لەگەڵ سوورەتی (الأنفال)دا، وە خاڵەكانی بە یەكگەیشتنیان لەگەڵ سوورەتی (الأنفال)دا، وە خاڵە جیاوازەكانیان، پاشان ئاماژەش دەكەین بە چۆنیەتی دابەشكردنیو، ئەم سوورەتە موبارەكە دابەش دەكەین بۆ نۆزدە (١٩) دەرس، هەموو ئەو مەسەلانەش لە هەشت بڕگەدا دەخەینە ڕوو .**

**<u>بڕگەی یەك :</u> سوورەتی تەوبە، سوورەتێكی مەدینەییەو، لە ڕیزبەندیی ئەو (مُصْحَف)ە موبارەكەدا كە لەبەردەستمانە، نۆیەمین سوورەتە، وە ژمارەی ئایەتەكانی (١٢٩)یە، هەندێكیش گوتوویانە: (١٣٠)، دیارە پێشتریش باسمان كردوە، كە شارەزایانی قورئان لە سەرژمێركردنی ئایەتەكانی قورئاندا، ڕا جیاییان هەیە، وە نەبێ هیچ كامیان بڵێن: ڕستەیەك زیادە لە قورئان، یاخود ڕستەیەك كەمە، بەڵكو جاری وا هەیە ڕستەیەكی درێژ ، هەندێكیان كردوویانەتە دوو بەش، واتە: دوو ئایەت، بەڵام لە هەندێ سەرژمێریاندا، هەر بە یەك ئایەت دانراوە، چونكە هەندێك سوورەت هەن، بە حەوت ئایەتو هەشت ئایەت جیاوازییان هەیە، ئەوە**

هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی‌و درێژیی ڕستەکانی ، کە دوایی ئایەتەکانیان پێکهێناوە.

**برگەی دوو** : ئەم سوورەتە، کۆتا سوورەتە لە قورئان دابەزی بێ، بەگشتی، وە لە سالّی نۆیەمداو لە دوای جەنگی تەبووك دابەزیوە، لەوبارەوە ئەم دەقە هەیە:

﴿عَنِ الْبَرَاءَ رضي الله عنه يَقُولُ: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ﴿١٧٦﴾﴾النساء، وَآخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ تَامَةً بَرَاءَةٌ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٤٦٥٤)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٦١٨)، وأبو داود برقم: (٢٨٩٠)} .

واتە: بەڕاء خوا لێی ڕازی بێ، کە یەکێکە لە هاوەڵان، دەڵێ: کۆتا ئایەت وەك ئایەت، کە لە قورئاندا دابەزی بێ، ئەم ئایەتەیە: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ﴿١٧٦﴾﴾النساء، وە کۆتا سوورەتیش کە بە تەواویی دابەزی بێ، سوورەتی تەوبەیە، واتە: بەسەر یەکەوە، ئەگەرنا هەندێك ئایەتی دیکە، لە هەندێك سوورەتاندا دابەزیون لەو ماوەیەدا، (واتە: لەو ماوەیەی کە دوای جەنگی تەبووکە، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کردوە)، ئایەتی دیکە لە هەندێك لە سوورەتەکانی دیکە، دابەزیون، بەلاّم کۆتا سوورەت کە دابەزیوە، وەك سوورەتی تەواو، ئەم سوورەتە بووە.

**برگەی سێ** : سوورەتی تەوبە ناوی زۆرن، هەندێ لە زانایان تاکو (١٤) ناو لەم سوورەتەیان هەڵداون، وە دەڵێن: ئەم سوورەتی (التوبة) لەگەڵ سوورەتی (الفاتحة)، دوو سوورەتن کە زۆرترین ناویان هەن، هەڵبەتە زۆرێك لە سوورەتەکانی دیکەی قورئان، زیاتر لە ناوێکیان هەیە، ئنجا هەیە دوو ناو، هەیە سێ ناو، هەیە چوار ناو، بەلاّم هیچ کامیان ژمارەی ناوەکانی نەگەیوەتە ئەو ناوانەی کە لەم سوورەتە هەڵدراون، هەروەها سوورەتی (الفاتحة)ش.

## ئەو ناوانەی کە لەم سوورەتە هەڵدراون

١/ (التوبة) : چونکە باسی تەوبەی تێدا کراوە، تەوبەی خوا، واتە: گەڕانەوەی خوا ﷻ بە ڕەحمەتو بەزەیی خۆی، بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ سەر کۆچکەران و پشتیوانان، وە بۆ سەر ئەو سێ کەسەش، کە بەسەرهاتێکی ناوداریان هەیەو، دوایی باسی دەکەین.

٢/ (البرآءة): چونکە یەکەمین وشەیە، کە ئەم سوورەتەی پێ دەست پێکردوە، دەفەرموێ : ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ﴿١﴾ ﴾التوبة،

(بَرَآءَة)ش، واتە: دووریی گرتن و حاشا لێ کردن.

٣/ (الفَاضِحَة): واتە: ئابڕووبەر، چونکە ئەم سوورەتە، ئابڕووی موناڧیق و دەغەڵ و دڵ نەخۆشەکانی بردوە، عەیب و کەم و کوڕییەکانیان و، هەڵوێستە خراپەکانیانی، خستوونە ڕوو.

٤/ (العذاب): چونکە باسی سزای خوای دادگەری کردوە، لە دنیاو لە دوارۆژدا، بۆ دڵ نەخۆش و دەغەڵەکان، وە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەران و، بۆ کافرەکانیش، بە گشتی.

٥/ (المقَشْقِشَة: أي: المبْرِئَة مِنَ النِّفَاق): واتە دوورخەرەوە لە نیفاق.

دەڵێ : (قَشْقَشَهُ) واتە: دووری خستەوە، پاکی کردەوە، یانی: هەر کەسێك ئەو سوورەتە چاك تێبگاو، کاری پێ بکات، لە نیفاق و دڵ نەخۆشیی دوور دەکەوێتەوە.

٦/ (المُنَقِّرَة: لأَنَّهَا نَقَرَة عَمّا فِي القُلُوب، قُلُوبُ المنَافِقِين وَغَيْرِهِ): (مُنَقِّرَة) واتە: پشکنەر، چونکە ئەوەی کە لە دڵی دڵ نەخۆشەکاندا هەیە، لێ کۆڵیوەتەوەو پشکنیونی، خوای پەنهانزان دڵیانی پشکنیوە، داخۆ چی تێدایە ؟

٧/ (البَحُوث) کە صیغە موبالەغەی (البَاحِثْ)ە، (بَحوث) واتە: زۆر پشکنەرو زۆر لێکۆڵەرەوە، چونکە زۆر لە دڵو دەروونو نیازو مەبەستەکانی هەرکام لە مونافیقەکانو، ئەعرابییە دڵنەخۆشەکانو غەیری وانیشی کۆڵیوەتەوە.

٨/ (الحَافِرَة: لإِنَّهَا حَفَرَة عَنِ القُلُوب)، (حَافِرَة)، واتە: هەڵقەنەر، هەڵکۆڵەر، ئەوەی شتێك هەڵقەنێ و، دەری بێنێ، چونکە خوا لەم سوورەتەدا دڵ نەخۆشەکانو ئەوانەی کە دوژمنو ناحەزی ئیسلام بوون، نیازو مەبەستەکانی نێو دڵەکانیانی دەرهێناوە.

٩/ (المثِيرَة)، واتە: دەرهێنەر، (لإِنَّهَا أَثَارت مَثَالِبَهُمْ وَعَوْرَاتَهُمْ) چونکە عەیبو کەمو کورییەکانی دەرخستوونو دەریهێناون.

١٠/ (المبَعْثِرة)، دەڵێ: (بَعْثَرَهُ)، واتە: پرژو بڵاوی کردوە، (مُبَعْثِرة) : پرژو بڵاوکەرەوە، چونکە نهێنییەکانی مونافیقو دڵ نەخۆشو دوژمنو ناحەزانی ئیسلامی، بڵاو کردۆتەوە.

١١/ (المدَمْدِمَة، أي: المهْلِكة) واتە: لەبەینبەر، فەوتێنەر، لەبەر ئەوەی کە کافرو بێبڕوایەکانی لەبەین بردوە، بەوەی کە هەرچی کەمو کوریی و عەیبیان هەیە، هەمووی لێ وەگۆڕێ وەرکردوون، بەوەش فەوتاون، یان بەوەی کە خوای کارزان لەم سوورەتەدا، زۆر باسی سزاو جەزرەبەی خۆی دەکات لە دنیاو لە دواڕۆژدا، بۆ ئەهلی کوفر.

١٢/ (المخْزِيَة) واتە: سەرشۆڕکەر، عەیبدارکەر، کە دیارە کە ئەم سوورەتە بۆتە مایەی سەرشۆڕیی و عەیبداریی هەموو ئەوانەی دووڕوون، بە تایبەت لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، زانیویانە کە فلان ئایەتە لەگەڵ کێیەتیو لەگەڵ کام کۆمەڵەیەتی ؟ وە کام ئایەتە کێ و کێ دەگرێتەوە ؟ کە لە چەند شوێنێك لەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ﴾،﴿ وَمِنْهُم ﴾، ﴿ وَمِنْهُم ﴾، مانای وایە زانیویانە، خوا لەگەڵ کێیەتی ؟ چونکە کە کابرا قسەکەی کردوەو هەڵوێستەکەی نواندوە، دوایی ئایەتەکە هاتۆتە خوار،

کە: هی وایە ئاوا دەڵێ، هی وایە ئاوا دەڵێ، هی وایە وایگوتوە هی وایە وایکردوە، زانیویانە لەگەڵ کێیەتی.

١٣/ (المُنَكِّلَة أو المعاقبة)، واتە: سزادەر، وە خەڵك تەمبێکەر، هەتا کەسی وا هەبووە، هەندێك لەم ئایەتانە کە گرتوویەتەوە، زانیویەتی کە ئەوە خوای پەروەردگار ئەو نهێنییەی زانیوە، چونکە بێجگە لە خۆیو خوا کەس نەیزانیوە، هاتوە مسوڵمان بووە.

١٤/ (المشَرِّدة: أي الطَّارِدَة لهُمْ وَالمفَرِّقَة لجَمْعِهِم)، واتە: دوورخەرەوە، دەرکەر.

ئەم سوورەتە ئەم چواردە ناوەی هەن، دیارە ناوی زۆریش، بەڵگەو نیشانەی گرنگییو بایەخی زۆرە، هەڵبەتە وە نەبێ سوورەتێکیش کە تەنیا ناوێکی هەیە، گرنگییو بایەخی کەم بێ، بەڵام مەبەستم لێرەدا ئەوەیە، گرنگییو بایەخی ئەم سوورەتە لەو ڕووەوە کە کەمو کورپیەکانی ئەوانەی دژی ئیسلام بوون، چ لە نێو خۆی مسوڵماناندا، کە دەغەڵو دڵ نەخۆشەکان بوون، چ لە دەرەوەی مەدینە، چ لە دوورتر، هەموو ئەوانەی کە دوژمنو ناحەزی ئیسلام بوون، زۆر بووە، چونکە باش تیشکی خستوونە سەر، وە بۆ مسوڵمانان بە درێژایی ڕۆژگارەکان بایەخێكو گرنگییەکی زۆری هەیە، تاکو هەموو دوژمنو ناحەزەکانی خۆیانی پێ بناسن.

<u>**بڕگەی چوار**</u> : بۆ هۆکاری نەبوونی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە، زانایانو لێکۆڵەرەوانو مانا لێکدەرەوانی قورئان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، زۆریان مشتو مڕ لەوبارەوە کردوە کە بۆچی دەبێ ئەم سوورەتە یەکسەر دەست پێ بکات، بەبێ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، کە دەفەرموێ:

﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ ...﴿٢﴾﴾ التوبة، تا کۆتایی ئایەتەکان ؟

## لەبارەی نەبوونی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)
## لە سەرەتای سوورەتی تەوبەوە، سێ ڕا هەن

ڕای یەکەمیان: {رَوَى الحَاكِم فِي المستدْرَك عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَأَلْتُ عَلِيّ بْنِ أَبِي طَالِب لِمَ لَمْ تُكْتَبْ فِي بَرَاءَةٍ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ؟ قَالَ: لأَنَّهَا (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) أَمَانٌ، وَبَرَاءَةُ نَزَلَتْ بِالسَّيْفِ، لَيْسَ فِيهَا أَمَانٌ} (أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٣٢٧٣)).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: لە بابم بیست دەیگوت: لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبم پرسی خوا لێی ڕازی بێ : بۆچی لە سەرەتای (براءة)ەوە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) نەنووسراوە ؟

ئەویش گوتی: لەبەر ئەوەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دڵنیا کەرەوەیە، ترس لابەرە بۆ بەرانبەر، وە سووڕەتی (براءة)ش بە هەڕەشەکردنی کوشتنو جەنگ لەگەڵ کردن، بۆ ئەهلی کوفر ـ یانی ئەوانەی پەیمان شکێنن ـ دابەزیوە.

(نَزَلَتْ بِالسَّيْف) واتە: بەکارهێنانی چەك لە دژی ئەو کافرو بێبڕوایانەی کە دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانانیان دەکردو پەیمانیان دەشکاند، یاخود سەنگەریان لە مسوڵمانان دەگرت، ئنجا بە هەڕەشە کردن لەوانو بە جەنگ ئیعلان کردن لە دژی ئەوان، ئەم سووڕەتە دابەزیوە، لەبەر ئەوە، گونجاو نەبووە کە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ی لە سەرەتاوە بێ، چونکە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دڵنیاکردنەوەی لایەنی بەرانبەر دەگەیەنێ، لێرەشدا ئیعلانی جەنگ کراوە.

وە (القاسمي) لە (محاسن التأويل)ەکەی خۆیدا ئەم قسەیە لە (ابْنُ عُيَيْنَة)ەوە دێنێ، کە یەکێکە لە زانایانی تابعیینو، قسەیەکی زۆر جوان دەکات:

(قَالَ ابْنُ عُيَيْنَة: اسْمُ اللهِ السَّلاَمُ أَمَانٌ، فَلاَ يُكْتَبُ فِي النبذِ وَالمحَارَبَةِ، قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ السَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴿٩٤﴾﴾

النســـاء، قِيلَ: فَإِنَّ النَّبيَّ ﷺ قَدْ كَتَبَ إِلى أَهْلِ الحَرْبِ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ؟! قَالَ: إِنَّمَا ذَلِكَ ابْتِدَاءٌ يَدْعُوهُم، وَلَمْ يَنْبُذْ إِلَيْهِم، أَلا تَرَاهُ يَقُولُ: ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾﴾طـه، فَمَنْ دُعِيَ إِلى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَأَجَابَ، وَدُعِيَ إِلى الجِزْيَةِ فَأَجَابَ، فَقَدْ اتَّبَعَ الهُدَى فَظَهَرَ الفَرْقُ)[١] .

واتە: (ابْنُ عُيَيْنَة) دەڵێ: ناوی خوا ﷻ ئاشتیی‌و دڵنیاکردنەوە دەگەیەنێ، بۆیە لە کاتێکدا کە دەویستری پەیمانێکی شکاو فڕێ بدرێتەوە بۆ خاوەنەکانی‌و ئیعلانی جەنگیان لە دژ بکرێ (کە ئەوان هەر دەرفەتێکیان لێ هەڵکەوێ، زەبر لە ئیسلام‌و مسوڵمانان دەدەن، لە پەنای پەیمانێکدا کە خۆیان پێوەی پابەند نین) ناگونجێ ناوی خوای بە بەزەیی‌و بەخشندە، بهێنرێ، وەك خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴿٩٤﴾﴾النســاء.

واتە: کەسێك سەلامی لێکردن، مەڵێن: تۆ بڕوادارنی.

وە لەوبارەیەوە کە گوتراوە: ئەدی ئەوە نیە پێغەمبەر ﷺ نامەی نووسیوە بۆ ئەوانە کە دوایی جەنگی لەگەڵدا کردوون، (مەبەست پێی ڕۆم‌و فارسەکانە)، وە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بۆ نووسیون:

{ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ، وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ}، { بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، مِنْ مُحَمَّد رَسُولِ الله إِلَى كِسْرَى عَظِيمِ فَارِسٍ} ، ئەویش ئاوا وەڵامی داوەتەوە، دەڵێ: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەڵس‌و کەوتی سەرەتای بوو لەگەڵیان، جارێ هیچ پەیمانێکی نەبووە لەگەڵیان، تاکو پەیمانەکەیان وێبداتەوەو بۆیان فڕێبدا، بەڵکو لە سەرەتاوە بانگی دەکردن، ئەدی نابینی چۆن پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی نامەکەیدا فەرموویەتی:

(والسَّلامُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى)؟!

واتە: ئاشتیی‌و سەلامەتیی لەسەر ئەو کەسەبێ کە بەدوای ڕێنمایی خوا دەکەوێ.

---

١) ج : ٥ ، ص : ٨٤ و ٨٥ .

ئنجا دەڵێ: هەر کەسێك بانگ بکرێ بۆ لای خواو وەڵام بداتەوە (واتە: مسوڵمان بێ)، یاخود بانگ بکرێ بۆ سەرانە دانو، وەڵام بداتەوە، ئەوە بە دوای ڕێنمایی خوا کەوتوە، کەواتە: جیاوازییەکە دەرکەوت.

هەڵبەتە ڕوونکردنەوەکەی زۆر جوانە.

ڕای دووەمیان: لەبارەی هۆکاری نە نووسرانی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە سەرەتای سوورەتی (التوبة) یاخود (البراءة)دا، ئەم دەقە هاتوە، کە پێشتریش هێناومانە لە سەرەتای تەفسیرکردنی سوورەتی (الأنفال)دا، لێرەش دەیهێنین:

﴿عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قُلْتُ لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ: مَا حَمَلَكُمْ أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى بَرَاءَةَ وَهِيَ مِنَ المئِينَ، وَإِلَى الأنفال وَهِيَ مِنَ المثَانِي، فَجَعَلْتُمُوهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَالِ، وَلَمْ تَكْتُبُوا بَيْنَهُمَا سَطْرَ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)؟

قَالَ عُثْمَانُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مِمَّا يَنْزِلُ عَلَيْهِ الآيَاتُ، فَيَدْعُو بَعْضَ مَنْ كَانَ يَكْتُبُ لَهُ وَيَقُولُ لَهُ: (ضَعْ هَذِهِ الآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا)، وَتَنْزِلُ عَلَيْهِ الآيَةُ وَالآيَتَانِ فَيَقُولُ: مِثْلَ ذَلِكَ، وَكَانَتِ الأنفال مِنْ أَوَّلِ مَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ بِالمدِينَةِ، وَكَانَتْ بَرَاءَةُ مِنْ آخِرِ مَا نَزَلَ مِنَ القُرْآنِ، وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهة بِقِصَّتِهَا، فَظَنَنْتُ أَنَّهَا مِنْهَا، فَمِنْ هُنَاكَ وَضَعْتُهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَالِ، وَلَمْ أَكْتُبْ بَيْنَهُمَا سَطْرَ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)﴾ {أَخْرَجَهُ إِبنُ أبي شَيْبَة برقم: (١٧٨٠٢)، وَأَحْمَد، برقم: (٤٩٩)، وَأَبُو دَاوُد، برقم: (٧٨٧)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٠٨٦)، وَالنَّسَائِي، فِي (الكُبْرَى)، برقم: (٨٠٠٧)، وَابْنُ حِبَّان، برقم: (٤٣)، وَالبَزَّار، برقم: (٣٤٤)، وقال مؤلفا: الإستيعاب ج٢، ص٢٦٤ هَذَا إِسْنَاد حَسَنٌ، وَصَحَّحَهُ الحَاكِم، وَوَافقهُ الذَّهَبِي، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّان وَالضياء المقدسي، ولكن ضَعَّفَهُ كُل مِنَ الألباني وشعيب الأنؤوط}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: بە عوسمانی عەففانم گوت (کە ئەو کاتە سێیەمین جێنشین بووە، خوا لێی ڕازی بێ) چ شتێك وای لێ کردن، سوورەتی بەڕائە کە لەو سوورەتانەیە، ژمارەی ئایەتەکانیان لە دوو سەد بە پشتەوەیە، لەگەڵ سوورەتی ئەنفال دا، کە لەو

سوورەتانەیە، ژمارەی ئایەتەکانیان لە سەد کەمترە، پێکەوەیان بێنن، وە لە ڕیزی سوورەتە ئایەت زۆر درێژەکانیان دا دابنێن، وە لە نێوانیشیاندا ڕستەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) نەنووسن؟!

عوسمان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتی بۆ دادەبەزێنران، ئەوانەی کە قورئانیان بۆ دەنووسی، یەکێکیانی بانگ دەکرد، پێی دەفەرموو: ئەو ئایەتە لە فلان سوورەتەدا دابنێ، کە فلانو فلان شتەی تێدا باس دەکرێ، سوورەتەکەی پێ دەناساند، وە شوێنی ئایەتەکەی بۆ دیاری دەکرد، پاشان کە ئایەتێك یان دوو ئایەتی دیکەی بۆ دادەبەزێنران، دیسان بەو شێوەیەی دەفەرموو، وە سوورەتی ئەنفال لەو سوورەتانە بوو، کە لە سەرەتای چوونمان بۆ مەدینە دابەزێنرا، وە سوورەتی بەرائە لەو قورئانەیە، کە لە کۆتایی قۆناغی مەدینەدا دابەزێنرا، وە نێوەرۆکی سوورەتی تەوبەش وەك نێوەرۆکی سوورەتی ئەنفالە (واتە: هەردووکیان بابەتی جەنگو جیهاد دەگرنە نێو خۆیان) منیش پێم وا بوو، سوورەتی تەوبەش هەر درێژەی سوورەتی ئەنفالە، لێرەوە من سوورەتی ئەنفالیشم لە ڕیزی حەوت سوورەتە درێژەکان دا دانا، وە ڕستەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)م لە نێوانیان دا نەنووسی.

رای سێیەمیان: {أَخْرَجَ أَبُو الشَّيخ عَنْ أَبِي رَوق، قَالَ: (الأَنْفَالُ) وَ(البَرَاءَةُ) سُورَةٌ وَاحِدَةٌ، وَنَقَلَ مِثْلَهُ عَنْ مُجَاهِد، وَأَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي حَاتِم عَن سُفْيَان، وَقَالَ: ابْنُ لُهَيْعَة يَقُولُونَ: إِنَّ (بَرَاءَة) مِنَ الأَنْفَالِ، وَلِذَلِكَ لَمْ تُكْتَبْ البَسْمَلَةُ فِي (البَرَاءَةِ)}[1].

واتە: ئەبو شەیخ لە ئەبی ڕەوقەوە هێناویەتی، کە گوتوویەتی: سوورەتی (الأنفال)و (البراءة) یەك سوورەتن، هەروەها ئەو ڕایەی لە موجاهیدیشەوە هێناوە، کە قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووە، خوا لێیان ڕازی بێ، هەروەها ئیبنو ئەبی حاتیم لە سوفیانەوە (سوفیانی کوڕی عویەینە، یان سوفیانی ثەوریی) هێناویەتی، وە ئیبنو لوهەیعە گوتوویەتی: سوورەتی (بَرَاءة) بەشێکە لە (الأنفال)، هەر بۆیەش (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە سەرەتای

---

١) محاسن التأويل، ج : ٥ ، ص : ١٢٣.

(بَرَاءة) نەنووسراوەو یەکسەر ئەو (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ە کە لە سەرەتای سوورەتی (الأنفال)ەوە نووسراوە، هی (براءة)ەشە.

بەڵام (حاکم) خاوەنی (المستدْرَك) دەڵێ:

(استفَاضَ النَّقْلُ أَنَّهُمَا سُورَتَانِ).

واتە: زۆر گوازراوەتەوە لە زانایانی پێشین، لە هاوەڵانو تابعیینەوە گوتوویانە: ئەوانە دوو سوورەتن.

(أبو السعود)یش کە یەکێکە لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێ:

(اشْتِهَارُهَا بِهَذِهِ الأَسْمَاءِ (يعني: الأَرْبَعَةَ عَشَرَ اسْمَاً) يَقْضِي بأَنَّهَا سُورَةٌ مُستقِلَّةٌ، وَلَيْست بَعْضَاً مِنْ سُورَةَ الأَنْفَالِ).

واتە: ئەوە کە سوورەتی (التوبة) بەم ناوانە ناوی دەرکردوە، ئەو ناوانەی هەن (واتە: ئەو چواردە ناوەی کە پێشتر باسمان کرد)، وا دەخوازێ سوورەتێکی سەربەخۆ بێ، وە بەشێك نەبێ لە سوورەتی (الأنفال).

هەڵبەتە هەردوو ڕایەکان هەن: کە یەك سوورەت بن، یان دوو سوورەتی جیاواز، وە بەڕاستیش ڕێی تێدەچێ کە یەك سوورەت بن، وە ئەو ڕێیەشی تێدەچێ کە دوو سوورەت بن، ئەوەتا عوسمانیش خوا لێی ڕازی بێ، وەك پێویست بۆی ساغ نەبۆتەوە، گرنگ ئەوەیە ئەگەر سوورەتێکی سەربەخۆ بێ، باسمان کرد کە حیکمەتی (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) تێدا نەکرانی ئەوە بووە، کە ئەم سوورەتە ئیعلانی جەنگە لە دژی ئەو کەسانەی عادەتیان پەیمان شکێنیی بووە، وە گونجاویش نیە ناوی خوای خاوەن بەزەیی بهێنرێ، لە کاتێکدا کە تۆ ئیعلانی جەنگ لەگەڵ لایەنێکدا دەکەی!

وە ئەگەر یەك سوورەتیش بن، ئەوە باسمان کرد کە نێوەرۆکەکەیان یەکە، بەڵێ سوورەتی (الأنفال) دەربارەی ڕووداوەکانی جەنگی بەدرە، وە سوورەتی (توبة) یان (براءة) ئاماژەیەك بە جەنگی حونەین دەکات ، دوایی زۆربەی تەرخانکراوە بۆ ڕووداوەکانی جەنگی تەبووك، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەردووکیان

دەربارەی جەنگو جیهادو ڕووبەڕووبوونەوەن، لە دژی ئەهلی کوفری شەڕ فرۆشو سەنگەرگر لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا.

**برگەی پێنج** : باسمان کرد کە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە، نە نووسراوەو هۆکارەکەیشمان باسکرد، بەلاّم ئایا دروستە کەسێك کە ئەم سوورەتە دەخوێنێ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بکات، یاخود دروست نیە؟

زۆربەی هەرە زۆری زانایان گوتوویانە: دروست نیە، مادام لە سەرەتای سوورەتەکە، دانەنراوە، کەواتە: نابێ شتێك زیاد بکەین کە قورئان تێیدا نەبێ، بەلاّم کە دەگوترێ: (أَعُوذُ بِاَللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، ئەوە لەبەرئەوەیە کە خوا فەرمانی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾ النحل، واتە: کاتێك قورئانت خوێند، پەنا بە خوا بگرە، لە شەیتانی ڕەجم کراو، کە ئەویش دیارە چەند صیغەیەکی هەن: (أَعُوذُ بِاَللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، (أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، (أَعُوذُ بِاَللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ، وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ)، بەم سێ صیغەیە هاتوە، ئەوە فەرمانی پەروەردگارە نەگەرنا، (أَعُوذُ بِاَللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، گوتن، مانای وانیە کە ئەوە بەشێکە لە سەرەتای ئەو سوورەتە، کە دەخوێنرێ.

بەلاّم هەندێك لە زانایان گوتوویانە: دروستە لە سەرەتای سوورەتی (التوبة)شەوە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم) بخوێنرێ، یەکێك لەوانە (السخاوي)ە، کە لە کتێبی (جَمَالُ الْقُرَّاء)دا، بەڵگەی خۆیشی هێناوەتەوە، دەڵێ: مادام ناوی خوا هێنان لە سوورەتەکانی دیکەدا هەیە، وە ڕایەکیش هەیە کە (براءة)ش هەر درێژکردنەوەی سوورەتی (الأنفال)ە، وە بەشێکە لەو، کەواتە: هەر کاتێك (براءة)ش خوێنرا، وە هەر شوێنێکی لێ خوێنرا: لە سەرەتای، یان لە نێوەڕاستییەوە، لە هەر شوێنێك بێ، دروستە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بکرێ، بەلاّم ڕای زۆربەی زانایان، بەهێزترو پەسندترە.

(ابْنُ الجزري) کتێبێکی هەیە دەربارەی قورئان، بەناوی (النشر فِي القراءات العشر) کە تێیدا قسەو ڕایەکی تازەی بە نسبەت (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ەوە هێناوە، دەڵێ:

(مَنِ اعْتَبَرَ بَقَاءَ أَثَرِ العِلَّةِ الَّتِي مِنْ أَجْلِهَا حُذِفَتِ البَسْمَلَةُ فِي أَوَّلِهَا وَهِيَ نُزُولها بالسَّيْف، لم يُبَسْمِل، وَمَنْ لَمْ يَعْتَبِرْ ذلك، أو لم يرها، بَسْمَلَ بلا نظر والله أَعْلَم)[1].

واتە: هەر کەسێك ڕەچاوی مانەوەی ئەو هۆکارە بکات، کە بە هۆیەوە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە سەرەتای سوورەتی (توبة)ەوە لابراوە، کە بریتیە لەوەی ئەم سوورەتە دابەزیوە بە ڕاگەیاندنی جەنگ، وە بەکارهێنانی چەك لە بەرانبەر کافرانی پەیمان شکێندا، (هەر کەسێك ڕەچاوی ئەو هۆکارە بکات، وە مانەوەی ئەو هۆکارە لەبەرچاو بگرێ)، ئەوە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) ناکات، بەڵام هەر کەسێك ئەوەی لەبەرچاو نەگرت، ئەوە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دەکات، بەبێ ئەوەی کە بواری قسەی تێدا هەبێ.

دیارە زۆربەی زانایان پێیان وایە ئەگەر لە نێوەڕاستی، یاخود لە دوای سەرەتا، یان هەر شوێنێکی دیکەی سوورەتی (التوبة) بخوێنێ، دروستە کە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بکات.

بەڵام ئەگەر (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)یش نەکات، لەبەر ئەوەی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) تەنیا لە سەرەتای سوورەتەکانەوە هاتوە، وە خوای پەروەردگاریش تەنیا فەرمانی کردوە بە (إِستِعَاذَة) کردن، نەك بە (بَسْمَلَة) کردن، وەك دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾النحل.

واتە: هەر کاتێك قورئانت خوێند، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی ڕەجم کراو، واتە: دەبێ بڵێی: (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، دیسان هەر شتێکی ڕەوایە.

---

١) محاسن التأويل ج٥، ص١٢٤ و ١٢٥.

بەڵام وا دێتە بەرچاو ئەو ڕایە پەسندتر بێ، کە ئیکتیفا بکرێ بە (إِستعَاذَة) کردنو (بَسْمَلَة) نەگوترێ.

**بڕگەی شەش** : بۆ زیاتر خستنە ڕووی نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە، باسی پەیوەندیی نێوان (الأنفال)و (التوبة)و خاڵە هاوبەشەکانیان دەکەین.

دیارە ئەم دوو سوورەتە ئەگەر یەك نەبن، لەسەر ڕای ئەو زانایانەی کە دەڵێن: یەك سوورەت نین، پەیوەندییەکی زۆر پتەویان لە نێواندا هەیە، وە خاڵی هاوبەشیان زۆرن، هەرچەندە بە لای کەمەوە حەوت هەشتساڵیان لە بەین دابوون، واتە: کاتی دابەزینیان، لەبەرئەوەی سوورەتی (الأنفال) لە ساڵی دووەمی کۆچییدا دابەزیوە، لە دوای جەنگی بەدر، وە وەك باسمان کرد، سوورەتی (التوبة) لە ساڵی نۆ (٩)ی کۆچیی دا، واتە: بە لای کەمەوە حەوت ساڵیان لە بەیندا هەن، بەڵام وەك ئێستا باسی دەکەین، خاڵی هاوبەشیان زۆرنو پەیوەندییەکی زۆر تۆکمەو توندو تۆڵیان پێکەوە هەیە، کە ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوە، کە ئەم قورئانە خوا فەرموویەتی: ئەگەرنا کەسێك ئێستا قسەیەك بکات، دوایی حەوت ساڵی دی قسەیەك بکات، ئنجا ئەو قسانە هەموویان بە یەك بچنو، وەك ئاڵقەی زنجیر یەکدی ببەستنەوە وەك یەکێکیان مەتن بێو ئەویدیان شەرح بێ، لەوێ قسەکە بە کورتیی کراوە، لەوەی دیکەدا زیاتر تەفصیلی پێ بدرێ، لەوێ شتێك گوتراوە، لەوی دیکەدا شتێکی دیکەی هاوشێوەی وی بگوترێ، کە هەردووکیان تەواوکەری یەکدی بن، بە ڕاستیی ئەوە هەر لە خوا دەوەشێتەوە، بەو شێوەیە فەرمایشت بکات، وە ماوەی هێندە زۆر لە نێوان فەرمایشتەکانی دا هەبێ، بەڵام فەرمایشتەکان، وەك یەك سوورەت بێنە بەرچاو، وە پێکەوە تۆکمەو پەیوەست بن.

# خاڵە هاوبەشەكانی نێوان سوورەتی ئەنفال و سوورەتی تەوبە

١/ سوورەتی (الأنفال) لە بارەی جەنگی (بەدر)ەوە دەدوێ، كە یەكەمین بەرەنگاربوونەوەی مسوڵمانان بوو، لەگەڵ ئەهلی كوفردا، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانی مەككەدا، وە بە فەرماندەیەتیی پێغەمبەر ﷺ بووە، سوورەتی (التوبة)ش لە بارەی جەنگی (حُنَیْن)و جەنگی (تبوك)ەوە دەدوێ، كە (حُنَیْن) دوا بەرەنگاربوونەوە بوو، لەسەر ئاستی نیوە دورگەی عەرەبیی، وە بە فەرماندەیی پێغەمبەر ﷺ بۆ سوپای مسوڵمانان، وە جەنگی (تبوك)یش یەكەمین ڕووبەڕوونەوەی مسوڵمانانو ڕۆمەكان بوو، بە سەركردایەتیی پێغەمبەر ﷺ.

كەواتە: لە لایەكەوە: بەدر یەكەمین بەرەنگاربوونەوەی ئیسلامو كوفر بوو، لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا، وە (حُنَیْن) دوا بەرەنگاربوونەوەی هێزی ئیسلامو هێزی كوفر بوو، وە لە لایەكی دیكەوە: جەنگی بەدر، كە سوورەتی (الأنفال) لەبارەیەوە دەدوێ، یەكەمین بەرەنگاربوونەوەی هێزی ئیسلامو كوفر بوو، بە سەركردایەتیی پێغەمبەر ﷺ، وە جەنگی (تبوك)یش كە سوورەتی (التوبة) لەبارەیەوە دەدوێ، یەكەمین ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئیسلامو كوفر بوو، بە سەركردایەتیی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕۆم، لە دەرەوەی دوورگەی عەرەبیی دا.

٢/ لە هەردووكیاندا، باسی جەنگ لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، وە خاوەن كتێبەكان، وە كافران بە گشتیی، كراوە.

٣/ لە هەردووکیاندا، ڕاگەیەنراوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دۆستو دڵسۆزی مزگەوتی حەرام نین، لە سوورەتی (الأنفال)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾، وە لە سوورەتی (التوبة)شدا دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ ﴿١٧﴾ ﴾، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ﴿٢٨﴾ ﴾التوبة، وەك دوایی تەفسیری ئایەتەکان دەکەین، کە لە یەکەمیان دا دەفەرموێ: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بۆیان نیە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، لە حاڵێکدا کە شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن کە ئەهلی کوفرن، لە هی دوومیشیان دا دەفەرموێ: موشریکەکان پیسن، با لەم ساڵ بە دواوە توخنی مزگەوتی حەرام نەکەون.

٤/ لە هەردووکیاندا، باسی پەیمان شکێنیی کافران‌و، پەیمان بۆ فڕێدان‌و، ئاگادار کرانەوەیان کراوە، بەڵام لە (التوبة)دا بە درێژتر باس کراوە، کە هەر سەرەتای سوورەتی (التوبة) بەوە دەست پێ دەکات: ﴿ بَرَاءَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ ﴾، وەك دوایی باسی دەکەین.

واتە: (إِلى الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ مِنَ الـمُشْرِكِينَ الَّذِيـنَ لَمْ يَلْتَزِمُوا بِعهُودِهِم) ئەوانەی پابەند نەبوون بە پەیمانەکانیانەوە، چونکە ئەوانی دیکە خوای پەروەردگار، زۆر بە ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿ فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ ﴿٧﴾ ﴾التوبة.

واتە: هەتا ئەوان ڕێك‌و ڕاست بن لەسەر پەیمانەكانیان، ئێوەش لەگەڵیان ڕێك‌و ڕاست بن.

٥/ لە هەردووكیاندا باسی سیفەتەكانی بڕواداران‌و كافران كراوە، هەروەها باسی دۆستایەتیی ئەهلی كوفر بۆ یەكدی، وە دۆستایەتیی ئەهلی ئیمانیش بۆ یەكدی كراوە، ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴿٦٧﴾ ﴾التوبة، لەولاشەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

دیارە لە چوار ئایەتی كۆتایی سوورەتی (الأنفال)یشدا، پەیوەندییەكانی ئەهلی ئیمان‌و پێكهاتەكانی كۆمەڵگای مسوڵمان‌و دۆستایەتییان پێكەوە، هەروەها ئەوە كە ئەهلی كوفریش لە نێو خۆیاندا پێكەوە دۆستن، باسكراوە.

٦/ لە هەردووكیاندا، باسی ماڵ بەخشین لە ڕێی خوادا كراوە، بەڵام بە تەئكید لە سوورەتی (الأنفال)دا، بە كورتیی باس كراوە، ﴿ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾الأنفال، كە دیارە ئاماژەی دیكەش هەن، بەڵام لە سوورەتی (التوبة)دا زۆر بە تەفصیل باسكراوە.

٧/ لە سوورەتی (الأنفال)دا، كە باسی حوكمی دەستكەوتی جەنگ كراوە، بەڵام لە سوورەتی (التوبة)دا، باسی زەكات كراوە، هەردووكیان دوو بابەتی ئابوورییین.

٨/ لە هەردووكیاندا، باسی دەغەڵەكان‌و دڵنەخۆشەكان كراوە، بەڵام بە تەئكید لە سوورەتی (التوبة)دا، زۆر بە درێژیی باسی دەغەڵ‌و دڵنەخۆشەكان كراوە.

٩/ لە هەردووكیاندا، باسی هاندانی مسوڵمانان بۆ جەنگ‌و فیداكاریی لە پێناوی خوادا كراوە، بەڵام لە سوورەتی (التوبة)دا بەپێی ئەوە كە قەبارەكەشی گەورەترە، دوو ئەوەندەی سوورەتی (الأنفال) زیاترە، بە تەفصیلتر‌و فراوانتر باسكراوە.

١٠/ لە هەردووکیاندا، باسی دابەزاندنی فریشتان کراوە، بۆ هاوکاریی مسوڵمانان، لە سووڕەتی (الأنفال)دا، دابەزاندنی فریشتان لە جەنگی بەدردا، وە لە سووڕەتی (التوبة)شدا، دابەزاندنی فریشتان لە جەنگی (حُنَیْن) بۆ هاوکاریی‌و پشتگیریی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان.

١١/ لە هەردووکیاندا، باسی پشتگیریی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کراوە، لە بەرانبەر پیلانی کافرانو لە کاتی کۆچ کردنیدا، بۆ مەدینە لە سووڕەتی (الأنفال)دا ئاوا باس کراوە: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾، که باسمان کرد، وە لە سووڕەتی (التوبة)شدا ئاوا باسکراوە ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾.

کە باسی هەمان ڕووداوو بەسەرهات دەکات، کە بریتییە لە کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکەی ئەبووبەکر ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە، وە پیلان گێڕانی کافرەکان لە دژیان، وە هاوکاریی‌و پشتگیریی کردنی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەر ﷺو بۆ هاوەڵە خۆشەویستو بەڕێزەکەی ئەبووبەکری صیددیق خوا لێی ڕازی بێ، کە تاکە هاوەڵی بوو لەو کۆچە پڕ مەترسییەدا، وە تاکە هاوەڵی بوو لەنێو ئەشکەوتەکەدا، ﴿ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾، وەك دوایی بە تەفصیل باسی دەکەین.

١٢/ لە هەردووکیاندا، سەرزەنشتی مسوڵمانان کراوە، کە بۆچی بۆ جەنگ و جیهاد قەلب گرانیی و سستیی دەکەن؟ لە سوورەتی (الأنفال)دا کە دەفەرموێ:

﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ۝٦ ﴾، وە لە سوورەتی (التوبة)شدا، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ۝٣٨ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ۝٣٩ ﴾.

١٣/ لە هەردووکیاندا، بە شێوەیەکی سووک و بە ئەسپایی، وە بە ناڕاستەوخۆ، ڕەخنە لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ گیراوە، لە سوورەتی (الأنفال)دا، دەربارەی ئەوە، کە بۆچی پێش ئەوەی کافرەکان بێهێز و پێز بکەن و کوشتاریی باشیان لێ بکەن و لە پەل و پۆیان بخەن، بە دیلیان گرتن، دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ۝٦٧ ﴾الأنفال، کە باسمان کرد.

وە لە سوورەتی (التوبة)شدا، لەسەر مۆڵەتدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێک لە مونافیق و دڵنەخۆشەکان، کە پێیان وا بوو پێغەمبەری خوایان خەڵەتاندوە، دەهاتن پاساوی درۆیان بۆ دەهێنایەوە، بڕو بیانووی پووچیان بۆ دەهێنایەوە، پێغەمبەریش ﷺ وەک بۆخۆی شایستەیە، کە خاوەنی ڕێز و حورمەت و کەرامەتێکی زۆرە، وەک لە خۆی دەوەشێتەوە، مامەڵەی دەکرد، نەک وەک بۆ ئەوان شایستەیە، لەوبارەوە خوای پەروەردگار گلەیی لێکرد، فەرمووی:

﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾التوبة، خوا لێت ببووریّ، بۆچی مۆڵەتت دان {نەیەن بۆ جەنگی تەبووك}، تاکو بۆت دەربکەویّ، ئەوانەی کە ڕاست دەکەن، وە ئەوانەش کە درۆزنن، دەبووایە مۆڵەتت نە دابانایە، لێرەشدا خوای کارزان سووکە ڕەخنەیەکی لیّ گرتوە.

١٤/ خاڵێکی دیکەی هاوبەشیان ڕەخنەگرتنی کافرەکانە لە قورئان، لە سوورەتی (الأنفال)دا، خوا ئەوەی لیّ گێڕاونەوە : ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾﴾.

واتە: وە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێنەوە دەڵێن: ئەوە بیستمان، ئێمەش ئەگەر ویستبامان قسەی وامان دەکرد، ئەوە هەر ئەفسانەی پێشیانانە.

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە وایان دەگوت، دڵنەخۆشەکانیش لە سوورەتی (التوبة)دا هەر شتێکی وایان گوتوە، دەفەرمویّ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾.

واتە: وە کاتێك کە سوورەتێك دابەزێنریّ، هەیانە لەو دڵنەخۆشانە لەو دەغەڵانە (کە خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن) دەڵێن: کامەتان بە هۆی ئەم سوورەتەوە، ئیمانی زیادی کرد؟!

خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴾، ئنجا ئەوانەی کە ئیماندارنو ئیمانیان هەیە، ئیمانیان پێی زیاد دەبێو دڵخۆشیش دەبن، ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، بەڵام ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە، لەجیاتی ئیمانی تێدابێ، گومانو دوو دڵییو دڵە ڕاوکەو نەخۆشیی تێدایە، شیرکو کوفری تێدایە، ئەوە هەر دڵ پیسییان بۆ زیاد دەکات! ئەمە یانی: چی؟

یانی: هەر سوورەتێك دێتە خوار، ئەوان پێی بێبڕوا دەبنو گاڵتەی پێدەکەن، ئەوەش دەبێتە هۆی خەست بوونەوەی کوفرەکەیان، و چڕبوونەوەی ئەو کوفرەی کە لە دڵو دەروونیاندا هەیە، کەواتە: لەو دوو سوورەتەدا، هەڵوێستی خراپ بەرانبەر بە قورئان پێشان دراوە: لە (الأنفال)دا هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو، لە (التوبة)شدا، هەڵوێستی دڵنەخۆشو مونافیقە دەغەڵەکان.

**برگەی حەوت:**

# زەقترین جیاوازیی و تایبەتمەندییەکانی سوورەتی (التوبة)

سوورەتی (التوبة) کۆمەڵێك جیاوازیشی هەن، لەگەڵ سوورەتی (الأنفال)دا، وە کۆمەڵێك تایبەتمەندیشی هەن، جیاواز لە سوورەتی (الأنفال):

١/ ئیعلان کردنی جەنگ لە دژی کافرانی پەیمان شکێن، کە دیارە هەر لە سەرەتای سوورەتەکە، ئاوا دەست پێ دەکات: ﴿ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم

مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: ئەمە ئیعلانی حاشا لێکردن‌و دووریی لێ گرتنە، لەلایەن خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ، بۆ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، {بەڵام بە پەیمانەکانیانەوە پابەند نەبوون}، ئەوە مۆڵەتە لەو ڕۆژەوە کە ئیعلان کراوە، تا چوار مانگی دیکە، بە زەویدا بڕۆن بۆ خۆتان ئازادن، بەڵام بشزانن! کە ئێوە خواتان بۆ دەستەوسان ناکرێ‌و دەرباز نابن، وە بشزانن! کە خوا کافران زەبوون‌و ڕیسوا دەکات.

کە بێگومان ئەمە بەس لە سوورەتی (التوبة)دا هاتوە

٢/ ڕێگرتن لە کافران، کە بێنە لای مزگەوتی حەرام، وەك خوا لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ ﴿١٧﴾ ﴾، هەروەها لە ئایەتێکی دوایی دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەم ساڵ بە دواوە، با هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان توخنی مزگەوتی حەرام نەکەون، وە ئەگەر لە هەژاریی‌و نەدارییش ترسان (کە دیارە کافرەکان کە دەوری کەعبەیان قەڵەباڵغ دەکردو، کڕین‌و فرۆشتن‌و بازرگانییان لێ دەکردو، مسوڵمانان قازانجیان دەکرد) ئەوە خوا لە بەخششی خۆی بێ نیازتان دەکات، ئەگەر ویستی، وە خوا زانای کارزانە.

٣/ دەرکردنی نەفیری گشتی، (نفیر العام) واتە: دەرچوونی گشتی لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەران، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ...﴿٣٦﴾﴾التوبة.

واتە: لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا بە گشتیی بجەنگن، وەك چۆن ئەوان بە گشتیی لە دژتان دەجەنگن.

کە ئەوە دوایی باسی دەکەین، ئەمە چۆنەو واتای چییە ؟!

واتە: بە گشتیی {ئەی مسوڵمانینە! هەمووتان بە هەرەوەزییو، بە یەك دەستیی} لە دژیان بجەنگن، وەك چۆن ئەوان هەموویان، لە دژتان دەجەنگن.

نەك لە دژ هەموو هاوبەشە بۆ خوا دانەرەکان بجەنگن! چونکە هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، جەنگ لە دژ کردنیان ڕەوا نیە، ئەوانەی کە پەیمانیان بەستوە، دەبێ پەیمانیان لەگەڵ تەواو بکرێ، وە ئەوانەی کە ئامادەن ملکەچ بکەن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیو سەرانە بدەن، پێویستە ئاشتییان لەگەڵدا بکرێ.

٤/ دەرخستنی نهێنییەکانو عەیبو کەمو کوڕیی دەغەڵو دڵنەخۆشەکان، کە لە چەند شوێنێکدا، لە سوورەتی (التوبة)دا، ئەوە زۆر بە تەفصیل هاتوە وە زۆربەی ناوەکانی، پەیوەندییان بە دەرخستنی نهێنییەکانو عەیبو کەمو کوڕییەکانی دەغەڵو دڵنەخۆشەکانەوە هەیە، وەك: (الفَاضِحَة، المُنَقِّرَة، المُثِيرَة، المُبَعْثِرة، المُدَمْدِمَة، المُخْزِيَة) هەموو ئەو ناوانە، وەك مانامان کردن، ئەوە دەگەیەنن، کە لەم سوورەتەدا عەیبو کەمو کوڕیی، ئاشکراو نهێنیی، نێو سینەکانی مونافیقو دەغەڵەکان، زۆر خراونە ڕوو، ئەم ڕستەیە لە چەند شوێنێك دا دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ﴿٤٩﴾﴾التوبة، ﴿وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ ﴿٦١﴾﴾التوبة، ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾﴾التوبة، ﴿وَمِنْهُم

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴿٥٨﴾ ﴾التوبة، ﴿ وَمِنْهُمْ ﴾، ﴿ وَمِنْهُم ﴾، واتە: لەوان کەسانێك هەیە، لەوان کەسانێك هەیە.

٥/ لەم سوورەتەدا، باسی عەرەبە خێڵەکییەکان کراوە (الأعراب)، وە پۆلێن کراون، دیارە بۆ خراپو خراپترو، باشو باشتر دابەش کراون، بۆ وێنە: خوای دادگەر دەربارەی خراپەکانیان دەفەرموێ: ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ﴿٩٧﴾ ﴾التوبة، ﴿ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ﴿٩٨﴾ ﴾التوبة، بەلام هی چاکیشیان هەن، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ۚ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحْمَتِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾ ﴾ التوبة.

٦/ لەم سوورەتەدا، باسی قەدەغەکردنی داوای لێبوردن کردن بۆ کافران کراوە، چ لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، چ لە لایەنی بڕوادارانەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِىِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾التوبة.

واتە: پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی بڕوایان هێناوە بۆیان نیە داوای لێبوردن بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکەن، با خزمو نیزیکیشیان بن، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوتوە، کە ئەوانە خاوەنی کڵپەی دۆزەخن.

واتە: دوای ئەوەی کە لەسەر کوفر دەمرن، لەسەر شیرك دەمرن، بۆیان نیە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوای لێبوردە بکەی، بەلام هەتا زیندوون، بۆت هەیە

داوای هیدایەتیان بۆ بکەی، بڵێی: خوایە! هیدایەتیان بدەو ڕێیان پێشانبدەو، دڵیان بۆ دینی خۆت نەرم بکە، بەڵام دوای ئەوەی بە کوفرەوە ڕۆیشتن، ئەوە خوا لێیان خۆش نابێ، ئنجا پێشینانی خۆمان دەڵێن: (قسە بکە جێ بگرێ، ڕبە بپێوە سەربگرێ)، قسەیەك کە جێ نەگرێ، دووعایەك کە ڕێی تێنەچێ، بۆچی دەیکەی؟ بەڵکو خوا پێشی ناخۆشە داوایەکی لێ بکرێ، کە بێجێ بێ، وە لە ڕاستییدا ناگونجێ کەسێك لەسەر دژایەتیی کردنی خوا، مردبێ، تۆش بڵێی: خوایە! لێی ببوورە، کەسێك دژی خوا بێ، دەبێ تۆش دژی بی، وە تۆ دەبی دۆستی دۆستەکانی خوا بی، وە دژی دوژمنەکانی خوا بی.

٧/ خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە مسوڵمانی خاوەن پاساوی ڕاستەقینە، گلەیی بەشدار نەکردنی جەنگیان لێ ناکرێ، ئەمەش تەنیا لەم سوورەتەدا باسکراوە، واتە: لە (الأنفال)دا باس نەکراوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾التوبة.

واتە: ئەوانەی کە بێهێزن، {جەستەیان بێهێزە شەڕیان بۆ ناکرێ}، وە ئەوانەی کە نەخۆشن، وە ئەوانەی کە توانای ماددییان نییە{ و هۆکارەکان و ئامرازەکانی جەنگیان پێ ئامادە ناکرێ} ئەوانە مادام دڵسۆزی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بن، گلەییان نایەتە سەر، هەروەها ئەوانەی کە هاتن بۆ لات گوتیان: وڵاخی سوارییمان بۆ دابین بکە، بۆ جەنگی تەبووك، دیارە ڕێیەکی دوورو درێژ بە بیاباندا، نە دەگونجا بە پێیان بڕۆن، وە تۆش فەرمووت: ﴿ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ ﴾.

واتە: هیچ وڵاخێکم چنگ ناکەوێ، ئێوەی لێ سوار بکەم، ﴿تَوَلَّوا۟ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ﴾.

ڕۆیشتن و چاویشیان پڕ بوو لە ئاو، فرمێسکیان لە چاویان دەهات.

﴿حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ﴾.

دڵتەنگ بوون کە نەیاندەتوانیو پارەیەکیان نەبوو خەرجی بکەن، بۆ ئەوەی وڵاخی بارو سواریی پێ بکڕن، تاکو بەشداریی ئەو جەنگە بکەن، ئەوانە خوای میهرەبان گلەییان لێ ناکات، بەڵکو لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ وەك دوایی باسی دەکەین، کە بە هاوەڵانی بەڕێزی خۆی فەرمووە: ئێوە هیچ شیوێکتان نەبڕیوەو، هیچ زەحمەتێکتان نەکێشاوە، مەگەر کەسانێك هەن لە مەدینەدا، بەشدارن لە پاداشت لەگەڵتاندا، گوتیان: ئنجا مادام لەوێن، چۆن بەشدارن؟

فەرمووی: {حَبَسَهُمُ الْمَرَضُ} بەهۆی نەخۆشییەوە نەیانتوانیوە بێن و، پەرج لەبەردەمیاندا هەبووە، بۆیان نەکراوە بێن.

٨/ باسی ئەوە کراوە کە خوا ﷻ تۆبەی لە پێغەمبەرو ﷺ کۆچکەرو پشتیوانانی بەشداری جەنگی تەبووك وەرگرتوە، خوا لێیان خۆش بووە، وە بەزمیێ پییاندا هاتۆتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٧﴾﴾التوبة، ئەوە بە گشتی، هەروەها بە تایبەتیش لەو سێ کەسە، کە دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓا۟

إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾﴾التوبة، کە ئەوانە بەسەرهاتێکیان هەیە، کە خوا پشتیوان بێ، دوایی بەسەرهاتەکە بە درێژیی دەگێڕینەوە، کە کەعبی کوڕی مالیك و دوو هاوەڵەکەی دیکەی، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، بەبێ پاساو دواکەوتبوون، بەڵام دوایی تەوبەیان کردو، خوای بەخشندەش لێی قبووڵ کردن.

* لەم سووڕەتەدا سەرزەنشتی مسوڵمانان کراوە لە جەنگی حونەین دا، کە بە زۆرییان سەرسام بوون، خوای کارزان سەرزەنشتیان دەکات و ڕەخنەیان لێدەگری، دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾﴾التوبة.

واتە: یاد بکەنەوە! کە خوا لە زۆر شوێنان ئێوەی سەرخست، وە لە ڕۆژی حونەینیشدا، کە بە زۆرییەکەتان سەرسام بوون، بەڵام زۆرییەکەتان، هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، وە زەوی بەو فراوانییەوە، لێتان وەتەنگ هات، وە پشتتان لە دوژمن کرد، ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾﴾ التوبة، بەڵام دوایی خوا ئارامیی ڕژاندە سەر دڵی پێغەمبەر {ﷺ، کە ئەو دڵیشی هەر پڕ لە ئارامیی بوو، بەڵام خوا بۆی زیاد کرد} وە ئارامیی ڕژاندە سەر دڵی ئیمانداران، وە سەربازانێکی ناردنە خوار، کە ئێوە نەتاندەبینن {کە فریشتەکان بوون}، وە ئەوانەی بێبڕوان (خوا) سزای دان {بە دەستی ئێوە} دواییش خوا لە هەر کەسێك بیەوێ، دەبووری {کە لەو ڕۆژەدا پشتیان لە دوژمن کردو گوناهێکیان کرد}، لەبەرئەوەی خوا خاوەنی لێبووردەو بە بەزەییە.

١٠/ ئیعلانی جەنگ بەرانبەر خاوەن کتێبانی شەڕ فرۆش، هەتا یان مسوڵمان دەبن، یان ئامادە دەبن کە ملکەچ بکەن، بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، کە ئەویش لە

سەرانەدان دا بەرجەستە دەبێ، بە نسبەت ئەوانەوە، کە سەنگەریان لە ئیسلامو مسوڵمانان گرتوە، ئەگەرنا خەڵکی دیکەش هەبوون، جوولەکەش بوونو نەصرانییش بوون، داوای سەرانەیان لێ نەکراوە بۆچی؟ چونکە پێشتر سەنگەریان لە ئیسلامو مسوڵمانان نەگرتوە ئەوە دوایی بە وردیی باسی دەکەین، چونکە هەندێك کەس پێی وایە، هەرچی خاوەن کتێب بوو بە گشتی، حەتمەن دەبێ سەرانە بدەن، کە ئەوە لە ڕاستییدا وانیە، بەڵام هەر کەسێك لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیا، دەبێ پابەند بێ بە سیاسەتو ستراتیژی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، وە بە ئەدەبە گشتییەکانیەوە، بەڵام سەرانە دان، وەك دوایی باسی دەکەین، وە من لە بەرگی چوارەمی کتێبی ئیسلامو دەوڵەتداریی دا، وە لە کتێبی (الإِسْلاَمُ كَما يَتَجَلَّى فِي كِتَاب الله) لە بەرگی (٧) و (٨)دا بە تەفصیل باسم کردوە، سەرانە دان، شتێك نیە حەتمیی بێ، بەڵکو ڕەمزی ملکەچ کردنی ئەو قەوارە سیاسییەو، ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە، بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی.

ئنجا ئەگەر ئەو ملکەچییە بە شێوەیەکی دیکەش تەعبیری لێ بکرێ، بۆ وێنە: کە جەنگ نەکەن، دژی ئەو قەوارە ئیسلامییە، یاخود بەوە کە بەشداریی جەنگو جیهاد بکەن، بەشداریی سوپا بکەن، یاخود بێ ئەوەی کە هیچ پابەندییەکی دارایییان لە بەرانبەر دەوڵەتی ئیسلامییدا هەبێ، وەك سێ تیرەکەی: (بني قينقاع و بني النضير و بني قريظة) کە تەنیا خاڵی هاوبەشیان ئەوە بوو، کە بە یەکەوە بەرگریی لە مەدینە بکەن، ئەگەرنا هەر کەسەو لەسەر دینی خۆی بوو، وە هیچ سەرانەیەکیان نەدەدا بە پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانان.

ئەمانە دە (١٠) تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە بوون، بەپێی تێگەیشتنی بەندە .

**بڕگەی هەشت:**

# دابەشکردنی جوگرافیای ئایەتەکان

سەرەتا بە پێویستی دەزانم، دابەشکردنی جوگرافیای ئایەتەکان بۆ نۆزدە (١٩) دەرس بخەمە ڕوو، بۆئەوەی بەرچاومان ڕۆشن بێ، دەربارەی باس و بابەتەکانی، کە ئەم سوورەتە موبارەکە، بە سەدو بیست و نۆ (١٢٩) ئایەتەکەیەوە، لەبارەیانەوە دەدوێ:

**دەرسی یەکەم:** کە (١٦) ئایەتە، لە ئایەتی (١ تا ١٦)، واتە: ئایەتی (١٦)ەشی لەگەڵدایە، دیارە لەو (١٦) ئایەتەدا، خوا ﷻ سەرەتا بەریی بوون و دووریی و بێزاریی خۆی و پێغەمبەرەکەی ﷺ لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، ڕادەگەیەنێ، کە پەیمانیان هەبووە لەگەڵ مسوڵمانانda، بەڵام پابەند نەبوون بە بەڵێن و پەیمانەکانی خۆیانەوە، وە چوار مانگ مۆڵەتیان بۆ دادەنێ، کە لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا ئازادن، بێن و بچن، وە پاشان جارێکی دیکە، لە ڕۆژی حەجی گەورەتردا (الحج الأكبر) خوای دادگەر ڕایدەگەیەنێ کە خوا ﷻ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دوورن، وە لێیان بەریین، ئەوانەی کە بەڵێن و پەیمانیان هەبووە لەگەڵ مسوڵمانان دا، بەڵام پێیانەوە پابەند نەبوون، ئیدی ئەم ئایەتانە لەوبارەوە دەدوێن، هەڵبەتە دوایی خوا ﷻ کۆمەڵێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لەو بڕیارو حوکمە هەڵداوێری و جیا دەکاتەوە، کە ئەوانەیان بوون پابەند بوون بە پەیمانەکەیانەوە، وە هیچ کەم و کوڕییان نەبووە.

پاشان خوا ﷻ ماهیەت و ناخی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بۆ پێغەمبەرو ﷺ بۆ بڕواداران دەخاتە ڕوو، کە ئەوەی لە دڵیاندا پەنهانیان کردوە، جیایە لەوەی بە زار دەیڵێن، دەفەرموێ: ئەوانە پابەند نین بە هیچ خزمایەتیی و نیزیکییەک و، هیچ بەڵێن و پەیمانێک لەگەڵ ئیمانداران دا ڕەچاو ناکەن.

پاشان ڕایدەگەیەنێ، کە هەر کاتێك ئەوانە تەوبەیان کردو گەڕانەوە بۆ لای خوا، وە نوێژیان بەرپاکردو زەکاتیان دا، ئەوە ڕێیان بەردەن، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ئەوانە براتانن لە ئاییندا، بەڵام ئەگەر هەر لەسەر پەیمان شکێنیی بەردەوام بوون، وە لەسەر تانە لێدانی ئایینەکەتان بەردەوام بوون، ئەوە سەرانی کوفر بکوژن، ئەوانە بێ بەڵێنو پەیمانن، یانی: لەسەر بێ پەیمانیی بیانکوژن، نەك لەسەر بێ ئیمانی.

دوایی خوای کاربەجێ هانی بڕواداران دەدات، کە چۆن دەبێ ئامادە نەبن، جەنگ لە دژی کەسانێك بکەن، پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوەو، پێغەمبەری خوایان ﷺ لە شارو وڵاتی خۆی دەرکردوە، وە ئەوانیش سەرەتا دەستپێشخەری جەنگ بوون، ئایا لێیان دەترسێن؟ بەڵکو خوا شایستەترە لێی بترسێن، دوایی فەرمانیان پێدەکات کە لە دژیان بجەنگن.

وە لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ئایا پێتان وایە وازتان لێ بهێنرێ، بەر لەوەی کە بۆ خوای پەنهانزان، ئەوانەتان دەربکەونو بناسرێن کە جەنگو تێکۆشان دەکەن لە ڕێی خوادا، وە ئامادەنین بێجگە لە خواو پێغەمبەرو ﷺ بڕواداران، هیچ کەسێکی دیکە بکەنە جێی ڕازو نیازیان، ئایا پێتان وایە وازتان لێ بهێنرێ، پێش ئەوەی ئەوە دەربکەوێ؟ واتە: نابێ پێتان وابێ.

**دەرسی دووەم:** لە ئایەتی (١٧ تا ٢٣) دەگرێتە خۆی، واتە: (٦) ئایەت، لەو (٦) ئایەتەدا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بۆیان نیە، لە کاتێکدا: شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن کە ئەهلی کوفرن، مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە بچنە مزگەوتەکانی خوا، بە تایبەتی مزگەوتی حەرام.

وە پاشان خوا ڕوونی دەکاتەوە کە کێ شایستەی ئەوەیە مزگەوتەکانی خوا، بە طاعەتێك کە لای خوا قبووڵە، ئاوەدان بکاتەوە: تەنیا ئەوانەن کە ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیەو، نوێژ بەرپا دەکەنو، زەکات دەدەن، وە بێجگە لە خوا لە کەس ناترسێن.

دوایی خوا ﷻ ڕەخنە دەگرێ لە هەندێك لە مسوڵمانان کە دوای ئەوەی مسوڵمان بوون، بە کۆچکەرانو پشتوانانیان گوتوە: ئەگەر ئێوە جەنگو

جیهادتـان کـردوە، لە ڕێـی خـوادا، ئێمـەش خزمـەتی حاجیانمـان کـردوە، خـواردن‌و ئاومـان داوە بە حـاجیـان، خـوای کارزان لەوبـارەوە ڕەخنەیـان لـێ دەگـرێ، وە پێیـان دەفـەرموێ: هـەر کەسـێك ئەوانـەی کـە لـە پێنـاوی خـوادا کۆچیـان کـردوە فیداکارییـان کـردوە بـە سـەرو ماڵیـان، بەراوردیـان بکـات لەگـەڵ کەسـانێك دا، هەڵساون بە خزمەتی حاجیان‌و پەردە دروسـت کـردن بـۆ کەعبـەو ... هتـد، ئـەوە ستەمی کردوە، وە دوایی خـوا بـاسی پاداشـتی ئەوانـە دەکـات کـە ئەهلـی ئیمـان‌و کـۆچ کـردن‌و جەنـگ‌و جیهـادن بـە سـەرو مـاڵیـان لـە پێنـاوی خـوادا، کـە پاداشتێکی گەورەیـان هەیە.

<u>دەرسی سێیەم:</u> لە ئایەتی (٢٣ تـا ٢٧) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: (٤) ئایـەت، لـەو (٤) ئایەتەدا خـوا ﷻ فەرمان بە بڕواداران دەکـات، کـە ئەگـەر بـاب‌و برایـان، کوفریـان بەسـەر ئیمـان دا هەڵـبژارد، نابـێ بـە دۆسـتیـان بگـرن‌و خۆشیـان بوێن‌و، کـەین‌و بەینیـان لەگـەڵیـاندا هەبـێ، دوایی خـوا ﷻ پێیـان دەفـەرموێ: ئەگـەر بێـت‌و بـاب‌و باپیـرانیـان، کوڕانیـان، برایـانیـان، هاوسەرانیـان، خزم‌و عەشیـرەتیـان، سەروەت‌و سامانیـان، بازرگـانییـان، وە جێگـاو ڕێگـایـان، هـەموو ئـەوان بە یەکـەوە، لە لایـان خۆشەویسـتـتر بـن، لە خـواو لە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ‌و جەنگ کـردن لە پێنـاوی خـوادا، ئەوە دەبـێ چاوەڕێـی تۆڵـەو سـزای خـوا بن.

دوایی خـوا ﷻ دەیخـاتـەوە بیـر ئیمانداران، کە لـە زۆر شـوێنان سـەری خسـتوون، بەتایبـەت جـەنگی (حونەیـن) کـە پێشـێ مسوڵمـانان بـە زۆرییەکـەیـان سەرسـام بوون، گوتیـان: {لَـنْ نُغْلَـبَ اليَوْمَ مِنْ قِلَّةٍ}[1].

واتە: ئەمڕۆ لەبـەر کـەمییـان ئێمـە تێنـاشکێیـن.

کـەچـی دوایـی تێشکـان، هـەتـا دوایـی خـوا ﷻ ئـارامیی نـارد، بـۆ سـەر دڵـی پێغـەمبـەرەکـەی ﷺ، وە بۆ سەر دڵی ئیمـانداران، وە سەربـازانێکی ناردنـە خـوار کە نەدەبینـران، کە فریشتەکانن، وە بێبـڕوایەکانی بە دەستی مسوڵمانانی سزادا.

---

[1] صحيح البخاري: كتاب الجهاد والسير، باب قول الله تعالى: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا ۝٢٥﴾ التوبة.

**دەرسی چوارەم:** لە ئایەتی (٢٨ تا ٣٣) دەگرێتە خۆی، واتە: (٦) ئایەت، لەم (٦) ئایەتەدا خوا ﷻ فەرمان دەكات بە بڕواداران، كە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان پیسن، (واتە: پیسیی مەعنەویی)، وە نابێ توخنی مزگەوتی حەرام بكەون، لە دوای ئەم ساڵەوە، لە ساڵی نۆ (٩) بە دواوە.

پاشان فەرمانیان پێ دەكات لە دژی ئەو خاوەن كتێبانە بجەنگن، كە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، وە ئەوەی كە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بە قەدەغەیان داناوە، بە قەدەغەی دانانێن، وە پابەند نین بە ئایینی هەقی خوای پەروەردگارەوە، هەتا سەرانە دەدەن (واتە: ملكەچ دەبن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی).

پاشان باسی هەندێك قسەو هەڵوێستی لادەرانەو پێچەوانەی تەوحیدی جوولەكەكانو نەصرانییەكان دەكات: {جوولەكەكان گوتیان: عوزێر كوڕی خوایە، نەصرانییەكان گوتیان: عیسا كوڕی خوایە}

پاشان باسی هەڵوێستی خاوەن كتێبەكان دەكات، بە تایبەتی هی نەصرانییەكان كە عابیدو زاناكانی خۆیانیان لە جیاتی خوا كردۆتە پەرستراو، كە حەڵاڵو حەرامیان بۆ دیاریی كردوون، لە حاڵێكدا كە پێیان گوترابوو: جگە لە خوا، كەسی دیكە نەپەرستن، دوایی باسی ئەو هەڵویستەیان دەكات، كە ئەوانە دەیانەوێ ڕووناكیی خوا بە فووی زاریان بكوژێننەوە، بەڵام خوای باڵادەست لێ ناگەڕێ هەتا ئایینەكەی تەواو نەكاتو، ڕووناكییەكەی تەواو نەكات.

**دەرسی پێنجەم:** لە ئایەتی (٣٤ تا ٣٧) دەگرێتە خۆی، كە (٤) ئایەتە، لەم (٤) ئایەتەدا خوا ﷻ سەرەتا بە بڕواداران دەفەرموێ: كە زۆرێك لە زانایانو ڕاهیبەكانی خاوەن كتێبان، لەژێر پەردەی دیندا، بەناهەق ماڵی خەڵك دەخۆن، وە خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، دوایی هەڕەشەی سەخت لەوانە دەكات كە زێڕو زیو پەزمەندە دەكەن، پارەو سامان پەزمەندە دەكەن، وە لە ڕێی خوادا نایبەخشن، كە لە ڕۆژی دوایی دا بۆیان سوور دەكرێتەوەو نێوچەوانو لاتەنیشتو پشتیانی پێ دەسووتێنرێ.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: مانگەكان لەلای خوای پەروەردگار، دوازدە (١٢) مانگن، بۆیە خوای زاناو توانا وا دەفەرموێ، چونكە عەرەبەكان لە نێو خۆیاندا

دەستکاریی مانگەکانیان دەکرد، بە تایبەت چوار مانگە حەرامەکان، ئەو چوار مانگەی کە جەنگیان تێدا قەدەغە بوو، واتە: (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، رجب) وە خوای شارەزا ڕوونی دەکاتەوە، کە پێویستە ئەو مانگانە، خوا چۆنی داناون، ئێوەش ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، کەمو زیادییان تێدا نەکەن، پاشان دەفەرموێ: ئەی مسوڵمانینە! بە تێکڕا دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرانەکان بجەنگن، وەك چۆن ئەوان بە تێکڕا دژتان دەجەنگن.

دوایی خوا ﷻ نەریتێکی نەفامیی کافرەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، کە بریتی بوو لە (النسيئ)، کە ئەوان: مانگەکانی (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم) بە دوای یەکدا، وە پاشان مانگی (رجب)یش، لەو چوار مانگەدا نەدەبوو جەنگو کوشتار لە یەکدی بکەن، ئنجا ئەگەر ئەوانە پەکیان لەسەر ئەوە کەوتبایە، لە یەکێ لەو مانگانەدا شەڕێك بکەن، دەیانگوت: ئەم مانگە دوا دەخەین، مانگێکی دیکە قەدەغەی دەکەین، خوای دادگەر دەفەرموێ: (نسيء) بریتییە لە زێدەیی لە کوفردا، یانی : ئەوانە هەر بۆ خۆیان کافر بوون، بەو هەڵوێستانەشیان، کوفرەکەی خۆیانیان خەستتر کردۆتەوە.

<u>دەرسی شەشەم:</u> لە ئایەتی (٣٨ تا ٤٨) دەگرێتە خۆی، واتە: یازدە (١١) ئایەت،

لەو (١١) ئایەتەدا خوا ﷻ بانگی بڕواداران دەکات بە سەرزەنشت کردنەوە: کە بۆچی کاتێك پێتان دەگوترێ: لە ڕێی خوادا دەربچن بۆ جەنگو جیهاد، بە قالب گرانییەوە دەردەچن، وە خۆتان بە زەوییەوە دەنووسێنن، ئایا ژیانی دنیاتان لە ژیانی دواڕۆژ پێ چاکترە، لە حاڵێکدا کە ژیانی دنیا، لە چاو نازو نیعمەتی دواڕۆژ شتێکی کەم بایەخە؟!

پاشان هەڕەشەیان لێ دەکات کە ئەگەر بێتو لە ڕێی خوادا جەنگو جیهاد نەکەن، خوا سزاتان دەدا، وە خەڵکێکی دیکە دێنێ بۆ شوێنی ئێوە، (واتە: ئێوە دەگۆڕێ)، وە هیچ زیانێکیش بە خوا ناگەیەنن.

ئنجا خوا ﷻ ئیمانداران هاندەدا بۆ پشتگیریی کردن لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ئەویش هەڵگری پەیامی خوایە، وە پرۆژەی ئایینو بەرنامەی خوای پەروەردگاری پێیە، وە ئاگاداریان دەکاتەوە، کە ئەگەر ئەوانیش پێغەمبەر ﷺ بەهێز نەکەنو

پشتگیـری نەکـەن، خـوای باڵادەسـت کاتێـك کـە هـیچ کـەسی لەگـەڵ دانـەبوو سەریخست، کاتێك کە تەنیا خۆیو هاوەڵەکەی بوون لە ئەشکەوتەکەدا، وە خـوا ئارامیی ڕژانـدە سـەر دڵـی پێغەمبـەر ﷺ، وە بـە فریشتەکـان، کـە نـەدەبینران هاوکاریی کرد، وە وشەی کافرەکانی نزم کـرد، واتـە: پیلانو نەخشـەی ئـەوان، وە وشەی خوا ـ واتـە: تەگبیـرو نەخشەکەی ـ هەمیشە بـەرزە.

پاشان فەرمانیـان پێدەکات کـە بـە سـووکیو بـە قورسیی، لـە پێنـاوی خـوادا بـە سەرو ماڵیـان جیهاد بکەن، وە دوایی خوا ﷻ تانە لـە کەسانێکی دڵ نـەخۆش، یـان مونـافیق دەدا، کـە دەفـەرموێ: ئەگـەر ئـەو دەرچوونـە، سەفەرێکی کورت بـایە، وە دەستکەوتێکـی نیزیـك بووایــە، شـوێنت دەکـەوتن، بـەڵام چونکـە سەفەرەکـە دوور بوو (لێرەدا مەبەسـت پێی جەنگی تەبووکە، دەبوو لە مەدینەوە بچن بـەرەو شـام، دەوری مانگـە ڕێیـەك بـووە) سوێندیشـان دەخـوارد، ئەگـەر توانیبـامان دەهاتیـن، بەڵام لەگەڵ سوێندەکەشیـاندا ڕاستیـان نەدەکرد، دەیانتـوانی بێـن.

ئنجا خـوا ﷻ سووکـە گلەییـەك لـە پێغـەمبـەری خۆشەویست ﷺ دەکـات، کـە بۆچی مۆڵـەتی هـەندێکیـانت دا، پێش ئەوەی بۆت دەربکـەوێ داخـۆ ڕاسـت دەکـەن، یـان درۆزنـن؟! دوایی هـەواڵی پێـدەدا، کـە تەنیـا ئەوانـە مۆڵـەتت لـێ وەردەگـرن کـە بڕوایـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، بۆیـە ئامـادەنین فیداکـاریی بکـەن، بـەڵام ئەوانەی کە بڕوایان بە خـواو بـە ڕۆژی دوایی هـەیە، هـەرگـیز داوای مۆڵەتـت لــێ ناکەن، مەگـەر هیچ توانایەکیـان نەبـێ، وە پاشـان خـوای بـەرزی مـەزن دەفـەرموێ: ئەوانەی کە داوای مۆڵـەت لە تۆ دەکەن، ئەگەر ویستبـایـان لەگەڵ تۆبـان، لە جـەنگی تەبـووك دا، پێشتـر خۆیـان بۆ ئامادە دەکـرد، چونکـە هـەیـان بـوو، دەیگـوت: خـۆم ئامـادە نەکـردوە، خـوا دەفەرموێ: ئەگـەر ویسـتبایـان، خۆیـان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام خۆیـان هـەر نەیـانویسـت، بۆیـە خـوای دادگـەریش ئـەوەی بـە قسـمەت نـەکردنو، عەزیمەتو ئیـرادەیـانی خاو کـردەوە، وە پێیـان گوترا: دانیشن لەگـەڵ دانیشتووان.

دوایـی خـوا دڵـی پێغـەمبــەر ﷺ دەداتــەوەو، دەفـەرموێ: ئەگـەر لەگەڵیشتــان دەرچووبـان، هـەر مایەی خراپە دەبوون بۆ ئێوە، وە ڕۆڵی خراپیـان دەگێـڕا، وە قسەو نهێنییـەکانی ئێوەیـان بۆ خـەڵـکی دیکـە دەبـرد، وەك چۆن لـە کاتـی هاتنیشـت دا هـەر ڕۆڵی خراپیـان بینیـوە، واتە: کاتێـك پێغـەمبـەر ﷺ چووە بۆ مەدینـە.

<u>**دەرسی حەوتەم:**</u> لە ئایەتی (٤٩ – ٦٣) دەگرێتە خۆی، واتە: پازدە (١٥) ئایەت،

خوا ﷻ لەم (١٥) ئایەتەدا، کۆمەڵێك لە هەڵوێستی مونافیق و دڵنەخۆشەکان دەخاتە ڕوو، یەکێکیان ئەوەیە، کە یەکێك لەوان هاتوە بە پێغەمبەر ﷺی گوتوە: ﴿ائْذَنْ لِي وَلاَ تَفْتِنِّي﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير) برقم: (٢١٥٤)، والبَزَّار برقم: (٤٨٩٩)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (الكُبْرَى) برقم: (١٧٦٤٨)}.

واتە: مۆڵەتم بدە، کە نەیەم بۆ ئەو جەنگە، با تووشی گوناه نەبم! کە وەك دوایی باسی دەکەین، بیانوویەکی زۆر بێجێی هێناوەتەوە، ئنجا خوای زاناو توانا باسی هەڵوێستی نەرێنیی و خراپیان دەکات: ئەگەر چاکەیەکت تووش بوو، پێیان ناخۆشە، بەڵام ئەگەر خراپەیەکت تووش بێ، بەڵایەکت تووش بێ، دەڵێن: پێشتر دووربینیی خۆمان کرد بوو، وە خوای بەرز بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: تۆش پێیان بفەرموو: جگە لەوەی کە خوا بۆی نووسیوین، هیچی دیکەمان تووش نابێ، وە بڕواداران دەبێ پشت بە خوا ببەستن.

دوایی دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئایا جگە لە یەکێك لە دوو شتە چاکەکان، چاوەڕێی چی دەکەن، تووشمان بێ: یان سەرکەوتن، یان لە پێناوی خوادا خۆ بەخت کردن و شەهید بوون؟ دوایی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: تۆ پێیان بفەرموو: کە ئەگەر بە پێخۆش بوون یان پێناخۆش بوون، ماڵی خۆتان خەرج بکەن، هەر لێتان قبووڵ ناکرێ، چونکە ئێوە خەڵکی لارێن و، بۆ خوا نایبەخشن.

دوایی دەفەرموێ: هیچ شتێك وای لێ نەکردن کە ئەو ماڵەی دەیبەخشن، لێیان قبووڵ نەکرێ، جگە لەوەی کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی و بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە، وە بە تەنبەڵییەوە نەبێ نەدەهاتن بۆ نوێژ، وە بە دڵ پێناخۆش بوونەوە نەبێ، ماڵی خۆیان نەدەبەخشی.

دوایی خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: تۆ سەر سام مەبە، بە ماڵ سامان و کوڕو خەڵك و دەوروبەریان، چونکە خوای توانا دەیەوێ ئەو نیعمەتانە لە دنیادا بکاتە مایەی سزادانیان، وە سەرەنجامیش بە کافریی سەربنێنەوە، چونکە تاکو سەروەت و سامان زیاتر بێ و پتر، گوناهی پێ بکرێ، زیاتر دەبێتە مایەی سزاو ئەشکەنجەی دوا ڕۆژیان.

دوایی چەند هەڵوێستێکیان باس دەکات، کە دەفەرموێ: سوێندتان بۆ دەخۆن کە ئەوانیش لە ئێوەن، لە حاڵێکدا کە ئەوان لە ئێوەش نین، بەڵام دەترسێن، کە ئەگەر بە کافر بزانرێن، تووشی سزا ببن، یاخود بە حیسابی خۆیان تووشی نارەحەتیی ببن، وە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ئەوانە ئەگەر پەناگەیەك، ئەشکەوتێك، هەر شوێنێکیان دەست بکەوێ، لە ترسان خۆی تێدە خزێنن.

دوایی باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خێرو چاکەی مسوڵمانانی دەهاتە دەستو دابەشی دەکرد، ئەوانە رەخنەیان دەگرت، ئەگەر درابایە وان رازی دەبوون، بەڵام ئەگەر نەیاندرابایە، توورە دەبوون، وە دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانە رازی بووبان بەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیاندەنێو گوتبایان: {خوا بۆ ئێمە بەسە، خوا لە بەخششی خۆی پێیان دەدات، وە پێغەمبەر ﷺ، وە ئێمە ئارەزوومان بۆ لای پاداشتی خوایە} ئەوە بۆ وان باشتر بوو.

دوایی خوای بەخشەر باسی زەکات دەکات، کە دەبێ بدرێ بە هەشت جۆرە کەس: هەژارو، نەدارو، ئەوانەی کار دەکەن بۆ کۆکردنەوەی زەکات، وە دڵ راگیراوانو کۆیلەکان کە خۆیانی پێ ئازاد بکەن، وە قەرزدارو، ئەوانەی لەپێناوی خوادا جەنگو جیهاد دەکەنو هەر خزمەتێك دەکەن، وە رێبواری دوورە وڵاتی بێ پارە.

پاشان باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات، ئەوانەی کە ئازاری پێغەمبەریان دەدا ﷺ لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پیاوێکی بەرێزو روو تەنك بووە، هەر کەسێك قسەی بۆ کردبایە، روو شکێنیی نەدەکرد، ئەگەر درۆشی کردبایە، سووریش زانیبای درۆ دەکات، نەیدەفەرموو: تۆ درۆزنی، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لە خۆی نەدەوەشاندەوە، بۆیە ئەوان دەیانگوت (هُوَ أُذنٌ)! موحەممەد هەر گوێیە، هەرچی پێی بڵێی، دەڵێ: بەڵێ، خوای بەرزیش دەفەرموێ: بڵێ: گوێی چاکەیە بۆتان، دەتانناسێ، بەڵام لە خۆی ناوەشێنێتەوە، بە کابرای درۆزن، بڵێ: درۆزنی، وەك دوایی باسی دەکەین.

دوایی خوای بەرز باسی ئەوە دەکات کە سوێندتان بۆ دەخۆن، بۆ ئەوەی رازییتان بکەن، بەڵام ئەگەر خواو پێغەمبەری خوایان ﷺ رازی بکردبایە، بەهۆی ئیمانو کردەوەی چاکەوە، باشتر بوو لەوەی سوێندی بە درۆی بخۆن،

دوایی دەفەرموێ: ئایا نازانن کە هەر کەسێك دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، ئەوە جێگەی دۆزەخەو بە هەمیشەیی تێدا دەمێنێتەوە، وە ڕیسواییەکی مەزنی تووش دێ!؟

__دەرسی هەشتەم:__ لە ئایەتی (٦٤ تا ٧٠) دەگرێتە خۆی، واتە: حەوت (٧) ئایەت، ئەم (٧) ئایەتەدا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە چۆن موونافیقو دەغەڵەکان، مەترسییان هەبووە کە سوورەتێك لە قورئان بێتە خوارو، ئەو نهێنییانەی کە لە دڵو دەروونیاندا هەن، دەریان بخات، پاشان هەڕەشەیان لێ دەکات کە گاڵتەیان دەکرد بە قورئانو بە ئیسلامو بە پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێ: ئەگەر لێشیان بپرسی: بۆچی ئەو قسانەتان کردوەو گاڵتەتان کردوە؟ دەڵێن: ئێمە ڕێگامان دەبڕیو، قسەی خۆشمان دەکرد بەڕێوە، بەڵام خوای بێنیاز لێیان قبووڵ ناکاتو دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئایا گاڵتە بە خواو، بە ئایەتەکانی خواو، بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن؟! پاساوو بیانوو مەهێننەوە، ئەگەر ئیمانیشتان بووبێ پێشتر، بەو گاڵتە کردنە بە خواو، بە ئایەتەکانی خواو، بە پێغەمبەری خوا ﷺ، کافر بوون.

پاشان باسی ئەوە دەکات کە موونافیقو دەغەڵەکان بە نێرو مێیەوە، پیاوانو ئافرەتان، هەندێکیان لە هەندێکیانن، فەرمان بە شتی خراپ دەکەنو، ڕێ لە چاکە دەگرن، وە دەستی خۆیان لە بەخشین دەگرنەوە، وە خوایان فەرامۆش کردوە، خوای دادگەریش ئیهمالی کردوونو پشت گوێی خستوون.

دوایی باسی سزای موونافیقو دەغەڵەکان دەکات، بە پیاوو ئافرەتیانەوە، هەروەها سزای کافرەکان، کە دۆزەخە.

پاشان دەفەرموێ: سەرەنجامی ئەوانە، وەك سەرەنجامی کافرەکانی پێشووە، کە هەرچەندە سەروەتو سامانیان زۆر بوو، بەڵام دادی نەدان، دوایی چەند نموونەیەك دێنێتەوە لە مێژووداو دەفەرموێ: ئایا هەواڵی گەلی نووحو گەلی عادو گەلی ثەموودو گەلی ئیبراهیمو هاوەڵانی مەدیەنو، شارە هەڵگەڕاوەکان {کە مەبەستی پێ گەلی لووطە}، ئایا هەواڵی ئەوانەیان پێ نەگەیشتوە، کە پێغەمبەرانیان هەموویان بە بەڵگەی ئاشکراوە هاتن بۆ لایان، کەچی بڕوایان

پێ نەکردن؟ وە خوا ستەمی لێنەکردن، بەڵام خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، خوای کارزانیش لە بەرانبەر ستەمەکەی خۆیان دا، سزای دان.

<u>دەرسی نۆیەم:</u> دوو ئایەتەکانی (٧١ و ٧٢) دەگرێتە خۆی، کە تێیاندا خوای پەروەردگار باسی بڕواداران دەکات، وە سیفەتە سەرەکییەکانی بڕواداران و سەرەنجامی خێری بڕواداران، دەخاتەڕوو، کە پاداشتی خوا لە بەهەشت و ڕەزامەندیی خۆی ﷻ دا، کە لە هەموو شتێك گەورەترە، بەرجەستەیە.

<u>دەرسی دەیەم:</u> لە ئایەتی (٧٣ تا ٨٠) دەگرێتە خۆی، واتە: هەشت (٨) ئایەت، لەم (٨) ئایەتەدا خوا ﷻ جارێکی دیکە سەرەتا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە لە دژی کافرو مونافیقەکان تێبکۆشێ، لە دژی کافرانێك کە سەنگەریان لە ئیسلام گرتبێ، بە چەك، وە لە دژی مونافیقەکانیش بە بەڵگەو دەلیل، وە بە هەڵماڵینی نهێنییەکانیان و پەردە لەسەر لادرانیان.

پاشان دێتە سەر باسی هەندێك هەڵوێستی مونافیق و دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان، کە سوێند دەخۆن: ئەو قسانەیان نەکردوە، هەندێ قسە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتۆتەوە، ئەویش بانگی کردوون: ئەوانەتان بۆچی گوتوە؟

ئەوانیش سوێندیان بۆ خواردوە کە نەمانگوتوە.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: بە تەئکید وشەی کوفریان بە دەمدا هاتوە وە لە دوای ئەو مسوڵمانەتییە ڕووکەشییەیان، کە هاتوونە نێو ئیسلام، کوفریان کردوە، وە ویستووشیانە کارێك لە دژتان ئەنجام بدەن، بەڵام دەستیان نەیگەیشتۆتێ، کە بریتی بووە لە هەڵداشتنی پێغەمبەر ﷺ لە دەربەندێك.

ئنجا خوا ڕەخنەیان لێدەگرێت، کە ئەوانە هیچ شتێکیان لە ئیسلام و مسوڵمانان بە عەیب نەگرت، تەنیا ئەوە نەبێ کە خوای بەخشەر بەهۆی ئیسلامەوە، دەوڵەمەندی کردبوون و، بێنیازی کردبوون، وە لە حاڵەتی پەراگەندەییەوە، کۆی کردبوونەوە سەریەك، وە لە زەبوونییەوە بە هێزی کردبوون، ئنجا لە جیاتی ئەوەی شوکری خوا بکەن، دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن !!.

وە دوایی خوای پەروەردگار باسی هەڵوێستی هەندێکیان دەکات، کە بەڵێنیان داوە: ئەگەر بێتو خوای میهرەبان لە بەخششی خۆی پێیان بدات، ئەوانیش خێرو چاکە دەکەنو لە صالحان دەبن، بەلام کاتێك خوا ﷻ ئەو داوایەی کردوویانە، بۆی جێبەجێ کردوون، ڕژدییو چرووکییان نواندوە، وە بەڵێنەکەیان شکاندوە بۆیە لە ئەنجامی ئەوەدا خوای دادگەر نیفاقو دەغەڵیی خستۆتە دڵیانەوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جاری وایە بەهۆی کردەوەی خراپەوە، ئینسان دڵی بەرەو کوفرو نیفاق دەگۆڕێ.

ئنجا خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ئایا نازانن کە خوا هەموو نهێنییەکانیان دەزانێ، وە چیەو سرکەو قسەی پەنهانی نێوانیان دەزانێ؟!

دوایی باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات کە: ڕەخنەیان دەگرت لەوانەی کە ماڵیان دەبەخشی، ئەوەی زۆری بەخشیبایە، دەیانگوت: ئەوە ڕیابازیی دەکات، وە ئەوەی کەمی بەخشیبایە، دەیانگوت: ئنجا خوا چ پێویستی بەوەندە هەیە؟!

بۆیە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر تۆ داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی، یان بۆیان نەکەی، ئەگەر حەفتا (٧٠) جار داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی، لێیان خۆش نابێ، چونکە بەرانبەر بە خواو بە پێغەمبەرەکەی بێبڕوا بوون، وە خوا ڕێنمایی کەسانی لاڕێ ناکات.

<u>دەرسی یازدەیەم:</u> لە ئایەتی (٨١ تا ٨٩) دەگرێتە خۆی، واتە: نۆ (٩) ئایەت، لەو (٩) ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی ئەوانە دەکات کە بە بیانووی بێجێ، خۆیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێهێشتو، نەچوون بۆ جەنگی تەبووك، وە پێیان ناخۆش بوو لە ڕێگای خوادا جیهاد بکەن، وە بە خەڵکی دیکەشیان دەگوت: ئێستا فەصڵی ساڵ زۆر گەرمە، بەو گەرمایە دەرمەچن، بە هیلاك دەچن! خوای بالادەستیش دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ گەرمترە، ئەگەر بزانن و عەقڵیان پێ بشکێ، بۆیە دەفەرموێ: سەرەنجام وایان لێدێ کە زۆر دەگریەن، وە کەم پێدەکەنن، بەهۆی کردەوەی دەستی خۆیانەوە، وە لە سزای ئەوەدا، کە ئێستا بە مسوڵمانان پێدەکەنن، کە بەو گەرمایە چوون بۆ جەنگی تەبووك، لە قیامەتدا تووشی گریانێکی زۆر دێن.

ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کاتێك گەڕایەوە بۆ لایان و هەندێك لەوانەی ئێستا خۆیان وەدوا داوەو خۆیان بەجێهێشتووە ویستیان بێن بۆ جەنگ و جیهاد، پێیان بڵێ: مەیەن! چۆن لەگەڵ ئافرەت و منداڵ دا بەجێماون، هەر لەگەڵ وان دابنیشن، وە هەر کامێکیش لەوانە مرد، هەرگیز لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستەو دوعای بۆ مەکە، چونکە ئەوانە بەرانبەر بە خواو پێغەمبەرەکەی، بێبڕوا بوون، وە بە لاڕێیی و کافریی مردوون.

دوایی بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بە سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵیان سەرسام مەبە، چونکە خوا دەیکاتە مایەی سزا بۆیان لە دنیادا، وە بە کافرێتییش گیان دەسپێرن.

دوایی باسی ئەو هەڵوێستەیان دەکات، کە هەر کاتێك سوورەتێك بێتە خوار کە فەرمانیان پێ بکات: ئیمان بە خوا بێنن و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بچن بۆ جەنگ و جیهاد، ئەوانەیان کە دەست ڕۆیشتوون، دەڵێن: مۆڵەتمان پێبدە، با لەگەڵ ئەوانەی کە دانیشتوون کە ئافرەت و نەدارو منداڵن، دابنشین، خوای پەروەردگاریش تانەیان لێدەداو دەفەرموێ: ڕازی بوون کە لەگەڵ ئافرەتان و پیرەژن و منداڵاندا دابنیشن.

بۆیەش کاتی خۆی من لە سەرباسی هەندێ وتاری خۆمدا گوتبووم: {جەنگ و جیهاد بە زبرە پیاوان دەکرێ، بە پیرەژن پیاوان ناکرێ}.

ئنجا باسی پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی کە لە خزمەتی دابوون، دەکات، دەفەرموێ: ئەوان بە سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا دەجەنگن و فیداکاریی دەکەن، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن، خوای بەخشندە ئەو بەهەشتانەی کە بۆی داناون، ڕووباری زۆر بە ژێر کۆشکەکانیان دا دەڕۆن، ئەمەش سەرکەوتنی مەزنە.

<u>دەرسی دوازدەیەم:</u> لە ئایەتی (٩٠ تا ١٠٦)، واتە: حەڤدە (١٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، لەم (١٧) ئایەتەدا خوا ﷻ باسی عەرەبە خێڵەکییەکان دەکات، ئەو عەرەبانەی کە بیابانشین بوون، مەڕو بزن و حوشتریان بەخێو دەکردن، گرنگ ئەوەیە لە بیابان بوون، بە زاراوەی ئەمڕۆ: لادێی بوون و، شارنشین نەبوون، کە ئەوانیش دیارە بۆ چەند بەشێك پۆلێن دەبن، سەرەتا خوا دەفەرموێ: عەرەبە

خێڵەکییەکان هاتن بۆ ئەوەی مۆڵەتیان بدرێ، ئەوانەی کە بۆیان نەدەگونجا، لەبەر بێ ئیمکانیەتییان، یان لەبەر هەر هۆیەك بێ، بەڵام کە ئەوانەی کە درۆیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد، هەر نەهاتن پاساویش بێننەوە، دوایی خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە کە ئا ئەوانە گلەییان نەهاتۆتە سەرێ کە نەچوون بۆ جەنگ، چونکە لەبەر بێهێزیی، لەبەر نەخۆشیی، یان لەبەر دەست نەڕۆیشتن، لە ڕووی مادديیەوە نەهاتوون بۆ ئەو جەنگە، مادام دڵسۆز بووبن بۆ خواو بۆ پێغەمبەر ﷺ، چونکە کەسانی چاکەکار گلەییان نایەتە سەرێ.

هەروەها کەسانێکیش کە هاتن بۆ لات ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، وە گوتیان: ولاخمان دەوێ، پشتێکمان دەوێ کە سواری بین، تا پێی بچین بۆ جەنگو جیهاد، تۆش گوتت: توانام نیە هاوکارییتان بکەم، ڕۆیشتنو چاویان پڕ بوو لە فرمێسك، ئەوانەش گلەییان نایەتە سەر.

دوایی دەفەرموێ: گلەیی تەنیا دێتە سەر ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ وەردەگرنو دەوڵەمەندیشن، ڕازی بوون لەگەڵ منداڵانو ئافرەتان دا دابنیشن، بۆیە خوا مۆری بەسەر دڵیانەوە ناوەو هیچ نازانن.

ئنجا خوا ﷻ باسی نهێنییەکانیان دەکات، دەفەرموێ: کاتێك کە دەگەڕێنەوە بۆ لات، لە جەنگی تەبووك، عوزرت بۆ دێننەوە، تۆش پێیان بفەرموو: عوزرو بیانوو مەهێننەوە، چونکە ئێمە بڕواتان پێناکەین، خوا ﷻ هەواڵی ئێوەی پێداوین، وە لەمەودواش خواو پێغەمبەرەکەی کردەوەکانتان دەبینن کە ئایا ڕاست دەکەن، یان درۆ دەکەن، دواییش دەگێڕڕێنەوە بۆ لای خوایەك، کە زانایە بە پەنهان ئاشکراو، هەواڵتان پێدەدا بەوەی کە دەیکەن.

دیسان خوا ﷻ دەفەرموێ: لەمەودوا سوێندتان بۆ دەخۆن، کاتێك کە دەگەڕێنەوە بۆ لایان، بۆ ئەوەی وازیان لێ بێنن، ئێوەش وازیان لێ بێنن، ئەوانە پیسن، وە سەرەنجامیان دۆزەخە، وە جارێکی دیکەش دەفەرموێ: سوێندتان بۆ دەخۆن، تاکو لێیان ڕازی بن، ئەگەر ئێوەش لەوان ڕازی بن، خوا لە کۆمەڵی لاڕێیان ڕازی نابێ.

ئنجا دێتە سەر جۆرێکی دیکەی عەرەبە خێڵەکییەکانو دەفەرموێ: عەرەبە خێڵەکییەکان {کە دیارە هەموویان نینو، پۆلێکیانن} لە هەموو کەس کافرترن، وە لە نیفاقو دەغەڵییدا زیاتر ڕۆچوون، وە زیاتر شایستەتر بوون بۆ ئەوەی کە سنوورەکانی ئەوەی کە خوا دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، نەیزانن، ئنجا دەفەرموێ: هەندێك لەو عەرەبە خێڵەکییانە هەن، کە ئەوەی دەیبەخشێ، بە حیساب لە ڕێی خوا دایە، پێی وایە تالان کراوەو، بە زۆر لێی سەندراوەو سۆغرە بێگاری پێکراوە، وە هەمیشە لە دەرفەت دەگەڕێ، بۆ ئەوەی زەبرتان لێبدات.

دوایی خوا ﷻ باسی جۆرێکی دیکە لە خێڵە عەرەبەکان دەکات، کە ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، وە ئەوەش کە دەیبەخشن، ئومێدیان پێیەتی کە پێی لە خوا نیزیك ببنەوە وە پێغەمبەر ﷺ دوعایان بۆ بکات، ئنجا خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: با دڵنیابن کە مایەی لە خوا نیزیك بوونەوەیانە، وە خوا دەیانخاتە ژیر سایەی بەزەیی خۆیەوە.

ئنجا خوای مەزن مەدحێکی پێشکەوتووەکان دەکات، لە کۆچکەرانو لە پشتیوانان، وە ئەوانەش بە باشی شوێنیان کەوتوون، کە خوا لێیان ڕازییە، وە ئەوانیش لە خوا ڕازین، وە دەیانخاتە بەهەشتەکانی خۆیەوە.

هەروەها خوا باسی ئەوە دەکات کە لە عەرەبە خێڵەکییەکانو، لە خەڵکی مەدینەش، هەیە کە زۆر ڕۆچووە لە نیفاقداو، زۆر مەشقی کردوە، بە ئاسانیی نازانرێو پەی پێ نابردرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ﴿١٠١﴾﴾ التوبة.

تۆ نایانزانی، بەڵام ئێمە دەیانزانین.

<u>دەرسی سێزدەیەم:</u> لە ئایەتی (١٠٧ تا ١١٠) دەگرێتە خۆی، واتە: چوار (٤) ئایەت،

خوای پەروەردگار لەو (٤) ئایەتەدا، باسی کۆمەڵێك دەکات کە پیلانێکی زۆر گڵاویان دارشت بۆ دژایەتییکردنی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، ئەویش ئەوە بوو مزگەوتێکیان دروست کرد، بۆ ئەوەی لە پەنای مزگەوتداو لە بەرگی دیندا، لە

دیـن بـدەن، لە بەرگی ئیسـلامدا، دژایەتیی ئیسلام بکـەن، کـە دوایی خـوای دادگـەر نـاوی لـەو مزگـەوتە نـا: (ضـرار)، وەك دەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا ﴿١٠٧﴾﴾التوبـة.

واتـە: مزگـەوتێك كـە بەهۆیـەوە، یـاخـود لـەبن بـاڵی ئـەو مزگـەوتەو، لـەبن سـێبەری ئەو مزگەوتـەدا، زیـان لە مسوڵمانان بدەن.

دوایی خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ئەوانە سوێند دەخۆن، كە هـەر مەبەسـتمان پێ چاكـە بووە، بەڵام خـوا دەزانـێ كـە درۆ دەكـەن، وە خـوا لـە پێغـەمبـەرەكەی ﷺ قەدەغـە دەكات، كە هەرگیز لەو مزگەوتەدا، هیچ نوێژێ بكات، یاخود تێیدا دابنیشێ.

پاشـان پێی دەفـەرموێ: مزگـەوتێك كـە لەسـەر بناغـەی تەقـوا بنیـات نـراوە، كـە مەبەسـت پێی مزگـەوتی قوبـایە، وە مزگـەوتی پێغـەمبـەر ﷺ بە پلـەی یەكـەم، وە هـەموو ئـەو مزگـەوتـانـەن كـە بـە نیـازو مەبەسـتـی چـاكو بۆ ڕازیكـردنی خـوا، بنیـات دەنرێـن، دەفەرمـوێ: ئـەو جـۆرە مزگـەوتـانە شایسـتەی ئـەوەن، كـە تێیـاندا دینداریی بكـرێ، بەندایـەتیی بۆ خـوا بكـرێ، كـە ئەوانـە پیاوانێكیـان تێدا هـەن، خۆیـان پاك دەكـەنەوە، لە ڕووی جەسـتەیی‌و لـە ڕووی مەعنەوییـەوە، وە خـواش خـۆ پاككـەراوانـی خـۆش دەوێـن.

دوایی خـوا ﷻ بەراورد دەكات، لـە نێـوان مزگـەوتێكـدا كـە لەسـەر بناغـەی تەقـوا بنیـات نراوەو بۆ ڕەزامەندیی خـوا، ئایـا ئەوە بـاشـترە، یـاخـود مزگـەوتێك كـە لەسـەر قـەراغی كـەندەڵانێكـی هـەڵـواسراو، كـە نـاو بنكـۆڵـی كـردوە، وە سەرەنجـام دەڕووخێتـە نێـو دۆزەخـەوە، ئایـا كـامیـان بـاشـترە؟ بـە تەئكیـد ئـەوەی كـە لەسـەر بناغـەی تەقـوا بنیـات دەنرێ.

دوایی خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ئەو بناغـەیەی كـە بنیـاتیـان نـا، هـەر مایـەی گومـان‌و دوو دڵیـی دەبـێ، تـاكو دڵیـان پارچـە پارچـە دەبێ لە دۆزەخدا، واتە: هـەندێ جـار هـەندێ گـوناه ئینسـان دەیكـات، دوایی شوێنەواری ئـەو گوناهـە، شـوێنەواری ئەو غەڵەت‌و لادانە، هـەر لەگـەڵیدا دەمێـنێتـەوەو بـەردەوام دەبـێ، وەك چۆن كـەسێك ژەهرێك دەخـوا، دوایی كـاریگـەریی، ئەو ژەهـرە لە جەسـتەی دا دەمێنـێ.

**دەرسی چواردەیەم:** ئایەتەکانی (١١١ و ١١٢) دەگرێتە خۆی، واتە: دوو (٢) ئایەت،

خوا ﷻ لەو (٢) ئایەتەدا باسی ئەوە دەکات، کە سەرو ماڵی لە بڕواداران کڕیوە، کە لە بەرانبەردا بەهەشتیان بداتێ، وە ئەوانیش لە پێناوی خوادا دەجەنگن، ئەوە بەڵێنێکە خوا داویەتی لە تەورات‌و ئینجیل‌و لە قورئاندا، وە خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: بەو بەڵێنەی خواو بەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ خوادا کردووتانە، دڵ خۆش بن، دوایی نۆ (٩) سیفەت لەو بڕوادارانە هەڵدەدا، کە بریتین لە سیفەتەکانی: تەوبەکردن‌و بەندایەتیی بۆ خوا کردن‌و، ستایشی خوا کردن، وە گەڕان بە زەوی خوادا، وە ڕکووع بردن، وە کڕنووش بردن، وە فەرمان بە چاکە، وە ڕێگا گرتن لە خراپە، وە پاراستنی سنوورەکانی خوا، وە دەشفەرموێ: مژدە بدە بەو بڕوادارانەی کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، چونکە کەسانێك خاوەنی ئەو سیفەتانە بن، دەتوانن ئەو جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ خوادا بکەن، کە سەرو ماڵیان لە پێناوی خوادا ببەخشن، وە لە بەرانبەریشدا خوا بەهەشتیان بداتێ.

**دەرسی پازدەیەم:** لە ئایەتی (١١٣ تا ١١٦) دەگرێتە خۆی، واتە: چوار (٤) ئایەت،

خوا ﷻ لەو چوار ئایەتەدا باسی مەسەلەیەکی گرنگ دەکات، ئەویش ئەوەیە کە نە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە نە بڕوادارانیش، بۆیان نیە، داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئەگەر خزم‌و نیزیکیشیان بن، دوای ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتوە: ئەوانە خاوەنی دۆزەخن، واتە: دوای ئەوەی کە بە کافریی دەمرن، کەس بۆی نیە بۆ خزمێکی کافری بپاڕێتەوەو خوا لێی خۆش بێ، چونکە ئەوە قسەیەکەو جێ ناگرێ، پێشینانیش دەڵێن: (قسەیەك بکە جێ بگرێ، ڕبە ببێو سەربگرێ)، ئەوە قسەیەکە جێ ناگرێ.

دوایی خوای پەروەردگار وەك جۆرێك لە عوزر هێنانەوە بۆ ئیبراهیم، کە کاتی خۆی ئیبراهیمیش داوای لێبوردنی لە خوا کرد بۆ بابی، دەفەرموێ: داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیم بۆ بابی (ئازەر) هەر لەبەر ئەوە بوو، کە پێشتر بەڵێنی پێدابوو، بەڵام دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت: دوژمنی خوایە، بەرائەتی لێکردو دووریی لێکرد، وە بێگومان ئیبراهیمیش پیاوێکی زۆر بە ڕەحم‌و زۆر هێدیی‌و هێمن بوو، زۆر بە پەرۆش بووە، لێرەدا خوای میهرەبان جۆرێك لە پاساودانەوە، بۆ هەڵوێستەکەی ئیبراهیم دەخاتە ڕوو.

ئنجا خـوا ﷻ ، كەسـێك لـە مسوڵـمانان نەیزانیبـێ‌و، بـۆ خزمێكـی كافـری پاڕابێتـەوە، ئەوە دەخاتە ڕووو دەفـەرموێ: خـوا هیچ كۆمەڵێك گومڕا ناكـات، واتـە: بە گومڕا لە قەڵەمیان نادات، تاكو ئەومیان بـۆ ڕوون نەكـاتەوە، كـە دەبێ پـارێزی لێبكـەن، پێشـتـر كـە خـوا بۆی ڕوون نەكـردوونەوە كـە: دروسـت نیـە، بـۆ خزم‌و كەسی كافرتـان بپاڕێنەوەو، داوای لێبوردنیـان بـۆ لـە خـوا بكـەن، بۆیـە گوناهبـار نەبوون.

پاشان ڕایدەگەیەنێ كە هەرچی موڵكی ئاسمانەكان‌و زەوییە، هی خوایە، خـوا دەژیێنـی‌و دەمرێنـی، وە جگە لە خوا، دۆست‌و پشتوان‌و یارمەتیدەرێكـی دیكـەتـان نیـە.

دەرسی شـازدەیەم: لە ئایەتی (١١٧ تـا ١١٩) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: سـێ (٣) ئایـەت، خـوا ﷻ لەو (٣) ئایەتەدا باسی ئەوە دەكـات، كـە لـە پێغـەمبـەری خـۆی ﷺ، وە لـە كۆچكـەران‌و پشتیوانان كە شوێنی كەوتوون، لە ڕۆژی سـەغڵەتییدا، {كە مەبەسـت پێی جەنگی تەبووكە} خـوا لە كەم‌و كورپییـەكانیـان خۆش بووە، وە تـەوبـەی لـێ قبـووڵ كـردوون، دوای ئەوەی كـە نیـزیـك بـوو دڵـی هەندێكیـان لابدات، وەزعەكـە زەحمـەت بوو، بەڵام خـوا لەگـەڵیـان میهرەبـان‌و بە بەزەییـە.

هـەروەها بەتایبەتی لەو سـێ نەفەرەی كـە بڕیـار لەبارەیانەوە دواخـرا بـوو، وەك خـوا ﷻ لەبـارەیـانەوە دەفـەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ ﴿١٠٦﴾ ﴾التوبـة، ئـەو سـێیەش خـوای بەخشـندە لێیـان خـۆش بـوو، كـە (كـەعبـی كـوڕی مالیـك‌و، مـەڕارەی كوڕی ڕەبیع‌و، هیلالـی كـوڕی ئوممـەیە)بوون، ئـەو سـێ هـاوەڵە كـە دوایـی بەسەرهـاتەكـەیـان بـە تەفصـیل دێنیـن، ئەوانـە بەبـێ پاسـاو دواكـەوتن لـە جـەنگی تـەبووك، بـەڵام درۆشیـان لەگـەڵ پێغـەمبـەردا ﷺ نەكـرد، چـوونە خزمـەتی‌و گوتیـان: ئـەی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ! ئێمـە هـیچ پاسـاومان نـەبوو، بـەڵام ئیسـراحەتمان پێخـۆش بـوو، نەهـاتین بۆ ئـەو جەنگـە، ئیـدی ئـەویش فـەرمووی: مادام ڕاسـتـتـان كـرد، بـڕۆن تـاكو خـوای دادگـەر لەبارەوەتـانەوە بڕیـار دەدا، ئیـدی ئەوان پەنجا (٥٠) شـەوو ڕۆژ، دوا خـران، دوایی خـوای كـارزان ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارو تەوبـەی لـێ قبووڵ كـردن، كـە ئەوە خۆشـتـرین ڕۆژ بوو لە ژیانیـاندا.

دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوان بێگومان دنیایان لێ وەتەنگ هاتو، نەفسی خۆشیانیان لێ وەتەنگ هاتو، زانیان کە جگە لە خوا هیچ پەنایەکی دیکەیان نیە، ئنجا خوا گەڕایەوە سەریان، بۆ ئەوەی ئەوانیش بگەڕێنەوە، بێگومان خوا زۆر تەوبە قبووڵکەری بە بەزەیی یە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن‌و لەگەڵ ڕاستان دابن، یانی: وەك چۆن ئەو سێ نەفەرە ڕاستیان کرد، وە ئەوانی دیکەش کە هاتن واقیعی خۆیان خستە ڕووو، گوتیان: ئاوا بووو ئاوا بووە، ئێوەش بەو شێوە بن، هەوڵ مەدەن بە درۆو دەلەسە خۆتان بپەڕێننەوە، چونکە درۆ ئەگەر بەسەر بەندەکانی خوادا تێپەڕێ، بەدڵنیایی بەسەر خوادا تێناپەڕێ.

<u>دەرسی حەڤدەیەم:</u> کە لە ئایەتی (١٢٠ – ١٢٣)، واتە چوار (٤) ئایەت، پێك دێ،

خوا ﷻ لەو (٤) ئایەتەدا، باسی ئەوە دەکات کە خەڵکی مەدینە، وە ئەو عەرەبە خێڵەکییانەی کە لە دەوروبەریانن، بۆیان نیە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێبمێنن، وە بۆیان نیە نەفسی خۆیان لە نەفسی پێغەمبەر پێ لە پێشتر بێ، واتە: مادام ئەهلی ئیمانن، دەبێ لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دابن، بەڵکو ببنە قەڵغان‌و بەلا گێڕەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئنجا باسی ئەوە دەکات کە: هیچ تێنوێتییەك‌و، هیچ ماندووبوونێك‌و، هیچ برسێتییەکیان لە ڕێی خوادا تووش نایە، وە ناچنە هیچ شوێنێك کە مایەی ڕق هەڵسان‌و تووڕەیی کافرەکان بێ، وە هیچ زەبرێك لە دوژمن نادەن، مەگەر خوا تبارك وتعالى بەوە، کردەوەیەکی باشیان بۆ بنووسێ، وە خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات.

هەروەها دەفەرموێ: هیچ ماڵێك خەرج ناکەن، چ کەم بێ، چ زۆر بێ، چ گچکە بێ، چ گەورە بێ، وە هیچ دۆڵ‌و شیوێك نابڕن، مەگەر خوا بۆیان دەنووسێ، بۆ ئەوەی خوا پاداشتی ئەوەیان بداتەوە کە کردوویانە.

دوایی خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە بڕواداران ناگونجێ هەموو تێکرا بچن بۆ جەنگ، بەڵکو دەبێ لە هەر کۆمەڵێکی زۆر، کۆمەڵێکیان بچن، بۆ ئەوەی کە لە دیندا شارەزا بن، یاخود لە هەر کۆمەڵێك بەشێکیان بچن، بەڵام ئەوانی دیکە بمێننەوەو بۆ ئەوەی هەتا ئەوان لە جەنگ دێنەوە، ئەوان خەریکی لێکۆڵینەوەو

شارەزایی لە قورئاندا بن، وە کاتێك ئەو جەنگاوەرانە گەڕانەوە بۆ لایان، لە دین تێیان بگەیەنن، وە ئاگاداریان بکەنەوە، بەڵکو ئەوانیش وریایی خۆیان وەربگرن.

پاشان خوا فەرمان بە ئیمانداران دەکات‌و، دەفەرموێ: ئەو دوژمنە کافرانەی لێتانەوە نیزیکن، لە دژیان بجەنگن، وە با زبرییتان پێوە ببینن، وە بشزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە، کەواتە: زبریی نواندن لە کاتی جەنگ‌و جیهاددا، بەرانبەر بە کەسانێك کە شەڕیان لە دژ دەکرێ، لەگەڵ پارێز لە خوا کردن، دژی یەك نین.

<u>دەرسی هەژدەیەم:</u> لە ئایەتی (١٢٤ تا ١٢٧) دەگرێتە خۆی، واتە چوار (٤) ئایەت، خوا ﷻ لەو (٤) ئایەتەدا، دووبارە دێتەوە سەر باسی هەندێك لە هەڵوێستی دەغەڵ‌و دڵنەخۆشەکان، کە کاتێك سوورەتێك لە قورئان دێتە خوار، هەیانە، دەڵێ: کامەتان بەوە ئیمانی زیاد بوو، کوا کە موحەممەد، دەڵێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ﴿٢﴾﴾الأنفال، کامەتان ئیمانی زیاد بووە!! ڕاست ناکات.

بەڵام خوای تاك‌و پاك دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾﴾التوبة، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هەیە ئیمانیان پێ زیاد دەبێ، بەڵام کەسێك ئیمانی هەر نەبێ، چی زیاد بێ؟ لە هیچی هیچ پەیدا نابێ، بەڵام شتێك دەگونجێ ببێتە شتێکی چاکتر، بەڵام کە هیچ‌ت نەبێ‌و سفر بێ، ئیمانی چی زیاد بێ؟!

بۆیە دەفەرموێ: ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، هەر پیسیی‌و نەخۆشیی زیاتر دەچێتە دڵ‌و دەروونیانەوە، چونکە تاکو ئایەتێك دێتە خوار، ئەوانیش کوفری پێ دەکەن، پێشتریش کوفریان بە ئایەتەکانی دیکە کردوە، ئنجا هەتا کوفر بە ئایەتەکان زیاتر بکەن، کوفرەکەیان خەستتر دەبێتەوە، ئنجا دواییش بە کافریی دەمرن.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ئایا نابینن: هەموو ساڵێك جارێك یان دووجار تاقی دەكرێنەوە، واتە: نهێنییەكانیان دەردەخرێن، عەیبو كەمو كورپیان دەردەكەوێ، هەڵوێستە سەرشۆڕانەكانیان كە پەنهانیان كردوون لە خەڵك، خوای پەنهانبین پەردەیان لەسەر لادەدا، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ناشكۆڕێنو پەندیش وەرناگرن!

ئنجا جارێكی دیكەش خوا دەفەرموێ: كاتێك سوورەتێك دێتە خوار، هەندێك تەماشای یەكدی دەكەن، ئایا كەس ناتانبینێ؟ ئەگەر كەس نەیانبینێ، دەڕۆن، بۆ ئەوەی گوێیان لەو ئایەتانە نەبێ، خوا دەفەرموێ: خوا دڵیان لابدا، لەبەرئەوەی كە كۆمەڵێكی نەزانو نا تێگەیشتوون.

<u>**دەرسی نۆزدەیەمو كۆتایی:**</u> ئایەتەكانی (١٢٨ و ١٢٩) دەگرێتە خۆی، واتە: دوو (٢) ئایەت، خوا ﷻ لەو (٢) ئایەتەدا ئیمانداران دەدوێنێ، یاخود مرۆڤایەتی دەدوێنێ بەگشتی، دەفەرموێ: لە خۆتان پێغەمبەرێكتان بۆ هات، ڕەوانەكراوێكتان بۆ هات، (موحەممەد ﷺ) كە هەر شتێك مایەی نارەحەتیی ئێوەیە، ئەو زۆری پێناخۆشەو لەسەر دڵی قورسە، وە زۆر سوورە لەسەر ئەوەی سوودتان پێ بگەیەنێ، وە بەرانبەر بە بڕوادارانیش زۆر میهرەبانو بە بەزەیی یە.

ئنجا بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانە پشتیان تێكردی، پشتیان هەڵكرد، تۆ بڵێ: خوام بەسە، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، پشتم بەس بەو بەستوە وە ئەو خاوەنی بارەگای مەزنە.

ئەمە كورتەیەك بووە لە نێوەڕۆكی ئەم (١٢٩) ئایەتە، كە لێرەدا دابەشمان كردوون بۆ نۆزدە (١٩) دەرس.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان، شازدە (١٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (١ تا ١٦)، هەڵبەتە پێشتریش باسمان کرد کە لەو ئایەتانەدا خوای کاربەجێ، بەرائەتو دووریی‌و بێزاریی خۆی‌و پێغەمبەرەکەی (موحەممەد ﷺ) بەرانبەر بە هاوبەش دانەرەکان ڕادەگەیەنێ، ئەو هاوبەش دانەرانەی کە پەیمانیان هەبووە لەگەڵ مسوڵماناندا، هەموو جارێ پەیمانەکانیان دەشکاندن، وە پێوەیان پابەند نەدەبوون، وە لە پەنای هەبوونی پەیماندا، زەبریان لە ئیسلام‌و مسوڵمانان دەدا، وە خوا ڕایدەگەیەنێ، کە هەتا چوار مانگ مۆڵەتە کە بە ئازادیی بێن‌و بچن، بەڵام دوای ئەو چوار مانگە، ئێوە لە لایەن سوپای ئیسلامەوە سەنگەرتان لێدەگیرێ‌و، ئاگادار دەکرێنەوە کە پەیمانتان لە نێوان دا نەماوە.

پاشان ڕایدەگەیەنێ: کە ڕۆژی حەجی گەورەتر (الحج الأكبر) لە لایەن خواو پێغەمبەرەوە ﷺ بەرائەتو دووریی لە کافرانی پەیمان شکێن‌و ڕاگەیەنراوە.

دوایی خوا ﷻ کەسانێك کە بە پەیمانەکانیانەوە پابەند بوون‌و، پەیمانەکانیان لەگەڵ ئەهلی ئیسلام دا پاراستوون، هەرچەند هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافریشن، ئەو بڕیارە هەڵداوێرێ‌و جیا دەکاتەوە، وە فەرمان بە مسوڵمانان دەکات: دەبێ هەتا کاتی دیاریکراو، پەیمانەکانیان لەگەڵدا تەواو بکرێن.

پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە دوای بەسەرچوونی ئەو چوار مانگە {ئەو چوار مانگە دوایی باسی دەکەین، کە لە (١٠)ی (ذي الحجة)وە، ئەوە بیست ڕۆژ، لە مانگی

(ذي الحجة)، ئنجا لە ساڵی تازە (محرم، سفر، ربیع الأول) لە (ربیع الثاني)یش، هەتاکو (٢٠)ی مانگ، کە دەکاتە چوار مانگ} ئەو چوار مانگە مۆڵەتە، دوای بەسەرچوونی ئەو چوار مانگە، ئەوجار مسوڵمانان دەستیان کراوەیە لە بەرانبەر ئەو هاوبەش دانەرە بێ پەیمانانەدا، کە بیانکوژن‌و، بیانگرن‌و، ئابڵووقەیان بدەن، مەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وە بێنەوە نێو ئیسلام‌و، ببنە ئەهلی نوێژو زەکات.

دوایی خوا ﷻ باسی پەنادانی بابایەکی موشریك‌و کافر دەکات، کە دەیەوێ لە قورئان تێبگات، کە دەبێ مسوڵمانان پەنای بدەن، با بێ گوێی لە فەرمایشتی خوا بێ، ئنجا ئەگەر ئیمانی هێنا، باشە، ئەگەر ئیمانیشی نەهێنا، بیگەیەننەوە شوێنی خۆی، ئەو شوێنەی کە لێی دڵنیا دەبێ، کە بێ زیان دەبێ .

ئنجا خوا باسی ئەوە دەکات کە چۆن دەبێ‌و ناگونجێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پەیمانیان لەگەڵ خواو پێغەمبەردا ﷺ هەبێ، لە حاڵێکدا کە بە پەیمانەکەیانەوە پابەند نین، بێجگە لەوانەی کە لە لای مزگەوتی حەرام، پەیمانیان لەگەڵ بەستراوەو، بە پەیمانەکەشیانەوە پابەندن، بۆچی؟

چونکە ئەو کافرانە ڕەچاوی هیچ خزمایەتییەك، هیچ پەیمانێك ناکەن لەگەڵ مسوڵمانان دا، وە ئایەتەکانی خواشیان بە نرخێکی کەم فرۆشتوە، واتە: بە بەرانبەرێکی کەم گۆڕیویانەتەوە.

دوایی خوا ڕایدەگەیەنێ کە ئەگەر ئەوانە گەڕانەوەو نوێژیان کردو زەکاتیان دا، ئەوە برای ئایینییتانن، واتە: مسوڵمانانن، بەڵام ئەگەر هەر لەسەر پەیمان شکێنیی‌و تاوانباریی خۆیان‌و، تانە لێدانی دین، بەردەوام بوون، ئەوە جەنگ لە دژکردنیان ڕەوایە.

ئنجا خوا ﷻ مسوڵمانان هان دەدات بۆ جیهاد کردن لە دژی کافرانی بێ پەیمان، وە بیریان دەخاتەوە کە کاتی خۆی ویستوویانە، پێغەمبەر ﷺ شاربەدەر بکەن‌و، دەریشیان کرد، وە ئەوانیش یەکەم جار دەستپێشخەری جەنگ بوون، ئەوە بوو کە هاتن بۆ (بەدر)و شەڕیان بە مسوڵمانان فرۆشت.

پاشان خوا دەفەرموێ: ئایا لێیان دەترسێن؟ خوا شایستەترە لێی بترسێن، وە دوایی خوا فەرمان بە مسوڵمانان دەکات کە لە دژیان بجەنگن، تاکو خوا بە دەستی

ون سزایـان بـدات، وە ڕیسوایـان بکـات، وە مسوڵمانـانیـان بەسـەردا سـەربخات، وە ـیفای سینەی پڕ لە داخ و خەفەتی هەندێ لە بڕواداران بدات، {دەڵێـن: مەبەست ێنی تیـرەی خوزاعەیـە، کە (بەنی بەکـر) کە هاوپەیمانی قورەیش بـوون، لـە نێـو مزگـەوتی حـەرام دا بیسـت (٢٠) نەفەریـان لـە (خوزاعـە) کوشـت، کـە هاوپەیمانی ێغەمبەر ﷺ بوون}، ئەوانیش دەرفەتیان دەبێ کە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە.

وە لە کۆتایی دا خوا بە نکوولیی لێکردنەوە بە بڕواداران، دەفەرموێ: ئایا پێتان ویە وازتان لێ بهێنرێ، بەرلەوەی خوا بزانێ، {واتە: لەسەر ئەرزی واقع بۆی ەرکەوێ، ئەگەرنا خوا هەر دەزانێ} کێتان تێدەکۆشێ لە پێناوی خوادا، وە ێجگە لە خواو لە پێغەمبەر ﷺ لە بڕواداران، هیچ کەس ناکاتە جێی نهێنی و ڕازو نیازی خۆی، ئایا پێتان وایە وازتان لێ بهێنرێ، پێش ئەوە؟ ئەگەر پێتان وابووبێ، دیارە بە هەڵەدا چوون.

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى
ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾
وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ
ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ
مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ
ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ
إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ
حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن
تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾
وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ
مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ
عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا
ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيْفَ وَإِن
يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ
قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا۟

عَن سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا
ذِمَّةٗۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ
ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ وَإِن نَّكَثُوٓاْ
أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ ۙ
إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ
أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ
أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣﴾ قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ
ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ
﴿١٤﴾ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ
﴿١٥﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ
﴿١٦﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{(خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:) ئەمە (ڕاگەیاندنی) دووریی‌و بێزاریی یە لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە، بۆ ئەو هاوبەش دانەرانەی پەیمانتان لەگەڵیان بەستوە، (بەڵام پێوەی پابەند نین) ﴿١﴾ (پێیان بڵێن:) چوار مانگ مۆڵەتتانە بە زەوی دا بگەڕێن (بێن‌و بچن) وە بزانن‌و دڵنیابن، کە ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین، وە (بزانن) کە خوا ڕیسواکەری بێبڕوایانە ﴿٢﴾ وە (ئەمە) ئاگادارکردنەوەیە لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە بۆ خەڵکی، لە ڕۆژی حەجی گەورەتردا، کە خواو پێغەمبەرەکەی دوورو بێزارن لە هاوبەش دانەران، ئنجا (ئەی هاوبەش دانەران!) ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوە باشترە بۆتان، وە ئەگەر پشت هەڵبکەن (و بەردەوام بن لەسەر دژایەتیی مسوڵمانان) ئەوە بزانن کە ئێوە دەستەوسانکەری خوانین، وە مژدەی ئازارێکی بە ئێش بدە بەوانەی بێبڕوان ﴿٣﴾ (ئەو حوکم‌و بڕیارە گشتگیرە) مەگەر بۆ ئەو هاوبەش (بۆ خوا) دانەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵیان بەستوە پاشان هیچ کەم‌و کورتییان لەگەڵتان نەبووە، وە پشتی هیچ کەسیشیان لە دژتان نەگرتوە، ئەوانە تاکو کاتی بۆ دیاریکراویان، پەیمانەکەیان لەگەڵ تەواو بکەن، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن ﴿٤﴾ ئنجا هەر کات (چوار) مانگە (جەنگ تێدا) قەدەغە کراوە (بە مۆڵەت دانراوە)کان، تێپەڕین، ئەوە لە هەر کوێیەك هاوبەش (بۆ خوا) دانەرەکانتان لێ هەڵکەوتن، بیانکوژن‌و بیانگرن‌و، ئابڵووقەیان بدەن، وە لە هەر بۆسەیەکدا بۆیان دابنیشن، ئنجا ئەگەر گەڕانەوە بۆ لای خواو، نوێژیان بەرپا کردو، زەکاتیاندا، ڕێیان بەردەن، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی‌و بە بەزەیی یە ﴿٥﴾ وە ئەگەر یەکێك لە هاوبەش دانەران داوای پەنادانی لێکردی، پەنای بدە، تاکو گوێی لە فەرمایشتی خوا بێ، پاشان بیگەیەنەوە شوێنی‌لێ دڵنیا بوونی، ئەو (پەنادان)ەش بەهۆی ئەوەوەیە، کە ئەوانە کۆمەڵێکن نازانن (خوا چی فەرمووەو ئایینەکەی چۆنە؟) ﴿٦﴾ چۆن دەگونجێ هاوبەش دانەران پەیمانیان لەلای خواو لەلای پێغەمبەرەکەی هەبێ، جگە لەوانەی لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتان لەگەڵیان

ـەست، ئەوانە هەتا (لە پەیمانداریی دا) لەگەڵتان ڕاستو ڕێك بن، ئێوەش بە ڕێكو
ـستیی لەگەڵیان بەردەوام بن، مسۆگەر خوا پارێزكارانی خۆشدەوێن ﴿٧﴾ چۆن
جۆنی دەبێ (هاوبەش دانەرەکان پەیمانیان لەلای خواو پێغەمبەرەکەی هەبێ) لە
حـاڵێکدا کە ئەگەر بەسەرتاندا زاڵبن (زەفەرتان پێ بەرن) هیچ خزماتییەتییو
ـەیمانێك لەبارەتانەوە ڕەچاو ناکەن، بە زاریان ڕازیتان دەکەن، بەڵام دڵیان ڕازی
ـیە. وە زۆربەیان لارێـن ﴿٨﴾ نرخێکی کەمیان بە ئایەتەکانی خوایان کڕیوەو،
ـەرەنجام لە ڕێی خوا لایانداوە (و خەڵکیشیان لاداوە) بێگومان ئەوەی دەیکەن،
حراپترین کردەوەیە ﴿٩﴾ لە (مامەڵەیان) لەگەڵ هیچ بڕوادارێکدا، هیچ خزمایەتییو
ـەیمانێك ڕەچاو ناکەن، وە هەر ئەوانن سنوور بەزێن ﴿١٠﴾ ئنجا هەرکات گەڕانەوە
ـۆ لای خوا)و نوێژیان بەرپا کردو زەکاتیان دا، ئەوە براتانن لە ئاییندا، وە
ـیەتەکانیشمان بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، ڕوون دەکەینەوە ﴿١١﴾ وە ئەگەر پاش
ـەندبوونیان سوێندەکانی خۆیانیان هەڵوەشاندەوە، وە تانەو تەشەریان لە
ـینەکەتان دا، ئەوە دژی پێشەوایانی کوفر بجەنگن، بەڵکو وازبێنن (لە دژایەتییکردنی
ـیسلام) ﴿١٢﴾ ئایا دژی کۆمەڵێك ناجەنگن کە سوێندو (پەیمان)ەکانی خۆیانیان
هەڵوەشاندۆتەوە، وە ویستیان پێغەمبەر وەدەربنێن، (وە کردیشیان)، وە ئەوانیش
یەکەمجار دەسپێشخەری (جەنگ بوون) لە دژتان، ئایا لێیان دەترسن؟ هەڵبەتە
ـەگەر بڕوادار بن، خوا شایستە ترە لێی بترسن ﴿١٣﴾ (کەواتە:) لە دژیان بجەنگن،
ـ خوا بە دەستتان لە ئازاریان بدات، وە ڕیسوایان دەکات، وە ئێوەیان بەسەردا
ـەردەخات، وە سینەکانی کۆمەڵێکی ئیمانداریشیان، بەرانبەر ئاسوودە دەکات، ﴿١٤﴾
ـە تووڕەیی پەنگ خواردووەوەی دڵەکانیان ناهێڵێ، وە هەر کەسێکیش خوا بیەوێ،
ئەگەڕێتەوە سەری (لێی دەبووریێ) وە خوا زانای کارزانە ﴿١٥﴾ یان ئایا (ئەی
مسوڵمانینە!) پێتان وایە بەرلەوەی خوا ئەوانەتان بزانێ کە لە ڕێی خوادا تێکۆشاون
ـەسەر ئەرزی واقیع دەرکەون)، وە جگە لە خواو، جگە لە پێغەمبەرەکەیو، جگە
ـە بڕوادارن، هیچ کەسی دیکەیان نەکردۆتە ڕاز زان (جێگای ڕازو نهێنیی) وازتان
ـێ بهێنرێ؟ وە خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، (بەرلەوەی تاقیشتان بکاتەوە)﴿١٦﴾} .

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بَرَآءَةٌ ): دووریی گرتن، حاشا لێكردن، بێزاریی دەربڕین، لە چییەوە هاتوە؟ (أصْلُ: البَرْءِ وَالبَرَاءَ وَالتَبَرّي: التَفَصّي مِمَّا يُكرهُ مُجَاوَرَتُهُ، وَلِذَلِكَ قِيلَ بَرَأْتُ مِنَ المَرَضِ، وَبَرِأْتُ مِنْ فُلاَنٍ، وَتَبَرَّأْتُ وَأَبْرَأْتُهُ مِنْ كَذَا، وَبَرَّأْتُهُ وَرَجُل بَرِيء).

مانای وشەكانی (البَرْءِ وَالبَرَاءَ وَالتَبَرّي) لە ڕیشەدا بریتیە لە خۆ دوورگرتن لە شتێك كە پێت ناخۆش بێ، لێت نیزیك‌بێ، هەر بۆیەش گوتراوە: (بَرَأْتُ مِنَ المَرَضِ)، لەو نەخۆشییە چاك بوومە، واتە: خۆم لە نەخۆشییەكە دوور گرت، یان نەخۆشییەكە لێم دووركەوتەوە، (بَرِأْتُ مِنْ فُلاَنٍ)، لە فلانە كەس بەری بووم، لە كوردییشدا بەكاری دێنین، واتە: لێی دوورم، حاشام لێكرد، هەروەها (تَبَرَّأْتُ وَأَبْرَأْتُهُ)، دووریيم لە فلان كەس كرد، یانی: دوورم خستەوە لە شتێك، واتە: ئەو نەفەرەم لەو تۆمەتە، یاخود لەو تاوانە دوور خستەوە، (وَرَجُل بَرِيء)، واتە: پیاوێك كە دووربێ لە تۆمەتێك كە بۆی كراوە.

(عَـٰهَدتُّم ): واتە: پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، (العَهْدُ: حِفْظُ الشَّيء وَمُرَاعَاتهُ حالاً بَعدَ حال، وَسُمِيَ الموثِق الّذي يَلزَمُ مُرَاعَاتهُ عَهداً).

واتە: (عَهْدُ) بریتیە لەوەی ڕەچاوی شتێك بكەی‌و، ئاگات لێی بێ جار لە دوای جار، وە ئەو پەیمانەی كە داكۆكیی لەسەر دەكرێ بە: (عَهْدُ) ناونراوە.

(فَسِيحُواْ ): (الساحَةُ: المَكانُ الوَاسِع) وشەی (ساحَة): بریتیە لە شوێنێكی فراوان، (السائِحُ: المَاء الدَّائِمُ الجَرِي فِي ساحَةٍ، وَساحَ فُلاَنٌ فِي الأَرْضِ مَرَّ السائِحِ)، (ساحَة)، واتە: شوێنێكی فراوان، (سائِح)، بە ئاوێك دەگوترێ كە لە دەشتێكەوە بڕوا، وە دەگوترێ: (ساحَ فُلاَنٌ فِي الأَرْضِ).

واتە: وەك چۆن ئاو دەڕوا بە زەویدا، ئەویش ئاوا ڕۆیشت.

وَأَذَانٌ ): (إِعْلَامٌ، آذَنَهُ: أَعْلَمَهُ)، واتە: ئاگاداركردنەوە، كەواتە: (أَذَان): یانی ئاگادار كردنەوەی مسوڵمانان، (آذَنَهُ)، واتە: ئاگاداری كردەوە.

وَبَشِّرِ ): (البَشِير: هُوَ المُبشر) واتە: دڵخۆشكەر یان مژدەدەر، دەگوترێ: (وَأَبشَرْتُ الرَجُل وَبَشَرْتهُ: أخْبَرتهُ بسارٍّ فانبَسَطَتْ بَشَرةُ وَجْهِهِ) ئەگەر هەواڵێكی خۆشت بە كەسێكدا كە ڕووی بگەشێتەوەو ڕووی خۆشبێ، دەڵێی: (بَشَرْتهُ) بۆچی؟ چونكە هەواڵێكت پێداوە دەمو چاوی گەشاوەتەوە.

لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا ): واتە: هیچیان لێ كەم نەكردوون، واتە: هیچ كەمو كورتییان نەبوو لە پەیمانداریان لەگەڵتاندا، دەڵێ: (النَّقْصُ: الخُسْرَانُ فِي الحَظِّ، وَالنُّقْصَان المَصْدَرُ، وَنَقَصْتُهُ فَهُوَ مَنْقُوص)، (نقْص)، بریتییە لەوەی كە لە پشكی كەسێك، لە بەشی كەسێك كەم بكرێتەوە، وە (نُقْصَان)، چاوگە، (وَنَقَصْتُه فَهُوَ مَنْقُوص)، كەمم كردەوە (مَنْقُوص)، واتە: شتێك لێی كەم كرابێتەوە.

وَلَمْ يُظَاهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا ): واتە: پشتگیریی كەسیان نەكردوە لە دژی ئێوە، دەڵێ: (ظَاهَرَهُ: عَاوَنَهُ، تَظَاهَرَا: تَعَاوَنا)، (ظاهره)، واتە: هاوكاریی كرد، پشتی گرت، (تظاهرا)، واتە: ئەو دووانە پشتی یەكدییان گرت، هاوكاریی یەكدی بوون.

مُدَّتِهِمْ ): واتە: ئەو ماوەیەی كە بۆیان دیاریی كراوە، (أَصْلُ المَدِّ: الجَرُّ، وَمِنْهُ المُدَّةُ لِلْوَقْتِ المُمْتَدِّ، وَمُدَّةُ الجَرْحِ)، وشەی: (مُدّ)، لە ڕیشەوە لە (مَدّ)ەوە هاتوە، ئەویش بە مانای ڕاكێشانی شتێك دێ، هەر بۆیە بە ماوەیەك لە كات گوتراوە: (مُدَّة)، چونكە كاتەكە بەردەوامەو ڕادەكێشرێ، هەروەها ئەو كێمو زووخاوەی كە لە بەدەن دەردەچێ، پێی دەگوترێ: (مُدَّة)، چونكە بەردەوام دەبێ.

(ٱنسَلَخَ): واتە: بەسەرچوونو ڕابردن، ئایا ئەوە لە چی یەوە هاتوە؟

(السَّلْخُ: نَزْع جِلْد الحَيْوَانِ، وَسَلَخَ الشَّهْرُ وَانْسَلَخَ)، (سَلْخ)، بریتیە لە کەوڵ کردن، داڕنینی پێستی ئاژەڵ، (سَلَخَهُ)، واتە: لە کەوڵەکەی دەریهێناوە، کەوڵەکەی لێ جیاکردەوە، بۆیە لەوەوە گوتراوە: (سَلَخَ الشَّهْرُ وَانْسَلَخَ)، واتە: مانگە کە تێپەڕیو ڕۆیشت.

(ٱلْحُرُمُ): کۆی (حَرَام)ە، (حَرَام)، واتە: قەدەغە، مانگە حەرامەکان کە (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، رجب)ن، جیان لەو چوار مانگە کە وەك مۆڵەت درابوون بە کافرەکان ئەوانەی پەیمانیان هەبوو.

ئنجا ئایا بۆچی پێیان گوتراوە: (ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ)، چونکە لەو مانگانەدا قەدەغە بووە، مسوڵمانان جەنگ لە دژی کافرەکان بکەن، وە کاتی خۆشی لە نێو عەرەبەکاندا لە چوار مانگە حەرامەکاندا، قەدەغە بووە، پێکەوە شەڕ بکەن.

(الحُرْمَةُ: مَا لاَيَحِلّ انْتِهاكُهُ، وَالحَرَامُ: المَمْنُوع)، (حُرْمَة) هەر شتێکە کە قەدەغە بێ دەستدرێژیی بکرێتە سەرو بشکێنرێ، وە (حرام)، واتە: قەدەغە.

(وَٱحْصُرُوهُمْ): واتە: ئابڵووقەیان بدەن، یاخود تەنگیان پێ هەڵبچنن، یاخود ڕێیان لێ تەنگ بکەنەوە، (الحَصْرُ: التَّضِيِيق)، تەنگ پێ هەڵچنین.

(وَخُذُوهُمْ): بیانگرن، (الأَخْذُ: حَوْزُ شَيء وَتَحْصِيلُهُ، الأَخِيذ: الأَسِير، وَكَذَلِكَ المأْخُوذ).

(أَخْذ)، بریتیە لە شتێك کە بیخەیە ژێر ڕکێفی خۆتەوە، وە پەیدای بکەی، بۆیە بە دیل گوتراوە: (أخيذ)، هەروەها گوتراوە: (مَأْخُوذ)، (أَخِيذ ومأخوذ)، یانی (أسير)، دیل، چونکە دەگیرێ.

(مَرْصَدٍ ): واتە: کەمینگە، یان بۆسە، ئەو شوێنەی کە ئینسان لەوێوە چاودێریی کەسێك دەکات، چاودێریی دوژمنێك دەکات، (الرَّصَدُ: الإستعداد للتَّرَقُّب، والمَرْصَدُ: مَوْضع الرَّصْدِ، كذالك وَالمِرْصَاد)، (رَصَد)، بریتیە لە ئامادەیی هەبوون بۆ چاودێریی کردن، (مَرْصَدُ ومِرْصَاد)یش، هەردووکیان بە مانای شوێنی چاودێریی لێوە کردنن.

(فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ): واتە: رێیان بەربدەن، (الخَلاَءُ: المَكَانُ الَّذِي لاَ سَاتِرَ فِيهِ، وَخَلَّيْتُ فُلاَناً: تَرَكْتُهُ فِي خَلاَءٍ).

(خَلاَء)، واتە: شوێنێکی چۆڵ، کە هیچ شتێکی لێ نیە دایپۆشێ، دیوارێکی نەبێ، بۆیە، دەگوترێ: (خَلَّيْتُ فُلاَنا)، واتە: بەرم هەڵدا شوێنێك، کە هیچ شتێك نەبێ دایپۆشێ.

(ٱسْتَجَارَكَ ): واتە: داوای پەنادانی لێکردی، (اسْتَجَرْتُهُ فَأَجَارَنِي، وَالجَارُ: مَنْ يقرب مَسْكَنُهُ مِنْكَ).

واتە: داوای پەنادانم لێکرد، ئەویش پەنای دام، (جار)، یانی: دراوسێ، کەسێك کە لێت نیزیکە، یاخود شوێنەکەی لە شوێنتەوە نیزیکە، ئنجا (اسْتَجَارَنِي)، واتە: داوای لێکردم، لێم نیزیك بێ، لە پەنام دابێ.

(مَأْمَنَهُ ): (المَنْزِلُ الَّذِي فِيهِ أَمْنُهُ)، واتە: شوێنی دڵنیایی.

(أَمْن) واتە: دڵنیایی، (مَأْمَن)، واتە: ئەو شوێنەی کە ئینسان لێی دڵنیا دەبێ، (أصْلُ الأَمْنِ: طُمْأنِينَة النَّفْس وزَوَال الخَوْف) لە ریشەدا (أمْن) یانی: دڵنیایی، وە (مأمَن) شوێنێکە (أمْن)ی هەبێ، واتە: نەفس تێیدا ئارام بگرێ، وە ترسی نەبێ.

(لَا يَرْقُبُواْ فِيكُمْ ): (رَقَبْتُهُ: حَفَظْتُهُ وَالرَّقِيب: الحافِظ).

وشەی (رَقَبْتُهُ): واتە: پاراستم، وە چاودێرییم كرد، (رَقِیب). واتە: پارێزەر، (لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ)، واتە: تێتان دا ڕەچاو ناكەن، پارێزگاریی هیچ خزمایەتیی‌و پەیمانێك لەگەڵ ئێوەدا ناكەن.

(إِلًّا): (الإِلُّ: كُلُّ حالة ظَاهِرَةٍ مِنْ عَهْدٍ وَحِلْفٍ وَقَرَابَةٍ).

(إِلُّ) هەر حاڵەتێكی ئاشكرایە لە پەیمانێك كە بە سوێندەوە وەرگیرا بێ، وەك خزمایەتیی، بەڵام زیاتر بە مانای خزمایەتیی‌و نیزیكیی دێ.

(ذِمَّةً): (الذِّمَامُ: مَا يُذَمّ الرَّجُلُ عَلَى إضاعَتِهِ مِنْ عَهْدٍ، وَكَذَلِكَ الذِمَّةُ وَالمَذِمَّةُ والمَذَمَّة).

وشەی (ذِمَام)، شتێكە كە پیاو بەهۆی زایە كردنیەوە، سەرزەنشت بكرێ، هەروەها (ذِمَّة، وَمَذِمَّة، ومَذَمَّة)، هەر سێكیان بەمانای ئەوە دێن، واتە: ئەوەیە كاتێك ئینسان زایەی بكات، لەسەری سەرزەنشت دەكرێ، كە بریتیە لە پەیمان‌و بەڵێن.

(نَّكَثُوٓا۟): واتە: هەڵیانوەشاندەوە، (النَّكْثُ: نَكْثُ الأَكْسِيَةِ وَالغَزْلِ، قَرِيبٌ مِنَ النَّقْضِ وَاسْتُعِيرَ لِنَقْضِ العَهْدِ).

وشەی (نَكْث)، ئەوەیە كە پۆشاكێك شی بكرێتەوەو هەڵبوەشێنرێتەوە، یاخود ڕیسێك بكرێتەوە بە خوریی، دەڵێ: (النَّقْضُ: النَّكْثُ)، (نَكْث) لە (نَقْض)ەوە نیزیكە، (نَقْض) بە مانای هەڵوەشاندنەوەیە، بۆیە وشەی: (نَكْث)، خوازراوەتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمان.

(وَطَعَنُوا۟): (الطَّعْنُ: الضَّرْبُ بالرُّمْحِ وَبِالْقَرْنِ وَاسْتُعِيرَ لِلْوَقِيعَةِ).

وشەی (طَعْن): بریتیە لەوە كە بە ڕم، یان بە قۆچ لە شتێك بدەی، وە خوازراوەتەوە بۆ ئەوە كە كەسێك زەمی كەسێك بكات، قسەی پێ بڵێ، تانەو تەشەری لێبدا.

(وَهَمُّوا): واتە: ویستیان، (الهَمُّ: مَا هَمَمْتَ بِهِ فِي نَفْسِكَ، وَأَهَمَّنِي كَذَا، أي حَمَلَنِي عَلَى أنْ أهمَّ بِهِ).

(هَم)، ئەوەیە كە لە دەروونی خۆتدا دەتەوێ ئەنجامی بدەی، دەگوترێ: (أَهَمَّنِي كَذَا)، واتە: وای لێكردم كە خەمی لێبخۆم‌و گرنگیی پێ بدەم‌و مشووری لێ بخۆم.

(وَيُخْزِهِمْ): واتە: زەبوونیان دەكات، ڕیسوایان دەكات، دەڵێ: (خَزِيَ الرَّجُل: لَحِقَهُ انْكِسارٌ، إمَّا مِنْ نَفْسِهِ أَو مِنْ غَيْرِهِ).

كە دەگوترێ: (خَزِيَ الرَّجُل)، پیاوەكە زەبوونیی بەسەر داهات، واتە: تەریق بۆوە، بە خۆدا شكایەوە، یاخود ڕیسوا بوو.

ئنجا یان لە زاتی خۆیدا تەریق دەبێتەوەو شەرم دەكات، یاخود كەسێك شتێكی لەگەڵ بكات، ببێتە مایەی تەریق بوونەوەی.

(وَيَشْفِ صُدُورَ): (الشِّفَاءُ مِنَ المَرَضِ: مُوَافَاةُ شَفَاءِ السَّلَامَةِ وَصَارَ اسْمَاً لِلبُرْءِ). (شِفَاء)، بۆ پێی گوتراوە: (شِفَاء)؟

(الشِّفَاءُ مِنَ المَرَضِ)، واتە: چاكبوونەوە لە نەخۆشیی، یانی: چوونە سەر قەراغی سەلامەتیی‌و ساغیی، چونكە (شَفَاء)، یانی: قەراغ (شِفَاء)، لەوەوە هاتوە، (مُوَافَاةُ شَفَاءِ السَّلَامَةِ)، چوونە سەر كەناری سەلامەتیی، دوایی كراوە بە ناو بۆ چاكبوونەوە لە نەخۆشیی.

(غَيْظَ): (الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَب)، واتە: توورەییەكی توند.

(التغيُّظُ: إظهار الغَيْظِ) (تَغَيُّظْ) یانی: دەرخستنی توورەییەكی زۆر، (وَهُوَ الحَرَارَةُ الَّتِي يَجِدُهَا الإِنْسان مِن فَوَرَانِ دَمِ قَلْبِهِ) ئەویش بریتیە لەو گەرمایەی كە ئینسان لە دەروونیدا هەستی پێ دەكات‌و، بەهۆیەوە كە خوێنی گەرم دادێ.

(وَلِيجَةً): (الوُلُوج: الدُّخُول فِي مَضِيقٍ).

دەڵێ: (وَلِيجة): ئەوەیە کە شتێك بخەیە نێو شتێکی تەسكو تەنگەبەرەوە (الوَلِيجة: كُلّ مَا يَتَّخِذُهُ الإِنْسَانُ مُعْتَمِداً عَلَيْهِ، وَلَيْسَ مِنْ أَهْلِهِ)، (وَلِيجة)، هەر کەسێکە، هەر شتێکە کە مرۆڤ پشتی پێ ببەستێ، بەڵام لە خۆی نەبێ، واتە: بیکاتە جێگای ڕازو نیازی خۆی، بێئەوەی کە لە خۆی بێ، یانی: مسوڵمانان کەسێك بکەنە جێگای ڕازو نیازی خۆیان لە کافران، ئەوە با دڵنیابن کە کردوویانە بە (وَلِيْجة).

# هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ١٤﴾ لەم شوێنەوارە هاتوە:

﴿عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: ذُكِر لَنَا أَنَّ هَذِهِ الآيةَ، نَزَلَتْ فِي خُزَاعَةَ حِيْن جَعَلُوا يَقتُلون بَني بَكر بِمَكة﴾ {أَخْرَجَهُ السيوطِي فِي (اللّبَاب) وَنَسبَه لأَبِي الشيخ، وقال مؤلفا الإستيعاب فِي بيان الأسباب، ج٢، ص٢٦٦، ضعيف}.

واتە: قەتادە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بۆمان باسکراوە، کە ئەم ئایەتە لەبارەی هۆزی خوزاعەوە هاتە خوار، کە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ بوون لە صوڵحی حودەیبییەدا، خوزاعە بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەنو بەکریش بوونە هاوپەیمانی قوڕەیش، ئنجا پێش فەتحی مەککە، بەنو بەکر هەڵیان کوتایە سەر خوزاعەو بیست (٢٠) کەسیان لە مزگەوتی حەرام دا لێ کوشتن.

بەنو بەکر هاوپەیمانی قوڕەیش بوون، بە پشتی ئەوان ئەمەیان کرد، خوزاعەش هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، ئنجا عەمری کوڕی سالم کە سەرۆکی هۆزی خوزاعە بوو، هات بۆ مەدینە، چەند شیعرێکی خوێندنەوە واتەکەیان ئەمویە:

کە من داوا دەکەم لە تۆی هاوپەیمانم ئەی موحەممەد! هاوپەیمانەکانی قوڕەیش بیست (٢٠) کەسیان لە ئێمە کوشت بە ستەم، هاتووم کە تۆش بەرگرییمان لێ بکەی.

پێغەمبەر ﷺ بەس ئەوەندەی فەرموو: {نُصِرْتَ يا عَمْرَو بْن سَالم}.

واتە: ئەی عەمری کوڕی سالم سەرخرای، یانی: تۆڵەت دەکرێتەوە.

ئنجا لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا کە خوازاعە بە ئەندازەی ئەوەی کە بەنو بەکر لێیان کوشتبوون، بیانکوژنەوە، هەندێك گوتوویانە: ئەوە کە خوا دەفەرموێ: {لە دژیان بجەنگن، خوا بە دەستی ئێوە ئازاریان دەداو زەبوونیان دەکات، وە ئێومیان بەسەردا سەردەخا، وە سینەی کۆمەڵێکی بڕواداریشی پێ شیفا دەدا} مەبەست پێی هۆزی خوزاعەیە، کە تۆڵەی خۆیان لە (بەنی بەکر) بکەنەوە.

بەڵام من ئەمە بە دوور دەزانم، چونکە ئەم ئایەتە دواتر هاتۆتە خوار، لە ساڵی نۆیەم داو فەتحی مەککەش لە ساڵی هەشتەم دابووە، بەڵام لەگەڵی دەگونجێ، واتە: یەکێك لە حیکمەتەکانی جەنگو جیهاد لە دژی ئەهلی کوفر، ئەوەیە کە ئەگەر زوڵمێکیان لە خەڵکێکی مسوڵمان کردبێ، تۆڵەی خۆیانیان لێ دەکەنەوەو دڵیان ئاسوودە دەبێ.

# مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە لەو چەند ئایەتەی سەرەتای سووڕەتی (التوبة)ەدا، کە (١٦) ئایەتن، خوا ﷻ ئیعلانی جەنگ لە دژی سەرجەم ئەو هاوبەش دانەرانە دەکات، کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانان دا بەستوە، بەڵام بە پەیمانەکەیانەوە پابەند نەبوون، وە ئەوە زۆر بە ڕوونیی لە ئایەتەکانەوە دیارە، ئەگەر بە وردیی تەماشایان بکەین.

پێشتر باسمان کرد، کە بۆچی ئەم سووڕەتە - ئەگەر سووڕەتێکی سەربەخۆ بێ و بەشێك نەبێ لە (الأنفال)، کە ئەوەش ڕایەکی زانایانە - ، بۆچی (بسم الله الرحمن الرحيم)ی لە سەرەتادا نەکراوە، یەکسەر خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ﴾، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: ﴿ بَرَآءَةٌ ﴾، هەواڵ (خبر)ە، (مبتدأ)ەکەی (هَـٰذِهِ)یە، (هَـٰذِهِ بَرَاءَة)، ئەمە (بَرَاءَة)ە لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بۆ ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران.

مانای وشەی: (براءة)، لە کوردییدا بریتییە لە دووریی گرتن، حاشا لێکردن، بێزاریی دەربڕین.

ئنجا خوا ﷻ هەر ئەوەنیە کە (براءة)تیان لێ بکات و بێزارییان لێ دەربڕێ و حاشایان لێ بکات، بەڵکو مۆڵەتیشیان دەدات، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَسِيحُواْ فِى الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ ﴾، بە زەوی فراواندا بڕۆن، ماوەی چوار مانگ، واتە: چوار مانگ مۆڵەتتانە بە زەویدا بڕۆن، ئەو چوار مانگە بۆ کێ؟ دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، کە ئەو چوار مانگە بۆ ئەوانەیە کە بەڵێنیان هەبووەو، کاتی دیاریکراوی هەبووە، یاخود بەڵێنیان هەبووە، ماوەکەی لە چوار مانگ کەمتر بووە، یاخود هیچ بەڵێنێکیان لەگەڵ بڕواداران دا نەبووە، ئەوە لەسەر ڕایەکی دیکە، بەڵام ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانان دا هەبووەو چوار مانگ زیاتر بووە، خوا دەفەرموێ: ئەوانە دەبێ ماوەکەیان لەگەڵ

تـەواو بکـرێ، ساڵێکـە، دوو ساڵـە، هـەرچـەند بـێ، ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، وە بـزانن کـە ئێـوە دەسـتـاوسانکـەری خـوا نـین، دەربـاز نـابن، وە بشزانن کـە خـوا ڕیسواکـەری کـافرانە، زەبوونیـان دەکـات، یانـی: ئـەوانەی بێبـڕوان، ئـەگـەر لـە بەرانبـەر ئیسلامدا سـەنگەر بگـرن، شـەڕ بە ئیسلام‌و مسوڵمـانـان بفرۆشـن، خـوا تێکیـان دەشکێنـێ‌و زەبوونیـان دەکـات لـە دنیـادا، وە ئـەگـەر لـە دنیاشـدا زەبوونیـان نـەکـات، لـە دوا ڕۆژدا بە سـزای خـۆی ڕیسواو زەبوونیـان دەکـات.

ئنجـا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ﴾، وە ئـەمە ڕاگـەیاندنەو ئاگادارکـردنەوەیە لـە خـواو پێغـەمبـەرەکـەیەوە ﷺ بۆ خەڵکی، واتـە: بۆ خەڵك بەگشتی، بۆ مرۆڤایەتیی، لە ڕۆژی حـەجی گـەورەتردا (الحج الأكبر) واتـە: لـە ڕۆژی حـەج دا، زۆربـەی زانـایـان گوتوویـانە: (الحج الأكبر)، واتـە: حەجی گـەورە بۆچی؟

چونکە بە (عُمْرة)میـان گوتـوە: (الحج الأصـغر)، ئنجـا ئایـا ئـەو ڕۆژە، چ ڕۆژێك بووە؟

لەسـەر ڕای هـەرە زۆری زانـایـان، ڕۆژی سـەربڕین (النحـر) بـووە، واتـە: ڕۆژی (١٠)ی (ذي الحجـة) کـە قوربـانیی تێدا سـەردەبڕدرێ، هـەندێکـیش گوتوویـانە: ڕۆژی (٩)ی (ذي الحجـة)، واتـە: ڕۆژی وەسـتـان لـە عەرەفە، بەڵام ئـەو ڕایە بێهێزە.

ئنجـا ئـەو ئاگادارکـردنەوەیـە لـە خـواو پێغـەمبـەرەکـەیەوە ﷺ بۆ خەڵکی، لـە ڕۆژی حـەجی گـەورەتردا، کـە ڕۆژی (١٠)ی (ذي الحجـة)یـەو (یـوم النحـر)ی پـێ دەڵێـن، ڕۆژی قوربانیی سـەربڕین، ئاگاداکردنەوە بە چی؟

﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾، کـە خـواو پێغـەمبـەرەکـەی ﷺ دوورو بێزارن، حـاشا دەکـەن لـە هـاوبەش بۆ خـوا دانەرەکان، ئـەوانەی کە پـەیمانیـان لـەگـەڵ مسوڵمـانـان هـەیـەو، پـابەند نـین بـە پـەیمانەکانیـانەوە، ﴿فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ

لَّكُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر بگەڕێنەوە، ئەوە باشترە بۆ ئێوە، واتە: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ پابەندیی بە پەیمانەوە هەروەها بگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

بەڵام وا پێدەچێ ئەمەیان مەبەست پێی ئەوەبێ كە: ئەی هاوبەشدانەرەكان! ئێوە پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان دڵنیا بكەنەوە، كە متمانەیان پێتان هەبێ، كە ئێوە پابەندن بە پەیمانەكانتانەوە، ئنجا لەمەودوا ئەگەر وا بكەن، ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، ئەوە باشترە بۆ ئێوە، ﴿ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ ﴾، بەڵام ئەگەر پشت هەڵبكەن، وەك چۆن هەتا ئێستا پەیمان شكێن بوون، لەسەر پەیمان شكێنیی بەردەوام بن، ﴿ فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُوا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، بزانن كە ئێوە دەستەوسانكەری خوا نین، وە بە ئازارێكی بە ئێش موژدە بە كافران بدە، واتە: ئەگەر شتێك هەبێ، مایەی دڵخۆشیی و موژدەیان بێ، بریتییە لە ئازاری بە ئێش، ئەگەرنا هیچ موژدەو دڵخۆشییەك لە دواڕۆژدا بۆ كافران نییە.

ئنجا خوا ﷻ هەندێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، كە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرو مسوڵمانان دا هەبووەو، بە پەیمانەكانیانەوە پابەندبوون، هەڵیانداوێری ئەو بڕیارەو، دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴾.

یانی: ئەو بڕیارە گشتگیرە بۆ هەموو لایەك، جگە لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، پاشان هیچیان لێ كەم نەكردوونەوە، واتە: لە پابەندیی بە پەیمان لەگەڵ ئێوەدا، هیچ كەم و كورتییان نییە، لە خودی خۆیاندا، ﴿ وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا ﴾، وە هاوكاریی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی هیچ كەسی دیكەیان نەكردوە، لە دژی ئێوە، پشتی كەسیان نەگرتوە لە دژی ئێوە، ﴿ فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ﴾، ئاتەواوە: پەیمانەكەیان لەگەڵ تەواو

بکەن، تا کاتی خۆیان، واتە: تا ئەو کاتەی کە بۆیان دیاریی کراوە، ساڵێکە، دووە، دەیە... هتد، پەیمانەکانیان لەگەڵ بەرنە سەر، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆش دەوێن، کە بەشێك لە پارێزکردن ئەوەیە کاتێك ئینسان بەڵێنو پەیمانیدا بە کەسێك، بیباتە سەر، وە بێ تەقواییە، کە ئینسان پەیمان شکێنو بێ بەڵێن بێ.

ئنجا خوا باسی دوای بەسەرچوونی ئەو چوار مانگە دەکات، ئەو چوار مانگە کە مۆڵەتەو دانراوە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ﴾، ئنجا ئەگەر ئەو چوار مانگە قەدەغە کراوە، {واتە: جەنگ تێدا قەدەغە کراوە} رابردنو تێپەڕین، ئەوە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان (واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرە پەیمان شکێنو بێ بەڵێنەکان) لە هەر شوێنێك بەر پەلتان کەوتنو وەچنگتان کەوتن، بیانکوژنو، بیانگرن، {ئەگەر نەتانکوشتن، بە دیلیان بگرن} وە ئابڵووقەیان بدەنو تەنگیان پێ هەڵبچنن، وە لە هەموو کەمیناگەیەك، لە هەموو بۆسەیەك دا بۆیان دابنیشن، ئەگەر لەسەر کوفرو شیرکی خۆیان بەردەوام بوون، کە دیارە ئەم گرتنو کوشتنو ئابڵووقەدانو بۆسە بۆ دانانە، سزای بێ بەڵێنییانو پەیمان شکێنییانە، نەك سزای کافربوونیان، دوایی دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بەڵام ئەگەر گەڕانەوە بۆ لای خواو نوێژیان بەرپا کردو، زەکاتیاندا، ڕێیان بەربدەن، {هەقتان بەسەریانەوە نەبێ} ، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

ئنجا وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، توێژەرەوانی قورئان ئەم ئایەتەی ژمای (٥)ی سوورەتی (التوبة)یان ناو ناوە: (آیة السیف)، ئایەتی شمشێر، وە هەندێك لە زانایان بەداخەوە گوتوویانە: ئەم ئایەتە، (١٣٠) ئایەتی نەسخ کردۆتەوە، هەیانە گوتوویەتی: (٧٠) ئایەتی نەسخ کردۆتەوە!

كە لە ڕاستییدا، نەك (٧٠)و، نەك (١٣٠)و، نەك ئایەتێك، بەڵكو ڕستەیەكیشی لە قورئانیێ نەسخ نەكردۆتەوە، وەك دوایی باسی دەكەین، بەڵكو ئەم ئایەتە كە ـویان ناوە: ئایەتی شمشێر، كە باسی شمشێر لە قورئاندا هەر نەهاتوە، ئەگەر ـە سیاقی خۆیدا تەماشای بكەین، لەگەڵ ئایەتەكانی پێشیی، وە لەگەڵ ـایەتەكانی دیكەی قورئاندا، یەكدی تەواو دەكەنو یەكدی دەبەستنەوە، وە هیچ ـێشكالو گرێیەكی تێدا نیە، تاكو ئێمە بێنین ئەم ئایەتە بكەینە شمشێرێكو ـنی چەندان ئایەتی پێ هەڵبڕین، بە ناهەق!

چونكە خوا ﷻ لە سەرەتاوە دەفەرموێ: خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ ـیەگەیەنن كە دووریی دەگرن، لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، كە پەیمانتان ـەگەڵیان هەیە، بەلام دوایی بۆمان دەردەكەوێ، كە مەبەست ئەوانەیانە كە ـەیمانان هەڵدەوەشێننەوە بۆچی؟

چونكە دوایی ئەوانەی پابەندبوون بە پەیمانەكانیانەوە، هەڵیان داوێری، ـەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾، واتە: ئەو دووریی و بێزاریی دەربڕینو ئیعلانی جەنگە، ئەوانە دەگرێتەوە كە ـەسەر پەیمان شكێنی بەردەوام بوون، ئەگەرنا ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی كە ـەیمانتان لەگەڵیان بەستوە، وە كەمو كورتییان نەبوە لەگەڵتان، وە هاوكاریی هیچ كەسیشیان نەكردوە لە دژتان، ئەوە پێویستە پەیمانەكەیان تا كاتی خۆیان ـەگەڵیان تەواو بكەن، بێگومان خوا پارێزكارانی خۆشدەوێن، ئەوانەی كە ـەیمانو بەڵێن دەپارێزن.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، ئەو (ال)ەی سەر ﴿ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ (ال)ی (عهد)ە، نەك (ال)ی (جنس).

واتە: ئەو موشریكانەی كە بەڵێنتان لێ وەرگرتنو بەڵێنیان شكاندوە، نەك هەرچی هاوبەش بۆ خوا دانەرە بە پەیمانەكەیان پابەندبن، یان پابەند نەبن،

هەموویان وەك یەك حیساب بکرێن! خوای دادگەر هەرگیز شتی وایاننەفەرمووە، وەك بە پێی ڕواڵەتی ئایەتەکانیش دیارە.

پاشان خوا ﷻ دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دیکەو، دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾.

وە ئەگەر یەکێك لە هاوبەش دانەران، داوای پەنادانی لە تۆ کرد، داوای نیزیکی لە تۆ کرد، تۆ پەنای بدە، بۆئەوەی گوێی لە فەرموودەی خوا بێ، دوایش بگەیەنەوە شوێنی دڵنیایی خۆی.

واتە: ئەگەر مسوڵمان بوو ئەوە باشە، ئەگەر مسوڵمان نەبوو، هات گوێی گرتو لە ئیسلام تێگەیشت، تێتان گەیاند، بەڵام گوتی: قەناعەتم نەهات، مسوڵمان نابم، بیگەیەنەوە شوێنی سەلامەتیی و دڵنیایی خۆی، ئەوەش لەبەر چی؟

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾، لە سۆنگەی ئەوەوە کە نازانن، مادام نازانن، دروست نیە کە کەسێك جارێ دینی خوای لێ حاڵی نەکراوە، جەنگی لە دژ بکرێ، دەبێ تێبگەیەنرێو، بەرچاوی ڕوون بکرێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾﴾ الأنفال.

واتە: تاکو ئەوەی کە دەفەوتێ، لەبەر ڕۆشنایی دا بفەوتێ، ئەوەش کە دەژی لەبەر ڕۆشنایی دا بژی.

ئنجا خوا ﷻ بە پرسیاری کردنی نکووڵیی کەرانەوە، بەڵکو بە جۆرێك لە سەرسوڕمانەوە دەفەرموێ: ﴿كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ﴾، چۆن دەبێ هاوبەش بۆ خوا دانەران، پەیمانیان لەلای خوا

هەبێ، وە پەیمانیان لەلای پێغەمبەرەکەی هەبێ ﷺ {پەیمانێك كە پێیەوە پابەند نین، پەیمانێك كە هەر دەیشكێنن}، پەیمانی وا چۆن دەبێ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ ببەسترێ! کە خاوەنەکەی دوایی پەیمانەکە بشکێنێ‌و، حورمەتی نەگرێ؟ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ شایستەی ئەوە نین ئەو جۆرە پەیمانەیان لەگەڵ دا ببەسترێ.

بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە؟ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، (هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بۆیان نیە پەیمانیان لەلای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ هەبێ)، جگە لەوانەی کە لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، هەتا ئەوان بۆت ڕاوەستاو بوون بۆتان (لەسەر ئەو پەیمانە)، ئێوەش لەگەڵیان ڕێك بوەستن، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆش دەوێن.

کەواتە: نابێ هاوبەش بۆ خوا دانەرانێك‌و کافرانێك پەیمانیان‌هەبێ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺو لەگەڵ مسوڵماناندا، کە پێوەی پابەند نین، بەڵام ئەوانەی کە پابەندن، ئیسلام فەرمان بە مسوڵمانان دەکات: دەبێ چاکتر لە خەڵك پابەندبن بەو بەڵێن‌و پەیمانانەوە.

جارێکی دیکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ (كَيْفَ)، ئەم (كَيْفَ)یە، واتە: چۆن؟

وە ئەو ڕستەی پێشێ دووبارە دەبێتەوە یانی: ﴿كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ ﴾، چۆن دەبێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بەڵێن‌و پەیمانیان لەلای خواو لەلای پێغەمبەرەکەی ﷺ هەبێ، واتە: بەڵێن‌و پەیمانیان لەگەڵ بڕوادارانداهەبێ، بە ناوی خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ، بەڵێن‌و پەیمانێك کە پێیەوە پابەند نین، (كَيْفَ) چۆن؟

﴿ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗ ﴾، خۆ ئەوانە هەر بەسەرتاندا زاڵ بن، هەر دەرفەتتان لێ ببینن، ڕەچاوی هیچ خزمایەتییو هیچ بەڵێنو پەیمانێكتان لەگەڵ ناكەن، با خزمیشتان بن، با بەڵێنو پەیمانیشیان لەگەڵتان هەبێ، هەر بۆیان ڕێك بكەوێ، زەبرتان لێ دەوەشێنن، مادام وابێ، كەسانی ئاوا، پەیمانەكانیان وێ بدەنەوە، وە با لە پەنای پەیمانداریێتییو هاوپەیمانێتییدا، زەبرتان لێنەدەن، با لە پشتەوە خەنجەری غەدرتان لێ نەدەن، ﴿ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ ﴾، بە دڵ ڕازیتان دەكەن، بە قسەی شیرین، بە قسەی خۆشو بۆش، ﴿ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ ﴾، وە دڵیان ناڕازییە، لە دڵدا بوغزو كینەیان هەیە بەرانبەرتان، بەرانبەر بە ئیسلام ﴿ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴾، وە زۆربەشیان لاڕێن، نافەرموێ: هەموویان، چونكە خوای كارزان دادگەرانە حوكم دەكات، نەك عاتیفییانە، هەیانە لاڕێ نەبووە، هەیان بووە كە پێی خۆش نەبووە پەیمان شكێنیی بكرێ، بەڵام سەرۆك هۆزەكە وای كردوە، یاخود هەیان بووە دوایی مسوڵمان بووە، وە هەبووە پابەند بووە.

ئنجا لەسەر خستنە ڕووی كردەوە خراپەكانیان بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا ﴾، نرخێكی كەمیان بە ئایەتەكانی خوا، كڕیوە، لە ئەسڵدا نرخ دەدرێ، شت لە بەرانبەری دا وەردەگیرێ، بەڵام خوای زانا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ئەوانە ئایەتەكانی خوایان كردۆتە شتێكی فرۆشراو، وە نرخێكیان پێكڕیوە، نرخێكیان لە بەرانبەردا وەرگرتوە، ئایەتەكانی خوا، ئەگەر بە هەموو دنیاش بگۆڕدرێنەوە، دنیا هەمووی نرخێكی كەمە، مەبەست ئەوە نیە كە ئەگەر بە نرخی زۆریان بفرۆشن، قەیدێ نەكات، یاخود ئەگەر نرخێكی زۆریان پێ بكرن قەیدێ نەكات!

مەبەست ئەوەیە كە ئەگەر هەموو دنیاش بەرانبەر دینی خوادا وەربگری، هەر نرخێكی كەمە.

ئنجا ئایا چۆن ئایەتەكانی خوایان بە نرخێكی كەم گۆڕیوەتەوە؟

دەفـەرموێ: ﴿ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِۦٓ ﴾، خۆیـان لـە ڕێـی خـوا لایـانداوە، یـاخود خەڵکیـان لـە ڕێی خـوا لاداوە.

﴿ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، ئـــەوانە ئـــەوەی دەیکـــەن خراپتـــرین کـردەوەیــە، واتــە: کــە خـەڵکیــان لاداوەو خۆشیــان لــە ڕێــی خــوا لایانــداوە، وە ـیەتەکانیشیـان لەبەردەستدا بـوون، وەك ئـەوەیـە کەسـێك شتێکی زۆر بـە قیمـەتو ـە نرخی لەلا بێ، بەڵام بیدات بە کەسێك بە نرخێکی کەمو بەهایـەکی کـەمی لـە ـەرئـبـەردا وەربگرێ.

دووبـارە خـوا ﷻ تـەئکـید دەکاتـەوە، دەفـەرموێ: ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾، لـە مامەڵەکردنیـان لەگـەڵ هـەر بڕواداریّکدا، هـیچ خزماتییـەك، هـیچ هـەوبـەیمانییـەك ڕەچاو نـاکـەن، ئـەوەی پێشـێ بـە گشـتی فـەرمووی، بـەڵام لـێرەدا ـحرێ دەخـات کـە لـە هـەڵسوکـەوتی تـاکییـــش دا هـەروان، لـە مامـەڵـەیان لەگـەڵ ـتـك تـاکیشیـان دا، خزمایـەتیی‌و هـاوپـەیمانیتـان لەگـەڵ ڕەچاو نـاکـەن، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴾، وە ئـا ئـەوانە سنوور شکێن‌و سنوور بەزێن‌و دەست درێژکارن، ـوـیــــە: ﴿ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴾، هـەر کـات گـەڕانەوە بـۆ لای خـواو، نوێـژیـان بەرپـا کـردو، زەکـاتیـان دا، ئـەوە بـرای ـیینییتـــانن، لــــە دینـــدا براتـــانن، ﴿ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾، وە ـیـەتـەکانی خـۆمان ڕوون دەکـەینەوە، بـۆ کـەسـانێك کـە بزانن، ئـەوە لـە حاڵێـك دا گـەڕێنەوەو پـابەند بـوون بـە ئیسلامەوە، ﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيْمَٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُواْ فِى دِينِكُمْ ﴾، بـەڵام ئـەگـەر سوێـندەکـانی خۆیـانیـان، دوای ئـەوەی ـەێنیان داوە، هەڵوەشـاندنەوە، وە تـانەو تەشـەریـان لـە دینـی ئێـوە داو، عەیببیـان لـە ئیسلام گـرت.

﴿ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ ﴾، لە دژی سەرانی کوفر بجەنگن، چونکە ئەوانە هیچ سوێندێکیان نیە، واتە: ئەو بەڵێن‌و پەیمانەی کە دەیدەن‌و سوێندی لەسەر دەخۆن، پابەندیی بە بەڵێنەکەوە ناکەن، پابەندیی بە سوێندەکەشەوە ناکەن، ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴾، لە دژیان بجەنگن، بەڵکو واز بێنن، لەو بێ بەڵێنیی‌و بێ پەیمانییە.

ئنجا خوای بالادەست مسوڵمانان لە دژی ئەو جۆرە دوژمنانەیان هان دەدات‌و تیژیان دەکات، ڕقیان هەڵدەستێنێ بە چەند شتێك: دەفەرموێ: ﴿ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمًا ﴾ ئایا جەنگ ناکەن لە دژی کۆمەڵێك، لە دژی کەسانێك کە ئا ئەو شتانەیان لەگەڵ ئێوەدا کردووون:

١/ ﴿ نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ ﴾، سوێندەکانی خۆیان هەڵوەشاندۆتەوە، واتە: پەیمانەکانیان.

٢/ ﴿ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ ﴾، وە ویستیان پێغەمبەری خوا وەدەر بنێن، وە کردیشیان، کە پێغەمبەر ﷺیان ناچار کرد، مەککە بەجێبهێڵێ.

٣/ ﴿ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، وە ئەوانیش یەکەمجار دەستپێشخەر بوون، دەستیان کرد بە جەنگ لە دژی ئێوە، مەبەست پێی جەنگی بەدرە.

کەواتە: بە لای کەمەوە سێ هاندەرو هۆکار هەن، بۆ جەنگ کردن لە دژی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡ ﴾، ئایا چ کۆسپێکتان لەبەردەمدا هەیە، تاکو جەنگیان لە دژ نەکەن؟ ئەوە سێ هۆکار هەنە، بەڵام چ کۆسپێك هەیە، ئایا لێیان دەترسێن؟

﴿ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، بێگومان خوا شایستەترە کە لێی بترسێن، ئەگەر بڕوادار بن، لەوانە مەترسێن‌و تەنیا لە خوا بترسێن.

خـوا ﷻ لـە كۆتـایی دا دەفـەرموێ: ﴿قَـٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ﴾، لە دژیان بجەنگن:

١/ خوا بە دەستی ئێوە سزایان دەداو ئازاریان دەدا،﴿يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ ﴾.

٢/ وە ڕیسواو شـەرمەزاریـان دەكات ﴿ وَيُخْزِهِمْ ﴾.

٣/ ﴿وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ ﴾، وە ئێومیـان بەسـەردا سـەر دەخات.

٤/ ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴾، وە شـیفای سـینەی كۆمەڵـێك لـە ئیمانـداران دەدات، كـە زۆر خـەفـەتو نـاسۆریـان چۆتـە دڵ، بەرانبـەر بەو كافرانەی كە ئـەهلی غەدرو پـەیمان شكێنیی بـوون، وە لـە پشتـەوە خـەنجـەری ژەهراوییـان لێداون، بە تـایبەت لـە هـۆزی خوزاعـە.

٥/ ﴿ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ﴾، وە ڕقو قـینو تـووڕەیی پـەنگ خـواردووی دەروونیـان لادەبات.

ئـەوە بە نسبەت ئیمـاندارانەوە، بـە نسبەت كافرانیشـەوە ﴿وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ﴾، وە هەر كـەسێكیش خـوا بیەوێ، تۆبەی لـێ وەردەگرێو، دەگەڕێتـەوە سـەریو هیدایـەتی دەدات، ئـەگـەر شایستـە بـێ، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، وە خـوا زانـای كاربەجێیـە.

لـە كۆتـایی دا دەفـەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ﴾، یان ئـایا پێتـان وایـە وازتـان لـێ بهێنرێ، بەر لـەوەی خـوا ئـەوانەتـان بزانـێ (بناسـێ)

كە لە پێناوی خوادا تێكۆشاون، وە جگە لە خواو جگە لە پێغەمبەرەكەی (ﷺ)و جگە لە بڕوادارانیش، كەسی دیكەیان نەكردۆتە جێگای ڕازو نیازو نهێنی خۆیانی لا دابنێنو، پشتی پێ ببەستن؟

ئایا پێتان وایە وازتان لێبهێنرێ، تاكو خوا لەسەر ئەرزی واقیع ئەوەی بۆ دەرنەكەوێ؟

ئەگەر پێتان وایە بەرلەوە وازتان لێ دەهێنرێ، خەیاڵ پڵاوتان كردوە، هەتا خوا تاقیتان نەكاتەوەو پاكو پیستان لێ جیا نەكاتەوە، لێتان ناگەڕێ.

﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾، وە خوا پێش ئەوەی تاقیتان بكاتەوە، شارەزایە بەوەی كە دەیكەن، بەڵام دەیەوێ تاقیتان بكاتەوە، تاكو هیچ كەس بڕوو بیانووی نەمێنێ، بڵێ: من وام دەكردو، وا دەچووم‌و، وا دەبووم.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

هەرچەندە تا ڕادەیەك لە مانا گشتییەکەدا، تیشکی باشمان خستۆتە سەر ئایەتەکان، لەبەرئەوەی کە سەرنجی تەفسیرەکان دەدەم، زۆر خەفەت دەخۆم[١]، هەندێك لە توێژەرەوان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، زۆر سەرکێڵانە، ئایەتەکانیان لێکداونەوە، بە تایبەت ئایەتی ژمارە (٥)، کە ناویان ناوە: ئایەتی شمشێر (آیة السیف)، وە بەو ئایەتە شمشێرە! ملی چەندان ئایەتی دیکەیان هەڵبڕیوە، وەك دوایی باسی دەکەم، کە گوتوویانە: هەرچی ئایەت هەیە لە قورئاندا، کە تێیدا خوا فەرمان دەکات بە موداراو، چاوپۆشیی کردنو، خۆڕاگریی‌و بانگەوازو ... هتد، ئەو ئایەتە هەموویان دەسڕێتەوە! بۆیە لە مانا گشتی یەکەیدا تا ڕادەیەك شیم کردەوە، بەڵام ئێستا لە مەسەلە گرنگەکاندا، تیشکی زیاتری دەخەینە سەر.

<u>مەسەلەی یەکەم</u>: کە دەفەرموێ : ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾.

واتە: ئەمە دووریی گرتنو بێزاریی دەربڕینە، لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە بۆ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵیان دا بەستوە.

لێرەدا ئەم بەریی بوونو حاشا لێکردنەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، تایبەتە بەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە کە پەیمانیان هەبوون، بەڵام بە پەیمانەکانیانەوە پابەند نەبوون، نەك هەموو ئەوانەی پەیمانیان هەبووە، چونکە ئایەتەکانی دواتر، بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، وە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (الطبري)، پێش هەموویان ئەمەی گوتوە[٢].

---

١) بۆیە لە کاتی مانا لێکدانەوە گشتییەکەش دا، هەندێك جار دەچمە نێو وردەکارییەکانەوە هەرچەندە شوێنی خۆیان مەسەلە گرنگەکانە .

٢) جامع البیان للطبري، ج٦، ص ٦٦ .

کەواتە: گرنگە بزانرێ، کە لێرەدا هەرچەندە خوای دادگەر دەفەرموێ: هەموو ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵیان بەستوە، بەڵام ئێمە هەم بەپێی سروشتی ئیسلامو، هەم بەپێی سیاقی ئایەتەکانی دیکە،، هەم بە چەندان ئایەتی دیکەش، کە فەرمان دەکەن بە وەفاداریی، دەزانین کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ موستەحیلە پەیمان لەگەڵ کەسێکدا هەڵبوەشێننەوەو وە بەرائەتی لێبکەن، بێئەوەی کە ئەو پەیمانی شکاندبێ‌و، بێئەوەی هەڵوێستێکی دوژمنانەی نواندبێ، واتە: لێرەدا هەرچەندە خوای زاناو توانا بە گشتی فەرموویەتی، بەڵام بەو سێ بەڵگەیەی باسمان کردن، دەزانین کە ئەو (أل)ی سەر ﴿ٱلْمُشْرِكِينَ﴾بۆ (عهد)ە، یانی: (المشركين الناقضين للعهود)، ئەو هاوبەش دانەرانەی کە پەیمان شکێنن، وەك گوتم: بە سیاقی ئایەتەکە دەزانین، وە بە رووحی ئیسلام دەزانین، وە بەوە کە لە چەندان ئایەتی دیکەدا، خوای دادگەر فەرمان دەکات بە پابەندیی بە بەڵێن‌و پەیمانەوە.

<u>مەسەلەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِي ٱلْكَٰفِرِينَ﴾.

سەرەتا دەپرسین: کە خوا ڕاستەوخۆ بە هاوبەش دانەرەکان دەفەرموێ، یان بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾، چوار مانگ بە زەوییدا بڕۆن، مۆڵەتە، وە بشزانن ئێوە دەستاوسانکەری خوا نین، وە خوا زەبوونکەرو سەرشۆڕکەری بێبڕوایانە.

ئایا ئەم چوار مانگە مۆڵەتانە، کام چوار مانگانەن؟

هەندێ لە توێژەرەوان کە بە بۆچوونی بەندە سەر کێڵانە تەماشایان کردوە، گوتوویانە: ئەمانە چوار (٤) مانگە حەرامەکانن، واتە: (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم) بە دوای یەکدا، وە (رجب)یش کە بە تەنیایە، بەڵام دەڵێم: ئەگەر وا بووایە، ئەو کاتە نەیدەکردە چوار مانگ (أربعة أشهر)، چونکە ئەگەر وا بووایە ئەو کاتە (ذوالقعدة) تێپەڕیوە، وە لە (١٠)ی (ذوالحجة)ەوە واتە: چل (٤٠) ڕۆژ

لە مانگە حەرامەکان، تێپەڕیوە، پاشان خوای پەروەردگار دەفەرموێ: دەبێ ئەو چوار مانگە بەسەر یەکەوە بن، بەڵام لێرە (لە چوار مانگە حەرامەکان دا) مانگی (رجب) بەکسەر بە دوای (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم)دا نایەت، چەند مانگێکی دیکە دەکەونە نێوانیان.

کەواتە: ناگونجێ مەبەست لەو چوار مانگە، چوار مانگە جەنگ تێدا قەدەغەکراوەکان بن، کە کاتی خۆی عادەتو نەریتێکی گەلی عەرەب بووە ، وە خوای زاناو شارەزا لە قورئان دا باسی کردوە.

هەندێکی دی لە زانایان کە بە وردیی تەماشای ئایەتەکەیان کردوە، دەڵێن: بەڵکو مەبەست لەو چوار مانگە مۆڵەتە، چوار مانگن لەو ڕۆژەوە کە ڕادەگەیەنرێ: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دوورن، بەریین، بێزارن لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی کە پەیمانیان هەیەو، بە پەیمانەکانیانەوە پابەند نین، کە ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێك بووە؟ ڕۆژی (١٠)ی (ذوالحجة) بووە، لە ساڵی (٩)ی کۆچیی دا.

ئنجا لە (١٠)ی (ذوالحجة)وە، کە (یوم النحر)ە، ڕۆژی قوربانیی سەربڕین، بەڵێ: لە (١٠)ی (ذو الحجة)وە بیژمێرە، تاکو سەری مانگ، ئەوە بیست (٢٠) ڕۆژ، ئەوە بیست (٢٠) لە مانگی (ذو الحجة)، ئنجا مانگی (محرم)، ئنجا (صفر)، ئنجا مانگی (ربیع الأول) هەموویان، ئنجا مانگی (ربیع الثاني) ئەویش لە سەرەتاوە تاکو (١٠)ی، هەمووی دەکاتە چوار مانگ، بەو شێوەیە:

بیست (٢٠) ڕۆژ لە مانگی (ذو الحجة) لە ساڵی نۆیەمدا (+) مانگی (محرم)، (+) مانگی (صفر)، (+) (ربیع الأول)، (+)دە (١٠) ڕۆژ لە مانگی (ربیع الثاني) لە ساڵی دەیەم = چوار مانگ، هەمووی دەکاتە چوار مانگ، چونکە (محرم، صفر، ربیع الأول) ئەوە سێ مانگ، ئنجا (٢٠) لە (ذو الحجة) لە ساڵی نۆیەم، (١٠)ش لە (ربیع الثاني) لە ساڵی دەیەم، ئەوە (٣٠) ڕۆژ، کەواتە: ئەوە چوار مانگ.

ئنجا ئایا ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە کامەنەن؟

جارێ خوا ﷻ تەنیا باسی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە دەکات، کە لەگەڵ مسوڵمانان دا هاوپەیمان بوون :

دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران.

واتە: باسی جگە لە پەیمان لەگەڵ بەستراواندا ناکات، کەواتە: دەگونجێ و زۆریش پێدەچێ کە بەس مەبەست پێی ئەوانە بن، کە پەیمانیان هەبووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و، لەگەڵ مسوڵمانانداو، بەڵام بە پەیمانەکەیانەوە پابەند نەبوون، هەر ئەوانە پەیمانەکانیان وێ دەدرێتەوەو، جەنگیان لە دژ دەکرێ.

بەڵام زۆربەی توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەو بەرائەتەو حاشالێکردنە بەرانبەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە بە گشتی!

بەڵام من تێبینییم لەسەر ئەو رایە هەیە، چونکە: لە هیچ ئایەتێکی قورئاندا نەهاتوە خوا ﷻ بە هەموو کافرەکان بفەرموێ: چوار مانگ مۆڵەتتان دەدەم، ئەگەرنا ئیعلانی جەنگم لە دژ کردوون، هەڵبەتە ئەو توێژەرەوانەی قورئان کە وایانگوتوە، دەڵێن: بەنسبەت هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانەوە، لەبەر ئەوەبووە کە لە نێو دوورگەی عەرەبیدا بوون، بۆ ئەوەی ئەو شوێنە بۆ ئیسلام یەکلابێتەوەو دەستەڵاتی جگە لە ئیسلامی لێ نەبێ، واتە: ئەوە وەك شتێکی ریزپەڕ بووەو، وەك حاڵەتێکی هەڵاوێردراو بووە، ئەگەرنا بنچینە لە ئیسلام دا وایە، ئەگەر لایەنێك با مسوڵمانیش نەبن، مادام ئامادەبن لەگەڵ قەوارەی سیاسیی ئیسلامییدا لێك تێگەیشتن بکەن، چ سەرانە بدەن، چ لەسەر ئەوە رێکبکەون کە دژایەتیی قەوارەی ئیسلامیی نەکەن و، لە حاڵەتی بێ لایەنیی دابن، وەك لە سوورەتی (النساء)دا باس دەکات[1]، ئیسلام هیچ ئیشکالێکی لەگەڵیان دا نابێ، چ لە نێو بازنەی قەواری سیاسیی ئیسلام دابن، چ لە دەرەوەی بن.

ئنجا هەرچەندە زۆربەی زۆری توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەوە ئیعلانی جەنگە بەرانبەر هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بەڵام من ئەم رایەم بە بەهێز نازانم، بەتایبەتیش کە لە فەرموودەیەکی صەحیحی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ﴾

١) ئایەتەکانی ٩١ و ٩٢ .

{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٠٢٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦١٤)}.

کە سەرەتا باسی مسوڵمان بوونو، دوایی باسی سەرانە (جزیة)دانو، ئنجا باسی جەنگ دەکات، کەواتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرانیش وەك خاوەن کتێبەکان (جوولەکەو نەصرانییەکان)وە وەك هەموو جۆرەکانی ئەهلی کوفر، ئەوانیش بۆ ئیسلام بانگ دەکرێن، ئەگەر مسوڵمان بن، باشە، ئەگەر مسوڵمان نەبن، داوای سەرانەیان لێدەکرێ، کە سەرانە دانیش، بۆ ئیسپاتی ئەوەیە کە ئەو هێزە، ئەو لایەنە لەگەڵ قەوارەی ئیسلامییدا، تەبایەو گونجاوەو دژی نیەو شەڕی پێ نافرۆشێ، کەواتە: لێرەدا مەبەست لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، کێیە؟

<u>یەك</u>: ئەو پەیماندارانەی گەیشتوونە کۆتایی دیاریکراوی پەیمانەکەیان.

<u>دوو</u> : ئەوانەی کە بۆ کەمتر لە چوار مانگ پەیمانیان بەستوە، بۆیان بکرێتە چوار مانگ.

<u>سێ</u> : وە ئەوانەش کە پەیمانیان هەبووە، بەبێ دیارییکردنو، بە ڕەهایی، چوار مانگ دیاریی دەکرێ، بۆ کۆتایی هاتنی ئەو پەیمانە ڕەهایانە[1].

وەك گوتم ڕایەکی دیکەش هەیە، کە دەڵێ: مەبەست ئەوانەشە کە پەیمانیشیان نەبووە، بەڵام ئەو چوار مانگە مۆڵەتیان بووە.

بەڵام ئەو ڕایە بە بەهێز نابینم، کە ئیسلام ئیعلانی جەنگی کردبێ بەرانبەر بە هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بەوانەشەوە کە پەیمانیان نەبووە، چونکە ئایەتەکان زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، کە ئیعلانی جەنگەکە دژی ئەوانەیە، کە پەیمانیان هەبووەو پەیمانەکەیان شکاندوەو پێوەی پابەند نەبوون، بەڵام ئەوانەی کە پابەند بوون، خوای کاربەجێ هەڵیواردوون لەو بڕیارە گشتگیرە، وە فەرموویەتی: پەیمانەکەیان لەگەڵ ببەنە سەر.

---

١) دیارە هەرکام لەو سێ جۆرە هاوپەیمانەش، ئەوانە بوون کە پابەند نەدەبوون بە پەیمانەکانیانەوە، وەك پێشتریش گوتمان .

ئنجا ئەوەی کە پەیمانی نەبووبێ، دیارە ئەو کاتە ئیسلام سەرپشکی کردوون، لەنێوان ئەو سێ بژاردەیەدا: یان مسوڵمان بە، یاخود دژی قەوارەی ئیسلامیی مەبەو، لێك تێگەیشتنی لەگەڵدا بکە، ئەگەرنا تۆ نە مسوڵمانیش بی، نە ئامادەش بی لەگەڵ قەوارەی ئیسلامییدا لە حاڵەتی ئاشتیی دابی، وە سوور بی لەسەر شەڕ پێ فرۆشتنی، ئەوە ئیسلام شەڕت لەگەڵدا دەکات بە ناچاریی.

## چەند دەقێکی ڕوونکەرەوەی مەبەستی ئایەتەکانی سەرەتای (توبة)

ئنجا با چەند دەقێك بێنینەوە، کە تیشکمان بۆ دەخەنە سەر چەمكو واتای ئەو ئایەتانەی سەرەتای سووڕەتی (التوبة) بەگشتی، کە لێرەدا خەریکی توێژینەوەی ئایەتی دووەمین: ﴿فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَـٰفِرِينَ ۝٢﴾:

١/ ﴿عَنْ مُجَاهِد قَوْلُهُ: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ قَالَ: أَهْلُ العَهْدِ: مُدْلِج، وَالعَرَب الَّذِينَ عَاهَدَهُمْ، وَمَنْ كَانَ لَهُ عَهْدٌ، قَالَ: أَقْبَلَ رَسُول الله ﷺ مِنْ تَبُوك حِيْنَ فَرَغَ مِنْهَا وَأَرَادَ الحَجَّ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّهُ يَحْضُرُ البَيْتَ مِشْرِكُونَ يَطُوفُونَ عُرَاةً، فَلاَ أُحِبُّ أَن أَحَجّ حَتَّى لاَ يَكُونَ ذَلِك، فَأَرْسَلَ أَبَا بَكر وَعَلِياً رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْهِمَا، فَطَافَا بِالنَاسِ بِذِي المَجَازِ، وَبِأَمْكِنَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا يَتَبَايَعُونَ بِهَا، وَبِالمَوسِمِ كُلِّهِ، وَآذَنُوا أَصْحَابَ العَهْدِ بِأَنْ يَأْمَنُوا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، فَهِيَ الأَشْهُرُ الحُرُمِ المُنْسَلِخَاتِ المُتَوَالِيَاتِ: عِشْرُونَ مِنْ آخِرِ ذِي الحِجةِ إِلَى عَشْرٍ يخلون مِنْ شَهْرِ رَبِيعِ الآخر، ثُمَّ لاَ عَهْدَ لَهُمْ. وَآذَنَ النَاسَ كُلَّهُم بِالقِتَالِ إِلاَّ أَنْ يُؤْمِنُوا، فَآمَنَ النَاس أَجْمَعُونَ حِينَئِذٍ، وَلَمْ يَسِحْ أَحَدٌ﴾[١].

واتە: موجاهید (کە دیارە قوتابی عەبدوڵلای کوڕی عەبباسە، خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ) دەڵێ: کە خوا دەفەرموێ: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ

١) جامع البيان للطبري، ج٦، ص٦٥ و ٦٦.

عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، مەبەستی پێی ئەوانەیە کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانانیدا هەبووە، بۆ وێنە: هۆزی مودلیج، وە هەموو ئەو هۆزە عەرەبانەی کە هاوپەیمان بوون، وە هەر کەسێك پەیمانی بووبێ لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانانیدا، مەبەستی ئەوانەیە، (دوایی موجاهید دەگێڕێتەوە) دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبووك گەڕایەوەو تەواوی کرد، فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانەرانێك ئامادەی بەیت دەبن، (واتە: کەعبە) کە بە ڕووتیی تەواف دەکەن، هەتا ئەو دیمەنە، ئەو حاڵەتە بەسەر نەچێ، حەز ناکەم حەج بکەم، بۆیە ئەبو بەکرو عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) ناردن، ئەوان بەسەر خەڵکەوە گەڕان، لە زیلمەجاز لەو شوێنانەی کە کڕین و فرۆشتنیان تێدا دەکردن، وە لە هەموو شوێنەکان، (واتە: ئەو شوێنانەی کە حەجیان تێدا دەکرا)، ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ لەگەڵ مسوڵمانانیدا هەبوو، ئاگاداریان کردنەوە، کە بۆ ماوەی چوار مانگ، کە ئەو چوار مانگەی کە بەدوای یەك دا دێن: لە (٢٠)ی (ذي الحجة)ی ساڵی نۆیەم تاکو (١٠)ی مانگی (ربيع الثاني) ساڵی دەیەم، (دەکاتە چوار مانگ)، دوای ئەوە هیچ پەیمانیان لە بەینیدا نامێنێ، هەموو خەڵکیان ئاگادار کردەوە، کە ئەگەر بڕوا بێنن، ئەگەرنا ئیعلانی جەنگیان لە دژ کراوە، دەڵێ: خەڵکی هەموویان ئەو کاتە ئیمانیان هێنا، هیچ کامیان بە زەویدا نەڕۆیشتن، {کە من تێبینیم لەسەر ئەو قسەیە هەیە، کە دەڵێ: هەموو خەڵکیان ئاگادار کردەوە، کە لە حاڵەتی جەنگ دان لەگەڵ مسوڵمانان، ئەگەر ئیمان نەهێنن، وەك دوایی باسی دەکەم، کە ئەمە قسەی موجاهیدەو تێگەیشتنی خۆیەتی لەبارەی ئایەتەکانەوە}.

٢/ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: عَنْ بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ فِي تِلْكَ الْحَجة فِي مُؤَذِّنِينَ يَومَ النَّحْرِ نُؤَذِّنُ بِمِنًى، أَنْ لا يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلا يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، ثُمَّ أَرْدَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلِياً فَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِّنَ بِبَرَاءَةٍ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَأَذَّنَ مَعَنَا عَلِيٌّ فِي أَهْلِ مِنًى يَومَ النَّحْرِ: لا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (١٦٢٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٣٤٧)، وَأَبُو دَاوُدَ (١٦٤٦)}.

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، منی نارد لەو حەجەدا (حەجی ساڵی نۆیەمی کۆچیی) لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی دیکەی ئاگادارکەرەوەدا، لە ڕۆژی (١٠)ی (ذي الحجة) ڕۆژی قوربانیی سەر بڕین لە مینا، (ئەو شوێنەی کە هەموو خەڵکی لێ کۆدەبێتەوە، دوای ئەوەی کە لە عەرەفات‌و موزدەلیفە دەگەڕێنەوە، خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە) دەیانگوت: لە دوای ئەم ساڵەوە هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك بۆی نیە حەج بکات، وە نابێ هیچ کەسێکی ڕووت بە دەوری کەعبەدا طەواف بکات، (چونکە ئەو کاتە، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان عادەتیان وابوو بە ئافرەت‌و پیاوەوە، ئەوەی کە بەرگ‌و پۆشاکێکی بەدەست نەکەوتبایە لە خەڵك وەری بگرێ، بە ڕووتیی طەوافیان دەکرد، چونکە پێیان وابوو، کە هیچ کەس بۆی نیە، بەو بەرگەوە کە گوناهی پێکردوە، طەواف بکات، دەیانگوت: دەبێ بەرگەکە دابنێی، ئنجا هەبوو بەرگی دیکەی دەست نەدەکەوت، دیارە جگە لە قوڕەیش، قوڕەیشییەکان دەیانگوت: ئێمە بۆمان هەیە، لەبەرئەوەی ئێمە ئەهلی حەرەمین) دەڵێ: بۆیە پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبو طالیبی نارد، (یانی: بەدوای ئەبو بەکردا ناردی، خوا لە هەموویان ڕازی بێ) کە سوورەتی (البراءة)، بە گوێی خەڵك دابدات‌و ڕایبگەیەنێ، عەلییش خوا لێی ڕازی بێ ڕۆژی قوربانیی سەربڕین، سەرەتای سوورەتی (البراءة)ی ڕاگەیاند، بە دەنگێکی بەرز لە شوێنەکان ئایەتەکانی دەخوێندنەوە، وە وێڕای ئایەتەکان، دەشیگوت: لە دوای ئەم ساڵ، هیچ کەسێکی هاوبەش بۆ خوا دانەر، بۆی نیە حەج بکات، وە نابێ کەسێکی ڕووت، طەواف بە دەوری کەعبەدا بکات.

٣/ ﴿رَوَى مُحَمَّد بْن إسْحاق عَنْ أَبِي جَعْفَر مُحَمَّد بْن عَلِيّ بن الحُسَيْن بن عَلِيّ رِضوانُ اللهِ عَلَيْهِم، أَنَّهُ قَالَ: لَما نَزَلَتْ بَرَاءَةٌ عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ، وَقَدْ كانَ بَعَثَ أَبَا بَكر الصِّدّيقَ لِيُقِيمَ لِلناسِ الحَجَّ، قِيلَ لَهُ: يا رَسولَ اللهِ! لَوْ بَعَثْت بِها إلى أَبِي بَكر! فَقَالَ: لا يُؤَدِّي عَنِّي إلاَّ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي، ثُمَّ دَعَا عَلِياً، فَقَالَ لَهُ: أخْرُجْ بِهَذِهِ القِصَّةِ مِنْ صَدْرِ بَراءَةٍ ، وَأَذِّنْ فِي النَاسِ يَومَ النَحْر إذَا اجْتَمَعُوا بِمِنَى، أَنَّهُ لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ كافِرٌ، وَلا يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيانٌ، وَمَنْ كانَ لَهُ عِنْدَ رَسولِ اللهِ ﷺ عَهْدٌ ، فَهُوَ لَهُ إلَى مُدَّتِهِ﴾.

فَخَـرَجَ عَلِـيّ رِضـوانُ اللهِ عَلَيْـهِ عَلَـى نـاقَةِ رَسـولِ اللهِ ﷺ الْعَضْـبَاءَ، حَتّـى أَدْرَكَ أَبَـا بَكـرٍ بِالطـرِيقِ، فَلَـما رَآهُ أَبُو بَكـر بِالطـرِيقِ، قَالَ: أَأَمِيـرٌ أَمْ مَأْمُورٌ؟

فَقَالَ: بَلْ مَأْمُورٌ، ثُمّ مَضَـيا.

فَأَقَامَ أَبُـو بَكـر لِلنـاسِ الحَـجّ، وَالْعَـرَبُ إِذْ ذَاكَ فِي تِلْـكَ السّـنَةِ عَـلَى مَنَازِلِـهِمْ مِنْ الحَـجّ الّتِي كَانُوا عَلَيْها فِي الْجَاهِلِية، حَتَّـى إِذَا كَـانَ يَـومُ النّحْـرِ، قَامَ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، فَأَذّنَ فِي النـاسِ بِالّـذِي أَمَـرَهُ بِـهِ رَسـولُ اللهِ ﷺ فَقَـالَ: أَيّهـا النـاسُ! إِنَّـهُ لا يَـدْخُلُ الْجَنّـةَ كَـافِرٌ، وَلا يَحُـجّ بَعْـدَ الْعَـامِ مُشْـرِكٌ، وَلا يَطُـوفُ بِالْبَيْـتِ عُرْيَـان، وَمَنْ كَـانَ لَهُ عِنْـدَ رَسولِ اللهِ ﷺ عَهْدٌ، فَهُوَ لَـهُ إِلَى مُدّتِـهِ.

فَلَـمْ يَحُـجّ بَعْـدَ ذَلِـكَ الْعَـامِ مُشْرِكٌ، وَلَـمْ يَطُـفْ بِالْبَيْـتِ عُرْيَـانٌ، ثُـمّ قَـدِمَا عَلَـى رَسـولِ اللهِ ﷺ قَـالَ ابْـنُ إِسْحَـاقَ : فَكـانَ هَـذَا مِـنْ بَـرَاءَةٍ، فِـيمَنْ كَـانَ مِـنْ أَهْـلِ الشّرْكِ مِنْ أَهْلِ الْعَهْـدِ الْعَـامّ، وَأَهْـلِ الْمُدّةِ إِلَـى الأَجَـلِ الْمُسَمّى﴾[١].

واتـە: موحەممـەدی کوڕی ئیسحـاق لـە ئـەبو جەعفـەر موحەممـەدی کوڕی حوسێـنی کوڕی عـەلی خـوا لێیـان ڕازی بـێ دەگێڕێتـەوەو دەڵێ: دوای ئـەوەی سـوورەتی (البـراءة) بـۆ پێغەمبـەری خـوا دابـەزی ﷺ کـە پێشتـریش ئـەبو بەکری ناردبوو سەرپەرشتیی حەج بکاتو حەج بـە خـەڵکی بکـات لـە جیاتی خۆی، کاتێك سـوورەتی (البراءة) دابەزی، گوترا: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ئەگەر بۆ ئەبو بەکرت ناردبایە، ئەو ئایەتانە بخوێنێتـەوە بەسـەر خەڵکدا، ئـەویش فـەرمووی: دەبـێ تـەنیـا پیـاوێك لـە بنەماڵـەی خـۆم، ئـەم ئایەتـانە بگەیـەنێ {بۆچی ؟ چونکـە عـورفو نـەریتی عەرەبەکـان وابـوو بەتـایبەت لـە مەسەلەی پەیماندا، ئەگەر کەسێك باسی بەڵێنو پەیمـانی کـردبا، دەبوو یـان خۆی، یان کەسێکی نیزیکیی، ئنجا ئامۆزای بێ، برای بێ، مامی بێ، کەسـێکی نیزیکی خۆی لـە ڕووی خزمایـەتییـەوە باسی بکـات، نەریتـی عەرەبەکـان وابـوو، نەك لە ئیسلامدا وابێ، ئنجا لـەو حاڵەتـانەدا، تۆ نـاچـاریی بـە پێی نەریـتو عورفـی بـاوی خەڵـك ڕەفتـار بکـەی، وەك گـوتراوە: (كَلّـمِ النـاسَ عَلَـى قَدَرِ

---

١) جامع البيان للطبري، ج ٦، ص ٦٥ و ٦٦، وە المصباح المنير فِي تهذيب تفسير ابن كثير: ص ٥٥٤.

عُقُولِهِم)} دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عەلی بانگ كردو فەرمووی: ئەم چەند ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (البراءة) بەرە وە لە ڕۆژی قوربانیی سەربڕیندا {كە دەكاتە ڕۆژی (١٠)ی (ذي الحجة)} بە گوێی خەڵكیان دابدە، هەر كاتێك كە لە مینا كۆبوونەوە، وە وێڕای ئایەتەكان، {كە ئایەتەكانیش ئەو مەبەستانە هەر دەگەیەنن، بەڵام بەتایبەتییش} پێیان بڵێ: كە هیچ بێبڕوایەك ناچێتە بەهەشت، وە لە دوای ئەم ساڵەوە، هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك نابێ حەج بكات، وە نابێ هیچ كەس بە ڕووتیی بە دەوری ماڵی خوادا طەواف بكات، وە هەر كەسێك پەیمانی هەیە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە پەیمانەكەی تا كاتی خۆی، لەلایەن مسوڵمانانەوە پابەندیی پێوە دەكرێ، (ئەگەر بۆخۆی نەیشكاندبێ).

دوایی عەلی خوای لێ ڕازی بێ، بە سواریی حوشترەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە پێیان دەگوت: (عَضْبَاءْ) ڕۆیشت، هەتا بە ئەبو بەكر گەیشت لە ڕێگا، كاتێك ئەبو بەكر عەلی بینی لێی پرسی: فەرماندەی، یان فەرمان پێكراوی؟ (واتە: ئەگەر هاتبی لە جیاتی من سەپەرشتیاریی حەج بكەی، با بزانم؟).

ئەویش گوتی: بەڵكو من فەرمان پێكراوم، (من لە ژێر فەرمانی تۆ دام، بەڵام پەیامێك هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ منی ناردوە بیگەیەنم بە خەڵك لە جیاتی خۆی).

ئنجا ڕۆیشتن ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ سەپەرشتیاریی حەجی كردو حەجی بە خەڵكەكە كرد، وە عەرەبیش لەو سەردەمەدا بە پێی باوو نەریتی سەردەمی نەفامیی، خوا پەرستییەكانی حەجیان ئەنجام دەدا، (واتە: جگە لە مسوڵمانان، عەرەبەكانیش ئەو كاتە هاتبوون بۆ حەج، هەر كەس بە پێی بیروبۆچوونی خۆی) هەتا ڕۆژی قوربانیی سەربڕین، عەلی كوڕی ئەبو طالیب خوا لێی ڕازی بێ هەڵسا، وە لە نێو خەڵك ڕایگەیاند ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو بوو، ئەو پەیامەی ڕاگەیاندو گوتی: ئەی خەڵكینە! بێگومان هیچ كافرێك ناچێتە بەهەشت، وە لەم ساڵ بە دواوە،

نابێ هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك حەج بكات، وە نابێ هیچ كەس بە ڕووتیی بە دەوری كەعبەدا طەواف بكات، وە هەر كەسێك پەیمانی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، پەیمانەكەی تا كاتی خۆی بەردەوام دەبێ، وە لەلایەن مسوڵمانانەوە پابەندیی پێوە دەكرێ، ئیدی دوای ئەو ساڵە، كەس نەهات لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، بۆ حەج، وە هیچ كەس بە ڕووتیی بە دەوری كەعبەدا طەوافی نەكرد، پاشان چوونەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (ابن إسحاق) دەڵێ: ئەوە بەسەرهاتی دابەزینی چۆنیەتی گەیاندنی سەرەتای سووڕەتی (البراءة) بوو، بۆ هابەش بۆ خوا دانەرەكان.

ج ئەوانەی كە بەگشتی پەیمانیان هەبووە لەگەڵ مسوڵمانان دا {كە هەموو لایەك بۆیان هەبووە بچن بۆ حەجو بە دەوری كەعبەدا بسووڕێنەوە وە خواپەرستییەكانی حەج جێبەجێ بكەن}، وە چ ئەوانەی بەتایبەت پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەبووە بۆ كاتێكی دیارییكراو.

٤/ (قَالَ القَاضِي أَبُو يَعْلَى: وَفَصْلُ الخِطَابِ فِي هَذَا البَابِ: أَنَّهُ قَدْ كَانَ بَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَبَيْنَ جَمِيعِ المُشْرِكِينَ عَهْدٌ عَامٌّ، وَهُوَ أَنْ لاَ يُصَدَّ أَحَدٌ عَنِ البَيْتِ، وَلاَ يُخَافَ أَحَدٌ فِي الشَّهْرِ الحَرَامِ، فَجَعَلَ اللهُ عَهْدَهُمْ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، وَكَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَقْوَامٍ مِنْهُمْ عُهُودٍ إِلَى آجَالٍ مُسَمَّاةٍ، فَأَمَرَ بالوَفَاءِ لَهُمْ وَإِتْمَامِ مُدَّتِهِم إِذَا لَمْ يَخْشَ غَدْرَهُمْ)[١].

واتە: قاضی ئەبو یەعلا دەڵێ: كورتەی قسە لەوبارەوە ئەوەیە كە: لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺو تێكڕای هاوبەش بۆ خوا دانەرەكاندا وەك عورفو باوی ئەو كاتە پەیمانێكو لێك تێگەیشتنێكی گشتیی هەبووە، ئەویش ئەوە بووە كە: هیچ كەس قەدەغە نەكرێ، لەوەی كە سەردانی كەعبە بكات بۆ ئەنجامدانی كاری خوا پەرستیی، وە هیچ كەس لەو مانگە حەرامانەدا نەترسێنرێ، (ئنجا دەڵێ:) خوا ﷻ چوار مانگی مۆڵەت بۆ دانان، بۆ ئەوانەی كە بە گشتیی جۆرێك لە تێگەیشتن لە نێوان ئەوانو مسوڵماناندا هەبووە، وە ئەوانەش كە پەیمانیان هەبووە، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ كاتێكی

---

١) زاد المسير في علم التفسير، لابن الجوزي، ص ٥٦٨.

دیاریکراو، ئەوە خوا فەرمانی کرد کە تا کاتی خۆی، پەیمانەکەیان لەگەڵدا تەواو بکرێ، مادام مەترسیی نەبێ لەوەی کە ئەوان پەیمانەکەیان بشکێنن.

هەڵبەتە دوایی تیشکی زیاتریش دەخەینە سەر چەمك و واتای ئەم ئایەتە.

مەسەلەی سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ ﴾.

واتە: ئەمە گەیاندنێکە، جاڕدانێکە لە خواو لە پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، لە ڕۆژی حەجی گەورەدا، بۆ تێکڕای خەڵك، کە خوا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دوورن و، بێزارن و حاشا دەکەن، لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، (ئەوانەی کە پەیمانیان هەبوو بەڵام دەیانشکاند)، ئنجا ئەگەر وازبێنن، واتە: لە پەیمان شکاندن بگەڕێنەوە، ئەوە باشترە بۆتان، وە ئەگەر پشتیش هەڵکەن، (واتە: هەر بەردەوام بن لەسەر پەیمان شکاندن)، ئەوە بزانن کە ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین، وە موژدەی ئازارێکی بە ئێش بە ئەوانە بدە، کە بێبڕوان.

## شەش هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا

هەڵوەستەی یەکەم : وشەی ( أَذَٰنٌ )، واتە: ڕاگەیاندن، هەر بانگ (أَذَان) بۆچی پێی دەگوترێ: (أَذَان)؟

چونکە تۆ بە خەڵك ڕادەگەیەنێ کە بۆ نوێژ بێن، بەڵێ : (أَذَان)، بە مانای (إِعْلَام) دێ، واتە: ئاگادارکردنەوەو بە خەڵك ڕاگەیاندن، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا هاتوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتــە: بـانگ بێــژێك، یــان ئاگادارکەرەوەیــەك لــە بەینیــاندا بــانگی کــرد، ئاگاداری کردنەوە.

هەڵوەستەی دووەم : ئایا ئەو ڕاگەیاندنو ئاگادارکردنەوەیە، لەلایەن کێیەوە بووە؟

دیـارە لەلایـەن خـواو لـە پێغەمبـەری خـواوەیـە ﷺ، ئنجـا هـەرچەنـدە لـە خواو لە پێغەمبەری خواوەیە ﷺ، بەڵام هەموو مسوڵمانـانیش دەگرێتـەوە، چونکە مسوڵمانـانیش فەرمانبەریی خـواو پێغەمبـەرەکەی ﷺ دەکەن.

هەڵوەستەی سێیەم : ئایا ئنجا ڕاگەیاندنە بۆ کێیە؟

دەفەرموێ: ﴿إِلَى ٱلنَّاسِ﴾، بۆ هەموو خەڵکە بە تێکڕا، واتـە: بۆ ڕای گشتی.

هەڵوەستەی چوارەم : ئایا لە چ ڕۆژێکدا بووە؟

خـوا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ﴾، لـە ڕۆژی حەجی گەورەتردا، کـە زۆربەی زانایـان دەڵێـن: مەبەست لـەو ڕۆژە، ڕۆژی قوربـانیی سـەربڕینە (يَومُ النَّحْرِ)، کـە دەکاتـە ڕۆژی (١٠)ی (ذِي الحِجة)، لـە سـاڵی (٩)ی کۆچییـدا، دیـارە قوربانیی سـەربڕینیش تـەنیا لـە کاتی حەج دایـە.

لەوبارەوەش چەند دەقێك هەن، ئاماژەیان پێدەکەین:

١) ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه، قَالَ: سَأَلْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ عَنْ يَومِ الْحَجِّ الأَكْبَرِ؟ فَقَالَ: يَومُ النَّحْرِ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٠٨٨)، وَصَحَّحَهُ الألباني}.

واتـە: عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب خوا لێی ڕازی‌بێ، دەڵێ: لـە پێغەمبـەری خـوام ﷺ پرسی دەربارەی ڕۆژی حەجی گەورەتر؟

فـەرمووی: ڕۆژی قوربانیی سـەربڕینە، واتـە: (١٠)ی (ذي الحجة).

٢) ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ قُرطٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: أَعْظَمُ الأَيـامِ عِنْدَ اللهِ: يَـومُ النَّحْـرِ، ثُمَّ يَـومُ القَـرِّ﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١٩٠٩٨) تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إِسْنَـادُهُ صَحِيحٌ، رِجَالُـهُ ثِقَـات، وَأَخْرَجَـهُ أَيْضـا: أَبُـو دَاوُدَ بـرقم:

(١٧٦٥)، وَالنَّسـائِيّ فِي (الكُبْـرَى) بـرقم: (٤٠٩٨)، وَالبَيْهَقِـي بـرقم: (١٠٠١٩)، وَابْـنُ خُزَيْمَــة، بــرقم: (٢٨٦٦)، وَالحــاكِمُ بــرقم: (٧٥٢٢) وَقَــالَ: صَـحِيحُ الإِسْنَـادِ، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِـي}.

واتــە: عەبدوڵلای كوڕی قورت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەترین‌و مەزنتــرین ڕۆژ لــە لای خــوا: ڕۆژی قوربانیی سەربڕینە، دوای ئەوەش (يَومُ القَرِّ) واتە: ئەو ڕۆژەی كە خەڵك نیشتەجێ دەبێتــەوە وردە وردە، واتـــە: ڕۆژی دوای وی، یـــانی: ڕۆژی (١١)یـــەمی (ذي الحجة).

٣) ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَـا، أَنَّ رَسـولَ اللهِ ﷺ وَقَـفَ يَـومَ النَّحْـرِ بَـيْنَ الْجَمَرَاتِ فِي الْحَجة الَّتِي حَجَّ، فَقَالَ: (أَيُّ يَومٍ هَذَا)؟

قَالُوا: يَومُ النَّحْـرِ، قَالَ: (هَذَا يَـومُ الْحَـجِّ الأَكْبَـر)﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ فِي (الحـج)، ج ٤، ص١٣٣ تَعْلِيْـقاً، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (١٧٦٥)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بــرقم: (٣٠٥٨)، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَـانِي}

واتــە: عەبدوڵــلای كــوڕی عومــەر خــوا لــە خــۆی‌و بــابی ڕازی بــێ، دەڵــێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قوربانیی سەربڕیندا {(١٠)ی (ذي الحجـة)}، لــە نێــوان (جَمَـرَات) {ئــەو شوێــنەی وردەبــەرد دەهاوێشــترێــن، بــۆ ســێ شوێنەكان، جەمرەی گچكەو گەورەو نێوەنجیی}، لەو حەجەدا، كە حەجی كرد، {كە پێغەمبەر ﷺ تەنیا یەك حەجی كردوە، ئەویش حەجی مــاڵ ئاوایی، لە ساڵی دەیەمی كۆچییدا} لەوێ وەستا بوو فەرمووی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێكە؟

گوتیــان: ڕۆژی قوربــانیی ســەربڕینــە، فــەرمووی: ئــەمڕۆ ڕۆژی حــەجی گەورەترە.

٤) ﴿عَنِ إِبْنُ أَبِي شَـيْبَة عَنِ الشَّـعْبِيِّ، قَالَ: سـأَلْـتُهُ قُلْـتُ: هَـذَا الْحَـجُّ الأَكْبَـرُ، فَمَا الْحَـجُّ الأَصْـغَرُ؟ قَـالَ: عُمْـرَةٌ فِي رَمَضَـان﴾ {أَخْرَجَـهُ إِبْنُ أَبـي شَـيْبَة، برقـم: (١٣١٩٠)}.

واتە: ئیبنو ئەبی شەیبە لە شەعبییەوە هێناویەتی، دەڵێ: پرسیارم لێکردو گوتم: ئەمە ڕۆژی حەجی گەورەیە، ئەدی حەجی گچکە کامەیە؟ گوتی: عومرە کردنە لە مانگی ڕەمەزان دا.

٥) ﴿عَنِ ابْنِ أَبِي شَيْبَةَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ شَدَّادٍ عَنِ الْحَجِّ الأَكْبَرِ؟ فَقَالَ: الْحَجُّ الأَكْبَرُ يَومُ النَّحْرِ، وَالحَجُّ الأَصْغَرُ: الْعُمْرَةُ﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبي شَيْبَة، برقم: (١٣٨٤٤)}.

واتە: ئیبنو ئەبی شەیبە لە ئەبی ئیسحاقەوە هێناویەتی، دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی شەددادم پرسی، دەربارەی حەجی گەورەتر؟ گوتی: ڕۆژی قوربانیی سەربڕینە، وە حەجی گچکەتریش، بریتیە لە عومرە کردن.

هەڵبەتە ئەمە ڕای (طبري)شە، وەك لە: (جامع البيان)ەکەیدا هێناویەتی[١]، ئەم دەقانە هەموویان (الشوكاني) لە (الفتح القدير)دا هێناونی[٢].

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u> ؛ ئنجا ئایا ئەوەی لەو ڕۆژەدا ڕاگەیاندرا، چی بوو؟

وەڵام ؛ ئەمە بوو ؛ ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾، کە خوا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەریین‌و دوورن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کام هاوبەش بۆ خوا دانەرانە؟ ئەوانەی کە پەیمان شکێن بوون، بێ بەڵێن بوون، وە هەمیشە لە دەرفەتێك دەگەڕان، زەبرێك لە ئیسلام‌و مسوڵمانان بدەن.

<u>هەڵوەستەی شەشەم</u> ؛ ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾.

(فَإِن تُبۡتُمۡ)، هەرچەندە هەندێك لە توێژەروان وایان لێکداوەتەوە، واتە: ئەگەر تەوبەتان کردو گەڕانەوە بۆ لای خوا، بۆ ئیسلام، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کە ئەگەر وازتان هێنا لە پەیمان شکاندن، چونکە

---

١) ج ٦، ص ٧٩.

٢) ج ٢، ص ٤١٨.

دوایی باسی مسوڵمان بوون دەکات، بەڵام لێرە ئەوەی لێیان داوا کراوە، بریتی بووە لەوەی پابەند بن بە پەیمانەکەیانەوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەگەر واز بێنن و بگەڕێنەوە لە پەیمان شکاندن و پابەند بن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، ﴿وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ﴾، بەڵام ئەگەر پشت هەڵ بکەن، واتە: لەسەر پەیمان شکاندنتان، لەسەر دژایەتییکردنی مسوڵمانان بەردەوام بن، ئەوە دڵنیا بن، کە ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین، ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾، وە موژدە بدە بەوانەی کە بێبڕوان، بە سزاو ئازارێکی بە ئێش.

هەڵبەتە لێرەدا یان بە توانجەوەیە، واتە: موژدەیان پێبدە، وەك چۆن تۆ بە کەسێك دەڵێی: موژدەت لێ بێ ئەو شتە بوو، کە شتەکەش ناخۆشە، بەڵام بە نەسەفەوە پێی دەڵێی، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە، کە ئەگەر شتێك هەبێ بۆ ئەوان جێگەی دڵخۆشیی بێت و موژدە بێ، هەر ئەوەیە، کە هەواڵیان پێ بدرێ: سزاو ئازارێکی بە ئێشیان هەیە لە دواڕۆژدا.

<u>مەسەلەی چوارەم</u> : کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾﴾.

واتە: جگە لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، کە پەیمانتان لەگەڵ دا بەستوون، پاشان لەگەڵ ئێوەدا هیچ کەمییان نەکردوە، {یانی: لە پەیمانەکەیاندا هیچ کەمییان نەکردوەو پابەند بوون بە پەیمانەکەیانەوە}، ﴿وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا﴾، وە پشتی هیچ کەسیشیان نەگرتوە لە دژی ئێوە، واتە: دژایەتیی ئێوەیان نەکردوە، نە بە ڕاستەوخۆ، نە بە ناڕاستەوخۆ، ﴿فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ﴾، پەیمانەکەیان لەگەڵ تەواو بکەن، تاکو کاتی خۆیان، واتە: تاکو دەگەنە کاتی

دیارییکراویی خۆیان، پەیمانەکەیان لەگەڵ تەواو بکە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆش دەوێن، یانی : بێگومان خوا ئەوانەی خۆشدەوێ، کە بە پەیمانو بەڵێنەوە پابەندن.

کەواتە: ئەمە زۆر ڕوونە، کە ئەو بەرائەتو دووریی‌و بێزاریی دەربڕینو حاشا لێکردنە، تایبەتە بە پەیمان شکێنەکانەوە، چونکە ئەوەتا خوا ﷻ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی پەیمانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە، بەڵام کەمو کورتییان نەبووە لە پابەندبوونیان دا بە پەیمانەکەیانەوە، وە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، شتێکیان نەکردوە کە پێچەوانەی ئەو پەیمانە بێ، خوا فەرمان بە پێغەمبەرو بە بڕواداران دەکات، کە پەیمانەکەیان تا کاتی خۆی لەگەڵ تەواو بکەنو، لەگەڵیان بەرنە سەر، وە دواییش کە دەفەرموێ: بێگومان خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن، واتە: هەر کەس پەیمان بەرێتە سەر، چونکە ئەوانەی کە پەیمان دەپارێزن، دیارە پارێزکارن، وە خوای پەروەردگاریش خۆشی دەوێن.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٥﴾.

ئەم ئایەتە کە ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة)یە، وەك پێشتریش گوتمان: زۆر لە توێژەرەوان ناویان لێناوە (آية السيف) ئایەتی شمشێر! کە بەڕاستیی ناوێکی نەگونجاوە چونکە لە هەموو قورئاندا، باسی شمشێر هەر نەکراوە، وە ئەم ئایەتەش باسی چەكو شمشێری تێدا نیە، بەڵێ باسی جەنگ کردنی تێدا هەیە، لەگەڵ کەسانێکدا کە پەیمان دەشکێنن، وە لە بۆسەدان بۆ ئیسلامو مسوڵمانان، وەك باسی دەکەین:

١- کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ﴾، ئەگەر مانگە جەنگ تێدا قەدەغە کراوەکان تەواو بوون، ڕابردن، ئایا مەبەستی پێ چییە؟ پێشتریش باسمان کرد، واتە: ئەو چوار مانگە مۆڵەتەی کە دانراون، کە لە (١٠)ی (ذي

الحجة)ی ساڵی نۆیەمی كۆچییەوە دەست پێ دەكەن، ئەوە (٢٠) لە ساڵی (١٠)ی كۆچی ڕۆژ لەوێ، وە تێدەپەڕن بە: (محرم، صفر، ربیع الأول)دا تاكو (١٠)ی (ربیع الثاني)، كە دەكاتە چوار مانگی تەواو.

بەڵام هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی ئەو مانگانەیە، كە بەپێی نەریتی عەرەبەكان جەنگیان تێدا نەدەكردن، كە بریتی بوون لە: (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم)، (رجب)یش بە تەنیا، بەڵام وەك گوتمان ئەوە قسەیەكە هیچ ڕوویەكی نیە، بەڵكو مەبەست ئەو چوار مانگە مۆڵەتەیە كە لە سەرەتای سووڕەتەكەوە دەفەرموێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ﴾، بۆ ماوەی چوار مانگان مۆڵەتە بۆ خۆتان بە زەوی دا بڕۆن، بەڵام دوایی مادام پابەند نابن بە پەیمانەكانتانەوە، وە هەر لە دەرفەتێك دەگەڕێن زەبر لە مسوڵمانان بدەن، ئەوە ئیسلام ئیعلانی جەنگی لەگەڵتاندا كرد.

٢ - كە دەفەرموێ: ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ﴾، واتە: (فَاقْتُلُوا المُشْرِكِينَ النَاقِضِينَ لِلعَهْد)، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە بكوژن لە هەر جێیەك بەرپەلتان كەوتن، (كە پەیمان شكێنن). بۆچی؟ چونكە لە تەفسیری ئایەتی چوارەم دا كە باسمان كرد، كە خوای كارزان ئەوانەی كە پابەند بن بە پەیمانەوە هەڵیان داوێرێ لەو بڕیارە گشتییە.

٣ - ﴿وَخُذُوهُمۡ﴾، واتە: بیانگرن، ئەگەر بەر دەستتان كەوتن، بیانكوژن، ئەگەرنا بیانگرن.

٤ - ﴿وَٱحۡصُرُوهُمۡ﴾، ڕێیان لێ وەتەنگ بێنن، یاخود ئابڵووقەیان بدەن.

٥ - ﴿وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖ﴾، لە هەموو بۆسەیەك، ئەو شوێنەی بۆسەی لێ دادەنرێ، بۆیان دابنیشن، تا كەی؟

٦ - ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡ﴾، بەڵام ئەگەر گەڕانەوە، لێرەدا مەبەست لە گەڕانەوە گەڕانەوەیە بۆ لای خوا، واتە: گەڕانەوەو

پەشێمـان بوونـەوە لـە کوفـر، وە نوێـژیـان بەرپاکـرد، وە زەکاتیـان دا، ئـەوە رێیـان بەردەن.

٧ - ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

هەڵبەتە لێرەدا زانایـان مشتومرێکیـان هەیـە، لەوبارەوە کـە ئایـا بۆ هـاتنە نێـو ئیسلامی مرۆڤـێك، تـەنیـا شایـەتمان بەسـە، یـاخود وێـڕای شایـەتمـان هێنـان پێویستـە نوێـژیشی هەبێ، وە ئـەگـەر زەکاتی لێکەوت، زەکـاتیشی هـەبـێ؟ چونکـە لێرەدا خـوا ﷻ باسی سـێ شتان دەکات، دەفـەرموێ: ئـەگـەر گـەڕانەوە، کە مەبەست پێی هاتنە نێـو ئیسلامو ئیمـان هێنـانە، بەڵام دوایی دوو شتی دیکەش باس دەکـات: وە نوێـژیـان بەرپـا کـردو، زەکاتیشیـان دا، ئنجـا ئایـا وێـڕای شایـەتمان هێنـان، پابەندیی بە شـەریعەتیشەوە کە لە نوێـژکردنو زەکاتـدان دا، بەرجەستـە دەبـێ، یانـی: لـە دینـداریی شـەخصیی دا، ئـەوەش پێویستـە، یـاخود تـەنیـا شەیـەتمان پێویستـە؟ وەك هـەندێك لـە فەرموودەکـان بـە ڕاشکـاویی دەیگـەیەنن، کـە هـەر کـەسێك شایـەتمانی هێنـا، ئـەوە دێتـە نێـو ئیسـلامەوە، وە دەربـازی دەبـێ لـە کوفر؟ زانایان زۆر مشتومریـان لەوبارەوە هەیـە.

بەڵام من پێم وایـە لێرەدا دەبێ بگوترێ: لە کاتێکدا کە تەنیـا شایـەتمان هێنـان بەس بێ، بۆ دەربڕینـی هاتنە نێـو ئیسلام، هەر ئـەوەندە داوا دەکرێ، هەر بۆیـەش لەو کاتـەدا کـە ئوسامەی کوڕی زەیـد لـە جەنگێکدا کابرایـەکی کافر، لـە گـەرمەی جەنگدا کە زەبری لـە مسوڵمانان دەدا، ئنجا کاتێك ئوسامە شمشێرەکەی لێ بەرز کـردەوە، شایەتمانی هێنا، بەڵام هەر کوشتی، دوایی پێغەمبەر ﷺ گلـەیی لێکـردو سەرزەنشتی کـردو فەرمووی: ئایا هـەر کوشتت، دوای ئەوەی ئەو وشـەیەشی گوت؟

ئەویش گوتی: لـە ترسـان وایگـوت، پێغـەمبـەر ﷺ فـەرمووی[1] : ئـەدی بۆچـی دڵـت شـەق نەدەکـرد، تاکـو بزانـی داخـۆ ڕاست دەکـات، بەڕاستی بـووە، یـاخود لـە ترسـان بووە؟!

---

١) ﴿ أَفَلاَ شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ، فَنَظَرْتَ صَادِقًا هُوَ، أَوْ كَاذِبًا﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٤٦)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٨٧)} .

لێرەدا کاتێك کە کابرا شمشێری لەسەر بەرز کراوەتەوە، هەر فریای ئەوە دەکەوێ، کە بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه) کەواتە: بۆ کەسێك کە هاوبەش بۆ خوا دانەرە، کە دەڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه) جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، مانای وایە: وازی لە بیروبڕوای پێشێی هێناوەو هاتۆتە نێو ئیسلامەوە، لە کاتی جەنگدا هەر فریای ئەوە دەکەوێ، بەڵام ئایا بۆ دوایی هەر ئەوەندە بەسە؟

بە ڕاستیی وەك من لە کتێبەکانی خۆم دا باسم کردوە، بە پێی ئایەتەکانی قورئانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئینسان تەنیا بە شایەتمان هێنان نابێتە مسوڵمانێك، کە خوای پەروەردگارو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێکردوەو، ئەو ئیسلامە نایەتەدی، بەڵکو دەبێ کەمو زۆر پابەندیی هەبێ بە شەریعەتەوە، وە دووریی گرتنیشی هەبێ لە قەدەغەکراوەکانی شەریعەت، وە فەرمانبەرییشی هەبێ بۆ فەرمان پێکراوەکانی شەریعەت، ئەمە کورتەکەیەتیو ئیدی درێژەی زۆریشی هەیە، بەتایبەت لەسەر نوێژ، چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەن، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة، برقم: (٣٠٣٩٦)، وَأَحْمَد، برقم: (٢٢٩٨٧)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٦٢١)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٣)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (١٠٧٩)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (١٤٥٤)، وَالحَاكِمُ، برقم: (١١)، وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (٦٢٩١)، وَالدَّيْلَمِيُّ، برقم: (٤٢٥٧)، وَعَبْدُ الله بْن أَحْمَد في (السنة) برقم: (٧٦٩)، قَالَ المَنَاوِيّ قال العراقي في أماليه: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي}.

واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو کافرەکاندا هەیە، نوێژە هەر کەسێك نوێژ نەکات، ئەوە بێبڕوایە.

هەروەها ئەم ئایەتەش {ئایەتی ژمارە (٥)ی (التوبة)} بە بەڵگە دێنینەوە، وە زۆر ئایەتی دیکە، وەك من لە کتێبی {خوا پەرستیی ئیسلامیی} لە بەرگی یەکەم دا، بە تەفصیل باسی ئەو بابەتەم کردوە.

# کورتە باسێک لەبارەی ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة)وە

## ناگونجێ ئیسلام بە زۆر بەسەر خەڵک دا بسەپێنرێ

ئەو ئایەتەی کە وەك گوتم بە ناهەق ناویان لێناوە (آیة السیف)، ئایەتی شمشێر، جارێ ناوەکە بۆ خۆی ناوێکی بێجێیە، چونکە لە ئایەتەکەدا باسی شمشێر نەکراوە، وە لە ڕاستییدا ئەم ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة)یە، ئەگەر لە سیاقی خۆیدا سەرنجی بدرێ، لەو بارودۆخەدا کە ئایەتەکانی تێدا هاتوونە خوارێ، کە بە تەفصیلێ لە دەرسەکانی پێشوودا، باسمان کرد، وە تەماشای ئایەتەکانی پێشێ، وە ئایەتەکانی دوایی بکرێ، هیچ شتێکی تایبەتی تێدانیە، کە ئەو ناوەی لێبنرێ، وە زانایەکی وەك (أبو القاسم، هِبَةُ اللّه بنُ سَلاَمَة) کە دەڵێ: ئەم ئایەتە (١٣٧) ئایەتی نەسخ کردۆتەوە، یان (السیوطي) کە بە حیساب خاتری گرتوە، دەڵێ: هەموو ئەم ئایەتانەی کە باسی لێبوردن‌و صەبر گرتن‌و چاوپۆشیی، وە ئاشتیی‌و تەبایی دەکەن، هەمووی نەسخ کردونەوە!! کە بە دڵنیایی ئەو قسانە هیچیان بە هیچ بەڵگەیەکی نەقڵ‌و عەقڵ پشت ئەستوور نین.

بەڵکو ئەم ئایەتە، وەك ئایەتەکانی دیکە، ئەوەی ڕاگەیاندوە کە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی هەمیشە لە بۆسەدان، بۆ زەبردان لە ئیسلام‌و مسوڵمانان، وە پابەند نین بە بەڵێن‌و پەیمانەوە، هەر کاتێك ئێوە دەرفەتتان لێ بینین، وەك خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ١٩٤﴾البقرة.

واتـە: هـەر کـەسێك دەسـتدرێـژیی کـردە سـەرتـان، وەك خـۆی بەرپـەرچی دەست درێـژییـەکـەی بدەنەوە.

هـەڵبەتە لـەوبارەشەوە کـە: ئایا ئەم ئایەتـە، ـ ئایەتـی ژمارە (٥) بە زاراوی زانایـان: ئـایـەتی شمشـێر (آیـة سـیف)ە، یـاخود ئایـەتی ژمـارە (٣٦)؟! کـە کۆتاییـەکەی دەفـەرموێ : ﴿ ... وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ٣٦ ﴾ التوبـة.

واتـە: وە لـە دژی هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرەکـان بجـەنگن، بـە تێکـڕا، وەك چـۆن ئـەوان بە تێکڕا لە دژتـان دەجـەنگن؟!

چونکە وەك دوایی دەیگـەیـنێ: مانـای ڕاستی ئـەم ڕستـەیـەش ئـەوەیـە کـە: بـە تێکـڕاو بـە هـەرەوەزییو هـەمووتـان پێکـەوە، دژی هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرەکـان بجەنگن، وەك چۆن ئـەوان هـەموویـان وێکڕا، لـە دژتـان دەجـەنگن.

کـەچی هـەندێك لـە توێـژەرەوان بە هـەڵـە ئـەمەشیـان ئـاوا لێکداوەتـەوە، ئێـوە لـە دژی تێکـڕای هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دا بجەنگن، وەك چـۆن ئـەوان لـە دژی تێکڕاتـان دەجـەنگن، بەڵام ئـەو مانـایـە هـەڵـەیـە، چونکە هەموو هاوبەش بـۆ خـوا دانەرەکان، ڕەوا نیـە جـەنگیـان لـە دژ بکـرێ، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە ئـەوەتـا خـوا دەفـەرموێ: ئـەوانەی کـە پـابەند بـوون بـە پەیمانەکانیانـەوە، پـەیمانیان لەگـەڵ بەرنەسـەر: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَـٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ﴾. هـەروەهـا لـە ئـایـەتی دوایـی دا دەفـەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ فَمَا ٱسْتَقَـٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ﴾.

واتـە: جگـە لەوانەی لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتـان لەگـەڵ بەستن ...

کـەواتـە: نـاگونجێ ئـەم ئـایـەتـە ئـاوا لێکبدرێتـەوە، لـە دژی تێکـڕای هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرەکان بجەنگن، بە سێ بەڵگان :

یەکەم: لەگەڵ قورئان دا تێکدەگیرێ، کە دەفەرموێ: هاوبەش بۆ خوا دانەرێك پەیمانی لەگەڵ مسوڵمانان هەبێو، پابەند بێ بە پەیمانەکەوە، دروست نیە جەنگی دژ بکرێ.

دووەم: خوا لە سووڕەتی (النساء)دا وەك دوایی دەیهێنین، باسی کەسانێکمان بۆ دەکات کە بێلایەنن، واتە: هاوپەیمان نین لەگەڵ مسوڵمانان دا، بەڵام دژیش نین، بەڵکو بێلایەنن، ئەوانەش دیسان دروست نیە جەنگیان لە دژ بکرێ.

سێیەم: پاشان فەرمووده‌مان هەیە، باسی ئەوە دەکات کە هەر هاوبەش بۆ خوا دانەرێك، وە هەر کافرێك ئامادە بوو سەرانە بدات، واتە: ئیعلانی ئاشتیی‌و تەبایی کرد، لەگەڵ قەوارەی ئیسلامییدا، دیسان دروست نیە جەنگی لە دژ بکرێ.

کەواتە: نە ئەم ئایەتەی ژمارە (٥)و، نە ئایەتی ژمارە (٣٦)یش، هیچ کامیان ئیعلانی ئەوەیان نەکردوە، کە بە تێکڕا جەنگ لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بکرێ.

ئنجا شایانی باسە (أبو جعفر الطبري)، کە پێشەوای توێژەرەوانی قورئانە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا باسی ئەوەی هەر نەکردوە، کە ئەم ئایەتە پێی بگوترێ: (آیة السیف)، ئایەتی شمشێر[1]، کاتێك ئەم ئایەتەی تەفسیر کردوە، هیچ بەلای ئەوەدا نەچووە، کەواتە: ئەو بیرۆکەی: بە ئایەتی شمشێر ناوزەدکردنی ئەم ئایەتی ژمارە (٥)ە، لە دوایی (طبري)یەوە پەیدا بووە، واتە: لە دوای سەدەی چوارەم، وە دەشگونجێ بیرۆکەکە پێشتریش بووبێ، بەڵام (طبري) وەك زانایەکی زەبر دەست، هەر بە هەندی هەڵنەگرتبێ‌و حیسابی بۆ نەکردبێ، چونکە لە تەفسیرەکەی خۆیدا کەم‌و زۆر باسی نەکردوە.

ئنجا ئەگەر ئەم ئایەتە لە سیاقی خۆی دا سەرنجی بدرێ: ئەوە هیچ کام لەو واتایانە ناگەیەنێ کە لێی داوا کراون، کە هەندێك لە زانایان بەداخەوە هەوڵیان داوە، لێی وەربگرن‌و لێی بفامنەوە، بۆ نموونە: (الشوکاني) کە

---

١) جامع البيان، ج ٦، ص ٨٢ - ٨٣.

زانایەكی باش‌و بیر كراوەشە، وە زۆریش لە پێش ئێمەدا نەبووە، دەڵێ: {وَهَذِهِ الآيةَ نَسَخَتْ كُلّ آيةٍ فِيها ذُكر الإِعْراض عَنِ المُشْرِكِينَ وَالصَّبْرِ عَلَى أذَاهُمْ، وَقَالَ الضَّحاكُ وَعَطَاءُ وَالسُّدِيُّ: هِيَ مَنْسوخةٌ بقَوْلِهِ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾﴾ محمد، وَأنَّ الأسِيرَ لا يُقْتَلُ صَبْراً، بَلْ يُمَنُّ عَلَيْهِ أوْ يُفَادَى، وَقَالَ مُجَاهِد وَقَتَادَةَ: بَلْ هِيَ نَاسِخَةٌ لِقَوْلِهِ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾﴾ محمد، وَأنَّهُ لا يَجُوزُ فِي الأُسَارَى مِنَ المُشْرِكِينَ إلاَّ القَتْلُ، وَقَالَ ابْنُ زَيدٍ: الآيَتَانِ مُحْكَمَتانِ، قَالَ القُرطُبي: وَهِيَ الصَّحِيح، لأَنَّ المَنَّ وَالقَتْلَ وَالفِدَاءَ لَمْ تَزَلْ مِنْ حُكْمِ رَسُولِ الله ﷺ فِيهِم مِنْ أوَّلِ حَرْبٍ جَاءَ بِهِم، وَهُوَ يَومُ بَدْرٍ}[1] كە بێگومان ئەوە یەكێكە لەو بۆچوونە هەڵانەی كە دەربارەی ئەم ئایەتە هەن.

واتە: ئەم ئایەتە هەموو ئەو ئایەتانەی نەسخ كردوونەوە كە باسی وازهێنان لە هاوبەش بۆ خوا دان دەكەن، وە باسی خۆڕاگریی لەسەر ئازارو ئەزیەتیان دەكەن، وە (ضَحّاكُ وَعَطَاءْ وسدِّيّ)[2]، گوتوویانە: ئەم ئایەتە نەسخ كراوەتەوە بە فەرمایشتی خوا، كە دەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾﴾ محمد، واتە: با دوایی – دیلەكانی كافران - منەتیان لەسەر بكرێ، بە خۆڕایی بەر بدرێن، یان بە فەرمبوو.

گوتوویانە: ناگونجێ كەسێك بكوژرێ، دوای ئەوەی بە دیل دەگیرێ، بەڵكو یان بە خۆڕایی بەردەدرێ، یاخود بە فەرمبوو (كە ئەمە ڕاستەو، ئەو ئایەتەی سووڕەتی موحەممەد ئەم ڕاستییە دەگەیەنێ)، بەڵام (مُجَاهِد وَقَتَادَة)، گوتوویانە: بەڵكو ئەم ئایەتەی سووڕەتی (التوبة)، نەسخی ئەو فەرمایشتەی خوای كردۆتەوە، كە دەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾﴾ محمد، وە

---

١) فتح القدير للشوكاني، ج٢، ص٤١٠.

٢) كە سێ زانای تابعیینن، واتە: جیلی دوای هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ.

گوتوویانە: دروست نیە دیلەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران بەربدرێن، بەبێ بەرانبەرو بە بەرانبەر، بەڵکو حەتمەن دەبێ بکوژرێن{ئەوەش ڕایەکی نەگونجاوەو، پێچەوانەی قورئان، وە پێچەوانەی سیرەو سوننەتی پێغەمبەریشە ﷺ} ئیبنو زەید (کە یەکێکە لە زانایان) گوتوویەتی: هەر کام لە ئایەتەکان موحکەمن، (واتە: نە ناسیخن، نە مەنسووخن، لە شوێنی خۆیاندان) (قرطبي)یش گوتوویەتی: ئەو ڕایە ڕاستە، چونکە هەر کام لە خەڵك ئازادکردن بە بەلاش‌و بە منەت، وە کوشتنی دیل، وە فەرەبوو لێ وەرگرتنیشی، هەموویان لە حوکمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون، لە مامەڵە لەگەڵ کافراندا، لە یەکەم جەنگەوە کە تێیدا بە دیل گیران، کە ڕۆژی بەدر بوو.

منیش دەڵێم : کە لە ڕاستییدا ئەو ڕایەی (قرطبي)یش لە جێی خۆیدا نیە، وەك کاتی خۆیشی باسمان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی بەدردا، - ئەویش ئەگەر ڕیوایەتەکە ڕاست بێ ـ تەنیا دوو کەسی کوشتن، کە بریتی بوون لە: (عُقْبَـةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ ، وَالنَّضْـرُ بْنُ الْحارِثِ)، ئەویش وەك حاڵەتێکی هەڵاوێردراو لەو حوکمە گشتییە کە نابێ دیل بکوژرێ، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوان تاوانی زۆر گەورەیان کرد بوو، ئەویش وەك تاوانباری جەنگ (مُجْرِمُ الحَرْب) مامەڵەی لەگەڵدا کردن.

# سێ ڕاستیی مەزن کە لەو ئایەتانە وەردەگیرێن

**ڕاستیی یەکەم** : ناگونجێ مەبەست لەم ئایەتی ژمارە (٥)ە، ئیعلانی جەنگ بێ، دژی هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، تاکو موسوڵمان دەبن، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ لە ئایەتی پێشتر ـ ئایەتی ژمارە (٤)دا ـ دەفەرمێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، کە پێشتر مانامان کرد، هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٧)یشدا دەفەرمێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾.

واتە: جگە لەوانەی کە لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون، تاکو ئەوان ڕێك وەستاو بن لەسەر پەیمانەکەیان، ئێوەش ڕێك وەستاو بن لەسەر ئەو پەیمانە، کەواتە: ناگونجێ ئایەتی ژمارە (٥) تێکبگیرێ، لەگەڵ ئایەتێکی پێش خۆی، وە ئایەتێکی دوای خۆی دا.

**ڕاستیی دووەم** : ناگونجێ هیچ کەس لەسەر هاتنە نێو ئیسلام ناچار بکرێ، بۆچی؟ لەبەر ئەم بەڵگانە:

**بەڵگەی یەکەم:**

أ/ خوای پەروەردگار دەفەرمێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة.

واتە: تۆبزیی کردن، ناچارکردن لە دینداریی دا نیە.

ب/ وە دەفـــــەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف.

واتــە: بڵــێ: هــەق لــەلای پەروەردگارتـانەوەیــە، کــێ حــەز دەکــات بــا بــڕوا بێنــێ، وە کــێ حــەز دەکات با بێبــڕوابــێ.

ج/ هــەروەهـــا دەفـــەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾یونـس.

واتــە: وە ئەگــەر پـەروەردگــار ویـسـتبای، تێکــڕای ئــەو خەڵکــەی لەســەر زەوییـن، بڕوایان دەهێنا، ئـایـا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی تا بیـانکەی بە بـڕوادار؟

واتــە: من پـەروەردگاریـانمو وە زۆرم لــێ نەکـردوونو، ئـازادم کــردوون، ئایـا تــۆ ئـەی موحـەممـەد! ﷺ نـاچاریـان دەکـەی ؟ بۆت نیـە!

هـەروەهــا ئایــەتی دیکــەش زۆرن، وەك خــوا دەفــەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ﴿٤٥﴾ ﴾ق، واتــە: تــۆ بــۆت نیـــە جەبریــان لــێ بکــەی، ﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ الغاشیـة.

واتـە: تۆ دەســەڵاتت بەسـەر دڵو دەروونیـان دا نیـە.

ئـەوە دەربارەی ئــەوە، کــە هـیـچ کــەس نـاگونجــێ لـەســەر هــاتنە نێــو ئیـسـلام نـاچار بکـرێ.

**بەڵـگـەی دووەم:**

کـەسی نـاچار کـراو لەسـەر ئیسلام نـابێتـە مسوڵمان، بەڵـکو دەبێتــە مونــافیق، وەك لـە کتێبـی (ئیسلامو دەوڵـەتداریی) لــە بـەرگی (٢)دا، کــە دواییـش کــراوە بـە نـامیلکەیـەك بـە نـاوی (حـوکمی هەڵگـەڕانەوە لـە ئیـسلامو چـەند سـەرنجـێك) باسمان کـردوە، کەسێك کە ناچار دەکرێ، مســوڵمان بێ، نابێتـە مسوڵـمان، بەڵـکو

دەبێتە موونافیق، بۆچی؟ چونكە مسوڵمانەتیی ئەوەیە كە مرۆڤ ئیمانی لە دڵدا هەبێ، وە بە ویستی ئازادانەی خۆی ئیسلام هەڵبژێرێ، وە وێڕای ئەوەی بە عەقڵ تێدەگاو بە دڵ پەسەندی دەكات، دەبێ بە كردەوەش پابەند بێ، وە بنەڕەتی ئیمانو، بەشی هەرە گەورەو گرنگی ئیمان، ئەوەیە كە لە دڵو دەروونـدا جێگیر دەبێ، بۆیەش هەمیشە خوای پەروەردگار ئیمانی بە دڵەوە بەستۆتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ (٢٢)﴾المجادلة.

**بەڵگەی سێیەم:**

ناچار كردن لەسەر ئیسلام، پێچەوانەی دروستكرانی حیكمەتی مرۆڤە، كە خوا مرۆڤی دروست كردوە تاكو لەسەر زەوی تاقی بكاتەوە، لە سێ ئایەت لە سوورەتەكانی قورئان دا خوای پەروەردگار ئەم ڕاستییەی خستۆتە ڕوو:

أ/ دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا (٢)﴾الملك.

واتە: خوا ئەو كەسەیە كە مردنو ژیانی گێڕراون، تاكو تاقیتان بكاتەوە، كامەتان كردەوەی باشتر ئەنجام دەدات.

ب/ دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا (٧)﴾الكهف.

واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە كردوومانە بە مایەی ڕازاندنەوەو جوانیی زەوی، تاكو مرۆڤەكان تاقی بكەینەوە، كامەیان كردەوەی باشترە.

ج/ وە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا (٧)﴾هود.

واتە: وە ئەو (خوا) ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكانو زەوی بە شەش ڕۆژان، (واتە: بە شەش قۆناغ، بە شەش ماوە لە كات) هێناونە دی، وە بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، تاكو تاقیتان بكاتەوە، كامەتان كردەوەی باشترە.

راستی سێیەم : هەموو مرۆڤەكان بۆیان رەوایە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بژین، وە سیرەو سوننەتی كردەیی پێغەمبەر ﷺ وا بووە، هەروەها خەلیفە راشیدەكانو حوكمڕانە سەر راستەكانی ئیسلامیش، هەروا مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكدا كردوە، كە دەوڵەتی ئیسلامیی توانیویەتی هەموو مرۆڤەكان بە جیاوازیی رەنگو دینو بیرو رایان، لەژێر سایەی خۆیدا بحەوێنێتەوە، تەنانەت هەڵگەڕاوەكانیش، وە تەنانەت مولحیدو زیندیقەكانیش، با تەماشا بكەین:

یەك : دەربارەی جوولەكەو نەصرانییەكان: خوای پەروەردگار زۆر بە روونو راشكاویی لەم سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾.

واتە: لە دژی ئەوانە بجەنگن كە ئیمان ناهێنن بە خواو بە رۆژی دوایی، وە ئەوەی كە خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەیان كردوە بە قەدەغەی نازانن، وە پابەند نین بە بەرنامەی هەقی خواوە، لەوانەی كتێبیان پێدراوە، {كە كتێب پێدراوەكان بە پلەی یەكەم جوولەكەو نەصرانییەكان، وە هەر كەسێكی دیكەش كە سەلمێنرا كتێبێكی ئاسمانیی هەیە، ئنجا زەردەشتییە، صابیئەیە، هەر كەسێك هەیە، هەمان حوكمی هەیە} ﴿ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾، تاكو سەرانە دەدن بە ملكەچیی، وە پابەند دەبن بە تەباییەوە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

دوو: دەربارەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێكی درێژدا كە ئێمە شوێنی مەبەستی لێ دێنین، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ ، أَوْ خِلَالٍ:

فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلَامِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُم، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَقَاتِلْهُم﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، بِرقم: (٢٣٠٨٠)، وَمُسْلِمٌ، بِرقم: (١٧٣١)، وَأَبُو دَاوُدَ، بِرقم: (٢٦١٢)، وَالتِّرمِذِيُّ، بِرقم: (١٤٠٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبْرَى) بِرقم: (٨٥٨٦)، وَابْنُ مَاجَهْ، بِرقم: (٢٨٥٨)، وَالدَّارِمِيُّ، بِرقم: (٢٤٣٩)، وَابْنُ حِبَّانَ، بِرقم: (٤٧٣٩)، وَأَبُو عَوَانَة، بِرقم: (٦٤٩٥)}.

واتە: ئەگەر بە دوژمنەکەت گەیشتی لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بانگیان بکە بۆ یەکێك لە سێ شتان، سێ خەصڵەتان: بانگیان بکە بۆ ئیسلام، بڵێ: مسوڵمان بن، ئەگەر لێیان وەرگرتیو مسوڵمان بوون، ئەوە وازیان لێ بێنە، وە لێیان قبووڵ بکە، وە ئەگەر مسوڵمان نەبوون، داوای سەرانەیان لێ بکە، {کە سەرانە دانیش ڕەمزێك بووە، بۆ ئەوەی ئەو کەسە، یان ئەو لایەنە، دژی دەوڵەتی ئیسلامیی نیە، ئەگەرنا، وەك دوایی باسی دەکەین، سەرانە دان، شتێکی حەتمیی نەبووە} ئەگەر سەرانەشیان نەدا، (هەر دژی ئیسلامو مسوڵمانان بوون) ئەو کاتە ناوی خوای لێ بێنەو پەنا بە خوا بگرەو لە دژیان بجەنگە.

سێ: دەربارەی مەجووسییەکان: دیارە ئەوانیش وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە، وەك چۆن هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش، وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە، لەوبارەوە ئەم دوو دەقە دێنینەوە:

أ - ﴿عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ لَمْ يَأْخُذِ الْجِزْيَةَ مِنَ الْمَجُوسِ حَتَّى شَهِدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد. برقم: (١٦٨٥) تَعْلِيق شُعَيْب الأَرْنَؤُوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي، رِجَالُهُ ثِقَات رِجَالُ الشَّيْخَيْنِ غَيْر بجالة التميمي، فَمِنْ رِجَال البُخَارِي، وَالبُخَارِيُّ، بِرقم: (١٧٣١)، وَأَبُو دَاوُدَ، بِرقم: (٣٠٤٥)، وَالتِّرمِذِيُّ، بِرقم: (١٥٨٦)، وَالدَّارِمِيُّ بِرقم: (٢٥٠١)}.

واتــە: عومــەری کــوڕی خــەتتــاب خــوا لێــی ڕازی بــێ، ســەرانەی لــە مەجووسییەکان (ئاگر پەرستەکان) وەرنەگرت تاکو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف شایەدیی دا، کە پێغەمبەر ﷺ سەرانەی وەرگرتوە لە مەجووسییەکانی هەجەر، (کە دیارە ناوی شوێنێکە).

ب - هەر لەوبارەوە ئەم شوێنەوارەش هەیە:

﴿أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ذَكَرَ الْمَجُوسَ ، فَقَالَ: مَا أَدْرِي كَيْفَ أَصْنَعُ فِي أَمْرِهِمْ؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، يَقُولُ: (سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ)﴾، {أَخْرَجَهُ مَالِكٌ فِي (الْمُوطَّأ) برقم: (٦١٦)، وَالشافِعِي فِي (المسند) برقم: (١١٣١)، وَالبَيْهَقِي فِي (الكُبْرَى) برقم: (١٨٤٣٤)}.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، باسی مەجووسییەکانی کرد، دوایی گوتی: نازانم چۆنیان مامەڵە لەگەڵدا بکەم، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، گوتی: من شایەدیی دەدەم کە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.

هەروەها لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە:

﴿عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ لِعَامل كِسْرى: أَمَرَ نَبِيّنَا ﷺ أَنْ نُقَاتِلَكُمْ حَتَّى تَعْبُدُوا اللهَ وَحْدَهُ أَوْ تُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٣١٥٩)}.

واتــە: موغەیــرەی کــوڕی شــوعبە خــوا لێــی ڕازی بــێ، بــە (عــامل)[1]ی کیسـرای گـوتوە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمانی پێکـردوین کـە لـە دژتـان بجەنگـین تاکـو بەندایـەتیـی بـۆ خـوا دەکـەن‌و مسوڵـمان دەبـن، یـاخود سـەرانە دەدەن.

---

[1] (عامل) کەسێك بووە، لە جێی پارێزگاری ئێستا، موغەیرەش خوا لێی ڕازی بـێ، یەکـێك بووە لـە کاربەدەستەکانی پێغەمبـەری خوا ﷺ.

<u>چوار</u>: دەربارەی مولحیدو ئەوانەی کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە: دوو دەق دێنین:

١) ﴿رَوَى سَعِيدُ بْن مَنْصُور فِي سُنَنِهِ[1]، أَنَّ تُسْتُرَ فُتِحَتْ صُلْحاً، ثُمَّ كَفَرَ أَهْلُهَا فَغَزَاهُمَ الـمُهَجِرونَ، وَسَبُوهُمْ، فَأَمَرَ عُمَر بْن الخَطَّابِ مَنْ سُبِيَ مِنْهُمْ ، أَنْ يُردُّوا إِلى جِزْيَتِهِم، وَفَرَّقَ بَيْنَ سادَتِهِم﴾.

سەعیدی کوڕی مەنسوور لە (سنن)ی خۆی دا هێناویەتی، کە توستور بە صوڵح گیرا، دوایی خەڵکەکەی هەڵگەڕانەوە، کۆچ کەرانیش (مسوڵمانان) چوون شارەکەیان گرتەوەو، بە دیلیان گرتن، عومەری کوڕی خەتتاب فەرمانی کرد: ئەوانەی کە بە دیل گیراون بگێڕدرێنەوە بۆ سەرانە دان، وە گەورە گەورەکانیشی لێ بلاوکردنەوە، (بۆ ئەوەی جارێکی دی گەلە کۆمەکیی نەکەن).

٢) ﴿رَوَى عَبْد الرَّزاق أَنَّ قَوْماً مِنْ أَهْلِ الجَزِيرَةِ أَسْلَمُوا، ثُمَّ لَمْ يَمْكُثُوا إِلاَّ قَلِيلاً حَتَّى ارتَدّوا، فَكَتَبَ فِيهِم مَيْمُون بْن مَهْرَان إِلى عُمَر بن عَبْد العَزِيزِ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَر: أَنْ رُدَّ عَلَيْهِم الجِزْيَة وَدعهُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ عَبْد الرَّزاق، برقم: (١٨٧١٤)}.

واتە: عەبدوڕڕەزاق دەگێڕێتەوە دەڵێ: کۆمەڵێك لە ئەهلی جەزیرە[2] هاتن، مسوڵمان بوون، دوایی زۆری پێنەچوو، هەڵگەڕانەوە، مەیموونی کوڕی مەهران نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، (کە ڕۆژگاری حوکمی ئەو بووە) عومەریش بۆی نووسی: سەرانەیان لێ وەربگرەو وازیان لێ بێنە.

کەواتە: تەنانەت هەڵگەڕاوەکانیش دوای ئەوەی تەبایی پێشان دەدەن لەگەڵ قەوارەی ئیسلامیی دا، کە وەك ڕەمزێك لە سەرانە دان دا بەرجەستە دەبێ، ئەوانیش لێیان قبووڵ دەکرێ، لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بژین.

---

١) برقم: ٢٥٨٨.

٢) شارێکە لە باکووری کوردستان، (کوردستانی تورکیا).

## وەرگـرتنـی سەرانـە (أخـذ الجـزيـة) شتێکی حـەتـمیـی نیـە

ئنجا پێویستە ئەوەش بزانـدرێ، کـە وەرگـرتنی سـەرانە (أخـذ الجـزيـة) شتێکی حەتمـیی نیـە، لـەو قـەوارە سیاسییـانەی یـاخود لـەو لایـەنو کـۆمەڵانەی، کـە دەیـانەوێ لــە ژێـر سایــەی دەوڵــەتی ئیسلامییدا بـژین، وە لـەگـەڵ دەوڵـەتی ئیسلامییدا تـەباو گونجاو بن، بەڵکو ئەوە تـەنیا مایـەی تـەباییـە، وە یـەکێکـە لـە صیغەکـانی ئاشـتییو پێکـەوە ژیـان لـەگـەڵ دەوڵـەتی ئیسـلامیی دا، بەڵگـەمان لەسەر ئەوە چییە؟

بەڵگەمان:

یەکەم : ئـەو سـێ هـۆزە جوولـەکـەیە کـە لـە مەدینـەدا دەژیـان، هیـچ کامیـان سەرانەیـان لـێ وەرنەگیـراوە، کە بریتی بوون لە: (بَنِـي قَيْنُـقَاعَ و بَنِـي النّضِـيرِ و بَنِـي قُرَيْظَـةَ)، چونکە وەك لە کتێبـی: (ئیسلامو دەوڵـەتداریی)، بەتایبـەت لـە بەرگـی (٤)دا باسـم کـردوە: لـە ڕاستییدا سـەرانە زیـاتر لـەوانە وەردەگیـرێ کـە پێشتـر دژایـەتیی دەوڵـەتی ئیسلامییـان کـردوە، دوایی بڕیـاڕ دەدەن کـە واز لـە دژایــەتییو سەنگەرگـرتن لــە دژی ئیســلامو مسوڵـمانان بێـنن، وە دەکــەونە حـاڵـەتی تـەبایی، لـەو کاتـەدا دەوڵـەتی ئیسـلامیی لێیـان داوا دەکـات بـۆ پێشـان دانو سـەلـماندنی ئـەوە کـە لـە مـەودوا دژایـەتیی دەوڵـەتی ئیسلامیی نـاکـەنو، لەگـەڵی تـەبـان: سـەرانە بـدەن، ئەندازەیـەك مـاڵ بـدەن، بـەڵام سـێ تیـرە جوولەکەکان، کە پێغەمبەری خـوا ﷺ لەسـەر بناغـەی پەیمـانێك، کـە پێـی گوتراوە: (کـتـاب)، وە پێشی گـوتراوە: (صحیفـة)، کـە (وثیقـة)یـەك بـووە، وەك دەسـتوورێکی ئێسـتا، لـە نێـوان پێکهاتـەکـانی مەدینـەدا، کـە پێغـەمبـەر ﷺو مسوڵمانـان لەلایـەك، بـە کۆچکـەرانو پشتیوانـانەوە، وە جوولـەکەکـانیش بـە هـەر سـێ تیـرەکەوە لەلایـەك، وە موشـریکەکانیشو، ئەوانەش کـە لـە حـاڵـەتی نیفـاقدا بوونە، هەریـەکە لە لایـەك، هەموو ئەو پێکهاتـانە لەسەر بناغەی ئـەو دەسـتوورو صەحیفەیـە، پێکـەوە مامەڵەیـان کـردوە، بۆیـە پێغـەمبـەر ﷺو مسوڵمانـان داوای سـەرانەیان لـەو سـێ هـۆزە نەکـردوە.

دووەم :ئنجا ئەگەر بشگوتریّ: وەرگرتنی سەرانە (جزیة)، دوای حوکمی سەرانە وەرگرتن هاتۆتە خوار، دەڵێین: ئەو کاتەش کە هاتۆتە خوار، دیسان هەندێك لەو پێکهاتانەی لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابوون، سەرانەیان لێ وەرنەگیراوە، با تەماشای ئەم ئایەتە بکەین لە سوورەتی (النساء)دا، خوای داگەر باسی حاڵەتێك دەکات: حاڵەتی بێلایەنیی (حیاد) واتە: نە لەگەڵ دابوون، نە دژ بوون، بەو واتایە کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا، هیچ پەیمانێکیان نیە، بەڵام دژیشی نین، بەڵکو بریاریان داوە لاشەڕو بێلایەن بن، وەك خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ۝٩٠﴾النساء.

پێشیّ باسی ئەوە دەکات ئەوانەی کە لە دەرفەت دەگەڕێن زەبرتان لێبدەن، هەر کاتێك ئێوەش زەفەرتان پێبردن، زەبریان لێبدەن، دوایی دەفەرموێ: جگە لەوانەی کە پەیوەندییان هەیە بە کۆمەڵێکەوە، کە لە نێوان ئێوەو ئەواندا، پەیمانێك هەیە، {واتە: هاوپەیمان نین لەگەڵ ئێوە، بەڵام هاوپەیمانن لەگەڵ کۆمەڵێکی کافردا، کە ئەو کۆمەڵە کافرە، لەگەڵ ئێوەدا هاوپەیمانن} .

﴿أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡ﴾.

یاخود دێن بۆ لاتان، دڵ تەنگن کە لە دژی ئێوە بجەنگن، یاخود لە دژی کۆمەڵەکەی خۆیان بجەنگن، {واتە: دەیانەوێ بێلایەن بن، لە نێوان ئێوەو کافرەکاندا، ئەو کافرانەی کە جەنگتان لە دژ دەکەن، ئەوان بێلایەنییان هەڵبژاردوە} ئەوانە دەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکریّ؟

﴿فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ﴾، واتە: ئنجا هەرکات بێلایەن بوون، گۆشەگیر بوونو، دژتان نەبوون﴿فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا﴾

وە لە دژتان نەجەنگین، وە ئاشتییان بۆ پێشاندان، ئەوە خوا رێگای نەداوە بە ئێوە، لە دژی وان هیچ هەڵوێستێك وەربگرن.

كەواتە: دەگونجێ قەوارەیەك، كۆمەڵێك و لایەنێكی كافر هەبن، لەگەڵ مسوڵمانان دا هاوپەیمان نەبن، بەڵام دژیش نەبن و بێلایەن بن، وە هیچ سەرانەش نەدەن.

ئنجا زانایان و شەرعزانان باسیان كردوە، كە چەند لایەنێك هەبوون لە نەصرانییەكان، وە هەندێك لە تیرەو هۆزەكانی دیكە، ئامادە بوون بە جۆرێك لە جۆرەكان: هاوكاریی دەوڵەتی ئیسلامیی بكەن، لە بەرانبەر ئەوەش دا سەرانەیان لەسەر هەڵگیراوە، یاخود ئامادە بوون سەربازیی بكەن، یاخود هاوكاریی سەربازیی دەوڵەتی ئیسلامیی بكەن، یاخود بە جۆرێك لە جۆرەكان هاوكاریی بكەن، ئەوانە لە بەرانبەردا سەرانەیان لەسەر هەڵگیراوە، وە هەندێك لایەن هەبوون، كە دەوڵەتی ئیسلامیی وا لەگەڵیان رێك كەوتوە، دژیان نەبن و بێلایەن بن، بێ ئەوەی كە داوای سەرانەیان لێبكەن.

كەواتە: مەسەلەی سەرانە وەرگرتن، تەنیا یەكێك بووە لە حاڵەتەكانی دەربڕینی ئاشتیی لە نێوان ئەو لایەن و، كۆمەڵە، وە دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

جارێكی دیكە دێمەوە سەر باسی ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة) كە بە ناهەق ناوی لێنراوە: (آیة السیف) ئایەتی شمشێر.

دەڵێم: ناگونجێ ئایەتەكانی قورئان، دژ بە یەك و ناكۆك بن، چونكە خوای كارزان زۆر بە روون و راشكاویی لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾.

واتە: ئایا لە قورئانێ ورد نابنەوە؟! ئەگەر لەلایەن جگە لە خواوە بووایە، ناكۆكیی زۆریان تێدا دەبینی.

كەواتە: خوای كاربەجێ دەفەرموێ: چونكە قورئان فەرمایشتی منە، ناكۆكیی و دژ بە یەكبوونی تێدا نیە، ئایەتەكان دژی یەك نابن، هەموویان وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك یەكدی دەبەستنەوە.

ئنجا ئەگەر بێتو ئایەتی ژمارە (٥)، هەموو ئەو ئایەتانە هەڵبوەشێنێتەوە، کە فەرمان دەکەن بە مسوڵمانان،بەوەی چاوپۆشیی بکەنو خۆڕاگر بن، وە بانگەواز بکەن بۆ لای ئیسلام بە حیکمەتو لێزانییو بە ئامۆژگاریی چاك، وە خۆڕاگر بن لە بەرانبەر ئازاری کافرەکاندا، وە خۆش خوڵق بن، ئەگەر هەموو ئەوانە هەڵوەشابنەوە، مانای وایە تێکگیران لە قورئان دا بووە!!

هەر بۆیەش من پێم وایە کە وەك پێشتر لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (البقرة)دا گوتمانو، باسێکی سەربەخۆمان لەوبارەوە کرد[١]، کە بە هیچ جۆرێك نەسخ لە قورئاندا بوونی نیە، ئەو قورئانەی کە ئێستا لەبەردەستمانە، هیچ دوو ئایەتێکی پێکەوە تێك ناگیرێن، تاکو ناچار بین بڵێین: ئەمیان ئەویانی نەسخ کردۆتەوە، کەواتە: ئەو قسەیەی کە (السیوطي) لە (الإکلیل)دا کە کتێبێکی خۆیەتی، دەربارەی ئەم ئایەتی ژمارە (٥) گوتوویەتی:

{﴿فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾، هَذِهِ آيةُ السَّيفِ الناسِخةُ لآياتِ العَفْوِ وَالصَّفْحِ، وَالإِعْرَاضِ وَالمُسالَمَةِ}[٢].

واتە: ئەم ئایەتە، ئایەتی شمشێرە، هەرچی ئەو ئایەتانەی باسی لێبووردنو چاوپۆشییو باسی ڕوو لێ وەرگێڕانو ئاشتییو تەبایی دەکەن، هەمووی نەسخ کردوونەوە.

ئەم قسەیەی (السیوطي) وەك قسەی هەموو ئەو زانایانەی دیکە وایە، (خوا لێیان خۆش بێو خوا پاداشتیان بداتەوە) کە ئەو ئایەتەیان کردوە بە شمشێرێكو ملی زۆر ئایەتیان پێ هەڵبڕیوە، کە لە ڕاستییدا نە ئایەتەکە ئەوە ناوەی شایستەیە، وە نە هیچ ئایەتێکی نەسخ کردۆتەوە، چونکە: بێگومان بابەتی تەباییو پێکەوە ژیان، وە ئازادیی مرۆڤەکان، وە لێبوردەییو ئارامگرییو چاوپۆشیی، وە بانگەواز بە حیکمەت ...هتد، هەموو ئەو مەبەستانە، بنەمای گرنگو بەهای بنەڕەتییو سەرەکیین، لە ئیسلامدا، وە ناگونجێ لابچن.

---

١) دواییش لە شێوەی نامیلکەیەکی سەربەخۆدا، چاپو بڵاوکرایەوە.

٢) (محاسن التأویل، ج٥، ص١٣٤).

ئنجا ئەگەر ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة) هەموو ئەو بنەما گرنگو بەها بەرزانەی لابردبێ، ئەدی ئایا لەگەڵ خەڵکدا نابێ خۆش خوڵق بین؟ نابێ لێبوردە بین؟ نابێ چاوپۆشییان لێبکەین؟ نابێ بە حیکمەت بۆ لای خوا بانگیان بکەین؟ ئەدی ئایا نابێ ئازادییان پێبدەین؟ دەبێ بڵێین: مسوڵمان بە دەنا دەتکوژم؟!! کەی شتی وا لە ئیسلامدا هەیە؟

ئەگەر بڵێین: ئەو هەموو ئایەتانە ـ کە سەدان ئایەتن ـ ئەم ئایەتەیان نەسخ کردۆتەوە، زۆر لە عەقڵو نەقڵەوە نیزیکترە، لەوەی بڵێین : ئایەتێك، بگرە ڕستەیەك ، نەسخ کەرەوەی ئەو سەدان ئایەتەیە، کە دەیان بنەمای گرنگو بەهاو ڕەوشتی گەورە گەورەی ئیسلامیی ڕادەگەیەنن، کە بە بێ ئەوانە ناگونجێ کۆمەڵگا پێکەوە بژی !.

ئنجا دەوڵەتی ئیسلامییش ئەو بنەماو بەهایانەی بەرجەستە کردوە لە دنیای واقیعدا، وە مسوڵمانان هەر بەو شێوەیە لەگەڵ خەڵکدا ژیاون، بە درێژایی سێزدە سەدە، وە دەوڵەتی ئیسلامیی لە هەموو قۆناغەکانی دا، دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺو، کاتی حوکمڕانیی خەلیفە ڕاشیدەکانو، ئومەوییەکانو، عەبباسییەکانو، عوسمانییەکان، تاکو ساڵی (١٩٢٤)ز کە بە ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانیی هەڵوەشێنرایەوە، هەموو خاوەن دینەکان لە ژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیاون: جوولەکە، نەصڕانیی، بووذایی، مەجووسیی، ئێزیدیی، صابیئە، هیندۆسیی، ...هتد، ئنجا چ سەرانەیان دابێ، چ بە شێوەیەکی دیکە مسوڵمانان لەگەڵیان ڕێککەوتبن، گرنگ ئەوەیە پەرستگاکانیان سەلامەت بوون، وە لە ڕووی باری کەسێتییەوە، بە پێی دینی خۆیان ڕەفتاریان لەگەڵ کراوە، وە مسوڵمانان دەستیان وەرنەداوەتە کاروباریان، وە ئەو شتانەی تایبەتمەندیی دینییانن، وە هەمووشیان بە تەبایی لەگەڵ مسوڵماناندا ژیاون.

## ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی نەسخەوە

ئنجا مەسەلەی نەسخ کە دەگوترێ: ئەم ئایەتی ژمارە (٥)ە، هەموو ئایەتەکانی دیکەی نەسخ کردوونەوە، کە لەبارەی ئارامگرتن‌و حیکمەت‌و چاوپۆشییەوە هاتوون، لەوبارەوە دەڵێین:

ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا {کە لە سووڕەتی (الفاتحة)و سووڕەتی (البقرة) پێکهاتوە}، بە تەفصیلێ باسی مەسەلەی (نسخ)مان کردوە، دوایی بە شێوەی نامیلکەیەکیش بڵاوکرایەوە، وە دەرمانخستوە کە: هیچ ئایەتێك لەم قورئانەی ئێستا لەبەردەستمان دایە، نەسخ نەبۆتەوە، بەو واتایەی ئایەتێك هەبێ بخوێنرێتەوە، بەڵام کاری پێنەکرێ، شتی وا نیە لە قورئاندا، وە ئێستا ئێمە کە گەیشتووینە جوزئی دەیەم لە قورئان، کە زۆربەی سووڕەتە مەدینەییەکانی قورئان، لەم دە جوزئە دان، هەتا ئێستا ئێمە هیچ ئایەتێکمان نەهاتۆتە بەرچاو، کە ناچار بین بڵێین: نەسخ بۆتەوە یاخود ئایەتێکی دیکەی نەسخ کردۆتەوە.

وە باسمان کردوە، کە هۆی بە هەڵەدا چوونی هەندێك لە زانایانەوە، لە بەلابراو (منسوخ ) دانانی هەندێك ئایەت دا، لە بەکارهێنانی وشەی (نسخ) بووە، چونکە زانایانی پێشین، بە تایبەت هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، وە (تابیعین) وشەی (نسخ)یان بەکارهێناوە بە چەمك‌و واتایەك، جیا لەو چەمك‌و واتایەی کە دوایی زانایان، پێیان بەکاریان هێناوە، ئەوان وشەی (نَسْخ)یان بەکارهێناوە بۆ تایبەتکردن (تخصیص)ی گشتی (عام)، وە بەنددارکردن (تَقِیید)ی ڕەها (مُطْلَق)، وە ڕوونکردنەوە (تَبیین)ی، کورت (مُجْمَل)، وە بۆ پلەپلەیی (تَدَرُّج)، وە بۆ سووککردن (تَخْفِیف)، کە دوایی هەر کامێك لەوانە بە وێنەیەك ڕوون دەکەمەوە.

ئنجا زانایانی پاشینیش بۆ خۆیان چەمکێکی دیارییکراویان بۆ (نسخ) داناوە، گوتوویانە: (النَّسْخُ: هُوَ إِزَالَة حُكْمٍ سابق بحُكْمٍ لاَحِق)، واتە: لابردنی حوکمێکی پێشترە، بە حوکمێکی دواتر.

ئنجا کە زانایانی پاشین تەماشایان کردوە، زانایانی پێشین وشەی (نسخ)یان بەکارهێناوە، وایانزانیوە هەر بە هەمان واتایە، کە ئەوان پێی بەکاردێنن، نەیانزانیوە کە ئەوانە بە واتایەکی دیکە بەکاریان هێناوە، لەلای وان نەسخ ئەوە نەبووە کە: ئەو ئایەتە، ئەم ئایەتەی نەسخ کردۆتەوەو لای بردوە، بەڵکو مەبەستیان لە نەسخ ئەوە بووە، کە ئایەتی پێشێ حوکمێکی گشتی تێدابووە، ئایەتی دوایی هاتوەو حوکمەکەی تایبەت (تخصیص) کردوە، بە هەندێ لە تاکەکانیەوە.

یاخود ئایەتێك حوکمێکی ڕەهای تێدا بووە، ئایەتێکی دواتر هاتوە، ئەو حوکمە ڕەهایەی بەنددار (مُقیَّد) کردوە، یاخود ئایەتی پێشێ بە کورتی (مجمل)بووە، ئایەتێکی دوایی هاتوە زیاتر ڕوونی کردۆتەوە، یاخود ئایەتی پێشێ تەعبیری کردوە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ئەو حوکمە، ئایەتەکانی دواتر، تەعبیریان کردوە لە قۆناغەکانی دیکە، یاخود ئایەتی پێشێ حوکمێکی ڕاگەیاندوە، ئایەتێکی دواتر هاتوە، حوکمەکەی سووك کردوە.

چەند وێنەیەك لەوبارەوە دێنینەوە:

١/ **تایبەتکردنی گشتی (تخصیص العام)**: بۆ وێنە:

أ - خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقـرة.

واتە: (بە گشتی ڕووی لە مسوڵمانان کردوە) وە لە پێناوی خوادا بجەنگن، دژی ئەوانەی کە شەڕتان پێ دەفرۆشن.

کە هەموو مسوڵمانانی گرتۆتەوەو بە گشتییە، دوایی ئایەتێك هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ ﴿٦١﴾ ﴾النور.

واتە: کەسێك کە کوێرە، وە کەسێکە کە شەلە، وە کەسێك کە نەخۆشە، سەغڵەت ناکرێ (بچێ بۆ جەنگ).

كەواتە: ئەم ئایەتەی دووەم ئایەتەكەی پێشێی تایبەت (تخصیص) كردوە، ئایەتەكەی پێشێ بە گشتی بووەو، ئایەتەكە دوایی تایبەتی كردوە، یانی: كۆمەڵێك خەڵكی هەڵاواردوە: شەلو كوێرو نەخۆش‌و ئەوانەی هەڵاواردوە، كە ئەوانە لەسەریان پێویست نیە بچن بۆ جەنگ‌و جیهاد.

ب - یان لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴿٩٥﴾ ﴾.

واتە: ئەو بڕوادارانەی دانیشتوون (ناچنە جەنگ‌و جیهاد) بێئەوەی كە زیانێك لە جەستەیان دا هەبێ، {بێئەوەی كە پاساوێكیان هەبێ}، یەكسان نین لەگەڵ ئەوانەدا كە بەسەرو ماڵیان لە پێناوی خوادا تێكۆشاون.

كەواتە: ئەگەر كەسێك زیان لە جەستەیدا هەبێ: كوێر بێ، شەل بێ، نەخۆش بێ، ئەوە دیارە ئەو حوكمە نایگرێتەوە.

٢ / بەنددداركردنی ڕەها (تقیید المُطلَق):

شتێك كە بە ڕەهایی هاتبێ، دوایی، بەنددار كرابێ، بۆ وێنە:

خوای پەروەردگار لە شوێنێكی قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴿٣﴾ ﴾ المجادلة .

واتە: ئازادكردنی كۆیلەیەك، بەڵام لە شوێنێكی دیكەدا دەفەرموێ:

﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ﴿٩٢﴾ ﴾النساء.

بڕواداریك ئازاد بكرێ، كەواتە: لەو شوێنەدا كە بە ڕەهایی فەرموویەتی كۆیلەیەك ئازاد بكرێ، بەپێی بنچینەی : (يُحْمَلُ المُطْلَقُ عَلَى المُقَيَّد) ئەوەی كە بە ڕەهایی (مطلق) هاتوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا كە بە بەنددارێی (مقیَّد) هاتوە، تەماشای دەكرێ.

**٣/ ڕوونکردنەوەی کورت (تبيين المجمل):**

واتە: شتێك بە کورتیی هاتوە، بەڵام دوایی خوای زانا زیاتر ڕوونی کردۆتەوە، بۆ وێنە:

خوا ﷻ لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾﴾.

واتە: موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هی خوایە، وە ئەوەی کە لە دەروونتاندا هەیە، ئاشکرای بکەن، یان پەنهانی بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات لەسەری، هەر کەسێك بیەوێ لێی دەبووری، وە هەر کەسێکی بیەوێ، سزای دەدات، وە خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە.

کە ئەم ئایەتە هاتە خوار هاوەڵان سەغڵەت بوون، دوایی ئایەتی ژمارە (٢٨٦) ئەوەی ڕوون کردەوە، کە دەفەرموێ:

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾البقرة.

خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، جگە لەوەی کە لە توانایدا هەیە... .

ئینسان ئەوەی لە توانادا نیە، خولیایەکی خراپ بە دڵی دادێ، بێنەوەی بیەوێ، مادام لە توانای دا نیە غایلەی خراپ بە دڵی داذێو، لە توانای دا نیە

نەهێڵێ بە دڵی دا بێ، خوا لەسەر ئەوە لێی ناپرسێتەوەو سزای نادات، بەڵام لەسەر چی سزای دەدات؟ لەسەر ئەوە کە دڵی خۆی لەسەر بچەسپێنێ.

کەواتە: ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ئەوەی لە دەروونتان دایە دەریبخەن، یاخود ئاشکرای بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەسەری لەگەڵدا دەکات، واتە: ئەگەر کردتان بە بڕیار (عزم)، بەڵام ئەگەر هەروا وەك شتێکی زوو تێپەر، بەسەر دڵتان دابێ، وەك خەیاڵێك، ئەوە گوناه نیەو سزای لەسەر نیە، خوا بە ئایەتی دواتر، ئایەتەکەی پێشێی ڕوونکردۆتەوە.

### ٤/ پلەپلەیی (تـدرُّج):

بۆ وێنە: مەیخۆریی (شرب الخمر)، بە چوار قۆناغو بە پلەپلەیی قەدەغە کراوە:

<u>قۆناغی یەکەم</u>: خوای بەرزی مەزن لە سوورەتی (النحل) ئایەتی ژمارە (٦٧)دا، ئاماژەیەکی سووك دەکات بەوە کە سەرخۆشبوون، خراپەو، مەی خواردنەوە شتێکی خراپە، دەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٦٧﴾.

واتە: لە بەروبوومی دارخورماوترێ (مێو) سەرخۆشکەری لێ دروست دەکەن‌و، ڕزقێکی باشیشی لێ دروست دەکەن {واتە: مێوژو دۆشاوو باسووغ‌و سرکەو... هتد} بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کە بفامن.

کە ئەمە ئاماژەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: لە بەری دارخورماو بەری مێو، دوو شتان دروست دەکەن:

<u>یەکەم</u>: ماددەیەکی سەرخۆشکەر (تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا).

<u>دووەم</u>: ڕزق‌و ڕۆزییەکی باش (وَرِزۡقًا حَسَنًا)، کەواتە: ئەو ماددە سەرخۆشکەرە، ڕزقێکی چاك نیەو خراپە، دیارە ئەوەش لە قۆناغی مەککەدا بووە، کە جارێ خوای پەروەردگار حوکمە شەرعییەکانی نەناردوونە خوارێ، تاکو

بفەرمویٚ: شەراب مەخۆنەوە، نەشدەگونجا لەو قۆناغەدا قەدەغە بکریٚ، بەپێی حیکمەتی خوای زانا، چونکە پێش ئەوەی خەڵك حەڵاڵو حەرامی بۆ دیاریی بکریٚ، دەبیٚ ئیمانو عەقیدەی هەبیٚو، عیبادەتی هەبیٚو، خوای پەروەردگاری ناسیبیٚو، بڕوای بە دوارۆژ بیٚو، بەرچاوی ڕۆشن بووبێتەوە، ئنجا پێی بگوتریٚ: وابکەو وامەکە !.

<u>قۆناغی دووەم</u>: ئەو ئایەتەی کە دەفەرمویٚ : ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ... ﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة.

واتە: دەربارەی شەڕابو قومار پرسیارت لێدەکەن: بڵیٚ گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو، هەندیٚ سوودو کەڵکیشیان تێدا هەن بۆ خەڵکی.

کە ئەمەش ئاماژەیەکی دیکەی بە هێزترە، کەواتە: شەڕابو قومار گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو، هەندیٚ وردە قازانجیشیان تێدا هەن، بەڵام دیسان خوا نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە، بەس ئەوەی زۆر عاقڵو لێزان بووبیٚ، هەر بە ئایەتەکەی سووڕەتی (النحل) کە دەفەرمویٚ: لە تریٚو خورما، ماددەی سەرخۆشکەرو ڕزقێکی باشی لیٚ دروست دەکەن، کەواتە: دیارە شەڕاب، ڕزقێکی باش نیە، هەر ئەوەندە بۆخۆی کەسانێك عەقڵیان بەقوەت بووبیٚ، بەڵگە بووە بۆ ئەوەی خۆیانی لیٚ دووربگرن.

ئنجا کەسێك ئەوەی پێشتریش حاڵی نەبووبیٚ، بە ئایەتی سووڕەتی (البقرة) لێی حاڵی بووە، کە دیارە شەڕابو قومار گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیە.

<u>قۆناغی سێیەم</u>: خوای بیٚ وێنە، لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ... ﴿٤٣﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! توخنی نوێژ مەکەون بەسەر خۆشیی، هەتا دەزانن چی دەڵێن، (چونکە ئینسانی سەرخۆش نازانیٚ چی دەڵیٚ).

ئەمجارەش خوای كاربەجێ نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە بەڵكو فەرموویەتی: بە سەرخۆشیی نوێژمەكەن، ئنجا مادام سەرخۆشیش، تاكو چەند سەعات (وەك سەرخۆشەكان دەڵێن) بەری نادات، مانای وایە بۆیان نەبووە كە لە نێوان نوێژی نیوەڕۆو عەصر، یان شێوانو خەوتنان دا، مەی بخۆنەوە، كەواتە: دوو دەرفەتیان هەبوون:

١) لە دوای نوێژی بەیانی، تاكو نیوەڕۆ دەرفەتێك بووە.

٢) لە دوای نوێژی خەوتنانیش تاكو بەیانی دەرفەتێك بووە.

واتە: خوا ماوەی شەڕاب خواردنەوەی زۆر لێ تەسك كردوونەتەوە، پێش ئەوەی بە یەكجاریی لێیان قەدەغە بكات.

<u>قۆناغی چوارەم</u> : ئەو ئایەتەی سوورەتی (المائدة) بوو كە خوای بالادەست شەڕابو قوماری لەگەڵ بتپەرستیی دا باسكردنو، یەكجاریی لێی قەدەغەكردن، كە دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان شەڕابو قومارو بتو صەنەمەكانو زەلەمەكان {(أزلام): كە بۆ یانسیب بەكاریان هێناوە} پیسن لە كردەوەی شەیتانن، خۆتانیان لێ بە دووربگرن، بۆ ئەوەی سەرفرازبن.

ئنجا نەفامی وا هەیە دەڵێ: خوا لەوێشدا نەیفەرمووە: شەڕاب مەخۆنەوە، بەس فەرموویەتی: خۆتانیان لێ دووربگرن!

بەڵام بێگومان خۆ دوورگرتن زۆر بەقووەتترە لەوەی بفەرموێ: مەیخۆوە، چونكە لێرە كە فەرموویەتی: خۆتانی لێ دووربگرن، واتە: مەیكڕن، مەیفرۆشن، لەو مەجلیسە دامەنیشن كە تێیدا دەخورێتەوە، ڕەفاقەتی ئەوانە مەكەن كە دەیخۆنەوە، خۆ لێ دوورگرتن تەنیا خواردنەوەكەی ناگەیەنێ، بەڵكو زۆر شتی دیكەش دەگەیەنێ، كە هەموویان حەرامن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە.

**٥/ سووك كـردن (تـخـفـيـف):**

ئێمە پێشتـر لە سوورەتی ئەنفالدا هێنـامان، كـە خـوای زاڵو زانـا دەفـەرموێ: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾﴾.

واتـە: ئەگـەر بیسـت كەسـی خۆڕاگرتـان هەبـن، بەسـەر دوو سـەد دا زاڵ دەبـن (لـەوانەی بێبـڕوان)، وە ئەگـەر سـەد كەسـتان هەبـێ، بەسـەر هـەزاردا زاڵ دەبـن، لـەوانەی بێبـڕوان، بەهۆی ئـەوە وە كـە نـافامن.

دوایـی خـوا ﷻ ئـەو حوكمـەی سووك كرد لە یـەك(١) بە دە(١٠) وە، كـردیە یـەك (١) بـە دوو(٢)، فـەرمووی: ﴿ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾الأنفال.

واتـە: ئێستـا خـوا لەسـەری سـووك كـردن، وە زانـی كـە بێهێـزییتـان تێـدایە، ئـەگـەر سـەد (١٠٠)ی خۆڕاگـرتـان هـەبـن {سـەد (١٠٠) جـەنگـاوەری خۆڕاگـر} بەسـەر دوو سـەد (٢٠٠) لـە كـافرەكـاندا زاڵ دەبـن، وە ئـەگـەر هـەزار (١٠٠٠)تـان هـەبێ، بەسـەر دوو هـەزار (٢٠٠٠)دا زاڵ دەبـن، بـە فـەرمانی خـوا، بـە ویسـتی خـوا، وە خـوا لـەگـەڵ خۆڕاگـران دایـە.

كە خـوا فـەرمووی: ﴿ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ﴾.

ئێستـا خـوا لە سەری سووك كـردن زانی بێهێـزییتـان تێدا هـەیـە.

یانـی: وەك حـاڵـەتی پێشـێ نەماون، كە لە ئـاستێكی بەرزی ئیمـانیـیو مەعنـەوییو تۆكمەییو توندو تۆڵییو خۆڕاگریی دابن، كە یەك(١) بە دە (١٠)، بتوانن بـەرەنگاری دوژمنەكانتان ببنەوە، ئێستا كە ئێوە لە ڕووی خۆڕاگرییتانو لە ڕووی مەعنەوییەوە، دابەزیون، تەنیـا یەك (١) بە دە (١٠)تان، لـەسـەر فـەرزە.

ئنجا وەنەبێ ئەو یەك (١) بە دوو (٢)ە، یەك (١) بە دە(١٠)یەکەی نەسخ کردبێتەوە، بەڵکو هەر کاتێك مسوڵمانان هێزو پێزو تۆکمەییو توندو تۆڵییان هەبوو، وە لە خۆیان ڕا بینی، با یەك (١) بە [redacted] (١٠) لە بەرانبەر دوژمن دا بوەستن، بەڵام کە هەستیان کرد بێهێزن ، با یەك (١) بە دوو (٢) بەرەنگاری دوژمنیان ببنەو[redacted] ئنجا بێگومان مەرجیش نیە، تەنیا یەك (١) بە دوو (٢)، یان یەك (١) بە [redacted] (١٠) بێ !

نەخێر بەڵکو جاری وایە لە دژی نۆ (٩) بەرانبەریان دەوەستن، یان هەشت (٨) بەرانبەریان، حەوت (٧)، شەش (٦)، پێنج (٥)، سێ (٣)، هەتا دەگاتە دوو (٢)، بەڵام هیچ کاتێك مسوڵمانان نابێ لە بەرانبەر دوو (٢) هێندەی خۆیان، یان کەمتردا پشت لە دوژمن بکەن، واتە: ئەگەر هێزێکی مسوڵمانان لە بەرانبەر هێزێکی کافراندا، کە بە ئەندازەی خۆیان بوون، یاخود تاکو دوو (٢) بەرانبەریان بوون، با لە حاڵەتی بێهێزییش دابن، نابێ پشتیان تێ بکەن، بەڵام ئەگەر سێ (٣) بەرانبەرو چوار (٤) بەرانبەر زیاتر بوونو، ئەوانیش لە حاڵەتی بێهێزیی دابوون، ئەوە وەك زانایان گوتوویانە: لەو کاتەدا بۆیان هەیە بەرەنگاریان نەبنەو[redacted] حوکم سووك کردنەکە، وە نەبێ ئەوەی پێشێی لابردبێ، بەڵکو ئەوەی کە یەك (١) بە دە (١٠)یە، لە هەلو مەرجێکدا بووە، ئەوەش کە یەك بە دوو (٢)ە {حوکمە سووکەکە} ئەویش لە هەلو مەرجێکی دیکەدایە.

کەواتە: پێویست ناکات باسی نەسخ بکەین.

## قسەی کۆتایی دەربارەی ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة)

لە کۆتایی باسو خواسمان دا دەربارەی ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة)، کە بە ناهەق بە ئایەتی شمشێر ناوزەد کراوە، دەڵێین: هەندێ لە زانایان گوتوویانە: ئەو ڕایەش ڕێی تێدەچێ، کە بگوترێ: ئەو بڕیارەی کە دراوە، ئەگەر ئایەتەکە بیگەیەنێ {کە من پێم وایە ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ، وەك باسمان کرد، وە خوای دادگەر ئیعلانی جەنگی بەرانبەر بە هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران نەکردوە، بەڵکو تەنیا بەرانبەر بەوانە، جاڕی جەنگ دراوە، کە پەیمانیان هەبووەو

پەیمانەكەیان هەڵوەشاندۆتەوەو پێوەی پابەند نەبوون، خوای كارزان تەنیا باسی ئەوان دەكات، بەڵام ئەوانەی كە پەیمانیان نەبووە، باسی نەكردوون، وە ئەوانەش كە پەیمانیان هەبووەو پێوەی پابەند بوون، خوای كاربەجێ هەڵیواردوون‌و فەرموویەتی: ئەوانە پەیمانەكەیان لەگەڵ بەرنەسەر} . بەڵام دەشگونجێ بگوترێ: كە نیوە دورگەی عەرەبیی، چونكە بۆتە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامیی، وەك حاڵەتێكی تایبەت، حوكمێكی تایبەتی بۆ دەركراوە، كە لە نیوە دوورگەی عەرەبیی دا جگە لە هێزی ئیسلام، هیچ هێزێكی دیكە نەمێنێ.

بەڵام وەك گوتم: ئایەتەكە ئەوە ناگرێتەوە، وە ئەوە تەنیا ڕای هەندێك لە شەرعزانانە، وە دیارە بۆشمان نە گێڕدراوەتەوەو، هیچ ڕیوایەتێك نیە كە هیچ هێزێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان گوتیبێتیان: ئێمە مسوڵمان نابین، كەچی مسوڵمانان بە زۆر مسوڵمانیان كردووین !! بەڵكو هەموویان بۆ خۆیان هاتوون‌و، مسوڵمان بوون.

ئنجا ئەگەر بەڕاستیان بووبێ‌و، ئەگەر بە درۆیان بووبێ، گرنگ ئەوەیە ئیسلام نەهاتوە ناچاریان بكات، وە ئەم ئایەتەش كە ناوی لێنراوە: ئایەتی شمشێر، لە دژی هیچ كەسێك بەكارنەهێنراوە، لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، كە بگوترێ: خوا ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوەو وەرە ! یان مسوڵمان بە، یان دەتكوژین !! چونكە ئەوە لەگەڵ عەقڵ دا ناگونجێ، وەك پێشتر باسمان كرد، وە پێچەوانەی كۆمەڵێك ئایەتی قورئانە . وە پێچەوانەی سیرەو سوننەتی كردەیی پێغەمبەری خواشە ﷺ.

هەر لەوبارەوە، فەرموودەیەك هەیە كە لەگەڵ ئایەتی شمشێردا، باس دەكرێ، وەك من لە باسێكی تایبەت دا دەربارەی (جەنگ‌و جیهاد) كە لە سەرەتای سوورەتی (الأنفال)ەوە دامانا، باسم كردوەو لێرەش دەیهێنین: ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٢٤)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٣٦)} .

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوای لێیان ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە: جەنگ لە دژی خەڵك بکەم، تاکو شایەتمان دێنن، کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، وە کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە نوێژ بەرپا بکەنو زەکات بدەن، ئنجا ئەگەر ئەمەیان کرد، ئەوە ماڵو خوێنی خۆیان لە من پاراستوە، مەگەر بە هەقی ئیسلام، وە لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە !

ئنجا هەندێك گوتوویانە: ئەم فەرمایشتەش لەگەڵ ئەو ئایەتی ژمارە (٥)ی سووڕەتی (التوبة)دا تێك دەکاتەوە! منیش دەڵێم: پێشتر باسی ئایەتەکەمان کرد، ئەم فەرمایشتەش، وەك لە شوێنی دیکەشدا گوتوومانە، باسی ئەوە دەکات: کە من فەرمانم پێکراوە: تەنیا هەتا ئەو سنووڕە لە دژی خەڵك بجەنگم، تاکو شەیەتمان دێنن، بە وەحدانیەتی خوا لە پەرستراوێتیی دا، بە ڕەوانەکراوێتیی موحەممەد ﷺ وە نوێژ بەرپا دەکەنو زەکات دەدەن، واتە: ئەگەر ئەوەیان کرد هیچ هۆی دیکە نیەو، نابێ لەسەر شتی دیکە لە دژیان بجەنگین.

بەڵام بێگومان لەم فەرمایشتەدا نەهاتوە، کە هەر کەسێك کە لەگەڵیدا ڕووبەڕووبوومەوە، لە کافران بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم، بەڵکو مەبەست پێی ئەو خەڵکانەیە کە سەنگەر لە دژی ئیسلام دەگرن، ئەوانەی کە ئامادە نین کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، تەبا بن، چ بە شێوەی سەرانە دان، چ بە شێوەی بێلایەنیی دەربڕین، چ بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان، واتە: کە دەفەرموێ: {أن أُقاتل الناس} وشەی (الناس) خەڵکێکی تایبەتن، واتە: ئەو خەڵکانەی کە دژایەتیی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکەن، ئەدی ئەگەر دژایەتیی دەوڵەتی ئیسلامییان نەکرد؟ ئەگەر دژایەتییان نەکرد، دروست نیە جەنگیان لە دژ بکرێ، چونکە جوولەکەو نەصرانییش هەر خەڵك (الناس)ن، بەڵام سەرانەیان لێوەردەگیرێ، هەروەها موشریکەکان: ﴿وإذا لقيت عدوك للمشركين﴾ وەك باسمان کرد: سەرانەیان لێ وەردەگیرێ، هەروەها مەجووس: سەرانەیان لێوەردەگیرێ، وە هەڵگەڕاوەکان (مرتدين)، سەرانەیان لێ وەردەگیرێو... هتد.

کەواتە: ئەو خەڵك (الناس)ە، خەڵکێکی تایبەتن.

دەتوانین بڵێین: ئەو فەرموودەیە کورتە (مجمل)ەو درێژەو (تفصیل)ەکەی لە فەرموودەکەی (مسلم) : ﴿واذا لقیت عدوك للمشركین﴾و فەرموودەکانی دیکەو لە سوننەتی کردەیی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، کە ئەگەر بێبڕوایانی شەڕفرۆش، نەهاتنە نێو ئیسلامەوە، پێویستە سەرانە (جزیة) بدەن، یان بە هەر شێوەیەك بێ، دەبێ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا ڕێك بکەون، وە دەوڵەتی ئیسلامیی قەناعەتیان پێ بکات، کە لەگەڵیدا تەباو گونجاو دەبن، وە شەڕی پێ نافرۆشن‌و دژایەتیی ناکەن.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾.

خوای میهرەبان باسی حاڵەتێکی تایبەت دەکات، بە نسبەت مامەڵەکردن لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران دا، دەفەرموێ: ئەگەر یەکێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان داوای پەنادانی لێکردی، پەنای بدە، بۆئەوەی گوێی لە فەرمایشتی خوا بێ، دواییش بیگەیەنە شوێنی دڵنیایی خۆی، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە نازانن.

جاری ڕستەی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، یانی: هەر کامێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەڵبەتە لێرەدا ڕووی قسەی لە موشریکەکان‌و کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەرە ﷺ، چونکە ئەوانەی کە لە دەوروبەری بوون، هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، ئەگەرنا ئەوە هەموو کافرێك دەگرێتەوە، هەموو کافرێك مافی ئەوەی هەیە لە دەوڵەتی ئیسلامیی داوای پەنادان بکات، تاکو بێ لە ئیسلام حاڵی بکەن، با بزانێ قورئان چی دەفەرموێ؟ هەموو کاتێك خوای بەخشندە ئەو مافەی پێداون، بەڵام کە تەنیا باسی موشریکان دەکرێ، لەبەر ئەوەیە لەو کاتەدا زیاتر مامەڵە لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا هەبووە، کە دەفەرموێ: ﴿ٱسْتَجَارَكَ ﴾، یانی: داوای پەنادان لێکردی، دەڵێ: (جار)، بە مانای دراوسێ‌و، بە مانای نیزیك دێ، ئنجا (مُجِیر)، کەسێکە کەسێکی دیکە لە

پەنای خۆی دەگرێ، یاخود لە خۆی نیزیكی دەخاتەوە، كەواتە: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ﴾، داوای دراوسێیەتیی‌و، نیزیكیی لێكردی، داوای پەنادانی لێكردی، ﴿فَأَجِرْهُ﴾، پەنای بدە، داڵدەی بدە، ئنجا بۆچی داوای پەنادان‌و نیزیكی دەكات؟

﴿حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾، هەتاكو گوێی لە فەرمایشتی خوا بێ، یانی: لە ئیسلام تێبگاو بەرچاوی ڕۆشن بێتەوە.

لێرەدا زانایان مشتومڕی زۆریان كردوە لە تەفسیرەكاندا، لەبارەی ﴿كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾، ئایا ئەم قورئانەی كە لەبەردەستمان دایە، كە بەڵێ فەرموودەی خوا ﴿كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾یە، بەڵام ئایا ئەم: ﴿كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾یە دروستكراو (مخلوق)ە، یان دروست نەكراوە؟

كاتی خۆی كێشەو مشتومڕی زۆریان لەسەر ئەوە بووە، ئایا قورئان دروستكراو (مخلوق)ە، یاخود دروستكراو (مخلوق) نیە؟

بە تەئكید ئەو ماناو مەبەستانەی لە قورئان دان، لە (مصحف) دان، ئەوە فەرمایشتی خوایەو سیفەتی خوایە، سیفەتی خواش دروستكراو نیە، بەڵام بە تەئكید ئەو مەرەكەب‌و كاغەزەی كە ئەو موصحەفەی لێ پێكهاتوە، دیارە ئەوە مرۆڤ دروستی كردوە، بەڵام ئەمە مانای وانیە، كە قورئان دروست كراوە، بە هەر حاڵ مشتومڕێك بووە كە كاتی خۆی، زۆر زانا لەسەر ئەوە تاقی كراونەوە، كێشەیەكی گەورە لەسەر ئەوەبووە، كە بە ڕاستیی سەرئێشەیەك بووە، كێشەو گرفتێك بووە، مسوڵمانان زۆر جاران لە بەر بێئیشیی، ئەو كێشەو گرفتانەیان بۆخۆیان دروست كردوون!

ئەگەرنا لە سەردەمی سەلەفی صاڵح دا، واتە: لە سەردەمی هاوەڵان‌و شوێنكەوتووان (تابعین)دا ئەو شتانە نەبوون، دوایی ئەو جۆرە بیرۆكانە

پەیداكراون، كە بوونەتە مایەی سەرقاڵیی مسوڵمانان، وە لە جیاتی ئەوەی زۆر شتی دیكەی كە پێویست بووە، پێیانەوە سەرگەرمو سەر قاڵ بن، بەو مەسەلە لاوەكییانەوە سەرقاڵ كراون، ئەگەرنا مادام قورئان سیفەتی خوایەو سیفەتی خواش وەك خوا وایە، وە خوای پەروەردگار بەدیهێنەرەو، بێ سەرەتاو بێ كۆتاییە، سیفەتەكانیشی وەك زاتی وان.

بەڵام هەندێك لە حەنبەلییەكان لە كاردانەوەی موعتەزیلە كە گوتوویانە: قورئان دروستكراو (مخلوق)ە، ئەوان گوتوویان: نەخێر، ئەو پەڕەش كە تێیدا نووسراوەو، مەرەكەبەكەش كە پێی دەنووسرێ، ئەوەش هەر دروستكراو (مخلوق) نیە!! كە ئەوەش دیارە قسەیەكی تێپەڕێنەرانەو عاتیفییەو كەس نایسەلمێنێ، چونكە دەقو واتای قورئان كە لەنێو موصحەف دایە، سیفەتی خوایەو هەر بەو تەعبیرانەش خوا بە جبریلی فەمووە، جبریل (علیه الصلاة والسلام)یش گەیاندوویەتی بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بە هاوەڵانی فەرمووەو ئەوانیش نووسیویانەتەوەو لەبەریشیان كردوە، بەڵام پێستەكەی كە كاتی خۆی تێیدا نووسراوەو، ئێستا كاغەزەكەی‌و، مەرەكەبەكەی، كە پێی نووسراوەتەوە، بە تەئكید ئەوانە دروستكراوی خوان‌و، بەندەكان سازیان كردوون‌و دروستیان كردوون.

ئنجا كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ﴾، دوایی بیگەیەنە جێگای دڵنیایی خۆی، جاری وایە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرە، دەستبەجێ قەناعەتی بە ئیسلام نایەت‌و، دەڵێ: بەڵێ، گوێم لە قورئان گرت، ئەوە زانیم چۆنە، بەڵام بڕوای پێناكەم، ئایا حوكمی چییە؟

وەڵام: دەبێ بگەیەنرێتەوە جێی خۆی!

ئنجا هەر ئەمە بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە، كە ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة) كە ناویان ناوە: ئایەتی شمشێر، مانایەكەی بەو شێوەیە نیە، كە ئەوان لێیان وەرگرتوە، ئەوەتا كافرێك كە داوای پەنادان دەكات‌و، دەیەوێ لە قورئان تێبگات‌و لە ئیسلام تێبگات، هەرچەندە قەناعەتیشی پێ ناكات، بەڵام

خـوا پێغـەمبـەر ﷺی، وە ئـەو کەسـەی کـە لـە جیـاتی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ دەبێتـە حوکمـڕانی مسوڵمانـان، مولـزەم کـردوە، بیگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی.

ئنجـا لـەوبارەوە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ئـەم فەرموودەیـەی هەیـە: ﴿مَنْ أَمَّنَ رَجُـلاً عَلَى دَمِـهِ، ثُمَّ قَتَـلَهُ، فَأَنَـا بَـرِيءٌ مِـنَ الْقَاتِلِ، وَإِنْ كَـانَ الْمَقْتُولُ كَـافِرًا﴾ {أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُد الطَّيـالِسي، بـرقم: (١٢٨٥)، وَالبُخَـارِي، فـي (التـأريخ)، وَالبَيْهَقِـي، فِي (الصُّغْرَى) برقم: (٣٦٨١)، وَفِي (الكُبْرَى) برقم: (١٨٨٨٨)، وَالبَزَّار، بـرقم: (٢٠٢٤)، وَابْنُ حِبَّان، بـرقم: (٥٩٨٢)، وَعَبْدالرزّاق فِي (المُصَنَّف) بـرقم: (٩٦٧٩)، وَالطَّبَرَانِيّ فِـي (مُسْـنَد الشَـامِيين) بـرقم: (٢٤٤٨) عَـنْ عَمْـرِو بْـنِ الْحَمِـقِ رضي الله عنه، قـال شـعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ} .

واتـە: هـەر کەسـێك پیـاوێك دڵنیـا بکاتـەوە، لەسـەر ئـەوەی کـە نـایکـوژێو ئـەمانی پێبـدات، دوایـیش بیکـوژێ، ئـەوە مـن بەرییـم لـەو بکـوژە، بـا ئـەو کـوژراوەش کـافـر بـێ.

کەسانێك با کافریش بن، مادام ئـەمانـت پێدان، دەبـێ لەگەڵیـان ڕاسـت بکەی.

ئنجا خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡلَمُونَ﴾، ئەویش بەهۆی ئـەوەوە، کـە ئـەوانە کـۆمەڵێکـن، نـازانن، واتـە: مـادام نـازانن‌و نەشـارەزان، ئێـوە دەبـێ شارەزایـان بکـەن‌و بەرچاویـان ڕوون بکـەنەوە، ئنجـا ئـەو کاتـە قەنـاعـەتیـان هـات، باشـە، قەنـاعـەتیـان نەهـات، ئـەوە: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴿٢٥٦﴾﴾ البقـرة، تۆبزیی کـردن لـە دینـدا نیـە.

هـەڵبەتـە ئـەمە ئـەوەشی لێوەردەگیـرێ، کـە بەبـێ زانیـاریی، شوێنکـەوتنی ئـایـین دروست نیـە، چونکـە خـوا دەفـەرموێ: بـا ئـەو هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرانـە بێـن، پـەنـایـان بدەن، گوێ لـە فـەرمایشتی خوا (کلام الله) بگـرن، چونکە نـازانن، کەواتـە: کەسێك ئـایین‌و بەرنامـەی خـوا نەزانـێ، لـە ڕیـزی کـافرانـدایـە! وە بۆیـە زانـایـان لـەم ئـایـەتـە، هـەڵیـانـهێنجـاوە دەڵێـن: لاسایی کـردنەوە (تقلیـد)، دروسـت نیـە، بەتـایبـەت لـە بنچینەکـانی دینـدا، لـە ئیمـان‌و عەقیـدەدا لاسـایی کـردنەوە

دروست نیە، بۆت نیە بڵێی: دەزانم خوا هەیە، چونکە مامۆستان فلان وا دەڵێ، یان دەزانم پێغەمبەر ﷺ راستە، چونکە لە فلان کتێب دا باسکراوە، یان دەزانم زیندووبوونەوەو پاداشتو سزا هەیە! چونکە فلان زانا وای گوت، ئەوە هەمووی لاسایی کردنەوەیەو دروست نیە، دەبێ بۆخۆت بزانی، بەڵگەکانی بوونی خوای پەروەردگار، وە بەڵگەکانی راستیی پێغەمبەر ﷺ، وە بەلگەکانی راستیی قورئان، دەبێ بایی ئەوەندە خوا بناسیو، پێغەمبەر ﷺ بناسیو، قورئان بزانیو، عەقڵی خۆت بەکاربێنی، کە بە بەڵگەی عەقڵییو نەقڵیی، ئیسپاتی بنچینەکانی ئیمانو عەقیدەی خۆت بکەی.

بەڵکو هەندێ لە زانایان دەڵێن: لە لقەکان (فروع)ی دینداریيشدا (تقلید) دروست نیە، کە ئەمە پێم وایە جۆرێکە لە زێدەڕۆیی، بەڵێ هەموو مسوڵمانێك لەسەری پێویستە تەنانەت لە کردەوەکانیشدا، نەك هەر لە ئیمانو عەقیدەدا، بە دوای بەڵگەی شەرعییدا بگەڕێ، وە بۆ هەموو شتێك بزانێ بەڵگە شەرعییەکەی چیە؟ بەڵام ئەگەر کەسێك لە توانای دا نەبوو، دروستە.

وە زانایان بەگشتی لاسایی کردنەوە (تقلید)یان بە دروست زانیوەو، (تقلید)یش بریتیە لە: (أَخْذُ القَوْلِ بِدُونِ مَعْرِفَةِ دَلِيلِهِ)، قسەیەك لە کەسێك وەربگری، بەبێ ئەوەی بزانی بەڵگەی چییە، ئەگەرنا ئەگەر تۆ بزانی بەڵگەکەی چییە، یان لەبەرئەوەی بە بەڵگەکەی قەناعەتدار (مُقْتَنِع)ی، بە دوای دەکەوی، ئەوە (تقلید) نیە، بەڵکو ئەوە شوێنکەوتن(إتِّباع)ە، وە ئەگەر خۆشت بتوانی حوکمەکەو بڕیارەکە هەڵهێنجی لە قورئانو سوننەت، ئەوەش کۆشش کردن (إجتهاد)ە، کەواتە: ئێمە سێ حاڵەتمان هەن لە مامەڵەکردن لەگەڵ شەریعەتدا:

یەکەم: کۆشش کردن (إجتهاد)ە: کە ئینسان خۆی هەوڵبدا لە قورئانو سوننەت، ئەو حوکمانە لێ هەڵهێنجێ، کە دینداریی خۆی بەوانە ئەنجام دەدات، ئەوە حاڵەتی باشترینە.

دووەم: بریتیە لە شوێنکەوتن (إتباع): ئەگەر خۆشی نەتوانێ کۆشش بکات، تەماشای قسەی زانایان بکاتو لە قسەکانیان تێبگاتو لە بەڵگەکانیان تێبگات، وە بۆیە بە دوای شافیعیی دەکەوێ لەو مەسەلەیەدا، وە لە

مەسەلەیەکی دیکەدا بە دوای ئەبو حەنیفە دەکەوێ، وە لە مەسەلەیەکی دیکەدا، بە دوای مالیك، یان سوفیانی ئەوریی، یان ئەحمەد دەکەوێ، چونکە بە بەڵگەی ئەو لەو مەسەلەیەدا موقتەنیعە، ئەگەر وابێ، ئەو کاتە شوێنکەوتوو (متبع)ە، واتە: شوێن بەڵگە کەوتوە.

سێیەم: بریتیە لە لاسایی کردنەوە (تقلید): ئەویش ئەوەیە کە شوێن قسەی کەسێك بکەوی، بەبێ ئەوەی بەڵگەکەی بزانی، (تقلید)یش لە چییەوە هاتوە؟ لە (قِلادة)وە هاتوە.

(قَلَّدَهُ، يُقَلِّدُهُ)، (قِلادَة) ش: ئەو ڕێشمەو پەتکەیە کە لە ملی ئاژەڵێکی دەکەی‌و ڕایدەکێشی!!

بۆیە دەبێ مسوڵمان ئەگەر زۆرزۆر ناچار نەبێ، حاڵەتی لاسایی کردنەوە (تقلید) لە خۆی نەوەشێنێتەوە، وە خوای پەروەردگار زۆر سەرزەنشتی کافرەکانی کردوە، کە گوتوویانە : ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ٢٢﴾ الزخرف.

واتە: ئێمە باب‌و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێك دیوە، وە هەر لەسەر ڕێی وان دەڕۆین‌و، ئەوان دەکەینە سەر مەشق.

بەبێ ئەوەی ئەوان لەسەر هەق بن، ئەوە دیارە عادەتی کافرو موشریکەکانە‌و، مسوڵمان نابێ لە خۆی بوەشێنێتەوە.

مەسەلەی حەوتەم: کە دەفەرموێ: ﴿كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧ كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ

قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

زانایان دەڵێن: لێرەدا ئەم سەرلێسوڕماندن (تَعْجیب)ە، مانای نەفی دەگەیەنێ، خوا دەفەرموێ: چۆن دەبێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، پەیمانیان لەلای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ، لە حاڵێکدا کە پابەند نین بە پەیمانەکانیانەوە؟! چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، جگە لەوانەی کە لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، ﴿فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ﴾، ئنجا هەتا ئەوان ڕاوەستاو بن لەسەر بەڵێنو پەیمانەکەیان، ئێوەش ڕاوەستاو بن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆشدەوێ، واتە: ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە پەیمان شکاندن.

دوایی دووبارەی دەکاتەوە، ﴿ كَيْفَ ﴾، واتە: چۆن دەبێ؟! ڕستەکە دووبارە ناکاتەوە، بفەرموێ: ﴿يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ ﴾، ﴿ كَيْفَ ﴾، چۆن دەبێ پەیمانیان لەگەڵ خواو پێغەمبەردا هەبێ، ﴿وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەگەر زەفەرتان پێ بەرنو کەلێنتان لێ ببیننەوە، وە دەرفەتتان لێ ببینن، ڕەچاوی هیچ خزمایەتییو بەڵێنو پەیمانێك لەگەڵ ئێوەدا ناکەن.

بۆیە نابێ پەیمانیان هەبێ لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ، لەبەر ئەوەی پابەند نین بە هیچ شتێکەوە، نە ڕەچاوی خزمایەتیی دەکەن، نە هی پەیمان دەکەن، نە هی هیچ شتێك دەکەن، بۆیە ئەوانە نابێ پەیمانیان هەبێ.

ئەگەرنا ئەوانەی ڕەچاوی پەیمانەکەیان دەکەنو، پابەندن بە پەیمانەکەیانەوە خوای کارزان لەسەر مسوڵمانانی فەرز کردوە، کە پەیمانەکەیان لەگەڵ بەرنەسەر، ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ﴾

وە لە ئایەتی ژمارە (٤) هەر ئەم سوورەتەدا دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـًٔا وَلَمۡ يُظَـٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ۝٤ ﴾.

کەواتە: بۆ ئەوەی مانایەکی ڕاستو دروستمان دەربارەی تێگەیشتنی ئایەتەکان دەست بکەوێ، دەبێ هەموو ئایەتەکان بەیەکەوە سەرنج بدەین، تاکو دووچاریی تێگەیشتنو بۆچوونێکی هەڵە نەبین، دەربارەی چەمکی ئایەتە موبارەکەکان، کە خوای پەروەردگار ئەو مەبەستو مانایەی ئەویستوە.

ئنجا بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە کە لە مەسەلەی حەوتدا هێنامانن: ﴿ كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَـٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ۝٧ كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلًّا وَلَا ذِمَّةًۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَـٰسِقُونَ ﴾

(طبري) دەڵێ: (مَعْنَاهُ: لاَ عَهْدَ لَهُمْ، وَأَنَّ الوَاجِبَ عَلَى الـمُؤْمِنِين قَتْلُهُمْ حَيْثُ وَجَدُوهُمْ، إلاَّ الَّذِينَ أَعْطوا العَهْدَ عِنْدَ الـمَسْجِدِ الحرَام مِنْهُمْ، فَإِنَّ اللهَ جَلّ ثَنَاؤُهُ أَمَرَ الـمُؤْمِنِين بالوَفَاءِ لَهُـمْ بعَهْدِهِم، وَالإِسْتِقَامَةِ لَهُـمْ عَلَيْـهِ، مَـا دَامُـوا عَلَيْـهِ لِلْمُؤْمِنِين مُسْتَقِيمِين)[١].

واتە: مانای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ئەوەیە: کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان هیچ پەیمانیان نیە، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺو لەگەڵ مسوڵمانانـدا، وە لەسەر بڕواداران پێویستە بیانکوژن، لە هەر شوێنێك بەرپەلیان کەوتن، مادام ئەوانە لەسەر دژایەتییکردنی ئیسلامو مسوڵمانان سوورن، جگە لەوانەی کە

---

١) جامع البیان، ج ٦، ص ٨٦.

پەیمانیان داوە، لەلای مزگەوتی حەرام، ئەوە خوا ستایشی هەر بەرز بێ، فەرمانی بە بڕوداران کردوە، کە بەڵێنەکەیان و پەیمانەکەیان لەگەڵ بەرنەسەرو پێی وەفادار بن، وە لەسەری ڕاوەستاو بن، مادام ئەوان لەگەڵ بڕواداراندا، ئەو پەیمانەیان ڕێك و ڕاست ڕادەگرن.

ئنجا چەند قسەیەك دێنێ دەربارەی ئەوانەی کە لە لای مزگەوتی حەرام پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانان دا بەستوە، وە ڕێك وەستاویشن، دوایی دەڵێ:

(وَأَوْلَى هَذِهِ الأَقْوَالِ بالصَّوَابِ عِنْدِي، قَوْلُ مَنْ قَالَ: هُمْ بَعْضُ بَنِي بَكر مِنْ كِنَانَةِ، مِمَّنْ كَانَ أَقَامَ عَلَى عَهْدِهِ، وَلَمْ يَكُنْ دخل فِي نَقْض مَا كَانَ بَيْنَ رَسول الله ﷺ وَبَيْنَ قُرَيْش يَوم الحُدَيْبِية)[1].

دەڵێ: نیزیکترین قسە لە ڕاستییەوە، بە لای منەوە، قسەی ئەو کەسەیە کە گوتوویەتی: مەبەست لەوانە هەندێك لە بەنی بەکرن لە کینانە، (دیارە بەنی بەکر تیرەیەك بوون لە هۆزی کینانە)، لەوانەی کە لەسەر پەیمانەکەیان بەردەوام بوون، وە لە ڕیزی ئەوانە دانەبوون، کە ئەو پەیمانەیان هەڵوەشاندۆتەوە، کە کاتی خۆی لە حودەیبییە لە ساڵی شەشەم لە نێوان پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانان لە لایەك، وە قورەیشییەکان لە لایەکی دیکەوە بەسترا، {ئەو پەیمانەی کە لەو کاتەدا، بەنو بەکر بوونە هاوپەیمانی قورەیش، خوزاعەش بووە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ}.

دیارە هۆزی بەنو بەکریش بۆخۆیان چەند بەشێك بوون، هەندێکیان ئەوانەی کە پابەند بوون بە پەیمانەکەیانەوە، لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانیان بەستوە دیارە دەبێ پەیمانەکەیان لەگەڵ مسوڵمانان دا بردبێتە سەر.

کەواتە: هەموو ئەو ئیعلانی جەنگ و بەرائەت و دووریی دەربڕینە، بەرانبەر بەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەیە، کە پابەند نەبوون بە بەڵێن و پەیمانەکانیانەوە، وە وشەی: ﴿ كَيْفَ ﴾ کە دووجاران دووبارە بۆتەوە، ﴿ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ ﴾ دوایی دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ ﴾، واتە: چۆن؟

١) هەمان سەرچاوە ، ج ٦، ص ٨٦.

دەڵێ: (تَعْجِيبٌ مَعْنَاهُ النَّفِي)، ئەوە سەرسووڕماندنە، بەڵام مەبەست پێی نەفی كردنە، واتە: نابێ شتی وا ببێ، یەكێك ئاوێك دەخواتەوە، تۆش پێت پاك نیە، پێی دەڵێی: (كَيْفَ تَشْرَبُ هَذَا المَاءَ؟) چۆن ئەم ئاوە دەخۆیتەوە؟!

یانی: بە سەرسووڕمانەوە وا دەڵێی‌و، مەبەستت پێی سەرسورمانە بە ڕواڵەت، بەڵام لە ڕاستیی دا مەبەستت پێی نەخواردنەوەیەتی، بۆیە، دەڵێ: ﴿ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ ﴾، چۆن دەبێ هەیان بێ، واتە: دەبێ نەیانبێ، كەسانێك پابەند نەبن بە پەیمانەوە، حورمەتی بەڵێن‌و پەیمانیان نەگرن، نابێ لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا، پەیمانیان هەبێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ ﴾، یانی: (يَغْلِبُوكُمْ)، واتە: بەسەرتاندا زاڵ بن، یان دەرفەتتان لێ ببینن، كەلێنتان لێ ببینن، ﴿ لَا يَرْقُبُواْ فِيكُمْ ﴾، ﴿ لَا يَرْقُبُواْ ﴾، وشەی (رَقَبَ) واتە: چاودێریی كرد، پاراستی، (رقیب)، واتە: ئەو كەسەی كە چاودێریی شتێك دەكات‌و دەیپارێزێ.

﴿ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾، ﴿ إِلًّا ﴾، (إلّ) كە پێشتر باسمان كرد، واتە: خزمایەتیی ﴿ ذِمَّةً ﴾، واتە: پەیمان‌و بەڵێن.

بۆیەش خوای دادگەر لە وەسفیاندا دەفەرموێ: ﴿ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ ﴾، بە زاریان ڕازیتان دەكەن، بەڵام دڵیان ناڕازییە، وە ﴿ وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾، وە زۆربەشیان لاڕێن.

ئنجا ئێمە لێرەدا چوار هەڵوەستە دەكەین:

<u>هەڵوەستەی یەكەم</u> : بۆیە خوای پەروەردگار ئاوا ناخی ئەو دوژمنانە بۆ ئەهلی ئیسلام، ئەو كاتەو ئێستاش دەخاتە ڕوو، چونكە دیارە بەشێك لە هاوەڵان بە قسەی خۆش‌و بۆش‌و شیرین‌و ڕازاوەی كافرەكان فریویان خواردوە،

بۆیە خوا ئاگاداریان دەكاتەوە، كە ئێوە تەماشای قسەی زاریان مەكەن، تەماشای رەفتارو كرداریان بكەن، وە بزانن كە ئێوە تەنیا قسەی زاریان دەبیستن، بەڵام خوای پەنهانزان، نێو دڵیشیان‌و نیازو مەبەستی نێو دڵ‌و ناخیشیان دەبینێ، بۆیە ئاگادارتان دەكاتەوە، ﴿يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ ﴾.

بە زاریان رازیتان دەكەن، بەڵام دڵیان ناڕازییە، كێ دەزانێ دڵیان چی تێدایە؟ تەنیا خوا ﷻ.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u> : مسوڵمان بەگشتی لەبەرئەوەی بۆخۆی ساغ‌و صافە، هەرواش تەماشای خەڵكی دەكات، بە زۆریی وایە ئینسان لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ، قیاسی خەڵك لەسەر خۆی دەكات.

دەڵێن: كابرایەك لە دێیەكەوە هاتوە لێیان پرسیوە: ئەرێ خەڵكی ئەو دێیە چۆنە؟

گوتوویەتی: هەموویان ئینسانی باشن، خراپیان تێدا نیە، یەكێكی دیكەش هەر لەو دێیەوە هاتوە، لە ویشیان پرسیوە: خەڵكی ئەو دێیە چۆنە؟

گوتوویەتی: هەموویان خراپن، دیارە ئەوەی پێشێ ئینسانێكی باش بووە، وایزانیوە خەڵك هەمووی باشە، چونكە بۆخۆی باشە، وایزانیوە هەموو خەڵك باشە، ئاگای لە خراپەی خەڵك نەبووە، بۆخۆی هەر خەریكی چاكە بووە، لەگەڵ چاكانیش تێكەڵ بووە، ئاگای لە خراپەی خراپەكاران نەبووە، ئەوەی دووەمیشیان: لەوە دەچێ بۆخۆی خراپ بووبێ‌و، لەگەڵ خراپانیش تێكەڵ بووبێ، وایزانیوە خەڵك هەمووی خراپە!

بۆیەش خوای زانا ناخی كافرەكان دەردەخات بۆ مسوڵمانان.

هەڵبەتە وەك چۆن هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان‌و كافرەكانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ رەچاوی خزمایەتیی‌و بەڵێن‌و پەیمانیان نەكردوە، ئائەوە سیفەتی كافرانە بە گشتی: مەگەر چۆن، ئەگەرنا بە زۆریی وایە، لەگەڵ مسوڵماناندا بێ بەڵێن‌و بێ پەیمانن، وە ئەهلی غەدرن، دەبێ مسوڵمان دڵنیا نەبن لێیان، بۆیەش مسوڵمانان بەلای دڵسافیی دان، چونكە ئەوانەی كە بۆخۆیان ساغ‌و صافن، وادەزانن خەڵكیش وەك وانە، وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ ...﴿١١٩﴾﴾.

واتە: ئەوەتا ئێوە ئەوانتان خۆشدەوێ، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆشناوێ، وە ئێوە بڕواتان بە هەموو کتێبەکانی خوا هەیە، کەچی ئەوان بڕوایان بە کتێبی ئێوە نیە، (کە مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکانە، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە).

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u> : ئنجا خوا ﷻ نەیفەرموە: هەموویان لاڕێن، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾، زۆربەیان، لادەرن، هەمیشە خوا ﷻ لە قورئانی بەپێزدا حوکمی دادگەرانە دەدا، قسەی عاتیفیانە ناکات، ئینسان جاری وایە، لە کەسێك، لە قەومێك تووڕە دەبێ، دەڵێ: یەکێکی چاکیان تێدانیە، بەڵام خوا ﷻ بە زۆریی وایە دەفەرموێ: زۆربەیان، نافەرموێ هەموویان، چونکە خەڵکی دیکەشیان هەیە، وەك وان نیە.

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u> : لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَٰسِقُونَ﴾، خۆی (فَسَق) یانی (خَرَج) (فاسق) بەمانای (خارج) دەرچوو، دێ، لە چی دەرچوون؟ لە حوکمی عەقڵ دەرچوون، لە حوکمی فیطرەتیان دەرچوون، لە حوکمی شەرع دەرچوون، لە بەها بەرزەکان دەرچوون، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَٰسِقُونَ﴾، لێرەدا مەبەست ئەو (فسق)ە نیە کە لە زاراوەی شەرعیی دا دەڵێ: مسوڵمانێك کە (فاسق) بێ، شایەدیی لێ وەرناگیرێ، بەڵکو مەبەست پێی (فسق)ی گەورەیە، واتە: دەرچوون لە دین‌و، دەرچوون لەو هەموو شتانەی کە پێویستە پابەند بن پێیانەوە، لە هەموویان دەرچوون.

<u>**مەسەلەی هەشتەم**</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ ﴿١٠﴾﴾.

ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرە پەیمان شکێنانە نرخێکی کەمیان بە ئایەتەکانی خوا کڕیوە، وە خەڵکیان لە ڕێبازی خوا لاداوە، یان خۆیان لە ڕێبازی خوا لایان داوە، ئەوەی کە دەیکەن خراپترین کردەوەیە، لە هیچ بڕواداریکدا ڕەچاوی خزمایەتیی‌و پەیمان ناکەن، وە ئەوانە دەستدرێژ کارن.

چوار هەڵوەستەی پێویست لەبەردەم ئەم دوو ئایەتەدا دەکەین :

هەڵوەستەی یەکەم: جارێ هەڵوەستەیەك دەكەین لەبەردەم ئەم تەعبیرە سەرسووڕهێنەرەدا، کە خوا ﷻ نەیفەرمووە: (بَاعُوا آيَاتِ اللهِ بِثَمَنٍ قَلِيل)، ئایەتەکانی خوایان بە نرخێکی کەم فرۆشتوە، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا ﴾، بە ئایەتەکانی خوا، نرخێکی کەمیان کڕیوە.

واتە: ئایەتەکانی خوای پەروەردگاریان کردوە بە کاڵایەك، بە شمەکێك، کە دەیفرۆشن‌و سەوداو مامەڵەی پێ دەکەن، وە لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوای پەروەردگاردا، نرخێکی کەمیان وەرگرتوە.

هەڵبەتە مەبەست ئەوەیە کە ئایەتەکانی خوای بەرزو مەزنیان بە نرخێکی کەم، گۆڕیوەتەوە، ئەو شتە کە دەفرۆشرێ، یاخود دەکڕدرێ، دوو شتن: یەکێکیان دەبێتە نرخ (ثَمَن)، ئەوی دیکە دەبێتە ئەو شتە کە فرۆشراوە، یان کڕدراوە، کە نرخەکەی لەسەر دانراوە (مُثْمَن).

کەواتە: بۆ هەر کامێکیان دەگونجێ بڵێی: نرخ (ثَمَن)ەکەیەو، ئەوەی دیکەیان، نرخ لەسەر دانراوەکەیە، مانای وایە، هەردووکیان دەگونجێ ئەو تەعبیرەیان بۆ بەکاربهێنرێ، بەڵام لێرەدا خوای کارزان بۆیە ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە، یانی: ئایەتەکانی خوای پەروەردگاریان کردوە بە کاڵایەك، بە شمەکێك، کە سەوداو بازرگانیی پێ دەکەن، لە بەرانبەر نرخێکی کەمدا، نرخێکی کەمیان پێ وەدەست هێناوەو پێ کڕیوە.

ئنجا ئایا مەبەست لەو نرخە کەمە چییە؟ ئایا خوای بەرزی مەزن بۆیە گلەییان لێدەکات کە نرخێکی کەمیان بە ئایەتەکانی خوا وەدەست

هێنـاوەو، ئایـەتـەکـانی خـوایان بـە نرخێکـی کـەم گۆڕیوەتـەوە، وە ئەگـەر نرخێکی زۆر بووایـە، گلەیی لێ نەدەکردن؟

لـە وەڵام دا دەڵێین: هـەرچی لـە بەرانبـەر ئـایـەتـەکـانی خـواو لـە بەرانبـەر شـەریعەتو بەرنـامەی خـوادا، وەربگیـرێ، وە ئایەتـەکانی خـوا ﷻ بـە هـەر نرخێـك بگۆڕدرێـنەوە، ئـەو نرخـە هـەر کـەمە، ئەگـەر هـەموو دنیـاش بـێ، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا ئـەوەمان بـۆ دەردەخـات، کـە ئـەوانە ئـایـەتـەکـانی خـوای پـەروەردگارو دینـی خوایـان، لەلا شـتێکی کەم بایەخو کەم نـرخ بـووە، بۆیـە بـە بەرژەوەندییـەکی کـەمی دنیـایی ـ کـە بەرژەوەنـدیی دنیـایی بەرانبـەر بـە دینـی خـوا هـەرچـەند بـێ، هـەر کـەمە ـ گۆڕیویانەتـەوە .

هەڵوەسـتـەی دووەم: ئنجـا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِۦٓ﴾،

سـەرەنجـام خـەڵکیـان لـە ڕێـی خـوا لاداوە، وشـەی: (صَدّ)، بـە مانـای لادان دێ، ئینسـان بۆخـۆی لـە بەرنـامەی خـوا لابـدات، دەگـوترێ: (صَدَّ عَنْ سَبيلِ اللهِ)، واتـە: خـۆی لـە بەرنـامەی خـوا لادا، وە بە مانـای لادانی خـەڵکیش دێ.

واتـە: دەگونجێ خۆیـان لە ئـەنجامی ئەوەدا کە نرخێکی کەمیان بە ئایـەتەکانی خـوا کـڕیوە، لـە ڕێی خـوا لایـاندابێ، یـاخود خـەڵکیـان لێ لادا بـێ هەردووکـیان دەگـرێتـەوە، کـە دیـارە ئەوەی ئەوان دەیکـەن، خراپتـرین کـردەوەیە.

هـەڵبەتـە مەبەست لـە کـڕینـی ئـەو نرخـە، واتـە: ئیمانیـان نەهێنـا، دیـارە کـە ئیمـانیـان نەهێنـاوە، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا بـووە کـە بەرژەوەندییـەکی دنیـاییان دەست بکەوێ، یـان ئـەهلی کوفر لێیـان ڕازی بن، سـەرۆك عەشـیـرەت لێیـان ڕازی بـێ، کـە پێکهـاتـەی کۆمەڵگـەی ئـەو کـاتـە عەشـایریی بـووە، وەك چۆن ئێسـتـا کەسێك لە حزبێکی بێبـڕوا دایە، لـە حزبێکـی عەلـمانیی دایە، لـە حزبێـك دایـە، کـە حیسـاب بـۆ دیـنو خـواو قیـامەتو پاداشـتو سـزاو دوارۆژ نـاکات، کابرا بۆ ڕازیـکردنی بەرپرسـەکـەی خـۆی، کـە دەشـزانی هـەق لـەولایـە. بەڵام شـوێن هـەق نـاکـەوێ، بۆ ڕازیـکردنی بەرپرسـەکەی خـۆی کـە چـاوەڕوانی زار چـەورکـردنێكو زار شـیـرینکـردنێکی لـێی هـەیـە، کـە ئـەوە بریتیـە لـە هـەمان پرۆسـە کە کـاتی خـۆی خـوای بـێ نیـاز سـەرزەنشـتی ئـەوانەی لەسـەر کـردەوە.

هەڵوەستەی سێیەم: ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾، دیارە هەر لەسەر خستنە ڕووی کردەوە هەڵوێستەکانی کافران، بەردەوام دەبێ.

دەفەرموێ: لە هیچ بڕوادارێکدا ڕەچاوی نە خزمایەتیی دەکەن، نە پەیمان دەکەن، ﴿إِلًّا ﴾، پێشتر گوتمان: زانایان زیاتر بە مانای (قرابة)، نیزیکیی‌و خزمایەتیی لێکیان داوەتەوە، وە ﴿ذِمَّةً ﴾ش بە مانای بەڵێن‌و پەیمان هەبوون، لێکیان داوەتەوە، لە ئایەتی پێشێ دا خوا فەرمووی: ﴿لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾، کە ئەوە حاڵەتی گشتییانە، واتە: لە مامەڵەیان لەگەڵ ئێوەدا، ئەی مسوڵمانینە! ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرە بێ بەڵێن‌و‌بێ پەیمانانە، ڕەچاوی هیچ خزمایەتیی‌و پەیمانێکتان لەگەڵ ناکەن، لە مامەڵەیاندا بە گشتی، بەڵام لێرە کە دووبارە بۆتەوە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ ﴾، واتە: لە هەڵسوکەوتی تاکییشدا هەروان، وەك چۆن بە گشتی لەگەڵ مسوڵمانان‌و قەوارەی ئیسلامیی دا، بەو شێوەیە مامەڵە دەکەن، کە ڕەچاوی پەیمان‌و خزمایەتیی‌و نیزیکیی‌و ئەوانە ناکەن، لە مامەڵە لەگەڵ تاك تاکی مسوڵمانانیشدا، هەر ئەوە پیشەیانە، کە ڕەچاوی خزمایەتیی‌و بەڵێن‌و پەیمان‌و یەکدی ناسین‌و ئەوانە ناکەن، بەڵکو ئەوەی کە جێی تەماشاو سەرنجیانە، هەر ئەوەیە کە چۆن بەرژەوەندییان بۆ بێتە دی.

هەڵوەستەی چوارەم: ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴾، ئا ئەوانە سنوور بەزێنن، ئەوانە دەست درێژ کارن، لێرەدا ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴾، ئەم تەعبیرە ئەوە دەگرێتەوە کە هەر ئەوانەن دەست درێژکارو سنوور شکێنی ڕاستەقینە.

هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ كە ئاوا بە ڕوونیی‌و، بە جەختەوە لەسەر كردنەوە، باسی ئەهلی كوفر دەكات، باسی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە دەكات، دەیـەوێ ئێمـەی مسوڵمان حاڵی بكات، كە ئەوانە لە مامەڵەیان لەگەڵماندا، بەو شێوەیە، ئێمەش هەر لە دڵی سافی خۆمانەوە تەماشا نەكەین، وە پیمان وانەبێ، كە ئێمەی مسوڵمان پێمان وایەو دینەكەمان وای تێگەیاندووین كە نابێ درۆ بكەین، نابێ پەیمان شكێنیی بكەین، نابێ غەدر بكەین، وە لەبەرئەوەی كە بۆخۆمان دڵمان ساف‌و ساغەو، دڵسۆزین بۆ هەموو كەس، پێمان وابێ خەڵكیش هەمووی وایە، خەڵكی نامسوڵمان وەك گوریسی نێو هەمبانە وایە، سەدو یەك قۆرت‌و پێچی هەیە!

بۆیە دەبێ لێیان وریا بین! لێرەدا خوا ﷻ كە ئاگاداری نهێنییەكانی نێو سینەی خەڵكە، خەڵك، بە كافرو مسوڵمانەوە، مسوڵمانان ئاگادار دەكاتەوە. بۆ ئەوەی كلاویان نەچێتە سەر، وە بە قسەی خۆش‌و بۆش‌و، بە ڕواڵەتی جوان‌و نێومرۆكی وێرانی، ئەهلی كوفر فریو نەخۆن.

<u>مەسەلەی نۆیەم</u>: كە دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾﴾.

ئەوەی پێشێ ئایەتی ژمارە (٥) دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ﴾، یانی، ئەگەر {ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەو پەیمان شكێنانە} گەڕانەوە بۆلای خواو، نوێژیان بەرپاكردو زەكاتیان دا، ڕێیان بەردەن.

بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ئەگەر گەڕانەوە بۆلای خواو، نوێژیان بەرپا كردو زەكاتیان دا، (واتە: مسوڵمان بوون) ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ﴾، ئەوە براتانن لە ئایینداو، چونكە ئەوەی پێشێ لە سیاقێكدا هاتبوو، كە خوا ﷻ فەرموو بووی: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾.

ئەگەر چوار مانگە مۆڵەتەكە بەسەرچوون، هەر كام لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، (واتە: ئەوانەی پەیمان شكێنن)، لێتان هەڵكەوتن بیانكوژن، بیانگرن، ئابڵووقەیان بدەن، وە لە هەموو بۆسەیەكدا بۆیان دابنیشین.

چونكە لەوێ باسی كوشتو گرتن بوو، فەرمووی: ڕێیان بەردەن، واتە: لێیان گەڕێن، ئەگەر تەوبەیان كردو نوێژیان بەرپا كردو زەكاتیان دا، بەڵام لێرەدا شتێكی بۆ زیاد كردوە، واتە: وێڕای ئەوەی كە دەبێ ڕێیان بدەن، ڕێیان بۆ چۆڵ بكەنو ئازاد بن، مادام هاتنە نێو ئیسلامەوە، با هەتا دوێنێش دوژمن بووبن، پەیمان شكێن بووبن، دەستیان بە خوێنی مسوڵمانان سوور بووبێ، ئێستا وێڕای ئەوە كە دەبێ ڕێیان بەردەن، زیاد لەوەشو سەربارەش برای ئایینیتانن، دەبێ وەك براتان حیسابیان بۆ بكەنو مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن، دیارە بە مەرجێك كە هاتنە نێو ئیسلامەكەیان ڕاست بێو بە ساغیی بووبێ.

كە ئەوەش سەماحەتی ئیسلامو دڵ فراوانییو لێبوردەیی دەگەیەنێ، كە تا دوێنێ كەسێك كە دوژمنی سەرسەختی مسوڵمانان بووەو، دەستی بە خوێنی مسوڵمانان سوور بووە، بەڵام ئەمڕۆ كە مسوڵمان دەبێ، هیچی پێشێی لەگەڵی لێك نادرێتەوە.

ئنجا ئەوە نەك هەر شتێكی تیۆریی (نظري)، بووبێ، بەڵكو بە كردەوەش هەروا بووە، بۆ وێنە: عەمری كوڕی عاص خودا لێی ڕازی بێ، كە لە سەردەمی نەفامییدا نوێنەری قوڕەیشییەكان بوو، چوو بۆ حەبەشە، بۆ ئەوەی جەعفەری كوڕی ئەبی طالیبو ئەو مسوڵمانانەی كە كۆچیان كرد بوو بۆ حەبەشە، بیانهێننەوە بە زۆر، وە هەرچی لە دەستی هات كردی، بەڵام كاتێك هاتە نێو ئیسلامەوە، یەكسەر پێغەمبەر ﷺ لە یەكێك لە جەنگەكاندا كە خۆی لەگەڵ دا نەبوو، كردی بە فەرماندە، كە ئەبو بەكرو، عومەریش خوا لێیان ڕازی بێ لە نێو ئەو سوپایە دابوون، هەروەها خالیدی كوڕی وەلید كە هۆكاری شكستی مسوڵمانان، وە زەبر لێدرانی مسوڵمانان بوو، لە جەنگی (ئوحود)دا ، لە سەردەمی نەفامییدا، بەڵام كە دوایی مسوڵمان دەبێ، پێغەمبەر ﷺ نازناوی شمشێری هەڵكێشراوی خوا (سیف الله المسلول)ی پێ دەدات، وە چەندان بەرپرسیارێتیشی پێ دەسپێرێ، كە تا دوێنێش دوژمنێكی سەرسەختی ئیسلام بووە!

ئـەوەش وەك گـوتم: تـەنیـا لـە ئیسلامـدا بـەو بـاخـەڵ فـەراحییو، ڕابـردوو لـە بیـرکردنو، لاپـەڕەی سپی هـەڵدانەوەو، ئـەو جۆرە مامەڵەیـە هـەیـە، خـەڵـکی دیکـە کـۆنە قینـی لـە دڵدا هـەر دەمێنـێ، وە شـتـە ڕابردووەکـان لـەسـەر ئـەو کـەسـانـە حیساب دەکـەن، کـە دێـنـە ژێر سایـەیـانـەوە.

دوایـی دەفـەرموێ: ﴿وَنُفَصِّلُ ٱلْآيَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾، وە ئـایـەتـەکـان بـۆ کۆمەڵێك کە بـزانن ڕۆشن دەکـەینـەوە.

(تفصیل) بریتیـە لـە لێك کێشـانەوەی شـتێك، واتـە: ئـایـەتـەکـانی خـۆمان وەك چـۆن شـتێك لێـك دەکێشیـەوەو فـراوانی دەکـەی، چاکتـر دیـار دەبـێ، ئـاوا ئـایـەتـەکانی خـۆمان ڕوون دەکـەینـەوە، بۆ کـێ؟

بۆ کـەسانێك کـە بزانـن، واتـە: کـەسانێك کـە عیلـمو زانیـاریـیان هـەبـێ، چاکتـر لـە ئـایـەتـەکـانی خـواو شـیکـردنەوەی ئـایـەتـەکـانی خـوا، تێیـانـدا بەهـرەمـەنـد دەبـنو حـاڵی دەبـن.

**مەسـەلـەی دەیـەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ فَقَـٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَـٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ ﴾.

ئـەوە لە حاڵێك دا کە تـەوبەیـان کـردو، نوێـژیـان بەرپـا کـردو، زەکـاتیـان دا، بـرای ئـاینیـتـانن، ئـەدی ئـەگـەر جارێکی دی، سـوێـندەکـانی خـۆیـان شـکـانـد، دوای ئـەوەی کە پەیمانیشیان داوە ؟، بێگومان ئەو کاتە حوکمێکی دیکەیان هەیە، بۆیە دەفەرموێ: وە ئـەگـەر سوێـندەکـانی خـۆیـان هـەڵوەشـانـدنەوە، دوای ئـەوەی پـەیمـانـیـان دابـوو. (واتـە: پـەیمـانیـان دابوو بە سـوێـندەوە)، وە تـانەیـان لـە ئایینەکـەتـان دا، ئـەوە لـە دژی پێشەوایـانی کوفـر بـجـەنگن، لـە دژی سـەرانی کوفردا، چونکـە ئـەوانە هـیچ سوێـندیان نیەو بە سوێـندەکانیـانەوە پابەند نین، وە بە پـەیمانیـانەوە پابەند نـین.

﴿لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ﴾، بەڵکو لـە ئـەنجامی ئـەوەدا کـە زەبـری ئێـوەیـان پـێبکـەوێ.

دەست هەڵبگرن، لە چی دەست هەڵدەگرن؟ لە پەیمان شکێنیی، یاخود لە دژایەتیی کردنی ئیسلامو موسوڵمانان، یاخود لە تانەدان لە ئیسلام.

بەڵام وا پێدەچێ زیاتر مەبەست ئەوە بێ کە دەست هەڵدەگرن لە پەیمان شکێنیی، چونکە ئیسلام نەیگوتوە، ئەو خەڵکە حەتمەن دەبێ موسوڵمان بێ، موسوڵمان دەبێ باشتر، موسوڵمان نابێ، با کافرێك بێ لاشەڕو، ئاشتییخواز بێ، لەگەڵ قەوارەی ئیسلامیی دا، ئیسلام هەر قبووڵیەتی مادام پابەند بێ بەو بەڵێنو پەیمانەوە کە دەیدات، یانی: سەنگەر لە ئیسلام نەگرێو دژایەتیی نەکات، ئیسلام هەر قبووڵیەتی.

کەواتە: ﴿لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ﴾، هەرچەند هەموویان دەگرێتەوە:

أ) دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، دەست هەڵدەگرن لە پەیمان شکێنییو بێ بەڵێنیی.

ب) وە دەنگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ، دەست هەڵدەگرن لە دژایەتیی ئیسلامو موسوڵمانان.

ج) وە دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، دەست هەڵدەگرن لە تانەدان لە ئیسلام.

بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەکان، ئەوەی کە زیاتر ئەوانی لەسەر سەرزەنشت کراو، پابەند نەبوونە بە سوێندو پەیمانەوە.

## سەرنجدانی پێنج تەعبیرو وشەی ئەم ئایەتە

١ / (النَّكْثُ، النَّقْضُ)، (نكث): لە ڕیشەدا بریتیە لەوە شتێك کە چنرا بێ، هەڵبوەشێنرێتەوەو، شیبکرێتەوە، (نقض)یش بۆ دیوارێکە کە دانرابێ، دوایی هەڵبوەشرێنێتەوە، پێی دەگوترێ: (نقض)، بەڵام (نكث)، بۆ شتێکە کە چنرا بێو ڕێسرا بێ، دوایی بکرێتەوە بە خوریی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا ﴿٩١﴾﴾النحل.

واتە: وە سوێندان پاش مەحکەم کرانیان، هەڵمەوەشێننەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿كَٱلَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا ﴿٩٢﴾﴾ النحل.

واتە: وەك ئەو ئافرەتەی کە ئەو شتەی چنیویەتی، دوایی شیکردۆتەوەو، ڕیسەکەی خۆی کردۆتەوە خوری.

٢ / وشەی: ﴿أَيْمَٰنَهُم﴾، کۆی (یمین)ە، (یمین)یش واتە: سوێند، کە (حَلْف)یشی پێ دەڵێن.

بۆیە وشەی: (یمین) بۆ سوێند بەکارهاتوە، چونکە عادەتیان وابووە کە سوێندیان خواردوە، ئەو شتەی بەلایانەوە گرنگ بووە، دەستی ڕاستیان لەسەر داناوە، کە ئێستاش هەر وایە، یاخود وێڕای سوێندەکەش دەستی ڕاستیشیان خستۆتە نێو دەستی کابرا، وە بەڵێنیشیان پێداوە.

٣ / کە دەفەرموێ: ﴿وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ﴾، واتە: تانەیان لە دینی ئێوە داوەو عەیبیان لێ گرتوە (عَابُوهُ وَقَدَحُوا فِيهِ فَثَلَمُوهُ)، ڕەخنەیان لێگرتوەو تانەیان لێداوە، وە عەیبیان بۆ دۆزیوەتەوە، ویستوویانە ناشیرینی بکەن.

٤ / وشەی ﴿أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ﴾، (أئمَّة)، کۆی (إمَام)ە، (إمَام) واتە: پێشەوا. جا پێشەوا هەر کەسێکە کە لە پێش خەڵکەوە بڕوا، لە خێرو چاکەدا بێ کە (أَئِمَّة الهُدَى)ن، یان لە خراپەدا بێ، کە (أَئِمَّة الكُفْر)، یان (أَئِمَّة الظُّلْم)ن، وە خوای زاناو شارەزا وشەی (أَئِمَّة) و (إِمَام)ی لە قورئاندا بۆ چاکەو بۆ خراپە بەکارهێناوە.

٥ / کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ﴾، ئەوانە سوێندیان نین، واتە: پابەند نین بە سوێندەوە، دەنا سوێند دەخۆن، بەڵام کە پێوەی پابەند نەبوون، وەك سوێندیان نەخواردبێ وایە، حەسەنی بەصرایی ڕەحمەتی

خـوای لـێ بـێ خوێندوویـەتەوە: (إِنَّهُمْ لَآ إِيمَـانَ لَهُمْ )، ئـەوانە ئیمانیـان نیـە، بۆیـە لـە دژیـان بـجەنگن.

بەڵام بێگومـان ئـەو خوێنـدنـەوە (قـراءة)یـە ڕاسـت نیـەو، بەجێ نیـە، چونكـە ئیسلام لەبەرئەوە لە دژیـان ناجەنگێ كە ئیمانیـان نیە، بە بەڵگەی ئەوە كە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانـەرو، كافرانەی كە پابەندن بە پەیمانەوە، ئیسلام جەنگیان لە دژ نـاكات، كەواتـە: لـەبەر بێ ئیمـانیی نیـە، بەڵكـو لـەبەر بێ پـەیمـانییـە، بۆیـە (أبو جعفر الطبري) لـە تـەفسیـرەكەی دا دەڵـێ: {وَالصَّوَابُ مِنَ القِرَاءَةِ فِي ذَلِكَ، الَّذِي لاَ أَسْتَجِيزُ القِرَاءَةَ بِغَيْرِهِ، قِرَاءَةُ مَنْ قَرَأَ بِفَتْحِ (الأَلِفِ) دُونَ كَسْرِهَا، لإِجْمَاعِ الحُجَةِ مِنَ القُرَّاءِ عَلَى القِرَاءَةِ بِهِ، وَرَفْضِ خِلاَفِهِ}[1].

واتـە: خوێندنەوەی ڕاست كـە من جگە لـەوە ڕێگە نادەم كە پێی بخوێنرێتـەوە، خوێندنەوەی ئـەو كەسـەیـە كـە بـە فـەتحی (أ)ەكە دەیخوێنێتەوە ﴿لَآ أَيْمَـٰنَ لَهُمْ ﴾، ئـەوانە خاوەنی سوێند نین، نـەك بـە ژێـری (أ)ەكـە: (إِنَّهُمْ لا إِيمَـانَ لَهُمْ )، چونكـە یەك دەنگیی هەموو قوڕئان خوێنـەكان لـەسەر ئـەوەیـە كـە دەبێ بە ﴿أَيْمَـٰنَ ﴾، بخوێنرێتـەوە، {وە لـە خـوای زانـاو، لـە پێغـەمبـەرەوە ﷺ بـەو شێوەیـە هاتوە}، وە پێچەوانەی ئەوەیان {كە (أ)ەكە ژێری هەبێ، كە ئـەو كاتـە دەبێتە (إِنَّهُمْ لا إِيمَـانَ لَهُمْ )، ڕەفـز كـردوە.

دیـارە قسەكـەشی ڕاستـە، چونكـە وەك باسیشمان كـرد: ئیسـلام ئیعـلانی جـەنگی لـە دژی ئـەو هـاوبەش بۆ خـوا دانـەرو كـافرانەدا كـردوە، كـە خـاوەن بەڵێـنو پـەیمـان نـینو، سوێندەكانیـان جێبەجـێ نـاكـەن، نـەك لـەبەر ئـەوەی ئیمانیـان نیـە، لـەبەر بـێ ئیمانیی نیە، بەڵكو لەبەر بێ پـەیمـانییە.

---

١) مجلد (١٠) ، ص ٩٤ .

# حوکمی ڕەخنە لە ئیسلام گرتن و تانە لێدانی

لێرەدا مسەلەیەك هەیە كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾، هەندێك لە زانایان شتێكیان گوتوە، كە من پێم وایە زیاتر حاڵەتێكی عاطیفیی پاڵی پێوە ناون، بیڵێن، ئەویش ئەوەیە كە هەر كافرێك لە ژێر سایەی ئیسلامو مسوڵمانانندا بێ، بۆی نیە ڕەخنە لە ئیسلام بگرێ، ڕەخنە لە پێغەمبەر ﷺ بگرێ، ڕەخنە لە قورئان بگرێ، وە ئەگەر وایكرد، ئەوە خوێنی حەڵاڵ دەبێ، هەڵبەتە ئەو ڕایە، ڕای مالیكو شافیعیی‌و غەیری ئەوانیشە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ئنجا ئەگەر خۆشیان دیكۆمێنێتێك نەبێ كە گوتوویانە: گرنگ ئەوەیە كە بە ناوی ئەوانەوەو لە مەزهەبی واندا، باوە.

بەڵام ئەبو حەنیفە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەگەڵ هەندێكی دیكە لە زانایان. ڕایان وایە كە نەخێر لەسەر تانەدان لە ئیسلامو، ڕەخنە گرتن لە قورئانو. قسە گوتن بە پێغەمبەر ﷺ، ئەو كافرانەی لە ژێر دەوڵەتی ئیسلامیی دا دەژین. وە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا تەبان، جا چ سەرانە بدەن، چ بە شێوەیەك لە شێوەكان تێگەیشتنیان هەبێ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، لەسەر ئەوەی كە ڕەخنە دەگرنو، قسە دەڵێنو، قسەی بێجێ دەكەن، ناكوژرێن، وە ئەوە بە پەیمان هەڵوەشاندنەوە، لە قەڵەم نادرێ.

وە بە تەئكید ئەو قسەیەی ئەبو حەنیفەو ئەو زانایانە، ڕاستە، بۆچی؟

چونكە: بابای جوولەكە، كە تۆ لێی دەسەلمێنی، جوولەكە بێو لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بژی، یان نەصرانیی بێ، یان بووذایی بێ، یان مەجووسیی بێ، یان صابیئە بێ، دیارە ئەوانە شتێكی ئاسایی یە كە بڕوایان بە قورئانو

ئیسلامو پێغەمبەری خاتەم ﷺ نیە، ئەدی ئەوە نیە تۆ ئێت سەلماندوون کە بڕواشیان بە قورئانو بە ئیسلامو بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، نەبێ، بەڵام هاوولاتییش بن؟!

بۆیە وەك ئەبو حەنیفە گوتوویەتی: ئەو کوفرەی کە لەسەرینی، گەورەترە لەو ڕەخنەیەی کە دەیگرن، ئەوە لە لایەك.

پاشان ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر ﷺ بکەین، دەبینین نەصرانییەکان (نصاری)ی نەجران لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا ﷺ لە ساڵەکانی: (٩ و ١٠)ی کۆچیی دا هاتوون، لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ موناقەشەو مشتومڕیان کردوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، لەسەر ئەوە کە عیسا کوڕی خوایە، وە نکووڵییان کردوە لەوەی کە (محەممەد) پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە مزگەوتی پێغەمبەریش شوێنی حەوانەوەیان بووە، وە پێغەمبەری خوا لێیان گەڕاوە، لەوێدا نوێژو تاعەتو پەرستشتی خۆیانیان کردوە!

کەواتە: لەسەر ئەوە کە شتێك خۆیان قەناعەتیان وایەو، ئیسلامیش ئەو قەناعەتەی لێ سەلماندوون، بەو واتایەی ڕێگای داون ئەو قەناعەتەیان هەبێ، وە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییش دا بن، با قەناعەتەکەشیان بە هەڵە بزانرێ، ئنجا جوولەکە بن، نەصرانیی بن، یان خاوەنی هەر جۆرە فیکرەیەك بن، لەسەر دەربڕینی ئەو فیکرەو قەناعەتەیان، وە لەسەر تانەدان لەسەر ئیمانو ئیسلام، خوێنیان حەلاڵ ناکرێ، وە بە هەڵوەشانەوەی پەیمانەکەیان لە قەڵەم نادرێ.

هەڵبەتە دەگونجێ دەوڵەتی ئیسلامیی لەگەڵیان ڕێك بکەوێو سنوورێك دابنرێ: وەرن ڕەخنەی بابەتییانە لە یەکدی دەگرین، وەرن با وتووێژمان هەبێ، دیارە ئێوە قەناعەتتان وایە، بڕواتان بە قورئان نیە، بە ئیسلام نیە، بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نیە.

بەڵام بێگومان قەناعەتی خۆ دەربڕین، وە ڕەخنە گرتن لە دینی بەرانبەرت شتێکە، وە قسەی ناشیرین گوتن، شتێکی دیکەیە.

هەڵبەتە قسەی ناشیرینو جنێودانو سووکایەتیی کردن لە کەس قبووڵ ناکرێ، خوای دادگەر تەنانەت لە موسوڵمانانیشی قبووڵ ناکات، بەرانبەر بە ئەهلی

کوفر، یا کوفرو شیرکەکەیانو بت پەرستییشیان هەڵەبێ، کە بە تەئکیدیش هەڵەیە، وەك خوای کارزان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ ﴿١٠٨﴾ ﴾الأنعام.

واتە: ئەو شتانەی کە (کافرەکان) دەیانپەرستن لە جیاتی خوا، جنێویان پێ مەڵێن، بۆ ئەوەی ئەوانیش نەزانانە، (یان لە بەرانبەر ئەوەدا) قسە بە خوا نەڵێن، وشەی بێڕێزی لە بەرانبەردا بەکار نەهێنن.

هەڵبەتە من لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام)دا بە تەفصیل باسی ئەو مەسەلەیەم کردوە، کە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەیە، کە ئیسلام ڕێگا بە مسوڵمانان نادات سووکایەتییو بێڕێزییو، وشەی بێ نەزاکەت بە بەرانبەر بە پەرستراوەکانی بت پەرستەکانو کافرەکان بەکاربێنن، دیارە بە هەمان شێوەش دەوڵەتی ئیسلامیی ڕێگا نادات کەس سووکایەتیی بە ئیسلامو مسوڵمانان بکات. بەڵام بڵێی: ڕێگای ڕەخنەیان لێ بگری!

نەخێر، چونکە ڕەخنە گرتن دەکەوێتە چوار چێوەی ئازادیی بیروڕاوە، وە خوای پەروەردگاریش بەندەکانی ئازاد کردوە، بە دەقی ئایەت وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف.

وە بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ حەز دەکات با ئیمان بێنێ، کێش حەز دەکات با بێبڕوا بێ.

واتە خوای باڵادەست ڕێگای کافر بوونی داوە، ئنجا ئەگەر ڕێگای کافر بوونی دابێ، کە بابای کافر تەعبیر بکات لە کوفرەکەی خۆی، وە فیکرەکەی بەرانبەری کە ئیسلامە، ڕەخنەی لێ بگرێ، بواری ئەوە هەیە، بەڵام جنێودانو قسەی سووكو بێ نەزاکەتو، دڵ بریندار کردنی مسوڵمانان، ئەوەیان دروست نیە، نە بۆ کافران دروستە، لە بەرانبەر مسوڵمانان دا، وە نە بۆ مسوڵمانانیش دروستە، لە بەرانبەر ئەهلی کوفردا.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣ ﴾.

دیارە لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ دەیەوێ مسوڵمانان هانبدات بۆ شەڕ کردنو جەنگ کردن لە دژی ئەو کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، کە بێ بەڵێنو،بێ پەیمانن، وە هەر لە دەرفەتێك دەگەڕێن، زەبر لە ئیسلامو مسوڵمانان بدەن، ئنجا لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئایا جەنگ ناکەن لە دژی کۆمەڵێك دا کە سوێندەکانی خۆیانیان هەڵوەشاندۆتەوە، ئەو سوێندانەی کە لەسەر پەیمانەکانیان خواردوویانن، ﴿ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ ﴾، وە کاتی خۆی ویستیان پێغەمبەر ﷺ لە شارەکەی خۆی، لە مەککە، وەدەر بنێن، [redacted] کردیشیان، ﴿ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، وە ئەوانیش یەکەمجار [redacted] پێشخەر بوون، هاتن بە سوپایەکی هەزار کەسییەوە، کە جەنگی بەدری لێ ڕوودا.

کەواتە: خوای زاڵی باڵادەست، سێ هۆکار دەخاتە ڕوو، بۆ ئەوەی ببنە هاندەر بۆ جەنگ کردنی مسوڵمانان لە دژی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، کە قورەیشییەکان سەرقافڵەیان بوون:

١ - بەڵێنو پەیمانەکانی خۆیانیان، هەڵوەشاندۆتەوەو پێوەی پابەند نەبوون.

٢ - کاتی خۆی پیلانیان گێڕا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شارەکەی دەربکەنو، دەریشیان کرد.

٣ - ئەوان دەسپێشخەری جەنگ بوون، شەڕیان بە مسوڵمانان فرۆشت.

بەڵێ ئەو سێ هۆکارو، هاندەرە هەن، بۆ جەنگ کردن لە دژی کافران، ئەدی با بزانین هیچ بەرپەرچێك هەیە؟

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡ ﴾، ئایا لێیان دەترسێن؟!

﴿ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، بێگومان خوا شایستەترە لێی بترسێن، ئەگەر بڕوادارن.

کەواتە: هۆکار هەیەو پاڵنەر هەیە بۆ جەنگ کردنتان لە دژیان، وە هیچ پەرچیش نیە، مەگەر ئەوە بێ کە لێیان بترسێن، ئنجا ئەگەر ئیمانداریش بن، دەبێ بەس لە خوا بترسێن و، خوا شایستەترە کە لێی بترسێن، لەوان بێ باك بن و مەترسێن.

کەواتە: پێویستە جەنگیان لە دژ بکەن، بۆ ئەوەی بە نێچیرێکی تووك نەرم نەیەنە بەرچاو، وە تەماعتان تێنەکەن و شەڕتان پێ نەفرۆشن.

<u>**مەسەلەی دوازدەیەم**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٥ ﴾.

واتە: لە دژیان بجەنگن، دوایی چوار جۆرە دەرهاویشتەی ئەو جەنگ کردنە دەخاتە ڕوو:

١) ﴿ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ ﴾، ئەگەر ئێوە لە دژیان بجەنگن، خوا بە دەستی ئێوە سزایان دەدات.

٢) ﴿ وَيُخۡزِهِمۡ ﴾، وە زەبوون و سەرشۆڕیان دەکات، ئەو لووت بەرزیی و کەشخەکردن و خۆ ڕانواندنەیان نامێنێ.

٣) ﴿ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾، وە خوا ئێوە بەسەر ئەوان دا سەردەخات، دڵنیابن.

٤) ﴿ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡ ﴾، وە شیفای سینەی کۆمەڵێك لە ئیمانداران دەدات، وە ڕق و کینەیەکی پەنگ خواردووی کە لە دڵیان دا هەبووە، لای دەبات، کە کێ بوون ئەوانە؟

بێگومان بە نسبەت ئەو کاتەوە دەڵێن: هۆزی خوزاعە بوون، هۆزی خوزاعە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ بوون، وەك (طبري) گوتوویەتی[1]، چونکە لە دوای صوڵحی حودەیبییە، خوزاعە بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ، بەنو بەکریش بوونە هاوپەیمانی قورەیشییەکان، ئنجا ڕۆژێك خوزاعە کە چوو بوون بۆ خوا پەرستیی، بۆ دەوروبەری مزگەوتی حەرام، بەنو بەکر بە پشتیوانیی قورەیش دەرفەتیان لێ هێنان، وە (١٠ تا ٢٠) کەسیان لێ کوشتن، بە غەدر، کە دیارە ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پەیمانەی کە لە حودەیبییەدا لەگەڵ قورەیشیەکاندا بەستبووی، بە هەڵوەشاوەی دابنێ، لەلایەن ئەوانەوە، پاشان ئەوە بوو کە ئازادکردنی مەککەی بە دوا داهات.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە لە دژیان بجەنگن، کۆمەڵێك لە ئیماندارانیش کە ڕقو کینەی زۆریان چۆتە دڵو سینەوە، لە بەرانبەر ئەو کافرانەدا، کە غەدریان لێکردوون، ئەوانیش دڵیان چاك دەبێو تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، لە ئەنجامی ئەو شەڕو جەنگەدا، ئەدی بەنسبەت ئەو کافرانەوە کە مسوڵمان دەبن؟

دەفەرموێ: ﴿وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾، وە دوایش خوا دەگەڕێتەوە بە تەوبە وەرگرتنو بە لێبوردن، بۆ سەر هەر کەسێك کە بیەوێ، واتە: ئەو ئەهلی شیركو کوفرە کە جەنگیان لە دژ دەکەن، ئەوانەیان کە مسوڵمان دەبنو، خوای بەخشەر هیدایەتیان دەدات، هەر کەسێك کە خوا بیەوێ، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، وە خوا زانایو کارزانە.

<u>مەسەلەی سێزدەمو کۆتایی</u>: خوای بێ هاوەڵ باسی بابەتێکی دیکە دەکات، کە هەر پەیوەستە بە جەنگ کردن لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەران، دەفەرموێ:

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا

١) جامع البيان، ج ٦، ص ٩٦.

تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾﴾.

یان ئایا پێتان وایە وازتان لێ بهێنرێ، بەرلەوەی کە خوا ئەوانەتان بزانێ (بناسێ) کە لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن، وە بێجگە لە خواو لە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)و لە بڕواداران، کەسی دیکە ناکەنە جێگای ڕازو نیازی خۆیان، {کە نهێنییەکانی خۆیانیان پێ بڵێن، ئایا پێتان وایە وازتان لێبهێنرێ، تاکو خوا ئەوەی بۆ دەرنەکەوێ، ئەگەر پێتان وابێ وازتان لێ بهێنرێ، پێش ئەوەی ئەوە دەربکەوێ، ئەوە خەیاڵ پڵاوتان کردوە}، وە بێگومان خوا ﷻ بەوەی کە دەیکەن شارەزایە، واتە: بەرلەوەی تاقیشتان بکاتەوە دەتانناسێو پێتان شارەزایە، بەڵام تاقیتان دەکاتەوە، تاکو لەسەر ئەرزی واقیع بۆی دەربکەون.

## شیکردنەوەی چەند وشەیەك

١/ ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ﴾، (حَسِبَ)، واتە: پێی وابوو.

(ظَنَّ أَو تَوَقَّعَ أَو تَخَيَّلَ)، ئایا پێتان وابوو، ئایا پێتان وایە.

﴿أَن تُتْرَكُوا﴾، کە وازتان لێ بهێنرێ، واتە: تاقی نەکرێنەوە.

خەڵك بە چی تاقی دەکرێنەوە؟ بە خۆشییو ناخۆشیی، بەوە کە تۆ دەبێ جەنگ بکەی لە پێناوی خواداو، فیداکاریی بکەیو سەرو ماڵی خۆت ببەخشی.

٢ / ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ﴾، جارێ خوا نەیزانیوە کامانەتان تێدەکۆشن (واتە: بە سەرو ماڵ تێدەکۆشن)، ئنجا ئایا تاکو خەڵك تێنەکۆشێ، خوا نایانناسێ، نایانزانێ؟

نەخێر، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، جارێ تێکۆشان لە ئێوەدا نەهاتۆتە دی. جگە لە خواو، پێغەمبەری خواو، بڕواداران بە جێی ڕازو نیاز نەگرتن. نەهاتۆتە دی، تاکو زانیاریی خوا پێوەی پەیوەست بێ، چونکە هەر شتێك

هەبێ، خوا دەیزانێ، بەڵام جارێ ئەو شتە نەهاتۆتە دی، تاکو زانیاریی خوا لە دنیای واقیع دا پێوەی پەیوەست بێ، نەك تاکو ئەوان ئەو کردەوانە نەکەن، خوای زانا، نەیانزانێ، نەخێر.

بەڵام ئەو کردەوانە تاکو لەسەر ئەرزی واقیع، پەیدا نەبن، زانیاریی خوای پەنهانزان، وەك شتێك کە لە واقیعدا هەن، پێیانەوە پەیوەست نابێ، ئەگەرنا خوای شارەزا هیچ شتێك نیە، لێی پەنهان بێ، چ هەبێ، چ دوایی پەیدابێ

٣/ وشەی: ﴿وَلِيجَةً﴾، (طبري)، دەڵێ: (الوَلِيجة: هُوَ الشيءُ يدخل فِي آخَر غَيْرِهِ، وَإِنَّمَا عُنِي بها فِي هَذَا المَوْضِع: البطَانَةُ مِنَ المُشْرِكِينَ، نَهَى اللهُ المُؤْمِنِينَ أَنْ يَتَّخِذُوا مِنْ عَدُوِّهِم مِنَ المُشْرِكِينَ أَوْلِيَاء، يُفْشُونَ إِلَيْهِم أَسْرَارَهُمْ)[1].

واتە: (وَلِيجَةً ) شتێکی نامۆیە دەچێتە نێو شتێکی دیکەوە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە هیچ کەس لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، مەکەنە جێی ڕازو نیازی خۆتان، نهێنیی خۆتانیان پێ بڵێن، خوا لە بڕوادارانی قەدەغە کردوە کە لە دوژمنەکانیان (لە هاوبەش بۆ خوا دانەران)، کەسانێك بگرن بە دۆست، وە نهێنییەکانی خۆیان، (نهێنییەکانی مسوڵمانانیان) پێ بڵێن.

٤ / ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُواْ ﴾، (ابن زيد) کە یەکێکە لە زانایان دەڵێ: (أَبى أَنْ يَدَعَهُمْ دُونَ التَّمْحِيص)، خوا ڕازی نەبووە وازیان لێ بێنێ، تاکو نەیان پاڵێوێ.

(تمحيص)، واتە: لە بێژینگ دانو پاڵاوتن، هەڵبەتە ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ بەندەکانی خۆی لە ئیمانداران دەپاڵێوێ، لە بێژینگیان دەدا، لە زۆر شوێن لە قورئاندا باسکراوە، جگە لێرەش، بۆ وێنە:

---

١) ج٦، ص٩٧.

أ / لە سووڕەتی (آل عمران)دا خوای بەرزی مەزن دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾

واتە: ئایا پێتان وایە بچنە بەهەشت کە جارێ خوا نەیزانیوە (واتە: لەسەر ئەرزی واقیع بۆی دەرنەکەوتوە) کێن ئەوانەتان کە لەپێناوی خوادا، تێدەکۆشن‌و خۆڕاگرن.

ب / هەروەها لە سووڕەتی (البقرة)ش دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم ﴿٢١٤﴾ ﴾، واتە: یان ئایا پێتان وابوو، شایستەی چوونە بەهەشت بن، کە جارێ ئەوەتان بەسەر نەهاتوە، کە بەسەر گەلانی پێش ئێوەو ئۆممەتانی پێش ئێوە هاتوە، {ئەو نارەحەتیی‌و گرفتاریی‌و تاقیکردنەوانە}.

ج / هەروەها لە سووڕەتی (العنكبوت)یشدا، کە دەفەرموێ: ﴿ الم ﴿١﴾ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: ئەلیف، لام، میم، ئایا خەڵك پێیان وابوو کە هەر بەوەندەی بڵێن: بڕوامان هێنا، وازیان لێدەهێنرێ‌و تاقی ناکرێنەوە ؟

﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ العنكبوت.

بێگومان ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە، بە تەئکید خوا ﷻ بەرلەوەی تاقیشیان بکاتەوە، ئەوانەی ڕاستیان کردوە، دەزانێ، وە درۆزنەکانیش دەناسێ، {بەڵام تاقییان دەکاتەوە، بۆئەوەی لەسەر ئەرزی واقیع دەرکەون، وە خۆشیان‌و خەڵکیش پێیان ئاشنابن‌و لێیان تێبگەن}.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان، شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (١٧ تاکو ٢٢)، لەو شەش ئایەتەدا، خوای کاربەجێ بەراوردێك دەکات، لە نێوان هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو، ئەو کردەوانەیان دا، کە شانازییان پێوە دەکردن، لە لایەكو، بڕواداران‌و، ئیمان‌و خواپەرستییان‌و جیهادو کۆچ‌و نوێژو زەکات‌و تاعەتیان، لە لایەکی دیکەوە، وە ڕایدەگەیەنێ کە هاوبەش دانەران، شایستەی ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکانی خوا نین.

ئنجا پێناسەی ئەوانە دەکات، کە شایستەی ئەوەن ماڵەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، کە تەنیا بڕواداران‌ن، وە دوایی خوا ﷻ بە سەرزەنشتکردنەوە بە هاوبەش دانەرەکان دەفەرموێ: چۆن ئاو پێدانی حاجییان‌و خزمەتی مزگەوتی حەرام، لەگەڵ کردەوەی کەسانێك دا دەخەنە تەرازووەوە، کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، وە سەرو ماڵیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن‌و فیداکاریی دەکەن؟

چۆن دەبێ ئەو دوو جۆرە کەسە، وە ئەو دوو جۆرە کردەوە، بخرێنە تەرازووەوەو پێکەوە هەڵبسەنگێنرێن؟

کەسێك کە هونەرەکەی بەس ئەوە بووە، ئاوی داوە بە حاجییان، وە پەردەی بۆ کەعبە کردووەو، خزمەتی کەعبەی کردوە، بەراورد بکرێ لەگەڵ کەسێکدا، کە ئیمانی هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە فیدارکارییش دەکات بە سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا؟!

بێگومان ئەو دووانە پێك هەڵناسەنگێنرێن.

پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە ئیماندارانی کۆچکەرو سەرو ماڵ بەختکەر لە ڕێی خوادا، پاداشتی هەرە مەزنیان هەیە، وە سەرفرازن، وە پەروەردگاریان مژدەی بەزەیی‌و ڕەزامەندیی خۆیان پێدەدا، وە لە بەهەشتە نەبڕاوەکانی خوادا، بە هەمیشەیی نیشتەجێ دەبن.

﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنفُسِهِم
بِالْكُفْرِ ۚ أُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ
مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى
الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ ۖ فَعَسَىٰ أُولَٰئِكَ أَن يَكُونُوا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾
أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ
وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٩﴾
الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً
عِندَ اللَّهِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ
وَجَنَّاتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ
عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لە حاڵێکدا کە شایەدیی کوفر لەسەر خۆیان دەدەن، لێیان ناوەشێتەوە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، ئەوانە کردەوە (باشە)کانیان هەڵوەشاونەوەو بە هەمیشەیی لە ئاگر(ی دۆزەخ)دا دەبن ﴿١٧﴾ تەنیا کەسێك مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە، کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناوەو، نوێژی بەرپا کردوەو، زەکاتی داوەو، بێجگە لە خواش لە کەس نەترساوە، ئەوانە نیزیکەو دەگونجێ لە ڕێی ڕاست گرتووان بن ﴿١٨﴾ ئایا ئاو پێدانی حاجییان و، ئاوەدان کردنەوە (و خزمەتکردن)ی مزگەوتی حەرامتان، وەك کردەوەی کەسێك دانا، کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هێناوەو (بە سەرو ماڵ) لە ڕێی خوادا تێکۆشاوە ؟!

لەلای خوا یەکسان نین، وە خوا کۆمەڵی ستەمکاران ڕاستە ڕێ ناکات ﴿١٩﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کۆچیان کردوەو، بە سامان و گیانەکانیان لە ڕێی خوادا تێکۆشاون، پلەیان لەلای خوا مەزنترە وە هەر ئەوانەن سەرفرازو بە مراد گەیشتوو ﴿٢٠﴾ پەروەردگاریان مژدەی بەزەیی و ڕەزامەندیی و چەند باخێکیان لە لایەن خۆیەوە، پێ دەدا، کە نازو نیعمەتێکی بەردەوامیان تێدایە ﴿٢١﴾ بە هەمیشەیی و تا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە، بە دڵنیایی خوا پاداشتی مەزنی لەلایە ﴿٢٢﴾ )) .

# شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ ): (عَمَرَ يَعْمُرُ عمارة)، واتە: ئاوەدانی کردەوە، ئاوەدانی دەکاتەوە، ئاوەدان کردنەوەو خزمەت کردن.

دەڵێ: (العِمَارَةُ: نَقِيضُ الخَرَاب، يُقَالُ عَمَرَ أَرْضَهُ يَعْمُرُهَا عِمَارَةً، عَمَرْتُهُ فَعَمَرَ فَهُوَ مَعْمُورٌ، وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا، وَأَعْمَرْتُهُ الأَرْضَ، وَاسْتَعْمَرْتُهُ، إِذَا فَوَّضْتَ إِلَيْهِ العِمَارَةَ).

(عِمَارَة)، پێچەوانەی وێران کردنو، تێکدانە، دەگوترێ: (عَمَرَ أَرْضَهُ يَعْمُرُهَا عِمَارَةً)، واتە: زەوییەکەی خۆی ئاوەدان کردەوە، کێڵای و بەرووبوومی لێ پەیدا کرد، (عَمَرْتُهُ فَعَمَرَ فَهُوَ مَعْمُورٌ)، وە من ئەو شوێنەم ئاوەدان کردەوەو چاکم کرد، وەك خوا ﷻ دەربارەی کافرەکان دەفەرموێ: ﴿ ... وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا ... ⁽⁹⁾ ﴾الروم.

ئەوانەی پێش وان دنیایان ئاوەدان کردبۆوە، زەوییان ئاوەدان کردبۆوە، زیاتر لەوەی ئەوان ئاوەدانیان کردبۆوە، واتە: زیاتر شارستانێتییو کۆشكو تەلاریان تێدا پەیدا کردبوو.

ئنجا کە دەگوترێ: (وَأَعْمَرتهُ الأَرْضَ وَاسْتَعْمَرْتُه)، واتە: زەوییەکەم پێ سپارد کە بیکێڵێو ئاوەدانی بکاتەوە، یاخود کشتوکاڵی لێ بکاتو بەرهەمی لێ پەیدا بکات.

(شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِ): واتە: شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن، بەوەی کە کافرن.

(من الشُّهُودُ والشَّهادةُ: الحُضورُ مَعَ المُشاهَدَةِ، إمَّا بالبَصَرِ أو البَصِيرَةِ) واتە: لە (شهُودُ) و (شَهادة)ەوە هاتوە، کە بەمانای ئامادەبوون دێ، لەگەڵ بینیندا، چ بینینی بە چاو، چ بینینی بە عەقڵ، وە (الشَّهادَةُ: قَوْلٌ صَادِرٌ عَنْ علْمٍ حَصَلَ بِمُشاهَدَةٍ بَصِيرَةٍ أو بَصَرٍ)، (شَهادة) بریتییە لە قسەیەك كە دەردەچێ لە كەسێكەوە، كە عیلمێكی هەیە، بەهۆی ئەوەوە كە بە چاو شتی بینیوە، یاخود بە عەقڵ دەركی پێكردوە، بۆی پەیدابووە.

(حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ ): واتە: كردەوەكانیان هەڵوەشاونەوە.

(وأَصلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ، وَهُوَ أَن تُكثِر الدابَّةُ أَكْلاً حَتَّى يَنتَفِخَ بَطنُها) واتە: وشەی (حَبِطَت) لە ڕیشەوە لە (حَبَطْ)ەوە هاتوە، ئەویش ئەوەیە كە ئاژەڵێك لەوەڕی زۆر بخوات، تاكو ورگی دە ئاوسێو دوایی وەزعی تێكدەچێ.

(إذاً: حَبِطَتْ أعمَالُهُم، أي: بَطَلَت وذَهَبَت، وبطُولُها: ذَهاب ثَوابِها وبطول الأَجْرِ عَلَيْها) كەواتە: (حَبِطَتْ أعمَالُهُم) یانی: كردەوەكانیان هەڵوەشاونەوەو لاچوون، كە دیارە مەبەست لە هەڵوەشانەوەشیان، نەمانی پاداشتیانە لەسەر كردەوەكانیان.

(فَعَسَىٰ ): (عَسَى) (طَمَعٌ وتَرجٍّ، ومَنْ قَالَ: إنَّ الطَمَع والرَّجَاءَ لاَ يَصِحُّ مِنَ اللهِ مُخطِيءٌ، لأنَّ الله تَعَالى إذَا ذكر ذَلِكَ، فالمَقصُودُ بِهِ هُوَ الإنسان أن يَطمَع ويَرجو).

وشەی (عَسَى) واتە: ڕەنگە، نیزیكە، لەوانەیە، وە ئەوانەی دەڵێن: (طمع) و (رجاء) بۆ خوا ناشێن، بە هەڵەداچوون، چونكە خوای بەرز، كە ئەوە دەفەرموێ، مەبەستی پێ مرۆڤە، كە تەماع و ئومێدی وابێ.

(سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ ): (السَّقيُ وَالسُّقيا: أَنْ يُعْطِيهِ مَا يَشْرَبُ، وَالإِسْقَاءُ أَبْلَغُ مِنَ السَّقيِ).

(سَقِي وسُقِيا)، ئەوەیە کە تۆ خواردنەوەیەك بدەی بە کەسێك بیخواتەوە، بەڵام (إِسْقَاء)، مانای زیاترە لە (سَقِي)، وە (سِقَايَة)، بریتیە لە پیشەی ئاو پێدان، کەسێك پیشەی ئەوە بێ، ئاو بە خەڵك بداتو بیخۆنەوە.

( ٱلْفَآئِزُونَ ) کۆی (فَائِزْ)یە، (فَائِز)ە، (الفَوْزُ: الظَّفَرُ بالخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلَامَةِ).

(فَوْز) بریتیە لەوەی تۆ چاکەیەکت پێ ببڕێ، وە لەگەڵیشیدا سەلامەت بی.

کەواتە: (فَائِز) واتە: بە مراد گەیشتوو، سەرکەوتوو، سەرفراز.

(نَعِيمٌ ): (النِّعْمَةُ: الحالةُ الحَسَنَة، والنَّعِيم: النِّعْمَةُ الكَثِيرَة، وَتَنَعَّمَ: تَنَاوَلَ مَا فِيهِ النِّعْمَةُ وَطِيبُ العَيْش).

(نِعْمَة): بریتیە لە حاڵەتێکی باش کە بۆ ئینسان دێتە پێشێ، (نَعِيم)، بریتیە لە نیعمەتی زۆر، وە دەگوترێ: (تَنَعَّمَ)، ئەگەر مرۆڤ شتێك بکات کەیفو لەزەتی لێ بکاتو، بەکاری بێنێ، ژیانو گوزەرانی خۆش بێ.

(مُّقِيمٌ ): واتە: بەردەوام، (أَقَامَ بالْمَكَانِ إِقَامَةً، فَهُوَ مُقِيمٌ).

کەسێك کە لە شوێنێك دەمێنێتەوە بە بەردەوامیی، پێی دەگوترێ: (مُقِيم)، (نَعِيمٍ مُقِيم)، واتە: نازو نیعمەتێكو خۆشیيو لەزەتێکی بەردەوامو نەبڕاوە.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـایـەتـەکـان

١) دەربـارەی هـۆی هـاتنە خـوارەوەی ئـەو ئـایەتـە موبارەکـەی کـە دەفـەرموێ:
﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾،
دوو گێڕدرانەوە هەن:

أ/ ﴿عَنِ النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: رَجُلٌ مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ، إِلاَّ أَنْ أُسْقِيَ الْحاجَّ. وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ، إِلاَّ أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَقَالَ آخَرُ: الْجِهادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ، فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ، وَقَالَ: لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ يَومُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ، دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ ...﴾﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، بِرقم: (١٨٣٩٣)، وَمُسْلِمٌ، بِرقم: (١٨٧٩)، وَالبَزَّار، بِرقم: (٢٧٧١)، وَالطَّبَرَانِي فِي (الصَّغير) بِرقم: (٤٢١)، وَالبَيْهَقِي فِي (الكُبْرَى) بِرقم: (١٨٩٦٠)، وَأَبِي عَوَانَة، بِرقم: (٧٣٥٢)}.

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: من لە لای مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ بووم (لە مەدینە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا ﷺ) پیاوێك گوتی: لە دوای مسوڵمان بوون ئەگەر ئـاو بـدەم بە حاجییان، هیچ ئیشی دیکە، نەکەم بەلامەوە گرنگ نیە، (ئەوەندە کارێکی گەورەیە)، یەکێکی دیکەیان گوتی: من لە دوای مسوڵمان بوونم‌و هاتنم بۆ نێو ئیسلام، بەلامەوە گرنگ نیە هیچ کارێك نەکەم، مەگەر خزمەتی مزگەوتی حەرام بکەم، یەکێکی دیکەشیان، گوتی: تێکۆشان لە ڕێی خوادا لەوەی ئێوە گوتتان،

چاکترو گەورەترە، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، کە لەوێ بوو، تێوەی خوڕین و، دەنگی دان، گوتی: لەلای مینبەری پێغەمبەر ﷺ دەنگ بەرز مەکەنەوە، وە ئەو ڕۆژە ڕۆژی جومعە بوو، وە گوتی: کە نوێژی جومعەم کرد، دەچمە ماڵی پێغەمبەر ﷺ، پرسیاری لێدەکەم لەوبارەوە کە ئێوەی تێدا کەوتوونەتە ڕا جیایی، (ئیدی دیارە عومەر خوای لێ ڕازی بێ، دوای نوێژی جومعە چووە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە پرسیاری لێکردوە)، خوای زاڵی پایەداریش ئەو ئایەتەی ناردۆتە خوار.

هەڵبەتە بە پێی ئەم ڕیوایەتە بێ، دەبێ ئەم ئایەتە دەربارەی مشتومڕی نێوان مسوڵمانان هاتبێتە خوارێ.

ب/ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ العَبَّاس بْن عَبْدُ المُطَّلِب حِيْنَ أُسِرَ يَوم بَدْرٍ: لَئِنْ كُنْتُم سَبَقْتُمُونَا بالإِسْلَامِ وَالهِجْرَةِ وَالجِهَادِ، لَقَدْ كُنَا نَعْمُرُ المَسْجِدِ الحَرَامَ، وَنَسْقِي الحَاجّ وَنَفُكُّ العَانِيَ، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ ...﴾، يَعْنِي ذَلِكَ كَانَ فِي الشِّرْكِ، ولاَ أَقْبَلُ مَا كَانَ فِي الشِّرْكِ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيّ ج١٠، ص٦٧، والسيوطي في (الدر المنثور فِي التفسير المنثور) ج ٤، ص ١٤٥، وَابْنُ أَبِي حَاتِم بِرقم: (١٠٠٦٦)، وَقَالَ مُؤَلِفَا الإِسْتِيعَاب فِي بيان الأسباب: قُلْنَا: هَذَا إِسْنَادٌ حَسَن، ج٢، ص٢٦٧}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: عەبباسی کوڕی عبدالمطلب (کە دەکاتە بابی وی، وە مامی پێغەمبەر ﷺ (کاتێك لە جەنگی بەدر بە دیل گیرا، بە مسوڵمانانی گوت: ئەگەر ئێوە پێش ئێمە مسوڵمان بوون و، کۆچتان کردوە و، جەنگتان کردوە و لە ڕێی خوادا تێکۆشاون، ئێمەش لە مەککە مزگەوتی حەرامان خزمەت دەکرد، وە ئاومان دەدا بە حاجییان، وە دیلمان بەردەدان، خوای پایەدارو زاڵیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾.

واتە: ئایا ئاودان بە حاجییانو، خزمەتکردنی مزگەوتی حەرامتان، پێ وەك کردەوەی کەسێکە، کە ئیمانی هەیە بە خواو بە ڕۆژی دواییو، بە سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا تێدەکۆشێ؟!

یانی: مادام ئەو کردەوانەتان لە کاتێکدا کردوون، کە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، (خوا دەفەرموێ:) ئەوە هیچ کردەوەیەکتان لێ وەرناگرم لە حاڵێکدا کە ئێوە لە شیرك دان.

هەڵبەتە من دڵم بەلای ئەوەدا دەچێ، کە ئەوەی دووەمیان زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەکان دا دەگونجێ، هەرچەندە ئەوەی یەکەمیشیان گونجاوە، بەو واتایە کە ئەوە مشتومڕی نێوان مسوڵمانان بووبێ، بەلام ئایەتەکان هەموویان موناقەشەو وتووێژو موجادەلەو مشتومڕن، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران دا.

هەڵبەتە ئەوەش کە عەبباس لە بەدردا وایگوتوە کە دەبێ دوای جەنگی بەدر وایگوتبێو، ساڵی دووەمی کۆچیی بووە، بەلام ئەم ئایەتانە لە ساڵی نۆیەم دا هاتوونەتە خوار، کە بێگومان ئەوەش پرسیارێکە حەوجێی وەلامە!

دەڵێین: دیارە ئەو فیکرەیە لەلای هاوبەش بۆ خوا دانەرانی مەککە هەر هەبووە، ئنجا کە عەبباس گوتوویەتی: لە دڵی ئەوانی دیکەش دا هەر هەبووە: {ئەی مسوڵمانینە! ئێوە مسوڵمان بوون، بەڵێ، بەلام ئێمەش خزمەتی مزگەوتی حەراممان کردوەو، ئێمەش ئاومان داوە بە حاجییانو، پەردەمان بۆ کەعبە کردوەو، ئێمەش وامان کردو وامان کردوە}، خۆیان بەو کردەوانە هەڵکێشاوە، واتە: مەرج نیە ئایەتەکە لە ساڵی دوو (٢)ی کۆچیی دا هاتبێتە خوارێ، ئەو کاتە نەهاتۆتە خوارێ، بەلام ئەو بیرۆکەیە هەبووەو لەنێو زەینی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دا هاتوچۆی کردوەو، لە مەجلیسان گوتوویانە، بۆیە خوای پەروەردگار بەرپەرچی داوەتەوە.

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـان

سـەرەتا خـوا ﷻ ڕایدەگەیـەنێ‌و دەفـەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴾.

هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرەکـان لێیـان ناوەشێتـەوەو، شایستـەی ئـەوە نـین، مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، هەڵبەتە خوێنراویشـەتەوە (مَسْجِدَ اللهِ)، واتـە: مزگەوتی خـوا، کە مەبەست پێی مزگـەوتی حەڕامـە، ئەگـەر ﴿مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ﴾ش بێ، مزگەوتەکانی خوا، یەکێکیان کە لە پێش هەموویانەوەیە، مزگەوتی حەڕامە، لێیـان ناوەشێتـەوە ئەوان مزگەوتەکانی خـوا ئاوەدان بکـەنەوەو خزمـەتیـان بکـەن، لە کاتێکدا شایـەدیی کوفر لەسەر خۆیان دەدەن.

لە موشـریـك بپرسـە: تۆ چی؟ دەڵـێ: من موشـریکم.

لە جوولـەکە بپرسـە؟ دەڵێ: من جوولـەکەم.

لە نەصرانیی بپرسـە؟ دەڵێ: من نەصرانییم.

ئنجـا دەفـەرموێ: ئـەوانە کـردەوەی باشیـان ئەگـەر هەشـبێ، هەڵوەشاوەتـەوە، بەهۆی ئەو شیـرك‌و کوفرەوە کە لە دڵ‌و دەروونیـاندا هەیە، وە لـە دۆزەخیشـدا بـە هەمیشـەیی دەمێننەوە.

ئنجا باسی ئەوە دەکات کە کێ شایستـەیی ئەوەیە، مزگەوتـەکـانی خـوا ئـاوەدان بکاتەوەو خزمەتیان بکـات؟ ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ

ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴾.

بێگومان مزگەوتەکانی خوا، تەنیا ئەوانە ئاوەدانیان دەکەنەوە، کە کەسێکن بڕوایان بە خوا هەیە، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە، نوێژ بەرپا دەکەن، زەکات دەدەن، وە جگە لە خواش لە کەس ناترسن، ئەوانە نیزیکە، وە ئومێدەواریی هەیە بۆیان، کە لە ڕێی ڕاست گرتووان بن، لە هیدایەت دراوان بن، وە شایستەی ئەوەن کە ماڵەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە.

دوایی خوای بەخشەر بە نکووڵیی لێکردنەوە، وە بە سەرزەنشتکردنەوە دەفەرموێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.

ئایا ئاو پێدانی حاجییانو خزمەتکردنی مزگەوتی حەرامتان، وەك کردەوەی کەسێك تەماشا کردو خستتانە دوو تا، تەرازووەوە، لەگەڵ کردەوەی کەسێکدا کە بڕوای بە خوا هەیە، وە بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەیە، وە لە ڕێی خوادا تێدەکۆشێو بە سەرو ماڵ فیداکاریی دەکات، ئایا وەك یەك تەماشایان دەکەن؟!

﴿لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، لەلای خوا یەکسان نین، وەك یەك نین.

﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاستو ڕاستە ڕێیان ناکات، کە هەر کەسێك ئەو بڕیارو حوکمە بدات بێگومان ستەمکارە، واتە: ئەوە حوکمێکی بێجێیە.

ئنجا خوای کارزان مەدحو ستایشی ئەو ئیماندارانە دەکات کە هەر ئەوان شایستەی ئەوەن مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوەو، لە پێش هەموویانەوە مزگەوتی حەرام،

دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ)، وە کۆچیان کردووە، ماڵو حاڵی خۆیان بەجێهێشتووە، چوون بۆ مەنزڵگای ئیسلام، ﴿ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴾، وە لە ڕێی خوادا تێکۆشاون بە سامانیانو بە گیانیان، ﴿ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، ئا ئەوانە پلەیان لەلای خوا بەرزترە، مەزنترین پلەیان هەیە، وە هەر ئەوانەش سەرفرازو بە موراد گەیشتوون، ﴿ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴾، پەروەردگاریان مژدەیان پێدەدا، بە بەزەیيو ڕەزامەندییەك لە خۆیەوەو بە چەند باخێك، كە نازو نیعمەتێكی بەردەوامو نەبڕاوەیان تێدا هەیە، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، کە بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾، بێگومان خوا پاداشتی مەزنی لە لایە، ئەوانیش شایستەی ئەو پاداشتە مەزنەن، خوای بەخشەر ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

__مەسەلەی یەکەم:__ کە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنفُسِهِم بِالْكُفْرِ ﴾.

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بۆیان نیە، ڕێیان ناکەوێو شایستە نین، مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوەو لە خزمەتیان دابن.

واتە: ئاوەدانکردنەوەی ماددیی: خزمەتکردنە، پاك ڕاگرتنە، بۆن خۆش کردنە، یان ئاوەدانکردنەوەی مەعنەویی، کە خواپەرستیی تێدا ئەنجام دانە، لە کاتێکدا کە شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن کەبێ بڕوان ﴿أُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ ﴿١٧﴾﴾، ئا ئەوانە کردەوە باشەکانیان هەڵوەوشانەوە، چونکە کردەوەی باش ئەگەر لەسەر بناغەی ئیمان دانەنرێ وەك دیواری بێ بناغە وایە، هەرەس دێنێ، وە ئەوانە لە ئاگردان، واتە: لە ئاگری دۆزەخدان بە هەمیشەیی دەمێننەوە■

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا، ئەوەیە کە خوا ﷻ پاش ئیعلانی بەرائەتو بێزاریی‌و دووریی خۆی‌و پێغەمبەرەکەی ﷺ وە لە دوای وانیشەوە، هی بڕوادارانی بەرانبەر بەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی پابەند نین بە پەیمانەکانیانەوە، ڕاگەیاند، وە ئیعلانی جەنگی لە دژ کردن، ئنجا وەك زەمینەسازیی بۆ بەرەنگاری هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، وە ڕێگرتن لە توخن کوتنیان بۆ مزگەوتی حەرام، دەست دەکات بە هەڵتەکاندنی بنەما فیکرییەکانی بێبڕوایەکان، وە بێ بایەخ پێشاندانی ئەو بەها بۆشانەی کە شانازییان پێوە دەکردن، وەك خزمەتی مزگەوتی حەرامو، ئاودان بە حاجییان ...

پاشان خوا بەراوردێك دەکات لە نێوان بڕوادارانێك دا، کە خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزانەن، کە لە ئیمانیانەوە پەیدا دەبن، وە بێبڕوایانێك کە خۆیان بە هەندێك شتی بۆشەوە هەڵدەکێشن، لە ڕەفتارە پووچەکانیان.

ئەوە هەمووی وەك زەمینەسازیی بۆ قۆناغی داهاتوو، کە بریتییە لە پاك کردنەوەی مزگەوتی حەرامو، وە کۆی نیوە دوورگەی عەرەبی، لە دەسەڵاتو هەیمەنەی ئەهلی کوفرو شیرك.

ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ ﴾

واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەران، شایستە نین وە لێیان ناوەشێتەوە، وە ناگونجێو شتێکی نامەتیقییە، کە ماڵەکانی خوا، یان مزگەوتەکانی خوا، ئاوەدان بکەنەوە، لە حاڵێکدا کە بێبڕوان، ئاخر بابای بێبڕوا چۆن دەگونجێ ماڵی خوا ئاوەدان بکاتەوە؟ بە چی ئاوەدانی دەکاتەوە؟

ئنجا ئەگەر خۆشی هەڵکێشێ بە هەندێك لە کردەوە چاکەکانەوە، بێگومان کردەوە چاکەکان ئەگەر لەسەر بناغەی ئیمان دانەنرێن، هەڵدەوەشێنەوە بەڵکو ئەوانە جێگایان ئاگری دۆزەخەو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێنەوە.

## سێ هەڵوەستەی کورت

هەڵوەستەی یەکەم: کە دەفەرموێ: ﴿أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ ﴾.

کە خوێنراویشەتەوە: (مَسْجِدَ اللهِ)، بە هەردوو خوێندنەوە (قراءة)کە هاتوە.

هەڵوەستەی دووەم: کە دەفەرموێ: ﴿أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ ﴾.

واتە: مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە.

(إعْمار) ئاوەدان کردنەوە، پێچەوانەی (تخريب) تێکدانو وێران کردنە، ئنجا ئایا مەبەست لە ﴿يَعْمُرُوا۟ ﴾، وە: ﴿وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، وەك لە ئایەتی دوایی دا هاتوە، چییە؟

وەڵام:

أ) یان بە مانای گشتیی خواپەرستییە، یانی: پەرستش ئەنجامدان بۆ خوا.

ب) یان مەبەست پێی ئەنجامدانی عومرەیە، عومرە کە بریتیە لە سەردانی ماڵی خوا بە تایبەت، وە عومرەش تایبەتە بە مزگەوتی حەرامو بە کەعبەوە، وەك حەج، تەنیا لەوێ ئەنجام دەدرێ.

ج) وە دەگونجێ مەبەست پێی پاك ڕاگرتنو خزمەتکردنی مزگەوتی حەرام بێ، پاك ڕاگرتنو بۆن خۆش کردنیو ... هتد.

د) وە دەشگونجێ مەبەست پێی دروست کردنو چاککردنەوەی بێ، کە هەندێ شوێنی کۆن دەبێو تێکدەچێ، چاك بکرێتەوەو بینا بکرێ.

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِ﴾.

واتە: شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن بە کوفر.

لەبەر ئەوەی لە هەر کامێکیان بپرسی: بیروبڕوایەکەی خۆی دەخاتە ڕوو، ئەوانەی کە هوبەلو لاتیان پەرستوە، عوززایان پەرستوە، مەناتیان پەرستوە بێ شەرمانە گوتوویانە: بەڵێ ئێمە عوززا دەپەرستین، مەنات دەپەرستین، لات دەپەرستین، هوبەل دەپەرستین، وە باقی بتەکانی دی، هەروەها ئەگەر لە خاوەنی هەر ئایینو بیروبڕوایەك بپرسی، بە شانازییەوە باسی بیرو بڕوای خۆی دەکات، لە جوولەکە دەپرسی، دەڵێ: بەڵێ جوولەکەم، لە نەصرانیی دەپرسی، دەڵێ: من نەصرانییم، مەسیحییم، لە ئێزیدیی دەپرسی، دەڵێ: من ئێزیدییم، لە مەجووسیی دەپرسی: دەڵێ: بەڵێ مەجووسییم، ئاگر پەرستم، بە شانازییشەوە، هەروەها هیندۆسێكو، گا پەرستێكو، بت پەرستێكو، تا کۆتایی.

کەواتە: ئەوانە لە هەرکامێکیان بپرسی، بە زمانی حاڵ شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن بە کوفر، ئەگەرنا مەرج نیە بڵێ: من کافرم، بەو واتایە، کە ئەگەر بزانێ وشەیەکی خراپە، بەکاری بێنێ، بەڵام بە زمانی حاڵ کوفرەکە لە خۆیان دا بەرجەستە دەکەنو، پێشانی دەدەن.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾﴾.

(إِنَّمَا)، زۆر جاری دیكە گوتوومانە: ئـامرازی كورت هەڵهێنـان‌و چەسپـاندنە. (أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات)، واتە: مانایەك لە شتێكدا كورت هەڵدێنێ‌و دەشیچەسپێنـێ.

كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ﴾، (مَن)، واتە: تەنیا ئەوانەماڵەكانی خوا، مزگەوتـەكانی خـوا، ئـاوەدان دەكەنەوە، بە هەموو شێـوەكانی ئـاوەدانكـردنەوە كە ئـەو پێـنج سیفـەتـەیان تێدان:

١ / ﴿ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾، بـڕوای بـە خـوا هەیـە، بـڕوا بـە خـوا بـوونی ڕاسـت‌و دروست، نـەك وەك لاف لێدان (إدّعاء).

٢ / ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾، وە بـڕوای بە ڕۆژی دوایی هـەیـە.

٣ / ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، وە نوێـژی بەرپـا كـردوە، كـە هــەقی خـوای پێـدەدات، هـەقی ڕواڵەت‌و هـەقی پـەنهانیی.

٤ / ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾، وە زەكـاتی داوە، نوێژ هـەقی خوایە جێبەجێی دەكـات، زەكاتیش هـەقی خـەڵكە، ئنجا وەك چۆن لـە ڕووی مەعنـەوییەوە، خـواپەرسـتە، لـە ڕووی ئـابوورییشـەوە خـەڵـك دۆسـتەو، لـە هـەموو ڕووێكـەوە پـابەندە بـە شـەریعەتـەوە.

٥ /﴿وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا﴾، وە بێجگە لە خواش لە كەسـی دی ناترسـێ.

خاوەنی ئەو پێـنج سیـفەتانە : ﴿فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ﴾.

نیزیكە ئـەوانە لـە ڕێـی ڕاسـت گـرتووان بن.

دیارە پێشتریش گوتوومانە: (عَسی)، بۆ هیواو ئومێدو (توقع) كردنە، بەڵام لێرەدا ئەوە پەیوەندیی بە خوای بەرزی بێ وێنەوە نیەو لە خوا ناوەشێتەوە بڵێی، لەوانەیە، یان ئومێد وایە، نەخێر، لە هەر شوێنێك كە خوای بێ هاوەڵ ئەو جۆرە وشانە بەكاردێنێ، هەمووی پەیوەندیی بە مرۆڤەكانەوە هەیە، مادام مانای ئومێدەوار بوون بگەیەنێ.

یانی: ئەگەر ئەو بڕوادارانە خاوەنی ئەو سیفەتانە بن، ئومێد وایەو لەوانەیەو، نیزیكە، لە ڕێی ڕاست گرتووان بن.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: لەوانەیەو نیزیكەو ئومێد وایە؟

وەڵام: چونكە ڕەنگە سیفەتەكانیان وەك پێویست تێدا نەبن، كە ئەو كاتە سەرەنجامو دەرەنجامەكە، كە لەو پێنج سیفەتانە پەیدادەبێو بەرهەمیانە، مسۆگەر نابێ.

كەواتە: خوای كارزان دەفەرموێ: تەنیا ئەو بڕوادارانەی كە خاوەنی ئەو پێنج سیفەتانەن ـ كە دیارە ئەو سیفەتانە، سیفەتەكانی دیكەش دەخوازن ـ تەنیا ئەوانە شایستەی ئەوەن كە مالەكانی خوا، مزگەوتەكانی خوا، وە لە پێش هەموویانەوە مزگەوتی حەڕام، ئاوەدان بكەنەوە، كە مزگەوتی حەڕام یەكەمین ماڵ بووە بۆ خوا لەسەر زەوی دابنرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: یەكەمین ماڵێك لەسەر زەوی دانراوە (پەرستشی تێدا بكرێ) ئەو خانوومیە، ئەو ماڵەیە كە لە مەككەیە، بە پیرۆزو (مایەی) ڕێنمایی یە بۆ هەموو جیهانییان .

## چەند فەرموودەیەك لە بارەی مزگەوتەوە

یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِداً يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللهِ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٤٣٤)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٤٣٩)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٥٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣١٨) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٧٣٦)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (١٦٠٩)}.

واتە: هەر کەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکات، کە مەبەستی پێی ڕووی خوا (ڕەزامەندیی خوا) بێ، خوا خانوویەکی لە بەهەشت لە بەرانبەرد بۆ دروست دەکات.

دووەم: ﴿عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نَتَّخِذَ الْمَسَاجِدَ فِي دِيَارِنَا، وَأَمَرَنَا أَنْ نُنَظِّفَهَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٠١٩٦ تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره}.

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب (کە یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین، کە مزگەوتان لە نێو ماڵو حاڵەکانی خۆمان دا دروست بکەین، وە فەرمانیشی پێ کردین، کە پاکیان ڕابگرین.

بە ڕاستیی پاكو بۆن خۆش ڕاگرتنی مزگەوتەکانو، حورمەت لێ گرتنیان کەمتر نیە لە ئەسڵی دروست کردنی مزگەوت، ئینسان جاری وایە دەچێتە مزگەوت، پیسو پۆخڵە، بۆنو بەرامەی ناخۆشی هەیە، یان بێسەرو بەرو نارێکە، هەر لەزەت لە عیبادەتو خواپەرستییەکەش ناکات، بۆیە ئەو هاوەڵە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین لە نێو ماڵو حاڵو گەڕەکەکانی خۆمان دا، مزگەوتان دروست بکەین، وە فەرمانیشی پێکردین، کە خاوێنیان ڕابگرین، بۆن خۆشیان ڕابگرین، وەك بۆ ماڵی خو شایستەیە.

سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿صَلاَةُ الْجَمِيعِ (وفِي رواية صلاة الجماعة) تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلاَتِهِ فِي سوقِهِ، خَمْسا وَعِشْرِينَ دَرَجة، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضأَ فَأَحْسَنَ، وَأَتَى الْمَسْجِدَ، لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، لَمْ يَخْطُ خَطوةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجة، وَحَطَّ عَنْهُ خَطِيئة، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، وَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَتْ تَحبِسُهُ، وَتُصَلِّي عَلَيْهِ الْمَلاَئِكة مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي يُصَلِّي فيهِ: اللهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يُؤْذِ فِيهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٧٤٢٤)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٤٦٥)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٦٤٩)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٥٥٩)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٧٩٩)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٢٠٤٣)}.

واتە: نوێژی بە کۆمەڵ (لە ڕیوایەتێك دا دەفەرموێ: نوێژی پێکەوە) پاداشتی زیاترە لە نوێژی مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا بە تەنیا، یان لەو نوێژەی کە لە دوکانو بازارەکەی دا دەیکات بە تەنیا، بە بیستو پێنج (٢٥) پلە، (ئنجا دەفەرموێ:) یەکێك لە ئێوە ئەگەر دەستنوێژێکی باشو پوختو ڕێکی گرت، دوایی چوو بۆ مزگەوت، تەنیا مەبەستی نوێژ کردن بوو، هیچ مەبەستو هاندەری دیکەی نەبوو، ئەوە هیچ هەنگاوێك نانێ، مەگەر خوا پلەیەکی بەو هەنگاونانە بەرەو مزگەوت بۆ بەرز دەکاتەوە، وە گوناهێکیشی لێ دەکەوێنێ (هەر بەو هەنگاوە) هەتا دەچێتە مزگەوت، ئنجا کە چووە مزگەوت، هەتا بەهۆی نوێژەوە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، وەك لە نوێژدابێ وایە، وە فریشتەکان دوعای بۆ دەکەن، هەتا لەو شوێنە بێ، کە نوێژی تێدا کردوە، دەڵێن: ئەی خوایە ! لێی ببوورە، ئەی خوایە ! بەزەییت پێیدا بێ، بەڵام بە مەرجێك ئازاری خەڵکی نەدابێ، (بۆ نموونە: بۆنێکی ناخۆشی لێ نەیە، هەر جۆرە بۆنێك بێ، بۆنی خواردنێکی ناخۆش، یان بۆنی جگەرە، یاخود هەر بۆنێکی دیکە، کە لە ئینسان پەیدا دەبێ، خەڵك بێزا نەکات بە قسەو ڕەفتاری خراپ).

چوارەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ وَالثُّومَ وَالْكُراثَ، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلاَئِكة تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدم﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٥١٩٨)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٥٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (١٨٠٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسائِي فِي (الكبرى) برقم: (٦٦٨٥)}.

واتـە: هــەر کەســێك پیــازو ســیــرو کــەوەر یــان (سیـرمۆکـە)ی خــوارد، بـا نیـزیکی مزگەوتـەکەمان نەکەوێ، چونکــە بـە هەمــان شــت کـە مرۆڤەکانـی پێ نـاڕەحـەت دەبـن، فریشـتـەکانیش پێی نـاڕەحــەت دەبـن.

دیـاره مرۆڤەکـان بـە بۆنــی نـاخــۆش نـاڕەحـــەت دەبـن، فریشـتـەکـانیش بـە هـەمان شـێوە.

<u>مەسەلـەی سێیــەم</u>: کــە دەفــەرموێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٩﴾﴾.

خــوای بــێ نیــاز بــە نکوولّــیی لێکــردنەوەو بــە ســەرزەنشــتو گلـەییــەوە. دەفــەرموێ: ئـایــا ئــاوەدان بــە حـاجییــانو خزمــەتی مزگــەوتی حەرامتــان، وەك کــردەوەی کەســێك دانــا، کـە بـڕوای بـە خــوا هەیـە، وە بــڕوای بـە ڕۆژی دوایــی هەیـە، [redacted] لـە ڕێی خـوادا تێکۆشـاوەو فیـداکاریی کـردوە بـە سـەرو مـاڵ، ئـایـا وەك یـەکتـان تـەماشا کـردن؟!

﴿لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ﴾، بـەڵام لـەلای خـواو، لـە تـەرازووی خــوادا، یـەکسـان نیـن، وە خـوا کۆمەڵی سـتـەمکاران ڕێنمـایی نـاکاتو نـایانخاتـە سەر ڕێی ڕاست.

کە ئــەوە ســتــەمە، تۆ بێنــی تـەنیـا ئــاوەدان بـە حاجییــانو، پــەردە کــردن بۆ کەعــبەو، یــاخود پــاك ڕاگـرتنــی مزگــەوتی حــەرام، یــان نــۆژەن کــردنەوەی، کــە موشریکەکـانی قوڕەیشو هـاوبەش بۆ خــوا دانەرەکـان، شـانـازییـان پێـوە دەکـرد. یـەکسانی بکەی لەگەڵ کردەوەی کەسێکدا، کـە بـڕواداره بـە خــواو ڕۆژی دوایــی. وە سـەرو ماڵی خۆیشی لـە پێنـاوی خـوادا بەخـت دەکـات!.

دیاره ئێمە پێشـتـریش باسمان کردو، دوو گێڕدراوە (روایـة)مان هێنان، وە ئەو کـات گـوتمان: هۆی هاتنەوە خوارەوەی دووەم، لـە مانایەکەی نیزیکتـره، چونکـە دوێــندراو (مخـاطـب) لەم ئـایەتـە موبارەکەدا: ﴿أَجَعَلْتُمْ ...﴾، هـاوبەش بۆ خـوا دانەرەکـانن.

بەڵام وەك گوتمان: ڕیوایەتی دیکەش هەیە لەوبارەوە بە پێی ئەو ڕیوایەتەش، دەبێ دوێندراو(مخاطب) لەم ئایەتەدا مسوڵمانان بن، چونکە مسوڵمانان مشتومڕیان بوو لەوبارەوە:

١ - یەکێکیان دەیگوت: لە دوای مسوڵمان بوون، ئەگەر ئاو بدەم بە حاجییان، پێم لە هەموو کردەوەیەك گەورەترە.

٢ - ئەوی دیکەیان دەیگوت: دوای مسوڵمان بوون، خزمەتی مزگەوتی حەڕامم پێ لە هەموو شتێك گەورەترە.

٣ - یەکی دیکەش گوتی: نەخێر، جەنگو جیهاد لە پێناوی خواداو فیداکاریی لە پێناوی خوادا، لە هەموویان گەورەترە.

ئنجا دوای ئەوەی عومەری کوڕی خەتتابیش تێوەی خوڕینو سەرزەنشتی کردن[1]، گوتی: لە لای مینبەری پێغەمبەر ﷺ دەنگ بەرز مەکەنەوە، بەڵام دوای نوێژی جومعە، من دەچمە خزمەتیو لێی دەپرسم، لەبارەی ڕا جیاییتان، ئنجا کە چوو، لێی پرسیو خوای شارەزاش بەو بۆنەوە ئەم ئایەتەی نارد خوار، کە بەو پێیە بێ، دەبێ خوای کارزان پشتگیریی ڕای کەسی سێیەمی کردبێ، کە گوتوویەتی: تێکۆشانو فیداکاریی لە پێناوی خوادا، لە هەموو ئەو کردەوانەی کە ئێوە باسیان دەکەن، گەورەترە لە دوای ئیمان.

---

١) پێشتر دەقی ڕیوایەتەکەمان هێنا.

## کاروبارە ئیدارییەکانی قورەیش پێش ئیسلام

شایانی باسە کە خوا ﷻ لێرەدا باسی دوو شتان دەکات:

١ / ﴿ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ ﴾، ئاودان بە حاجییان، کە لێرەدا مەبەست پێی تێکڕای حاجییانە، ئەوانەی کە دەچن حەج دەکەن.

٢ / ﴿ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، وە ئاوەدان کردنەوەو خزمەتکردنی مزگەوتی حەرام.

ئنجا پێویستە بزانرێ کە، دە (١٠) جۆرە پێگەو کردەوە، لە نێو خەڵکی مەککەدا هەبوون، لە نێو هۆزی قورەیش کە لە مەککە دا نیشتەجێ بوون، وە خۆیان بە خاوەنی مزگەوتی حەرام دەزانی، وە لە نێو خۆیان دا چەند تیرەیەك بوون و کاروبارەکانیان ئاوا دابەش کردبوون:

١) (السِّقَايـة)، واتە: ئاودان بە حاجییان، کە ئەوە هی (بنو هاشم) بوو، خزمانی پێغەمبەر ﷺ، وە کاتێك ئیسلام هات، عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، ئەم ئەرکەی بە دەستەوە بوو، واتە: ئەرکی ئاودان بە حاجییان.

٢) (السِّدَانَـة أو السَّدَانَـة)، کە پێشی گوتراوە: (العِمَارَة وَالحِجَابَـة) هەمووی بە مانای خزمەتکردنی مزگەوتی حەرام و کەعبەو، پەردە بۆ کردنی و، پاك ڕاگرتنی و، بۆن خۆش کردنی، دێن، ئەوانەش هی تیرەی (بني عبد الدار) بوون.

شایانی باسە : (بنو هاشم)و (بني عبد الدار) و تیرەکانی دیکەش هەموویان لە هۆزی قورەیشن.

هۆز چەند تیرەیەکە، ئێمە بە کوردی دەڵێین: هۆز، تیرە، بەڵام ئەوان دەڵێن: (قبيلة القريش) ئنجا ئەوانە، وەك عەشیرەت تەماشا کراون.

وە کاتێك ئیسلام هات، سەرپەرشتییکردنی خزمەتی مزگەوتی حەرام، بە دەستی (عثمان بن طلحة)ەوە بوو.

٣) (الدِّیات وَالحمَالاَت) خوێنو صوڵح کردنو خوێندان، ئەوەش هی (بنو تیم بن مرَّة) بوو، وە کە ئیسلام هات بە دەست (أبو بکر الصدیق)ەوە بوو، خوا لێی ڕازی بێ، کە ئەگەر خوێنێك خۆش کرابایە، یان کەسێك قەرزێکی کەوتبایە سەر بەهۆی صوڵحەوە، کە (حمالة)یان پێگوتوە، (أبو بکر الصدیق) خوا لێی ڕازی بێ سەرپەرشتیی ئەوەی دەکرد، وەك نوێنەری: تیرەی: بەنی تەیمی بەنی موڕڕە، کە ئەوانیش تیرەیەك بوون لە تیرەکانی قوڕەیش.

٤) (السِّفارة)، نوێنەرایەتیی، بۆ پەیوەندیی یەکانو صوڵح لەگەڵ تیرەو هۆزەکانی دیکەدا، ئەمە هی (بنو عدي) بووە، واتە: تیرەی عومەری کوڕی خەتتاب، وە کاتێك ئیسلام هات، ئەو ئەرکە بە دەستی عومەری کوڕی خەتتابەوە بوو، خوا لێی ڕازی بێ.

٥) (الرَّایة)، واتە: ئاڵا هەڵگرتن، کە (العُقَاب)ی پێی گوتراوە، واتە: (هەڵۆ) ئەویش هی (بنو أُمیة) بووە، وە کاتێك کە ئیسلام هات، بە دەستی ئەبو سوفیانەوە بوو، کە ئەو نوێنەری تیرەی بەنو ئومەییە بووە.

٦) (الرِّفَادَة)، واتە: خاوەن ئازووخە بوون، ئازووخەو مەسرەفو خەرجیی، ئەوەش هی تیرەی: (بنو نوفل) بووە، (بنو نوفل بنو عبدالمناف) کە کاتێك ئیسلام هات، بە دەست (حارث بن عامر بن نوفل)ەوە بووە.

٧) (المَشورة)، کە شوێنی ڕاوێژکردنیان پێی گوتراوە: (دَارُ النَّدوَة)، مەنزڵگای ڕاوێژ کردن، وە (دار الندوة)، وەك پەرلەمانی ئێستا بووە، تێیدا دانیشتوون، ڕاو تەگبیریان تێدا کردوە، بیرو ڕایان تێدا گۆڕیوەتەوە، کە ئەوە هی تیرەی: (بنو أسد بن عبدالعزة بن قصي) بووە، وە کاتێك کە ئیسلام هاتوە، بەدەستی (زید بن زمعة)وە بووە.

٨) (الأَعِنَّةُ أَو القُبَّة)، چادرێکی گەورەیان هەڵداوە، وە لەوێدا سوپا ڕێکخراوەو تەرتیب کراوەو، نەخشەی جەنگ دانراوە، وە ئەوە هی تیرەی (بنو مخزوم)

بووەو، کە ئیسلام هاتوە بە دەست خالیدی کوڕی وەلیدەوە بووە، بە نوێنەرایەتیی تیرەکەی خۆی.

٩) (الحُكُومَـة وأَمْـوَال الآلهـة)، حکوومەتیشیان پێ گوتوە، وە (أمْـوَال الآلهـة)شیان پێ گوتوە، کە وەك خوا پەروەردگار باس دەکات، دەفەرموێ:

﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ...(١٠٣)﴾ المائدة.

ئنجا ئەو ئاژەڵانە کە نەزریان کردوون، یاخود بە چەند هۆیەکەوە بەرهەڵدایان کردوون، یاخود نەزریان کردوون بۆ بتەکانیان، ئەو پارەیەی کە لەوانە هاتۆتەوە، یاخود خەڵکێك کە پارەی داناوەو بۆ کەعبە، یان بە حیساب بۆ بتەکان، ئەوانە کۆکراونەوە وە ئەوە بە دەست تیرەی (بنو سهم) بووەو، کە ئیسلام هاتوە، بە دەستی (الحارث بنُ القيس بنُ السهم)ەوە بووە.

١٠) (الأَيْسار وَهِيَ الأَزْلام)، (الأزلام)، کۆی (زلم)ە، کە قوماریان پێکردوون، یاخود (یانسیب)، کە قورعەیان پێ کێشاون، وە ئەمە بەدەست (بَنو جُمَح)ەوە بووە. وە کاتێك کە ئیسلام هاتوە بەدەستی (صفوان بن أمية بن خلف)ەوە بووە[١].

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئازادکردنی مەککە، هەموو ئەوانەی هەڵوەشاندەوە، چونکە ئەمە، یانی: بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، وەك نیمچە دەوڵەتێك. بۆیە پێغەمبەر ﷺ جگە لە یەکەمو دووەم، واتە: (السِّقَاية) و (العِمَارَة).

﴿سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ﴾، ﴿وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾، ئەو هەشتەی دیکەی هەموو هەڵوەشاندنەوە، وەك لە فەرموودەیەکدا لە کاتی وتارە مێژووییەکەی لە حەجیماڵئاواییدا، لە (حجة الوداع)دا دەفەرموێ:

{ألا إنَّ كُل مَأْثَـرَةٍ مـن مآثـر الْجَاهِلِيـة، تَحْـتَ قَدَمَـيَّ هاتَـيْنِ إلاَّ سِـقَايـة الْـحاجِّ وَ سِـدَانَـةَ الْبَيْـتِ}[٢].

---

١) التحرير والتنوير، ج ١٠ ، ص ١٤٤- ١٤٥، مَحَمَّد الطاهر بنُ عاشور.

٢) التحرير والتنوير: ج١٠، ص١٤٥.

واتە: ئاگاداربن! هەموو پێگەیەك {كە پێیان گوتراوە: (مآثر)}، هەموو ئەو ئەرکانەی کە لە سەردەمی نەفامیی دا تیرەکانی قورەیش لە نێو خۆیاندا دابەشیان کردوون، لە ژێر ئەو دوو پێیانەم دایە، بێجگە لە ئاودان بە حاجییان، وە خزمەتی مزگەوتی حەرام‌و خزمەتی کەعبە.

دیارە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی هەڵنەوەشاندبانەوەو، ئەوانە هەموویان مابانەوە، مانای وایە ئیسلام هیچی نەکرد، بەڵام ئەو دووانە، چونکە لەگەڵ ئامانجە شەرعییەکان دا تێك ناگیرێن، وە ئیسلام عادەتی وایە هەر شتێك لەگەڵ ڕووحی شەریعەت‌و لەگەڵ ئامانجە شەرعییەکاندا تێك نەگیرێ، دەیهێڵێتەوە، هەموو شتێك ژێرەو ژوور ناکات، بەڵکو ئەو شتانە لا دەبات، کە لەگەڵ ئیسلام‌و لەگەڵ ئامانجە شەرعییەکاندا دژ دەوەستن.

**مەسەلەی چوارەم‌و کۆتایی**: کە دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَرِضۡوَٰنٖ وَجَنَّٰتٖ لَّهُمۡ فِيهَا نَعِيمٞ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٢٢﴾ ﴾.

ئەو سێ ئایەتە بەپێزە لەبارەی یەك بابەتەوە دەدوێن، ئەویش بریتیە لەوە کە خوا ﷻ مەدح‌و ستایشی بڕواداران دەکات، بڕواردارانی کۆچکەر، وە بڕوادارانی تێکۆشەر بە سەرو ماڵیان لە پێناوی خوای بێ هاوتادا، دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی ئەو سێ سیفەتەیان هەن: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ﴿ وَهَاجَرُواْ ﴾، ﴿ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ﴾.

١ / ﴿ ءَامَنُواْ ﴾، واتە: بڕوایان هێناوە، بەڵام بە چی؟

لە هەموو قورئاندا مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا ئەوەی کە ئیمانی پێ هێنراوە، باس نەکراوە، تەنیا لە دوو سێ شوێن دا باسکراوە، بۆ وێنە دەفەرموێ:

ا - ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴿١٧٧﴾ ﴾البقرة.

لێرەدا هەر پێنج پایە سەرەکییەکەی ئیمان باس کراون.

ب - لە ئایەتی (٢٨٥)ی سوورەتی (البقرة)شدا دەفەرموێ: ﴿ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ﴿٢٨٥﴾ ﴾، لێرەشدا چوار پایەکانە ئیمانی باسکراون، بۆیە لە هەموو شوێنەکانی دیکەی قورئاندا، بە زۆریی وایە هەر دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئیمانیان هێنا، بەچی؟

بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، ئەوە بۆ کورت کردنەوەیە، واتە: ئیمانیان هێنا بە خواو بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەران، وە بە رۆژی دوایی، وە بە قەدەر، وە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خواوە هەواڵی پێداون.

٢ / ﴿ وَهَاجَرُوا۟ ﴾، واتە: کۆچیان کردوە، دیارە لە مەککەوە کۆچیان کردوە، لە شوێنەکانی خۆیانەوە کۆچیان کردوە، هاتوون بۆ مەدینە، کە ئیسلام کردوویەتی بە مەنزڵگای سەرەکیی خۆی، لە سەرەتاوە.

٣ / ﴿ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴾، وە تێکۆشاون لە رێی خوادا بە سامانەکانیانو بە گیانەکانیان، واتە: سەرو ماڵیان لە پێناوی خوادا بەخشیوە، ئەوانەی خاوەنی ئەو سێ سیفەتە سەرەکییەن، خوای پەروەردگار بە حەوت برگە باسی پاداشتەکەیان دەکات:

یەکەم: ﴿ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانە پلەیان لەلای خوا مەزنترە، لە هەر هەر کەسێکی دیکە، هەڵبەتە لێرەدا مەرجیش نییە بۆ بەراورد بێ، مەگەر ئەو بەراوردە لەگەڵ کردەوەی هەندێ خەڵکی دیکە دا بێ، بۆ وێنە

ئەوانەی کە مسوڵمان بوون، گوتوویانە: ئێمەش ئاو دەدەین بە حاجییان، یان خزمەتی کەعبە دەکەین، یان فلاّن کارە دەکەین، خوا ﷻ دەفەرموێ: خاوەنی ئەو کردەوانە پاداشتیانو پلەیان لەلای خوا مەزنترە، ئەگەرنا ئەگەر بە بەراوردبێ، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دا، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە مەزنترە، یانی: ئەویش (شیرکیش)! مەزنە، بەڵکو بە ڕەهایی (مطلق)ی هەر ئەوانە پلەی مەزنیان هەیە، چونکە ئەهلی کوفرە هەر بەراورد ناکرێنو، هەر ناچنە تەرازووەوە، لەگەڵ ئەهلی ئیمان دا.

دووەم: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾، وە ئا ئەوانەن سەرفرازان، ئا ئەوانەن بە موراد گەیشتوان، چونکە (فوز)، بریتیە لەوەی کە ئەوەی ئینسان دەیەوێ، پێی بگاتو بە سەلامەتییش پێی بگات.

سێیەم: ﴿يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ﴾، پەروەردگاریان موژدەیان پێدەدا، بە بەزەییەك لە لایەن خۆیەوە بە زەییەکی تایبەت، بەزەیی پێیاندا دێتەوەو ڕەحمیان پێ دەکات.

چوارەم: ﴿وَرِضۡوَٰنٖ﴾، واتە: (رضوان مِنْهُ)، ئنجا زانایان دەڵێن: (رضوان): (الرِّضا الكامِلُ الشَّدِيد، لإنَّ هَذِهِ الصِّيْغَةُ تُشْعِرُ بالمبالغة، مثلُ الغفران والعصيانِ).

(رِضوان) واتە: ڕەزامەندییەکی بەهێزی تەواو، چونکە ئەم صیغەیە زێدەڕۆییو تۆخیی دەگەیەنێ، وەك (عصیان)، واتە: زۆر سەرپێچیی کردن، وە (غفران)، واتە: زۆر لێبوردن، وە هەموو ئەو وشانەی دی، کە بەو صیغەیە هاتوون، هەمان واتا دەگەیەنن.

پێنجەم: ﴿وَجَنَّٰتٖ لَّهُمۡ فِيهَا نَعِيمٞ مُّقِيمٌ﴾، {وە خوا موژدەیان پێدەدا بە} چەند باغێك کە نازو نیعمەتێکی بەردەوامو نەبڕاوەیان تێدا هەیە.

(نَعیم)، بریتیە لەوەی کە نەفس چێژ وەربگرێ لە لەزەتە بەرهەستەکان. وە (نَعیم) لە (نعمة) تایبەتترە، یانی: هەموو (نعیم)ێك نیعمەتی تێدایە. بەڵام مەرج نیە هەموو نیعمەتێك (نعیم) بێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾، دەڵێ: (المقیم: المُسْتَمِرُّ، اسْتُعِيرَ الإِقَامَةُ لِلدَّوَامِ وَالإِسْتِمْرَارِ) کەسێك کە لە شوێنێك نیشتەجێ بێ، مانای وایە لەوێ بەردەوام دەبێ‌و مانەوەکەی درێژە دەکێشێ. لەوەوە بۆ ئەوە خوازراوەتەوە.

شەشەم: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، لە نێو ئەو هەموو نازو نیعمەت‌و باخچەو باغ‌و گوڵزارەدا کە رووباریان بەژێر دادەڕۆن، بە هەمیشەیی، واتە: هەتا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە.

حەوتەم: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾، بێگومان خوا پاداشتی مەزنی لەلایە.

لەوبارەوە با فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بێنین، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ اللهَ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، يَقُولُونَ: لَبَّيْكَ، رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَى، وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالُوا: يَا رَبَّنَا وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١١٨٥٣)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦١٨٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٨٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٥٥٥)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٧٤٤٠)}.

واتە: خوا بە خەڵکی بەهەشت دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! دەڵێن: لە خزمەت داین ئەی پەروەردگارمان، بۆ هەر شتێك مایەی ڕەزامەندیی تۆ بێ ئامادەین، خوا دەفەرموێ: ئایا ڕازی بوون‌و، خۆشنوودن بەوەی کە پێم داون، دەڵێن: ئنجا بۆ ڕازی نەبین شتێکت بە ئێمە داوە، کە بە هیچ کاه لە دروستکراوەکانی خۆتت نەداوە، خواش دەفەرموێ: باشتر لەوەی پێم

داون، پێتـان دەدەم، ئـەوانیش دەڵێـن: ئـەی پـەروەردگـارمان! ئنجـا چ شتێك لەوەی پێتداوین، باشـترە؟ دەفەرموێ: ڕەزامەندیی خۆمتـان بەسـەردا دەڕێـژم، کە لە دوای ئەوە، هەرگیز لێتـان تووڕە نابـم.

لە کۆتایی ئەم دەرسەمان دا، بە باشی دەزانم چەند قسەیەکی جوان لـە (محمد رشید رضا)ەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە لە تەفسیـری ئەم ئایەتـانەدا هێناونی، بیانهێنم، دەڵێ:

(ومن تَنَطُّع بعض الصوفية في فلسفتهم ، أنهم لا يطلبون من اللهِ النجاة من النـّار، ولا الفـوزَ بالجنّـة، وإنمـا يطلبـون الروحـانيـة الأعلـى فقـط، وهـو لـقاؤه ورضوانه ورؤيته عز وجل، وإنَّهـا لفلسفـة جَهْلَيّـة مـن نزغات المنكرين للنَّعيم الجسمانيِّ مُخالِفَة لنصوص كتاب الله تعالى وهدي رسوله ﷺ)[1].

واتـە: لە زۆر ڕۆچوونو قسەی نەگونجاوی هـەندێك لـە صۆفییەکان، کـە لـە فەلسەفەکەی خۆیاندا دەیڵێن، دەڵێن: ئێمە لە خوا ناپاڕێینەوە کە دەربازمان بکـات لـە ئـاگـری دۆزەخ، هەروەهـا لێشـی ناپاڕێینـەوە کـە بـە بەهەشـتمان شـاد بکـات، بەڵکـو ئـەوان تـەنیـا نـازو نیعـمەتی ڕووحـانیی هـەرە بـەرز، لـە خـوا داوا دەکەن، کە بریتیـە لـە دیداریـی خـوا، وە ڕەزامەنـدیی خـوا، وە بـە دیداریی خـوا شـاد بوونو دیتنـی خوا ﷻ ! وە ئـەوە فـەلسەفـەیەکی نەفامانـەیـە، وە ڕیشەکـەی لـەو فیکـرەو فـەلسەفـەیـەوە دێ، کـە نکووڵیی دەکـەن لـەوە کـە مرۆڤـەکـان بـە جـەسـتە زینـدوو ببنـەوە، لە ڕۆژی دوایـی دا، دەڵێن: ئینسانەکـان تـەنیـا بـە ڕووح لـە نیعمـەت دا دەبـن، یـاخود لـە سـزادا دەبـن، وە ئـەوە پێچەوانەی دەقـەکـانی کتێبـی خـوای بـەرزو، ڕێو شـوێنی پێغـەمبـەری پێشـەوامانە ﷺ .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

[1]) تفسير القرآن الحكيم: ج١٠، ص ٢٠٩.

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان، پێنج (٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (٢٣ تاکو ٢٧). خوای زاناو توانا ﷻ سەرەتا بۆ جاری یەکەم، لەو شەش جارەی کە لەم سوورەتەدا. هاتوون بە نازناوی ئیمان، بڕواداران دەدوێنێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، وە پێیان دەفەرموێ: کە باب‌و برایان بە دۆست نەگرن، ئەگەر کوفریان بەسەر ئیماندا هەڵبژارد، وە هەر کەسێك دۆستایەتیی باب‌و باپیری یان برایەکانی بکات، لە حاڵێك دا کە کافرن، وە نهێنیی مسوڵمانانیان پێ ڕابگەیەنێ، وە یارمەتییان بداتو، کەین‌و بەینیان لەگەڵیان دا هەبێ، ئەوە ستەمکارە.

دوایی خوا ڕایدەگەیەنێ، کە هەر کەس باب‌و کوڕو براو هاوسەرو خزم‌و ماڵ‌و سامان‌و بازرگانیی‌و خانووبەرەیەك، کە لەلای خۆشەویستە، لە خواو پێغەمبەر ﷺ‌و تێکۆشان لە ڕێی خوادا، لەلای خۆشەویستتر بن، ئەوە دەبێ چاوەڕێی سزاو تۆڵەو جەزرەبەی خوا بێ.

ئنجا خوا ﷻ وە بیر بڕوادارانی دێنێتەوە، کە لە زۆر شوێنان سەری خستوون. لە زۆر جەنگان دا، سەرەتا لە جەنگی بەدردا، ئنجا لە جەنگی ئوحودیش دا خوای میهرەبان لە فریای مسوڵمانان هات، بۆ ئەوەی کافران زەبری زیاتر لە مسوڵمانان نەدەن، دوایی لە جەنگی خەندەق دا، کە ئەحزابیشی پێ دەگوترێ، هەروەها لە جەنگ لە دژی: (بني قريظة)دا، وە لە دەرکردنی: (بني قينقاع و بني النضير)دا، کە پەیمانیان شکاند، وە پاشان لە جەنگی خەیبەردا، وە لە ئازادکردنی مەککەدا، وە بە تایبەتییش لە جەنگی حونەیندا، کە سەرەتا خوا دەفەرموێ: بە زۆرییەکەتان

سەرسام بوونو، پێتان وابوو مادام زۆرن، دوژمن پێتان ناوێرێ، بەڵام زۆرییەكەتان دادی نەدانو، سوودی پێنەگەیاندن، وە تێشكان، وە دنیای فراوانتان لێ وەتەنگ هات، وەك گوتراوە: (كونە مشكی لێ بوو بە قەیسەریی).

بەڵام دوایی خوا ئارامی ڕژاندە سەر دڵی پێغەمبەرەكەی ﷺ، وە سەر دڵی بڕوادارانیش، وە سەربازی نەبینراوی ناردن، كە مەبەست پێی فریشتەكانن، وە كافرەكانیشی بە دەستی مسوڵمانان سزادان.

وە خوا دوایی ڕایدەگەیەنێ: كە هەر كەسێك خوا بیەوێ، دەگەڕێتەوە سەریو تۆبەی لێ قبووڵ دەكاتو لێی دەبووری.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ
ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلۡ
إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ
ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٞ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم
مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا
يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ
حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ
عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن
يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٧﴾ ﴾ .

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بابو باپیرانتانو برایەکانتان، ئەگەر کوفریان بەسەر ئیماندا هەڵبژارد، بە دۆست مەگرن، وە هەر کامێکتان بە دۆستیان بگرێ، ئەوانەن ستەمکاران (٢٣) بڵێ: ئەگەر بابو باپیرانتانو، کوڕانتانو، برایانتانو، هاوسەرانتانو، خزمانتانو، ئەو سامانانەی وەدەستتان هێناونو، بازرگانییەك كە مەترسیی بێ ڕەمێن بوونیتان هەیەو، خانووبەرە دڵ پەسندەكانتان، لە خواو پێغەمبەرەكەیو، تێكۆشان لە پێناوی خوادا، لە لاتان خۆشەویستترن، ئەوە چاوەڕێ بن، هەتا خوا كاری (سزادانی) خۆی دێنێ، وە خوا ڕێنمایی كۆمەڵی لە ڕێ دەرچووان ناكات (٢٤) بە دڵنیاییەوە خوا لە زۆر ڕووداوی جەنگاندا سەریخستن، هەروەها لە ڕۆژی جەنگی حونەین دا، كە زۆرییەكەتان سەرسامی كردن، (پێتان وابوو لەبەر ژمارەی زۆرتان تێناشكێن)، كەچی هیچ دادی نەدانو، زەوی بەو فراوانییەی لێتان وەتەنگ هات، پاشان بە پشت لە دوژمن كردنەوە، ڕاتانكرد (٢٥) بەڵام دوایی خوا هێمنیی خۆی دابەزاندە سەر دڵی پێغەمبەرەكەیو، سەر دڵی بڕواداران، وە سەربازانێكی دابەزاندن، نەتاندەبینین، وە ئەوانەی بێبڕوا بوون (بە دەستی بڕواداران) سزای دان، وە هەر ئەوەش سزای بێ بڕوایانە (٢٦) ئنجا پاش ئەوە، خوا هەر كەسێكی بوێ (بە لێبوردن) دەگەڕێتەوە سەری، وە خوا لێبوردەو بە بەزەیی یە (٢٧))).

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱسْتَحَبُّواْ ): واتە: زۆریان خۆشویستوە، یاخود هەڵیان بژاردوە، دەڵێ: (الإستحباب: تحرِّي الإنسان للشيء يُحِبُّهُ، وتَعديتهُ بـ(على) يقتضي الإيثار).

وشەی (استحباب): بریتیە لە خەفتانی ئینسان لە شتێك كە خۆشی بوێ، وە وەختێك بە (على) تەعەددا دەكات {بۆ (مفعول)} ئەوە مانای هەڵبژاردن دەگەیەنێ.

كەواتە: دەشگونجێ بڵێی: (استحبُّوا )، واتە: زۆریان خۆشویستوە، خۆشەویستییەك كە لە دڵیان دا جێگیر بووە، چونكە هەردووك پیتی (س. ت) كە دەچنە سەر كردارێك، ئەوە جەختكردنەوە (تأكيد) دەگەیەنێ، (سين و تاء)، وەك (إستقامة)، واتە: زۆر ڕاوەستاو، (قامَ) واتە: ڕاوەستا، (إستقام) واتە: چاك ڕاوەستا، وە (استبشر)، واتە: زۆر دڵ خۆش بوو.

(وَعَشِيرَتُكُمْ ): (العشيرة: أهل الرجل الذين يتكثَّر بهم أي يصيرون له بمنزلة العدد الكامل، وذلك أن العشرة هو العدد الكامل).

(عشيرة): بریتیە لە خزمو كەسی ئینسان، كە خۆی بەوانەوە زۆر دەكات. واتە: وەك بڵێی بۆی دەبن بە ژمارەی تەواو، چونكە (عشرة)، واتە: دە (١٠) كە ژمارەی تەواوە، هەندێكیشیان گوتوویانە لە (عُشرَة) هاتوە، ئەوانەی كە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ دەكاتو مامەڵەیان لەگەڵ دەكات.

(ٱقْتَرَفْتُمُوهَا ): واتە: وە دەستتان هێناوە، (الإقتراف: الإكتساب وفِي الإساءة أكثر: استعمالاً).

(اقتراف)، واتە: وەدەست هێنان، بەڵام زیاتر بۆ خراپە بەكاردێ، بەڵام بۆ چاكەش جارجار بەكاردێ، عەرەب گوتوویانە: (الإعتراف يُزِيلُ الإقْتَرَاف)، دانپێداهێنان

خراپەکردن بەرانبەر بە کەسی بەرانبەر لادەبا، واتە: مادام (إعتراف)ی کرد، یانی دانی بە هەڵەی خۆی داهێنا، مانای وایە خراپەکەی دەسڕێتەوە.

(وَتِجَـٰرَةٌ ): (التجارة : التصرُّف فِي رأس المال طلباً للربح).

(تجارة): بریتیە لە هەڵسوکەوت کردن لە سەرمایەدا، بە مەبەستی قازانج وەدەست هێنان.

(كَسَادَهَا ): (كَسَدَ: يَكْسُدُ : لَمْ يَرُجْ وَلَمْ يَنفق).

کە دەگوترێ: (کسادها)، واتە: بێ ڕەمێنو بێ ڕەواج بوونیو لە برەو کەوتنی، (كَسَدَ يَكْسُد)، واتە:بێ برەو بوو، چاك خەرج نەبوو، وە ڕەمێنی نەبوو.

(وَمَسَـٰكِنُ ) کۆی (مسکن)ە، واتە: خانوو بەرە (سَكَنَ فُلاَن مَكَانَ كَذَا: استوطنه، واسم المكان: مسكن، جمعه مساكن).

دەگوترێ: فلاَن کەس لە فلاَن شوێندا نیشتەجێ بوو، (سَكَن)ی بۆ بەکاردێ، وە ناوی شوێن (مکان)ەکەی بریتیە لە (مسکن) کە بە (مساکن) کۆ دەبێتەوە، واتە: خانوو، خانووبەرەکان.

(فَتَرَبَّصُواْ ) واتە: چاوەڕێ بن، (التربُّصُ: الإنتظار بالشيء، أمرٍ ينتظر زوالَه، أو حصولَه).

(تربص): بریتیە لەوەی کەسێك چاوەڕێی شتێك بێ، چ چاوەڕێ بێ لابچێ، یاخود چاوەڕێی شتێك بێ پەیدا بێ.

(مَوَاطِنَ ): (الوطن: محلُّ الإنسان، الموطن مشهد من مشاهد الحرب).

وشەی (وطن): ئەو شوێنەیە کە ئینسان تێیدا دادەنیشێ ، وە (موطن)، واتە: دیمەنێك لە دیمەنەکانی جەنگ، یاخود شوێنێکە جەنگێکی تێدا دەقەومێ،

واتە: شەڕگە، وە خودی جەنگەکەش پێی دەگوترێ: (موطن)، بۆ وێنە: (موطن بَدْر)، (موطن أُحُد)، واتە: جەنگی بەدر، جەنگی ئوحود.

(أَعْجَبَتْكُمْ)، واتە: سەر سامی کردن، دەڵێ: (أَعْجَبَنِي كَذَا: رَاقَنِي)، واتە: پێی سەرسام بووم، پێم گرنگ بوو، جێی سەرنج بوو.

دەگوترێ: (مُعْجَبٌ بِنَفْسِهِ: يروقُه نَفْسُهُ)، واتە: ئەو کەسە بەخۆی سەرسامە، خۆی پێ گرنگەو لە بەرانبەر خۆیدا، سەرسامەو سەرسووڕماوە.

(حُنَيْنٍ): دەڵێ: (مَكان مَعْرُوف، وأَوْطَاس: مَوْضُعَان بَيْنَ مَكة وَالطَّائِف (هَوَازِن)).
شوێنێکی زانراوە، کە (أوطاس)یشی پێ دەگوترێ، هەردووکیان دوو شوێنن لە نێوان مەککەو طائیف دا، کە دیارە هۆزی هەوازین کاتی خۆی لەوێ بوون.

(رَحُبَتْ): دەڵێ: (الرُّحْبُ: سعة المكان، وَرَحُبَتِ الدار).

(رُحْب)، بە فراوانیی شوێنێك دەگوترێ، وە دەگوترێ: (رَحُبَتِ الدَّار)، واتە: خانووەکە فراوانە، خانووێکی فراوانە، وە کە بە کەسێك دەگوترێ: (مَرْحَبًا بِكُمْ)، واتە: تۆ هاتوویت بۆ شوێنێکی فراوان، جێی تۆ دەبێتەوە، بە ڕێزو حورمەتەوە وەردەگیرێی.

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـــان

خوای پاكو تاك بۆ جاری یەكەم لە شەش جاران، كە لەم سوورەتە موبارەكەدا مسوڵمانان بە نازناوی ئیمان، كە خۆشترین نازناوە لەلایەن، دەیاندوێنێ، ڕوو دەكاتە بڕواداران لەم سوورەتەدا، هەڵبەتە تەنیا بە نازناوی ئیمان، ئەگەرنا هەموو سوورەتەكە هەر لە سەرەتای تا كۆتایی، دواندنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە بڕوادارانیش لە پشتیەوە، یاخود بڕواداران ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، با بە نازناوی ئیمانیش لە سەرەتاوە باس نەكرابن، بۆ وێنە: كە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ ﴿١٦﴾ ﴾ التوبة، كە دیارە دوێنراو لێرەدا بڕوادارانن: ئایا پێتان وایە وازتان لێ دەهێنرێ، بەرلەوەی خوا ئەوانەتان بزانێ (بناسێ) كە تێكۆشانیان كردوە.

ئنجا بۆ جاری یەكەم خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، كە پێویست ناكات هەموو جارێ دووبارە بكرێتەوە، واتە: بڕواتان هێناوە بە خوا ﷻ، بە فریشتەكانی خوا، بە كتێبەكانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە ڕۆژی دوایی، وە بە هەموو ئەو شتانەی كە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە لایەن خواوە هەواڵی پێداون، بڕواتان بە هەمووی هێناوە، ﴿ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ ﴾، بابو باپرانتانو برایەكانتان (كە نیزیكترین كەستانن) بە دۆستو خۆشەویست، وە بە جێگای ڕازو نیازتان مەگرن، واتە: مەیانكەنە جێی ڕازو نیازو خۆشەویستیی خۆتان، لەسەر حیسابی مسوڵمانان، ﴿ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ﴾، لە حاڵێكدا كە ئەوانە كوفر بەسەر ئیماندا هەڵدەبژێرن، وە كوفریان پێ چاكترە، واتە: مادام لەسەر كوفربن، مەیانكەنە جێی متمانەو ڕازو

نیازتان، بەڵكو ئەوەی كە جێی متمانەو جێی ڕازو نیازتانە، وە نهێنییەكانی خۆتانیان لەلا دەدركێنن، با تەنیا ئەو بڕوادارانە بن كە لەگەڵتان لە ئیماندا پێك دەگەنەوە.

﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾، وە هەر كەسێك لە ئێوە دۆستایەتییان بكات، بێگومان ئا ئەوانە ستەمكارانن، دۆستایەتییان بكات، بەو واتایە نا، كە سەلام‌و مەرحەبای لەگەڵیان هەبێ، ڕێزیان بگرێ، خزمەتیان بكات. چونكە فەرزە ئینسان خزمەتی باب‌و دایكی خۆی بكات، خزمەتی براو خوشكی خۆی بكات، بەڵكو خزمەتی خزم‌و كەسی خۆی‌و دەرو دراوسێی خۆی بكات، بگرە خزمەتی خەڵك بە گشتی بكات، خزمەت‌و ڕێزگرتن‌و قسە خۆشیی‌و ڕوو خۆشیی، لەگەڵ هەموو كەسدا پێویستە، بەڵام بە دۆست گرتن، كە تۆ بیكەیتە جێی نهێنییەكانت وە پشتی پێ ببەستی، ئا ئەوەیان قەدەغەیە، نابێ لەگەڵ جگە لە ئیمانداراندا. بەو شێوەیە مامەڵە بكرێ.

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾﴾.

كە بە ڕاستی ئەمە پێوەرو تەرازوویەكی زۆر گەورەو گرنگە، خوای پەروەردگار دەیخاتە دەستی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە دەیخاتە دەستی بڕواداران، كە خۆیان‌و خەڵكی پێ هەڵسەنگێنن، دەفەرموێ: بڵێ : ئەگەر باب‌و باپیرانتان، كوڕانتان، برایانتان، هاوسەرانتان، خزم‌و عەشیرەتتان، ماڵ‌و سامانێك كە وەدەستتان هێناوە بازرگانییەك كە دەترسێن بێ ڕەمێن‌و بێ ڕەواج بێ‌و لە برەو بكەوێ (بەهۆی ئیمان هێنانتانەوە، یان بەهۆی جەنگ‌و جیهاد كردنتانەوە)، وە خانوو بەرەیەك كە دڵ پەسندتانەو خۆشتان دەوێ، لەلاتان خۆشەویستترن، لە خواو لە

پێغەمبەرەکەی ﷺ و لە تێکۆشان لە پێناوی خوادا، ئەگەر ئەوانە هەر هەشتیان لە تای تەرازوویەکدا بن، وە تێکۆشان لە پێناوی خوادا، بە مەبەستی ڕازیکردنی خوا، بە مەبەستی جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تای تەرازوویەک دابێ، ئەگەر تا تەرازووی ئەو هەشتانەتان قورستتر کرد، ئەوە مانای وایە ئێوە لە ئیمانی خۆتان بکەوتە گومانەوە، ﴿فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ﴾، چاوەڕێ بن تاکو خوا کاری خۆی دێنێ، ئنجا ئایا کاری خۆی چییە کە دەیهێنێ؟

بۆیە بە شێوەیەك کە نەزانراو (مجهول)ە خوای زاناو شارەزا باسی دەکات، تاکو زەمین بۆ هەموو شتێك بچێ: خوا سزاتان دەدات، بەڵاتان بۆ دەنێرێ، یاخود: تاکو خوا مەرگتان بۆ دەنێرێ، وە دوایی سزاتان دەدات، هەمووی دەگرێتەوە، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾، وە بێگومان خوا کەسانی لاڕێ ڕێنمایی ناکات‌و، نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، کەسێك کە لە ڕێ دەرچووبێ‌و بۆخۆی بیەوێ لاڕێ بێ، خوا بە تۆبزی نایهێنێتەوە سەر ڕێ، چونکە خوا بڕیاری داوەو ویستی وابووە کە مرۆڤەکان لەم سەر زەوییە ئازادانە خۆیان ڕێی ڕاست بگرن، یان ڕێی چەوت بگرن.

﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ۝٣﴾الإنسان، واتە: ئێمە ڕێی ڕاستمان پیشانداوە، یان سوپاسگوزار دەبێ، یاخود سپڵەو ناسوپاس دەبێ.

گرنگ ئەوەیە کە خوای کارزان بە تۆبزیی کەس ناکاتە مسوڵمان‌و سوپاسگوزار، هەروەك بە تۆبزییش کەس ناکاتە نا سوپاس‌و بێ بڕوا.

ئنجا خوا ﷻ ڕوو دەکاتە بڕواداران‌و، ئەو نیعمەتی سەرخستن‌و پشتگرتن‌و هاوکارییکردنی خۆی، لە کاتە مەترسییدارو لە کاتە هەستیارەکاندا بۆ بڕواداران، دەخاتەوە بیریان‌و دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ۝٢٥﴾، بێگومان خوا لە

زۆر جەنگان دا ئێوەی سەرخست، لە زۆر ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاربوونەواندا. ئێوەی سەرخستو پشتی ئێوەی گرت، کە ئەوە ئاماژەیە بە جەنگی بەدر پێش هەمووی، پاشان بە جەنگی ئوحود، کە هەرچەندە مسوڵمانان زیانیان هەبوو، بەڵام لەچاو ئەو ژمارە زۆرەی کافران، کە پێنج ئەوەندەی مسوڵمانان بوون، وە لەچاو ئەو سەرپێچییەی مسوڵمانان لە فەرمانی لە پێغەمبەر ﷺ باشیش دەرچوون.

هەروەها ئاماژەیە بە جەنگی ئەحزاب، کە مسوڵمانان خوا دەربازی کردن، وە جەنگ دژی (بنـي قريظـة)، وە دژی جوولەکەکانی خەیبەر، هەروەها دەرکردنی هەردوو تیرەی پەیمان شکێنی: (بنو قینقاع) و (بنو النضیر) هەروەها ئازادکردنی مەککە، هەروەها دەربازبوونی ئەو سوپا سێ هەزار (٣٠٠٠) کەسییەی کە دوو سەد هەزار (٢٠٠.٠٠٠) لە ڕۆمەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە، لە جەنگی (مؤتـة)دا کە سێ لە فەرماندەکانیان شەهید بوون: (زَيْدُ بْنُ حارِثة) و (جَعْفَرُ بْنُ أَبي طَالِبٍ) و (عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ)، وە دوایی خالیدی کوڕی وەلید ئابلووقەکەی دوژمنی شکاندو هێزەکەی دەرباز کرد.

ئەو ڕستەیە ئاماژەیە بە هەموو ئەمانە، بەڵام بە تایبەت ئاماژە بۆ جەنگی حونەین دەکات دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا﴾، وە لە ڕۆژی جەنگی حونەینیشدا، {(حنین) ناوی شوێنێکە لە نێوان مەککەو طائیف دا}، کە زۆرییەکەتان سەرسامی کردن، بەڵام هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، زۆرییەکەتان دادی نەدان، پێتان وابوو بەهۆی زۆرییتانەوە سەردەکەون. ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾، زەوی بەو فراوانییەیەوە لێتان وەتەنگ هات، وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: (دنیای لێ بووە بە چەرمی چۆلەکە). ﴿ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾، دواییش پشتتان لە دوژمن کردو ڕاتان کرد، واتە: شکان.

بەڵام لەوێش دیسان خوا لە فریاتان هات، ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾، دوایی خوا ئارامیی خۆی ڕژاندە سەر دڵی پێغەمبەرەکەی، وە سەر دڵی بڕواداران، وە سەربازانێکی ناردنە خوار، کە ئێوە نەتاندەبینین (کە فریشتەکانن) وە ئەوانەی بێبڕوا بوون، ئازاری دان و سزای دان (واتە: بە دەستی بڕواداران) هەر ئەوەش سزای بێبڕوایانە.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ﴾، ئنجا دوای ئەوەش خوا تۆبە وەردەگرێ، لە هەر کەسێك کە بیەوێ، واتە: لەو کافرانەی کە شەڕیان لە دژ کردووە و، سەنگەریان لێ گرتووە و پەیمانیان شکاندوە ئەگەر لەمەودوا مسوڵمان بن، چ هۆزی هەوازن و غەطەفان، چ هۆزی قورەیش، هەموو ئەو هۆزانە، هەر کەسێك لەوانە بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، خوا دەگەڕێتەوە سەری، واتە: تۆبەی لێ وەردەگرێ، ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾ ﴾، وە بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبان و بە بەزەیی یە، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی تۆبە لە ئێمەش قبووڵ بکات، وە بگەڕێتەوە سەر ئێمەش بە لێبوردەیی و بەزەیی خۆی.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

ڕاستە مانایەکەی ئاوایە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! (بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ)، بابو باپیرانتانو برایانتان بە دۆست مەگرن، ئەگەر کوفریان بەسەر ئیماندا هەڵبژارد، وە هەر کام لە ئێوە بە دۆستیان بگرێ، لە حاڵێکدا کە ئەوان بێبڕوان، ئەوە ئەوانەن ستەمکاران.

لێرەدا مەبەست لە (تَوَلِّي)، واتە: بە دۆست گرتن، ئەوە نیە کە تەنیا پەیوەندییەکی ئاسایی بێ، وەك پەیوەندیی بابو دایكو ڕۆڵەیی، یاخود پەیوەندیی برایەتیی، یان خوشکایەتیی، بەو واتایە کە هەردووکیان کچو کوڕی بابو دایکێکن، یاخود براو خوشکی بابو دایکێکن، کە ئەوە پەیوەندییەکی ئاساییە، وە ئاساییشە ئینسان بابو دایکی خۆی خۆش بوێن، وە براو خوشکی خۆی خۆش بوێن، با لەسەر کوفریش بن، وەك خۆشەویستییو سۆزی ڕەچەڵەکیی، کە ئەوە شتێکی غەریزەییو شتێکی سروشتییە، بەڵام نابێ ئەو کوفرەی ئەوان لەسەرینی. وە ئەو هەڵسوکەوتە ناشەرعییانەی ئەوان دەیکەن، نابێ ئەومت خۆش بوێو. پەسندت بێ، چونکە ئەوە کوفرە (الرِّضا بالكُفْرِ كُفْرٌ)، ڕازیی بوون بە کوفر. کوفرە، کەواتە: لێرەدا مەبەست لە: ﴿ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ ﴾، مەبەست ئەوە نیە کە وەك خۆشەویستییەکی ئاسایی، وەك سۆزی خزمایەتییو ڕەچەڵەك خۆشت بوێن، ئەوە بێگومان لە شەریعەتدا ڕێگا دراوە. چونکە بۆ وێنە: پیاوی مسوڵمان ئەگەر ئافرەتێکی کیتابیی بێنێ، (جوولەکە

یاخود نەصرانیی)، کە بە تەئکیدیش ئینسان هاوسەری خۆی خۆش دەوێ، وەك خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴿٢١﴾ ﴾الروم.

واتە: لە نیشانەکانی پەروەردگارێتیی خوا، ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان هاوسەرانێکی بۆ رەخساندوون، (بەنسبەت پیاوانەوە، ئافرەتانو، بەنسبەت ئافرەتانەوە، پیاوان)، ﴿لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا ﴾، تاکو ئێوە بەهۆی ئەوانەوە ئارامییتان بۆ بێ، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾، وە لە نێوانتاندا خۆشەویستیی‌و سۆزو بەزەیی داناوە.

ئنجا کاتێك پیاوێکی مسوڵمان هاوسەرەکەی خۆی، کە جوولەکەیە، یان نەصرانییە، خۆشدەوێ، دیارە وەك هاوسەر خۆشیدەوێ، نەك وەك جوولەکەو نەصرانیی.

کەواتە: لێرەدا مەبەست لە (تولّي)، قەدەغەکراو، ئەوەیە کە پشتیان بگریو هاوکاریان بی، لەسەر ئەو رێبازە کوفرەی کە ئەوانی لەسەرن، یاخود ئەو کردەوانەی کە دەیانکەن لە دژی ئیسلامو مسوڵمانان.

(أبو جعفر الطبري)، لەوبارەوە دەڵێ: (لاَ تَتَّخِذُوا آبَاءكُمْ وَإِخوانكُمْ بِطَانَةً وَأَصْدِقَاء تُفْشُونَ إِلَيْهِم أَسْرارَكُم، وَتُطْلِعُونَهُمْ عَلَى عَوْرَةِ الإِسْلاَمِ وَأَهْلِهِ، وَتُؤْثِرُونَ المكْثَ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ عَلَى الهِجْرَةِ إِلى دَارِ الإِسْلاَمِ)[1].

واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ ﴾، واتە: باب‌و باپیرانتان‌و برایەکانتان، مەکەن بە جێی رازو نیازتان، وە مەیانکەن بە دۆست‌و نیزیکێکتان کە نهێنییەکانی خۆتانیان پێ بڵێن، وە ئاگاداریان بکەنەوە لە کەم‌و کورییەکانی ئیسلام‌و مسوڵمانان، وە کە لە نێویاندا بمێننەوەو، هەڵیبژێرین بەسەر کۆچکردندا بۆ مەنزڵگای ئیسلام.

---

١) جامع البيان، ج ٦ ، ص ١٠٣.

کەواتە: دەبێ وەك خۆیان لە وشەکانی خوای پەروەردگار تێبگەین، بۆئەوەی تووشی بڕیارو حوکمی هەڵە نەبین، بۆ نموونە : لێرەدا پێمان وابێ ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە باب‌و برات، یان خزمت، ئەگەر بێبڕوا بوون، نابێ سەلام‌و مەرحابایان لێ بکەی‌و، نابێ هاموشۆیان بکەی ! کە ئەوە ڕاست نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: لەسەر ئەو ڕێبازە کوفرەی کە ئەوانی لەسەرن، وە ئەو کردەوەی کوفرانەی کە ئەوان دەیانکەن، هاوکاریان مەبن‌و پشتگیریان مەکەن‌و خۆشتان نەوێن‌و لەگەڵیاندا مەبن، بەلام ئەگەر وەك هەست‌و سۆزی باب‌و ڕۆڵەیی، یان هەست‌و سۆزی دایك‌و ڕۆڵەیی، یان برایەتیی، یان براو خوشکایەتیی، یان خزمایەتیی، ئەوە بە تەئکید نەك ڕێی لێ نەگیراوە، بەڵکو فەرمانیشی پێکراوە.

وەك خوای بەخشندە لە سوورەتی (لقمان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٥ ﴾.

واتە: وە (ئەگەر باب‌و دایکت) هەوڵیان لەگەڵ دای، شتێك بکەیە هاوبەشی من، کە تۆ زانیارییت پێی نیە، (واتە: بوونی نیە، چونکە هاوبەش بۆ خوا بوونی نیە، تاکو زانیاری پێیەوە پەیوەست بێ) ئەوە تۆ بە قسەیان مەکە (لە هاوبەش بۆ خوا دانان‌دا)، بەلام لە کاروباری دنیاییاندا بە باشە مامەڵەیان لەگەڵدا بکە، وە بکەوە شوێن ئەو کەسانەی کە بۆ لای من گەڕاونەوە.

کەواتە: خۆش ڕەفتاریی‌و، بە چاکە مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو کەس د. بەتایبەتی لەگەڵ باب‌و دایك‌و براو خوشك‌و خزمان، با ئەهلی کوفریش بن، شتێکی فەرمان پێکراویشە، نەك هەر ڕێگا پێدراوە، بەلام ئەوەی کە لێرەدا قەدەغە کراود بریتیە لە خۆشویستنی بیرو بەرنامەکەیان، وە هاوکاریی کردنیان‌و پشتگرتنیان لەسەری، یان لەسەر ستەم‌و خراپە، وە یاخود ئاگادار کردنەوەیان لە نهێنییەکانی مسوڵمانان، وە گرتنیان بە جێگای ڕازو نیازو تەگبیرو ڕاوێژی تایبەت، کە ئەوانە

دەبێ تەنیا ئەهلی ئیمان بن، کە ئینسانی مسوڵمان ئەو جۆرە پەیوەندییانەی لەگەڵیاندا دەبێ، بەلام خۆشەویستیی‌و سۆزیی ئاسایی، وە ڕێز لێگرتن، وە چاکە لەگەڵدا کردن، ئەوە مسوڵمان فەرمانی پێکراوە، کە لەگەڵ هەموو کەسدا وابێ، چ جای خزمان! بەڵکو لەگەڵ هەر کەسێکدا کە لەگەڵی لەو وڵاتەدا دەژی، پێویستە بە چاکە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، وە لەسەر چاکە هاوکارییان بکات، وەك خوای کاربزان دەفەرموێ: ﴿لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة.

واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات، ئەوانەی کە لەسەر دینتان دژایەتییتان ناکەن، وە لە ماڵو حاڵی خۆتان وەدەرتان نانێن، (واتە: نە دژی دینتانن، نە دژی ژینتانن، خوا لێتان قەدەغە ناکات)، کە چاکەیان لەگەڵدا بکەن، (چاکەی مەعنەویی وەك ڕێز لێگرتن)، وە لە ماڵی خۆشتان پێیان ببەخشن‌و هاوکارییان بکەن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆش دەوێن.

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾﴾.

## پێوەرو تەرازووی مسوڵمانەتیی لە ئایەتی ژمارە (٢٤) دا

لێرەدا ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم ئایەتە بەپێزە، دەبینین خوا پێوەرو تەرازوویەکی زۆر ڕوون‌و ڕاشکاوی داناوە، بۆ ئەوە کە ئینسان خۆی پێ بناسێ: ئایا ئیمانی چەندە؟ تەقوای چەندە؟ خۆشەویستیی بۆ خواو بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ ئایینی خوا، چەندە؟ فیداکاریی لە پێناوی خوادا، چەندە؟ وە چەندە بۆ خوا، ساغ‌و یەکلا

بۆتەوە، ئەم ئایەتە لەوبارەوە پێوەرو تەرازوویەکی زۆر چاکە، خوا دەفەرمـوێ: پێیان بڵێ: ئەگەر باب و باپیرانتان و کوڕانتان، {هەڵبەتە کوڕانتان، یانی: کچانیشتان، چونکە جاری وایە وشەی: (أَبْناء) بە مانای ڕۆڵان (أولاد) دێ، بەڵام بۆیە بەس باسی کوڕانی کردوە، چونکە کلتوورو عادەتی ئەوکاتە وابووە کە خەڵك زیاتر کوڕی خۆشویستوە، چونکە بە پشت و پەناو جێی ئومێدی زانیوە، ئەگەرنا کچیش هەر ڕۆڵەیە}، وە برایەکانتان، وە هاوسەرانتان، (بەنسبەت پیاوەوە، ژنەکانیان. بەنسبەت ئافرەتانەوە مێردەکانیان)، وە تیرەو هۆزو خزمانتان، وە ماڵ و سامانێك کە بەزەحمەت وەدەستتان هێناوەو ئارەقەی نێوچەوانتان پێ ڕشتوە، وە بازرگانییەك کە دەترسێن ڕەمێنی نەمێنێ و لە برەو بکەوێ، وە خانووبەرەیەك کە دڵ پەسندتانەو خۆشتان دەوێ {ئەگەر هەموو ئەو هەشتانە} لە لاتان خۆشەویستترن، لە خواو لە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە لە تێکۆشان لە ڕێی خوادا، (ئەوە دیارە ئێوە شایستەی سزادانن لە لایەن خواوە، بۆیە) ﴿فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ﴾. چاوەڕێ بن تاکو خوا کاری خۆی دێنێ {تاکو خوا فەرمانەکەی دێنێ} وە بێگومان خوا ڕێنمایی کۆمەڵی لارێ بووان ناکات، نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

لێرەدا خوا ﷻ بە (و)ی (عطف)، ئەوانەی کۆکردۆتەوە، ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ ...﴾، واتە: ئەگەر ئەم هەشتە، هەر هەشتیان پێکەوە لە تای تەرازوویەکدا دابنرێن، خۆشەویستیی خوا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام و، فیداکاریی لە پێناوی خواو پێغەمبەرو، لە پێناوی ئیسلامدا، لە تای تەرازوویەکدا دابێ، ئەگەر ئەو هەشتە قورستر بوون، ئەوە مانای وایە ئێوە شایستەی ئەوەن کە خوای دادگەر سزاتان بدات، وە دەبێ لە ئیمان و موسوڵمانێتیی خۆتان، بکەونە گومانەوە، موسوڵمانەتییەکەتان نیشانەی پرسیاری لەسەرە! چونکە ئەگەر فەرمووبای: (قُلْ إِنْ كانَ آباؤُكُم أَوْ أَبْناؤُكُمْ أَو إِخوانُكُمْ)، واتە: هەر کامێك لەوانەی بە جیا جیا فەرمووبان، مانایەکی دی دەگەیاند، ئەویش ئەوەیە کە : خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی و جیهاد لە ڕێی خوادا، لەگەڵ هەر کامێکیان دەکێشرێ، بەڵام لێرەدا خوا دەفەرموێ: هەر

هەشتیان پێکەوە، واتە: دەبێ ئەگەر هەر هەشتیان پێکەوە، لە تای تەرازوو دابن، وە خۆشەویستیی خواو پێغەمبەر ﷺو تێکۆشان لە پێناوی خوادا، لە تایەکەی دیکەی تەرازوودا بێ، دەبێ خۆشەویستیی خواو پێغەمبەرو ئیسلام، لە هەموو ئەو هەشتانە قورستر بێ.

کە خوا دەفەرموێ : ﴿فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ﴾، وشەی (أمر)، دەڵێ: (الشأنُ وَالحال)، لە زمانی عەرەبییدا (أمر)، واتە: حاڵەت، کار، کە شتێکی روون نیە، چییە؟

لێرەدا بۆیە خوای کارزان بە نەزانراو (مُبْهَم)ی، هێناویەتی، تاکو زەین بۆ هەموو شتێك بچێ، تاکو خوا کاری خۆی دێنێ، کاری خوا چییە؟ زۆر شتان هەڵدەگرێ:

١) کافرەکانتان بەسەردا زاڵ دەکات، لە ئەنجامی ئەوەدا کە واز لە جەنگو جیهاد دێنن.

٢) خوا سزاتان دەدات.

٣) تاقیتان دەکاتەوە، ماڵو سامانەکەتان بەدەستەوە نامێنێ.

٤) لە قیامەت دا سزاتان دەداتو ... هتد.

بۆیە دیاریی نەکراوە، تاکو هەموو ئەوانە بگرێتەوەو زۆر شتی دیکەش.

لەوبارەشەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن، کە دەبێ مرۆڤ خواو پێغەمبەری خوای لە هەموو کەسێكو لە هەموو شتێك خۆشتر بوێن :

١ / پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإيمانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيهِ مِمَّا سِواهُمَا، وأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لايُحِبُّهُ إلاَّ للهِ، وأَنْ يَكرهَ أنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ كَمَا يَكرهُ أنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (١٦)، وَمُسْلِم، برقم: (١٦٤)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٢٦٢٤)} .

واتە: سێ شت لە هەر کەسێکدا هەبن، ئەوە شیرینی ئیمانی بەهۆی ئەو سێ شتانەوە چێشتوە: کە خواو پێغەمبەری خوای لە غەیری خۆیان

خۆشتر بوێن (هیچ شتێکی بە قەدەر خوا، وە پاشان بە قەدەر پێغەمبەر ﷺ خۆش نەوێ)، وە کە کەسێکی خۆشویست، تەنیا لەبەر خوا خۆشی بوێ، وە کە پێی ناخۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ کوفر، دوای ئەوەی خوا دەربازی کردوە لێی، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە نێو ئاگر.

٢ / پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَاسِ أَجْمَعِيْنَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٢٨٣٧)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد، برقم: (١١٧٥)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (١٥)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٤٤)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٥٠١٤)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٦٧)، وَالدَّارِمِيُّ، برقم: (٢٧٤١)، وَابْنُ حِبَّان، برقم: (١٧٩)}.

واتە: یەکێك لە ئێوە بڕوا ناهێنێ، تا منی لەلا خۆشەویستتر نەبێ، لە باب و دایکی و لە ڕۆڵەی و لە تێکڕای خەڵکی.

کە دەفەرموێ: بڕوا ناهێنێ، واتە: بڕوای تەواو ناهێنێ، هەندێکیش گوتوویانە: هەر لەسەر ڕواڵەتی خۆیەتی و، دەبێ ئینسان پێغەمبەری خوای ﷺ لە باب و دایکی و لە ڕۆڵەی و لە خۆی و لە تێکڕای خەڵك خۆشتر بوێ ئەوجار دەبێتە بڕواداری ڕاستەقینە.

بەڵام ڕای یەکەمیان لە ڕاستییەوە نیزیکترە با تەماشای ئەم دەقەش بکەین:

٣ / ﴿عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ هِشَامٍ[1]، قَالَ: كُنا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَر بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: يا رَسولَ اللهِ! لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، إلا نَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِن نَفْسِكَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: فَإِنَّهُ الآنَ، وَاللهِ لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي، فَقَالَ النبي ﷺ: الآنَ يا عُمَرُ﴾ {أخرجه أحمد، برقم: (١٨٠٧٦)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦٢٥٧)، وَالحاكِمُ، برقم: (٥٩٢٢)، والطبراني في الأوسط، برقم: (٣١٧)، والبزار، برقم: (٣٤٥٩)}.

---

١) هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَعَبْدُ اللّهِ بْنُ هِشَام: هُوَ جَدُّ زُهْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ، رَأَى النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ غُلامٌ صَغِيرٌ فَمَسَحَ رَأْسَهُ وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ. أنظر: شرح السنة للبغوي: باب حلاوة الإيمان، ص٢٤.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی هیشام دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین، ئەویش دەستی عومەری کوڕی خەتتابی گرتبوو، عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ لە لام خۆشەویستتری لە هەموو کەس، جگە لە خۆم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، (نابیە بڕوادری کامڵ) سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هەتا منت لە خۆشت خۆشتر نەوێ، عومەر خوای لێی ڕازی بێ، پێی گوت: بە خوا ئێستا، تۆم لە خۆشم خۆشتر دەوێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێستا ئەی عومەر! (ئیمانەکەت تەواوە)، کەواتە: پێشتریش هەر ئیماندار بووە، بەڵام دیارە ئیمانیش پلە پلەیە.

<u>**مەسەلەی سێیەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

لێرەدا خوا ﷻ چاکەو نیعمەتێکی زۆر گەورەی خۆی دێنێتەوە بیری مسوڵمانان، کە بریتیە لە پشتگیریی کردنو سەرخستنی بۆ ئیمانداران و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگەکاندا، لە کاتی بەرەنگاربوونەوەکانیاندا لەگەڵ دوژمناندا، دەفەرموێ: خوا ئێوەی لە زۆر جەنگاندا سەرخستوە، بە تایبەتی لە ڕۆژی حونەین دا، کە زۆرییەکەتان ئێوەی سەرسام کرد، بەڵام هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، وە سەر زەوی بەو فراوانییەی لێتان وەتەنگ هات، وە پاشان پشتتان لە دوژمن کردو ڕاتان کرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ﴾، وشەی: (مَوَاطِنَ)، کۆی (موطن)ە، (موطن)یش یانی: (مشهد الحرب)، دیمەنی جەنگ، یاخود خودی جەنگەکە، یان ئەو شوێنەی کە جەنگەکەی لێدەکرێ، دەنا ئەسڵی (وطن)، واتە: ئەو شوێنەی کە ئینسان تێیدا نیشتەجێیە، هەروەها (موطن)یش، ئەو شوێنەیە کە ئینسان لێی نیشتەجێ دەبێ، بەڵام بە پێی سیاق دەزاندرێ کە لێرەدا ﴿ مَوَاطِنَ ﴾، یانی: (معارك)، واتە: لە زۆر جەنگو بەرەنگاربوونەواندا، خوا ئێوەی سەرخست،

کە ئەوە ئاماژەیە بە :

١ - جەنگی بەدر.

٢ - بە جەنگی ئوحود ـ کە لە سەرەتاوە سەرکەوتنو دواییش دەگونجا زیانی زۆرتریان لێ بکەوێ ـ .

٣ - وە بە دەرکردنی هەردوو تیرەی پەیمانشکێنی جوولەکە: (بنو قینقاع و بنو النَّضیر).

٤ - هەروەها دوای ئەوانیش (بنو قریظة)، کە (بنو قینقاع و بنو النَّضیر)، بەبێ جەنگ، دوای ئەوەی کە پەیمانیان شکاند، لە مەدینەدا دەرکران، بەڵام (بنو قریظة)، بە جەنگ دەرکران.

٥ – وە جەنگی ئەحزاب کە خەندەقیشی پێ دەڵێن.

٦ - وە جەنگی خەیبەر.

٧ - وە فەتحی مەککە.

وە لە گەلێ جەنگی دیکەش دا خوای زاڵ و بەهێز بڕوادارانی سەرخستوە بە یارمەتی تایبەتی خۆی، ﴿وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ﴾، وە ڕۆژی حونەینیش، واتە: ڕۆژێك کە جەنگی حونەینی تێدا ڕوودا، کە لە کۆتایی دا سەری خستن، نەك لە سەرەتاوە چونکە سەرەتا بە زۆرییەکەتان سەرسام بوونو پێتان وابوو لەبەر ئەوەی زۆرن دوژمن پێتان ناوێرێ، بۆیە تێشکان، چونکە نەتانگێڕایەوە بۆ خوا، بەڵکو گێڕاتانەوە بۆ شانو شەوکەوتی خۆتان، بۆ زۆریی ژمارەتان، وەك دوایی دەیگەیەنێ، یەکێك لە هاوەڵان گوتی:

﴿لَنْ نُغْلَبَ اليَومَ مِنْ قِلة﴾[1].

---

١) صحیح البخاري: كتاب الجهاد والسير، باب قول الله تعالى :﴿ ... وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ ﴾ التوبة.

واتە: ئەمڕۆ ئێمە لەبەر كەمییان تێناشكێین، ئەگەر جاران لەبەر كەمییان تێشكابین.

بۆ وێنە: لە جەنگی ئوحودا كە مسوڵمانان دەوری (٦٠٠ ـ ٧٠٠) كەس بوون، وە سوپای ئەهلی كوفر سێ هەزار (٣٠٠٠) كەس بوون، واتە: ئەوان پێنج شەش هێندەی مسوڵمانان بوون، بەڵام ئێستا ئێمە لەبەر كەمییان تێناشكێین، چونكە لە جەنگی حونەین دا، مسوڵمانان ژمارەیان دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) كەس بوو، دە هەزار (١٠٠٠٠) كەس كە لە مەدینەوە هاتبوون بۆ ئازادكردنی مەككە، وە دوو هەزار (٢٠٠٠)یش لە تازە مسوڵمانانەكانی مەككە ڕەگەڵیان كەوتبوون، ئەوە دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) كەس، كەچی دوژمن كە هۆزی (غطفان) و(هوازن) بوون، وەك دوایی باسی دەكەین چوار هەزار (٤٠٠٠) كەس بوون، واتە: سوپای مسوڵمانان سێ هێندەی ئەوان بوو، بەڵام لە سەرەتاوە تێكشكان، هەڵبەتە دوایی باسی دەكەین كە هۆی تێشكانەكەش، ئەو دوو هەزار (٢٠٠٠) تازە مسوڵمانە بوون، كە كەسانی دڵ دەغەڵو دڵ نەخۆشیان تێدابوون، بەڵكو تێیاندا هەبوون زەلەمەكان (أزلام)یشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوون، كە قومارو یانسیبی پێ دەكردن! وە هەیان بوو كە بینی سوپای ئیسلام تێشكا، وەك (شماتة) گوتی: هەتا دەریای سوور خۆیان ناگرنەوە، یەكێكی دیكەیان گوتی: ئەمڕۆ سیحرەكەیان بەتاڵ بۆوە!

زۆر قسەی بێجێیان كردن، هەندێكیان هەر كافر بوون، وە بە زۆریی بۆ تاڵانو بۆ دەستكەوت هاتبوون، بۆیە كە (غطفان و هوازن)، بە دەستگەرمیی و كتوپڕ، خۆیان پێدا دان، خۆیان نەگرتو ڕایان كرد، وە سەریان لەوانی دیكەش تێكدا، بەڵام سەرەنجام دوایی چارەنووسی جەنگەكە هەر بە قازانجی مسوڵمانان شكایەوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا ﴾، یانی: زۆرییەكەتان هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، دەڵێ: (مَا يُغْنِي عَنْكَ هَذَا أَي: مَا يُجْزِيء عَنْكَ وَمَا يَنفَعُكَ)[1].

---

١) مختار الصحاح، ص ٤٤٨.

دەگوترێ: ئەو شتە (ما يُغْنِي عَنْكَ)، واتە: هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ. وە هیچ شتێکت لێ ناگێڕێتەوە.

﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾، وە زەوی بە فراوانیی خۆی، لێتان وەتەنگ هات.

لە کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (دنیای لێ بووە بە چەرمی چۆلەکە)، یان دەڵێ: (کونە مشکی لێ بۆتە قەیسەریی)، واتە: زەوی لە پێش چاوتان وەتەنگ هاتو، نەتاندەزانی بچنە کوێ؟ لە ترسی دوژمن! خوای دادگەر تانەو تەشەرێکی باشیان لێدەدات، بۆ ئەوەی جارێکی دی ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەنەوە.

هەڵبەتە خوا ﷻ خاتری کەس ناگرێ، پێغەمبەریش ﷺ هەڵەی کردبێ، لە بۆچوونێکی دا، لە کاتێکدا کە ئیجتیهادی کردبێ‌و نەیپێکابێ، خوا فەرموویەتی: هەڵەت کردوە، هەروەها هاوەڵانی بەڕێزیش خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوەتا خوای کاربەجێ لە چەند شوێنان سەرزەنشتیان دەکاو ڕەخنەیان لێ دەگرێ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾، دوایی پشتتان کردە دوژمن، وە هەڵاتن ﴿مُّدْبِرِينَ﴾، (أَدْبَرَ يُدْبِرُ إِدْبَاراً : أي مُنْهَزِمِين)، پشتتان لە دوژمن کردو ڕاتان کرد، جا توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەگەر خوا ﷻ نەیفەرمووبا: ﴿مُّدْبِرِينَ﴾، تەنیا ﴿وَلَّيْتُم﴾، واتە: پشتتان کردە دوژمن، جاری وایە ئینسان پشت دەکاتە دوژمن‌و، ئەوە تاکتیکی جەنگییە، یان پشت دەکاتە دوژمن، بۆ ئەوەی بچێ بۆلای کۆمەڵێکی دیکە لە جەنگاوەرانی ئیسلام، کە لەوێ باشتر جەنگەکەی بۆ دەکرێ، وەك لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴿١٦﴾﴾.

واتە: هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا، پاشیان تێبکات، مەگەر بۆ باو لێ دیتنەوەی جەنگو وەرسووڕان بۆ جەنگ، یاخود بۆ پەیوەندیی کردن بە کۆمەڵێکی دیکەی مسوڵمانانەوە، ئەوە خوا لێی تووڕە بووە، بەڵام کە لێرە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ وَلَّيْتُم﴾، پشتتان تێکردن بۆچی؟

﴿مُّدْبِرِينَ﴾، یانی: (مُنْهَزِمِين)، بە تێشکاویی‌و بە ڕاکردوویی، وەك گوتم: خوا زۆر بە ڕوونیی‌و ڕاشکاویی‌و بەبێ خاترگرتن، ئەو دیمەنەی ئەوان کە تێشکانیانەو ڕاکردنیانە لە بەرانبەر دوژمندا، دەیخاتە ڕوو، بۆ ئەوەی بۆخۆشیان‌و بۆ ئێمەش بۆ دوای ئێمەش، ببێتە جێگای دەرس‌و پەند، کە جارێکی دی ئینسان بێجگە لە یارمەتی خوا، بێجگە لە پشت بەستن بە خوا، پشت بە هیچی دیکە نەبەستێ‌و، دڵی بە هیچی دیکە خۆش نەبێ، بەڵێ : دەبێ هۆکارەکان ساز بکات، بەڵام دڵی بە خواوە پەیوەست بێ، هۆکارەکان (أَسْبَاب) هەن، بەڵام لە پشت هۆکارەکانەوە: ڕەخسێنەری هۆکاران (مُسَبِّب الأَسْبَاب) هەیە، کە هۆکارەکان دەجووڵێنێ.

<u>مەسەلەی چوارەم</u> : ئنجا خوای کارزان باسی قۆناغی دووەمی جەنگی حونەین دەکات‌و، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ  ﴾.

دوایی خوا ئارامیی خۆی ڕژاندە سەر دڵی پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ، وە بۆ سەر دڵی بڕوادارانیش، وە سەربازانێکی ناردنە خوارێ، کە نەتاندەبینین {کە مەبەست پێی فریشتەکانن}، وە (خوا) ئەوانەی بێبڕوان سزای دان‌و ئازاری دان (بەچی سزاو ئازاری دان؟ بێگومان بە دەستی مسوڵمانان)، وە هەر ئەوەش سزای بێبڕوایانە، واتە: هەر بەو شێوەیان لێدێ، ئەگەر لە بەرانبەر بڕوادارانی ڕاستەقینەدا بوەستن‌و بەرەنگاریان ببنەوە.

شەش کورتە هەڵوەستە:

هەڵوەستەی یەکەم : وشەی: (سَكِينَتَهُ) دەڵێ: (الثَّبَاتُ وَالطُّمَأنينة)، بریتیە لە چەسپاویی‌و ئارامیی، بەڵکو ئارامییەکە لە پێشەوەیە، دەبێ ئارامیی هەبێ لە دڵدا، ئنجا چەسپاویی بەرجەستە دەبێ.

هەڵوەستەی دووەم : کە دەفەرموێ: ﴿عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ نەیفەرموە: (على رَسُولِهِ وَالْمُؤْمِنِين)، بۆ ئەوەی بزانرێ کە ئەو ئارامییەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی پێی بووە، جیا بووە لەو ئارامییەی کە بڕواداران پێویستییان پێی بووە.

أ - ئەو ئارامییەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی پێی بووە، ئەوە بووە کە خوای پەنهانزان دڵنیای بکاتەوە، کە ئەوە کۆتایی ئەو جەنگە نیە بەڵکو تەنیا جەولەکەیە لە جەولەکانی ئەو جەنگە، وە سەرەنجامەکەی بە قازانجی مسوڵمانان تەواو دەبێ، کە پێشتریش پێغەمبەر ﷺ، خوای کارزان ئەو موژدەیەو ئەو دڵخۆشیەی پێدابوو.

ب - بەڵام بۆ بڕواداران، ئارامییەکە بۆ ئەوە بووە کە ترسیان نەبێ، وە بگەڕێنەوە، وە لە بەرانبەر دوژمندا خۆڕاگر بن، بەس پێغەمبەری خوا ﷺ ترسی نەبووە لە دوژمن، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین: کاتێك کە مسوڵمانان ڕایان دەکرد، پشتیان لە دوژمن دەکرد، پێغەمبەر ﷺ بە خۆی‌و سواری ئێسترەکەی بەرەو پێشەوە دەڕۆی، وە (عباس)ی مامی‌و (أبو سفیان بن الحارث)، کە ئەویش ئامۆزایەتی، توند جڵەوی ئێسترەکەیان گرتبوو، کە زۆر بەرەو دوژمن نەچێ.

هەڵوەستەی سێیەم : کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾، بە تەئکید مەبەست لەو سەربازانە فریشتەکانن.

ئنجا وشەی: (جنود)، دەڵێ: (جُنُود: جمع جُنْد وَهُوَ اسْمُ جَمْع، والمفرد جندي)، (جُنُود)، کۆی (جُنْد)ە (جُنْد)یش ناوی کۆیە، وەك (غَنَم)، ناوی کۆی مەڕانە، بەڵام ئەگەر بتوێ بڵێی یەك مەڕ دەڵێی: (شاة)، (جند)یش ناوی کۆیە بە (جنود) کۆ دەکرێتەوە، بەڵام تاکی (جند) بریتیە لە (جندي)، واتە: یەك سەرباز.

هەڵوەستەی چـوارەم : کە دەفەرموێ: ﴿لَّمْ تَرَوْهَا﴾، واتە: ئێوە نەتان دەبینین، بەڵام بە تەئکید نەبینین بەڵگە نیە لەسەر نەبوون، فریشتەکان نابینرێن، جین نابینرێن، وەك چۆن زۆر لە دروستکراوانی دیکەی خوای پەنهانکار نابینرێن، بەڵام هەشن، کاتی خۆی کێ دەیزانی زیندەوەری زۆر ورد هەیە، کە دوایی ناوی لێنرا: میکرۆب، دوایی لەوەش وردتر دۆزرایەوەوەو ناوی لێنرا: ڤایرۆس، هەروەها ئەو هەموو زیندەوەرانەی دیکە کە هەن، دیسان کێ دەیزانی کە گەردیلە (Atom) ئەتۆم هەیە، کە گەردیلە (ذرة) ئەسڵەن بە چاو نابینرێ، نەك بە چاویش، بەڵکو بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنییش نابینرێ، کە (٦٠٠ تاکو ٧٠٠) هەزار جار شت گەورە دەکات!

بەڵکو دوایی زانرا کە لە نێو گەردیلەشدا، سێ پێکهاتەی سەرەکیی هەن کە بریتین لە: (ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن) ئەوانە هیچیان نەدەزانران، بەڵام هەشبوون، بە هەمان شێوەش فریشتەکانیش هەن، بەڵام ئێمە لە دنیادا نایانبینین، مەگەر خۆیان بجەستێنن لە شێوەی بەشەرێك، یاخود لە شێوەی دروستکراوێکی موبارەکدا، وەك زانایان دەڵێن، هەروەها جنیش نابینین، مەگەر ئەوانیش جەستەدار ببن، لە شێوەی دروستکراوێکی پەست دا، وەك : سەگو مارو پشیلە، یاخود لە شێوەی بەشەرێکدا، ئەگەرنا نایانبینین.

هەڵوەستەی پێنجەم : کە دەفەرموێ: ﴿وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، واتە: وە (خوا) ئەوانەی بێبڕوان، سزای دان، ئازاری دان بە چی؟ دیارە بە دەستی ئیمانداران.

کەواتە: ئیمانداران قامچی دەستی خوان بۆ ئەهلی کوفر، ئەهلی کوفرێك کە سەنگەر لە ئیسلام دەگرن، وە دژایەتیی مسوڵمانان دەکەن.

هەڵوەستەی شەشەم : کە دەفەرموێ: ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، دەڵێ: (الجَزَاء: الغَنَاء وَالكفَايَة، وَالجَزَاء مَا فِيهِ كِفَايَة مِنَ المقَابَلَة، إنْ خَيْراً فَخَيْر وَإِنْ شَرّاً فَشَر).

(جزاء)، واتە: شتێك كە بەس بێ، بۆ بەراوردكردن لەگەڵ شتێك دا، ئنجا ئەگەر چاك بێ بە چاكەو، ئەگەر خراپ بێ بە خراپە.

واتە: وشەی: (جزاء)، هەم پاداشت (ثواب) دەگرێتەوە، هەم سزا (عقاب)یش، كە لێرەدا مەبەست پێی سزایە، واتە: هەر ئەوەش سزای كافرانە كە خوای تۆڵەستێن ئاوا تێكیان بشكێنێ، كاتێك كە لەگەڵ ئیماندارانی ڕاستەقینەدا ڕووبەڕوو ببنەوە، نەك لەگەڵ زرە مسوڵمان، كافری ڕاستەقینە لەگەڵ زرە مسوڵماندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، مسوڵمانەكە تێدەشكێ، لەبەر ئەوەی مسوڵمانی تەواو نیە، ئەگەرنا بڕوادارانی ڕاستەقینە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ آل عمران، ئەگەر بڕواداری ڕاستەقینە بن، هەر ئێوە لەسەرەوە دەبن.

مەسەلەی پێنجەمو كۆتایی: كە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾.

دوای ئەوە، خوا ﷻ هەر كەسێكی بوێ (بە لێبوردن) دەگەڕێتەوە سەری، وە خوا لێبوردەی‌و بە بەزەیی یە .

(تاب)، واتە: (رَجَعَ)، ﴿يَتُوبُ ٱللَّهُ ﴾، واتە: خوا دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئنجا یانی چی خوا بۆ لای دەگەڕێتەوە؟ یانی: تۆبەی لێ قبووڵ دەكات، لێی دەبوورێ، ڕەحمی پێدەكات، زانایەك دەڵێ: (التَّوبَةُ فِي الشَّرْعِ: تَرْكُ الذَّنْبِ لِقُبْحِهِ، وَالنَّدَمُ عَلَى مَا فَرَطَ مِنْهُ، وَالعَزِيمَةُ عَلَى تَرْك المعَاوَدَةِ، وَتَدَارُكُ مَا أَمْكَنَهُ أَنْ يُتَدَارَكَ مِنَ الأَعْمَال).

واتە: (توبة) لە زاراوی شەرعدا، بریتیە لە وازهێنان لە گوناح لەبەر ئەوەی پێی شتێكی خراپە، وە پەشێمان بێ لەوەی كە لەدەستی چووە، وە بڕیاری پتەوی

هەبێ لەسەر ئەوەی کە جارێکی دی نەگەڕێتەوە سەر ئەو گوناهە، وە هەرچی کە لە دەستیشی دێ، بۆ قەرەبووکردنەوە، قەربووی بکاتەوە لە کردەوەکان.

هەڵبەتە ئێمە لە سوورەتی (النساء)دا بە درێژیی باسی تەوبەمان کردوە، وە کتێبێکی تایبەتیشمان هەیە لەبارەی تەوبەوە، بە ناوی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)، هەر کەسێك بیەوێ زیاتر شارەزا بێ، با بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنانە.

ئنجا (تابَ إلى اللهِ)، واتە: گەڕایەوە بۆ لای خوا، بەڵام (تابَ اللهُ عَلَيْهِ)، واتە: خوا گەڕایەوە بۆ لایو تەوبەکەی لێ وەرگرت.

ئنجا وشەی: (تائب) : (يُقَالُ لِبَاذِلِ التَّوْبَةِ، وَلِقَابِلِ التَّوْبَةِ)، واتە: (تائب) هەم بە کەسێك دەگوترێ کە پەشێمان دەبێتەوە، بۆ لای خوا، وە هەم بە کەسێکیش دەگوترێ، کە پەشێمان بوونەوە وەردەگرێ، کە خوای بەخشندەیە.

ئەدی ئایا بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ﴾، ئنجا دوای ئەوەش خوا لە هەر کەسێك تەوبە وەردەگرێ کە بیەوێ، بۆچی بە (فعل المضارع)، هێناویەتی ﴿ يَتُوبُ اللَّهُ ﴾؟

چونکە کرداری ئێستا (فعل المضارع) دەلالەت لەسەر تازە بوونەوەو ، بەردەوام بوون دەکات، واتە: خوا ﷻ دوای ئەوەش هەر کەسێك کە شایستە.بێ، تەوبەی لێ وەردەگرێ، وە لێی خۆشدەبێ، لە کوفرو بێ دینییەکەی دەربازی دەکات، هەڵبەتە ئەگەر کەسەکە بۆخۆی بیەوێو، ئیرادەی هەبێ، خوای پەروەردگاریش دەستی دەگرێ لێرەدا مەبەست پێی هۆزی (هوازن)، وە غەیری هۆزی (هوازن)یشە، هەر کەسێك ئەگەر بۆ لای خوا بگەڕێتەوە، بە تەئکید خوای بەخشەر، تەوبەکەی لێ وەردەگرێ.

لە کۆتایی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتانەدا، بە پێویستی دەزانم کە باسێکی جەنگی حونەین بکەین، دیارە لەبەر ڕۆشنایی کتێبە ناودارەکەی (ابن هشام)دا: (السيرة النبوية)، ئێمە لە (١٣) بڕگەدا، قسەکانی (إبن هشام)، وە (إبن إسحاق)، کە (إبن هشام) بەزۆریی لە (إبن إسحاق)ەوە، وەردەگرێ بەڵام جاری وایە زانیاریی خۆیشی دەخاتە سەری، دێنین:

# پوختەیەک لەبارەی جەنگی حونەینەوە

**کاتی ڕوودانی جەنگی حونەین :**

**(غَزْوَةُ حُنَيْنٍ فِي سَنَةِ ثَمَانٍ بَعْدَ الْفَتْحِ)، واتە: جەنگی حونەین لە ساڵی هەشتەمی کۆچیی دا بووە، لە دوای ئازادکردنی مەککە:**

**١ / (وَلَما سَمِعَتْ هَوَازِنُ بِرَسولِ اللهِ ﷺ وَمَا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ مِنْ مَكَةَ، جَمَعَهَا مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ فَاجْتَمَعَ إِلَيْهِ مَعَ هَوَازِنَ ثَقِيفٌ كُلّها، وَاجْتَمَعَتْ نَصْرٌ وَجُشَمٌ كُلّها، وَسَعْدُ بْنُ بَكر، وَناسٌ مِنْ بَنِي هِلالٍ وَهُمْ قَلِيلٌ، وَلَمْ يَشْهَدْهَا مِنْ قَيْسِ عَيْلانَ إِلاّ هَؤُلاءِ وَغَابَ عَنْها، فَلَمْ يَحْضُرْهَا مِنْ هَوَازِنَ كَعْبٌ وَلاَ كِلابٌ. وَلَمْ يَشْهَدْهَا مِنْهُمْ أَحَدٌ لَهُ اسْمٌ، وَفِي بَنِي جُشَمٍ دُرَيْدُ بْنُ الصِّمَّةِ شَيْخٌ كَبِيرٌ لَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ إِلاّ التَّيَمّنَ بِرَأْيِهِ، وَمَعْرِفَتَهُ بِالْحَرْبِ، وَكَانَ شَيْخًا مُجرِّبًا، وَفِي ثَقِيفٍ سَيّدَانِ لَهُمْ، وَفِي الأَحْلاَفِ قَارِبُ بْنُ الأَسودِ بْنِ مَسْعُودِ بْنِ مُعَتِّبٍ، وَفِي بَنِي مَالِكٍ : ذُو الْخِمَارِ سُبَيْعُ بْنُ الْحارِثِ بْنِ مَالِكٍ وَأَخُوهُ أَحْمَرُ بْنُ الْحارِثِ).**

**واتە: کاتێك هۆزی هەوازن بیستیان کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەککەی ئازاد کردوە، کەسایەتییەکیان هەبوو بە ناوی (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ). هۆزی هەوازنی کۆکردەوە، هۆزی هەوازنیش لە چەند تیرەیەك پێك هاتبوو. یەکێك لەوانە (ثَقِيفٌ) بوو، (ثَقِيفٌ) هەمووی کۆبوونەوە بۆ لای (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ) وە پاشان (نصر وجشم) ئەوانیش هەموو کۆبوونەوە،**

**وە(سَعْدُ بْنُ بَكر)، وە کۆمەڵە خەڵکێك لە (بَنِي هِلالٍ) کە ئەوان کەم بوون. لە (قَيْسِ عَيْلانَ) هەر ئەوانە بەشدار بوون.**

بەڵام لە هـۆزی گـەورەی هـەوازن هـەر کـام لـە تیـرەی (كَـعْب) و تیـرەی (كِلاب) ئامادەی ئەو جەنگە نەبـوون و نەهاتـن، هەروەها هیچ کەسێك لەوان نەهـات کـە نـاوێکی هەبـێ، (ڕەنگـە کەسـێکی ئاسـایی چووبـێ)، وە لـە (بَنِـي جُشَـم) پیـاوێك هـەبوو بەنـاوی (دُرَيْـدُ بْنُ الصِّـمَّة)، پیـاوێکی بـە تـەمەن بـوو، توانـای جـەنگ کـردنی نەبوو، بەڵام پیـاوێکـی شەڕزان بوو، زۆر خاوەن ئەزموون و شارەزا بوو لـە شـەڕدا، وە لـە نێـو تیـرەی (ثَقِيـفٌ)یشـدا کـە بەشـێکە لـە هـەوازن، دوو گـەورەیـان هـەبوون وە لـە (أَحْلافِ)یش (قَارِبُ بْنُ الأَسْـودِ بْنِ مَسْعُـودِ بْنِ مُعَـتِّب)، وە لـە (بنـي مالـك): (ذُو الْخِمَـارِ سُـبَيْعُ بْـنُ الْحـارِثِ بْـنِ مَالِـك) وە برایـەکەی (أَحْمَرُ بْنُ الْحارِث)، وە خـەڵکەکە هـەمووی لەسـەر (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ)ی کۆبوونەوە، ئەو فـەرمانـدەی گشـتی ئـەو هێـزە بوو، (کـە لـە شـوێنـی دیکـەدا هاتوە کـە ئـەوان هـەموویـان ژمارەیـان دەوری (٤٠٠٠) کـەس بووە).

٢ / (وَجِمَـاعُ أَمْـرِ النـاسِ إِلَـى مَالِـكِ بْـنِ عَـوْفٍ النَّصْـرِيّ، فَلَـما أَجْمَـعَ السَّـيْرَ إِلَـى رَسولِ اللهِ ﷺ حَطَّ مَـعَ النـاسِ أَمْوَالَهُمْ وَنِسـاءَهُمْ وَأَبْنَـاءَهُمْ، فَلَـما نَـزَلَ بِأَوْطَاسٍ إجتمع اليـه الناس وفيهـم دُرَيْـدُ بْنُ الصِّمَّةِ فِي شِجَارٍ لَهُ، يُقَادُ بِهِ، فَلَـما نَـزَلَ قَـالَ: بِأَيِّ وَادٍ أَنْتُـمْ؟ قَالُـوا: بِأَوْطَـاسٍ، قَـالَ: نِعْـمَ مَجَـالُ الْخَيْـلِ لاَ حَزْنٌ ضِـرْسٌ، وَلاَ سَهْـلٌ دَهْـسٌ، مَا لِـي أَسْمَـعُ رُغَـاءَ الْبَعِيرِ، وَنُهَـاقَ الْحَمِيـرِ، وَبُكَـاءَ الصَّـغِيرِ، وَيُعَـارَ الشـاءِ؟ قَـالُوا: سـاقَ مَـالِـكُ بْـنُ عَوْفٍ مَـعَ النـاسِ أَمْوَالَـهُمْ وَنِسـاءَهُمْ وَأَبْنَـاءَهُمْ، قَـالَ: أَيْـنَ مَالِـكٌ؟ قِيـلَ هَـذَا مَالِـكٌ وَدُعِـيَ لَـهُ، فَقَـالَ: يَـا مَالِـكُ! إِنَّـكَ قَـدْ أَصْبَحْتَ رَئِيـسَ قَوْمِـكَ، وَإِنَّ هَـذَا يَـومٌ كَـائِنٌ لَـهُ مَـا بَعْدَهُ مِـنَ الأَيـامِ، مَـالِي أَسْمَـعُ رُغَـاءَ الْبَعِيـرِ، وَنُهَـاقَ الْحَمِيـرِ، وَبُكَـاءَ الصَّـغِيرِ، وَيُعَـارَ الشـاءِ؟ قَـالَ: سُـقْت مَـعَ النـاسِ أَمْوَالَـهُمْ وَأَبْنَـاءَهُمْ وَنِسـاءَهُمْ، قَـالَ وَلِـمَ ذَاكَ؟ قَـالَ : أَرَدْت أَنْ أَجْعَـلَ خَلْـفَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْـهُمْ أَهْلَـهُ وَمَالَـهُ لِيُقَاتِلَ عَنْـهُمْ، قَـالَ: فَانْقَضَ بِـهِ، ثُـمّ قَـالَ رَاعِـي ضَأْنٍ وَاللهِ، وَهَـلْ يَـرُدّ الْمُنْـهَزِمَ شَـيْءٌ؟ إِنَّهـا إِنْ كَـانَتْ لَـكَ لَـمْ يَـنفَعْكَ، إِلاَّ رَجُلٌ بِسَـيْفِهِ وَرُمْحِـهِ، وَإِنْ كَـانَتْ عَلَيْـكَ، فُضِحْـتَ فِـي أَهْلِـكَ وَمَالِـكَ، ثُـمّ قَـالَ: مَـا فَعَلَـتْ كَعْـبٌ وَكِلابٌ؟ قَـالُوا: لَـمْ يَشْهَدْهَـا مِنْهُـمْ أَحَـدٌ، قَـالَ: غَـابَ الْحَـدّ وَالْجِـدّ، وَلَـوْ كَـانَ يَـومَ عَـلاءٍ

وَرِفْعَـةٍ، لَـمْ تَغِـبْ عَنْـهُ كَعْـبٌ، وَلاَ كِـلاَبٌ وَلَـوَدِدْتُ أَنَّكُـمْ فَعَلْـتُمْ مَـا فَعَلَـتْ كَعْـبٌ وَكِلاَبٌ، فَمَنْ شَهِدَهَـا مِنْكُمْ؟ قَالُوا: عَمْرُو بْنُ عَامِرٍ، وَعَوْفُ بْنُ عَامِرٍ، قَـالَ ذَانِكَ الْجَذَعَانِ مِنْ عَامِرٍ لا يَنفعَانِ، وَلاَ يَضُرَّانِ، يَـا مَالِكُ! إِنَّكَ لَمْ تَصْـنَعْ بِتَقْدِيمِ هَوَازِنَ إِلَى نُحُورِ الْخَيْلِ شَيْئًا، ارْفَعْهُمْ إِلَى مُتَمَنَّعِ بِلاَدِهِمْ وَعُلْيَـا قَوْمِهِمْ، ثُمَّ الْـقَ الصُّبَاءَ عَلَى مُتُونِ الْخَيْلِ، فَإِنْ كَانَتْ لَـكَ، لَحِقَ بِكَ مَنْ وَرَاءَكَ، وَإِنْ كَـانَتْ عَلَيْكَ، أَلْفَاكَ ذَلِكَ قَدْ أَحْرَزْتَ أَهْلَكَ وَمَالَكَ، قَالَ: وَاللهِ لاَ أَفْعَلُ ذَلِكَ، إِنَّكَ قَدْ كَبِرْتَ وَكَبِرَ عَقْلُكَ، وَاللهِ لَتُطِيعُنَّنِي، يَا مَعْشَرَ هَوَازِنَ، أَوْ لأَتَّكِئَنَّ عَلَى هَذَا السَّيْفِ، حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ ظَهْرِي، وَكَرِهَ أَنْ يَكُونَ لِدُرَيْدِ بْنِ الصِّمَّةِ فِيهَا ذِكْرٌ أَوْ رَأْيٌ! فَقَالُوا: أَطَعْنَاكَ).

کـاتێك (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ) خـۆیو سوپایەکـەی بڕیاریـاندا بـەرەو پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بچن (واتـە: بڕیاریـاندا کـە هێرش بکـەن) بـە خـەڵکەکـەی گـوت: هـەموو مـاڵو سامانەکـەتـان بێنـنو ژنو منداڵیشتـان بێنـن، وە لـە شوێـنێك دابـەزینو بارگـەو بنـەیـان خسـت، بـە نـاوی (أَوْطَاس) {کـە دیـارە جـەنگی (حنـین) بە نـاوی جـەنگی (أوطـاس)یش نـاوبراوە، کـە دوو شوێـنن لـە نێوان مەککەو طائیـف دان} خـەڵك کۆبوونەوە، وە لـە نێـو خـەڵکەکـەدا (دُرَیْدُ بْنُ الصِّمَّة) هەبوو، بە سواری (شِجَار)ێك، {(شِجَار) شتێکە وەك کـەژاوە، بـەڵام سـەرەکـەی کـراوەیـە، واتـە: سـەرەکـەی نەبەسـتـراوە، وەك کـەژاوەی ئافرەتـان}، جڵەوی وڵاغەکـەیان گرتبوو دەیانبـرد، (دیارە توانـای نـەبوو بـە پێیـان بـڕوات) کاتێك کە دایانبەزاند، گوتی: ئێوە لـە کوێـن، ئێرە کوێیـە؟

گوتیـان: لـە (أَوْطَاس)یـن .

(دُرَیْـدُ) گوتی: ئێرە شوێـنێکی زۆر باشـە بـۆ ڕم بازێـنـی ئـەسـپ، ئـەسـپ بـاش دەرفـەتی هـەیـە، بێتو بچـێ، نـە شوێـنێکی تـەپۆڵکـاوییو بـەرزەو نـە بـەردی تیژی لێـن، وە نە شوێـنێکی نەرمۆڵـەی واشـە کـە پێـی ئـەسپـانی تـێ بچەقـێ، (واتـە: نە وایـە کـە زبـر بـێ، سـمی ئـەسپـەکـان ئـازار بـدات، وە نـە وایـە لەبەر نـەرمیی، تێـی بچەقـن).

گوتی: بەڵام بۆچی گوێم لە دەنگی حوشترە {کە بە عەرەبی (رُغَاء)ی پێ دەڵێن، ڕەنگە بەکوردیی (بارە) یان بە (بۆڕە) بێ}، وە بۆچی زەڕەی کەر دەبیستم، وە گریانی منداڵ دەبیستم، وە بارەی بزن‌و مەڕ دەبیستم؟

گوتیان: (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ) لەگەڵ خەڵکەکەدا کە هێناویەتی، لەگەڵ سوپایەکەدا، هەموو سەروەت‌و سامانیانی هێناوە، وە ژن‌و منداڵەکانیشیان هێناوە.

گوتی: مالیك لە کوێیە؟

گوتیان: ئەوە مالیکە، مالیکیان بۆ لای بانگ کرد، (واتە: فەرماندەی سوپای هەوازن).

گوتی: ئەی مالیك! ئەوە تۆ ئێستا بووی بە سەرۆکی گەلەکەی خۆت، وە ئەمرۆش ڕۆژێکە ڕۆژانی دیکەی بەدوا دادێن، بەڵام ئەوە بۆچی گوێم لە بۆڕەی حوشترو زەڕەی کەرو گریانی منداڵ‌و بارەی بزن‌و مەڕە؟

گوتی: لەگەڵ خەڵکەکەدا ماڵ‌و سامان‌و ژنەکان‌و منداڵەکانیانیشم هێناوە.

(دُرَيْد) گوتی: بۆچی ؟

گوتی: ویستوومە لە پشت هەر پیاوێکەوە، ماڵ‌و منداڵەکەی‌و سامانەکەشی هەبێ، بۆ ئەوەی کە بەرگرییان لێبکات.

(دُرَيْد) لێی تووڕە بوو، سەرزەنشتی کرد، گوتی: (رَاعِي ضَأْنٍ وَاللهِ) بە خوا تۆ مەڕ لەوەڕێنی، (یانی: تۆ فەرماندەی جەنگ نی‌و لێی نازانی، گوتی: ئایا کەسێك تێبشکێ، هیچ شتێك دەیگێڕێتەوە؟ ئەو ماڵ‌و سامانەو ژن‌و منداڵەی کە هێناوتە لەگەڵ سوپایەکەدا، ئەگەر سەرکەوتن بۆ تۆ بوو، ئەوە تۆ ئەو ژن‌و منداڵ‌و حوشترو مەڕو بزنە، هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن، ئەوەی سوود بە تۆ دەگەیەنێ، پیاوێکە شمشێری پێ بێ‌و ڕمی پێ بێ، بەڵام ئەگەر تێبشکێی، ئەوە تۆ ئابڕووت دەچێ، ماڵەکەشت دەڕواو، ژن‌و منداڵەکانیشت دەڕۆن، دوایی گوتی: ئەدی کوا (كعب)و (كلاب) لە کوێن؟ {کە پێشتر باسمان کرد (كعب) و (كلاب) دوو تیرە بوون لە هەوازن هیچیان نەهاتبوون}.

گوتیان: هیچیان نەهاتوون، ئەویش گوتی: (غَابَ الْحَدّ وَالْجِدُّ) تیژییەکەو ئەوەی شەڕ بە چاکیی دەکات، نەهاتوە، ئنجا گوتی: ئەگەر ئەمڕۆ ڕۆژی بەرزیی و ڕۆژی سەرکەوتن بووایە (کعب) و (کلاب) دەهاتن، {چونکە ئەو دوو تیرەیە، دیارە زۆر ناودار بوون، وە شەڕکەر بوون و زبر بوون}، وە حەزم دەکرد ئێوەش هەر وەك (کعب) و (کلاب)تان بکردایە، نەهاتبان، گوتی: ئەدی کێ هاتوە لە هەوازن؟

گوتیان: (عَمْرُو بْنُ عَامِر) هاتوە، (عَوْفُ بْنُ عَامِر)یش هاتوە، {دیارە ئەوانیش دوو تیرە بوون}.

گوتی: ئەوانە وەك بەرانی یەك ساڵ وان، {واتە: وەك کاوڕ وان و، نەبوونە بەران شەڕیان پێ ناکرێ} نە سوودیان هەیە، نە زەرەریان هەیە.

ئنجا پێی گوت: ئەی مالیك! ئەدی ئەوە چییە! تۆ بەوەی کە سوپای هەوازن دێنیە پێش مسوڵمانان شتێکی چاکت نەکردوە، دەبووایە ئەو سوپایەت بردبایە شوێنێك کە عاصێیە، لەوێ بێ، {یانی: سوپایە زۆرەکەت لەوێ دانابا}، بەڵام با ئەسپ سوارەکانتان خۆیان بە هەڵگەڕاوەکان دابدەن، {مەبەستی پێی سوپای مسوڵمانانە، (الصّبَاءَ) کۆی (صابيء)ە، یانی: هەڵگەڕاوە، ئەوان مسوڵمانەکانیان بە هەڵگەڕاوە دەزانی، واتە: لە دینی باب و باپیرانیان هەڵگەڕاونەوە}، ئنجا ئەگەر سەرکەوتی، ئەوە دوایی ئەوانەشن کە لە شوێنە بەرزەکان دانراون، هەموویان پێت دەگەنەوە، بەڵام ئەگەر تێشکای، ئەوە ئەوانیش دوایی پێت دەگەنەوە، وە ماڵ و سامان و کەسوکارەکەی خۆشت پاراستوە.

مالیك گوتی: بە خوا وا ناکەم، تۆ پیر بووی و عەقڵیشت لەگەڵت پیر بووە، ئنجا (مالیك) گوتی: ئەی هۆزی هەوازن! یان دەبێ بە قسەم بکەن، {یانی: وەك من تاکتیکی جەنگ و نەخشەکەم داناوە، ئاوا بکەن}، یان ئەوەتا خۆم دەدەمە سەر ئەم شمشێرە، نووکەکەی لەسەر سینگم دادەنێم تاکو لە پشتم دەرچێ و، خۆم دەکوژم، وە پێی ناخۆش بوو کە (دُرَيْدُ بْنُ الصِّمَّةِ) هیچ ناوو دەنگ و ڕاو بۆچوونێکی هەبێ، ئەوانیش گوتیان: بە قسەت دەکەین.

دەڵێم : سوپاس بۆ خوا زەرەریشیان کرد، ئنجا لە ڕاستییدا ئەو کابرایە تەگبیرکەرێکی زۆر چاکیان بووە،بەڵام وەك گوتراوە: (لا رأي لِمَن لا يُطَاع) بۆیەش بە وردیی قسەکانیم هێنان، تاکو بزانرێ ئەوانە، پیاوی دنیا دیدەو شەڕ زانو بە ئەزموونیان هەبوون، بەڵام خەڵکی هەڵەشە (متهوِّر)یشیان هەبووە، وەك فەرماندەکەیان (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ)، کە دوایش مسوڵمان بووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە شەڕەکەی دۆڕاندوە، وە بە قازانجی مسوڵمانانیش تەواو بوو، وە لە بەدبەختیی هەوازن بووە، کە بە دوای هەڵەشەیی مالیك کەوتوونو، بەدوای تەگبیرو ڕاو نەخشە عاقڵانەکەی (دُرَيْدُ بْنُ الصِّمَّةِ) نەکەوتوون، هەرواشە، خوا ئەگەر ویستی کۆمەڵێك تێکبشکێنێ، بە دوای خەڵکی هەڵەشەو کەم ئەزموونیان دەکەون، کەسانی کرچو کاڵ، کە دوایی بەسەر کەندێکیاندا دەدا، وە ناکەونە دوای خەڵکی خاوەن ئەزموونو دنیا دیدە.

٣ / (وَلَما سَمِعَ بِهِمْ نَبِيِّ اللهِ ﷺ بَعَثَ إِلَيْهِمْ عَبْدَ اللهِ ابنِ أَبِي حَدْرَدٍ الأَسْلَمِيّ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَدْخُلَ فِي الناسِ، فَيُقِيمَ فِيهِمْ حَتَّى يَعْلَمَ عِلْمَهُمْ، ثُمّ يأتِيَهُ بِخَبَرِهِمْ، فَانْطَلَقَ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ فَدَخَلَ فِيهِمْ، فَأَقَامَ فِيهِمْ حَتَّى سَمِعَ وَعَلِمَ مَا قَدْ أَجْمَعُوا لَهُ مِنْ حَرْبِ رَسولِ اللهِ ﷺ وَسَمِعَ مِنْ مَالِكٍ وَأَمْرِ هَوَازِنَ مَا هُمْ عَلَيْهِ، ثُمّ أَقْبَلَ حَتَّى أَتَى رَسولَ اللهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ، فَدَعَا رَسولُ اللهِ ﷺ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ عُمَرُ: كَذَبَ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ، فَقَالَ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ: إِنْ كَذّبْتَنِي فَرُبّمَا كَذّبْت بِالْحَقّ يا عُمَرُ، فَقَدْ كَذّبْتَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنّي، فَقَالَ عُمَرُ يا رَسولَ اللهِ! أَلا تَسْمَعُ مَا يَقُولُهُ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ؟ فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: قَدْ كُنْت ضَالاً فَهَدَاك اللهُ يا عُمَر).

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بیستی کە ئەوانە هاتوون (عَبْدُ اللهِ ابنُ أَبِي حَدْرَدٍ الأَسْلَمِيّ) نارد وەك جاسووسو هەواڵگر، وە فەرمانی پێکرد کە بچێتە نێو خەڵك، وە ماوەیەك لە نێویان دا بمێنێتەوە تاکو بزانێ بە تەمای چین؟ وە چی دەکەن؟ وە نەخشەی جەنگییان چۆنە؟ {پێغەمبەر ﷺ کاری هەواڵگریی زۆر گرنگی پێداوە}.

ئنجا: (عَبْد اللهِ ابن أَبِي حَدْرَدٍ الأَسْلَمِيّ)یش ڕۆیشت چووە نێویان، وە لە نێویاندا مایەوە، (دیارە نەیانناسیوە) تاکو بیستیو، زانی کە دەیانەوێ چی بکەن؟ وە چۆن جەنگ لە دژی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان‌دا بکەن؟ وە گوێی لە قسەی (مَالِكُ بْنُ عَوْفٍ النَّصْرِيّ)یش گرت، (واتە: فەرماندەکەیان).

ئنجا دوای ئەوەی زانی: کە هۆزی هەوازن بە تەمای چین‌و نەخشەیان چۆنە؟ هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە هەواڵەکەی پێدا، پێغەمبەری خواش عومەری کوڕی خەتتابی بانگ کردو هەواڵەکەی‌پێ ڕاگەیاند، کە (عَبْد اللهِ ابن أَبِي حَدْرَدٍ الأَسْلَمِيّ) ئەو هەواڵەی هێناوەتەوە.

عومەری کوڕی خەتتاب خوالێی ڕازی بێ، گوتی: (كَذَبَ ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ) کوڕی (أَبِي حَدْرَد) ڕاست ناکات.

(ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ)یش گوتی: ئەگەر من بە درۆزن دابنێی، تۆ هەقت بە درۆ داناوە، وە ئەگەر منیش بە درۆزن دابنێی، لە پێش مندا هی لە من چلکترت بە درۆ داناوە، {واتە: ئەگەر بڕوا بە من ناکەی لە پێش مندا بڕوات بە هی لە من چاکتر نەکردوە، کە مەبەستی پێی پێغەمبەر ﷺ بووە}.

عومەریش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! گوێت‌لێ نیە (ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ) چی دەڵێ؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (قَدْ كُنْتَ ضَالاً فَهَدَاكَ اللهُ يَا عُمَرُ)، ئەی عومەر! کاتی خۆی تۆ گومڕا بوویو، خوا هیدایەتی دای.

هەڵبەتە (ابْنُ أَبِي حَدْرَدٍ) هەواڵەکەشی ڕاست بوو، بەڵام عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) وایزانیوە درۆ دەکا، گوتوویەتی: ڕاست ناکەی، ئیدی ئەوانەش بەشەر بوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەقدا بووە، با ئەو هەقە بە سادەترین کەس بووبێ، وە لەگەڵ ناهەق دا نەبووە، ئنجا ئەو ناهەقییە، هەر کەسێك هەڵیگرتبێ.

٤ / (فَلَما أَجْمَعَ رَسولُ اللهِ ﷺ السَّيْرَ إِلَى هَوَازِنَ لِيَلْقَاهُمْ، ذُكِر لَهُ أَنّ عِنْدَ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيةَ أَدْرَاعاً لَهُ وَسِلاَحا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ وَهُوَ يَومَئِذٍ مُشْرِكٌ، فَقَالَ: يا أَبَا أُمَيةَ أَعِرْنَا سِلاحَكَ هَذَا، نَلْقَ فِيهِ عَدُوّنا غَداً، فَقَالَ: صَفْوَانُ أَغَصْبًا يا مُحَمّدُ؟! قَالَ: بَلْ عَارِيةَ وَمَضْمُونَةٌ حَتّى نُؤَدّيَها إِلَيْكَ، قَالَ: لَيْسَ بِهَذَا بَأْسٌ، فَأَعْطَاهُ مِئةَ دِرْعٍ بِمَا يَكْفِيها مِنَ السّلاَحِ، فَزَعَمُوا أَنّ رَسولَ اللهِ ﷺ سَأَلَهُ أَنْ يَكْفِيَهُمْ حَمْلَها، فَفَعَلَ).

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری داو هێزی کۆکردەوە کە بەرەو هەوازن بڕوا، بۆئەوەی بەرەنگاریان بێتەوە ، بۆی باسکرا کە (صَفْوَانَ بْنِ أُمَيةَ)، چەند زرێیەکی لە لان ، وە چەکیشی لەلایە، (زرێی ئەو کاتە لەبەرکراوە، بۆ ئەوەی شیرو تیر کار لە ئینسان نەکات، ئالْقە ئالْقە بووە)، کە ئەو کاتە (صَفْوَانَ بْنِ أُمَيةَ)، هەر لەسەر شیرك بوو، (هاوبەش بۆ خوا دانەرو، کافر بوو) وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يا أَبَا أُمَيةَ أَعِرْنَا سِلاحَكَ هَذَا نَلْقَ فِيهِ عَدُوّنا غَداً).

ئەی ئەبو ئومەییە! ئەو چەکەتمان پێ بدە، تاکو بەیانی پێی بەرەنگاری دوژمنمان ببینەوە!

صەفوان گوتی: ئەی موحەممەد! ئایا لێم داگیر دەکەی، لێم زەوت دەکەی؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بَلْ عَارِيةَ وَمَضْمُونَةٌ حَتّى نُؤَدّيَها إِلَيْكَ).

واتە: نەخێر، بەڵکو بە سپاردە لە لامان دەبێ، تاکو دوایی وێت دەدەینەوە.

(صەفوان) گوتی: مادام وابێ قەیدێ ناکات، ئیدی سەد زرێی وێدان، لەگەڵ ئەو چەکەش کە لەگەڵی دابووە، چی دیکەشی پێویست بووە، وە دوایی پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد کە یارمەتییان بدات بۆ هەڵگرتنی، ئەویش بۆی هێنان و وێیدان.

٥ / (ثُمّ خَرَجَ رَسولُ اللهِ ﷺ مَعَهُ أَلْفَانِ مِنْ أَهْلِ مَكةَ مَعَ عَشَرَةِ آلاَفٍ مِنْ أَصْحَابِهِ الّذِينَ خَرَجُوا مَعَهُ، فَفَتَحَ اللهُ بِهِمْ مَكةَ، فَكَانُوا اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفاً، وَاسْتَعْمَلَ رَسولَ اللهِ ﷺ عَتَابَ بْنَ أَسِيدِ بْنِ أَبِي الْعِيصِ بْنِ أُمَيةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ

عَلَى مَكة، أَمِيرًا عَلَى مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ مِنَ النـاسِ، ثُمَّ مَضَى رَسـولُ اللهِ ﷺ عَلَى وَجْهِهِ يُرِيـدُ لِقَـاءَ هَوَازِنَ).

واتـە: دوایی پێغـەمبـەر ﷺ دەرچوو بەرەو دوژمن، کـە دوازدە هـەزار (١٢٠٠٠) کەس بوون، دە هەزار (١٠٠٠٠) کەس لە هاوەڵانی بەڕێزی کە لـە مەدینەوە لەگـەڵی هاتبوون، وە خـوا ﷻ مەککەی پـێ ئـازاد کردبوون، دوو هـەزار (٢٠٠٠) کـەسیش لە خەڵکی مەککە، لە خـەڵکی تـازە مسوڵمان، کـە ڕەگـەڵیان کـەوتبـوون، ئـەوە دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) کـەس، {دیـارە ئـەو دوو هـەزار (٢٠٠٠) کـەسـە ـ وەك پێشتـریش باسمان کـرد ـ نەفەریـان تێدا هەبووە، هـەر کافری ڕووت بـووە، موشـریك بـووە، وە قـین لـەدڵ بـووە، یـان بـە نیفـاق مسوڵـمان بـووە، بـەڵام گـرنگ ئەومیـە ڕەگـەڵیان کەوتوون بە تـەماعی غـەنیمـەتو دەسـتکەوت}، وە پێغەمبـەر ﷺ (عَتَـابَ بْنَ أَسِيدِ بْنِ أَبِي الْعِيصِ بْنِ أُمَيـةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ)ی لـەسـەر مەککـە کـردە فـەرماندەو کاربەدەست، لە شوێـنی خـۆی، لـەسـەر ئـەو خـەڵکەی کـە لـە نێـو مەککەدا مـاون، دوایی پێغـەمبـەر ﷺ بەرەو هـەوازن ڕۆیشـت بۆ ئـەوەی لـەوێ پێـیـان بگـات.

٦ / ﴿إِنَّ الْحَـارِثَ بْـنَ مَالِـكٍ قَـالَ: خَرَجْنَـا مَـعَ رَسُـولِ اللهِ ﷺ إِلَـى حُنَيْـنٍ وَنَحْـنُ حَدِيثُـوا عَهْـدٍ بِالْجَاهِلِيـةِ ، قَالَ : فَسِرْنَـا مَعَـهُ إِلَى حُنَيْـنٍ، قَـالَ: وَكَـانَتْ كُفَّارُ قُرَيْشٍ وَمَـنْ سِـوَاهُمْ مِـنَ الْعَـرَبِ لَـهُمْ شَجَرَةٌ عَظِيمَـةٌ خَضْـرَاءُ، يُقَـالُ لَهَـا : ذَاتُ أَنْـوَاطٍ، يَأْتُونَهَـا كُلَّ سَنَةٍ فَيُعَلِّقُـونَ أَسْلِحَتَهُمْ عَلَيْهَـا، وَيَـذْبَحُونَ عِنْدَهَـا، وَيَعْكُفُـونَ عَلَيْهَـا يَـوْمًا، قَـالَ: فَرَأَيْنَـا وَنَحْـنُ نَسِـيرُ مَـعَ رَسُـولِ اللهِ ﷺ سِـدْرَةً خَضْـرَاءَ عَظِيمَةً، قَـالَ: فَتَنَـادَيْنَا مِنْ جَنَبَـاتِ الطَّرِيقِ: يَـا رَسُولَ اللهِ ! اجْعَـلْ لَنَـا ذَاتَ أَنْـوَاطٍ كَمَا لَهُـمْ ذَاتُ أَنْـوَاطٍ، قَـالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((اللهُ أَكْبَرُ قُلْتُمْ وَالَّـذِي نَفْسُ مُحَمَّـدٍ بِيَـدِهِ، كَمَا قَـالَ قَوْمُ مُوسَى لِمُوسَى: (اجْعَلْ لَنَـا إِلَهًـا كَمَا لَـهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَـوْمٌ تَجْهَلُونَ) إِنَّهَـا السُّنَنُ، لَتَرْكَبُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ))﴾.

واتـە: (حـارث)ی کوڕی مالیـك خـوا لێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: لـەگـەڵ پێغـەمبـەری خـوادا ﷺ چووین بـەرەو حونـەیـن، وە ئێمە لـە سـەردەمی نەفامییـەوە نیزیك

بووین، (دیاره ئەو لە تازە مسوڵمانەکان بووه) ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە حونەین، لەوێ کافرەکانی قورەیش، وە کافرەکانی دیکەی غەیری قورەیش لە عەرەب، درەختێکی سەوزی گەورەیان هەبوو، پێی دەگوترا: (ذَاتُ أَنْوَاطٍ).

{(أَنْوَاطٍ)، کە لە (نَوْط)[1]ەوە هاتوە چونکە شتی پێ هەڵواسراوە، وەك درەختی مەزارگەو پیروچاکی لای خۆمان، کە خەڵکێکی نەزان پەڕۆوەڕۆی پێ هەڵدەواسن}، هەموو ساڵێك دەچوون لەوێ چەکەکانی خۆیانیان پێ هەڵدەواسی، وە ئاژەڵیان لەلا سەردەبڕی، وە ڕۆژێك لەژێر ئەو درەختەدا دەمانەوە، بە شتێکی موبارەكو پیرۆزیان دادەنا.

ئنجا کاتێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺدا دەڕۆیشتین، ئەو درەختە مەزنە سەوزەمان بینی، لەملاولای ڕێگاکەوە، بانگمان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ (اجْعَلْ لَنا ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنْوَاط)، درەختێکیش بۆ ئێمە دابنێ، کە ئێمەش ئاوا چەكو شتی خۆمانی پێ هەڵواسین، وەك چۆن ئەو کافرانە درەختێکی شت پێ هەڵواسینیان هەیە!

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ﴿اللَّهُ أَكْبَرُ ، قُلْتُمْ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى لِمُوسَى: (اجْعَلْ لَنا إلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَة، قَالَ: إنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ) إنَّها السَّنَنُ لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ﴾ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا گەورەترە، یان (الله أكبر)! (دیاره بۆ نیشانەی سەرسوڕمان بووه)، سوێند بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، وەك گەلی مووسا بە مووسایان گوت: ئێوەش هەمان شتتان بە من گوت، گەلی مووساش بە لای کۆمەڵێك دا ڕۆیشتن، بتیان دەپەرست، گوتیان: ئەی مووسا! تۆش پەرستراوێکمان بۆ دابنێ با بیپەرستین، وەك چۆن ئەوانە بت دەپەرستن، ئەویش فەرمووی: بێگومان ئێوە کۆمەڵێکن نەفامیی دەکەن، ئێوەش هەر لەسەر ڕێی ئەوان دەڕۆن، بەدوای ڕێو شوێنی پێش خۆتان دەکەون، {ئەگەر پابەند نەبن بە قورئانو سوننەتەوە، هەر کاتێك مسوڵمانان لە

---

١) ناط ينوطُ نوْطاً: عَلَّق يُعَلِّقُ تعليقاً، و أناط يُنيطُ ... .

قورئانو سوننەت لایاندا، دەکەونە سەر ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکانی خەڵکی پێش خۆیانو، تووشی شیركو داهێنانو لادان دەبن، لە دینداریی‌یاندا}.

٧ / (عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ أَبِيهِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: لَما اسْتَقْبَلْنا وَادِيَ حُنَيْنٍ، انْحَدَرْنا فِي وَادٍ مِنْ أَوْدِيَةِ تِهامَةَ أَجْوَفَ حَطُوطٍ، إنَّمَا نَنْحَدِرُ فِيهِ انْحِدارًا، قَالَ: وَفِي عَمايَةِ الصّبْحِ، وَكانَ الْقَوْمُ، قَدْ سَبَقُونا إلَى الْوادِي، فَكَمَنُوا لَنا فِي شِعَابِهِ وَأَحْنائِهِ وَمَضايِقِهِ، وَقَدْ أَجْمَعُوا وَتَهَيّئُوا وَأَعَدّوا، فَوَاللّهِ مَا رَاعَنا وَنَحْنُ مُنْحَطُونَ، إلاَّ الْكَتائِبُ قَدْ شَدّوا عَلَيْنا شَدّةَ رَجُلٍ وَاحِدٍ، وَانْشَمَرَ النَّاسُ رَاجِعِينَ، لا يَلْوِي أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَانْحازَ رَسولُ اللهِ ﷺ ذَاتَ الْيَمِينِ، ثُمّ قَالَ: {أَيْنَ أَيّها النّاسُ؟ هَلُمّوا إلَيّ، أنا رَسولُ اللهِ، أنا مُحَمّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ}، قال: فَلا شَيْءَ وحَمَلَتِ الإِبِلُ بَعْضُها عَلَى بَعْضٍ، فَانْطَلَقَ النّاسُ، إلاَّ أنّهُ قَدْ بَقِيَ مَعَ رَسولِ اللهِ ﷺ نَفَرٌ مِنْ الْمُهاجِرِينَ وَالأَنْصارِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ، وَفِيمَنْ ثَبَتَ مَعَهُ مِنْ الْمُهاجِرِينَ أَبُو بَكرٍ وَعُمَرُ، وَمِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ وَالْعَبّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطّلِبِ، وَأَبُو سُفْيانَ بْنُ الْحارِثِ، وَابْنُهُ وَالْفَضْلُ بْنُ الْعَبّاسِ وَرَبِيعَةُ بْنُ الْحارِثِ، وَأُسامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَأَيْمَنُ بْنُ عُبَيْدٍ، قُتِلَ يَومَئِذٍ).

واتە: لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە خوای لە خۆییو بابی ڕازی بێ، گێڕدراوەتەوە، دیارە ئەویش بەشداری ئەو جەنگە بووە، دەڵێ: کاتێك ئێمە ڕووبەڕووی دەوری شیوی حونەین بووینەوەو شۆڕبووینەوە، لەو دۆڵانەوە کە نزمن، وە فراوانن، وە لێژن، دەڵێ: ئاوا هەڵڕژاین بەرەو خوار، وە لە کاتێکدا کە لە تاریکایی بەیانییدا بوو، دوژمن پێش ئێمە کەوتبوو بۆ ئەو شیوە وە لیمان چووبوونە بۆسەوە، لە قەد پاڵەکانی، لە لا تەنیشتەکانیو تەنگەبەرەکانی دا، وە خۆیان ئامادە کردبوو، چاوەڕێی ئێمە بوون، دەڵێ: هەر ئەوەندەمان زانی لە هەموو لایانەوە وەك هێرشی یەك پیاو، هێرشیان کردینە سەر، (بە تیرو بە شیر)، دەڵێ: خەڵکیش یەکسەر پشتییان تێکردنو کەس ئاوڕی لە کەس نەدەدایەوە، وە پێغەمبەر ﷺ لای ڕاستی گرت، دوایی فەرمووی:

(أَيْنَ أَيّها النّاسُ؟ هَلُمّوا إلَيّ، أنا رَسولُ اللهِ، أنا مُحَمّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ)

خەڵکینە بۆ کوێ دەچن؟ وەرن بۆ لای من، من پێغەمبەری خوام، من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلام.

دەڵێ: بەلام هیچ کەس گوێی لێنەبوو، یاخود نەگەڕانەوە وە حوشترەکان خۆیان پێکدادا، وە خەڵك ڕۆیشتن، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا لەگەڵ چەند کەسێکی کەم لە کۆچکەران و لە پشتیوانان و لە بنەماڵەکەیدا، مایەوە، کە لە نێویاندا لە کۆچکەران: ئەبوبەکرو عومەر، وە لە خزمەکانی عەلی کوڕی ئەبی طالیب و عەبباسی کوڕی (عبدالمطلب)ی مامی هەبوون، وە ئەبو سوفیانی کوڕی حارث و کوڕەکەی هەبوون، {دیارە حارثیش مامی پێغەمبەر بووە، ئەبو سوفیانیش ئامۆزای بووە}، وە فەزلی کوڕی عەبباس هەبوو، وە ڕەبیعەی کوڕی حاریث هەبوو، وە ئوسامەی کوڕی زەید هەبوو، وە ئەیمەنی کوڕی عوبەید هەبوو، کە هەر لەو ڕۆژەدا کوژرا (شەهید بوو).

٨ / (فَلَـما انْهَـزَمَ النـاسُ وَرَأَى مَنْ كـانَ مَـعَ رَسـولِ اللهِ ﷺ مِـنْ جُفَـاةِ أَهْـلِ مَكـةَ، الْهَزِيمَـةَ تَكَـلَّمَ رِجَـالٌ مِنْهُـمْ بِمَـا فِـي أَنْفُسِهِمْ مِنْ الضّغْنِ ، فَقَـالَ أَبُـو سُفْيَـانَ بْـنُ حَـرْبٍ: لاَ تَنْتَـهِي هَزِيمَتُـهُمْ دُونَ الْبَحْـرِ، وَإِنّ الأَزْلاَمَ لَمَعَـهُ فِـي كِنـانَتِهِ، وَصَـرَخَ جَبَلَـةُ بْنُ الْحَنْبَـلِ، قَـالَ: ابْنُ هِشَـامٍ: كَلَـدَةُ بْنُ الْحَنْبَـلِ، وَهُـوَ مَـعَ أَخِيـهِ صَـفْوَانَ بْنِ أُمَيـةَ، مُشْرِكٌ، فِـي الْمُدّةِ الّتِـي جَعَـلَ لَـهُ رَسـولُ اللهِ ﷺ: أَلاَ بَطَـلَ السّحْرُ الْيَـوم، فَقَـالَ لَهُ: صَـفْوَانُ اُسْكُـتْ فَضَ اللهُ فَـاكَ، فَوَاللهِ لأَنْ يَرُبّنِـي رَجُـلٌ مِـنْ قُـرَيْشٍ أَحَـبّ إلَـيّ مِنْ أَنْ يَرُبّنِـي رَجُـلٌ مِنْ هَـوَازِنَ).

واتە: دوای ئەوەی کە خەڵکەکە تێشکان، ڕایان کرد، وە ئەوانەی کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوون، لە کرچ و کاڵەکانی مەککە، لەوانەی کە تازە مسوڵمان بووبوون، {بەڵکو کەسانێکیان تێدا هەبوون، هەر دەغەڵ و دڵ نەخۆشیش بوون}، پیاوانێکیان ئەو ڕق و بوغزەی کە لە دەروونیاندا هەبوو، ئەو ڕۆژە دەریانبڕی، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، (واتە: بابی موعاویە) گوتی: (لاَ تَنْتَهِي هَزِيمَتُـهُمْ دُونَ الْبَحْـرِ)، هەتا نەگەنە دەریای سوور شکانەکەیان ناگەڕێتەوە، (وَإِنّ الأَزْلاَمَ لَمَعَهُ فِي كِنانَتِهِ)، زەلەمەکانیشی پێبوون،

{(الأَزْلامَ)، کۆی (زلم)ە، کە کاتی خۆی شتیان‌پێ دابەش کردوە، شێوەی قومارو یانسیبی هەبووە}.

وە (جَبَلة بْنُ الْحَنْبَل) کە (ابْنُ هِشام) گوتوویەتی: (کَلَدَةُ بْنُ الْحَنْبَل) کە لەگەڵ (صَفْوَانَ بن أُمَيَة)ی برای دابوو، وە هەردووکیان موشریك بوون، لەو ماوەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك مۆڵەت بۆی دانابوون، گوتی: (أَلا بَطَلَ السِّحْرُ الْيَومَ) ئەمڕۆ جادووەکە هەڵوەشایەوە.

صەفوانیش گوتی : (اُسْكُتْ فَضَّ اللهُ فَاك، فَوَاللهِ لأَنْ يَرُبّنِي رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ أَحَبَّ إِلَيّ مِنْ أَنْ يَرُبّنِي رَجُلٌ مِنْ هَوَازِنَ).

واتە: بێدەنگ بە! خوا زارت بقڵیشێنێ، یان خوا ددانانت نەهێڵێ قسەیان پێ بکەی، سوێند بە خوا، ئەگەر پیاوێك لە قوڕەیش سەرپەرشتییم بکات پێم باشترە لەوەی کە پیاوێك لە هەوازن سەرپەرشتییم بکات. {واتە: هەرچۆن بێ موحەممەد کە قوڕەیشییە، ئەوم پێ باشترە نەك یەکێك لە هۆزی هەوازن بەسەرمانەوە ببێتە فەرمانڕەواو حوکمڕان، ئەویان دیارە بە پاڵنەرو بە هاندەری دەمارگیریی تیرەییو هۆزگەرایەتیی قسەکەی کردوە}.

٩ / دیارە لە جەنگی (حونەین) دا هەوڵێك درا، بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەلایەن: (شَيْبَةُ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَخُو بَنِي عَبْدِ الدّارِ)، وەك بۆخۆی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (قُلْت: الْيَومَ أُدْرِكُ ثَأرِي (مِنْ مُحَمّدٍ)، ـ وَكَانَ أَبُوهُ قُتِلَ يَومَ أُحُدٍ ـ الْيَومَ أَقْتُلُ مُحَمّدًا، قَالَ: فَأَدَرْتُ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ لأَقْتُلَهُ، فَأَقْبَلَ شَيْءٌ حَتّى تَغَشّى فُؤَادِي، فَلَمْ أُطِقْ ذَاكَ وَعَلِمْت أَنّهُ مَمْنُوعٌ مِنّي).

واتە: گوتم: ئەمڕۆ من تۆڵەی خۆم لە موحەممەد دەکەمەوە، (چونکە بابی لە جەنگی ئوحوددا کوژرا بوو)، ئەمڕۆ موحەممەد دەکوژم، دەڵێ: وەرسووڕام کە زەبر لە پێغەمبەری خوا ﷺ بدەمو بیکوژم، شتێك بەرەو ڕووم هات، هەتا بەسەر دڵم داهاتو داپۆشیم، ئیدی ئەو کارەم بۆ نەکراو گەڕامەوەو زانیم کە پێغەمبەر ﷺ لە من قەدەغەیە، (واتە: ناتوانم زەفەری پێبەرم).

١٠ / (عَنِ العَبّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطّلِبِ، قَالَ: إنّي لَمَعَ رَسولِ اللهِ ﷺ آخِذٌ بِحَكَمَةِ، بَغْلَتِهِ البَيْضاءِ قَد شَجَرْتُها بِها، قَالَ: وَكُنْتُ امْرَأً جَسِيماً شَدِيدَ الصَّوْتِ، قَالَ: وَرَسولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: حِينَ رَأَى مَا رَأَى مِنْ النَاسِ، أَيْنَ أَيّهَا النَاسُ؟ فَلَمْ أَرَ النَاسَ يَلْوُونَ عَلَى شَيْءٍ، فَقَالَ: يَا عَبّاسُ! أُصْرُخْ يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! يَا مَعْشَرَ أَصْحابِ السَمُرَةِ! قَالَ فَأَجَابُوا: لَبّيْكَ لَبّيْكَ، قَالَ فَيَذهَبُ الرّجُلُ لِيُثْنِيَ بَعِيرَهُ، فَلا يَقْدِرُ عَلَى ذَلِكَ، فَيَاخُذُ دِرْعَهُ فَيَقْذِفُهَا فِي عُنُقِهِ، وَيأْخُذُ سَيْفَهُ وَتُرْسَهُ وَيَقْتَحِمُ عَنْ بَعِيرِهِ وَيُخَلّي سَبِيلَهُ، فَيَؤُمّ الصَوْتَ، حَتّى يَنتَهِيَ إِلَى رَسولِ اللهِ ﷺ حَتّى إِذَا اجْتَمَعَ إِلَيْهِ مِنْهُمْ مِئَة، اسْتَقْبَلُوا النَاسَ، فَاقْتَتَلُوا، وَكَانَتْ الدَعْوَى أَوّلَ مَا كَانَتْ : يَا لَلأَنْصَارِ، ثُمّ خَلَصَتْ أَخيْرًا: يَا لَلْخَزْرَجِ، وَكَانُوا صُبْرًا عِنْدَ الْحَرْبِ، فَأَشْرَفَ رَسولُ اللهِ ﷺ فِي رَكَائِبِهِ، فَنَظَرَ إِلَى مُجْتَلَدِ الْقَوْمِ وَهُمْ يَجْتَلِدُونَ، فَقَالَ: الآنَ حَمِيَ الْوَطِيس).

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، جڵەوی هێسترە سپیەکەیم گرتبوو، وە لە شەویلاگەیم قایم کردبوو، وە پیاوێکی بەخۆوە بووم، دەنگێکی بەهێزیشیم هەبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێك ئەوەی لە خەڵك بینی، فەرمووی: خەڵکینە بۆ کوێ؟

تەماشام کرد: خەڵکەکە گوێیان لە دەنگەکە نیەو، ئاوڕ نادەنەوە، بۆیە پێی فەرمووم: ﴿یا عَبّاسُ أُصْرُخْ یا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! یا مَعْشَرَ أَصْحابِ السَمُرَةِ!﴾.

ئەی عەبباس! هاوار بکە بە دەنگی بەرز، بڵێ: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان! ئەی کۆمەڵی خاوەنانی درەختەکە ! {ئەوانەی کە لەژێر ئەو درەختەدا بەیعەتیان بە پێغەمبەردا ﷺ کە ناوی لێنرا (شجرة الرضوان)}.

دەڵێ: ئەوجار کە گوێیان لە دەنگی من بوو، وەڵامیان دایەوە، گوتیان: (لَبّیْكَ لَبّیْكَ) لە خزمەتداین، لە خزمەتداین، وە هاتن، کابرا ئەگەر بۆی کرابایە، ملی حوشترەکەی وەردەسووڕاند، ئەگەر پێی نەکرابا، زرێیەکەی لێ دەهێنایە خوار، لە ملی خۆی قایم دەکرد، وە شمشێرو قەڵغانەکەی بەدەستەوە دەگرت و لە حوشترەکەی دەهاتە خوار، وە حوشترەکەی بەردەدا، بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆ

لای دەنگی پێغەمبەر ﷺو، بەرەو دەنگەکە دەهات، هەتا دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ، هەتا نیزیکەی سەد کەسێك لە دەوری کۆبوونەوە، ئەوجار ئەو سەد کەسە بوون بە بناغەو ڕوویان لە دوژمن کرد، لە سەرەتاوە تەنیا دەگوترا (یا للأَنْصَارِ) ! هاوار ئەی پشتیوانەکان! دوایی بەتایبەت دەگوترا: هاوار خەزرەجییەکان! وەرن، چونکە بە زۆریی خەزرەجییەکان بوون، وە زۆر خۆڕاگر بوون لە جەنگدا، ئنجا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا بە سواری هێسترەکەی، تەماشای جەنگو لێکدانەکەی کردو فەرمووی: (الآنَ حَمِيَ الْوَطِيسُ) ئێستا تەندور گەرم بووە، شەڕ گەرم بووە.

١١ / (عَنْ عبدالله بن أَبِيهِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ، قَالَ : و رَجُلٌ مِنْ هَوَازِنَ عَلَى جَمَلٍ له أحمر بيده رآية سوداء، في رأس رُمحٍ له طويل، أمام هَوَازِن، و هَوَازِن خَلفَهُ . إذا أَدْرك طَعَنَ بِرُمحِهِ، وإذا فاته الناس رفَعَ رُمْحَهُ لمن وراء فاتَّبعوه).

واتە : (عبدالرحمن) کوڕی (جابر بن عبدالله) لە بابییەوە گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی: پیاوێك لە هۆزی هەوازین سواری حوشترێکی سوور بووبوو، ئاڵایەکی ڕەشی بەدەستەوە بوو کە بە نووکی ڕمە درێژەکەیەوە کردبوو، لە پێش سوپای هەوازینەوە بوو، هەوازینیش لە پشتیەوە بوون، گەیشتبایە هەرکەس بە ڕمەکەی لێیدەدا، وە ئەگەر خەڵکەکە لێی قوتار بووبان ڕمەکەی بۆ ئەوانەی دوایەوە بەرز دەکردەوەو ئەوانیش شوێنی دەکەوتن .

١١ / (عَنْ عبدالله عن أَبِيهِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ، قَالَ بَيْنَا ذَلِكَ الرَّجُلُ مِنْ هَوَازِنَ صَاحِبُ الرَّايَةِ عَلَى جَمَلِهِ، يَصْنَعُ مَا يَصْنَعُ، إِذْ هَوَى لَهُ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رِضْوانُ اللهِ عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُرِيدَانِهِ، قَالَ: فَيَأْتِيهِ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ مِنْ خَلْفِهِ، فَضَرَبَ عُرْقُوبَيِ الْجَمَلِ فَوَقَعَ عَلَى عَجُزِهِ، وَوَثَبَ الأَنْصَارِيّ عَلَى الرَّجُلِ، فَضَرَبَهُ ضَرْبَةً أَطَنّ قَدَمَهُ بِنِصْفِ سَاقِهِ، فَانْجَعَفَ عَنْ رَحْلِهِ، قَالَ: وَاجْتَلَدَ النَّاسُ، فَوَاللّهِ مَا رَجَعَتْ رَاجِعَةُ النَّاسِ مِنْ هَزِيمَتِهِمْ حَتَّى وَجَدُوا الأُسَارَى مُكَتَّفِينَ عِنْدَ رَسولِ اللهِ ﷺ).

واتە : (عبدالرحمن) کوڕی (جابر بن عبدالله) لە بابیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە کاتێك دا ئێمە لەو حاڵە دابووین‌و کابرای هۆزی هەوازین خاوەن ئاڵایەکە بە سواری حوشترەکەی ئەوەی دەکرد، کە دەیکرد، هەر ئەوەندەم زانی عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ، وە پیاوێك لە پشتیوانان خوا لەویش ڕازی بێ، بەرەو ڕووی ئەو حوشتر سوارە چوون، (کە سەرقافڵەی سوپای هەوازن بوو، وە سەرە ڕمیان بوو) هەرچی عەلی کوڕی ئەبی طالیب بوو خوا لێی ڕازی بێ، لە پشتەوەڕا، لە دوو پاشووی حوشترەکەی دا، (لە پێیەکانی پاشەوەیدا)، حوشترەکە بەسەر پشتدا کەوت، ئنجا پیاوە پشتیوانەکەش خۆی هەڵدایە سەری‌و، یەك زەبری لێدا لاقی لە نیوەیڕا پەڕاندو لاق پەڕینەکەی دەنگێکیشی لێوە هات.

ئنجا کابراش لەسەر بارەکەی کەوتەخوار (وەکوژرا).

ئنجا خەڵك تێکڕژان دەڵێ: سوێند بە خوا، ئەوانەی کە شکابوون، جارێ ئێستا نەگەڕابوونەوە، کاتێك کە هاتنەوە، تەماشایان کرد، ئەوە دیلەکان بە دەستبەستراوەیی لە لای پێغەمبەری خوان ﷺ (واتە: سوپای دوژمن، تەسلیم بوون‌و، بە دلیلیان گرتوون‌و لەوێ دایاننـاون).

١٢ / (عن عَبْدِ اللهِ بْنُ أَبِي بَكر: أَنّ رَسولَ اللهِ ﷺ الْتَفَتَ، فَرَأَى أُمّ سُلَيْمٍ ابْنَةَ مِلْحانَ، وَكانَتْ مَعَ زَوْجِها أَبِي طَلْحَةَ، وَهِيَ حازِمَةٌ وَسَطَها بِبُرْدٍ لَها، وَإِنّها لَحامِلٌ بِعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ وَمَعَها جَمَلُ أَبِي طَلْحَةَ، وَقَدْ خَشِيَتْ أَنْ يَعُزّها الْجَمَلُ: فَأَدْنَتْ رَأْسَهُ مِنْها، فَأَدْخَلَتْ يَدَها فِي خِزامَتِهِ مَعَ الْخِطامِ، فَقالَ لَها رَسولُ اللهِ ﷺ: أُمّ سُلَيْمٍ؟ قالَتْ: نَعَمْ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمّي يا رَسولَ اللهِ! اُقْتُلْ هَؤُلاءِ الّذِينَ يَنهَزِمُونَ عَنكَ، كَمَا تَقْتُلُ الذِينَ يُقاتِلُونَكَ، فَإِنّهُمْ لِذَلِكَ أَهْلٌ، فَقالَ رَسولُ اللهِ ﷺ أَوَ يَكْفِي اللهُ يا أُمّ سُلَيْمٍ؟

قالَ: وَمَعَها خِنْجَرٌ، فَقالَ لَها أَبُو طَلْحَةَ: مَا هَذَا الْخِنْجَرُ مَعَكِ يا أُمّ سُلَيْمٍ؟

قالَتْ: خِنْجَرٌ أَخَذْتُه، إِنْ دَنا مِنّي أَحَدٌ مِنْ الْمُشْرِكِينَ، قالَ: يَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ أَلا تَسْمَعُ يا رَسولَ اللهِ! مَا تَقُولُ أُمّ سُلَيْمٍ الرُّمَيْصاءُ !.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی حونەین دا ئاوڕ دەداتەوە (أُمّ سُلَيْمٍ بِنْتِ مِلْحانَ) دەبینێ، کە هاوسەری (أبو طَلْحَةَ الأنصاري) بووە، کە تەماشا دەکات پشتێنێکی بەستوە، (عەبایەکی لە پشتی خۆی بەستوە) کە لەو کاتەشدا دووگیان بووە بە (عَبْدِاللّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ)، وە حوشتری (أَبِي طَلْحَةَ)شی پێبووە، ترساوە لەوەی کە حوشترەکەی بۆ مەرزەم نەکرێ، بۆیە سەری حوشترەکەی لە خۆی وەنیزیك خستوە وە دەستی خستۆتە نێوان (خِزامة)و (خطام)یەوە، {(خزامة): جۆرە ئاڵقەیەك بووە، لە لووتی حوشتریان کردوە، (خطام)یش جڵەوە، هەردووکیان پێکەوە گرتوون، بۆ ئەوەی حوشترەکە مەرزەم بکات}، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو: (أمّ سُلَيْم)!، ئەویش دەڵێ: بەڵێ، دایكو بابم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوانەی کە شکاون لەوانەی کە لە خزمەتتدان، پشت لە دوژمن دەکەن، بیانکوژە وەك چۆن ئەوانە دەکوژی، کە لە دژت دەجەنگن، (دیارە بە عاطیفەوە قسەی کردوە)، چونکە ئەوانە شایستەی ئەوەن کە تۆ سزایان بدەی!

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ﴿أوَ يَكْفِي اللهُ يا أُمّ سُلَيْم؟﴾ یان خوا ئەو کارەمان لەکۆڵ دەکاتەوە، ئەی (أم سليم)! (یانی پێویست بەوە ناکات، ئێمە سزایان بدەین، چونکە ئەوانیش دوژمن کتوپڕ بەسەریدا داون).

دەڵێ: خەنجەرێکیشی پێبوو، (أَبُو طَلْحَةَ) گوتی: ئەو خەنجەرەت بۆ چییە ئەی (أم سليم)؟

گوتی: ئەوە خەنجەرێکە پێمە بۆ هەر کەسێك لە کافرەکان کە لێم نیزیك بکەوێتەوە (ورگی دەدرم)،

دەڵێ: (أَبُو طَلْحَةَ)ش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا دەبیستی (أُمّ سُلَيْمٍ الرّمَيْصَاء)[1]، چی دەڵێ؟! {سەرسام بووە بە هاوسەرەکەی خۆی، کە سکپڕ (حامل)ەو، حوشترێکی بۆ گرتوەو، خەنجەرێکی لەبەر دایەو، ئاواش بە

١) الرّمَيْصَاءُ: یانی چاو گچکە، جاری وایە ژنو مێرد قسەی خۆش پێکەوە دەکەن، (أَبُو طَلْحَةَ)ش وەك موجامەلە ئەو لەقەبەی لێ هەڵداوە .

عەزیمەتەوە قسە دەکاتو، دەڵێ: ئەوانەش کە ڕایان کردوە لە سوپایەکەت، ئەوانیش سزا بدەو، شایستەن کە سزایان بدەی، وەك چۆن ئەوانی دیکە دەکوژی} .

١٣ / بڕگەی سێزدەیەمو کۆتایی: (ابن هشام) لە ژێر ناوونیشانی: (تێشکانی هەوازن، وە ئامادە بوونی فریشتەکان لە جەنگدا، دەڵێ:

{عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ قَبْلَ هَزِيمَةِ الْقَوْمِ وَالنَاسُ يَقْتَتِلُونَ، مِثْلَ الْبِجَادِ الأَسْوِدِ، أَقْبَلَ مِنْ السَّمَاءِ حَتَّى سَقَطَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ فَنَظَرْتُ، فَإِذَا نَمْلٌ أَسودُ مَبْثُوثٌ، قَدْ مَلأَ الْوَادِيَ، لَمْ أَشُكَّ أَنَّهَا الْمَلائِكَةُ، ثُمَّ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ هَزِيمَةُ الْقَوْمِ}.

واتە: جوبەیری کوڕی موطعیم دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێش ئەوەی کۆمەڵەکە بشکێن، (واتە: کۆمەڵی هەوازن)، خەڵك یەکدییان دەکوشت، تەماشام کرد شتێك وەك بەڕمیەکی ڕەش (کە ڕادەخرێ) هاتە خوار لە ئاسمان، هەتا لە نێوان ئێمەو ئەو کۆمەڵەدا (کە دوژمن بوون) کەوت، تەماشام کرد وەك مێرووڵەی ڕەش، ئەو دۆڵو دەشتەیان هەموو داپۆشیبوو، دەڵێ: هیچ گومانم لەوەدا نەبوو، کە ئەوە فریشتەن هاتوون، ئیدی دوای ئەوە، یەکسەر ئەو کۆمەڵەی بەرانبەر (هەوازن) تێشکان.

لێرەدا کۆتایی بە باسو خواسی جەنگی حونەین، دێنین.

ئنجا وەك زانیارییەکی جوگرافیی ئەوەش بڵێین باشە، کە: حونەین شیوێکە لەلای (ذِي الْمِجَازِ) کە ئەویش شوێنێکە، لە نیزیك (طائف)ەوەیە، وە نێوان حونەینو مەککە دەوری (١٠، ١٥) میلێك دەبێ، {واتە: دەوری (٢٠)کم زیاتر} لە لای عەرەفاتەوە، ئەوەندە لە مەککە دوورە[١] .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

١) تفسير القرآن الحكيم ، محمد رشيد رضا، ج١٠، ص ٢٢٨.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەو دەرسەمان شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی (٢٨ تا ٣٣)، لەم شەش ئایەتەدا، خوا سەرەتا بۆ جاری دووەم لەم سوورەتەدا، بە نازناوی ( يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! مسوڵمانان دەدوێنێ، وە فەرمانیان پێدەکات کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، چونکە پیسن، نابێ لەم ساڵ (واتە: ساڵی نۆیەم) بەدواوە، توخنی مزگەوتی حەرام بکەون‌و، دەبێ مسوڵمانان ڕێیان لێ بگرن، وە ئەگەر مسوڵمانان بەهۆی مەترسیی هەژارییشیانەوە بڵێن: ئاخر ئەو کارو کەسابەت‌و بازرگانییەی کە موشریکەکان بەهۆی هاتنیانەوە بۆ دەوری مزگەوتی حەرام، دەیکەن، ئەگەر بێت‌و ئەوە نەمێنێ، ئێمە هەژار دەکەوین!

با بێگومان بن کە خوا ئەگەر بیەوێ لە بەخششی خۆی بێنیازیان دەکات.

دوایی خوا فەرمان بە مسوڵمانان دەکات، کە جەنگ لە دژی خاوەن کتێبە شەڕفرۆشەکان بکەن، کە بڕوای ڕاستەقینەیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، وە پابەندی حەرام‌و حەلاڵێك نین، کە خوا ﷻ و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونیان کردۆتەوە، لە قورئان‌و سوننەتدا، وە ملکەچی شەریعەت نین، هەتا یان مسوڵمان دەبن، یاخود سەرانە دەدەن بە ملکەچیی.

دوایی خوا ﷻ باسی لادانی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات، کە جوولەکەکان گوتوویانە: عوزەیر کوڕی خوایە، وە نەصرانییەکان گوتوویانە: مەسیح کوڕی خوایە، پاکیی بۆ خوا، وە لەوەشدا لاسایی کافرەکانی پێش خۆیانیان کردۆتەوە، کە هەندێ لە دروستکراوەکانی خوایان بە کوڕی خوا، یان بە کچی خوا لە قەڵەم داون.

هەروەها وێڕای ئەوە کە عوزەیرو مەسیحیان بە کوڕی خوا داناوە، جوولەکەو نەصرانییەکان، زانایانو ڕەبەنەکانی خۆشیان، {واتە: ئەوانەی کە خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ خواپەرستیی} ، وە هەروەها عیسای کوڕی مەریەمیشیان، لەجیاتی خوا، کردبوو بە پەرستراوو سەرپەرشتیار، کە حەلاڵو حەرامیان بۆ دابنێن، لە حاڵێکدا کە جگە لە یەکتاپەرستییو تەنیا پەرستنی خوا، هیچ فەرمانێکی دیکەیان پێ نەکرابوو.

پاشان خوا باسی هەوڵی نەزۆکی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو کافرەکان دەکات، هەروەها خاوەن کتێبەکان، بەتایبەت جوولەکەو نەصرانییەکان، کە دەیانەوێ چرای ئایینی خوا بە فووی زاریان، بکوژێننەوە، بەڵام خوای بالادەست ناهێڵێ.

وە لە کۆتایی دا: خوا ڕایدەگەیەنێ کە پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد ﷺ ی بە ڕێنماییو بە بەرنامەی هەقەوە ناردوە، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا سەری بخات، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکان پێشیان ناخۆش بێ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ
ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن
فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٨ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ
بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ
ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ
صَٰغِرُونَ ٢٩ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ
ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۚ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٣٠ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ
وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا
لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ
٣١ يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ
وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٣٢ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ
لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ٣٣ ﴾

## مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئـەوانەی بڕواتـان هێنـاوە! بە دڵنیاییەوە هاوبەش بۆ خـوادانەرەکان پیسـن، بۆیـە با پاش ئـەم ساڵ (ساڵی نۆیـەمی کۆچیی) توخنی مزگـەوتی حـەرام نەکـەون، وە ئەگەر ترسی هـەژارییشتان هەبێ، ئەوە مسۆگـەر خوا ئەگـەر ویستی، لە بەخششی خـۆی بێنیازتان دەکات، بەڕاستیی خـوا زانای کارزانە ﴿٢٨﴾ لـە دژی بەشێك لـەوانە بـجەنگن کە (پێشتـر) کتێبیان (لەلایەن خـواوە) پێدراوە، نە بڕوایان بە خوایەو، نە بە ڕۆژی دوایـی، وە ئەوەی خـواو پێغـەمبـەرەکەی قەدەغـەیـان کـردوە، قەدەغـەی ناکەن، (بـە قەدەغـەی نـازانن)و ملکەچـی بەرنامـەی هـەق (ئیسـلام) نـین، وە تـاکو بـە دەستــڕۆیشتوویی، ملکەچانە سەرانە دەدەن ﴿٢٩﴾ جوولـەکە گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایەو، نەصـڕانییەکان گـوتیـان: مەسیح کوڕی خـوایـە، ئـەوە هـەر قسـەی زاریـانە، شوێـن قسـەو بیـروڕای ئـەوانەی لـەمـەوپێش کـافر بـوون، دەکـەون، خـوا بیـانکوژێ، بەرەو کوێ لادەدرێـن! ﴿٣٠﴾ زانـایەکانو ڕەبەنەکانی خـۆیانو، مەسیحی کـوڕی مەریەمیـان لـە جیـاتی خـوا، کـردە پەروەردگار، لە حاڵێکدا کە تەنیا بەوە فەرمانیان پێکرابوو، کـە بـەس یـەك پەرستـراو بپـەرستنو، بێجگـە لـەو هیچ پـەرستـراوێك نیـە، پـاکیی بـۆ وی، لـەوەی کـە دەیکـەنە هـاوبەش (بـۆی) ﴿٣١﴾ دەیـانـەوێ بـە فـووی زاریـان ڕووناکـیی (ئـاییـنی ڕاسـتی) خـوا بکوژێننەوە، بەڵام خـوا بە هیچ جۆرێك نـاهێڵێ بکوژێتەوە، هەتـا ڕووناکییەکەی تـەواو نەکات، هـەرچـەندە بێـبڕوایانیش پێیـان نـاخۆش بێ ﴿٣٢﴾ (خـوا) ئـەو کـەسەیـە کـە پێغـەمبەری خـۆی بە ڕێنماییو بە بەرنامەی هەقەوە ڕەوانەکردوە، تـاکو بەسـەر هـەموو بەرنـامـەکـاندا سـەری بخات، هـەرچـەنـدە هـاوبەش بۆ خـوا دانـەرەکـان پێشیـان نـاخۆش بێ ﴿٣٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(نَجَسٌ ): (النَّجَاسَة: القَذَارَةُ وَذَلِكَ ضَرْبَانِ: مَحْسوسة وَمَعْنَوِيـة، وَبِالثـانِي وَصَفَ الله تَعَالى المُشْرِكين ، فَقَالَ: (إِنَّمَا المُشْرِكُون نَجَس) وَنَجَّسَهُ أي: جَعَلَهُ نَجِساً).

وشەی (نجس) و (نجاسة) بە مانای پیسی دێ، ئەویش دوو شێوەیە: بەرهەست، نابەرهەستو مەعنەویی، وە ئەوەی دووەمیان (واتە: پیسی مەعنەویی) خوا موشریکەکانی پێ وەسف کردوە، فەرموویەتی: بێگومان هاوبەش بۆ خوادانەرەکان پیسن، واتە: لە ڕووی مەعنەوییەوە، نەك لە ڕووی جەستەیی، (وَنَجَّسَهُ) واتە: پیسی کرد.

(عَيۡلَةً ): واتە: (فقراً) کە بە مانای هەژاریی دێ، (عَالَ الرَّجُلُ، إِذَا افْتَقَرَ يَعِيل عِيلة فهو عائل، وَأَعَالَ : كَثُرَ عِيالُهُ).

(عَالَ الرَّجُلُ) واتە: پیاوەکە هەژار بوو، (يَعِيل عِيلة فهو عائل) واتە: هەژار بوو، بەڵام (أعال) واتە: خێزانی زۆر بوو.

(ٱلۡجِزۡيَةَ ): (الجزية: ما يُؤْخَذ مِن أَهْل الذمّة، وتسميتها بذَلِكَ للإجتزاء بها فِي حَقن دمهم).

(جزية) ئەوەیە کە لە هاووڵاتییانی نامسوڵمان وەردەگیرێ، بۆیە ئەو ناوەشی لێنراوە، چونکە لەبری ئەوەیە کە خوێنیان بپارێزرێ.

دەڵێم ئەوە قسەی ڕاغیبی ئەصفەهانییە، ئەگەرنا من پێم وا نیە لە بەرانبەر ئەوەدابێ، کە خوێنیان بپارێزرێ، بەڵکو ئەو ناوە دەگونجێ وشەیەکی عەرەبیی نەبێ، یان ڕیشەیەکی غەیرە عەرەبیی هەبێ، وەك دوایی زیاتر باسی دەکەین، کە بە کوردیی پێی دەگوترێ: سەرانە.

(صَٰغِرُونَ ): (الصاغِر: الراضي بالمنْزِلة الدّنية، الصّغَار: الذل).

(صَاغِر) كەسێكە كە بە پلەیەكی خوارتر ڕازی بێ، وە (صَغَار) بە مانای ملكەچیی دێ.

(أَنَّىٰ ): (مِن أَيْنَ، كَيْفَ) (أَنَّى) بە دوو واتان دێ : ١- لە كوێ ؟ ٢- چۆن ؟

(يُؤْفَكُونَ ): (الإفْكُ: الكَذِبُ، والأَفْكُ: القلْب أفكَهُ: قَلَبَهُ وَصَرَفَهُ عَنِ الشيء).

(إفك) بە مانای درۆ دێ، (أَفْك) بە مانای لادان دێ، دەگوترێ: (أَفَكَهُ: قَلَبَهُ وَصَرَفَهُ عَنِ الشيءِ) واتە: لەو شتەی كە دەیویست، لێی گێڕایەوەو لێی لادا.

(أَحْبَارَهُمْ ): كۆی (حَبْر) یان (حِبْر)ە، كە بە زانای جوولەكە دەگوترێ، هەندێكیش گوتوویانە: (حِبر) بەمانای ئەو مەرەكەبە دێ، كە پێی دەنووسرێ، بەڵام (حَبْر) واتە: زانا.

(وَرُهْبَٰنَهُمْ ): (رُهبان) كۆی (راهب)ە، واتە: كەسێك كە خۆی یەكلاكردۆتەوە بۆ بەندایەتیی كردن بۆ خوا، وە (رهبان) لە (رَهْب)ەوە هاتوە، واتە: ترسان، (راهب)یش یانی: كەسێك كە سامو هەیبەتی خوای لە دڵدا هەیە.

(أَرْبَابًا ): (أرباب) كۆی (رب)ە بەمانای خاوەن (مالك) دێ، وە بە مانای پەرستراو (الإله) دێ، وە بە مانای كەسێك دێ، كە سەرپەرشتیی كاروبارەكان دەكات.

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ بۆ جاری دووەم ـ لەم سوورەتەدا ـ بـە نـازنـاوی ئیمـان بـانگی مسولّمانـان دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ ﴾، ئـەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پیسن، (نَجَس وَنَجَاسة). چاوگن، یانی: پیسی (نَجِس) واتە: شتێکی پیس، وە (مُتنجِّس) واتە: ئەوەیە کە پیس بووبێ، کە بەتەئکید لێرەدا مەبەست پیسی مەعنەوییە، چونکە خـوا دەفەرمـــوێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ ﴾، بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پیسن، واتە: بەهۆی شـیرکەکەیـانەوە، بەهـۆی کوفرەکەیـانەوە، بە پـیس لـە قەڵـەم دەدرێـن لـە ڕووی مەعنەوییـەوە، هەڵبەتـە دوایـی لـە مەسەلـە گرنگـەکان دا زیـاتر باسی دەکـەین. هـەرچـەندە هەندێـك لـە شـەرعزانـانو زۆربـەی شیعەی دوازدە ئیمـامیی گوتوویـانە: مەبەست پێ پیسیی مادديیو مەعنـەوییە، واتـە: ئەگـەر دەستت لـە کافرێك دا، دەبێ دوایی دەستت بشۆیـەوە، یاخود ئەگـەر کافرێـك لـە قاپێکدا شتێکی خوارد، دەبێ دوایـی بیشۆی، لەبەر ئەوەی پیس بووە! بەڵام ئەوە ڕایەکی بێهێـزە، وە ڕای هەر چوار پێشـەوا سـەر مەزهـەبەکان (أبو حنيفة، مالك، شافعي، أحمد) وە ڕای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایان، ئەوەیە کە مەبەست لە پیسیی، پیسیی مەعنەوییە، نـەك پیسیی جەستەییو ڕواڵـەتیی .

ئنجا کە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، بێگـومان ئێمـە وەچەی ئـادەممان ڕێـز لێگـرتوە، دیـارە لـە ڕێزگـرتنی خـوایە بـۆ وەچەی ئـادەم، کـە جەستەیان بە پاك لە قەڵەم دەدرێ، مسوڵمان بن، یان کافـر بن، چونکە هەموویـان وەچەی ئـادەمن، کە ڕێزی لێنـاون، دیـارە جـەستەکانیانی بە پاك خوڵقـاندوە، بـەڵام ڕووحەکانیان پیس دەبن لـە ڕووی مەعنـەوییـەوە، بەهـۆی ئـەو کوفـرو شـیرکـەوە، کە لە دەروونی خۆیاندا هەڵیدەگرن.

ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ دەفەرموێ: بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پیسن، دەفەرموێ: ﴿فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا﴾، با لەم ساڵیان بەدواوە، توخنی مزگەوتی حەرام نەکەون، نیزیکی نەکەون.

چونکە شایستە نین بێنە مزگەوتی حەرامەوە، نەك ئەگەر کافرێك چووە مزگەوتێکەوە مزگەوتەکە پیس بێ، پێویستی بە ئاوەگلێ بێ، یان پێویستیی بە شۆردنەوە بێ، نەخێر، بەڵکو مانای وایە کاتێك کە شیرك‌و کوفر لە دەروونیاندا هەیە، شایستە نین بێنە ماڵێکی خواوە، کە ئەو مزگەوتە بۆیە دانراوە، خەڵك تەنیا خوای تێدا بپەرستێ، ئەوە شتێکی پێچەوانەیە.

﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ﴾، وە ئەگەر لە هەژارییش ترسان، ئەوە لەمەودوا خوا لە بەخششی خۆی بێ نیازتان دەکات.

کارو کەسابەت‌و بازرگانیی، نەبەستراوەتەوە بە هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکانەوە، خوای بەخشەر لە بەخششی خۆی بێ نیازتان دەکات، دەوری ئێوە قەرەباڵغ دەبێ، مسوڵمانان دێن‌و، پەکتان لەسەر ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە نەکەوتوە.

وە دەگونجێ خوای هیدایەتدەر ئەوانیش هیدایەت بداتو، لەمەودوا بە پاکیی بێن بۆ مزگەوتی حەرام، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿إِن شَآءَ﴾، هەر کاتێك ویستی، واتە: ئەوەش بەستراوەتەوە بە ویستی خواوە، هەر کاتێك خوا ویستی بەبێ کارو کەسابەت‌و بازرگانیی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەش، ئێوە بێ نیاز دەکات لە بەخششی خۆی، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە، زانای کارزانە، دەزانێ چۆنی دەکات‌و، بۆ کێی دەکات‌و، لە کوێی دەکات‌و، چەندی بۆ دەکات؟ خوای بەخشەر بە پێی زانیاریی خۆی‌و، بە پێی حیکمەتەکەی خۆی، لەگەڵ بەندەکانیدا مامەڵە دەکات.

ئنجا خوا ڕووی هەر لە بڕوادارانە، کە پێشتر دواندنی‌و فەرمانی پێکردن، کە ڕێبگرن لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، لەم ساڵ بە دواوە، کە دیارە ساڵی نۆیەمی

کۆچیی بووەو، ئەو ساڵە کە ئەبو بەکر سەرپەرشتیاری حەج بووە، لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ، وە (عەلی کوڕی ئەبو طالیب)یش بە نوێنەرایەتی پێغەمبەر ﷺ چوو، ئەو ئایەتانەی سەرەتای سووڕەتی (التوبة)ی خوێندنەوە، ئنجا خوا کە دەفەرموێ: لەم ساڵتان بە دواوە، نابێ هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بێنە مزگەوتی حەرام، واتە: نابێ ڕێگایان بدەن، مەبەست پێی ئەوەیە.

ئنجا دوای ئەوە، فەرمانیان پێدەکات:﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ ﴾.

بجەنگن لە دژی ئەوانەی بڕوایان بە خوا، وە بە ڕۆژی دوایی نیە، وە ئەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا قەدەغەیان کردوە، بە قەدەغەی دانانێن، وە ملکەچ نین بۆ بەرنامەی هەقی خوا (کە ئیسلامە)﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾، لەوانەی کە کتێبیان پێدراوە، نەیفەرموە: (وَهُمُ الذِينَ أُتُوا الكِتابَ) کە بریتین لەوانەی کتێبیان دراوەتێ .

چونکە هەموو ئەوانەی کە کتێبیان پێدراوە، جەنگ لە دژ کرانیان ڕەوا نیە. بەڵکو تەنیا ئەوانەی کە هەڕەشە لە دەوڵەتی ئیسلامیی دەکەن‌و، خۆیان ساز کردوە کە هەڵکوتنە سەر دەوڵەتی ئیسلامیی، کە ڕۆمەکان بوون، وە ئەوانەی کە دەستپێشخەرییان کردوە، ئەوانە دەبێ ئەو جەنگەیان لە دژ بکرێ، بەڵام خاوەن کتێبێك لە ماڵەکەی خۆی دانیشتوەو، زەڕی نیە بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، یاخود پەیمانی هەیە لەگەڵ مسوڵمانان دا، یاخود لاشەڕەو بێ لایەنە، ئەوانە جەنگیان لە دژ ناکرێ، ئنجا ئەوانەش کە جەنگیان لە دژ دەکرێ، ئایا لە کوێ جەنگەکە لەگەڵیان کۆتایی پێدێ؟

دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴾، تاکو سەرانە دەدەن لە کاتێکدا کە دەستیان دەڕوات، ﴿عَن يَدٍ ﴾، واتە: دەبێ دەوڵەمەند بن، کە هەیانبێ، چونکە سەرانە لە کەسێك وەردەگیرێ، توانای هەبێ، ﴿وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴾،

دەبێ ملکەچ بن، واتە: پابەندبن بە دەسەڵاتی ئیسلامییەوە، وە دژی دەوڵەتی ئیسلامیی نەبن، ئەو جەنگە هەتا ئەوێ بەردەوام دەبێ، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی ئەگەر مسوڵمان بوون؟

بە تەئکید ئەگەر مسوڵمان بوون، ئەوە باشتر، چونکە سوپای ئیسلام کە لەگەڵ نەیارانیدا، لەگەڵ دوژمنانیدا بەرەنگار بۆتەوە، هەمیشە سێ بژاردەی خستۆتە بەردەمی سوپای بەرانبەر:

١ - یان مسوڵمان بن (لَكُمْ مَا لَنا وَعَلَيْكُمْ مَا عَلَيْنا) هەمان ماف کە ئێمە هەمانە، ئێوەش هەتانە، وە هەمان ئەرك کە ئێمە لەسەر شانمانە، ئێوەش لەسەر شانتانە، بەبێ جیاوازیی.

٢ - ئەگەر مسوڵمانیش نابن، سەرانە بدەن، سەرانە دان، واتە: ئەندازەیەك سامان بدرێ بە دەوڵەتی ئیسلامیی، کە ئەوە ڕەمزو هێمای ئەوەیە، ئەو قەوارەیە دژی دەوڵەتی ئیسلامیی نیە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەندازەیەك ماڵو سامان دەدات، وە بە پاساوی ئەوەش، کە مادام تۆ لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دای، وە دەوڵەت ئەگەر موحتاج بووی، دەتژیەنێ، وە بەرگرییت لێ دەکات، وە مافەکانت بۆ دابین دەکاتو، دەتپارێزێ، تۆش دەبێ هاوکارییەکی ئەو دەوڵەتە بکەی، کە ئەوە دەبێ بە درێژتر قسەی لێ بکەین، وە لە مەوسووعەی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی)، لە بەرگی چواردا، بە درێژیی لەوبارەوە قسەم کردوە، هەروەها لە بەرگی (٨)ی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)[1]دا، کە تەرخانم کردوە بۆ چۆنیەتی تێڕوانینو مامەڵەی ئیسلامو مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیاندا.

٣ – ئنجا کە مسوڵمان نەبوون، وە سەرانەشیان نەدا، مانای وایە نە دێنە نێو ئیسلام، وە نە ئیعلانی ئەوەش دەکەن، کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا تەبانو ئاشتەواییو هێمنیی دەپارێزن، کەواتە: لەسەر شەڕفرۆشیی خۆیان سوورن، بۆیە ئیسلام لە دژیان دەجەنگێ.

---

١) کە لە چاپی دووەمی دا بۆتە کتێبی دوازدە (١٢)یەمی مەوسووعەی ناوبراو.

ئیسلام هیچ کاتێك جەنگی نەکردوە، مەگەر لە دژی کەسانێك کە ناچاریان کردبێ، وەك پێشینیانی خۆمان دەڵێن: ئەوانەی کە بۆخۆیان داریان داوەتە دەست ئیسلام، کە لێیاندا، وە سیرەی پێغەمبەریش ﷺ هەر وابووە. جەنگەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە دوایی جەنگەکانی چوار خەلیفەکان (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەموویان بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمنان بوون، بۆ بەرگریی لەخۆکردن بوون، با سەرنج بدەین:

١) جەنگی (بەدر)، مسوڵمانان شەڕ بەردەرگای پێ گرتبوون.

٢) جەنگی (ئوحود) کافرەکان هاتبوون بۆ دەوروبەری مەدینە.

٣) جەنگی (ئەحزاب) کافرەکان ئابڵووقەی مەدینەیان دابوو.

٤) جەنگی (حونەین) وەك بینیمان هۆزی هەوازین هێرشیان دەکرد.

٥) جەنگی (تەبووك) هەڕەشەی ڕۆمەکانیان بیستبوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕوویان چوو.

٦) جەنگی (مؤتة) بە هەمان شێوە، مسوڵمانان هەڕەشەی ڕۆمەکانیان بیستبوو. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی سێ هەزار (٣٠٠٠) کەسی بەڕێ کرد. بەڵام دوو سەد هەزار (٢٠٠,٠٠٠) یان بۆ خڕ بۆوە، وە خالیدی کوڕی وەلید پاشەکشێیەکی زۆر عاقڵانەی بە سوپایەکە کردو، پاراستنی، دوای ئەوەی زەبری زۆریان لە دوژمندا، خۆشیان ژمارەیەك شەهیدیاندا.

٧) هەروەها پاشتریش، لە سەردەمی حوکمڕانی ئەبو بەکردا، کە جەنگی لە دژی دەوڵەتی فارسو ڕۆم کرد، لەبەرئەوە بوو کە هەرکام لەوانە بەتەمابوون هێرش بکەنە سەر مەدینە.

٨) دوایی لە ڕۆژگاری حوکمڕانی عومەری کوڕی خەتتاب دا، بە هەمان شێوە.

٩) دواییش لە ڕۆژگاری خەلیفەی سێیەم عوسمان دا، کە لە سەردەمی ئەو سێ خەلیفەیەدا زیاتر فتووحات کراوە، لە هەمووی دا ئەهلی ئیسلام لە بەرانبەر هەڕەشەی دوژمناندا، خۆیان بینیوەتەوە.

هەڵبەتە لێرەدا نامەوێ بڵێم: لە ئیسلامدا جەنگ تەنیا جەنگی بەرگریی کردنە، چونکە جاری وایە هێرش کردن، باشترین هۆکارە بۆ بەرگریی کردن، وە دوو زاراوەی: (هجوم) و (دفاع) هێرش و بەرگریی، دواتر داهاتوونو، شەرعزانان دایاننــاونو، پێشتر گوتوویانە: (جهاد الطلب وجهاد الدفع) بەڵام ئەوانە لە قورئاندا نەهاتوون، نە (دفع و طلب) هاتوونو، نە (هجوم) و (دفاع)یش هاتوون! ئەوەی من مەبەستمە بیڵێم، ئەوەیە کە: ئیسلام دەستپێشخەری جەنگ کردن نیە لە دژی دوژمنانی، مەگەر ئەوان دەستپێشخەریی بکەن، وە ناچاری بکەن، وە ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة) زۆر بە روونو راشکاویی خوا تێیدا دەفەرموێ:

﴿ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾.

واتە: لە رێی خوادا لە دژی ئەوانە بجەنگن، کە لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، (واتە: کەسێك کە لە دژتان ناجەنگێو لاشەرە شەڕی پێ مەفرۆشن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، بێگومان خوا دەستدرێژیکارانی خۆشناوێن.

هەروەها ئایەتی ژمارە (٦١)ی سوورەتی (الأنفال)، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾.

وە ئەگەر لای ئاشتییان گرت، ئێوەش لای ئاشتیی بگرن، وە پشت بە خوا ببەستن.

چەمكو واتایەكەیان زۆر روونە، لەوبارەوە كە گوتمان.

ئنجا خوا ﷻ لەسەر باسی هەڵوێستی جوولەكەو نەصرانییەكان، وە هەڵتەكاندنی بنەما فیكرییەكانیان، بەردەوام دەبێ، كە ئەوە زەمینە سازیی بووە، بۆ جەنگ لە دژی جوولەكەكانو نەصرانییەكان، یانی: پاشماوەكانیان لە نیوە دوورگەی عەرەبیدا،

یاخود لە شام، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴾، وە جوولەکەکان گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، وە نەصرانییەکان گوتیان: مەسیح کوڕی خوایە، (پاکیی بۆ خوا) ﴿ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ﴾، ئا ئەوە هەر قسەی زاری خۆیانە، واتە: هەر قسەیەکە بە زاری خۆیان دەیکەن، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، پشت ئەستوور نیە، نە بە بەڵگەی نەقڵ، نە بە بەڵگەی عەقڵ، چونکە خوا تاك (أَحَد)و بێنیازو جێی نیاز (صَمَد)ە.

کاتی خۆی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەروەها نەصرانییەکانی نەجران لە پێغەمبەر ﷺ یان پرسی، گوتیان: (صِفْ لَنا رَبَّكَ)[1] پەروەردگاری خۆتمان بۆ وەسف بکە، خوای تاك‌و پاکیش ئەم سوورەتەی ناردە خوار:

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾.

بڵێ: خوا تاکە، یانی: دووەمی نیە، ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾، خوا بێ نیازە، وە جێی نیازە، ﴿ٱلصَّمَدُ ﴾، دەڵێ: (ئەوەی هەموو کەس‌و هەموو شتێك پێویستی بەوە. ئەو پێویستی بە هیچ کەس‌و هیچ شتێك نیە)، ﴿ لَمْ يَلِدْ ﴾، کەسی لێ نەبووە. ﴿وَلَمْ يُولَدْ ﴾، لە کەسیش نەبووە، واتە: فەرعی نیەو ئەصڵیشی نیە. ئەدی

---

١) رَوَى عَطَاء عَنِ ابْنِ عَبَّاسَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: {قدم وَفْد نَجْرَان، فَقَالُوا: (صِفْ لَنَا رَبَّكَ): أَمِنْ زُبُرْجُدٍ، او يَاقُوتٍ، أو ذَهَبٍ، او فِضَّةٍ؟

فَقَالَ: إِنَّ رَبِّي لَيْسَ مِنْ شَيْءٍ: لأَنَّهُ خَالِقُ الأَشْيَاءِ، فَنَزَلَ: ﴿ ... قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ... ﴾ الإخلاص.
قَالوا: هُوَ وَاحِد، وَأَنْتَ وَاحِد؟

فَقَالَ: ﴿ ... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ... ۝١١ ﴾ الشورى}، انظر: تفسير النيسابوري، ص ٣٩٥، ومجموع الفتاوى لإبن تيمية، ج ٥، ص٤٤٠.

چۆنە؟ تاكو تەنیایە، ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴾ وە هیچ كەس هاوتای وی نیە، واتە: بێ وێنەیە.

هەڵبەتە خوایەكی بێ وێنە، خوایەكی جێی نیازو بێ نیاز، خوایەكی تاك، هاوسەری نیە، تاكو ڕۆڵەی هەبێت، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا خوای بێ وێنە باسی كردوە، لەوێدا بە تەفصیلێ باسمان كردوە[١]، كە دەفەرموێ:

﴿وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيْرِ عِلْمٍۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾﴾.

واتە: كوڕو كچیان بۆ (خوا) داتاشین، بەبێ زانیاریی (هەر لە خۆوە كوڕو كچیان بۆ هەڵتاشینو، گوتیان: خوا كوڕی هەنو كچی هەن).

هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەیانگوت: شەیتانەكان كوڕی خوان، وە فریشتەكانیش كچی خوان، بەڵام وەك دەفەرموێ: بەبێ زانیاریی، پاكیی بۆ خوا لەوەی ئەوان خوای پێ وەسف دەكەن، بەدیهێنەرو پەیداكەری ئاسمانەكانو زەوییە، ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌۖ ﴾، كاتێ كە خوا هاوسەری نیە، چۆن دەبێ ڕۆڵەی هەبێ! ڕۆڵە لە پێكگەیشتنی دوو هاوسەر پەیدا دەبێ.

ئنجا كە خوای تاكو پاك هاوسەری نەبێو، وێنەی نەبێ، ڕۆڵەی چۆن پەیدا دەبێ؟!

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْۖ ﴾، ئەوە هەر قسەیانە بە زاری خۆیان، واتە: قسەیەكە بە دەمی خۆیان دەیكەن، هیچ پشت ئەستوور نیە نە بە بەڵگەی عەقڵ، نە بە بەڵگەی نەقڵ، ئەدی ئەو قسەیان لە كوێوە هێناوە ؟!

---

١) واتە: لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا كە بۆ سوورەتی (الأنعام) تەرخان كراوە .

﴿يُضَاهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ﴾، ﴿يُضَاهِـُٔونَ﴾، كە خوێنراویشەتەوە: (يُضاهُونَ) یانی: (يُشاكِلون وَيُشابِهُون) بەم قسەیەیان خۆیان وەك ئەوانە لێ دەكەن، كە لە پێش ئەواندا بێبڕوا بوون.

ئنجا هەندێك دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی مەجووسییەكانە، وە هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە، وە هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی هیندۆسەكانە، چونكە هەموو ئەوانەی ڕۆڵەیان پاڵ داوەتە لای خوا.

واتە: جوولەكەو نەصرانییەكان بە دوای ڕێچكەی وان كەوتوون، قسەی وەك هی وان دەكەن، ﴿قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾، خوا بیانكوژێ، یان خوا نەفرینیان لێبكات، بەرەو كوێ لادەدرێن؟! یاخود چۆن وا لادەدرێن؟!

وشەی: ﴿أَنَّىٰ﴾، هەم بە مانای (أَيْنَ) دێ، واتە: لە كوێوە یان بۆ كوێ، هەم بە مانای (كيف) دێ، واتە: چۆن.

خوای زانای زاڵ لەسەر هەڵتەكاندنو خستنەڕووی بیروڕاو بنەما فیكرییەكانی جوولەكەو نەصرانییەكان، بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾، زاناكانو ڕاهیبەكانی خۆیان، وە عیسی كوڕی مەریەمیان لە جیاتی خوا كردن بە پەروەردگارو، پەرستراوو، مشورخۆرو، سەرپەرشتیاری خۆیان.

وشەی (أحبار) كۆی (حَبْر)ە، كە بە زانای جوولەكەكان دەگوترێ، وشەی (رهبان)یش كۆی (راهب)ە، كە بە گۆشەگیریی نەصرانییەكان دەگوترێ، ئەوانەی كە گۆشەگیر دەبن لە ئەشكەوتێك لە شوێنێكی چۆڵ دا، بە تەنیا پەرستش دەكەن.

(أرباب)یش كۆی (رب)ە، كە لە زمانی عەرەبییدا بە مانای پەروەردگارو، بەخێوكارو، پەرستراوو، مشورخۆرو سەرپەرشتیارو، دانەری بەرنامەو حەڵاڵو حەرام، دێ.

ئنجا لەبەر ئەوەی جوولەکە زیاتر بە زانایانیان مەشهوورن، وە نەصرانییەکان زیاتر بە ڕاهیبو ڕەبەنەکانیان مەشهوورن، ئەوانەی کە گۆشەگیرنو خواپەرستیی لە چیاو چۆڵو، لە ئەشکەوتو ... هتددا دەکەن، بۆیە باسی ئەو دوو جۆرە کەسانە کراوە، یاخود لەبەرئەوەی: جوولەکەو نەصرانییەکان، هەم زاناو چاوساغەکانیان، وە هەم ئەوانەی کە عەوامنو تەنیا پەرستش دەکەنو، خۆیان یەکلا کردۆتەوەو گۆشەگیر بوون، بۆ بەندایەتیی بۆ خوا، ئەوانەیان لە جیاتی خوا، کردن بە پەرستراوو مشوورخۆرو پەروەردگاری خۆیان، لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم دا، ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ ﴾، وە فەرمانیشیان پێ نەکرا بوو، مەگەر بەوە کە یەك پەرستراو بپەرستن، ئەویش خوای بێ وێنەوبێ هاوتایە، ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، پاکیی بۆ وی، لەو شتانەی کە دەیانکەن بە هاوبەش بۆی.

﴿ يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾، دەیانەوێ کە ڕووناکیی خوا بە زاریان، واتە: بە فووی زاریان، یان بەو قسانەی لە زاریان دەردەچن، بکوژێننەوە، بەڵام قسەکەیان هیچ بەڵگەیەکی عەقڵییو نەقڵیی لە پشت نیەو، دەیانەوێ هەر بەو قسە بێ بەڵگانە، یانی: بە فووی زاریان، ڕووناکیی خوا بکوژێننەوە، کە وەك دوایی باسی دەکەین، هەندێ لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست ئەومیە کە وەك چۆن کەسێك فوو لە خۆر دەکات، بۆ ئەوەی بیکوژێنێتەوە، ئەوانەش کە دژی ئیسلام قسە دەکەن، هەوڵەکانیان لە دژایەتیی ئیسلامدا، وەك هەوڵی کەسێکە کە فوو لە خۆر دەکات، کە بیکوژێنێتەوە!

﴿ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ ﴾، وە خوا ڕازی نابێ، وە ناهێڵێ، مەگەر ڕووناکییەکەی هەر تەواو بکات، ناهێڵێ بکوژێتەوە، ڕووناکیی ئایینی خۆی تەواو دەکات، ئەو ئیسلام و ئیمانە هەر دەبێ بڵاوبێتەوە، کە هەر واشبوو، ﴿ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٣٢ ﴾، هەرچەندە ئەوانەی بێبڕوان، پێشیان ناخۆش بێ.

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ ﴾، خـوا ئـەو کەسـەیـە کە پێغەمبـەری خـۆی بە ڕێنمایی‌و بە بەرنامەی هەقەوە ناردوە، ڕێنمایی بۆ تـاك، وە بەرنـامـەی ڕاست بۆ کۆمەڵگا، وەك لـە مەوسووعـەی: (الإسلام کما یتجلي في کتاب الله)دا بە تـەفصیلێ باسـم کـردوە[1]، ئیسلام ڕێنمـایی‌و ڕێ پێشاندەرە بۆ تـاك، وە بەرنـامـەو سیستـەم‌و ڕێکخەرە بۆ ژیانی کۆمەڵگا، (هدی) تـاك هـەڵیدەگـرێ، (دین الحق) یش کۆمەڵگاو خـەڵك، قەوارەی سیاسی پیادەی دەکات‌و جێبەجێی دەکات.

کەواتـە: ئـەم ئیسلامە، تـەنیـا دینێکی کەسیی نیە، بەڵکو هەم بۆ تـاکـە، هـەم بۆ کۆمەڵە، هەم ڕێنماییە بۆ تاك، تـاك سـەرەدەری خـۆی پێدەکات، هیدایـەت یـانی چـی؟ یـانی بەرچـاوی ڕۆشـن دەکـاتـەوە، بوونـنـاسـیی ڕاستـەقـینەی دەخاتـە بەردەست، لـێی حـاڵی دەکـات، کـە ئـەم بـوون (وجود)ە چییـە؟ کـێ خاوەنیـەتی‌و بۆچی هاتۆتـەدی؟ پاشـان حاڵی دەبێ لـە خـۆی کـە مەحەلالـی لـە ئیعرابـی ئـەو بوونـەدا چییـە؟ بۆچی دروستبووە؟ لـە کوێ هـاتوەو بۆچی هـاتوە؟ بۆ کـوێ دەچـێ؟ وە دەبـێ چـۆن بـژی؟ وە پـاشـان لـێی حـاڵی دەکات کە ژیانی دنیا چییە؟ ئـایـا ژیـان هـەر هـی دنیـایـە، یـاخـود ژیانـی دواڕۆژیش دەبـێ؟ وە پێغـەمبـەران کێـن؟ وە کتێبەکـانی خـوا بۆچی هـاتوون‌و فریشتـەکان دەوریان چیـە؟ واتە: هەم بوونـنـاسیی‌و هەم ئیمان‌و عەقیدەیـەکی ڕاست‌و دروست دەخاتـە بەردەستی تـاك، وە هـەم بـەهـۆی ئـەو هیدایـەتـەوە، لـێی حـاڵی دەکـات، کە چۆن مامەڵـە لـەگـەڵ خـوادا بکـات، چۆن بیپـەرستێ‌و بەندایـەتیی بۆ بکـات؟

وە پـاشـان چۆن هـەڵسوکـەوت بکـات لـە زاتـی خـۆیداو لـەگـەڵ خـەڵکـدا، واتـە: لـە ڕووی ڕەوشـت‌و ئـاکارەوە، ئەو سیفـەتـانەی کـە دەبێ ئینسان خـۆیان پێ بڕازێنێتـەوە، کامانەن، وە کـامانەن ئـەو سیفـەتـە خراپـانەی کە دەبـێ خـۆیـان لـێ بـە دوور بگـرێ؟ ئـەوە هـەمووی هیـدایـەتـە.

بەڵام ئیسلام تەنیـا هیدایـەت نیـە بۆ تـاك، بە بوونـنـاسـیی‌و ئیمـان‌و عەقیـدەوە، بە عیبـادەتـەوە، بە ئـاکارو ڕەوشـتـەوە، بە ڕەفتـاری تـاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایـەتییـەوە، ئیسلام تەنیـا ئـەوەندە نیـە، بەڵکـو ﴿ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ ﴾، بەرنـامەیـەکی ڕاستیشـە، کـە

١) بـڕوانـە: الکتاب التاسع: إهتداء الفرد بهدی الله تعالی .

کۆمەڵگـای پـێ بەڕێـوە دەچـێ: لـە ڕووی ئـابووریی، لـە ڕووی سیاسـیی، لـە ڕووی کۆمەڵایـەتیی، لـە ڕووی پـەیوەندییـەکـان، لـە ڕووی جەنـگو ئاشـتییەوە، ئـەو قورئانە هەموو ئەوانەی تێدایـە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا پێغەمبـەری خـۆی ﷺ نـاردوە، بـە ڕێـنماییو بـە بەرنـامەی هەقـەوە؟!

﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، بۆئەوەی سەریبخات بەسەر هەموو بەرنامەکاندا، هەموویـان بخاتـە ژێر ڕکێفـی خۆیـەوە.

ئایا مەبەست ئەوەیە نەیانهێڵێ؟

نـەء، ئیسـلام دینـی هەقـە، ڕێگـا بـەو دینـە بەتـاڵانە دەدات ببـن، وەك خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾الکافرون، چونکە زۆر کەس لە کۆلکە عەلمانییـەکان، ئـەوانەی کە ناشارەزان، ئەوانەی کە لە پشت پەردەی ڕەشـەوە تـەماشای ئیسـلام دەکـەن، ئـەوانەی کـە قیـاسی ئیسـلام لەسـەر نەصرانییـەتی شێوێـنراوو یەهودییەتی شێوێنراو دەکەنو، مێژووی ئیسلام قیاس دەکەنە سەر مێژووی ڕۆژئـاواو، تـاریکایی سـەدەکانی نێوەڕاست، دەڵێـن: ئـەگەر ئیسلام دەسـەڵاتی هـەبێت، ڕێ نـادات دینەکانی دیکە هەبن!!

بـەڵام ئـەوە درۆیـەکی شـاخدارە، چونکـە ئـەو دینـە هـەقە، بـێ منەتـە لـەوەی دینەکانی دیکە هەبن، بەڵام دەبێ ئەو دینە هەقە باڵادەست بێ، باڵادەست بـێ، بەو واتایە کە کەس نەتوانـێ ڕێـی لـێ بگرێ، پیادە ببێ لە زەویدا، بەڵام ئەو دینە هـەقە، کاتێك کە پیـادە دەبـێ، ڕێگـا دەدا بە هەموو دینو بەرنـامەکانی دیکە، بە بەڵگەی:

<u>یـەکـەم</u> : خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾الکـافرون، (ئەی بێبـڕواینـە!) دینـی خۆتـان بۆ خۆتـان، وە دینـی خـۆم بۆ خـۆم.

<u>دووەم</u> : خـوا دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾البـقرة، زۆریی کردن لە ئاییـن دا نیـە.

سێیەم : واقیعی ژیانو هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، كە وەسیقەیەكی لەگەڵ جوولەكەكاندا مۆر كرد، یەكێك لە بڕگەكانی: (لليهودِ دِينهُمْ وَلِلْمُسْلِمِين دِينهُمْ) جوولەكە دینی خۆیان بەڕێوەبەرنو، مسوڵمان دینی خۆیان بەڕێوەبەرن، ئنجا لە مەدینەدا سێ تیرە جوولەكەكان هەبوون[1]، قەوارەی سیاسیی خۆیان هەبوو، كە هەتا پەیمانیان نەشكاندو غەدریان لە مسوڵمانان نەكردو، بێ بەڵێن دەرنەچوون، پێغەمبەر ﷺ هەر مامەڵەی یەكسانی لەگەڵدا دەكردن، وەك هاوڵاتییانی دیكەی مسوڵمان، بە پێی ئەوەی لە صەحیفەی مەدینەدا هاتبوو، كە (وثيقة) و (كتاب)یشی پێدەگوترێو، لە جێی دەستووری ئێستا بووە.

چوارەم : وە ئەگەر تەماشای مێژووی سێزدە سەدەی دەوڵەتی ئیسلامیی بكەین، چ لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، چ دوایی لە سەردەمی چوار خەلیفە ڕاشیدەكانو، لە سەردەمی بنەماڵەكانی ئومەوییەكانو عەبباسییەكانو عوسمانییەكان دا، كە بە داخەوە لەدوای چوار خەلیفە ڕاشیدەكان، حوكمی ئیسلامیی دەبێتە بنەماڵەییو عەشیرەتییو میراتیی، كە ئێستاشی لەگەڵدا بێ، ئێمە هەر بە دەستیەوە گرفتارینو، باجی ئەو هەڵەیە دەدەین كە كاتی خۆی موعاویە كردی، خوا لێی خۆشبێ، كە جارێ بۆخۆی هەر هەبوو، هێشتا هەر زیندوو بوو، بە تۆبزیی بەیعەتی بۆ یەزیدی كوڕی وەرگرت، هەرچەندە هاوەڵان، ئەوانەی كە هەبوون، پێیان ناخۆش بووو، ناڕازی بوون، بەڵام بە زۆر بەیعەتی بۆ وەرگرت، وە لەوێوە حوكمی ئیسلامیی، لە ڕاوێژ (شورى) گۆڕا بۆ میراتییو بنەماڵەیی.

بەڵام تەنانەت لەو كاتانەش دا كە حوكمی ئیسلامیی لادانی تێدا بووە، لە چۆنیەتی هەڵبژاردنی حوكمڕانان دا، هەموو كەمایەتییە دینییەكان: جوولەكە، نەصرانیی، بوزایی، مەجووسیی، یەزیدیی، صابیئە، مولحیدو زەندیقەكان، كەسانی وەك: (ئەبو العلاى مەعەڕری، عەبدوڵلای كوڕی موقەففەع، بەشاری كوڕی بورد) ئەوانەی لە شیعرو قسەكانیاندا ئیلحادو زەندەقە دەخوێنیەوە، لە دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیاون، وە زانایان وەڵامی قسەیان بە قسە داوەتەوەو، وەڵامی فیكریان بە فیكر داوەتەوە.

---

١) مەبەست : (بنو قينقاع) و (بنو النَّضير)و (بنو قريظة)ن.

کەواتە: ئیسلام ڕێگا دەدات بە غەیری خۆی، بەڵام غەیری خۆی لە بەرنامەو دینەکان، ڕێگا بە بوونی ئیسلام نادەن، تەماشا بکەن: ئەندەلوسی ڕابردوو، ئیسپانیای ئێستا، مسوڵمانان هەشت سەد ساڵ لەوێ حوکمڕان بوون، لە ماوەی ئەو هەشت سەد ساڵەدا نەصرانییەك لە نەصرانییەتی خۆی هەڵنەگێڕدرایەوە، جوولەکەیەك لە یەهوودییەتی خۆی هەڵنەگێڕدرایەوە، جوولەکە هەبوون، نەصرانیی هەبوون، بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەی مسوڵمانان گڵۆڵەیان کەوتە لێژی، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دابەش بوون بۆ چەند مەملەکەتێك، بۆ چەند شارێکی لەگەڵ یەك ناکۆك، کە لە هەر شارەدا حاکمێك حوکمی دەکرد، بەڵێ کە مسوڵمانان گڵۆڵەیان کەوتە لێژی، نەصرانییەکان کە دەستی خۆیان بینی، مسوڵمانانیان چی لێکرد؟ پێشێ خستیاننە نێوان سێ بژاردەوە: یان دەبنە نەصرانیی، یان دەڕۆن، یان دەتانکوژین، دوایی خستیاننە نێوان دوو بژاردەوە: یان دەبنە نەصرانیی، یان دەتانکوژین، بەو شێوەیە مسوڵمانێك، یەك تاکە مسوڵمان نەما، دوای ئەوەی هەشت سەد ساڵ بوو، لەوێ حوکمڕان بوون! یانی: پازدە بیست جیل لەوێ بڕابوونەوە، بەڵام کە نەصرانییەکان دەستیان بینی، مسوڵمانانیان نەهێشتو دوایی جوولەکەشیان نەهێشت، جوولەکەکانیشیان دەربەدەر کرد.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾، بۆ ئەوەی بەسەر هەموو دینەکاندا سەربیخات، مەبەست ئەوە نیە کە نەیانهێڵێ، واتە: باڵادەست بێ، ئنجا وەك سایەو چەتر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکاتو ڕێزیان دەگرێو، پێیان دەفەرموێ: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦ ﴾.

﴿ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ۝٣٣ ﴾، هەرچەندە هاوبەش بۆخوا دانەرەکان پێشیان ناخۆش بێ.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەهلی کوفرو شیرك هەرگیز بە باڵادەستیی ئیسلامو مسوڵمانان ڕازیو خۆشنوود نابن .

## چەند مەسـەلەیەکی گرنـگ

**مەسـەلـەی یـەکـەم:** کە خـوای بەرزو مەزن دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾.

ڕاستـە مانـای ئـەم ئـایـەتـە بەم شێـوەیـە: ئـەی ئـەوانـەی بڕواتـان هێـناوە! بێگـومان هـاوبەش بۆ خـوا دانەرەکان پیسن، بـا لـە دوای ئـەم سـاڵـیـانەوە، توخنـی مزگـەوتی حـەرام نەکـەون، وە ئـەگـەر لـە هـەژارییش ترسـتـان هـەبوو، ئـەوە خـوا ئەگـەر بیـەوێ بێ نیـازتـان دەکات لـە بەخششی خۆی، بێگومان خـوا زانـای کاربەجێـیـە.

سـەرەتا دەڵێین: ئەمە زەمینەسازییو ڕێ خۆشکردنە بۆ حەجی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە یـەکـەمین حـەجو دوا حـەجیش بوو، کە لـە دوای خـۆی نـاوی لـێـنرا (حجـة الـوداع) واتـە: حـەجی ماڵئـاوایی کردنی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ لـە دنیـا، کە لـە سـاڵی دەیەمی کۆچییـدا پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بە ئـامادەبوونی سەد هـەزار، یـاخود سـەدو بیست هەزار کـەس لـە هـاوەڵانی، هـەڵبەتە ئەوانەی کە لـەو کاتەدا مسـوڵـمان بـوون، ئـەو حـەجـەی ئـەنجامدا، دیـارە ئێمە دەبێ چەند هـەڵوەسـتـەیـەك بکـەین لـە بـەردەم ئـەو ئـایـەتـە موبارەکەدا:

١/ کە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ ﴾، ئەی ئـەوانەی بڕواتـان هێـنـاوە! بە دڵنیـاییـەوە هـاوبەش بۆ خـوادانـەران پیسن، چونکـە ﴿إِنَّمَا ﴾، پێی دەگوتـرێ: (أَدَاةُ الحَصْر وَالإثبَات) واتە: ئامرازی کورت هەڵێنانو چەسـپاندن، کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ

نَجَسٌ ﴾، واتە: پیسییەتیی لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا دەچەسپێنێو، کورتیشی هەڵدێنێ.

# کورتە باسێک لەبارەی چەمک و واتای پیسی کافرانەوە

لەوبارەوە کە ئایەتلێرەدا مەبەست لە (نَجَسْ) چییە؟ کە بە مانای پیسی (النَّجاسة) دێ، بەڵام (نَجَس) یانی پیس بوو، زانایان لەوبارەوە بوونەتە دوو ڕا، ئایا مەبەست لە پیسییەتیی هاوبەشدانەران، پیسیی بەرهەستە، یاخود پیسی مەعنەوییە؟

جەماوەری ظاهیرییەکان لەگەڵ شیعەی دوازدە ئیمامیی، وە هەندێکی دیکەش، کە هەر چۆن بێ کەمینەیەکن، ڕایان وایە کە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، پیسن، بە پیسیی بەرهەست، واتە: ئەگەر یەکێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، یان بە گشتی کافرەکان دەستیان لە شتێك دا، ئەو شتە بە پیس بوو (نَجَس) لە قەڵەم دەدرێ، وە ئەگەر کافران لە قاپێکیان دا خوارد، وە ئەگەر کەسێ دەستی پێیان کەوت، دەستی بە پیس بوو لە قەڵەم دەدرێ.

بەڵام جەماوەری زانایان لە پێشینو پاشین (سلف و خلف) کە لە نێویاندا هەر چوار پێشەوا سەر مەزهەبەکان هەن: (أبو حنیفة، مالك، شافعي، أحمد)، وە زۆربەی زانایان بەگشتی دەڵێن: مەبەست لە پیسیی هاوبەش دانەران پیسیی مەعنەوییە، واتە: ڕووحیان پیسە، ناخیان پیسە، نەك جەستەیان پیس بێ.

دیارە لەوبارەشەوە هەرکام لەو دوو لایەنە بەڵگە دێننەوە:

## یەکەم: بەڵگەکانی لایەنگرانی ڕای بە پاك دانانی جەستەی مرۆڤ بە گشتی

هەڵبەتە لە تەفسیرەکاندا کە من سەرنجم دان، نەمبینیوە ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الإسراء) بە بەڵگە بێننەوە، کە پێم وایە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مرۆڤ وەك مرۆڤ: کافر بێ، یان مسوڵمان بێ لەڕووی جەستییەوە، بە پاك لە قەڵەم دەدرێ:

**بەڵگەی یەکەم** : خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتووە لە دەریاو وشکانیی دا هەڵمان گرتوون، (واتە: ئامرازی وامان بۆ ڕەخساندوون کە سەفەری دەریاو وشکانییان پێ بکەن)، وە لە ڕۆزییە خۆش و بەتامەکان پێمان داون، وە بەسەر زۆر لە دروستکراوانان دا هەڵمان بژاردوون.

دیارە مەخلووقێکی وا، ناگونجێ جەستەکەی بە پیس لە قەڵەم بدرێ. هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەریش دا ﷺ دەگونجێ زۆر بەڵگە بهێنرێنەوە.

**بەڵگەی دووەم** : ﴿أَنَّهُ ﷺ تَوَضَّأَ مِنْ مَزَادَةِ مُشْرِكَة﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٨٢)}.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرتوە، لە کوندەو مەشکەی ئاوی ئافرەتێکی هاوبەش بۆ خوا دانەر.

ئنجا ئەگەر پیس بووایە، ئاوەکەی بە کەڵکی دەستنوێژ نەدەهات.

**بەڵگەی سێیەم** : ﴿أَكَلَ ﷺ مِنْ طَعَامِ الْيَهُودِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٥٧٧٧)}.

واتە: لە خواردنی جوولەکەکانی خواردوە.

بەڵگەی چوارەم : ﴿رَبَطَ ﷺ ثُمَامَةَ بْنَ أُثَالٍ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٤٣٧٢)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٧٦٤)}.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ثومامەی کوڕی ئوثالی بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەگەکانی مزگەوت (ی خۆی)ەوە (لە مەدینە) بەستەوە.

(ثُمَامَةَ بْنَ أُثَالٍ) کە ئەو کاتە دیارە بە دیل گیراوەو، هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە کۆڵەگەیەکی مزگەوتی خۆیەوە بەستۆتەوە، ئنجا ئەگەر پیس بووایە، دیارە دەیانگوت: کۆڵەگەکە پیس بووەو دەبێ بیشۆینەوە!

بەڵگەی پێنجەم : ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَنُصِيبُ مِنْ آنِيَةِ الْمُشْرِكِينَ، وَأَسْقِيَتِهِمْ فَنَسْتَمْتِعُ بِهَا، فَلَا يُعَابُ عَلَيْنَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٥٠٩٥) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٣٨٤٠)، وَالطَّبَرَانِيّ فِي (مسند الشاميين) برقم: (٣٧٥)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي الكُبْرَى برقم: (١٢٦) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِيُّ}.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووین بۆ جەنگ، لە قاپو قاچاغی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانو، لەو دەفرانەی کە ئاوو خواردنەوەکانی خۆیانیان تێدەکردن، ئێمە لەو قاپو دەفرو مەشکەو کوندانەمان دەستکەوت دەبوو، سوودیشمان لێ دەبینین، لێشمان بە عەیب نەدەگیرا، یانی: پێغەمبەر ﷺیش لێی بە ڕەخنە نەدەگرتین.

## دووەم: بەڵگەکانی ڕای بە پیس دانانی جەستەی کافران

بەڵگەی یەکەم : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنجُسُ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ برقم: (١٨٢٥)، وَأَحْمد برقم: (٧٢١٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٨١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٢٦٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٥٣٤)}.

واتە: بێگومان بڕوادار پیس نابێ.

جا ئـەوان چـەمكی پێچـەوانەكـەیـان لـێ گـرتوە، واتـە: ئـەگـەر بـڕوادار پـیس نەبێ، دیـارە بـێبڕوایـان پیسـن.

بـەڵام زانـایـان لـەسـەر ئـەوە یـەكدەنگـن كـە هـەمیشـە چـەمكی پێچـەوانە (مفهوم المخالفة) كاری پێنـاكرێ، وە ئـەمە یـەكێكـە لـەو شوێنـانە، چونكـە چەمكی پێچەوانە، نـابێ لـەگـەڵ دەقێكی ڕوونو ڕاشكاوی دیكـەدا، تێك بگیـرێ، بەڵكو كاتێك كار بە چەمكی پێچەوانـە دەكرێ، كـە دەقێك نەبـێ لـەوبارەوە، وە پـاشـان پێچـەوانەی ڕووحـی شـەریعـەتیش نەبـێ.

**بەڵگـەی دووەم** : دەڵێـن: {أَمَرَهُ ﷺ بغَسْلِ آنِيـةِ أَهْلِ الْكِتَـابِ وَالأَكْلِ فِيهَـا، إنْ لَم يُوْجَد غَيْرُهـا﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٤٨٨)}.

واتە: پێغـەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كردوە كە قاپو قاچاغی خاوەن كتێبـەكان بشۆرێـن، وە تێیـان دا بخورێ، ئـەگـەر هیچی دیكـە دەسـتنەكەوت.

زۆربـەی زانـایـان وەڵامیان داوەتـەوە: هۆكـارەكـەی ئـەوە بووە كـە ئـەوانە گۆشـتی بەرازیـان لـەو قاپو قاچاغانـەدا، خـواردوە، یـان شـەڕابیان تێـدا خـواردۆتـەوە، وە دەگونجێ خواردنی دیكەی پیسیشیان تێدا خـواردبن، كە بـەپێی شـەریعەتی ئێمـە پیس بووە، نەك لـەبەرئەوەی كـە ئەوانە جـەسـتـەیـان بە پیس لـەقەڵەم بدرێ.

ئنجا زانایانو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: بە پیس لە قەڵەم دانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان هیچ ڕیشەو بنەمایەكی نیە لە شەریعەتی ئیسلامییدا، بەڵكو ئەوە لەلای هیندۆسـییەكان هەیە، بت پەرستـەكانی هیند، هەروەهـا هەندێ لـە دەمارگیـرەكانی نەصـــڕانییش، وە لـــەوبارەوە زۆر شـــت باســـكراوە، ئەویـــش بەمەبەســـتی دوورخستنەوەی خـەڵـكی خـۆیـان لـە ئیسـلام، وە لـە شـەریعـەتی ئیسـلامیی، وە دەمارگیـریی بۆ پەیداكـردنیان بـە تایبـەت نەصـڕانییەكان، زۆر درۆو دەلـەسـەیـان كـردوە، هـەم كاتی خۆیو هەم ئێستاش بە تەئكید هـەر هـەوڵ هەیـە، بۆئـەوەی لـە مسوڵمانان دوور بـنو خۆیـان بـە دوور بگـرن، بـە بیـانووی ئـەوە كـە مسـوڵـمانان جەستەیان پیسـە!!

كـەواتـە: بیـرۆكـەی بە پیس دانـانی مـرۆڤ، لـە ئیسـلام دا نیـەو، بـەڵـكو لـەلای نەصـرانییـەكان هەیە، وە لە ڕاستییدا لە غـەیری ئیسـلامدا ئـەو بیـرۆكەیە هەیـە.

لەنێو هەندێك لە هیندۆسەكانو، هەندێ لە دەمارگیرەكانی جوولەكەو، هەندێ لە خاوەن دینەكانی دیكەش هەیە.

٢/ ئنجا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَا ﴾.

با لەم ساڵیان بەدواوە، توخنی مزگەوتی حەرام نەكەون، نیزیكی نەكەون، واتە: نەك هەر نەیەنە نێوی، بەڵكو نیزیكیشی نەكەونەوە.

زانایان لەوبارەوە: باسیان كردوە: كە ئایا حوكمی چوونە نێو حەرەم، واتە: نێو مزگەوتی حەرامو دەوروبەری، هەروەها چوونە نێو حیجاز، واتە: ئەوەی كە دەكەوێتە نێوان یەمامەو یەمەنو نەجدو مەدینەوە، پاشان چوونە نێو وڵاتی مسوڵمانان بە گشتی، چییەو چۆنە؟

لەوبارەوە زۆر شتیان باسكردوە، بەڵام ئەگەر دەقێك هەبێ هەر ئەوەیە كە لێرەدا خوای كارزان فەرموویەتی : ﴿ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ ... ﴾.
با هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان نیزیكی مزگەوتی حەرام نەكەون، حیكمەتەكەیشی دیارە، وەك پێشتر باسمانكرد: ئەوە بووە كە ئەوان بە ڕووتیی بە دەوری كەعبەدا تەوافیان كردوە، وە بێ بەندو بار بوونو، فیكەیان كێشاوەو چەپڵەیان لێداوە، وەك لە تەفسیری سوورەتی ئەنفالدا باسمان كرد، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمۡ عِندَ ٱلۡبَيۡتِ إِلَّا مُكَآءٗ وَتَصۡدِيَةٗ ...﴿٣٥﴾ ﴾.

وە نوێژیان لەلای ماڵ ـ ی خوا ـ تەنیا فیكە كێشانو چەپڵە لێدان بوو.

دیارە ئەوەش لەگەڵ ویقارو ڕێزو حورمەتی بەندایەتیی بۆ خواو خواپەرستیی ئەنجامدان دا ناگونجێ، بە تایبەت كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی دەیەمدا حەجی كردوە، ئەوە هەمووی زەمینەسازیی بووە بۆ ئەو كاتە، بۆیەش زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، بۆ وێنە:

ئەبو حەنیفە دەڵێ: ئەگەر کافرێك هاوپەیمان بێ لەگەڵ مسوڵمانان، یاخود پەنا درابێ، بۆی هەیە بچێتە ئەو شوێنانە، مادام بە مۆڵەتی مسوڵمانان بێ، وە خواپەرستییەکی تایبەتی خۆیانی تێدا ئەنجام نەدەن، کە پێچەوانەی خوا بە یەکگرتن‌و مسوڵمانێتیی بێ، بەڵام بە هەر حاڵ من پێم وایە: ئەو بابەتە زیاتر پەیوەست بووە، بەو کاتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی یەکەمین‌و دوامین حەجی خۆی بکات، تاکو بۆمان ببێتە سەرمەشقێك لە ئەنجامدانی خواپەرستییەکانی حەجدا، وەك چۆن لە هەموو شتەکانی دیکەدا سەرمەشق بووە، وە بە تایبەتییش حەج، کە ئەوە یەکەمین‌و دوا حەجی بووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو:

﴿لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ، بِرقم: (١٢٩٧)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ. برقم: (٢٨٧٧)}.

واتە: خواپەرستییەکانی حەجم لێوە فێربن، تەماشام بکەن داخۆ من چۆن مەناسیکی حەج جێبەجێ دەکەم، (مناسک) کە کۆی (منسک)ە، واتە: خواپەرستیی‌و، عیبادەتەکانی تایبەت بە حەج.

٣/ کە دەفەرموێ: ﴿بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا﴾، بە تەئکید مەبەست لە: دوای ئەم ساڵیان، واتە: ساڵی نۆیەم، کە دەکاتە ساڵی دەیەم‌و ساڵەکانی دی، نابێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەرفەتیان بدرێ، بچن بۆ مزگەوتی حەرام‌و دەوروبەری مزگەوتی حەرام، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ساڵە بۆخۆی حەجی نەکرد، ئەبو بەکر (رضي الله عنه)ی نارد کە ئەمیری حەج بوو، وە پاشان عەلی (رضي الله عنه)ی بەدوادا نارد، ئەو ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی تەوبەی بەسەردا خوێندنەوە، کە ببێتە ئاگادارکردنەوەیەك، تاکو بۆ ساڵی داهاتوو دەوروبەری مزگەوتی حەرام‌و ئەو شوێنانەی کە خواپەرستییەکانی حەجیان تێدا دەکرێ پاك‌و تەمیز بن‌و، جگە لە مسوڵمانانی خوا بەیەکگرو مسوڵمانانی خاوەن عەقیدەی ڕاست‌و دروست، وە خاوەن خواپەرستیی ڕاست‌و دروست، کەسی دیکە لەو شوێنە موبارەکەدا نەبێ.

٤/ كە دەفەرموێ : ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً ﴾، دەڵێ: (عَالَ يَعِيلُ عَيْلاً وَ عيْلَةً) وەك (كَالَ يَكِيلُ كَيْلاً) یانی: (افْتَقَرَ يَفْتَقِرُ افتِقاراً): هەژار كەوت، هەژار دەكەوێ، هەژاركەوتن.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً ﴾، یانی: ئەگەر لە هەژاریی‌و نەداریی‌و ئاتاجیی ترسان، بەهۆی ئەوەوە كە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان قەدەغە دەكەن، بێنە دەوروبەری مزگەوتی حەرام‌و، ئەو بازرگانیی‌و كڕین‌و فرۆشتنەی كە ئەوان ئەنجامی دەدەن، ئەوە دەبڕێ، ئەگەر ئەو مەترسییەتان هەبوو، ﴿ فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ إِن شَاءَ ﴾، ئەوە لەمەودوا خوا بە بەخششەكانی خۆی، بێ نیازتان دەكات، ئەگەر بیەوێ.

دیارە وەك جاری دیكە باسمان كردوە: هەمیشە خوای بالادەست كارەكان پەیوەست دەكات بە ویستی ڕەهای خۆیەوە، چونكە ئەگەر خوا نەیەوێ، بەخششەكەشی نابەخشێ، نە بە موسوڵمانان‌و نە بە كەس، بۆیەش هەمیشە خوا ﷻ كارەكان بە ویستی خۆیەوە پەیوەست دەكات، تاكو هەمیشە چاومان لەوەبێ‌و، بزانین كە هیچ شتێك بەبێ ویستی ڕەهای خوای پەروەردگار ئەنجام نادرێ.

٥/ كە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، بێگومان خوا زانای كاربەجێیە، یانی: دەزانێ كە چیتان بۆ دەكات، وە كاربەجێیە، دەزانێ چەندو كەی‌و چۆنتان بۆ دەكات.

مەسەلەی دووەم: كە دەفەرموێ: ﴿ قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾

دوای ئەوەی خوا ﷻ لە باسی دوورخستنەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، لە مزگەوتی حەرام‌و لە شوێنە موبارەكەكان، تەواو بوو، وە لە میانی موسوڵمانانەوە

ئیعلانی جەنگی لە دژی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە کرد، کە بێ بەندو بارن‌و پەیوەست نین بە پەیمانەکانیانەوە، وە ئەوانەی هەڵاوارد کە پەیوەستن بە بەڵێن‌و پەیمانەکانیانەوە، کە دەبێ بەڵێن‌و پەیمانەکانیان تا کاتی دیاریکراوی خۆیان بۆ تەواو بکرێن، دوای ئەوەی کە بە گشتی چوار مانگ مۆڵەتی بۆ دانان، واتە: ئەوانەی کە پەیمانەکانیان ڕەها بوو، یاخود کەمتر لە چوار مانگ بوو، ئەگەرنا ئەوەی لە زیاتر لە چوار مانگی بۆ دیاری کرابوو، ئەوە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡ﴾، پەیمانەکەیان تا کاتی دیاریکراوی خۆیان بۆ تەواو بکەن، ئنجا دوای ئەوە خوا لەم ئایەتە بە دواوە، باسی زەمینەسازیی دەکات بۆ جەنگ کردن لە دژی ڕۆمەکان کە نەصرانیی بوون، بۆیە سەرەتا ڕوو لە ئیمانداران دەکات‌و دەفەرموێ: بجەنگن لە دژی ئەوانەی کە بڕوایان بە خوا نیە، وە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، وە ملکەچ نین بۆ بەرنامەی ڕاستی خوا. وە ئەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا بە قەدەغەیان داناوە، بە قەدەغەی دانانێن. یانی: ئەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا قەدەغەیان کردوە، ئەوان پێیەوە پەیوەست نین، هەروەها ملکەچ نین بۆ بەرنامەی هەقی خوا (کە تەنیا ئیسلامە). لە دژی ئەوانە بجەنگن، تاکو بە دەستڕۆیشتوویی ملکەچانە سەرانە دەدەن.

# لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی واتای ئەم ئایەتەوەو چۆنیەتی هەڵسوكەوتی قەوارەی ئیسلامی لەگەڵ نامسوڵمانان دا[1]

**بڕگەی یەكەم :**

سەرەتا دەڵێین: خوای زانا، ئەو خاوەن كتێبانەی كە فەرمانی بە مسوڵمانان كردوە لە دژیان بجەنگن، هەتا سەرانە دەدەن، بە چوار سیفەتان پێناسەی كردوون:

یەكەم: بڕوایان بە خوا نیە.

دووەم: بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە.

سێیەم: پابەند نین بەو حەڵاڵو حەرامەوە كە خواو پێغەمبەرەكەی دیارییان كردوون.

چوارەم: وە پابەند نین بە ئایینی هەقەوە، ﴿وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ﴾، یانی : ملكەچ نین بۆ دینی هەقو بەرنامەی هەقی خوا، كە ئیسلامە.

ئنجا لێرەدا زانایان مشتومڕێكی زۆریان بووە، لەوبارەوە كە: ئایا خوای زاناو توانا، ئەو سیفەتانەی بۆیە باس كردوون كە: ئەگەر خاوەن كتێبانێك هەبوون:

---

١) شایانی باسە كە لە بەرگی چوارەمی: مەوسووعەی {ئیسلامو دەوڵەتداریی} دا بە ناوونیشانی: (نامسوڵمانان لە سایەی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا)، وە لە بەرگی هەشتەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) دا، كە لە چاپی دووەمی دا دەبێتە (الكتاب الثاني عشر) بە درێژیی ئەو بابەتەمان توێژیوەتەوە.

ئیمانیان بە خوا بوو، وە ئیمانیان بە ڕۆژی دوایی بوو، وە پابەند بوون بەوەوە کە خواو پێغەمبەری خوا حەڵاڵیان کردوەو حەرامیان کردوە، وە پابەند بوون بەو دینەی خۆیانەوە، {هەڵبەتە لێرەدا دەبێ مەبەست ئەوەبێ کە بە پێی ئایین و بەرنامەکەی خۆیان، ئیمانیان بە خوا بوو، ئیمانیان بە ڕۆژی دوایی بوو، وە ئەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی لە ڕۆژگاری خۆیان دا، ئنجا مووسایە، یان عیسایە یاخود پێغەمبەرانی دیکەن، ئەگەر چەسپابێ کە ئۆممەتیان هەن و کتێبیان لێ بەجێ مابوون، کتێبی جێی ئیعتیبار}، ئەوە نابێ جەنگیان لە دژ بکرێ، ئایا مەبەست ئەوەیە؟ یاخود ئەو سیفەتانە تەنیا بۆ ناسینەوەی ئەوانەیە، کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن؟!

پێم وایە: باسکردنی ئەو سیفەتانە، وەك زۆربەی توێژەرەوانی قورئانیش گوتوویانە: وەك پاساو نیە بۆ جەنگ لە دژ کردنیان، واتە: لەبەرئەوەی خاوەنی ئەو سیفەتانەن: ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، وە پابەند نین بەوەوە، کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەیان کردوە، وە پابەند نین بە بەرنامەی هەقی خواوە، چونکە خاوەنی ئەو چوار سیفەتەن، بۆیە با جەنگیان لە دژ بکرێ. واتە: مەبەست ئەوە نیە، کە ئەو سیفەتانەیان هەن، یان: پێچەوانەکانی ئەوانەیان نین، بۆیە دەبێ جەنگیان لە دژ بکرێ، تاکو بڵێین: ئەگەر خاوەنی ئەو سیفەتانە بوون: ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبووو، پابەند بوون بە حەڵاڵ و حەرام و، پابەند بوون بە دینەکەی خۆیانەوە، ئەو کاتە جەنگیان لە دژ ناکرێ!

بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئێوە لە دژی ئەو خاوەن کتێبانە بجەنگن، کە ئیددیعای کتێبی ئاسمانیی دەکەن، وە لافی ئەوە لێدەدەن کە بە دوای پێغەمبەرانی خوا کەوتوون سەلامی خوایان لێ بێ، بە دوای کتێبەکانی خوا، کەوتوون، کەچی ئەوەش سیفەتەکانیانن: نە ئیمانێکی ڕاست و دروستیان بە خوا هەیە، نە ئیمانیان بەڕۆژی دوایی هەیە، نە ئەوەی کە خواو پێغەمبەری کۆتایی خوا (موحەممەد) ﷺ بە حەرام و قەدەغەیان داناوە، پێیەوە پابەندن، وە نە بە بەرنامەی هەقی خواشەوە، کە تەنیا ئیسلامە: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ پابەندن. واتە: لە دژی کەسانێك بجەنگن کە ئەوانە وەسفەکانیانن، نەك بە هۆی ئەوەوە.

کە ئەو سیفەتانەیان هەن، لە دژیان بجەنگن، بەڵکو لە دژی کەسانێك بجەنگن، کە ئەو سیفەتانەیان هەن، وە شایستەی ئەوەشن کە لە دژیان بجەنگن.

چونکە: شەڕتان پێ دەفرۆشن، دەستدرێژییتان دەکەنە سەر، جێگای مەترسیین بۆ ئێوە، هەڕەشەتان لێ دەکەن، چونکە لە ڕاستییدا جەنگی (تەبووك)یش هەر بۆیە ئەنجامدرا، کە ڕۆمەکان هەڕەشەیان دەکرد لە مسوڵمانان، وە جموجۆڵیان هەبوو کە بێنە سەر مەدینە، لەولاشەوە (أبو عامر الراهب)یش وەك تابووری پێنجەم لە نێو مەدینەو دەوروبەری مەدینەدا خەریکی پیلان گێڕان بوو، ئنجا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار کرایەوە، لە جموجۆڵی ڕۆمەکان، بەرلەوەی ئەوان هێرش بێنن، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپایەکی سی هەزار (٣٠,٠٠٠) کەسییەوە بەرەو ڕوویان چوو، چونکە زۆر جار هێرش بردن باشترین شێوازی بەرگرییە (الهُجُوم أَحْسَنُ وَسِيلَة للدِّفَاع).

<u>بڕگەی دووەم :</u>

ئنجا ئایا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾، لەوانەی کتێبیان پێدراوە، مەبەست کێن؟

أ) زانایان هەندێکیان دەڵێن: تەنیا مەبەست پێی جوولەکەکانو نەصرانییەکانە.

ب) وە هەندێکی دیکەیان دەڵێن: وێڕای جوولەکەو نەصرانییەکان، مەبەست پێی مەجووسییەکان (واتە: ئاگر پەرستەکان)ـنە.

ج) هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی: جوولەکەو نەصرانییو مەجووسییو صابیئەکانە، چونکە خوای بەرز ناوی ئەو چوارانەی هێناوە، لە سووڕەتی (الحج)دا، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾

ئنجا وێڕای ئەو چوارە، هەر كۆمەڵێكی دیكەش كە شوبهەی كتێبێكی ئاسمانیی هەبێ، ئەگەر لەوپەڕی دنیا بێ، لە چین، لە هیند، لە خوارووی ئەفریقیا، مادام خۆیان بە خاوەن كتێبێكی ئاسمانیی بزانن، یا شوبهەیەكیشیان بە دەستەوە بێ، ڕستەی: ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ﴾، ئەوانیش دەگرێتەوە.

وە من ئەو ڕایەی سێیەمم زیاتر بەلاوە بەهێزە، چونكە بەڵێ، خوا لە هەندێ شوێندا، تەنیا باسی جوولەكەو نەصرانییانی كردوە، وە لە هەندێ شوێندا وێڕای وان، باسی مەجووسیی‌و صابیئەشی كردوە، بەڵام لە هەندێ شوێنیشدا، هەر بە گشتی دەفەرموێ: ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ﴾، لەوانەی كتێبیان پێدراوە، یان ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾، ئەی خاوەن كتێبینە! بۆیەش خوا بەگشتی وادەفەرموێ. تاكو هەموو ئەوانە بگرێتەوە كە خۆیان بە خاوەن‌و، شوێنكەوتووی كتێبێكی ئاسمانیی دەزانن.

ئنجا ئەگەر بڵێین: كتێبە ئاسمانییەكانی دیكە گۆڕدراون، دیارە هی جوولەكەو نەصرانییەكانیش‌و، هی صابیئەو مەجووسییش هەر گۆڕدراون‌و دەستكاریی زۆر كراون.

<u>بڕگەی سێیەم</u>:

خوا ﷻ كە دەفەرموێ: لە دژیان بجەنگن، یانی چی؟!

ئایا هەر كەسێك خاوەن كتێب بوو، كتێبی ئاسمانیی پێدرا بوو، ئێمە بۆمان ڕەوایە لە دژی بجەنگین؟

بێگومان نەخێر، چونكە لە شاری پێغەمبەردا ﷺ سێ تیرەی جوولەكە: (بنو قینقاع، بنو النَّضیر، بنو قریظة) هەبوون، وە هەندێ لە موشریكەكان هەبوون. وە هەندێك نەصرانیی هەبوون لە مەدینەدا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعلانی جەنگی لە دژ نەكردوون، بەڵكو سەرانەشی لێ نەستاندوون، بۆیە ئەو قسەیەی (محمد رشید رضا) زۆر جوانە، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴿٢٩﴾﴾، دەڵێ:

(أَي قَاتِلُوا مَنْ ذُكر، عِنْدَ وَجُود مَا يَقْتَضِي وُجُوب القِتَال: كالإعْتِدَاء عَلَيْكُمْ أَو عَلَى بلادِكُمْ، أَوْ اضْطِهادِكُمْ وَفِتْنَتِكُمْ عَنْ دِينِكُمْ، أَوْ تَهْدِيد أَمْنِكُمْ وَسَلامَتِكُمْ، كَمَا فَعَلَ الرُّوم فَكانَ سَبَبَاً لِغَزْوَةِ تَبُوك)[1].

واتە: ئەوانەی كە باسكران، لە دژیان بجەنگن لە كاتێكدا كە پاڵنەرو هاندەرێك هەبێ بۆ پێویست بوونی جەنگ لە دژیان، وەك ئەوەی كە دەستدرێژییتان بكەنە سەر، یان دەستدرێژیی بكەنە سەر نیشتیمانتان، یاخود بتان چەوسێننەوەو لە دینی خۆتان هەڵتانگێڕنەوە، یان رێگریی دینداریتان لێ بكەن، یاخود هەڕەشە لە هێمنیی‌و ئاساییش‌و سەلامەتییتان بكەن، وەك چۆن رۆمەكان كردیان، كە بوو بە هۆكارێك بۆ جەنگی تەبووك.

رایەكەشی زۆر جوانە، وە هەر ئەوەش مەبەستە.

كەواتە: دەبێ بزانین لەو شوێنانەدا كە خوا بە رەهایی هەندێ شت دەفەرموێ، دەبێ دوایی تەماشا دەقەكانی دیكە بكەین، چونكە ئەو رەهاییە كە هاتوە، نابێ لەگەڵ دەقەكانی دیكەدا تێكبگیرێ، هەرچەندە لە كۆتایی ئەو ئایەتەشدا دەفەرموێ: تاكو سەرانە دەدەن، بەڵام لە شوێنەكانی دیكە، لە هەموو ئایەتەكانی دیكەدا باسی ئەوە كراوە، كە ئەگەر بەرانبەرەكە لای ئاشتیی گرت‌و شەڕفرۆشیی نەكرد، نابێ لە دژی جەنگ بكرێ، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا ...﴿٦١﴾﴾، ئەگەر ئەوان لای ئاشتییان گرت، تۆش لای ئاشتیی بگرە.

هەڵبەتە ئەم ئایەتەش نەسخ نەبۆتەوە، وە ناكرێ نەسخ بووبێتەوە، چونكە ئەگەر دوژمنەكەت شەڕت پێ نەفرۆشێ، ناگونجێ بڵێی: من هەر شەڕت لەگەڵدا دەكەم !

چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە لە رێی خوادا لە دژی ئەوانە بجەنگن كە جەنگتان لە دژ دەكەن.

---

[1]) تفسير القرآن الحكيم، ج ١٠، ص ٢٦٦ .

بەلام ئەدی ئەگەر ئەوان جەنگیان لە دژمان نەکرد؟

ئەوە ﴿وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ﴾، دەستدرێژیی مەکەن، سنوور شکێنیی مەکەن، ئەگەر ئەوان لای سەلامەتیی و ئاشتییان گرت، تۆش لای سەلامەتیی و ئاشتیی بگرە. ئیسلام عەودالی شەڕو شۆڕ نیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:

﴿أَيُّهَا النَّاسُ! لا تَتَمَنَّوا لِقَاءَ العَدُوِّ، وَاسأَلُوا اللهَ العَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٢٨٠٤)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٧٤٢)، وَأَبُو دَاوُد. برقم: (٢٦٣١)}.

واتە: ئەی خەڵکینە! بە ئاوات مەخوازن بەرەنگاری دوژمنتان ببنەوە، وە داوای سەلامەتیی لە خوا بکەن، بەلام ئەگەر بەرەنگاریشیان بوون (شەڕ بەری دەرگای لێگرتن) خۆڕاگربن و چەسپاو بن.

بڕگەی چوارەم :

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾، ئایا ئەو جەنگە لە دژیان تا کوێ دەوامی دەبێ؟ ئەوە دیارە پاڵنەر هەیە بۆ جەنگ لە دژ کردنیان: یان بەهۆی ئەوەوەیە کە مسوڵمانان دەچەوسێننەوە، یان بەهۆی ئەوەوە کە دەستدرێژیی دەکەنە سەر وڵاتی مسوڵمانان، یاخود هەڕەشە دەکەن. یان خۆیان بۆ جەنگ و پەلاماردان کۆدەکەنەوە، تۆ نابێ چاوەڕێ بی تاکو بەسەر ماڵتدا دەدەن.

بەڵێ دوای ئەوەی کە خوازیارو پاڵنەرو هاندەری ئەوە هەبوو کە جەنگیان لە دژ بکرێ، ئایا ئەو جەنگە، تا کوێ درێژە دەکێشێ؟

خوا دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾، تاکو سەرانە دەدەن لە کاتێکدا کە دەستڕۆیشتوون، وە بە ملکەچییەوە، واتە: ملکەچ دەبن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، یان ملکەچ دەبن و لای ئاشتیی و سەلامەتیی دەگرن.

لەگەڵ قەوارەی ئیسلامییدا، ئەگەر لە دەرەوەی قەوارەی ئیسلامییدا بوون، لێرەدا دەبێ چەند هەڵوەستەیەك بكەین:

هەڵوەستەی یەكەم : وشەی (جزیة): (الجزیة جمعها : الجزی، كاللحیة جمعها اللِّحی)، (جزیة) بە (جِزی) كۆدەكرێتەوە، وەك چۆن (لحیة) بە (لِحی) كۆدەكرێتەوە، واتە: سەرانە، سەرانەكان، وشەی (جزیة) هەندێ گوتوویانە: (جزیة) ڕیشەیەكی فارسیی هەیە، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن كە ڕیشەیەكی عەرەبیی هەیەو لە (جزاء)ەوە هاتوە، (الجزیة) یانی: سزادان، یاخود بەرانبەر بوونی شتێك بە شتێك، دەڵێ: (جزاءً عن كذا).

هەڵوەستەی دووەم : ئایا سەرانە بۆچی وەردەگیرێ، لەوانەی كە سەرانەیان لێ وەردەگیرێ؟ ئایا لەبەر كوفریانە؟ هەندێ لە زانایان گوتوویانە: لەبەر كوفریانە، گوتوویانە: ئەوە سزای ئەوەیە كە ڕێگا دەدرێ لەسەر كوفر بمێننەوە، وە هەندێكیان گوتوویانە: ئەوە بەرانبەرو قەرەبووی ئەوەیانە كە ڕێگا دەدرێ هاووڵاتیی بن لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، وە هەندێكی دیكە لە زانایان گوتوویانە: ئەوە لە بەرانبەر ئەوەدایە كە خوێنیان دەپارێزرێ.

من لە مەوسووعەی: {ئیسلامو دەوڵەتداریی} دا، وە لە مەوسووعەی: {الإسلام كما یتجلى في كتاب الله} لە بەرگی هەشتدا باسم كردوە، كە لە ڕاستییدا سەرانە لە بەرانبەر ئەوەدا نیە كە ڕێگایان دەدرێ، لەسەر كوفر بمێننەوە، چونكە لەسەر كوفر مانەوەی خەڵك، ئەسڵێكە لە ئیسلامداو خوا ڕێگای داوە كە خەڵك ئیمان بێنێ، یان كافر بێ، هەڵبەتە خوای پەروەردگار ئیمانی خۆشدەوێو ڕقی لە كوفرە، بەڵام بە مەبەستی تاقیكردنەوەی خەڵك، ڕێی كافربوونی لێ نەگرتوون، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف.

بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، كێ دەیەوێ با ئیمان بێنێ، كێش دەیەوێ با كافربێ.

کەواتە: سەرانە لە بەرانبەر مانەومیان دا لەسەر کوفر نیە، وە لە بەرانبەر ئەوەش دا نیە، کە خوێنیان دەپارێزرێ، بۆچی؟

چونکە کە ئیسلام قبووڵی کرد هاووڵاتیی بن، دیارە ئەو کاتە سەرو ماڵو نەفسو ناموسیان، وەك هی مسوڵمانان وایە، کە پێغەمبەر ﷺ وەك بنچینەیەك دایناوە، دوایی شەرعزانان کردوویانە بە بنچینەیەك، وە زۆریش لە نووسەرە ئیسلامییەکان وادەزانن کە ئەوە هەر بنچینەیەکی فیقهییە، نازانن ئەوە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ:

﴿أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٣٣٧٢)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٣٨٥)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٢٦٤١)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٦٠٨)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٣٩٦٧)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٥٨٩٥)، وَأَبي يَعْلَى، برقم: (٢٦٦٨)، وَالبَيْهَقِيُّ، برقم: (٢٠٣١)}.

کە ئەوە لە دەقی ئەو پەیماننامەیەی، کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نەجرانییەکاندا بەستوویەتی، لەوێدا هاتوە[1]، واتە: (هەمان ماف کە مسوڵمانان هەیانە، ئەوانیش هەیانە، وە هەمان ئەرك کە مسوڵمانان لەسەر شانیانە، ئەوانیش لەسەر شانیانە).

هەڵبەتە جگە لەوەی کە تایبەتمەندیی دینی مسوڵمانانە، یاخود تایبەتمەندیی دینی ئەو هاوپەیمانانەیە، کە جوولەکەن، یان نەصرانیین، یان مەجووسیین... هتد.

کەواتە: ئەو سەرانەیە، نە سزای کوفریانە، وە نە بەرانبەرو فەرمبووی هاووڵاتیی بوونیانە، وە نە فەرمبووی پارێزرانی خوێنیانە.

بەڵکو من لەو کتێبانەدا کە ئاماژەم پێدان باسم کردوە، کە سەرانە (جزية) بریتیە لە ڕەمزو هێمای ئەوە، کە ئەو هەوارە سیاسییە نامسوڵمانە، لەگەڵ هەوارەی ئیسلامیی‌و دەوڵەتی ئیسلامییدا، لە شەڕدا نیە، واتە: تەنیا ڕەمزو هێمایەکە بۆ پێشاندانی ئاشتیی‌و تەبایی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، هەر

---

١) مجموعة الوثائق للعهد النبّوي والخلافة الراشدة، محمد حميدالله ، ج ١، ص ١٨٨ .

بۆیەش کاتێ کە ئەو نامسوڵمانانە، جا چ لە نێو بازنەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابن، چ لە دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابن، ئامادە بن هاوکاریی دەوڵەتی ئیسلامیی بکەن، بۆ وێنە: هاوکاریی سەربازیی بکەن، یان هاوکارییان بکەن لە ڕووی هەواڵگریی‌و زانیارییەوە، یان لە ڕووی داراییەوە، ئەوە تەماشا دەکەین: کە حوکمڕانانی مسوڵمانان بە درێژایی مێژوو، سەرانەیان لەسەر هەڵگرتوون لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئەوانیش خزمەتێك پێشکەش دەکەن بە مسوڵمانان‌و، هاوکاریی مسوڵمانان دەکەن.

کەواتە: وەك پێشتریش باسم کردوە: وەرگرتنی سەرانە شتێکی حەتمیی نیە، بەڵکو ڕەمزو هێمایەکە، ئنجا ئەگەر ئەو مەبەستە کە: ئەو قەوارەیە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا تەبایەو لەگەڵی لە شەڕدا نیەو دژی نیە، ئەگەر ئەو مەعنایە بە هەر صیغەیەکی دیکە هاتەدی، با سەرانەش نەدەن، بۆ وێنە: هاوکاریی سەربازیی دەکەن، هاوکاریی زانیاریی‌و هەواڵگریی دەکەن، یاخود جاری وایە دەڵێن: شەڕتان ناکەین‌و شەڕمان مەکەن، ئەوە مادام ئەو مەعنایە بە هەر صیغەیەك لە صیغەکان هاتە دی، کە هەردووك لایان لەسەری پێکبێن، مانای وایە ئەو لایەنە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، لە حاڵەتی ئاشتیی‌و تەبایی دایەو پەکیشی لەسەر سەرانە نەکەوتوە.

هەڵوەستەی سێیەم : ئنجا ئایا سەرانە لە کێ وەردەگیرێ؟ هەڵبەتە ئێمە پێشتر باسی ئەو بابەتەمان کرد، بۆیە لێرەدا ناگەڕێمەوە سەری، ئێمە لە دەرسی یەکەمدا لە ژێر ناوونیشانی {کورتە باسێك دەربارەی ئایەتی (٥)ی سوورەتی تەوبە} دا، کە وەك گوتمان: بە ئایەتی شمشێر (آیة السیف) ناسێنراوە، کە واش نیە، لەوێدا بە تەفصیلْ باسمان کرد، کە ئەو ڕایە ڕاستە کە دەڵێ: سەرانە دەگونجێ لە هەموو جۆرەکانی ئەهلی کوفر، لە هەموو جۆرەکانی نا مسوڵمانان وەربگیرێ، هەڵبەتە لەوبارەوە چوار ڕا هەن:

١ - هەندێکیان گوتوویانە: تەنیا لە جوولەکەو نەصرانییەکان وەردەگیرێ.

٢ - هەندێکیان گوتوویانە: لە جوولەکەو لە نەصرانیی‌و مەجووسیی‌و لە صابیئەش وەردەگیرێ.

٣ - هەندێکیان گوتوویانە: لە هەمووان بە هاوبەشدانەرەکانیشەوە وەردەگیرێ. کە هەر کام لە: (ئەوزاعیی و مالیك) ڕایان وایە.

٤ - منیش پێم وایە: ڕای ڕاستو دروست ئەوەیە کە لە هەموو نامسوڵمانان وەردەگیرێ، کە پێشتر لەوبارەوە بەڵگەمان هێنایەوە.

شایانی باسیشە کە من لە هەر کام لە کتێبی: {چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) بە تایبەت لە چاپی شەشەم، بە تەفصیلێ باسی ئەوەم کردوە، وە لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) لە بەرگی هەشتەمدا[1] باسم کردوە، وە لە کتێبی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی دا) دیسان لە بەرگی چوارەمو کۆتایی دا بە تەفصیلێ باسی ئەو بابەتەم کردووە، بەڵگەکانیشم بۆ هێناونەوە. بۆیە لێرەدا بەو ئاماژانە ئیکتیفا دەکەین، وە وەك گوتم: لەو کورتە باسەش دا کە لە دەرسی یەکەمدا هاتوە باسی ئەو بەڵگانەم کردوە کە پشتیان پێ دەبەسترێ، بۆ سەلماندنی ئەوە کە دەگونجێ، سەرانە لە هەموو جۆرەکانی نا مسوڵمانان وەربگیرێ، مادام ئەوان ڕازی بن لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا لە حاڵەتی ئاشتییو تەبایی دا بن، چ لە نێو سنووری دەوڵەتی ئیسلامیی دابن، چ لە دەرەوەی سنوورەکەی دابن.

وە گوتیشمان کە سەرانە دانو، سەرانە وەرگرتن، یەکێکە لە هێماو ڕەمزەکانی تەبابوونی ئەو قەوارەیە، یان ئەو کۆمەڵە خەڵکە نامسوڵمانە، لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، نەك تاکە صیغەو تاکە هێما بێ، وە دەگونجێ حاڵەتی دیکە بەخۆوە بگرێ، وەك لە درێژەی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، ئەوە زۆر بە زەقیو بە ڕوونیی دەبینرێ.

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u> : دوو وشە هەن، کە بە داخەوە توێژەرەوانی قورئان، لێرەدا بەبێ ئەوەی کە ئایەتەکەو وشە قورئانییەکە بیگەیەنێ، شتیان زۆر پێ هەڵواسیون:

ا) یەکێکیان: ﴿عَن يَدٍ﴾.

---

١) لە چاپی دووەمی دا دەبێتە (الكتاب الثاني عشر ).

ب) ئەوەی دیکەش ﴿وَهُمْ صَٰغِرُونَ﴾.

سەبارەت بە مانای وشەی (ید)، دەڵێ: (لفلان ید عليّ) فلان کەس دەستێکی لەسەر من هەیە، واتە: چاکەیەکی لەسەرم هەیە، ﴿عَن يَدٍ﴾، یانی (عَن سَعَةٍ وَغِنىً وَقُدْرَةٍ)، ئەو کەسەی کە سەرانەی لێ وەردەگیرێ، هەموو شەرعزانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە سەرانە وەرناگیرێ لە:

١ - پیری کەنەفت.

٢ - نەخۆش.

٣ - کەسێك کە توانای نەبێ.

٤ - ئافرەت.

٥ - منداڵ (نا باڵغ).

٦ - هەر کەسێك لە هاوپەیمانانی نێو دەوڵەتی ئیسلامیی توانای خۆ ژیاندنی نەبێ (لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی واجبە کە بیژیەنێ).

وەك لەو بەسەرهاتەی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ‌و، ئەو پیاوە بەتەمەنە جولەکە، یاخود نەصرانییەدا، دیارە[1]، کە پێی گەیشت‌و بینی سواڵی دەکرد، گوتی: بۆچی سواڵ دەکەی؟ ئەویش گوتی: (الحاجة السن والجزية)، واتە: لەبەر نەداریی‌و تەمەنی زۆر، کە کەوتوومە تەمەنەوەو، هەم دەبێ سەرانەش بدەم، ئنجا عومەر خوا لێی ڕازی بێ، بانگی بەرپرسی دارایی کردو گوتی: ئەمەو هاووێنەکانی، سەرانەیان لەسەر هەڵبگرەو ئەندازەیەك مووچەشیان پێ بدە، کە بێ نیازیان بکات لە سواڵ کردن.

کەواتە:

---

١) کە (أبو یوسف) لە (الخراج)دا هێناویەتی.

١ / ﴿عَن يَدٍ﴾، واتە: (عَنْ قُدْرَةٍ وَسَعَةٍ وَغِنَىً) بە کوردیی دەستڕۆیشتوو و هەبوو، کەسێك نەیبێ، سەرانەی لێ وەرناگیرێ.

٢ / ﴿وَهُمْ صَٰغِرُونَ﴾، واتە: لە حالێکدا کە ملکەچن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، لەگەڵیدا تەبان، چونکە (صغار) بە مانای (خضوع) ملکەچیی دێ.

شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە کتێبی خۆی (الأم)دا، وەك (تفسیر القرآن الحکیم) لێی خواستۆتەوە دەڵێ: (قَالَ الشافِعِيُّ: وَسَمِعْتُ عَدَداً مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: الصَّغَارُ: أَنْ يَجْرِيَ عَلَيْهِم حُكْمُ الإِسْلامِ)[1].

واتە: گوێم لە ژمارەیەك لە زانایان بووە دەیانگوت : وشەی (صَغَار) مەبەست پێی ئەوەیە، کە حوکمی ئیسلامییان بەسەردا جێبەجێ بکرێ.

ئیدی ئەوە کە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: دەبێ کابرا کە سەرانە دێنێ، ملی کەچ بکات، وە دەبێ دەستی لە ژێرەوە بێ، وە ئەوەی کە سەرانەکەی لێ وەردەگرێ، دەستی لەسەرێ بێ!

ئایەتەکە هیچ لەوانە ناگەیەنێ، وە هەمووی زیادەیەو ڕەنگە کاردانەوەی واقیعێکی دیارییکراوی مسوڵمانان بێ، وە لە کاتێکدا بووبێ کە نامسوڵمانان جۆرێك لە حاڵەتی لە خۆبایی بوونو ملهووڕییان پێشان دابێ.

ئنجا هەندێ لە زانایانو شەرعزانان بۆ سەر شکاندنەوەیانو وەك کاردانەوە لە دژی ئەو هەڵوێستانەیان، ئەو شتانەیان گوتبێ، ئەگەرنا ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ:

١ / ﴿عَن يَدٍ﴾ واتە: کاتێك سەرانەیان لێ وەردەگیرێ، کە لە ڕووی دارایی یەوە دەسەڵاتیان هەبێ.

٢ / ﴿وَهُمْ صَٰغِرُونَ﴾، وە لە حاڵێکیشدا کە ملکەچ بن، وە تەبابن لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

---

١) تفسیر القرآن الحکیم، ج ١٠، ص ٢٦٦ .

<u>هەڵوەستەی پێنجەم</u> : دوو وشە هەن، کە بریتین لە: (أَهْلُ الذِّمَّة)و، (أَهْلُ العَهْد).

١ / (أَهْلُ الذِّمَّة) واتە: ئەوانەی کە مافەکانیان لە ئەستۆی ئیسلامو پێغەمبەرەکەی‌و مسوڵمانان دانە، (حقوقهم في ذمة الله ورسوله والمسلمين) خواو پێغەمبەری خوا ئۆباڵیان بۆ کێشاون، کە ئەوانە بە زۆریی وایە، کە لە چوار چێوەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین.

٢ / (أهل العهد)یش بریتین لەو لایەن‌و کەسانەی کە پەیمانێکیان هەیە لەگەڵ مسوڵمانان، واتە: پەیمانێك هەیە لە نێوان هەردووك لاداو، هەر کامێکیشیان سەربەخۆیە لەوەی دیکە، کە ئەو پەیمانە ئەوە دەخوازێ کە هەر کامێك لەو دوو قەوارەیە، سەربەخۆیەو، خاوەنی هەموو شتێکی خۆیەتی.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

واتە: جوولەکەکان گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، وە نەصرانییەکان گوتیان: مەسیح کوڕی خوایە، ئەوەش قسەیەکە کە هەر بە زاریان دەیڵێن، خوا بیانکوژێ بەرەو کوێ لادەدرێن؟

لەبەردەم ئەم ئایەتە بەپێزەدا، پێنج هەڵوەستە دەکەین :

<u>هەڵوەستەی یەکەم</u> : زانایەکی خاوەن کتێبەکان بە ناوی (جۆرج بوست) لە کتێبی (قاموس الكتاب المقدس)دا لە باسی عوزەیردا، کە ئێمە دەڵێین: عوزێر لە قورئاندا بە عوزەیر هاتووە، بەڵام ئەوان بە عەزرا ناوی دێنن، ئەو نووسەرە دەڵێ: {عَـزْرَا (عُـون) كـانَ يَهُـودِيـاً وَكـاتِبـاً شَـهيراً سَكَـنَ بَابِـل مُـدَّةَ مُلْـك (أَرْتَحشَشتـا) الطـويل البَـاعْ، وَفِـي السَّنَّـةِ السـابعة لِمُلْكِـهِ أَباحَ لِعَـزْرَا بـأن

یأخُذ عَدَداً وَافِراً مِنَ الشَّعْبِ إلـى أورْشَلِيم، نحو سنة (٤٥٧)، وَكـانَتْ مُدَّة السَّفَر أَرْبَعَة أَشْهُر﴾[1].

واتـە: عـەزرا عـون جوولـەكەیـەك بووە، هـاوكات نووسـەرێكی نـاودار بـووە، كـە لە ماوەی حوكمڕانیی (ئەرتەحششـتـا) (كە دیـارە یەكێ بـووە لـە حوكمڕانەكـانی دەوڵەتی هەخەمانشیی فارسیی) لە بابـل نیشتـەجێ بـووە، وە لە سـاڵی حەوتەمی حوكمـڕانیی (ئـەرتـەحشـشـتـا)دا، رێگـای داوە بـە عـەزرا كـە ژمارەیـەكی زۆر لـە گەل (واتـە: لـە گـەلی جوولـەكە) لـەگـەڵ خـۆی بەرێتـەوە بۆ ئۆرشـەلیـم، ئـەمەش لـە دەوروبـەری سـاڵی (٤٥٧)، (پـێش ئـەوەی عیسـی لـە دایـك بـێ)، وە مـاوەی چوونیـانو سەفەرو گەیشتنیـان، دەوری چـوار مانگی خایـاندوە.

هـەر سەرچـاوەی پێشـو ئـەمەشـی هێنـاوە: (وفِي تَقْلِيد الـيَهود يَشْغُل عَزْرا مَوْضِـعاً مُهِـمّاً يُقَابِـلُ بمَوْضِـع مَوسـى وَإيليـا، وَيَقُولُـونَ: أَنَّـهُ أَسَّـسَ الـمَجْمَع الكَبيـر، وَأَنَّـهُ جَمَـعَ أَسْفَارَ الكِتَـاب المُقَـدَّس، وَأَدْخَلَ الأَحْـرُف الكِلدَانِيـة عِوض العِبْرَانِيـة القَدِيمَة، وَأَنَّهُ أَلَّفَ أَسْفَارَ: الأَيام وَعَزْرَا وَنَحْمِيا)[2].

واتـە: لـە نێـو جوولـەكـەكـاندا عـەزرا، پێگـەیـەكی گـرنگی هـەیـە، كـە بـەراورد دەكرێ بە پێگەی مووسـاو ئیلیـا، وە دەڵێـن: عـەزرا (الـمجمـع الكبیـر)ی پێكهێـناوە ﴿ ئەنـجوومەنێك بووە، بۆ كۆكردنەوەی كتێبی موقەددەسی خۆیان﴾، وە هـەر ئـەو هەموو سیفرەكانی (كتـاب الـمقدس)ەی كۆكردوونـەوە، ﴿(أسفار) كۆی (سِفْر)ە، (سِفْر)یش لە جێی كتێبی ئێمەیە﴾، وە هەر ئەویش پیتی كلدانیی لە جێگای پیتە عیبـرانییە كۆنەكان داناوە، وە هەر ئـەویش سێ سـیفری نووسیون، كە بـریتین لـە: (الأیـام، عزرا، نحمیا)، (كە دیارە سێ سیفرنو ئێستـا لـە پەیمانی كۆنـدان).

شـایـانی باسـە: جوولـەكـەكـان كـە گـوتوویـانـە: ﴿ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴾، دەگـونجـێ لـەمەدا مەبەسـتیـان ئـەوە بووبـێ كـە كوڕی خـوایـە، وە دەشگونجـێ مەبەسـتیـان ئـەوە بووبـێ كـە خـوای پـەروەردگار وەك كوڕی خـۆی لـە ڕووی ڕێـز لێـنـانەوە،

١) تفسـیر القرآن الحكیم، ج ١٠، ص ٢٩٥.

٢) هـەمان سـەرچاوەو بەرگو لاپـەڕە.

مامەڵەی لەگەڵ کردبێ، بەڵام وا پێدەچێ زیاتر ئەوەی یەکەمیان مەبەست بێ، کە مانایەکی نەگونجاوە، لەگەڵ ڕێزو گەورەیی خواو پێغەمبەراندا، بۆیەش خوای بەرزو مەزن لێی بە عەیبو ڕەخنە گرتوون، وە ئەگەر هەر بۆ ڕێز لێگرتن بووایە، دیارە ئەوە بە جۆرێك لە تەئویل جێی دەبێتەوەو، هی ئەوە نیە بە عەیبو ڕەخنە بگیرێ.

هەڵوەستەی دووەم : کە دەفەرموێ : ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾، وە نەصرانییەکان گوتیان ، مەسیح کوڕی خوایە .

ئایا لە کەیەوە نەصرانییەکان کوڕایەتیی مەسیحیان بۆ خوا بڕیاردا؟

سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: لە دوو کۆبوونەوەی گرنگدا، کە یەکەمیان (مجمع نیقیة) بوو، کە لە ساڵی (٣٢٥)ز کۆبوونەوەیەك کرا، بە ناوی کۆبوونەوەی نیقییە، دووەمیان کۆبوونەوەی (قوسطەنطینییە)، (مجمع قسطنطينية) بوو کە لە ساڵی (٣٨١)ز بەسترا، لەو دوو کۆبوونەوەیەدا بڕیار درا، کە سێ پەرستراو هەن: (الأب، الإبن، الروح القدس) وە بڕیار درا کە (ابن و روح القدس) یەکسانن لەگەڵ (أب)دا، لەوەدا کە بە هەر سێکیان خوا پێکدێنن.

هەڵبەتە ئێمە پێشتر لە تەفسیری ئایەتی (١٨) سوورەتی (المائدة)دا (واتە: لە بەرگی چوارەمی ئەم تەفسیرەدا)، ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾، وە هەروەها لە ئایەتەکانی پێشتر: ﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ... ﴿٧٢﴾﴾، بە درێژیی باسی ئەو بیرۆکە ئەفسانەییانەمان کردووەو هەڵیشمان وەشاندوونەوە.

هەڵوەستەی سێیەم : ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾، وە ئەوە قسەی زاریانە، یانی : جوولەکە کە دەڵێن: عوزەیر کوڕی خوایەو،

نەصرانیی کە دەڵێن: مەسیح کوڕی خوایە، ئەوە هەر قسەی دەمی خۆیانە، واتە: قسەیەکە هەر بە زار دەیڵێن‌و، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

(یُضاهُونَ)و ﴿ یُضَٰهِـُٔونَ ﴾، هەر دوو قیرائەتەکەی هاتوون، ﴿ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾، واتە: (یُشابِهُونَ وَیُشاكِلُونَ) واتە: لاسایی قسەی کافرەکانی پێش خۆیان دەکەنەوە، یاخود قسەی وەك ئەوان دووبارە دەکەنەوە. وەك چۆن دەگوترێ: وەك تووتی قسەی ئەوان دووبارە دەکەنەوە.

ئەوان چییان گوتوە؟

لە سوورەتی (الأنعام)دا خوای بێهاوەڵ دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾، باسی هاوبەش بۆ خوا دانەران دەکات، دەفەرموێ: وە کوڕان‌و کچانیان بۆ هەڵبەستن بەبێ زانیاریی، پاکیی‌و بەرزیی بۆ وی، لەوەی کە خوای پێ وەسف دەکەن، پەیداکەرو بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، چۆن دەگونجێ رۆڵەی هەبێ کە هاوسەری نەبووە؟ وە هەموو شتێکی وەدیهێناوەو. بە هەموو شتێکیش زانایە.

واتە: خوا کە هاوسەری نەبێ، چۆن دەگونجێ رۆڵەی هەبن؟! چونکە هاوبەشدانەرەکان دەیانگوت: (الشیاطین أبناء الله والملائكة بنات الله) شەیتانەکان کوڕانی خوان، وە فریشتەکان کچانی خوان.

ئنجا خوا دەفەرموێ: جوولەکەو نەصرانییەکانیش لاسایی قسەی کافرانی پێش خۆیان دەکەنەوە، هەڵبەتە رەچەڵەك خستنەوەی هەندێ لە بەشەر، بۆ سەر خوای تاك‌و پاك، وەك ئەوەی کە کوڕی بێ، یان کچی بێ، یاخود هاوتای بێ. لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، کۆنە، لە نێو هیندۆسییەکان دا هەیە، وە لە نێو

مەجووسییەکانیشدا بڕوایان بە دوو پەروەردگاران هەیە، (ئەهریمەنو یەزدان)، وە یەزیدییەکان (ملک طاوس) بە نیمچە خوایەك دادەنێن، کە ئەوە هەمووی لادان بووە لە ڕێبازی پێغەمبەران، کە فەرموویانە: تەنها یەك پەروەردگار هەیە، ئەویش خوایە، بەڵام شەیتان هەیە، ئنجا ئەگەر زیاتر لە قەبارەی خۆی گەورەتر بکرێ، وەك مەجووسییەکان کردوویانە بە (ئەهریمەن)، لە بەرانبەر یەزداندا، وە یەزیدییەکان کردوویانە بە (ملک طاوس) لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا، وە هیندۆسییەکان بە جۆرێکی دیکە، هاوتایان بۆ خوا داناوە، وە جوولەکەکان کە عوزەیر، یان عەزرایان بردۆتە ئاستی خواو، کردوویانە بە کوڕی خوا، وە نەصرانییەکان کە مەسیحیان کردوە بە کوڕی خوا، هەموو ئەوانە لادان بوون لە بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەران، وە بریتی بووە لە ڕۆچوونو زێدەڕۆیی کردن، لە ڕێز لێگرتنی هەندێ لە دروستکراوانی خوادا.

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u> : خوا کە دەفەرموێ : ﴿قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ﴾ یانی: خوا لە دژیان بجەنگێ.

زەمەخشەریی دەڵێ: ئەو تەعبیرە بۆ سەرسوڕمانە، واتە: بێ قەزا بن، شتێکی گەورەتان کرد! وەك گوتوویانە: (قاتله الله ما أفصحه) چەند ڕەوانبێژە! وە دەشگونجێ ﴿قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ﴾، مانای: نەفرینی خوایان لێ بێ، یاخود: خوا بیانکوژێ، یان: خوا لە بەینیان بەرێ، بگەیەنێ.

<u>هەڵوەستەی پێنجەم</u> : کە دەفەرموێ: ﴿أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾، یانی: بەرەو کوێ لادەدرێن؟!

﴿أَنَّىٰ﴾، هەم بە مانای: چۆن (كَيْفَ) دێ، هەم بە مانای: بۆ کوێ ، لە کوێ (أَيْنَ) دێ، واتە: بەرەو کوێ لادەدرێن؟! یان چۆن لادەدرێن؟!

واتە: چۆن لادەدرێن لەو ڕاستە شەقامی تەوحیدو خوا بەیەکگرتنە، بەرەو ئەو کوێرە ڕێی شیرکو هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنە؟

مەسەلەی چوارەم: كە دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾.

خوای پەروەردگار هەر بەردەوام دەبێ لەسەر خستنە ڕووی بنەما فیكرییە پووچەكانی خاوەن كتێبەكان، بەتایبەت جوولەكەو نەصرانییەكانو ئەوانی دیكەی وەك ئەوانیش، ئەمەش هەمووی زەمینەسازییە، بۆ ئەوەی مسوڵمانان هاندەرو پاڵنەریان هەبێ بۆ جەنگ كردن لە دژی ڕۆمەكان، وە لە دژی جوولەكەكانو، لە دژی هەموو ئەوانەی كە دژایەتیی دەوڵەتی ئیسلامیی دەكەن، پێشێ خوای كارزان هاتوە بنەما فیكرییو دینییەكانی هەڵوەشاندوونەوە، ئەو شتە ئەفسانەییانەی كە خستوویاننە نێو دینە ئەسڵییەكەی خۆیانەوە، یانی: سەرەتا جەنگێكی دەروونییو فیكرییان لەگەڵدا دەكات، وەك زەمینە خۆش كردن، بۆ بە هێزو چەك ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیاندا لەسەر ئەرزی واقیع، بۆیە دەفەرموێ:

ئەوانە زانایەكانو ڕاهیبەكانی خۆیانیان ﷻ جیاتی خوا كردن بە پەروەردگارو مشوورخۆرو گەورەی خۆیان، هەروەها مەسیحی كوڕی مەریەمیشیان كرد بە پەروەردگاری خۆیان، لە حاڵێكدا كە فەرمانیان پێ نەكرابوو، تەنیا بەوە نەبێ، كە خوا بپەرستن، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، پاكیی بۆ وی، لەوەی كە دەیكەن بە هاوبەشی خوا.

وشەی (أحبار) كۆی (حَبْر)ە، هەندێكیش گوتوویانە: كۆی (حِبْر)ە، كە مەبەست پێی: زانای خاوەن كتێبە پێشووەكانە، هی جوولەكەو نەصرانییو مەجووسییو ئەوانی دیكەش، ئەوان بە زانایانی خۆیانیان گوتوە: (حَبْر) یاخود (حِبْر) هەندێكیش گوتوویانە: (حِبْر) ئەو مەرەكەبەیە كە پێی دەنووسرێ. بەڵام (حَبْر) واتە: زانا، (رهبان)یش كۆی (راهِبْ)ە، كە (راهِبْ) لە: (رهب یرهب) هاتوە، واتە: (خاف یخاف)، (راهب) واتە: (خائف) كە مەبەست پێی كەسێكە كە دادەبڕێ بۆ خواپەرستییو گۆشەگیر دەبێو، خۆی یەكلا دەكاتەوە بۆ بەندایەتیی

بۆ خوا، وەك خوا لە سوورەتی (الحدید)دا دەفەرموێ: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ...﴿٢٧﴾﴾.

واتە: وە (نەصرانییەکان) ڕەهبانییەتێکیان داهێنا، کە ئێمە لەسەرمان پێویست نەکردبوون، بەڵام ئەوان دایانهێنا، بە مەبەستی ئەوە کە ڕەزامەندیی خوای پێ وەدەست بێنن، بەڵام زۆربەیان ڕەچاویان نەکردو ئاگایان لێی نەبوو.

کەواتە: لە ڕاستییدا ڕەهبانییەت لە هیچ بەرنامەیەکی خوای پەروەردگاردا بوونی نیە، وە لە نەصرانییەتیشدا پەیدا کراوەو، خوا نەیفەرمووە، بەڵکو وەك دەفەرموێ: ﴿ٱبْتَدَعُوهَا﴾ خۆیان دایانهێناو پەیدایان کردوە، هەرچەندە ڕەنگە نیەتیشیان باش بووبێ، بەڵام نیەتی باش، شەفاعەت ناکات بۆ ڕێگای ڕاست نەگرتن، واتە: هەرچەندە ئینسان نیەتی باش بێ، بەڵام کە ڕێگای ڕاستی نەگرت، کارەکەی هەر بە کەڵك نایەت.

ئنجا لەوبارەوە کە ئایا چۆن ئەوان زاناو ڕاهیبەکانی خۆیان لە جیاتی خوا پەرستوەو کردوویانن بە پەروەردگاری خۆیان؟ با ئەم دوو دەقە بێنینەوە.

<u>فەرموودەی یەکەم</u>: ﴿عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وهو يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةَ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ ﴾، فقَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئاً اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئاً حَرَّمُوهُ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٠٩٥)، قال الشيخ الألباني: حسن}.

واتە: عەدیی کوڕی حاتیم دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، لە حاڵێك دا کە لە سوورەتی (براءة) ئەو ڕستەیەی دەخوێند: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ ﴾، دوایی پێغەمبەر ﷺ هەر بۆخۆی فەرمووی: ئاگادار بن! ئەوانە بەندایەتییان

بۆ نەدەکردن، {بەو واتایە کە ڕکووعو سەجدەیان بۆ بەرن، نوێژو ڕۆژوویان بۆ بکەن}، بەڵام زاناکانیانو ڕاهیبەکانیان، ئەگەر شتێکیان بۆ حەڵاڵ کردبان، شوێنکەوتووەکانیشیان بە حەڵاڵیان دەزانی، وە ئەگەر شتێکیان لێ قەدەغە کردبان، ئەوانیش بە قەدەغەیان دەزانی، {ئەوەش بە بەندایەتییو پەرستن لە قەڵەم دەدرێ}.

بەندایەتییو پەرستن بۆ خوا، تەنیا ڕکووعو سەجدە بردنو نوێژو ڕۆژوو نیە.

فەرموودەی دووەم: ﴿عَنْ عَدِيِّ بْنِ حاتِمٍ أَنَّهُ لما بلغته دَعْوَةَ رَسول الله ﷺ فرَّ إلى الشام، وكانَ قَدْ تَنَصَّرَ في الجاهلية، فأُسِرَتْ أُخْتُهُ وجماعةٌ مِنْ قَوْمِه. ثُمَّ مَنَّ رسولُ الله ﷺ عَلى أُخته وأَعْطاها، فَرَجَعَتْ إلى أَخيها، ورَغَّبَتْهُ في الإِسْلامِ وَفي القُدُومِ عَلى رسول الله ﷺ، فقَدم عَدِيّ المَدينة، وَكانَ رَئيساً في قَوْمِهِ طيئ، وَأَبُوهُ حاتَم الطَّائِي المَشْهُور بالكرم، فتَحدَّث الناس بقدومه. فدَخَلَ عَلى رسول الله ﷺ وَفي عُنُقِ عَدِيّ صَليبٌ مِنْ فِضَّةٍ، فقَرَأَ رَسول الله ﷺ هَذِهِ الآيةَ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّهُمْ لَمْ يَعْبُدُوهُمْ، فَقَالَ: (بَلى إِنَّهُمْ حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ الحَلالَ، وَأَحَلّوا لَهُم الحَرَام، فاتبعوهم، فَذَلِكَ عِبادَتُهُم إياهُمْ، وَقَالَ رَسول الله ﷺ: يا عَدِيّ، مَا تَقُولُ؟ أَيُفِرُّك أَنْ يقال: أَللهُ أَكْبَر؟ فَهَلَ تَعْلَمُ شَيْئاً أَكْبَرَ مِنَ الله؟ مَا يُفِرُّكَ؟ أَيُفِرُّك أَنْ يُقَالَ: لا إله إلا الله؟ فَهَلْ تَعْلَم مِنْ إِلهٍ، إلا الله؟)، ثُمَّ دَعَاهُ إِلى الإِسْلامِ، فَأَسْلَمَ، وَشَهِدَ شَهادَةَ الحَقِّ، قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ وَجْهَهُ اسْتَبْشَر، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ اليَهُودَ مَغْضوبٌ عَلَيْهِم، وَالنَّصَارَى ضالُّون)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٣٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٩٥٣)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٧٣٦)، وَانْظُر: (صَحيح الجامع الصغير)، برقم: (٨٢٠)}.

واتە: عەدیی کوڕی حاتیمی طائیی لێی گێڕراوەتەوە، کە دوای ئەوەی بانگەوازی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدەگات (واتە: بانگەوازی ئیسلام)، ڕادەکات بۆ شام، وە پێشتریش لە سەردەمی نەفامیی دا لە شیرکەوە، بوو بوو بە نەصرانیی.

ئنجا لە جەنگێکدا، یان لە چالاکییەکی سەربازییدا، خوشکەکەیو کۆمەڵێك لە هۆزەکەی بە دیل دەگیرێن، پێغەمبەری خواش ﷺ خوشکەکەی بەردەداو دیارییشی پێدەدا، وەك ڕێزلێنانی بابی، (کە بابی حاتیمی طائیی بووە، کە مەشهوور بووە بە سەخاوەتو کەرەم)، خوشکەکەی دەچێتەوە بۆ لای برایەکەیو هانی دەدا کە مسوڵمان بێو، بچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، {پێی دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزت لێ دەگرێ، ئەگەر بچی}، عەدیی دێ بۆ مەدینە، کە لەو کاتەشدا سەرۆکی هۆزەکەی خۆی هۆزی (طيء) بووە، بابیشی ناودار بووە بە بەخشندەییو، خەڵك باسی دەکەنو، دەزانن کە عەدیی کوڕی حاتمی طائیی هاتووە، پاش ئەوە دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وە خاچێکی زیوییشی لە مل دا دەبێ، وەك نیشانەی نەصرانییەت، لەو کاتەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ﴾، عەدیی دەڵێ: پێم گوت: ئەوان {واتە: خەڵکی نەصرانیی} زانایانو گۆشەگیرەکانی خۆیانیان نەدەپەرستن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با، (واتە: با دەیانپەرستن) چونکە زاناو ڕاهیبو ڕەبەنەکانیان حەڵاڵیان لێ قەدەغە دەکردن، وە قەدەغەشیان بۆ حەڵاڵ دەکردن، ئەوانیش شوێنیان دەکەوتن، ئەوەش پەرستنی ئەوان بوو، (واتە: بەندایەتیی خەڵکەکە بوو بۆ ئەو زاناو ڕاهیبانەیان)، ئنجا پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ئەی عەدیی چی دەڵێی؟ ئایا ئەوە وات لێ دەکات ڕابکەی، کە بگوترێ: خوا گەورەترە! ئایا هیچ شتێکت پێ شك دێ، لە خوا گەورەتر بێ؟ چ شتێك وا لە تۆ دەکات ڕابکەی (لە ئیمانو ئیسلام)؟ ئایا ئەوە وات لێ دەکات کە بگوترێ: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك بوونی نیە، ئایا هیچ پەرستراوت جگە لە خوا، پێ شك دێ؟

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام، (دیارە بۆی ڕوون کردۆتەوە) ئەویش مسوڵمان بوو شایەتمانی بە هەقی هێنا، عەدیی دەڵێ: ڕووی پێغەمبەری خوام بینی گەشایەوە، {پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە پیاوێکی ڕاستو ڕێك بووە، کە هەر شتێك لە دڵیدا بووبێ، ئەگەر خۆشیی بووبێ، یان ناخۆشیی،

لەسەر دەمو چاوی موبارەکیشی دەرکەوتوە، نەك وەك هەندێ خەڵکی ئەهلی نیفاقو دەغەڵ، کە بتوانێ ئەوەی لە دڵیدایە بیشارێتەوە، ئنجا چ خۆشیی بێ، یان ناخۆشیی بێ، لەبەرئەوەی کە ڕواڵەتو دەروونی، دڵو ڕووی یەك بوون} ـ دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان جوولەکەکان غەزەب لێگیراوانن، لێ تووڕە بووانن، وە نەصرانییەکانیش سەرگەردانانن.

لێرەدا تەنیا هەڵوێستەیەك لە بەرانبەر ئەو قسەیەدا دەکەین، کە ڕاوی دەیگێڕێتەوە، ئنجا چ عەدیی بۆخۆی بێ، یان هەر کەسێکی دیکە بێ، لە عەدیی بیستبێ، زۆر بە کورتیی ئەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن وتووێژو دیالۆگی کردوە، لەگەڵ عەدیی دا، تاکو مسوڵمان بووە، یانی: وە نەبێ تەنیا ئەو سێ چوار وشەیەی فەرموو بن، چونکە کە دەڵێ: (ثُمَّ دَعَاهُ إِلى الإِسْلاَم) ئەوە دەریدەخات موناقەشەی لەگەڵدا کردوەو، ئیسلامی بۆ ڕوون کردۆتەوەو، باسی ئیمانی بۆ کردوە ـ باسی حەڵاڵو حەرامی بۆ کردوە، بەڵام دیارە گێڕەرەوەکان (رواة) هەمیشە کە شتەکان دەگێڕنەوە، شوێنی مەبەست دەگێڕنەوە، واتە: نابێ هیچ کەس وا تێبگات کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کە لێی دەگێڕنەوە، هەر ئەوەندەی فەرموو لەو سیاقەدا، بۆیە جاری وایە لە ڕیوایەتێکدا فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ درێژتر هاتوە، جاری وایە کورتتر هاتوە، کە بە شێوەیەکی کورت دێ، دیارە ڕاوی شوێنی مەبەست دەگێڕێتەوە، یاخود هەر ئەوەندەی لەبیرە لەو کاتەدا.

کە دەفەرموێ: ﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ﴾، (أرباب) کۆی (رَبّ)ە، (رَب) بە مانای: پەرستراوو، سەرپەرشتیارو دانەری حەڵاڵو حەرامو، سەرۆكو ، پەروەردگار، دێ.

(إله)یش کۆیەکەی (آلهة)یە، (إله) واتە: پەرستراو (معبود)، جێی سەرنج ئەوەیە کە پێشێ خوا دەفەرموێ: ﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ﴾، زانایەکانو ڕەبەنو ڕاهیبەکانی خۆیانیان، لە جیاتی خوا، کردنە (أرباب)، واتە: سەرپەرشتیار مشورخۆر، دوایی دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا﴾، فەرمانیشیان پێ نەکرابوو، کە جگە لە یەك پەرستراو، کەسی دیکە بپەرستن، ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾، پاکیی بۆ خواو دووریی بۆ خوا، لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ، وە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەریشەوە کە عەدیی وایزانیوە پەرستن تەنیا ئەوەیە، کە دەبێ سەجدەیان بۆ بەرن، ڕکووعیان بۆ بەرن، ڕۆژوویان بۆ بگرن، نوێژیان بۆ بکەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕوون کردۆتەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە حەڵاڵیان لێ حەرام کردوون، وە حەرامیان بۆ حەڵاڵ کردوون، ئەوانیش شوێنیان کەوتوون، بۆیە ئەوەی بە پەرستن و بەندایەتیی بۆ کردن، داناوە!

ئنجا ئایەتەکەش هەر ئەوە دەگەیەنێ: کە پێشێ باسی (رب) دەکات، کە بە مانای بەرنامە دانەرو، مشوورخۆرو سەرپەرشتییکارو دیارییکەری حەڕامو حەڵاڵ، دێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا﴾، کەواتە: هەر کەسێك کەسێکی دیکە بکاتە سەرپەرشتیارو بەرنامەدانەرو دیارییکەری حەڕامو حەڵاڵ، مانای وایە کردوویەتی بە پەرستراوی خۆی، ئنجا لەمەوەش دەردەکەوێ کە هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەروەردگاریێتیی و سەرپەرشتیکاریی دا، دەکاتە هاوبەش بۆ خوا دانانیشی لە پەرستراوێتیی دا، چونکە یەکێك لە مانایەکانی پەروەردگار، بریتیە لە پەرستراوێتیی، کە دەبێ تەنیا خوای پەروەردگار بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٣٢﴾.

دەیانەوێ کە ڕووناکیی خوا، بە زاریان بکوژێننەوە، وە خواش ڕازی نابێ هەتاکو ڕووناکییەکەی تەواو نەکات، هەرچەندە بێبڕوایەکان پێ قەڵس و لالووت بن و، پێیان ناخۆش بێ.

جێی سەرنجە! ئەم ڕستە قورئانییە کە دیارە مەبەست پێی کتێب پێدراوەکان و، خاوەن کتێبەکانە، کە دەیانەوێ بە زاریان ڕووناکیی خوا بکوژێننەوە، کە بە تەئکید مەبەست لە ڕووناکیی خوا، قورئانە، ئیسلامە، پەیامی پێغەمبەرە، وە مەبەستیش لە زاری ئەوان، ئەو قسەو پڕوپاگەندانەیە کە دەیکەن، وە ئەو دژایەتییەیە کە ئەوان دەیکەن، ئەو شتانەن کە لە دژی ئیسلام بڵاویان دەکەنەوە، یانی: لێرەدا خوا هەوڵی ئەوان بۆ خەفەکردن، یان کوژاندنەوەی چرای ئیسلام، وە دژایەتییکردنی ئیسلام، وەك هەوڵی کەسێك وێنا دەکات، کە فوو لە خۆر دەکات، کەسێك فوو لە خۆر بکات، بە تەئکید خۆر هیچ زیانێکی پێ ناگات، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، بەڵام لە سوورەتی (الصف)دا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ ...﴿٨﴾﴾، ئنجا ئایا جیاوازیی ئەو دوو بێژەیە چییە لێرەدا؟

دەڵێین :

١/ ﴿أَن يُطْفِـُٔواْ﴾ واتە: لە داهاتوودا دەیانەوێ کە بیکوژێننەوە، بۆیەش خوا لە بەرانبەر ئەوەدا، دەفەرموێ: ﴿وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ﴾، خواش ڕازی نابێ و، بە هیچ جۆرێ خوا ڕێگا نادات، تاکو ڕووناکییەکەی خۆی تەواو نەکات لە داهاتوودا.

٢/ بەڵام لە سوورەتی (الصف)دا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾. یانی: ئێستا دەیانەوێ ڕووناکیی خوا بەزاریان بکوژێننەوە، بۆیە لەوێدا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾، یانی: لە حاڵی حازردا خواش تەواوکەری ڕووناکییەکەی خۆیەتی، کەواتە: بەم دوو تەعبیرە دەردەکەوێ، کە چ ئەوانەی ئێستا دەیانەوێ ڕووناکیی خوا بکوژێننەوە، چ ئەوانەی دەیانەوێ لە داهاتوودا بیکوژێننەوە، ئەوە هەر یەك سەرەنجامی هەیە، ئەگەر ئێستا بیانەوێ بیکوژێننەوە، خوا تەواوکەری

ڕووناکیی خۆیەتی، وە ئەگەر لە داهاتوودا بیانەوێ، خوا ڕازی نابێ، بە هەر جۆرێ بێ، هەر دەبێ ڕووناکییەکەی تەواو بێ، ئایینو پەیامەکەی بگات.

پاشان کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، هەرچەندە بێبڕوایان پێیان ناخۆش بێ، ئەمە یانی: خاوەن کتێبەکان بە کافرو بە بێ بڕوا لە قەڵەم دەدرێن، چونکە بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم نیەو، بڕوایان بە دوا کتێبی خوا نیە، بەڵکو بڕوای ڕاستیان نیە، نە بە خوا، نە بە ڕۆژی دوایی، وە نە پابەندن بە حەڵاڵو حەرامی، تەنانەت شەریعەتی خۆشیان، چ جای ئەوەی لە شەریعەتی ئیسلامییدا هاتوە! وە ملکەچیش نین بۆ بەرنامەی هەقی خوا، کە لە ئیسلامدا بەرجەستەیە، کەواتە: کە دەگوترێ: (کافرون) خاوەن کتێبەکانو غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾﴾.

کە هەمان ئەم تەعبیرە لە سوورەتی (الصف)یشدا هاتوە، وەك خۆی، وە لە سوورەتی (الفتح)یشدا هاتوە بە تۆزێك جیاوازییەوە، لەوێدا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾﴾.

بەڵام لێرەداو لە سوورەتی (الصف)دا بە یەك تەعبیر هاتوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾﴾.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنماییو، بە بەرنامەی هەقەوە ناردوە، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵی بکات، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەران پێیان ناخۆش بێ، وە پێی قەڵس بن.

لێرە خوا دوو وشەی هێناون، کە کەمتر بینیومە لە تەفسیرەکاندا ئاماژە بەوە بکرێ، خوا دوو وشەی باس کردوون:

١/ ﴿ٱلْهُدَىٰ﴾.

٢/ ﴿وَدِينِ ٱلْحَقِّ﴾.

﴿ٱلْهُدَىٰ﴾، واتە: ڕێنمایی بەرچاوڕوونیی، کە هەم بوونناسیی ـ معرفة الوجود ـ (Ontulogy) دەگرێتەوە، هەم ئیمانو عەقیدە، هەم دینداریی تاکیی‌و تایبەتیی دەگرێتەوە، وەك عیبادەتی شەخصییو، ئاکارو خووڕەوشتو تەزکیەی نەفسو تەقوا، وەك لە بەرگی شەشەمی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا بەتەفصیل باسم کردوە[1].

کەواتە: ﴿ٱلْهُدَىٰ﴾، بۆ تاکە، خوا پێغەمبەری خۆی بە دوو شتەوە ناردوە. یاخود بە ئیسلامێکەوە ناردوویەتی، کە دوو ڕووی هەن، ڕوویەکیان هیدایەتە بۆ تاكو، ڕوویەکیشیان بەرنامەی هەقە بۆ کۆمەڵگا، چونکە ئیسلام دەبێ:

یەکەم: هەم وەك هیدایەت، تاك تاکی خەڵك وەریبگرن، ئینسان لە خودی خۆیدا. وەك هیدایەت وەریبگرێ، کە ئەمەش بابەتەکانی:

١/ بوونناسییو جیهانبینیی کە من وشەی (بوونناسیی) بە ڕاستتر دەزانم لە دنیابینییو جیهانبینیی، چونکە وشەی (بوون) چەمکەکەی لە جیهانو دنیا فراوانترە، ئنجا ئیسلام بوونمان پێ دەناسێنێ، کە پێش بوون (وجود) پەیداکەری بوون بەدیهێنەری بوون هەیە، کە خوایە، ئنجا بوون بە دنیاو دوارۆژەوە، بە سەرووو خوارووییەوەوە، بە مرۆڤ و غەیری مرۆڤەوە.

٢/ پاشان ئیمانو عەقیدە، بە هەر شەش پایەکەیەوە.

٣/ ئنجا عیبادەتو پەرستشە کەسییە تایبەتییەکان.

٤/ دوایی ئاکارو ڕەوشت.

---

١) لە چاپی دووەمی دا (الكتاب التاسع)ە.

٥/ تەقواو تەزکیە دەگرێتەوەو، ئەوە هەمووی دەچێتە چوارچێوەی هیدایەتەوە بۆ تاك.

بەڵام بە دڵنیاییی ئیسلام تەنیا هەر لەوەدا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکو:

دووەم: ﴿ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ﴾، بەرنامەیەکی هەقیشە کە هەموو ژیانی کۆمەڵگا ڕێکدەخات، بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، لە ڕووی سیاسییو، ئابوورییو، کۆمەڵایەتییو، لە ڕووی پەیوەندییەکان، لە ڕووی جەنگو ئاشتیی یەوە، ئنجا ئەگەر تەماشای قورئانیش بکەین، دەبینین هەم هیدایەتی تێدا دەبینین بۆ تاك، وە هەم بەرنامەو سیستەمی تێدا دەبینین، بۆ کۆمەڵگا.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾، واتە: تاکو سەری بخات، (ظهر عليه) یاخود (غلبه) واتە: بەسەریدا زاڵ بوو، ﴿ لِيُظْهِرَهُۥ ﴾، واتە: سەری بخاتو ئاشکرای بکات بەسەر هەموو بەرنامەکاندا.

هەڵبەتە مەبەست ئەوە نیە کە ئەو بەرنامانەی دیکە لەبەین بەرێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەو بەرنامانەی دیکە بخاتە ژێر ڕێکفی خۆیەوە، بەو واتایە کە ئیسلام ئاڵاکەی بەرزتربێ، ئنجا کە ئیسلام وابوو ئەو کاتە ئیسلام ڕێگا بە بوونی بەرنامەکانی دیکە دەدا، بەڵام بە زۆریی وابووەکە بەرنامەکانی دیکە دەسەڵاتیان هەبوو، ڕێگا بە بوونی ئیسلامو بە ئەهلی ئیسلام نادەن، ئەگەرنا ئیسلام ڕێ بە بوونی غەیری خۆی دەدات، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾.

بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

{بلێ ئەی ئەوانەی بێبڕوان (١) ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، نایپەرستم (٢). ئێوەش پەرستەری ئەوە نین کە دەیپەرستم (٣) وە من ـ لە داهاتووش دا ـ پەرستەری ئەوە نابم کە دەیپەرستن (٤) وە ئێوەش پەرستەری ئەوە نابن کە دەیپەرستم (٥) ئایینی خۆتان بۆخۆتان ـ پیادەی بکەن ـ منیش ئایینی خۆم بۆخۆم ـ پیادەی دەکەم ـ (٦)}.

ئیسلام ڕێگا بە بەرنامەکانی دیکە، دەدات کە هەبن، چونکە لە خۆی دڵنیایەو پشت ئەستوورە، بەڵام بەرنامەکانی دی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەست بە بێهێزیی دەکەن لە بەرانبەر ئیسلامدا، ئەگەر دەسەڵاتیان هەبێ، بە زۆریی وابووە، ناهێڵن ئەهلی ئیسلام هەناسە بدات، یاخود زۆر بەربەستی لەبەردەم دا دادەنێن، لە حاڵێکدا کە ئیسلام دەفەرموێ:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: تۆبزیی کردن لە ئایین دا نیە.

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف.
واتە: وە بلێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا کێ دەیەوێ با بڕوا بێنێ، کێش حەز دەکات با بێبڕوا بێ.

شایانی باسە هەندێ لە تەفسیرەکانیش بە هەڵە ئەم ئایەتەیان مانا کردوە. کە خوا دەفەرموێ: ﴿لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، گوتوویانە: بۆ ئەوەی کە ئایینەکانی دیکە نەهێڵێ!

بەڵام لە ڕاستییدا وا نیە، بەڵکو واتە: تاکو ئیسلام ئاشکرا بێو ڕوون بێ، وە هیچ کەس ئیسلام نەخاتە ژێر ڕکێفو دەسەڵاتی خۆیەوە، ئنجا ئەو کاتە یان مۆڵەتی دەدا، یان نایدات!

نا، ئیسلام دەبێ دەسەڵاتی هەبێ، ئنجا ئەو ئیسلامە بەو دەسەڵاتو هەیمەنەیەوە. دەبێ ڕێگا بدات بە هەموو بەرنامەکانی دیکە، ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي

ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقـرة، وە دەفـەرموێ: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكـافرون، وە دەفـەرموێ: ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف.

پێغـەمبـەریش ﷺ کـاتی خـوای لـەوبارەوە مـوژدەی داوە، کـە ئیسـلام دەسـەڵات ڕادەنـێ بەسـەر زۆربەی دنیـادا، بۆیـە لـە فـەرموودەیـەکیـدا دەفـەرموێ: ﴿فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُتِمَّنَّ اللهُ هَذَا الأَمْرَ، حَتَّى تَخْرُجَ الظَّعِينَةُ مِنْ الحِيرَةِ، حَتَّى تَطُوفَ بِالْبَيْتِ فِي غَيْرِ جِوَارِ أَحَدٍ، وَلَيُفْتَحُنَّ كُنُوزُ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٩٣٩٧)، وَالحاكِمُ، برقم: (٨٥٨٢) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْن}.

واتـە: سوێـند بـەو کەسـەی گیـانمی بەدەستـە، خـوا ئـەم کارە تەواو دەکات، (ئـەم ئـایینە، ئەم پەیامەی خۆی تەواو دەکات)، تـاکو ئـافرەتێك بە کـەژاوەوە لـە حیـرەوە (کە شـارێك بووە لـە عـێراق) دەردەچـێ، تـاکـو تـەواف بـە دەوری کـەعبـەدا دەکـات، بێئـەوەی کە لـەژێر پـەنـای کـەسـدا بـێ، وە خـەزنەکـانی کیسـرای کوڕی هورمـوز دەگیـرێـن{و دابـەش دەکرێـن، بەسـەر خـەڵکی هـەژارو نـەداردا}.

ئـەوەش کـە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فـەرموویەتـی: بـە کـردەوە هـاتۆتـە دی، وەك خۆی‌و، وەك مانگی چواردە درەوشـاوەتـەوە بە ئـاسـمانی واقیـعـەوە.

ئنجـا لێـرەدا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾، هـەرچـەندە ئـەوانەی هـاوبەش بـۆ خـوا دانـەرن، پێشیـان نـاخـۆش بـێ، خـوای زاڵ‌و مـەزن پێغـەمبـەری خۆی ﷺ بە ڕێـنمـایی‌و، بە بەرنـامەی هەقـەوە، ناردوە، تـاکو بەسـەر هـەموو بەرنـامەکـاندا زاڵی بکات، هـەرچـەندە موشـریکەکـان پێشیـان نـاخـۆش بـێ، واتـە: پێیـان خـۆش بێ‌و پێیـان نـاخـۆش بـێ، ئـەوەی کـە خـوا پێغـەمبـەری خـۆی بـۆ نـاردوە، ئـەو ئـامانجە هـەر دێتـە دی، کە بە کردەوەش هـاتۆتـە دی.

هـەڵبەتـە ئێستـاش لـە ڕۆژگاری ئێمـەدا، لـەسـەرمان پێویستـە کـە هـەموو وزەو توانایەکمان بخەینە کار، کە پەیامی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، وە ئـەو دینە هـەقەی کـە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەمدا ناردوویەتی، بیگەیەنین بە هەموو بەشەر، چ وەك هیدایـەتـەکەی بۆ تـاکەکان، چ وەك بەرنـامەی هـەق بۆ کۆمەڵگایەکان.

دەشگونجێ کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، بڵێین: مەبەست ئەوەیە لە ڕووی بەڵگەو دەلیلەوە، بەسەر هەموو بەرنامەکاندا سەری بخات.

واتە: مسوڵمانان مولزەمن بەوەی کە لە ئاستی بەرزی ئیسلامدا، ئیسلام پێشانی خەڵکی بدەنو ڕایبنوێنن، تاکو دەربکەوێ بۆ هەموو کەس، کە ئیسلام حەقێکە، هەرچی لەگەڵی تێکبگیرێ ناهەقەو پووچە.

دیارە ئەمەش تێکناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا، کە دەبێ مسوڵمانان هەوڵبدەن لەسەر زەمینیش خاوەنی هێزو پێزو توانا بن، بە شێوەیەك کە بتوانن پەیامی خوا بگەیەنن، وە هیچ کەسێکیش نەتوانێ پەرچو لەمپەری لەبەردەمدا دروست بکات، ئەگەرنا بە تەئکید ئیسلام بۆخۆی، بە خۆی پشت ئەستوورە، وە ئیسلام بە شایستەی خۆی نازانێ بەسەر هیچ کەسدا فەرز بکرێ، چونکە ئەوەی کە دەویسترێ بەسەر خەڵکدا فەرز بکرێ، دیارە لەخۆی لە گومان دایەو لە خۆی دڕدۆنگەو، لە خۆی دەترسێ، بۆیە پێویستیی بە هێز هەیە، ئەگەرنا هەق پێویستیی بە هێز نیەو، ناگونجێ فەرز بکرێ بەسەر خەڵکدا، بەڵام بە تەئکید پێویستیی بە هێزێك هەیە کە بۆی ببێتە قەڵغانو پەرژینو ڕێگا بگرێ، لەوەی کە خەڵکی دیکە ڕێی لێ بگرنو، شەڕی پێ بفرۆشنو گێچەڵی پێ بکەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥٧

# دەرسی پێنجەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان لە چوار (٤) ئایەت پێك دێ، کە بـریتین لـە ئـایەتەکـانی (٣٤ تـا ٣٧)، سەرەتا بۆ جاری سێیەم (لەم سوورەتەدا) خوای کاربەجێ بـە نـازنـاوی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، مسولْـمانان دەدوێنـێ‌و، ئاگـاداریان دەکاتـەوە کـە: زۆرێـك لـە زانـایـان‌و گۆشەگیـرانی کتێب پێدراوان، ماڵ‌و سامانی خەڵك بە نـاهـەق دەخۆن‌و خـەڵك لـە ڕێـی خـوا لادەدەن.

پـاشـان ڕایدەگـەیـەنـێ: کە ئـەوانەی زێڕو زیو پـەزمەندە دەکـەن، وە لـە ڕێـی خـوادا خەرجی ناکـەن، موژدەی ئـازاری بە ئێش‌و ژانیان پێ دەدرێ، لە ڕۆژێکدا کە لـە ئاگـری دۆزەخـدا سـوور دەکـرێـتەوە، کە نێوچـەوان‌و کـەلـەکەو پشـتیـانی پـێ داغ دەکـرێ.

ئنجا ئەو ڕاستییـە گـەردوونییە ڕادەگەیەنێ، کـە ژمارەی مانگـەکانی سـاڵ لـە کتێبـی خواداو لـە زانیـاریی خواداو بە بڕیـاری خـوا، یـاخود لـە (لوح المحفوظ)دا، دوازدەن، کە دیارە مەبەست پێی مانگەکانن، بە پێی سەرژمێری ساڵی مانگیی (السنة القمريـة)، چواریـان جەنگیـان تێدا قەدەغەیـە، کـە بریتیـن لـە: (رَجَب، ذُو القَعِدة، ذُو الحِجـة، مُحَـرَّم)، وە فـەرمان دەکات کە سـتـەمیـان تێدا لـە خۆتـان مەکـەن، یـاخود بـە گشـتی قسە لەگەڵ بەشـەر دەکات کە لەو چوار مانگـەدا، ستـەم لـە خۆتـان مەکـەن، واتـە: شـەڕ بە یـەکدی مەفرۆشن، هـەڵبەتـە لـە هـەموو مانگـەکاندا، بەڵام بـە تـایبـەت لـەو چـوار مانگـەدا، کـە جـەنگیـان تێـدا قەدەغە کـراوە، وە فـەرمانیـش دەکات بە جـەنگ کردن لە دژی هـاوبەش بۆ خـوا دانەران بە تێکڕایی، وەك چۆن ئـەوانیش هـەروا دەکـەن.

وە لە کۆتایی دا باسی (نسيء) دەکات کە بریتی بووە، لە دواخستنی مانگە جەنگ تێدا قەدەغەکراوەکان، وە دەستکاریی کردنیان بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان، بۆ وێنە: ئەگەر پێویستیان بووبێ لە مانگی موحەڕڕەم دا شەڕ بکەن، گوتوویانە: ئەم مانگی (محـرم)ە، حەڵاڵ دەکەین، بەڵام لە جیاتی وی، فڵان مانگە حەرام دەکەین، وە جەنگی تێدا لە خۆمان قەدەغە دەکەین! کە دوایی بە وردیی باسی دەکەین.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ
ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ
ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾
يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ
وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾
إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ
فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ
كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾ إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ
يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا
حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا
يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دڵنیاییەوە زۆرێك لە زانایان (ی جوولەکە)و ڕاهیبەکان(ی نەصرانیی) ماڵو سامانەکانی خەڵك بە ناهەق دەخۆنو، لادان لە ڕێی خوادا ئەنجام دەدەن، وە ئەوانەی زێڕو زیو پەزمەندە دەکەنو لە ڕێی خوادا خەرجی ناکەن، موژدەی ئازارێکی بە ئێشیان بدەیە ﴿٣٤﴾ لە ڕۆژێکدا کە لە ئاگری دۆزەخدا سوور دەکرێتەوەو، نێو چەوانو کەلەکەو پشتیانی پێ داغ دەکرێ، (پێیان دەگوترێ: ) ئەمە ئەوەیە کە بۆ خۆتانتان پەزمەندە دەکرد، دەجا (سزای) ئەوە بچێژن، کە بۆخۆتان پەزمەندەتان دەکرد﴿٣٥﴾ بێگومان ژمارەی مانگەکان لە لای خوا (لە ساڵێکدا) لە نووسین (و بڕیار)ی خوادا، لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکانو زەوی هێناونە دی، دوازدە مانگن، لەوان (دوازدە مانگ)ەش چواریان حەرامن (جەنگیان تێدا قەدەغەیە)، ئا ئەوەیە ئایینی ڕاستو ڕێك، ئنجا ئێوە لەو (چوار مانگ)انەدا، ستەم لە خۆتان مەکەن، وە بە تێکڕایی لە دژی هاوبەشدانەرەکان بجەنگن، وەك چۆن ئەوان بە تێکڕایی لە دژتان دەجەنگن، وە بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە ﴿٣٦﴾ بە ڕاستیی دواخستن (ی مانگە قەدەغەکراوەکان لە کاتی خۆیان) زێدەییە لە بێبڕوایی دا، ئەوانەی بێبڕوان (زیاتر) پێی گومڕا دەکرێن، ساڵێك حەڵاڵی دەکەنو ساڵێك قەدەغەی دەکەن، تاکو ژمارەی ئەو مانگانە کە خوا قەدەغەی کردوون، تەواو بکەن، وە سەرئەنجام ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە (لە جەنگ کردن لەو مانگانەدا) حەڵاڵی بکەن، کردەوە خراپەکانیان بۆ ڕازێنراونەوە، وە خوا کۆمەڵی بێبڕوایان ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ ﴿٣٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِٱلْبَـٰطِلِ ): (الباطِلُ: نَقِيضُ الحَقِّ، وَهُوَ مَا لا ثَبَاتَ لَهُ عِنْدَ الفَحْصِ).

(باطل) پێچەوانەی هەقە، وە بە شتێك دەگوترێ، كە دەیپشكنیو تەماشای دەكەی، هیچی لە باراندا نەبێو، حاڵەتێكی جێگیرو چەسپاوی نەبێ.

(يَكْنِزُونَ ): (الكَنْزُ: جَعْلُ المَالِ بَعْضِها عَلَى بَعْضٍ وَحِفْظُهُ).

(كنز) بریتیە لەوە كە ماڵو سامان هەندێكی لەسەر هەندێكی دابنێی، وە بیپارێزی، كە بە كوردیی پێی دەگوترێ: پەزمەندە كردن، یاخود خەزنەكردن، یان وەسەریەك نان.

(ٱلذَّهَبَ ): یەكێكە لە كانزایەكان، كە كانزایەكی زۆر گران بەهایە، كاتی خۆی ئەو دراوەی كە مامەڵەی پێكراوە، یان زێڕ بووە، یاخود زیو بووە، زیویش دیارە كانزایەكە لە خوار زێڕەوە، ئێستاش ئەو دوو كانزایە نرخو بەهای خۆیان تا ڕاددەیەك هەیە، وە وشەی دینارو درهەم، لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ لە جێی زێڕو زیو هاتوە، چونكە دینار كە زێڕ بووە هی ڕۆمەكان بووە، وە درهەم هی فارسەكان بووە، كە لە زیو دروست كراوە.

(يُحْمَىٰ عَلَيْهَا ): (الحَمِيُ: الحَرَارَةُ المُتَوَلِّدَةُ مِنَ الجَوَاهِرِ المَحْمِيَة).

(حَمِي) بریتیە لە گەرمایی‌یەك كە لەو كانزایانەی كە گەرم دەكرێن، پەیدا دەبێ، كەواتە: (يُحْمَى عَلَيْها) واتە: گەرم دادەهێنرێ، سوور دەكرێتەوە.

(فَتُكْوَىٰ بِهَا ): (كَوَيْتُ الدَّابَّةَ بالنارِ كيّاً).

واتە: ئاژەڵەكەم بە ئاگر داخ كرد.

(جِبَاهُهُمْ ): (جِبَاه) کۆی (جَبهَة)یە، (الجَبْهَة: مَوْضِعُ السُّجُودِ مِنَ الرَّأسِ).

(جَبـهَة) ئەو شوێـنەیە کە کـرنووشـی پـێ دەبردرێ، واتــە: نێـوچـەوان، تەوێـڵ، وەك لـە ئـەحمـەدیی دا دەڵـێ:

جـەبیـن و جـەبـهــە : (تـەوێـــڵ)ە مەکـرو کـەیـدو حیـلـە فێـڵـە

(وَجُنُوبُهُمْ ): کۆی (جَنْب)ە، (الجَنْب: الجَارِحَةُ وَجَمْعُهُ جُنُوب).

واتە: کەلەکە یاخود تەنیشتی مرۆڤ ـ لای ڕاستو چەپی ئینسان، پێی دەگوتـرێ: (جَنْب).

(وَظُهُورُهُمْ ): (الظّهْر : الجَارِحَة وَجَمْعُهُ ظهور).

(ظَهْـر) بـە (ظُهُـور) کۆدەکرێتـــەوە، واتـــە: پشـت، دیـــارە (ظَهْـر) و (بَطْـن) پێچەوانەی یـەکدین، وەك چۆن (یَمِـین) و (یَسـار) پێچەوانەی یـەکـدین.

(ٱلشُّهُورِ ): (الشَّهْرُ: مُدَّة بِهِلاَل، أَوْ باعْتِبَار حركـة الشـمس مـن نقطـة إِلـى تِلْـك النُّقْطـة).

(شَـهْر) ماوەیـەکی زانراوە، لـەو کاتـەوە کـە هیلال، {واتـە: مانگی یـەك شـەوە}. دەردەکـەوێ، یـاخود تـا کـاتی ئـاوا بوونی مانـگ، یان لـەو ڕووەوە کـە مانگ بەشێکـە لە دوازدە بەش لە سووڕانەوەی خـۆر، لـە خـاڵێکـەوە بۆ خاڵێکی دیکە، واتـە: خـۆر کە سووڕێك بە دەوری خۆیدا تەواو دەکات، بە دوازدە مانگ تـەواوی دەکات، واتـە: هـەر بەشێك لـەو دوازدە بەشـە، پێی دەگوترێ: (شهر) یـانی: (مانـگ).

(حُرُمٌ ): کۆی (حرام)ە، (الحَرَامُ: وَهُوَ الـمَمْنُوعٌ مِنْ فِعْله).

(حـرام) هـەر شتێکـە کـە قەدەغەبـێ، ئـەنجام بـدرێ، کـە دەگـوترێ: (الأَشْهُـر الحُـرُم)، واتـە: ئـەو مانگانەی کـە جـەنگـیـان تێـدا قەدەغـە کـراوە.

( كَآفَّةً ): واتە: بە تێکڕا، هەموو.

(ٱلنَّسِيٓءُ ): (النسيءُ : تأخِيرٌ فِي الوَقْتِ، وَالنسِيئة بَيْعُ الشيء بالتأخِير، وَمِنْها النَّسِيءُ الّذي كانتِ العَرَبُ تَفعَلُهُ، وَهُوَ تأخير بَعْض الأَشْهر الحُرم، إِلى شَهْرٍ آخر).

(نَسيء) بریتیە لە دواخستن لە کات، وە (نَسِيئة) بریتیە لە شتێك کە نرخەکەی دواتر وەربگیرێ، پێچەوانەی (نَقْد).

(نَقْد) ئەوەیە کە دەستاو دەست بێ، یەکسەر نرخەکەی بدەیە دەستی، وە (نَسِيء) بریتی بووە لەوەی کە کاتی خۆی عەرەبەکان هەندێك لە مانگەکانی حەرامیان، لە کاتی خۆیان دوا خستوون بۆ مانگێکی دی، ئەو مانگەی پێویستیان پێی بووە، گوتوویانە: ئەو مانگەمان حەلاڵ کرد، لە جیاتی ئەوە لە مانگێکی دیکەی ساڵدا، ئەو جەنگە لە خۆمان قەدەغە دەکەین.

(لِّيُوَاطِـُٔوا۟ ): واتە: (ليُوافِقُوا).

واتە: بۆ ئەوەی تەواوی بکەن، یاخود پڕ بە پێست بێ، دەڵێ: (المُوَاطَأَة : المُوَافَقَةُ وَأَصْلُهُ أَنْ يَطَأَ الرّجل برِجْلِهِ مَوْطِئَ صَاحِبِهِ)، یانی: (مُوَاطَأَة) واتە: (مُوَافَقَة) وەك ئەو بوون، لە ڕیشەدا بریتیە لەوە کە کەسێك پێ لە شوێنی پێی کەسێکی دیکە دابنێ، بە شوێن پێی ئەودا بڕواو، وەك ئەو بکات.

## مانـای گشـتی ئایـەتەکـان

خوا ﷻ بۆ جاری سێیەم لەم سوورەتەدا، بە نازناوی ئیمان بانگی مسوڵمانان دەکات، کە بێگومان ئەمەش هەر لە درێژەی ئەو زەمینەسازییو ڕێ خۆشکردنە دایە، کە خوا مسوڵمانان ئامادە دەکات، بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕۆمە نەصرانییەکاندا، هەروەها لەگەڵ غەیری ئەوانیشدا.

ئنجا کە خوا پێشتر لە ڕووی فیکرییەوە، بنەما فیکرییەکانی ئەوانی هەڵتەکاند. ئێستا لە ڕووی هەندێ هەڵسوکەوتی ناڕەوایانەوە بە تایبەت لە ئاستی زاناکانیانو ڕاهیبەکانیان، کە بە حیساب سەرپەرشتیاریانو بەرجەستەکەری دینەکەیانن. خوای پەروەردگار پووچییو بوودەڵەیی دیندارییەکەیان دەخاتەڕوو، کە ئەوانە زاناو پێشەواکانیشیان، بە شێوەیەکی ناڕەوا مامەڵە دەکەنو، ماڵی خەڵکی بە ناهەق دەخۆن.

دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ﴾.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان زۆرێك لە زانایانی خاوەن کتێبەکانو خواپەرستەکانیان، ماڵی خەڵك بە ناهەقو ناڕەوا دەخۆن، ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، وە خۆشیانو خەڵکیش لە ڕێی خوا لادەدەن، دیارە کەسێك لە بەرگی دیندا دنیا بخوات، بە تەئکید خەڵکی بەهۆی ئەوەوە، دینی لەبەرچاو دەکەوێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٤﴾.

دیارە خوا کە باسی زانایانو خواپەرستەکانی خاوەن کتێبەکان بۆ مسوڵمانان دەکات، کە ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخۆنو، بازرگانیی بە دینەوە دەکەن، وە خەڵك لە رێی خوا لادەدەن، واتە:

یەکەم: ئێوە پەندیان لێ وەربگرن.

دووەم: بزانن کە ئەوانە لەسەر رێگایەکی ناهەقن.

هەر کاتێك شەڕیان پێ فرۆشتن، زۆر باش لەگەڵیاندا بەرەنگار ببنەوە، چونکە ئەوانە ئەهلی ناهەقن، ئەهلی بەتاڵن، چ لە رووی فیکرییەوە، کە هەندێ لە بەندەکانی خوا دەپەرستن، پێغەمبەران بە کوڕی خوا دادەنێن، وە ئەوانە گیرۆدە بوون بە هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنەوەو بە لادان لە دینەوە، هاوکات هەڵسوکەوتیشیان بەو شێوەیە، کە ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخۆن، بە ناوی دینەوە.

کەواتە: لە لایەکەوە: ئامادە بن بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵیان، کاتێ شەڕیان پێ فرۆشتن سەنگەریان لێگرتنو هەڕەشەیان لێکردن، وە بزانن کە لەسەر ناهەقن.

وە لە لایەکی دیکەوە: پەندو دەرسیان لێ وەربگرن، کە ئێوە وەك ئەوان نەکەن.

﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾﴾.

وە ئەوانەی زێڕو زیو پەزمەندە دەکەن (خەزنی دەکەن، دەیخەنە سەریەك) وە لە رێی خوادا نایبەخشن، موژدەیان پێ بدە بە ئازارێکی بە ئێش.

کە دیارە ئەوە مەرج نیە تەنیا جوولەکەو نەصرانییان بگرێتەوە، بەڵکو ئەوانیش دەگرێتەوە، وە مسوڵمانانیش دەگرێتەوە، وەك دوایی باسی دەکەین، چونکە سەروەتو سامان وەسەریەکنان، وە نەبەخشینی لە رێگای خواداو، بێ هوودە کەڵەکە کردنی لەسەریەك، بە تەئکید لەگەڵ ئیمانو تەوحیددا ناگونجێ، ئینسانی ئیماندار دەبێ خوای لە هەموو کەسێكو لە هەموو شتێك خۆشتر بوێ، وە دەبێ ئەو نیعمەتەی کە خوا پێی داوە، سەروەتو سامانێك کە خوا پێی بەخشیوە لە خزمەت خەڵکی خوادا بەکاری بێنێ، ئەگەرنا ئەوە موژدەی ئازارێکی بە ئێشی پێ دەدرێ.

دیارە موژدەش بۆ خۆشییە، بەڵام لێرەدا ئەوە دوو واتای هەن‌و، دەگونجێ بە دوو شێوە لێك بدرێتەوە:

١/ واتە: ئەگەر دڵخۆشیی‌و موژدەیەك هەبێ، بۆ ئەو جۆرە كەسانە، ئەوەیە كە موژدەی ئازاری بە ئێشیان پێ بدرێ.

٢/ یاخود ئەوە جۆرێكە لە گاڵتە پێ كردن، كە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (تهكم). وەك تۆ كەسێك كە ڕقت لێی هەڵدەستێ‌و بە قسەی تۆی نەكردوەو لار ڕۆیشتوە. دەڵێی: موژدەت لێبێ: تووشی فلان چۆرتمە بووی!

ئنجا خوا ڕوونی دەكاتەوە: كەی‌و لە كوێ، ئەو ئازارە بە ئێشەیان دەبێ؟ ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ﴾.

لە ڕۆژێكدا دەبێ كە ئاگر دەدرێتە بەر ئەو زێڕو زیوەو سوور دەكرێتەوەو گەرم دەكرێ، لە ئاگری دۆزەخدا، دوایی نێوچەوانیان‌و لا تەنیشتیان‌و پشتیانی پێ داخ دەكرێ، بەو سەروەت‌و سامانەی بەو زێڕو زیوە كە پەزمەندەیان كردوە، بۆیان سوور دەكرێتەوە لە ئاگری دۆزەخدا، دەم‌و چاو، یاخود نێوچەوان‌و لاتەنیشت‌و پشتیانی پێ داخ دەكرێ.

ئنجا پێشیان دەگوترێ: ﴿ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ﴾، ئا ئەوە بوو كە بۆخۆتان پەزمەندەتان دەكردو خڕتان دەكردەوە، سەر یەك، ﴿ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، ئێستا سزای ئەوە بچێژن، كە هەر وەسەریەكتان دەناو لە خواو خەڵك بێ خەبەر بوون.

ئنجا خوا دێتە سەر باسی مەسەلەیەكی دی، كە ئەمە گەڕانەوەیە جارێكی دیكە. بۆ دەرخستنی كەم‌و كوڕیی‌و ئەفسانەو لادانەكانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان‌و. دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ ﴾.

بێگومان ژمارەی مانگەکان لەلای خوا، (واتە: مانگەکانی ساڵ) لە نووسینی خوادا، (لە بڕیاری خوادا، یان لە زانیاریی خوادا)، هەر لەو کاتەوە کە ئاسامانەکانو زەوی هێنانەونە دی، دوازدەن، واتە: ژمارەیان دوازدە مانگە.

ئنجا لەو دوازدەیە ﴿مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞ﴾، چواریان جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، کە بریتین لە (رجب، ذو القعدة، ذو الحجة، محرم)، دوازدە مانگەکەش دوازدە مانگی قەمەریین، کە پێشیان دەگوترێ: مانگی عەرەبیی، بەڵام وا باشترەو وا ڕاستترە بگوترێ: مانگی قەمەریی، چونکە غەیری عەرەبیش حیسابیان بەو مانگانە کردوە، واتە: حیسابی ساڵیان بە جووڵەی مانگ (قمر) کردوە، کە لەوەشدا زیاتر حیسابی شەوەکانیان کردوە، چونکە مانگ لە شەودا دیارە، وە ساڵیان دابەش کردوە بۆ دوازدە بەش، مانگە عەرەبییەکانیش، کە بە مانگ (قمر) حیساب کراون، ئەوانەن:

١- محرم . ٢- صفر . ٣- ربيع الأول. ٤ - ربيع الثاني.

٥ - جمادي الأول. ٦ — جمادي الثاني. ٧ - رجب. ٨ - شعبان.

٩ - رمضان. ١٠ - شوال . ١١ - ذو القعدة. ١٢- ذو الحجة.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾، ئا ئەوە دینی ڕێكو ڕاستە کە بەو شێوەیە بێ، نەك مانگەکان بکرێنە سێزدە، یان مانگە قەدەغەکراوەکان، جێگۆڕکەیان پێبکرێ ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡ﴾، لەو چوار مانگەدا ستەم لەخۆتان مەکەن.

هەڵبەتە زانایان هەندێکیان گوتوویانە: (فِيهِنَّ) دەگەڕێتەوە بۆ هەر دوازدە مانگەکان، بەڵام وەك دوایی (لە مەسەلە گرنگەکاندا) باسی دەکەین، ئەو ڕایە بەهێزترە کە بگەڕێتەوە بۆ چوارەکان، چونکە لە زمانی عەرەبییدا ﴿فِيهِنَّ﴾، زیاتر بۆ ژمارەی کەم بەکاردێ، بەڵام ﴿فِيهَآ﴾، بۆ ژمارەی زیاتر.

شارەزایانی زمان دەڵێن: لە سێ (٣) وە تا نۆ (٩) (فِيهِنَّ)ی بۆ بەکاردێ، وە لە یازدە (١١)وە بۆ بیست (٢٠)یش (فِيهَآ )ی بۆ بەکاردێ.

پاشـــان خـــوا ﷻ دەفـــەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً﴾، وە بە تێکڕاتان لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بجەنگن، وەك چۆن ئەوان بە تێکڕا لە دژتان دەجەنگن، نەك وەك هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: لە دژی تێکڕای هاوبەش بۆ خوا دانەران، بجەنگن، وەك ئەوان لە دژی تێکڕاتان دەجەنگن! چونکە جەنگ لە دژی تێکرای هاوبەشدانەرەکان دروست نیە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە:

١/ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك، داوای پەنا بکات، دەبێ پەنای بدەی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ... ﴿٦﴾﴾ التوبة .

٢/ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك پەیمانی هەبێ، دەبێ پەیمانەکەی لەگەڵ ببرێتە سـەر، ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾﴾. هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾﴾، لە یەك سیاقدا، خوا دوو جاران فەرموویەتی: ئەو هاوبەش بۆ خوادانەرانەی پەیمانیان لەگەڵ ئێوەدا هەیە، پەیمانەکانیان لەگەڵ ببەنە سەر، تاکو کۆتایی کاتی دیاریکراو. وە پارێز لە خوا بکەن، خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن، واتە: ئەگەر پەیمانشکێنی بکەن، خوا خۆشی ناوێن، چونکە بێ تەقوا بوون!

کەواتە: ئەگەر لە ڕووی زمانەوانییشەوە ـ وەك دوایی باسی دەکەین ـ بگونجێ وشەی ﴿كَآفَّةً﴾ پەیوەست بێ، بە بەرکار (مفعول)ەوە، نەك بە بکەر (فاعل)ەوە با لە ڕووی زمانەوانیشەوە دروستبێ، بەڵام لە ڕووی لێکدانەوەی قورئانو، لە ڕووی

حەقیقەتێکی شەرعییەوە، دروست نیە، کە جەنگ لە دژی هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران بکرێ، ئەگەر گریمان ئەوانیش بە هەموویان جەنگ لە دژی مسوڵمانان بکەن، چونکە مەرج نیە هەرچی ئەهلی کوفر خۆیان بە ڕەوایان زانی، ئیسلام بۆ مسوڵمانانو بۆ شوێنکەوتووانی خۆی، بە ڕەوای بزانێ.

لە کۆتایی دا: خوا باسی حاڵەتێکی دیکە دەکات، کە ئەم ئایەتەی پێشێ زەمینە خۆشکردن بوو، بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو حاڵەتە، ئەویش بریتی بوو لە حاڵەتی (نسيء)، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ﴾، بێگومان (نسيء) زێدەییە لە بێبڕوایی دا، ﴿يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، ئەوانەی کە بێبڕوان، پێی گومڕا دەبن، یان پێی گومڕاتر دەبن، چی دەکەن؟

﴿يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا﴾، ساڵێك جەنگی تێدا حەلاڵ دەکەنو، ساڵێك جەنگی تێدا قەدەغە دەکەن، واتە: لە چەند مانگێکی دیاریکراودا، ﴿لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾، بۆ ئەوەی هەمان ژمارە کە خوا قەدەغەی کردوە (کە چوار مانگن) ژمارەکە تەواو بێ، ﴿فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ﴾، وە سەرەنجام ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردوە، حەلاڵی بکەن، (وە ئەوەش کە خوا حەلاڵی کردوە، حەرامی دەکەن).

﴿زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ﴾، کردەوە خراپەکانی خۆیانیان بۆ ڕازێنراونەوە، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٧﴾، وە خوا کۆمەڵی بێبڕوایان ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

هەرچەندە وشەی: (هداية) ڕێنمایی کردنو، ڕێ پیشاندان، وە خستنە سەر ڕاستە ڕێ، دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا دەبێ بڵێین: نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، چونکە خوای بە بەزەیی هیدایەتی خۆی بۆ هەموو لایەك دابین کردوە، بەڵام ئەوانەی بێبڕوابن شایستەی ئەوە نین، خوای بەخشەر زێدە لوتفێکیان لەگەڵ بەکاربێنێو بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

مەسەلەی یەکەم: خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾.

جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان زۆرێك لە زانایانو گۆشەگیران ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخۆن، وە خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن.

نەیفەرمووە: هەموویان، ئنجا قورئان هەمیشە خۆی دەپارێزێ لە ڕەهاییو گشتاندن، بەڵکو هەمیشە لە فەرمایشتی خوادا پۆلێن کردنی خەڵك هەیە، وە خەڵك هەمووی پێکەوە حەشر ناکرێ، وە هەموویان یەك حیسابیان بۆ ناکرێ. هەمیشە یەك حیساب بۆ کردن، وە قسەکردن بە ڕەهاییو گشتاندن، ئینسان تووشی هەڵە دەکات، وە ئەو جۆرە هەڵوێستەش زیاتر لە عاتیفەوە سەرچاوە دەگرێ. خوای تاكو بێ وێنەش دوورە لەوەی کە بە ئارەزوو بە عاتیفە شت بفەرموێ، بەڵکو ئەوەی خوای بەرزی مەزن دەیفەرموێ، هەمووی لە عیلمی تەواو، لە حیکمەتی تەواو، لە سیفەتە هەرە تەواوو بێ سنوورەکانی خۆیەوە، سەرچاوە دەگرێ.

لە بەرانبەر ئەم ئایەتەدا دوو هەڵوێستە دەکەین :

هەڵوێستەی یەکەم : پێشتر باسمان کرد، کە وشەی (أحبار) کۆی (حَبر)ە، یان کۆی (حِبر)ەو، بە زانای خاوەن کتێبان دەگوترێ، زیاتریش بە زانای جوولەکەکان دەگوترێ، (رهبان)یش کۆی (راهب)ە، کە بە گۆشەگیرو ڕەبەنو خواپەرستەکانی نەصرانییان دەگوترێ، یان هی هەردووکیان. وە من وام دێتە بەرچاو کە بۆیە

لێرەدا خوا بە گشتیی باس دەکات، چونکە هەرچەندە دەگونجێ بڵێین: مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکانە، بەڵام بۆیە لێرەدا خوا بەگشتی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ﴾، زۆرێك لە زانایانو گۆشەگیران، چونکە لە دینداریی دا، یان ئەوەتا مرۆڤ دەبێ پێشەواو چاوساغو، ڕێ پێشاندەر بێ، یاخود دەبێ شوێنکەوتوو بێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: هەم زۆرێك لە پێشەواو سەرکردەو زاناکان، وە هەم زۆرێك لەوانەی کە شوێنکەوتوونو بە تەنیا خواپەرستیی شەخصیی ئەنجام دەدەن، دیارە ئەو حاڵەتەش شتێکی گشتیی یەو تایبەت نیە بە جوولەکەو نەصرانییەکانەوە، بەڵکو لە هەموو تائیفە دینییەکان دا، هەروایە: لە نێو مەجووسیاندا هەیە، لە نێو ئێزیدییاندا هەیە، لە نێو صابیئەدا هەیە، لە نێو بوزاییەکاندا هەیە، لە نێو هەمووواندا هەیە، بەڵکو لە نێو ئەهلی ئیسلامیشدا، ئێستا ئەوە هەیە، کە لەو حاڵەدا، وە لە زۆر حاڵی دیکەشدا، وەك پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێداوە، مسوڵمانان کاتێك دووچاری لادان دەبن، بە دوای زاناو ڕەبەنەکانی خاوەن دینەکانی دیکە دەکەون، کە بە پەنای دیندا، دنیا دەخۆن.

دیارە نەمبینیوە لە هیچ کام لە تەفسیرەکاندا، ئەوە باس کرابێ، بەڵام پێم وایە ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، وە خوای زاناو تواناش باسی ئەوەی نەکردوە، کە (أحبار) تایبەتن بە جوولەکانەوە، وە (رهبان)یش تایبەتن بە نەصرانییەکانەوە، بەڵکو بە گشتی فەرموویەتی، لێرە لەم سیاقەدا.

وە لە ڕاستییشدا تەنیا لە نێو جوولەکەکانو نەصرانییەکاندا، بازرگانیی بە دینەوە ناکرێ، وە ماڵی خەڵك بە ناهەق ناخورێ، بەڵکو لە نێو هەموو شوێنکەوتووانی ئایینە ئاسمانییەکاندا، لە ڕۆژهەڵاتی دنیاوە، تاکو ڕۆژئاوای دنیا، ئەو حاڵەتە هەیە، وە هەندێ لە مسوڵمانانیش بەو دەردەوە گیرۆدە بوون، ئەوانەی کە لە شەریعەت لادەدەنو قورئانو سوننەت پشتگوێ دەخەن.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u> : ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ﴾، ماڵی خەڵکی بە ناهەق دەخۆن، (باطل) پێچەوانەی (حق)ە، هەق ئەوەیەکە لە ڕووی شەرعییەوە ڕێكو ڕاست بێ، (باطل)یش ئەوەیە کە پێچەوانەی شەریعەت بێ.

ئەو ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردنەش چەند حاڵەتێك بەخۆوە دەگرێ، بەتایبەت لە نێو جوولەکەکانو، نەصرانییەکانو، مەجووسییەکانو، صابیئەکان دا، وە جاری وایە لە نێو مسوڵمانانیشدا.

## شێوەکانی ماڵ وسامانی خەڵک بە ناهەق خواردن لەلایەن شارەزایانی ئایینەوە

(محمد رشید رضا) لە تەفسیرەکەی (تفسیر القرآن الحکیم)[1]دا، حەوت نموونەی هێناونەوە، بۆ حەوت جۆرە ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن، لە لایەن زانایانو پێشەوایانو ئەوانەوە کە خۆیان بە سەرپەرشتیاری دینی خەڵك دەزانن :

یەك : کەسێك کە خەڵك ماڵو سامانی خۆیانی دەدەنێ، لەبەرئەوەی پێیان وایە خواپەرستەو دنیا بە کەمگرە، تاکو بۆیان بپارێتەوە.

هەڵبەتە دوعا کردنو پارانەوە بۆ خەڵك، بۆ کەسێك کە شایستە بێ، شتێکی شەرعییەو ڕەوایە، بەڵام ماڵ لە بەرانبەردا وەرگرتنی، شتێکی ناڕەوایە، هەروەها کەسێك کە پێت ئینسانێکی چاکە، پیاوە، یان ئافرەتە، ئومێدت هەبێ کە دوعاکەی قبوول دەبێ، چاکە، بەڵام نابێ قەناعەتێکی جەزمت هەبێ بڵێی حەتمەن دوعاکەی قبوولە، چونکە هەواڵی لای خوا غەیبەو، تەنیا خوا دەیزانێ.

---

١) ج ١٠، ص ٣٥٨ .

بەڵام لێرەدا حاڵەتێکی دیکە لەم بنچینەی ڕەوایەتییە هەڵداوێردرێ، ئەویش ئەوەیە کە کەسێك پێی وابێ ئەو کەسە، ئەو شێخە، ئەو زانایە، ئەو پێشەوایە، لە هەر دینێکدا هەیە، خاوەن دەسەڵاتە لەلای خواوە، دەتوانێ شەفاعەت بکاتو، بەشدارە لە حوکمی خوادا، وە خوا قسەی ڕەت ناکاتەوە!! کە لە ڕاستییدا ئەوە شیرکە.

دوو: ئەوانەی کە خزمەتی مەزارگە دەکەن، ئنجا ئەو مەزارگەو گۆڕە چ هی پێغەمبەرانە، چ هی صالحانە، وە دیاریی‌و خەڵات بۆ ئەو مەزارگانە دەچێ، وەك ئێستا باوەو هەیە، وە لەنێو شیعەدا هەر زۆر زۆرەو، بۆتە سەرچاوەیەکی دارایی گەورە بۆ ئەو (ئایەتوڵڵا)یانە، ئەو مەلایانەیان کە تاڕاددەیەکی زۆر لەو سیفەتەدا، شوێنی (أحبار) و (رهبان)یان گرتۆتەوە.

هەروەها ئەوەی کە نەزر دەکرێ، بۆ ئەو گۆڕو مەزارگانە، کە لە حەقیقەت دا ئەوە بۆ خۆی شیرکە، ئنجا ئەو ماڵو سامانە، کە بەهۆی ئەو گۆڕو مەزارگانەوە کۆدەبێتەوە بە شێوەیەك لە شێوەکان، جۆرێکە لە ماڵی خەڵك خواردن بە ناهەق، چونکە ماڵو سامان، دەبێ بدرێ بە خەڵك نەك ببرێتە سەر گۆڕستان! وە دەبێ نەزر تەنیا بۆ خوا بکرێو، نابێ بە ناوی هیچ کەسەوە بکرێ، بەڵێ دەگونجێ خێرەکەی بۆ پیاو چاکێك بکرێتە دیاریی، بەڵام دەبێ بە ناوی خواوە نەزر بکرێ، کە ئەوەش لە زۆربەی شوێنکەوتووانی دینە ئاسمانییەکاندا هەیە، هەرچەندە ئایینی ئاسمانیی ڕێكو ڕاست هەر یەکێکە، بەڵام هەر کامێك لەوان، ئێستا شکڵو شێوەیەکی تایبەت بەخۆی گرتوە، بۆیە بە کۆ (جمع) باسیان دەکەین.

سێ : کە ئەمە تایبەتە بە نەصرانییەکانەوە، هەڵبەتە نەصرانیی ئێستا سێ جۆرن ١) پرۆتستانت، ٢) ئەرثەدۆکس، ٣) کاثۆلیك.

(پرۆتستانت) واتە: ئەوانەن بە حیساب چاکسازییان کرد لە ئایینی نەصرانییداو پەیوەست نین بە پاپاوە، وە کۆمەڵێك ئەفسانەو شتی داهێنراوی نەصرانییەتیان بە حیساب ڕەفز کردوە، بەڵام ئێستا هەم (ئەرثەدۆکس) کە زیاتر لە ڕووسیاو لە بلۆکی ڕۆژهەڵاتو لە میسریش هەن، هەم (کاثۆلیك) کە

زیاتر لە ڕۆژئاواو لە ئەمریکان، ئەوانە کە هەندێ لە قەشەو پاپاکانیان کە بە ناوی خواوەو لە بەرانبەر پارەدا، لە خەڵك خۆشدەبن، یاخود کاتی خۆی بەهەشتیان پێ فرۆشتوون، ئەوەش جۆرێکە لە ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن، کە بێگومان هەر خوا لە گوناهان خۆشدەبێ، وە هیچ کەس بۆی نیە خۆی بکات بە وەکیلی خواو، لە گوناهان ببووریّ، وە بەهەشت تەنیا بەدەست خوای پەروەردگارەو، بە دەست کەسی دیکە نیە، تاکو بە خەڵکی بفرۆشیّ!

چوار : ئەو ماڵەی لە بەرانبەر فەتوای ناهەقدا وەردەگیریّ، کە حەرامێك حەلاڵ دەکریّ، یاخود حەلاڵێك حەرام دەکریّ، بۆ ڕازیکردنی دەسەلاتدارێك، یان دەوڵەمەندێك، ئەوەش کە دیارە هەموو خاوەن دینەکان، بە گشتی پێیەوە گیرۆدە بوون، لە نێو ئەهلی ئیسلامیشدا کەمو زۆر ئەوە هەبووە، وە ئەو جۆرە زانایانە پێیان دەگوتریّ: (وعاظ السلاطین) ئەوانەی کە ئامۆژگاریی خەڵك دەکەنو ڕایاندێننو ڕامیان دەکەنو باریان دێنن، بۆ دەسەلاتداران بۆئەوەی لە قسەیان دەرنەچن!

پێنج : ئەوەیە کە بە شێوەی دزیی‌و خیانەت‌و ناپاکیی، لە خەڵکی وەردەگرن. وەك خوای دادگەر لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمویّ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ...(٧٥)﴾.

کە لێرەش خوای کارزان خاوەن کتێبەکان پۆلێن دەکات‌و دەفەرمویّ: وە لە خاوەن کتێبەکان هەیە، کە ئەگەر بیکەی بە ئەمیندار لەسەر قینتارێك لە زێڕ، (واتە: ئەندازەیەکی زۆر)، ئەوە پێت دەداتەوەو ئەمانەتەکە دەپارێزیّ. هەشیانە دینارێکیش بێ خیانەتی پێ دەکاو نایپارێزیّ، مەگەر هەمیشە بەسەریەوە ڕاوەستی‌و چاودێری بی ...

شەش : بریتیە لە بەرتیل وەرگرتن، کە بە هۆیەوە لە بەرانبەری دا هەقێك دەکاتە ناهەق‌و، ناهەقێك دەکاتە هەق، ئەوەش جۆرێکی دیکەیە لە خواردنی ماڵی خەڵك بە ناهەق‌و بە ناوی دینەوە.

حەوت : بریتیە لە سوود خۆریی، کە ئەوە لەلای جولەکەو نەصرانییەکان زۆرە، خوای بالادەست لە سوورەتی (النساء)دا، لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ ﴾.

واتە: وە سوود خۆرییان، کە لێی قەدەغە کرابوون، کە نابێ بیکەن، وە ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردنیان، وە بۆ کافرەکانیان ئازارێکی بە ئێشمان ئامادە کردوە.

ئەوەی جێی سەرنجە بەڵام نەمبینیوە لە تەفسیرەکان دا ئاماژەی پێ بکرێ، ڕەنگە هەشبێ، بەس بەرچاوم نەکەوتبێ، کە خوا ﷻ دوای ئەوەی ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن، باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، وە خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، هەڵبەتە توێژەرەوان زیاتر وایان لێکداوەتەوە، کە ئەو جۆرە کەسانە دوو شتان دەکەن:

١ - ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخۆن بە ناوی دینەوە.

٢ - خەڵکیش لە ڕێی خوا لادەدەن.

بەڵام من وای بۆ دەچم کە مەبەست ئەوەیە: ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردنەکەیان، دەرەنجامێکی شوومی لێ دەکەوێتەوە، کە بریتیە لە خەڵك لادان لە ڕێی خوا، چونکە خەڵك وەختێك کەسانێك کە لە بەرگی دینداندان، بە ڕواڵەت خزمەتی دین دەکەن، جا چ وەك زانا، چ وەك زاهیدو خواپەرستو ڕەبەن، کاتێك دەیانبینن لە پەنای دیندا، دنیای خەڵك دەخۆن، دینی خوایان لەبەرچاو دەبێزرێو، لەبەرچاویان دەکەوێو، سەرەنجام ئەو جۆرە کەسانەی کە لە پەنای دیندا دنیا دەخۆن، خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەنو، خەڵك بەهۆی ئەو ڕفتارو ئاکارانەیانەوە، لە دینی خوای بەرزو مەزن دوور دەکەوێتەوە.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

لە سیاقی باسی ئەو زاناو ڕاهیبانەدا كە كتێبیان پێدراوە، لە پێش ئوممەتی پێغەمبەردا ﷺ كە چۆن بازرگانیی بە ئایینەوە دەكەن، وە خەڵك ئیستیغلال دەكەن، وە لە پەنای دیندا دنیا دەخۆن، لەو سیاقەدا دەفەرموێ: وە ئەوانەی كە زێڕو زیو پەزمەندە دەكەن و خڕی دەكەنەوە، وە لە ڕێی خوادا نایبەخشن، موژدەی ئازارێكی بە ئێشیان پێبدە، لە ڕۆژێكدا كە ئەو زێڕو زیوە بۆیان سوور دەكرێتەوە، لە ئاگری دۆزەخدا، وە پاشان نێوچەوان و لاتەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەكرێ، وە پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەوە بوو، كە بۆخۆتان پەزمەندەتان دەكرد، دە بیچێژن سزای ئەوەی خڕتان دەكردەوە سەریەك و وسەریەكتان دەنا، لە ڕێی خوادا نەتاندەبەخشی.

وشەی (كَنْز) هەر لە كوردیشدا جار جار بەكاردێ، ئێمە بە كوردیی دەڵێین: (خەزنە) بەڵام مانای ئەسڵی وشەی (كَنْز) دەگوترێ: (رَجُلٌ مُكْتَنِزُ الجِسْمِ)، واتە: پیاوێكی جسمی تێك سڕماوە یانی: گۆشت و چەوری كەوتۆتە سەریەك و چڕو پڕە.

ئنجا وشەی (كَنْز) ئەوەیە كە شتێك بخەیە سەریەك و بیپارێزی، (الكَنْز: جَعْلُ الـمَالِ بَعْضَـهُ عَلَى بَعْضٍ وَحِفْظُهُ)، (كَنْز) ئەوەیە كە ماڵ و سامان هەندێكی لەسەر هەندێكی دابنێی، وە بیپارێزی.

دیارە پێشتریش باسمان كرد، بۆیە خوا ﷻ باسی زێڕو زیو دەكات، كە لە سوننەتدا لە جیاتی زێڕ، دینار بەكارهاتوە، وە لە جیاتی زیو، درهەم بەكارهاتوە چونكە دراوی ئەو كاتە، یان دیناری زێڕ بووە، كە دراوی ڕۆمەكان بووە، یاخود درهەمی زیوە بووە، كە دراوی فارسەكان بووە، بەڵام خوا ﷻ وشەكانی: دینارو درهەمی بەكارنەهێناون، چونكە ئەگەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ ئەو دوو

دراوە، پێیان گوتراوە: دینارو درهەم، ئەوەتا لە سەردەمی ئێمەدا ناوی دراوەكان دەگۆڕێ، وە هەر لە دوایی پێغەمبەریشەوە ﷺ ڕەنگە لە وڵاتانی دیكەدا ناوی دیكەیان هەبوو بێ، با لەو دوو كانزایەش، واتە: لە زێڕو زیویش، دروست كرابن.

لێرەشەوەیە كە ڕەهایی قورئان، وە گوێڕەیی (نِسبي) بوونی سوننەتمان بۆ دەردەكەوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو وشەی بەكارهێناون، كە لە ڕۆژگاری خۆیدا بوونو بەنسبەت ڕۆژگاری خۆیەوە، دینارو درهەم، زانراو (معلوم) بوون، بەڵام لە قورئاندا خوای پەروەردگار زێڕو زیوی بەكارهێناون، كە دەگونجێ دراویان لێ دروست بكرێ، بەڵام ناویان لێ نەنرێ، دینارو درهەم، بەڵكو ناوی دیكەیان بۆ بەكاربهێنرێ.

كەواتە: لێرەدا مەبەست لە دراو، پارەی نەخدینەیە بە گشتی، با لە زێڕو زیویش دروست نەكرابێ، وەك ئێستا كە لە كاغەز دروست دەكرێ، ئەوە دینارە، ئەوە دیناری عێراقییە، ئەوە دیناری كوێتییە، دیناری ئوردونییە، ئەوە ڕیالی سعودییە، ڕیالی سودانییە، ئەوە دۆلارە، ئەوە ڕۆبڵی ڕوسییە، ئەوە ماركی فەڕەنسییە، ئەوە یۆڕۆیە، ئەو هەموو جۆرە دراوانە هەن، كە ئێستا عادەتی دنیا وایە هەمووی لە كاغەز دروست دەكرێ، لەبەرئەوەی هەڵگرتنو پاراستنی ئاسانترە، وە كاتی خۆی لە كانزاكان دروست كراوە بە تایبەتیی لە زێڕو زیو.

# کورتە باسێک دەربارەی ماڵ وسامان کۆکردنەوە

زانایان مشتومڕیان کردوە لەوبارەوە، کە ئایا هەر کەسێك پارەی وسەرێك ناو هەڵیگرت، ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە، کە دەفەرموێ: ئەوانەی کە پارە وسەرێك دەنێن، سەرزەنشت کراون؟

زۆربەیان ڕایان وایە، کە هەر پارەو سامانێك، با زۆریش بێ، مادام زەکاتی لێ دەرکرا، واتە: لە (٢،٥٪) یاخود (١/٤٠)، دیارە ئەگەر پارەی نەغدینە، یان ماڵی بازرگانی بێ، بەڵام ئەگەر جۆری دیکەبێ، خەزنە بێ دۆزرابێتەوە ئەوە حیسابی دیکەی هەیە، مادام زەکاتی لێدەرکرا، هەقی خواو خەڵکی لێ دەرکرا، هەرچەندە زۆریش بێ، ئەم ئایەتە وەك سەرزەنشت نایگرێتەوە.

بەڵام (أبو ذر الغفاري) خوا لێی ڕازی بێ، ڕایەکی دیکەی هەیە، با تەماشای ئەو چەند دەقە بکەین، دەربارەی پەزمەندەکردنی ماڵو سامان :

١) ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِنَّمَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ. فَلَما أُنْزِلَتْ جَعَلَها اللّهُ طُهْراً للأَمْوَالِ، ثُمَّ قَالَ: مَا أُبَالِي لَوْ كَانَ عِنْدِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبَاً أَعْلَمُ عَدَدَهُ وَأُزَكِّيهِ وَأَعْمَلُ فِيهِ بِطَاعَةِ اللهِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (١٤٠٤)، وَابْنُ مَاجَه، برقم: (١٧٨٧) وغيرهما}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەم ئایەتە پێش ئەوە بوو، کە زەکات بێتە خوار (زەکات پێویست بکرێت) بەڵام کاتێك کە خوا زەکاتی ناردە خوار، کردی بە مایەی پاکبوونەوەی ماڵو سامانەکان، دوایی (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) گوتی: من بەلامەوە گرنگ نیە ئەگەر بەقەدەر چیای ئوحود زێڕم هەبێ، ژمارەکەی بزانم، وە زەکاتی لێ بدەم، وە لە فەرمانبەری خوادا بەکاری بێنم.

من تەنیا تێبینییم لەسەر قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، ئەوەیە کە دەڵێ: ئەم ئایەتە بەرلەوەی زەکات فەرز بکرێ هاتۆتە خوار!

کە من پێم وایە، وا نیە، بەڵکو پێش ئەوە، زەکات پێویست کراوە، چونکە ئەم ئایەتانە کە لە سوورەتی تەوبەن، لە ساڵی نۆیەمی کۆچییدا هاتوونە خوار، دوای جەنگی تەبووک لە نێوان ساڵانی: (٩ و ١٠)شدا هاتوونە خوارێ، کەواتە: زەکات پێش ئەوە پێویست کراوە.

دیارە مەبەستی ئەوەیە هەر ماڵێک زەکاتی لێدرا، ئەم ئایەتە هەڕەشە نیە بۆ ئەو، مادام زەکاتی لێدرا، کەواتە: بەو پەزمەندە کراوە لە قەڵەم نادرێ، کە سەرزەنشت کراوو ڕەخنەی لێگیراوە.

٢) ﴿عَنِ ابْنِ عمر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَا أُدِّيَتْ زَكَاتُهُ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ، وَإِنْ كَانَ تَحْتَ سَبْعِ أَرْضِينَ، كُلُّ مَالٍ لاَ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ فَهُوَ كَنْزٌ، وَإِنْ كَانَ ظَاهِرًا﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِكٌ، بِرقم: (٣٤٠)، وَعَبْدالرّزاق، بِرقم: (٧١٤٠)، وَالبَيْهَقِي، بِرقم: (٧٠٢٢)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط)، برقم: (٨٢٧٩)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: هەر ماڵ و سامانێك زەکاتی لێ دەرکرا، بە خەزنەو کەڵەکراو (کنز) دانانرێ ئەگەر لە ژێر حەوت زەوییانیش دابێ، وە هەر ماڵێك زەکاتی لێدەرنەکرا، ئەوە بە پەرمەندەکراو (کنز) دادەنرێ، هەرچەندە ئاشکرا بێ و لەبەرچاویش بێ.

٣) هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە ئەوەشی لێ گێڕراوەتەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا أَدَّيْتَ الزَّكَاةَ، فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بِرقم: (٦١٨) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ، بِرقم: (١٧٨٨)، وَالحَاكِمُ، بِرقم: (١٤٤٠) ووافقه الذهبي، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٣٢١٦)، قال شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ}.

واتە: ئەگەر زەکاتی ماڵ و سامانی خۆتت دا، ئەوەی کە لەسەرت پێویست بووە ئەنجامت داوە.

یانی: ئەو کاتە ئەم ئایەتە کە هەڕەشە دەکات لەوانەی کە سەروەت و سامان وسەر یەك دەنێن، نایگرێتەوە.

٤) ﴿قَالَ ابْنُ عَبْدِ الْبَرِّ، وَرَدَت عَنْ أَبِي ذَرّ آثار كَثِيرَة تَدُلّ عَلَى أَنَّهُ كَانَ يَذهَبُ إِلى أَنْ كُلّ مَال مَجْمُوعٍ يَفْضُل عَنِ القُوتِ وَسَدَاد العَيْش، فَهُو كَنْزٌ، يُذَمُّ فَاعِلُهُ، وَأَنَّ آية الوَعِيد نَزَلَتْ فِي ذَلِك" وَخَالَفَهُ جُمهُور الصَّحابَةِ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ. وَحَمَلُوا الوَعِيدَ عَلَى مَانِع الزَّكاةِ، وَأَصَحّ مَا تمسكوا به، حَدِيث طَلْحَةَ وَغَيْرِهِ فِي قِصَّةِ الأَعْرَابِي، حَيْثُ قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُها (يعني الزكاة)؟ قَالَ رسول الله ﷺ: لا، إِلاَّ أَنْ تَطوعَ﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (٤٦)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١١)}.

واتە: ئیبنو عەبدولبەڕ دەڵێ: لە ئەبو ذەڕەوە چەند شوێنەوارێکی زۆر هاتوون، ئەوە دەگەیەنن کە ئەو ڕای وا بووە هەر ماڵ و سامانێك لە بژیوی خۆت، وە لەوە کە ژیانێکی ئاسایی پێ بگوزەرێنێ، زیاد بێ، بە پارەی پەزمەندەکراوو زەمکراو. لە قەڵەم دەدرێ، وە ئەو کەسەی پارە وسەریەك دەنێ، بەو شێوەیە، سەرزەنشت دەکرێ، وە ئەم ئایەتە هەڕەشەیەو لەوبارەوە هاتۆتە خوارێ، بەڵام جەماوەری هاوەڵان، وە جەماوەری ئەوانەی دوای وان، وە ئەوانەی دوایی تابعینیش. پێچەوانەی ڕای ویان هەیە، گوتوویانە: ئەم هەڕەشەیە بەس ئەوانە دەگرێتەوە. کە زەکات نادەن، وە ڕاستترین بەڵگەش لەوبارەوە بە بەڵگە هێناویانەتەوە. ئەو دەقەیە کە لە بەسەرهاتی پیاوە ئەعراببییەکەدا هاتوە[1]، {ڕۆژێك ئەعراببییەك دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لێی دەپرسێ: خوا چی لەسەر فەرز کردوە؟ پێی دەفەرموێ: لە شەوو ڕۆژدا، پێن نوێژ، دەڵێ: چی دیکە؟ دەڵێ: هەر ئەوەندە مەگەر بۆ خۆت خۆبەخشانە لێی زیاد بکەی، (نوێژی سوننەت بکەی). ئنجا دەربارەی ڕۆژوو لێی دەپرسێ؟ دەڵێ: مانگی ڕەمەزان، دەربارەی زەکاتیش لێی دەپرسێ؟ دەڵێ: ئەویش بۆی دیاریی دەکات، کە زەکات ئەو ئەندازەیە. دەڵێ: ئایا جگە لەوە لەسەرم پێویستە لە ماڵ و سامانی خۆم ببەخشم؟ پێغەمبەریش ﷺ، دەفەرموێ: نەخێر، مەگەر بۆخۆت خۆبەخشانە ماڵی دیکە ببەخشی}.

---

١) کە بخاري: ٤٦ و مسلم: ١١، لە کتێبەکانیان دا هێناویانە.

کە ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە تەنیا زەکات لەسەر ئینسان فەرزە لە حاڵەتی ئاساییدا.

٥) ﴿عَن زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، قَالَ: مَرَرْتُ بِالرَّبَذَةِ فَإِذَا أَنَا بِأَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا أَنْزَلَكَ مَنْزِلَكَ هَذَا؟ قَالَ: كُنْتُ بِالشَامِ، فَاخْتَلَفْتُ أَنَا وَمُعَاوِيَةُ فِي الَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، قَالَ مُعَاوِيَةُ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ، فَقُلْتُ: نَزَلَتْ فِينَا وَفِيهِمْ، فَكَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فِي ذَاكَ، وَكَتَبَ إِلَى عُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَشْكُونِي، فَكَتَبَ إِلَيَّ عُثْمَانُ أَنْ أَقْدَمْ الْمَدِينَةَ، فَقَدِمْتُهَا، فَكَثُرَ عَلَيَّ النَاسُ حَتَّى كَأَنَّهُمْ لَمْ يَرَوْنِي قَبْلَ ذَلِكَ، فَذَكَرتُ ذَلِكَ لِعُثْمَانَ، فَقَالَ: لِي إِنْ شِئْتَ تَنَحَّيْتَ فَكُنْتَ قَرِيبًا، فَذَلكَ الَّذِي أَنْزَلَنِي هَذَا الْمَنْزِلَ، وَلَوْ أَمَّرُوا عَلَيَّ عَبْداً حَبَشِياً لَسَمِعْتُ وَأَطَعْتُ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (١٣٤١)}.

واتە: زەیدی کوڕی وەهەب (کە یەکێکە لە تابیعیین خوا لێی خۆش بێ)، دەڵێ: بە لای ڕەبەذەدا تێپەڕیم (ڕەبەذە: شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینە) لەوێ ئەبو ذەڕم بینی گوتم: بۆ هاتووی بۆ ئێرە؟ (وا دیارە تاقەماڵە بووە لەوێ؟ ئەویش باسی کرد: هۆکاری ئەوەی کە بۆچی چووە بۆ ئەو شوێنەو بە تەنیا لەوێ دانیشتوە) دەڵێ: من لە شام بووم لەگەڵ موعاویەدا لەسەر ئەم ئایەتە: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾، تێکگیراین، موعاویە گوتی: ئەوە دەربارەی خاوەن کتێبان هاتۆتە خوار (جوولەکەو نەصرانییەکانو ئەوانی دی)، منیش گوتم: دەربارەی ئێمەشو ئەوانیش هاتۆتە خوار، (کە هیچ گومانی تێدا نیە، قسەکەی ئەبو ذەڕ، ڕاستەو، موعاویە نەیپێکاوە، وەك لە شتی دیکەش دا نەیپێکاوە)، جا لە نێوان منو ئەودا، ئەو مشتومڕە بوو، ئەویش نامەی نووسی بۆ عوسمان، (دیارە ئەو کاتە عوسمان خوای لێ ڕازی بێ، حوکمڕانو خەلیفەی مسوڵمانان بووە، وە موعاویەش والی بووە لە شام)، سکاڵای لە بارەی منەوە بۆلا کرد، عوسمانیش نامەی بۆ نووسیم: کە وەرە بۆ مەدینە، منیش چووم بۆ مەدینەو خەڵك زۆر لەسەرم کۆبوونەوە، وەك پێشتر نەیانبینیبم، منیش

ئەوەم بۆ عوسمان باس کرد، گوتم: سەرم زۆر قەڵەباڵغەو خەڵك زۆر دێن بۆلام، ئەویش گوتی: ئەگەر پێت خۆشە بچۆ دەرێی مەدینە، بەلام نیزیك بە لێمان، زۆر لێمان دوور مەکەوە، ئەوە هۆکاری ئەوەیە کە من هاتوومە ئەم مەنزڵگایە، وە ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشەییشیان لەسەر کردبامە حوکمڕان، گوێم بۆ دەگرت و بە قسەم دەکرد.

کەواتە: هۆکاری ئەوە کە ئەبو ذەر لە ڕەبەذە ژیاوە، ئەوە بووە.

## ڕای بەندە لەبارەی کێشەی نێوان (أبو ذر)و (معاوية)ەوە:

شایانی باسە من وای تێدەگەم ئەبو ذەری غیفاریی کێشەکەی لەگەڵ موعاویەدا قووڵتر بووە، پێم وایە ئەبو ذەر تەماشای موعاویەی کردوە تەصەڕووف دەکات لە خەزێنەی مسوڵمانانادا (بیت المال)، بەملاولادا تەخشان و پەخشانی دەکات. ئەبو ذەڕیش لەسەر ئەوە لەگەڵی تێکگیراوە، وە تەماشای کردوە سەروەت و سامان وەسەر یەك دەنێ، ئیدی لەسەر ئەوە لەگەڵی تێکگیراوە، ئەگەرنا بۆچی لەگەڵ ئەبو بەکر تێکنەگیراوە؟ بۆچی لەگەڵ عومەر تێکنەگیراوە خوا لێیان ڕازی بێ. ئەوە لە لایەك.

پاشانیش کە دەگوترێ: هەر کەسێك زەکاتی ماڵی خۆیدا، هیچ هەقێکی دیکەی لەسەر پێویست نیە، لە حاڵەتی ئاسایی دا، ئەدی ئەگەر مسوڵمانان لێقەوماو بوون، دەوڵەمەندیشیان لە نێودا هەبوون، وە خەزێنەی دەوڵەتیش خاڵیی بوو، وە سوپا پێویستی پێی بوو، وە بۆ بەرگریی لە خۆ کردنی مسوڵمانان پێویستییان بە ماڵی دەوڵەمەندان بوون، ئایا بە زەکاتەکە ئیکتیفا دەکرێ، کە دوایی دوژمن بەسەر وڵاتدا بدات و، دەوڵەمەندەکان بە زەکاتیشەوەو بە ماڵ و سامانەکانیشیانەوە بفەوتێنێ؟

من ڕام وایە: بە تەئکید نەخێر، کە وەك لەوبارەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە شوێنەوارێکیان هێناوە، کە دەڵێ: {إِنَّ فِي الْمَالِ لَحَقًّا سوى الزَّكَاةِ} واتە: لە ماڵ و ساماندا، جگە لە زەکات، هەقی دیکەش هەیە، بەلام ئەوە لە حاڵەتی نائاسایی دا. ئەگەرنا لە حاڵەتی ئاسایی دا، دەوڵەمەندەکان زەکاتی خۆیان دەدەن، بەلام لە حاڵەتی نائاسایی دا کە دەوڵەت پێویستیی پێیەو، مسوڵمانان پێویستییان پێیە.

یان کەسێك کە دەوڵەمەندە، بەڵام لە دەوروبەری دراوسێیەکانی لە برسان دەمرن، یاخود زۆر ئاتاجن، ئەویش سەروەت‌و سامانی زۆری هەیە، ئایا تەنیا بەوە کە زەکاتەکە دەدا، بەرپرسیارێتیی لەسەر شان لادەچێ؟

پێم وایە نەخێر، چونکە ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنن‌و، تەنیا باسی زەکات ناکەن بۆ نموونە: ﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾الذاريات، واتە: لە سامانەکانیان دا ماف هەیە بۆ داواکەر (سواڵکەر)و بۆ بێبەش.

وە خوا ﷻ دەفەرموێ: بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾ الماعون.

وەك دەبینین: خوا هەڕەشە لە کەسانێك دەکات، کە هاوکاریی لە خەڵك دەگرنەوە، نەك تەنیا زەکات هاوکاریی گێڕانەوە لە مسوڵمانان، لە کاتێکدا کە پەکیان لەسەر تۆ دەکەوێ، تاوانە، چونکە ئەو کاتە، بە تەئکید ئەو ماڵ‌و سامانە کە خوا دەیدا بە تۆ، ئەمانەتێکە لەلای تۆو دەبێ لە بەرژەوەندیی کۆمەڵگاو خەڵکدا بەکاری بێنی.

وە من لە مەوسووعەی (خواپەرستیی ئیسلامیی) لە بەرگی سێ، لە باسی زەکاتدا، بە تەفصیلێ لەوبارەوە قسەم کردوە، وە ڕای زانایانم هێناوە، کە لە حاڵەتە نائاساییەکاندا، دەبێ دەوڵەمەندەکان هەست بە بەرپرسیارێتیی بکەن، بەرانبەر بە کۆمەڵگا، بەڵکو دەسەڵاتی شەرعیی بۆی هەیە بە زۆر، پێداویستیی خەڵکی دیکە لە ماڵ‌و سامانی وان، دابین بکات، مادام خەڵکێك هەبێ، وە دەوڵەتیش توانای نەبێ، بەتایبەتیی لە کاتی بەرگریکردنی لە قەوارەی ئیسلامییدا.

(إبْنُ تَیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: ئەو دەوڵەمەندانە ئەگەر هەندێك لە ماڵەکەیان بکەنە بەلاگێڕی باقی مسوڵمانان، خۆشیان‌و ماڵەکەی دیکەی خۆیشیان

کە دەمێنێتەوە، باشترە وەك لەوەی کە دوژمن بەسەریان دا بدات و هیچیان نەمێنێ.

کە بە تەئکید ئەوە ڕای ڕاستە، ئەوەی ئەبو ذەریش خوای لێ ڕازی بێ، پێم وایە کێشەکەی قووڵتر بووە لەگەڵ موعاویەدا، وەك گوتم: موعاویە هەڵسوکەوتی ناشەرعییانەی لە ماڵ و سامانی (بیت المال)دا کردوە، لەسەر ئەوە زیاتر لەگەڵی تێکگیراوەو ڕەخنەی لێگرتوە، وە لە ڕاستییدا ئەگەر هەر ئایەتێکیش کە لە قورئاندا هاتوە، لە سیاقێکدا کە باسی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات، بگوترێ تایبەتە بەوانەوە، ئەوە وەك حذیفەی یەمانیی گوتوویەتی: ﴿نِعْمَ الإِخْوَةَ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيل، إِنْ كَانَ لَكُمْ كُلَّ حُلْوَة، وَلَهُمْ كُلَّ مُرَّة!! ﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٣٢١٨)، وَقَالَ صَحِيح الإِسْنَاد، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي}[1].

واتە: بەنی ئیسرائیل باشترین بران بۆ ئێوە، ئەگەر هەموو شتێکی شیرین بۆ ئێوەبێ و، هەموو شتێکی تاڵیش بۆ ئەوان بێ!

دیارە ئەو لەو سیاقەدا وایگوتوە، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (المائدة)دا هێنامان، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾المائدة، لەوێدا وایگوتوە، کە ئەوە بەڵێ لە سیاقێکدا دەربارەی ئەهلی کیتاب قسە دەکات، بەڵام بە تەئکید مسوڵمانانیش دەگرێتەوە، وە خوای پەروەردگار بۆیە بۆ مسوڵمانانی باس دەکات، کە ئێوەش وەك وان مەبن، ئەگەرنا هەمان هەڕەشە، کە ئەوان دەگرێتەوە، ئێوەش دەگرێتەوە، وە ئێمە مافی ڤیتۆمان نیە لە بەرانبەر خوای دادگەرو، لە بەرانبەر قانوونەکانی خوادا.

کە دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾، موژدەیان پێ بدە بە ئازارێکی بە ئێش، بێگومان ئازار هەر بە ئێشە، بەڵام وا دیارە ئەو ئازارە زۆر ئێشدارو بە ژانە.

---

١) روح المعاني: ج ٣، ص ٤٤٤. ئەو سێ ئایەتە لەلای حوزەیفە خوێنرانەوە (کە باسی ئەوە دەکەن، کە کەسێك حوکم نەکات بەوەی خوا ناردوویەتە خوار، کافرن، ستەمکارن، لارێن) پیاوێك گوتی: ئەوە دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتە خوارێ، حوزەیفەش گوتی: {نِعْمَ الإِخْوَةَ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيل...}

بۆیە خوا ﷻ بە وشەی ﴿أَلِيمٍ﴾، وەسفی دەکات، هەڵبەتە موژدەش بۆ شتی خۆشە، بۆیە ئەمە دوو واتای لێ وەردەگیرێن:

١/ واتە: ئەگەر ئەوان موژدەو دڵخۆشییەك هەبێ بۆیان، ئەوەیە: كە هەواڵی ئازاری بە ئێشییان پێ بدرێ.

٢/ یاخود ئەوە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن، وەك تۆ دوای ئەوەی کە زۆرت ئامۆژگاریی کەسێك کردوەو بە قسەی نەکردووی، پێی دەڵێی: دە بخۆ دەی، هەڵگرەوە، وەك جۆرێك لە گاڵتە پێکردنو شەماتە پێکردن.

ئنجا ئایا ئەو موژدە پێدانی ئازاری بە ئێش، کەیو لە کوێدایە؟

خوای بەرز لە ئایەتی دوای ویدا ڕوونی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ﴾، ئەو سزایە دەچێژن لە ڕۆژێکدا ﴿يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾، کە ئەو زێڕو زیوە گەرم دەکرێو سوور دەکرێتەوە لە ئاگری دۆزەخدا، نەیفەرموە: (تُحْمَى) خۆی گەرم دەکرێ، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿يُحْمَىٰ عَلَيْهَا﴾، ئاگری دەخرێتە سەر، ئنجا شتێك بۆخۆی گەرم بکرێ جیایەو، ئاگری بخەیە سەرێو بنەوەو سەرەوەی گەرم دابێنیو سووری بکەیەوە، جیایە، ئەوە دیارە ماناکەی زۆر بەهێزترە، ئنجا لە کوێشدا؟ لە ئاگری دۆزەخدا!

ئنجا زانایان گوتوویانە: بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا﴾، خۆ لەوێدا دوو شتی باس کردوون: ﴿الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ﴾، بۆچی نەیفەرمووە: (يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيهِمَا)؟!

دەڵێ: چونکە کۆی زێڕو زیوەکە، کۆی دراوەکە کە پەزمەندە دەکرێ بە مێ (مُؤَنَّث) دادەنرێ، چونکە: (كُلُّ جَمْعٍ مُؤَنَّثٌ) بەو ئیعتیبارە ڕاناوی مێینەی بۆ بەکارهێناوە، کە دیارە مێینەی مەجازییە.

ئنجا ئایا بۆچی ئاگری دەدرێتە بەرو، سوور دەکرێتەوەو گەرم دادەهێنرێ؟

﴿فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ﴾، ﴿فَتُكْوَىٰ بِهَا﴾.

واتە: پێی داخ دەکرێ، نێوچەوانەکانیان، لا تەنیشتەکانیان، پشتەکانیان.

(جِبَاه)، کۆی (جَبْهَة)یە، دەڵێ: (مَوْضِعُ السُّجُودِ مِنَ الرَّأْسِ) ئەو شوێنەی سەر، کە سەجدەی پێ دەبردرێ.

(جُنُوب)یش کۆی (جَنْب)ە، (جَنْب) واتە: تەنیشت کە ئینسان دوو (جَنْب)ی هەن، ڕاستو چەپ.

(ظُهُور)یش کۆی (ظَهْر)ە، (ظَهْر) واتە: پشت، پێچەوانەی (بطن)ە، واتە: سك.

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ رَجُلٍ لا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ، إِلاَّ جُعِلَ لَه يَومَ الْقِيامَةِ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ، فَيُكْوَى بِها جَنْبُهُ وَجَبْهَتُهُ وَظَهْرُهُ فِي يَومٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ العبادِ، ثُمَّ يُرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النارِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٨٩٦٥)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٩٨٧)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (١٦٥٨)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٢٤٤٢)}.

واتە: هیچ پیاوێك نیە زەکاتی ماڵو سامانی خۆی دەرنەکات، مەگەر ڕۆژی قیامەت ئەو ماڵو سامانە، بۆی دەکرێتە چەند لەوحێکی لە ئاگردا سوورەوەکراو. پاشان لاتەنیشتیو نێوچەوانیو پشتی پێی داخ دەکرێ، لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا دادوەریی دەکرێ لە نێوان بەندەکاندا، ئنجا دوای ئەوە ڕێیەکەی خۆی پێشان دەدرێ، یان بەرەو بەهەشت، یاخود بەرەو دۆزەخ. {ئەگەر بەو سزایەش پاك نەبووبێتەوە، یاخود گوناهی دیکەشی هەبن}.

زانایان باسیان کردوە، کە بۆچی خوای کاربەجێ ئەو سێ ئەندامەی باس کردوون؟ (جبهة، جنب، ظهر) (نێوچەوان، تەنیشت، پشت) زۆر شتیان گوتوە دەگونجێ بڵێین:

١ - نێوچەوانیان داخ دەکرێ، لەبەرئەوەی کە نێوچەوانی خۆیان گرژ کردوە، لە هەژارانو نەداران، کاتێك داوای هاوکارییان لێکردوون، خۆیان مۆنو مرج کردوە.

٢ - وە بۆیە کەلەکەو لاتەنیشتیان، داخ دەکرێن، لەبەر ئەوەی کە ئەوانە کاتێك کە خەڵك داوای هاوکاریی لێ کردوون، کەلەکەو تەنیشتیان لە خەڵك کردوەو

ڕوویان لێ وەرسوڕاندوون، یاخود لەبەر ئەوەی کە لەسەر ئەو لاتەنیشتانە لەسەر جێی نەرمو گەرم زۆر خەوتوون، بە ماڵی حەرام، وە مافی خەڵکو هەژارو نەداریان لە ماڵەکەی خۆیان دەرنەکردوە.

٣ ـ وە پشتیان، داخ دەکرێ لەبەرئەوەی کە پشتیان لە هەق کردوە، پشتیان لە هەژارو نەداران کردوەو، پشتیان لە مافی خەڵك کردوە؟

فریشتەکانیش پێیان دەفەرموون: ﴿هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ﴾، واتە: ئەمە سزای ئەوەیە کە خۆتان پاشەکەوتتان دەکردن، پەزمەندەتان دەکردو خڕتان دەکردەوە سەریەك، ﴿فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾، واتە: سزای ئەوەی کە خڕتان دەکردەوە سەریەك، بچێژن.

هەڵبەتە وەك باسمان کرد، ئەوە هی کەسانێکە کە ئەو سەروەتو سامانە کە خڕی دەکەنەوەو پەزمەندەی دەکەن، هەقی خواو خەڵکی لێ دەرناکەن، ئەگەرنا دەوڵەمەندیی و سەروەتو سامان هەبوون لە ئیسلامدا، شتێکی خراپ نیە، وەك پێشتریش باسمان کردوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿نِعْمَ الْمَالُ الصَّالِحُ لِلرَّجُلِ الصَّالِحِ﴾ {رَوَاهُ البُخَارِيُّ، فـي (الأدب المفرد) (٢٩٩)، وَأَحْمَدُ، (١٧٨٣٥)، وغيره عَنْ عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ ﷺ، وَقَالَ الأَلباني: إِسنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِم).

واتە: باشترین شت ماڵی حەڵاڵە بۆ پیاوی چاك، بەڵێ، ئیسلام نیعمەتەکانی دنیا بە خراپ دانانێ، بەمەرجێ بە حەلاڵیی وەدەست بێن، وە لە سنووری شەرع دا سوودیان لێ ببینرێ.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: لە ئایەتی ژمارە (٣٦)دا خوای زاناو شارەزا باسی مەسەلەیەکی دیکە دەکات، کە کافرەکانو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لادانێکی زۆریان تێدا کرد بوو، ئەویش مەسەلەی مانگەکانە، مانگەکانی ساڵ، بۆیە خوا ﷻ لەم ئایەتەدا ئەو مەسەلەیە ڕاست دەکاتەوە، چونکە قورئان هەمیشە ئەو شتانەی کە خەڵك تێیان دا لایداوەو لار بووە، ڕاستی کردوونەوە، جا چ هی جوولەکەو نەصرانییەکان بن، چ هی هاوبەش بۆ خوا دانەران بن، هی خەڵك بە گشتی بن،

چ لە بواری سیاسیی، چ لە بواری کۆمەڵایەتیی، چ لە بواری ئابووریی دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ ﴾.

واتە: بێگومان ژمارەی مانگەکان (واتە: مانگەکانی ساڵ) لە لای خوا دوازدە مانگن لە نووسینی خوادا، {لە بڕیاری خوادا، یان لەو تۆمارگایەدا کە خوا هەموو شتەکانی خۆی تێدا تۆمار کردوون: لە (اللوح المحفوظ)} هەر لەو ڕۆژەوە کە خوا ئاسامانەکانو زەوی بەدی هێناون، چواریان جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، بۆیە ستەم لە خۆتان مەکەن لەو چوار مانگەدا.

لەوبارەوە با سەرەتا ئەم فەرموودەیە بێنین:

﴿عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ فِي حَجَّتِهِ، فَقَالَ: ألا إِنَّ الزَّمَانَ قَدْ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَومَ خَلَقَ اللهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنا عَشَرَ شَهْرًا، مِنْها أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقِعْدَةِ وَذُو الْحِجة وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ، الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٠٤٠٢)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٥٢٣٠)، وَمُسْلِمٌ. برقم: (١٦٧٩)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (١٩٤٧)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضا ابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٥٩٧٤)}.

واتە: ئەبی بەکرە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەو حەجەدا کە کردی، وتاری داو فەرمووی: ئاگاداربن! ڕۆژگار سووڕاوەتەوە، وەك ئەو کاتەی کە خوا ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون، هاتۆتەوە شوێنی خۆی، ساڵ دوازدە مانگە، چواریان حەرامن، (واتە: جەنگیان تێدا قەدەغەیە)، سێیان بە دوای یەکدان (ذُو الْقِعْدَةِ وَذُو الْحِجة وَالْمُحَرَّم)، وە (رجب)یش بە تەنیایە، بە پێی سەرژمێری هۆزی (مُضَر) کە دەکەوێتە نێوان (جُمَادَى وَشَعْبَان).

لەبەر ئەوەی کە عەرەب (ربیعة و مُضَر) بوون، (ربیعة) جۆرێك لە سەرژمێری دیکەیان هەبووە، بۆ مانگەکان (رَجَب)یان لە نێوان (جُمَادَى وَ شَعْبَان)دا دانەناوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دیاریکردوە کە ئەوەی (مُضَر) ڕاستە.

ئایا لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بووە؟

بێگومان ئەگەر بێتو ئێمە لە سیرەو ژیانی نەکۆڵینەوە، نازانین پێغەمبەر ﷺ بۆچی هەندێك شتی فەرمووە؟!

ئێستا ئەوەی کە دەفەرموێ: ﴿وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ﴾ کە (جَمادی)یشی پێ دەڵێن، (جُمَادَى)شی پێ دەڵێن، بۆیە دیاریی کردوە، چونکە دیارە (رَجَب) لەلای (ربیعة) بە جۆرێکی دیکە دانراوە لە ڕیزبەندیی مانگەکاندا.

ئەدی بۆچی لێرە دەفەرموێ: ڕۆژگار وەك ئەو کاتەی کە خوا دنیای دروست کردوە، ئاسمانەکانو زەوی هێناونە دی، وەك خۆی لێ هاتۆتەوە؟

چونکە عەرەبەکان عادەتیان وابوو، مانگەکانیان دەستکاریی دەکرد، دەڵێن: هەندێك ساڵیان دەکردە سێزدە (١٣) مانگ، دوایی لە ساڵی داهاتوودا مانگێکیان کەم دەکردەوە، بۆ ئەوەی جووت بێتەوە، یاخود لە چوار مانگە قەدەغەکان، ئەگەر مانگێك زانیبایان پێویستییان بە شەڕ هەیە، دەیانگوت: ئەو مانگەمان حەڵاڵ کرد، وە مانگێکی دیکەیان قەدەغە دەکرد!

وە ئەو ساڵە کە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، حەجی کردوە، لە (ذُو الْقِعْدَةِ)دا حەجی کردوە، واتە: لە (ذُو الْقِعْدَةِ)دا لە عەرەفاتدا ڕاوەستاوەو، مەناسیکی حەجی جێبەجێ کردوون، بۆچی؟

چونکە عەرەبەکان وایان دەستکاریی کردبوو بە پێی عورفو باوی ئەوان (ذو القعدة) ببووە (ذو الحجة).

ڕیزبەندییەکەیان تێکداوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ئەو ساڵە، نەچووە بۆ حەج، چونکە دوایی لەو ساڵەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەجی کرد، کە ساڵی دە (١٠)یەمە، ڕیزبەندییەکە هاتبووەوە شوێنی خۆی، وە لەبەر هۆکارێکی دیکەش کە پێشتر باسمان کردوە، کە موشریکەکان بە ڕووتیی بە دەوری کەعبەدا طەوافیان دەکرد.

## مانگە عەرەبییەکان، مانگە مانگییەکان (الأشهر القمرية)

دیارە ئەمانە ناوەکانیانن: (محرم، صفر، ربیع الأول، ربیع الثاني، جمادی الأول، جماد الثاني، رجب، شعبان، رمضان، شوال، ذُوالْقَعِدَةِ، ذو الحجة).

(السخاوي) لە نامیلکەیەکی دا بە ناوی: (المشهور فِي أسماء الأيام والأشْهُر) کە (ابْنُ کَثِير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا لێیەوە نەقڵ دەکات، وەك لە: (المصباح المنير فِي تهذيب تفسير ابن كثير)[1]دا هێناویەتی، هۆی ناونرانی مانگەکان، وە پاشان چۆنیەتی کۆکرانەوەیان بەم شێوەیە دێ:

یەکەم (محرم): کە بە (مُحَرَّمون، محرَّمات، ومحاريم)، واتە: بە سێ جۆر کۆ دەکرێتەوە بۆچی ناوی لێنراوە (محرم)؟

لەبەرئەوەی کە مانگێك بووە جەنگی تێدا قەدەغە کراوە، یاخود بۆ داکۆکی کردن لەسەر ئەوە کە جەنگی تێدا قەدەغە کراوە.

دووەم (صفر): کە بە (أصفار) کۆ دەکرێتەوە، بۆچی ناوی لێنراوە (صفر)؟

چونکە ئەو مانگە ئەوکاتە کە ناویان لێناوە، عەرەبەکان ماڵەکانی خۆیان چۆڵ کردوە، بەوە دەگوترێ: (صَفِرَ المَكانُ إِذَا خَلاَ)، شوێنەکە چۆڵ بوو.

سێیەم (ربیع الأول): کە بە (أربعاء) وە (أربعة) کۆ دەکرێتەوە.

لەبەر ئەوەی ئەو کاتەی ئەو ناوەیان لەو مانگە ناوە، لە مەنزڵگاکانی خۆیاندا نیشتەجێ بوون (لاِرتباعهم فِيهِ، ارتَبَعَ فِي المَكان: أقام)، واتە: نیشتەجێ بوون، وە بەملاولادا نەچوون.

چوارەم (ربیع الثاني): ئەمیش وەك هی یەکەمە.

---

١) ص ٥٦٦، ٥٦٧ .

پێنجەم (جُمَادَى الأول): کە بە (جُمادى الأول)، وە (جُمادى الأولى)ش دێ، واتە: هەم بە (مُذَکَّر)، وە هەم بە (مُؤَنَّث) دێ، وە بە (جُماديات) کۆ دەکرێتەوە.

بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە لەو کاتەدا ئاو بەستوویەتی، دیارە لە کاتی ناونرانی یەکەمی ئەو مانگەدا، ئەگەرنا مانگە عەرەبییەکان لەگەڵ هەموو کەشەکانی ساڵدا دەسوورێن.

شەشەم (جُمَادى الثاني): یان (جُمَادى الثانية): ئەویش بە هەمان شێوە.

حەوتەم (رَجَب)، کە بە (أَرْجَاب) وە (رِجَاب) وە (رَجَبَات)، واتە: بە سێ جۆر کۆ دەکرێتەوە، ئەویش لە چییەوە هاتوە؟

دەڵێ: (الترجيب: التَّعظِيم)، چونکە خوای پەروەردگاریان تێدا بە مەزن گرتوە.

هەشتەم (الشعبان)، بە (شعابيب) وە (شعبانات) بە دوو شێوە کۆ دەکرێتەوە.

ئەویش لەوەوە هاتوە (مِنْ تَشَعُّبِ القَبَائِلِ فيه) لەو مانگەدا هۆزەو تیرەکان لێك بڵاوبوون.

نۆیەم (رمضان)، کە بە (رمضانات) وە بە (رماضين) وە (أرمضة) واتە: بە سێ جۆر کۆدەکرێتەوە لە چییەوە هاتوە؟

وشەی (رمضاء)، واتە: گەرما، دەگوترێ: (رَمِضَ الفِصَالُ إِذَا عَطَشَ)، (فِصَال) واتە: بەچکە حوشتر کە تینووی دەبێ‌و دەبێتە (رمضاء)،( رَمِضَ) واتە: گەرمای بوو، (رمضاء) واتە: زۆر زۆر گەرم، دیارە ئەو کاتە کە ئەو مانگە ئەو ناوەی لێنراوە، کاتێکی گەرم بووە، دەبێ هاوین بووبێ، یان تەمووز بووبێ.

دەیەم (شوال)، کە بە (شواول)و (شواويل) وە (شوالات)، ئەمیش بە سێ جۆر کۆ دەکرێتەوە، لە چییەوە هاتوە؟

(من شالتِ الإبلُ أذنابَها لتُطْرَق) کە حوشتر کلکی بەرز دەکاتەوە لە کاتی جووت بووندا.

یازدەیەم (ذو القعدة): کە بە (ذوات القَعدة) کۆ دەکرێتەوە.

(لقعودهم من الترحال)، لەبەرئەوەی لەو مانگەدا، ئەو کاتەی ئەو ناوەیان لێناوە، وازیان لە کۆچ و کۆچباریی هێناوەو، لە شوێنی خۆیان نیشتەجێ بوون.

دوازدەیەم (ذو الحجة)، کە بە (ذوات الحجة) کۆ دەکرێتەوە.

لەبەر ئەوەی کە لەو مانگەدا، زۆربەی مەناسیکی حەجیان ئەنجامداوە، بە تایبەت ڕاوەستان لە عەرەفە.

## ناوی حەوت ڕۆژەکانی هەفتە

یەك شەم (الأحد): کە بە (آحاد) وە بە (أوحاد) وە بە (وحود) کۆدەکرێتەوە.

دوو شەممە (الإثنين): بە (الأثاني) کۆدەکرێتەوە.

سێ شەممە (الثلاثاء): کە بە (الثلاثاءات)، وە بە (أثاليث) کۆدەکرێتەوە.

چوار شەممە (الأربعاء): کە بە (الأربعاوات) و (أرابيع) کۆدەکرێتەوە.

پێنج شەممە (الخَمِيس): کە بە (أخمس)و(أخاميس) کۆدەکرێتەوە.

هەینی (الجُمُعَة): کە بە (الجُمع) و (جُمَاعَات) کۆدەکرێتەوە.

شەممە (السبت): دەڵێ: (السَّبْتُ: وَهُوَ القَطْع لإنتِهاء العَدَدِ) لەبەرئەوەی لێرە ژمارەی ڕۆژەکان کۆتایی دێ، ئەویش بە (أسبت) و (سبوت) کۆ دەکرێتەوە.

شایانی باسە: لێرەدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ژمارەی مانگەکان لە ساڵدا لە لای خوا ﷻ دوازدە (١٢)ن، دەگونجێ مەبەست پێی مانگەکانی ساڵی خۆریی، (السنة

الشمسية)ش بێ، بەڵام بە پێی سیاق دەزانین، وە بە پێی عورف باوی نەتەوەی عەرەبیش، کە زیاتر بە مانگە عەرەبییەکان، یان مانگە قەمەرییەکان حیسابو کتابیان کردوە، دەزانین کە مەبەست پێیان ئەو مانگانەیە کە بە مانگ (قمر) حیساب دەکرێن، واتە: (السنة القمرية).

دیارە مانگ بە گشتی، سێ حاڵەتی هەن: (هلال) و (بدر) و (مُحاق)، خاوەنی (مختار الصحاح) دەڵێ: (هلال: أولُ الليلة، والليلة الثانية والثالثة) هەرسێکیان شەوی یەك شەوەو، دوو شەوەو، سێ شەوە، پێیان دەگوترێ: (هلال) کە بەقەدەر دەمە داسێکی بچووکە.

ئنجا دوایی پێی دەگوترێ: (القمر) هەتا دەبێتە پازدە، لە پازدە کە تەواو دەبێو، جێخونکە دەکات، پێی دەگوترێ: (بدر)، دەڵێ: (بَدر القَمَر أي إكْتَمَلَ) تەواو بوو، ئنجا لە دوای ئەوە، هەر (قمر)ی پێی دەگوترێ، تاکو دەگاتە حاڵەتی (مُحاق)، کە لە (مَحْق)ەوە هاتوە، واتە: لەبەین چوونو نەمان، هەتا سێ شەوی کۆتایی، واتە: ئەگەر مانگەکە سی پڕ بێ (٢٨، ٢٩، ٣٠)، ئەگەر (٢٩)ش بێ لە (٢٧، ٢٨، ٢٩)، مانگ پێی دەگوترێ: (محاق).

پێشتریش هێنامان کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾، هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: واتە: لە قورئاندا، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، چونکە لەو کاتەوە کە خوا ئاسمانو زەوی دروست کردوون، قورئان لەبەردەستی ئێمەدا نەبووەو، کتێبەکانی دیکەش نەبوون، دوایی خوای پەروەردگار کتێبەکانی دیکەی دابەزاندوون، وە قورئان دوایین کتێبی خوای پەروەردگارە.

ئنجا ﴿ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾:

١ / دەگونجێ لێرەدا (كِتاب)، چاوگ (مصدر) بێ، واتە: (فِي كِتابة الله) لە نووسینی خوادا، کە لەلای خۆی بڕیاری داوە.

٢ / یاخود (فِي حكم الله) یانی: لەو سیستەمو یاسایەدا کە خوا دایناوە بۆ ژیانی بەشەر.

٣ / وە دەشگونجێ مەبەست لە (کتاب) لێرەدا لە (اللَّوْح المَحْفوظ)بێ، کە ئەو دروستکراوە گەورەیەیە کە خوای زاناو توانا هەموو زانیارییەکانی خۆی کە پەیوەندییان بە دروستکراوەکانی خواوە هەیە، لەوێدا تۆماری کردوون.

٤ / یاخود لە نەخشەدانان و ئەندازەگیریی خوای بالادەست دا، دەگونجێ هەر کام لەم مانایانەی هەبێ.

کە دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾، واتە: لە سەرەتاوە، هەر لەو ڕۆژەوە خوا ئەم کەون و کائیناتەی داناوە.

خۆر یەك سووڕ بە دەوری خۆیدا تەواو کردوە، لە ماوەی دوازدە (١٢) مانگدا، هەروەها مانگیش دوازدە (١٢) جار بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، لە ماوەی ساڵێکداو، لە ئەنجامدا دوازدە (١٢) مانگەکان پەیدا دەبن، کە دیارە مانگی خۆریی و. مانگی مانگییش (١٠، ١١) ڕۆژیان جیاوازیی هەیە، هەر بۆیەش ساڵی کۆچیی (ساڵی مانگیی) دەسووڕێ لە هەموو کەشەکانی ساڵدا، بەڵام ساڵی خۆریی هەر لە شوێنی خۆیەتی.

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٌ﴾، بە تەئکید مەبەست لەو چوار مانگە قەدەغەکراوانەیە، کە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، ئنجا دیارە جەنگ لە مانگەکانی دیکەش دا هەر قەدەغە بووە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوە بووە کە جەنگێك بۆ شت ڕەوا بێ، بیکەی، هەر نابێ لەو مانگانەدا بیکەی، یانی: لایەنی کەم. با سێیەك (١/٣)ی ساڵ خەڵك پشوویان هەبێ، لە یەك ئەمین بن و، بتوانن. بەملاولادا بچن، لەیەك دڵنیابن، هێمنیی و ئاسایش هەبێ، بۆ ئەوەی بازرگانیی بکەن، کارو کەسابەت بکەن، سەفەر بکەن، ئەگەرنا لە هەموو مانگەکاندا، شەڕو دەستدرێژیی هەر قەدەغەیە.

هەڵبەتە ئەوەش زانایان مشتومڕێکی زۆریان لەبارەوە کردوە، وە من لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا لە سوورەتی (البقرة)دا هێناومە، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ

كَبِيرٌ ﴿٢١٧﴾ ﴾، واتە: دەربارەی مانگە حەرامەکان، پرسیارت لێدەکەن، جەنگ تێیان دا چۆنە؟ بڵێ: جەنگ تێیدا (گوناهێکی) گەورەیە، بەڵام ئایا ئەوە نەسخ بۆتەوە؟ یاخود هەر ماوە؟ بە تەئکید ڕای زیاتری زانایان وایە کە نەسخ نەبۆتەوە، ئەدی بۆچی پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە جەنگەکانی، لە مانگە حەرامەکاندا کردوون؟

زانایان، دەڵێن لەبەرئەوەی کە لەو کاتانەدا، هێرش کراوەتە سەر مسوڵمانان، واتە: جەنگ لەو مانگانەدا قەدەغەیە، کە تۆ دەست پێشخەر بی، بەڵام ئەگەر دەست درێژییت بکرێتە سەر، بەرگریی لە خۆ کردن قەدەغە نیە، ئەم ڕایەش ڕێککەوتن (توفیق) دەکات لە نێوان ئەو دەقانەدا، کە هەندێکیان وا دەگەیەنن: جەنگ لەو مانگانەدا هەر لە جێی خۆی بێ‌و، قەدەغەبێ، هەندێکیش وا دەگەیەنن: کە جەنگ لەو مانگانەدا، ڕەوا بێ، قەدەغەی لەسەر لاچوو بێ، ئەویش بەوە کە بگوترێ: جەنگی هێرش بەرانە قەدەغەیە، بەڵام جەنگی بەرگرییکارانە، قەدەغە نیەو ڕەوایە.

بۆیە خوای پەروەردگار هەر لەو ئایەتەی سووڕەتی (البقرة)شدا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ... ﴿٢١٧﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: جەنگ لەو مانگانەدا گەورەیە (قەدەغەیە)، بەڵام خەڵك لە ڕێی خوا لادان، وە ڕێگرتن لە مزگەوتی حەرام، وە کوفر پێکردنی، لەلای خوا گەورەترە، وە ئازاردانی مسوڵمانان لەلای خوا، گەورەترە (لە جەنگ کردن لەو مانگە قەدەغانەدا).

چونکە ئەو مانگانەش بۆیە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، لەبەر بەرقەرارکردنی هێمنیی‌و ئاسایش‌و ئازادیی خەڵك، ئنجا کەسێك ئەو مانگانە ئیستیغلال بکات‌و مسوڵمانانی تێدا ئەزیەت بداو، هێرشیان بکاتە سەرێ، ئەوە مسوڵمانان بۆیان هەیە بەرگریی لە خۆیان بکەن.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾، ئا ئەوە بەرنامەی ڕاستە.

واتە: بەرنامەی ڕاست ئەوەیە، کە ئەو شتانەی کە خوا دایناون، پابەندییان پێوە بکرێ، نەك گوڵبژێر بکەین، وەك خوای کاربەجێ دەربارەی ئەهلی کیتاب دەفەرموێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ﴿٨٥﴾﴾البقرة.

واتە: ئایا بڕوا بە هەندێك لە کتێبی خوا دێنن، وە کوفریش بە هەندێکی دەکەن؟

نابێ گوڵبژێر بکەین، بەڵکو دەبێ پابەندبین بە بەرنامەی خواوە، چ ئەو پابەندییە لە بەرژەوەندییماندا بێ، یاخود بە ڕواڵەت لە زەرەرمان بێ، بەو واتایە لە زیانماندابێ: کە بەرژەوەندییەکی ناشەرعیی، یان زووتر تێپەڕ، لەدەست دەچێ. بەهۆی پابەندیی بە شەرعەوە، نابێ گوڵبژێر بکەی، لەو کاتانەدا کە پێت خۆشە. پابەند بیو، لەو کاتانەشدا کە پێت ناخۆشە، پابەند نەبی، یان لەو کاتانەدا کە بە قازانجی دەزانی، پابەند بی، بەڵام کە زانیت بە قازانجت نیە، لێی لادەیا ئەوە دینداریی ڕاست نیە، دینداریی ڕاست ئەوەیە، دەبێ لە هەموو حاڵەتێکدا. پابەند بێ بە شەریعەتی خواوە.

کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾، بە تەئکید مەبەست ئەو چوار مانگەیە، واتە: لەو چوار مانگەدا ستەم لە خۆتان مەکەن، دەستدرێژیی مەکەنە سەر یەکدی، دەستپێشخەریی مەکەن، بەڵام ئەگەر کەسێك هێرشی کرایە سەرو پەلاماری درا، دیارە بەرگریی لەخۆ کردن، لە هەموو حاڵاندا ڕەوایە.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾، واتە: لەو دوازدە (١٢) مانگەی ساڵدا، هەڵبەتە ڕاستە لە دوازدە (١٢) مانگەکەی ساڵیشدا. نابێ ستەم لە خۆمان بکەین، وە نابێ دەستدرێژیی بکرێ، بەڵام وا پێدەچێ. مەبەست پێی ئەو چوار مانگە بێ، کە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، بۆچی؟

لەم بارەوە با ئەم ڕایەی (طبري) ببینین دەڵێ: {وَأَوْلَى الأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ عِنْدِي بالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ﴾، فِي الأَشْهُرِ الأَرْبَعَةِ، أَنْفُسَكُم. باستحْلَالِ حَرَامِهَا، فَإِنَّ اللهَ عَظَّمَهَا وَعَظَّمَ حُرْمَتَهَا، وَذَلِكَ أَنَّ العَرَبَ تَقُولُ فِيمَ بَيْنَ الثلاثة إِلى العَشْرَةِ، إِذَا كَنَتْ عَنْهُ: (فَعَلْنا ذَلِكَ لِثَلاثِ لَيالٍ خَلَوْنَ، وَلأَرْبَعة

أَيـام بَقِـين)، وَإِذَا أَخْبَرَتْ عَمَّا فَوْقَ العَشَرَةِ إِلى العِشْرِين، قَالَتْ: "فَعَلْنا ذَلِكَ لِثَـلاثَ عَشَرَةَ خَلَتْ، وَلأَرْبَع عَشَرَة مَضَتْ، فَهُوَ مُخْرَج عَـدَدَ جَـبْر}[1].

دەڵـێ: ڕاسـتترینو لـە پێشـترین ڕا لـەلای من، قسەی ئـەوانەیە کـە گوتوویـانە: ﴿ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡ ﴾، واتە: لەو چوار مانگانەدا، ستەم لە خۆتان مەکەن، ئەویش بەوەی ئەوەی تێیاندا قەدەغە کراوە، بۆ خۆتانی ڕەوا بکەن، چونکە خوا ئەم چوار مانگەی بە گەورە گرتوون، وە حورمەتی ئـەو چوار مانگەی بە گەورە داناوە، وە بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، ئەمەیە کە عەرەب ئەگەر لە سێیەوە هەتـا دە، بیانەوێ قسەی لەوبارەوە بکەن دەڵێن: (فعلنـا ذَلِكَ لِثَـلاثَ لَيـالٍ خَلَوْنَ، وَلأَرْبَعَة أيـام بَقِـينَ)، ئەو شتەمان ئەنجام دا، سێ دوای ئـەوەی کە سێ شـەو تێپـەڕی بوون، وە دوای ئـەوەی کە چـوار ڕۆژ مابوون (لـە فلان مانگـە، یـان لە فلان هـەفتـە)، بـەڵام ئـەگـەر بیـانەوێ قســە بکەن دەربـارەی دە (١٠) تـاکـو بیسـت (٢٠)، دەڵێـن: (فَعَلْنـا ذَلِكَ، لِثَلاثَ عَشَـرَةَ خَلَتْ، وَلأَرْبَع عَشَرة مَضَتْ) واتە: ئەو کارەمان ئـەنجامدا، دوای ئـەوەی سێزدە شـەو تێپـەڕین، وە چواردە ڕۆژ تێپەڕین.

بۆیــە لێـرەدا کــە دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡ ﴾، ﴿فِيهِنَّ ﴾، لێرەدا بۆ لای کـەمەکـەیـە.

واتە: لـە نێوان (٣ تـا ٩)دایـە، کەواتە: مەبەست چوار مانگە حەڕامەکـانن، چونکە ئەگـەر مەبەست پێی دوازدە (١٢) مانگەکان بوونایـە، دەیفـەرموو: (فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهـا أَنفُسَكُمۡ )، چونکە (فیهـا)، بۆ دە (١٠) بە پشـتـەوەیـە، بـەڵام ﴿فِيهِنَّ ﴾، بـۆ (٣ تاکو ٩)یە.

ئـەو ڕسـتـەیـەش کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗ ٣٦ ﴾، وە لـە دژی هـاوبەش بۆ خـوا دانـەرەکان، بجەنگن بـە تێکڕا، وەك چۆن ئـەوان بە تێکڕا، لـە دژتـان دەجـەنگن.

١) جامع البيان، ج ٦، ص ١٣٤.

وشەی: ﴿كَآفَّةً﴾، واتە: (جَمِيعَاً) هەمووتان، هەڵبەتە هەندێك لە توێژەران ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً﴾: وە لە دژی تێکڕای هاوبەش بۆ خودا دانەرەکان بجەنگن، وەك چۆن ئەوان لە دژی تێکڕاتان، دەجەنگن. بەڵام بە تەئکید ئەو مانایە ڕاست نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: (وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ جميعُكم كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ جميعُهم)، هەمووتان لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بجەنگن، هەروەك ئەوان هەموویان لە دژتان دەجەنگن. بۆچی دەڵێین وایە؟

چونکە ڕاستە لە ڕووی زمانەوانییەوە، دەگونجێ ﴿كَآفَّةً﴾، پەیوەست بێ بە (فاعل)ەوە وەك ئێمە گوتمان: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟﴾ ﴿كَآفَّةً﴾، بە (واو)ەکەوە. پەیوەست بێ، واتە: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ جميعُكم ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، وە دەشگونجێ ﴿كَآفَّةً﴾ پەیوەست بێ بە (مفعول)ەکەوە: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً : أي جميعَهُم﴾، ئنجا هەرچەندە لە ڕووی زمانەوانییەوە، ئەوە ڕاست بێ. بەڵام ئەوەی ڕێمان لێ دەگرێ لەوە، ئەو حەقیقەتە شەرعییەیە، کە ئێمە شەریعەت ڕێی نەداوین دژی هەموو موشریك و کافران بجەنگین.

خوای دادگەر لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾.

واتە: وە لە دژی ئەوانە بجەنگن: کە لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژی مەکەن، خوا دەستدرێژیکارانی خۆش ناوێن.

واتە کەسێك شەڕتان لە دژ ناکات، ئێوە یەخەی مەگرن و، بەهانەی پێ مەگرن.

هەروەها پێشتـر باسمان کرد، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ ﴾التوبة.

دوای ئـەوەی نەفیـری عامو ئیعـلانی جـەنگ لـە دژی هـەموو هـاوبەش بۆ خـوا دانـەرە پـەیمـان شـکێنـەکـان، بڕیـار دەدات، خـوا ﷻ دوایـی دەفـەرموێ: جگـە لـەو هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرانـەی کـە پـەیمـانیـان لـەگـەڵ ئێـوەدا بەستووەو دوایـی هـیچ کەمـییان نەکـردوە، وە هاوکـاریی هـیچ کەسیـان نەکـردوە، لـە دژی ئێـوە، ئـەوانە پـەیمانەکـەیان لـەگەڵ بگـەیـەننە، ئـەو کاتـەی کـە دیـاریی کـراوە، بێگـومان خـوا پـارێزکارانـی خـۆش دەوێـن، واتـە: ئـەوانەی خـۆش دەوێـن، کـە لـە مامەڵـە لـەگـەڵ کافرانیشـدا، پـارێزکارنو، پـەیمان شکـێن نیـن.

کەواتـە: نـاگونجێ بگـوترێ: وشـەی ﴿ كَآفَّةً ﴾، پـەیوەندیی بـە هـەموو کـافرو هـاوبەش بۆ خـوا دانەرەکانەوە هەیـە، چونکە نـاگونجێ هەموویـان جەنگیـان لە دژ بکرێ، بەڵکو وەك پێشتـر هێنامان، لەو کورتە باسەدا دەربارەی ئایـەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة) کـردمان، پێغـەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٣٠٢٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَأَبُو دَاوُد، برقم: (٢٦١٤)}.

واتـە: ئـەگـەر بە دوژمنەکەت گەیشتی لە هاوبەش بـە خـوا دانەرەکـان، بانگیـان بکە بۆ سـێ شتـان ... کە دوایـی لە درێـژەی فەرموودەکەدا هاتوە، کە یـەکێـك لـەو سـێ شـتانە ئەوەیـە : ئـەگـەر مسوڵمان نەبـوون، داوایـان لـێ بکـە، سـەرانە بدەن.

کەواتـە: موشریکێك کـە ئـامادەیـە سـەرانە بدات، وە کافـرێك کە ئـامادەیـە تـەبابێ لەگەڵ دەوڵـەتی ئیسلامییو قەوارەی ئیسلامیی دا، جەنگ لە دژ کردنی دروست نیە.

<u>مەسەلـەی چوارەم</u>: کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ

فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَـٰلِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾.

وشەی: ﴿ٱلنَّسِىٓءُ﴾، دوو واتای هەن: یان چاوگ (مصدر)ە بەمانای دواخستن، یانی: (التأخیر)، یاخود ﴿ٱلنَّسِىٓءُ﴾، (فاعل)ی بەمانای (مفعول)ە، یانی: المؤَخَّر).

کەواتە: ﴿ٱلنَّسِىٓءُ﴾، ئەگەر بە مانای دواخراو (مُؤَخَّر)بێ، مانایەکەی ئاوایە: (إِنَّمَا الشَّهْر المُؤَخَر زِيادَة فِي الكُفْر)، ئەو مانگەی کە دوا دەخرێ، زێدەیی یە لە کوفردا.

ئنجا ئەوە چۆن بووە؟

عەرەبەکان لە سەردەمی نەفامیی دا، ئەگەر پێویستیان بەوە بووبێ کە جەنگ بکەنو، مانگێکی حەرامیان هاتبێتە پێشێ، بۆ وێنە: (رجب) گوتوویانە: ئەم ساڵ ڕەجەب حەڵاڵ دەکەین، بۆخۆمان جەنگی تێدا دەکەین، بەڵام مانگی دوای ڕەجەب دەکەین بە مانگێکی حەرامو، جەنگی تێدا ناکەین! کەواتە: لێرەدا ﴿ٱلنَّسِىٓءُ﴾. بەپێی ئەم واتایە دەبێ بە (فعيل)، بە مانای (مفعول)، یانی: (المُؤَخّر) دواخراو.

مانای دووەمی: ﴿ٱلنَّسِىٓءُ﴾، ئەوەیە کە چاوگ (مصدر) بێ، واتە: دواخستنی مانگە قەدەغە کراوەکان، لە ڕیزبەندیی خۆیان، بۆ دواتر، ئەوە زێدەییە لە کوفری کافرەکاندا، وەك (الطبري)، لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: (إِنَّمَا التأخِير الَّذِي يُؤَخِّرُهُ أَهْل الشِّرْك بِاللهِ مِنْ شُهُور الحُرُمِ الأَرْبَعَة، وَتَصيِيرِهِم الحَرَام مِنْهُنَّ حَلَالاً ، وَالحَلَالِ مِنْهُنَّ حَرَامًا، زِيادَة فِي كُفْرِهِم وَجُحُودِهِم أَحْكَامَ اللهِ وَآيَاتِهِ)[1].

واتە: بێگومان ئەو دواخستنەی کە ئەهلی شیرك (هاوبەش بۆ خوا دانەران) لە مانگە حەرامەکان دا ئەنجامی دەدەن، ئەوەیان کە جەنگی تێدا قەدەغەیە، جەنگی

---

١) جامع البيان، ج ٦، ص ١٢٦.

تێدا حەڵاڵ دەکەن، وە ئەوەیان کە جەنگی تێدا حەڵاڵە (واتە: جەنگێکی ڕەوا) جەنگی تێدا قەدەغە دەکەن، پێکیان دەگۆڕنەوە، ئەوە زێدەییە لە کوفریاندا، وە لە نکووڵییاندا، لە یاساکانی خواو لە ئایەتەکانی خوا.

هەڵبەتە وشەی: ﴿ٱلنَّسِیٓءُ﴾، بە (النَّسِي)ش، خوێنراوەتەوە، ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِیٓءُ﴾، وە (إنما النَّسِي).

ئنجا ئایا بۆچی دەفەرموێ: ﴿زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ﴾؟ چونکە موشریکەکان هەر کافرن، بەڵام بەو کردەوانە، کوفرەکەیان زیاد دەبێ، وەك چۆن ئینسانی ئیمانداریش، بە طاعەت ئیمانەکەی زیاد دەبێ، ئینسانی کافریش بە کردەوەی خراپو تاوان، کوفرەکەی زیاتر دەبێ، واتە: وەك چۆن ئیمان بە طاعەت زیاد دەکات، کوفریش بە تاوانو خراپە خەستترو تۆختر‌و قووڵتر دەبێتەوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان پێی گومڕاو سەرگەردان دەبن، وە زیاتر لە ڕاستە ڕێ لادەدەن، هەڵبەتە خوێنراویشەتەوە (يَضِلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟)، (يُضَلُّ بِهِ)، واتە: لا دەدرێن‌و گومڕا دەکرێن، (يَضِلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟)، واتە: گومڕا دەبن‌و سەرگەردان دەبن، کە چی دەکەن؟ ﴿يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا﴾، ساڵێك جەنگی تێدا حەڵاڵ دەکەن، کە لە ئەسڵدا جەنگی تێدا قەدەغەیە، ﴿وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا﴾، ساڵێکی دیکە جەنگی تێدا قەدەغە دەکەن، وەك حاڵەتی ئاسایی خۆی، ﴿لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾، بۆ ئەوەی سەرەنجام ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردوە، ئەو ژمارەیە دەربێنن، واتە: پێکەڵپێك بێ، چونکە وەك دەڵێن: ﴿لِّيُوَاطِـُٔوا۟﴾، مانای (ليوافقوا) واتە: ڕێك بێتەوە، چونکە ڕیز بەندییەکەیان تێکداوە بە پێی بەرژەوەندیی خۆیان.

(الطبري) لەوبارەوە لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وَإِنَّمَا مَعْنَى الكَلَامِ: أَنَّهُمْ يُوَافِقُونَ بعِدَّة الشهُور الَّتِي يحرِّمونَها، عِدَّةُ الأَشْهُر الأَرْبَعَة الَّتِي حَرَّمَهَا الله،

لا يَزِيدُونَ عَلَيْهَا وَلاَ يَنقِصُونَ مِنْهَا، وَإِنَّ قَدَّموا وَأَخَّروا، فَذَلِكَ مُوَاطأة عِدَّتَهُمْ عِدَّةَ مَا حَرَّم الله)[١].

واتە: مانای قسەکە ئەوەیە کە ئەوان بە ژمارەی ئەو مانگانەی کە قەدەغەیان دەکەن، لە مانگە حەڵاڵەکان، ژمارەی ئەو چوار مانگانەی کە خوا قەدەغەی کردوون، (یانی جەنگی تێدا قەدەغە کردوون) تەواو دەکەن، پێکەڵپێکیان دەکەن، نە لێیان کەم دەکەن، نە لێیان زیاد دەکەن، با پاش‌و پێشیشیان بکەن، ئا ئەوە مانای ئەوەیە کە : هەمان ژمارە مانگ کە خوا لە ساڵدا جەنگی تێدا قەدەغە کردوون (کە چوار مانگن) ئەوانیش لە هەمان ژمارەی مانگ دا، جەنگ قەدەغە بکەن.

هەڵبەتە لەوبارەوە زانایان زۆر قسەیان کردوون، کە ئایا عەرەبەکان بۆچی وایان کردوە؟

بەڵام وەك (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی (التحرير والتنوير)دا، دەڵێ: (وَأَحْسَن مَا رُوِي فِي صِفَةِ ذَلِكَ: قَوْلُ أَبِي وَائِل أَنَّ العَرَبَ كَانُوا أَصْحَاب حُرُوب وَغَارَات، فَكَان يشقّ عَلَيْهِم أَنْ يَمْكثُوا ثَلاَثَة أَشْهُر مُتَوَالِيَة لا يغِيرُون فِيها، فَقَالوا: لَئِنْ تَوَالَتْ عَلَيْنا ثَلاَثَة أَشْهُر لاَ نُصِيب فِيها شَيْئاً، لَنَهْلِكَنَّ)[٢].

واتە: باشترین قسە لەوبارەوە ئەوەیە کە ئەبو وائیل گوتوویەتی، دەڵێ: عەرەب لە سەردەمی نەفامیی دا، هەر خەریکی شەڕو شۆڕو هێرشکردنە سەر یەکدی بوون، بۆیە لەسەریان قورس بوو سێ مانگان لەسەر یەك هیچ شەڕێك نەکەن‌و پەلاماری کەس نەدەن، وە گوتوویانە: ئەگەر بێت‌و سێ مانگمان بەسەردا تێپەڕن‌و هیچ نەکەین‌و دەستکەوتێکمان نەبێ‌و شەڕێك نەکەین (کە خێرێکی تێدابێ) دەفەوتێین.

بۆیە سێ مانگان تەحەممولیان نەدەکردو، یەکێك لەو سێ مانگانە، یان جاری وا هەبووە مانگە تاکەکە کە ڕەجەبە، جەنگیان تێدا ڕەوا دەکرد.

---

١) جامع البيان، ج ٦، ص ١٣٩.

٢) ج ٥، ص ١٨٩.

پێشتریش باسمان كرد، كە ئەوە كلتوورو عادەتێكی عەرەبەكان بوو، كە (نسي)یان (نسيء) یان هەبوو، كە بریتی بوو لەوەی ئەو چوار مانگانەی كە جەنگیان تێدا قەدەغە كراوە، لە هەر مانگێك دا بە پێویستیان زانیبایە جەنگی تێدا بكەن، ئەو مانگەیان حەڵاڵ دەكردو لە جیاتی ئەو مانگە، مانگێكی دیكەیان حەرام دەكرد.

ئنجا (ابن حزم)ی ئەندەلوسیی لەبارەی ئەوەوە دەڵێ: (كُلُّ مَنْ صَارَتْ إِلَيْهِ هَذِهِ المَرْتَبَةُ (أَي مَرْتَبَةُ النَّسِيءِ) كَانَ يُسَمَّى القَلَمَّس، وَقَالَ القُرطُبِيُّ: كَانَ الَّذِي يَلِي النَّسِيءِ يَظْفَرُ بالرِّئَاسةِ لِتَرْيِيس العَرَبِ إيِاهُ، وَكَانَ القَلَمَّسُ يَقِفُ عِنْدَ جَمْرَةِ العَقَبَةِ وَيَقُولُ: اللّهُمَّ إنّي نَاسِيءُ الشُّهُورِ وَوَاضِعُهَا مَوَاضِعَهَا، وَلاَ أُعَاب وَلاَ أُجَاب، أَللّهُمَّ إنّي قَدْ أَحْلَلْتُ أَحَدَ الصَّفَرَيْنِ وَحَرَّمْتُ صَفَرَ المُؤَخَّر انْفِرُوا عَلَى اسْمِ اللهِ تَعَالَى)[1].

واتە: هەر كەسێك ئەو پێگەی (النَّسِيءِ)ی پێ دەسپێردرا لە نێو عەرەبەكاندا، پێی دەگوترا: (القَلَمَّس)[2]، وە (قُرْطُبي) دەڵێ: ئەو كەسەی كە دواخستنی مانگێك لە مانگە قەدەغەكراوەكانی ڕاگەیاندبایە، وە جێگۆڕكە پێ كردبا بە مانگێكی دیكە، ئەوە عەرەبەكان دەیانكرد بە سەرۆك‌و ڕیش سپی خۆیان بۆ ئەو كارە وە ئەو كەسە ناوی لێ‌دەنرا (قَلَمَّس) ئەویش لەلای (جَمْرة العقبة) ئەو بڕیارەی ڕادەگەیاند، (واتە: ئەو شوێنەی كە دوو پەیمانەكەی لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و نوێنەرانی شاری یەسریبدا تێدا بەستران)، وە دەیگوت: ئەی خوایە! من دواخەری مانگەكانم، وە ئەو كەسەم كە مانگەكان لە شوێنی خۆیان دادەنێم، ڕەخنەم لێ ناگیرێ، وە نابێ وەڵامیشم بدرێتەوە، ئەی خوایە! ئەوە من یەكێك لە دوو مانگەكانی صەفەرم حەڵاڵ كرد (كە دیارە بە پێی ڕیزبەندیی ئەوان، جەنگی تێدا قەدەغە كراوە) وە صەفەرەكەی دیكەم قەدەغە كرد (لە جیاتی ئەومیان كە جەنگی تێدا حەڵاڵ دەكەم) بڕۆن بە ناوی خوای بەرزەوە، (واتە: بڕۆن جەنگتان بۆ ڕەوایە)!!.

---

١) فتح القدير للشوكاني: ج ١، ص ٤٣٧ .

٢) لە هەندێك سەرچاوە دەڵێن: لەبەرئەوەی كە یەكەم كەس ئەو عادەتەی داهێناوە ناوی (قَلَمَّسْ) بووە، بۆیە هەر كەسێك ئەو پێگەیەی پێ سپێررابا، پێی دەگوترا: (قلمس).

ئنجا خوای پەروەردگار لە درێژەی ئەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ: ﴿زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَٰلِهِمْ﴾، کردەوە خراپەکانیان بۆ ڕازێنرابوونەوە.

کێ بۆی ڕازاندبوونەوەو بۆی جوان کردبوون؟

بێگومان شەیتان، چونکە خوا لە شوێنی دی دەفـەرموێ: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾﴾العنكبوت.

واتە: شەیتان کردەوەکانی بۆ جوان کردبوون، ئنجا لە حاڵێک دا کە بەرچاوو ڕوون بوون، لە ڕێ لایدان.

واتە: کردەوە خراپەکان، ئەگەرنا شەیتان کردەوەی چاك جوان ناکات، بەڵکو ئەوەی کردەوەی چاك جوان دەکات، بە ئیرادەی تەکوینیی‌و قەدەریی خۆی، وە بە ئیرادەی تەشریعیی خۆی، خوای پەنهانکارە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾﴾ الحجرات، کەواتە: خوا، ئیمان لە دڵی بڕواداراندا خۆشەویست دەکات‌و دەیڕازێنێتەوە، وە بە پێچەوانەوە کوفرو سەرپێچیی‌و لادانیان لە دڵدا بوغزێنراوو ناشیرین دەکات، بەڵام شەیتان بە پێچەوانەوە: ئیمانیان لەلا ناشیرین دەکات، وە گوناهو تاوان‌و لادانیان، لەلا جوان دەکات.

﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، وە خوا کۆمەڵی بێبڕوایان هیدایەت نادات، لێرەدا دەبێ وردبینەوە، هیدایەت نادات یانی چی؟

ئایا خوا ﷻ قورئانی نەناردوە، هیدایەت بێ بۆ هەموو بەشەرو جند؟ ئەدی خوا نافەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾الأنعام.

واتە: ئەو (قورئان) بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان..؟!

دەبێ بڵێین: هیدایەت بەنسبەت مرۆڤ و جیننەوە، دوو چەمکی هەن:

١/ چەمکێکی گشتی کە بریتیە لە ڕێ پێشاندانو ڕێنماییو هەقو ناهەق بۆ لێك جیا کردنەوە، کە خوای بەخشەر بە گشتی ئەوەی بۆ هەموو کەس کردوە.

٢/ بەڵام چەمك و قۆناغی دووەمی هیدایەت، دوای قبووڵ کردنی هیدایەتی یەکەمە، ئەو هیدایەتو ڕێنماییەی کە خوا ناردوویەتی بۆ بەندەکانی لەسەر زمانی پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، دوای ئەوەی بەندەکان ئەوە قبووڵ دەکەن، ئنجا واتاو قۆناغی دووەمی هیدایەت دێتە پێش، کە بریتیە لەوەی خوا بتخاتە سەر ڕاستە ڕێ، وە دڵت بەهێز بکات لەسەری، وە بەرچاوت ڕۆشن بکاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾محمد.

واتە: ئەوانەی کە هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، وە پارێزکاریی خۆیشیانیان پێ‌دەدا.

کەواتە: لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، وە خوا کۆمەڵی بێبڕوایان ڕێنمایی ناکات، واتە: هیدایەتی تایبەتیی خۆی بەهرەمەندیان ناکات، نەك لە هیدایەتە گشتییەکەی، کە خوای پەروەردگار هیچ شتێکی دروست نەکردوە، کە هیدایەتی گشتی نەدابێ، وەك مووسا سەلامی خوای لێ بێ، لە وەڵامی فیرعەوندا کە لێی دەپرسێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾طه.

واتە: گوتی: ئەی موسا! پەروەردگاری ئێوە کێیە؟

فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾طه.

واتە: پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە کە هەموو شتێکی دروست کردوە، وە ڕێنماییشی کردوە، (ڕێی پێشانداوە چۆن بەڕێوە بچێ؟).

بەڵێ لە گەردیلە تا کەهکەشان، هیچ شتێك نیە خوای کاربەجێ بەرنامەی بۆ دانەنابێو ڕێنمایی نەکردبێ، بەڵام مرۆڤ وێڕای هیدایەتی گشتی غەریزیی، خوا هیدایەتێکی تایبەتییشی بۆ ناردوون، بە پێغەمبەران دا صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ.

کەواتە: خوای کاربەجێ هیچ شتێکی دروست نەکردوە، ڕێنمایی نەکردبێ، بەڵام لێرەدا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، وە خوا کۆمەڵی بێبڕوایان ڕێنمایی ناکات، واتە: ئەو هیدایەتە تایبەتەی کە لە دوای قۆناغی یەکەمی هیدایەتەوە دێ، دوای قبووڵکردنی هیدایەتی خوای بە بەزەیی، دێ.

ئنجا جێی سەرنجە کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾وە، لە شوێنێکی دی دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾﴾الأنعام، کە هەم وشەی (کافر)و هەم وشەی (ظالم) بە (اسم فاعل) هاتوون، (کافر) واتە: (ساتر) کەسێك کە هەقی بۆ دێ‌و دادەپۆشێ. (ظالم)یش واتە: کەسێك کە ستەم دەکات.

کەواتە: ئەوانەی کە شایستەی ئەوە نین، خوای میهرەبان هیدایەتیی تایبەت خۆییان پێ ببەخشێ، کەسانێکن کە کوفرو ستەم لە خۆیاندا دێننە دی. خراپەکاریی لە خۆیاندا دێننە دی، وە سەرنجام ئەو کوفرو ستەم‌و خراپەکارییە. دەبێتە پەردەیەك لە نێوان ئەوان‌و هیدایەتی خوای دادگەردا.

## وەڵامی دوو پرسیار

ئنجا لە کۆتایی دا دەمەوێ وەڵامی دوو پرسیاران بدەمەوە:

١) ڕەنگە یەکێك بپرسێ: ئاشکرایە جەنگ نەکردن لەو چوار مانگەداو، بە قەدەغە لە قەڵەم دانیان، کلتوورێکی عەرەبەکان بووە لە سەردەمی نەفامیی دا، ئنجا ئایا ئیسلام چۆن تەبەنیی کردوە؟! ئایا هەندێك لە ڕۆژهەڵات نووسەکان هەقیان نیە بڵێن: موحەممەد ﷺ، هەندێك لە عادات‌و نەریتی گەلەکەی، کردوە بە بەشێك لەو ئایین‌و شەریعەتە کە گوتوویەتی: خوا بۆی ناردووم؟!

لە وەڵام دەڵێین: هەم مەسەلەی مانگە حەرامەکان، وە هەم هەندێك لە خواپەرستییەکانی حەج، وەك ڕاوەستان لە عەرەفات‌و، تەوافی دەوری کەعبەو.

هاتووچۆی نێوان صەفاو مەڕوەو، وردە بەرد هاویشتن بۆ سێ جەمرەکان، وە قوربانیی سەربڕین، هەموویان ڕاستە وەك کلتوورو عادەتێك لەنێو عەرەبەکاندا بوون، بەڵام ئەوانە هەموویان پاشماوەکانی ئەو ئایینو شەریعەتە بوون، کە ئیبراهیمو ئیسماعیلی کوڕی، وە نەوەکانیان پیادەیان کردوە، وەك ئایینێکی خوایی‌و ئاسمانیی، کەواتە: عەرەبەکانیش بۆیە بە پیرۆزیان زانیوە، وە وەك دینداریی ئەنجامیان داون، بەڵام گرفت ئەوە بووە کە شتی دیکەی ناهەقیان لەگەڵ تێکەڵ کردوون، بۆ وێنە: بە ڕووتیی بە دەوری کەعبەدا تەوافیان کردوە، ئیسلام تەوافەکەی هێشتۆتەوە، چونکە تەواف کردن بە دەوری کەعبەدا، ئیبراهیم وەك لە شەریعەتەکەی دا هەبووە، ئەنجامی داوە، وە فەرمانی خوای لەسەرە، هەروەها قوربانیی سەربڕینو، هاتووچۆی نێوان صەفاو مەڕوەو، وردە بەرد هاویشتنەکانو، ڕاوەستان لە عەرەفات، بەڵام عەرەبەکان شتی دیکەیان لەگەڵ تێکەڵ کردوون، ئیسلامیش شتە زیادکراوو داهێنراوەکانی لابردوەو ئەوانی دیکەشی هێشتۆتەوە.

ئنجا ئەم مەسەلەی چوار مانگە قەدەغەکانیش هەر وابووە، ئەوان هەڵساون هەر مانگێك کە پەکیان لەسەر کەوتبێ، کە جەنگی تێدا حەڵاڵ بکەن، پێویستیان پێی بووبێ، حەڵاڵیان کردوە، خوای پەروەردگاریش ئەوەی لێ بە ڕەخنە گرتوون، چونکە ئەم مانگانە، دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێو، بەلای کەمەوە، هیچ کەس لە ساڵدا چوار مانگ بۆی نیە هێمنیی‌و ئاسایشی کۆمەڵگا بشێوێنی، با جەنگێکی ڕەواش بێ.

٢) یەکێکی دیکە بۆی هەیە بپرسێ ـ پێشتریش ئەو پرسیارەمان کردو وەڵامیشمان دایەوە ـ ئایا ئیسلام هەر لەو چوار مانگەدا، جەنگ قەدەغە دەکاتو، لە مانگەکانی دیکەدا جەنگ ڕەوایە؟

دەڵێین: نەخێر، جەنگ‌و کوشتار هەر نارەوایە، بەڵام کوشتاری ڕەواش لەو چوار مانگانەدا قەدەغە کراوە، هەتا دەڵێ: هەندێ لە عەرەبەکان، ئەگەر کەسێك دوژمنی بابە کوشتەیان بووایە، لەو مانگە قەدەغانە تووشی بووانایە، دەستیان نەدەگەیاندێ، دەیانگوت: لە مانگی حەرام داین، لە وڵاتی حەرام داین، بۆیە هیچکەس دەستی بۆ بکوژی بابیشی نەدەبرد، ئەوەش دەبووە هۆی ئەوە کە بەلای کەمەوە، یەك لەسەر سێی ساڵ خەڵك لە هێمنیی‌و ئارامیی دا بژین، لەو

کۆمەڵگایەی ئەو کاتی دا، کۆمەڵگای نەفامیی، کە یاسای دارستان‌و یاسای دەریا حاکم بووە، ئەوەی بەهێز بووە بێهێزی لەبەین بردوە! بۆیە ئیسلام وەك ئەسڵەکە هێشتوویەتەوەو، ئەوەی لێیان زیاد کردوەو لادانیان تێدا کردوە، لای بردوە.

کەواتە: ئەو مشتومڕەش کە لە نێوان زانایاندا هەیە: ئایا ئەم چوار مانگە قەدەغانە، هەر ماون؟

وەك لە تەفسیری سووڕەتی بەقەڕەش دا باسمان کردوە، ڕای ڕاست ئەوەیە، کە ئێستاش ئەو مانگە حەرامانە، هەر جەنگیان تێدا قەدەغەیە، واتە: جەنگی ڕەوا، ئەگەرنا جەنگی ناڕەوا، لە هەموو مانگەکاندا قەدەغەیە.

ئەدی بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێك لەو مانگانەدا جەنگی کردوە؟

دەڵێین: ئەوە جەنگی بەرگرییکردن بووە، وە ئاواش هەموو دەقەکان کۆدەکرێنەوە، کەواتە: ئەم حوکمە هەر لە شوێنی خۆیەتی، چونکە خوا زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٣٦ ﴾التوبة.

کە ئەم سووڕەتەش لە ساڵی نۆیەمی کۆچی دا هاتۆتە خوارێ، واتە: ساڵێك پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ.

وە لە سووڕەتی بەقەڕەش دا دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ ٢١٧ ﴾البقرة.

واتە: لەبارەی جەنگ تێداکردنی مانگی قەدەغەوە، پرسیارت لێ دەکەن بڵێ: جەنگ کردن لەو مانگە قەدەغەکراوانەدا شتێکی گەورەیە.

دواییــش دەفــەرموێ: ﴿ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ﴿٢١٧﴾ ﴾ البقرة.

واتــە: بەڵام خەڵك لادان لــە ڕێــی خـواو لـە مزگـەوتـی حـەرامو کوفرکـردن بـە خـوا، وە خەڵکی دەوری مزگەوتی حـەرام وەدەرنـان لە جێگاو ڕێگای خۆیـان، لـە لای خـوا (گوناهێـکی) گـەورەتـرە، وە ئـازاردان (ی خـەڵـك بـۆ ڕێ لـێگرتنیـان کـە مسوڵمان ببـن، یان هەڵگێـڕانەوەیـان) لە کوشـتن گـەورەتـرە... .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە یـازدە (١١) ئـایـەت پێك دێ، ئـایـەتـەكـانی (٣٨ تـا ٤٨)، لـەو یـازدە ئایەتەدا، سـەرەتا خوای بەرزو مەزن بۆ جاری چوارەم لـەم سوورەتـەدا بە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَـا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، واتـە: ئـەی ئـەوانەی بڕواتـان هێنـاوە! مسولـمانــان دەدوێنــێ، وە لەسەر ئەوە کە لە کاتی فەرمان پێکرانیاندا بۆ جەنگ، قالب گران بوون، سەرزەنشتیان دەکاو بە سـەرسوڕمانـەوە دەپرسێ: ئایا ژیـانی دنیاتان بەسەر دواڕۆژدا هەڵبـژارد ؟!

پـاشـان هـەڕەشـەی سـزادانی بە ئێـشو، گۆڕانیان بە کۆمەڵێکی دیکـەیـان لـێ دەکـات. لـە کـاتی سـستییـاندا لە بـواری بەرگـریی‌و بەرەنگـاریی دا.

دوایی ڕووداوی کـۆچکردنی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکەی (أبو بکـر) خـوا لێی ڕازی بـێ. لـە مەککـەوە بۆ مەدینـە، دەخاتـە یـاد، کـە چـۆن خـوا سـەریخـستن‌و، پیلانی کـافرەکـانـی پووچـەڵ کـردەوە.

پـاشـان فـەرمانیـان پـێ دەکـات کـە بە سـووکیی‌و قورسـیی، بـە سـەرو مـاڵـتـان جـەنـگ بکـەن لـە ڕێی خـوادا.

ئنجا باسی هـەڵوێستی نـەرێییـانـەی دڵنـەخـۆش‌و دەغـەڵـەکـان دەکـات، کـە هـەمیشـە بەدوای شتی ئاساندا دەگەڕێن‌و، سوێندی بە درۆش بۆ دواکـەوتنیان دەخـۆن‌و، گلەیـیەکی نـەرمییش لـە پێغـەمبـەر دەکات، لەسـەر ئـەوە کـە مۆڵـەتی داون بۆ دواکـەوتن.

دوایی ئـەو ڕاستییـە دەخاتـەڕوو کـە هـەرگیز بڕوادارانـی ڕاسـتـەقینەی پـارێزکـار. داوای مۆڵـەتی دواکـەوتن لـە جـەنگ نـاکـەن، بەڵکو ئـەوە دڵنـەخۆش دەغەڵـەکانن، کـە

ئەو ڕەفتارەیان لێ دەپشکوێتەوە، کە ئەگەر بە ڕاستیی مەبەستیان هاتنەدەر بووایە، پێشتر خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام خوای کارزان بەهۆی نیەتی خراپیانەوە، دڵی خاوکردوونەوە، وەك پاسایەکی خۆی.

پاشان دەیخاتەڕوو، کە ئەگەر بەشدارییشیان کردبایە:

١) هەر زیانیان لە مسوڵمانان دەدات.

٢) ڕۆڵی ئاژاوەگێڕییان دەبوو.

٣) سیخوڕیشیان هەن لە نێو مسوڵماناندا، یان کەسانی کارتێکراو (مُتَأَثِّر) پێیان.

٤) پێشتریش ڕۆڵی خراپیان گێڕاوە، هەتا هەق هاتوەو، خوا ئەو کارەی ئاشکرا کردوون.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى
ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى
ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا
غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ
فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ
إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ
وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ
وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا
وَجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ
﴿٤١﴾ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَـٰكِنۢ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ ۚ
وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ
لَكَـٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ
ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَـٰهِدُوا۟
بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ
وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ
لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ
﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَـٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ
وَفِيكُمْ سَمَّـٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ
وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَـٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەوە چیتانە! کاتێك پێتان گوترا: لە ڕێی خوادا دەربچن بۆ جەنگ، بەرەو زەمین خۆتان قورس کرد، (قالب گرانیی دەکەن) ئایا ژیانی دنیاتان بەسەر دواڕۆژدا هەڵبژاردوە؟ لە حاڵێکدا کە خۆشیی ژیانی دنیا لە چاو دواڕۆژ جگە لە کەمێك هیچی دیکە نیە! ﴿٣٨﴾ ئەگەر نەڕۆن بۆ جەنگ (خوا) بە ئازارێکی بە ئێش سزاتان دەدات، وە کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە دێنێ، وە هیچ زیانیشی لێنادەن (بە سەرپێچیی کردنتان) وە خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە ﴿٣٩﴾ ئەگەر ئێوە سەری نەخەن (واتە: پێغەمبەرەکەی) ئەوە لە ڕابردوودا (زانیوتانە چۆن) خوا سەریخست، لە کاتێکدا کە ئەوانەی بێبڕوان وەدەریان نا، کە دووەمی دوو کەسەکە بوو لە چاڵایی یەکەدا، کاتێك بە هاوەڵەکەی دەگوت: خەمەت نەبێ، بێگومان خوا لەگەڵمانە، ئنجا خوا هێمنکردنەوەی خۆی دابەزاندە سەری، و بە سەربازانێك کە نەدەتان دەبینین، پشتگیریی کرد، وە وشە (و پیلان)ی ئەوانەی بێبڕوای خستە بنەوەو، هەر وشە (و بڕیاری) خواش بەرزە، وە خوا زاڵی کارزانە ﴿٤٠﴾ سووك بن یان قورس، بەرەو جەنگ بچن، و، بە سامان و گیانتان لە ڕێی خوادا تێبکۆشن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، ئەگەر بزانن ﴿٤١﴾ ئەگەر دەستکەوتێکی نیزیك و سەفەرێکی کورت و ئاسان بووایە، شوێنت دەکەوتن، بەڵام سەفەرێکی دوورو زەحمەت بوو، (بۆیە نەهاتن)، وە بە جەختکردنەوە سوێند بە خوا دەخۆن، (دەڵێن:) ئەگەر توانیبامان، لەگەڵتان دەردەچووین (بە سوێندی درۆ) خۆیان دەفەوتێنن، خواش دەزانێ کە بێگومان ئەوان درۆزنن ﴿٤٢﴾ خوا لێت ببووری (ئەی موحەممەد!) بۆچی جاری مۆڵەتت دان، (نەدەبوو مۆڵەتیان بدەی) تاکو ئەوانەت بۆ دەربکەون، کە ڕاستیان کرد، وە درۆزنانیش بزانی ﴿٤٣﴾ ئەوانەی بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی دێنن، مۆڵەتت لێومرناگرن، کە (ئامادە نەبن) بە سامان و گیانیان تێبکۆشن، وە خوا بە پارێزکاران زانایە ﴿٤٤﴾ تەنیا ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیەو، دڵیان بە گومانەو، لە دوو دڵییاندا دێن و

دەچن، مۆڵەتت لێوەردەگرن، (بۆ نەهاتن بۆ جەنگ) ﴿٤٥﴾ وە ئەگەر ویستبایان دەربچن (پێشتر) پێداویستییان بۆ (جەنگ) ئامادە دەکرد، بەڵام خوا هاتنیانی پێ ناخۆش بوو، بۆیە خافڵاندنیو دوای خستن، وە (پێیان) گوترا: لەگەڵ دانیشتووان‌دا دابنیشن! ﴿٤٦﴾ ئەگەر لەگەڵیشتان هاتبان، جگە لە خراپەیان بۆ زیاد نەدەکردن، وە لە میانی ڕیزەکانتان‌دا هەر ئەسپی خراپەکاریی یان تاودەدا، نارێکییو ئاژاوەیان بۆ پەیدادەکردن، وە لە نێویشتان دا کەسانێك هەن، زۆر گوێیان بۆ دەگرن، وە خواش بە ستەمکاران زانایە ﴿٤٧﴾ بێگومان پێشتر هەوڵی ئاژاوەو خراپەکارییان‌دا، وە هەر سەرگەرمی هەڵگێڕو وەرگێڕی کاروبارەکان (پیلانگێڕان) بوون، هەتا هەق هاتو هەرچەندە زۆریشیان پێناخۆش بوو، کاری (ئایینی) خوا سەری گرتو سەرکەوت ﴿٤٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱنفِرُواْ ): (النَّفْرَةَ: الإِنْزِعَاجُ مِن شَيءِ وَإِلى شَيءٍ، وَنَفَرَ إِلى الحَرْبِ، يَنفَرُ وَيَنفِرُ نَفَرًا).

(نَفْرَة) بریتیە لەوەی کەسێك بێزار بێ لە شتێك، یاخود بەرەو شتێك بێزار بێ کە بۆی بچێ، (نفر) واتە: بۆ جەنگ دەرچوو، (يَنفَرُ وَيَنفِرُ نَفَرًا) واتە: دەرچوون بەرەو جەنگ.

(ٱثَّاقَلۡتُمۡ ): لە (تثاقلتم)ەوە هاتوە، واتە: خۆتان قورس کرد، سستییتان نواند، (الثِّقَلُ وَالخِفَة مُتَقَابِلاَنِ).

(ثقَل) و (خِفَة) واتە: گرانییو سووکیی، بەرانبەر یەکدین.

(مَتَـٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ): واتە: ڕابواردن، یاخود خۆشییو لەززەتی ژیانی دنیا، (المَتَاعُ: السِّلْعَةُ وَالمَنْفَعَةُ وَمَا تَمَتَّعْتَ بِهِ، وَمَتَّعَ بِهِ: إِنْتَفَعَ).

(مَتَاع) بریتیە لە کەلوپەلو سوود، وە هەر شتێك کە خۆشیی لێ ببینیو لێی بەهرەمەند بی، (وَمَتَّعَ بِهِ) واتە: سوودی لێ بینی.

(وَيَسۡتَبۡدِلۡ بِهِ): واتە: دەیهێنێ بۆ شوێنی دی، (اسْتَبْدَلَ الشيءَ بِغَيْرِهِ وَتَبدَّلَه بِهِ: إِذَا أَخَذَهُ مَكانَهُ، الإِبْدَالُ وَالتَّبْدِيلُ وَالتَبَدُّلُ وَالإِسْتِبْدَال: جَعْلُ شَيءٍ مَكانَ آخَر).

عەرەب ئەگەر بڵێن: (اسْتَبْدَلَ الشيءَ بغَيْرِهِ) یان (تَبدَّلَه بِهِ) ئەو شتەی هێنا بۆ شوێنی ئەو شتەی دیکە کە نایەوێ، هەروەها (الإِبْدَالُ وَالتَّبْدِيلُ وَالتَبَدُّلُ وَالإِسْتِبْدَال) هەمووی بە مانای ئەوەیە کە شتێك لە شوێنی شتێکی دیکە، دابنێی.

(ٱلْغَارِ ): واتە: چاڵایی، بەڵام زیاتر بە چاڵایی و کەلێنی چیا دەگوترێ، جا ئەگەر زۆر فراوان بێ پێی دەگوترێ: ئەشکەوت (كَهْف)، بەڵام ئەگەر بەرتەسك بێ پێی دەگوترێ: (غَار)، دەڵێ: (الغَوْرُ: المُنْهَبِطُ مِنَ الأَرْضِ، الغَارُ والمَغَارُ وَالمَغَارَةُ: كَالْكَهْفِ فِي الجَبَلِ، جَمْعُهُ غِيْرَان).

وشەی (غَور) بریتیە لە نزمایی لە زەوییدا، وشەی (غَارُ ومَغَارُ ومَغَارَةُ) وەك ئەشکەوت وایە لە چیادا، کۆیەکەی (غِيْرَان)ە، واتە: چاڵاییەکان.

(لَا تَحْـزَنْ ): واتە: دڵتەنگ مەبە، خەفەت مەخۆ، (الحُزْنُ والحَزَنُ: ضِدُّ السُّرُورِ، حَزِنَ يَحْزَنُ).

(حُزْن) و (حَزَن) واتە: دڵتەنگیی و خەفەتباریی، پێچەوانەی (سُرُور)ە، کە بە مانای دڵخۆشییە، دەگوترێ: (حَزِنَ يَحْزَنُ حُزْنا).

(سَكِينَتَهُۥ ): واتە: هێمنییەکەی، ئارامییەکەی، دەڵێ: (السَّكِينَةُ: الوَدَاعُ وَالوَقَارُ، وَالسَّكِينَةُ وَالسَّكَنْ: زَوَالُ الرُّعْبِ).

وشەی (سَكِيْنَة) بە مانای هێمنیی و ئارامیی دێ، وە (سَكِيْنَة) و (سَكَن) بە مانای لاچوونی ترس و دڵەڕاوکە دێ.

(ٱلسُّفْلَىٰ) و (ٱلْعُلْيَا): (السُّفْلُ: ضِدُّ العُلُوّ، وَسَفُلَ فَهُوَ سَافِل، وَأَسْفَل ضِدّ أَعْلَى، وَالسُّفْلَى ضِدُّ العُلِيا).

وشەی (سُفْل) واتە: نزمیی، پێچەوانەی (عُلُوَ)ە، واتە: بەرزیی، (سَفُلَ فَهُوَ سافِل) شۆڕبۆوە، ئەو لە ژێرەوەیە، وە (أَسْفَل) واتە: لە ژێری ژێرەوە، پێچەوانەی (أَعْلَى)یە، واتە: لەسەری سەرەوە، هەروەك (سُفْلَى) بە باری (مُؤَنَّث) دایە.

(خِفَافًا ) و (وَثِقَالًا ): (خِفَاف) کۆی (خَفِيف)ە، واتە: سووك، پێچەوانەی (ثَقِيل)ە، کە بە مانای قورس دێ، دەڵێ: (الثَّقِيلُ مِنَ الأَجْسامِ الَّتِي مِنْ شأْنِها، أن تَرْجَعَ إِلَى أَسْفَلَ، كالأَرْضِ وَالماء).

(ثَقِيل) بە شتێك دەگوترێ كە دابكەوێ، وەك زەوی، ئاو، كە دادەكەوێ بەرەو خوار دێ، (خَفَّ الشيءُ يَخِفُّ خِفَّةً) واتە: ئەو شتە سووك بوو، سووك دەبێ، سووكیی، كە پێچەوانەی (ثَقُلَ)یە واتە: قورس بوو، هەڵبەتە لێرەدا ئەم وشەیە خوازراوەتەوە بۆ قالب گرانیی‌و سستیی‌و تەنبەڵیی.

(عَرَضًا): (عَرَضُ الدُّنيا: مَا كانَ مِنْ مَالٍ قَلَّ أَوْ كَثُرَ)، واتە: بەرژەوەندیی دنیا، وە هەر شتێك كە سوودت پێبگەیەنێ لە ژیانی دنیا، پێی دەگوترێ: (عَرَضُ الدُّنيا).

(قَاصِدًا): (القَاصِدُ: القَرِيبُ، وَالقَصْدُ: بَيْنَ الإِسْرَافِ وَالتَقْتِيرِ مُقْتَصِدٌ).

(قَاصِد) لێرەدا بە مانای نیزیك دێ، چونكە وشەی (قَصْد) واتە: میانگیر، لە نێوان تێپەڕاندن‌و كورتهێناندا، لە نێوان زێدەڕۆیی‌و چرووكیی دا، كە لێرەدا مەبەست ئەوەیە سەفەرەكە دوور نەبێ‌و ئاسان بێ.

(ٱلشُّقَّةُ): (الشُّقَّة: السَّفَرُ البَعِيدُ، شَقَّهُ شاقَّهُ، المَشَقَّة: الصُّعُوبَة).

وشەی (شُقَّة) واتە: سەفەری دوور، دیارە سەفەری دووریش قورسە، هەروەك چۆن سەفەری كورت ئاسانە.

(وَٱرْتَابَتْ): (الرَّيْبُ: أَنْ تَتَوَهَّمَ بالشيءِ أَمْراً مَا، والإِرَابَة: أن يَتَوَهَّم فِيهِ أَمْراً مَا).

(رَيْب) بریتیە لەوەی شتێكت بە خەیاڵدابێ كە وایە، بەڵام واش نەبێ، وە (إِرَابَة) ئەوەیە كە تۆ لە شتێكدا دوو دڵ بی، ئنجا ولبێ، یان وا نەبێ، وە (تَرَدُّد) بریتیە لەوەی كە بێی‌و بچی، مرۆڤ بیری بۆ لای شتێك دەچێ، دەڵێ: دەبێ وابێ، یان وانەبێ؟ واتە: لە حاڵەتی دڵەڕاوكە دایەو، دڵی دامەزراو نیە.

(عُدَّةً): (العُدَّة: مَا يُعَدُّ مِنْ مَالٍ وَسِلاَحٍ، بحَيْثُ يُعَدُّ فَهُوَ كَثِيرٌ).

وشەی (عُدَّة) هەر شتێكە كە ئامادە دەكرێ بۆ جەنگ، لە ماڵ‌و سامان‌و چەك، وە لە هەر شتێكی دیكە كە جەنگ پێویستی پێی بێ، بۆچی پێی گوتراوە: (عُدَّة)؟ چونكە دەژمێردرێ، هەر شتێك زۆربێ، دەژمێردرێ.

(ٱنۢبِعَاثَهُمۡ ): (أَصْلُ البَعْثِ : إثارَةُ الشيءِ وَتَوْجِيهُهُ، بَعَثَهُ فَانْبَعَثَ).

وشەی (بَعْث) لە ڕیشەدا بە مانای وروژاندنی شتێکە، وە ئاراستەکردنو ناردنیەتی، جا (إنبعاث) (إنفعال)ە، لە (بعث)، واتە: دەرچوونو هەڵسانو ئامادە بوون.

(فَثَبَّطَهُمۡ ): (ثَبَّطَهُمْ: حَبَسَهُمْ وَشَغَلَهُمْ، ثَبَّطَهُ المَرَضُ وَأَثْبَطَهُ: أَي مَنَعَهُ وَحَبَسَه).

وشەی (ثَبَّطَ) واتە: دوای خست، سستی کرد، وە سەرقاڵی کردو خافڵاندی.

هەڵبەتە وەك دوایی باسی دەکەین، لێرەدا خوا باسی چەسپاندنی یاسایەکی گەونیی خۆی دەکات بەسەر ئەوانەدا، نەك خوای دادگەر پێی ناخۆش بووبێ، ئەوانە بچن بۆ جەنگو جیهاد!.

(خَبَالٗا ): (الخَبَالُ: الفَسادُ الَّذِي يَلْحَقُ الحَيْوَانَ فَيُورِثُهُ الإِضْطِرابَ، خَبَل وَخَبَّل فَهُوَ خَابِلٌ).

(خبال) بریتیە لەو تێکچوونەی کە تووشی هەر ژیاندارێك دێ، وە سەرەنجام تەندروستیی تێکدەچێو بێسەروبەر دەبێ.

(وَلَأَوۡضَعُواْ ): (وَضَعَتِ الدَّابَّةُ تَضَعُ فِي سَيْرِهَا وَضعاً، وَأَوْضَعْتُهَا حَمَلْتُهَا عَلَى الإِسْرَاعِ).

لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (وَضَعَتِ الدَّابَّةُ تَضَعُ فِي سَيْرِهَا وَضعاً) واتە: ئاژەڵەکە خێرا ڕۆیی لە ڕۆیشتندا، بەلام ئەگەر بگوترێ: (وَأَوْضَعْتُهَا) واتە: خێرا لێم خوڕیو پێش خۆمدا، ناچارم کرد کە بە خێرایی بڕوات.

(يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ ): (فتنة) لێرە بە مانای هەر خراپەکارییەك دێ، کە مرۆڤ لێی تووشی زیان دێ.

(يَبْغُونَكُمْ: يَطْلُبُونَ لَكُمْ الفَسَاد)، واتە: خراپەو ئاژاوەو ناڕێکییتان بۆ بە ئاوات دەخوازن.

(سَمَّٰعُونَ لَهُمۡ ): واتە: لە نێو ئێوەدا کەسانێك هەن، کە گوێ بۆ ئەوان دەگرن، ئەوە واتایەکی، یاخود زۆر گوێ دەگرن لە قسەکانی ئێوە بۆ ئەوان، واتە: جاسووسییتان لەسەر دەکەن، بۆ ئەوەی قسەکانی ئێوە بۆ ئەوان ببەن.

(وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ): واتە: کاروبارەکانیان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکەن، داخۆ بە کام لایەن دا زیانی بۆ تۆ زیاترە؟ (تَقْلِيبُ الأُمُورِ: تَدْبِيرها وَالنَّظَر فِيها) ئەوەیە کە لێی وردبیەوەو تەماشای بکەی، داخۆ بە کام باردا، زیانی زیاترە بۆ ئیسلامو مسوڵمانان، ئەوان هەر خەریکی پیلانگێڕیی و نەخشەی گڵاوی خۆیانن.

# پوختەیەك دەربارەی جەنگی تەبووك لەبەر ڕۆشنایی (السيرة النبوية لابن هشام)دا[1]

خوا پشتیوان بێ ئێمە لە بیستو سێ (٢٣) برگەداو لەبەر تیشكی كتێبی (السيرة النبوية)ی (ابن هشام)دا، باسی جەنگی تەبووكو بەسەرهاتو ڕووداوە گرنگەكانی دەكەین، شایانی باسیشە: زۆرجاران بە مەبەستی باشتر ڕوونبوونەوەی مەبەست هەندێك قسەی خۆم ناواخنی قسەكانی (ابن هشام)، دەكەم، بەڵام قسەكانی خۆم دەخەمە نێوان دوو كەوانەوە بۆ لەیەك جیابوونەوە:

١ / (أَقَامَ رَسولُ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، مَا بَيْنَ ذِي الْحَجةِ إِلَى رَجَبٍ، ثُمّ أَمَرَ النَاسَ بِالتّهَيّؤِ لِغَزْوِ الرّومِ، وَقَدْ ذَكر لَنا الزّهْرِيّ، وَيَزِيدُ بْنُ رُومَانَ، وَعبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكر، وَعَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، وَغَيْرُهُمْ مِنْ عُلَمائِنا ، كُلّ حَدّثَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ مَا بَلَغَهُ عَنْها، وَبَعْضُ الْقَوْمِ يُحَدّثُ مَا لا يُحَدّثُ بَعْضٌ: أَنّ رَسولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ أَصْحابَهُ بِالتّهَيّؤِ لِغَزْوِ الرّومِ، وَذَلِكَ فِي زَمَانٍ مِنْ عُسْرَةِ النّاسِ، وَشِدّةٍ مِنْ الْحَرّ، وَجَدْبٍ مِنْ الْبِلادِ، وَحِينَ طَابَتْ الثّمَارُ، وَالنّاسُ يُحِبّونَ الْمُقَامَ فِي ثِمَارِهِمْ وَظِلالِهِمْ، وَيَكرهُونَ الشّخُوصَ عَلَى الْحَالِ مِنْ الزّمَانِ الّذِي هُمْ عَلَيْهِ، وَكَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ قَلّمَا يَخْرُجُ فِي غَزْوَةٍ إِلاّ كَنّى عَنْها ، وَأَخْبَرَ أَنّهُ يُرِيدُ غَيْرَ الْوَجْهِ الّذِي يَصْمُدُ لَهُ، إِلاّ مَا كَانَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَإِنّهُ بَيّنَها لِلناسِ، لِبُعْدِ الشّقّةِ

---

١) بڕوانە : (السيرة النبويّة لابن هشام)، ج ٤ ، ص ٢٩٢ - ٣٠٨.

وَشِدَّةِ الزَّمَانِ وَكَثْرَةِ الْعَدُوِّ الَّذِي يَصْمُدُ لَهُ، لِيَتَأَهَّبَ النَّاسُ لِذَلِكَ أُهْبَتَهُ، فَأَمَرَ النَّاسَ بِالْجِهَازِ وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّهُ يُرِيدُ الرُّومَ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی کە لە نێوان مانگی (ذي الحجة) تاکو (رجب)، (واتە: دەوری شەش مانگ) لە مەدینە نیشتەجێو سەقامگیر بوو، {دوای ئەوەی لە جەنگی حونەینو ئەو جەنگانەی دوای حونەین بۆوە، دوایی هەواڵی پێگەیشت کە ڕۆمەکان بە تەمان هێرش بێنن، ئنجا وەك گوتراوە: هێرش بردن باشترین شێوازی بەرگری لە خۆ کردنە}، بۆیە فەرمانی کرد کە هاوەڵان خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگی ڕۆم، ئەویش لە کاتێکدا بوو خەڵك زۆر تەنگ دەست بوو، وە زۆر گەرما بوو، کەشی هاوین بوو، قاتیو قڕیی بوو، وە خەڵکی مەدینە (کە شوێنێك بووە خورماو ترێو میوەی لێ بووە) پێیان خۆش بووە لە سێبەرەکانی خۆیان بن، وە میوەکانی خۆیان بخۆن، وە پێیان ناخۆش بووە لەو حاڵەتی تەنگ دەستیو گەرماو نارەحەتییە بڕۆن (بەرەو دوژمنێکی کە یەکەمجارە ڕووبەڕووی دەبنەوە، وە ئەو دوژمنە لەسەرئاستی جیهان دەوڵەتێکی یەکجار بەهێزو گەورەیە، ئەوانیش دێن شانسی خۆیانی لەگەڵ تاقی دەکەنەوە).

ئنجا پێغەمبەر ﷺ کەم وا بووە، کە ویستبی جەنگێك بکات، مەگەر ئاماژەی دەکرد بە شوێنێکی دی، پێچەوانەی ئەو شوێنەی کە بۆی دەچن، بەڵام ئەمجارە هەواڵی پێدان: کە دەیەوێ بەرەو کوێ بچێ؟ (بەرەو شام دەچێ)، بەرەو ڕۆم دەچێ.

{بۆیەش بۆی ڕوون کردنەوە، چونکە ڕێیەکە زۆر دوور بوو، وە کاتێکی زۆر سەغڵەتیی بوو، وە دوژمنێکی زۆر گەورە بوو، تاکو خەڵك لە قەدەر ئەو دوژمنەو ئەو ڕێیە دوورە، خۆیان ئامادە بکەن، بۆیە فەرمانی کرد کە خۆیان ئامادە بکەن، چونکە دەیەوێ بچێ لەگەڵ هێزی ڕۆمەکان ڕووبەڕوو بێتەوە، کە ئەوان سوپایەکیان ناردوە (وەك لە ڕیوایەتی طەبەرانییو تیرمیذیی دا هاتوە) کە سوپایەکی چل هەزار کەسییان ناردوە، کە دیارە ئەوە هەر پێشەکیی بووە}.

٢ / ﴿فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ ذَاتَ يَومٍ وَهُوَ فِي جِهازِهِ ذَلِك ، لِلْجَدِّ بْنِ قِيسٍ أحَدِ بَنِي سَلِمَةَ ، يا جَدُّ! هَلْ لَك الْعَامَ فِي جِلادِ بَنِي الأَصْفَرِ؟ فَقَالَ: يا رَسولَ اللهِ! أَوْ تَأذَنُ لِي وَلا تَفْتِنّي؟ فَوَاللهِ لَقَدْ عَرَفَ قَوْمِي أنَّهُ مَا مِنْ رَجُلٍ بِأَشَدّ عُجْبًا بِالنِّسَاءِ مِنّي، وَإِنّي أَخْشَى إنْ رَأيْتَ نِسَاءَ بَنِي الأَصْفَرِ، أنْ لا أَصْبِرَ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسولُ اللهِ ﷺ، وَقَالَ: قَدْ أذِنْتُ لَك ، فَفِي الْجَدِّ بْنِ قِيسٍ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾التوبة، أيْ إنْ كَانَ إنّمَا خَشَى الْفِتْنَةَ مِنْ نِساءِ بَنِي الأَصْفَرِ وَلَيْسَ ذَلِك بِهِ، فَمَا سَقَطَ فِيهِ مِنَ الْفِتْنَةِ أَكْبَرُ، بِتَخَلّفِهِ عَنْ رَسولِ اللهِ ﷺ وَالرّغْبَةِ بِنَفْسِهِ عَنْ نَفْسِهِ، يَقُولُ تَعَالَى: وَإِنّ جَهَنّمَ لَمِنْ وَرَائِهِ﴾.

واتە: پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو، کابرایەك کە پێیان دەگوت: (الجد بن قیس) کە یەکێك بوو لە هۆزی بەنو سەلەمە، پێی فەرموو: ئەی جەد! ئەمساڵ ئامادەنی بێی بۆ جەنگ لە دژی بەنی ئەصفەر؟ (دیارە عەرەبەکان بە رۆمەکانیان گوتوە: بەنی ئەصفەر، لەبەرئەوەی کە سوورو سپیی‌و چاوشین‌و موو زەرد بوون) جەددیش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ مۆڵەتم نادەی، بۆ ئەوەی تووشی تاقیکردنەوەمو تووشی گوناح نەیەم، سوێند بە خوا، گەلەکەی من دەزانن، هیچ کەسێك بەقەدەر من سەرسام نیە بە ئافرەتان، وە من مەترسیی ئەوەم هەیە کە ئافرەتانی رۆمیی ببینم‌و خۆم رانەگرم! (واتە: نەزەر، یان گەورەتر لە نەزەرم ببێ) پێغەمبەریش ﷺ (لەبەرئەوەی قسەی زۆر پێ بێجێ بوو، رووی لێوەرگێڕاو فەرمووی: (قَدْ أذِنْتُ لَك) ئەوە مۆڵەتم دای.

ئنجا دەربارەی ئەو هەڵوێستەی جەدی کوڕی قەیس، ئەم ئایەتە هاتە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾التوبة.

واتە: هەیانە دەڵێ: مۆڵەتم بدەو تووشی گوناهانم مەکە، ئاگاداربە کەوتوونە نێو گوناهانەوە، وە دۆزەخ دەورە دەری بێبڕوایانە، واتە: ئەو گوناهەی کە لێی ترساوە لەگەڵ ئافرەتانی ڕۆمیی دا تووشی بێ، ئەوە هیچ شتێك نیە لە چاو ئەو گوناهە گەورەی، کە بریتیە لەوەی فەرمانی پێغەمبەر بشکێنێ، وە لەوکاتە چارەنووسسازەدا خۆی لەو شوێنە بەجێبهێڵێ، وە نەفسی خۆی بە لاوە گرنگتر بێ، بۆیەش خوا هەڕەشەی بە دۆزەخ لێ دەکات، کە لە پشتیەوەیەتی.

٣ / (وَقَالَ قَوْمٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ : لا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ، زَهَادَةً فِي الْجِهَادِ وَشَكاً فِي الْحَقِّ، وَإِرْجَافًا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِيهِمْ: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾﴾التوبة).

واتە: هەروەها هەندێك لە دەغەڵو موونافیقو دڵنەخۆشەکان بە هەندێکیان دەگوت: بەو گەرمایە مەچن بۆ جەنگو جیهاد! دیارە هەم لەبەرئەوەی بۆخۆیان لە گوماندا بوون، وە هەم بۆ ئەوەش کە خەڵك لە پێغەمبەری خوا، دووربخەنەوە، خوای بەرز لەبارەی ئەوانیشەوە ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾﴾التوبة.

واتە: وە (دڵنەخۆشەکانو دەغەڵەکان) گوتیان: بەم گەرمایە مەچوون بۆ جەنگ، بفەرموو: ئاگری دۆزەخ گەرمییەکەی توندترە، ئەگەر تێبگەن، کەواتە: با لەمەودوا کەم پێبکەنن و زۆر بگریەن، وەك سزادان لەوەی کە وەدەستیان دەهێنا.

﴿وبَلَغَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنّ نَاسًا مِنَ الْمُنَافِقِينَ يَجْتَمِعُونَ فِي بَيْتِ سُوَيْلِمٍ الْيَهُودِيِّ، وَكَانَ بَيْتُهُ عِنْدَ جَاسُومَ، يُثَبِّطُونَ النَّاسَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ النَّبِيّ ﷺ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَأَمَرَهُ أَنْ

يُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بَيْتَ سوَيْلِمٍ، فَفَعَلَ طَلْحَةُ، فَاقْتَحَمَ الضَّحاكُ بْنُ خَلِيفَةَ مِنْ ظَهْرِ الْبَيْتِ ، فَانْكَسَرَتْ رِجْلُهُ﴾.

واتە: وە هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، کە کۆمەڵێك لە دەغەڵەکان لە ماڵی (سوَيْلِمٍ الْيَهُودِيّ) (دیارە کابرایەك بووە)، کۆدەبنەوە کە ماڵەکەی لە لای (جَاسومَ) بوو، خەریکن خەڵك سارد دەکەنەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆئەوەی کە نەچن بۆ جەنگی تەبووك، پێغەمبەری خواش ﷺ (طَلْحَة بْن عُبَيْدِ اللهِ)ی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی.بۆ لا ناردن، وە فەرمانی پێکردن کە ماڵی (سوَيْلِم)یان بەسەردا بسووتێنێ، (طَلْحَة)ش وایکرد، ئنجا یەکێك لەوان کە ناوی (الضّحاكُ بْنُ خَلِيفَة)بوو، لە پشتی خانووەکەوە دەرچوو، بەڵام لاقی شکا، {دیارە ئەوانی دیکەش هەموویان دەرباز بوون، بەڵام خانووەکەی سووتاند}.

٤ / (ثُمّ إنّ رَسولَ اللهِ ﷺ جَدّ فِي سَفَرِهِ، وَأمَرَ الناسَ بِالْجِهازِ وَالإنْكِمَاشِ وَحَضّ أهْلَ الْغِنَى عَلَى النّفَقَةِ وَالْحُمْلاَنِ فِي سَبِيلِ الله، فَحَمَلَ رِجَالٌ مِنْ أهْلِ الْغِنَى وَاحْتَسَبُوا. وَأَنْفَقَ عُثْمَانُ بْنُ عَفّانَ فِي ذَلِكَ نَفَقَةً عَظِيمَةً، لَمْ يُنْفِقْ أَحَدٌ مِثْلَها، قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: حَدّثَنِي مَنْ أَثِقُ بِهِ أنّ عُثْمَانَ بْنَ عَفّانَ أَنْفَقَ فِي جَيْشِ الْعُسْرَةِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، أَلْفَ دِينارٍ ، فَقَالَ رَسولُ اللّهِ: أللّهُمّ ارْضَ عَنْ عُثْمَانَ، فَإِنّي عَنْهُ رَاضٍ).

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە دەستو برد کردن بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو سەفەرە، وە فەرمانی بە خەڵکیش کرد کە خۆبپێچنەوەو، کەلوپەل ئامادە بکەن، وە هانی دەوڵەمەندەکانیشی دا، کە ماڵ سەرف بکەن، وە لە ڕێی خوادا پشتی وڵاخان ئامادە بکەن، {واتە: کەسانێك کە وڵاخیان نیە وڵاخیان بۆ ئامادە بکەن}، جا کەسانێك لەوانە کە دەوڵەمەند بوون کاری باشیان کرد، یەکێك لەوانە عوسمان خوا لێی ڕای بێ، ماڵێکی مەزنی بەخشی، کە هیچ کەس بەقەدەر ئەو بۆ ئامادەکردنی ئەو سوپایە ماڵی نەبەخشی بوو، ئیبنو هشام دەڵێ: کەسێك کە من متمانەی پێدەکەم، هەواڵی پێداوم کە عوسمان بۆ ئامادەکردنی ئەو سوپایە کە پێی گوتراوە: (جیش العسرة) واتە: سوپای سەغڵەتیی، هەزار دیناری زێڕی بەخشیوە، وە پێغەمبەر لە بەرانبەر ئەوەدا فەرموویەتی: ﴿أللّهُمّ ارْضَ عَنْ عُثْمَانَ، فَإِنّي عَنْهُ رَاضٍ﴾.

واتە: خوایە! لە عوسمان ڕازییبە، من لێی ڕازییم.

٥ / ئیبنو ئیسحاق لەوبارەوە باسی هەڵوێستی حەوت کەس لە هاوەڵان دەکات، دیارە رووت و رەجاڵ و بێ ئیمکانیەت بوون خوا لێیان رازی بێ، کە پێیان گوتراوە: گریاوەکان (الْبَكَّاءُونَ)، وە هەموویان لە پشتیوانەکان بوو، کە بریتین لە: (سالِمُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَعُلْبَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَأَبُو لَيْلَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ كَعْبٍ، وَعَمْرُو بْنُ حُمَامِ بْنِ الْجَمُوحِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُغَفَّلِ الْمُزَنِيّ، وَهَرَمِيّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، وَعِرْبَاضُ بْنُ سارِيَةَ الْفَزَارِيّ)، ئەوانە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا، وە داوایان لێکرد وڵاخی سوارییان بۆ پەیدا بکات، ئەویش فەرمووی: ﴿لا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ، فَتَوَلَّوْا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنْ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلاَّ يَجِدُوا مَا يُنْفِقُونَ﴾

واتە: توانام نیە وڵاخی سوارییتان بۆ پەیدا بکەم، ئەوانیش روویان وەرگێڕاو، فرمێسکیان بە چاودا هات، دڵتەنگ بوون کە نەتوانن ماڵێك خەرج بکەن لە پێناوی خوادا.

(قَالَ ابْنُ إِسْحاقَ: فَبَلَغَنِي أَنَّ ابْنَ يامِينَ بْنِ عُمَيْرِ بْنِ كَعْبٍ النَّضْرِيّ، لَقَى أَبَا لَيْلَى عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ كَعْبٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ مُغَفَّلٍ، وَهُمَا يَبْكِيانِ، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكُمَا؟ قَالاَ: جِئْنَا رَسولَ اللهِ ﷺ لِيَحْمِلَنَا، فَلَمْ نَجِدْ عِنْدَهُ مَا يَحْمِلُنَا عَلَيْهِ، وَلَيْسَ عِنْدَنَا مَا نَتَقَوَّى بِهِ عَلَى الْخُرُوجِ مَعَهُ، فَأَعْطَاهُمَا نَاضِحًا لَهُ، فَارْتَحَلاهُ وَزَوَّدَهُمَا شَيْئاً مِنْ تَمْرٍ فَخَرَجَا مَعَ رَسولِ اللهِ ﷺ).

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: پێم گەیشتوە کە ئیبنو یامین کوڕی عومەیری کوڕی کەعبی نەضری، گەیشتە (أَبَا لَيْلَى عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ كَعْبٍ) و (عَبْدَ اللهِ بْن مُغَفَّل) هەردووکیان دەگریان، گوتی: هۆی گریانتان چییە؟ گوتیان: چووینە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی وڵاخی سواریمان بۆ پەیدا بکات، ئەویش هیچی لەلا نەبوو، وە ئێمە توانامان نیە وڵاخ بکڕین، بۆ ئەوەی خۆمانی پێ بەهێز بکەین و لەگەڵی دەربچین، لەبەرئەوە دەگریەین، ئەویش حوشترێکی پێدان، کە ئاوی پێ دەهێنرا، ئەوانیش هەردووکیان سواری بوون، وە ئەندازەیەکی باش خورماشی پێدان، وەك پێخۆرو زەخیرە، ئیدی ئەوانیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچوون.

{کەسانێك هەبوون، ئاوا بەو کولەمەرگیی چوون، کەسانێکیش هەبوون، ئیمکانیەتێکی زۆریشیان لەبەر دەست دا هەبووە، کەچی نەچوو ون!}.

٦ / (ثُمَّ اسْتَتَبَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَفَرُهُ، وَأَجْمَعَ السَّيْرَ، وَقَدْ كَانَ نَفَرٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَبْطَأَتْ بِهِمْ النِّيَّةُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى تَخَلَّفُوا عَنْهُ، عَنْ غَيْرِ شَكٍّ وَلا ارْتِيَابٍ، مِنْهُمْ: كَعْبُ بْنُ مَالِكِ بْنِ أَبِي كَعْبٍ، أَخُو بَنِي سَلِمَةَ ، وَمُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعِ، أَخُو بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَهِلالُ بْنُ أُمَيَّةَ).

واتە: دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ پێداویستیەکانی سەفەری ڕێکخست، وە بڕیاریدا کە دەست بکات بە ڕۆیشتن، وە کۆمەڵێك لە مونافیقەکان لێی دواکەوتن‌و خۆیان بەجێهێشت، وە کۆمەڵێك مسوڵمانیش کە لە پێغەمبەر ﷺ دواکەوتن. نیەتیان باش بوو، هیچ گومانیان نەبوو لە ئیسلام‌و ئیماندا، (بەتایبەتی سێ کەسیان)، یەکەمیان: کەعبی کوڕی مالیك، دووەمیان: مەرارەی کوڕی ڕەبیع، سێیەمیان: هیلالی کوڕی ئومەییە.

{کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: وە خوا لەو سێیانەش خۆش بوو، کە باسیان دواخرابوو، یان بڕیار لەبارەیانەوە دواخرابوو، کە دوایی بە تەفصیل باسی دەکەین، چونکە گێڕراوەیەکی دوورو درێژ هەیە، کە بوخاریی‌و موسلیم هێناویانە، لە زاری کەعبی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێ} .

٧ / (فَلَمَّا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ضَرَبَ عَسْكَرَهُ عَلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە مەدینە دەرچوو (بەرەو ڕۆم)، سوپایەکەی خۆی لە شوێنێك مۆڵداو بنەیان خست، کە پێی دەگوترێ: (ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ). {(ثَنِية)، یانی بەرزایی، دیارە ناوی شوێنێکە، کە ئەگەر کەسێك بیەوێ بچێتە مەدینە، دەبێ بەو بەرزاییەدا بەرەو شاری مەدینە شۆڕ بێتەوە} .

٨ / (وَاسْتَعْمَلَ عَلَى الْمَدِينَةِ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيَّ، وَذَكَرَ عَبْدَ الْعَزِيزِ بْنِ مُحَمَّدٍ الدَّرَاوَرْدِيِّ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَعْمَلَ عَلَى الْمَدِينَةِ، مَخْرَجَهُ إِلَى تَبُوكَ: سِبَاعَ بْنَ عُرْفُطَةَ).

واتە: وە پێغەمبەری خوا ﷺ {وەك عادەتی خۆی کە شاری مەدینەی بەجێدەهێشت، بۆ جەنگێك بۆ سەفەرێك دەچوو، یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێزی لە

شوێنی خۆی دادەنا، دەیکردنە سەرپەرشتیار} (مُحَمّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيّ)، خوا لێی ڕازی بێ، کردە سەرپەرشتیار، بەڵام لەوبارەوە ڕایەکی دیکەش هەیە کە (عَبْدَ الْعَزِيزِ بْنَ مُحَمّدٍ الدّرَاوَرْدِيّ)، لە بابیەوە گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەمجارە دوای ئەوەی چووە بۆ تەبووك (سِبَاعَ بْنَ عُرْفُطَة)ی لە جێگای خۆی داناوە، {بەڵام زیاتر وا باوە کە (محمد بن سلمة)ی داناوە لە شوێنی خۆی، وەك سەرپەرشتیاری شاری مەدینە، کە پایتەختی ئەوسای دەوڵەتی ئیسلامیی بووە}.

٩ / (وَضَرَبَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيّ مَعَهُ عَلَى حِدَةٍ، عَسْكَرَهُ أَسْفَلَ مِنْهُ، نَحْوَ ذُبَابٍ، وَكَانَ فِيما يَزْعُمُونَ: لَيْسَ بِأَقَلّ الْعَسْكَرِيْنِ، فَلَما سارَ رَسولُ اللهِ ﷺ تَخَلّفَ عَنْهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيّ، فِيمَنْ تَخَلّفَ مِنْ الْمُنَافِقِينَ وَأَهْلِ الرّيْبِ).

واتە: وە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە، ئەویش سوپای خۆی بە جیا دانا، لە خوار سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺەوە، لە داوێن ئەوەوە، لە شوێنێك کە پێی دەگوترێت: (ذباب)، وە هەندێك گوتوویانە: کە ئەو سوپایەی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوری ئوبەییەی کوڕی سەلوولیش بوو، کەمتر نەبوو لەو سوپایەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو، ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت (بەرەو تەبووك بەرەو ڕۆم) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە، لێی بەجێما، خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لە مونافیقو دەغەڵەکان، وە لەوانەی کە لە گوماندا بوون، وە لە دڵ نەخۆشەکان.

{بەڵام من پێم وایە زێدەڕۆییەك هەیە لێرەدا، کە گوتراوە ئەو سوپایەی کە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی سەلول دابوو، کەمتر نەبوو لە سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺ، چونکە شتێکی زانراوە، کە ئەو سوپایەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ژمارەیان بە سی هەزار (٣٠,٠٠٠) کەس مەزەندە کراوە بۆیە زێدەڕۆیی تێدا هەیە کە بگوترێ: ئەوانەی کە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی سەلوول دابوون ژمارەکەیان ئەوەندە بووە !}.

١٠ / (وَخَلَّفَ رَسولُ اللهِ ﷺ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، رِضوانُ اللهِ عَلَيْهِ عَلَى أَهْلِهِ، وَأَمَرَهُ بِالإِقَامَةِ فِيهِمْ، فَأَرْجَفَ بِهِ الْمُنَافِقُونَ وَقَالُوا: مَا خَلَّفَهُ إِلاَّ اسْتِثْقَالاً لَهُ وَتَخَفُّفًا مِنْهُ، فَلَما قَالَ ذَلِكَ الْمُنَافِقُونَ، أَخَذَ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، رِضوانُ اللهِ عَلَيْهِ سِلاحَهُ، ثُمّ خَرَجَ حَتَّى أَتَى رَسولَ اللهِ ﷺ وَهُوَ نَازِلٌ بِالْجُرْفِ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ! زَعَمَ الْمُنَافِقُونَ أَنّكَ إِنَّمَا خَلّفْتنِي لأَنّكَ اسْتَثْقَلْتنِي وَتَخَفّفْت مِنّي، فَقَالَ: كَذَبُوا، وَلَكِنّنِي خَلّفْتُكَ لِمَا تَرَكْت وَرَائِي، فَارْجِعْ فَاخْلُفْنِي فِي أَهْلِي وَأَهْلِكَ. أَفَلاَ تَرْضَى يَا عَلِيّ! أَنْ تَكُونَ مِنّي بِمَنْزِلَة هَارُونَ مِنْ مُوسَى؟ إِلاَّ أَنَّهُ لا نَبِيَّ بَعْدِي، فَرَجَعَ عَلِيّ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَمَضَى رَسولُ اللهِ ﷺ عَلَى سَفَرِهِ، قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: وَحَدّثَنِي مُحَمّدُ بْنُ طَلْحَةَ بْنِ يَزِيدَ بْنِ رُكَانَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ سَعْدٍ أَنّهُ سَمِعَ رَسولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لِعَلِيّ هَذِهِ الْمَقَالَةَ. قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: ثُمّ رَجَعَ عَلِيّ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَمَضَى رَسولُ اللهِ ﷺ عَلَى سَفَرِهِ).

واتە: وە پێغەمبەری خوا ﷺ (عەلی کوڕی ئەبو طاڵیبی)ی لە دوای خۆی بۆ سەرپەرشتیاریی ماڵو خێزانی جێهێشت، ئنجا مونافیقەکان دەستیان کرد بە پروپاگەندە لە دژی عەلی خوا لێی ڕازی بێ!

{پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبو طاڵیبی ئامۆزای خۆی، وەك مشووورخۆر بەسەر ماڵو خێزانو خزمو کەسییەوە دانا، بە تایبەت، وە فەرمانی پێکرد کە بمێنێتەوە لە نێویاندا، بەڵام مونافیقو دەغەڵەکان، دەستیان کرد لە پروپاگەندەی ناحەزانە} گوتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا بۆ ئەوە بەجێی هێشتوە، کە ڕەزای گرانە، وە پێی ناخۆش بووە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بێ، وە بۆ ئەوەی بووە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە.

ئنجا کاتێك مونافیقەکان دەستیان کرد بەو پروپاگەندانە، عەلی کوڕی ئەبو طاڵیبیش خۆیو چەكو چۆڵەکەی هەڵگرتو، وە ڕۆیشت هەتا گەیشتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە ئەوکاتە لەلای (جرف)، (کە شوێنێکە) لەوێ بارگەو بنەیان خستبوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! مونافیقو دەغەڵەکان پێیان وایە کە تۆ منت بۆیە بەجێشتوە، کە ڕەزام گرانە لەلات، وە ویستووتە لەکۆڵ خۆتە بکەیەوە!

پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ﴿كَذَبُوا، وَلَكِنِّي خَلَّفْتُكَ لِمَا تَرَكْتُ وَرَائِي، فَارْجِعْ فَاخْلُفْنِي فِي أَهْلِي وَأَهْلِكَ، أَفَلا تَرْضَى يَا عَلِيّ! أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى؟ إِلاَّ أَنَّهُ لا نَبِيَّ بَعْدِي﴾.

واتە: درۆیان کردوە، بەڵکو بۆیە تۆم لە جێی خۆم بەجێهێشتوە، تاکو لە شوێنی من بیو لە جیاتی من سەرپەرشتیی ئەوانەی دوای من بکەی (ماڵو خێزان)، بگەڕێوە جێنشینی من بە، لە سەرپەرشتیکردنی ماڵو خێزانی خۆمو خۆشت، ئەی عەلی! ئایا ڕازی نی کە هاڕوون بۆ مووسا چۆن بوو، تۆش بۆ من وابی، ئەوەندە نەبێ کە لە دوای من هیچ پێغەمبەر نین!

دیارە عەلییش خوا لێی رازی بێ، گەڕایەوە، وە پێغەمبەری خواش ﷺ بەرەو سەفەرەکەی چوو.

(شایانی باسە دەقی ئەوەی کە ماناکەی هاتوە، بوخارییش بە ژمارە (٥٠٣)، وە موسلیمیش بە ژمارە: (٢٤٠٤) هەروەها (البزّار) لە موسنەدەکەی خۆیدا بە ژمارە (١١٩٤)، وە (ابن كثير)یش لە (البداية والنهاية)کەی خۆیدا، هەروەها (طبري)، وە (ابن حبان)یش، وە (الذهبي)یش لە (تأريخ الإسلام)دا، ئەوانە هەموویان هێناویانە.

شایانی باسیشە کە شیعە یەکێك لەو شتانەی کە دەیانکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، لە دوای پێغەمبەر ﷺ پێشەوای موسوڵمانان بووە، وە پێغەمبەری خوا ئەوی لە جێگای خۆی داناوە، بەڵام دوایی هاوەڵان ئەو حەقەیان لە عەلی زەوت کردوە، ئەم دەقەیە، لەگەڵ هەندێك شتی دیکەدا، کە لە ڕاستییدا ئەو دەقە، ئەوە ناگرێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبو طاڵیبی لەجێی خۆی داناوە، کە سەرپەرشتیی ماڵو خێزانی بکاتو تەنانەت سەرپەرشتیی مەدینەشی بەو نەسپاردوە، هەڵبەتە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، شایستە بووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ یان (مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيّ)، یان (سِبَاع بْن عُرْفُطَة)، (بە پێی دوو ڕیوایەت)ی داناوە، بە سەرپەرشتیاری مەدینە، بەڵام عەلی خوا لێی ڕازی بێ، بۆ سەرپەرشتیی ماڵو خێزانەکانی خۆیو، ئەو کەسانەی کە خزمو نزیکی بوون، کە لە دوای خۆی بەجێهێشتوە.

١١ / (ثُمّ إنّ أبَا خَيْثَمَةَ رجَعَ، بَعْدَ أنْ سَارَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أيامًا إلى أهْلِهِ، فِي يَوم حارٍّ، فوَجَدَ امْرَأتَيْنِ لَهُ فِي عَرِيشَيْنِ لَهُمَا فِي حائطِهِ، قَدْ رَشّتْ كُلّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا عَرِيشَها، وبَرّدَتْ لَه فِيهِ مَاءً، وَهيّأتْ لَهُ فِيهِ طعَامًا، فلما دَخَلَ، قامَ على بَابِ العَرِيشِ، فنَظَرَ إلى امْرَأتَيْهِ وَمَا صَنَعَتَا لَهُ، فقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الضّحّ وَالرّيحِ وَالحَرّ، وَأبُو خَيْثَمَةَ فِي ظِلّ بَارِدٍ وَطعَامٍ مُهَيّأٍ وَامْرَأةٍ حَسْنَاءَ فِي مَالِهِ مُقِيمٌ، مَا هَذَا بِالنّصَفِ، ثُمّ قَالَ: وَاللهِ لا أدْخُلُ عَرِيشَ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا، حَتّى ألْحَقَ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَهَيّئَا لِي زَادًا، ففعَلَتَا، ثُمَّ قَدَّمَ نَاضِحَهُ فَارْتَحَلَهُ، ثُمّ خَرَجَ فِي طلَبِ رَسُولِ اللهِ ﷺ حَتّى أدْرَكَهُ حِينَ نَزَلَ تَبُوك، وَقَدْ كَانَ أدْرَكَ أبَا خَيْثَمَةَ عُمَيْرُ بْنُ وَهْبٍ الجُمَحِيّ فِي الطرِيقِ، يَطْلُبُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فتَرَافَقَا، حَتّى إذَا دَنَوْا مِنْ تَبُوكَ، قَالَ أبُو خَيْثَمَةَ لِعُمَيْرِ بْنِ وَهْبٍ: إنّ لِي ذَنْبًا، فَلا عَلَيْكَ أنْ تَخَلّفَ عَنّي حَتّى آتِيَ رَسُولَ اللهِ ﷺ ففعَلَ، حَتّى إذَا دَنَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ نَازِلٌ بِتَبُوكَ، قَالَ النّاسُ: هَذَا رَاكِبٌ عَلَى الطرِيقِ مُقْبِلٌ: فقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُنْ أبَا خَيْثَمَةَ، فقَالُوا: يا رَسُولَ اللهِ! هُوَ وَاللهِ أبُو خَيْثَمَةَ، فلما أنَاخَ، أقْبَلَ فَسَلّمَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ( أوْلَى لَكَ يا أبَا خَيْثَمَةَ ! ثُمّ أخْبَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ الخَبَرَ: فقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ خَيْرًا، وَدَعَا لَهُ بِخَيْرٍ).

واتە: (أبو خيثمة)، دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت، چەند ڕۆژێك دوای ئەوە، ڕۆژێك چۆوە بۆماڵێ، لە ڕۆژێکی گەرمدا، هەردوو هاوسەرەکەی لە دوو کەپرەکانیاندا، وە لە نێو باخی دارخورمادا، (کە دیارە دوو باخی دارخورمای هەبوونو دوو خێزانی هەبوون) هەر کامێکیان ئاو ڕشێنی کەپرەکەی کردبوو، وە ئاوی بۆ سارد کردبوو، وە خواردنیشی بۆ ئامادە کردبوو، کاتێك کە (أبو خيثمة) چووە ژوورێ لەبەر دەرگای کەپرو ساباتەکە ڕاوەستا، تەماشای دوو هاوسەرەکەی کرد، کە ئەو خواردنو شتەیان بۆ ئامادە کردوەو، کە جێوڕێیان بۆ ئامادە کردوە. ئنجا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر گەرماو لە نێو باو نارەحەتیی دابێ. (أبو خيثمة)ش لەبەر سێبەرێکی ساردو، خواردنێکی ئامادەکراوو هاوسەرێکی جوان چاوەڕێی بکاتو، لە ماڵی خۆیدا نیشتەجێ بێ! ئەمە ویژدانو دادگەریی (إنصاف) نیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا، دوایی گوتی: بە خوا نایەمە نێو

کەپرو ساباتی هیچ کامێکتانەوە، تاکو نەگەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە خوارنو توێشووم بۆ ئامادە بکەن، ئەوانیش بۆیان ئامادە کرد، وە حوشترەکەی کە ئاویان پێ دەهێنا، هێنای ئامادەی کردو سواری بوو، وە بە دوای پێغەمبەری خوادا ڕۆیشت، تاکو گەیشتە تەبووک کە پێغەمبەر ﷺ و سوپایەکەی لەوێ بارگەیان خستبوو، (سوپایەکەی لەوێ دانابوو) پێی گەیشت.

ئنجا (أبو خیثمة)، (عمیر بن وهب)ی، لە ڕێگادا پێگەیشت، ئەویش بە هەمان شێوە کە پێشتر بەجێمابوو، دەیویست بگاتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە لە ڕێگادا بوونە هاوڕێ، هەتا لە تەبووک نیزیك کەوتنەوە، کە نیزیك کەوتنەوە (أبو خیثمة)، بە عومەیری کوڕی وەهبی گوت: من گوناهێکم هەیە {وا پێدەچێ عومەیری کوڕی وەهب، وەك (أبو خیثمة) نەبوو بێ‌و، بە عوزرێك دوا کەوتبێ، بۆ وێنە: لە سەفەرێك بووبێ، بەڵام (أبو خیثمة)، زانیویەتی‌و کەمتەرخەمیی کردوە} ، ئەگەر هاوکارم بی، تۆزێکم لێ دوا بکەوی، تاکو من دەگەمە پێغەمبەری خوا ﷺ، {واتە: بە تەنێ پێی دەگەم، تۆزێکم لێ دوابکەوە} ، ئەویش وایکرد، هەتا لە پێغەمبەری خوا نیزیك کەوتەوە کە گەیشتبووە ناوچەی تەبووك، خەڵك تەماشایان کرد، گوتیان: ئەوە سوارێکە بەڕێوەیە دێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کن أبا خیثمة)، واتە: با ئەبو خەیثەمە بێ! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! {دیارە دوای ئەوەی کە نیزیکتر کەوتۆتەوە} ، بە خوا (أبا خیثمة)یە، کاتێك هاتو حوشترەکەی یەخدا، (واتە: لێی هاتە خوار) سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش پێی فەرموو: {أولی لك یا أبا خیثمة} ، واتە: ئەمە بۆ تۆ باشترە ئەی (أبا خیثمة)! یان دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ، بێقەزابی (أبو خیثمة)، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی لێ بیست، (واتە: هەواڵەکەی خۆی بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە) پێغەمبەریش ﷺ قسەی باشی بۆ کرد، وە دوعای خێری بۆ کرد.

واتە: (أبو خیثمة)، واقیعی خۆی بۆ بەیان کردوە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەڵێ من کەمتەرخەم بوون، بەڵام دوایی چوومەوە ماڵەوەو ئەو وەزعەم بینیەوەو لەگەڵ حاڵی ئێوەدا بەراوردم کردوەو، ویژدانم موحاسەبەی کردوومو، ئیمانەکەم ڕێی نەداوم کە لەوێ دابنیشم.

١٢ / (وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ مَرَّ بِالْحِجْرِ نَزَلَهَا، وَاسْتَقَى النَاسُ مِنْ بِئْرِهَا، فَلَما رَاحُوا، قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ : لا تَشْرَبُوا مِنْ مَائِهَا شَيْئاً، وَلا تَتَوَضَّأُوا مِنْهُ لِلصَّلاةِ، وَمَا كَانَ مِنْ عَجِينٍ عَجَنْتُمُوهُ، فَاعْلِفُوهُ الإبِلَ، وَلا تَأْكُلُوا مِنْهُ شَيْئاً، وَلا يَخْرُجَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ اللَّيْلَةَ إلاّ وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ، فَفَعَلَ النَاسُ مَا أَمَرَهُمْ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ إلاّ أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ بَنِي سَاعِدَةَ، خَرَجَ أَحَدُهُمَا لِحَاجَتِهِ وَخَرَجَ الآخَرُ فِي طَلَبِ بَعِيرٍ لَهُ، فَأَمَّا الّذِي ذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، فَإنّهُ خُنِقَ عَلَى مَذْهَبِهِ. وَأَمّا الّذِي ذَهَبَ فِي طَلَبِ بَعِيرِهِ، فَاحْتَمَلَتْهُ الرِّيحُ حَتّى طَرَحَتْهُ بِجَبَلَيْ طَيِّئ. فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ رَسولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَمْ أَنْهَكُمْ أَنْ لا يَخْرُجَ مِنْكُمْ أَحَدٌ إلاّ وَمَعَهُ صَاحِبُهُ، ثُمّ دَعَا رَسولُ اللهِ ﷺ لِلّذِي أُصِيبَ عَلَى مَذْهَبِهِ فَشُفِيَ، وَأَمّا الآخَرُ الّذِي وَقَعَ بِجَبَلَيْ طَيِّئ، فَإنّ طَيِّئاً أَهْدَتْهُ لِرَسولِ اللهِ ﷺ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ. وَالْحَدِيثُ عَنْ الرَّجُلَيْنِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْر، عَنْ عَبّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَاعِدِيّ، وَقَدْ حَدّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْر أَنْ قَدْ سَمّى لَهُ الْعَبّاسُ الرّجُلَيْنِ وَلَكِنّهُ اسْتَوْدَعَهُ إيَاهُمَا، فَأَبَى عَبْدُ اللهِ أَنْ يُسَمّيَهُمَا لِي).

(قَالَ ابْنُ هِشَام: بَلَغَنِي عَنْ الزّهْرِيّ أَنّهُ قَالَ لَما مَرّ رَسولُ اللهِ ﷺ بِالْحِجْرِ سَجّى ثَوْبَهُ عَلَى وَجْهِهِ، وَاسْتَحَثّ رَاحِلَتَهُ ثُمّ قَالَ: لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ الّذِينَ ظَلَمُوا إلاّ وَأَنْتُمْ بَاكُونَ، خَوْفًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ).

{(حِجْر) دیاره ناوچەیەکە کە کاتی خۆی گەلی (ثمود)ی لێبووەو، لەوێ لەبەین چوون}.

(ابن إسحاق)، دەڵێ: دوایی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆی بەرەو تەبووك، بە (حجر)دا تێپەڕی، وە لەوێ بارگەو بنەیان خست، خەڵکیش لە بیرەکەی وێ ئاویان هەڵێنجا، بەڵام دوای ئەوەی کە چوون ئاوەکەیان هەڵێنجا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿لا تَشْرَبُوا مِنْ مَائِهَا شَيْئا، وَلا تَتَوَضَّأُوا مِنْهُ لِلصَّلاةِ، وَمَا كَانَ مِنْ عَجِينٍ عَجَنْتُمُوهُ فَاعْلِفُوهُ الإبِلَ، وَلا تَأْكُلُوا مِنْهُ شَيْئاً، وَلا يَخْرُجَنّ أَحَدٌ مِنْكُمْ اللّيْلَةَ إلاّ وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ﴾.

{پێغەمبەر ﷺ دیارە دەبێ دواتر خوای پەنهانزان ئاگاداری کردبێتەوە، یاخود ڕەنگە پێشتر نەیزانیبێ کە ئەو شوێنە (حِجْر)ە، بە هەر حاڵ گرنگ ئەوەیە دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون:} هیچ ئاو لە ئاوی بیرەکە مەخۆنەوە، وە دەستنوێژیشی لێ مەگرن بۆ نوێژ، وە هەر هەویرێکیش کە بەو ئاوە شێلاوتانە، بیکەن بە ئالف بۆ حوشترەکانتانو هیچی لێ مەخۆن لەو هەویرە، (واتە: مەیکەن بە نان)، وە هیچ کامتان ئەم شەو (دیارە شەوێك لەوێ ماونەوە) بە تەنیا نەچێتە دەر، مەگەر هاوەڵێکی لەگەڵ دابێ.

ئنجا خەڵکیش ئاوەیان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو بوون، جگە لە دوو پیاو، کە هەردووکیان لە هۆزی بەنی ساعیدە بوون، (لە خەڵکی مەدینە) یەکێکیان بۆ کارێکی خۆی چوو بووە دەرێ، وە ئەوی دیکەیان بە دوای حوشترێکی کەوتبوو، ئنجا ئەوەیان کە بۆ تارەت، (یان کارێکی خۆی) چوو بوو، تووشی جۆرێك لە حاڵ تێکچوون بوو بوو، {حاڵەتی دەروونی تێکچوو بوو}، ئەوەشیان کە بە دوای حوشترەکەی دا چوو بوو، با هەڵی گرتبوو، هەتا دوو چیایەکە (طَيِّئٍ)، {هەتا وێ ئەو بایە ڕای داوەو، فڕاندوویەتی}.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدرا، فەرمووی: ئەدی پێم نەگوتن: بەتەنیا دەرمەچن، مەگەر هاوەڵیشتان لەگەڵبێ؟ دوایی ئەوەیان کە باری دەروونی تێکچوو بوو، دوعای بۆ کردو چاك بۆوە.

ئەوەشیان کە لە چیای (طَيِّئٍ)، کەوتبوو، هۆزی (طَيِّئٍ)، بە دیاریی هێنایانەوە بۆ پێغەمبەر خوا ﷺ دوای ئەوەی کە گەڕایەوە بۆ مەدینە.

ئنجا (إبن هشام) دەڵێ: بەسەرهاتی ئەو دوو پیاوە لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکرەوە، وە لە عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە گێڕدراوەتەوە، وە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکر ناوی عەبباس، واتە (عەباسی کوڕی سەهلی سەعدی ساعیدی) ناوی ئەو دوو پیاوەی پێ گوتوە، بەلام گوتوویەتی ناوی ئەو دوو پیاوە مەدرکێنە، عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکری صددیقیش دەڵێ: ئامادە نەبوو ناوی ئەو دووانەم پێ بڵێ، چونکە عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی بە ئەمانەت پێی گوتبوو! (تەماشا بکەن! چەند نهێنیی قایم بوون!).

(قَالَ ابْنُ هِشَامٍ : بَلَغَنِي عَنْ الزّهْرِيّ أَنّهُ قَالَ: لَمّا مَرّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْحِجْرِ سَجّى ثَوْبَهُ عَلَى وَجْهِهِ وَاسْتَحَثّ رَاحِلَتَهُ، ثُمّ قَالَ: لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ الّذِينَ ظَلَمُوا إلاّ وَأَنْتُمْ بَاكُونَ، خَوْفًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ)[1].

واتە: ئیبنو هیشام دەڵێ: لە زوهرییەوە پێم گەیشتووە کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ بە لای (حِجْر)دا تێپەڕیوە، بە پۆشاکەکەی خۆی دەم‌و چاوی خۆی داپۆشیوە، وە بە خێرایی وڵاخەکەی خۆی، (حوشترەکەی خۆی) لێخوڕیوە، وە دوایی فەرموویەتی: مەچنە نێو خانوو جێگاو ڕێگای ئەوانەوە کە ستەمیان لە خۆیان کردوە، مەگەر لە حاڵەتی گریان دابن، نەبادا ئەوەی کە تووشی ئەوان بووە، تووشی ئێوەش ببێ.

١٣ / (قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : فَلَمّا أَصْبَحَ النّاسُ وَلا مَاءَ مَعَهُمْ، شَكَوْا إلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ فَدَعَا ﷺ، فَأَرْسَلَ اللّهُ سُبْحَانَهُ سَحَابَةً، فَأَمْطَرَتْ، حَتّى ارْتَوَى النّاسُ وَاحْتَمَلُوا حَاجَتَهُمْ مِنْ الْمَاءِ، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: فَحَدّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ رِجَالٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ، قَالَ قُلْت لِمَحْمُودِ: هَلْ كَانَ النّاسُ يَعْرِفُونَ النّفَاقَ فِيهِمْ؟ قَالَ نَعَمْ وَاللّهِ، إنْ كَانَ الرّجُلُ لَيَعْرِفُهُ مِنْ أَخِيهِ وَمِنْ أَبِيهِ وَمِنْ عَمّهِ وَفِي عَشِيرَتِهِ، ثُمّ يُلْبّسُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً عَلَى ذَلِكَ، ثُمّ قَالَ مَحْمُودٌ لَقَدْ أَخْبَرَنِي رِجَالٌ مِنْ قَوْمِي عَنْ رَجُلٍ مِنْ الْمُنَافِقِينَ مَعْرُوفٍ نِفَاقُهُ، كَانَ يَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ حَيْثُ سَارَ، فَلَمّا كَانَ مِنْ أَمْرِ النّاسِ بِالْحِجْرِ مَا كَانَ، وَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ دَعَا، فَأَرْسَلَ اللهُ السّحَابَةَ، فَأَمْطَرَتْ حَتّى ارْتَوَى النّاسُ، قَالُوا: أَقْبَلْنَا عَلَيْهِ نَقُولُ: وَيْحَك ، هَلْ بَعْدَ هَذَا شَيْءٌ؟! قَالَ: سَحَابَةٌ مَارّة).

واتە: (ابن اسحاق) دەڵێ: کاتێك خەڵك ئەو شەوە کە لەوێ مانەوە {دیارە لە دەوروبەری ئەو شوێنە، دەنا مادام فەرموویەتی: لەوێ مەمێننەوە! هەر لە دەوروبەری ئەوێ ماونەتەوە، لە دەوروبەری شاری (ثمود)، لە ناوچەیەی (حِجْر) بووە، لەو دەوروبەرە ماونەتەوە، چونکە پێی فەرموون: نابێ ئاو لە بیرەکەشی

١) أَخْرَجَهُ عَبْدُ الرَّزَّاق برقم: (١٦٢٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٢٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٨٠).

بخۆنــەوە، وە نـابــێ بـۆ هـیـچ شـتێك بەكـاری بێـنن، تـەنـانـەت بـۆ دەستنوێـژیش} كـاتێك ڕۆژیـان كـردەوە: ئـاویـان لـەلا نەبـوو، سـكـالای خـۆیـان بـردە لای پێغـەمبـەری خـوا ﷺ (كـە بـێ ئـاوین چی بكـەین؟) پێغـەمبـەریش ﷺ دوعـای بـۆ كـردن، خـوا ﷻ هـەورێكی نـارد، بـارانێك بـاری، تـاكـو خـەڵـك هـەموویـان تێـر ئـاو بـوون، وە هـەرچی كوندەو مەشـكـە بـوو، پڕیـان كـرد لـە ئـاو، بۆ پێویسـتیی خـۆیـان.

ئنجا (ابن اسحـاق) دەگێڕێتەوە لـە مەحمـوودی كـوڕی لـەبیـد لـە چـەند پیـاوێك لـە (بني عبد الأشهل)، دەڵـێ: بە مەحمـوودم گـوت: ئایا خەڵك لە بەینی خـۆیـان دا مونـافیقەكـانیـان دەنـاسی؟

دەڵـێ، گوتی: بەڵـێ، بە خـوا دەیـانـزانی، جـاری وا هـەبوو پیـاوێك حـاڵـەتی نیفـاقی لـە برایـەكـەی خۆی دەزانـی، لـە بـابـی دەزانـی، لـە مـامـی، لـە خزمو عـەشـیـرەتی، بـەڵام دوایی تێكـەڵ دەبوون بە یەكدی، ئنجا دوایی مەحمـوود گـوتی: پیـاوانێك لـە گـەلـەكـەی خـۆم {واتـە: لـە هۆزی (بنـي سعد الأشـهل)} هـەواڵـیـان دامـێ دەربـارەی پیـاوێك لـە مونـافیقـەكـان كـە ئـاشـكـرا بـوو، شتێكی بـاوبـوو كـە ئـەهلی نیفـاقە، كـە لـەوكـاتـەدا لـە خزمەت پێغـەمبـەر ﷺدا ڕۆیشـتـوە، ئنجـا كـاتێـك كـە ئـەوەی لـە (حِجْر) بـۆ خـەڵك هـاتـۆتـە پێش، {حـاڵـەتی بـێ ئـاویی، كـە سكـالا بۆ لای پێغـەمبـەری خـوا ﷺ كـراوە} ئـەویش لـە خـوا پـاڕاوەتـەوە، خـوای بـەرزیش هـەورێـكی نـاردوەو بـاران باریـوەو، تـاكو خـەڵك تێـر ئـاو بووە {وە پێداویستیی خـۆیـان لـە ئـاو هەڵگـرتوە}، بەو پیـاوەمان گـوت: {كـە حـاڵـەتی نیفـاقی تێدا دیـارو ئـاشكـرا بـوو}، بێـقـەزا بـێ! ئـایا دوای ئـەوە هیچی دیكەت دەوێ؟

ئەویش گـوتی: ئـەوە هەر هـەورێكی ڕێـڕەوییـە، پەیدابووە {یـانـی: بە موعجیـزەی پێغـەمبـەر ﷺی نەزانیـوە، وە بەوەی نەزانیـوە كە بە دوعـای پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو بـارانـە باریـوە!}.

١٤ / (قَـالَ ابْـنُ إسْحَـاقَ: ثُـمّ إنّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سَـارَ حَتّـى إذَا كَـانَ بِـبَعْضِ الطّـرِيقِ ضَلّتْ نَاقَتُـهُ، فَخَرَجَ أَصْحَـابُهُ فِي طَلَبِهـا، وَعِنْـدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَـابِهِ، يُقَـالُ لَـهُ عُمَـارَةُ بْـنُ حَـزْمٍ، وَكَـانَ عَقَبِيـاً بَدْرِيـاً، وَهُـوَ عَـمّ بَنِـي عَمْـرِو بْـنِ حَـزْمٍ،

وَكَانَ فِي رَحْلِهِ زَيْدُ بْنُ اللّصَيْتِ الْقَيْنُقَاعِيّ، وَكَانَ مُنَافِقًا، قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: وَيُقَالُ ابْنُ لُصَيْبٍ بِالْبَاءِ، قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَحَدّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ رِجَالٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ قَالُوا: فَقَالَ زَيْدُ بْنُ اللّصَيْتِ وَهُوَ فِي رَحْلِ عُمَارَةَ، وَعُمَارَةُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَلَيْسَ مُحَمّدٌ يَزْعُمُ أَنّهُ نَبِيٌّ ، وَيُخْبِرُكُمْ عَنْ خَبَرِ السّمَاءِ، وَهُوَ لا يَدْرِي أَيْنَ نَاقَتُهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَعُمَارَةُ عِنْدَهُ: إنّ رَجُلاً قَالَ: هَذَا مُحَمّدٌ يُخْبِرُكُمْ أَنّهُ نَبِيّ، وَيَزْعُمُ أَنّهُ يُخْبِرُكُمْ بِأَمْرِ السّمَاءِ، وَهُوَ لا يَدْرِي أَيْنَ نَاقَتُهُ، وَإِنّي وَاللهِ مَا أَعْلَمُ إلا مَا عَلّمَنِي اللهُ، وَقَدْ دَلّنِي اللهُ عَلَيْهَا، وَهِيَ فِي هَذَا الْوَادِي، فِي شِعْبِ كَذَا وَكَذَا، قَدْ حَبَسَتْهَا شَجَرَةٌ بِزِمَامِهَا، فَانْطَلِقُوا حَتّى تَأْتُونِي بِهَا، فَذَهَبُوا، فَجَاءُوا بِهَا، فَرَجَعَ عُمَارَةُ بْنُ حَزْمٍ إلَى رَحْلِهِ، فَقَالَ: وَاللهِ لَعَجَبٌ مِنْ شَيْءٍ حَدّثَنَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ آنِفًا، عَنْ مَقَالَةِ قَائِلٍ، أَخْبَرَهُ اللّهُ، قَالَ زَيْدُ بْنُ لُصَيْتٍ: فَقَالَ رَجُلٌ مِمّنْ كَانَ فِي رَحْلِ عُمَارَةَ وَلَمْ يَحْضُرْ رَسُولَ اللهِ ﷺ زَيْدٌ، وَاللهِ قَالَ هَذِهِ الْمَقَالَةَ قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَ، فَأَقْبَلَ عُمَارَةُ عَلَى زَيْدٍ يُجَافِي عُنُقَهُ وَيَقُولُ: إلَيّ عِبَادَ اللّهِ إنّ فِي رَحْلِي لَدَاهِيَةً وَمَا أَشْعُرُ، أُخْرُجْ أَيْ عَدُوّ اللهِ مِنْ رَحْلِي، فَلا تَصْحَبْنِي، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: فَزَعَمَ بَعْضُ النّاسِ أَنّ زَيْدًا تَابَ بَعْدَ ذَلِكَ، وَقَالَ بَعْضُ النّاسِ: لَمْ يَزَلْ مُتّهَمًا بِشَرّ حَتّى هَلَكَ).

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت هەتا لە (حِجر)یش تێپەڕی، دوایی لە ڕێگا حوشترەکەی لێ ون بوو، {دیارە دەبێ ئەو حوشترە نەبوو بێ کە سواری بووە، یاخود بە هەر حاڵ لەو کاتەدا بە پێیان بووە} ، لەو کاتەدا هاوەڵەکانی خوا لێیان ڕازی بێ، {یانی: هەندێك لە هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ} ، چوون ئەو حوشترە بدۆزنەوە، وە لەو کاتەدا یەکێك لە هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا بوو، پێی دەگوترا: (عمارة بن حزم)، کە یەکێك بوو لەوانەی کە لە جەنگی بەدردا بەشداریی کرد بوو، وە مامی (بني عمر بن حزم) بوو، وە لەگەڵ ئەو بەشە کاروانەی کە لەگەڵ ئەودا، (زید بن لصیت)ی قەینوقاعیی هەبوو، کە بابایەکی مونافیق بوو، (واتە: نیشانەی نیفاقی لێ دەرکەوتبوون)، (ابن هشام)یش گوتوویەتی: ناوی (زید بن لصیب) بووە.

ئنجا (ابن اسحاق) دەڵێ: عاصیم لە عومەری کوڕی قەتادە، ئەویش لە مەحموودی کوڕی لەبید، ئەویش لە پیاوانێکەوە لە (بني عبد الأشهل) ئەویش دیارە یەکێکە لە تیرەو هۆزەکانی مەدینە، گێڕاویانەتەوە کە گوتوویانە: کە زەیدی کوڕی لەصیت کە لەگەڵ ئەو بەشە کاروانەی (عُمارة)دا بوون، وە (عُمارة)ش لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دابوو، گوتی: (واتە: زەید بن لصیت گوتوویەتی): ئایا موحەممەد! پێی وانیە کە پێغەمبەرەو، هەواڵی ئاسمانتان پێ ڕادەگەیەنێ! ئەدی چۆن دەبێ نەزانێ حوشترەکەی لە کوێیە؟

ئنجا لەو کاتەدا کە (عُمارة) لەلای پێغەمبەری خوا بوو، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ﴿إن رجلاً قال: أَلَيْسَ مُحَمَّدٌ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، وَيُخْبِرُكُمْ عَنْ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَهُوَ لا يَدْرِي أَيْنَ نَاقَتُهُ؟﴾[1].

پیاوێك گوتوویەتی: ئەوە موحەممەدە هەواڵتان پێ دەدات کە پێغەمبەری خوایە، وە پێی وایە هەواڵی ئاسمانتان پێ ڕادەگەیەنێ (واتە: هەواڵی لای خوا) کەچی نازانێ حوشترەکەی لە کوێیە؟ وە بە خوا من جگە لەوەی کە خوا فێرم دەکات، نایزانم، بەڵام ئێستا خوا پێی فەرمووم: حوشترەکەم لە کوێیە! بچن ئەوە لە فلان شیوە دایە، لە فلان شوێن‌و بە ڕێشمەکەیەوە بە درەختێکەوە ئاڵقاوە، بچن بۆم بێنن، وە چوون حوشترەکەیان بۆ هێنا.

ئنجا کاتێك (عُمارة) گەڕایەوە بۆ مەنزڵگاکەی خۆی، گوتی: بە خوا شتێکی سەیر بوو، ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ تۆزێك پێش ئێستا بۆی باسکردین، دەربارەی کەسێك کە قسەیەکی وای کردوە، وە خوای پەروەردگاریش هەواڵی پێداوە، کە مەبەستی پێی (زید بن لصيت) بوو.

---

١) ئەمە (ابن كثير)، لە سیرەکەی خۆیدا هێناویەتی، لە بەرگی (٢) لاپەڕە (٣٤٩)، هەروەها لە (البداية والنهاية)یەدا، لە بەرگی (٣)، لاپەڕە (٢٤٠).

وە (الطبري)، لە (تأريخ)ەکەی خۆیدا، بەرگی (٢) لە لاپەڕە (١٨٤)، وە (ابن حبان) لە سیرەکەی خۆیدا، لە بەرگی (١) لاپەڕە (٣٦٦)دا، وە (الذهبي) لە (تأريخ الإسلام)، بەرگی (١) لاپەڕە (٣٤٠) هەموو ئەوانە ئەومیان هێناوە.

ئنجا پیاوێك لەوانەی کە لەگەڵ (عُمارة) بوون، وە لەو کاتەدا لە کۆڕەکەی پێغەمبەردا ﷺ نەبوو، گوتی: سوێند بە خوا، فلاّن کەس ئەو قسەیەی کرد، پێش ئەوەی تۆ بێی، کە (زید بن لصیت)ی قەینوقاعیی بوو.(عُمارة)ش کە سەرقافڵەکەیان بووە، سەرو گوێی تێك با هەڵدا، وە گوتی: خەڵکینە! ومرن لە نێو کاروانەکەی من دا مارێك هەیە، {یاخود دوژمنێك هەیە}، هەستیشم پێ نەکردوە، [redacted] برۆ ئەی دوژمنی خوا، لە کاروانەکەی من دوور بکەوەو، جارێکی دیکە هاوەڵایەتیی من مەکە.

(ابن اسحاق) دەڵێ: هەندێك لە خەڵکی گوتوویانە: دوای ئەوەی کە (زید) ئەو شتەی بۆ دەرکەوتوە، تۆبەی کردوە، هەندێکیش گوتوویانە: هەر تۆمەتبار بووە بە خراپە، تاکو مردوە، هەتا بە نیفاقەوە ڕۆیشتوە.

١٥ / (ثُمَّ مَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ سائِراً، فَجَعَلَ يَتَخَلَّفُ عَنْهُ الرَّجُلُ، فَيَقُولُونَ: يا رَسولَ اللهِ! تَخَلَّفَ فُلانٌ، فيَقولُ: دَعُوهُ فَإِنْ يَكُ فِيهِ خَيْرٌ، فَسَيُلْحِقُهُ اللهُ تَعالَى بِكُمْ، وَإِنْ يَكُ غَيْرَ ذَلِكَ، فَقَدْ أَراحَكُمْ اللهُ مِنْهُ، حَتَّى قِيلَ: يا رَسولَ اللهِ قَدْ تَخَلَّفَ أَبُو ذَرّ، وَأَبْطَأَ بِهِ بَعِيرُهُ، فقَالَ: دَعُوهُ، فَإِنْ يَكُ فِيهِ خَيْرٌ فَسَيُلْحِقُهُ اللهُ بِكُمْ. وَإِنْ يَكُ غَيْرَ ذَلِكَ فَقَدْ أَراحَكُمْ اللهُ مِنْهُ، وَتَلَوَّمَ أَبُو ذَرّ عَلَى بَعِيرِهِ، فَلَما أَبْطَأَ عَلَيْهِ. أَخَذَ مَتاعَهُ فَحَمَلَهُ عَلَى ظَهْرِهِ، ثُمّ خَرَجَ يَتْبَعُ أَثَرَ رَسولِ اللهِ ﷺ ماشِياً، وَنَزَلَ رَسولُ اللهِ فِي بَعْضِ مَنازِلِهِ، فَنَظَرَ ناظِرٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: يا رَسولَ اللهِ! إنّ هَذا الرّجُلَ يَمْشِي عَلَى الطريقِ وَحْدَهُ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ كُنْ أَبا ذَرّ، فَلَما تَأمّلَهُ الْقَوْمُ، قَالُوا: يا رَسولَ اللهِ! هُوَ وَاللهِ أَبُو ذَرّ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: رَحِمَ اللهُ أَبَا ذَرّ، يَمْشِي وَحْدَهُ، وَيَمُوتُ وَحْدَهُ، وَيُبْعَثُ وَحْدَهُ، وَقَالَ ابْنُ إسْحاقَ: فَحَدّثَنِي بُرَيْدَةُ بْنُ سُفْيانَ الأَسْلَمِيّ، عَنْ مُحَمّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ. قَالَ لَما نَفَى عُثْمانُ أَبَا ذَرّ إِلَى الرّبَذَةِ، وَأَصابَهُ بِها قَدَرُهُ، لَمْ يَكُنْ مَعَهُ أَحَدٌ إلا امْرَأَتُهُ وَغُلامُهُ، فَأَوْصاهُمَا أَنْ اغْسِلانِي وَكَفّنانِي، ثُمّ ضَعانِي عَلَى قارِعَةِ الطريقِ، فَأَوّلُ رَكْبٍ يَمُرّ بِكُمْ، فَقُولُوا: هَذا أَبُو ذَرّ صاحِبُ رَسولِ اللهِ ﷺ فَأَعِينُونا عَلَى دَفْنِهِ، فَلَما ماتَ، فَعَلا ذَلِكَ بِهِ، ثُمّ وَضَعاهُ عَلَى قارِعَةِ الطريقِ. وَأَقْبَلَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ مَسْعُودٍ فِي رَهْطٍ مِنْ أَهْلِ الْعِراقِ عُمّارٍ، فَلَمْ يَرُعْهُمْ إلا بِالْجِنازَةِ عَلَى ظَهْرِ الطريقِ، قَدْ كادَتْ الإِبِلُ تَطَؤُها، وَقامَ إِلَيْهِمْ الْغُلامُ، فقَالَ

هَذَا أَبُو ذَرٍّ صَاحِبُ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَعِينُونَا عَلَى دَفْنِهِ، قَالَ فَاسْتَهَلَّ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ يَبْكِي، وَيَقُولُ: صَدَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ تَمْشِي وَحْدَك، وَتَمُوتُ وَحْدَك، وَتُبْعَثُ وَحْدَك، ثُمَّ نَزَلَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ فَوَارَوْهُ، ثُمَّ حَدَّثَهُمْ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ حَدِيثَهُ، وَمَا قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي مَسِيرِهِ إِلَى تَبُوك).

واتە: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت، هەتا دەرۆیشت پیاوێك دوا دەكەوت، {ئیدی خۆ نەیاندەزانی ئەو دوا كەوتنە بۆچییە؟ ئایا ولآخەكەی بە دوایدا نەهاتوە؟ یاخود ویستوویەتی خۆی بە جێبهێڵێ؟} هەتا پیاوێك دوا دەكەوت دەیانگوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ فلان كەسیش دوا كەوت، ئەویش دەیفەرموو: لێیگەڕێن، ئەگەر خێرو چاكەی پێوەبێ، خوای بەرز دەیگەیەنێتەوە بە ئێوە، وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوەش بێ، {واتە: خێری پێوە نەبێ} ئەوە خوای ﷻ ئێوەی لێ دەرباز كردوەو ئێوەی لێ ئاسوودە كردوە {هەروەها بەو شێوەیە} تاكو گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوە (أبا ذر)یش دوای كەوت، وە حوشترەكەی سستەو لەگەڵ كاروانەكەدا ناتوانێ بڕواو ڕێ بكات، دیسان بۆ ئەویش فەرمووی: لێیگەڕێن ئەگەر خێری پێوەبێ، خوا پێتانی دەگەیەنێ، ئەگەر واش نەبێ، ئەوە خوا ئێوەی لە دەستی دەرباز كردوە وە ئەبو ذر، خوا لێی ڕازی بێ لەگەڵ حوشترەكەی هەر خەریك بوو، (واتە: لێی دەخوڕی)، بەڵام كاتێك هەر نەیتوانی بە پێی كاروانەكە بڕواو ڕێ بكات، كەلوپەلەكەی لەسەر حوشترەكەی هێنایە خوار، وە بە كۆڵی خۆی داداو، ڕۆیشت بە دوای شوێن پێی پێغەمبەردا ﷺ بە پێیان، {وە پێغەمبەری خوا ﷺ و سوپایەكە، دیارە قۆناغ قۆناغ ڕۆیشتوون، چەندان ڕۆژە ڕێ، دیارە جارجار دوای چەند سەعاتێك، كە ولآخەكان ماندوو دەبن بارگەو بناغەیان خستوە}، ئنجا لە كاتێكدا كە لە مەنزڵگایەك كە بارگەو بناغەیان خستوە، یەكێك لە موسوڵمانان كە تەماشای دەكرد، سەرنجی داو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە پیاوێك هات بە پێیان، بە تەنیا دێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (كُن أبا ذر)، (ئەی ئەو كەسەی كە بە پێیان دێی!) تۆ ئەبو زەڕ بە! ئنجا كاتێك خەڵكەكە لێی وردبوونەوەو نیزیك بۆوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بە خوا ئەوە ئەبو زەڕە، پێغەمبەری خواش فەرمووی: ﴿رَحِمَ اللهُ أَبَا ذَرٍّ يَمْشِي وَحْدَهُ، وَيَمُوتُ وَحْدَهُ، وَيُبْعَثُ وَحْدَهُ﴾.

واتە: خوا بەزەیی بە ئەبو زەڕدا بێتەوە: بە تەنێ دەڕوات، بە تەنێش دەمرێ، بە تەنێش زیندوو دەکرێتەوە.

کە دیارە دوایی وەك (ابن اسحاق) لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك کە (عثمان بن عفان)، کە خەلیفەی سێیەمی پێغەمبەرە ﷺ خوا لێی ڕازی بێ، بە (أبو ذر)ی گوت: کە بچێتە (الربذة)، {کە شوێنێك بووە لە دەرەوەی مەدینە} ، وە (أبو ذر)، لەوێ گیان دەسپێرێ، وە هیچ کەسی لەگەڵ دا نابێ، جگە لە هاوسەرەکەی‌و لە غوڵامێکی، ئنجا ئەویش وەسیەتیان بۆ دەکات، دەڵێ: بمشۆن‌و کفنم بکەن، دوایی لەسەر ڕێگا دامبنێن، هەر کۆمەڵە ڕێبوارێك، یان هەر کاروانێك بە لاتاندا تێپەڕی، بڵێن: ئەوە (أبو ذر)، هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ هاوکارییمان بکەن، بۆ شاردنەوەی، دەڵێ: کاتێك کە وەفاتی کرد، ئەوانیش بەو شێوەیان لێکرد (واتە: شۆردیان‌و، کفنیان کردو، هەڵبەتە نوێژیشیان لەسەر کردوە)، دوایی لەسەر قەراغی ڕێیە دایاننا، لەو کاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەڵکی عێراق بۆ عومرە دەهاتن، هەر ئەوەندەیان بینی: جەنازەیەك لەسەر ڕێیە دانراوە، کە خەریك بوو حوشترەکان پێی لێ بنێن، لەو کاتەدا غوڵامەکەی هەڵساو گوتی: ئەوە (أبو ذر)، هاوەڵی پێغەمبەری خوایە، هاوکارییمان بکەن، بۆ بە خاك سپاردنی، دەڵێ: یەکسەر عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەستی کرد بە گریان، وە گوتی: {صَدَقَ رَسولُ اللهِ ﷺ تَمْشِي وَحْدَك، وَتَمُوتُ وَحْدَك، وَتُبْعَثُ وَحْدَك} .

واتە: پێغەمبەری خوا ڕاستی فەرموو: بە تەنێ ڕۆیشتی، بە تەنێ مردی، بە تەنێش زیندوو دەکرێیەوە، دوایی خۆی‌و هاوەڵەکانی دابەزین، وە بە خاکیان سپارد، وە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بەسەرهاتەکەی (أبو ذر)ی بۆ گێڕاونەوە: کە چۆن لە کاروانەکەی دوا کەوتوەو، حوشترەکەی نەڕۆیشتوە، وە پێغەمبەری خواش ﷺ چی پێ فەرمووە، لەو کاتەدا کە بۆ جەنگی تەبووك چوون.

١٦ / (وَقَدْ كَانَ رَهْطٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ، مِنْهُمْ، وَدِيعَةُ بْنُ ثَابِتٍ، أَخُو بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَمَعَهُمْ رَجُلٌ مِنْ أَشْجَعَ حِلْفٌ لِبَنِي سَلِمَةَ، يُقَالُ لَهُ: مُخَشِّنُ بْنُ حُمَيِّرٍ (قَالَ ابْنُ هِشَامٍ) وَيُقَالُ: مَخْشِيّ، يُشِيرُونَ إِلَى رَسولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ مُنْطَلِقٌ إِلَى تَبُوك.

فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَتَحْسَبُونَ جِلادَ بَنِي الأَصْفَرِ كَقِتَالِ الْعَرَبِ بَعْضِهِمْ بَعْضاً؟ وَاللهِ لَكَأَنَّا بِكُمْ غَداً مُقَرَّنِينَ فِي الْحِبَالِ، إرْجَافاً وَتَرْهِيباً لِلْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ مُخَشّنُ بْنُ حُمَيّرٍ: وَاللهِ لَوَدِدْت أَنّي أُقَاضِي، عَلَى أَنْ يُضْرَبَ كُلّ رَجُلٍ مِنّا مِائَةَ جَلْدَةٍ، وَأَنْ نَنْفَلِتَ أَنْ يَنْزِلَ فِينَا قُرْآنٌ لِمَقَالَتِكُمْ هَذِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (فِيمَا بَلَغَنِي) (لِعَمّارِ بْنِ يَاسِرٍ) أَدْرِكْ الْقَوْمَ فَإِنّهُمْ قَدْ احْتَرَقُوا، فَسَلْهُمْ عَمّا قَالُوا، فَإِنْ أَنْكَروا، فَقُلْ: بَلَى، قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا"، فَانْطَلَقَ إلَيْهِمْ عَمّارٌ فَقَالَ: ذَلِكَ لَهُمْ، فَأَتَوْا رَسُولَ اللهِ ﷺ يَعْتَذِرُونَ إلَيْهِ، فَقَالَ وَدِيعَةُ بْنُ ثَابِتٍ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ وَاقِفٌ عَلَى نَاقَتِهِ، فَجَعَلَ يَقُولُ وَهُوَ آخِذٌ بِحَقَبِهَا: يَا رَسُولَ اللهِ! إنّمَا كُنّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾التوبة}.

واتە: کۆمەڵێك لە موونافیقەکان یەکیان (وَدِيعَةُ بْنُ ثَابِت) بوو، لە هۆزی بەنی عەمری بەنی عەوف، وە پیاوێك لە هۆزی ئەشجع هاوپەیمانی بەنی سەلەمە، بوو پێی گوتراوە: (مُخَشّنُ بْنُ حُمَيْرٍ)، (ابن هشام) دەڵێ: پێی گوتراوە (مَخْشِيّ) ئاماژەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە، کاتێك چووە بۆ تەبووك، وە هەندێکیان بە هەندێکیان گوتوە: ئایا پێتان وایە جەنگ لەگەڵ (بَنِي الأَصْفَرِ)دا وەك جەنگ کردنی عەرەب وایە، هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان، لەنێو خۆیاندا؟! بە خوا وامان دێتە بەرچاو: کە بەیانی ئێوە دەبینین کەلەپچە کراون (واتە: بە دیل گیراون) لە لایەن ڕۆمەکانەوە!

ئەوە وەك پروپاگەندەو ترساندنی ئیمانداران، ئنجا دەڵێ: (مُخَشّنُ بْنُ حُمَيرٍ) (دیارە لە نێویاندا بووە، بەڵام ئەو وەك وان نەبوو) گوتوویەتی: بە خوا من حەز دەکەم کە لەسەر ئەو قسەیەی کە ئێوە کردتتان، هەر کامێکمان یەکێ سەد قامچیمان لێبدرێ، بەڵام دەرباز بین لەوەی کە خوا قورئانمان دەربارە بنێرێتە خوارێ، لەبەر ئەو قسانەی ئێوە کە کردتانن، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بە عەمماری کوڕی یاسیری فەرموو: ﴿أَدْرِكْ الْقَوْمَ، فَإِنّهُمْ قَدْ احْتَرَقُوا، فَسَلْهُمْ عَمّا قَالُوا، فَإِنْ أَنْكَروا، فَقُلْ بَلَى، قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا﴾.

واتە: بگە ئەو کۆمەڵە، وە پێیان بڵێ: کە سووتان، (واتە: گوناهبار بوون)، وە لێیان بپرسە: کە چییان گوتوە؟ ئنجا ئەگەر نکوڵییان لێکرد، بڵێ: با، فلان شتەو فلان شتەتان گوتوە.

عەمماریش چوو بۆ لایان، وە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو بوو: پێی گوتن، ئەوانیش هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، وە عوزریان بۆ هێنایەوەو داوای لێبوردنیان لێکرد.

(وَدِيعَةُ بْنُ ثَابِت)یش لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا بە سواری حوشترەکەی وەستا بوو، ئەویش دەستی بە کورتانو بە لاباری حوشترەکەی پێغەمبەرەوە گرتبوو، دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە هەر ڕیمان دەبڕیو بە گاڵتە قسەمان دەکرد، ئیدی لەوبارەوە خوای زاڵی پایە بەرز، ئەوەی ناردە خوارێ:

﴿ وَلَبِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾التوبة.

واتە: ئەگەر لێیان بپرسی: دەڵێن: ئێمە هەروا قسەی ڕییەمان دەکردو بە گاڵتە قسەمان دەکرد، بڵێ: ئایا گاڵتە بە خواو، بە ئایەتەکانی خواو، بە پێغەمبەری خوا دەکەن؟ تا کۆتایی ئایەتەکان کە دوایی دەیانگەینێ.

(ابن هشام) دەڵێ: (مُخَشّنُ بْنُ حُمَيرٍ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کە زیانی بە من گەیاندوە، ناوی خۆمو ناوی بابمە! {ناوی خۆی کە (مُخَشّن)ە لە زبرییەوە هاتوە، ناوی بابیشی (حُمَير)یش یانی: کەرۆکە (تصغير حمار)، (ابن هشام) دەڵێ: من پێم وایە ئەوەی لەم ئایەتەدا بەر عەفو کەوت تەنیا (مُخَشّنُ بْنُ حُمَير) بوو، دواییش ناوی لە خۆی نا: (عبد الرحمن) وە داوای لە خوا کرد بە شەهیدیی بڕواتو، کەسیش بە شوێنەکەی نەزانێ، ئیدی ئەوە بوو کە لە جەنگی یەمامەدا کوژرا، وە کەسیش جەنازەکەی نەدۆزیەوە، (دیارە دوعایەکەی قبوڵ بووە).

١٧ / (وَلَما ﷺ بَلَغَ إلَى تَبُوك، أتَاهُ يُحَنَّةُ بْنُ رُؤْبَةَ، صَاحِبُ أيْلَة، فَصَالَحَ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَأَعْطَاهُ الْجِزْيَة، وَأَتَاهُ أَهْلُ جَرْبَاءَ وَأَذْرُحَ، فَأَعْطوهُ الْجِزْيَة، فَكَتَبَ رَسولُ اللهِ ﷺ كِتَاباً، فَهُوَ عِنْدَهُمْ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك گەیشتە تەبووك {(أيلة)، شارێك بووە، ناوچەیەك بووە کە کەسێك لەوێ بەرپرس بووە بە ناوی (يُحَنَّةُ بْنُ رُؤْبَةَ)، دیارە دەبێ نەصرانیی بووبێ بە پێی ناوەکەی}.

(ابن هشام) دەڵێ : (يُحَنَّةُ بْنُ رُؤْبَةَ) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا پێك هاتنو، صوڵحی لەگەڵ دا کرد، ئەویش سەرانەی دا بە پێغەمبەر ﷺ، هەروەها خەڵکی (جربا)و (أذرح)، هاتن، ئەوانیش بە هەمان شێوە بڕیاریاندا کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا تەبا بن، وە سەرانەیاندا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ نووسینێکی نووسی، وە نووسینەکەی وێیاندا. {دیارە دەبێ نوسخەکی دیکەش لەلای مسوڵمانان بووبێ}.

ئنجا ئەوەی کە بۆ (يُحَنَّةُ بْنُ رُؤْبَةَ)، نووسی، ئەمە دەقی کیتابەکەیە:

﴿فَكَتَبَ لِيُحَنَّةَ بْنِ رُؤْبَةَ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ أَمَنَةٌ مِنَ اللهِ وَمُحَمّدٍ النَّبِيِّ رَسولِ اللهِ ﷺ لِيُحَنَّةَ بْنِ رُؤْبَةَ وَأَهْلِ أَيْلَة، سُفُنُهُمْ وَسَيارَتُهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ، لَهُمْ ذِمَّةُ اللهِ وَذِمَّةُ مُحَمّدٍ النَّبِيِّ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُمْ مِنْ أَهْلِ الشامِ، وَأَهْلِ الْيَمَنِ، وَأَهْلِ الْبَحْرِ، فَمَنْ أَحْدَثَ مِنْهُمْ حَدَثاً، فَإِنَّهُ لا يَحُولُ مالُهُ دُونَ نَفْسِهِ، وَإِنَّهُ طَيِّبٌ لِمَنْ أَخَذَهُ مِنْ النَاسِ، وَإِنَّهُ لا يَحِلّ أَنْ يُمْنَعُوا مَاءً يَرِدُونَهُ، وَلا طَرِيقًا يُرِيدُونَهُ، مِنْ بَرٍّ أَوْ بَحْرٍ﴾.

واتە: بۆ (يُحَنَّةُ بْنُ رُؤْبَةَ)ی نووسی :

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەمە دڵنیاکەرەوەیە لە خواو لە پێغەمبەری خواوە بۆ (يُحَنَّةُ بْنُ رُؤْبَةَ)، وە خەڵکی ئەیلە کە کەشتییەکانیانو کاروانەکانیان لە وشکانییو لە دەریادا، کە لەگەڵ خواو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا پەیمانیان هەیە، وە هەر کەسێك لەگەڵیان بێ لە خەڵکی شامو لە خەڵکی یەمەن، وە لە خەڵکی دەریا {واتە: لە خەڵکی دەوروبەری دەریانیشین}.

بەڵام هەرکامێك لەوان کەتنێکی کرد، ئەوە ئەو ماڵەی کە دەیدەن بە سەرانە، نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەدا کە سزا بدرێت، لەسەر تاوانەکەی، وە لەو کاتەدا ماڵیان حەڵاڵ دەبێ، بۆ هەر کەسێك کە دەستی بکەوێت، بەڵام نابێ ڕێیان لێ بگیرێ، بچنە سەر هەر ئاوێك کە دەیانەوێ، وە هەر ڕێیەك کە بیانەوێ پێیدا بڕۆن، لە وشکانییو لە دەریا.

{یانی: لەو ناوچەیەدا ئازادن بێنو بچن، مادام لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا هاوپەیمانن} .

١٨ / (إِنّ رَسولَ اللهِ ﷺ دَعَا خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ، فَبَعَثَهُ إِلَى أُكَيْدِرِ دُومَةَ، وَهُوَ أُكَيْدِرُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، رَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ، كَانَ مَلِكاً عَلَيْهَا، وَكَانَ نَصْرَانِياً، فَقَال رَسولُ اللهِ ﷺ لِخَالِدِ: إِنّكَ سَتَجِدُهُ يَصِيدُ الْبَقَرَ، فَخَرَجَ خَالِدٌ حَتّى إِذَا كَان مِنْ حِصْنِهِ بِمَنْظَرِ الْعَيْنِ، وَفِي لَيْلَةٍ مُقْمِرَةٍ صَائِفَةٍ، وَهُوَ عَلَى سَطْحٍ لَهُ، وَمَعَ امْرَأَتِهِ، فَبَاتَتْ الْبَقَرُ تَحُكّ بِقُرُونِهَا بَابَ الْقَصْرِ، فَقَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: هَلْ رَأَيْت مِثْلَ هَذَا قَطّ؟ قَالَ: لا وَاللهِ، قَالَتْ فَمَنْ يَتْرُكُ هَذِهِ؟ قَالَ: لا أَحَدَ، فَنَزَلَ فَأَمَرَ بِفَرَسِهِ، فَأُسْرِجَ لَهُ، وَرَكِبَ مَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فِيهِمْ أَخٌ لَهُ، يُقَالُ لَهُ: حَسّانُ. فَرَكِبَ وَخَرَجُوا مَعَهُ بِمَطَارِدِهِمْ، فَلَمّا خَرَجُوا، تَلَقّتْهُمْ خَيْلُ رَسولِ اللهِ ﷺ فَأَخَذَتْهُ، وَقَتَلُوا أَخَاهُ، وَقَدْ كَانَ عَلَيْهِ قُبَاءٌ مِنْ دِيبَاجٍ مُخَوّصٍ بِالذّهَبِ، فَاسْتَلَبَهُ خَالِدٌ فَبَعَثَ بِهِ إِلَى رَسولِ اللهِ ﷺ قَبْلَ قُدُومِهِ بِهِ عَلَيْهِ، قَالَ ابْنُ إِسْحَاق: فَحَدّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ رَأَيْت قُبَاءَ أُكَيْدِرِ حِينَ قُدِمَ بِهِ عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ فَجَعَلَ الْمُسْلِمُونَ يَلْمِسونَهُ بِأَيْدِيهِمْ وَيَتَعَجّبُونَ مِنْهُ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ فَوَالّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا).

ثُمّ إِنّ خَالِدًا قَدِمَ أُكَيْدِرًا عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ فَحَقَنَ لَهُ دَمَهُ، وَصَالَحَهُ عَلَى الْجِزْيَةِ، ثُمّ خَلّى سَبِيلَهُ، فَرَجَعَ إِلَى قَرْيَتِهِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ طَيّئٍ يُقَالُ لَهُ: بُجَيْر بْنُ بُجَرَةَ، يَذْكُرُ قَوْلَ رَسولِ اللهِ ﷺ لِخَالِدِ: إِنّكَ سَتَجِدُهُ يَصِيدُ الْبَقَرَ، وَمَا صَنَعَتْ الْبَقَرُ تِلْكَ اللّيْلَةَ، حَتّى اسْتَخْرَجَتْهُ، لِتَصْدِيقِ قَوْلِ رَسولِ اللهِ ﷺ:

تَبَـارَكَ سـائِقُ الْـبَقَـرَاتِ إِنِّـي ... رَأَيْـتُ اللّهَ يَهْدِي كُـلَّ هـادِ

فَمَنْ يَكُ حائِدًا عَنْ ذِي تَبُوكٍ ... فَـإِنـا قَـدْ أُمِـرْنـا بِالْـجِهـادِ

واتـە: پێغـەمبەری خـوا ﷺ خالیدی کـوڕی وەلیدی بانگ کـردو نـاردی بەرەو لای: (أُكَيْدِرِ دُومَةَ)، {دیـارە (دومـة) دیـارە نـاوی نـاوچەیـەك بووەو، پـادشـایـەکەی نـاوی ئوکەیدەری کـوڕی عـەبدولمەلیك} بووە، کە پیـاوێك بووە لە هۆزی کیندەو پادشـا بووە لـەسەریان، وە نەصرانییش بووە، پێغەمبـەر ﷺ بە خـالیدی فـەرمـوو: {إِنَّـكَ سَتَجِدُهُ يَصِيدُ الْبَقَـرَ} تۆ کـە دەچی، دەبینی: خـەریکی ڕاوکـردنی مانگایـە (واتـە: مانگای کێـوی).

ئنجا خالـید چـوو، کـاتێك کـە لـە قەڵاکـەی چەشـمەندازێـك[1] لێـوە دەرکـەوت لـە شـەوێکی مانگـە شـەوی ئـاسـمان سـاف دا، ئـەویش لـەسـەر بانەکـەی خـەوتبوو، وە هـاوسـەرەکەی لـەگـەڵـدا بوو، مانگـایـەکی کێـوی هـات بە قـۆچ دەرگـای کۆشکەکـەی دەخوراند، {یـاخود قۆچی خـۆی بە دەرگـای کۆشکەکـە دەخوراند}، ژنەکـەی پێـی گـوت: هـەرگیز شتی وات بینیـوە؟ کـابراش (ئوکـەیدیر) گـوتی: نـا قـەت شـتی وام نەبینیـوە، ئنجا چۆن دەبێ من واز لەو مانگـا کێـوییە بێـنم، کە دێـنێ قۆچی خـۆی بە دەرگـای کۆشکەکـەمان دەخورێـنـێ، ئـایـا کـەس واز لـەوە دێـنـێ؟ (کـەس واز لەوە ناهێـنـێ و، دەبێ بچم)، ئیـدی لـەسـەر بانەکـە دابـەزی و فـەرمانی کـرد: ئەسپـەکەیـان بۆ زین کردو، کـۆمەڵێك لەوانەی کە لێی نیزیك بوون لە خزمانی، لەگـەڵی دەرچوون، کە یـەکێکیـان برای بوو، بـە نـاوی (حەسسـان) سـوار بـوون، وە بـە دوای ئـەو مانگـا کێـوییە کەوتـن، {کە مەرجیش نیە هـەر یـەکێك بووبـێ}، کـاتێـك کـە ڕۆیشـتن و، ڕاوی ئەو مانگا کێـوییـەیان دەنا، ئەسپـەکانی پێغەمبـەر ﷺ کە خالیـد فەرمانـدەیان بوو، پێیـان گـەیشتن، گـرتیـانن، وە برایـەکـەیـان کوشت، {کـە دیـارە پێکـەوە بەشـەڕ هاتـوون}، کە پۆشـاکێکی ئـاوریشمی، بە زێـر چـنـراوی لـەبەر دابوو، خالیـدیش خـوا لێـی ڕازی بێ، پۆشـاك و چـەك و شـتـەکـانی لێکردنـەوەو، نـاردنی بۆ پێغـەمبـەری خـوا ﷺ، بەر لـەوەی بۆخـۆی بچێتـەوەو بگـەڕێتـەوە بۆ خـزمەتـی.

---

[1] ) واتـە: ئەندازەیـەك کە لە حوکمی بینـینی (چاو) دایـە.

ئنجا ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: ئەو قوبایەی ئوکەیدیر کە بینیم هێنایان بۆ پێغەمبەری خوا، مسوڵمانان دەستیان لێدەدا، وە پێی سەرسام بوون، {کە ئەو بەرگە ئاوریشمییە، چەند جوانو نەرمە!} پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ﴿أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا﴾[1].

واتە، ئایا سەرتان سوڕ دەمێنێ لەو بەرگو پۆشاکە (نەرمو جوانە)؟! سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، ئەو دەستەسڕو خاولییەی کە سەعدی کوڕی موعاذ، لە بەهەشت دەستی پێ دەسڕێ، لەمە چاکترو جوانترە.

ئنجا خالید خوا لێی ڕازی بێ، ئوکەیدیری بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خواش خوێنی پاراست، وە لەگەڵی پێکهات کە سەرانە بدات، وە دوایی مۆڵەتی دا بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی.

ئنجا پیاوێك لە (طَيِّئ)، کە ناوی (بُجَيْرُ بْنُ بُجْرَةَ) بووە، باسی ئەو قسەیەی یاد کردوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خالیدی فەرموو: کاتێك کە تۆ دەگەیە ئوکەیدیر، ڕاوە مانگا دەکات، وە دواییش ئەو شەوە چۆن مانگا قۆچی خۆی بە دەرگای کۆشکەکەی خوراندوە، تاکو ناچار بووە بە دوای بکەوێ. کە ئەوە ڕاستیی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوای دەرخستوە، ئنجا ئەو کابرایە لەوبارەیەوە، بە شیعر گوتوویەتی:

تَبَارَكَ سَائِقُ الْبَقَرَاتِ إِنِّي ... رَأَيْتُ اللَّهَ يَهْدِي كُلَّ هَادِ

فَمَنْ يَكُ حَائِدًا عَنْ ذِي تَبُوكٍ ... فَإِنَا قَدْ أُمِرْنَا بِالْجِهَادِ

واتە: بەرزیو دەوام بۆ ئەو کەسەی مانگایەکانی لێخوڕین (بەرەو شوێنی مەبەست).

من دەبینم خوا ڕێنمایی هەر ڕێی ڕاستگرتوویەك دەکات.

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّيَالِسِي، برقم: (٧١٠)، وَأَحْمَد، برقم: (١٨٦١٨)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦٢٦٤)، وَمُسْلِمْ برقم: (٢٤٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٨٤٧) عَن البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ.

ئنجا هەر کەسێك لە خاوەنی جەنگی تەبووك لابدا (واتە: بڕوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نەهێنێ) ئەوە ئێمە فەرمانمان پێکراوە جیهادی لە دژ بکەین.

١٩ / (فَأَقَامَ رَسولُ اللهِ ﷺ بِتَبُوكَ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، لَمْ يُجَاوِزْهَا، ثُمّ انْصَرَفَ قَافِلاً إلَى الْمَدِينَةِ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ (١٠ تاکو ٢٠) شەوێك مایەوە لە تەبووك {دەڵێ: (بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً)، ئێمە لە کوردییدا دەبێ بڵێین: (١٠- ١٥- ٢٠) شەوێك}، وە لەوێ بەولاوەتر نەچوو{واتە: لە تەبووك تێنەپەڕی، دیارە ڕۆمەکانیش ئامادە نەبوون، ترسان لەوەی کە لەگەڵی ڕووبەڕوو ببنەوە}، بۆیە دواتر پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە.

٢٠ / (كَانَ فِي الطريقِ مَاءٌ يَخْرُجُ مِنْ وَشَلٍ، مَا يَرْوِي الرّاكِبَ وَالرّاكِبَيْنِ وَالثّلاثةَ بِوَادٍ يُقَالُ لَهُ: وَادِي الْمُشَقّقِ، فَقَالَ رَسولُ اللّهِ ﷺ: مَنْ سَبَقَنَا إلَى ذَلِكَ الْوَادِي، فَلا يَسْتَقِيَنّ مِنْهُ شَيْئاً، حَتّى نأْتِيَهُ، قَالَ: فَسَبَقَهُ إلَيْهِ نَفَرٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ، فَاسْتَقَوْا مَا فِيهِ، فَلَما أَتَاهُ رَسولُ اللهِ ﷺ وَقَفَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرَ فِيهِ شَيْئاً، فَقَالَ: مَنْ سَبَقَنَا إلَى هَذَا الْمَاءِ؟ فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسولَ اللهِ! فُلانٌ وَفُلانٌ، فَقَالَ: أَوَلَمْ أَنْهَهُمْ أَنْ يَسْتَقُوا مِنْهُ شَيْئاً حَتّى آتِيَهُ (ثُمّ لَعَنَهُمْ ﷺ وَدَعَا عَلَيْهِمْ، ثُمّ نَزَلَ فَوَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ الْوَشَلِ، فَجَعَلَ يَصُبّ فِي يَدِهِ مَا شَاءَ اللّهُ أَنْ يَصُبّ، ثُمّ نَضَحَهُ بِهِ وَمَسَحَهُ بِيَدِهِ، وَدَعَا رَسولُ اللهِ ﷺ بِمَا شَاءَ اللّهُ أَنْ يَدْعُوَ لَهُ، فَانْخَرَقَ مِنْ الْمَاءِ (كَمَا يَقُولُ مَنْ سَمِعَهُ) مَا إنّ لَهُ حِسّاً كَحِسّ الصّوَاعِقِ، فَشَرِبَ النَاسُ وَاسْتَقَوْا حَاجَتَهُمْ مِنْهُ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: لَئِنْ بَقِيتُمْ أَوْ مَنْ بَقِيَ مِنْكُمْ، لَتَسْمَعُنّ بِهَذَا الْوَادِي ).

واتە: لە ڕێگادا ئاوێك هەبوو کە لە شوێنێك دەردەچوو سەرچاوەیەکی بێهێز بوو، کە تەنیا سوارێك، یان دوو سوار، یان سێ سوارێکی تێر دەکرد، (واتە: بەشی دوو سێ سوارانی دەکرد، کە خۆیانو وڵاخەکانیان لێی بخۆنەوە) لە شیوێکدا کە پێی دەگوترا: (وَادِي الْمُشَقّقِ).

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿مَنْ سَبَقَنَا إِلَى ذَلِكَ الْوَادِي فَلا يَسْتَقِيَنَّ مِنْهُ شَيْئاً حَتَّى نَاتِيَهُ﴾ هەر کەسێك لە پێش ئێمەدا گەیشتە فلان شیوە. با هیچ لەو سەرچاوەیە نەخواتەوەو لێی هەڵ نەهێنجێ، تاکو هەمووومان دەچین. {دیارە مەبەستی ئەوە بووە کە دوعا بکاتو ئاوەکە بەرەکەتی بکەوێتێ}، کەچی کۆمەڵێك لە مونافیقەکان چوون {لە سێ تا نۆ کەس[1] لە دەغەڵەکان} وە ئاوەکەیان لێ هەڵێنجا، کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو، لەسەری وەستا، هیچی تێدا نەبینی، {چونکە ئاوەکە بەشی دوو سێ سواری دەکرد، لەگەڵ ولاخەکانیان}.

ئنجا فەرمووی: کێ پێشمان کەوتوە بۆ سەر ئاوەکە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! فلان کەسو فلان کەس، ئەویش فەرمووی: ئەدی ڕێگرییم لێ نەکردبوون. کە هیچی لێ هەڵنەهێنجن تاکو من دێم؟ دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ تووکی لێکردنو نەفرەتی لێکردن، (دوعای خراپی لێکردن)، دوایی دابەزیو دەستی خستە ژێر ئەو بەردە کە ئاوەکەی لێ دەهاتە دەرێ، ئیدی ئاو ڕژایە سەر دەستی، ئەوەندەی کە خوا بیەوێ بڕژێ، دوایی پێغەمبەر ﷺ ئاوەکەی ڕاوەشاندو پڕژاندی وە دەستی پێدا هێنا، وە پێغەمبەری خوا ئەوەی کە خوا هێنایە سەر زمانی، دوعای کرد. ئنجا ئاو دەرقوڵی، وە ئەوەی گوێی لێبووە گوتوویەتی: دەنگی وەك هەورە تریشقە بوو، وە ئەو سوپا زۆرە هەرچی کە پێویستیان بوو، هەم لێیان خواردەوە. هەم دەفرو شتەکانی خۆیانیان لێ پڕ کرد.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئێوە بمێنن، یاخود کەستان لێ بمێنی. دوایی دەبیستن ئەم شیوو دۆڵە {واتە: هەموو دەورووبەری} دەبێتە شوێنێکی وا {زۆر پڕ لەوەڕو زەمەند} کە ناوبانگی هەبێ.

٢١ / (إِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ كَانَ يُحَدِّثُ، قَالَ: قُمْتُ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ وَأَنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، قَالَ فَرَأَيْتُ شُعْلَةً مِنْ نَارٍ فِي نَاحِيَةِ الْعَسْكَرِ قَالَ: فَاتَّبَعْتُهَا أَنْظُرُ إِلَيْهَا، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَإِذَا عَبْدُ اللهِ ذُو الْبِجَادَيْنِ الْمُزَنِيُّ قَدْ مَاتَ، وَإِذَا هُمْ قَدْ حَفَرُوا لَهُ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حُفْرَتِهِ

---

١) چونکە (نفر) لە سێ کەس تاکو نۆ (٣ - ٩) دەگرێتەوە.

وَأَبُو بَكرٍ وَعُمَرُ يُدَلِّيَانِهِ إِلَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ أَدْنِيَا إِلَيَّ أَخَاكُمَا، فَدَلَّيَاهُ إِلَيْهِ، فَلَما هَيَّأَهُ لِشِقِّهِ قَالَ: أَللَّهُمَّ إِنِّي أَمْسَيْتُ رَاضِياً عَنْهُ، فَارْضَ عَنْهُ، قَالَ يَقُولُ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: يَا لَيْتَنِي كُنْتُ صَاحِبَ الْحُفْرَةِ).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود گێڕاویەتەوە دەڵێ: من لە نیوەی شەودا هەڵسام، ئەوکاتەی لە خزمەت پێغەمبەر خوادا ﷺ بووین لە جەنگی تەبووك، بڵێسەی ئاگرێکم بینی لە لایەرێکی سوپاکەوە، منیش شوێنی کەوتم، تەماشای بکەم داخۆ چییە؟ تەماشام کرد: کە ئەوە پێغەمبەری خواو، ئەبو بەکرو عومەرن، (عَبْدُ اللّهِ ذُو الْبِجَادَيْنِ الْمُزَنِيِّ)ی وەفاتی کردوە، ئەوانیش گۆڕێکیان بۆ هەڵکەندوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو گۆڕەکەیدایە، وە ئەبو بەکرو عومەریش خوا لێیان ڕازی بێ، جەنازەکەی بۆ شۆڕ دەکەنەوە، ئەویش دەفەرموێ: براکەتانم بۆ شۆڕ بکەنەوە، ئەوانیش شۆڕیان کردەوە، هەتا کاتێك خستیە لا گۆڕەکەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿اللّهُمَّ إِنِّي أَمْسَيْتُ رَاضِياً عَنْهُ، فَارْضَ عَنْهُ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيّ فِي الأَوْسَط برقم: (٩١١١)، وَابْنُ كَثِير فِي السيرة، وَغَيْرهُمَا} .

واتە: ئەی خوایە! من لێی ڕازییم، تۆش لێی ڕازی بە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود گوتی: خۆزگە من خاوەنی ئەم گۆڕە بوومایە.

(قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: وَإِنَّمَا سُمِّيَ ذُو الْبِجَادَيْنِ، لأَنَّهُ كَانَ يُنَازِعُ إِلَى الإِسْلامِ، فَيَمْنَعُهُ قَوْمُهُ مِنْ ذَلِكَ وَيُضَيِّقُونَ عَلَيْهِ، حَتَّى تَرَكُوهُ فِي بِجَادٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ، وَالْبِجَادُ الْكِسَاءُ الْغَلِيظُ الْجَافِي ، فَهَرَبَ مِنْهُمْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَلَما كَانَ قَرِيبًا مِنْهُ، شَقَّ بِجَادَهُ بِاثْنَيْنِ فَاتَّزَرَ بِوَاحِدٍ، وَاشْتَمَلَ بِالآخَرِ، ثُمَّ أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقِيلَ لَهُ: ذُو الْبِجَادَيْنِ لِذَلِكَ ).

واتە: ئیبنو هیشام دەڵێ: بۆیە پێی گوتراوە: (ذُو الْبِجَادَيْنِ)، چونکە دەیویست بێتە نێو ئیسلامەوەو، خزمو خەڵکەکەشی نەیاندەهێشت، وە زۆر سەغڵەتیان دەکرد، هەتا کاتێك بوو، کە تەنیا بیجادێکی لەبەر مابوو، {بیجادیش: بەرگێکی ئەستووری زبرە} هەر ئەومیان لەبەردا هێشت} ، ئنجا هەر بەو بەرگەوە ڕایکرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو کاتێك لێی نیزیك کەوتەوە، بیجادەکەی کە لەبەری دابووە، کردی بە دوو بەش: بەشێکیانی لە نیوەی خوارێی جەستەی

ئالاند، وە بەشەکەی دیکەشی بەسەر شانی خۆی دادا، {واتە: بەشێکی لە جێی بیجامەو شەرواڵ، بەشێکی دیکەشی لەجێی کراسو چۆغە}، دوایی هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەوە پێی گوترا: (ذُو البِجَادَيْنِ)، (بجاد)یش قوماشێکی ئەستووری زبرە.

٢٢ / (قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: ثُمَّ أَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى نَزَلَ بِذِي أَوَانٍ، بَلَدٌ بَيْنَهُ وَبَينَ الْمَدِينَةِ سَاعَةٌ مِنْ نَهَارٍ، وَكَانَ أَصْحَابُ مَسْجِدِ الضِّرَارِ قَدْ كَانُوا أَتَوْهُ، وَهُوَ يَتَجَهَّزُ إِلَى تَبُوكَ ، فَقَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنا قَدْ بَنَيْنَا مَسْجِدًا لِذِي الْعِلَةِ وَالْحَاجَةِ وَاللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ وَاللَّيْلَةِ الشَاتِيَةِ، وَإِنا نُحِبّ أَنْ تَاتِيَنَا، فَتُصَلِّيَ لَنَا فِيهِ فَقَالَ: إِنّي عَلَى جَنَاحِ سَفَرٍ وَحَالِ شُغْلٍ أَوْ كَمَا قَالَ ﷺ، وَلَوْ قَدْ قَدِمْنَا إِنْ شَاءَ اللهُ لأَتَيْنَاكُمْ، فَصَلّيْنَا لَكُمْ فِيهِ، فَلَما نَزَلَ بِذِي أَوَانٍ، أَتَاهُ خَبَرُ الْمَسْجِدِ، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مَالِكَ بْنَ الدّخْشُمِ أَخَا بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ، وَمَعْنَ بْنَ عَدِيّ. أوْ أَخَاهُ عَاصِمَ بْنَ عَدِيّ، أَخَا بَنِي الْعَجْلانِ فَقَالَ: انْطَلِقَا إِلَى هَذَا الْمَسْجِدِ الظَّالِم أَهْلُهُ، فَاهْدِمَاهُ وَحَرِّقَاهُ، فَخَرَجَا سَرِيعَيْنِ، حَتّى أَتَيَا بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ، وَهُمْ رَهْطُ مَالِكِ بْنِ الدّخْشُمِ، فَقَالَ مَالِكٌ لِمَعْنٍ: أَنْظِرْنِي حَتَّى أخرج إِلَيْكَ بنار مِنْ أَهْلِي. فَدَخَلَ إِلَى أَهْلِهِ، فَأَخَذَ سَعَفًا مِنْ النَّخْلِ، فَأَشْعَلَ فِيهِ نَارًا، ثُمَّ خَرَجَا يَشْتَدَّانِ حَتَّى دَخَلاهُ وَفِيهِ أَهْلُهُ، فَحَرَّقَاهُ وَهَدَّمَاهُ، وَتَفَرَّقُوا عَنْهُ، وَنَزَلَ فِيهِمْ مِنْ الْقُرْآنِ مَا نَزَلَ: وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِداً ضِرَاراً وَكُفْراً وَتَفْرِيقاً بَينَ الْمُؤْمِنِينَ... إِلَى آخِرِ الْقِصَّةِ).

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە هەتا گەیشتە (ذِي أَوَان)، شوێنێکە کە لە نێوان ئەوێو مەدینەدا سەعاتە ڕێیەکە. {واتە: بەشێك لە ڕۆژێك}، ئنجا ئەوانەی کە مزگەوتی (ضرار)یان دروست کرد بوو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە دەکرد، بچێ بۆ جەنگی تەبووك، هاتبوونە خزمەتی، وە پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئێمە مزگەوتێکمان دروست کردوە، بۆ بابای نەخۆش ئەوەی نەتوانێ بێتە مزگەوتو، بۆ شەوی بارانێاوی و شەوی سارد، وە ئێمە حەز دەکەین تۆ بێی لەو مزگەوتەدا نوێژمان بۆ بکەی.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئێستا ئێمە لەسەر ڕۆیشتنینو سەرقاڵین، یان شتێکی وای فەرموو، بەڵام ئەگەر خوا حەز بکات، هەر کاتێك گەڕاینەوە دێینە لاتان، وە لەو مزگەوتەدا نوێژتان بۆ دەکەین.

ئنجا کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺو ئەوانی دی، گەیشتە (ذِي أَوَانٍ)، هەواڵی ئەو مزگەوتەی پێگەیشت، {کە ئەو مزگەوتە بە پیلان دروست کراوە، وەك دوایی لە درێژەی تەفسیری ئایەتەکان دا بە تەفصیلْ باسی دەکەین}.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ (مَالِك بْن الدّخْشُم) کە لە هۆزی بەنی سالمی بەنی عەوف بوو، وە (مَعْنَ بْنَ عَدِيّ) یاخود (عَاصِمَ بْنَ عَدِيّ) کە لە هۆزی بەنی عەجلان بوو، بانگی کردن فەرمووی: (انْطَلِقَا إِلَى هَذَا الْمَسْجِدِ الظَّالِمِ أَهْلُهُ فَاهْدِمَاهُ وَحَرِّقَاهُ)، واتە بچن بۆ ئەو مزگەوتەی کە ئەوانەی ستەمیان کردوە دروستیان کردوە، بیڕووخێنن، وە بیسووتێنن، ئەوانیش بە خێرایی چوون تاکو چوونە لای بەنی سالمی بەنی عەوف، کە کۆمەڵی (مَالِك بْن الدّخْشُم) بوون، وە مالیك بە مەعنی گوت: لێم بگەڕێ تا من دەچم، بزووتێك لەماڵەوە دێنم، ئیدی چووە ماڵەوە، بزووتە ئاگرێکی لە دارخورما هێنا، {بزووت ئەو دارەیە سەرێکی ئاگر بێو سەرەکەی دیکەشی بگیرێ} وە بە خێرایی ئاگری لە مزگەوتەکە بەردا، تاکو چوونە نێو مزگەوتەکەو سووتاندیان، وە ئەو خەڵکەی کە لە نێوی دابوون، پرژو بڵاو بوونو ڕایان کرد، وە لە بارەی ئەوانەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوار:

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ﴿١٠٧﴾﴾، واتە: ئایەتەکانی (١٠٧ و ١٠٨ و ١٠٩ و ١١٠) کە دوایی قسەیان لەبارەوە دەکەین.

٢٣ / باسی ئەو سێ کەسەی کە بڕیار لەبارەیانەوە دواخرا بووو، خاوەن پاساو (عُذر) بوون، دەڵێ:

(قَال ابن هشام: قَدِمَ رَسولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَقَدْ كَانَ تَخَلَّفَ عَنْهُ رَهْطٌ مِنْ الْمُنَافِقِينَ، وَتَخَلَّفَ أُولَـئِكَ الرَّهْطُ الثَّلاثَة مِنْ الْمُسْلِمِينَ، مِنْ غَيْرِ شَكٍّ وَلا نِفَاقٍ: كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ، وَمُرَارَةُ بْنُ الربِيع، وَهِلالُ بْنُ أُمية؛ فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ

لأَصْحَابِهِ: لا تُكَلِّمُنَّ أَحَداً مِنْ هَؤُلاءِ الثَّلاثَةِ، وَأَتَاهُ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ مِنَ الْمُنَافِقِينَ، فَجَعَلُوا يَحْلِفُونَ لَهُ وَيَعْتَذِرُونَ فَصَفَحَ عَنْهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَلَمْ يَعْذِرْهُمْ اللهُ وَلا رَسُولُهُ، وَاعْتَزَلَ الْمُسْلِمُونَ كَلامَ أُولَئِكَ النَّفَرِ الثَّلاثَةِ).

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە، وە كۆمەڵێك لە دەغەڵ مونافیقەكانی كە لە جەنگ دواكەوتبوون، وە ئەو سێ نەفەرەش لە مسوڵمان كە هیچ گومانیان نەبوو، وە مونافیق نەبوون، واتە: (كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ، وَمُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعِ، وَهِلالُ بْنُ أُمَيَّة)، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: با هیچ یەكێ لە ئێوە، هیچ لەم سێ نەفەرە نەدوێنێ، ئەوانەی لە دەغەڵو دووڕووەكی دواكەوتوون هاتنە لای سوێندیان بۆ خواردو پاساویان بۆ هێنایەوە، تاكو لێیان ببووری، وە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پاساویان لێ قبووڵ نەكردن، مسوڵمانان دوورەپەرێزییان كرد لەو سێ كەسە كە بیاندوێنن .

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ بۆ جاری چوارەمین لـەم سـوورەتـە موبارەکەدا، بە نازنـاوی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، مسولْمانـان دەدوێـنـێ، دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾.

ئـەی ئـەوانەی بڕواتـان هێـنـاوە! ئـەوە چیتـانە کە کـاتێك پێـتـان گـوترا: لـە ڕێـی خوادا بچن بۆ جـەنگو جیهاد، خۆتـان قـورس کرد بەرەو زەوی، خۆتـان بە زەوییەوە نووساند، {واتـە: سستیی‌و تـەنبەڵییتان نواند}، ئایا ژیـانی دنیـاتـان پـێ پەسـندتـرەو هەڵبژاردوە بەسەر ژیـانی دواڕۆژدا، لـە حـاڵێکـدا کـە ڕابـواردنو خۆشـیی‌و لـەززەتی ژیـانی دنیـا، لـە چاو هـی دواڕۆژ، جگە لـە کـەمێك، شتێکی دیکە نیـە.

زانـایـانو لێکۆڵـەرەوانی مانـاو مەبەسـتـەکـانی قورئـان، هـەموویـان باسیـان کـردوە، کە لـەم ئـایـەتـە بە دواوە، خـوا ﷻ باسـی ڕووداوەکانی جـەنگی تـەبووك دەکـات، هـەر بۆیـەش ئێمـە پـێش ئـەوەی بێینـە سـەر ماناکـردنی ئـەم ئـایـەتـە موبارەکـانەو، هەڵهێـنجانی ئـەو مەسـەلـە گرنگـانەی کـە لێیـان وەردەگیـرێـن، بـە باشـمان زانـی: باسی ڕووداوەکانی جەنگی تـەبووك بکەین.

لێـرەدا خـــوا ﷻ یەکـەمین دوانـدن کـە بڕوادارانـی پـێ دەدوێـنـێ، ئـەوەیـە کـە دەفـەرموێ: ئـەی ئـەوانەی بڕواتـان هێـنـاوە! ئـەوە چیتـانە بۆچی کـاتێك پێـتـان گـوترا: دەربچـن بۆ جـەنگ لـە ڕێـی خـوادا، خۆتـان قـورس کـرد بەرەو زەوی؟!

{وشـەی: (نَفْر)، لێـرەدا لـەم سـیاقەدا ، یـانی: دەرچـوون بـەرەو جـەنگو جیهـاد، ئـەگـەرنـا مانـای وشـەی: (نَفْر) لـە ئەسڵـی زمان دا، بریتیـە لـەوەی کـە ئینسـان لـە

حاڵێکەوە بە خێرایی بچێ بۆ حاڵێکی دیکە، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی (نَفْر) بۆ دەرچوون بەرەو جەنگو جیهاد بەکاردەهێنرێ}.

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ بە پرسیارکردنی نکووڵییکەرانەوەو بە جۆرێك لە سەرزەنشتو ڕەخنە گرتنەوە، بە مسوڵمانان دەفەرموێ: بۆچیو، چیتانە، چ شتێك وای لێکردن؟ کاتێك کە پێتان گوترا: دەربچن بەرەو مەیدانی جەنگو جیهاد لە پێناوی خوادا، خۆتان قورس کرد؟

{وشەی: (ٱثَّاقَلْتُمْ)یش، لە ئەسڵدا (تَثَاقَلْتُمْ)ە، (تَثَاقَلْتُمْ)، واتە: خۆتان قالب گران کرد، واتە: خۆتان قورس کرد، ئنجا کە بە ﴿إِلَى﴾، تەعەددای کردوە، ﴿ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾، بۆ ئەوەیە مانای (إخلاد)، بگەیەنێ، واتە: خۆتان بە زەوییەوە نووساندو. خۆتان بەرەو زەوی شۆڕکردەوە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لەسەر دڵتان قورس بوو، وە بە قالب گرانیی بە دەم بانگی جەنگو جیهادەوە چوون}.

ئنجا خوا ﷻ باسی هۆکارەکەی دەکات، کە بۆچی وایان کرد؟

﴿أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ﴾، ئایا ژیانی دنیاتان پێ چاکترەو هەڵتانبژارد بەسەر دواڕۆژدا، واتە: خۆشەویستییتان بۆ ژیانی دنیا، وای لێکردن کە ئەو هەڵوێستە خراپە لە خۆتاندا بەرجەستە بکەن، کە بریتیە لە خۆ بە زەوییەوە نووساندن، وە قالب گرانیی کردن، لە کاتێکدا کە پێویست دەکات بچن بۆ جەنگو جیهاد!

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾، بێگومان ڕابواردنو خۆشییو لەززەتی ژیانی دنیا، لەچاو هی دواڕۆژ: جگە لە شتێکی کەم، هیچی دیکە نیە.

وشەی: (مَتَاع)، (مَا يُتَمَتَّعُ بِهِ)، شتو کەلوپەل، یان شتێك کە ئینسان لێی بەهرەمەندبێو، سوودێکی لێ ببینێ، بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم، واتە: ڕابواردنو خۆشییو لەززەتی ژیانی دنیا، یانی: نازو نیعمەتی دنیا، لەچاو دواڕۆژ، شتێکی کەم

دەنوێنێ، بەڵێ: دنیا بەرانبەر نیعمەتەکانی دوارۆژدا، شتێکی زۆر کەمەو شایانی باس نیە، کەواتە: نەدەبوو ئەو شتە کەمە، ئەو ڕابواردنو خۆشییە کەمە، واتان لێبکات، بێ فەرمانیی خوا بکەنو، سەرەنجام ئەو نازو نیعمەتەی بەهەشت لە کیس خۆتان بدەن، یاخود بەلای کەمەوە لە خۆتانی کەم بکەنەوە، چونکە تاکو مرۆڤ لە دنیادا بۆ خوا سوڵحاوتر بێو بۆ فەرمانی خوا ئامادەتر بێ، بێگومان پشكو بەشی باشتری دەبێ لە نازو نیعمەتی دوا ڕۆژدا.

هەڵبەتە لێرەدا پێویستە بگوترێ: کە هەرچەندە خوا ﷻ بەگشتی بڕوادارانی دواندوون، بەڵام بە تەئکید مەبەستی پێی کەسانێك بووە، کە قالب گرانییان کردوە، نەك هەموویان بە تێکڕایی، بەڵێ خوا ﷻ بە تێکڕا دواندوونی، بەڵام دواندنەکە زیاتر پەیوەستە بەو کەسانەوە کە ئەو هەڵوێستە خراپەیان هەبووە، ئەگەرنا لە نێو دوێنراوان دا، ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو سەرجەم ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە هەمیشە گیان فیداییان کردوەو، هەمیشە گیان لەسەر دەست بوون، لە پێناوی خوادا، ئەوانەش هەبوون، بەڵام بە تەئکید ڕووی دواندن لەوان نیە، چونکە هیچ کاتێك قالب گرانییان نەکردوە، وە تەوەزەل نەبوون، وە خۆیان بە زەوی نەنووساندوە.

ئنجا خوا هەڕەشەیان لێدەکاتو، دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، ئەگەر نەچن بۆ جەنگو جیهاد {لە کاتێکدا کە لەسەرتان پێویست دەبێ}، خوا بە ئازارێکی بە ئێش سزاتان دەدات، ئنجا ئایا ئەو ئازارە بە ئێشە کەنگێیەو لە کوێیە؟

هەندێك لە توێژەران گوتوویانە: مەبەست ئازاری دنیاییە، کە دوژمنان بەسەریاندا زاڵ دەبنو، تووشی چەوسێنرانەوەو دەردو بەڵا دەبن.

وە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی سزای دوا ڕۆژە.

منیش وای تێدەگەم: کە هەردووکیان دەگرێتەوە، ئەو سزاو ئازارە بە ئێشە، هەم دەگونجێ لە دنیادا بێ، وە هەم دەگونجێ لە دوارۆژیشدا بێ، ئەوەی دنیا: لە ئەنجامی ئەوەدا کە مسوڵمانان جەنگو جیهاد ناکەنو فیداکاریی ناکەن، سەری خۆیانو

ماڵی خۆیان ئابەخشن، لە پێناوی خوادا: زەبوون دەبن‌و، ژێر چەپۆك‌و ژێر دەست دەبن، وە دوژمنان خێرو بێریان بە تاڵان دەبەن، کە بێگومان ئەوەش ئازارێکی زۆر بە ئێشە، بەڵام بۆچی پاڵ دراوەتە لای خوا؟ چونکە بە پێی قانوون‌و سوننەتی خوا ئەو وەزعەیان بەسەر دادێ، ئەگەرنا وە نەبێ خوای دادگەر، ڕاستەوخۆ بەو جۆرە سزایان بدات.

هەروەها سزای دوا ڕۆژیش، ئەوە دیارە کە لە دۆزەخدا خۆی دەبینێتەوە.

ئنجا هەر ئەوەندە نیە کە خوا سزاتان بدات، لە دنیاو لە دواڕۆژدا، ﴿وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾، وە کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە دێنێ، یانی: کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە دەکاتە جێگرەوەو فەرمبووی ئێوە، ئێوە لا دەداو ئەوان دێنێ‌و، کە ئەوەش دیسان باسی یاسایەکی خوایە، کە خوا ﷻ هەر کۆمەڵێك نەیانتوانی ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن، ئەوان لادەبات‌و خەڵکی دیکەی شایستەتر دێنێ، کە ئەوان بتوانن ئەرکەکانیان ڕاپەڕێنن. ﴿وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـًٔا﴾، وە هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنن. واتە: بە کەمتەرخەمییتان‌و، بە قالب گرانییتان‌و، بە خۆ بە زەوییەوە نووساندنتان‌و. نا ئامادەییتان بۆ جەنگ‌و جیهاد، هیچ زیانێك لە خوا نادەن ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٣٩﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

ئنجا خوا ﷻ لەبەرئەوەی ئەو کارو پرۆژەیەی، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتە سەرپەرشتیی کردوەو، ئەو بەرپرسی بووە، بۆیە باسی ئەوە دەکات، کە ئەگەر ئێوەش پێغەمبەری خوا سەرنەخەن ﷺ، لەو کارو پرۆژە ئیسلامییەدا، کە خوا ﷻ پێی سپاردوە، پشتی نەگرن‌و هاوکاری نەبن، کە یەکێك لە جۆرەکانی پشتگریی‌و هاوکاریی کردنی، ئەوەیە: ئامادە بن، لەگەڵ دوژمنانێکدا کە هەڕەشەتان لێدەکەن ڕووبەڕوو ببنەوە، کە ئەو کاتە ڕۆمەکان بوون، چونکە پێشتر باسمان کرد: کە جەنگی تەبووك پێغەمبەر ﷺ بۆیە مسوڵمانانی بۆ کۆکردوەوە، چونکە ڕۆمەکان ویستیان هێرش بێنن، وە (٥٠،٠٠٠) کەسیشیان ناردبوو، بە فەرماندەیی یەکێك لە سەرکردەکان بە ناوی (قوباد)، وە هەتا (بلقاء) هاتبوون‌و، کە بەرەو مەدینە دەهاتن.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە پێویستی زانی کە لە مەدینەدا دانەنیشنو چاوەڕێیان بکەن، تاکو دوژمن بەسەریاندا دەدات، بەڵکو بەرەو ڕوویان بچن، چونکە وەك گوتراوە: (الهُجُومُ أَحْسَنُ وَسِيلَة لِلدفَاع)، هێرش بردن باشترین شێوازی بەرگریی کردنە.

ئنجا خوا ﷻ ئەوە دەخاتەوە بیری مسوڵمانان: کە ئەگەر ئێوەش پێغەمبەر ﷺ سەرنەخەنو، پشتی نەگرن، لە بەرانبەر دوژمنانو ناحەزانی دا، کە لە ڕاستیدا سەرخستنو پشت گرتنەکە بۆ خۆشتانە، ئەوە خوا پەکی ناکەوێ، وە خوا پەکی پێغەمبەری خۆی ناخات، دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر ئێوەش سەری نەخەنو پشتی نەگرن، ئەوە خوا پێشتر سەریخست، کەی؟ بۆیان باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾.

ئەو کاتە سەریخست، کە ئەوانەی بێبڕوا بون دەریان کرد {لە شارەکەی، کە مەککە بوو}، کە دووەمی دووەمەکان بوو، کێ بوون ئەو دووانە؟ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نیزیکترین هاوەڵیو دڵسۆزترین کەسی، کە ئەبو بەکری صیددیق بوو، خوا لێی ڕازی بێ، ﴿إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ ﴾، لە کاتێکدا کە لە چاڵایی (غار)ەکەدا بوون.

(غار)، هەندێکیان بە ئەشکەوت لێکیان داوەتەوە، بەڵام (غار) قڵیشێکی گەورەیە لە چیایەکدا، یان چاڵێکی گەورە، کە دەشگونجێ سەرەکەشی هاتبێتەوە یەك، بە باری شاقووڵییدا، ئەشکەوت (کهف) زیاتر بە باری ئاسۆییدا فراوانە، بەڵام (غار) زیاتر بە باری شاقووڵییدا قووڵە، وە جیاوازییەکەیان ئەوەیە کە ئەشکەوت سەری گیراوە، بەڵام (غار) مەرج نیە سەرەکەی بەسترا بێ.

﴿إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾، کاتێك بە هاوەڵەکەی خۆی دەفەرموو: دڵتەنگ مەبە، خەمبار مەبە، بێگومان خوا لەگەڵمان دایە، واتە: بە لەگەڵدا بوونی تایبەت لەگەڵمان دایە، ئەگەرنا بێگومان خوا لەگەڵ هەموو شتێکدا هەیە، بە دەسەڵاتو بە زانیاریو بە ئیرادەی خۆی، بەڵام لێرەدا مەبەست

پێی: ـ وەك توێژەرەوان گوتوویانە ـ لەگەڵ دابوونو ئاگا لێبوونو ڕەچاو کردنو لوتف لەگەڵ نواندنە، ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا﴾، ئنجا خوا ﷻ ئارامییو هێمنیی خۆی ڕژاندە سەری، وە بەهێزیشی کردو، وە پشتیشی گرت، بە سەربازانێك کە ئێوە نەتاندەبینین، کە بە تەئکید مەبەست پێی فریشتەکانە، ئنجا ئەمە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین مادام بە (ف) هاتوە، ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ﴾، (ف)، جاری وایە دەلالەتی لەسەر بەدواداهاتن (تعقیب)ی ڕاستەوخۆ دەکات، کەواتە: هەر کە چوونەتە نێو ئەشکەوتەکەوە، یەکسەر خوا ئارامییو هێمنیی دابەزاندۆتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، وە یەکسەر فریشتەشی دابەزاندوون بۆ سەر پێغەمبەر ﷺو ئەبو بەکر، بۆ ئەوەی دڵیان بەهێزتر بکەن، وە ئیلهامی چاك بخەنە دڵیانەوەو وەسوەسەی شەیتانەکان نەچێتە دڵیانەوە، دڵە ڕاوکێ نەیانگرێ.

ئنجا خوای کاربەجێ چی دیکەشی کرد؟ ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾، وە وشەی ئەوانەی خستە ژێرەوە، کە بێبڕوان، لێرەدا (كَلِمَة) هەرچەندە واتە: (وشە) بەڵام لە زمانی عەرەبییدا، جاری وایە بۆ وتارێك بەکاردێ، دەگوترێ (الآن يُلْقي فلانٌ كَلِمَةً)، کە مەرج نیە یەك وشە بێ، بەڵکو دەبینی یەك سەعات، یان دوو سەعات، قسە دەکات، بەڵام پێی دەگوترێ: (كَلِمَة).

وە (كَلِمَة) جاری وایە بەمانای بڕیار دێ، بۆ وێنە: ﴿لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ ﴿١١٥﴾﴾ الأنعام، واتە: هیچ کەسێكو هیچ شتێك ناتوانێ بڕیارەکانی خوا بگۆڕێ.

وە جاری وایە بە مانای ئەو ئەرکانە دێ، کە بە ئینسان دەسپێررێن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة، واتە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیمی ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە چەند وشەیەك، لێرەدا مەبەست چەند ئەرکێکە.

کەواتــە: لــێرەدا ﴿ وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ ﴾، واتــە: خـوا ﷻ پیلان‌و کاری ئـەوانەی خسـتە بنـەوە، کـە بێبـڕوابوون، وە ژێری خسـتن، ﴿ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا ﴾، وشــەی خــواو، بڕیــاری خــواو، کــاری خــوا، هـەمیشە لـە سەرێیـە، ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، وە خـوا زاڵـی کار بەجێیـە.

ئنجــا خــوا ﷻ فــەرمان دەکــات بــە بــڕواداران‌و دەفــەرموێ: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾، بە سووکیی‌و بە قورسیی بڕۆن بۆ جـەنگ‌و جیهاد.

﴿ وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، وە بـە سامانەکانتــان‌و بـە گیانەکانتــان لــە ڕێــی خــوادا، تێبکۆشــن‌و فیداکاریی بکــەن، ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، ئـا ئـەوە بۆ ئێوە باشـترە، ئـەگـەر بزانن.

ئنجــا وەك دوایی لـە مەسـەلـە گرنگەکاندا زیـاتر تیشکی دەخــەینە ســەر: ﴿ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾، زۆر واتـایـان هـەڵدەگرن، هـەروەهــا ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، ئــا ئــەوە بـۆ ئێوە باشـترە، دیسان چەمك‌و واتـایـەکەی فراوانـەو زۆر شـت دەگـرێتـەوە.

دوایی خـوا ﷻ دێتـە سەر باسی هـەڵوێسـتی ئەوانەی کە دڵ نەخۆش‌و ئیمان بێهـێز بــوون، یــاخود دەغــەڵ‌و مونافــیق بــوون، هــەموویان دەگرێتــەوە، دەفـەرموێ: ﴿ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ ﴾، ئەگەر ئەو ئامانجەی کە لە جەنگی تەبووك دا بۆی دەچن، ئەگەر دەستکەوتێك‌و بەرژەوەندییەکی نیزیك بووایە، واتە: نێچیرێکی ئـاسان بووایە، وە سەفـەرێکی کورتیش بووایە، ﴿ لَّٱتَّبَعُوكَ ﴾، شـوێـنـت دەکەوتن.

لــێرەدا: ﴿ لَّٱتَّبَعُوكَ ﴾، واتــە: هــەر شوێــن تــۆ دەکـــەوتن، بــە دوای تــۆدا دەهــاتن، بــەڵام ئــەوە نــەبووە لــە پێنــاوی خــوادا بــێ‌و لــەبەر خــوا بــێ، هــەر لــەبەر خــاتری خــاتران‌و لــەبەر تــۆ دەهــاتن، ئــەویش ئـەگــەر دەستکەوتێکــی نیزیــك‌و سەفەرێکــی

کورت بووایە! ﴿ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُ ﴾، بەڵام شوێنەکە دوور بوو، بۆیە لەسەریان قورس بوو، ئەو سەفەرە دوورە بکەن.

دەڵێ: (ٱلشُّقَّةُ)، (الشُّقَّة: السَّفَرُ البَعِيدُ، شَقَّه شاقَّةً، المَشَقَّة: الصُّعُوبَة).

وشەی (شُقَّة) واتە: سەفەری دوور، دیارە سەفەری دووریش قورسە، هەروەك چۆن سەفەری کورت ئاسانە.

﴿ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ ﴾، وە بە تەئکیدیش سوێند بە خوا دەخۆن: ئەگەر توانیبامان لەگەڵتان دەردەچووین، لەگەڵتان دەهاتین بۆ جەنگ.

دیسان ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، ﴿ لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ ﴾، لەگەڵ ئێوە دەهاتین، ئینسانی ئیماندار شتێك کە بۆ خوا دەکات، نابێ لەبەرئەوەی خەڵك دەیکات، ئەویش بیکات، دەبێ بۆخۆی بیکات، بە هاندەری ئەوە کە خوا لە خۆی ڕازی بکات.. نەك ڕەگەڵ خەڵك بکەوێ! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ۝٤٢ ﴾. خۆیان دەفەوتێنن، واتە: بەو سوێندە بە درۆیانە خۆیان دەفەوتێنن، سوێندی بە درۆ ئینسان لە بەین دەبات، وەك دوایی باسی دەکەین، وە خوا دەزانێ کە ئەوان درۆزنن، وە ئەوە یەکەم درۆیان نیەو، دواهەمین درۆشیان نابێ، ئەگەر لە حاڵەتی نیفاقدا بمێننەوە

ئنجا خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەر ﷺو سووکە گلەییەکی لێ دەکات، دەفەرموێ ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٤٣ ﴾، خوا لێت ببوورێ، (ئەی موحەممەد!) بۆچی مۆڵەتت دان، واتە بۆچی مۆڵەتت دان، نەیەن بۆ جەنگو جیهاد لە پێناوی خوادا؟ ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾، دەبوو مۆڵەتت نەدابان، هەتا ئەو کاتەی ئەوانەی کە ڕاست دەکەن، بۆت ڕوون بووبانەوە، وە درۆزنەکانیشت زانیبایە، واتە پەلەت کرد لە مۆڵەت دانیاندا، بەڵام لێرەدا خوا (لوطف)ی، لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ﷺ

نواندوە، بەرلەوەی گلەییەکەی لێبکات لێبوردنەکەی خۆی بۆ خستۆتە ڕوو، ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾، خوا لێت ببووریٚ بۆچی مۆڵەتت دان؟ هەتا ئەو ئامانجانە دەهاتنە دی، ئەوانەی کە ڕاست دەکەن، بۆت دەرکەوتبە چ کاتێك ئەوە دەردەکەوت؟ گوتبات: نەخێر دەبیٚ بێن، ئەوکاتە ئەوانەی کە بەڕاستیان بوو، دەردەکەوت، دەیانگوت: باشە ئەوە ئێمە هاتووین، بەڵام وڵاخمان نیە، وە چەکمان پێنیە، زادو زەخیرەمان نیە، بۆمان دابین بکە، ئەوە ئێمە دێین، بۆتان دەردەکەوت کە ئەوانە ڕاست دەکەن، هاتوون عوزر بێننەوە، کە ناتوانن بێن، وە ئەوانەش کە درۆزنن و پەکیان لەسەر هیچ نەکەوتوە، بەڵام هەر نایەن ئەو کاتە دەردەکەوتن، ئەگەر تۆ مۆڵەتت نەدابان، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا کە تۆ مۆڵەتت داون، ئەوانە چاكو خراپیان، وە ڕاستگۆو درۆزنیان تێکەڵ بوون، لەبەرچاوی ئێوە، هەڵبەتە بەڵام خوای زاناو شارەزا هەر دەیناسین .

ئنجا خوا ﷻ پێشانی دەدات، کە کێن ئەوانەی داوای مۆڵەت دەکەن و کێن ئەوانەی داوای مۆڵەت ناکەن؟ دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، مۆڵەتت لێ وەرناگرن، کە ئایا بێن جەنگو جیهاد بکەن؟ واتە: بۆ هاتن مۆڵەتت لێ وەرناگرن، بڵێن: ئەی پێغەمبەر! ﷺ بێین، یان نەیەین؟ یەکسەر دێن، بۆچی؟ چونکە ئەسڵ بریتی بوو لە چوون بۆ جەنگو جیهادو، دەبووایە بۆ نەهاتن مۆڵەت وەربگرن، ئەمما بۆ هاتن پێویستیی بە مۆڵەت ناکات، کەسێك ئیمانی بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێ، ناچێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بێم یان نەیەم؟! یەکسەر دێ.

﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾﴾ ، وە خوا زانایە بە پارێزکاران، واتە: ئەوانەی پارێزکارین، هەرگیز بۆ هاتنیش مۆڵەت وەرناگرن، چ جای بۆ نەهاتن!

ئنجا ئەدی ئایا کێن ئەوانەی مۆڵەت وەردەگرن، وە بیانوو دەگرن، بۆ ئەوەی خۆیان لە جەنگو جیهاد دوابخەن؟ ﴿إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾﴾، بێگومان تەنیا

ئەوانە مۆڵەتت لێ وەردەگرن، کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، وە دڵیان لە گومان دایەو، لە گومانی خۆیاندا دێن‌و دەچن، سەرگەردان‌و سەراسیمەن، هەر ئەوانە مۆڵەتت لێ وەردەگرن کە نیەن.

بەڵام ئەوانەی ئیمانیان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیەو، بە تەقوان، بۆ هاتنیشیان نایەن پرست پێ بکەن‌و یەکسەر دێن، چ جای بۆ نەهاتن!

﴿وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ﴾، ئنجا خوا ﷻ پەردەیان لەسەر هەڵدەماڵێ‌و ناخیان دەردەخاتو، دەفەرموێ: ئەگەر ویستبایان بێن بۆ جەنگ‌و جیهادو لەماڵ دەربچن ﴿لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً﴾، ئەوە پێداویستییەکانیان بۆ ئامادە دەکرد، پێشتر خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، چونکە هەیانبوو دەیگوت: خۆم ئامادە نەکردوە!

خوا دەفەرموێ: ئەگەر ویستبایان بێن بۆ جەنگ‌و جیهاد، پێشتر خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، کە لە مێژە زانیویانە، ئەو جەنگە لەپێشە!!

﴿وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ﴾، بەڵام خوا پێی ناخۆش بوو بێن. دەرچوونەکەیانی پێناخۆش بوو، بۆچی پێی ناخۆش بوو؟ حیکمەتەکی دوایی ڕوون دەکاتەوە، ﴿فَثَبَّطَهُمْ﴾، بۆیە خوا ﷻ دوای خستن‌و ئیرادەو ویستی ئەوانەی خاو کردەوە، دڵی خاو کردنەوە، ﴿وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ ﴿٤٧﴾﴾، وە پێیان گوترا: دانیشن لەگەڵ دانیشتوان، وەك فەرمانیان پێکرابێ بە دانیشتن ، ئاو دانیشتن، ئەگەرنا کەس پێی نەگوتبوون: دانیشن.

یاخود مەبەست ئەوەیە مونافیقەکانی کە لە بەینی خۆیان دا کەین‌و بەینیان هەبوو، هەندێکیان بە هەندێکیان گوتوە: دانیشن لەگەڵ دانیشتوان، چیتان داوە لەو جەنگ‌و جیهادە، بەو گەرمایە، بە تایبەت لەگەڵ دوژمنێکی وەك ڕۆمدا!!

ئنجا خوا ﷻ حیکمەتی ئەوەی، کە بۆچی وایکردوە کە نەیەن بۆ جەنگ‌و، بۆچی پێی ناخۆش بووە؟ دەردەخاتو، دەفەرموێ: ﴿لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَـٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّـٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ

عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، ئەگەر لەگەڵ ئێوە دەرچووبان بۆ جەنگ، هەر خراپەیان بۆ زیاد دەکردن،﴿ ﴿خَبَالًا ﴾، (الخَبَالُ: الفَسَادُ)، هەر خراپەکاریی‌و پەشێویی‌و ناڵۆزیی یان لە نێودا زیاد دەکردن، واتە: نەك هێزو پێزیان بە ئێوە نەدەدا، ئەوە هیچ، بەڵکو ئەگەر شتێکیان بۆ زیاد کردبان، بریتی بوو لە خراپەکاریی‌و پەشێویی‌و ناڵۆزیی‌و، زیان لێدان، ﴿وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ ﴾، وە لە نێوان ئێوەدا ئەسپی خۆیان تاو دەدا، چونکە: (أَوْضَع)، واتە: وڵاخەکەی خۆی خێرا کرد، وای لێکرد کە خێرا بڕوا، واتە: ئەسپی خۆیان تاو دەدا لە نێوان ئێوەداو لە کەلێنەکان‌و، درزەکانتان دا دەهاتن‌و دەچوون، بۆچی؟ ﴿يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ ﴾، ئاشووب‌و ئاژاوەو خراپەیان بۆ ئێوە بە ئاوات دەخواست، دەیانویست تووشی زیانتان بکەن.

﴿وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ﴾، وە لە نێو ئێوەشدا کەسانێکیان هەن، قسەیان بۆ دەبیستن، واتە: قسە لە ئێوە دەبیستن بۆ ئەوان، بە واتایەکی دیکە سیخوڕییتان لەسەر دەکەن، سیخوڕیی بۆ ئەوان دەکەن، لەسەر ئێوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە بێگومان خوا بە ستەمکاران زانایە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا: زیاتر ناخی ئەوانە دەردەخات، بە ڕوونکردنەوەی هەڵوێستە پێشووەکانیان‌و، دەفەرموێ: ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُاْ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ ﴾، ئەمە وەك بەڵگە هێنانەوە وایە بۆ ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ ﴾، یەکێك بۆی هەیە بڵێ کوا؟ کەی ئەوانە ویستوویانە زیان لە موسوڵمانان بدەن‌و ڕیزەکانیان تێکبدەن‌و ئاشووب‌و ئاژاوەیان لەنێودا پەیدا بکەن؟!

دەفەرموێ: ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُاْ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، ئەوانە پێشتر ئاشووب‌و ئاژاوەو خراپەیان بۆ ئێوە خواست‌و هەوڵیاندا، بۆ وێنە: لە جەنگی ئوحوددا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلوول خۆی‌و بە سێیەکی سوپاکەی گەڕایەوە.

هەروەها لە زۆر هەڵوێستی دیکە: بوختانیان کرد بە دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، هەمیشە خەریکی پەشێویی بوونو، خەریکی ئاڵۆزیی نانەوە بوون، وەك خوای کارزان باس دەکاتو، دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَـٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾آل عمران.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر بە قسەی ئەوانەی بێبڕوان، بکەن. لە سەرپاژنەکانتان بەرەو دوا دەتانگێڕنەوەو لە زیانباران دەبن.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ ﴾آل عمران.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر بە قسەی کۆمەڵێك لەوانە بکەن کە پێشتر کتێبیان پێدراوە، ئەوە لەدوای ئەوەی ئیمانتان هێناوە، هەڵتان دەگێڕنەوە.

هەم جوولەکەکانو هەم مونافیقەکان، هەمیشە خەریکی پیلانگێڕیی بوون، پاشان لەسەر باسی پیلانگێڕیی پێشوویان بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: ﴿ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلْأُمُورَ ﴾، وە کاروبارەکانیان بۆ هەڵدەگێڕایەوە هەڵگێڕو وەرگێڕیان دەکرد، کە ئایا: لە چ لایەکەوەو، لە چ ڕوویەکەوە، باشتر دەتوانن زەفەرت پێبەرن؟!

هەندێکی دی گوتوویانە: ﴿ وَقَلَّبُواْ ﴾، بە مانای هەڵگێڕو وەرگێڕ نیە، بەڵکو بە مانای سەرنجی شتەکانیان دەدا: لە کوێوە بتوانن زەبرت لێبدەن، پیلانیان دەگێڕاو نەخشەیان دادەنا، هەتا کەی؟ ﴿ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ ﴾، هەتا هەق هات، کە ئیسلامە ﴿ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَـٰرِهُونَ ﴾، وە فەرمانی خوا، ئایینی خوا دەرکەوت زاڵ بوو، وە دەستەڵاتی پەیدا کرد، لە حاڵێك دا پێیان ناخۆش بوو.

کەواتە: ئەوە ئیشی ئێستایان نیە، بەڵکو لە ڕابردووشدا هەر خەریکی پیلانگێڕیو خراپەکاریی بوون.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨ ﴾.

پێشتر باسی ماناکەمان کرد کە دەفەرموێ: ﴿مَا لَكُمۡ ﴾، یانی: (أي شيء ثبت لكم)، چ شتێك بۆ ئێوە چەسپاوەو هاتۆتە دی؟ هەڵبەتە ئەم شێوازە تەعبیرە، پێی دەگوترێ: (الإستفهامُ الإنكاريُّ)، پرسیارلێکردنی نکووڵیی لێکەرانە، وەك رەخنە لێگرتنێكو، نکووڵیی لێکردنێك رایدەگەیەنێ کە: هیچ شتێك بۆ ئێوە نەهاتۆتە دیو، هیچ هۆکارێك لە ئارادا نیە، ئێوە وا لێ بکات کە لە کاتێکدا پێتان دەگوترێ: لە رێی خوادا دەرچن بۆ جەنگو جیهاد، ئێوە خۆتان بە زەوییەوە بنووسێنن.

ئنجا وشەی: (إِذَا )، دەفەرموێ: ﴿ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ﴾، دەڵێ: (ظَرْف تَعَلَّق بمَعْنَى الإسْتِفْهام الإنْكاريِّ عَلَى مَعْنَى: أن الإنكار حاصلٌ في ذلك الزمان الذي قيل لهم فيه: انفروا، ولَيْسَ مُضَمَّناً مَعْنَى الشَّرْطِ)، (إِذَا )، لێرەدا (إذا)ی (شرطية) نیە، ﴿مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ﴾، بەڵکو ئەم (إذا)یە (ظرف)ێکە پەیوەستە بە پرسیارە نکووڵیی لێکەرانەکە، بە مانای ئەوە کە: ئەو نکووڵیی لێکردنو رەخنە لێگرتنە، لە کاتێکدایە کە ئێوە پێتان گوتراوە: دەربچن بۆ جەنگو جیهاد، وە مانای مەرج بوون، ناگەیەنێ.

ئنجا ئایا چییان پێ گوترا؟ ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، دیارە وشەی: ﴿ٱنفِرُواْ﴾، پێشتر باسمان کرد، کە دەڵێ: (نَفَر الناس إلى العَدوِّ: أَسْرَعُوا لِقِتالِهِ)، هەروەها (النفير العام)یش واتە: دەرچوونی گشتی، (نَفْر) واتە: خەڵك دەرچوون بەرەو دوژمن، واتە: بە خێرایی دەرچوون بەرەو ڕووی، دەنا وشەی: (نَفْر) بە مانای سڵەمینەوە دێ، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك، وە چوون لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك، بەڵام کە گوترا: ﴿ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، واتە: لە ڕێی خوادا بە خێرایی دەربچن بۆ جەنگو جیهاد، ئنجا کێ وای پێ گوتوون؟ بە تەئکید پێغەمبەری خوا ﷺ وای پێگوتوون، کە ئەویش خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوە، هەر بۆیەش عەرەب دەربارەی کەسێك کە لە هیچ شتێك دانەبێ، گوتوویانە: (فلان لا في العير ولا في النفير)، واتە: بە کەڵکی هیچ نایەت، نە لەگەڵ کاروانەو، نە لەگەڵ سوپایە.

کە دەفەرموێ: ﴿ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾، ﴿ٱثَّاقَلْتُمْ﴾ لە ئەسڵدا (تثاقلتم)ە. ئنجا وشەی: (تثاقلتم)یش، دەڵێ: (التثاقل: تكلّف أي إظهار أنه ثقيل، لا يستطيع النهوض)، (تثاقل)، بریتیە لەوە کە ئینسان خۆی وا پیشانبدا، کە قورسەو ناتوانێ هەڵسێ، واتە: خۆ قالب گران کردنو، خۆ تەوەزەل کردن، وە وشەی: (تثاقل). بۆیە بە (إلى)ی تەعەدادای کردوە، (لإنَّه ضُمِّن معنى الميل والإخلاد)، چونکە بە مانای مەیل کردنو خۆ بەردانەوەی خراوەتە نێو.

کە دەفەرموێ: ﴿أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْآخِرَةِ﴾، دیسان ئەمە لێرەدا پرسیارکردنێکی نکوولّیی لێکەرانەی سەرزەنشت کەرانەیە، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿مِنَ ٱلْآخِرَةِ﴾ وشەی: (من)، لێرەدا بۆ (بَدَلْ)ە، یانی: ئایا ئێوە ژیانی دنیاتان پەسند کردو هەڵتان بژارد، وەك جێگرەوە بۆ دواڕۆژ. وە بۆیەش وشەی: (رضيتم)، بەکارهاتوە، لە جێی (آثارتم)یان (فضّلتم)، چونکە عەرەب کە گوتیان: (رضى بكذا)، ئەوە دەگەیەنێ کە لەگەڵ پێخۆش بوونو

سینە گوشاد بوونو دڵ پێخۆش بوون دایە، ئەگەرنا جاری وایە کە ئینسان شتێك بەسەر شتێك دا هەڵدەبژێری، بەڵام مەرج نیە پەسندی کردبێ، واتە: ئێوە چۆن ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن، بە پەسندکردنو بە دڵ پێ خۆشبوونەوە بەسەر ژیانی دواڕۆژدا، ﴿فَمَا مَتَـٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾، بێگومان ڕابواردنو خۆشیی ژیانی دنیا، لە بەرانبەر نازو نیعمەتەکانی دواڕۆژدا، جگە لە کەمێك شتێکی دیکە نیە.

دیارە وشەی: (متاع)، پێشتریش باسمان کرد، کە ناوی چاوگە (التمتّع هو: الإلتذاذُ والتنعُّم)، لەزەت لێوەرگرتنو خۆشیی لێ بینینو لێ بەهرەمەند بوون.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا مانای ئەم ڕستە قورئانییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿مَا الدُّنْيا فِي الآخِرَةِ إلا مِثْلَ مَا يَجْعَلُ أحَدُكُمْ أُصْبَعَهُ فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ لِيَنظُرْ بِمَ يَرْجِعُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٨٠٤٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٨٥٨)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤١٠٨)، وَابْنُ حِبَّان، برقم: (٦١٥٩)}.

واتە: دنیا لە چاو دواڕۆژدا، تەنیا وەك ئەوە وایە، کە یەکێك لە ئێوە پەنجەی بخاتە نێو ئاوی دەریاوە با بزانێ چەند ئاو بە پەنجەیەوە هاتوە! یانی: ئەو ئاوەی بە پەنجەیەوە دێ، لەچاو ئاوی دەریا چەندە، ژیانی دنیاش لەچاو ژیانی دواڕۆژ، ئەوەندەیە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾.

دیارە لێرەدا خوا ﷻ سێ جۆرە هەڕەشە لە مسوڵمانانێك دەکات، کە خۆیان لە جەنگو جیهاد دوادەخەن، جەنگو جیهادێك کە لەسەریان پێویست بووە، وە دەبێ ئەنجامی بدەن:

<u>هەڕەشەی یەکەمیان</u> : ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ﴾، ئەگەر دەرنەچن بۆ جەنگو جیهاد.

﴿يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا﴾، خـوا ﷻ بـە ئـازارێـکی بـە ئـێش ئـازارتـان دەدات.

هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی سزای دنیایە، کە زاڵبوونی کافرانە بەسەر مسوڵمانانێك دا کە خۆیان لە جەنگو جیهاد بەردەدەنەوە، وە هەڵدەخزێنو دادەنیشنو مل لەوی دەکەنو کافر بەسەریاندا زاڵ دەبن، وەك ئێستا بەسەر زۆربەی مسوڵمانانی دنیادا هاتوە.

وە هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست پێی سزادانی دواڕۆژە.

بەڵام ڕاست ئەوەیە کە خوا ﷻ دەری نەخستوە ئەو ئازارە بە ئێشە هی کەیەو، هی کوێیە؟ بۆیە دەگونجێ بڵێین: هەم مەبەست پێی سزای دنیایەو، هەم سزای دواڕۆژیش، هەردووکیان دەگرێتەوە.

<u>هەڕەشەی دووەم</u> : دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾، وە کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە دێنێ، (يأْتِي بِهِم عِوَضاً عَنْكُمْ)، یانی: کۆمەڵێکی دیکە دێنێ: وەك قەرەبووو جێگرەوە بۆ ئێوە، خوا پەکی ناکەوێ، چونکە دەڵێ: (البَدَلُ: هُوَ المَأْخُوذُ عِوَضاً)، (بَدَل)، بریتیە لە قەرەبوویەك کە لە بەرانبەر شتێکدا وەردەگیرێ، ئەمەش دیارە هەڕەشەیەکی دیکەیە، واتە: خوا ﷻ ئێوە لا دەبات، مادام ئامادەی فیداکاریی نەبن بە سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا، ئێوە دیارە کەڵکی ئەوەتان نیە کە هەڵگری مەشخەڵی ئایینی خوای پەروەردگار بن، وە ئەمینداری خوا بن لەسەر زەوی، وە هەڵگری ئەمانەتی خوا بن، بۆیە خوا ئێوە لادەباتو کەسانێکی شایستە دێنێ، وەك لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤﴾ المائدة.

هەڕەشەی سێیەم : دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ﴾، واتە: وە ئێوە بە دواکەوتنتان لە جەنگو جیهادێك کە لەسەرتان فەرز بووە، هیچ زیانێك لە خوا نادەن، واتە: زیان دەدەن، بەڵام نەك لە خوا، بەڵکو لە خۆتان، بەڕاستیی هەرکەسێك جەنگو جیهاد نەکات، زیان لە خۆی دەدات، دوژمنان بەسەر خۆیدا زاڵ دەکات، وا دەکات دوژمنان تەماعی تێبکەن، دوژمنان وەك دڕندە وان، هەموو دڕندەیەکیش کەیفی بە نێچیرێکی ئاسانو تووك نەرم دێ، بەڵام هەر کەسێك دڕکی پێوە بێ، دوژمنی دڕندە، سەدو یەك حیساب دەکات، بەرلەوەی پەلاماری بدات، وەك ئێمە لە دارستانیش دا دەیبینین، وە لە دەوروبەری خۆماندا دەیبینین، هەر کۆمەڵێكو هەر خەڵکێك دڕکی هەبێ، حیسابی بۆ دەکرێ، بەڵام شتی تووك نەرمو بێ دڕك، هەموو کەس تەماعی تێدەکات، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یانی: هەموو ئەو شتانەی کە خوای دادگەر هەڕەشەیان پێ لە ئێوە دەکات، دەتوانێت بیهانهێنێتەدی، چونکە هیچ شتێك لە خوا عاسێ نابێ.

## قسەیەك لەبارەی نەسخ نەبوونەوەی ئەم ئایەتەوە

شایانی باسە دەربارەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {هەر کەسێك لە ئێوە نەچێ بۆ جەنگو جیهاد، خوا بە ئازارێکی بەئێش سزای دەدا} . هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە، بە ئایەتی ژمارە (١٢٢)ی هەر ئەم سوورەتە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾التوبة.

واتە: بڕواداران بۆیان نیە هەموویان بچن بۆ جەنگو جیهاد، دەبووایە لە هەر کۆمەڵێکی زۆری بڕواداران، هەندێکیان بچن بۆ جەنگو جیهاد، تاکو ئەوانەی نیشتەجێن لە دین دا شارەزابن، وە کە (جەنگاوەرەکان) گەڕانەوە، خەڵکەکە کۆمەڵەکەی خۆیان ئاگادار بکەنەوە، بۆ ئەوەی ئەوانیش وریایی خۆیان وەربگرنو خۆیان لە ناشەرعییەکان بپارێزن.

وەك دوایی دەیگەینێ لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا.

(طبري) دەڵێ: (قال عكرمة والحسن، أنَّ هَذِهِ نَسَخَتْهَا الآيةُ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً﴾، وَلاَ خَبَرَ بالَّذِي قال عكرمةُ والحَسَنُ، مِنْ نَسْخِ حُكْمِ هَذِهِ الآيةِ الَّتي ذكرا، يَجِبُ التسلِيمُ لَهُ، وَلاَ حُجة لصِحَّةِ ذَلِك)[1].

واتە: هەر کام لە عیکریمەو حەسەنی بەصرایی (کە هەردووکیان زانایانی تابیعینن) گوتوویانە: ئەم ئایەتەی کە خوێندمانەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً﴾، نابێ بڕواداران هەموویان بچن بۆ جەنگ، ئەم ئایەتەی ئێرەی نەسخ کردۆتەوە، بەڵام هیچ هەواڵێك نیە کە ئێمە ناچار بکاتو تەسلیمی بین، {یانی: هەواڵێکی وەحی، چ ئایەتێك، چ فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ کە ئەوە بگەیەنێ} هەروەها هیچ بەڵگەیەکی عەقڵییش نیە کە دروستیی ئەو رایە بگەیەنێ.

ئنجا (طبري)، دوایی زۆر جوان دەڵێ: ئەم ئایەتەی ئێرە، مەبەستی ئەوە نیە کە مسوڵمانان هەموو تێکڕا بۆ جەنگ بچن، بەڵکو ئەو مسوڵمانانە لەسەریان پێویستە بچن بۆ جەنگو جیهاد، کە ئاگادار کراونەوە، ئنجا ئایەتی: (١٢٢)یش هەروا دەڵێ: دەفەرموێ: بڕواداران نابێ هەموو تێکڕا بچن، وە پێغەمبەر ﷺ لە حاڵێك دا کەسانێکی دەنگداوە بچن بۆ جەنگی تەبووك، کەسانێکیشی لە مەدینە بەجێهێشتوەو، یەکسەر قەل فریان لێ نەکردوە، هەموویان چووبن.

---

١) جامع البيان، ج ٦، ص ١٤١.

کەواتە: ئەم دوو ئایەتە تێکناگیرێن، نەسخیش وەك چەندان جاری دیکە گوتوومانە: کاتێك ناچار دەبین بڵێین: ئەم ئایەتە ئەوەی دیکەی نەسخ کردۆتەوە، کە تێکگیران لە نێوانیاندا هەبێ، بەڵام ئەم ئایەتەی ئێرە دەفەرموێ: کاتێك پێتان گوترا: بۆ جەنگ بچن، واتە: کەسانێك کە پێیان دەگوترێ و دیاریی دەکرێن، دەبێ ئەوانە بچن بۆ جەنگ، ئایەتی (١٢٢)یش دەفەرموێ: بڕواداران نابێ هەموویان وێکڕا بچن بۆ جەنگ، بەڵکو دەبێ ئەوانەیان بچن، کە دیارییکراون، بەو شێوەیەش هیچ تێکگیرانێك لە نێوان ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا نابێ، تاکو ئێمە ناچار بین بڵێین ئەوەی دواییان، ئەوەی دیکەی نەسخ کردۆتەوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾.

کە پێشتر مانامان کرد، دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە سەری نەخەن، بە پێی سیاق و مەقام دەزانرێ کە مەبەست پێی پێغەمبەری خاتەم موحەممەدە ﷺ، چونکە ئەو خاوەنی کارو پڕۆژەی ئیسلامیی بووە لەو کاتیدا، ئەو خاوەنی ئەو کارو چالاکییانە بووە، کە بۆ ئیسلام ئەنجام دراون.

یانی: ئەگەر ئێوە بە نەچوونتان بۆ جەنگی تەبووك، پشتی پێغەمبەر ﷺ نەگرن و، سەری نەخەن، خوا پەکی ناخات، وشەی: (إلاّ)، هەرچەندە لە ئیملای قورئاندا نووسراوە (إلا) وەك (أداة الإستثناء)، بەڵام لە ئەسڵدا (إن + لا)یە، (إلا)، مانای (إن لا تنصروه)، وەك لە سورەتی (الأنفال)یش دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾﴾، لەوێش دیسان ﴿إِلَّا تَفْعَلُوهُ﴾، مانای (إن لا تفعلوه)، ئەگەر ئەنجامی نەدەن، لێرەش: (إن

لا تنصروه)، قسەکە ئاوایە: ئەگەر ئێوە پشتی نەگرن، ﴿فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾، ئەوە خوا پشتی گرتوەو سەریخستوە، کەی؟

بێگومان لە ڕابوردوودا، ئنجا کەی‌و چۆن‌و لە کوێ؟

ئەوە ئایەتەکانی دوایی ڕوونی دەکەنەوە، کە ئەو سەرخستنە تایبەتەی خوای میهرەبان بۆ پشتگیریی کردن‌و هاوکاریی کردنی پێغەمبەر ﷺ کاتێك بووە، کە هیچکەس نەبووە، بەس خوا بۆخۆی مشووری خواردوەو سەریخستوەو پشتی گرتوە.

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە: ﴿إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئەو کاتە کە ئەوانەی بێبڕوان دەریانکرد، لە کوێ دەریان کرد؟ لە شاری مەککە، هەڵبەتە ئەوە نەبووە بێن پاڵ بە پێغەمبەرەوە بنێن، بڵێن: بڕۆ!، بەلام ئەدی بۆچی دەرکرانەکە. پاڵ دراوەتە لای ئەوان؟ چونکە ئەوان هۆکاری ئەوە بوون، کە پێغەمبەر ﷺ هەست بکات لە مەککە گەیشتۆتە بن بەست، وە ئەوان تەنگیان پێ هەڵچنی، وە ئەوان هاوەڵەکانیان ئەشکەنجەداو ناڕەحەتیان کردن‌و، خۆی ناچار بینی کە خۆی‌و. وە هاوەڵانی کۆچ بکەن.

سەرەتا دووجاران هاوەڵانی کۆچیان کردوە، بۆ حەبەشە، دوایی ناچار بوو خۆیشی‌و هاوەڵانی کۆچ بکەن بۆ (یثرب) کە دوایی ناوی لێنرا (مدینة)، واتە: شار، شاری پێغەمبەر ﷺ، ئەمە لە سوورەتی (الأنفال)دا باسکراوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾﴾.

واتە: یاد بکەوە کە ئەوانەی بێبڕوا بوون، پیلانیان لە دژی تۆ دەگێڕا، کە یان حەپست بکەن، (زیندانییت بکەن‌و، بتهێڵنەوە) یان بتکوژن، یاخود دەرتبکەن. کەواتە: کافرەکان دەستیان هەبووە لە دەرکرانی پێغەمبەردا ﷺ، با بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆش بێ.

ئنجا دەفەرموێ: ئەو کاتە خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی سەرخست، کە ئەوانەی بێبڕوا بوون، دەریانکرد، یانی: تەنگیان پێ هەڵچنی‌و ناچاریان کرد کۆچ بکات.

﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ﴾، کە دووەمی دوو کەسەکان بوون، کە کاتێك ئەوان لە قلێشی شاخەکەدا بوون، لە چاڵەکەدا بوون، کە ئەبو بەکر خوای لێی ڕازی بێ، لە کاتێك دا پێکەوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەو چاڵەدا دابوون، گوتی: ئەگەر یەکێکیان تەماشای ژێر پێی خۆی بکات، ئێمە دەبینێ، کەواتە: ئەشکەوت نەبووە، چونکە ئەشکەوت کاتێك لە سەرەوە تەماشا دەکەی، خوارێ نابینرێ، هەتا نەچیە ژوورێ لە دەرگایەکەیەوە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: دووەمی دوو کەسەکان بوو، ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ﴾ لە ڕووی زمانەوانییەوە وشەی: (الثاني)، (اسم فاعل)ە، پاڵ دراوەتەوە لای (إثنين)، وە بە مانای (مَنْ) دێ، واتە: دووەم بوو، لە دووەکان، دووەکان کێ و کێ بوون؟

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نیزیکترین و دڵسۆزترین خۆشەویستترین هاوەڵی دا، کە ئەبو بەکرە خوا لێی ڕازی بێ.

ئنجا وێنایان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ﴾، {ئەو (إذ)ە، دەگەڕێتەوە بۆ (إذ)ی یەکەم}، لە کاتێکدا کە ئەوان لە چاڵەکەدا بوون، ﴿إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ﴾، کاتێك کە بە هاوەڵەکەی خۆی دەفەرموو، {هاوەڵەکەی کێ بوو؟ هاوەڵەکەی ئەبو بەکر بوو خوا لێی ڕازی بێ} دڵتەنگ مەبەو غەمبار مەبە، بێگومان خوا لەگەڵمانە.

(صاحِب)، هاوەڵ هەر کەسێکە کە بە زۆریی لەگەڵت بێ، ئنجا بۆیەش بە هاوەڵ و ڕەفیق دەگوترێ (صاحب) چونکە بە زۆریی لەگەڵ ئینساندایە، هەر بۆیەش بە هاوسەری ئینسانیش دەگوترێ: (صاحبة)، خوای تاك دەفەرموێ: ﴿مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ۝٣﴾الجن.

واتە: خوا نە هاوەڵێکی هاوسەری هەیە، وە نە ڕۆڵەشی هەیە.

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)یشدا، خوا (صاحبة)ی نەفی کردوە لە خۆی دەفەرمویّ: ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴿١٠١﴾﴾الأنعام.

واتە: چۆن (خوا) رۆڵەی دەبێ، لە حاڵێکدا هاوسەر (هاوەڵ)ی نیە، وە هەموو شتێکیشی دروست کردوەو، بە هەموو شتێکیش زانایە.

ئنجا کە دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾، بە تەئکید لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە خوا بە خود (ذات)ی لەگەڵمانە! بەڵکو یانی: بە بەزەیی‌و لوتف‌و پشتیوانیی‌و...هتدی لەگەڵمانە، چونکە بەگشتی خوا لەگەڵ هەموو دروست کراوەکانی دایە، بەڵام لێرەدا یانی : خوا چاودێریمان دەکات‌و ئاگای لێمانەو، پشتمان دەگریّ، واتە: بە لەگەڵدا بوونێکی تایبەت، لەگەڵماندایە.

شایانی باسیشە کە لێرەدا شیعەکان ویستوویانە تانە لە ئەبو بەکر بدەن خوا لێی رازی بێ، لە تەفسیرەکانیاندا باسیان کردوە، گوتوویانە: تەماشا بکەن! ئەبو بەکر، چەندە ئیمانەکەی بێهێز بووە، ترساوە، لە حاڵێکدا کە مادام لە خزمەتی پێغەمبەری خوا دابوو، نەدەبوو ترسابایە! بەڵام مادام زۆر تووشی ترس‌و ناڕەحەتیی بووە، دیارە ئیمان‌و پشت بە خوابەستنی، بێهێز بووە! بەڵکو هەندێکیان لە نەفامیی‌و بوغزدا رۆچوون، گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەبو بەکری لەگەڵ خۆی دا بردوە، چونکە گومانی لێی هەبووە، نەوەك ئەگەر لێی دوور بێ، سیخوڕیی لەسەر بکات‌و، هەواڵی لێبداو زیانی پێ بگەیەنێ!!

کە بەڕاستیی ئەوە لە پشت پەردەی رەشەوە تەماشا کردنێکە، هیچ خاوەن عەقڵێك‌و، خاوەن ویژدانێك قسەی وا ناکات، زانایانی جەماوەری مسوڵمانانیش، کە بە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت ناسراون، زۆرباش بەرپەرچی ئەو قسەو قاڵانەیان داوەتەوە، بەتایبەتی ئیمام (فخر الدين الرازي)، لە تەفسیرەکەی (التفسير الكبير)دا، هەروەها (محمد رشيد رضا)، لە (تفسير القرآن الحكيم)دا، کە بە پێویستی نازانم زۆر بچینە نێو ئەم باسەوە، گرنگ ئەوەیە: ئەوەی کە شیعە لێرەدا بەرانبەر ئەبو بەکر خوا لێی رازی بێ، دەیڵێین، جگە لە بێویژدانیی‌و جگە لە دەمارگیریی‌و بوغزو غەرەز، هیچی دیکە نیە.

ئنجا لێرەدا کە خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿لَا تَحْـزَنْ﴾ نەیفەرمووە: (لا تَخَفْ)، ئەگەر گوتبای: (لا تَخَفْ) ئەوە دیارە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، ترساوە، هەرچەندە ئەو کاتیش دەگونجا بگوترێ: ترسەکەی لە سەلامەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، نەبادا زیانێکی پێ بگات!

بەڵام فەرموویەتی: ﴿لَا تَحْـزَنْ﴾، دڵتەنگ مەبە! ئەبو بەکر ئەگەر لە خۆی ترسابایە، پێغەمبەر دەیفەرموو: (لا تَخَفْ)، بەڵام ئەبو بەکر پەژارەو دڵتەنگییەکەی لەبەر پێغەمبەر ﷺ بووەو، خەمی بۆ ئەو داگرتوە.

کەواتە: ئەو حاڵەتە دەروونییەی ئەبو بەکر، بۆ وی جوامێریی‌و سیفەت بەرزیی (فضیلة)ە، کە پەرۆشی پێغەمبەری خوای بێ ﷺ و، لەبەر وی غەمباریی‌و دڵتەنگیی هەبێ، پێغەمبەریش ﷺ، ئەوەی لێ ڕەواندۆتەوە.

ئنجا بە دڵنیایی ئەبو بەکرو عەلی خوا لێیان ڕازی بێ، (هەرچەندە ئەبو بەکر لە تەمەنی عەلی دا نەبووە، عەلی کاتی موسڵمانبوونی (١٠) ساڵە بووە، خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ، بەڵام ئەبو بەکر ئەو کاتە پیاوێکی کامڵ‌و تێرو تەواو بووەو، هاوەڵی زۆر دڵسۆزو نیزیکی پێغەمبەر ﷺ بووەو، دوو ساڵ لە پێغەمبەر ﷺ تەمەنی کەمتر بووە)، بەڵام بێگومان ئەبو بەکرو عەلی، وە هەموو هاوەڵان پێکەوە، برا بوون‌و بەمانای وشە، یەکدییان خۆشویستوە، وە ئەوەی دوایی شیعە، وە غەیری شیعەش‌و هەندێك خەڵکی دیکەش کە دواتر پەیدابوون، پەیدایان کردوەو، دەیانەوێ لە نێوان ئەبو بەکرو عەلی‌و عومەرو عوسمان دا، بیوروژێنن، ئەوە هەمووی چێنراوی خەیاڵی خۆیانەو، گومانی خراپی خۆیانە، ئەگەرنا کە تەماشای واقیعی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە دەکەی: دەبینی جگە لە ڕێزو خۆشەویستیی‌و حورمەتیان بەرانبەر یەکدی‌و بۆ یەکدی هیچی دیکەیان لەگەڵ یەکدا نەبووە.

ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ﴾، خوا ئارامی ڕژاندە سەری، ئارامیی ڕژاندە سەر کێ؟

دیارە مەبەست پێی پێغەمبەرە ﷺ هەرچەندە هەندێك لە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت، لە کاردانەوەی شیعەدا گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی بە

ئارامیی نەبووەو، ئەو ئارامییە ڕژاوەتە سەر دڵی ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، بەڵام ڕاستە ماناکەی وا ڕێکتر دێتەوە، کە مەبەست ئەوەیە کە هەر چوونەتە نێو قڵیشی چیایەکەوە، خوا دڵی پێغەمبەر ﷺی ئارام کردوە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ نە ترسی هەبووەو، نە خەمی هەبووە، بەڵکو ئەبو بەکریشی ئارام کردۆتەوە.

کەواتە: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ﴾، ئەو (ف)ە بۆ بەدواداهاتن (فاء التعقیب)ە، یانی: یەکسەر کە چوونە نێو (غار)ەکە، خوا ئارامیی خۆی ڕژاندۆتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، وە فریشتەکانیشی دابەزاندوونە سەری، ئەوەش هۆکارە مەعنەوییەکەیە، کە خوا دڵی پێغەمبەری خۆی ﷺ پێ بەهێز کردوە، ئنجا پێغەمبەریش ئەبو بەکری خوا لێی ڕازی بێ. دڵنیا کردۆتەوەو ئارامی کردۆتەوە.

ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکر دەفەرموێ: ﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾، ئەوە لە ڕاستییدا شوێنەواری ئەو ئارامییەیە، کە خوا دایبەزاندۆتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، وە شوێنەواری ئەو پشتگیریی کردنەیە، کە خوا بە تایبەت بۆ پێغەمبەری خۆی کردوویەتی، کە دابەزاندنی فریشتەکان، کەواتە: مانای ئەم ڕستە قورئانییە ئاوای لێ دێتەوە: (فقد نصرهُ الله فأنزل السكينة عليه وأيده بجنود لم تروها، حين أخرجه الذين كفروا وحين كان في الغار وحين قال لصاحبه لا تحزن إن الله معنا).

واتە: ئەگەر ئێوەش سەری نەخەن، خوا پێغەمبەری خۆی سەرخست، وە ئارامیی ڕژاندە سەر دڵی، وە بە فریشتەکان کە ئێوە نەتاندەبینین، بەهێزی کردو پشتی گرت، کاتێك ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، دەریانکرد، وە کاتێك لە (غار)ەکەدە بوون، وە بە هاوەڵەکەی دەفەرموو: دڵتەنگ مەبە! خوا لەگەڵماندایە.

ئنجا دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰ﴾، وە خوا وشەی ئەوانەی بێبڕوان، ژێر خست.

وەك پێشتریش باسمان کرد: (كلمة)، بە مانای (وشە) دێ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا بە مانای بڕیاریش، دێ، وە بە مانای پیلانیش، دێ، وە بە مانای نەخشە دانان، دێ، وە بە مانای حاڵیش، دێ، بە مانای ئەرکیش، دێ، واتە: (كلمة)، بە مانای بێژە (لفظة)یەك دێ لە قسە، بەڵام دوایی بەکارهێنراوە بۆ: کاروبارو بۆ پیلانو نەخشەو ئەرك.

وەك پێشتر باسمان کرد، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة.

واتە: وە یاد بکەوە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقی کردەوە بە چەند وشەیەك.

کە بە تەئکید مەبەستی لە چەند وشەیەك، چەند ئەرکێکە، بەڵام ئەرکەکان بە وشەی خوا پێی سپێردراون.

هەروەها خوا ﷻ ناوی لە عیسا ناوە (كلمة)، ﴿بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ﴿٤٥﴾﴾ آل عمران، بۆچی؟

چونکە عیسا بە وشەی خوا، بە فەرمانی خوا دروست بووە، نەك لە ڕێی پێکگەیشتنی ژنو مێردێك.

ئنجا خوا وشەی ئەوانەی بێبڕوان واتە: کاری وان، پیلانی وان، یاخود بەرنامەی ئەوانی خستە ژێرەوەو، وەبنی خست، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ﴾، چونکە وا مەزندە کراوە: ئەو پیلانو فێڵەی ئەوان، ئەو هەموو هێزو دەسەڵاتەی ئەوان، نەدەبوو ژێر بکەوێو، پووچەڵ بێتەوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ﴾؟ مانای وایە خوا وایلێکرد، ئەگەرنا لە ڕاستییدا مەزندەی ئەوەی لێ نەدەکرا، بەڵام خوا ژێری خست، ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، وە خوا زاڵی کاربەجێیە.

كە دەفەرمویٚ: ﴿وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا﴾ یانی: وە وشەی خـوا، بڕیاری خـوا، نەخشـەی خـوا، كـاری خـوا، هەر ئەو لە سەرێیە، یانی حالّەتی ئاسایـی ویستو نەخشەی خواو، وشەی خواو بڕیاری خواو، كاری خوا وایە، كە دەبیٚ هەر لە سەریٚ بیٚ. چونكە ﴿وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا﴾، بە ڕستەی ناویی (الجملة الإسمیة) هـاتوە، كـە مانـای بەردەوامییو سـەقامگیـریی دەگەیەنـیٚ.

# کورتە باسێک دەربارەی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵەکەی ئەبوبەکر (خوالێی ڕازی بێ) لەمەککەوە بۆ شاری مەدینە

دیارە ئێمە لەبەر ڕۆشنایی کتێبی (السیرة النبویّة لابن هشام)[١]دا، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئەو کورتە باسە دەکەین، بەلاّم سەرەتا دەڵێین: کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی گوێ بیست دەبێ، کە کافرەکان پیلانی لە دژ دەگێڕن {وەك خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٣٠) لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنفال.

وە یاد بکەوە: کاتێك ئەوانەی بێبڕوا بوون، پیلانیان لە دژ دەگێڕای بۆ ئەوەی زیندانییت بکەن، یاخود بتکوژن، یاخود دەرتبکەن، ئەوان پیلانیان دەگێڕاو خواش نەخشەی دادەنا، وە خوا باشترین نەخشە دانەر بوو} .

ئنجا ئەوە لێرەدا[٢] خوا ﷻ، ئەوەی کە لە سوورەتی (الأنفال)دا باسیکردوە، ئەو ڕاستییە دەخاتەوە بیر پێغەمبەر ﷺو، بیر مسوڵمانانیش کە خوا ئاوا پشتی پێغەمبەری خۆی گرتوە .

---

١) بڕوانە : ج ٢ ، ص ، ٢٥١ –٢٥٧.

٢) واتە: لە ئایەتەکانی (٣٩، ٤٠)ی (التوبة) دا.

بەڵێ کاتێـک پێغەمبـەر ﷺ ئـەوە دەبیسـتێو گـوێ بیسـتی ئـەو پیلانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەبێ، فەرمان بە عەلی دەکات، کە ئەو کاتە گەنجێکی تەمەن سەرووی (٢٠) ساڵ بووە، کـە لـە شوێـنی وی دا بەبێ ترسیی بخـەوێ، وە پێی دەفەرموێ: لەسەر جێگـای من بخەوە، وە ئەو بوردە (حضرمیـة)یە سەوزەم بە خۆت دابدەو تێیدا بخەوە، دڵنیابە هیچ شتێك لەوانەوە بە تۆ ناگات کە پێت ناخۆش بێ، یانی: هیچ زیانێکت لێ نادەن.

وە پێغەمبـەر ﷺ عادەتی وابوو ئـەو قوماشـەی بـە خـۆی داداوە، دیارە وەك لێفـەیەك، بەتانییەك بووە.

ئنجا (ابن اسحاق) دەڵێ: لە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ زانی کە ئەوانە پیلان دەگێڕن، کە یەکێك لەو سێ شتانەی لەگەڵدا بکەن: یان سجنی بکەن، یان بیکوژن، یاخود دەریبکەن، وە سەرەنجام بڕیاریشیان هاتۆتە سەر کوشتنی، وەك کاتی خۆی لە سوورەتی (الأنفال)دا بە تەفصیلێ باسی ئەوەمان کـرد، کـە ئـەو ڕایەیان تەبەننیی کردوە، کە بیکوژن، لەو کاتەدا خوا مۆڵەت بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەدات، کە کۆچ بکات بـەرەو مەدینـە، کـە دیارە پێشتریش هاوەڵانی بەرێزی بەرەو مەدینە بەڕێ کردوە.

(ابن إسحاق) دەڵێ: (وَأَذِنَ اللهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ فِي الْهِجْرَةِ) لـەو کاتەدا (واتە: لەو هەلومەرجەی کە پێشتر باسمان کرد) خوای بەرز مۆڵەتی دا بە پێغەمبەری خۆی ﷺ کە کۆچ بکات.

## باسی چۆنیەتی کۆچی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکەی لە چوارده ( ١٤ ) بڕگەدا

١ / ﴿وَكَانَ أَبُو بَكرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ رَجُلاً ذَا مَالٍ، فَكَانَ حِيْنَ اسْتَاذَنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي الْهِجْرَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لا تَعْجَلْ لَعَلَّ اللهَ يَجِدُ لَكَ صَاحِباً. قَدْ طَمِعَ بِأَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّمَا يَعْنِي نَفْسَهُ حَيْنَ، قَالَ لَهُ ذَلِكَ، فَابْتَاعَ رَاحِلَتَيْنِ فَاحْتَبَسَهُمَا فِي دَارِهِ، يَعْلِفُهُمَا إِعْدَادًا لِذَلِكَ﴾.

واتە: ئەبو بەکر پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، کاتێک مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت، کە کۆچ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿لا تَعْجَلْ لَعَلّ اللّهَ يَجِدُ لَكَ صَاحِبًا﴾.

واتە: پەلە مەکە، بەڵکو خوا هاوەڵێکت بۆ پەیدا بکات.

ئەبو بەکریش خوا لێی ڕازی بێ ئومێدی وابوو، ئەو هاوەڵە خودی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، بۆیە ئەبو بەکر دوو حوشتری سواریی کڕین، وە لە ماڵی خۆیدا ڕایگرتن، وە ئالیکی پێدەدان، ئامادەی دەکردن بۆ ئەو کاتەی کە کۆچ دەکات لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢ / ﴿عَنْ عَائِشَةَ أُمّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ لا يُخْطِئُ رَسولُ اللهِ ﷺ أَنْ يأتِيَ بَيْتَ أَبِي بَكر، أَحَدَ طرفَيْ النّهار، إمّا بُكرةً وإمّا عَشِيةً، حتّى إذَا كَانَ الْيَومُ الّذِي أُذِنَ فِيهِ لِرَسول اللهِ ﷺ فِي الْهِجْرَةِ وَالْخُرُوجِ مِنْ مَكة مِنْ بَيْنِ ظَهْرَيْ قَوْمِهِ، أَتَانا رَسولُ اللهِ ﷺ بِالْهاجِرَةِ فِي ساعَةٍ كانَ لا يأتِي فِيها، قَالَتْ: فلَما رَآهُ أَبُو بَكر، قَالَ: مَا جاءَ رَسولُ اللهِ ﷺ هَذِهِ الساعَةَ إلاّ لأَمْرٍ حَدَثَ، قَالَتْ: فَلَما دَخَلَ تأخّرَ لَهُ أَبُو بَكر عَنْ سَرِيرِهِ فَجَلَسَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَلَيْسَ عِنْدَ أَبِي بَكر إلاّ أَنا وَأُخْتِي أَسماءُ بِنْتُ أَبِي بَكر، فقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ أَخْرِجْ عَنّي مَنْ عِنْدَك، فقَالَ: يا رَسولَ اللهِ! إنّمَا هُمَا ابْنَتَايَ، وَمَا ذَاكَ؟ فِدَاك أَبِي وَأُمّي، فَقَالَ: إنّ اللهَ قَدْ أَذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ وَالْهِجْرَةِ، قَالَتْ: فَقَالَ أَبُو بَكر: الصّحْبَةَ يا رَسولَ اللهِ؟ قَالَ: الصّحْبَةَ، قَالَتْ: فَوَاللهِ مَا شَعُرْت قَطّ قَبْلَ ذَلِكَ الْيَومِ، أَنّ أَحَدًا يَبْكِي مِنْ الْفَرَحِ حَتّى رَأَيْت أَبَا بَكر يَبْكِي يَومئِذٍ، ثُمّ قَالَ: يا نَبِيّ اللهِ إنّ هاتَيْنِ رَاحِلَتانِ، قَدْ كُنْت أَعْدَدْتهما لِهَذَا، فَاستَاجَرَا عَبْدَ اللهِ بْنَ أَرْقَطٍ (رَجُلاً مِنْ بَنِي الدّئَلِ بْنِ بَكر، وَكَانَتْ أُمّهُ امْرَأَةً مِنْ بَنِي سَهْمِ بْنِ عَمْرٍو ، وَكَانَ مُشْرِكاً) يَدُلّهُمَا عَلَى الطريقِ، فَدَفَعَا إلَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا، فَكَانَتَا عِنْدَهُ يَرْعَاهُمَا لِمِيعَادِهِمَا﴾.

واتە: عائیشە دایکی بڕواداران خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کەم ڕۆژ هەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نەیەت بۆ ماڵی ئەبو بەکر، بەیانیان یان ئێواران.

ئنجا ئەو ڕۆژەی کە مۆڵەت درا بە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچ بکات، لە مەککەو هۆزەکەی خۆی بە جێبهێڵێ بەرەو مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە چرقەی نیوەڕۆیەدا، لە کاتێکدا کە عادەتی وانەبوو، بێ بۆ ماڵمان، هات، کاتێك ئەبو بەکر بینی، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم کاتەدا بۆ شتێك هاتوە، دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ژوور کەوت، ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، لەو شوێنە تایبەتەی کە خۆی لێی دادەنیشت، وە دوور کەوت، بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دابنیشێ، وە تەنیا لەو کاتەدا لەلای ئەبو بەکر، منو ئەسمائی خوشکم لەوێ بووین.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکری فەرموو: ﴿أَخْرِجْ عَنِّي مَنْ عِنْدَكَ﴾ کێت لەلایە با بچنە دەرێ، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تەنیا دوو کچەکانمن، چی لە ئارادایە، دایكو بابم بە قوربانت بن؟

فەرمووی: ﴿إِنَّ اللهَ قَدْ أَذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ وَالْهِجْرَةِ﴾، بێگومان خوا مۆڵەتی پێداوم کە کۆچ بکەمو دەربچم، دەڵێ: ئەبو بەکریش گوتی: پێکەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ پێکەوە بە هاوەڵیی.

عائیشە دەڵێ: بە خوا پێش ئەو کاتە هەرگیز، هەستم نەکردبوو کە هیچ کەس لە خۆشییان گریانی بێتێ، هەتا ئەو ڕۆژە ئەبو بەکرم بینی، لە خۆشییان گریا، وە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ دوو وڵاخی سوارییم بۆ ئەم کارە ئامادە کردوون.

ئنجا (عَبْدَ اللهِ بْنَ أَرْقَطٍ) پیاوێك بوو لە بەنی (بَنِي الدِّئَلِ بْنِ بَكرٍ) وە دایکی ئافرەتێك بوو لە (بَنِي سَهْمِ بْنِ عَمْرٍو) کە هاوبەش بۆ خوادانەر بوو، بە کرێیان گرت، کە ببێتە ڕێ پێشاندەریان، ئەو دوو حوشترەی کە ئەبو بەکر ئامادەی کردبوو، دوو حوشترەکەی لابوون، تاکو بیانلەوەڕێنێ، بۆ کاتی دیاریکراو.

٣ / ﴿وَلَمْ يَعْلَمْ فِيمَا بَلَغَنِي، بِخُرُوجِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَحَدٌ، حِيْنَ خَرَجَ، إِلاَّ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبُو بَكرٍ الصِّدِّيقُ، وَآلُ أَبِي بَكرٍ، أَمَّا عَلِيٌّ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ (فِيمَا بَلَغَنِي) أَخْبَرَهُ بِخُرُوجِهِ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَتَخَلَّفَ بَعْدَهُ بِمَكَّةَ، حَتَّى يُؤَدِّيَ عَنْ رَسُول

اللهِ ﷺ الْوَدَائِعَ الّتِي كَانَتْ عِنْدَهُ لِلنَاسِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيْسَ بِمَكَة أَحَدٌ عِنْدَهُ شَيْءٌ يُخْشَى عَلَيْهِ، إلاّ وَضَعَهُ عِنْدَهُ، لِمَا يُعْلَمُ مِنْ صِدْقِهِ وَأَمَانَتِهِ ﷺ﴾.

واتە: وە بە پێی ئەو زانیارییەی پێم گەیشتوە، هیچ کەس بە دەرچوونو بەو سەفەرەی پێغەمبەری خوای ﷺ نەزانیوە، جگە لە عەلی کوڕی ئەبی طاڵیبو، ئەبو بەکری صیددیقو بنەماڵەی ئەبو بەکر، هەرچی عەلی بوو خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد کە لە جێی ئەو بمێنێتەوە لە مەککە، وە ئەو سپاردانەی خەڵك کە لەلای دانرابوون بە خاوەنەکانیان بسپێرێتەوە.

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە هیچ کەسێك ماڵو سامانێك، شتێکی نەدەبوو کە مەترسیی لێی هەبێ، {کە نرخو بەهایەکی باشی هەبێ} . مەگەر لە لای پێغەمبەر ﷺ دایدەنا، لەبەر ئەوە کە شارەزای بوون کە زۆر ڕاست بێژە، وە زۆر دەست پاکە.

٤ / ﴿فَلَما أَجْمَعَ رَسولُ اللهِ ﷺ الْخُرُوجَ، أَتَى أَبَا بَكر بْنِ أَبِي قُحافة، فَخَرَجَا مِنْ خَوْخَة لأَبِي بَكر فِي ظَهْر بَيْتِهِ، ثُمّ عَمَدَا إلَى غَار بِثَوْر (جَبَل بِأَسْفَل مَكَة) فَدَخَلاَهُ، وَأَمَرَ أَبُو بَكر ابْنَهُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي بَكر، أَنْ يَتَسَمّعَ لَهُمَا مَا يَقُولُ النَاسُ فِيهِمَا نَهارَهُ، ثُمّ يأْتِيهِمَا إذَا أَمْسَى، بِمَا يَكُونُ فِي ذَلِكَ الْيَومِ مِنْ الْخَبَر، وَأَمَرَ عَامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ مَوْلاَهُ أَنْ يَرْعَى غَنَمَهُ نَهارَهُ، ثُمّ يُرِيحُها عَلَيْهِمَا، يأْتِيهِمَا إذَا أَمْسَى فِي الْغَار، وَكَانَتْ أَسمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكر تأْتِيهِمَا مِنْ الطّعَامِ إذَا أَمْسَتْ، بِمَا يُصْلِحُهُمَا، قَالَ ابْنُ هِشَام: وَحَدّثَنِي بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنّ الْحَسَنَ بْنَ أَبِي الْحَسَنِ الْبَصْرِيّ، قَالَ انْتَهَى رَسولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو بَكر إلَى الْغَارِ لَيْلاً، فَدَخَلَ أَبُو بَكر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَبْلَ رَسولِ اللهِ ﷺ فَلَمَسَ الْغَارَ لِيَنظُرَ أَفِيهِ سَبُعٌ أَوْ حَيةٌ يَقِي رَسولَ اللهِ ﷺ بِنَفْسِهِ﴾.

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دەرچوونی دا، هاتە لای ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە، وە پێکەوە لە دەرگایەکی بچووکی پشتی خانووەکەی ئەبو

بەکر، {یان لە کلاّوڕۆژنەیەك کە لە پشتی خانووەکەیاندا هەبووە}، لەوێوە دەرچوون بەرەو (غار)ی (ثور) ڕۆیشتن، (غار)ی (ثور)یش لە چیایەکە لە دامێن مەککەوە، هەردووکیان چوونە نێو ئەو قڵیشە شاخەوە.

وە ئەبو بەکر فەرمانی بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر کرد ، کە هەواڵی خەڵکیان بۆ بێنێ، واتە: گوێ هەڵبخات، بزانێ خەڵك بە ڕۆژ چی دەڵێن؟ کاتێك ئێوارە داهات، بۆیان بێنێ، وە فەرمانیشی کرد بە (عَامِر بْن فُهَيْرَةَ) کە ئەویش خزمەتکاری بوو، کە بە ڕۆژێ مەڕەکەی بۆ بلەوەڕێنێ، وە ئێواران بە لای وان دا بیهێنێ، بۆ ئەوەی سوود لە شیرەکەیان ببینن، هەروەها ئەسمائی کچی ئەبو بەکریش خوا لێیان ڕازی بێ، ئەویش ئێواران خواردن‌و هەر پێداویستییەکی هەیان بوو، بۆی دەهێنان.

ئیبنو هیشام دەڵێ: هەندێك لە زانایان بۆیان باسکردووم، کە حەسەنی کوڕی حەسەنی بەصرایی گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر بە شەوێ چوونە نێو ئەشکەوتەکە، ئەبو بەکر سەرەتا چووە نێوی ، وە دەستی پێدا گێڕا، بۆ ئەوەی ئەگەر دڕندەیەك، مارێك هەبێ، خۆی بکاتە بەلاگێڕەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٥ / ﴿فَأَقَامَ رَسولُ اللهِ ﷺ فِي الْغَارِ ثَلاثاً، وَمَعَهُ أَبُو بَكر، وَجَعَلَتْ قُرَيْشٌ فِيهِ حِيْنَ فَقَدُوهُ مِئَةَ نَاقَةٍ لِمَنْ يَرُدّهُ عَلَيْهِمْ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكر، يَكُونُ فِي قُرَيْشٍ نَهَارَهُ مَعَهُمْ يَسْمَعُ مَا يأْتَمِرُونَ بِهِ، وَمَا يَقُولُونَ فِي شأْنِ رَسولِ اللهِ ﷺ وَأَبِي بَكر، ثُمّ يأْتِيهِمَا إِذَا أَمْسَى فَيُخْبِرُهُمَا الْخَبَرَ، وَكَانَ عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ مَوْلَى أَبِي بَكر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَرْعَى فِي رعيان أَهْلِ مَكة، فَإِذَا أَمْسَى أَرَاحَ عَلَيْهِمَا غَنَمَ أَبِي بَكر، فَاحْتَلَبَا وَذَبَحا، فَإِذَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكر غَدَا مِنْ عِنْدِهِمَا إِلَى مَكة، اتّبَعَ عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ أَثَرَهُ بِالْغَنَمِ حَتّى يُعَفّي عَلَيْهِ، حَتّى إِذَا مَضَتْ الثّلاثُ، وَسَكَنَ عَنْهُمَا النّاسُ، أَتَاهُمَا صَاحِبُهُمَا الّذِي اسْتأْجَرَاهُ بِبَعِيرَيْهِمَا وَبَعِيرٍ لَهُ، وَأَتَتْهُمَا أَسمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكر رَضِيَ اللهُ عَنْهَا بِسُفْرَتِهِمَا. وَنَسِيَتْ أَنْ تَجْعَلَ لَهَا عِصَاماً، فَلَمّا ارْتَحَلا، ذَهَبَتْ لِتُعَلّقَ السّفْرَةَ، فَإِذَا لَيْسَ لَهَا

عِصَامٌ، فَتَحِلَ نِطَاقَهَا فَتَجْعَلُهُ عِصَاماً، ثُمَّ عَلَّقَتْهَا بِهِ، فَكَانَ يُقَالُ لأَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكر: ذَاتُ النِّطَاقِ لِذَلِكَ﴾.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکر سێ ڕۆژو شەوان لە (غار)ی (ثور)دا مانەوە، قورەیشییەکانیش کاتێك کە زانیان پێغەمبەر ﷺ لە مەککە نەماوە، سەد حوشتریان وەك پاداشتو خەڵات دانا، بۆ هەر کەسێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ وان بگێڕێتەوەو تەسلیمیان بکاتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بکریش بە ڕۆژێ لە نێو قورەیشییەکان دەبوو، گوێی هەڵدەخست: بزانێ کە ئەوان چ پیلانێك دەگێڕن، وە ڕاوێژ دەربارەی چی دەکەن، وە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکرو چی دەڵێن؟ هەواڵەکانی هەموو وەردەگرت، وە کاتێك ئێوارە دادەهات، دەچوو بۆ خزمەتیان، هەواڵەکانی پێدەگوتن.

(عَامِر بْن فُهَيْرَةَ)ش لەگەڵ شوانەکانی خەڵکی مەککە، ئەو ڕانە مەڕەی دەلەوەڕاند، وە کاتێك کە ئێوارە دا دەهات، ئەو ڕانە مەڕەی ئەبو بەکری بە لایان دا دەبرد، ئەوانیش شیریان لێ دەدۆشیو، ئەگەر پێویست بووایە لێیان سەردەبڕی، ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکریش خوا لێی ڕازی بێ، دوایی لەلای وانەوە، دەچۆوە بۆ لای خەڵکی مەککە.

کە دەگەڕایەوە، (عَامِر بْن فُهَيْرَةَ) شوێنەوارەکەی بە ڕانە مەڕەکەی دەکوژراندەوە، بۆ ئەوەی کە شوێن پێیەکانی دیار نەبن، هەتا سێ شەو تێپەڕین، وە خەڵك لە لێ خەفتانی پێغەمبەر ﷺو ئەبو بەکر ئارام بوونەوە (یانی: بێ ئومێد بوون).

ئنجا ئەو هاوەڵەیان کە بە کرێیان گرتبوو (عَبْدُ اللهِ بْنُ أَرْقَطِ)، وە دوو حوشترەکانیشیان تەسلیم کردبوو، وە خۆشی حوشترێکی پێبوو، هەر سێکیانی هێنان.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکریش خواردنو خۆراکی بۆ دەهێنان، بەڵام ئەو ڕۆیەك کە ئەو خواردنو خۆراکەی پێ دەپێچرێو هەڵدەواسرێ، لە بیری چوو بوو بیهێنێ، بۆیە کاتێك کە سوار بوون، ئەسماء چوو ئەو شتە بێنێ، کە ئەو خواردنەی پێ ببەستێو هەڵواسێ، بەڵام تەماشای کرد هیچ شتێکی پێ نیە،

بۆیە پشتێنەکەی خۆی لەخۆی کردەوەو ئەو پڕێسکەیەی کە خواردنەکەی تێدا بوو، هەڵیواسی، وە ئەوی دیکەشیانی کردە پشتێن، بۆیە لەوەوە بە ئەسمائی کچی ئەبو بەکر گوتراوە: (ذَاتُ النِّطَاقِ) خاوەن پشتێن.

(قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: وَسَمِعْتُ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُ: ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ. وَتَفْسِيرُهُ أَنَّهَا لَمَا أَرَادَتْ أَنْ تُعَلِّقَ السُّفْرَةَ، شَقَّتْ نِطَاقَهَا بِاثْنَيْنِ، فَعَلَّقَتْ السُّفْرَةَ بِوَاحِدٍ، وَانْتَطَقَتْ بِالآخَرِ).

واتە: ئیبنو هیشام دەڵێ: گوێم لە زیاتر لە یەكێك لە زانایان بووە، كە گوتوویانە: (ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ) واتە: خاوەنی دوو پشتێنەكان، ئەویش بەهۆی ئەوەوە كە ویستوویەتی ئەو پڕێسكەیەی خواردنی تێدابووە، بە وڵاخەكەیەوە هەڵواسێ‌و، نەیتوانیوە بۆیە پشتێنەكەی خۆی دوو لەت كردوەو، بە یەكێكیان پڕێسكەكەی هەڵواسیوەو، ئەوی دیكەشی كردۆتە پشتێن.

٦ / ﴿فَلَمَا قَرَّبَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ الرَّاحِلَتَيْنِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ قَدَّمَ لَهُ أَفْضَلَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: ارْكَبْ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي لا أَرْكَبُ بَعِيرًا لَيْسَ لِي، قَالَ: فَهِيَ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ! بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، قَالَ لا، وَلَكِنْ مَا الثَّمَنُ الَّذِي ابْتَعْتَهَا بِهِ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: قَدْ أَخَذْتُهَا بِهِ، قَالَ: هِيَ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ! فَرَكِبَا وَانْطَلَقَا وَأَرْدَفَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ مَوْلاهُ خَلْفَهُ، لِيَخْدِمَهُمَا فِي الطَرِيقِ﴾.

واتە: كاتێك ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ، دوو وڵاخەكەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە نیزیك خستن، كامەی پێ باشتر بوو، بردیە پێش پێغەمبەری خواو فەرمووی: سوار بە! دایك‌و بابم بە قوربانت بن، پێغەمبەری خواش فەرمووی: (إِنِّي لا أَرْكَبُ بَعِيرًا لَيْسَ لِي) من سواری حوشترێك نابم، كە هی خۆم نەبێ. ئەبو بەكریش گوتی: ئەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا! دایك‌و بابم بە قوربانت بن، ئەویش فەرمووی: (وَلَكِنْ مَا الثَّمَنُ الَّذِي ابْتَعْتَهَا بِهِ) نەخێر، بە چ نرخێكت كڕیوە؟ ئەویش گوتی: بەوەندەو بەوەندە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (قَد

أَخَذْتُها بِهِ) ئەوە بەو نرخە ئەو حوشترەم لە تۆ کڕی، ئەبو بەکریش خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە ئەو حوشترەم بەم نرخە دا بە تۆ، (مادام بێ پارە ناتەوێ).

ئنجا سوار بوونو ڕۆیشتن، وە ئەبو بەکر (عَامِر بْن فُهَيْرَةَ)شی لە دوای خۆی سوار کرد، بۆ ئەوەی لە ڕێگادا خزمەتیان بکات.

٧ / ﴿عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكر أَنَّها، قَالَتْ: لَما خَرَجَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو بَكر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَتانا نَفَرٌ مِنْ قُرَيْش، فِيهِمْ أَبُو جَهْل بْن هِشام، فَوَقَفُوا عَلَى بَابِ أَبِي بَكر، فَخَرَجْتُ إِلَيْهِمْ فَقَالُوا: أَيْنَ أَبُوك يا بِنْتَ أَبِي بَكر؟ قَالَتْ: قُلْتُ: لا أَدْرِي وَاللهِ أَيْنَ أَبِي؟ قَالَتْ: فَرَفَعَ أَبُو جَهْلٍ يَدَهُ، وَكَانَ فَاحِشاً خَبِيثاً، فَلَطَمَ خَدِّي لَطْمَةً طرحَ مِنْها قُرْطِي﴾.

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر گوتوویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر دەرچوون، چەند کەسێك لە قوڕەیشییەکان هاتن بۆ لامان، کە لە نێویاندا ئەبو جەهلی کوڕی هیشام هەبوو، لەبەر دەرگای ماڵی ئەبو بەکر ڕاوەستان، گوتیان: ئەی کچی ئەبو بەکر! بابت لە کوێیە؟ منیش گوتم: بە خوا نازانم بابم لە کوێیە، ئەبو جەهل کە پیاوێکی جنێودەری خراپەکار بوو، دەستی بەرز کردەوەو زللەیەکی لێدام، گوارەکەم بەهۆی زللەکەیەوە لە گوێم پەڕی.

٨ / ﴿وَكَانُوا أَرْبَعَةً: رَسولُ اللهِ ﷺ، وَأَبُو بَكر الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَعَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ مَوْلَى أَبِي بَكر، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَرْقَطَ دَلِيلُهُمَا، قَالَ ابْنُ هِشامٍ: وَيُقَالُ عَبْدُ اللّهِ بْنُ أُرَيْقِطٍ﴾.

واتە: وە سەرەنجام بوونە چوار کەس کە ڕۆیشتن: پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەبو بەکری صیددیقو، عامری کوڕی فوهەیرەی خزمەتکاری ئەبو بەکر، وە عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەط، کە ڕێپێشاندەریان بوو، ئیبنو هیشام گوتوویەتی: پێی گوتراوە: (عَبْدُ اللهِ بْنُ أُرَيْقِطٍ).

٩ / ﴿قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَحَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزَّبَيْرِ، أَنّ أَبَاهُ عَبّاداً حَدّثَهُ عَنْ جَدّتِهِ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ: لَمّا خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ مَعَهُ، احْتَمَلَ أَبُو بَكْرٍ مَالَهُ كُلّهُ، وَمَعَهُ خَمْسَةُ آلافِ دِرْهَمٍ أَوْ سِتّةُ آلافٍ، فَانْطَلَقَ بِهَا مَعَهُ، قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيْنَا جَدّي أَبُو قُحَافَةَ، وَقَدْ ذَهَبَ بَصَرُهُ. فَقَالَ: وَاللهِ إِنّي لاَ أَرَاهُ إِلاّ قَدْ فَجَعَكُمْ بِمَالِهِ مَعَ نَفْسِهِ، قَالَتْ قُلْتُ: كَلاّ يَا أَبَتِ. إِنّهُ قَدْ تَرَكَ لَنَا خَيْراً كَثِيراً، قَالَتْ فَأَخَذْتُ أَحْجَارًا فَوَضَعْتُهَا فِي كُوّةٍ فِي الْبَيْتِ الّذِي كَانَ أَبِي يَضَعُ مَالَهُ فِيهَا، ثُمّ وَضَعْتُ عَلَيْهَا ثَوْباً، ثُمّ أَخَذْتُ بِيَدِهِ فَقُلْتُ: يَا أَبَتِ ضَعْ يَدَكَ عَلَى هَذَا الْمَالِ، قَالَتْ: فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ إِذَا كَانَ تَرَكَ لَكُمْ هَذَا فَقَدْ أَحْسَنَ، وَفِي هَذَا بَلاغٌ لَكُمْ، وَلا وَاللهِ مَا تَرَكَ لَنَا شَيْئاً، وَلَكِنّي أَرَدْتُ أَنْ أُسَكّنَ الشّيْخَ بِذَلِكَ﴾.

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: یەحیای کوڕی عەبباد لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە بۆی گێڕاومەوە، کە بابی عەبباد بۆی گێڕاومەتەوە لە نەنکی ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە کە گوتوویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەبو بەکر ﷺ خزمەتیدا، ڕۆیشتن، ئەبو بەکر هەرچی ماڵی هەبوو، کە پێنج هەزار درەم، یان شەش هەزار درەم بوو، هەمووی برد، ئنجا باپیرم ئەبو قوحافە، هات بۆ لامان، چاوی نەمابوو، کوێر بوو، گوتی: بە خوا من وا هەست دەکەم، کە ئەو کوڕەی من، ماڵو سامانەکەی هەموو بردوەو، ئێوەی تووشی سەغڵەتیی کردوە. دەڵێ: منیش گوتم: نەخێر باپیرە، ماڵو سامانێکی زۆری بۆ بەجێهێشتووین. بۆ دڵدانەوەی وی چەند بەردێکم پەیدا کردن (دیارە دەبێ وردە بەرد بوو بن) وە لە تاقەیەکدا دامنان، کە عادەتی بابم وا بوو، ماڵو سامانی خۆی لەوێ دادەنا، وە پۆشاکێکیشم بەسەر دادان، دوایی دەستی ئەبو قوحافەم گرت، گوتم: باپیرە! دەست لەسەر ئەو ماڵو سامانە دابنێ، ئەویش دەستی کردێ (و نەیزانی بەردن) گوتی: مادام ئەوەندە ماڵەی بۆ بەجێهێشتین، شتێکی باشی کردوە. قەیدێ ناکات، بەوەندە خەرجییو مەسرەفی خۆتانی پێدەکەن.

ئەسماء دەڵێ: بە خوا هیچیشی بۆ بەجێنەهێشتبووین، بەڵام ویستم ئەو پیاوە بەتەمەنە ئارام بکەمەوە. {(ماشاء الله) چەندە بە هۆشو سەلیقەدار بوون! خوا لێیان ڕازی بێ} .

١٠ / ﴿ عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ، قَالَ: لَما خَرَجَ رَسولُ اللهِ ﷺ مِنْ مَكة مُهاجِراً إِلَى الْمَدِينَةِ، جَعَلَتْ قُرَيْشٌ فِيهِ مِئة نَاقَةٍ لِمَنْ رَدَّهُ عَلَيْهِمْ، قَالَ: فَبَيْنا أنا جَالِسٌ فِي نَادِي قَوْمِي، إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ مِنا، حَتَّى وَقَفَ عَلَيْنا، فَقَالَ: وَاللهِ لَقَدْ رَأَيت رَكْبَهُ ثَلاثَة مَرّوا عَلَيّ آنِفاً، إِنّي لأَرَاهُمْ مُحَمّدًا وَأَصْحابَهُ، قَالَ: فَأَوْمَأْتُ إِلَيْهِ بِعَيْنِي: أَنْ اُسْكُتْ، ثُمّ قُلْت: إنمَا هُمْ بَنُو فُلانٍ، يَبْتَغُونَ ضالّة لَهُمْ، قَالَ: لَعَلَّهُ، ثُمّ سَكَتَ، قَالَ: ثُمّ مَكَثْت قَلِيلاً، ثُمَّ قُمْت فَدَخَلْتُ بَيْتِي، ثُمَّ أَمَرْت بِفَرَسِي، فَقِيدَ لِي إِلَى بَطْنِ الوَادِي، وَأَمَرْت بِسِلاحِي، فَأُخْرِجَ لِي مِنْ دُبُرِ حُجْرَتِي، ثُمّ أَخَذْت قِدَاحِي الّتِي أَسْتَقْسِمُ بِها، ثُمّ انْطَلَقْت، فَلَبِسْت لأْمَتِي، ثُمّ أَخْرَجْت قِدَاحِي، فَاسْتَقْسَمْت بِها، فَخَرَجَ السّهْمُ الّذِي أَكرهُ (لا يَضُرّهُ)، قَالَ: وَكُنْت أَرْجُو أَنْ أَرُدّهُ عَلَى قُرَيْشٍ، فَآخُذَ الْمِئة النَاقَةِ، قَالَ فَرَكِبْت عَلَى أَثَرِهِ فَبَيْنَمَا فَرَسِي يَشْتَدّ بِي، عَثَرَ بِي، فَسَقَطْت عَنْهُ، قَالَ: فَقُلْت: مَا هَذَا؟ قَالَ: ثُمّ أَخْرَجْت قِدَاحِي، فَاسْتَقْسَمْت بِها، فَخَرَجَ السّهْمُ الّذِي أَكرهُ (لا يَضُرّهُ)، قَالَ: فَأَبَيْت إلاّ أَنْ أَتّبِعَهُ، قَالَ: فَرَكِبْت فِي أَثَرِهِ، فَبَيْنا فَرَسِي يَشْتَدّ بِي، عَثَرَ بِي، فَسَقَطْت عَنْهُ، قَالَ فَقُلْت: مَا هَذَا؟ قَالَ: ثُمّ أَخْرَجْت قِدَاحِي، فَاسْتَقْسَمْت بِها، فَخَرَجَ السّهْمُ الّذِي أَكرهُ (لا يَضُرّهُ)، قَالَ: فَأَبَيْتُ إلاّ أَنْ أَتّبِعَهُ، فَرَكِبْت فِي أَثَرِهِ، فَلَما بَدَا لِي الْقَوْمُ، وَرَأَيْتهم عَثَرَ بِي فَرَسِي، فَذَهَبَتْ يَدَاهُ فِي الأَرْضِ وَسَقَطْت عَنْهُ، ثُمَّ انْتَزَعَ يَدَيْهِ مِنْ الأَرْضِ وَتَبِعَهُمَا دُخَانٌ كالإِعْصَارِ، قَالَ: فَعَرَفْت حِينَ رَأَيْت، ذَلِكَ أَنَّهُ قَدْ مُنِعَ مِنّي، وَأَنّهُ ظَاهِرٌ، قَالَ: فَنَادَيْت الْقَوْمَ فَقُلْت: أَنا سُرَاقَةُ بْنُ جُعْشُمٍ اُنْظُرُونِي أُكَلّمْكُمْ، فَوَاللهِ لا أَرِيبُكُمْ وَلا يَأْتِيكُمْ مِنّي شَيْءٌ، قَالَ فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ لأَبِي بَكر: قُلْ لَهُ وَمَا تَبْتَغِي مِنّا؟ قَالَ فَقَالَ: ذَلِكَ أَبُو بَكر، قَالَ قُلْت: تَكْتُبُ لِي كِتَابًا، يَكُونُ آية بَيْنِي وَبَيْنَكَ، قَالَ: اُكْتُبْ لَهُ يَا أَبَا بَكر، فَكَتَبَ لِي كِتَابًا فِي عَظْمٍ، أَوْ فِي رُقْعَةٍ، أَوْ فِي خَزَفَةٍ، ثُمّ أَلْقَاهُ إلَيّ، فَأَخَذْتُهُ فَجَعَلْته فِي كِنَانَتِي، ثُمّ رَجَعْت، فَسَكَتّ فَلَمْ أَذْكر شَيْئاً مِمّا كَانَ، حَتّى إذَا كَانَ فَتْحُ مَكة، عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ وَفَرَغَ مِنْ حُنَيْنٍ وَالطّائِفِ، خَرَجْت وَمَعِي الْكِتَابَ لأَلْقَاهُ فَلَقِيته بِالْجِعْرَانَةِ، قَالَ: فَدَخَلْت فِي كَتِيبَةٍ مِنْ خَيلِ الأَنْصَارِ، قَالَ: فَجَعَلُوا يَقْرَعُونَنِي بِالرّمَاحِ وَيَقُولُونَ إلَيْكَ، مَاذَا تُرِيدُ؟ قَالَ: فَدَنَوْت مِنْ رَسولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ، وَاللهِ لَكَأَنّي أَنْظُرُ إلَى سَاقِهِ فِي غَرْزِهِ كَأَنّها

جُمَّارَةٌ، قَالَ" فَرَفَعْتُ يَدِي بِالْكِتَابِ ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَذَا كِتَابُكَ (لِي). أَنَا سُرَاقَةُ بْنُ جُعْشُمٍ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَوْمُ وَفَاءٍ وَبِرٍّ أُدْنُهْ، قَالَ: فَدَنَوْتُ مِنْهُ، فَأَسْلَمْتُ، ثُمَّ تَذَكَّرتُ شَيْئاً أَسْأَلُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْهُ، فَمَا أَذْكُرُهُ إلاَّ أَنِّي قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ الضَّالَّةُ مِنْ الإِبِلِ تَغْشَى حِيَاضِي، وَقَدْ مَلأْتُهَا لإِبِلِي، هَلْ لِي مِنْ أَجْرٍ فِي أَنْ أَسْقِيَهَا؟ قَالَ: نَعَمْ فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ حَرَّى أَجْرٌ، قَالَ: ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى قَوْمِي، فَسُقْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ صَدَقَتِي﴾.

واتە: سوڕاقەی کوڕی جوعشوم دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە دەرچوو بەرەو مەدینە، قورەیشییەکان سەد حوشتریان دانا، وەك خەڵات، بۆ هەر کەسێك کە پێغەمبەریان بۆ لا بگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێك من لە دیوەخانی خزمەکانمدا دانیشتبووم، پیاوێك لە ئێمە هات، هەتا لەسەر سەرمان وەستا، وە گوتی: سێ نەفەرم بینین بە لامدا تێپەڕین، وایتێدەگەم موحەممەدو هاوەڵەکانی بوون، دەڵێ: منیش بە چاو ئاماژەیەکم بۆ کرد، گوتم: بێدەنگ بە، دوایی گوتم: ئەوە بەنو فلانن، لە حوشترێکیان دەگەڕێن، کە لێیان ون بووە، ئەویش گوتی: ڕەنگە وابێ. دوایی بێدەنگ بوو.

ئنجا دوای ئەوەی ماوەیەك مامەوە، هەڵسام، {هەڵبەتە ڕێستوویەتی خەڵکەکە شوێنە ون بکاو، سەریان لێ بشێوێنێ} چوومەوە ماڵێ، فەرمانم کرد ئەسپەکەیان بۆ ئامادە کردم، وە ئەسپەکەیان بۆ بردم تا شیوەکە، وە فەرمانم کرد چەکەکەشیان بۆ ئامادە کردم، ئەویشیان لە پشتی ژوورەکەمەوە بۆ بردمە دەرێ، بۆ ئەوەی کە نەبینرێم، ئنجا قیدحەکانم هەڵگرت بۆئەوەی شانسی خۆمیان پێ تاقی بکەمەوە. ئایا ئەم سەفەرە بکەم، یان نا؟ دوایی ڕۆیشتم زرێیەکەشم پۆشی، ئنجا کە قیدحەکانی خۆم هێنانە دەر، ئەوەیان دەرچوو کە پێم ناخۆش بوو، ئەوەیان کە دەڵێ: بەدوایاندا مەچوو، زیانیان پێناگەیەنیو، هیچت دەست ناکەوێ، دەڵێ: منیش بڕیارمدا بوو، کە هەر بیانگێڕمەوە بۆ قورەیش، وە سەد حوشترەکەش وەربگرم. بۆیە ڕۆیشتم، {دیارە بەقسەی یانسیبو قیدحەکەی[1] خۆیشی نەکردوە}.

---

١) (قداحْ) کۆی (قِدْح)ە کە چەند داروو چکەیەك بوون، بۆ شانسو بەخت، تاقیکردنەوەو فاڵگرتنەوە، بەکاریان هێناون .

ئنجا کە ڕۆیشتم بە دوایاندا، لە کاتێکدا کە ئەسپەکەم زۆر بە غار دەڕۆیی، زۆر بە پەلە بەدوایان دەکەوت، ئەسپەکەم هەڵەنگوتو، منیش لەسەر پشتی کەوتمە خوارێ، دوایی گوتم: ئەوە چی بووا! دووبارە فیدحەکانم دەرهێنانو، قورعەم کێشایەوە، دیسان ئەوەیان دەرچوو کە پێم ناخۆش بوو، ئەوەی کە دەیگوت: زیانیان پێناگەیەنیو، هیچیشت دەست ناکەوێ، بەڵام دیسان ملم نەدا، هەر بە دوایان کەوتم، بە سواری ئەسپەکەم، ئنجا لە کاتێکدا کە ئەسپەکەم بە غار دەڕۆیی، جارێکی دیکە ئەسپەکەم هەڵەنگوتو، دووبارە لەسەر پشتی ئەسپەکەم کەوتمە خوارێ، پێم سەیر بوو، گوتم: ئەوە چییە؟!! سێ بارە فیدحەکانم دەرهێنایەوەو دیسان قورعەم پێ کێشان، سێبارە هەر ئەوەم بۆ دەرچوو، کە هیچم دەستگیر نابێ، بەڵام دیسان لاملییم کردو ملم نەدا، سواری ئەسپەکەم بوومەوەو بە دوایان کەوتم، تاکو لێم وەدەرکەوتن، کە لێم وەدەرکەوتن ئەسپەکەم ساتمەی کرد، وە هەردوو پێی پێشەوەی بە زەویدا ڕۆیشتن، منیش کەوتمە خوارێ، دوایی ئەسپەکەم دوو دەستی پێشەوەی دەرهێنان، بەڵام بە دوایاندا {کە لە زەوی پێیەکانی دەرهێنانەوە} دووکەڵێك دەرچوو وەك گەردەلوول، دەڵێ: کاتێك ئەوەم بینی، زانیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە من ڕێگیریی لێ دەکرێ، (واتە: ناهێڵرێ زەفەری پێ بەرم) بانگم کرد، گوتم: من سوراقەی کوڕی جوعشومم، چاوەڕێم بکەن، قسەتان لەگەڵدا دەکەم، بە خوا درۆتان لەگەڵدا ناکەم، وە لە منەوە هیچ شتێکتان پێناگات کە پێتان ناخۆش بێ.

دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو بەکری فەرموو: پێی بڵێ: چیت لە ئێمە دەوێ؟ ئەبو بەکریش وای گوت: گوتی: چیت لە ئێمە دەوێ؟

منیش گوتم: شتێکم بۆ بنووسن، کە نیشانە بێ لە نێوان منو تۆدا.

دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر! بۆی بنووسە، ئەویش شتێکی دەرهێنا، یان ئێسقان بوو، یان پارچە پێستێك بوو، یان سواڵەت (خەزەف)ێك بوو، (ئەو کاتە دیارە لەسەر ئەو شتانە نووسیویانە) شتێکی لەسەر نووسی، وە دوایی بۆی هەڵدام، وە منیش هەڵمگرتو لە تیردان (کنان)ەکەی خۆمم هاویشت، دوایی گەڕامەوەو بێدەنگ بووم، هیچم باس نەکرد، هەتا کاتی ئازاد کرانی مەککە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک کە لە جەنگی حونەین و طائیفیش بۆوە. منیش بەرەو ڕووی چووم، وە ئەو نووسراوەی کە هەبوو لە نێوانمان دا، پێم بوو. ویستم دیداری بکەم و نامەکەی پێشان بدەم، ڕۆیشتم چوومە نێو کەتیبەیەک لە نێو سوار چاکەکانی پشتیوانان، ئەوانیش بە ڕمەکانیان ئاماژەیان بۆ دەکردم. دەیانگوت: خۆت دوور بخەوە، خۆت دوور بخەوە، دەچیە کوێ؟

منیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە نیزیک کەوتم، کە سواری حوشترەکەی بوو، تەماشای لاقی پێغەمبەری خوام کرد، وەک (جُمّارة)[1] وابوو لە ئاوزینگەکەیدا، منیش دەستم بەرز کردەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە نووسراوەکەی تۆیە، منیش سوڕاقەی کوڕی جوعشومم.

دەڵێ: پێغەمبەری خواش فەرمووی: ﴿يَومُ وَفَاءٍ وَبِرٍّ أُدْنُهْ﴾.

واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی وەفایەو ڕۆژی چاکەکارییە، وەنیزیک بکەوە!

دەڵێ: منیش لێی وەنیزیک کەوتم، وە مسوڵمان بووم (کەواتە: ئەگەر لە دڵی خۆشیدا زانیبێتی کە پێغەمبەر، هەقە، بەڵام تاکو ئەوڕۆژە، بەئاشکرا مسوڵمان نەبووە).

دوایی شتێکم بۆ پێغەمبەری خوا باسکرد، کە ئێستا لە یادم نیە، بەڵام ئەوەندەم لەبیرە کە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ جاری وا هەیە، حوشتری ون بوو دێنە سەر ئەو حەوزەم، کە من بۆ حوشترەکانی خۆمم پڕ کردوە، ئایا من پاداشتە هەیە کە لەو حەوزەی خۆم ئاویان پێ بدەم؟

فەرمووی: ﴿نَعَمْ، فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ حَرَّى أَجْرٌ﴾.

واتە: بەڵێ هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕ، ئەگەر خزمەتی بکەی پاداشتت هەیە، دەڵێ: دوایی گەڕامەوە بۆ لای قەومەکەم، وە ئەو زەکاتەی کە لێیە کەوتبوو، ئەویشم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ برد.

---

١) (جُمّارة) شتێکی زۆر سپی وەک کەلەم وایە، لە دارخورما دایە.

١١ / ﴿خَرَجَ بِهِمَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَرْقَطَ، دَلِيلُهُمَا حَتَّى قَدِمَ بِهِمَا قُبَاءً، عَلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، لاثْنَتَيْ عَشْرَةَ لَيْلَةً خَلَتْ مِنْ شَهْرِ رَبِيعٍ الأَوَّلِ يَومَ الإِثْنَيْنِ، حَيْنَ اشْتَدَّ الضَّحَاءُ، وَكَادَتْ الشَّمْسُ تَعْتَدِلُ﴾.

واتە: (عَبْدُ اللهِ بْنُ أَرْقَطْ) بردنی، کە ڕێ پێشاندەریان بوو، تاکو گەیشتنە (قُبَاء)، کە بەنی عەمری بەنی عەوفی لێ بوو، دوازدە ڕۆژ تێپەڕی بوون، لە مانگی ڕەبیعی یەکەم، وە لە ڕۆژی دوو شەممەدا، لە کاتێکدا کە چێشتەنگاو قایم بووبوو، خەریك بوو ڕۆژ بکەوێتە نێوەڕاستی ئاسمان.

ئنجا ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُوَيْمِرِ بْنِ سَاعِدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي رِجَالٌ مِنْ قَوْمِي مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالُوا: لَمَا سَمِعْنَا بِمَخْرَجِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ مَكَة، وَتَوَكَّفْنَا قُدُومَهُ، كُنَّا نَخْرُجُ إِذَا صَلَّيْنَا الصَّبْحَ إِلَى ظَاهِرِ حرَّتِنَا، نَنْتَظِرُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَوَاللهِ مَا نَبْرَحُ حَتَّى تَغْلِبَنَا الشَّمْسُ عَلَى الظِّلالِ، فَإِذَا لَمْ نَجِدْ ظِلاً دَخَلْنَا، وَذَلِكَ فِي أَيامِ حَارَّةٍ، حَتَّى إِذَا كَانَ الْيَومُ الَّذِي قَدِمَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ جَلَسْنَا كَمَا كُنَّا نَجْلِسُ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ ظِلٌ، دَخَلْنَا بُيُوتَنَا، وَقَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَيْنَ دَخَلْنَا الْبُيُوتَ، فَكَانَ أَوَّلُ مَنْ رَآهُ، رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، وَقَدْ رَأَى مَا كُنَّا نَصْنَعُ، وَأَنَا نَنْتَظِرُ قُدُومَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَلَيْنَا، فَصَرَخَ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا بَنِي قَيْلَة! هَذَا جَدُّكُمْ قَدْ جَاءَ، قَالَ: فَخَرَجْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ فِي ظِلِ نَخْلَة ، وَمَعَهُ أَبُو بَكر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي مِثْلِ سِنِّهِ، وَأَكْثَرُنَا لَمْ يَكُنْ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ قَبْلَ ذَلِكَ، وَرَكِبَهُ النَاسُ وَمَا يَعْرِفُونَهُ مِنْ أَبِي بَكر، حَتَّى زَالَ الظِّلُّ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَامَ أَبُو بَكر فَأَظَلَّهُ بِرِدَائِهِ، فَعَرَفْنَاهُ عِنْدَ ذَلِكَ﴾.

واتە: ئنجا ئیبنو ئیسحاق لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عومەیری کوڕی ساعیدە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: کۆمەڵێك لە پیاوانی قەومەکەم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان باس کردووم: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە دەرچوو، وە مەزندەی ئەوەمان دەکرد بێ بۆ لامان، ئێمە هەموو ڕۆژێ کە نوێژی بەیانیمان دەکرد، دەچووین بۆ پشتی حەڕڕە (کە شوێنێکە هەمووی بەردی ڕەشی لێیە)، چاوەڕێمان دەکرد، وە ئێمە لانەدەچووین لەوێ، تاکو سێبەر

نەدەمان، (واتە: تاكو خۆر دەگەیشتە نێوەڕاستی ئاسمانێ). ئنجا دەگەڕاینەوە بۆ ماڵێ، هەتا ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە، ئێمە وەك ڕۆژان دانیشتبووین، تاكو كاتێك كە سێبەر نەما، خۆمانی تێبگرین، چووینەوە ماڵەكانی خۆمان، وە پێغەمبەریش ﷺ لە كاتێكدا هات، كە ئێمە چووبووینەوە ماڵێ. یەكەمین كەسێك كە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی، پیاوێك بوو لە جوولەكەكان، كە ئەویش لەبەرئەوەی بینیبووی، ئێمە هەموو ڕۆژێ چاوەڕێی پێغەمبەر دەكەین، كاتێك كە پێغەمبەری خوای بینی، یەكسەر بە دەنگێكی بەرز هاواری كرد: (يا بَنِي قَيْلَة، هَذَا جَدّكُمْ قَدْ جَاءَ).

ئەی بەنی قەیلە! (كە دیارە مەبەستی پێی پشتیوانەكان بووە) ئەوە باپیرەكەتان، یان گەورەكەتان هات.

ئێمەش دەرچووین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ كە لەو كاتەدا لەبەر سێبەری دار خورمایەك دانیشتبوو، ئەبو بەكریشی لەگەڵدا بوو، وە ئەبو بەكریش خوا لێی ڕازی بێ هاوتەمەنی پێغەمبەری خوا بوو، وە زۆربەمان پێغەمبەری خوامان ﷺ نەبینیبوو، وە خەڵك زۆر هاتن و، كەڵەكەیان كرد، نەیاندەزانی كامیان پێغەمبەری خوایە، وە كامیان ئەبو بەكرە؟ ئنجا كە سێبەر لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لاچوو، ئەبو بەكر هەڵسا بە پۆشاكەكەی خۆی سێبەری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئەوكاتە زانیمان: ئەوەی كە سێبەری لێكراوە، پێغەمبەری خوایە ﷺ.

﴿قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (فِيمَا يَذْكُرُونَ) عَلَى كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ، أَخِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، ثُمّ أَحَدِ بَنِي عُبَيْدٍ: وَيُقَالُ بَلْ نَزَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ خَيْثَمَةَ، وَيَقُولُ مَنْ يَذْكر أَنّهُ نَزَلَ عَلَى كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ: إنّمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إذَا خَرَجَ مِنْ مَنْزِلِ كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ، جَلَسَ لِلنّاسِ فِي بَيْتِ سَعْدِ بْنِ خَيْثَمَةَ، وَذَلِكَ أَنّهُ كَانَ أَعْزَبًا لاَ أَهْلَ لَهُ، وَكَانَ مَنْزِلُ الأَعْزَابِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ، فَمِنْ هُنَالِكَ يُقَالُ نَزَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ خَيْثَمَةَ، وَكَانَ يُقَالُ لِبَيْتِ سَعْدِ بْنِ خَيْثَمَةَ: بَيْتُ الأَعْزَابِ، فَاللهُ أَعْلَمُ أَيّ ذَلِكَ كَانَ، كُلاً قَدْ سَمِعْنَا﴾.

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: وەك بۆمان باسكراوە: پێغەمبەری خوا ﷺ یەكەمین مەنزڵگای لەلای (كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ) بوو، كە لە عەشیرەتی بەنی عەمری بەنی عەوف بووە، ئەویش یەكێك بووە لە بەنی عوبەید، وە هەندێكیش گوتوویانە: لە لای (سَعْدِ بْنِ خَيْثَمةَ) مەنزڵگای گرتوە، وە ئەوانەی دەڵێن: لە ماڵی (كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ) بووە، گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ كە لە ماڵی (كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ) دەرچووە، لە ماڵی (سَعْدِ بْنِ خَيْثَمةَ) دانیشتوە، ئەویش لەبەرئەوەی كە (سَعْدِ بْنِ خَيْثَمةَ) بێ ژنو ماڵ بوو، وە ماڵی ئەو ماڵی زگورتییەكان بوو، لە هاوەڵانی كۆچكەر، بۆیە گوتراوە: لە ماڵی (سَعْدِ بْنِ خَيْثَمةَ) بووە، وە بە ماڵی (سَعْدِ بْنِ خَيْثَمةَ) گوتراوە: (بَيْتُ الأَعْزَابِ) ماڵی گەنجە بێ هاوسەرەكان (زگورتییەكان).

ئنجا خوا زاناترە بە هەر كامێك لەوانەی كە بیستوومانە، {ئایا پێشێ لەوێ بووە، یان لەولا بووە؟} ئێمە هەردووك قسەكانمان بیستوون.

ئنجا (ابْنُ إِسْحاقَ) دەڵێ: (وَنَـزَلَ أَبُو بَكر الصِّدّيقُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَلَى خُبَيْبِ بْنِ إِساف، أَحَدِ بَنِي الْحارِثِ الْخَزْرَجَ بِالسّنْحِ، وَيَقُولُ: قَائِلٌ: كانَ مَنْزِلُهُ عَلَى خارِجة بْنِ زَيْدِ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ أَخِي بَنِي الْحارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ).

واتە: وە ئەبو بەكریش خوا لێی ڕازی بێ، لە ناوچەی سەنح لە ماڵی (خُبَيْبِ بْنِ إِسافٍ) كە ئەویش یەكێك بووە، لە (بَنِي الحارث الخزرج) نیشتەجێ بووە، وە یەكێكیش گوتوویەتی: لە لای (خَارِجة بْنِ زَيْدِ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ) بووە، كە ئەویش هەر یەكێك بووە لە (بَنِي الحارث الخزرج).

١٢ / ﴿أَقَامَ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِمَكة ثَلاثَ لَيالٍ وَأَيامِها، حَتّى أَدّى عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْوَدَائِعَ الّتِي كانَتْ عِنْدَهُ لِلنّاسِ، حَتّى إِذَا فَرَغَ مِنْها، لَحِقَ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَنَزَلَ مَعَهُ عَلَى كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ﴾.

واتە: وە عەلی كوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ سێ شەوو سێ ڕۆژان لە مەككە مایەوە، بۆ ئەوەی ئەو سپاردانەی كە لە لای پێغەمبەری بوون، تەسلیمی خاوەنەكانیان بكاتەوە، كاتێك كە لێیان بۆوەو، تەواوی كردنو هەر هەمووی تەسلیم كردنەوە، ئەویش بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، كە لەو كاتەدا لە ماڵی (كُلْثُومِ بْنِ هِدْمٍ) بووە.

١٣ / ﴿فَكَانَ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَإِنَّمَا كَانَتْ إِقَامَتُهُ بِقُبَاءٍ لَيْلَةً أَوْ لَيْلَتَيْنِ يَقُولُ: كَانَتْ بِقُبَاءٍ امْرَأَةٌ لا زَوْجَ لَهَا، مُسْلِمَةٌ، قَالَ: فَرَأَيْت إِنْسَاناً يَأْتِيهَا مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَيَضْرِبُ عَلَيْهَا بَابَهَا، فَتَخْرُجُ إِلَيْهِ، فَيُعْطِيهَا شَيْئاً مَعَهُ، فَتَأْخُذُهُ. قَالَ: فَاسْتَرَبْتُ بِشَأْنِهِ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا أَمَةَ اللَّهِ، مَنْ هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي يَضْرِبُ عَلَيْكِ بَابَكِ كُلَّ لَيْلَةٍ، فَتَخْرُجِينَ إِلَيْهِ، فَيُعْطِيكِ شَيْئًا لا أَدْرِي مَا هُوَ، وَأَنْتِ امْرَأَةٌ مُسْلِمَةٌ لا زَوْجَ لَكِ؟ قَالَتْ هَذَا سَهْلُ بْنُ حُنَيْفِ بْنِ وَاهِبٍ قَدْ عَرَفَ أَنِّي امْرَأَةٌ لا أَحَدَ لِي، فَإِذَا أَمْسَى، عَدَا عَلَى أَوْثَانِ قَوْمِهِ فَكَسَرَهَا، ثُمَّ جَاءَنِي بِهَا. فَقَالَ احْتَطِبِي بِهَذَا، فَكَانَ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَأْثُرُ ذَلِكَ مِنْ أَمْرِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، حَتَّى هَلَكَ عِنْدَهُ بِالْعِرَاقِ﴾.

واتە: عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك کە لە قوبا بووە، شەوێك، یان دوو شەو، ئافرەتێك هەبوو لە قوبا، کە هاوسەری نەبووو مسوڵمان بوو، دەڵێ: هەموو شەوێك لە نیوەشەودا کەسێکم دەبینی لە دەرگای دەدا، ئەویش (ئافرەتەکە) دەهاتە دەرێ، پیاوەکە شتێکی وێدەداو، پیاوەکە دەڕۆی، دەڵێ: منیش کەوتمە گومانەوە، گوتم: ئەی بەندەی مێینەی خوا! ئەو پیاوە کێیە هەموو شەوێ لە دەرگا دەدات‌و، شتێکت دەداتێ‌و تۆش لێی وەردەگری، لە حاڵێك تۆش ژنێکی مسوڵمانی‌و بێ مێردی؟!

گوتی: ئەوە (سَهْلُ بْنُ حُنَيْفِ بْنِ وَاهِبٍ)ە، دەزانێ کە من ئافرەتێکم کەسم نیە هەر کاتێك کە ئێوارەی کردەوە، دەچێ بتەکانی قەومەکەی دەشکێنێ (دیارە لە تەختە بوون) دوایی پارچەکانیان بۆ من دێنێ، دەڵێ: (نان‌و چێشتی پێ سار بکەو) خۆتی پێ گەرم بکەوە!

ئنجا عەلی خوا لێی ڕازی بێ، دوای ئەوەی ئەو هەڵوێستەی لە سەهل بینی هەتاکو لە عیراق لە لای وی وەفاتی کرد، زۆر لەلای بەڕێز بوو، وە ئەو هەڵوێستە زۆر کاری تێکرد.

١٤ / ﴿قَالَ ابْنُ إسْحاقَ: فَأَقَامَ رَسولُ اللهِ ﷺ بقُباءٍ، فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، يَومَ الإِثْنَيْنِ وَيَومَ الثّلاثَاءِ وَيَومَ الأَرْبِعَاءِ وَيَومَ الْخَمِيسِ، وَأَسّسَ مَسْجِدَهُ، ثُمّ أَخْرَجَهُ اللّهُ مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِهِمْ، يَومَ الْجُمُعَةِ، وَبَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ يَزْعُمُونَ أَنّهُ مَكَثَ فِيهِمْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَاللّهُ أَعْلَمُ أَيّ ذَلِكَ كَانَ، فَأَدْرَكَتْ رَسولَ اللهِ ﷺ الْجُمُعَةُ، فِي بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ، فَصَلّاهَا فِي الْمَسْجِدِ الّذِي فِي بَطْنِ الْوَادِي، وَادِي رَانُونَاءَ، فَكَانَتْ أَوّلَ جُمُعَةٍ صَلّاهَا بِالْمَدِينَةِ﴾.

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە قوباء مایەوە، لە نێو (هۆزی) بەنی عەمری بەنی عەوف دا، ڕۆژانی دووشەمەو سێ شەمەو چوارشەمەو پێنج شەمە، {واتە: چوار ڕۆژ مایەوە} وە مزگەوتەکەشی لەوێ دروست کرد، {کە ئێستا مزگەوتی (قوباء)ی پێ دەڵێن}، بەڵام هۆزی بەنی عەمری بەنی عەوف، پێیان وا بووە کە زیاتر لە چوار ڕۆژان لەوێ ماوەتەوە، بەڵام خوا زاناترە، ئایا هەر ئەو چوار ڕۆژە بووە، یان زیاتر؟

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو بەنی سالمی بەنی عەوفدا جومعەی بەسەرداهات، وە نوێژی جومعەی لە مزگەوتێك دا کرد کە لەوێ دروست کرابوو، لە نێو شیوەکەدا، کە پێی دەگوترا (وَادِي رَانُونَاءَ)، وە ئەوە یەکەمین نوێژی جومعە بوو، کە لە مەدینە کرا.

ئەمە کورتەی چۆنیەتی کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لە مەککەوە بۆ مەدینە.

<u>مەسەلەی چوارەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾﴾

خوا فەرمان دەکات بە بڕواداران، دەفەرموێ: بە سووکییو بە قورسیی بڕۆن، وە بەماڵو سامانو گیانتان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، ئائەوە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن.

(محمد الطاهر بن عاشور) گوتوویەتی: (النَّفْرُ: الخُرُوجُ السَّرِيعُ مِنْ مَوْضِعٍ إِلى غَيْرِهِ لأَمْرٍ يَحْدُثُ، وَأَكْثَرُ مَا يُطْلَقُ عَلَى الخُرُوجِ إِلى الحَرْبِ، وَمَصْدَرُهُ حِينَئِذٍ: النَّفِير)[1].

واتە: وشەی (نَفْر) بریتیە لە دەرچوونێکی خێرا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، بەهۆی شتێکەوە کە ڕوودەدات، بەڵام بە زۆریی وشەی (نَفْر) بەکاردەهێنرێ بۆ دەرچوون بۆ جەنگ، کە ئەو کاتە چاوگی (نَفَرَ يَنفِرُ)، (نَفِيراً)ە، (نَفِير) واتە: دەرچوون بۆ جەنگ.

کە دەفەرموێ: ﴿خِفَافًا وَثِقَالًا﴾، دیارە (خِفَاف) کۆی (خَفِيف)ە، وە (ثِقَال)یش کۆی (ثَقِيل)ە، هەڵبەتە (خَفِيف) واتە: سووك، وە (ثَقِيل) واتە: قورس. بەڵام ئایا مەبەست لەو سووکیی‌و قورسییە چییە؟

تەماشای زۆر تەفسیرانم کردوە بۆ تەفسیرکردنی ئەم ئایەتە، نیزیکەی دە (١٠) مانایان لێگرتوون، کە دەڵێن: هەر کام لە وشەی (خِفَة) و (ثِقَل) واتە: سووکیی‌و قورسیی، خوازراونەوە بۆ ئەو مانایانە:

١) سووکیی بۆ ژمارەی کەم (قلة العدد)، وە قورسیی بۆ زۆری ژمارە (كثرة العدد) کەواتە: کەم بن، یان زۆربن، بڕۆن، بە کەمیی‌و بە زۆریی بڕۆن بۆ جەنگ‌و جیهاد.

٢) سووکیی بۆ زادو زەخیرەی کەم (قلة الأزواد)، وە قورسیی بۆ زادو زەخیرەی زۆر (كثرة الأزواد)، واتە: بە زادو زەخیرەی زۆر، یان هی کەم، هەر بچن.

٣) سووکیی بۆ ماڵ‌و منداڵی کەم (قلة العيال)، وە قورسیی بۆ ماڵ‌و منداڵی زۆر (كثرة العيال)، واتە: ماڵ‌و منداڵتان زۆربن، یان کەم، هەر بچن بۆ جەنگ.

٤) سووکیی بۆ سواریی (الركوب)، وە قورسیی بۆ پێڕۆ (المشي)، واتە: بە سواریی بن، یان بە پێڕۆ، بچن بۆ جەنگ.

---

١) التحرير والتنوير، ج ١٠، ص ١٩٨.

٥) سووکیی بۆ گەنجێتیی (شباب)، وە قورسیی بۆ پیریی (الشیخوخة) واتە: گەنج بن، یان پیر، بۆ جەنگ هەر بڕۆن.

٦) سووکیی بۆ لەش ساغیی (الصحّة)، وە قورسیی بۆ (المرض)، واتە: نەخۆش بن، یان لەش ساغ بن، هەر بچن بۆ جەنگ.

هەڵبەتە نەخۆشییەکی وا نا کە لە پەلوپۆی خستبن.

٧) سووکیی بۆ دەوڵەمەندیی (الغنى)، وە قورسیی بۆ هەژاریی (الفقر)، واتە: دەوڵەمەندبن، یان هەژاربن، بڕۆن بۆ جەنگ.

٨) سووکیی بۆ سەرقاڵ نەبوون (غیر مشاغیل)، وە قورسیی بۆ سەرقاڵ بوون (مشاغیل)، واتە: کاتێك دەستتان گیراوەو، کاتێك کە دەستتان نەگیراوە، بچن بۆ جەنگ.

٩) سووکیی بۆ قالب خۆشیی، (نشاط)، وە قورسیی بۆ قالب ناخۆشیی (غیر نشاط) بەکاردێ.

١٠) کاتێك کە باغو بێستانێکتان هەیە کە پێویستیی بە خزمەت کردن هەیە، یاخود کە نەتانبێ.

ئنجا (طبري) دەڵێ: {وَيَدْخُلُ فِي (الخِفَافِ) كُلُّ مَنْ كَانَ سَهْلاً عَلَيْهِ النَّفْرُ، وَيَدْخُلُ فِي (الثِّقَالِ)، كُلُّ مَنْ كَانَ بِخِلَافِ ذَلِكَ}[1].

واتە: وشەی (خِفَاف) هەر کەسێك دەگرێتەوە، کە ئاسان بێ لەسەری، دەربچێ بۆ جەنگو جیهاد، وشەی (ثِقَال)یش هەر کەسێك دەگرێتەوە کە لەسەری قورس بێ، دەربچێ بۆ جەنگو جیهاد.

کەواتە: لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا خوای کاربەجێ فەرمان دەکات کە مسوڵمانان دەربچن بۆ جەنگو جیهادێك کە پێویستە ئەنجامی بدەن.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾.

واتە: وە بە سامانتانو بە گیانتان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، جەنگ بکەن.

---

١) جامع البيان للطبري ج٦، ص١٤٦ و ١٤٧.

هەمیشە ماڵ پێش نەفس دەخرێ، کە مەبەست پێی بەخشینی بێ، چونکە ئەگەر کەسێك دەستی لە ماڵو سامانەکەی نەبێتەوە، دەستی لەبەر ڕووحو گیانەکەی هەر نابێتەوە.

وە لێرەدا هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەست لە دەرچوون، دەرچوونی گشتییە (النفیر العام)، کە خوای زاڵی زانا دەفەرموێ: بە سووکیی‌و قورسیی هەمووتان دەربچن، ئەوە لە کاتێکدایە کە پێویست بکات مسوڵمانان هەموو دەوبچن بۆ جەنگو جیهاد، بەڵام ئەویش دیسان هەر کاتو هەلومەرجە، تایبەتمەندیی خۆی هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٨٩٨)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (١٧٣٧)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٣٥٣)، وَأَبُو دَاود، برقم: (٢٤٨٠)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٤١٧٠)}.

واتە: وە ئەگەر فەرمانتان پێکرا بە دەرچوون بۆ جەنگو جیهاد، بە تێکڕ دەربچن.

لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾.

ئا ئەوە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن.

واتە: دەرچوون بۆ جەنگو جیهاد، بە سووکیی‌و بە قورسیی‌و، بە سامان‌و بە گیان فیداکاریی کردن، بۆ ئێوە چاکترە، لە کوێ چاکترە؟

خوا بە گشتی فەرموویەتی، یانی: هەم بۆ دنیاتان باشترە هەم بۆ قیامەتتان باشترە بە تایبەت لەو ڕووەوە کە ئەگەر ئێوە فیداکاریی بکەن لە پێناوی خوادا ئەوکاتە ئارام دەبن، وە بێ ترس دەبن لەوەی دوژمن زەفەرتان پێ بەرێ، بەڵام هەر کەسێك نێچیرێکی تووك نەرم بێ، بە تەئکید درندەیەکی هەر لێ هەڵدەکەوێ کە ڕاوی بکاو بیخوات! بۆیەش دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾، یانی ئەگەر بزانن دنیا چ باسە، دەزانن هەبوونی ڕووحی فیداکاریی‌و بەرخۆدان لە پێناوی خواداو، تێکۆشان لە پێناوی خوادا، لە دنیاو لە دواڕۆژ بۆ ئێوە باشترە.

ئنجا ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ، کە ئەوە پێویستی بە زانیاریی هەیە، دەبێ هەولّبدەی زانا بی، شارەزا بی، بەرچاو ڕوونبی، ئەوجار قەدری جەنگو جیهادو فیداکاریی دەزانی، وە پەی بە گرنگیی و بایەخەکەی دەبەی.

مەسەلەی پێنجەم : کە دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٤٢﴾﴾.

ئەگەر ئەو دەرچوونەتان دەستکەوتێکی نیزیك بووایە، وە سەفەرێکی کورت بووایە، بەدوات دەکەوتن، بەلاّم سەفەرەکە دوور بوو، زەحمەت بوو لەسەریان، وە لەمەودواش سوێند بە خوا دەخۆن، بۆ ئێوە، کە: ئەگەر توانیبامان لەگەلّتان دەردەچووین، خۆیان دەفەوتێنن، {واتە: بە سوێندی درۆ} وە خواش دەزانێ کە ئەوانە درۆزنن.

کە دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا﴾، دەلّێ: (اسم كان محذوفٌ)، یانی: (لَوْ كانَ العَرَضُ، عَرَضا قَرِيباً، وَالسَّفَرُ سَفَراً قاصِداً) لێرەدا وشەی (عَرَضْ) دەستکەوت دەگەیەنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿لَّاتَّبَعُوكَ﴾، شوێنت دەکەوتن، واتە: ئەو کاتەش لەبەر دلّڕاگرتنی تۆ دەهاتن، نەك لەبەر خواو، لەبەر ئیسلام.

﴿وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ﴾، دەلّێ: (الشُّقَّةُ: المَسافةُ الطويْلة) بریتیە لە ماوەیەکی دوورو درێژ، مەبەست پێی ئاوایە: (وَلَكِن بَعُدَ مِنْهُمُ المَكانُ، لأَنَّهُ شُقَّةٌ، فَثَقُلَ عَلَيْهِمُ السَّفَرُ)، بەلاّم شوێنەکە دوورە، بۆیە ئەو سەفەرە لەسەریان قورس بوو، لە زمانی عەرەبیی دا بنچینەیەك هەیە، پێشتریش باسمان کردوە، پێی دەگوترێ: لەنێو وەرگرتن، تێخستن (تضمين)، ئەویش ئەوەیە کە (فعل)ێك بە پیتێك تەعەددا[1] بکات، کە عادەت وانەبێ بەو پیتە تەعەددا بکات، بۆئەوەی وێڕای مانا ئەسلّییەکەی خۆی، مانایەکی دیکەش بگەیەنێ، ئێستا لێرەدا لە جیاتی

١) یانی: بەرکار (مفعول) بخوازێ.

بفەرموێ: (بَعُدَتْ مِنهُمُ الشُّقَّةُ)، فەرموویەتی: ﴿بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ﴾، خۆی لە ئەسڵدا وشەی: (بَعُدَ) بە (عَلَى) تەعەددا ناكات، بەڵام لێرە (بَعُدَ) بە (عَلَى) تەعەددای کردوە، بۆ ئەوەی مانای (ثَقُلَ) بگەیەنێ، یانی: (بَعُدَ مِنْهُمُ المَكَانُ فَثَقُلَ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ)، ئەوە خاوەنی (التحرير والتنوير)[1] هێناویەتی.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ﴾.

وە سوێندیش بە خوا دەخۆن، (دەڵێن): ئەگەر توانیبامان لەگەڵتان دەردەچووین.

دیارە وشەی (الخروج) واتە: دەرچوون، بەڵام زیاتر بۆ دەرچوون بەرەو جەنگ و جیهاد بەكاردەهێنرێ، لێرەشدا دیسان دەفەرموێ: ﴿وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ﴾، وە سوێندیش بە خوا دەخۆن: ئەگەر توانیبامان لەگەڵتان دەردەچووین، واتە: هەر لەگەڵ ئێوە دەهاتین، نەك بۆ خوا، سەرنج بدەن! تەعبیرەكانی (كلام الله) چەند وردن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾.

خۆیان دەفەوتێنن، وە خوا دەزانێ كە ئەوانە درۆزنن، یانی: ئەگەر بشتوانن هەر لەگەڵتان دەرناچن، بەچی خۆیان دەفەوتێنن؟

لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە، لەسەر ئەوە كە بە سوێندی بە درۆ خواردن، ئینسان سەری خۆی بە فەتارەت دەدات.

وە لەوبارەوە بوخاریی لە (صحيح الجامع)ەكەی خۆیدا[2]، هەواڵی (الهذليين)ی هێناوە كە سوێندی قەسامەیان خواردوە بەدرۆ لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا، دیارە نەفەرێكیان كوشتوە، دوایی سوێندیان خواردوە، كە نەیانكوشتوە، دوایی بارانیان لێ باریوەو ئەوانیش چوونە ئەشكەوتێك لە چیایەكداو، ئەشكەوتەكەیان بەسەردا رووخاوەو هەموویان مردوون.

١) ج ٥، ص ٢٠٩.

٢) التحرير و التنوير، ج ٥، ص ٢٠٩.

مەسەلەی شەشەم: کە دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾.

خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا بتبەخشێ، بۆچی مۆڵەتت دان، تاکو ئەوانەی کە ڕاست دەکەن بۆت دەربکەون، وە درۆزنەکانیش بزانی!

دیارە کە دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾، بە ئاشکرا لە سیاقەکە دیارە، مەبەست ئەوەیە کە: بۆچی مۆڵەتت دان کە دابنیشن‌و بەجێبمێنن؟ هەمیشە قورئان ئەوەی کە سیاقەکە، یاخود ڕواڵەتی ڕستەکە بیگەیەنێ، دەیقرتێنێ‌و خوا وشەیەکی زیادی نەخستۆتە نێو قورئان.

کەواتە: هەر وشەیەك، هەر پیتێك کە لە قورئان دا هەیەو کەسێك پێی وایە زیادە، ئەگەر لێی وردبیەوە، حەتمەن حیکمەتێك‌و مانایەکی خۆی هەیە.

لێرەدا خوا نەیفەرموە: (عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ فِي التَّخَلُّفِ عنِ الجهاد)، بۆچی؟

چونکە دیارە کە دەفەرموێ: بۆچی مۆڵەتت دان، واتە: بۆچی مۆڵەتت دان کە نەیەن بۆ جەنگ‌و جیهادو، ڕێگات دان کە دابنیشن‌و بەجێبمێنن؟

ئنجا لەبەر ئەوەی دەزانرێ کە مەبەست لەو مۆڵەت دانە چییە؟ خوای کاربەجێ بە پێویستیی نەزانیوە باسی بکات.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە ـ وەك زانایان دەڵێن ـ خوا ﷻ زۆر بە نەرمیی نەرمە گلەییەك لە پێغەمبەری خۆی دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا لێبوردنەکەی، پێش گلەیی لێکردنەکەی دەخات، دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾، خوا لێت ببوورێ، بۆچی مۆڵەتت دان، کە نەیەن؟

ئنجا ئایا بۆچی دەبوو مۆڵەتی نەدابان؟!

دەفـــەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾.

دیارە (حتى) بۆ گەیشتن بە مەبەستە، دەگوترێ: (ذَهَبْتُ حَتَّى وَصَلْتُ البَصْرَة) ڕۆیشتم، تاکو گەیشتمە بەسرە، لێرەش دەڵێ: (حَتَّى: غَايَة لِفِعْل أذنت. فالمَعْنَى: لا مُقْتَضي للإذْن إلى أن يَتَبَيَن الصَّادِق مِنَ الكاذِب).

واتە: هیچ هۆکارێك نەبووە بۆ مۆڵەت دان، تاکو ئەو کاتەی، ڕاستو درۆیانت بۆ لێك جیادەبۆوە، هەتا ڕاستەکەت دەناسیو، ئەوانەش کە درۆزنن، دەتزانین.

ئنجا ئەگەر سەرنج بدرێ: خوای بەرزو مەزن (صَدَقُوا)ی بە (فعل) هێناوە: بەڵام (الكاذِبِين) بە (إسم فاعل) هێناوە : ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾، یانی: تاکو ئەوانە، کە جار جار ڕاست دەکەن لەوان. بۆت دەربکەون، وە ئەوانەش کە بەردەوام درۆزنن بیانزانی، چونکە (کاذب) لەسەر کێشی (فاعل)ە، هەمیشە (اسم) دەلالەت لەسەر بەردەوامیی دەکات، وەك چۆن (فعل) دەلالەت لەسەر تازەبوونەوە دەکات، واتە: ئەوانە کە زۆر بە درۆکردن دا قووڵبوونەوەو ڕۆچوون، ئەوانەش بناسیو بزانی، تاکو ئەوکاتە دەبوو مۆڵەتت نەدابان.

<u>مەسەلەی حەوتەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە، مۆڵەتت لێومرناگرن، کە بە سامانو گیانیان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، وە خوا بە پارێزکاران زانایە، ئەمە دوو واتای هەن:

١ - واتە: مۆڵەتت لێومرناگرن، کە بێن بۆ جیهاد، بەڵکو بەبێ مۆڵەت وەرگرتن یەکسەر دێن بۆ جیهاد، چونکە ئەسڵ ئەوەیە کە بێن بۆ جەنگو جیهاد.

٢ - واتە: مۆڵەتت لێومرناگرن، کە نەیەن بۆ جیهاد، چونکە دڵی خۆیان لەسەر ئەوە چەسپاندوە، کە هەر بێن.

بەڵام مانای دووەمیان زیاتر بە دڵەوە دەچەسپێ.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، وە خوا زانایە بە پارێزکاران.

کەواتە: ئەوانەی پارێزکاربن لە پێناوی خوادا فیداکاریی دەکەن، خەبات دەکەن، سەروماڵی خۆیان دەبەخشن، ئەو جۆرە کەسە پارێزکارە، نەك ئیمان وابێ کە پارێزکار کەسێکە لە ماڵێ دانیشتوەو، پەیوەندیی بە کەسەوە نیەو، هەقی نیەکێ ستەم دەکاو، کێ ستەمی لێ دەکرێو، ئیسلام چی لێدێو، مسوڵمانان چییان لێ دێ؟

بەڵێ بێگومان ئەهلی تەقوا کەسانێکن کە فیداکارو خەباتگێڕن، سەرو ماڵی خۆیان لە پێناوی خوادا دەبەخشن .

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

بێگومان هەر ئەوانە داوای مۆڵەتت لێدەکەن ـ کە نەیەن بۆ جەنگو جیهاد ـ کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، وە دڵیشیان لە گومان دایەو، لەو دوو دڵیی و گومانەی خۆیاندا دێنو دەچن.

کە دەفەرموێ: ( إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ) واتە: تەنیا ئەوانە مۆڵەتت لێوەردەگرن، ئەوە بۆ ئەوەیە بزانرێ کە بڕوادارانی پارێزکار، تەنانەت لە هاتن بۆ جەنگو جیهادیشدا، مۆڵەت وەرناگرن، چ جای بۆ نەهاتن! بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان، ئا ئەوانەن کە داوای مۆڵەت دەکەن، کە نەیەن.

وشەی: (وَٱرۡتَابَتۡ ) دەڵێ: (الإرتياب: إفْتِعَالٌ مِنَ الرَّيْبِ، إذ كانوا فِي شَكٍ وَتَرَدّد في أمر النبيّ خُصُوصاً غزوه للروم).

(ارتياب) (إفتعال)ە لە (ريب) واتە: دوو دڵیی و گومانو ئەگەرو نەگەر، ئەوانیش لە گومانو ئەگەرو نەگەر دا بوون، دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەتایبەت بۆ ڕۆیشتنی بۆ جەنگ لە دژی ڕۆمەکان.

ئنجا کە دەفەرمویٚ: ﴿فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾، واتە: لە گومانو دوودڵییدا دێنو دەچن، بۆچی؟

چونکە لەلایەکەوە تەماعیان هەبوو لە دەستکەوتی جەنگیی دا، وە لە لایەکی دیکەوە دەترسان لەخۆیان، بۆیە وەك پێشینان گوتوویانە: (پێیەکی دەبردە پێش. پێیەکی دەهێنایە دواوە).

دەربارەی وشەی (تردُّد) دەڵێ: (التَّردُّد: حَقِيقَتُهُ: ذهابٌ وَرجُوع مُتَكرِّرٌ إِلى مَحَلّ وَاحِدٍ، وَهُوَ هُنا تَمْثِيل لِحال المُتَحَيِّر، بَيْنَ الفِعْل وَعَدَمِهِ، بحال الماشي وَالرَّاجع).

(تردُّد) ئەوەیە کە ئینسان بچێ بۆ شوێنێك و بێتەوە، بچێو بێتەوە، کە لێرەدا خوای پەنهانزان دەیەوێ کەسێك کە سەراسیمەیەو لە لەرەلەر دایە، بۆمان وێنا بکات، دەیچوێنێ بە حاڵی کەسێك کە هەر دەچێتە شوێنێك و دێتەوە، واتە: لەسەر بارێك ڕاناوەستێ، ئەوانە ترسی ئەوەیان هەبووە شتێکیان بەسەربێ، وە تەماعیشیان هەبووە، شتێکیان دەست بکەوێ، جاری وا هەبووە چوون، بەڵام نەك لەبەر خوا، بەڵکو لەبەر تەماعی دەستکەوت، وە جاری وابووە ترسەکەیان پێشخستوەو نەچوو ون، بۆ ئەوەی خۆیان سەلامەت بکەن.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ ﴿٤٦﴾﴾.

واتە: وە ئەگەر ویستبایان بێنەدەر بۆ جەنگ، پێداویستییەکانیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام خوا پێی ناخۆش بوو دەربچن، بۆیە عەزیمەتو ئیرادەی خاوکردنەوە وە پێیان گوترا: {وەك فەرمانیان پێکرابێ}، لەگەڵ دانیشتووانددا دابنیشن.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ﴾، وەك پێشتر باسمان کرد، وشەی (خروج) واتە: دەرچوون، بەڵام بە پێی سیاقو شوێن دەزانرێ، مەبەست پێی دەرچوونە بەرەو کوێ؟ وە بە زۆریی وشەی (خروج) کە بەکاردەهێنرێ. بۆ دەرچوون بۆ جەنگو جیهاد بەکاردێ.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ﴾، واتە: ئەگەر ویستبایان بۆ جەنگو جیهاد دەربچن، چییان دەکرد؟

﴿لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً﴾، پێداویستیەکانیان بۆ ئامادە دەکردن.

دەڵێ: (العُدَّةُ: مَا يُحْتَاجُ إِلَيْهِ مِنَ الأَشْيَاءِ، كَالسِّلَاحِ للمُحَارِبِ، وَالزَّاد للْمُسَافِرِ، مُشْتَقَّةٌ مِنَ الإِعْدَاد وَهُوَ التَهِيئَة).

(عُدَّة) هەر شتێکە کە پێویست بێ، وەك چەك بۆ جەنگاوەر، وە توێشوو بۆ ڕێبوار، لە چییەوە هاتوە؟ لە (إعداد)ەوە هاتوە، (إعداد)یش واتە: ئامادە کردن.

چونکە کەسی وایان هەبووە گوتوویەتی: ولاخم ئامادە نەکردوە، هی وایان هەبووە گوتوویەتی: چەکەکەم ئامادە نەکردوە، هی وا هەبووە گوتوویەتی: توێشووم نەپێچاوەتەوە، ئەو بروبیانووانەیان هێناونەوە، خواش ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر ئەوان بیانویستبایە، پێشتر خۆیان ئامادە دەکرد، پاشان پێغەمبەری خواش ﷺ لە شەوو ڕۆژێکدا یەکسەر نەیفەرمووە: خۆتان بپێچنەوە، بەڵکو ماوەیەکی پێچووەو چەند ڕۆژێك پێشتر ئاگاداری کردوونەوە، وە هەر کەسێك ویستبای خۆی ئامادە دەکرد.

﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ﴾، بەڵام خوا پێی ناخۆش بوو دەربچن.

ئنجا ئایا لەبەرچی پێی ناخۆش بوو؟

لەبەرئەوەی شایستە نەبوون، کەواتە: دەرنەچوونیان بۆ جەنگو جیهاد، وە ئەوە کە خوا نەیویستوە دەربچن، خوای کاربەجێ ئەوانی بێبەش کردوە لە هیدایەتی خۆی، لە یارمەتی خۆی، وە ئەمە چاکەیەکی خوا بووە بەرانبەر بە مسوڵمانان، چونکە دەرچوونیان، هەر بە زەرەرو زیان بۆ مسوڵمانان تەواو دەبوو، وەك دوایی باسی دەکەین.

﴿فَثَبَّطَهُمۡ﴾، (التثبيطُ: إِزَالَةُ العَزْمِ وَتثبيط الله إِيَاهُمْ أَنْ خَلَقَ فِيهِمِ الكَسَل عَلَى الغَزْوِ).

(تثبیط) بریتیە لە لابردنی عەزمو ئیرادە، ئنجا ئایا خوای پەروەردگار چۆن عەزمو خواستی لابردن؟

بەوە کە عەزمو ئیرادەی تێدا دروست نەکردوون، وە خواستو ویستی خاوکردوونەوە، لەسەر ئەوە کە بچن بۆ جەنگو جیهاد کردن، بۆچی وای لێکردوون؟

دیارە خوا ستەم لە کەس ناکات، بەڵام خۆیان پێشەکییەکانی ئەم ئەنجامەیان هێناوەتە دی، هەر کاتێك مرۆڤێك هەڵسوکەوتەکانی، دەرهاویشتەو ئەنجامێکی خراپیان هێنایە دی، دوایی خوا دەرهاویشتەو دەرئەنجامەکە پاڵ دەداتە لای خۆی. بەڵام بە تەئکید ئەم دەرئەنجامە لە چەند پێشەکییەك پێکهاتوە، کە مرۆڤ هەڵیچنیون، دیارە بە پێی یاساکانی خوای باڵادەست ئەو هەڵسوکەوتانە، ئەو دەرهاویشتەو دەرئەنجامانەیان لێ پێك دێ، بۆیە خوای کاربەجێ زۆرجار دەرئەنجامەکە پاڵدەدتە لای خۆی، بەڵام لە ئەسڵدا ئەو دەرئەنجامە لە چەند پێشەکییەك پەیدا بووە، کە پێشەکییەکان، مرۆڤەکان سازیان دەکەن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ ٱقْعُدُواْ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ﴾، (القُعُودُ: مُسْتَعْمَل فِي تَرْكِ الغَزْوِ، تَشْبِيهاً للتَّرْك بالجلوس).

(قعود)، واتە: دانیشتن، بەڵام بەکارهێنراوە بۆ وازلێهێنانی جەنگو جیهاد، وە چوێنراوە بە کەسێك کە دادەنیشێ، هەر کەسێك نەچێ بۆ جەنگو جیهاد، وەك ئەوە وایە کە پاڵی دابێتەوەو دانیشتبێ.

ئنجا ئایا کێی پێگوتن: ﴿وَقِيلَ ٱقْعُدُواْ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ﴾؟

دەڵێ: (القول أمر التكوين: أي كوَّن فيهم القعود عن الغزو)، ئەمە فەرمانێکی تەکوینییە، نەك فەرمانی تەشریعیی، ئەگەر خوا پێی فەرموون: دەربچن بۆ جیهاد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: دەربچن بۆ جەنگو جیهاد، کەواتە: ئەو (قیل) لە کوێوە هاتوە؟

لەوەوە هاتوە کە ئەوانە هێندە بێ ئیرادەو بێ ئارەزوو بوونە بۆ دەرچوون بۆ ئەو جەنگە، وەك ئەوە وابووە لە ناخی خۆیان دا پێیان گوترابێ: نەچن بۆ جەنگو

جیهاد، یاخود مەبەست ئەوەیە کە دڵنەخۆشەکان هەندێکیان هەندێکیانیان خاو کردۆتەوەو، فەرمانیان بە یەکدی کردوە کە نەچن بۆ جەنگو جیهاد.

ئنجا: ﴿ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾، ئەوە سەرزەنشتە بۆ ئەوان، چونکە ئەوانەی کە کاتێك جەنگو جیهادو فیداکاریی دێتە پێش دادەنیشن، کێن ؟

بێگومان بێهێزەکانن لە منداڵو لە ئافرەتو لە نەخۆشو لە بێ دەرەتانو پەککەوتووان، واتە: دانیشن لەگەڵ کەسانێك دا کە جگە لە هەڵسانو دانیشتن، شتێکی دیکەیان پێ ناکرێ، کەچی ئێوە هەرچەندە ساغو سەلیمن، بەڵام خۆتان بردۆتە ریزی نەخۆشان، خۆتان بە پیاو دەزانن، بەڵام خۆتان بردۆتە ریزی ژنو منداڵان! ئەوەش سەرزەنشتێکی گەورەی تێدایە، بۆ کەسێك کە هەر تۆزێك جوامێریی هەبێ.

<u>مەسەلەی دەیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧﴾.

ئەگەر لەگەڵتان دەرچووبانایە، هەر خراپەیان بۆ زیاد دەکردن، وە لە نێوانتاندا دەهاتنو دەچوون، {ئەسپی خراپەیان تاو دەدا}، هەمیشە بۆتان بەدوای ئاشووبو ئاژاوەو خراپەدا دەگەڕێن، وە ئێوەش کەسانێکتان لەنێودا هەن، کە گوێ بۆ ئەوان دەگرن، ئنجا یان سەر بەوانن، یان جاسووسیی بۆ ئەوان دەکەن، وە خوا بە ستەمکاران زانایە.

کە دەفەرموێ: ﴿لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم﴾، یانی: (خَرَجُوا فِيكُمْ إِلى الغَزْوِ، إِلى القِتَالِ، إِلى الجِهاد).

ئەگەر لەگەڵتان دەرچووبانایە بۆ جەنگو جیهاد، چییان دەکرد؟ خوای زانا چوار شتی باسکردوون:

١) ﴿مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾: (أَي: مَا زَادوكُم قُوَّة، أَوْ شَيْئا مِمَّا تُفِيدُ زِيادَته فِي الغَزْو، نَصْراً عَلَى العَدُو، ثُمَّ اسْتُثْنِيَ مِنَ الْمَفْعُولِ الْمَحْذُوف، الخَبالُ عَلى طَرِيقَة التهكّم).

واتە: ئەگەر دەرچووبان، تەنیا شتێك كە بۆتان زیاد بكەن، بریتی بوو لە خراپە، واتە: شتێكیان بۆ زیاد نەدەكردن، كە ببێتە هۆی سەركەوتنتان بەسەر دوژمندا، یەك شتیان بۆ زیاد دەكردن، ئەویش بریتیە لە خراپەو تێكدان، كە ئەویش بە تەئكید نابێتە هۆی سەركەوتن بەسەر دوژمندا، وە ئەوە جۆرێكە لە گاڵتە پێكردن، وەك یەكێك بە كەسێك دەڵێ: ئەگەر دۆستی وەك تۆم هەبێ، دوژمنم بۆچییە؟ یان كەسێك كە لە كۆڕو مەجلیسێك دا هێرشی دەكرێتە سەرێ، یەكێكیش بە حیساب بەرگریی لێ دەكات، ئەویش دەڵێ: قسەكانی تۆ بوونە سەرباری قسەكانی ئەوان، واتە: بەرگریی كردنەكەت. وەك هێرش كردنەی ئەوان وا بوو، خوا دەفەرموێ: ئەوانە ئەگەر شتێكتان بۆ زیاد بكەن، خراپەیە.

٢) ﴿وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ﴾، وشەی (خلال) كۆی (خلل)ە، دەڵێ: (الخلل: وهو فرجة بين الشيئين).

(خلل) كەلێنی نێوان دوو شتانە، واتە: لە نێوانتاندا ئەسپی خۆیان تاو دەدا، دەگوترێ: (أَوْضَعَ خَيْلَهُ) واتە: ولاخەكەی زۆر بە خێرایی لێخوڕی.

٣) ﴿يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ﴾، یانی: (يَطْلُبُونَ فِتْنَتَكُمْ).

وشەی (يَبْغُونَكُمْ) (بَغَى يَبْغِي) جاری وایە بۆ دوو (مَفْعُول) تەعەددا دەكات، جاری وایە بۆ یەك (مَفْعُول)، لێرەدا بۆ یەك (مَفْعُول) تەعەددای كردوە، ئەمە وەك ئایەتەكەی سوورەتی (آل عمران)ە، كە خوا ﷻ دەفەرموێ

﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ ﴿٨٣﴾﴾.

واتە: (أَفَغَيْرَ دِينِ اللهِ يَطْلُبون) ئایا جگە لە دینی خوا دەخوازن.

وشەی (ٱلْفِتْنَةَ )ش بە پێی سیاقەکان زۆر جار مانای دەگۆڕێ، چونکە بە مانای سزا دێو، بە مانای ئازار دێو، بە مانای تاقیکردنەوە دێو، بە مانای ئاشووب دێ، بەڵام لێرە بە مانای تێکچوونی کاروبار دێ، واتە: ئەگەر شتێکیان بۆ کردبان، ئەوە بوو کە زیاتر حاڵو باڵتان تێکبدەن.

٤) ﴿ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ﴾، وە لە نێو ئێوەدا کەسانێك هەن، گوێ بۆ وان هەڵدەخەن، ئەمەش دوو واتای هەن:

أ/ واتە: لە نێو ئێوەدا کەسانێك هەن، کە بەوانەوە پەیوەستن.

ب/ یاخود واتە: لە نێو ئێوەدا کەسانێك هەن، کە جاسووسیی بۆ ئەوان دەکەن لەسەر ئێوە.

دیارە (طبري) وای لێکداوەتەوە، دەڵێ: زیاتر وا زانراوە کەسێك کە بە قسەی کەسێك بکات، پێی دەگوترێ: (سامع)ە، نەك (سَمَّاع).

کەواتە: ﴿ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ﴾، یانی: کەسانێك هەن لە نێوتان دا بەسەرتانەوە جاسووسن، زۆر سیخوڕییتان بەسەرەوە دەکەن، وە زۆر گوێ هەڵدەخەن، بۆ ئەوەی قسەکانتان بۆ لایەنەکەی دی ببەن، نەك مەبەست ئەوەبێ: لە نێو ئێوەدا کەسانێك هەن، بە قسەی ئەوان دەکەن، چونکە وشەی (سَمَّاع) بۆ بە قسە کردنێ نەهاتوە.

(طبري) ئاوای گوتوە، وە ئایەتەکەش زیاتر واپێدەچێ، ئەو مانایە بگەیەنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە خوا زانایە بە ستەمکاران، ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە: مادام خوا زانایە، کەواتە: بەهۆی تێوەڕامانمانەوە لە قورئاندا، دەتوانین نیشانەکانی ستەمکارانو دەستدرێژیی کاران، بزانین، چونکە خوا چاکیان دەزانێو دەناسێ، وە قورئانیش بە زانیاریی خوا هاتۆتە خوارێ.

**مەسەلەی یازدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾﴾.

واتە: پێشتریش ئاشووبو خراپەیان بۆ ئێوە خواست، وە کاروبارەکانیان هەڵدەگێڕایەوە، هەڵگێڕو وەرگێڕیان دەکرد، {داخۆ بە کام باردا بۆ تۆ خراپترە؟} تاکو هەق هات، وە کاری خوا دەرکەوت، لە حاڵێکدا کە ئەوان پێیان ناخۆش بوو.

ئەمە ڕوونکردنەوەیە بۆ قسەی خوای بەرز، کە پێشتر فەرموویەتی: ﴿يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ﴾، چۆن ئاشووبو خراپەمان بۆ دەخوازن؟ بەڵگەمان چییە لەسەری؟

بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ﴾، پێشتریش ئاژاوەو ئاشووبیان بۆ تۆ خواست، ئەی پێغەمبەر ﷺ. وە بۆ ئێوە ئەی مسوڵمانان! وە هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: ئەوە ئاماژەیە بۆ جەنگی ئوحود، کە (عَبْدُ الله بْنُ أُبَيِّ بْنِ سَلُول) بە خۆی‌و سێیەکی سوپایەکەوە بە بیانووی ئەوەی پێغەمبەری خوا، بە قسەی گەنجەکانی کردوەو بە قسەی ئەوی نەکردوە، گەڕاونەوە، جا دەفەرموێ: پێشتریش ئەوان ئاشووبو ئاژاوەیان بۆ ئێوە هەر خواستوە، ئەوە لە جەنگی ئوحود دا، ئەوە لە زۆر حاڵ‌و مەقامی دیکەدا، بۆ وێنە: بوختان کردن بە دایکمان عائیشە خوا لێی رازی بێ، وە زۆر قسەو قاڵی دیکە، کە زۆرێك لە مونافیقەکان کردوویانن، کەواتە: ئەوە هی تازەیان نیە، پێشتریش ئەو هەڵوێستە خراپانەیان هەر هەبوون.

﴿وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ﴾، یانی: (تَرَدَّدُوا فِي آرَائِهِم وَأَعْمَلُوا المَكَائِدَ ضدَّكُمْ).

واتە: تەماشایان کردوەو لێ وردبوونەوەو هەڵگێڕو وەرگێڕیان کردوە، داخۆ بە کام بارەدا پیلانێك دابنێن، زیان بە ئیسلام‌و مسوڵمانان دەگەیەنن، وە پیلانیان لە دژتان گێڕاون.

یاخود ﴿ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ ﴾، واتە: (وَفتَّشوا وَبَحَثُوا).

یانی: پشكنیویانەو لێیان كۆڵیوەتەوە: چۆن زیاتر دەتوانین زیان بە مسوڵمانان بگەیەنین‌و، پەكی كارەكانیان بخەین؟!

(الأمر) واتە: كاروبارەكان بەگشتی، واتە: هەموو شتەكانیان هەڵگێڕو وەرگێڕ كردوە، داخۆ بە كام باردا زیاتر دەتوانن زەبرتان لێبدەن، وە زیانتان پێبگەیەنن.

كە دەفەرموێ: ﴿ جَآءَ ٱلْحَقُّ ﴾، مەبەست لە هاتنی هەق، بریتیە لەوەی كە هەق بچەسێ‌و پەیدابێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی دەركەوتنی حاڵی مونافیقەكان‌و پەردە لەسەر لادرانیان بێ.

﴿ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴾، وە كارو فەرمانی خوا دەركەوت‌و سەركەوت، كە بریتی بوو لە سەركەوتن‌و سەقامگیر بوونی ئیسلام‌و، دەستەڵات پەیداكردنی مسوڵمانان، چونكە وشەی (ظهر) وێڕای ئاشكرابوون‌و دەركەوتن بە مانای زاڵ بوون‌و سەركەوتنیش دێ، ئەوەش لە كاتێكدا، كە كافرەكان پێیان ناخۆش بوو.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان لـە پـازدە (١٥) ئـایـەت پێك دێ، ئـایـەتەکـانی (٤٩ تـاکو ٦٣)، لـەو پازدە ئـایـەتـەشدا تیشکی زۆر خراوەتـە سـەر مونـافیقو دڵنەخۆشـەکـانو، سـێ جاران وشەی (ومنهم) دووبارە بۆتەوە، وە بە گشتی لەم ئایەتانەدا، دوازدە هەڵوێستی خراپیان خراونەتـە ڕوو:

سـەرەتـا باسی هـەڵوێستی کەسانێکیـان دەکات، کـە بە بیـانووی بێجێ، داوای مۆڵـەتی بەجێمـانیـان کـردوە، لـە جـەنگـو جیهاد.

پاشان باسی ئەو هـەڵوێستـەیان دەکات کە هـەمیشە بە خۆشییو چاکەی مسوڵـمانان نـاڕەحـەتو، بە نـاخـۆشییـان شادمان دەبن!

خـوای کاربەجێش بە پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفـەرموێ: کـە پێیـان ڕابگـەیـەنـێ: جگە لـەوەی خـوا بۆی نووسیون، هیچیـان بەسـەر نـایـەت، ئـەوەی بەسـەریشیـان دێ، ئەوپـەڕی یـەکێکـە لـە دوو شتـە هـەرە باشـەکـان: کـە زۆربـەی توێـژەرەوان دەڵێـن: بریتیـن لـە: سـەرکـەوتن، یـان شـەهیدیی!

پاشـان بۆ جـاری سێیەم بە پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: کە پێیان ڕابگەیەنێ: بەهۆی بێبـڕواییـانەوە هەر چۆنێك ماڵو سـامان ببەخشن، هەر لـێتـان وەرنـاگیـرێ، دواییش بە پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: کە بـە سـامانو کـوڕانیـان سـەرسـام نەبـێ، چونکـە خـوا بۆیـان دەگـێڕێ بە مایـەی سـزای دنیـاو دواڕۆژ.

ئنجا باسی هـەڵوێستێکی دیکـەیـان دەکات، کـە بریتیـە لـە ئـازاردانی پێغـەمبـەر ﷺ بەهۆی تۆمەتبارکـردنیـەوە بە سادەیی.

وە لـە کـۆتـایی دا دووبارە باسی سوێندی درۆیـان دەکـاتو، هـەڕەشـەیـان لێدەکات کە لـەسـەر دژایـەتییـان بۆ خـواو پێغـەمبـەر ﷺ، دۆزەخ چـاوەڕێیـانـە.

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ
جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٞ تَسُؤْهُمْۖ وَإِن
تُصِبْكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمْ
فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ
فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِۖ
وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَاۖ
فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلْ أَنفِقُواْ طَوْعًا أَوْ كَرْهٗا لَّن يُتَقَبَّلَ
مِنكُمْۖ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ
إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ
وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْۚ إِنَّمَا يُرِيدُ
ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحْلِفُونَ
بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٞ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ
مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلٗا لَّوَلَّوْاْ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي
ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ

أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن
فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ
وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ
ٱلسَّبِيلِ ۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ
ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ
وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ يَحْلِفُونَ
بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ
﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا
فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{وە لەوان کەسی وا هەیە دەڵێ: مۆڵەتم بدە (نەیەم بۆ جەنگ) وە تووشی گوناهم مەکە، ئاگاداربن! کەوتوونەتە نێو (چاڵی) گوناهبارییەوە، وە دۆزەخیش دەورەدەری بێبڕوایانە ﴿٤٩﴾ ئەگەر چاکەیەکت تووش بێ، نارەحەتیان دەکات، وە ئەگەر بەڵایەکت بەسەر بێ، دەڵێن: ئێمە پێشتر (دووربینییمان کردبوو) کاری خۆمان (بە وریایی) گرتبوو، وە بە خۆشحاڵییەوە، پشت دەکەنەوە (و دەڕۆن) ﴿٥٠﴾ بڵێ: جگە لەوەی خوا بۆی بڕیار داوین، بەسەرمان نایەت (کە هەر ئەو سەرپەرشتیارمانە)، وە با بڕوادارانیش هەر پشت بە خوا ببەستن ﴿٥١﴾ بڵێ: ئایا جگە لە یەکێك لە دوو شتە هەرە باشەکان (سەرکەوتن یان شەهیدیی) چیدیکەمان بۆ چاوەڕێ دەکەن! وە ئێمەش ئەوەتان بۆ چاوەڕێ دەکەین، کە خوا لەلایەن خۆیەوە، ئازارێکتان تووش بکات، یان بە دەستی ئێمە (سزاتان بدات) دەجا چاوەڕوان بن، ئێمەش چاوەڕوانین ﴿٥٢﴾ بڵێ: بە خۆشحاڵیی یان بە ناخۆشحاڵیی، ببەخشن (ئەو ماڵ بەخشینە) لێتان وەرناگیرێ، چونکە بێگومان ئێوە کۆمەڵێکی لاڕێ بوون ﴿٥٣﴾ وە تەنیا ئەوەش ڕێگری ئەوە بوو کە ماڵ خەرج کردنەکانیان لێوەربگیرێ، کە بێبڕوابوون بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، وە بەس بە تەنبەڵیی دەچنە نوێژێ، وە بە ناخۆشحاڵییو ناچاریی نەبێ، ماڵ خەرج ناکەن ﴿٥٤﴾ تۆش بە سامانو منداڵەکانیان (با زۆریش بن) سەرسام مەبە، چونکە خوا تەنیا دەیەوێ بە هۆیانەوە، لە ژیانی دنیادا ئازاریان بدات، وە با کافرانەش گیانەکانیان دەربچن ﴿٥٥﴾ وە سوێند بە خوا دەخۆن کە ئەوانیش لە ئێوەن، وە مسۆگەربن ئەوان لە ئێوە نین، بەڵام کۆمەڵێکن زۆر دەترسن، (بۆیە ئەو درۆیەتان بۆ دەکەن) ﴿٥٦﴾ ئەگەر پەنایەك، یان شوێنێکی هەڵۆڵ، یان کونو کەلێنێکی تەنگەبەریان چنگ بکەوێ، بە پەلەپرووزە خۆیانی تێ دەپەستێون ﴿٥٧﴾ وە لەوان کەسی وا هەیە، لەسەر سامان بەخشینەکان ڕەخنەت لێدەگرێ، ئنجا ئەگەر لێیان بەشیان بدرێ،

ڕازیین، وە ئەگەر بەشیان لێیان نەدرێ، یەکسەر تووڕەو پەست دەبن ﴿٥٨﴾ وە ئەگەر ئەوەیان پەسند کردبایەو، قەناعەتیان پێی هاتبایە، کە خواو پێغەمبەرەکەی پێیان داون، وە گوتبایان: خوامان بەسە، مسۆگەر خوا لە بەخششی خۆیو پێغەمبەرەکەیشی پێمان دەدەن، ئێمە تەنیا ئارەزووی (پاداشتو بەخششی) لای خو دەکەین، (بۆ ئەوان باشتر بوو) ﴿٥٩﴾ بە دڵنیایی یەوە: سامانە بەخشراوەکان (زەکات) تەنیا هی هەژارانو، نەدارانو، کار بۆ کردووەکان (سەرپەرشتیاران)و، دڵڕاگیراوانو بۆ ئازادیی کۆیلانو، دانەوەی قەرزی قەرزدارانو، ئەوانەی لە پێناوی خوادا کاردەکەنو ڕێبوارانن، ئەوە شتێکە لەلایەن خواوە پێویست کراوە، وە خوا زانای کارزانە ﴿٦٠﴾ وە لەو (مونافیقو دڵنەخۆش)انە کەسانێك هەن، کە ئازاری (دڵی) پێغەمبەر دەدەنو دەڵێن: ئەو هەر گوێیە (و هەموو شتێك لە هەموو کەس وەردەگرێ) بڵێ: گوێی چاکەیە بۆتان، بڕوای بە خوا هەیەو، بڕواداران بە ڕاست دادەنێ، (و متمانەی پێیان هەیە)، وە (مایەی) بەزەیی یە بۆ بڕوادارانتان، وە ئەوانەی ئازاری (دڵی) پێغەمبەری خوا دەدەن، سزاو ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە ﴿٦١﴾ سوێندتان بۆ بە خوا دەخۆن، تاکو ڕازییتان بکەن، ئنجا ئەگەر بڕوادار بوونایە، خواو پێغەمبەرەکەی شایستەتر بوون ڕازییان بکەن ﴿٦٢﴾ ئایا نازانن کە هەر کەسێك دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات بە دڵنیایی ئاگری دۆزەخی بۆ دانراوەو، بە هەمیشەیی تێیدا دەبێ، ئا ئەوە زەبوونییو سەرشۆڕییەکی مەزنە ﴿٦٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱئۡذَن لِّي ): (أَذِنَ: اسْتَمَعَ)، وشەی (أَذِنَ) واتە: گوێی گرت، دەڵێ: (الإِذْنُ: الإِعْلَام بِإِجَازَةِ الشيءِ وَالرُّخْصَةِ فِيهِ).

(إِذْن) بریتیە لە ئاگاداركردنەوە بە مۆڵەت دان بە شتێك، وە مۆڵەت دان پێی.

(وَلَا تَفۡتِنِّيٓ ): واتە: بەڵام بەسەر مەهێنە، گوناهبارم مەكە، (إِفْتَتَنَ فُلَانَاً: أَوْقَعَهُ فِي الفِتْنَةِ، أَي: البَلاَءِ، أَوْ العَذَابِ، أَوْ الإِمْتِحَانِ).

دەگوترێ: (إِفْتَتَنَ فُلَانَاً)، واتە: فلانكەسی خستە نێو بەلاوە، نێو گرفتارییەوە، نێو سزاو نێو تاقیكردنەوە.

(فَرِحُونَ ): (الفَرَحُ: انْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِلَذَّةٍ عَاجِلَة، وَأَكْثَرُ مَا يَكُونُ ذَلِكَ فِي اللَّذَّاتِ البَدَنِية الدُّنَيَوِية).

(فرح) بریتیە لە گوشادبوونی سینە، بەهۆی خۆشییەكی بە پەلەی دنیاوە، كە بە زۆرییش بۆ ئەو لەززەتو خۆشییانە بەكاردەهێنرێ، كە هی جەستەن، لە دنیادا.

(مَوۡلَىٰنَا ): واتە: سەرپەرشتیارمان، خەم خۆرمان، (الوَلَايَة: النُّصْرَةُ، وَالوِلاَية التدبير، وَالوَلِيّ وَالمَوْلَى، فَاعِلاً وَمَفْعُولاً).

(وَلاَية) بە مانای سەرخستنو پشتگرتن دێ، (وِلاَية)یش بە مانای سەرپەرشتیی كردنو كاربەرێ كردن دێ، وشەی (وَلِي) و (مَوْلَى) هەم بە (فَاعِل) دێن، هەم بە (مَفْعُول) دێن، وە هەردوو وشەی (وَلِيّ) و (مَوْلَى) بە مانای مشوورخۆرو سەرپەرشتیارو، بە مانای مشوور لێخوراو سەرپەشتیی كراویش دێن.

(تَرَبَّصُونَ ): (التَرَبّصُ: الإنْتِظَارُ بالشيء).

(تَرَبّصُ) ئەوەیە کە چاوەڕوانیی کەسێك بکەی شتێکی بەسەر بێ، یان شتێکی بۆ بێ.

(طَوْعًا ): (الطوعُ: الإنْقِيادُ، وَيُضادُّهُ الكُرْهُ).

(طوع) بریتیە لە ملکەچیی یان پێخۆشبوون، پێچەوانەکەشی بریتیە لە پێناخۆش بوون،

( كَرْهًا ): (الكَرْه وَالكُرْهُ، كالضَّعْفِ وَالضُّعْف، وَقِيلَ الكُرْه خَارجِيٌّ والكُرْهُ ذاتي).

وشەی (كَرْه) و (كُرْه) وەك (ضَعْف) و (ضُعْف) هەردووکیان بە یەك مانا دێن، دیارە (كُرْه) و (كَرْه) واتە: پێ ناخۆش بوون، وە (ضَعْف) و (ضُعْف)یش واتە: بێهێزیی، وە هەندێکیش گوتوویانە: (كَره) واتە: لە دەرەوەی خۆت شتێکت لەسەر پێویست بکرێ کە پێت ناخۆشبێ، وە (كُرْه) ئەوەیە کە لە دڵی خۆتدا، شتێکت پێ ناخۆش بێ.

(كُسَالَىٰ ): (جَمْعُ كسْلاَن، مِنْ كَسِلَ، والكَسَلُ المَصْدَرُ: التَّثَاقُلُ عَمَّا لاَ يَنبَغِي التثاقُلُ عَنْهُ).

(كسالى) كۆی (كَسْلان)ە، واتە: تەنبەڵ، بە کوردیی ئێمە دەڵێین: تەنبەڵ. تەوەززەل، لە (كَسِلَ)ەوە هاتوە، (كَسِلَ يَكْسَلُ كَسَلاً)، تەنبەڵیی کرد، تەنبەڵیی دەکات، تەنبەڵیی، دیارە (كَسَل) چاوگە، کە بریتیە لە قالب گرانیی کردنو تەنبەڵیی کردن لە شتێك، کە نابێ تەنبەڵیی تێدا بکرێو خاوەخاوی تێدا بکرێ.

(فَلَا تُعْجِبْكَ ): واتە: با سەرسامت نەکات، (أَعْجَبَنِي كَذَا: رَاقَنِي) واتە: پێی سەرسام بووم، پێم گرنگ بوو.

دەگوترێ: (فُلاَنٌ مُعْجَب بنَفْسِهِ) واتە: فلان کەس خۆی پێ گرنگەو، بە خۆی سەرسامە.

(وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ ): (زَهَقَتْ نَفْسُهُ: خَرَجَتْ مَعَ الأَسَفِ عَلَى الشيءِ).

(زَهَقَتْ نَفْسُهُ) واتە: ڕووحی دەرچوو، لەگەڵ خەفەت پێخواردن لە شتێكدا، یاخود بە زەحمەت ڕووحی دەرچوو.

(يَفْرَقُونَ ): (الفَرَقُ: تَفَرُّق القَلْب مِنَ الخَوْفِ).

(فَرَق) لە (فَرْق)ەوە هاتوە، یانی: جیا كردنەوە، دەڵێ: ئەوەیە كە كەسێك دڵی بەش بەش بێ، پارچە پارچە بێ، لە ترسان.

(مَلْجَـًٔا ): (لَجَأَ إِلى الشيءِ وَالمَكانِ، لِجْأً وَلُجُوءاً: لاذَ إِلَيْهِ وَاعْتَصَمَ بِهِ).

پەنای بۆ ئەو شتە برد، یاخود پەنای بۆ ئەو شوێنە برد، یانی: (لاذَ إِلَيْهِ وَاعْتَصَمَ بِهِ)، پەنای پێ بردو خۆی پێ گرتەوە، (المَلْجَأُ: المَعْقِلُ وَالمَلاذُ) (مَلْجَأ) شوێنێكە كە ئینسان خۆی تێدا حەشار بدات، وە پەنای پێ بەرێ.

(مَغَـٰرَٰتٍ ): (المَغَارُ وَالمَغَارَةُ وَالغَارُ: كَالْكَهْفُ فِي الجَبَلِ وَجَمْعُ الغَارِ: غِيْرَان).

(مغَار) و (مَغَارَة) و (غَار) وەك ئەشكەوتە لە چیا، یاخود بە شوێنێكی هەڵۆڵو فراوان دەڵێن كە ئینسان تێیدا خۆی حەشار بدات، وە كۆی (غار) (غیران)ە، دیارە كە بریتیە لە قوڵتێك، یان قڵیشێك لە شاخێك، كە سەرەكەی داپۆشراو نەبێ، بەڵام (كهف) ئەوەیە كە سەرەكەی داپۆشراو بێ.

(مُدَّخَلًا ): (المُدَّخَل: شبهُ الغَارِ يُدْخَلُ فِيهِ).

(مُدَّخَل) وەك (غَار)ە، (غَار) لە چیایە، قڵیشی بەردێك، شاخێك، هەڵۆڵێك، بەڵام (مُدَّخَل) لە زەوییە، لە دەشتاییە، بۆیە بە (سَرَب)یان لێكداوەتەوە، كونێك، كەلەبەرێك، كە ئینسان بە زەحمەت تێی بچێ.

(لَّوَلَّوْاْ إِلَيْهِ ): واتە: بە خێرایی بەرەو ئەو شوێنە دەچوون .

(وَلَّى إِلَيْه) واتە: ڕووی تێكرد، (وَلَّى عَنْهُ) واتە: پشتی تێكرد.

(يَجۡمَحُونَ ): (جَمَحَ: أَسْرَعَ، جَمَحَ الفَرَسُ يَجْمَحُ جَمْحاً: ... عَنْ أَمْرِ صَاحِبِه حَتَّى غَلَبَهُ).

(جَمَحَ) واتە: خێرایی کرد، دەگوترێ: (الفَرَسُ الجمُوح) ئەسپێکی چەمووش. یاخود ئەسپێکی سەرکێش، کە وا بکات خاوەنەکەی دەستەلاتی بەسەریدا نەبێ‌و، لێی یاخیی بێ، ئەوانەش وەك ئەسپی سەرکێش، دەچوونە نێو ئەو حەشارگەیەوە، بۆ ئەوەی خۆیان بشارنەوە.

(يَلۡمِزُكَ ): (لَمَزَهُ: عَابَهُ) واتە: عەیبت لێ دەگرن، ڕەخنەت لێ دەگرن.

(يَسۡخَطُونَ ): (سَخِطَهُ وَسَخِطَ عَلَيْهِ، سَخَطاً وَسُخْطاً: كَرِهَهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ. وَلَمْ يرضَهُ).

(سَخِطَهُ وَسَخِطَ عَلَيْهِ) هەردووکیان دێ، واتە: هەم بۆخۆی تەعەددا دەکات. هەم بە (على)ش واتە: پێی ناخۆش بوو، لێی تووڕە بوو، وە لێی ڕازی نەبوو.

(حَسۡبُنَا ٱللَّهُ ): واتە: خوامان بەسە، (حَسْبُ: اسْمٌ بمَعْنَى كَافٍ، وَاسْم فعل: حَسْبُكَ كَذَا: اكتف به!).

(حَسْب) واتە: بەس، (حَسبُكَ كَذَا) واتە: بەوەندە واز بێنە، ئەوەندەت بەسە، دەبێتە (اسم فعل)یش، بەلام لە ئەسلدا، ناوە بە مانای کافی.

(رَٰغِبُونَ ): (رَغِبَ فُلاَنٌ رَغَباً وَرَغْبَةً وَرِغْبَةً: حَرَصَ عَلَى الشيءِ وَطَمِعَ فِيهِ).

دەگوترێ: فلان کەس ئارەزووی بۆ فلان شتە بوو، (رَغْبَةً وَرِغْبَةُ وَرَغبا) هەموویان هاتوون، واتە: لەسەر ئەو شتە سوور بوو، وە تەماعی تێیدا هەبوو

(لِلۡفُقَرَآءِ ): (جَمْعُ فَقِير: المَكْسُور الفِقَار، مَنْ لاَ يَمْلِكُ إلاَّ أَقَلَّ القُوتِ).

(فقراء) کۆی (فقير)ە، کە بە کەسێك دەگوترێ: کە فەقەرەی پشتی شکابێ. یاخود بە کەسێك دەگوترێ: کە کەمترین بژیوی هەبێ، هێندەی هەبێ کە بەشی

نەکات، هەندێکیش دەڵێن: هەر هیچی نەبێ، کە ئەم مانایە ڕاستترە وەك پێشتریش گوتوومانە.

(وَٱلۡمَسَـٰكِينِ ): كۆی (مِسْكِين)ە، (مَنْ لَيْسَ عِنْدَهُ مَا يَكْفِي عِيالَهُ).

کەسێك کە هێندەی نەبێ بەشی ماڵو منداڵی بکات، شتێکی هەبێ، بەڵام بەشی ماڵو منداڵی نەکات، بەڵام (فقیر) ئەوەیە کە هیچی نەبێ.

(وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ ): واتە: دڵڕاگیراون، (أَلَّفَ) واتە: پێکیەوە نووساند.

(مؤلَّف) واتە: پێکەوەنووسێنراو، بۆیە بە کتێب دەگوترێ: (مؤلَّف) چونکە وشەکانو ڕستەکانی پێکەوە نووسێنراونو کتێبێکیان لێ پێکهاتوە، (أَلَّفَهُ: إِسْتَمَالَهُ، الأُلْفَة: الإِجْتِمَاعُ والإِلتئام).

(أَلَّفَهُ) واتە: دڵی ڕاگرت، دڵی بەلای خۆی داهێنا، (الأُلْفَة) بریتیە لە کۆبوونەوەو پێکەوە گونجان.

(ٱلرِّقَابِ ): كۆی (رقبة)یە، بە مانای مل دێ، بەڵام بە هەموو جەستەی ئینسان دەگوترێ، وە کاتی خۆی زیاتر بۆ ئەو کۆیلانە بەکارهاتوە، کە ویستراوە ئازاد بکرێن.

(وَٱلۡغَـٰرِمِينَ ): (الغَارِمُ: الَّذِي يَلْتَزِمُ مَا ضَمِنَهُ وَتَكَفَّلَ بِهِ، الغَرِيمُ: الدَّائِنُ وَالمَدِين).

(غَارِمُ) کەسێکە کە ماڵێکی وە ئەستۆ گرتوەو گرەنتی کردوە کە بیدات، واتە: مەرج نیە بۆ خۆی شتی قەرز کردبێ، بەڵام صوڵحێکی کردوە، کەوتۆتە نێوان دوو لایەنەوە، (غريم)یش هەم بە بابای قەرزدەر دەگوترێ، هەم بە بابای قەرزدار دەگوترێ.

(وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ): واتە: لە ڕێی خوادا، بەڵام لێرەدا بە مانای هەموو ئەو شتانەی دێ، کە جێگای ڕەزامەندیی خوان، وە مایەی بەرژەوەندیی موسوڵمانانن، چ بۆ کاروباری دنیایان، چ بۆ کاروباری دینداریيان.

(وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ): واتە: کوڕی ڕێگا، بەڵام لێرەدا بە مانای ڕێبوار دێ، کە هەمیشە بەڕێوەیە.

(أُذُنٌ): واتە: گوێ، کە کۆیەکەی (آذان)ە، (أُذن: الجَارِحَةُ: مَنْ يَسْمَعُ مَقَال كُلّ أَحَد. يَسْتَوِي فِيهِ الوَاحِدِ والجَمْع والمذكر والمؤنث).

لە زمانی عەرەبییدا کە گوترا: فلان کەس گوێیە، مەبەست ئەوە نیە ئەو ئەندامەیە کە قسەی پێ دەبیستێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە زۆر دەبیستێ، وەك ئەگەر بڵێی فلان کەس چاوە، واتە: زۆر چاودێریی دەکات.

(هو أذن، وهي أذن، وهم أذن، وهنَّ أذن، وهما أذن)، واتە: نێرو مێو کۆو تاكو دووان، هەمووی (أذن)ی بۆ بەکاردێ.

(يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ): (المُحادَّةُ: المُخَالَفة، وَكَذَا: التحادّ).

(مُحادَّةُ) واتە: بەربەرەکانێ، یان دژایەتیی، هەروەها (تحادّ)یش هەمان مانای هەیە.

(ٱلۡخِزۡيُ): (خَزِيَ: ذَلَّ وَهانَ: خَزِيَ خِزْياً، وَخَزِيَ خَزَايَة: إِسْتَحْيا).

(خَزِيَ خِزْياً) زەبوونو سەرشۆڕ بوو، بەڵام (خَزِيَ خَزَايَة) واتە: شەرمی کرد.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایـەتـەکـان

١) هـۆی هـاتنە خـوارەوەی ئـەم ئایـەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رَضِيَ الله عَنْهُمَا، سَمِعْتُ رَسولَ الله يَقُولُ: يَا جَدّ! هَلْ لَكَ فِي جِلادِ بَنِي الأَصْفَرِ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَوْ تَأْذَنُ لِي وَلا تَفْتِنّي؟ فَإِنِّي رَجُلٌ أُحِبّ النّسَاءِ، وَإِنّي أَخْشَى إِنْ رَأَيْتَ نِسَاءَ بَنِي الأَصْفَرِ أَنْ أُفْتَنَ! فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ معْرِضٌ عَنْهُ: قَدْ أَذِنْتُ لَكَ، فَعند ذلك أنزل الله ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي حاتم فِي التفسير، برقم: (٩٦٠٠)، وقال الألباني إسناده حسن، وصحّحَهُ مؤلّفا: الإستيعاب في بيان الأسباب ج٢، ص٢٨١}.

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبـدوڵڵا خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵێ گوێم لە پێغـەمبـەری خوا ﷺ بوو دەیفـەرموو: ئـەی جـەد! ئامادەی بێی بۆ جـەنگ کـردن لـە دژی بـەنی ئەصـفەر[1]؟ جەد گوتی: ئەی پێغـەمبـەری خوا! مۆڵەتم دەدەی نەیەم؟ من پیـاوێکم ژنم زۆر خـۆشدەوێن، وە من مەترسییم هەیە کە ئافرەتانی بەنی ئـەصفـەرم بینـی، تووشی گونـاهێ ببم (بیـانوو هێـنـانـەوەیـەکی چـەند سـاردو سڕو بـێ تـامـەو ڕووی مەجلیسێ نیـە) پێغـەمبـەری خـواش بـە ڕوو لێوەرگێـڕانەوە فـەرمووی: ئـەوە مۆڵەتم دای.

بـەوبۆنـەوە ئـەم ئـایـەتـە هـاتـە خـوارەوە.

---

١) بە ڕۆمەکانیـان گوتـوە: بەنی ئەصـفەر، لەبەرئـەوەی عـەرەبەکان لـە چاو ئـەوان ئەسـمەر بوون، ئەوان زیاتـر پـرچ زەردو چـاو شینو سـپی بوون.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾.

﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَهُوَ يَقْسِمُ قَسْمًا، أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! اعْدِلْ فَقَالَ: وَيْلَكَ وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ، قَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ. فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! ائْذَنْ لِي فِيهِ، فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ، فَقَالَ: دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ مَعَ صَلَاتِهِمْ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ. لا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٣٤١٤)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٠٦٤)، وَقَالَ مؤلفا (الإستيعاب) قلنا: ليس عندهما التصريح بسبب النزول، لكنه ثبت هذا التصريح في رواية النسائي في التفسير، برقم: (٢٤٠)، والطبري في جامع البيان، ج١٠، ص١٠٩، وعبد الرزاق في التفسير، ص٢٧٧ و ٢٨٨، وابن ابي حاتم في تفسيره برقم: (١٠٣٤)}.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لە کاتێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین، سامان وماڵێکی دابەش دەکرد (پیاوێك ناوی {ذُو الْخُوَيْصِرَةِ} بوو، لە هۆزی بەنی تەمیم، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دادگەر بە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بێ قەزا بی، یان وای بۆ تۆ، ئەگەر من دادگەر نەبم، کێ دادگەر دەبێ؟ من پەشێمان و زیانبەخشم، ئەگەر دادگەر نەبم. عومەر گوتی: مۆڵەتم بدە با لە گەردنی بدەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لێی گەڕێ، ئەوە چەند هاوەڵێکی هەن، {واتە: دوایی دێن، بە پێی میزاج و مەشرەبی ئەم پیاوەن، تەنانەت ڕەخنە لە پێغەمبەریش دەگرن، بیروڕای کەسیان پێ چاك نیە، غەیری خۆیان، زۆر لە خۆڕازیی و خۆپەسندن، ئنجا وەسفیان دەکات} دەفەرموێ: یەکێك لە ئێوە نوێژی خۆی لەچاو نوێژی ئەوان پێ کەمە، وە ڕۆژووگرتنی خۆی لەچاو ڕۆژوو گرتنی ئەوان پێ کەمە، وە قورئان دەخوێنن. بەڵام لە گەروویان ئاودیو نابێ، {واتە: دەیخوێنن، بەڵام تێگەیشتنی لەگەڵدا نیە.

یاخود دەیخوێنن، بەڵام لەزەت لێکردنی لەگەڵدا نیە} لە ئایین دەردەچن، وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ.

کاتێ خۆی کە تیریان بە هێزێکی زۆر لە نێچیر داوە، لەم سەریان داوە لەوسەری دەرچووە، ئنجا لە درێژەی فەرموودەکەدا باس دەکات، دەفەرموێ: دوایی کابرا کە تەماشا دەکات تیرەکە نە بە نووکەکەیەوە، نە بە ڕیشەکەیەوە، هیچ شوێنەوارێکی خوێنی پێوە نیە، واتە: ئەوانیش لە ئایین دەردەچن، هیچ ئایینیان پێوە نامێنێ.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾.

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ نَبْتَلُ بْنُ الحارِثِ يأْتِي رَسولَ اللهِ ﷺ فَيَجْلِسُ إِلَيْهِ فَيَسْمَعُ مِنْهُ، ثُمَّ يَنقُلُ حَدِيثَهُ إِلى المُنافِقِينَ، وَهُوَ الَّذِي قَالَ لَهُمْ: إِنَّمَا مُحَمَّدٌ أُذُنٌ، مَنْ حَدَّثَهُ شَيْئاً، صَدَّقَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِيهِ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ﴾﴾ {أَخْرَجَه إِبْنُ إِسْحاق كَمَا في (الدر المنثور)، ج٤، ص٢٢٧، وإبن أبي حاتم في تفسيره، ج٦، ص١٨٢٦، لباب النقول ج١، ص١١٥، وقال مؤلّفا الإستيعاب: سنده ضعيف، ج٢، ص٢٨٦}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی دەبێ، دەڵێ: نەبتەلی کوڕی حارث دەهاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنیشت، گوێی بۆ دەگرت، دوایی قسەکانی دەگواستنەوە، بۆ لای دەغەڵو موونافیقەکان، وە ئەو بوو کە گوتی: موحەممەد هەر گوێیە؟ هەر کەسێك قسەی بۆ بکات بە ڕاستی دادەنێ، دەربارەی وی ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ﴾.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکــان

خـوا ﷻ لەم پازدە ئایەتەدا ـ وەك پێشتـریش ئاماژەمان پێکرد ـ تیشکی زۆر دەخاتـە سەر موونافیق‌و دڵنەخۆشـەکان، دیـارە هـەڵوێستـەکانیـان زیـاتر پـەیوەسـتن بە حاڵـەتی جەنگ‌و ئاشـتیی‌و، حاڵەتی بەخشین‌و نەبەخشین، وە شێوازی هـەڵسوکەوتیـان لەگەڵ پێغـەمبـەردا ﷺ، کە دیارە کۆمەڵی مسوڵمان چ لە حـاڵـەتی جـەنگ‌و ئـاشـتیی دا، چ لە حاڵەتی گوێڕایەڵیدا، لە حاڵەتی بەخشیندا، لە گشت بوارەکانی ئابووریی، کۆمەڵایـەتیی‌و هـەڵسوکەوت لەگەڵ قیادەی خۆیدا، ئەگـەر ئـەو قیـادەیـە پێغـەمبـەر ﷺ بێ، یـان کەسانێك بن، کە بە ڕێی پێغـەمبـەر ﷺدا دەڕۆن، لـە هـەموو ئـەو حـاڵـەتـانەدا، خەڵکی مسـوڵمان، پابەنـدە بە قورئان‌و سـوننەتەوە، وە ڕازاوەیە بە ئاکارە بەرزو جوانەکان.

سەرەتا دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ﴾، بۆچی نـاوی نەهێنـاون فـەرموویـەتی: (وَمِنْهُم) وە لـەوان؟! چونکە بە پێی سیـاق دەزانـرێ کـە مەبەست پێی ئەوانەیە کـە پێشتـر باسی کردوون، کە بریتین: لە موونافیق‌و دڵـنـەخۆش‌و دەغەڵەکان، دەفەرمووێ: کەسی وایان تێدایە دەڵێ: مۆڵەتم بدەو تووشی بـەڵاو گرفتـاریی‌و تـاقیکـردنەوەو گونـاهم مەکە.

ئنجا ئەمە وەك دوایـی باسی دەکەین، سـێ چـوار واتـایان دەگرێتەوە، هەرچەنـدە هـۆی هـاتنە خـوارەکەی دەربارەی جەددی کـوڕی قەیسە، ئەو بە نـموونە هێنـراوەتـەوە، بـەڵام وەك هەمیشـە گـوتوومـانە: (إِنَّ خُصُـوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَـعُ شُـمُولَ الـمعْنَى)، واتـە: ئەوە کە هۆیـەکەی تـایبەتـە، ڕێگـر نـابێ لـەبەردەم گشتگیـریی مانـاکەیدا، گـرنگ ئـەوەیـە کـەسـانێك هەبوون لە نێو موونافیـق‌و دڵـنەخۆشـەکان دا، ویستوویانە بە بیانووو پاساوی بێـجێ، خۆیـان لـە جـەنگ‌و جیهاد دەرباز بکـەن.

هەیـانە کە دەڵێ: مۆڵـەتم بدەو تووشی تاقیکـردنەوەیـەکم مەکە، کـە لێی دەرنـەچـم‌و تووشی گوناح ببم، ﴿أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْ﴾، ئاگاداربن! ئەوانە کەوتوونەتە نێـو

گرفتاریی‌و گوناهەوە، وە ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ٤٩ ﴾، وە بێگومان دۆزەخ دەورەدەری کافرانەو ئابلۆوقەی داون‌و لێی دەرباز نابن.

﴿ إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ ﴾، ئەگەر خۆشیی‌و چاکەیەکت تووش بێ، پێی ناڕەحەت دەبن‌و، پێیان ناخۆشە، ﴿ وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ ﴾، وە ئەگەر بەلایەکت بەسەر بێ، دەڵێن: ئێمە پێشتر دووربینیی خۆمان وەرگرتبوو، پێشتر وریایی خۆمان کرد بوو، ﴿ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ ٥٠ ﴾، وە پشتتان تێدەکەن‌و دەڕۆن، زۆر بە شادمانییەوە کە بۆ خۆیان ساغ‌و سەلامەتن، پێغەمبەر ﷺ‌و مسوڵمانان چییان بەسەر دێ، با بەسەریان بێ، ئاوا خۆ پەرستو (أناني)ن!.

﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَا ﴾، پێیان بڵێ: هیچ شتێکمان تووش نایەت، مەگەر ئەوەی خوا بۆی بڕیار دابێ، هەر شتێکیشمان بۆ بڕیار بدات، بە خێرو قازانجمان تەواو دەبێ، جا ئەو شتە خۆشبێ، یان ناخۆش بێ، ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٥١ ﴾، وە با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن.

﴿ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ ﴾، بڵێ: ئایا جگە لە یەکێك لە دوو شتە هەر چاکەکان، چی دیکە بۆ ئێمە چاوەڕێ دەکەن، {ئێمە یان شەهید دەبین، یان سەردەکەوین}، ﴿ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ ﴾، وە ئێمەش بۆ ئێوە چاوەڕێ دەکەین، یان خوا لەلایەن خۆیەوە سزایەکتان بدات، لە دنیا یان لە دواڕۆژدا، یان بە دەستی ئێمە سزاتان بدات لە دنیادا، ﴿ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ٥٢ ﴾، دەجا ئێوە چاوەڕێ بن، ئێمەش لەگەڵ

ئێوە چاوەڕێ دەبین، واتە: چاوەڕێ بن، کە ئەوەی ئێوە پێتان وایە بەسەرمان دێ بەسەرمان بێ، وە ئێمەش چاوەڕێ دەکەین، کە ئەوەی ئێوە بەسەرتان دێ، بەسەرتان بێ.

﴿ قُلْ أَنفِقُواْ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾
بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ماڵی خۆتان ببەخشن، {کە بە پێی سیاقی ئایەتەکان دەردەکەوێ، مەبەست پێی ماڵ بەخشینە، بۆ ئامادەکردنی سوپا بۆ جەنگی تەبووك، کە ئیسلامو مسوڵمانان زۆر پێویستییان بە هاوکاریی هەموو لایەك هەبووە، چونکە مسوڵمانان کەم دەست بوون، وە ئەو جەنگەش یەکەم بەرەنگاربوونەوە بووە، لەگەڵ ڕۆمەکاندا، وە کاتەکەشی زۆر گەرمو ناخۆش بووە. وە ڕێیەکەش زۆر دوور بووە، بۆیە پێویستییان بە خۆ ئامادەکردنی باش بووە}. ئنجا خوا دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ماڵی خۆتان خەرج بکەن، بە خۆشحاڵیی، یان بە ناخۆشحاڵیی، لێتان قبووڵ ناکرێ، هەرگیز لێتان وەرناگیرێ، واتە: لە لای خواوە لێتان وەرناگیرێو، پاداشتتان نادرێتەوە، بۆچی؟

دەفەرموێ: بێگومان ئێوە کۆمەڵێکی لاڕێ بوون، واتە: بە هۆی لاڕێ بوونو لادانتانەوە: لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی فیطرەت، لە حوکمی شەریعەت، بۆیە خوای دادگەر ئەو کردەوە چاکانەتان کە بەڕواڵەت چاکن، بەڵام مەبەستتان پێیان ڕەزامەندیی خوا نیە، لێتان وەرناگرێ.

ئنجا خوای دادگەر دێتە سەر باسی هۆکاری وەرنەگیرانی کردەوە باشەکانیان.

دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ ﴾ هیچ شتێکیش نەبوو بە ڕێگری ئەوەی، کە کردەوەکانیان لێ وەربگیرێو پاداشتیان بدرێتەوە، لە لایەن خوای کارزانەوە، ئەوە نەبێ کە ئەوان ئەو چوار سیفەتەیان تێدا بوون: ﴿ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾.

١ - بێبڕوا بوون بە خوا {خوایان دەناسی، بەڵام ئیمانیان بە خوا نەبوو، چونکە ئیمان بە خوا جیایە، لە خوا ناسین، ئیمان بە خوا، ئەوەیە کە بە عەقڵ دەرك بە هەموو ئەو ڕاستییانە بکەی، کە خوا فەرموونیو تێیان بگەی، پاشان بە دڵ پەسندیان بکەیو بە ڕاستیان بزانیو بۆیان ملکەچ بی، ئنجا بە زمان دانیان پێدابێنیو، دوایی بە ئەندامەکانی جەستەش جێبەجێیان بکەی}.

٢ - هەروەها بێبڕوا بوون بە ڕەوانە کراوی خواش، (کە موحەممەدە ﷺ).

٣ - وە نەدەچوونە نوێژێ، مەگەر بە قالب گرانییو بە تەنبەڵیی.

٤ - وە ماڵی خۆشیان خەرج ناکەن، مەگەر لە حاڵێکدا کە پێیان ناخۆشە، واتە: بە ناخۆشحاڵیی ماڵەکەیان دەبەخشن، بە ناچاریی، ئەگەرنا لە دڵەوە پێیان خۆش نیە، هەر کەسێکیش بە دڵ کردەوەیەك بۆ خوا نەکات، بێگومان خوای کارزان کردەوەکەی لێوەرناگرێ، واتە: پاداشتی ناداتەوە، ئەگەرنا لەوانە هەبووە کەسانێك ماڵو سامانی خۆیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نەیناسیون، وە مسوڵمانان نەیانناسیون کە ئەوانە مونافیقن، دیارە ماڵەکەیان لێوەرگرتوون، کە وەك ڕواڵەتی شەرع، لێیان وەرگیراوە، بەڵام وەك لای خوای پەنهانزانو پاداشت دانەوەیان، لە ڕۆژی دوایی دا، کردەوەکانیان لەلای خوا قبووڵو پەسند نەبوون.

ئنجا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُمْ﴾، با ماڵو سامانەکانیان، وە منداڵەکانیان تۆ سەرسام نەکات، واتە: بە چاوی سەرسوڕمانو زۆر بە گەورەو بایەخدار تەماشاکردن، سەرنجی سەروەتو سامانو منداڵو خزمو خەڵكو دەوروبەریان مەدە، با زۆریش بن، ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾﴾، بێگومان ئەو سەروەتو سامانەی کە وەسەرێکیان ناوە، وە ئەو منداڵو کوڕو کچانەی کە هەیانن، خوا ﷻ تەنیا دەیەوێ لە ژیانی دنیادا بیانکاتە مایەی سزادانیان، دەیەوێ بەو ماڵو منداڵە، سزاو ئازاریان بدات، وە ڕووحەکانیان دەربچن، لە کاتێکدا کە بێبڕوان، واتە: تاکو

بە كافرییش بمرن، یانی: ئەو ماڵو سامانە، وە ئەو منداڵو كوڕو كچانەی كە هەیانن. بە ڕەحمەت نین، مایەی سزاو جەزرەبەی دنیاو، مایەی بە كافریی مردنیانن.

ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێكی دیكەیان: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ﴾.

واتە: وە ئەوانە سوێند بە خوا دەخۆن كە لە ئێوەن، واتە: مسوڵمانو، بڕوادارن. بە جەخت كردنەوەوە سوێندتان بۆ دەخۆن، بەڵام ئەوان لە ئێوە نین.

{دیارە بە ڕواڵەت لەوان بوون، لە یەك شاردا ژیاونو، مرۆڤ بوونو، خۆیان بە مسوڵمان داناوە، بەڵام یانی: لە ڕووی ئیمانو ئیعتیقادو، لە ڕووی بەندایەتییان بۆ خواوە، لە ئێوە نین}، ئەدی بۆچی سوێند دەخۆن، كە لە ئێوەن؟

﴿وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾﴾، بەڵام ئەوانە كۆمەڵێكن زۆر دەترسێن.

(یَفْرَقُون) جیاوازیی چییە، لەگەڵ (یَخافُون)دا؟ دەڵێ: (یَفْرَقُون) بریتیە لە ترسێك كە مرۆڤ خەریك بێ، دڵی پارچە پارچە بێ، لە (فَرْق)ەوە هاتوە، كە لێك جیاكردنەوەی دوو شتە.

ئنجا خوای زاناو شارەزا بە دڵو دەروون، ترسانەكەی ئەوانمان بۆ وێنا دەكات. دەفەرموێ: ﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَـٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْاْ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾﴾، ئاشكرایە كەسێك بیەوێ خۆی بشارێتەوە، ئەگەر لە ئاوەدانییو شار بێ، دەبێ پەنایەك هەبێ، وەك قەڵایەك، كە خۆی تێدا حەشار بدات، وە ئەگەر لە چیا بێ، دەبێ كەلێنو قڵیشە شاخێك، یان ئەشكەوتێك هەبێ بچێتە نێوی، وە ئەگەر لە دەشتێ بێ، دەبێ كونو كەلەبەرێكو، شوێنێكی تەنگو تەسك هەبێ، خۆی تێپەستێ.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەوانە ئەگەر پەنایەكیان دەست بكەوێ، یان شوێنێكی بن هەڵۆڵیان دەست بكەوێ، {وە هەندێك گوتوویانە: (مغارة) واتە: ئەشكەوت. هەندێكیش دەڵێن: مەرج نیە ئەشكەوت بێ، بەڵكو (مغارة) شوێنێكی هەڵۆڵەو.

مەرج نیە سەرەکەی گیرابێ}، یاخود کونو کەلەبەرێکی تەنگەبەریان چنگ بکەوێ: کە بە تۆبزیی خۆیانی تێپەستن، ئەگەر هەر کامێك لەوانەیان دەست بکەوتایە، چییان دەکرد؟ بەرەو ڕووی دەچوون، زۆر بە خێرایی، وەك چۆن ئەسپی سەرکێش دەرواو ناگەڕێتەوە، ئاوا بە خێرایی بەرەو ئەو شوێنە دەچوون، بۆ ئەوەی خۆیانی تێدا پەنهان بکەن.

ئنجا ئایا بۆچیو لەچی دەترسان؟ دیارە لەوە دەترسان، کە عەیبو عاریان دەربکەوێ، ئەو حاڵەتی دەغەڵییو نیفاقەیان ئاشکرابێ، بۆیە ئەگەر هەر کامێك لەو شوێنانەیان دەست بکەوتایە، خۆیان تێدا حەشار دەدا.

ئنجا خوای زاناو توانا دێتە سەر هەڵوێستێکی دیکەیان، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَـٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾. وە لەوان (واتە: لە دڵ نەخۆشو موونافیقەکان) کەسانێك هەن، لە ماڵ بەخشینەکاندا (یاخود لە زەکات پێدانەکاندا)، ڕەخنەت لێ دەگرن، ئەگەر لەو ماڵی خێرو زەکاتانە، کە کۆکراونەتەوە بەشیان بدرێ، ئەوە ڕازی دەبنو پێیان خۆشە، وە ئەگەر پێیان نەدرێ، تووڕەو پەست و ناڕەحەت دەبن، ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، وە ئەگەر ئەوانە ئەوەیان پەسند کردبایە کە خوا ﷻ، وە پێغەمبەرەکەی ﷺ پێیان دەدەن، وە گوتبایان: خوامانە بەسە، لەمەودوا خوا لە بەخششی خۆی پێمان دەدا، وە پێغەمبەریش ﷺ (لەوەی لەبەر دەستیەتی) پێمان دەدا، ئێمە هەر بەرەو خوا ئارەزوو مەندین، ئارەزووومان لە پاداشتی لای خوایە، ئەو ڕزقە حەڵاڵەی کە لای خوایە، هەر چاومان لەوەیە، ئنجا وەڵام (جواب)ی (لو) لێرەدا فڕتێنراوە، واتە: ئەگەر وایان کردبایە بە تەئکید بۆ وان باشتر بوو، سەربەرزانەتر بوو، لە دنیاو دوارۆژداو، لەلای خواو خەڵکی بۆ وان باشتر بوو، نەك ئاوا چاو ببڕنە هەر تەماعێك کە دێتە دەست، بێئەوەی کە شایستەی بن،

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر شتێك کە هاتۆتە دەستی، بە تەئکید هیچ تەماعێکی خۆی تێیدا نەبووە، بەڵام بە پێی شایستەیی داوپەتی بەو خەڵکە، ئنجا دیارە ئەوانە کەسانێك بوون، کە شایستە نەبوون، بەڵام هەر چاویان تێبڕیوە.

ئنجا خوا بەم بۆنەوە، دێتە سەر باسی چۆنیەتی دابەش کردنی (صدقات)، کە بە کۆدەنگیی هەموو زانایان لێرەدا مەبەست لە (صدقات) زەکاتە، بەڵام بە تەئکید وێڕای زەکات، صەدەقەش دەگرێتەوە، کە هەر ماڵێکە ڕاستگۆیانەو دڵسۆزانەو لەبەر خوا ببەخشرێ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ﴾.

بێگومان صەدەقەکان تەنیا بۆ ئەو (هەشت) جۆرە کەسانەن: بۆ هەژاران و، نەداران و. کۆکەرەو مشوورخۆرانی ئەو صەدەقەو زەکاتانەو، دڵ ڕاگیراوان، وە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان، وە دانەوەی قەرزی قەرزداران، وە لە ڕێی خوادا، {ئنجا جەنگ و جیهادە. بانگەوازە، هێنانەدی هەر بەرژەوەندییەکە، کە دینداریی و دنیاداریی مسوڵمانان پەکیان لەسەری کەوتوە}، وە ڕێبوار.

دیارە خوای کارزانی پەروەردگار ئەوانەشی کردوون بە دوو بەش، چونکە بەشێکیان بە (ل)ی (تملیك) باسیکردوون، واتە: دەدرێ بە خۆیان، بەشێکیشیان بە (فِي) هێناونی، واتە: لەواندا خەرج دەکرێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر باسی دەکەین.

﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾، ئەوە لەلایەن خواوە پێویست کراوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾، وە خوا زانای کارزانە، زانایە کە دەبێ ئەو ماڵ و سامانە، چۆن ببەخشرێ، وە کارزانە، بە کێی دەداو چەندی پێ دەدات، بە پێی ئەو شەریعەتە کە ناردوویەتی؟!

ئنجا دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە کە بریتی بووە، لەوە کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە دڵ گەورەیی و بە لێبوردەیی بە ڕەوشت بەرزیی مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، لەبەرئەوەی کە ناخی خۆیان پیس بووە، موخەننەت و خراپەکار بوون، ئەو جوامێریی و

دڵ گەورەیی و لێبوردەییەی پێغەمبەریان ﷺ بە شێوەیەکی خراپ وەسف کردوە، ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ﴾، وە لەو دەغەڵ و مونافیق و دڵنەخۆشانە هەیە کە ئازاری دڵی پێغەمبەر ﷺ دەدەن، بەهۆی چییەوە؟

یەکێك لە ئازارەکان ئەوە بوو دەیانگوت: ئەو هەر گوێیە، ئەوە لە زمانی عەرەبییدا هەیەو، لە کوردییشدا هەیە، دەگوترێ: (فلان کەس هەر گوێیە)، (أذن) ئەندام (جارحة)یە، تۆ کە کەسێکت بە گوێ چواند، واتە: ئەو کەسە زۆر زێدەڕۆیی دەکات، لەوەدا کە هەموو شتێك دەبیستێ، گوتوویانە: موحەممەد ﷺ هەر قسەیەکی بۆ بکرێ، دەیبیستێ، مەبەستیان ئەوە بوو کە گوێ پێنادات، چەندی ڕاستەو چەندی درۆیە، دیارە ئەوان وای لێ حاڵی بوون و، وایان خەیاڵ کردوە، کە لە ڕاستییدا وا نەبووە، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر زێدە ڕەوشت بەرزیی و ڕەوشت جوانیی و سینگ فراوانیی و جوامێریی خۆی، گوێی بۆ هەموو کەسێك گرتوە، ئەگەرنا بێگومان هەموو کەسی بە ڕاست نەزانیوە.

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ﴾، تۆ بڵێ: {پێغەمبەر ﷺ گوێی چاکەیە بۆ ئێوە، {واتە: تەنیا چاکەکەتان لێوەردەگرێ}، بڕوای بە خوا هەیەو، بڕوادارانیش بە ڕاست دەزانێ، وە بەزەیی خوایە بۆ ئەوانەتان کە بڕوا دێنن.

چونکە ئەوانەی کە بڕوادار نین، بەهرەمەند نابن لە ڕەحمەت و بەزەیی خواو، لە پێغەمبەری خاتەم، چونکە ڕێزی ناگرن و بڕوای پێ ناهێنن، بەڵکو لەجیاتی ئەوە ئازاری دەدەن، ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾، وە بێگومان ئەوانەی ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، ئازارێکی بە ئێش و ژانیان بۆ هەیە، چاوەڕێیان دەکات لە دۆزەخدا.

ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی دیکەیان، دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ ﴾، سوێند بە خوا دەخۆن بۆ ئێوە، تاکو ڕازییتان بکەن، بۆ وێنە:

گوتوویانە: ئێمەش دڵسۆزین، ئێمەش بە تەنگ ئیسلامەوەین، ئێمەش بڕوامان بە قورئانە، ئێمەش وەك ئێوەین، ئاوا بە پێی مەقام، ئەم جۆرە سوێندانەیان خواردوە.

﴿وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ٦٣﴾، بەڵام خواو پێغەمبەری خوا ﷺ شایستەتر بوون، کە ڕازییان بکەن، ئەگەر بڕوادار بوونایە. واتە: ئەگەر بڕوادار بوونایەو، ئاوا دڵسۆز بوونایە، دەبوایە لەگەڵ خوادا ڕاستیان کردبایە، بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ هێنابایە، ئەو کاتە ئەو سوێندە درۆیەی بۆ ئێوەیان خواردوە، لە کۆڵیان دەبۆوە!

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدٗا فِيهَاۚ﴾، ئایا نازانن، (دەبوو زانیبایان) کە هەر کەسێك دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، ئەوە بێگومان ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، ئنجا کەسێك نەبێتە خاوەنی هیچ شتێك، تەنیا ببێتە خاوەنی ئاگری دۆزەخ، کە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ ٦٣﴾، ئا ئەوە زەبوونیی و سەرشۆڕییەکی مەزنە، کە لە دوارۆژدا دێتە سەریان.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم**: كە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾.

وە لەوان كەسی وا هەیە، {بە پێی سیاق دەزانرێ، كە مەبەست لەوان: دەغەڵو مونافیقەكانە}، دەڵێ: مۆڵەتم بدەو تووشی فیتنەم مەكە، ئاگاداربن! ئەوانە كەوتوونە نێو فیتنەوە.

واتە: نەك هەر خۆیان بپارێزن كە تووشی فیتنە نەبن، بەڵكو هەر كەوتوونە نێو چاڵی فیتنەوە، دیارە وشەی (فتنة) ـ وەك جاری دیكەش باسمان كردوە ـ لە قورئاندا بە پێی ئەو سیاقەی كە تێیدا هاتوە، ماناكەی دیاریی دەكرێ، ئەگەرنا ئەسڵی وشەی (فتنة) لە (فتن)ەوە هاتوە، (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (أصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَّهَبِ النَّار، لِتَظْهَرَ جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ).

واتە: ئەسڵی وشەی (فِتنَة) لە (فَتْن)ەوە هاتوە، (فَتْن)یش ئەوەیە زێڕ بخەیە نێو ئاگر، بۆ ئەوەی چاك وخراپی لەیەك جیابێتەوە.

دوایی (فِتنَة) بە مانای هەر تاقیكردنەوەیەك هاتوە، دوایی بە مانای ئەنجامی تاقیكردنەوەكە هاتوە، وە هەندێك لە زانایان بە: كوفرو شیركیان لێكداوەتەوە، وە هەندێك بە: گوناهیان لێكداوەتەوە، لێرەدا زیاتر وا پێدەچێ مانای گوناح بگەیەنێ، كە دەڵێ: ﴿ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ﴾، مۆڵەتم بدە، با نەیەم بۆ جەنگو جیهاد، وە تووشی گوناهم مەكە، وە دوایی كە دەفەرموێ: ئەوان كەوتوونە نێو گوناهەوە، نەك هەر بترسێن كە تووشی ببن، بەڵكو هەر كەوتوونە نێو گوناهو تێیدا نوقم بوو ون، كە ئەمە سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١ ـ هەندێك لەو دەغەڵانە گوتوویانە: ئەگەر ئێمە بێینە دەر بۆ جەنگو جیهاد، بەهۆی هاتنمان بۆ جەنگو جیهادەوە، وامان لێدێ دڵمان هەر لە لای ماڵو منداڵمان بێو تووشی نارەحەتیی بین، کەواتە: بەهۆی دوورییمان لە ماڵو منداڵو خزمو کەسمانەوەو، بەهۆی جێهێشتنی نیشتیمانمانەوە تووشی گرفتارییمان مەکە!

٢ ـ واتە: مۆڵەتمان بدە، چونکە تۆ مۆڵەتمان بدەی یان نەدەی، ئێمە هەر نایەین. ئنجا کە مۆڵەتمان نەدەی، مانای وایە ئێمە دەکەوینە نێو گوناهەوە، چونکە تۆ مۆڵەتیشمان نەدەی، هەر نایەین، ئنجا کە سەر پێچییشمان کرد، تووشی گوناح دەبین، بۆیە تۆ تووشی گوناهمان مەکەو، داوامان لێ مەکە، بێینو وازمان لێ بێنە، با بۆخۆمان دابنیشین.

٣ ـ لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشیدا باسمان کرد: کەسێك هەبوو لە سەرانی ئەهلی نیفاق، بە ناوی جەددی کوڕی قەیس، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی جەدد! ئامادەی بێی بۆ جەنگ کردن، لە دژی بەنی ئەصفەر؟

ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! مۆڵەتم دەدەی نەیەم، من پیاوێکم ژنە زۆر خۆشدەوێن، مەترسییم هەیە کە ئافرەتانی بەنی ئەصفەرم بینین، تووشی گوناهێ ببم {بیانوو هێنانەوەیەکی چەند ساردو سڕو بێ تامەو ڕووی مەجلیسی نیە} پێغەمبەری خواش بە ڕوو لێومرگێڕانەوە فەرمووی: ئەوە مۆڵەتم دای. ئنجا بەم بۆنەوە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

هەڵبەتە لە یەك کاتدا هەر سێکیشیان دەگرێتەوە، چونکە لە ئایەتەکەدا هیچی دیاریی نەکردوە، وە هۆی هاتنە خوارەوە، جاری وایە یەکێك لە چەمکەکانی ئەو ئایەتە دەگەیەنێو، مەرج نیە تەواوی ماناکەی ڕۆشن بێ، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا.

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئاگادار بن! ئێوە کەوتوونە نێو فیتنە، واتە: کەوتوونە نێو

بەڵاو گرفتاریی‌و ئازارو مەینەتیی، ئنجا دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ: کە ئەوانە کەوتوونە نێو فیتنەی شیرك‌و نیفاقەوە، یاخود پێش ئەو هەڵوێستەشیان، ئەوانە هەر لە چاڵی شیرك‌و نیفاقدا بوون، یاخود کەوتوونە نێو فیتنەی ناوو ناوبلنگی خراپ‌و ئابڕووچوونیان، چونکە خەڵك هەموویان دەزانن کە ئەوانە درۆ دەکەن‌و، ئەو بڕوبیانووانەی کە دەیانهێننەوە، هەر مەبەستیان نەچوونە بۆ جەنگ‌و جیهاد، ئەگەرنا ڕاست ناکەن.

ئنجا کە ئەوە هەڵوێستیان بوو، خەڵك دەیانبوغزێنێ‌و، نەفرینیان لێ دەکات‌و، دووریيان لێ دەکات.

کەواتە: ئەوەی لێی ترساون، هەر هاتۆتە دی، بەڵێ لە نێو ماڵ‌و منداڵی خۆیاندا دانیشتوون، بەڵام لە نێو کۆمەڵگادا بوونەتە کەسانێکی بوغزێنراوو نەفرین لێکراوو ناپەسند.

ئنجا لێرەدا خوای بێ‌نیاز، دوو شتی بۆ فەرموو ون:

١) ﴿أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا﴾، واتە: لە دنیادا ئەوانە کەوتوونە نێو فیتنەوە، کە بریتیە لەو سزاو ئازارەی دنیایی، کە لەو شتانەدا بەرجەستە دەبێ، کە باسمان کردن، بەتایبەت ناوزڕان‌و سومعە چوون‌و سووك بوون، لەلای خەڵك‌و، نیشانەی پرسیار لەسەر دانرانیان، کە بێگومان ئەوە جۆرێکە لە سزاو ئازار، وە ئەو ئایەتانەیان لەسەر هاتوونە خوار، کە بێگومان ئەو کاتە هاوەڵانی بەڕێز، بگرە ڕەنگە ژن‌و منداڵەکانیشیان، زانیبیان: فلان موونافیق کام ئایەتە دەیگرێتەوە؟ فلان موونافیق کام ئایەتە دەیگرێتەوە؟ کە ئەوەش عەیبەیەکی گەورەیە، بەسەریان هاتوە، وەك چۆن ئێمەش ئێستا ئەگەر باش لە قورئان تێبگەین‌و، چاك سەرنجی کۆمەڵگاکەی خۆمان بدەین‌و تەماشای کەسایەتییەکان بکەین، تەماشای لایەن‌و پێکهاتەکان بکەین، دەتوانین بڵێین: ئەم ئایەتە فلانە کەس دەگرێتەوە، ئەم ئایەتە فلان هەڵوێست‌و فلان ڕەفتارەی فلان کەس دەگرێتەوە.

٢) بە نسبەت سزای دوارۆژیشیانەوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾، بێگومان دۆزەخ دەورە دەری کافرانە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟ وَّهُمْ فَرِحُونَ ۝٥٠ ﴾.

ئەگەر تۆ چاکەیەك و خۆشییەکت تووش بێ، ئەوان ناڕەحەت دەکات، وە ئەگەر بەڵایەکت بەسەربێ، ئەوان دەڵێن: ئێمە پێشتر وریایی خۆمان وەرگرتبوو. دووربینییمان لە کاری خۆمان دا کردبوو، وە پشتتان تێدەکەن و دەڕۆن و زۆر شادمان و خۆشحاڵیشن.

(حسنة) لێرەدا بریتیە لە هەر پێشهاتێك کە بۆ هەر کەسێك بێتە پێشێ و پێی خۆشبێ و بۆی چاك بێ، کە لێرە مەبەست پێی سەرکەوتن و دەستکەوتە.

(مصيبة)یش لە (أصابَ)ەوە هاتوە، (أصابَ) واتە: تووشی بوو، بەسەری هات. پێی کەوت، کە لە زماندا تایبەت کراوە بەو شتەوە، کە بەسەر ئینساندا دێ و پێی ناڕەحەت دەبێ.

دەربارەی وشەی (أَمْر) کە دەفەرموێ: ﴿يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ ﴾، دەڵێ: (الأَمْرُ: الحال المُهِمُّ صَاحِبَه).

(أَمْر) بریتیە لە هەر حاڵێك شتێك کە خاوەنەکەی گرنگیی پێدەدات، دیارە وشەی (أَمْر) نەزانراو (مُبْهَم)ە، ماناکەی دیار نیەو، زۆر شت دەگرێتەوە، دەڵێن کاری خۆمان بە وریایی گرتبوو، واتە: ئێمە پێشتر خۆمان بۆ ئەو کارە ئامادە کردبوو، دووربینییمان کرد، بۆیە تووشی ئەم بەڵایە نەبووین!

پێیان وا بووە، ئەگەر بچن بۆ جەنگ و جیهاد، ئنجا چ بریندار بن، چ بکوژرێن، چ ماڵ و سامان سەرف بکەن، چ تووشی ئازار ببن، پێیان بەڵا بووە گوتوویانە: ئێمە هێندە عاقڵ بووین، دووربینییمان کردوەو تووشی ئەم بەڵایە نەبووین!

هەڵبەتە ئێستاش لە نێو موسوڵمانانیدا کەسانێك هەن، کە کاتێك موسوڵمانێك تووشی گرتن دێ، تووشی ئازار دێ، تووشی نان بڕان دێ، تووشی گوزران و بریندار بوون و، کۆچ و کۆچبار دێ، لەسەر خوا، دەڵێن: دەبا هەڵیگرێتەوە، بۆ خۆی عاقڵ نەبوو! پێیان وایە عاقڵ ئەو کەسەیە کە هەمیشە لای سەلامەتیی بگرێ، نازانن کە عاقڵ ئەو کەسەیە کە لەگەڵ شەریعەتی خوادا بێ، عاقڵ ئەو کەسەیە کە لەگەڵ بەرژەوەندیی ئیسلام و موسوڵمانان دابێ، با لەسەر ئەو بەرژەوەندییە تووشی ناڕەحەتییش ببێ، ئەگەرنا عەقڵی سەلامەتیی، هەموو کەس دەیزانێ و دەیتوانێ، بەڵام بە دڵنیایی ئەوە عاقڵیی نیە، عاقڵیی ئەوەیە کە تۆ فەرمانی خوا جێبەجێ بکەی و، بەندایەتیی خۆت بۆ خوا، لە ژیانی دنیادا، بەرجەستە بکەی.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾.

بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: تۆ پێیان بڵێ: بێگومان تووشمان نایەت و، بەسەرمان نایەت، مەگەر ئەوەی خوا بۆی نووسیووین، وە خوا سەرپەرشتیاری ئێمەیە.

کەواتە: ئەو هەر شتێکی بۆ بڕیار دابێن و بەسەرمان بێ، دیارە لە خێرو بەرژەوەندیی ئێمە دایە، با ناخۆشیش بێ، بە ڕواڵەت، وە با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن.

دیارە وشەی (لَنْ) بۆ جەخت کردنەوەیە، واتە: هەرگیز، کەواتە: ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴾، یانی: هەرگیز تووشمان نایەت، مەگەر ئەوەی خوا بۆی نووسیووین، واتە: هەر شتێکمان بەسەردێ، دیارە پێشتر ئەوە لە زانیاریی خوادا هەبووە، وە بڕیاری خوای لەسەر بووە.

وشەی (مولى) بە مانای سەرپەرشتیار دێ، وە بە مانای مشوورخۆر دێ، وە بە مانای نیزیك دێ، وە بە مانای خۆشەویست (محِبّ) دێ، ئنجا مادام خواش سەرپەرشتیارو دۆست و نیزیك و خۆشەویستی ئێمە بێ، دیارە هەر شتێك لە لای ئەوەوە بۆ ئێمە بێ، بۆ ئێمە خێرو خۆشیی و قازانجە، ئەگەر چی لە دنیادا،

ناخۆشیی‌و ئازاریشی تێدابێ، بەڵام لە دواڕۆژدا هەمووی پاداشتە، واتە: ئێمە دەربەست نین، لەم دنیایەدا هەر شتێکمان بەسەربێ: بە زانیاریی خوایەو، بە بڕیاری خوایە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ١١﴾محمد، واتە: خوا سەرپەشتیارو دۆستو نیزیكو خۆشەویستی بڕوادارانەو، ئەوانەی بێبڕوان، هیچ سەرپەرشتیارێکیان نیە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، وە با بڕواداران جگە لە خوا پشت بە کەسی دیکە(و بە هیچ شتێکی دیکە) نەبەستن، با پشتیان تەنیا بە خوا قایم بێ، خوایەك کە بەو جۆرە بۆ بڕواداران، ئەوەی کە لە بەرژەوەندیی دواڕۆژیان دا نەبێ، بەسەریان ناهێنێ، چونکە لە دۆست و چاوەڕوان دەکرێ، جگە لە چاکە، بەسەر دۆستەکەی نەهێنێ!

بەڵام بێگومان چەمکی چاکەو خۆشیی‌و بەختەوەریی، لە ڕوانگەی ئیماندارەوە ئەوەنیە کە هەمیشە لە ئیسراحەتو خۆشیی دابێ، بۆ وێنە: شەهیدیی، کە دوای پێغەمبەرایەتیی‌و زۆرڕاستیی (صديقية) بەرزترین پلەیە، دیارە بەهۆی جەنگو جیهادەوە، بەدەست دێ، وە خوای بەرزیش ناوی لێناوە: هەڵبژاردن، وەك دەفەرموێ: ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَ ١٤٠﴾آل عمران، خوا دەیەوێ شەهیدانتان لە نێودا هەڵبژێرێ، کە دیارە بە هۆی جەنگو جیهادو گیان فیداییشەوە، ئەو پلە بە دەست دێ.

کەواتە: کوژران لە ڕێی خوادا، وەك ڕواڵەتی دنیایی ناخۆشە، بەڵام لەلای خوای پەروەردگارو، بە تەرازووو پێوەری قیامەت، پلەیەکی زۆر گەورەیە.

<u>مەسەلەی چوارەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ٥٢﴾.

بڵێ: ئایا جگە لە یەکێك لە دوو شتە هەرە چاکەکان، چی دیکە لە ئێمە چاوەڕێ دەکەن، کە بەسەرمان بێ، وە ئێمەش بۆ ئێوە چاوەڕێ دەکەین: کە یان خوا لەلایەن خۆیەوە، ئازارو سزاتان بۆ بنێرێ، یاخود بە دەستی ئێمە، {دوای ئەوەی کە کوفرەکەتان ئاشکرا دەکەن‌و، دژایەتیی ئیسلام‌و مسوڵمانان دەکەن، مسوڵمانانیش سزاتان دەدەن} ، ئێوە چاوەڕێ بن، وە ئێمەش چاوەڕێین، واتە: ئێوە چاوەڕێ بن، بزانن ئێمە چیمان بەسەر دێ؟ کە یەکێك لەو دوو شتە چاکانەیە، ئێمەش چاوەڕێ دەبین بزانین ئێوە چیتان بەسەر دێ؟ کە بە تەئکید یەکێك لەو دوو شتە خراپانەیە.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ ﴾، بڵێ: ئایا چی لە ئێمە چاوەڕێ دەکەن، دەڵێ: (الإستفهامُ: هُنا مُستَعمل فـي النفي وهو توبيخ) واتە: لێرەدا پرسیارکردنەکە بەمانای لابردن (نفي) بەکارهێنراوە، بەڵام مانای سەرزەنشتکردنە، بەچی دەزانین؟

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوەی لەگەڵ هەڵاواردن (إستثناء)دا هاتوە وە مەبەست پێی سەرزەنشت کردنیانە، ﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ﴾، بڵێ: ئایا چی لە ئێمە چاوەڕێ دەکەن، چییمان بۆ چاوەڕێ دەکەن، جگە لە یەکێك لە دوو شتە هەرە چاکەکان؟!.

دەڵێ: (التَّرَبّص: إنْتظَار حصُولُ شَيءٍ مَرْغُوبٌ حصُوله، وَأَكْثَر اسْتعْمَاله، أَنْ يَكُون انْتِظَارَ حصُول شيء لغَيْرِ المُنْتَظِر).

(تَرَبّص) بریتیە لە چاوەڕێ کردنی شتێکی ویستراوو ئارەزووکراو کە پەیدابێ، بەڵام بە زۆریی بۆ ئەوە بەکاردێ، کە لایەنێك چاوەڕێ بێ بەرانبەرەکەی شتەکەی بۆ بێتە پێش، نەك خۆی.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ﴾، دیارە (إِحْدَى) (مُؤَنَّث)ی (أَحَد)ە، وە (حُسْنَى)ش (مُؤَنَّث)ی (أَحْسَن)ە، (أَحْسَن)، واتە: هەرەباش، باشترین، (حُسْنَى)ش، هەر بە مانای هەرەباش دێ، بەڵام بە باری مێینەی مەجازیی دا، لە جیاتی بفەرموێ:

(واحد الحسنين، أو أحد الحسنين)، فەرموویەتی: (إحدى الحُسنيين)، ئەگەر بە (مذكّر) بووایە، وای دەفەرموو.

زۆربەی توێژەروانی قورئان گوتوویانە: ئەو دوو شتە هەرەباشە بریتین لە: سەرکەوتن‌و شەهید بوون (النصر والشهادة).

هەڵبەتە لە ئایەتەکەدا دیاریی نەکراوە، کە ئەو دوو شتە هەرە باشە چین؟

بۆیە دەگونجێ ئەو دوو شتانە بن، وە دەگونجێ دوو شتی دیکە بن، دەشگونجێ یەکێ لەو دوو شتانەو، شتێکی دیکە بێ، گرنگ ئەوەیە ئینسانی بڕوادار، هەمیشە لە نێوان دوو شتی هەرەباش دایە، هەرگیز لە نێوان قازانج‌و زەرەردا نیە، بەڵکو لە نێوان چاك‌و چاکتردایە، یاخود لە نێوان چاکترو چاکتر دایە، مادام لەسەر ڕێی خوابێ، بەتایبەتی لە جەنگ جیهاددا گوتوویانە: یان سەردەکەوین‌و دەستکەوت بەدەست دێنین، یان شەهید دەبین‌و بەهەشت بەدەست دێنین، بۆیە زانایان وایان لێکداوەتەوە، ئەگەرنا ئایەتەکە دیاریی نەکردوون، وە لە ڕاستییشدا ئەو دوو شتە زۆر چاکن، یەك لە یەکدی چاکترن: بۆ دنیا ئەگەر مسوڵمانان سەربکەون‌و دەستەڵاتیان هەبێ بەسەر ئەهلی کوفرداو نەهێڵن زوڵم‌و ستەم بکەن‌و خراپەکاریی بکەن، ئەوە شتێکی زۆر باشە.

وە بۆ دوارۆژیش بێگومان باشترین شتێك کە ئینسان پێی بچێتەوە خزمەتی خوای پەروەردگار، ئەوەیە کە بە بەرگی سوورەوە بچێتەوە خزمەت خوای باڵادەست‌و، بڵێ: خوایە! ئەوە من سەلماندم کە تۆو دینی تۆم، لە خۆم‌و لە ژیانی خۆم، خۆشتر ویستوە، ئەوەش بەڵگە کە من لە ڕێی تۆدا خوێنی خۆم ڕشتوەو ژیانی خۆم بەخشیوە، بۆ قیامەت هیچ شتێك لەوە باشتر نیە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا﴾، {ئێوە یەکێك لە دوو شتە هەرە چاکەکان بۆ ئێمە چاوەڕێ دەکەن}، ئێمەش لە بەرانبەردا یەکێك لە دوو شتە هەرە خراپەکان بۆ ئێوە چاوەڕێ دەکەین: کە خوا تووشی سزاو ئازارێکتان بکات لەلایەن خۆیەوە، یان بەدەستی ئێمە، سزاتان بدات، دیارە بەدەستی ئیمانداران، دوای ئەوەی کوفرەکەیان

ئاشکرا دەکەن، وە سەنگەر لە ئیسلام دەگرن‌و، بە ئاشکرا دژایەتیی ئیسلام‌و مسوڵمانان دەکەن، ئەوکاتە مسوڵمانان دەستیان کراوە دەبێ، لە بەرانبەریاندا، ئەگەرنا موناڧیقەکان تاکو لە حاڵەتی نیفاقدا بوون، بە پێی سوننەت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر موداراى لەگەڵدا کردوون، بەڵام بەتەئکید ئەوکاتەش هەر لە سزاو ئازاری دەروونیی دا بوون، چونکە هەر لە حاڵەتی ترس‌و بیم دا ژیاون، کەی ئاشکرا دەبن؟ کەی بە درۆ دەخرێنەوە؟ کەی نیفاقەکەیان دەردەکەوێ؟ هەمیشە لە حاڵەتی ترس دابوون، کە ئەوەش ئازارێکی دەروونیی زۆری لە دڵ دا دروست کردوون.

لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴾.

دەجا چاوەڕێ بن: ئێمە لەو دوو شتە هەرە چاکە کامیانمان بەسەردێ؟ ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانین، کە ئێوەش لەو بەڵاو سزایانە، کامیانتان بەسەردێ؟

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ۝٥٣ وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ۝٥٤ ﴾.

پێیان بڵێ: سامان‌و ماڵەکانی خۆتان خەرج بکەن، بە خۆشحاڵیی یان بە ناخۆشحاڵیی، بە پێخۆشبوون، یان بە پێناخۆشبوون، (بە هەر جۆرێك ماڵەکەی خۆتان ببەخشن)، لێتان وەرناگیرێ، (واتە: خوا پاداشتتان ناداتەوە)، چونکە بێگومان ئێوە کۆمەڵێکی لادەرن.

لێرەدا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کە دەفەرموێ: ﴿ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا ﴾، بە خۆشحاڵیی، یان بە ناخۆشحاڵیی، واتە: لەو دوو حاڵەتەدا: چ بە قالب سووکیی‌و بە دڵخۆشیی، بەڵام کە بە دڵخۆشییش دەبەخشن، مەبەستیان پێ خوا نیە، مەبەستیان ئەوە بووە کە مسوڵمانان باوەڕ(ثقة)یان پێ بکەن، وە چ بە قالب گرانیی‌و ناخۆشحاڵیی، لەو ڕووەوە کە ماڵ‌و سامانەکەیان بێ بەرانبەر بەخشیوە.

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا﴾، واتە: هەر ئەو دوو حاڵەتە نا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بە هەر جۆرێك لە جۆرەکان ماڵو سامانی خۆتان ببەخشن، هەر لێتان وەرناگیرێ، ئەویش لەبەرئەوەی ئێوە کۆمەڵێکی لارێن، لە شەرعی خوا لاتان داوە، بگرە لە عەقڵو فیطرەتو عیلمو لە هەموو شتێکی باش، لاتان داوە.

دوایی خوای کاربەجێ لە ئایەتی دوای ئەودا، ڕوونی دەکاتەوە، بۆئەوەی خەڵکانێك وا نەزانن: کە خوا هەر لەخۆوە لەو مونافیقانە هەڵدەپێچێ، ئەگەر هەرچی چاکەشە بیکەن، لێیان وەرناگرێ! دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴾.

وە هیچ شتێك ڕێگر نەبوو، کە ماڵ خەرج کردنەکانیان لێوەرنەگیرێ، {واتە: لەلایەن خوای بەخشەرەوە پاداشتیان نەدرێتەوە}، مەگەر ئەوە کە ئەوانە کەسانێکن بێبڕوا بوون بە خوا، وە بە پێغەمبەرەکەی، وە بە تەنبەڵیی نەبێ نوێژ ناکەن، وە ماڵی خۆشیان نابەخشن، مەگەر بە ناخۆشحاڵیی.

بناغەی ئیمان، ئیمانە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، وە بناغەی کردەوە چاکەکانیش، بریتیە لە نوێژو زەکاتو ماڵ بەخشین، ئنجا ئەو مونافیقانە، هیچ کام لەو چوارانەیان بەوجۆرەی شەریعەت گوتوویەتی، تێدا نەبوون، کەواتە: شتێکیان نەبووە، سوودیان پێ بگەیەنێ، بۆیە کردەوە چاکەکانیان لێ وەرنەگیراون.

خوای پەروەردگار دەربارەی ئەوە، کە تەنیا چاکە لە پارێزکاران وەردەگری، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧﴾ المائدة.

واتە: بێگومان خوا تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ، واتە: ماڵ بەخشینو کردەوەی باش، تەنیا لەوان قبووڵ دەکات.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَقْبَلُ مِنَ العَمَلِ إلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ﴾، {أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، برقم: (٣١٤٠)، وَالطَّبَرَانِيُّ

فِي (الكبيـر)، بـرقم: (٧٦٢٨)، قَال الحـافظ فِي (الفتـح): إِسْنَـادُهُ جَيِّـد، قَـالَ الشيخ الألبانـي: حَسَنٌ صَحِيح).

واتـە: بێگومان خـوا هیچ کـردەوەیـەك وەرناگرێ، مەگەر بە سـاغیی بۆ وی بـێ، وە تەنیـا مەبەستیش پێی ڕووی خـوا بێ، واتـە: بیـەوێ ڕەزامەندیی خـوای تـاكو پاکـی پـێ وەدەسـتبێنـێ.

واتە: لێرەدا خوای بەرز، حیکمەتو هۆکاری ئەوە کە کردەوەکانیان لێوەرنـاگـرێ، لەوەدا کورت هـەڵدێنـێ، کە ئـەوانە: نە ئیمـانو عەقیدەیـەکی چاکیـان هـەبووە، نـە طـاعـەتێکی واشیان هەبووە، کە شایستـەی وەرگیـران بـێ.

<u>مەسەلـەی شەشـەم</u>: کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

{ئەی پێغـەمبەر ! وە هەر کەسێك کە مامەڵە دەکات، لەگەڵ مونـافیـقو دەغـەڵو دڵنەخۆشەکان}، تۆ سەرسام مەبە بە ماڵو سامانەکانیانو منداڵەکانیان، چونکە خوا دەیەوێ لە ژیانی دنیایاندا، بەهۆی ئەو ماڵو سـامانو منداڵانەیانەوە، سـزایان بـدات.

(إعجـاب) بریتیە لـەوە کە شتێکت پـێ زۆر چاك بـێو، سـەرت لێی سوور بمێنـێ، وە دڵخۆشبی بە بینینی، بۆیـە خـوای بـێ وێنـە لـە سـووڕەتی مائیـدەدا دەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

واتـە: بڵێ: پیسو پاك وەك یەك نین، هەرچەندە زۆریی پیس، تۆ سـەرسـام بکات.

کە دەفەرموێ: پێـی سـەرسـام مەبـە، واتـە: بەو چـاوە تـەماشـای مەکـە، کـە زۆرت پـێ گەورەو جێی بایـەخ بـێ.

دوایـی کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، بێگومان خـوا بـەس دەیـەوێ، لـە ژیـانی دنیـادا ئـەوانـە ئـازار بدات، بەهـۆی ئـەو سـەروەتو سامانو منـداڵانەیـانەوە، یـانی چـی؟

یانی: کەسابەت دەکەنو، بە زەحمەت ئەو پارەو سامانە بەدەست دێنن، ئنجا پاراستنی ئەو سامانە، وە گەشە پێدانی ئەو سەروەتو سامانە، دیارە هەموو ئەوانە نارەحەتییو ئارەقە ڕشتنو، ماندووبوونی دەوێ، یان بەلای کەمەوە قۆڵ بڕینی خەڵكو دزییو جەردەییو ڕێگرییو حەرام خۆرییو ئابڕووچوونی دەوێ، ئنجا منداڵیش بە هەمان شێوە: کەسێ کە ماڵو منداڵی زۆربێ، ئەویش بە هەمان شێوە تووشی نارەحەتییو زەحمەتییو ماندوو بوون دەبێ، بەهۆیانەوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەمە واتایەکەیەتی، کە ڕوونمان کردەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴾، یانی: وە خوا دەیەوێ، کە ئەوانە بە کافرێتیی ڕووحەکانیان، گیانەکانیان دەربچن، لە جەستەیان.

وشەی (زَهق) بریتیە لە دەرچوونی ڕووح بە سەختیی، وە بە تەنگییو نارەحتیی.

کەواتە: ئەو ماڵو سامانە، وە ئەو منداڵانەیان لە دنیادا، مایەی مەینەتییو گرفتارییو دەردەسەرییانن، وە سەرەنجامیش گیانەکەشیان بە کافریی دەردەچێ، بەهۆی ئەو کوفرەوە کە لەسەری دەمرن، مانای وایە نە دنیاین هەیە، نە قیامەت. کەواتە: تۆ پێیان سەرسام مەبە: بەو سەروەتو سامانو، بەو ماڵو منداڵەیان، کە دەیبینی.

<u>مەسەلەی حەوتەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾.

سوێندتان بۆ دەخۆن: لە ئێوەن، وە بە دڵنیایی ئەوان لە ئێوە نین، بەڵام ئەوان کۆمەڵێکن زۆر دەترسێن، ئەگەر پەنایەك، یاخود شوێنێکی هەڵۆل، یاخود شوێنێکی تەنگەبەریان دەست بکەوێ، ئەوە زۆر بە خێرایی بەرەو ڕووی دەچن، {وەك ئەسپی تێر جۆ، کە هەر دەڕواتو ناگەڕێتەوە}.

خوای پەروەردگار لێرەدا سێ سیفەتیان لێ هەڵدەدات:

١) سوێندی درۆ بە خوا دەخۆن.

٢) وە بە درۆ ستایشی خۆیان دەکەن.

٣) کۆمەڵێکن زۆر دەترسێن.

(يَفْرَقُونَ ) واتە: ئەوەندە دەترسێن، خەریکە دڵیان پارچە پارچە ببێ.

ئنجا خوای زاناو کارزان چۆنیەتی ترسەکەیان ڕوون دەکاتەوەو، دەفەرموێ:

﴿ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَـٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، ئەگەر هەر پەناگەیەکیان دەست بکەوێ، یان شوێنێکی بن هەڵۆڵی فراوان، یان شوێنێك کە زۆر بە زەحمەت تێی بچن، لەبەر تەنگەبەریی: ﴿لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴾، واتە: ئەوە بە خێرایی بۆی دەچوون، لە حاڵێکدا وەك ئەسپی سەرکێش، ڕایان دەکرد! چونکە ئەسپ کە بۆ خاوەنەکەی دەستەمۆ نابێ‌و ڕاناوەستێ، پێی دەگوترێ: حاڵەتی (جموح)ی هەیە، کە پێم وایە (چەمووش) لە زمانی کوردییدا لەوەوە هاتوە.

(محمد رشيد رضا) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆی (تفسير القرآن الحكيم)[1]دا، دەڵێ: واتە: ئەوانە لەبەرئەوەی کە زۆر پێیان ناخۆش بوو، بچن بۆ جەنگ‌و جیهاد، وە پێیان ناخۆش بوو لەگەڵ ئێوەدابن، وە دەشترسان کە نیفاقەکەیان دەربکەوێ، خۆزگەیان دەخواست کە لە دەستتان ڕابکەن، وە لە شوێنێکی تەنگەبەر لە زەویدا بژین، لە ترسی تۆڵەو سزادانی ئێوە، دوای ئەوەی کە کوفرەکەیان ئاشکرا دەبێ.

<u>مەسەلەی هەشتەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ

---

١) ج ١٠، ص ٤٣٢ .

رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

وە لەو مونافیقو دەغەڵانە کەسانێك هەن، کە دەربارەی ئەو زەکاتو صەدەقەو چاکانەی کە کۆدەکرێنەوە، {پێغەمبەری خوا ﷺ، وە دەستەڵاتی شەرعیی دابەشیان دەکات} ڕەخنەت لێ دەگرنو، عەیبت لێ دەگرن، ئنجا ئەگەر لەو خێرو چاکەو زەکاتانە بەشیان بدرێ، ئەوە ڕازیی دەبن، بەڵام ئەگەر بەشیان نەدرێ، ئەوە هەمیشە پرتەو بۆڵەیانەو تووڕەو پەستن.

شایانی باسە کە: وشەی (لَمْز) چاوگە بۆ وشەی (لَمَزَ)، (لَمَزَهُ) واتە: (عَابَهُ) واتە: ڕەخنەی لێگرت، تانەی لێدا، بە شێوەیەکی گشتی، واتە: لەبەرەو ڕوو، یان لە پاشەملە، بەڵام (هَمَزَهُ) واتە: ڕەخنەی لێگرتو عەیبی لێگرت، بەڵام لە پاشە ملە، مەبەستی ئەوەیە کە لەو مونافیقانە کەسانێك هەن، کە عەیبت لێ دەگرنو تانەت لێدەدەن، لە دابەشکردنیماڵی زەکاتو ماڵە بەخشراوەکان دا، پێیان وایە کە تۆ لایەنگیریی تێدا دەکەی.

ئنجا ئەگەر لەو ماڵانە پێیان ببەخشرێ، ڕازی دەبن، واتە: بە هەق یان بە ناهەق، شایستە بن، یان شایستە نەبن، مادام بەشیان بدرێ، ڕازی دەبن، بەڵام: ﴿وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ﴾، وە ئەگەر بەشیان نەدرێ، لەو ماڵو سامانەدا، ئەوە هەردەم تووڕە دەبن.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ ﴾، بەشێوەی ڕابردوو (ماضِي) فەرموویەتی، واتە: تەنیا لە کاتێکدا کە پێیان دەدرێ، ڕازی دەبن. واتە: هەر ئەو جارە ڕازی دەبن، کە پێیان دەدرێ، مەرج نیە ڕازی بوونەکەیان بەردەوام بێ، ئەدی کە پێیان نادرێ؟

دەفەرموێ: ﴿وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ﴾، بە ئێستاو بەردەوام (مضارع)ی هێناوە، واتە: هەر کە پێیان نەدرا، یەکسەر تووڕەییو پرتەو بۆڵەیان

دەست پێدەکاتو بەردەوامیش دەبن، چونکە کرداری ڕابردوو، ئەوە دەگەیەنێ کە یەکجار دەگرێو دەبڕێتەوە، بەڵام کرداری (مضارع) بەردەوامە.

ئنجا خوای بە بەزەیی ڕێیان پێ پێشان دەدات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

وە ئەگەر ئەوانە ڕازی بووبانایە، بەوەی کە خوا ﷻ وە پێغەمبەرەکەی پێیان دەدان، وە گوتباشیان: خوامان بەسە، لەمەودوا ئەگەر ئێستاش بەشمان نەبێ، لەبەرئەوەی کە شایستە نەبووین، لەمەودوا خوا لە بەخششی خۆی پێمان دەدات، وەك چۆن لە ڕابردووش دا لە بەخششی خۆی پێی داوین، وە پێغەمبەرەکەشی پێمان دەدات، وە ئێمە ئارەزوومەندین بۆ لای خوا، واتە: ئێمە تەنیا چاومان لە دەستی خوایەو، چاومان لە نیعمەتەکانی خوایەو، چاومان لە دەستی کەسی دیکە نیە.

دیارە وەڵامی ئەگەر (لو)ەکە قرتێنراوە، لەبەرئەوەی سیاق دەلالەتی لەسەر دەکات، یانی: ئەگەر وایان کردبایە، ئەوجار شایستەی مسوڵمانەتیی بوون، وە ئەوە بۆیان باشتر بوو، وە خۆیان دەپاراست کە چاوچنۆك بنو، چاویان لە دەستی خەڵك بێ، وە لە دوارۆژیشدا بۆ وان سەلامەتتر بوو، کە شتێك وەرنەگرن، کە شایستەی نین، بەڵکو خەڵکی لەوان شایستەتر هەیە، ئەوەك عەیبدار بن لە دنیاداو، گوناهباریش بن لە قیامەت دا.

جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای بالادەست وشەی (حَسْب)ی تەنیا بۆخۆی بەکارهێناوە، دەڵێن: ﴿ حَسْبُنَا ٱللَّهُ ﴾، یانی: (اللهُ كافِينا) واتە: خوا بۆ ئێمە بەسە، پێغەمبەر ﷺ بەشی بەوەوە نیە، بۆچی؟ چونکە ئەوەی کە کیفایەت دەکات، ئەوەی کە بەسە، ئەوەی کە هەموو کەلێنان بۆ ئینسانی دەگرێ، تەنیا خوای تاكو پاكو بەخشەرە، بۆیە لە قورئاندا وشەی: (حَسْب) تەنیا بۆ خوای تاكو تەنیا، بەکارهاتوە.

بۆ نموونە: لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ﴿٣٦﴾ ﴾.

واتە: ئایا خوا كافی نیە بۆ بەندەكەی، واتە: خوا بە تەنیا بەسەو، پێویست ناكات پێغەمبەریشی ﷺ بچێتە پاڵ.

هەروەها لە كۆتایی ئەم سوورەتەدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾ التوبة.

واتە: بڵێ: خوام بەسە، جگە لەو هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە، پشتم هەر بەو بەستوە، وە ئەو خاوەنی بارەگای مەزنە.

هەروەها لە سوورەتی (الطلاق)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴿٣﴾ ﴾.

واتە: هەر كەس پشت بە خوا ببەستێ، ئەوە خوای بەسە.

هەروەها (فضل)یش تایبەت كراوە بە خوای باڵادەستەوە وەك دەفەرموێ:

﴿ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ ﴾.

(فضل) واتە بەخششێك بەبێ بەرانبەر، ئەوەی كە بەبێ بەرانبەرو بە ڕەهایی دەبەخشێ، تەنیا خوایە، وە پێغەمبەرەكەشی ﷺ لەوەی كە لەبەردەستی دایەو لە توانای دایە، پێمان دەبەخشێ، ئەگەرنا ئەوەی كە لە توانایدا نەبووە، نەیتوانیوە. چونكە دیارە توانای پێغەمبەر ﷺ دیاریكراو بووە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی شەرعی خوا بەخشیویەتی، نەك بە ڕەهایی، وە تەنیا بە مسوڵمانانی بەخشیوە، بەڵام خوای بەخشەر بە ڕەهایی بە مسوڵمانانو كافرانی بەخشیوە بەبێ بەرانبەر، چونكە خوای هەموو لایەكەو، خاوەنی هەموو لایەكە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ مولزەم بووە، بەوەی كە بە پێی شەریعەت ببەخشێ، كەسێك داوای شتێكی لێكردبێو شایستە نەبووبێ، مەگەر بە ناچاری پێی بەخشیبێ، ئەگەرنا نەیداوەتێو، فەرموویەتی: تۆ شایستە نیی!.

هەربۆیەش خوای پەروەردگار لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا، کە دوایی باسی زەکات دەکات، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ ...﴾، تا کۆتایی، تاکو بۆ مسوڵمانانو بۆ هەموو لایەك دەربکەوێ، کە ئەم جۆرە ماڵو سامانە تایبەتە بەو جۆرە کەسانەوە، بۆئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەغڵەتو نارەحەت نەکەن، کەسانێك شایستەش نەبنو بچن داوای لێبکەن، ئەویش تووشی ئیحراجیی بکەن، وەك لە فەرمایشتێکدا هاتووە، رۆژێك کەسانێك داوای کۆمەکییو هاوکاریی ماددییان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، شایستەش نەبوون، ئەویش پێیدان، دوایی پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە شایستە نەبوون، فەرمووی:

﴿إِنَّـهُمْ يَسأَلُـونَنِي فَإِمَّـا أَنْ أُعْطِيَهُـمْ، وَإِمَّـا أَن يُبَخِّلُونِـي، ولَسْـتُ بِبَاخِـلٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٣٤)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٠٥٦)، وَالخَرَائِطِي فِي (مكارم الأَخْلاَق) برقم: (٥٦٣)}.

واتە: ئەوانە داوام لێدەکەن، یان دەبێ بیاندەمێ، یان دەبێ چرووکیی بنوێنمو دەست بگرمەوە، وە منیش ناگونجێ دەست بگرمەوەو چرووکیی بنوێنم، کەواتە: بە ناچاریی، بە ناهەق پێیان دەبەخشم، وە خۆیان تەحەممولی ئەو بەرپرسیارێتییە دەکەن، کە ماڵێکیان وەرگرتووە پێیان ناشێ.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ﴾، ئارەزوومەندییو چاو لە دەستیی ئینسان، دەبێ بەس بۆ لای خوا بێ: ئێمە ئارەزوومەندین بۆ لای خوا، واتە: بۆ لای غەیری خوا ئارەزوومەند نین، تەنیا چاومان لە دەستی خوایە.

دەبوو ئاوایان گوتبایە، ئەوە شایستەی ئینسانی مسوڵمانە، ئەگەر ویستبایان بە مسوڵمان لە قەڵەم بدرێن، دەبووایە ئەوە هەڵوێستیان بووایەو، ئەوەش قسەیان بووایە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾.

دیارە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، ئەم ئایەتە باسی زەکات دەکات، چونکە (صدقات) کە کۆی (صدقة)یە، ناوە بۆ زەکات، وە ماڵێکە کە صادیقانەو ڕاستگۆیانە ببەخشرێ، لە پێناوی خوادا، ئنجا زەکات هەم وشەی صەدەقەی بۆ بەکارهاتوە، هەم وشەی زەکاتی بۆ بەکارهاتوە، وەك لە ئایەتەکانی دواتردا دەیگەینێ.

# کورتە باسێک لەبارەی ئەو هەشت جۆرە کەسانەی زەکاتیان پێ دەشێ

لێرەدا خوا ﷻ بە ئامرازی (إِنَّمَا) هێناویەتی، کە ئامرازی (الحصر والإثبات)ە، واتە: غەیری ئەم هەشت جۆرە، هیچ کەسێکی دی بەشی بە زەکاتەوە نیە، با خەڵکی دیکە چاوەڕێی نەکات!.

بەڵێ، زەکاتی فەرزکراو، تەنیا بۆ ئەو هەشت جۆرە کەسانەیە، ئەوەش دیارە بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەیە کە ڕەخنەیان لە پێغەمبەر ﷺ گرت، بەهۆی دابەشکردنی زەکاتێکەوە کە لەبەردەستی دا دەبوو.

هەڵبەتە بابەتی زەکات، بابەتێکی زۆر گەورەو گرنگە، چونکە زەکات یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام، لە ڕیزی شایەتمان هێنانو، نوێژو، ڕۆژووو، حەج کردن دا، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿بُنِيَ الإِسلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، والحَجِّ ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٨)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١١٤)، والتِّرمِذِيّ، برقم: (٢٦٠٩)}.

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج شتان بنیات نراوە: شایەتمان بەوە کە بێجگە لە خوا، پەرستراوی دیکە نین، وە کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە بەرپاکردنی نوێژ، وە زەکات دان، وە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان، وە حەجی ماڵی خوا.

هەروەها لە وەڵامی پرسیاری (جبریل)دا دەربارەی ئیسلام، کە فەرمووی: ﴿ما الإِسْلاَمُ؟﴾.

پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ فەرمووی: ﴿الإِسْلاَمُ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٨٤٩٦)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (١٣٣٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٤)}.

کەواتە: مسوڵمانەتیی شەخصیی، لەسەر ئەو پێنج پایە بنیات دەنرێ[1]، وە من لە مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا، بەرگی سێیەمم کە دەوری چوار سەد لاپەڕەیە، تەرخانم کردوە بۆ باسو بابەتی زەکاتو ماڵ بەخشین، بۆیە لێرەدا ناتوانین تەواو هەقی خۆی بدەینێ، بەڵام ئاماژەیەك دەکەین بە هەر کام لەو هەشت جۆرە کەسانەی، کە زەکاتیان پێ دەشێ:

١ و ٢) دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾، صەدەقەو زەکات هی هەژارانو نەدارانە، کە من لە کوردییدا (فقیر)م بە (هەژار) لێکداوەتەوەو. (مسکین)یش بە (نەدار)، هەڵبەتە زانایان مشتومڕیان زۆر بووە لەبارەی چەمکی ئەم دوو وشەیەوە:

هەندێك گوتوویانە: هەژار ئەوەیە شتێکی هەبێو، نەدار ئەوەیە هیچی نەبێ.

بەڵام زۆربەی زانایان گوتوویانە: بە پێچەوانەوە، هەژار ئەوەیە هیچی نەبێو، نەدار ئەوەیە شتێکی هەبێ، بەڵام بەشی نەکات.

منیش بۆچوونی دووەمم پێ ڕاستە، بۆیەش خوای پەروەردگار کێ زیاتر پێویستی پێیەتی، ئەوی پێشخستوەو، بە پێی ڕیزبەندیی ئاتاجییەکەیان، ڕیزی کردوون، کەواتە: دیارە (فقراء) لە هەمووان ئاتاجترن، وە لە هەمووان شایستەترن زەکاتیان بدرێتێ، بۆیە لە ڕیزبەندییدا، خراونە پێشەوە، ئنجا (مساکین)و دوایی ئەوان (والعاملین علیها)، ئاوا پێ بە پێ.

---

١) واتە: ئەو چوارەی لێرە باسکراون، وێڕای (حەج کردن) کە لە فەرموودەکانی دیکەدا هاتوە.

وە بەڵگەمان لەسەر ئەوە کە هەژارەکان (فقراء) لە نەدارەکان (مساکین) ئاتاجترن، ئەوەیە کە یەکەم: لە ڕیزبەندیی ئایەتەکەدا خراونە پێشەوە دووەم: لە سوورەتی (الکهف)دا لە بەسەرهاتی مووساو ئەو بەندە چاکەدا، کە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ناوی (خضر) بووە[1] کە لەگەڵی دا بووە، بۆئەوەی هەندێ زانیاریی لێ فێربێ، ئنجا دوای ئەوەی سواری کەشتی دەبن، پێی دەڵێ: ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾ ﴾الکهف.

واتە: هەرچی کەشتییەکە بوو، هی کۆمەڵێك نەدار بوو، کە ئیشیان لە دەریادا دەکرد، ئنجا ویستم عەیبداری بکەم، چونکە لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، هەر کەشتییەکی (نوێی) هاتبایە بەر چەنگ، دەستی بەسەردا دەگرت، {منیش ویستم کەمو کورو نارێك دەربکەوێ، بۆئەوەی تەماعی تێنەکات} ، هەڵبەتە کەشتیی بە مانای ئێستای نا، کە ئاوا فراوان بووبێ، ڕەنگە هەر بەلەمۆکەیەك بووبێ، کە ماسییان لەسەر گرتبێ، یان چەند نەفەرێکی پەڕاندبێتەوە .

کەواتە: دەگونجێ کەسێك (مسکین) بێو شتێکیشی هەبێ، بەڵام ئەو شتە بەشی نەکات، بەڵام هەژار ئەو کەسەیە، کە هیچی نەبێ، وە زانایان گوتوویانە: (الفَقِيرُ مَنْ لاَ يَمْلِكُ شَيْئًا، وَالمسكِينُ مَنْ يَمْلِكُ مَا لاَ يَكْفِيهِ) واتە: هەژار ئەو کەسەیە کە هیچی نەبێ، بەڵام نەدار ئەو کەسەیە شتێکی هەیە، بەس بەشی ناکات، بۆیە ئەویش هەر دروستە، زەکاتی پێ بدرێ.

---

١) ﴿عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّهُ تَمَارَى هُوَ وَالْحُرُّ بْنُ قَيْسِ بْنِ حِصْنٍ الْفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام، الَّذِي سَأَلَ السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هُوَ خَضِرٌ، إِذْ مَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ فَنَادَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي تَمَارَيْتُ أَنَا وَصَاحِبِي هَذَا، فِي صَاحِبِ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام الَّذِي سَأَلَ السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، فَهَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَأْنَهُ قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَا مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام فِي مَلَإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، إِذْ قَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ؟ قَالَ: لا، قَالَ: فَأَوْحَى اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَيْهِ: عَبْدُنَا خَضِرٌ...﴾ { أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢١١٠٩) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين} .

وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (مسكین) فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلاَ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَلَكِنْ الْمِسْكِينُ الَّذِي لاَ يَجِدُ غِنىً يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ، فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِكٌ، بِرقم: (١٧٥٩). وَالبُخَارِيُّ، بِرقم: (١٤٧٩)، وَمُسْلِم، بِرقم: (٢٣٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ، بِرقم: (١٦٣١). وَالنَّسائِيُّ، بِرقم: (٢٥٧٢)، وَابْنُ حِبَّانَ، بِرقم: (٣٣٥٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ}.

واتە: نەدار بریتی نیە لەو کەسەی کە دەنکە خورمایەك یان دوو دەنکە خورما قەناعەتی پێدێنێ، یان پاروویەكو دوو پاروو (چونکە لە تۆ کەمێكو لەویدیکە کەمێكو لەویدیکەو لەویدیکە دەکا زۆر بۆی)، بەڵکو نەدارێك، وا باشە کە تۆ ماڵی خۆتی بدەیەو هاوکاریی بکەی، کە هێندەی نیە بێنیازی بکات. وە واش خۆی پێشان نادا کە نەدارە {یانی: ناڵاڵێتەوەو دەست پان ناکاتەوە} تاکو یارمەتی بدەنو خێری پێ بکەن.

بەخشین بەو جۆرە کەسانە زۆر خێرە، دراوسێیەکت، یاخود کەسێك لە شارەکەتدا، لە گوندەکەتدا، لە دەوروبەرت، یاخود لێت دووریشە، بەس دەزانی کە ئاتاجە، بەڵام عیززەتی نەفسی هەیەو، دەستی پانناکاتەوەو ناکڕووزێتەوە. هەرچەندە زۆریش هەژارو نەدارە، خێرو صەدەقەو زەکات، بەوجۆرە کەسانە. زۆر چاك جێگا دەگرێ.

٣) ﴿وَٱلْعَـٰمِلِينَ عَلَيْهَا﴾، وە ئیشکەران لەسەر صەدەقات.

جا ئایا ئەوان کێن؟ زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەوانەن کە کۆی دەکەنەوە، بەڵام مەرج نیە تەنیا کۆکەرەوانی بن، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە بەشداریی دەکەن، لە کۆکردنەوەو پاراستنو دابەشکردنی زەکات دەگرێتەوە، دیارە هەژارو نەدار، لەبەر پێویستییان دەیاندرێتێ، بەڵام ئیشکەران، مەرج نیە لەبەر ئەوە بیاندرێتێ کە پێویستییان پێی هەیە، بەڵکو لەبەر کارەکەیان دەیاندرێتێ، ئەوە قسەی زۆربەی زانایانە.

٤) ﴿وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾، ئەوانەی دڵیان ڕادەگیرێ، ئەوانەی دەویسترێ سەرنجیان ڕابکێشرێ.

هەڵبەتە لەوبارەشەوە زانایان ڕاجیاییان هەبووە:

هەندێك گوتوویانە: ئێستا ئەو جۆرە کەسانە هەر نەماون. کە بێگومان ئەمە ڕایەکی بێهێزە، هەرچەندە هەڵوێستێکی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەکەنە بەڵگە کە لەسەردەمی خۆیدا، لە صەدەقات‌و زەکات بەشی دڵڕاگیراوانی نەدا، کەسانێك هاتن بۆئەوەی زەکاتیان بداتێ، گوتی: ئێوە کێن؟

گوتیان: ئێمە ئەوانەین کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکری صیددیق دا زەکاتمان دراوەتێ: (مُؤَلَّفَة القُلُوب)ین.

گوتی: بڕۆن ناتاندەمێ، کاتی خۆی کە زەکاتتان دراوەتێ، لەبەرئەوە بوو، کە ئیسلام بێ دەستەڵات بووە، بەڵام ئێستا ئیسلام بێنیازە، فەرموون: چیتان لە دەست دێ، بیکەن.

بەڵام بێگومان ئەم هەڵوێستەی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، بۆچوونێکی خۆی بووە[1] ، بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە ئێستا ئەو جۆرە کەسانە نەماون، لەو کاتەدا ئەو پشکەیان پێنەدراوە، بەڵام دوایی کە ئەو حاڵەتە هاتەوە پێش‌و ئەو کەسانەش پەیدا بوونەوە، دەگونجێ پێیان بدرێ.

وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوانە دوو بەشن:

بەشی یەکەم: دەگونجێ کافربن‌و، بیاندرێتێ بۆ ئەوەی مەیل بۆ لای ئیسلام بکەن، یاخود ئیسلام لە شەڕو خراپەو زیانیان دووربێ.

بەشی دووەم: مسوڵمانن، بۆ ئەوەی زیاتر دڵیان چەسپاوو دامەزراوبێ، وەك دیاریی‌و هاوکاریی دەیاندرێتێ، ئیسلام دووربینەو، ئایینێکی واقیع بینە، ئەگەر بەشێك لە ماڵ‌و سامانی دەوڵەمەندانی مسوڵمان بکاتە بەلاگێڕەوەی کۆی کۆمەڵگاو قەوارە ئیسلامییەکە، باشترە لەوەی کە بەهۆی کەمتەرخەمیی کردن لەو بوارەدا، ئیسلام دوژمنی بۆ زۆربن.

---

١) هەڵبەتە لە بۆچوون‌و کۆشش (إجتهاد)ەکەشی دا، پێکاویەتی، چونکە کەسێك لەبەر سیفەتێك یان لەبەر هەل‌و مەرجێك زەکاتی بدرێتێ، هەرکات ئەو سیفەتەی نەما، یان هەل‌ومەرجەکە گۆڕا، زەکاتەکەی ناکەوێ‌و پێی ناشی .

ئنجا ئەم چوار جۆرەماڵەکە تەسلیمی دەستی خۆیان دەکرێ، بۆیە بە (ل)ی (تملیک) هێناویەتی.

کەواتە: ئەم چوارە جۆری یەکەمن.

جۆری دووەم: ماڵەکە مەرج نیە تەسلیمی خۆیان بکرێ، بەڵکو دەبێ زەکاتەکە بۆیان بەکاربهێنرێ، ئەوانیش ئەم چوار جۆرەن:

٥) ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾، زۆربەی زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی (مکاتبون)ە، وەك خوا لە سوورەتی (النور)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ ٣٣﴾.

واتە: وە ئەوانەی لە کۆیلەکانتان داوای موکاتەبەتان لێ دەکەن، موکاتەبەیان لەگەڵدا بکەن، ئەگەر چاکەتان پێوە بینین، وە لەو ماڵەی کە خوا پێی داون، پێیان بدەنو چاکەیان لەگەڵ بکەن.

موکاتەبەش ئەوە بووە کە کۆیلەیەك لەگەڵ گەورەکەی خۆی دا، رێککەوتوە گەورەکەی گوتوویەتی: بچۆ ئەوەندە پارەیەم بۆ بێنە، ئازادیە، ئەویش چوود بۆ خۆی کارو کەسابەتی کردوە، ئنجا یەکێك لەو هەشت جۆرە کەسەی زەکاتیان پێ دەشێ، ئەو کۆیلانەن.

زۆربەی زانایان وایانگوتوە، بەڵام من پێم وایە: یەك لەسەر هەشتی زەکاتی مسوڵمانان تەرخان دەکرێ، لە هەر کاتێکدا کۆیلە هەبوون، بۆ ئازادکردنی ئەو کۆیلانە، هەڵبەتە ئێستاش کۆیلەی بە ئاشکرا نەماون، ئەگەرنا کۆیلەی پەنهان هەر هەن، ئێستاش چەند جۆرە کۆیلایەتییەك هەیە، بەڵام ئەم جۆرە نەماوە، کە لە بازاڕدا کڕینو فرۆشتنیان پێوە بکرێ، مەگەر لە چەند شوێنێکی پەراگەندەی دنیادا، دەڵێن: چەند ملیۆنێك کەس لەو جۆرانە هەن، کە دیارە دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی، یەك لەسەر هەشتی زەکات، تەرخان بکات بۆ ئازادکردنی ئەو کۆیلانە.

٦) ﴿وَٱلْغَـٰرِمِينَ﴾، كۆی (غارم)ە، واتە: قەرزدار.

زانایان گوتوویانە : {هم الّذين ركبتهم ديون، وتعذّر عليهم أداؤها، واشترط الفقهاء أن تكون الديون في غير معصية الله}.

(غارمین) ئەو كەسانەن كە قەرزیان كەوتوونە سەرێ، وە ناشتوانن قەرزەكە بدەنەوە، بەلاَم شەرعزانان بە مەرجیان گرتوە، كە ئەو قەرزانەی كەوتوونە سەریان نابێ بەهۆی گوناهو تاوانەوە بووبێ، كەسێك قوماری كردبێ، شەڕابی خواردبێتەوە، خراپەی كردبێ: زەكاتی پێ نادرێ، چونكە دەبێتە هاندانی ویش‌و كەسانی دیكەش لەسەر گوناهو خراپە.

بەڕاستیی ئەو تێبینییەی شەرعزانان زۆر جوانە، بەلاَم دیسان كەسێك كە خۆی ماندووكردوەو كارو كەسابەتی حەلاَلی كردوە بۆ ماڵو منداڵی‌و بەشی نەكردوەو چووەقەرزی كردوە، یان بەهۆی ئەوەوە كە صۆلحێكی كردوە، قەرزدار بووە، كە ئەوە لە نێو عەرەب دا هەبووە، ئەگەر صولحێك كرابێ لە نێوان دوو لایەن دا، مەبلەغێك مابێتەوەو كەسیان دەستبەرداری نەبووبن، ئەوە بە پارەی زەكات كێشەكە كۆتایی پێ هێنراوە.

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: ﴿عَنْ قَبِيصَةَ بنِ الـمُخَارِقِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً، فَأَتَيْتُ رَسولَ الله ﷺ أَسأَلُهُ فِيها، فَقَالَ: أَقِمْ حَتَّى تأتِيَنا الصَّدَقَةُ، فَنأمُرَ لَكَ بِها﴾ {أَخْرَجَهُ الحُمَيْدِيُّ، برقم: (٨١٩)، وَأَحْمَد، برقم: (٤٧٧)، وَالدَّارِمِيُّ، برقم: (١٦٨٥)، وَمُسْلِم، برقم: (٢٤٥١)، وَأَبُو دَاوُد، برقم: (١٦٤٢)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٢٥٨٠)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٣٣٦٩)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، برقم: (٢٣٥٩)}.

واتە: قەبیصەی كوڕی موخاریق خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەندازەیەك خوێنم كەوتبووە سەرێ، بەهۆی صولحكردن‌و میانگیرییەوە، {كە ئاشتەوایی كردوە لە نێوان دوو لایەندا} چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، داوام لێكرد هاوكارییم بكات بۆ ئەو مەبەستە، فەرمووی: دانیشە لە لامان هەتا صەدەقەو زەكات دێ، فەرمان دەكەین: پارەی ئەوەندە قەرزەی كە كەوتۆتە سەرت (بەهۆی ئەو صولحەوە) بتدرێتێ، تاكو قەرزەكەی پێ بدەیەوە.

٧) ﴿وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، لە ڕێی خوادا، دیارە شەرعزانان زۆر مشتومڕیان بووە لەسەر چەمکی لە ڕێ خوادا، بەڵام بەگشتی سێ ڕایان هەن:

أ/ زۆربەیان دەڵێن: (الغزاة والمجاهدون) واتە: ئەوانەن کە جەنگاوەرن و لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن.

ب/ هەندێك دەڵێن: (الحجّاج) هەر کەسێك کە بیەوێ حەجێ بکاو، پارەشی نەبێ، ئەوە لە ماڵی زەکات دەیدرێتێ، بۆئەوەی حەجەکەی پێ بکات. لەوبارەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ یان هێناوە.

ج/ هەندێکی دی دەڵێن: (مصالح المسلمين الدينية والدنيوية) بەرژەوەندیی مسوڵمانان، جا چ پەیوەندییان بە دینداریانەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە دنیادارییانەوە هەبێ.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم قسەیەکی (محمد رشيد رضا) بێنم، کە قسەیەکی زۆر جوان دەکات لەوبارەوە، دەڵێ[1]:

(وَالتَّحْقِيق أَنَّ سَبِيل الله هُنَا مَصَالِحُ الْمُسْلِمِين العَامَّة الَّتِي بِهَا قِوَامُ أَمْر الدِّينِ وَالدَّوْلَة دُونَ الأَفْرَادِ، وَإِنَّ الحَجّ لَيْسَ مِنْهَا، لأَنَّهُ وَاجِبٌ عَلَى الْمُسْتَطِيع دُونَ غَيْرِهِ، وَهُوَ مِنَ الفَرَائِضِ العَيْنِيَة بشَرْطِهِ، كَالصَّلاَةِ وَالصِّيَام لا مِنْ المَصَالِح الدّينية الدّولية... وَلَكِن إقَامَةِ شَعِيرَةِ الحَجّ وَإقَامَةِ الأُمَّةِ لَهَا مِنْهَا. فَيَجُوزُ الصَّرْفُ مِنْ هَذَا السَّهْمُ عَلَى تَأمِين طَرِيق الحَجّ وَتَوْفِير المَاءِ وَالغِذَاء وَأَسْبَاب الصحة للحِجَاج، إِنْ لَمْ يُوجَد لِذَلِكَ مَصْرِفٌ الآخَر).

واتە: ئەوەی کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا دەردەکەوێ، ئەوەیە کە مەبەست لە (سبيل الله) لێرەدا بەرژەوەندیی گشتی مسوڵمانانن، کە کاروباری دینداریی و دەوڵەتدارییان بەو بەرژەوەندییانە بەڕێوە دەچێ، نەك تاکەکانی خەڵك، وە حەج کردنی تاکەکان لەو بەرژەوەندییانە نیە، چونکە حەج تەنیا لەسەر کەسێك پێویستە، کە لە توانایدا هەیە، وە حەج کردنیش لەو جۆرە ئەرکانەیە کە لەسەر خودی ئینسان پێویست دەبێ، ئەویش بە مەرجی خۆی، وەك: نوێژ.

١) تفسير القرآن الحكيم ج١٠، ص٤٤٩.

ڕۆژوو گرتن، وە حەج کردن لەو بەرژەوەندییە دینیی‌و دەوڵەتییانە نیە، کە پەیوەندیی بە هەموو مسوڵمانانەوە هەبێ، بەڵکو پەیوەندیی بە تاك تاکیانەوە هەیە.

بەڵام بۆ بەرپاکردنی دروشمی حەج، ئەوە کە ئۆممەت بەوکارە هەڵسێ، ئەوە دەگونجێ لەوبەشەی زەکات خەرج بکرێ، بۆ پاراستنی ڕێی حەج کردن، هەروەها دەستەبەرکردنی ئاو، دەستەبەرکردنی خۆراك، دەستەبەرکردنی ئەو هۆکارانەی کە بۆ تەندروستی حاجییەکان پێویستن، ئەگەر سەرچاوەیەکی دیکەی داراییمان نەبوو {بۆ هێنانەدی ئەو بەرژەوەندییانەی کە حەجێکی ڕێك‌و باشیان پێ ئەنجام بدرێ}.

منیش وای تێدەگەم کە (فِي سبيل الله) هەموو ئەو کارو چالاکییانە دەگرێتەوە، کە بەگشتی دینداریی مسوڵمانان پەکی لەسەریان کەوتوە، ئنجا جەنگ‌و جیهادە لە کات‌و شوێنی خۆیدا، بانگەوازە، پەروەردەکردنی مسوڵمانانە، بڵاوکردنەوەی زانیاری شەرعییە، ڕاگەیاندنە، کە لەم ڕۆژگارە پێی دەگوترێ: دەسەڵاتی چوارەم، هەموو ئەو شتانەی کە دینداریی‌و دنیاداریی مسوڵمانان پێویستییان پێیانە، پێم وایە دروستە ماڵی زەکاتیان بۆ تەرخان بکرێ، وە لە زەکات ئەو پێداویستییانە جێبەجێ بکرێن‌و، ئەو کارانە ڕاپەڕێنرێن.

٨) ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾، واتە: کوڕی ڕێگا، کە لێرەدا مەبەست پێی ڕێبوارە (وَهُوَ الـمُنْقَطِعُ مِنْ بَلَدِهِ وَإِنْ كَانَ غَنِياً فِي بَلَدِهِ)، واتە: کەسێکە کە لە وڵاتو نیشتیمانی خۆی دابڕاوە، لە شوێنێك پەکی کەوتوە با لە شوێنی خۆیشی دەوڵەمەند بێ، بایی ئەوەندە کە پێی دەگاتەوە شوێنی خۆی، دروستە لە زەکات بیدرێتێ.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾، ئەوەش شتێکە لەلایەن خواوە پێویست کراوە، وە خوا زانای کارزانە.

وشـەی (فَرِيضَـة) دەڵـێ: (منصوبٌ على أنه مصدرٌ مُؤَكِّدٌ لـمصدر محذوف يـدلُّ عليـه: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ﴾، لأنَّهُ يُفِيد مَعْنَى: فَرَضَ اللهُ وَأَوْجَب).

یانی: وشەی (فَرِيضَة) مەنصوب بووە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، چونکە: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ﴾، لـە مانـای ئـەوە دایـە کـە بگوتـرێ: (فَـرَضَ اللهُ وأوجـب الصدقات).

﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، ئـاوا دەچێتـــەوە بـۆ وێ، چونکـە لـە مانـای ئـەوە دایـە.

ئنجا کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، واتـە: خـوا لـەوەدا کـە زەکاتی کورت هەڵهێناوە لەسـەر ئـەو هەشـت جۆرە کەسـە، زانایـە، وە کـارزانیشـەو کاربەجێشە، چونکـە خوای زانـاو توانـا هـەموو شتێك دەزانـێ، وە کـەسـەکـانیش دەناسێ، زانـایـە بە شـتـەکان، وە کـارزان‌و کـاربەجێشـە لـە مامەڵـەکـردنی لـەگـەڵ کەسەکاندا.

کـەواتـە: کورتـەی قسان دەتوانین بڵێیـن: ئـەو شوێنـانـەی زەکـاتیـان بـۆ خـەرج دەکـرێ دوو بـەشن:

أ/ کـەسـەکـان (أشخاص).

ب/ وە بەرژەوەندییـەکان (مصالح).

کـەسـەکان: هـەژاران‌و نـەداران‌و کـارمـەنـدانی زەکـات‌و دڵـڕاگیـراوان.

بەرژەوەندیەکانیش: (ئازادکردنی کۆیلان‌و، قەرزدانەوەی قەرزداران‌و، بـەرژەوەندیی مسـوڵمانان‌و، بابایـەکی ڕێبواری پـەککـەوتوو).

بۆیەش زانـایـان وایـان گـوتووەو منیش زۆرم بە دڵە، چونکە چوار جۆری بەشـی یەکەمی بە (ل)ی (تـمـلـيـك)ی هێـناون، بـەڵام چوارەکەی بەشـی دووەمی بە (فِـي) هێـنـاون، واتـە: تێیانـدا خەرج دەکرێ، چوارەکـەی پێشـێ پێیان دەدرێ‌و، دەبـێ بـە موڵکیان، بەڵام (فِـي) بۆ کـارتێداکـردن (ظـرفـيـة)ە.

هەڵبەتە لێرەدا پێویستە ئەوەش بزانرێ، کە مەرج نیە بدرێتە هەر هەشت لەو جۆرە کەسانە، هەر کەسێك زەکاتی هەبوو بڵێ: دەبێ بیدەم بە هەر هەشت جۆر! بەڵکو بە ڕای زۆربەی زانایان، دروستە زەکات بدرێ بە یەك جۆریان، کەسێك زەکاتی هەیە هەژارێك دەناسێ، مەرج نیە بڵێ: دەبێ نەدارێك و ڕێبوارێك ... هتدیشی هەبن! گرنگ ئەوەیە بیدات بە کەسێك کە خانووی نیە، جێگاو ڕێگای نیە، ئاتاجە.

<u>مەسەلەی دەیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾.

وە لە مونافیقەکان کەسانێك هەن، ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدەن، دڵی دەشکێنن، وە دەڵێن: ئەو هەر گوێیە، پێیان بڵێ: گوێی چاکەیە بۆتان.

(الأذى: ما يؤلم الحيَّ المُدرِك في بدنه أو نفسه).

واتە: (الأذى) هەر شتێکە کە زیاندارێك هەست دەکات لە جەستەی دا، یان لە نەفسیدا، ئازاری دەدات، دەگوترێ: (أَذِيَ الإِنْسان بكذا) واتە: مرۆڤ ئازاری پێگەیشت، وەك (رَضِيَ بكذا) واتە: لێی ڕازی بوو، پەسەندی کرد، (أَذِيَ أَذَىً، وَتَأَذَّى تَأَذِّياً) واتە: ئازاری پێگەیشت، بە ئازار پێگەیشتن، ئەگەر شتێکی پێ بکەوێ کە پێی ناخۆش بێ، (وَ آذى غَيره إِيْذَاءً) واتە: جگە لەخۆی ئازاردا، بە ئازار پێگەیاندن.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ ﴾، مەرج نیە بچن مستێك لە پێغەمبەر خوا ﷺ بدەن، ئەوجار مانای ئێش پێگەیاندن، بیگرێتەوە ! بەڵکو ئاماژەیەك، قسەیەك، هەڵسوکەوتێك، کە پێغەمبەر ﷺ دڵی پێی بئێشێ و پێی ناڕەحەت بێ، دەیگرێتەوە.

دوایی خوا چۆنیەتی ئەو ئازاردانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ﴾، وە دەڵێن: ئەو گوێیە، (أُذُن) بریتیە لەو ئەندامەی کە ئینسان پێی

دەبیستێ، وە ناونانی کەسێك بەو ئەندامە، بۆ زێدەڕۆیی کردنە لەوەدا، کە زۆر دەبیستێ، وە ئەو ئەرکەی خۆی زۆر ئەنجام دەدات، کە بریتیە لە زۆر بیستن، وە هەر شتێك بگوترێ، دەیبیستێ، وە بە ڕاستیشی دەزانێ، یانی: هەر بۆتە گوێ. دەگوترێ: فلانکەس هەر گوێیە، هەر دەبیستێ، یان دەگوترێ: فلانکەس بۆتە چاو، واتە: زۆر زێدەڕۆیی دەکات، لەوەدا کە چاودێرییمان دەکات.

کە لێرەدا ئەو مونافیق‌و دەغەلانە ـ وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا ـ لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوون، وە بە زۆریی مرۆڤ وایە، بۆخۆی چۆن بێ، ئاواش تەماشای خەڵکی دەکات، کە پێغەمبەر ﷺ بە حورمەت‌و ڕێزی گەورەی شایستەی خۆی، گوێی بۆ گرتوون، هەر کەسێك هاتبێ ڕاستی گوتبێ، یان درۆ، ئەو هەر گوێی بۆ گرتوەو، کەسی ڕووشکێن نەکردوە، ئەو نەفامانە وایانزانیوە درۆیەکانیشیان بە ڕاست دەزانێ! بێئاگا لەوەی کە ئەو گوێ بۆ گرتنەییان‌و، ئەم ڕوونەشکاندنەییان، لە مەقامی بەرزی پێغەمبەر دەوەشێتەوە.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ﴾، بڵێ: گوێی چاکەیە بۆ ئێوە، واتە: هەر چاکەتان لێوەردەگرێ‌و، ئەوەی کە ڕاست بێ، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەنی گەورەترین عەقڵ‌و هۆش‌و وریایی بووە، بەتەئکید زۆر زۆر لەوە بەرزتر بووە، بە دوو قسەی بابایەکی درۆزن، یان برو بیانووی بێجێ هەڵبخەڵەتێ، بەڵام چی بکات، ئەو دەبێ هەر لە مەقامی بەرزی خۆیدابێ.

بۆ وێنە: جاری وابووە داوای هاوکارییان لێکردوەو، جاری وابووە ئەو کەسە شایستەش نەبووە، هەر پێی داوە، بەوەش پاساوی هێناوەتەوە، فەرموویەتی: یان دەبێ ڕژدیی لە خۆمدا بێنمە دی، یان دەبێ بە ناهەق پێی بدەم، ئنجا ناچارمو نابێ چرووك‌و ڕژد بم، دەبێ هەر پێی بدەم، با ناهەقیش بێ، ئەو دوایی بۆخۆی پێی گوناهبار، بەڵام نابێ سیفەتی خراپ لەودا بێتە دی.

ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی ڕووشکێن کردبایەو، کە درۆیان بۆ دەکرد، فەرمووبای: درۆ دەکەی! ئەوکاتە دەیانگوت: موحەممەد خەڵك ڕووشکێن دەکات، قسەی زبرو ڕەق دەکات، بە خەڵك دەڵێ: تۆ درۆ دەکەی.

بەڵام خوای بەرز وەسفی پێغەمبەری ﷺ کردوەو فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾.

تۆ (ئەی موحەممەد!) بەهۆی بەزەیی یەك لە خواوە، بۆیان (بۆ هاوەڵانتو شوێنکەوتووانت) نەرمو نیان بووی، وە ئەگەر هاتباو قسەو ڕەفتار زبرو دڵڕەق بووایەی، ئەوە بێگومان لە دەورت دەپرژان، بۆیە لێیان خۆش بەو، داوای لێبوردنیان بۆ (لە خوا) بکەو لە کاروباریشدا (وەك عادەتی پێشووت) ڕاوێژیان پێ بکە.

کەواتە: لە جیاتی ئەوەی زبرو ڕەق (فظ غلیظ) بێ، نەرمو حەلیم بووە.

پێغەمبەر ﷺ دەبێ لێبوردە بێ، دەبێ لەو ئاستە بەرزەی ڕەوشتی بەرزو جوانیدابێ، هەرچەندە سەرەنجام ئەو گومانە خراپەی پێ دەبردرێ، بەڵام ئەو گومانە خراپەی پێ ببردرێ، ئاسانترە لەوەی تۆمەتبار بکرێ، بەوەی کە قسە ڕەقەو دڵ ڕەقەو هەڵسوکەوتی ناڕێکە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بڕوای بە خوا هەیە، وە بڕوادارانیش بە ڕاست دەزانێ، {کەواتە: ئەی مونافیقو دەغەڵەکان! ئێوە بە ڕاست نازانێ، کە گوێتان بۆ دەگرێ، لەبەر ڕێزەو گەورەیی خۆیەتی}، وە مایەی ڕەحمەتو بەزەیی خوایە، بۆ ئەوانەتان کە ئیمانیان هێناوەو ڕاست دەکەن لە ئیمان هێنانیاندا، {نەك بۆ ئەوانی دیکە، چونکە ئەوانی دی لەو ڕەحمەتەی خوا بەهرەمەند نەبوون، چونکە ئیمانیان پێ نەهێناوەو بە ڕاستیان نەزانیوە}.

﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، وە ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئازار دەدەن، ئازارێکی بە ژانیان هەیە لە ڕۆژی دوایی دا.

هەڵبەتە زانایان گوتوویانە: ئەمە لێی وەردەگیرێ کە ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی داو، لە دوای مردنیشی قەدەغەیە، وە دیارە ئازاردانیش جۆراوجۆرە، هەر جۆرە ئازاردانێك حوكمێكی تایبەتی خۆی هەیە: هەیە كوفرە، هەیە گوناهی گەورەیە. وە جۆری دیكەشی هەیە، بە ئەندازەی ئەوە كە ئێش بە دڵی پێغەمبەر ﷺ دەگەیەنێ و، بە ئەندازەی ئەوە، كە پێچەوانەی شەریعەتە، حوكمەكەی قورستر دەبێ.

لێرەدا پێم باشە ئاماژەیەك بكەم بەوەی كە شیعە، ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ تۆمەتبار دەكەن، دەڵێن: ئازاری (فاطِمَة)ی كچی داوەو، بێبەشی كردوە لە میراتی بابی، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا فَاطِمَةُ بَضْعَةٌ مِنِّي يُؤْذِينِي مَا آذَاهَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٦١٦٨). وَمُسْلِمٌ، برقم: (٦٤٦١)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٨٦٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ، برقم: (١٠١٣). وَالحاكِمُ، برقم: (٤٧٥١)، وَأَبي عَوَانَة، برقم: (٤٢٣٣)}.

واتە: بێگومان فاتیمە جگەر گۆشەی منە، هەر شتێك ئەو ئازار بدات، ئەوە منی ئازار داوە.

ئێمەش دەڵێین: هەڵوێستی ئەبو بەكر لەوەدا كە زەوی فەدەكی نەدا بە فاتیمە خوا لێیان ڕازی بێ، كە فاتیمە خوا لێی ڕازی بێ داوای فەدەكی دەكرد، وەك میراتی بابی، ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

﴿نَحْنُ مَعَاشِرَ الأَنْبِيَاءِ لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ فَهُوَ صَدَقَةٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد. برقم: (٢٦٣٠٣)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم. وَالرّبيع فِي (المسند)، برقم: (٦٦٢)، وَاللَّفْظُ لَهُ}.

واتە: ئێمەی كۆمەڵی پێغەمبەران، میراتمان لێناگیرێ، ئەوەی كە بە جێی دەهێڵین، خێرو صەدەقەیە بۆ هەموو مسوڵمانان.

ئەبو بەكری خوا لێی ڕازی پێغەمبەری ﷺ لە نەفسی خۆشی خۆشتر دەویست. ئەگەر هیچ بڕ ڕێی تێچووبایە، بە دڵنیایی ئەوەی دەكرد، كە فاتیمە دڵی پێی خۆشبایە، بەڵام ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ، لە نێوان دوو حاڵەت دابووە:

١/ سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکاتو، فاتیمە ڕازی بکات بە ناهەق.

٢/ یان: بە پێچەوانـەوە!

بۆیە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ جێبەجێ کردوە، وە فاتیمەی بێبەش کردوە، لە شتێك کە مافی نەبووە، ڕاستە فاتیمەی تووڕە کردوە، بەڵام (فاطِمَة)ش لە تووڕەبوونەکەی دا هەقی نەبووە، چونکە داوای شتێکی کردوە، کە لە مافی نەبـووە.

بەشەریش هەر بەشەرە، عەلی کوڕی ئەبو طاڵیبیش، کە پێی وابووە: شایستەتر بووە بە جێنشینایەتیی پێغەمبەری خوا، وە فاتیمەش خوا لە هەموویـان ڕازی بێ کە داوای میـراتی کـردوە، کارتێکراو بوون، بەو ژینگەو هەلومەرجەی کە تێیدا ژیاون، تەماشایان کردوە ئەو گەورە پیاوانو دەستەڵاتدارانەی ڕۆژگاری خۆیان، ئەگەر شتێکیان بەجێ هێشتبێ، دوایی خزمە نیزیکەکانیان چوونەتە شوێنیان، وە ئەگەر ماڵو سامانێکیان بەجێ هێشتبێ، لێیـان بـە میـرات گیـراوە، لەلایـەن خـزمو کەسەکانیانەوە، وایانزانیوە بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ هەر وایە، بەڵام پێغەمبەری خـوا ﷺ دەستەڵاتدارێکـی دنیـایی نەبـووە، تـاکـو خـزمو نیزیکەکـانی هـەمان چاوەڕوانییـان لـە شوێنەکـەیو، لـە شـمەکەکەیو، لـە میـراتـەکـەی هـەبـێ، کـە دەستـەڵاتدارانی دیکە هەمان چاوەڕوانییـان لێیـان هەبووە !!

کەواتـە: کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ: فاتیمــە جگـەر گۆشـەی منــە، هـەر کەسـێك ئـەو ئـازاو بـدات، ئـەوە منـی ئـازار داوە، واتـە: بە ناهـەق ئـازاری بدات، وە بە تـەئکید ئـەو حاڵـەتـەش کە ڕوویداوە، لـە نێوان ئـەبو بەکـرو فاتیمـەدا خـوا لـێیـان ڕازی بـێ، فـەرموودەکە نـایگرێتـەوە.

<u>مەسەلـەی یازدەیـەمو کۆتـایی</u>: کـە دەفـەرموێ: ﴿يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدًا فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾﴾.

بۆ ڕوونکـردنەوەی چەمكو واتـای ئـەم دوو ئایەتـە، وا پێویسـت دەکـات، ئـەم بەسەرهاتـە بگێڕینـەوە :

﴿عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: ذُكِر لَنَا أَنَّ رَجُلاً مِنَ الـمُنافقِين قَالَ فِي شَأْنِ الـمُتَخَلِّفِينَ: في غَزْوَةِ تَبُوكَ الَّذِي نَزَلَ فِيهِمْ مَا نَزَلَ مِنَ القُرآنِ: واللهِ إِنَّ هَؤُلَاءِ لَخِيارُنا وَأَشْرَافُنا. وَإِذَا كانَ مَا يَقُولُهُ مُحَمَّدٌ حَقّاً، لَهُمْ شَرٌّ مِنَ الْحَمِير، فَسَمِعَهُ رَجُلٌ مِنَ الـمُسْلِمِين. فَقَالَ: والله إِنَّ مُحَمَّدًا لاَ يَقُولُ إِلاَّ حَقّاً، وَلأَنْتَ شَرٌّ مِنَ الحِمَار، فَسَعَى بِها الرَّجُلُ إِلَى رَسولِ اللهِ فَأَخْبَرَهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى الرّجل فَدَعَاهُ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى الَّذِي قُلْتَ؟ فَجَعَلَ يَلْتَعِنَ وَيَحْلِفُ بِاللهِ : إِنَّهُ مَا قَالَ ذَلِكَ، وَقَالَ الرَّجُلُ الـمُسْلِمُ: اللَّهُمَّ صَدِّقِ الصَّادِقَ، وَكَذِّب الكاذِبَ، فَأَنْـزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيـة الْكريمَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرِي، بِرقم: (١٦٩٢٢)، وَابْنُ الـمُنْذِرِ وَابْنُ أَبِي حاتِم كَمَا فِي الـدر المنثور، ج ٣، ص ٤٥٤}.

واتە: قەتادە دەڵێ: بۆمان باسکراوە کە پیاوێك لە دووڕووەکان، دەربارەی ئەوانە کە لە جەنگی تـەبووك بەدواکەوتبـوون، وە ئـەوەی لـەبارەیانەوە دابەزی لـە قورئـان کـە دابەزی، گوتی: سوێـند بە خوا، ئەوانە گەورەکانی ئێمەنو ناودارەکانی ئێمەن، ئەگەر ئەوەی موحەممەد دەیڵێ، هەق بێ، ئەو گەورەو ناودارانەی ئێمە لە کەران خراپتـرن. پیاوێك لە مسوڵمانان گوێی لێبوو، گوتی: بە خوا ئـەوەی موحەممـەد دەیڵـێ: هـەقو ڕاستەو، تـۆش لـە کـەر خراپتـری، ئـەو پیـاوە دوو ڕووەش، ئـەو هەواڵـەی بـردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی ڕاگەیاند کە ئەو پیاوە ئاوای پێ گوتوە، ئەویش بەدوای ئەو پیاوە مسوڵمانەی دا ناردو بانگی کرد، گوتی: بۆچی وات گوتوە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بۆیە وام گوتوە چونکە ئەو وای گوتوە، ئەویش بە دوو ڕووەکەی فـەرموو: بۆچی تۆ وات گوتوە؟ چ شتێك پاڵی پێـوەنای وا بڵێـی؟ ئـەویش نـەفرینی لـە خـۆی کـردو سوێنـدی بـە خـوا خـوارد، کە قسـەی وای نەکـردوە، مسوڵـمانەکەش گـوتی: ئـەی خوایە! داوات لێدەکەم، ڕاستگۆ بە ڕاست بگێڕەو، درۆزن بە درۆ بخەوە، ئیدی خوای بـەرزی مـەزن لـەوبارەوە، ئـەم ئایـەتـەی نـاردە خـوار:

﴿يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ...﴾.

لێرەدا مەسەلەیەکی ڕەوانبێژیی (بلاغي) هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ ﴾، خواو پێغەمبەرەکەی شایستەترە، کە ڕازی بکەن، مەسەلەکە ئەوەیە کە لێرەدا ڕاناوەکە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەچێتەوە، ئنجا لەبەرئەوەش وایفەرمووە، چونکە ڕازیکردنی پێغەمبەر ﷺ، بریتیە لە خودی ڕازیکردنی خوای بەرز، هەروەها تووڕەکردنی پێغەمبەر ﷺ، بریتیە لە خودی تووڕەکردنی خوای بەرز.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴾، ئایا نازانن، واتە: دەبوو زانیبایان، کە ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەکەنو سەرپێچییان دەکەن، ئەوە ئاگری دۆزەخ چاوەڕێیانە، وە هەر کەسێکیش بچێتە ئەوێ، ئەوە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە وە سەرشۆڕییەکی مەزنی دێتە سەر.

وشەی ﴿ يُحَادِدِ ﴾، لە (حَدّ)ەوە هاتوە، واتە: دژایەتییکردنو بەربەرەکانێ کردن، وە (يشاقق) لە (شق)ەوە هاتوە، هەردووکیشیان یانی: ئەو لە لایەك، ئەم لە لایەك.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ ﴾، ئەوە پرسیارێکە بۆ سەرزەنشتو، بۆ تانەدانە، دەفەرموێ: دەبوو زانیبایان: کە هەر کەسێك دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، ئەوە ئاگری دۆزەخ جێگایەتی.

کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴾، دیارە ئاگری دۆزەخ، بۆ جەستەیانە، وە ئەو زەبوونییو سەرشۆڕییەش، بۆ ڕووحیانە، واتە: وێڕای سزاو ئازاری جەستەیی، سزاو ئازار دەروونیشییان هەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی هەشتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسەمان لە حەوت (٧) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (٦٤ تاکو ٧٠)، بابەتی سەرەکیی ئەم ئایەتانەش وەك دەرسی پێشوو بریتیە لە پێناسەکردن‌و پەردە لەسـەر هەڵماڵینی دەغەڵ‌و موونافیقەکان، سەرەتا خوای کاربەجێ باسی ترس‌و لەرزی موونافیقـەکان دەکـات، لـە دابـەزینی قورئـان‌و هـەواڵـدانـی لـە نهێـنییـەکانی نێـو دڵ‌و دەروونیـان.

پاشـان باسی ئەوە دەکات، کە ئەگەر پرسیاریان لـێ بکـرێ لـەبارەی ئـەو قسـەو قاڵـەوە کە دەیکـەن، پـاساو بەوە دێـننەوە، کە قسـەی ڕێ برین‌و گاڵتەیان کردوە، بـەڵام خـوا بـە پێغـەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: کە سـەرزەنشتیـان بکـات‌و پێیـان ڕابگـەیـەنـێ: کە لەسـەر گاڵتـەکردن بـە خـواو بـە ئایەتـەکانی‌و بـە پێغـەمبەر ﷺ، حـوکمی کوفریـان بەسـەردا دەدرێ! وە پێشیان بفەرموێ: با ئەو جۆرە بیانووانە نەهێـننەوە، چونکە جگە لەوانەیان کە تۆبە دەکەن، دووچاریی سزای خوا دەبن، بەهـۆی تاوانەکانیانەوە.

پـاشـان بە نـاوونیشـانی (المنـافقون والمنـافقات) بـە پێـنج سیفـەتی بنـەڕەتییـان، دەیانناسێنێ، وە ڕاشیدەگەیەنی کە سـەرەنجامیان دۆزەخە، دوایی بەراوردی سەرەنجامیان لەگەڵ هی کافرانی گەلانی پێشوودا دەکات، کە سـەروەت‌و سـامان‌و خزم‌و بنـەماڵـەی زۆر هیـچ دادی نـەداون.

پاشان سەرەنجامی شـوومی شەش لە گەلانی پێشوویان، بەهـۆی سـتەم‌و خراپەیانـەوە دەخاتەوە یاد، کە گەلەکانی نووح‌و عادو سـەموودو ئیبـراهیم‌و مەدیەن‌و لـووطن.

﴿ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ
ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا
كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا
تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ
كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ
بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ
إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ
وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ
﴿٦٨﴾ كَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرَ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا
فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم
بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا
وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ
قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ
أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ
يَظۡلِمُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ مونافیقەکان بیمی ئەوەیان هەیە کە سوورەتێکیان دابەزێتە سەر، هەواڵی ئەوەیان بداتێ کە لە دڵیان دایە (لە دەغەڵیی‌و نیازی خراپ) بڵێ: گاڵتە بکەن (بە ئیسلام‌و مسوڵمانان) بە دڵنیایی ئەوەی خۆی لێ دەپارێزن، خوا وەدەری دەخات ﴿٦٤﴾ وە ئەگەر (لەوبارەوە) لێیان بپرسی؟ بە جەختکردنەوە دەڵێن: بێگومان ئێمە وەنێو قسان دەکەوتین‌و یارییمان دەکرد! بڵێ: ئایا گاڵتەتان بە خواو بە ئایەتەکانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکرد؟ ﴿٦٥﴾ پۆزش مەهێننەوە، پاش ئیمانەکەتان، بێبڕوا بوون. ئەگەر لە کۆمەڵێکیشتان ببوورین، کۆمەڵێکتان ئازار دەدەین، لە سۆنگەی ئەوەوە کە تاوانبار بوون ﴿٦٦﴾ پیاوانی مونافیق‌و ئافرەتانی مونافیق، هەندێکیان لە هەندێکیانن. فەرمان بە خراپە دەکەن‌و، ڕێگریی لە پەسند دەکەن، وە دەستیان (لە بەخشین) دەگرنەوە، خوایان لە بیر کردو، ئەویش لەبیری کردن، بێگومان هەر مونافیقەکان لاڕێن ﴿٦٧﴾ خوا گفتی ئاگری دۆزەخی بە پیاوانی مونافیق‌و ئافرەتانی مونافیق‌و، کافران داوە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، (ئەی کافرینە!) ئەوێتان (بۆ سزادان) بەسە، وە خوا نەفرینی لێکردوون‌و ئازارێکی بەردەوام‌و نەپساوەیان هەیە ﴿٦٨﴾ (سەرەنجامتان) وەك (هی) ئەوانەی پێش خۆتانە، کە لە ئێوە هێزیان توندترو سامان‌و منداڵیان زیاتر بوون، ئنجا ئەوان لە پشك‌و بەشی (دنیای) خۆیان بەهرەیان وەرگرت‌و. ئێوەش وەك بەهرە وەرگرتن‌و ڕابواردنی ئەوانەی پێش خۆتان، ڕاتانبواردو بەهرەتان وەرگرت‌و، وەك وەنێو قسەو قاڵ کەوتنی وانیش، وەنێو کەوتن، ئەوانە لە دنیاو دواڕۆژدا کردەوەکانیان بە فیڕۆ چوون، وە هەر ئەوانەن زیانباران (ی ڕاستەقینە) ﴿٦٩﴾ ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان پێ نەگەیشتوە: گەلی نووح‌و عادو سەموودو گەلی ئیبراهیم‌و هاوەڵانی مەدیەن‌و (ئاوەدانییە) هەڵگێڕراوەکان(ی گەلی لووط). پێغەمبەرانیان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە، هاتنە لایان، (ئنجا کە خوا سزای دان) نەدەگونجا کە خوا ستەمیان لێ بکات، بەڵکو ئەوان ستەمیان لەخۆیان کرد ﴿٧٠﴾ }.

## شیکردنـەوەی هـەندێک لە وشـەکان

( يَحۡذَرُ ): (الحَذَرُ: احتِرازٌ عَنْ مُخِيفٍ، يُقَالَ حَذِرَ حَذَرَاً وَحَذَّرْتُهُ، وَالحِذْرُ مَا فِيهِ الحَذَرُ).

(حَذَرُ) بۆ خۆی بریتیە لـە خـۆپاراستن لە شتێکی مەترسیی لێکراو، دەگـوترێ: (حَذِرَ حَذَرَاً) واتـە: خـۆی لـێ پاراسـت، بیمی لێی هـەبوو، (وَحَذَّرْتُهُ) واتـە: بـیمم دایە بەرێ، وە ترساندم، کە دەفـەرموێ: ﴿وَلۡيَأۡخُذُواْ حِذۡرَهُمۡ وَأَسۡلِحَتَهُمۡ ١٠٢﴾ النسـاء، واتـە: وە با لە خۆیان وریا بـن‌و چەکەکانیان هەڵبگرن.

(ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ ): واتـە: گـاڵتـە بکەن، (الـهُزءُ: مَزْحٌ مَعَ خِفْيـة، وَالإِسْتِهْزَاءُ: إِرْتِيـادُ الـهُزْءِ، وَقَدْ يُعَبَّرُ بِهِ عن تُعَاطِي الـهُزْءِ).

واتـە: (هُـزءْ) بریتیـە لـە گـاڵتـەکـردنێکی بە پـەنهـان، وە (إِسْتِهْزَاء) واتـە: کـە (س) و (ت)ای هـاتۆتـە سـەرێ، بریتیـە لـەوەی کـە ئینسان بە دوای شتێك دا بگەڕێ کە گـاڵتەی پێبکات، وە جاری واش هـەیە، بە خودی گاڵتـە پێکـردنەکە، تـەعبیـری پـێ دەکـرێ.

(نَخُوضُ ): دەرژێینە نێوی، دەکـەوینە نێـوی، (الخَوْضُ: هُوَ الشّروعُ فِي الـمَاءِ وَالـمُرورِ فِيـهِ، وَيُسْـتَعَارُ فِي الأُمُورِ، وَأَكْثَرُ مَا وَرَدَ فِي القُرآنِ، وَرَد فِيما يُذَمُّ الشّروعُ فِيهِ).

(خَوْض) بریتیـە لـە چـوونە نێـو ئـاو، وە بە نێویدا ڕۆیشتن، (ئـەو گوتوویـەتی: ئـاو، بەڵام دەشگونجێ بە نێـو قوڕاوو چڵپـاوو هـەر شتێکی دیکـەی شل بکـەوێ) وە دەخـوازرێتـەوە بـۆ وە نێـو کـەوتنی چـوونە نێـو هـەندێ قسـەو باسـەوە، وە بـە زۆریـی کـە لـە قورئـان دا هـاتوە، بـە مانـای وەنێوکـەوتنی شـتی سـەرزەنشـتکراوو خـراپ هـاتـوە.

(وَنَلْعَبُ ): واتە: يارییمان دەكرد، كە مەبەست پێی گاڵتە كردنە، دەگوترێ: (لَعِبَ فُلَانٌ: إذَا كَانَ فِعْلُهُ غَيْرَ قَاصِدٍ بِهِ مَقْصَداً صَحِيحاً، يَلْعِبُ لَعِباً).

واتە: فلان كەس یاریی كرد، ئەگەر كردەوەكەی مەبەستێكی ڕاستی لە پشتەوە نەبێ، ئامانجێكی باشی لە پشتەوە نەبێ، دەگوترێ: (يَلْعَبُ لَعِباً) یاریی دەكات. یاریی كردن.

( لَا تَعْتَذِرُواْ ): واتە: پۆزش‌و پاساو مەهێننەوە، یاخود داوای لێبوردن مەكەن. (العُذْرُ: تَحَرِّي الإنْسَانِ مَا يَمْحُو بِهِ ذُنُوبَهُ، اعْتَذَرْتُ إلَيْهِ: أتَيْتُ بِعُذْرٍ، وَعَذَرْتُهُ: قَبِلْتُ عُذْره).

(عُذْر) بریتیە لەوە كە ئینسان بخەفتێ لە شتێك، كە گوناهەكانی خۆی پێ بسڕێتەوە، دەگوترێ: (اعْتَذَرْتُ إلَيْهِ) واتە: پاساوم بۆی هێنایەوە، بە شێوەیەك كە داوای لێبوردنم لێكرد، وە (عَذَرْتُهُ) واتە: داوای لێبوردنم، لێ قبووڵ كرد.

(مُجْرِمِينَ ): واتە: تاوانباران، (مُجْرِم) كەسێكە كە تاوانێك دەكات، (الجُرْمُ وَالجَرِيْمَةُ: الذَّنْبُ، جَرَمَ وَأجْرَمَ وَاجْتَرَمَ..).

(جُرم) وە (جَرِيْمَة) بە گوناح دەگوترێ، دەگوترێ: (جَرَمَ وَأجْرَمَ وَاجْتَرَمَ) هەر سێكی بە كرداری ڕابردوو، بە مانای گوناهی كرد، یان تاوانی كرد، دێ.

( ٱلْمُنَٰفِقُونَ ): دوو ڕووەكان، كە من وشەی دەغەڵەكانی بۆ بەكاردێنم، (النِّفَاقُ: هُوَ الدُّخُولُ فِي الشَّرْعِ مِنْ بَاب، وَالخُرُوجِ عَنْهُ مِنْ بَاب، وَمِنْهُ نَافِقَاء اليربوع).

(نِفَاق) بریتیە لەوە كە لە دەرگایەكەوە بچیە نێو شەرع، (واتە: بچیە نێو شەریعەتی ئیسلام) وە لە دەرگایەكی دیكەوە، لێی بچیە دەرێ، ئنجا ئەوە لە (نفق)ەوە هاتوە، (وَالنَّفَقُ: السَّرَبُ فِي الأرْضِ النافِذ فِيهِ).

(نَفَقْ) بریتیە لە كونێك كە لە زەویەوە دەربچێ، یانی: دوو سەری هەبن. وە (نافِقَاء) بە كونی جورج دەگوترێ، كە دوو كون لێدەدات، كە تینی بۆ هات

لە لایەك، لە لایەکەی دی دەربچێ، موونافیقیش وەك جورج وایە، کە مسولمان لێیان پرسی؟ دەڵێ: لەگەڵ ئێوەم، وە کە کافر لێیان پرسی؟ دەڵێ: لەگەڵ ئێوەم.

(وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ): (يَمْتَنِعُون مِنَ الإِنْفَاقِ، القَبْضُ: إمْسَاكُ اليَدِ).

(يَمْتَنِعُون) واتە: نابەخشن، دەستی خۆیان لە بەخشین دەگرنەوە، چونکە وشەی (قبض) بریتیە لەوە کە ئینسان دەستی خۆی لە شتێك بگرێتەوە، هەڵبەتە (قبض) بریتیە لە دەست نووقاندن، بەڵام بە زۆریی وایە کە ئینسان ئەگەر نەیەوێ شتێك ببەخشێ کە لە دەستیدا دەبێ، دەستی توند دەگرێ بۆئەوەی لە دەستی نەیەتە دەرێ.

(نَسُواْ ٱللَّهَ ): واتە: خوایان لە بیر کرد، (النِّسْيانُ: تَرْكُ الإِنْسان ضَبْط ما اسْتَودِعَ وَلاَزِمُهُ: الإِهْمَال).

(نسیان) بریتیە لەوە کە ئینسان واز لە کۆنترۆل کردنی شتێك بێنێ، کە پێی سپێردراوە، بیپارێزێ، کە ئەمە دەرەنجامەکەی بریتیە لە فەرامۆش کردن و پشت گوێ خستن.

(فَٱسْتَمْتَعُواْ ): واتە: ڕایان بوارد، یان بەهرەمەند بوون، یان لەززەتیان وەرگرت، چونکە دەڵێ: (الإِسْتِمْتَاعُ: طَلَبُ التَّمَتّع، المَتَاعُ: السِّلْعَةُ والمَنْفَعَةُ، وَمَا تَمَتَّعْتَ بِهِ).

(إِسْتِمْتَاع) بریتیە لەوە کە ئینسان بە دوای ڕابواردندا بگەڕێ، وە (مَتَاع) کەلوپەلێکی بە سوودە، یان هەر شتێکە کە ئینسان بەهرەیەکی کاتیی لێوەردەگرێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾﴾ التوبة، واتە: ڕابواردن و سوود لێوەرگرتن و بەهرە لێوەرگرتنی ژیانی دنیا، لە چاو هی دواڕۆژ زۆر کەمە.

(بِخَلَٰقِهِمۡ ): (الخَلاَقُ: النَّصِيبُ، مَا اكْتَسبه الإِنْسان مِنَ الفَضِيلَة بِخُلقه).

(خَلاَق) واتە: پشك و بەش، هەروەها ئەوەی کە ئینسان بە ڕەوشتی جوانی خۆی، ئاکارێکی پەسند بەدەست بێنێ، ئەویش پێی دەگوترێ: (خلاق).

(حَبِطَتْ ): (حَبِط عَمَلُهُ: بَطَلَ ثَوَابُهُ أَوْ بَطَلَ نَفْسُهُ).

(حبط) یان بەو مانایە دێ: پاداشتەكەی هەڵوەشێتەوە، یان خودی كردەوەكە پووچ بێتەوە، وەك بڵقی سەر ئاو، چونكە هەر كردەوەیەك كە بە ناوی دینداریەوە بكرێ، مادام خوا پێ مەبەست بوونی تێدا نەبێ، وە بە پێی شەرع نەبێ، ئەمە وەك چۆن شیرێك كە هەوێنی تێ نەكرێ هەڵدەبزرِكێ‌و دەترشێ‌و، دەبێ فڕێ بدرێ. ئەو كردەوانەش كە هەوێنی ئیخلاصیان تێدانەبێ، وە بە پێی شەرع نەبن، وەك شیری بێ هەوێن دەترشێن‌و بە كەڵك نایەن.

(نَبَأُ ): واتە: هەواڵ، (النَّبَأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أَو غَلَبَةُ ظَنٍ. وَلاَ يُقَالُ لِلْخَبَرِ فِي الأَصْلِ نَبَأ، حَتَّى يَتَضَمَّنَ هَذِهِ الأَشْيَاء الثَّلاَثَة).

(نَبأ) بریتیە لە هەواڵێك كە سوودێكی مەزنی تێدابێ، كە بەهۆی ئەو هەواڵەوە زانیاریی یاخود گومانێكی زاڵت بۆ پەیدابێ، وە بە (خَبَر) ناگوترێ: (نَبأ) تا ئەو سێ شتەی تێدانەبن: سوودێكی مەزنی هەبێ، زانیارییەكی پێ پەیدابێ، یاخود ببێتە هۆی ئەوەی گومانێكی زاڵت بۆ پەیدابێ بەهۆی ئەو هەواڵەوە.

(وَالْمُؤْتَفِكَاتِ ): واتە: ئەو شارانەی كە هەڵگێڕدرانەوە، (الإِفْك: كُلُّ مَعْرُوف عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ).

(إفْك) بریتیە لە هەر شتێك لەو ڕووەوە كە دەبێ لەسەری بێ لێی لابدرێ. (المُؤْتَفِكَات: المُدُنُ الَّتِي قَلَبَهَا اللهُ تَعَالَى عَلَى قَوْمِ لُوط)، (مُؤْتَفِكَات) ئەو شارانەن كە خوای بالادەست بەسەر گەلی لووط دا هەڵیگێڕاونەوە، واتە: ژێرو ژووری كردن، سەرەو بنی كردن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو ئایەتەی کە خوا تێیان دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

لەبارەی هۆی هاتنەخواری ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە، ئەم بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە:

﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ رَجُلٌ فِي غَزْوَةِ تَبوك فِي مَجْلِسٍ يَوماً: مَا رَأَيْنَا مِثْلَ قُرَّائِنَا هَؤُلاءِ، لاَ أَرْغَبَ بطونا، ولاَ أَكْذَبَ أَلْسِنَةً، وَلاَ أَجْبَنَ عِنْدَ اللِّقَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ فِي الْمَجْلِسِ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ مُنَافِقٌ، لأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَنَزَلَ الْقُرآن، قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ مُتَعَلِّقَاً بِحَقَبِ نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ وَالْحِجَارَةُ تَنْكُبه، وَهُوَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ، وَالرَّسُولُ ﷺ يَقُولُ: (أَبِاللَّهِ وَءَايَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ؟)﴾ {(أخرجه الطبري، ج١٠، ص١١٩، وابن أبي حاتم، برقم: (١١٨٣٠)، وَصَحَّحَهُ مُؤَلِّفَا الإستيعاب: ج ٢، ص ٢٨٧}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێك پیاوێك لە جەنگی تەبووك لە کۆڕێك دا دانیشتبوو، گوتی: ئێمە وەك ئەو قورئان خوێنانەمان نەبینیوە: زۆر خۆرتر، وە درۆزنتر، وە لەکاتی بەرەنگارییشدا، ترسنۆکتر، پیاوێك لە کۆڕەکەدا گوتی: درۆ دەکەی، بەڵام تۆ موونافیقی بۆیە وا دەڵێی، هەواڵیش بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەم، وە هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتو، قورئان دابەزی، دەڵێ: ئەو کابرایەم بینی، خۆی بە قەیاسەی کورتانی حوشترەکەی پێغەمبەر ﷺ هەڵواسیبوو، (دەستی پێوە گرتبوو)، حوشترەکەی دەڕۆیی، ئەویش پێی لە زەوی دەخشاو پێی بە

بەردان دەکەوت، وە کابرا دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئێمە هەر وەنێو قسان دەکەوتین و یاریی و گاڵتەمان دەکرد، (واتە: حاشای لە قسەکان نەکردوە) پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ئایا گاڵتەتان بە خواو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکرد؟! ئنجا لەوبارەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوار.

شایانی باسە کاتی خۆی وشەی (قُرَّاء) کە بەکارهێنراوە، مەبەست پێی زانایان بووە. چونکە ئەو کاتە زانایی لە ئیسلامدا، بەهۆی شارەزاییەوە لە قورئاندا بووە، کێ زیاتر قورئانی لەبەر بووبێ و، چاکتری تێگەیشتبێ، ئەوە زاناتر بووە لە ئیسلامدا، چونکە ئەسڵ و مەتنی ئیسلام قورئانە، هەڵبەتە ئێستاش هەر دەبێ وابێ، چونکە سوننەت و ڕێگای پێغەمبەر ﷺ جگە لە بەرجەستەکردنی قورئان، لە ئەرزی واقیع دا شتێکی دیکە نیە، وە ڕوونکردنەوەی پێغەمبەریش ﷺ بۆ قورئان هەر ئەوەیە کە پێشانمان بدات، کە ئەم قورئانە چۆن جێبەجێ دەکرێ؟ چ لە ڕووی خواپەرستیی تاکەکەسیی، چ لە ڕووی دروشمەکانەوە، لە ڕووی جەنگ و ئاشتییەوە، چ لە ڕووی حوکم و سیاسەتەوە، لە گشت ڕووەکانەوە، ئەم قورئانە چۆن جێبەجێ دەکرێ؟ ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوننەتی خۆی دا، بۆی ڕوون کردووینەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار لە درێژەی خستنەڕووی نهێنییەکانی دوو ڕووەکان داو، بەرپەرچدانەوەی قسەو قاڵیانو، تیشك خستنە سەر خیانەتەکانیان، دەفەرموێ:
﴿ يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْ ﴾.

مونافیقەکان بیمو مەترسیی ئەوەیان هەیە، کە سوورەتێکیان دابەزێتە سەر هەواڵیان پێبدا بەوەی کە لە دڵەکانیاندا هەیە.

چی لە دڵیاندا هەیە؟ بێگومان ئەوەی لە دڵیان دایە، بریتیە لە بوغزو غەرەزو پیلانو فێڵو نیازو مەبەستی خراپ، بەرانبەر بە ئیسلامو مسوڵمانان.

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾، پێیان بڵێ: گاڵتە بکەن! بێگومان خوا دەرهێنەری ئەوەیە کە ئێوە بیمتان لێی هەیەو، مەترسییتان لێی هەیە، کە بریتیە لەو نهێنییو پیلانە گڵاوانەی، لە دڵو دەروونیاندا هەیە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: گاڵتە بکەن؟!

دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، کە مونافیقەکان کاتێك کە سوورەتێك دەهاتە خوار، گاڵتەیان پێی دەهات، چونکە پێیان وابووە کە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ئەو ئایەتانە دەفەرموێ، بە گاڵتە کردنەوە گوتوویانە: ئایا خوا ئایەتێکی دیکە دادەبەزێنێ؟ خواش ﷻ فەرموویەتی: بڵێ: گاڵتە بکەن، بێگومان ئەوەی ئێوە مەترسییتان لێی هەیە، خوا ﷻ دەری دەخات.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ﴾، وە ئەگەر پرسیاریان لێبکەی، دەربارەی ئەم قسەو قاڵو پڕوپاگەندە خراپانەوە، کە دەیکەن؟

زۆر بە دڵنیاییو جەخت لەسەر کردنەوە، دەڵێن: بێگومان ئێمە تەنیا وەنێو قسان دەکەوتین، وە یاریی و گاڵتەمان دەکرد.

واتە: مەبەستی خراپمان نەبوو، هەروا بۆخۆمان قسەمان دەکرد، قسە قسە دێنێ، ئاوا، نەك بە جیددیی گاڵتەمان کردبێ و تانەمان لە ئیسلام دابێ!!

ئنجا ئەوان کە دەڵێن: یاریی و گاڵتەمان دەکرد، خواش دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾، بڵێ: ئایا گاڵتە بە خواو بە ئایەتەکانی و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن؟ ئایا گاڵتەتان بەو سێیانە دەکرد؟

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ ﴾، پۆزش مەهێننەوە. لە دوای ئەو ئیمانەتان کە هەتان بووە، بێ ئیمان بوونەوە.

خوا ئیمانەکە پاڵدەداتە لای وان، نەیفەرمووە: (قد كفرتم بعد الإيمان)، ئەگەر وای فەرمووبایە، ئەو کاتە (ئیمان) واتە: ئەو ئیمانەی کە ڕاستەقینەیە، ئەو ئیمانەی کە لەلای خوا جێی ئیعتیبارە، بەڵام کە ئیمانەکە پاڵ دەداتە لای وان، واتە: ئەو جۆرە ئیمانەی، کە لە ئێوە دەوەشێتەوە، کە دیارە ئیمانێکی ڕاستەقینەیان نەبووە، هەر ئیمانێکی ڕواڵەتییان هەبووە.

ئنجا لە دوای ئەو ئیمانە ڕۆاڵەتییەشتانەوە، کوفرتان کرد ! واتە: ئیمانە ڕواڵەتییەکەتان هەڵوەشاندەوە، بەهۆی ئەو کوفرەوە، کە بە دەمتاندا هات.

﴿ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

ئەگەر - گریمان - لە کۆمەڵێکتان ببوورین، بۆچی خوا لێیان دەبووری؟ چونکە پەشێمان دەبنەوە، وەك دوایی لە درێژەی ئایەتەکاندا دەیگەینێ، کەسی وا هەبووە لە مونافیقەکان، کە دوایی هاتوەو تۆبەیەکی باشی کردوەو، دانی بە هەڵەی خۆیدا هێناوە، ئنجا ئەگەر لە هەندێکتان ببوورین، ئەوە هەندێکتان سزا دەدەین، بۆچی؟ چونکە تاوانبار بوون، دیارە هەموویان هەر تاوانبار بوون، بەڵام ئەوانەی کە خوا لێیان دەبووری، دەگەڕێنەوەو پەشێمان دەبنەوە لە تاوانەکەیان، خواش لێیان دەبووری. بەڵام ئەوانەی دیکە، لەسەر ئەو تاوانو خراپەیان هەر بەردەوام دەبن.

ئنجا خوای پەروەردگار پیاوانی موناڤیق و ئافرەتانی موناڤیق، بە چەند سیفەتێك پێناسە دەكات، دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾، پیاوانی موناڤیق و ئافرەتانی موناڤیق، هەندێکیان لە هەندێکیانن.

یانی: سەرو کاریان پێکەوەیەو تێکەڵن.

لێرەدا جێی سەرنجە! خوای بەرز ئافرەتانی موناڤیق، لە ڕیزی پیاوانی موناڤیق دا باس دەكات، واتە: ڕۆڵی ئافرەتانی موناڤیق، کەمتر نیە لە هی پیاوانی موناڤیق، وە پێکەوەش هاوکارن!

ئنجا لەبارەی سیفەتێکی دیکەیانەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ ﴾، فەرمان بە شتی ناپەسند دەکەن، شتی ناپەسند چییە؟

بریتیە لە کوفر بە خوا، بە ئایەتەکانی خوا، بە پێغەمبەر ﷺ، وە بریتیە لە دەستگرتنەوە لە ماڵ خەرج کردن بۆ مسوڵمانان، بۆ فیداکاریی، ﴿ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وە ڕێگرییش دەکەن لە شتی چاك، ڕێگریی دەکەن لە پێغەمبەری خوا، لە ئایەتەکانی خوا، وە لە ماڵ بەخشین، وە لە هاوکاریی مسوڵمانان، واتە: هەرچی شتی خراپە، فەرمانی پێدەکەن، وە هەرچی شتی باشە، ڕێگریی لێدەکەن.

﴿ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ﴾، دەستی خۆشیان دەگرنەوە: هەم لە بەخشین، هەم لە فیداکاریی و بەرگریی کردن، لە ئیسلام، لە هەموو شتێکی چاك دەست دەگرنەوە.

سیفەتێکی دیکەیان: ﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾، خوایان لە بیر کردوە، واتە: خواو ئایینی خواو پێغەمبەری خوایان، پشت گویٚ خستوە، خواش ﷻ لە بیری کردوون، واتە: پشتگوێی خستوون، وە وا مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، وەك چۆن کەسێك شتێك لەبیر دەكات، ئاوا بە کەم تەماشای کردوون، ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، بێگومان موناڤیقەکان بە نێرو مێیانەوە، لادەرو لە ڕێ دەرچوون.

ئنجا باسی سەرەنجامیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ﴾، خوا گفتی داوە بە پیاوانی موونافیق‌و ئافرەتانی موونافیق‌و کافرەکان، (چ گفتێکی پێداون؟) گفتی ئاگری دۆزەخی پێداون، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، وە ئەو ئاگری دۆزەخە بەسیانە، کە پێی سزا بدرێن، ﴿ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، وە خوا نەفرینی لێکردوون، ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾، وە ئازارو سزایەکی بەردەوام‌و نەپساوەشیان هەیە.

کەواتە: ئەگەر گفت‌و بەڵێنێك لەلایەن خواوە بۆ ئەوانە هەبێ، تەنیا ئاگری دۆزەخ‌و نەفرین لێکردنیانە.

ئنجا خوا ﷻ بەراوردی سەرەنجامی موونافیقەکان‌و کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، وە ئێستاو تاکو دنیا کۆتایی پێ دێ، دەکات، لەگەڵ سەرەنجامی شوومی گەلانی پێشوودا، کە ئەوانیش بەهۆی کوفرو نیفاقەوە، تووشی ماڵ وێرانیی بوو ون، دەفەرموێ: ﴿ كَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا ﴾، واتە: سەرەنجامی ئێوەش وەك هی گەلانی پێشێ دەبن، (ماڵ وێران دەبن)، کە هێزیان لە هێزی ئێوە توندتر بوو، (ئەوە لە ڕووی سیاسییەوە دەسەڵاتەوە)، وە لە ڕووی ئابوورییشەوە: ماڵ‌و سامانیان زیاتر بوو، وە لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە منداڵ‌و وەچەو خزم‌و کەسیشیان زیاتر بوو.

﴿ فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ ﴾، ئنجا ئەوان ئەو بەشەی کە هەیانبوو، پێیان ڕابواردو، لێی بەهرەمەند بوون، وە ئێوەش لە پشك‌و بەشی خۆتان بەهرەمەند بوون، وەك چۆن ئەوانی پێش ئێوە لە پشك‌و بەشی خۆیان لە دنیادا، بەهرەمەند بوون.

دوایی باسی دەکەین، کە خوای کارزان لێرەدا، سێ جار وشەی (إستمتاع) دووبارە دەکاتەوە، واتە: ئەوانەی پێش ئێوە: زۆر خەریکی ڕابواردن‌و کەیف‌و سەفا بوون، هەر

خەریکی تێرکردنی ئارەزووەکانیان بوون، ئێوەش بە هەمان شێوە، وەك وانن، ﴿وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْ﴾، وە ئێوەش وەنێو کەوتن، وەك بەنێو کەوتنی ئەوان، بەنێو چی کەوتن؟

بە نێو قسەی پووچ، پروپاگەندە، گاڵتەو یاریی و گەمە کردن، بە ئایینی خوا، بە پێغەمبەری خوا ﷺ، بە مسوڵمانان، ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَـٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾، ئا ئەوانە، واتە: ئەوانەی کە بەو شێوە بوون، یان ئەوانەی کە بەو شێوە دەبن، ئێوەش و ئەوانەی پێش ئێوەش، کردەوەکانیان لە دنیاو دوارۆژدا، هەڵوەشاونەوە، ﴿وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَـٰسِرُونَ ٦٩﴾، وە هەر ئەوانەش زیانباری ڕاستەقینەن.

ئنجا لە کۆتایی دا، خوای زاناو شارەزا جارێکی دی، سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، ئەگەر لە ئایەتی پێشێ دا بە گشتی بەراوردی کرد لە نێوان سەرەنجامی شوومی مونافیق و دەغەڵەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و ڕۆژگارەکانی دواییش، لەگەڵ هی کافرو مونافیقەکانی پێشوودا بە گشتی، ئەمجارە بە شێوەیەکی تایبەت و دیار، شەش وێنە دێنێتەوە لە مێژووی گەلانی پێشوو، لەگەڵ پێغەمبەرانیاندا.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾، ئایا هەواڵی گرنگی ئەوانەی پێش خۆیانیان بۆ نەهاتوە، کە چۆن لە بەین چوون؟ کێن ئەوانە؟

شەش وێنە دێنێتەوە:

﴿قَوۡمِ نُوحٖ﴾، گەلی نووح، کە دیارە خوا لە قورئاندا باسی ناوی گەلی نووحی نەکردوە، وا پێدەچێ لەسەردەمی نووح دا، هەر ئەوەندە مرۆڤانە هەبووبن، کە نووحیان بۆ لا ڕەوانە کراوە، وە دواییش کە خوا تۆفانی بۆ ڕەوانە کردوون، واپێدەچێ ئەو کافرانەی گەلی نووح کە لەبەین چوون، سەر زەمین کەسی دیکەی تێدا نەمابێ، جگە لەوانەی کە لەگەڵ نووحدا بە ئیمانەوە سواری کەشتییەکە بوون.

واتە: خوای کارزان جۆماڵێکی سەر زەوی کردوە، وە گەسکێکی لێداون و سەر زەوی پاك کردۆتەوە لە ئەهلی کوفر.

ئنجا دووباره جارێکی دیکه وەچەیەکی تازەی بەشەر، کە ئەوانە بوون لەگەڵ نووح دا سواری کەشتییەکە بوون، بە ئیمانەوە هاتوونەتەوە سەر زەوی‌و ئاوەدانیان کردۆتەوە.

خوای پەنهانزان ناوێکی دیاریی کراویان بۆ بەکارناهێنێ، ﴿ قَوۡمِ نُوحٖ ﴾.

وە گەلی عاد، کە پێغەمبەرەکەیان هوود ﷺ بووە.

وە گەلی سەموود کە پێغەمبەرەکەیان صالح ﷺ بووە.

وە گەلی ئیبراهیم ﷺ، کە هەم لە عێراق بووەو، هەم لە شام بووە، هەم چووە بۆ میسر، وە هەم لە حیجاز بووە، بۆیە دەفەرموێ: ئەو کۆمەڵەی کە ئیبراهیمیان بۆ لا ڕەوانەکرا، دیسان لە قورئاندا خوای پەروەردگار باسی گەلی ئیبراهیمی نەکردوە، بە ناوێکی دیار.

﴿ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ ﴾، وە ئەو خەڵکەی کە لە مەدیەن بوون، کە پێغەمبەرەکەیان ناوی شوعەیب ﷺ بوو، کە بەپێی ڕایەکی زانیان ئەو پێغەمبەرە. هەم بۆ لای گەلی مەدیەن ڕەوانە کراوە، وە هەم بۆ لای خاوەنانی درەختەکە (أصحاب الأَیكة)، پێشتر لە تەفسیری سوورەتی ئەعرافدا باسمان کرد، واتە: هاوەڵانی باغە چڕو پڕەکە، یان هاوەڵانی درەختە مەزنەکە.

بەشێکیش لە زانیان گوتوویانە هەر کام لە (مدین) و (أصحاب الأَیكة) هەر یەك گەل‌و کۆمەڵگا بوون، بەڵام ئەو دوو ناوەیان بۆ بەکارهاتوون.

وە ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِ ﴾، واتە: شارەکانی سەدووم‌و عەمووڕەو ئەوانە، کە هەڵگێڕدرانەوە، کە دیارە پێغەمبەر لووط ﷺ چوو بۆ لایان‌و، پەیامی خوای بەرزی پێ ڕاگەیاندن، بەڵام ئەوانە لەبەرئەوەی سروشتی خۆیان هەڵگێڕابۆوەو، لەجیاتی ئەوەی بۆ تێرکردنی غەریزەی جنسیی لەگەڵ ئافرەتان دا جووت بن، بۆئەوەی وەچەی مرۆڤ بەردەوام بێ، دەچوون لەگەڵ پیاوان دا جووت دەبوون، وە ئافرەتەکانیشیان لەگەڵ ئافرەتان دا جووت دەبوون، کە ئەگەر بەو پێیە بووایە، چۆن دیناسۆر بڕایەوە، مرۆڤیش دەبڕایەوە! ئەگەر هەموو خەڵك وەك وانی کردبایە، ئنجا ئەوان سروشتی خۆیان هەڵگێڕابۆوە، بۆیە خواش شارەکانیانی هەڵگێڕانەوە لە دنیادا.

ئنجا باسی هەموویان پێکەوە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾، پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانەوە چوون بۆ لایان، ﴿فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾﴾، نەدەگونجا خوا ستەمیان لێبکات، بەڵام هەر بۆخۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

واتە: خوا لێی ناوەشێتەوە کە ستەم بکات، چونکە کەسێك کە ستەم دەکات، دیارە ئامانجێکی هەیە بە ستەم نەبێ، بۆی نایەتە دی، بەڵام خوا بێنیازە لە هەموو شتێك، وە هەموو شتێك نیازمەندی خوایە، کەواتە: پێویستی بە هیچ شتێك نیە، تاکو ستەمی بۆ بکات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

(الحذر: إحترازٌ مِنْ مخيف)و، (حذر) وریا بوونە لە شتێکی مەترسیی لێکراو. لەخۆت وریابی، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ترسو بیمت لە شتێك هەیە.

کەواتە: مونافیقەکان مەترسییو بیمیان هەبووە، لەوەی کە سوورەتێکیان دابەزێتە سەر، هەواڵیان لێبدا لەوەی کە لە دڵەکانیاندا هەیە.

(السورة: طائفة معينة من آيات القرآن، ذات مبدأ ونهاية)، (سورة) بریتیە لە کۆمەڵە ئایەتێکی دیاریکراوی قورئان، کە سەرەتایان هەیەو کۆتاییان هەیە.

ئنجا کە دەفەرمویٚ: ﴿ تُنَبِّئُهُم ﴾، کە چاوگەکەی (التنبئة)، بریتیە لە هەواڵ پێدانو ئاگادارکردنەوە، کە مەبەست پێی هەواڵ پێدانی مسوڵمانانو ئاگادارکردنەوەیانە لە دەغەڵەکان، ئەگەرنا ئایەتەکان ڕاستەوخۆ بۆ مونافیقەکان نەچوون، پێیان بفەرموون: ئەوەتان لە دڵدایە، هەروەها مونافیقەکان کە زانیویانە چییان لە دڵدا هەیە، پێویستی نەکردوە هەواڵیان پیٚ بدریٚ، کەواتە: مەبەست ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانانە، بەوەی کە لە دڵی مونافیقەکاندا هەیە.

لێرەدا ئیشکالێك دێتە پێش: مونافیقەکان بە تەئکید بڕوایان بەوە نەبووە کە ئەو قورئانە وەحی خوایەو بۆ پێغەمبەر ﷺ دادەبەزیٚ، ئەدی چۆن بڕوایان وا بووە لە ئاسمانەوە سوورەتێك لە قورئان دابەزیٚ، نهێنییەکانی دڵیان ئاشکرا بکاتو بخاتەڕوو؟!

سیٚ وەڵام بۆ ئەم ئیشکالە هەن:

١/ مونافیقەکان کە وایان پێشانداوە ترسیان هەیە، مەبەستیان پێی گاڵتە پێکردنی مسوڵمانانە، واتە: لەنێو خۆیاندا بە یەکدییان گوتوە: وا مەڵێ، با سوورەتێک دانەبەزێ! بەڵام مەبەستیان پێی گاڵتەکردن بووە، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ﴾، کەواتە: بیمو ترسیان لەوە هەبووە کە بێبڕواییەکەیان ئاشکرا بێ، وە لە خۆ وریا بوونەکەیان بە گاڵتەپێکردنەوە بووە، بۆیە خوا دەفەرموێ: بڵێ: گاڵتە بکەن، بێگومان خوا دەرخەری ئەوەیە کە دەیشارنەوە، کە ئێوە ترسو بیمتان لێی هەیە کە ئاشکرا بێ.

٢/ بە ئەزموون بۆیان دەرکەوتوە، کە لەو حاڵانەدا ئەوان لە نێوان خۆیان پیلان دەگێڕن، دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی دەزانێ، بۆیە گوتوویانە: با لە خۆمان وریابین، بە شێوەیەکی وا ئەو قسانە بکەن، دوایی نەزانرێنەوە.

٣/ ئەوانە یەقینیان نەبووە، کە ئەوە وەحی نیەو دانابەزێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو گومانیان هەبووە، کە ڕەنگە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوابێو ڕاستیش بکات.

منیش بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتوە، کە کوفر هەرگیز مرۆڤ ناگەیەنێتە یەقین، وە ئەهلی کوفر هەرگیز لە کوفری خۆیان لە دڵنیاییو یەقیندا نین، هەمیشە ئەگەری ئەوە دادەنێن، کە ئەوەی بەرانبەر ڕاستبێ، ئینسان تەنیا بە ئیمان دەگاتە یەقین، چونکە ئیمان پشت ئەستوورە بە عەقڵو مەنتیقو، بە سروشتی ئینسان، بە عیلم، بە واقیع، بەڵام کوفرو نیفاق، پشت ئەستوور نیە بە هیچ کام لەوانە، بۆیە هەمیشە ئەهلی کوفر لە جۆرێک لە دوو دڵیی دان.

شایانی باسە من هەر سێ وەڵامەکانیشم پێ جوانن بۆ لابردنی ئەم ئیشکالە.

<u>مەسەلەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

کە پێشـتـریش تـەفسـیـرمان کـردن: (نخـوض ونلعب) واتــە: (نخـوض فـي الکلام ونقطع الطـریق) واتـە: وەك چۆن کەسێك بە نێو ئاوو جۆگەیـەك دەکـەوێ، ئێمـەش ئاوا بە نێو قسان دەکەوتین، قسەی گاڵتەو گەپمان دەکرد، قسەی ڕاستییمان نەبوو. وە قسەی ئەوەمان دەکـرد کـە ڕێگای پـێ ببـڕین.

بەڵام خـوای پـەنهانـزان ئـەو پۆزشـەیـان لـێ قبـووڵ نـاکـات، بەڵکو بۆیـان بە کوفر لـە قەڵـەم دەداتو، دەفـەرموێ: بڵـێ: ئایـا گاڵتـە بە خـواو، بە ئـایـەتـەکانی خـواو، بـە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ دەکەن؟ پـۆزش مەهێـننەوە، بـەم جـۆرە بیـانوو هێـنـانەوانە. خـۆتـان مەپەڕێـننەوە، ئێـوە لە دوای ئیمانەکەتـان بێبـڕوا بـوون، یـانی: لـە دوای ئـەو ئیمـانەی کـە تـایبەتـە بە ئێوەوە، نەك ئـەو ئیمانە ڕاستەقینـەیەی کـە لـە لای خـو پێی بە ئیمـاندار لـە قەڵـەم دەدرێـن.

ئنجـا ئــەوە لــە شوێـنی دیکـەشـدا هـاتوە، وەك لـە شوێـنی خـۆی دەیگـەینـێ. دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ﴾ التوبـة.

واتـە: لـە دوای ئـەو ئیسلامەتییـەی ئـەوان، {ئیسلامەتییـەکی تـایبەت بـەوان، کـە زۆر ڕووکـەشییو بێ ڕووح بووە}، کوفریـان کـردوە.

هـەروەها لـە سووڕەتی (الحجـرات)یشدا دەفـەرموێ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟ ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾.

واتـە: (عەڕەبە خێڵەکییەکان کـە هـاتوونە نێـو ئیسلام) منـەتت لـەسـەر دەکـەن. بڵـێ: ئـەو ئیسلامەتییـەی خـۆتـان، لـەسـەر مـن مەکـەنە منـەت، نەیفـەرمووە: (لا

تمنُّوا عليَّ الإسلام)، چونکە (إِسۡلَٰمَكُمۡ) واتە: ئەو ئیسلامەتییەی کە تایبەتە بە خۆتانەوە، کە ئیسلامەتییەکی ڕووکەش‌و بێ ڕووح‌و ڕواڵەتییە.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ﴾، واتە: ئەگەر لە کۆمەڵێکتان ببوورین، خوا لە کێ دەبووری؟ بێگومان لە کەسانێك کە بگەڕێنەوەو پەشێمان ببنەوە، ﴿نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ﴾، کۆمەڵێکی دیکەتان سزا دەدەین (لە دوارۆژدا).

ئنجا خوا ﷻ بۆچی سزایان دەدات، وە ئەوانە کێن؟ لەبەرئەوەی ئەوانە تاوانبار بوون، واتە: خوای دادگەر بەهۆی تاوانەکانیانەوە سزایان دەدات، هی ئەوانەی پێشێ لەبەرئەوە خوا ﷻ لێیان دەبووریٚ‌و چاوپۆشییان لێدەکات، چونکە دەگەڕێنەوە.

خوا باسی گوناهەکانیشیانی نەکردوە، واتە: ئەوانەی کە لەو گوناهانەی کردوویانن، مادام تۆبە دەکەن، خوا لێیان دەبووریٚ.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٦٧﴾.

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، لێرەدا خوای پەنهانزان، بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیان، ناوی مونافیقەکان دێنێ، بە نێرو مێوە، دەفەرموێ: پیاوانی مونافیق‌و ئافرەتانی مونافیق، هەندێکیان لە هەندێکیانن.

جێی سەرنجە کە لە ئایەتی ژمارە (٧١)ی ئەم سوورەتەدا، دەربارەی بڕواداران خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ٧١﴾، پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان دۆستی هەندێکانن.

بەڵام مونافیقەکان چونکە پەیوەندییەکەیان لە دڵەوە نیە، پەیوەندییەکی ساغ نیە، بەڵکو پێکەوە پەیوەست بوونێکی ڕووکەشییە، بۆ هێنانە دی هەندێ بەرژەوەندیی

کاتیی، نەك لە ناخی دڵەوەو بە قەناعەتەوە، یەکدییان خۆشبوێ‌و، بە تەنگ یەکدیەوە بن‌و، بۆ یەکدی بە پەرۆش بن، بۆیە خوای زاناو شارەزا، بەم شێوەیە تەعبیری لێکردوە: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾، پیاوانی موناڧیق‌و ئافرەتانی موناڧیق، هەندێکیان لە هەندێکیانن، وەك چۆن لە مەسەلەی ڕەچەڵەك‌و وەچەدا دەفەرموێ: ﴿بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۝٢٥﴾النساء، واتە: هەندێکتان لە هەندێکتانن، پیاوان لە ئافرەتان دەبن، ئافرەتان لە پیاوان دەبن، لەو ڕووەوە: هەندێکیان دەبنەوە بە وەچەی هەندێکیان، بەڵام بە نسبەت بڕوادارانەوە، باسی دۆستایەتیی‌و نیزیکیی‌و خۆشەویستیی تێدا بوو.

ئنجا خوا ﷻ بە شەش سیفەت موناڧیق‌و دەغەڵەکانمان پێ دەناسێنێ:

١ - ﴿بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾، هەندێکیان لە هەندێکیانن، وەك گوتم: یانی: جۆرێك لە پەیوەندیی ڕواڵەتیی‌و ڕووکەشیی لە نێوانیاندا هەیە.

٢ - ﴿يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ ﴾، فەرمان بە شتی خراپ دەکەن، وەك: درۆ، نیفاق، شیرك، تاوان، کوفر، پڕوپاگەندەی خراپ بۆ ئیسلام‌و مسوڵمانان.

٣ - ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وە شتی پەسند قەدەغە دەکەن، وەك: ئیمان. خوا بەیەکگرتن، فەرمانبەریی بۆ خوا کردن، وە دڵسۆزیی بۆ ئیسلام، وە فیداکاریی لە پێناویدا، وە ماڵ خەرج کردن، وە قسەی باش ...هتد.

٤ - ﴿وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ﴾، وە دەستیان دەگێڕنەوە، هەڵبەتە تەعبیری {دەستیان دەنووقێنن}، کینایەیە لە ماڵ خەرج نەکردن، واتە: دەستیان دەگرنەوەو ڕژدیی‌و چرووکیی دەنوێنن، لە کاتێك دا ئیسلام پێویستی بە ماڵ بەخشین‌و مەسرەف لێکردن هەیە، بە تایبەت لە کاتی جەنگی تەبووکدا، کە مسوڵمانان تەنگ دەست بوون، وە جەنگێکی گەورەش بوو.

٥ - ﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، خوایان لەبیـر کردوە، لەبیـرکردنی خوا، مەبەست پێی دەرەنجام‌و لازیمـەکەیەتی، واتـە: خـوای پـەروەرگاریان پشت گویّ خستوە، هـەڵبەتـە پشت گویّ خستنی خـوا، واتـە: پشت گویّ خستنی: پەیـام‌و ئـایین‌و بەرنـامەی خـوا، وە هـەموو ئـەو شـتـانەی پەیوەندیـیـان بە خوای بیّ هاوتـاوە هـەیە، وە ئـەو فەرمانبەرییانـەی کـە دەبیّ ئـەنجام بـدرێـن ئـەوانەیـان پشت گـوێیـان خستوە.

﴿ فَنَسِيَهُمْ ﴾، خـواش لەبیـری کردوون، واتـە: خـوای زانـاو شـارەزا، وا مامەڵەی لەگەڵ کردوون، کە ئەوانی لەبیـر نەبیّ، ئەگەرنا خوا هەرگیـز هیچ شـتێکی لەبیـر ناچیّ، وەك دەفەرمویّ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَـٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾المؤمنـون، خـوا هیچ کاتێك لە دروستکراوەکانی بیّ ئاگا نیـە، بـەڵام لـێرەدا هەندێك دەڵێـن: بۆ موشاکـەلـەیـە، وەك دەفـەرمویّ: ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ ﴾، لـێرەش: ﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾، بەڵام نـە هـی ئـەوان مەبەست پێی خودی لـەبیـرچوونە، بەڵکو مەبەست پێی ئـەوەیـە، کـە لـە ئـەنجامی لەبیـرچووندا، دێتە دی، کە بریتیە لە فـەرامۆش کـردن، هی خـوای پەروەردگاریش بریتیـە لـە فـەرامۆش کـردن‌و پشـتگویّ خسـتنیـان.

٦ - ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾، بێگومان موناقیقەکان لارێـن‌و لـە ڕێ دەرچـوون.

(فسـق) بـە مانـای دەرچـوون (خـروج) دیّ، ئنجـا ئـایـا مونـافیقەکـان لـە چـی دەرچـوو ون؟ لـە سروشتـی خـۆیـان دەرچـوون، لـە عەقـڵ دەرچـوون، لـە شـەرع دەرچوون، لـە مەنتـیق دەرچوون.

ئەوە سیفـەتە سـەرەکییـەکانی مونـافیقەکانن، کە خـوا لێرەدا پێناسـەیان دەکات پێیـان.

**مەسەلەی چوارەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ٦٨ ﴾.

وشەی (وعد) واتە: بەڵێن پێدان، هەم بۆ باری خێرو چاكە بەكاردەهێنرێ. هەم بۆ باری شەڕو خراپە، (الوعد أعمّ من الوعيد، فهو يطلق على الإخبار بالتزام المُخْبِر للمُخْبَر بشيء في المستقبل، نافع أو ضار، أو لا نفع فيه ولا ضرّ. والوعيد خاصّ بالضارّ).

(وعد) گشتگیرترە لە (وعید)، (وعد) واتە: بەڵێن، (وعید) واتە: هەڕەشە. بۆیە (وعد) بەكاردەهێنرێ بۆ هەواڵ دان، وە هەواڵدەر پابەند دەبێ بۆ كەسێك كە هەواڵی پێدەدات، بە شتێكی داهاتوو، جا سوودبەخش بێ، یان زیانبەخش. یان بۆ شتێك كە نە سوودی هەیە، نە زیان، بەڵام (وعید) كە ئێمە بە كوردیی دەڵێین: هەڕەشە، تایبەتە بە شتی زیانبەخشەوە.

لێرەدا خوای پەروەردگار، باسی سێ شتانی كردوە بۆ ﴿ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ ﴾، پیاوانی مونافیقو، ئافرەتانی مونافیقو، كافرەكانیش، بە نێرو مێیانەوە، چ بەڵێنێكی پێداون؟ ﴿ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴾، بەڵێنی پێداون: بە ئاگری دۆزەخ، كە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوەو بەسیانە، وە خوا نەفرینی لێكردوون، وە سزاو ئازارێكی بەردەوامو نەپساوەو نەبڕاوەشیان هەیە.

هەڵبەتە لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە وشەی (وعد) مانا گشتییەكەی نەبێ. بەڵكو مەبەست پێی ئەو مانا تایبەتییە بێ، واتە: بۆ چاكەو شتی بە سوود، بەڵام بەو واتایە كە خوای دادگەر، تاكە بەڵێنێك ئەگەر بگونجێ هەبێ بیدات بە مونافیقو كافرەكان، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، كە ئەوە جۆرێكە لە گاڵتە پێكردن.

ئنجا ئەو سزایە خوای تۆڵەستێن بە پێنج شتان تەعبیری لێدەكات:

١) ﴿نَارَ جَهَنَّمَ﴾، ئاگری دۆزەخ.

٢) ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

٣) ﴿هِيَ حَسْبُهُمْ﴾، بەسیانە.

٤) ﴿وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ﴾، وە خوا نەفرینی لێكردوون، ئەگەر ئەوەی پێشییان سزای جەستەییە، ئەمەیان سزای مەعنەوییە.

٥) ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾، وە سزاو ئازارێكی بەردەوامو نەپساویان هەیە، چونكە دەگونجێ كەسێك لە سزادا بە هەمیشەیی بمێنێتەوە، بەڵام جار جار نێوبڕێكی بكەوێتێ، بەڵام هی ئەوان نێوبڕی تێدانیە، هەمیشە تێیدا دەبنو، سزایەكەیان نەبڕاوەو نەپساوەیە.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: كە دەفەرموێ: ﴿كَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ  ﴾.

لێرەدا شتێك فرتێنراوەو كە سیاق دەلالەتی لەسەر دەكات، ئەویش ئەوەیە: (أَنْتُمْ كَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ) ئێوەش وەك ئەوانەی پێش خۆتانن، یاخود: (عَاقِبَتُكُمْ كَعَاقِبَةِ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ) سەرەنجامی ئێوەش وەك سەرەنجامی ئەوانەی پێش ئێوەیە، یاخود (شَأْنكم كشأن الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ) واتە: حاڵی ئێوەش وەك حاڵی ئەوانەی پێش ئێوەیە، وەك گوتم لە قورئاندا خوای زاناو توانا هەمیشە وشەیەك، ڕستەیەك، كە سیاق بیگەیەنێ، دەیفرتێنێ، بۆئەوەی هەرچی زیاتر فەرمایشتەكەی

کورتتر بێتەوە، وە یەکێك لە گرنگترین ڕووەکانی ڕەوانبێژیی، بریتیە لەوە کە قسە کورتو پوخت بێ، واتە: وشەکانی کەم بنو مانایان زۆربێ.

ئنجا لێرەدا خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ئێوەش، یان: سەرەنجامی ئێوەش، یان: حاڵی ئێوەش، وەك هی ئەوانەی پێش خۆتانە، واتە: گەلانی پێش ئێوە، ئەی کافرو موناڤیقەکان، خوا سزای دانو فەوتان، زیانبار بوون، چۆنیش بوون؟ ﴿كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً﴾، هێزیان لە هی ئێوە پتر بوو، چ هێزو پێزی ماددییان، چ دەستەڵاتی سیاسییان، ﴿وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا﴾، ماڵو منداڵیشیان لە هی ئێوە زیاتر بوون، واتە: هەم لە ڕووی ئابووریی‌و، هەم لە ڕووی سیاسیی‌و، هەم لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ئێوە بەهێزتر بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ڕزگار نەبوونو، هەموو ئەو شتانە دادیان نەدان .

ئنجا ئایا ئەوان چییان کرد؟

﴿فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ﴾، واتە: لە بەشی خۆیان بەهرەمەند بوون.

(خلاق) واتە: پشكو بەش، (إستمتاع)یش بریتیە لە ڕابواردنو لەززەت لێ وەرگرتنو لێ بەهرەمەند بوون، واتە: ئەوانە لەو بەشەی دنیایی خۆیان، بەهرەمەند بوون، وە گوزەرانییان، وە پێیان ڕابوارد، هەر خەریکی ڕابواردنو تێرکردنی غەریزەکانیان بوون، ﴿فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ﴾، ئێوەش {ئەی کافرو موناڤیقەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و دوای ئەویش!} ئێوەش لە بەشی خۆتان دا ڕاتانبوارد، وە لێی بەهرەمەند بوون، وە ئەو لەززەت وەرگرتنو خۆشییە جەستەییەی کە بینیتان، وەك ئەوانەی پێش خۆتانتان کرد، ﴿وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟﴾، وە وەك چۆن ئەوان وەنێو قسان کەوتنو، قسەی بەلاشو قسەی پووچیان کرد، بەنێو گاڵتەکردن، کەوتن، ئێوەش بە نێو کەوتن.

لێرەدا وشەی: ﴿ وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ ﴾، {الّذي مصدرية مثل (ما): خضتم كخوضهم}.

(الّذي) چاوگە، وەك (ما)، واتە: ئێوەش بەنێوکەوتن، وەك بەنێوکەوتنی ئەوان، واتە: وەك چۆن ئەوان هەر خەریکی قسەی بەلاش‌و پووچ‌و گاڵتە پێکردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون، ئێوەش بەنێو ئەو قسەو قاڵە پووچ‌و بۆشانە کەوتن.

وە هەندێك گوتوویانە: وشەی (الّذي) لێرەدا بە مانای (الّذين) دێ، بەڵام ئەمە بۆچوونێکی لاوازە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ ﴾، ئەوانە کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە لە دنیاو دواڕۆژدا، ئەوانە کێن؟ یانی: ئەوانەی پێش ئێوەو، ئێوەو، هەموو ئەوانەی وەك ئێوەو ئەوان مامەڵەو هەڵسوکەوت دەکەن، هەر کەسێك هەر خەریکی خۆشیی‌و ڕابواردن‌و عەیش‌و نۆشی مادیی بێ‌و، بێئاگا بێ، لە دواڕۆژو لە چارەنووسێك کە چاوەڕێی دەکات، سەری هەڵنەبڕێ‌و بەرزی نەکاتەوە، بەڵکو وەك ئاژەڵ هەمیشە سەری بەرەو خوار بێ! وە هەر خەریکی قسەی پووچ‌و بەلاش‌و، هەر سەرگەرمی ڕەفتاری ناشەرعیی بێ، ئەوانە هەرچەندە کردەوەی باشیشیان هەبێ، کردەوە باشەکانیان لە دنیاو دواڕۆژدا هەڵدەوەشێنەوە.

مانایەکی دیکەشی ئەوەیە: هەموو ئەو جموجۆڵ‌و چالاکییانەو، هەموو ئەو پیلان‌و فێڵانەی کە دەیکەن، نە لە دنیاداو نە لە دواڕۆژدا سوودیان پێناگەیەنێ، واتە: لە دنیادا بێ ئامانج دەبێ، وە لە دواڕۆژدا بێ پاداشت دەبێ.

﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٦٩ ﴾، وە ئەوانە زیانباری ڕاستەقینەن، واتە: ئەگەر زیانبارانێك هەبن، ئەوانەن.

<u>مەسەلەی شەشەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ أَتَتۡهُمۡ

رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ  ﴾.

ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆیانیان پێنەگەیشتوە، سەرەتا خوا بە گشتی باسی فەرموون: ﴿كَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾، فەرموویەتی: سەرەنجامی ئێوەش، وەك سەرەنجامی ئەوانەی پێشێ دەبن، ئنجا بە دیارییکراویی، شەش کۆمەڵگا بە نموونەی دێنێتەوە، لە مێژووی مرۆڤایەتیی دا، یانی: ئێوە سەرنجی سەرەنجامی ئەم کۆمەڵگایانە بدەن، کە لەبەرچی سەریان بە فەتارەت چووو، لەبەرچی خوا سزای دان؟!

لەبەر ئەو کوفرو نیفاقو، بەهۆی ئەو خراپەو تاوانانەوە کە دەیانکردن.

کەواتە: ئێوەش ئەگەر لەسەر ئەو کوفرو نیفاقەی هەتانەو، لەسەر ئەو ڕەفتارانەتان بەردەوام بن، سەرەنجامتان وەك هی ئەوان دەبێ.

ئەو شەش گەلەش؟ ﴿قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ﴾، گەلی نووح، وە گەلی عاد، کە پێغەمبەرەکەیان ناوی هوود بوو، وە گەلی سەموود، کە پێغەمبەرەکەیان ناوی صاڵح بوو، وە گەلی ئیبراهیم، وە هاوەڵانی مەدیەن، یان خەڵکی مەدیەن، کە پێغەمبەرەکەیان ناوی شوعەیب بوو، (وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِ)، واتە: شارە هەڵگێڕدراوەکان، سەرەوژێرکراوەکان. کە پێغەمبەرەکەیان ناوی لووط بوو.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوا ﷻ وەك پێشتریش باسمان کرد: لە هەموو قورئاندا کە گەلی نووحی ناو نەبردوە، هەر دەفەرموێ: گەلی نووح، بۆ وێنە، دەفەرموێ: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ ﴿٧١﴾﴾یونس.

(قوم) کۆمەڵە خەڵکێکن، بەڵام خەڵکی نووح، کێ بوونە؟ ناویان چی بووە؟ نازانین، بەڵام وەك من لە تەفسیری سوورەتی ئەعرافدا باسم کردوە واپێدەچێ

کاتی خۆی هەر ئەوەند مرۆڤە بووبن لەسەر زەوی، کە نووح بۆ لایان نێردراوە وەك چۆن ئادەم بابی یەکەمی مرۆڤایەتییە، بە (نووح)یش گوتراوە: بابی دووەمیی مرۆڤایەتی، واتە: هەر ئەوەندە مرۆڤە هەبوون، بۆیە نەگونجاوە ناوێکی تایبەتییان لێ هەڵبدات.

بەڵام ئەو خەڵکە کە (هوود)یان بۆلا ڕەوانەکراوە، گەلی عاد بوون.

هەروەها ئەو خەڵکەی کە (صالح)یان بۆلا ڕەوانە کراوە، گەلی سەموود بوون، کە لە ناوچەی (حجر) نیشتەجێ بوون، کە دەکەوێتە نێوان شامو نیوەدورگەی عەرەبیی‌و لەو ناوچە دایە، بەڕای زۆربەی زانایان‌و مێژوو نووسان.

هەروەها گەلی ئیبراهیم، لە هەموو قورئاندا خوا باسی گەلی ئیبراهیمی نەکردوە، کە ناویان چی بووە؟ چونکە کاتێك بووە لە عێراق بووە، هەندێك دەڵێن: لە کوردستانیش بووە، دوایی چووە بۆ شام، لە شامیش پێدەچێ لە ناوچەی حەرران بووبێ، کە ناوچەیەکی کوردستانییە، ئنجا چووە بۆ فەڵەستین، دوایی چووە بۆ میسر، ماوەیەك لەوێ بووە، دوایی چووە بۆ حیجازو، کەعبەی بنیات ناوە، کەواتە: ئیبراهیمیش سەلامی خوای لێ بێ، لەبەرئەوەی بەنێو زۆر گەلاندا گەڕاوە، واشپێدەچێ هەر ئەو شوێنانە، ئاوەدانییان لێ بووبێ، کە ئیبراهیم چووە بۆ نێویان، بۆیە خوا گەلی ئیبراهیمی بەگشتی هێناوە.

وە هاوەڵانی مەدیەن کە پێغەمبەر شوعەیب بۆ لایان ڕەوانە کراوە، پێشتریش باسمان کرد: بە ڕای بەشێك لە زانایان شوعەیب تاکە پێغەمبەرێکە کە بۆ لای دوو گەلان ڕەوانە کراوە، بۆ لای ئەهلی مەدیەن، وە بۆ لای (أصحاب الأیکة) واتە: خاوەنانی درەخت، کە باخێکی گەورەو چڕو پڕیان هەبووە، دییەك، یان شارێك بووە لە دەوروبەری ئەو باغە، وە مەدیەن ئێستا دەکەوێتە نێو (ئوردون)ەوە.

بەشێك لە زانایانیش گوتوویانە، (أهل مدین)و (أصحاب الأیکة) هەر یەکن.

وە شارە هەڵگێردراوەکانیش پێغەمبەر (لووط)یان بۆ لا ڕەوانە کراوە، کە گەلێکی خراپو ڕەوشت نزم بوون، ئنجا وەك چۆن ئەوان سروشتێك کە خوا لەسەری دروست کردوون، هەڵیان گێڕاوەتەوەو لە جیاتی ئەوەی پیاوو ئافرەت پێکەوە هاوسەرگیریی

بکەن، پیاویان چۆتە لای پیاوو، ئافرەتیان چۆتە لای ئـافرەت، خـوای زاڵو دادگـەریش بەوە سزای داون کە شـارو ئاوەدانییەکانیان هـەڵگـێڕێتـەوەو سـەرەو بنیـان بکـات، کـە لـە چەندان شوێـن خـوا لـە قورئـاندا باسیـان دەکـات، بۆ نموونـە دەفـەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ ﴾ هـود.

واتـە: کاتێك فەرمانمان هت لای سـەرێیمان کردە لای خوارێی، (واتـە: سـەرەو بنمـان کرد) وە جۆرە بەردێك کە لە قـوورِ بوو، بە ڕیز بەسەرماندا بـارانـدن.

ئنجا ئـەو شـەش گەلو کۆمەڵگایـە، خـوای کـارزان چی بۆ کـردن؟

﴿أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرەکانیان بە بەڵـگە ڕوونو ئاشـکراکانەوە هاتنـە لایـان.

(بیِّنـات) کۆی (بَیِّنَـة)یـە، (بَیِّنَة) بەڵگەیەکی ڕوونو ئـاشـکرایە کـە بەرانبەرەکـەی ﷺ قەنـاعەت هاتن بکەرێ، پێی موقتـەنیع بـێ، دەشگونجێ مەبەست لـە (بَیِّنـات) (معجزات) بـێ، واتـە: ئـەو شتـانەی کـە خـوای کـارزان بـە پێغـەمبـەرانی داون، بـۆ سـەلـماندنـی پێغـەمبـەرایـەتییـان، وەك لـە (صـحیح)ی بوخـاریی‌و موسلـیمدا هـاتوە، کـە هـیچ پێغـەمبـەرێك نەبـووە، مەگـەر خـوا بەڵگـەیـەکی داوەتـێ کـە ئیسپـاتی پێغـەمبـەرایەتیی خۆی پێ بکات، چونکە ئەگەر وا نەبێ هەر کەسێك هـەڵسـێ بڵـێ: من پێغـەمبـەرم، خەڵك دەڵێن: بەڵگەت چییـە؟ دەبێ شتێکی پێ بـێ کـە هـیچ کـەس نەتوانـێ ئـەو شتـە بکـات.

مووسـا ﷺ گۆچانەکـەی دەبـوو بـە مارێـکی زل (ئەژدیهـا)، هـەروەهـا دەسـتـی ڕوونو پرشـنـگدار بووەو، کـەس نەیتوانیوە وەك وی بکـات.

عیسـا ﷺ مردووی زینـدوو کـردۆتـەوە بە مۆڵـەتی خـوا، وە کـەرو لاڵو بەڵـەکی چاك کـردۆتـەوەو کـەس نەیتوانیوە شتی وا بکـات.

وە حوشترەکەی صالح ... هتد، هەموو پێغەمبەران، ئەوەی پێیان دراوە، بە کەسی دی لە غەیری خۆیان نەکراوە.

وە پێغەمبەری خاتەم ﷺ یش فەرموویەتی: ﴿مَا مِنَ الأنبياءِ نَبِيٌّ إلاَّ أُعْطِي مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيهِ البَشَرُ، وَإنَّمَا كانَ الَّذي أُوتِيتُ وَحياً أوحاهُ اللهُ إليَّ، فَأرْجُو أنْ أكُونَ أكثَرَهُمْ تابِعاً يَومَ القِيامَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم، برقم: (٣٨٣)، عَن أبي هُرَيرَة ﷺ}.

واتە: هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا نەبووە (علیهم الصلاة والسلام) کە بەڵگەیەکی پێ نەدرێ، کە لەسەر بناغەی وی خەڵك ئیمانی پێ بێنن (وە بزانن کە ڕاست دەکات) وە ئەوەی بە من دراوە لەو بوارەدا، وەحییە بۆم هاتوە، (واتە: ئەوەی کە پێم دراوە، وەك بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییم وەحی و پەیام و بەرنامەی خوایە)، بۆیە ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن.

چونکە هی ئەو ماوەتەوە، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام) بە وەفاتی خۆیان کۆتایی یان پێهاتوە، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر کامێکیان بۆ قۆناغێك و هەلومەرجێك و بۆ گەل و میللەتێکی دیارییکراو هاتوون و، موعجیزەکەیان هەر ئەوەندە پێویست بووە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی، بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بە پانایی زەمین و بە درێژایی زەمان، بۆیە موعجیزەکەشی هەموو ڕۆژگارو سەرزەمینی گرتۆتەوەو بەردەوامە، وە لە ڕاستییدا هەر خودی بەرنامەکەی موعجیزەکەشیەتی و، قورئان موعجیزەی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾، نەدەگونجا خوا ستەمیان لێ بکات، بەڵام خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، کە دەفەرموێ: نەدەگونجا واتە: ئەسڵەن لە خوا ناوەشێتەوە، ستەم لە بەندەکانی بکات.

چونکە کەسێك کە ستـەم دەکات، یـان لـەبەرئـەوەیـە کـە دادگـەریـی نیـە، یـان لەبەرئەوەیە کە ئامانجێکی هەیە بە ستەم نەبێ، بۆی نایەتە دی، بەڵام خوای تـاك و پاك لە هەموو شتێك بێ نیازە هەموو شتێك دروستکراوی خوایەو، پێویستی بە خوایە، کەواتە: هیچ ئامانجێکی نیە لە ڕێی ستـەمەوە بیهێنێتـە دی.

وە پاشـان خـوا ﷻ خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندە، (وللهِ مَثَلُ الأَعْلَى). سیفەتی هەرە بەرز بۆ خـوایـە، هـەرچی سیفـەتی هـەرە باشـە، هەرچی نـاوی هـەرە چـاکە، خـوا هـەیـەتی، ئنجـا یـەکێك لـە سیفـەتـە چاکەکـانی خـوا، ئـەوەیـە کـە کاربەجێیـە، وە یەکی دیکەیـان ئەوەیە کە ئـەوپەڕی دادگـەریی هـەیە، وە هێـندەی گەردیلەیەك ستەم ناکات، کەواتە: نەك هەر ستەم ناکات، بەڵکو هەر لێی ناوەشـێتەوە ستـەم بکات، بەڵام ئەوان ستەمیان لە خۆیان کرد، کە بڕوایـان بـە پێغـەمبـەرەکـانیان نەکرد، بۆیە خوای دادگەرو زاڵیـش سـزای داون و لـە بەینـی بردوون.

کەواتە: ئەی کافرو مونافیقەکانی ڕۆژگاری پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ و دوای ویـش! ئێوەش وریابن! ئەگەر لەسەر ئەو کوفرو نیفاقەی کە لەسەرینی، بەردەوام بن، هـەمان سـەرەنجام، کە هـاتۆتـە ڕێی ئەو گەلـە پێشووانە، دێتـە ڕێی ئێـوەش.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دوو ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی (٧١ و ٧٢)، لە ئایەتی یەكەمیاندا خوای بەرزو مەزن پێناسەی بڕواداران دەكات، لە بەرانبەر مونافیقاندا، بە حەوت لە سیفەتە سەرەكییەكانیان، وەك مونافیقەكانیشی بە شەش سیفەتان پێناسە كردن، دیارە بە سیفەتە سەرەكییەكان، ئەگەرنا دەگونجێ هەم مونافیقەكانو، هەم مسوڵمانانیش بە سیفەتی زیاتر پێناسە كرابان، وە ڕایدەگەیەنێ كە خوا بەزەیی لەگەڵ بڕوادارانی پیاوو ئافرەت دا دەنوێنێ، هەم لە دنیاو هەم لە دوارۆژدا.

وە لە ئایەتی دووەمیاندا باسی پاداشت دانەوەیان دەكات، بەو بەهەشتو باغو بێستانانەی كە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە كۆشكو تەلاری بەرز بەرز، وە لە سەرووی هەموو ئەوانەوە ڕەزامەندیی خوا، كە بێگومان لە هەموو ئەوانە گەورەترە.

﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ
عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ
أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ
وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً
فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشــەی ئایەتەكــان

{وە بڕوادارانی پیاوو بڕوادارانی ئافرەت، هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن. فەرمان بە هەرچی پەسندە دەكەنو، ڕێگریی لە هەرچی ناپەسندە دەكەن، وە نوێژ بەرپا دەكەنو زەكات دەدەن، وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن، ئەوانە خوا بەزەیی پێیان دادێ، وە خوا زاڵی كارزانە ﴿٧١﴾ خوا بەڵێنی بەهەشتانێكی بە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار داوە، كە ڕووبار بە ژێر (كۆشكەكان)یاندا دەڕۆن بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، وە چەندان خانوو بەرەی خۆشو باش لە نێو باغو بێستانی بەردەوامدا، وە ڕەزامەندییەكی (لە هەموو ئەوانە) گەورەتر لە خواوە، ئا ئەوە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزنە ﴿٧٢﴾}.

# شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً ): (مساكن) كۆی (مسكن)ە، (مسكن: اسمُ مَكانٍ وَالجَمْعُ مَساكِن)، (السكون: ثبوت الشيء، ويستعمل في الإستيطان).

دیارە وشەی (مسكن) ناوی شوێنە، لە (سكون)ەوە هاتوە.

(سكون)بریتییە لەوەی شتێك دوای ئەوەی كە جووڵاوە، ڕابوەستێ‌و، سەقامگیربێ، وە بۆ نیشتەجێبوونیش بەكاردێ.

(عَدْنٍ ): (العَدَنَ): (أَي الإسْتقرار وَالثَبَات، عَدَنَ بمَكانِ كَذَا : اسْتَقَرّ، والمَعْدِنُ لِمُسْتَقَرّ الجوَاهِر).

وشەی (عَدَن) بە مانای چەسپاویی‌و سەقامگیریی دێ، دەگوترێ: (عَدَنَ بمَكانِ كَذَا) فلان كەس لە فلان شوێن دا نیشتەجێ بوو، وشەی (عَدَن)ی بۆ بەكاردێ، وە بەو شوێنەی كە كانزاكانی لێ دەردەهێنرێن (مَعْدِن)ی بۆ بەكاردەهێنرێ.

(وَرِضْوَٰنٌ ): (أَعْظَم الرّضا رِضَى اللهِ، لذَا خُصّ الرّضوانُ بِمَا كانَ مِنَ اللهِ تَعَالى)

بێگومان گەورەترین ڕەزامەندیی، ڕەزامەندیی خوای بەرزە، بۆیە وشەی (رضوان) تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوەو، تەنیا بۆ خوا بەكاردەهێنرێ، (رضوان) واتە: ڕازیبوونێكی گەورە، كە ڕازیبوونی گەورەش هی خوای بەرزو مەزنە.

(ٱلْفَوْزُ ): (الظفر بالخير مع حصول السلامة).

وشەی (فوز) بریتییە لەوە كە ئینسان خێرو خۆشییەكی چنگ بكەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا كە سەلامەت دەبێ.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەكانی پێشیّ دا، باسی مونافیقەكانو كافرەكانی كرد. بە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێیانەوە، وە باسی سیفەتو نیشانە سەرەكییەكانیانی كرد. ئنجا هەر بەو بۆنەوە، باسی بڕوادان دەكات بە پیاوانو ئافرەتانەوە دەفەرمویّ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾، وە پیاوانو ئافرەتانی بڕودار هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن، دیارە وشەی (أولیاء) كۆی (ولي)یە. (ولي)یش بە مانای نیزیك، خۆشویست، پشتیوان، مشوورخۆر، سەرخەر، دڵسۆز. سەرپەرشتیار دیّ، كەواتە: پیاوانو ئافرەتانی بڕوادار هەندێكیان دۆستو پشتیوانو نیزیكو خۆشویستو مشوورخۆرو، سەرخەرو، دڵسۆزو، سەرپەرشتیاری هەندێكیانن.

﴿يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾. فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە دەكەن، وە ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسندە دەكەن، وە نوێژ بەرپا دەكەنو، زەكات دەدەن. وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن، واتە: پابەند دەبن بە قورئانو سوننەتەوە، دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم سیفەتە گەورەو گرنگانە، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دیّ، هەم لە دنیادا خوا دەیانخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتی خۆیەوەو، لەگەڵیان بە لوتفو بەخشندەو میهرەبان دەبیّ، هەم لە دوارۆژیشدا، چاوپۆشیی لە هەڵەو كەمو كورتییەكانیان دەكاتو. دەیانخاتە بەهەشتی پانو بەرینەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، بێگومان خوا زاڵی كارزانە، زاڵو باڵادەستە، هەر شتێكی بویّ دەیكات، وە كارزانو كاربەجیّو لێزانە. دەزانیّ هەر كەسە چی بۆ دەكات، چی بۆ بڕواداران دەكات؟ وە چ لە كافرو مونافیقو دەغەڵەكانیش دەكات؟

ئنجا دێتە سەر باسی ئەو بەڵێنەی کە بە بڕوادارانی پیاوو ئافرەتی داوە، دەفەرموێ :

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، خـــــوا بەڵێنی بەهەشتانێکی بە بڕوادارانی پیاوو ئافرەت داوە.

ئنجا ئەو ڕووبارانەی بە ژێر باغەکاندا دەڕۆن، دەگونجێ بە ژێر بنکەکانیاندا بڕۆن، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کە بەژێر ئەو کۆشك‌و تەلارانەدا دەڕۆن کە لە نێو باغ‌و بێستانەکان دان، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ﴾، کە بە هەمیشەیی تێیان دا دەمێننەوە، وە چەند خانووبەرەو جێگاو ڕێگایەکی زۆر خۆش‌و باش، لە نێو چەند باغ‌و بێستان‌و گوڵ‌و گوڵزارێکدا کە هەمیشەیین، نەك وەرزێك هەبن‌و وەرزێك نەبن، بەڵکو بەردەوامن، هەم خۆیان‌و، هەم بەروبوومیان‌و، هەم گەڵا سەوزەکانیشیان، ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾، وە بێگومان ڕازی بوونێك لەلایەن خواوە گەورەترە، لە چی گەورەترە؟ لە هەموو ئەوانە، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، ئا ئەوە {واتە: گەیشتن بەو بەهەشتانەو، بەو کۆشك‌و تەلارانە، بەو باغ‌و بێستانانە، وە شاد بوون بە ڕەزامەندیی خوا}، ئا ئەوە بردنەوەی مەزن‌و بە مراد گەیشتنی مەزنە.

وە دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە : ڕازیبوونێکی تایبەتی خوا، گەورەترە لە هەموو نیعمەتەکانی بەهەشت.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۢ ۚ
يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ
ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
﴿٧١﴾ ﴾.

لەم ئایەتە موبارەکەدا خوای پەروەردگار بە حەوت سیفەتی بنەڕەتیی، پێناسەی بڕوادارانی ڕاستەقینە دەکات، بە پیاوان‌و ئافرەتانەوە:

١/ ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۢ ﴾، هەندێکیان دۆست‌و هاوکارو پشتیوانی یەکدییەن. بە نسبەت موونافیقانەوە فەرموویەتی: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍۢ ۚ ...﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: پیاوانی موونافیق‌و ئافرەتانی موونافیق، هەندێکیان لە هەندێکیانن.

لەبەرئەوەی پەیوەندییەکانیان ڕووکەشیی‌و ڕواڵەتیین، هەندێکیان سەر بە هەندێکیانن، هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان تێکەڵن، بەڵام تێکەڵییەکی، لە ناخ‌و دڵ‌و دەروون‌و قەناعەتەوە نیە، بەڵکو هەر ئیشیان پێکەوە هەیە، کارو ئامانجی هاوبەشیان پێکەوە هەیە، بەڵام هی بڕواداران: پەیوەندییەکی لە دەروون‌و ناخی دڵەوەیەو، بە قەناعەتەوە لەگەڵ یەکدا پەیوەستن.

(أولیاء) کۆی (ولي)یە، (ولي)یش، بە مانای نیزیک، خۆشەویست، پشتیوان. مشوورخۆر، سەرخەر، دڵسۆز، سەرپەرشتیار، دێ، وەك پێشتر باسمان کرد. وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی:

﴿لِيَلِيَنِي مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة، برقم: (٣٥٢٧)، وَأَحْمَد، برقم: (١٧١٤٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٤٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٢١٧٢) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ}.

واتە: با ئەوانەتان کە خاوەنی عەقڵو تێگەیشتنی زیاترن (لە ڕیزی نوێـژدا) لە منەوە نیزیکتربن، دوایی ئەوانەی دوای وان، دوایی ئەوانەی دوای وان.

کەواتە: مانای ڕیشەیی وشەی (ولي) بریتیە لە نیزیك، بڕواداران هەندێکیان نیزیکی هەندێکیانن، ئەمەش ئەوەی لێومردەگیرێ کە لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا، دەبێ مسوڵمانان بەگشتی سەرپەرشتیی کۆمەڵگا بکەن، وە هەردوو ڕەگەزەکە، دەبێ هەست بە بەرپرسیارێتیی بکەن، هەر یەکەیان بە پێی سروشتی خۆی، وەك لە زۆر شوێنی دیکەش دا باسم کردوە، بە تایبەت لە مەوسووعەی: (ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا)، باسم کردوە، کە ئەرکە شەرعییەکان لە شەریعەتی ئیسلامیی دا، سێ جۆرن:

أ) زۆربەی هەرەزۆری ئەرکە شەرعییەکان هاوبەشن، لە نێوان پیاوان و ئافرەتان دا.

ب) کەمێکیان تایبەتن بە پیاوانەوە، لەبەرئەوەی کە سروشتی پیاو، ئەو ئەرکانە دەخوازێ.

ج) وە کەمێکیان تایبەتن بە ئافرەتانەوە، لەبەرئەوەی کە سروشتی ئافرەت: ئەو ئەرکانە دەخوازێ، بە پیاوان ناکرێن.

لێرەدا خوای کاربەجێ، شەش لەو ئەرکانەمان بۆ ڕیز دەکات، کە تایبەت نین بە پیاوان یان ئافرەتانەوەو، گشتیین لە نێوانیاندا، تایبەت نین بە هیچ کامیانەوە بە جیا، وە ئەمە ئەوەشی لێومردەگیرێ کە ئافرەتانیش بەرپرسیارن بەرانبەر بە کۆمەڵگا، لە ڕووی ئابووریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، سەربازیی، ئەمنیی، فیکریی، بانگەواز، پەروەردە، دەبێ ئەوانیش مشوور بخۆن، وە دەبێ سەرپەرشتیی کۆمەڵگا بکەن، وە نابێ نە ئافرەتان خۆیان لە ئەرکی سەرشانیان ببوێرن، وە نە پیاوانیش ڕێگرییان لێ بکەنو، پەرچ بخەنە بەردەمیان.

ئنجا ئایا ئەرکەکانیان چین؟

١- ﴿ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە دەکەن، شتی پەسند، وەك: ئیمان، خوا بە یەکگرتن، فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، نوێژو، ڕۆژوو، زەکاتو، فیداکاریی لە پێناوی خوادا.

٢- ﴿ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾، وە ڕێگریی دەکەن لە هەرچی شتی ناپەسندە، وەك: کوفر، شیرك، نیفاق، تاوان، گوناح، قسەو قاڵی خراپ، پیلان گێڕان، گاڵتەکردن بە ئیسلامو مسوڵمانان، هەرچی شتی خراپە، ڕێگریی لێ دەکەن.

ئاشکراشە فەرمان بە شتی پەسند، وە ڕێگریی لە شتی ناپەسند، هەموو بوارەکانی عیبادەتو سیاسەتو ئابوورییو جەنگو ئاشتییو... هتد، دەگرنەوە.

٣- ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژ بەرپا دەکەن، واتە: نوێژەکانیشیان بە کۆمەڵ دەکەن، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئافرەتانیش دەبێ لە نوێژی بە کۆمەڵ دا ئامادەبن، وەك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەهاتن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، نەك تەنیا بۆ نوێژی جومعە، بەڵکو پێنج فەرزەی نوێژ، ئافرەتان لەگەڵ پیاوان لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادە دەبوون، چونکە خوا لەگەڵ پیاوانی بڕوداردا، ئافرەتانی بڕواداریشی ناو هێناوە، کە دۆستو پشتیوانی یەکدین، یەکێك لە ئەرکەکانیشیان ئەوەیە کە نوێژ بەرپا دەکەن.

٤- ﴿ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، وە زەکاتیش دەدەن، ئافرەتیش کە زەکاتی لیکەوت، وەك پیاو دەبێ زەکات بدات، چونکە لەسەری فەرزە.

٥ و ٦- ﴿ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾، وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، واتە: پابەندن بە شەریعەتەوە، ئەو شەریعەتەی کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە.

کەواتە : ١ + ٦ = ٧ سیفەتی بنەڕەتیی .

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین، ئایا خوا کە دەفەرموێ: پیاوانی ئیماندارو ئافرەتانی ئیماندار دۆستو پشتیوانو هاوکاری یەکدیین: بواری جەنگو جیهادیش دەگرێتەوە؟

دەڵێین: هەرچەندە جەنگو جیهاد بە مانای کوشتار کردن، زیاتر لەسەر پیاوان فەرزە، وەك چۆن جومو‌عەش هەر لەسەر پیاوان فەرزە، بەڵام ئافرەتانیش نە ڕێیان لێگراوە بچن بۆ جەنگو جیهادو، نە ڕێیان لێگیراوە بچن بۆ جومو‌عەو جەماعەتیش، بەڵکو ئەوە بۆوان، بە شتێکی پەسند دانراوە، بەڵکو زانایان گوتوویانە: ئەگەر بوو بە نەفیری عام، دەبێ ئافرەتانیش وەك پیاوان بەشداربنو، ئەوانیش وەك پیاوان ئەرکیان لەسەر شانە، وە لە جەنگەکانی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتان بە شێوەیەك لە شێوەکان بەشدار بوون، بوخارییو موسلیم دەگێڕنەوە دەڵێن: فاتیمەی کچی پێغەمبەر، وە ئوممو سولەیم کە یەکێك بووە لە هاوەڵانی ئافرەت، لە جەنگی ئوحود دا بە کوندەو مەشکە، ئاویان لەسەر شانو پشتیان دەگواستەوە بۆ بریندارەکان، وە چارەسەرو تیماری بریندارەکانیان دەکرد، وە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە کە لە کاتی ناچاریی دا بەشداریی ڕاستەوخۆی شەڕیشیان کردوە، یەکێك لەوانە نوسەیبەی کچی کەعب، کە بەشداریی کوشتار (قتال)ی کردوە بە دەستی خۆی.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ﴾، ئا ئەوانە خوا بەزەییان لەگەڵ دەنوێنێ، ڕەحمیان پێدەکات، لە کوێ؟ هەم لە دنیادا، وە هەم لە دوارۆژدا، دیارە خوای بەخشندە بە یەکسانیی تەماشای هەموو بەندەکانی دەکات، لە بواری بەزەیی نواندنی دا، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ ... ﴿١٥٦﴾﴾الأعراف، وە بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

چونکە لە دنیادا هەموو شتێك بە بەزەیی خوا بەڕێوە دەچێ، بەزەیی خوا لە دنیادا بۆ هەمووان هاتۆتە دی: کافر، مسوڵمان، بێ ژیان، ژیاندار، لە گەردیلە تا کەهکەشان، لە ڕەحمەتی خوادا دەژین، وە بە ڕەحمەتی خوا دروست بوون، وە بە ڕەحمەتی خوای کاربەجێو پەروەردگاریش بەڕێوە دەچن.

بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی حیسابەکان دەگۆڕێن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَالَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾﴾ الأعراف.

واتە: بێگومان لەمەو دوا (یانی: لە دوارۆژدا) تۆماری دەکەمو دەینووسمەو، تایبەتی دەکەم بەوانەوە کە پارێز دەکەن، وە زەکات دەدەن، وە ئەوانەی کە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن.

دوایی زیاتر پێناسەی ئەوانە دەکات کە پارێز دەکەنو زەکات دەدەنو بڕوا بە ئایەتەکانی خوا دێنن، دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَىٰةِ وَالْإِنجِيلِ ...﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف .

ئەوانەی کە بە دوای ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار، {یان نەشارەزا لە کتێبە ئاسمانییەکان} دەکەون کە بە نووسراویی لەلای خۆیان لە تەوراتو ئینجیلدا دەیبینن، چی بە نووسراوی دەبینن؟ پێناسەی ئەو پێغەمبەرەو وەسفەکانی.

کەواتە: بەزەیی خوا لە ڕۆژی دوایی دا، بۆ کەسانێك تەرخان کراوە، کە ئەو چوار سیفەتەیان تێدان:

١/ پارێز دەکەن، {ئنجا پارێزکردنو خۆپاراستن، پێش هەموو شتێك دەبێ ئینسان خۆی لە کوفرو شیركو نیفاقو بێ دینیی، بپارێزێ، پاشان دەبێ خوا بەیەکگرتنو تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن بە ساغییو ڕاستیی لە خۆیدا بێنێتە دی}.

٢/ ئنجا دوای خۆ دوورگرتن لە شکاندنی قەدەکانو نەچوواندنی فەرزەکان، زەکاتی ماڵی خواش لە ماڵو سامانیان دەدەن، کەسانێکی بەخشندەنو دەبەخشن.

٣/ وە یەکێکی دیکە لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە بڕوا بە ئایەتەکانی خوا دێنن.

٤/ سیفەتی چوارەمو کۆتاییش ئەوەیە ئەوانە بە دوای ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەشارەزا لە کتێبە ئاسمانییەکان، (یاخود نەخوێندەوار) دەکەون، کە نە نووسینی نووسیوەو، نە خوێندنەوەی زانیوە.

لەوبارەوە كە مسوڵمانان دەبێ دۆستو هاوكارو خۆشەویستی یەكدی بن، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا زۆرن:

١- ﴿عَن أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً) وَشَبَّكَ أَصَابِعَهُ.﴾ {أَخْرَجَهُ البخاري، برقم: (٢٣١٤) ، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٥٨٥)، والترمذي، برقم: (١٩٢٨)، وَالنَّسَائِيُّ، برقم: (٢٥٦٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٣١)}.

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وایە، هەندێكی بەهێز دەكات، پەنجەكانیشی خستنە نێو یەك.

وەك چۆن پەنجەكان یەكدی دەهۆننەوە، بڕوادارانیش دەبێ ئاوابن، توندو تۆڵو تۆكمە بن، وە دوژمن نەچێتە كەلێنو درزەكانی نێوانیانەوە.

٢- ﴿عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (الْمُؤْمِنُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ إِنِ اشْتَكَى رَأْسُهُ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالْحُمَّى وَالسَّهَرِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٨٤٥٦)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٥٨٦)}.

واتە: نوعمانی كوڕی بەشیر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ئیمانداران هەموویان وەك یەك پیاو (نەفس) وان، ئەگەر ئەندامێكی ئازارێكی پێگەیشت، هەموو ئەندامەكانی دیكەی بە تا لێهاتنو بە شەونخوونیی بەشداریی دەكەن.

ئینسان ددانی بێشێ چاوی، بێشێ، گوێی بێشێ، ئەندامێكی بچووكی بێشێ، هەموو ئەندامەكانی دیكەی، ئیسڕاحەتیان لێ هەڵدەگیرێ، ئیمانداڕانیش ئاوان.

مەسەلەی دووەم: كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا نەیفەرمووە: (أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ غفور رحيم)؟ وەڵامەكەی ئەوەیە، سیاقەكەو هەلومەرجەكە، ئەوە دەخوازێ، چونكە:

١) مسوڵمانان پێویستییان بە عیززەتە، لە بەرانبەر ئەهلی کوفرو نیفاقو دژایەتییاندا.

٢) بۆ کافرەکانیش پێویست بەوە هەبووە، کە خوای زاڵ، زەبوونو سەرشۆڕیان بکات.

٣) هەر کام لە عیززەتمەندبوونی بڕواداران‌و، زەبوون بوونی کافران‌و مونافیقەکانیش. بە پێی حیکمەت‌و لێزانیی خوای کاربەجێ، ئەنجام دەدرێن، بۆیە خوای زاناو کارزان بەم دوو وەسفە خۆی وەسف کردوە.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾﴾.

لێرەدا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: خوا بەڵێن‌وگفتی داوە، بە بڕوادارانی پیاو‌و ئافرەت، بەڵێنی چەند بەهەشت‌و چەند باغێکی پێداون.

وشەی (جَنَّات) کۆی (جَنَّة)یە، (جَنَّة) واتە: باغ، بێستان، گوڵ‌و گوڵزار. کۆمەڵە دارو درەختێك کە بەرداربن‌و میوەیان هەبێ، خوا بەڵێنی ئەوەی بە پیاوان‌و ئافرەتانی بڕوادار داوە ئنجا بە حەوت وەسفان پێناسەی ئەوە دەکات، کە بەڵێنی پێداون:

١/ ﴿جَنَّٰتٍ﴾، واتە: چەندان باغ‌و بێستان‌و گوڵ‌و گوڵزارو میوە، کە ڕەنگە ئەمانە تەنیا بۆ خواردن‌و کەیف‌و سەفا بن.

٢/ ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، کەواتە: هەمیشە تەڕو تازەو پاراون.

٣/ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

٤/ ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً﴾، وە چەند خانووبەرەیەکی زۆر خۆش‌و دڵپەسند.

٥/ ﴿ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖ ﴾، ئــەو خانووبەرانــەش دیســان، بــە چــەند باغێكــی هەمیشەیی‌و نەبڕاوە، دەورە دراون، واتە: ئەوە نیـە لـە وەرزێك دا میـوە دەربكەن، لە وەرزێـكی دیكەدا میوە دەرنەكەن، وەك هی دنیـا، بەڵكو چوار وەرزەو بــەردەوام میـومیـان هـەیـە.

٦/ ﴿ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ ﴾، وە ڕەزامەندییـەك لـە خـواوە گـەورەترە لـە هـەموو ئـەوانەی كـە بـاس كـران.

٧/ ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئا ئەوە سەركەوتن‌و بە مراد گەیشتن‌و بردنەوەی هـەرە مەزنـە.

ئنجا با لەوبـارەوە ئـەم دوو فـەرموودەیـەش بێـنیـن:

أ/ ﴿عَـنْ أَبِـي مُوسَـى الأَشْـعَرِيِّ ﷺ فِـي تَفْسِـير أَيـات سـورَةِ الرَّحْمَـن: ﴿ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ﴾، وقولـه بَعْـد وصفهـا: ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ ﴾، أَنَّ رَسـولَ اللهِ ﷺ قَـالَ: جَنَّتَـانِ مِـنْ فِضَّـةٍ آنِيَتُهُـمَا وَمَـا فِيهِمَـا، وَجَنَّتَـانِ مِـنْ ذَهَـبٍ، آنِيَتُهُـمَا وَمَـا فِيـهِمَا، وَمَـا بَيْـنَ الْـقَوْمِ وَبَيْـنَ أَنْ يَـنظُـرُوا إِلَـى رَبِّهِمْ، إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْـرِيـاء عَلَى وَجْهِهِ، فِي جَنَّـةِ عَـدْنٍ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، بـرقم: (٧٠٠٦)، وَالتِّرمِذِيُّ، بـرقم: (٢٥٢٨) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٨٠)، وَالنَّسـائِي فِي الـكُبْرَى برقم: (٧٧٦٥)، وَابْنُ مَاجَـهَ، برقم: (١٨٦)}.

واتـە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لـێی ڕازی بێ، لە تەفسیــری ئـایەتەكانی سووڕەتی (الرحمن)دا كە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ﴾، {بۆ هـەر كەسێك كـە لـە پـایـەی بـەرزی پـەروەردگـاری بتـرسـێ، دوو بەهەشـت هەن}، وە دوای ئەوە كە وەسفی دەكات، دەفـەرموێ: ﴿ وَمِن دُونِهِمَا

جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾﴾، وە لە پلەیەکی نزمتر لەوان، یان لە خوار وانەوە، دوو بەهەشتی دیکە هەن، لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو باغ، کەلوپەلیانو هەرچی تێیاندایە، لە زیوە[1]، وە دوو باغیش، کەلوپەلیانو هەرچی تێیاندایە، لە زێڕ دروست کراوە، وە لە نێوان ئەو خەڵکەی کە لە نێو ئەو بەهەشتانەدانو، تەماشاکردنیان بۆ پەروەردگاریان دا، تەنیا پۆشاکی کیبریاء هەیە لەسەر ڕووی (خوا) لە بەهەشتی هەمیشەیی دا.

ب/ ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! يَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَى، وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ، قَالُوا: يَا رَبِّ! وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١١٨٥٣)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦١٨٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٨٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٥٥٥)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٤٤٠)}.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وای ﷻ بە خەڵکی بەهەشت دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەوانیش دەڵێن: لە خزمەت داین ئەی پەروەردگارمان! بۆ ڕازیکردنی تۆ ئامادەین، وە هەموو خێرێك لەلایەن تۆوەیە، پێیان دەفەرموێ: ئایا ڕازی بوون؟ دەڵێن: پەروەردگارمان! بۆچی ڕازی نابین! ئەوەی بە ئێمەت داوە، بە هیچ کەس لە دروستکراوانی خۆتت نەداوە، دەفەرموێ: شتێکتان دەدەمێ لەوە باشترە، دەڵێن: پەروەردگارمان! جا چ شتێك لەوەی پێت داوین، باشترە؟ دەفەرموێ: ڕەزامەندیی خۆمتان بەسەردا دەبارێنم، هەرگیز لەمەودوا لێتان تووڕە نابم.

---

١) واتە: ئەو دوو بەهەشتە: ئەو خانووانەی تێیاندانو دەرگاو پەنجەرەو دیوارو کەلو پەلی نێویان، هەمووی لە زیو دروست کراوە، هەروەها دوو بەهەشتەکەی دیکەش کە لەوانی پێشی بەرزترن، هەموو شتێکیان لە زێڕ دروستکراوە.

کۆتایی ئەم دەرسەش بەوە دێنین، کە لە تەفسیری ڕستەی: ﴿ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً ﴾دا، دەقێك گێڕدراوەتەوە لە عیمرانی کوڕی حوصەین، وە لە ئەبی هورەیرەوە، کە دەڵێ: بۆ هەرکامێك لەوانە حەوت سەد بەهەشت هەیە، وە هەر بەهەشتێك حەوت سەد کۆشکی تێدان، وە هەر کۆشکە حەوت سەد چی تێدایە، وە لە هەرچیدا چی هەیە! ئەوە دەقێکە کە زانایانی فەرمووودەناس گوتوویانە: (هَذَا مُنْكر سَنَداً وَمَتْناً) بۆیە دەقەکەشم نەهێنا، چونکە ئەوە شتێکی نەبیستراوەو نەزانراوە، هەم لە ڕووی زنجیرەی ڕاوییەکانەوە، هەم لە ڕووی نێوەڕۆکەوە.

وە (إبن القيم) دەڵێ: (إِنَّهُ لَمْ يَثْبُتْ فِي نِساء الجَنَّةِ حَدِيثٌ صَحِيح بأَكْثَر من زوجين لكل رجل)[1] واتە: لە هیچ فەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەردا ﷺ نەچەسپیوە، کە هیچ پیاوێك لە دوو ئافرەت زیاتری هەبێ، واتە: لە حۆرییەکان، کە خوا بە تایبەت لە بەهەشت دا بۆ پیاوانی ئیماندار دروستی کردوون.

بەڵام لە دنیادا ئەگەر کەسێك زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێ، ئەگەر ئەهلی ئیمان بن، خوای پەروەردگار کۆیان دەکاتەوە، بەڵام لەو ئافرەتە تایبەتانەی کە (حور العين)یان پێ دەگوترێ، کەس ■ دوو هاوسەران زیاتری پێ نادرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج ١٠، ص ٤٨٧.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت ئایەتان پێك دێ، لە ئایەتی (٧٣ تاکو ٨٠)، سەرەتا خوای بەرزو مەزن بە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ﴾، پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ، وە فەرمانی پێدەکات کە دژی کافرو مونافیقەکان بجەنگێ‌و، لەسەریان زبر بێ، پاشان جارێکی دی خوا ﷻ باسی سوێندی بە درۆیان دەکات، کە گوایە: قسەی کوفریان نەگوتوە، بەڵام خوا بە درۆیان دەخاتەوە، کە کوفریان گوتوە، وە نەخشەو پیلانی خراپیشیان هەبووە. بەڵام سەری نەگرتوە، کە بریتی بووە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بێئلگایی دا بکوژن، پاشان وێڕای دەرگای تۆبە بۆ کردنەوە، هەڕەشەشیان لێ دەکات.

ئنجا باسی کەسانێکی دیکەیان دەکات، کە پەیمانیان بە خوا داوە، ئەگەر بێت‌و دەوڵەمەندیان بکات، بەخشندە بن، کەچی دواییش پەیمانەکەیان ڕاست دەرنەچووە، وە سەرەنجام نیفاق چۆتە دڵیانەوە، بەهۆی درۆکردنیانەوە، وە خوا سەرزەنشتیشیان دەکات، کە دەبوایە بزانن: خوا ئاگاداری نهێنییەکانیانە.

پاشان باسی کەسانێکی دیکەیان دەکات، کە ڕەخنەو توانج ناڕاستەی ئەو مسوڵمانانە دەگەن: کە زۆر، یان کەم دەبەخشن، وە گاڵتەیان پێدەکەن.

وە لە کۆتایی دا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: کە چ داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی، چ داوای لێبوردنیان بۆ نەکەی، ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ بکەی، خوا هەر نایانبوورێ، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵی لاڕێ بووان ناکات .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ
وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ (٧٣) يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ
بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن
فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي
ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ (٧٤) وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ
ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (٧٥) فَلَمَّآ
ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ (٧٦) فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي
قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ
(٧٧) أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ
ٱلۡغُيُوبِ (٧٨) ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي
ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٧٩) ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ
مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ (٨٠)﴾

# مانای وشــە بە وشــەی ئایەتەکـان

{ئـەی پێغـەمبـەر ﷺ! دژی کـافرو دەغەڵەکـان تێبکۆشـەو لەسـەریـان زبـربـە، وە جێگای حەوانەوەیان دۆزەخەو (ئەویش) خراپـترینی سەرەنجامە ﴿٧٣﴾ سوێند بە خـوا دەخۆن کە (ئەوەی لە کوفرو قسەی خـراپ دەدرێتـە پاڵـیان) نەیانگـوتوە، وە بێگـومان وشـەی کوفریـان گـوتوەو، پاش ئیسلامەتییەکەیـان نیـاز (ی پیلانێـک)یـان کـرد، کە بۆیان نەلوا (کە لە نەغافڵ کوشتنی پێغەمبـەر ﷺ بوو) وە هەر ئەوەشیان بە ڕەخنە گـرت، کە خوا لە بەخششی خۆیو پێغەمبـەرەکەی دەوڵەمەندیان کـردن، ئنجا ئەگـەر (بۆ لای خوا) بگەڕێنەوە، بۆ ئەوان باشـترە، وە ئەگەر پشت بکەنەوە، خـوا بە ئـازارێکی بە ئێش لە دنیاو دواڕۆژدا سزایان دەدات، وە هیچ دۆستو پشتیوانێکیان لە زەویدا چنگ ناکەوێ ﴿٧٤﴾ وە لـەوان (دەغـەڵان) کەسـانێك هـەبوون، پـەیمانیان بـە خـوادا: ئەگـەر لـە بەخششی خۆی بمانداتێ، بێگومان دەبەخشینو بە دڵنیایی لـە چاکان دەبـین﴿٧٥﴾ کەچی کـاتێك (خـوا) لـە بەخششـی خـۆی پێـدان، ڕژدییـان پێکرد، وە بـە ڕوو وەرگێـڕانەوە، پشتیان کردەوە ﴿٧٦﴾ ئنجا بەهۆی ئەوەوە کە ئەو بەڵێنەی بە خوایاندا بوو، نەیانبـردە سـەرو، بـەهۆی درۆکردنیانـەوە (خـوا) نیفـاقی خسـتە دڵـیانەوە هـەتا ئـەو ڕۆژەی بـە دیداری دەگەن﴿٧٧﴾ ئایا نازانـن کە خـوا نهێـنییانو چپەچپـیان دەزانێ، وە (ئایـا نازانن) کە خـوا زۆر زانایە بە پەنهانەکان؟! ﴿٧٨﴾ ئـەوانەی بەهـۆی مـاڵ بەخشـینەکانەوە تانـە لـە ماڵـی خۆبەخشـەران لـە بـڕواداران دەدەن، وە تـانە لـەوانەش دەدەنو گاڵتـەیـان پێدەکەن، کە جگە لـەوەی بە قورسیی بەدەستیـانەوە دێ (لـە ماڵو سامان) شك نابـەن. ئـەوانە خـوا گـاڵتـەی پێکـردن، وە ئـازارێکی بـە ئێشـیان هەیـە ﴿٧٩﴾ یـەکسـانـە (ئـەی موحەممەد!) داوای لێبوردنیـان بۆ (لـە خـوا) بکـەی، یـان داوای لـێبوردنیان بـۆ نەکـەی. ئەگەر حەفـتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ بکەی، هـەرگیز خـوا لـێیان نابـوورێ، بەهۆی ئەوەوە کە بە خـواو بە پێغـەمبـەرەکـەی بێبـڕوا بوون، وە خـوا کـۆمەڵـی لاڕێیـان ناخاتـە سـەر ڕێی ڕاسـت ﴿٨٠﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(جَٰهِدِ ): واتە: تێبكۆشە، (جَاهَدَ: بَذَلَ الوُسْعَ)، واتە: هەرچی لە توانایدا هەبوو، بەكاری هێنا.

(وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ): (الغِلْظَةُ: ضِدّ الرِقّةِ، وَيُقَالُ: غِلْظَةٌ وَغُلْظَة، وَأَصْلُهُ أَنْ يُسْتَعْمل فِي الأَجْسَامِ، لَكِن قَد يُسْتَعَار لِلْمَعَانِي).

وشەی (غلظة) پێچەوانەی نەرمو ناسكییە، وە دەگوترێ: (غِلْظَةٌ وَغُلْظَة) وە (غِلظة) بۆ شتی ماددییە، بەڵام دەخوازرێتەوە بۆ شتی مەعنەوییش.

(وَهَمُّواْ ): واتە: شتێكیان ویست، نیازێكیان هەبوو، (الهَمُّ: الحَزَنُ الَّذِي يُذيبُ الإِنْسانَ، وَالهَمُّ: ما هَمَمْتَ بِهِ فِي نَفْسِكَ).

(هَم) بریتییە لەو خەفەتو نارەحەتییەی كە ئینسان دەتوێنێتەوە، وە (هَم) بریتییە لەوەی كە ئینسان لە دڵی خۆیدا دەیەوێ بیكات.

(لَمۡ يَنَالُواْ ): دەستیان نەگەیشتێ، وەدەستیان نەهێنا، (النَّيْلُ: مَا يَنالهُ الإِنْسان بيَدِهِ).

(نیل) شتێكە ئینسان بە دەستی وەدەستی بێنێ، دەگوترێ: (نِلْتُهُ، أَنالُهُ، نَيْلاً) واتە: وەدەستم هێنا، وەدەستی دێنم، وەدەست هێنان.

(وَمَا نَقَمُوٓاْ ): (نَقِمْتُ الشيءَ وَنَقَمْتُهُ، إِذَا أَنْكرتَهُ إِمَّا باللّسان أَو بالعُقُوبَة).

(نَقِمَ وَنَقَمَ) واتە: نكوڵییم لەو شتە كرد، یان ڕەخنەم لێگرت، یان بە زمان یان بە سزادان دان.

( ﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا﴾ ): لە ئەنجامی ئەوەدا دووڕوویی خستە دڵیان، (أَعْقَبَهُ كَذَا: إِذَا أَوْرَثَهُ ذَلِكَ).

واتە: ئەو شتەی کردە میراتیو تێیدا نیشتەجێ کرد.

(فُلاَن لَمْ يُعْقِبْ: لَمْ يَتْرُك وَلَداً)، (فُلاَن لَمْ يُعْقِبْ) واتە: فلانکەس هیچ منداڵی بەجێ نەهێشت.

(﴿أَخْلَفُوا اللَّهَ﴾ ): (وَعَدَنِي فَأَخْلَفَنِي، أَي خَالَفَ فِي المِيعَادِ).

واتە: بەڵێنی پێدامو بەڵێنەکەی نەبردە سەرێ، یان لە بەڵێنگەدا پێچەوانە بوو، یاخود بەڵێنەکەی نەبردە سەر، (وَالخُلْفُ: المُخَالَفَة فِي الوَعْدِ).

(خُلْف) بریتیە لەوە کە ئینسان بەڵێن نەباتە سەر.

(﴿سِرَّهُمْ﴾ ): واتە: نهێنییەکانیان، (الإِسْرَار: خِلاَفُ الإِعْلاَنِ، وَالسِّرُّ: هُوَ الحَدِيثُ المُكَتَّمُ فِي النَّفْسِ).

(إسرار) واتە: پەنهانکاریی پێچەوانەی ئاشکرا کردنە، وە (سِرّ) بریتیە لەو قسەیەی کە ئینسان لە دڵی خۆیدا پەنهانی دەکات.

(﴿وَنَجْوَاهُمْ﴾ ): واتە: چپەچپیان، (نَاجَيْتُهُ أَي: سَارَرْتُهُ، وَأَصْلُهُ أَنْ تَخْلُوَ بِهِ فِي نَجْوَة مِنَ الأَرْضِ).

(نَاجَيْتُهُ) واتە: بە چپە، یاخود بە فسکە فسك قسەم لەگەڵدا کرد، ئەویش بنبج ڕیشەکەی لەوەوە هاتوە، کە ئینسان لەگەڵ کەسێکدا لە زەوییەکی بۆشدا کە کەسی لێ نەبێ، قسان بکات.

(﴿يَلْمِزُونَ﴾ ): (اللَّمْزُ: الإِغْتِيَابُ وَتَتَبّعُ المُعَابِ، لَمَزَهُ يَلْمِزهُ).

(لَمْز) بریتیە لە پاشملە بە خراپ باسکردنو بە دوای عەیبی کەسێك گەڕان. (لَمَزَهُ يَلْمزهُ) واتە: عەیبی لێگرتو ڕەخنەی لێگرت.

(ٱلْمُطَّوِّعِينَ ): کە لە ئەسڵدا (المُتَطوعِين)ە، (التَطوع: فِي الأَصْلِ تَكَلّف الطاعة والتبرّع بما لا يلزم، كالتَنَفُّلِ).

(تطوُّع) لە ڕیشەدا بریتیە لەوە کە ئینسان فەرمانبەریی بکات، بەڵام بە زۆر لەخۆکردن، هەروەها (تطوع) بە بەخشینی ماڵێك دەگوترێ کە ئینسان لەسەری پێویست نەبێ، وەك چۆن ئینسان نوێژی سوننەت دەکاتو لەسەریشی فەرز نیە.

(فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ): واتە: گاڵتەیان پێدەکەن، (سَخِرْتُ مِنْهُ وَاسْتَسخَرْتُهُ لِلْهُزْءِ بِهِ، وَرَجُلٌ سُخَرَةٌ: يَسْخَرُ، وَسُخْرَةٌ: يُسْخَرُ مِنْهُ).

(سَخِرْتُ مِنْهُ وَاسْتَسخَرْتُهُ) واتە: گاڵتەم پێکرد، پیاوێك کە زۆر گاڵتە بە خەڵك بکات پێی دەگوترێ: (رَجُلٌ سُخَرة)، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (رَجُلٌ سُخْرَةٌ) واتە: پیاوێك کە گاڵتەی پێ دەکرێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا ۚ وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِن فَضْلِهِ ۚ فَإِن يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ (٧٤) ﴾.

لەوبارەوە ئەم دوو بەسەرهاتە گێڕدراونەوە:

أ/ ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعَ زَيْد بْن أَرْقَم رَضِيَ اللهُ عَنْهُ رَجُلاً مِنَ المُنَافِقِينَ يَقُولُ: وَالنَّبِي ﷺ يَخْطُبُ: إِنْ كَانَ هَذَا صَادِقاً لَنَحْنُ شَرٌّ مِنَ الحَمِيرِ، فَقَالَ زَيْد رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: هُوَ (والله) صَادِقٌ وَلأَنْتَ أَشَرّ مِنَ الحِمَارِ، فرفَع ذَلِكَ إِلى النَّبي ﷺ فَجَحَد القَائِلُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا ...(٧٤) ﴾، فَكَانَتِ الآيَة فِي تَصْدِيق زَيد﴾، {أَخْرَجَهُ اِبْنُ أَبي حاتِم فِي تفسير، برقم: (١٠٢٢٢)، والسيوطي في الدر المنثور ص ٣٠٤، والشوكاني في فتح القدير، ج ٢، ص ٥٥٦}.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: زەیدی کوڕی ئەرقەم گوێی لە پیاوێك بوو لە دووڕووەکان، لە کاتێك دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، گوتی: ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بێژ بێ، ئێمە لە گوێدرێژان خراپترین. زەیدیش گوتی: سوێند بە خوا، ئەو ڕاست دەکاو تۆش لە کەر خراپتری.

ئنجا ئەو مەسەلەیە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش کابرای بانگ کرد، بەڵام ئەو نکووڵیی لێکرد کە ئەو قسەیەی کردبێ، خوای بەرزیش ئەو ئایەتەی نارده خوار، ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ ...﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: ئەم ئایەتە زەیدی کوڕی ئەرقەمی بە ڕاست دانا.

ب/ ﴿عَنِ ابنُ عبَّاسٍ رضي الله عنهما كانَ رَسولُ الله ﷺ جَالِساً فِي ظِلِّ شَجَرَةٍ، فَقَالَ: (إِنَّهُ سَيأْتِيكُمْ إِنْسانٌ يَنظرُ إليْكُمْ بعيْنِ الشَّيْطَانِ، فإذَا جَاءَ فَلاَ تُكَلِّمُوهُ) فَلَمْ يَلْبَثُوا أَنْ طَلَعَ رَجُل أَزْرَقٌ، فَدَعَاهُ رَسولُ الله ﷺ، فَقَالَ: (عَلامَ تَشْتِمُنِي أَنْتَ وَأَصْحابُكَ) فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ، فَجَاءَ بِأَصْحابِهِ، فَحَلفُوا باللهِ مَا قَالُوا وَمَا فَعَلُوا، حَتَّى تَجَاوَزَ عَنْهُمْ، وَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالى: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ ...﴿٧٤﴾ ﴾﴾
{أَخْرَجَهُ الطبري فِي جامع البيان، برقم: (١٦٩٧٣)، والسيوطي فِي الدر المنثور، ج ٤، ص ٢٤١، نسبته للطبراني، وقالا في الإستيعاب: رجاله ثقات}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر سێبەری درەختێکدا دانیشتبوو، فەرمووی: ئێستا ئینسانێك دێ، بە چاوی شەیتان تەماشاتان دەکات، ئەگەر هات قسەی لەگەڵدا مەکەن، هێندەی پێ نەچوو، پیاوێکی ڕەنگ شین هات، فەرمووی: بۆچی خۆتو هاوەڵەکانت جنێوم پێ دەڵێن؟ کابراش ڕۆیی، هاوەڵەکانی خۆی هێناو سوێندیان بە خوا خوارد، کە نە قسەی وایان کردوەو نە کاری وایان کردوە، هەتا پێغەمبەر خوا ﷺ چاوپۆشیی لێکردن، ئیدی لەوبارەوە، خوای بەرز ئەم ئایەتەی نارده خوار:
﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ ...﴿٧٤﴾ ﴾.

٢) لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوە ئەم سێ ئایەتە: ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ

يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾.

ئەم گێڕراوەیە هەیە:

﴿قال عبدالله بن مسعود: اعْتَبِرُوا الْمُنَافِقَ بِثَلَاثٍ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، أَنْزَلَ اللهُ تَصْدِيق ذَلِكَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ ... ﴿٧٥﴾ ﴾، إلى قوله: ﴿ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾﴾،{أَخرَجَهُ سَعِيد بْن مَنْصُور فِي سننه برقم: (١٠٢٦)، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٢٦١٢٤)، والطبري ج ١٠، ص ١٣٢، والطبراني في (الكبير)، برقم: (٩٠٧٥)، وقالا في الإستيعاب: قلنا سنده صحيح}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی‌بێ، گوتوویەتی: بابای موونافیق بەو سێ شتانە بناسنەوە: کە قسەی کرد درۆ دەکات، وە ئەگەر بەڵێن بدات دەیشکێنێ، وە ئەگەر پەیمانی لەگەڵ کەسێك بەست، دەیشکێنێ‌و غەدر دەکات.

وە خوای پەنهانزانیش بۆ بەڕاست دانانی قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾.

لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە :

﴿عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: لَما نَزَلَتْ آيةُ (وفي رواية لما أُمرنا بـ) الصَّدَقَةِ كُنا نُحامِلُ (وفي رواية نتحامل) فَجَاءَ رَجُلٌ فَتَصَدَّقَ بِشَيْءٍ كَثِيرٍ، فَقَالُوا: (وفي رواية فقال المنافقون) مُرَائِي، وَجَاءَ رَجُلٌ (وفي رواية أبو عقيل) فَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ، فَقَالُوا: إِنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَاعِ هَذَا، فَنَزَلَتْ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾﴾، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٤٦٩) وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٠٨٨)}.

واتە: ئەبو مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارو، فەرمانی کرد {وە لە گێڕانەوەیەك دا هاتوە: کاتێك کە فەرمانمان پێکرا} بە صەدەقە، ئێمە زۆرمان لە خۆمان دەکرد، {واتە: فشاریان بۆخۆیان دەهێنا کە ببەخشن لەبەرئەوەی نەدار بوون} پیاوێك هات ئەندازەیەکی زۆری ماڵو سامان هێنا بەخشی، گوتیان: {وە لە گێڕانەوەیەکدا موتافیقەکان گوتیان:} ئەوە بۆ ڕووپاماییو ڕیابازیی وا دەکات، وە پیاوێکیش هات، {وە لە گێڕانەوەیەکی دی دا دەڵێ: ئەبو عەقیل هات}، ئەویش صاعێکی {واتە: ڕبەیەك، ئنجا ئایا خورما بوو، ئایا گەنم بوو، جۆ بوو} بەخشی، گوتیان: خوا پێویستی بەو ڕبەیەی ئەو پیاوە نەبووە، لەوبارەوە خوا ﷻ ئەم ئایاتەی ناردە خوارەوە.

## مانـای گشـتی ئایەتەکـان

لەم هەشت ئـایـەتـەدا، خـوای پەروەردگار جارێکی دیکە دێتـەوە سـەر باسی ناساندنی موناڤیق‌و دەغەڵەکان، وە تیشکی زیـاتر دەخاتـە سـەر هـەم دڵ‌و دەروونیـان، هـەم قسـەو کردارو هەڵوێستیـان، سـەرەتا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، دەدوێنـێ، دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾﴾.

ئەی پێغـەمبـەر! لە دژی کافرەکان‌و مونـافیقـەکـان تێبکۆشـەو لـەسـەریـان زبر بـە، وە جێی حەوانەوەو ئیسرِاحەتیان دۆزەخەو، ئەوێش خراپترین شوێـنە کە ئینسانی بچێتێ. هەڵبەتە وەك دوایی لە مەسـەلە گرنگەکان دا زیـاتر باسـی دەکـەین، لێـرەدا کـە خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾، لە دژی کافرو مونافیقەکان تێبکۆشەو لەسەریان زبربە.

تێکۆشانی پێغـەمبـەر ﷺ‌و مسوڵمانەکان لـە دژی کـافرەکان، جۆرێـك بـووە، وە لـە دژی مونـافیقەکـان جۆرێکی دی بووە، هەروەها زبـریی نواندن، لـە بەرانبـەر کافرەکانـدا، بە تـایبەت ئـەو کافرانـەی شـەڕیـان بە مسوڵمانـان فرۆشتوە، جۆرێك بـووە، وە زبـریـی نواندن بەرانبـەر بـە مونـافیقەکان جۆرێکی دیکە بووە.

چونکە تێکۆشان لە بەرانبەر کافرەکان دا بەوە بووە، کە سـەنگەریان لـێ بگیـرێ‌و بەرپەرچ بدرێنەوە، وەك چۆن ئەوان شـەڕ بە مسوڵمانان دەفرۆشن، مسوڵمانـانیش لـە دژی ئـەوان بـجـەنگن، واتـە: بە چـەك‌و بە هێـز.

بەڵام هی مونـافیقـەکان بریتی بووە لـە وریـابوون لێیـان، وە کە قسـەی زبریـان پـێ بگوترێ، لە بەرانبەر پیلان‌و فێڵ‌و قسەی خراپیاندا، وە نهێنییـەکانیان ئاشکـرا بکـرێـن.

وە ئەگەر گوناهو هەڵەو ناشەرعییەکیان کرد، وەك باقی مسوڵمانان سزا بدرێن، مادام خۆیان بە مسوڵمان لە قەڵەم داوە، وەك دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

ئنجا دوایی خوا ﷻ باسی ئەو هەڵوێستەیان دەکات، کە بریتیە لە سوێندی بە درۆ خواردن، بۆ خۆ پەراندنەوەو پاساو هێنانەوە، دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ ﴾، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشی دا باسمان کرد، دەفەرموێ: (مونافیقەکان) سوێند بە خوا دەخۆن کە نەیانگوتوە، {واتە: ئەو قسەیەی کە پێی تۆمەتبار کراون، کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد}، وە بە دڵنیایی وشەی کوفریان گوتوە، وە لە دوای ئەو ئیسلامەتییەی خۆیان، کافر بوونەتەوە.

لێرەدا نەیفەرموە: (وكفروا بعد الإسلام) بۆ ئەوەی وا نەزانرێ، کە ئەوانە بە ئیسلامەتییەکی ڕاستەقینە هاتوونە نێو ئیسلامەوە، بەڵکو ئەو جۆرە ئیسلامەتییەی کە تایبەت بووە بەوانەوە، کە بریتی بووە ئیسلامەتییەکی ڕووکەش و سادەو ڕواڵەتیی، واتە: تەنانەت ئیسلامەتییە ڕواڵەتیی و ڕووکەشییەکەی خۆشیانیان، هەڵوەشاندۆتەوە لەلای مسوڵمانان، ﴿ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ﴾، وە شتێکیان ویست، نەخشەو مەبەستێکیان هەبوو، کە دەستیان نەیگەیشتێ، کە وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوەی کە ویستوویانەو دەستیان پێی نەگەیشتوە، ئەوە بووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بێئاگایی دا بکوژن، لە کاتێکدا کە لە جەنگی تەبووك دەگەڕانەوە، لە دەربەندێك (شوێنێکی تەنگەبەر) هەڵیدێرن، بەڵام پیلانەکەیان ئاشکرا بووە، وە ئەوەی کە لە دڵیاندا هەبووە، ئەو نیازو مەبەستە خراپە، بۆیان نەهێنراوەتە دی، ﴿ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، وە هیچ شتێکیشیان بە عەیب و بە ڕەخنە نەگرت، وە هیچ شتێك پاڵی پێوە نەنان، کە ئاوا بە دوای تۆڵەدا بگەڕێن، مەگەر ئەوە کە خوا لە بەخششی خۆی بێنیازی کردن و دەوڵەمەندی کردن، وە چاکەو نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتن، هەروەها پێغەمبەرەکەیشی (چاکەی جۆراو جۆری لەگەڵیان دا کرد).

چونکە پێشتر پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بچێ بۆ مەدینە لە حاڵێکی زۆر ناخۆش دا بوون، هەم لە ڕووی ئابوورییەوە، هەژارو نەدار بوون، هەم لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، ناکۆك و پرژو بڵاو بوون، هەم لە ڕووی سیاسییەوە، هیچ حیسابێکیان بۆ نەدەکرا، بەڵام بەهۆی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەرەوە ﷺ وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: (پارووبان کەوتە ڕۆنی)! لە ڕووی ئابوورییەوە: دەولەمەند بوون، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە: پێکەوە بوونەوە براو تەبا بوون، لە ڕووی سیاسییەوە: حورمەت و ئیعتیباریان بۆ پەیدا بوو، لە دوورگەی عەرەبیی و لە دنیای نیزیکی خۆیاندا، بێگومان خوا بە توانجەوە فەرموویەتی: هەر ئەوەیان بە عەیب گرت!

ئنجا دەفەرمویْ: ﴿فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ﴾، ئێستاش ئەگەر بگەڕێنەوە، واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای خواو، دەست لەو کارە کردەوەو، نیازو مەبەستە خراپ و گڵاوانە. هەڵبگرن، ئەوە بۆ ئەوان باشترە، ﴿وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾، بەڵام ئەگەر پشت هەڵبکەن، واتە: پشت لە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، ئەوە خوا لە دنیاو دواڕۆژدا، سزاو ئازارێکی بەئێشیان دەدات، لە دنیادا ئەوە ئازارێکی بەئێش بوو بۆیان، کە هەمیشە چاوەڕێ بوون کەی قسەکانیان بەدرۆ دەخرێنەوە؟

کەی پیلانەکانیان ئاشکرا دەکرێن؟

کەی مسوڵمانان بە پیلان و فێڵیان دەزانن؟ ئەوە لە ئازارێکی دەروونیی زۆردا بوو ون.

کاتێك کە هەر کامێکیان نەخشەیەکی گڵاوی لێ ئاشکرا بووە، هەر کامێکیان قسەیەکی خراپی لەسەر ساغ بۆتەوە کە کردوویەتی، وە ناچار بوون بۆ پاکانەی خۆیان بێن. سوێندی بە درۆ بخۆن، وە سەرەنجام: لە لای هاوەڵانی خۆیشی ئابڕووی چووە، وە لە لای مسوڵمانانیش بێ ئیعتیبار بووە، کە ئەوەش ئازارێکی بە ئێش بووە.

وە لە دواڕۆژیشدا وەك خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ...﴿١٤٥﴾﴾النساء، واتە: بێگومان دوو ڕووەکان لە پلەی خوارەوەی ئاگردان.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾﴾، وە لەسەر زەوی هیچ سەرپەرشتیارو مشوورخۆرێكو یارمەتیدەرێكیان چنگ ناكەوێ، لە بەرانبەر خوادا.

ئنجا دێتە سەر جۆرێكی دیكەیان، دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِن فَضْلِهِ﴾، وە كەسانێك لە نێو مونافیقەكاندا هەن، كە پەیمانیان لەگەڵ خوادا بەست، گوتیان: ئەگەر خوا لە بەخششی خۆی پێمان بدات، واتە: دەوڵەمەندمان بكات، ئەوە ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٧٥﴾﴾، بە تەئكید ئێمە چاكە دەكەینو ماڵو سامان دەبەخشین، وە بە تەئكیدو بە دڵنیایی ئێمە لە چاكان دەبین، واتە: ئەو ماڵو سامانەی خۆمان لە چاكەو لە خواپەرستییدا خەرج دەكەین.

بەڵام ئایا ڕاستیان كرد لە بەڵێنو پەیمانەكەیاندا؟

﴿فَلَمَّا آتَاهُم مِّن فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾﴾، بەڵام كاتێك خوا لە بەخششی خۆی پێیدان، دەوڵەمەندی كردن، سەروەتو سامانی بەسەردا ڕشتن، چرووكییان تێدا كردو، ڕژدییان لەو ماڵو سامانەدا كرد، وە پشتیان هەڵكرد، لە كاتێكدا كە ڕوویان وەرگێڕا بوو، {لە ئیسلامو لە قورئانو لەوْ بەڵێنو پەیمانەی كە بە خوایان دابوو}.

ئنجا خوا لە سزای ئەوەدا چی لێكردن؟

دەفـــــەرموێ: ﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾﴾، خواش نیفاقی خستە دڵیانەوە، واتە: سەرەنجامیان نیفاق بوو، تا ئەو ڕۆژەی پێی دەگەن، واتە: تا ڕۆژی قیامەت، ئەو نیفاقە لە دڵیاندا جێگیر بوو.

ئایا بەهۆی چییەوە ئەو نیفاقە لە دڵیان دا جێگیر بوو تاكو ڕۆژی قیامەت؟

بەهۆی ئەوەوە كە ئەو بەڵێنەی بە خوایاندا، نەیانبردە سەر، وە بەهۆی ئەوەوە كە درۆیان كرد.

لەمەوەش بۆمان دەردەکەوێ کـەبـێ پـەیمـانیی‌و پـەیمـان شکـێـنیی، وە درۆزنیی‌و درۆ کردن، دەبێتە هۆی پەیدابوونی نیفاق‌و دەغەڵیی لە دڵی ئینساندا، دیارە گوناهەکان هەندێکیان هـەندێکیان پەلکێش دەکەن، وەك چۆن چاکـەکان هـەندێکیان هەندێکـیان پەلکێش دەکەن، ئینسان جاری وایە گوناهێك دەکات، ئەو گونـاهە دەبێتـە هۆی ئەوەی گوناهێکی دیکەشی بەدوادا بێت، هەروەك بە پێچەوانەوە: جاری وایە ئینسان چـاکەیەك دەکات، ئەو چاکەیـە وا دەکات، چاکەیەکی دیکەی بـەدوادا بکات.

ئنجا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ ﴾، ئایا نەیاندەزانی؟ واتـە: دەبوو زانیبایان، ئەمە پرسیـارلێکردنی نکوڵیی لێکەرانەیـە، یانـی: دەبوو زانیبـایـان کە خـوا نهێنییـەکـانیـان دەزانـێ، وە قسـەی چپـە چپیشیـان دەزانـێ. قسەیەك کە بە پـەنهانیی پێکەوە دەیکەن، بەڵکو نهێنییەکانی نێو دڵیشیان دەزانـێ. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ۝٧٨﴾، وە کە بێگومان خـوا زۆر زانـایـە بە نهێـنیی‌و پـەنهـانەکان.

ئنجـا دێتـە سـەر جـۆرێکی دیکـە لـە مونـافیق‌و دەغەڵەکان، وە جـۆرە هەڵوێسـتێکی دیکـەیان، دەفـەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾، ئەوانەی کە ڕەخنەو عەیب دەگرن، لـەوانەی کـە ماڵ‌و سـامانی خـۆیـان دەبەخشن، لـە بـڕواداران.

(ٱلْمُطَّوِّعِينَ ) واتە: (المُتَطوعِين) ئەوانەی کە ماڵ‌و سامانی خـۆیان دەبەخشن. بێئـەوەی لەسـەریـان پێویست بـێ، ئنجا دەغـەڵەکان بەهـۆی مـاڵ بەخشـینەکانیانەوە ڕەخنەیـان لـێدەگـرن، دەڵـێن: ئـەوە بۆ ڕیـابـازیی‌و ڕووپـامایی وا دەکـەن، وەك لـە هـۆی هـاتنە خـوارەوەکـەشی دا باسمان کـرد: ئـەوەی زۆری بەخشیبـایـە، دەیـانگوت: ڕیـابـازە. ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ﴾، وە ئەوانەی کە تـەنیـا ئـەوە دەبەخشن کە بە زەحمەت بۆیان دەکرێ، وە فشار لە خۆیان دەکـەن‌و، گوشـار بۆخۆیـان دێـنن، ئەوجار دەتوانن شـتێك ببەخشـن، لەبەرئەوەی کە کەمیـان هەیە، کـەسێك کـەمی

هەبێ، دەبێ زۆر لە خۆی بكات، بۆ ئەوەی شتێكی لێ ببەخشێ، ئەوانەش مونافیقەكان گاڵتەیان پێدەكردن، دەیانگوت: خوا چ پێویستیی بەو ماڵ بەخشینە كەمە هەبوو؟

﴿سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٩﴾، خـواش گاڵتـەیـان پێبكـات، وە سـزاو ئازارێكی بە ئێشیان هەیە، یان: خوا گاڵتەی پێكردن، وەك چۆن ئەوان گاڵتە دەكەن، خواش گاڵتەی پێكردن لە دوارۆژدا، واتە: بە شێوەیەك مامەڵەی لەگەڵدا كردن، وەك مامەڵەی كەسێك كە گاڵتە بە كەسێك دەكات.

ئنجا خـوای زانـاو توانـا لـە كۆتـایی دا بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾، داوای لێبوردنیان بۆ (لە خوا) بكە، یان داوای لێبوردنیـان بۆ مەكە، واتـە: داوای لێبوردنیـان بۆ لە خوا بكەی، كە خوا لێیان ببوورێ، چاوپۆشییان لێبكات، یاخود داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا نەكـەی، ﴿إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ﴾، ئەگـەر حـەفتا جـار داوای لێبوردنیـان بـۆ لـە خـوا بكەی، كە خوا بیان بوورێ لەو كردەوانەیان، لەو نیفاقەیان، هەرگیز خوا لێیان نابوورێ، بۆچی خوا لێیـان نـابوورێ؟

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە كە بێبـڕوا بوون بە خـواو بە پێغـەمبـەرەكەی ﷺ، كەسێكیش كافر یان موشریك بێ، بە تەئكـید قەڵەمی عەفووی بەسـەردا نـایـەت‌و، لێبوردنی خوا نـایگرێتـەوە.

﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٨٠﴾، وە خـوا كۆمەڵی لاڕێیان‌و لادەران ناخاتـە سـەر ڕاسـتـە ڕێ.

چونكە شایستـەی ئەوە نین خـوا بیـانخاتـە سەر ڕاسـتە ڕێ.

مەگـەر لەو كوفرو نیفاق‌و، لەو شیـركە كە لە دڵیاندا جێگیـر بووە، خـۆیان دەربـاز بكەن‌و، تۆبـە بكـەن، ئەگـەرنا تـاكو شیـرك‌و كوفرو نیفاق لـە دڵ‌و دەروونـی ئینسـانـدا هەبێ، بە پێی یـاسـای خـوای دادگـەر، لێبوردنـی خـوا نـایگرێتـەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾﴾.

پێشتر ئایەتەکەمان مانا کرد، واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ لە دژی کافرەکانو مونافیقەکان تێبکۆشەو زبربە لەسەریان، وە جێگای حەوانەومیان دۆزەخە، وە خراپترین شوێنیش کە ئینسان بۆی بچێ، ئەوێیە.

(الجهاد: بَذْلُ الوُسعِ)، (جهاد) ئەوەیە کە ئینسان هەرچی لە توانایدا هەیە بەکاری بێنێ، یان گوتراوە: (بَذْلُ أَقْصَى مَا فِي الوُسْعِ)، ئینسان ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاربێنێ، تێبکۆشێ، خۆی ماندوو بکات.

ئنجا وەك پێشتر ئاماژەیەکمان پێدا، دیارە تێکۆشانی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان لە دژی کافرەکان بە هێزو بە چەك بووە، کە لەگەڵیان ڕووبەڕوو بوونەوە، ئەو کاتەی کە ئەوان سەنگەریان لە مسوڵمانان گرتوە، بەڵام هی مونافیقەکان چۆن بووە؟ هەرگیز لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەگێڕدراوەتەوە، کە بە چەكو بە هێز لەگەڵ مونافیقو دەغەڵەکاندا ڕووبەڕوو بووبێتەوە.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾، وەك لە سوورەتی (التحریم)یشدا، هەر ئەم ئایەتە موبارەکە هاتوە، دیارە تێکۆشانی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان لە دژی کافران، بریتی بووە لە جەنگ کردن بە هێزو بە چەك لە دژیان، بەڵام هی مونافیقەکان بریتی بووە لەوە، کە بە قسەو بە بەڵگەو بە ڕوونکردنەوەی نهێنییەکانیان، وە بە سەرزەنشت کردنیانو بە قسەی زبر لەگەڵ کردنیان، ڕووبەڕوویان ببنەوە، بۆ ئەوەی بسڵەمێنەوە لەو پیلانو فێڵانە. وە لەو قسەی خراپانە کە دەیانکەن لەبەرو مەجلیسان.

هەڵبەتە دەغەڵانیش ئەگەر دوژمنایەتیی‌و دژایەتیی خۆیان ئاشکرا بکەن، وە سەنگەر لە مسوڵمانان بگرن، ئەو کاتە هەمان مامەڵەی کافرانی ئاشکرایان لەگەڵدا دەکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ﴾، دەڵێ: (الغِلْظَةُ: الشِّدَّةُ الحِسِّيَةُ وَالخُشُونَةُ، وَهِيَ مُسْتَعَارَةٌ لِلمُعَامَلَةِ الضارَّة، فَأُمِرَ رَسولُ اللهِ ﷺ بالتَّخَلّي عَنْ جِبِلَّتِهِ الَّتِي هِيَ رَحْمَةٌ وَلِين).

(غِلْظَة) بریتییە لە سەختیی‌و توندوتیژیی ڕواڵەتیی‌و بەرهەست، ئنجا خوازراوەتەوە بۆ مامەڵەکردنێك کە زبرو توند بێ لەگەڵ مونافیقەکان دا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکراوە، کە واز لە سروشتی ئاسایی خۆی بێنێ، کە بریتی بووە لە بەزەیی‌نواندن‌و نەرمیی‌و میهرەبانیی‌و لێبوردەیی،وە شێوەو حاڵەتێکی دیکە بەخۆوە بگرێ کە پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی، کە بریتییە لە زبریی‌و ڕەقیی لەگەڵ مونافیق‌و دەغەڵەکاندا، بۆئەوەی بپرینگێنەوەو بسڵەمێنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾، (المَأْوى: مَا يأوي إلَيْهِ الإنْسان مِنَ المَكانِ، أَي : يَلْتجِيءُ إليهِ).

(أوي ياوي) یانی: (لَجأَ يَلْجأُ) کەواتە: (مأوى) ئەو شوێنەیە کە ئینسان پەنای پێ دەبات، لە زمانی کوردییش دا بەکاردێ، دەگوترێ: جێ‌و ماوای بەهەشت بێ، ئنجا ئەوانە شوێنی حەوانەوەو پشوودانیان، دۆزەخە.

وشەی (مصير)یش دەڵێ: (المَكانُ الَّذِي يَصِيرُ إلَيْهِ المَرْءُ: أَي يَرْجِعُ إِلَيْهِ)، (مَصِير): ئەو شوێنەیە کە ئینسانی بۆلا دەچێ، دەگەڕێتەوە بۆ لای، کەواتە: (مأوى)و (مَصِير) هەردووکیان بە مانای ئەو شوێنە دێن کە ئینسانی بۆ لا دەگەڕێتەوەو بۆ لای دەچێ‌و، دەیکات بە جێی حەوانەوەی خۆی، (مأوى) بە ئیعتیباری تێدا حەوانەوەی، وە (مَصِير) بە ئیعتیباری بۆ لا گەڕانەوەی.

ئەم ئایەتە موبارەکە وەك ئەو سێ ئایەتەی سوورەتی (الأحزاب)ە، کە خوای پەروەردگار ڕوونتر بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ بەیان دەکات، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ مونافیق‌و دەغەڵەکاندا بکات، وە ڕوونتر لەگەڵ مونافیقەکان دەدوێ‌و توندتر هەڕەشەیان لێ دەکات، دەفەرموێ:

﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ
لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟
أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ
لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾﴾.

واتە: ئەگەر موناfیقەکانو ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو، ئەوانەی پڕوپاگەندەی خراپ دەکەن، لە مەدینەدا، وازنەهێنن لەو عادەتو پیشە خراپەیان، (ئەی پێغەمبەر ﷺ) تۆیان لێ هان دەدەین، وە پاشان کەمێك نەبێ {واتە: بایی ئەوەندە کە تۆیان لێ تێدەگەیەنین‌و، تۆیان بە گژدا دەکەین} لە دراوسێیەتی تۆدا نامێنن {واتە: دەبێ لە مەدینە دەربکرێن، ئەگەر دوژمنایەتییەکەیان ئاشکرا بکەن} نەفرین لێکراون‌و دوورخراوەن لە ڕەحمەتی خوا، لە هەر شوێنێك بەر پەل بکەون، دەگیرێن‌و زۆر بە خراپیی کوشتاریان لێدەکرێ، {واتە: ئەگەر کەوتنە حاڵەتی جەنگەوە، لە بەرانبەر ئیسلام‌و مسوڵمانانـدا} ئەوەش یاسای خوایە، لەوانەدا کە پێشتر ڕابردوون ، وە هیچ جێدار (بدیل)ێکت بۆ یاسای خوا چنگ ناکەوێ (یاسای خوا ناگۆڕێ).

دیارە سڵەماندنەوەی موناfیقەکان‌و پرینگاندنەوەیان، پێویستی بە زبریی هەبوو، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (کەس لە شەڕ، شەکری نەبەخشیوەتەوە):

١- وەختێك کە موناfیقەکان پیلانیان گێڕاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن.

٢- پیلانیان گێڕاوەو بوختانیان بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ (عائشة) کردوە.

٣- پیلانیان گێڕاوە کە مسوڵمانان تێکبەردەن.

٤- پیلانیان گێڕاوەو لەگەڵ ڕۆمەکاندا کەین‌و بەینیان هەبووە، بۆ دژایەتیی مسوڵمانان‌و هێنانی سوپای ڕۆم، کە بەسەر مسوڵمانان دا بدەن.

٥- پیلانیان گێڕاوەو خەڵکیان سارد کردۆتەوە لە جەنگ‌و جیهاد.

٦- پیلانیان گێڕاوە کە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی پەیدا بکەن لە نێوان کۆچکەران‌و پشتیوانان دا.

٧- پیلانیان گێڕاوە کە خەڵك ماڵ نەبەخشێ؛ ئەوەی زۆری بەخشیبێ گوتوویانە: ئەوە ڕیابازەو، ئەوەی کەمی بەخشی بێ، گوتوویانە: خوا پێویستی بەوە نیە!

ئەگەر تەماشا بکەین: مونافیقەکان زۆر پیلان‌و نەخشەی گڵاوو خراپیان هەبووە، لە حاڵێکدا کە ئەوانە هاووڵاتیی بوون، ئنجا لێرەوە تێدەگەین : بۆچی خوا ﷻ بەو شێوەیە پێغەمبەری خۆی ﷺ یان لێ تێدەگەیەنێ، وە هەڕەشەیان لێ دەکات، کە ئەگەر بێت‌و دەست هەڵنەگرن، لەمەودوا بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ.

بەڵێ ئەگەر چاك بزانین لە مەدینەدا چی گوزەراوەو، مونافیق‌و دڵنەخۆشەکان‌و دەغەڵەکان‌و پڕوپاگەندە چییەکان، چییان کردوە؟! بۆمان دەردەکەوێ کە بۆچی خوای کاربەجێ بەو شێوەیەی فەرمووە؟

بۆچی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: دژی کافرەکان‌و مونافیقەکان تێبکۆشە، وە لەسەریان زبربە!

کە دیارە ئێستاش لە سەردەمی ئێمەدا، ئەو جۆرە کەسانە هەر هەن، کەسانێك کە کوفر لە دڵ‌و دەروونیاندا هەیە، بەڵام خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن، وە خەریکی پیلانگێڕانن‌و، خەریکی دانانی نەخشەی خراپن، لە دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان.

کەواتە: ئێمەش دەبێ لەگەڵ مونافیق‌و دڵنەخۆشەکانی ڕۆژگاری خۆماندا، بەهەمان شێوە مامەڵە بکەین، کە پێغەمبەری خوا مامەڵەی لەگەڵ کردوون.

<u>مەسەلەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٧٤ ﴾.

پێشتر مانامان کردوە، پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات.

حەوت هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتەدا، بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و واتایەکەی :

هەڵوەستەی یەکەم : ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ ﴾، سوێند بە خوا دەخۆن کە نەیانگوتوە، چییان نەگوتوە؟

(أَي مَا قَالوا، ما اتُّهِمُوا بهِ وَنُقِل عَنْهُمْ)! واتە: ئەوەی پێی تۆمەتبار کراون و لێیان گێڕدراوەتەوە، ئەومیان نەگوتوە، کە ئەوەش، بەپێی هەندێك لە ڕیوایەتەکان ـ کە پێشتر باسمان کردن ـ ئەوە بووە، کە قسەیان بە پێغەمبەر ﷺ گوتوە، لە کاتێکدا کە وتاری داوە، یەکێکیان گوتوویەتی: ئەگەر موحەممەد ڕاست بکات، ئێمە لە کەر خراپترین! واتە: موحەممەد ڕاست ناکات و، ئەوانیش کەر نین، کە بە ڕاستیی بەدوای ناکەون و، بڕوای پێ ناهێنن! وە دەگونجێ قسەی دیکەشیان کردبن، وەك چەند ڕیوایەتێکی دیکە هەن.

خوای پەروەردگارو پەنهانزانیش بە درۆیان دەخاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ ﴾، وە بێگومان ئەوان وشەی کوفریان گوت: وشەی کوفر مەبەست پێی چییە؟

(راغب الأصفهاني): {أَصْلُ الكَلِمَة: اللَّفْظُ الوَاحِدُ الَّذِي يَتَرَكَّبُ مِنْهُ، وَتُطْلَقُ الكَلِمَةُ عَلَى الكَلَامِ، إِذَا كَانَ كَلَاماً جَامِعاً مُوجَزاً: ﴿ كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ﴿١٠٠﴾ ﴾المؤمنون، وَفِي الحَدِيث : (أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَاعِر: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللهَ بَاطِلُ).

فَكَلِمَةُ الكُفْرِ جِنْسٌ لِكُلِّ كَلَامٍ فِيهِ تَكْذِيب النَّبِيّ ﷺ}.

واتە: وشەی (كلمة) لە بنەڕەتدا یەك بێژەیە کە ئەو وشەیەی لێ پێکدێ، بەڵام وشە (كلمة) بۆ قسەی زۆریش بەکاردێ، مادام قسەیەك بێ کە کۆکەرەوەو پڕ مانابێ، وەك خوا ﷻ لە وەڵامی کافرێکی دۆزەخییدا، کە دەڵێ: ﴿ ...قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ... ﴿١٠٠﴾ ﴾المؤمنون.

واتە: پەروەردگارم! بمگێڕنەوە، بەڵکو کردەوەی باش بکەم لەم ژیانە دنیاییەدا کە بەجێم هێشتوە (جارێکی دیکە بمگەڕێننەوە دنیایە).

خوا دەفەرموێ: ﴿...كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ...﴿١٠٠﴾﴾المؤمنون.

واتە: نەخێر، ئەوە وشەیەکە هەر خۆی دەیڵێ، {کە هەر یەك وشەش و، یەك بێژەش نیە، بەڵکو چەند وشەیەکە، کەواتە: جاری وایە قسەیەکی زۆریش بە (کلمة) تەعبیری لێ دەکرێ}، وە لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی:

﴿أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَاعِرِ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللهَ بَاطِلُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٠٠٧٦)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٣٦٢٨)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٢٥٦)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٣٧٥٧)}.

واتە: ڕاستترین وشەیەك کە شاعیرێك گوتبێتی، ئەوەیە کە دەڵێ: ئاگاداربن! هەموو شتێك جگە لە خوا بۆشە.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ﴾، وشەی کوفر، جینسی هەر وشەیەکە ﷻ بەدرۆدانانی پێغەمبەر ﷺی تێدابێ، یان قسەیەکی تێدابێ کوفر بگەیەنێ.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u> : دوایی دەفەرموێ: ﴿وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟﴾، وە لە دوای ئیسلامەتییەکەیان کافر بوونەوە، لێرەدا نەیفەرموە: (وَكَفَرُوا بَعْدَ الإِسْلاَم) واتە: لە دوای ئیسلامەتیی ڕاستەقینە، کافر بوونەوە، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ﴾، دوای ئیسلامەتییەکەی خۆیان، واتە: دوای ئەو جۆرە مسوڵمانەتیی و ئیسلامەتییەی کە هەیانبووە، کە بە تەئکید مسوڵمانەتیی و ئیسلامەتییەکی ڕووکەشیی و ڕواڵەتیی بووە، ئنجا ئەوانە لە دوای ئەو ئیسلامەتییە ڕووکەشییەش کوفریان کردوە، واتە: تەنانەت ئەو پەردە تەنکەشیان لەسەر خۆیان لاداوە !

هەڵوەستەی سێیەم : ﴿وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟﴾، واتە: وە شتێکیان ویست کە دەستیان پێی نەگەیشت.

(الهمُّ: نية الفعل، سواء فُعِلَ أو لم يُفْعل)، (هَمّ) بریتیە لەوە کە ئینسان نیەتی ئەنجامدانی کردەوەیەکی هەبێ، ئنجا ئەو کردەوەی بۆ بکرێ، یان بۆی نەکرێ.

ئنجا ئایا ئەو نیازو مەبەستە چی بووە کە هەیانبووە، بەڵام دەستیان پێی نەگەیشت؟ وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، بریتی بوو لەوەی کە کۆمەڵێك لە مونافیقەکان کە ژمارەیان چواردە، یان پازدە نەفەر بووە، ویستوویانە لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان دا، لە جەنگی تەبووك، لە دەرووێکی سەخت، شوێنێکی تەنگەبەر، کە خوارەوەی دۆڵو شیوێکی قووڵ بووە، لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر وڵاخەکەی هەڵدێرنو بیکوژن، دیارە لە شەوێکی تاریکدا، وەك (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: {والمَقصُود به هو الفَتْك برسولِ الله ﷺ عِنْدَ مَرْجَعِهِ مِنْ تَبوك، تَوَاثَقَ خَمْسَةَ عَشَرَ مِنْهُمْ، عَلَى أَنْ يَتَرَصَّدُوا لَهُ فِي عَقَبَةٍ بالطريق، تَحْتَها وَادٍ فَإِذا اعْتَلاها لَيْلاً، يَدْفَعُونَهُ عَنْ رَاحِلَتِهِ إلى الوَادِي، وَكانَ رَسولُ اللهِ ﷺ سائِراً. وَقَدْ أَخَذَ عَمَّار بن ياسِر بِخِطَامِ رَاحِلَتِهِ يقودها، وَكانَ حُذَيْفَة بْنُ اليمان يسوقُها، فَأَحَسَّ حُذَيْفَة بهِم، فَصَاحَ بِهِم، فَهَرَبُوا}[1].

واتە: مەبەست لەوەی کە ویستیانو دەستیان پێی نەگەیشت ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا غافڵ گیر بکەنو لە نەغافڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن. لە کاتی گەڕانەوەی لە جەنگی تەبووك دا، پازدە کەس لە دەغەڵەکان ڕێککەوتن کە چاودێریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، لە شوێنێکی تەنگەبەر لە ڕێگا، کە لە خوارەوەی شیوێکی زۆر قووڵ هەبوو، کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ئەو دەرووە، ئەو دەربەندە، لە کاتی ڕەتبوونی بەوێ دا، بە شەو لەسەر وڵاخەکەی هەڵیدێرن، بەرەو ئەو شیوە قووڵە، ئنجا کە گەیشتە ئەوێ، لە حاڵێك دا کە (عَمَّار بن ياسِر) ڕێشمەی حوشترەکەی دەکێشا، وە (حُذَيْفَة بْنُ اليمانِ)یش لە پشتیەوە بوو.

---

١) التحرير والتنوير، ج ٥، ص٢٧٠، وانظر: صحيح مسلم برقم: (٢١٤٤)، والطبري ج١٤، ص٣١٣.

حوشترەکەی لێ دەخوڕی، (حُذَيْفَة) هەستی بە دەنگی پێیان کرد، بە دەنگی بەرز تێوەی خوڕین، ئەوانیش ڕایانکرد.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە دەڵێ: (حُذَيْفَة) پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردۆتەوەو، ئەویش تێی خوڕیونو ڕایانکردوە.

ئەم دەقەش هی (البيهقي)یە، کە لە (دلائل النبوّة)دا هێناویەتی.

(ابن كثير)یش لە تەفسیرەکەی خۆی دا ئەو ڕووداوەی هێناوە دەڵێ: {وَقَدْ وَرَدَ أَنَّ نَفَراً مِنَ الْمُنَافِقِينَ هَمّوا بالفتْكِ بالنَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي غَزْوَة تبوك، فِي بَعْضِ تِلْكَ اللَيالي فِي حال السَّير، وَكانُوا بضعة عَشَرَ رَجُلاً، قَالَ الضَّحاك فَفِيهِم نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة، وَذَلِكَ بَيِّنٌ فِيما رَوَاهُ الحافظ أَبُو بَكر البَيْهَقِي فِي كِتاب (دَلائِلُ النُّبوة)} [١].

واتە: گێڕدراوەتەوە کە کۆمەڵێك لە دەغەڵەکان ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەغافڵ بکوژن، (لە گەڕانەوەیان) لە جەنگی تەبووك دا، لە یەکێك لە شەوەکان داو ، لە کاتی ڕۆیشتن دا، کە ئەوانیش لای زۆریی پازدە بوون، لای کەمیشی دوازدە بوون، ضەححاك گوتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوان هاتۆتە خوارێ، وە ئەوەش ڕوونە لەوەدا کە ئەبو بەکری بەیهەقیی لە کتێبەکەی خۆی (دَلائِلُ النُّبوة)دا گێڕاویەتەوە.

وشەی (فتك) کە لەو ڕیوایەتانەدا هاتوە، (الرازي) دەڵێ: (الْفَتْكُ ، القَتْلُ عَلَى غِرَّة) [٢]، واتە: (فَتْك) بریتیە لە کوشتن لە بێ ئاگایی دا، کوشتنێك کە کەسی کوژراو ئاگای لێ نەبێ، پێغەمبەری خواش ئەم وشەیەی لە فەرمایشتی خۆیدا بەکارهێناوە، فەرموویەتی:

﴿الإِيمانُ قَيَّدَ الْفَتْكَ، لاَ يَفْتِكُ مُؤْمِنٌ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبي شَيْبَة، برقم: (٣٧٤٣٥)، وَالبُخَارِيُّ فِي التاريخ الكبير، ج ١، ص٤٠٣، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٢٧٦٩)، وَالحاكِمُ، برقم: (٨٠٣٧) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي}.

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ٥٨١.

٢) مختار الصحاح، ص٤٢٨.

واتـە: ئیمان مرۆڤی بەستۆتەوە، کە لە نەغافڵ بکوژێ، یانــی: ئینسـانی بـڕوادار کەس لە نەغافڵ ناکوژێ.

هەڵوەسـتەی چـوارەم : دوایی خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، وە هیچیان بە ڕەخنە نەگرت، تەنیا ئەوەنەبێ کە خـوا لە بەخششی خۆی بێنیازی کردوون، وە پێغەمبـەر ﷺ لەوەی کە لەبەردەستی دا بووە پێی داون، (دەوڵەمەندیان کـردوون و بـێ نیازیان کردوون)، هەڵبەتە ئەمەش جێی عەیب لێگرتن نیە، کەسێك کە چاکە لەگەڵ کەسێك بکات، نابـێ بـە لێـی بـە ڕەخنەو بە عەیب بگیـرێ، بەڵام ئەمە وەك ئەو شیعرەی شاعیـر وایە، کە دەڵێ:

لا عَيْـبَ فِيهِم غَيْـرَ أَنَّ سـيُوفَـهُم بِـهِـنَّ فُـلـولٌ مِن قِـرَاعِ الـكـتـائِـبِ

واتـە: قەومەکـەی من هیچ عـەیبیـان نیـە، تەنیا ئەوە نەبـێ کە شـمشێرەکانیان پـاچـاونەوە هێـندەی شـەڕە شمشێریـان پێبکەن! کە دیارە ئـەوەش عـەیب نیــە، شـمشێر وەشـێنێك هێنده شـمشێرەکەی وەشانـدبـێ، دەمەکەی پاچابێتـەوە دیارە جەنـگاوەری چاکە، واتـە: قەومەکەی من هیچ عەیبیان نیە، مەگەر چاکـەکانیـان بە عـەیـب بزانــن!

لێرەشدا خوای بەخشەر دەفـەرموێ: ئەو مونـافیقـانە هیچ شتێکیان بە ڕەخنـەو بە عەیب نەگرت، لە ئیسلام و مسـوڵمانان، ئەوە نەبێ کە بەهـۆی ئیسـلامەتیـیو بەهۆی پێغـەمبەرەوە ﷺ بـێ نیـاز بوو بوونو دەوڵەمەند بوو بوون، کە بێگومان ئەوەش هی ئەوە نەبوو بە عەیب دابنرێو ڕەخنەی لـێ بگیـرێ.

هەڵوەسـتەی پێـنجـەم : ئنجا کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، ئـەوە چـەند شـتێك دەگرێتـەوە:

١- بە هۆی ئـەو دەسـتکەوتانەو، ئەو هۆکـارانەی ڕزقو ڕۆزیيو کاروکەسـابەتەوە، کە بەهـۆی کۆچکـردنی کۆچکـەرانەوە بـۆ مەدینـە، کـە بوومتـە پایتـەختـی

دەوڵەتی ئیسلامیی، خەڵکی شاری مەدینەو دەوروبەری ژیان و گوزەرانیان زۆر باش بووە.

٢- بەهۆی ئەوەوە کە شاری مەدینە هێمنیی و ئاسایشی تێدا پەیدا بووە، چونکە قەوارەی یەکەمی سیاسی ئیسلام لە مەدینەدا دانرا، وە سەرەنجام خەڵکەکە بەگشتی عیززەت و شکۆی زۆریان بۆ دەستەبەر بوو.

٣- ئەو برایەتیی و یەکریزییەی کە لە نێو مەدینەییەکاندا پەیدا بوو، بەتایبەت هەردووك هۆزی ئەوس و خەزرەج، وە ئەو هەموو ناڕەحەتیی و کێشەو بێشەو شەڕو کوشتارەی بێجێیەی، کە لە نێویاندا هەبوو، هەمووی لاچوو، وەك خوای پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿...وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠٣﴾﴾، واتە: ... وە یادی چاکەی خوا بکەن بەسەر خۆتانەوە، بیهێننەوە یاد: کاتێ کە پێکەوە دوژمن بوون، کەچی خوا دڵتانی پێکەوە بەست و لە سایەی چاکەی ئەوەوە، پێکەوە بوونە برا، وە لەسەر قەراغی چاڵێکی ئاگر بوون، بەڵام دەربازی کردن لێی، ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن.

هەڵوەستەی شەشەم : ئنجا دەفەرموێ: ﴿فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ﴾، ئەگەر بگەڕێنەوە، ئەوە بۆ ئەوان باشتر دەبێ.

بۆ کوێ، وە بۆ لای کێ بگەڕێنەوە؟ ۆ لای خوا بگەڕێنەوەو، دەستبەرداری ئەو جۆرە قسەو نیەتە خراپ و پیلانە گڵاوانە بن، ئەوە بۆ ئەوان چاکترە.

وشەی (يَكُ) دیارە نوون (ن)ەکەی لابراوە بۆ سووکیی.

کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٧٤﴾﴾، بەڵام ئەگەر پشت هەڵبکەن،

{پشت لە ئیسلام‌و ئیمان‌و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بکەن}، ئەوە خوا بە ئازارێکی زۆر بەئێش سزایان دەدات، هەم لە دنیاو هەم لە دوارِۆژدا، وە هیچ کەسیشیان دەستناکەوێ سەرپەرشتیاریان بێ‌و، سەرخەرو یارمەتیدەریان بێ.

دیارە سزادانی مونافیقەکان بە ئازاری بە ئێش لە دوارِۆژدا، باسکراوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ...﴿١٤٥﴾﴾ النساء، واتە: بێگومان دوو ڕووەکان لە پلەی خوارەوەی ئاگردان، بەڵام مەبەست لە سزای دنیا چی بووە؟

١/ یان مەبەست هەرِەشەیە، واتە: ئەگەر دوایی ئەوان کوفرەکەیان ئیعلان بکەن، وە هەر لەسەر ئەوە بەردەوام بن، تاکو کوفرەکەیان ئاشکرا دەبێ، ئەوە ئیسلام سزایان دەدات، وە بە ئاشکرا لەگەڵیان ڕووبەڕوو دەبێتەوە.

٢/ یاخود ئەگەر هەر لەسەر ئەو حاڵەتەش بمێننەوە ئەوە ئازارو سزایەکی سەخت بووە بۆ ئەوان، کە هەمیشە لە سزاو ئازارێکی دەروونیی بە ئێش دابوون، ئایەتێك بێتە خوار، سوورِەتێك بێتە خوار، وە نهێنییەکانیان ئاشکرابن، وە پیلانەکانیان ئاشکرابن، وە ئابڕوویان بچێ، بکەونە سەر زاری خەڵکی، کە فلان وا خیانەتی کرد، فلان وا خراپەی کرد، ئەوە بۆ ئەوان ئازارو سزایەکی دەروونیی زۆر بە ئێش‌و سفت سۆ بووە.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: ئنجا خوای بەرزو مەزن باسی جۆرێکی دیکە لە مونافیق‌و دەغەڵەکان دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾﴾.

واتە: لەو مونافیق‌و دەغەڵانە کەسانێك هەن، کە پەیمانیان لەگەڵ خوادا بەست: ئەگەر لە بەخششی خۆی بەشمان بدات، ئێمەش خێر دەکەین‌و ماڵ دەبەخشین لە

پێناوی خوادا، وە لە چاکان دەبین، بەڵام کاتێك خوا لە بەخششی خۆی پێیدان، ڕژدییان پێکرد، وە پشتیان هەڵکردو ڕوویان وەرگێڕا، لە ئەنجامی ئەوەشدا خوا نیفاقی خستە دڵو دەروونیانەوە، تاکو ئەو ڕۆژەی پێی دەگەن، بەهۆی ئەوەوە کە بەڵێنیان لەگەڵ خوادا نەبردە سەر، وە بەهۆی ئەوەوە کە درۆیان دەکرد.

لێرەدا زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان، بەسەرهاتێك دێنن لە (ثَعْلَبة بْن حاطِب)ەوە، کە گوایە یەکێك بووە لە هاوەڵان، چۆتە لای پێغەمبەری خوا، گوتوویەتی: (يا رَسولَ اللهِ: ادْعُ اللّهَ عَزَّ وَجَلَّ أنْ يَرْزُقَنِي مَالاً) واتە: ئەی پێغەمبەر خوا ! ﷺ داوا لە خوای زاڵی پایەدار بکە، ماڵم بداتێو دەوڵەمەندم بکات، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووە: ﴿وَيْحَكَ يا ثَعْلَبة! قَلِيلٌ تُؤَدِّي شُكرهُ، خَيْرٌ مِنْ كَثِيرٍ لا تُطِيقُ شكرَهُ و حَقّهُ﴾.

واتە: هاوار بۆ تۆ ئەی سەعلەبە! کەمێك کە دەتوانی سوپاسی خوای لەسەر بکەی، باشترە لە زۆرێك کە نەتوانی سوپاسی خوای لەسەر بکەیو، هەقەکەی بدەی.

دیارە ئەویش چەند جارێك دووبارەی کردۆتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کردوە، دوایی زۆر دەوڵەمەند بووە، هەتا وای لێهاتوە کە نوێژی بە کۆمەڵی چواندوە دوایی نوێژی جومعەشی کەمتر کردوون، ئنجا ماڵی چۆتە دەرەوەی مەدینە، لەبەرئەوەی ماڵو سامانەکەی زۆر بووە، مەڕو حوشترو ڕەشە وڵاخو ... هتدی زۆر بووە.

پاشان کە چوون زەکاتی لێوەربگرن، گوتوویەتی: زەکاتی چی !، کەی ئەوە زەکاتە؟ ئەوە بریتیە لە غەرامەکردنو تالان کردن ! بەڵام دوایی زەکاتەکەی بردوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش زەکاتی لێ وەرنەگرتوە، دوایی لە سەردەمی ئەبو بەکرو عومەریش دا بردوویەتی، هەر لێیان وەرنەگرتوە... هتد.

بەڵام ئەو بەسەرهاتە، چ لە ڕووی نێوەڕۆکەکەیەوە، وە چ لە ڕووی سەنەدەکەیەوە، تەواو نیە.

لە ڕووی نێوەڕۆکییەوە، کەسێك کە دوای مسوڵمانبوون، کافر بوو، بەڵام پەشێمان بۆوەو تۆبەی کرد، ئەوە بێگومان خوا تۆبەکەی لێ قبووڵ دەکات، ئەگەر لە کوفرو نیفاقیش بگەڕێتەوە، تۆبەی لێ قبووڵ دەکات، چ جای لە زەکات نەدان !.

وە لە ڕووی سەنەدیشیەوە، هەردوو نووسەری کتێبی (الإستيعاب فِي بيان الأسباب) لە بەرگی (٢) لاپەڕە (١٩٧ تاکو ١٩٩) کە بەسەرهاتەکەیان بە درێژیی هێناوە، گوتوویانە: (باطلٌ، قَبَّح الله واضِعَهُ) ئەمە قسەیەکی پووچو بێ بنەمایە، خوا ئەو کەسە ناشیرین بکات کە هەڵیبەستوەو دایناوە.

کە دەفەرموێ: ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، وشەی ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ﴾، یانی: (لَنَتَصَدَّقَنَ)، بە تەئکید ئێمە خێرو چاکە دەکەین،ماڵەکەمان دەبەخشین، وە هەر ئەوەندە نا، بەڵکو خۆشمان لە چاکان دەبین، یانی: ئەو ماڵو سامانە زۆرە، ئێمە لە خشتە ناباتو نامانباتە ڕیزی خراپانەوەو چرووكو ڕژدانەوە.

بەڵام دوایی بەڵێنەکەیان ڕاست دەرناچێ.

خوای بێوێنە لەوبارەوە کە بەڵێنەکەیان نابەنە سەر، دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ﴾، ئنجا کاتێك (خوا) لە بەخششی خۆی پێیدان، ڕژدییان تێدا کرد.

وشەی (بَخِلُوا۟ بِهِۦ) واتە: ئەو ماڵو سامانەی کە خوا پێیدان، چرووکییان تێدا کرد، دەستیان تێدا نووساند، وە نەیانبەخشی، ئەدی خوا چی لێکردن؟ ﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ﴾، (خوا) لە سزای ئەوەدا، نیفاقو دەغەڵیی خستە دەروونیانەوە.

(فَأَعْقَبَهُمْ) {أي جَعَلَ الله فِي قُلُوبِهِم نِفَاقاً، عَقِبَ ذلِكَ (أي إِثْرَهُ)} خوا لە ئەنجامو دەرەنجامی ئەوەدا، نیفاقی خستە دڵو دەروونیانەوە.

ئنجا ئایا بۆچی (أَعْقَبَ) دوو (مَفْعُول)ی ویستوون؟

﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا﴾، دەڵێ: {لَما ضُمِّنَ (أَعْقَبَ) مَعْنَى (أَعْطَى) نَصَبَ فعلَين}، لەبەرئەوەی وشەی (أَعْقَب)، مانای وشەی (أَعْطَى)ی خراوەتە نێو، بۆیە

دوو (مَفعُول)ی (منصوب) كردوون، ئەگەرنا لە ئەسڵدا (أعقَبَ) یەك (مَفعُول)ی دەوێ، واتە: خستیە شوێنی، خستیە جێگای.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا ﴾، لێرەدا مادام (نِفَاقًا) بە (نكرة) هاتوە، ئەوە (نِفَاق)ێكی تازەیە، چونكە ئەوان لە ئەسڵدا مونافیق بوون، پاشان نیفاقێكی دیكەش چووە دڵیانەوە، لەبەرئەوەی بەڵێنیان شكاندو، پەیمانیان لەگەڵ خوادا نەبردە سەر.

کە دەفەرموێ: ﴿إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ ﴾، تاكو ئەو ڕۆژەی پێی دەگەن، بە كێ دەگەن؟ بە خوای پەروەردگار دەگەن، دەڵێ (اللِّقَاء: مُصَادَفَة شيءٍ شَيْئاً ، فِي مَكَانٍ وَاحِدٍ)، (لقاء) بریتیە لەوەی كە شتێك بگاتە شتێكی دی، لە یەك شوێن دا، كە لێرەدا مەبەست پێی دیداری خوایە.

یەكێك بۆی هەیە بڵێ: بە دڵنیایی ئەو نیفاقە بە مردنیان كۆتایی پێهاتوە ! ئێمە دەڵێین: نەخێر، چونكە كوفرو نیفاق پەیوەندیی بە ڕووحو جوهەری ئینسانەوە هەیە، ئەو ڕووحەش تاكو ئەو كاتەی مرۆڤ مرۆڤە، ئەو سیفەتو خەسڵەتانە كە كەسبیان دەكات، تەبع دەبن لەسەر دڵو دەروونی، ئنجا ئەگەر ئیمانو خواپەرستییە، ئەگەر كوفرو نیفاقو شیركە، دوایی خوای كاربەجێ هۆكارەكەی ڕوون دەكاتەوە، دەفەرموێ: ﴿بِمَآ أَخْلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ﴾، (بۆیە وایان لێهات) بەهۆی ئەو بەڵێنەوە، کە لەگەڵ خوادا نەیانبردە سەر، وە بەهۆی ئەوەوە كە درۆیان كرد.

لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (أَخْلَفَ الوَعْدَ، أَي لَمْ يَفِ بِهِ) واتە: بەڵێنەكەی نەبردە سەر، هەروەها (الخُلْفُ: نَقْضُ العَهْدِ وَمُخَالَفَتهُ).

(خُلَف) بریتیە لەوەی كە كەسێك بەڵێنێك بدات، دوایی بەڵێنەكەی نەباتە سەر.

ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە گوناهو تاوانەكان، كردەوە خراپەكان دەبنە هۆی پەیداكردنی نیفاقو كوفر، واتە: ئەگەر ئینسان لەسەر گوناهان بەردەوام بوو، ئەو گوناهانە دەیگەیەنن بە كوفرو نیفاق.

بۆیە زانایان گوتوویانە: بەردەوام بوون لەسەر گوناهی گچکە، سەردەکێشێ بۆ گوناهی گەورە، وە بەردەوام بوون لەسەر گوناهی گەورە، سەردەکێشێ بۆ کوفر. ئەوەش شتێکی ئەزموونکراوە کە وایە، هەروەك چۆن ئەگەر ئینسان لەسەر چاکەی کەمیش بەردەوام بێ، دەیگەیەنێ بە چاکەی گەورەتر، وە ئەگەر لەسەر چاکەی گەورەتریش بەردەوام بێ، دەیگەیەنێ بە پلەی ئیمانی باشتر.

<u>مەسەلەی چوارەم</u>، کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ﴾.

ئایا نەیاندەزانی، {واتە: دەبوو زانیبایان، ئەمە پرسیارلێکردنی نکوولیی لێکەرانەیە، دەبوو زانیبایان} کە خوا نهێنییەکەیان دەزانێ، وە قسەی چپە چپیشیان دەزانێ، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴾، وە بێگومان خوا زۆر زانایە بە هەموو نهێنیی و پەنهانەکان.

وشەی (سِرّ) دەڵێ: (السِّرُّ: مَا يُخْفِيهِ الـمَرْءُ مِنْ كَلَامٍ وَمَا يُضْمِرُهُ فِي نَفْسِهِ. فَلاَ يَطَّلِعُ عَلَيْهِ النَّاس).

(سِرّ) بریتییە لەو نیازو مەبەستەی، یان لەو قسەیەی کە مرۆڤ لە دڵی خۆیدا پەنهانی دەکات، و خەڵك لێی ئاگادار نابن.

وشەی (نجوی)، (النَّجوَى: المحادثة بِخُفْيَة) بریتییە لە قسەکردنێکی بە پەنهانیی، لە کوردیی دا دەڵێن: (فسکە فسك، چپە چپ، قسەی نهێنیی، قسەی پەنهان)، وشەی (عَلَّٰمُ) صیغەی موبالەغەیە، واتە: زۆر زانا، وە (ٱلْغُيُوبِ ) کۆی (غیب)ە، واتە: نادیارەکان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٨٦٧٠)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٣٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٥٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٦٣١)، وَالنَّسَائِيُّ، برقم: (٥٠٢١)}.

واتە: نیشانەی ئینسانی مونافیق سێ شتن: ئەگەر قسەی کرد، درۆ بکات، وە ئەگەر بەڵێنی دا، بیشکێنێ، وە کاتێك سپاردەیەکی پێ سپێردرا، ناپاکیی لێ بکاتو زایەی بکات.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوای پەنهانزان باسی جۆرێکی دیکە دەکات لە مونافیقو دەغەڵەکان، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾.

ئەوانەی ڕەخنە دەگرن لەو بڕوادارانەی خۆبەخشانەماڵو سامانەکانیان خەرج دەکەن، ئەو دەغەڵو مونافیقانە ڕەخنەیان لێ دەگرن، واتە: ئەوانەی کە بە ئەندازەی زۆر دەبەخشن بە خۆبەخشانە، ڕەخنەیان لێ دەگرن، دەڵێن: ئەوە بە ڕیابازیی ئەو ماڵە خەرج دەکەن، یان ئەوانە بێ عەقڵن، نەدەبوو ماڵی خۆیان ئاوا بە هەدەر بدەن !

هەروەها ڕەخنەش لەوانە دەگرن، کە جگە لەوەی بە زەحمەت، یان بە گرانیی دەتوانن بیبەخشن، هیچی دیکە شك نابەن، (جُهْد) شتێکە کە ئینسان بە زەحمەت بۆی بکرێ، قورسایی بکەوێتە سەر شان، تاکو بۆە دەکرێ، دیارە ئینسانی نەداریش ئەگەر کەمیش ببەخشێ، قورسایی دەکەوێتە سەر شان.

یانی: ئەو دەغەڵانە ڕەخنە لەوانە دەگرن کە زۆر دەبەخشن، وە ڕەخنە لەوانەش دەگرن کە کەم دەبەخشن !

کەواتە: کەس لە زمانی ئەو دەغەڵو مونافیقانە سەلامەت نابێ.

﴿ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ ﴾، وە گاڵتە بە جۆری دووەم دەکەن، لەوانەی کە کەمێك دەبەخشن، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد، کە کابرایەك ڕبەیەك خۆراکی هێنا (ئنجا خورما بوو، دەغڵ بوو؛ گەنم، یان جۆ) گوتیان: ﴿إِنَّ اللّٰهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَاعِ هَـذَا﴾، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (١٤١٥)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٧٢)}.

واتە: بێگومان خوا لەو ڕبەیە بێ نیازە، یانی، ئەوەندە هیچ نیە، گاڵتەیان پێکردن !

خواش دەفەرموێ: ﴿ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، خوا گاڵتەیان پێبکات، یان خوا گاڵتەی پێکردن، وە ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە.

گاڵتەی پێکردن واتە: بە جۆرێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، وەك کەسێك کە گاڵتە بە کەسێك دەکات، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کە سزای گاڵتە پێکردنەکەیان بداتەوە، هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە.

وشەی (يَلۡمِزُونَ) یانی: (یعیبون) ڕەخنە دەگرن، (ٱلۡمُطَّوِّعِينَ) لە ئەسڵدا (المُتَطوعِيْنَ)ە، یانی (المُتَبَرِّعِين) ئەوانەی ماڵی خۆیان خۆبەخشانە دەبەخشن، بێ ئەوەی کە لەسەریان پێویست بێ.

لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە، کە زیاتر تیشکمان بۆ دەخاتە سەر چەمکی ئەو ئایەتە موبارەکەو، هەڵوێستی دەغەڵ و موناfیقەکان، لەگەڵ ئیمانداری بەخشەرەکان دا، چ ئەوانەی زۆریان بەخشیوە چ ئەوانەی کەمیان هەبووەو، کەمیان بەخشیوە.

﴿عَنْ أَبِي السَّلِيلِ، قَالَ: وَقَفَ عَلَيْنَا رَجُلٌ فِي مَجْلِسِنَا بِالْبَقِيعِ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَوْ عَمِّي، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالْبَقِيعِ، وَهُوَ يَقُولُ: مَنْ يَتَصَدَّقُ بِصَدَقَةٍ، أَشْهَدُ لَهُ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَجَاءَ رَجُلٌ، لَمْ أَرَ رَجُلاً أَشَدَّ سَوَادًا وَلَا أَصْغَرَ مِنْهُ، وَلَا آدَمَ، بِنَاقَةٍ، لَمْ أَرَ أَحْسَنَ مِنْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! دُونَكَ هَذِهِ النَّاقَةَ. قَالَ: فَلَمَزَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: هَذَا يَتَصَدَّقُ بِهَذِهِ، فَوَاللَّهِ لَهِيَ خَيْرٌ مِنْهُ، قَالَ: فَسَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: كَذَبْتَ، بَلْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ وَمِنْهَا، ثَلَاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ قَالَ: (وَيْلٌ لِأَصْحَابِكَ) إِلَّا مَنْ قَالَ بِالْمَالِ هَكَذَا وَهَكَذَا، وَجَمَعَ بَيْنَ كَفَّيْهِ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ﴾، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٠٣٧٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ ضَعِيف لِجَهَالَة الرَّاوِي عَنْهُ أَبُو السليل}.

واتە: ئەبی سەلیل لە پیاوێکەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە بابی، یان لە مامیەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، دەیفەرموو: کێ چاکەیەك، بەخشینێك

دەکات کە ڕۆژی قیامەت شایەدیی بۆ بدەم؟ دەڵێ: پیاوێك هات لەو ڕەش پێستتـرم نەبینی بوو، وە لەو قەبارە بچووکتـرم نەبینی بوو، وە لەویش ئەسمەرترم نەبینـی بوو، حوشترە مێیەکی هێنا، کە لەو حوشترە جوانتـرم نەبینـی بوو، وە گـوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەم حوشترە مێینە بگرە، {ئەوە لە پێناوی خـوادا بەخشیم، تۆش بەکاری بێنە بۆ بەرژەوەندیی ئیسلام و مسوڵمانان}. دەڵێ: پیاوێك (کە لە مونافیقەکان بوو)، ڕەخنەی لێگرت، گوتی: ئەم پیاوە ئەم حوشترە چاکە دەبەخشێ! سوێند بە خوا ئەو حوشترە لە خۆی باشترە، پێغەمبەری خواش گوێی لێبوو، فەرمووی: درۆ دەکەی، بەڵکو ئەو پیاوە لە تۆو لە حوشترەکەش باشترە، سێ جاران ئەم قسەیەی دووبارە، دوایی فەرمووی: سزای سەخت بۆ هاوەڵەکانت، مەگەر کەسێك کە ماڵ و سامانەکەی ئاوا ئاوا ببەخشێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی کۆکردنەوە، بە لای ڕاستو بە لای چەپدا، {یانـی: ئەگەرنا هەر کەسێك ماڵ و سامانی هەبێ و لە ڕێی خوادا نەیبەخشێ، ئەوە سزای سەخت بۆ وی}.

هەروەها لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەش گێڕدراوەتەوە:

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ﴿وَكَانَ الْمُطوعُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَعَاصِمَ بْنَ عَدِيٍّ أَخَا بَنِي العَجْلانِ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَغَّبَ فِي الصَّدَقَةِ وَحَضَّ عَلَيْهَا، فَقَامَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فَتَصَدَّقَ بِأَرْبَعَةِ آلافِ دِرْهَمٍ، وَقَامَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ، فَتَصَدَّقَ بِمِائَةِ وَسْقٍ مِنْ تَمْرٍ، فَلَمَزُوهُمَا وَقَالُوا: مَا هَذَا إِلاَّ رِيَاءٌ، وَكَانَ الَّذِي تَصَدَّقَ بِجُهْدِهِ، أَبُو عُقَيْلٍ أَخُو بَنِي أُنَيْفٍ، أَتَى بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، فَأَفْرَغَهَا فِي الصَّدَقَةِ، فَتَضَاحَكُوا بِهِ وَقَالُوا: إِنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَاعِ أَبِي عُقَيْلٍ﴾[1].

واتە: ئەوانەی کە ماڵی خۆیان زۆریان بەخشی، لە بڕواداران (عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ) بوو، لەگەڵ (عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ)[2]، کە لە هۆزی بەنی عەجلان بوو، دەڵێ: ئەویش ئەوە بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی هاندا، بۆ ماڵ خەرج کردن و ماڵ بەخشین لە پێناوی خوادا، (عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْف) هات چوار هەزار درەمی

١) سيرة ابن هشام، ج٤، ص ١٩٦.

٢) دیارە ئەم ئەو دووانەی بە نموونە هێناونەوە.

زیـوی هێنـا (کە ئەوکاتـە زۆر زۆر بووە)، وە (عَاصِـمُ بْنُ عَـدِيّ)یش هات ئـەویش سەد (١٠٠) ویسـق[1] خورمای هێنـا، ئنجا مونـافیقەکـان لێیـان بـە ڕەخنـە گـرتن. گوتیـان: ئـەوە بۆ ڕیابازییە.

وە ئـەو کەسـەش کـە زۆر فشـاری لـە خـۆی کـرد، تـاکـو کـەمێکی پـێ بەخشـرا. ئەبو عوقـەیل بوو، لـە هۆزی بەنی ئونەیف، ئـەویش ڕبـەیـەك خورمای هێنـاو، ڕۆی کـردە سـەر[2] خێـرو صەدەقـەو مـاڵ بەخشـینە کۆکرابووەوەکـە، ئـەوانیش پێـی پێکەنینو، گوتیـان: خوا بێنیـازە لەو ڕبەیـەی ئەبو عوقەیـل !

ئیدی ئەم ئـایـەتـە بەم بۆنەوە هاتـە خوار.

<u>مەسەلـــەی شەشـــەم</u>: کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٨٠﴾.

داوای لێبوردنیـان بۆ (لـە خوا) بکـەی، یـان داوای لێبوردنیـان بۆ نەکـەی، ئـەگـەر حەفتـا جاریش داوای لێبوردنیـان بۆ بکـەی، هەرگیز خـوا لێیـان نـابووری، بەهـۆی ئـەوەوە کە بە خـواو بـە پێغـەمبـەرەکـەی بێبـڕوا بـوون، وە خـوا کۆمەڵـی لاڕێیـان نـاخاتـە سـەر ڕێـی ڕاسـت.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئـەوەیـە، کە خـوا لـە مونـافیقەکـان نـابووری، هەرچەنـد پێغەمبەر ﷺ زۆریش داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکات، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە ئەگەر لە حەفتا جار زیاتر، داوای لێبوردنیان بۆ لـە خوا بکات، خـوا بیـانبووری بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە هـەرچەنـدە زۆر داوای لێبوردنیـان بۆ لـە خـوا بکات، خـو لێیـان نـابووری.

---

١) (وِسـق) و (وَسْق) هـەر وەسـقێك سێصەد (٣٠٠) ڕبـە (صاع)یە هەر ڕبەیەکیش چوار مستە.
٢) ڕۆی کردەسەری : هەڵیـرشتەسەری.

ئنجا ئەوە نەك هەر لە زمانی عەرەبییدا، بەڵكو لە زمانەكانی دیكەشدا هەیە، دەڵێ: پەنجا جار هاتووم، سەد جار وام كرد، یان دەڵێ: سەد جاریش داوا بكەی، ئەوەت بۆ ناكەم، كە مەبەستی تەنیا سەد جارەكە، یان پەنجا جارەكە نیە، بەڵكو یانی: هەرچەندە زۆر داوا بكەی، ئەوەت بۆ ناكەم، وە خاوەنی (التحرير والتنوير) ئاوای لێكداوەتەوە، واتە: خوا لێیان نابووڕێ هەرچەندە داوای لێبوردنیان بۆ بكەی، بە ئەندازەیەكی زۆر زۆر.

ئنجا لەوبارەوە ئەم ڕیوایەتەش هاتوە: كە قسە لەسەر سەنەدەكەی هەیە: ﴿أن عبد الله ابن أُبيٍّ بن سلول، قال لأصحابه: لولا أنكم تُنْفقون على محمد وأصحابه، لانفَضُّوا مَنْ حَولَه! وهو القائل: ﴿لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴿٨﴾﴾ المنافقون، فأنزل الله: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾﴾التوبة، قال النبيّ ﷺ: لأزيدنّ على السبعين! فأنْزَلَ الله: ﴿سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾﴾ المنافقون، فأبى الله تبارك وتعالى أن يغفر لهم} (رَوَاهُ ابْنُ جَرِيرٍ عَنْ عُروَةَ مُرْسَلاً، برقم: (١٧٠٣٨)، ضعيف بإرساله، أُنظر: الإستيعاب ج٢، ص٣١٠)﴾.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەییەی كوڕی سەلوول، بە خەڵكەكەی خۆی گوتوە: ئەگەر ئێوە ماڵو سامانتان خەرج نەكردبایە بۆ موحەممەدو هاوەڵانی، ئەوە لە دەوری دەپرژانو، وازیان لێ دەهێنا، {هەروەها هەر ئەویش بووە كە گوتوویەتی: كە گەڕاینەوە بۆ مەدینە، ئەوەی كە بە دەستەڵاتە، ئەوەی بێ دەستەڵاتە، دەردەكات، وەك لە سوورەتی (المنافقون) دا هاتوە}.

ئنجا خوای بەرز ئەم ئایەتەی ناردە خوار: {داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بكەی یان نەیكەی، ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ بكەی، خوا لێیان نابووڕێ}،

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لە حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردنیان بۆ دەکەم {بۆ ئەوەی خوا هەر لێیان ببووریّ} ، دەڵێ: دوایی خوا ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوار، {یەکسانە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی، یان نەیکەی، خوا هەر لێیان نابووریّ} .

بەڵام وەك گوتم: ئەمە لە ڕووی سەنەدەوە تەواو نیە، هەروەها نێومڕۆکیشی تەواو نیە، وەك دوایی باسی دەکەین، چونکە ناگونجێ پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمایشتەی خوای بەرز حاڵی نەبووبێ، کە مەبەست ئەوە نیە: ئەگەر لە حەفتا جاریش زیاتر بێ، خوا هەر لێیان نابووریّ!

بۆیە لە ڕووی نێومڕۆکیشەوە ناگونجێ ڕاست بێ، لە ڕووی سەنەدیشەوە. باسمان کرد، بەڵام بۆیە هێنام، تاکو ئاماژە بەو ئیشکالە بکەم، کە لە سەنەدو لە نێومڕۆکیشی دا هەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ (٩) ئایەت دەگرێتەوە، ئایەتەکانی (٨١ تا ٨٩)، سوڕگەی سەرەکیی ئەم نۆ ئایەتە موبارەکەش، بریتیە لە هەڵوێستی نەرێنیی مونافیق‌و دڵنەخۆشەکان، لە بواری جەنگ‌و جیهاددا‌و، ئاڕاستەکردنی خوا، بۆ پێغەمبەرو مسوڵمانان، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، کە لە پێنج هەڵوێستاندا خۆی دەنوێنێ:

١) ترساندنیان بە ئاگری دۆزەخ، کە گەرمای دۆزەخ لە کەشی هاوین لە بیاباندا گەرمترە، چونکە یەکێك لە بیانووەکانیان ئەوە بوو دەیانگوت: لە گەرمای هاوین بە بیاباندا، کە زۆر گەرمە، مەچن بۆ جەنگ.

٢) هەواڵ پێدانیان کە لە دۆزەخدا، تووشی گریانی زۆر دەبن.

٣) مۆڵەت نەدانیان بە دەرچوون بۆ جەنگ‌و جیهادو، بەشداریی کردنی جەنگ، لە داهاتوودا، مادام لە جەنگی تەبووك بەجێماون.

٤) نوێژ لەسەر نەکردنیان‌و، بەشداریی نەکردن لە بە خاك سپاردنیاندا.

٥) سەرسام نەبوون بە سەروەت‌و سامان‌و منداڵەکانیان.

پاشان خوا ﷻ باسی ئەو هەڵوێستەیان دەکات، کە هەر کات سوورەتێك دابەزێ‌و، فەرمان بە ئیمان هێنان‌و، جیهادکردن لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بکات، خاوەن سامانەکانیان مۆڵەتی دانیشتن وەردەگرن‌و، ڕازی دەبن کە لەگەڵ ئافرەتانی دانیشتوو کە لە ماڵ بەجێدەمێنن لە پیاوان، دابنیشن، وە لە کۆتایی دا خوا باسی هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ‌و ئەو بڕوادارانە دەکات، کە لەگەڵیدان، وە بە سەرو ماڵیان لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن، وە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی بۆ ئامادە کردوون.

﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟
يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن
رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا
وَلَن تُقَٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ
﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ
وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ
ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ أُنزِلَتْ
سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟
ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ
قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟
بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾
أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ
﴿٨٩﴾ ﴾

## مانای وشـه بە وشەی ئایەتەکـان

{بەجێهێڵراوەکان (لە جەنگی تەبووك) بە دانیشتنیان (لەماڵەکانیاندا) دوای پێغەمبەری خواو سەرپێچیی لێکردنی شادمان بوون، وە حەزیان نەکرد کە بە سامان و گیانیان لە ڕێی خوادا تێبکۆشن (بجەنگن) وە گوتیان: لە گەرمادا مەچنە جەنگ، بڵێ: ئەگەر تێگەیشتبان (دەیانزانی کە) ئاگری دۆزەخ گەرمایەکەی بەهێزترە (لەگەرمای هاوین) ﴿٨١﴾ دەجا لە سزای ئەوەدا کە کردیان، با (لەم ژیانی دنیایەدا) کەم پێبکەنن، (وە لە دۆزەخدا) زۆر بگریەن ﴿٨٢﴾ وە هەر کات خوا گێڕایتیەوە بۆ لای کۆمەڵێکیان، وە داوای مۆڵەتیان لێکردی بۆ دەرچوون (بۆ جەنگ)، پێیان بڵێ: هەرگیز نابێ لەگەڵم بێنەدەرێ و، نابێ لەگەڵمدا جەنگی هیچ دوژمنێکیش بکەن، چونکە ئێوە یەکەمجار دانیشتنتان پەسند کرد، دەجا (ئێستاش) هەر لەگەڵ بەجێماواندا دابنیشن ﴿٨٣﴾ وە (ئەی موحەممەد !) هەر کامێکیان مرد، هەرگیز نوێژی لەسەر نەکەی، وە لەسەر گۆڕەکەیشی (بۆ بە خاك سپاردنی) نەوەستی، چونکە ئەوانە بە خواو پێغەمبەرەکەی بێبڕوا بوون، وە لاڕێبووانە مردن ﴿٨٤﴾ وە با سامان و منداڵەکانیان سەرسامت نەکات، خوا بەس دەیەوێ بەهۆیانەوە، لە دنیادا ئازاریان بدات، وە بێبڕوایانەش گیانیان دەربچێ ﴿٨٥﴾ وە هەر کات سوورەتێك دابەزێنرا کە: بڕوا بە خوا بێنن و، لەگەڵ پێغەمبەرەکەی دا بچنە تێکۆشانێ، خاوەن توانایەکانیان مۆڵەتیان لێوەرگرتی (کە نەیەن) وە گوتیان: لێمانگەڕێ با لەگەڵ دانیشتووان بین ﴿٨٦﴾ ڕازیبوون کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماوبن، وە مۆریان بەسەر دڵەوە نرا، بۆیە تێناگەن ﴿٨٧﴾ بەڵام پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێناوە، بە سامان و گیانیان تێدەکۆشن، وە ئەوانە هەرچی چاکەیە (لە دواڕۆژدا هەیانە) وە هەر ئەوانە سەرفرازن ﴿٨٨﴾ خوا چەند باغێکی بۆ داناون، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، تێیاندا هەمیشەیی دەبن، ئا ئەوە بردنەوەی مەزنە ﴿٨٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( فَرِحَ ): (الفَرَحُ: إنْشِرَاحُ الصَّدْرِ بلَذَّةٍ عَاجِلَة، وَأَكْثَرُ مَا يَكُونُ ذَلِكَ فِي اللَّذاتِ البَدَنِيَة).

(فَرَح) بریتیە لە سینە گوشاد بوون، بە خۆشیی‌و لەززەتێکی بە پەلەو زوو تێپەڕ، بە زۆرییش بۆ ئەو چێژ وەرگرتنە دنیاییانە بەکاردێ، کە مرۆڤ لە دنیادا لێیان بەهرەمەند دەبێ.

(ٱلۡمُخَلَّفُونَ ): واتە: بەجێهێڵراوەکان، (خَلَّفَهُ: أَخَّرَهُ وَجَعَلَهُ خَلْفَهُ أَوْ خَلِيفَتَهُ).

(خَلَّفَهُ) واتە: دوایخست، یاخود لە پشت خۆیەوە داینا، یاخود کردی بە جێنشینی خۆی.

(بِمَقۡعَدِهِمۡ ): (المَقْعَدُ: الجُلُوسُ، وَمَا يُجْلَسُ عَلَيْهِ)، واتە: بە دانیشتنیان.

وشەی (مَقْعَد) بەوەش دەگوترێ، کە دانیشتنی لەسەر دەکرێ.

(خِلَٰفَ ): بە مانای (خَلْف)ە، واتە: لە پاش، یاخود بە مانای (مُخَالِفِين)ە، (أي مُخَالِفِين رَسُولَ الله) واتە: سەرپێچیی کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ، یاخود لە پاش پێغەمبەری خوا، بەجێمان.

(لَا تَنفِرُواْ ): (نَفَرَ إلَى العَدوِّ: خَرَجَ لِقِتَالِهِ).

(نَفَر) واتە: دەرچوو بەرەو دوژمن، بۆ ئەوەی جەنگی لە دژ بکات.

(ٱلۡخَٰلِفِينَ ): كۆی (خَالِف)ە، (وَهُوَ المُتَأَخِّرُ لِنُقْصَانٍ أَوْ قُصُورٍ كَالْمُتَخَلِّف).

(خَالِفْ) بە کەسێك دەگوترێ، کە بەهۆی ناتەواویی‌و کەمتەرخەمییەکەوە، بەجێمابێ، یاخود بە ڕەهایی بە هەرکەسێك دەگوترێ، کە بەجێمابێ.

(أُوْلُواْ ٱلطَّوْلِ ): (أولوا: اي أصحاب، الطولُ: الفَضْلُ وَالغِنَى وَاليُسْر).

(طَوْل) بە بەخشش‌و دەوڵەمەندیی‌و ئاسانیی‌و دەستڕۆیشتوویی، دەگوترێ.

(ذَرْنَا): (دَعْنا، أُتْرُكنا) واتە: لێمانگەڕێ، وازمان لێبێنە.

(ٱلْخَوَالِفِ ): (الخَالَفة: عَمُودُ الخَيْمَةِ المتأخّر، وَيُكَنَّى بها عَنِ المَرْأةِ لِتَخَلُّفِها عن المُرْتَحِلِين، جَمْعُها خوالِف).

(خالفة) لە ئەسڵدا بە دینگەو کۆڵەگەی چادر دەگوترێ، کە لە دیوی پشتەوەیەتی، وە بە کینایە بەکاردەهێنرێ بۆ ئافرەت، چونکە پیاوان کە دەڕۆن، ئافرەتان بەجێ دەمێنن لە ماڵ، وە کۆیەکەی (خوالِف)ە واتە: بەجێهێڵراوەکان.

(وَطُبِعَ ): (طَبعَ عَلَى الكِتابِ: خَتِمَ)، واتە: مۆر کرا، (الطَّبْعُ أَعَمُّ مِنَ الخَتْمِ وَأَخَصُّ مِنَ النَّقْشِ).

وشەی (طبع) گشتییترە لە (ختم) وە تایبەتتریشە لە (نقش)، نەقش‌و نیگار.

(يَفْقَهُونَ ): (الفِقْهُ: هُوَ التَّوَصلُ إِلى عِلْمِ غَائِبٍ بعِلْمٍ شاهِدٍ، فَهُوَ أَخَصّ مِنَ العِلْمِ).

(فقه) بریتیە لە گەیشتن بە زانیارییەکی نادیار بەهۆی زانیارییەکی دیارەوە، واتە: تایبەتترە لە زانیاریی.

(ٱلْخَيْرَاتُ): (الخَيْرُ: ضِدُّ الشرِّ، والخَيْر: مَا يرغبُ فِيهِ الكلّ).

(خَیْر) پێچەوانەی (شرّ)ە، (خَیْر) واتە: چاکە، (شرّ) واتە: خراپە، (خَیْر) شتێکە هەموو کەسێك بۆی ئارەزوومەندە، (خَیرات) کۆی (خَیرة)یە، واتە: لە هەموو شتێکدا چاکەکەی (الفَاضِلة فِي كُلّ شَيء) وەك دوایی باسی دەکەین.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ ﴾.

لەوبارەوە ئەمە گێڕراوەتەوە:

﴿عَنْ جَابِر بْنِ عَبْد اللهِ، قَالَ: اسْتَدَارَ بِرَسول اللهِ ﷺ رِجَالٌ مِنَ المُنَافِقِينَ حِين أذِنَ لِلْجَدّ بْنِ قَيْسٍ، لِيَستَأذِنُوهُ، وَيَقُولُون: يَا رَسولَ اللهِ! ائْذِنْ لَنا فَإنَّا لا نَسْتَطِيعُ أنْ نَنْفِر فِي الحرّ، فَأذِنَ لَهُمْ وَأعْرَضَ عَنْهُمْ، فَأنْزَلَ الله: ﴿ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ ﴾﴾، {الدر المنثور، ج٤، ص٢٥٦، الإستيعاب، ج ٢، ص ٣١٢}.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوانێك دەوری پێغەمبەری خوایان ﷺدا، لە موونافیقەکان، کاتێك کە مۆڵەتی جەددی کوڕی قەیسی دا، ئەوانیش دەوریاندا بۆ ئەوەی مۆڵەتی لێ وەربگرن، وە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ مۆڵەتمان بدە، ئێمە بەم گەرمایە ناتوانین بێین بۆ جەنگ، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕان‌و مۆڵەتی دان، ئیدی لەوبارەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

لەوبارەوەش ئەم گێڕراوەیە هاتوە:

﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ لَمَا مَاتَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، دُعِيَ لَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَلَما قَامَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَثَبْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يا رَسولَ اللهِ! أَتُصَلِّي عَلَى ابْنِ أُبَيٍّ، وَقَدْ قَالَ: يَومَ كَذَا كَذَا وَكَذَا، قَالَ: أُعَدِّدُ عَلَيْهِ، قَوْلَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسولُ اللهِ ﷺ، وَقَالَ أَخِّرْ عَنِّي، يا عُمَرُ! فَلَما أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ، قَالَ: إِنِّي خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي إِنْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ، يُغْفَرْ لَهُ لَزِدْتُ عَلَيْها، قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَمْكُثْ إِلاَّ يَسِيراً، حَتَّى نَزَلَتْ الآيَتانِ مِنْ بَراءَةَ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ قَالَ: فَعَجِبْتُ بَعْدُ مِنْ جُرْأَتِي عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ يَومَئِذٍ، وَاللهُ وَرَسولُهُ أَعْلَمُ﴾، {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٣٦٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٧٤)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە عومەری کوڕی خەتتاب دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێک کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کرا، بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ هەڵساو ڕاوەستا نوێژی لەسەر بکات، منیش بە کتوپڕی هەڵسام، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ چۆن نوێژ لەسەر کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول دەکەی، کە لە فلان ڕۆژدا، ئاواو ئاواو ئاوای گوتوە؟ قسەو هەڵوێستەکانیم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کردن، پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەی هاتێو فەرمووی: لاچۆ عومەر، کاتێک من هەر دووبارەم کردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا منی سەرپشك کردومو، منیش ئەوەم هەڵبژاردوە، کە نوێژی لەسەر بکەم، وە ئەگەر زانیبام کە ئەگەر لە حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردن بکەمو لێی دەبوردرێ، حەفتا جار زیاتریش داوای لێبوردنم بۆ دەکرد، دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کردو ڕۆیشت، ئنجا کەمێك نەبێ پێی نەچوو، ئەم دوو ئایەتەی سوورەتی (البَرَاءَة) هاتنە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴾ هەتا دەگاتە ﴿وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾، دەڵێ: دواییش من پێم سەیر بوو، کە ئەوەندە بوێر بووم لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەدا، کە خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن. {یانی: جۆرێك لە ڕەخنەی لە خۆی هەبووە}.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

دیـارە ئەم نۆ ئـایەتە باسی هـەڵوێستی مونـافیق‌و دڵنەخۆشـەکان دەکەن، کە چـۆن خۆیان لە جەنگ‌و جیهاد کردن دەبوێرن، بە بڕو بیانووی جۆراو جۆر، وە خۆیان وەپاش دەدەن، وە ئامـادە دەبـن کـە لەگـەڵ ژن‌و منـداڵ لـە ماڵەکانیـاندا دابنیشـن، وە لـەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ‌و پیاوانی جەنگاوەرو تێکۆشەردا، نەچن بۆ جەنگ، سـەرەتا خـوای پـەروەردگــار دەفـەرموێ: ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﴾. بەجێهێـڵراوەکان دڵخۆش بـوون بـەوەی کـە لـە پاش پێغەمبـەری خـوا ﷺ، یـاخود بـە سـەرپێچیی کردنیان لـە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ، دڵخـۆش بـوون، ﴿وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، وە حـەزیان نـەکرد کە بـە سامان‌و گیانیـان لـە ڕێـی خـوادا تێبکۆشـن، پێیـان نـاخۆش بـوو، نـەك هـەر بۆخۆیـان حـەزیان پێنـەکرد، بەڵـكو خەڵـكیشیان سـارد دەکـردەوە، ﴿وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلْحَرِّ ﴾، وە گوتیـان: بـەو گەرمایـە مەچن بۆ جـەنگ‌و جیهاد!

خوای بێنیازیش دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ ﴾. پێیـان بفـەرموو: ئـاگری دۆزەخ گەرمییەکـەی زۆر سەختتـرو تونـدترە، ئەگـەر بفـامن، ئەگەر بزانن‌و تێبگەن، دیارە ئەگـەر زانیـبایان لـە قیامەتێ چ باسـە، سزاکـەی چـەند بە تینە، نەیاندەگوت: بەو گەرمای هاوینە، مەچن بۆ جەنگ، هەر کەسێك ئاوا دەغـەڵ‌و موخەننەت بێ، نەك هەر بۆخۆی فەرمانبـەریی خـوا نەکـات، بەڵـكو خەڵكیـش سـارد بکاتەوە، بەتایبەتی لە کاتێکی ئاوا ناسك‌و دژواردا، کە دەوڵـەتی ڕۆم هەڕەشەی کردوە لە دەوڵەتی ئیسلام‌و مسوڵمانان، وە پێغـەمبـەر ﷺ زۆر بە جەخت لێکـردنەوە هـاوەڵانی بەڕێزی دەنگ داوە، کـە نیزیکەی سی هەزار (٣٠٠٠٠) کەس لە خزمەتی دا بوون، کەچی ئەوان نـەك بۆخـۆیان نـەچوون، خەڵکیشیـان سـارد دەکـردەوە.

ئنجا بۆ ئەوانە ئاگری دۆزەخ بە تەئکید زۆر گەرمترو، بە تینترە، وە ئەگەر ئەوەیان زانیباو تێگەیشتبان، ئەوە هەڵوێستیان نەدەبوو.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا ﴾، با کەم پێبکەنن و زۆر بگریەن، واتە: با کەمێك پێبکەنن لە ژیانی دنیایاندا، بەڵام بێگومان دوایی دەبێ زۆر بگرین لە دوارۆژدا، لە ئاگری دۆزەخدا، ﴿ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، لە سزای ئەوەدا کە دەیکەن، {لەو قسانە، لەو هەڵوێستانە، لەو خۆبواردن و خۆ بەجێهێشتنە} لە سزای ئەوەدا تووشی گریانی زۆر دێن، کەواتە: ئێستا با کەمێك پێبکەنن لە ژیانی دنیادا، ﴿ فَإِن رَّجَعَكَ اللَّهُ إِلَىٰ طَائِفَةٍ مِّنْهُمْ ﴾ هەر کاتێك خوا تۆی گێڕایەوە بۆ لای کۆمەڵێك لەوان.

دیارە وشەی (رَجَع) هەم بە (لازم) دێ، هەم بە (متعدِّي) دێ، کە لێرەدا بە (متعدِّي) هاتوە، واتە: کاتێك خوا تۆی گێڕایەوە بۆ لایان، ئەگەرنا وشەی (رجع) بە مانای گەڕایەوەش دێ، بەڵام لێرەدا مانای ئەوەیە: کاتێك خوا تۆی گێڕایەوە بۆ لای کۆمەڵێك لەوان، ﴿ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ ﴾، واتە: داوای مۆڵەتیان لە تۆ کرد، کە بێنە دەر، بۆ جەنگی تەبووك داوایان لێکردی، کە نەیەنە دەر، ئەمجار ئەگەر جەنگێکی دیکە هاتە پێش، کە زیاتر ئەگەری ئەوەی تێدا بێ، مسوڵمانان سەربکەون، وە دەستکەوتیان هەبێ، داوای مۆڵەتت لێ دەکەن بێن، ئنجا خوا دەفەرموێ: هەر کاتێك خوا تۆی گێڕایەوە بۆ لای کۆمەڵکیان، وە داوای مۆڵەتیان لێکردی، کە بێن بۆ جەنگ، ﴿ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا ﴾، بڵێ: هەرگیز لەگەڵ ئێمە نایەنە دەرێ بۆ جەنگ، وە هەرگیز لەگەڵ مندا، نابێ لە دژی هیچ دوژمنێك بجەنگن، بۆچی؟ ﴿ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، مادام ئێوە یەکەمجار ئامادە بوون، وە ڕازی بوون دابنیشن، لە کاتێکدا ئیسلام زۆر پێویستیی بەوە هەبوو، کە سوپای ئیسلام زۆربێ، وە خەڵکی لەگەڵدا بێ، قەڵەباڵغ بێ، کەچی لەوکاتە ناسك و دژوارەدا، دانیشتنتان هەڵبژاردو

ڕازی بوون پێی، ﴿فَٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾﴾، ئێستاش دابنیشن لەگەڵ بەجێماوان‌و دانیشتوان دا، واتە: لەگەڵ پیرو پەککەوتەو ژن‌و منداڵ دا، کە جەنگیان پێ ناکرێ.

ئنجا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ﴾، وە لەمەودوا هەرکامێکیان بمرێ، هەرگیز نوێژی لەسەر نەکەی. وە هەرگیز لەسەر گۆڕەکەی نەوەستی، واتە: بۆ بە خاك سپاردن‌و بۆ بەڕێکردنی بۆ گۆڕستان، یاخود بۆ دووعا بۆ کردنی، دوای ئەوەی بە خاك دەسپێردرێن، بۆچی؟

﴿إِنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾﴾، ئەوانە بێبڕوا بوون بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە بە لاڕێ بووانەو لادەرانەش مردن، کەواتە: شایستەی ئەوەنین پێغەمبەر ﷺ نوێژیان لەسەر بکات، نوێژ لەسەر ئینسانی بڕوادار دەکرێ.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ بۆ خاك سپاردنی ئەهلی ئیمان ئامادە بێ. بەڵام ئەوانە کە بەو شێوەیە بن ، با مسوڵمانانیش بزانن کە ئەوانە مونافیقن، وە کەسێك مونافیق بێ، شایستەی نوێژ لەسەر کران نیە، وە شایستەی ئەوەش نیە کە پێغەمبەر ﷺ سەرپەرشتیی بە خاك سپاردنی بکات.

دوایی جارێکی دیکە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَأَوۡلَٰدُهُمۡۚ﴾، وە با سامانەکانیان‌و منداڵەکانیان تۆ سەرسام نەکات، واتە: هەرچەندە سەروەت‌و سامانیان زۆربێ، وە ماڵ‌و منداڵیان قەڵەباڵغ بێ، تۆ پێی سەرسام مەبە. بە چاوی سەرسامیی‌و سەرسوڕمانەوە تەماشایان مەکە، بۆچی؟ ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾، بێگومان خوا بەس دەیەوێ بەوانە ئازاریان بدات، سزایان بدات، وە لە کاتێکیشدا کە گیان دەسپێرن، و دەمرن، بە کافریی بمرن، واتە: ئەو ماڵ‌و سامان‌و منداڵە، وەك پێشینان دەڵێن: بە غەزەبە، بە ڕەحمەت نیە، خوای دادگەریش دەیەوێ بیکات بە هۆکاری زیاتر ئەشکەنجەدرانیان لە ژیانی دۆزەخییاندا، وە بە کافرێتییش بمرن.

لە دنیادا کەسێك سەروەت‌و سامانی هەبێ، ماڵ‌و منداڵی قەڵەباڵغ بێ، دەبێ کەسابەت بکات‌و، خەم‌و خەفەتیان بۆ بخوات‌و، دەبێ سەرپەرشتییان بکات، دەبێ ئارەقە بڕێژێ.

ئنجا لە دوارۆژیشدا مادام ماڵ‌و سامانەکەی هیچ نەیەتەوە ڕێی، وە منداڵ‌و کوڕو کچەکانیشی هیچ بۆی نەبنە مایەی بەختەوەریی، مانای وایە، هەر ماندووبوون‌و زەحمەتیی‌و سەرئێشەکەی بۆ ماوەتەوە، بۆیە دەفەرموێ: لە دنیادا بەو ماڵ‌و سامانەیان، بەو ماڵ‌و منداڵەیان ئازاریان بدات‌و سزایان بدات.

خوای کاربزان باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، وە هەرکاتێك سووڕەتێك هاتە خوار، تێیدا هاتبوو، کە ئیمان بە خوا بێنن، وە لە خزمەت پێغەمبەرەکەیدا تێکۆشان‌و جەنگ‌و جیهاد بکەن، ئەوانەی کە دەستڕۆیشتوون، ئەوانەیان کە خاوەن توانای جەستەیی‌و ماددیین، داوای مۆڵەتت لێدەکەن، وە دەڵێن: لێمانگەڕێ، با لەگەڵ دانیشتووان بین، {واتە: ئەوانەی کە دادەنیشن لە ماڵی‌و نایەن بۆ جەنگ‌و جیهاد، دەمانەوێ لەگەڵ وان بین} ئاشکراشە ئەوانەی دانیشتبوون لە ماڵ، یان پیاوانی پیرەمێرد بوون، یان خەڵکی نەخۆش‌و، پەککەوتە بوون، یان خەڵکی ناتەواو بوون، یان منداڵ بوون، نەك هەر لەگەڵ ئەوان، بەڵکو ﴿ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ ﴾، ڕازی بوون کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماودا دابنیشن.

(خوالف) کۆی (خالفة)یە، واتە: ئافرەتێك کە لە ماڵدا دادەنیشێ، بۆ سەرپەرشتیی کردنی ماڵ‌و منداڵ، دوای ئەوەی مێردەکەی دەچێتە دەرێ، یاخود (خوالف) کۆی (خالفة)یە، واتە: لەگەڵ کەسانی خراپەکاردا، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین (خَلَف) بە مانای خراپ بوو (فَسَدَ)ش دێ، کەواتە: هەم (خالِفْ) و هەم (خالِفة)، وە (خالفین)و هەم (خوالف) بە مانای لەبەر خراپیی بەجێماو، یاخود تێکچوو دێ، وێڕای ئەوەی کە بە کەسی بەجێماو دەگوترێ.

دوایـیش دەفـەرموێ: ﴿ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾، وە مـۆر بەسەر دڵیانەوە نراوە، واتە: وەك چۆن كتێبێك، نامەیەك مۆری لێ دەدرێ، تـازە هیچـی دیكەی لێ نانووسرێ، دڵی ئەوانەش تازە داخراوە، بۆیـە تێـناگەن، بـە وردیـی تێـناگەن. شارەزاییان نیە، ئەگەر تێگەیشتبان و شارەزاییان هەبووایە، ئەوە هەڵوێسـتیان نەدەبوو.

ئنجا دێتە سـەر باسی هـەڵوێستێكی پێچەوانەی هـەڵوێستی دەغەڵ و دڵنەخۆشـەكان. ئـەویش هەڵوێسـتی پێغەمبـەرە ﷺ وە ئـەو هاوەڵـە بەرێزانـەی كـە لـە خزمـەتی دان. دەفەرموێ: ﴿ لَٰكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴾ بەڵام پێغەمبەری خواو ﷺ، ئەوانەی كە لەگەڵی دا، بڕوایان هێناوە، بە سامان و گیانیـان تێدەكۆشن، واتە: فیداكاریی دەكەن، ﴿ وَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ ﴾، وە ئەوانە هەرچی چاكەو خێرو خۆشیی دواڕۆژ هەیـە، بـۆ ئەوانـە، ﴿ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾، وە هـەر ئـەوانەش سـەرفـرازو بەختـەوەرن.

ئنجا باسی سەرفرازیی و بەختەوەرییەكەی دواڕۆژیان دەكات، دەفـەرموێ: ﴿ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ﴾، خـوا بـۆی ئـامادە كـردوون، چـەند باغێك كە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشـەیی تێیانـدا دەمێـننەوە، ﴿ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ ﴾، ئا ئەوە بردنەوەی مەزنە، ئا ئەوە بە مراد گەیشـتن و بـە ئاكام گەیشـتنی مەزنـە.

كەواتە: ئەوەی بڕواداربێ، دەبێ ئاوا تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بكات، پێغەمبـەری خوا ﷺ وە ئەو بڕواداره ڕاستو دڵسۆزانەی كە لە خزمەتی دا ئیمانیان هێناوە، ئـەوانە بكات بە سـەرمەشق، نەك وەك دەغەڵ و دڵنـەخۆشـەكان بكات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

مەسەلەی یەکەم، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ ﴾.

واتە: بە جێهێڵراوەکان دڵخۆش بوون بە دانیشتنیان، {یان: بە شوێنی خۆیان} لە دوای پێغەمبەر ﷺ، {یان بە سەرپێچی کردنی پێغەمبەری خوا} ﷺ، وە حەزیان نەکرد کە بە سامانو گیانیان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، وە بە خەڵکیشیان گوت: بەو گەرمایە مەچوون بۆ جەنگ، بڵێ: ئاگری دۆزەخ گەرمترە، ئەگەر تێبگەنو، شارەزابن.

لەبەردەم ئەم ئایەتە بە پێزەش دا، حەوت هەڵوەستە دەکەین:

هەڵوەستەی یەکەم : کە دەفەرموێ : ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ ﴾ واتە:

بەجێهێڵراوەکان دڵخۆش بوون، وشەی ﴿ٱلْمُخَلَّفُونَ﴾ واتە: بەجێهێڵراوەکان، بەڵام کێ بەجێی هێشتوون؟

یانی: (الَّذِينَ خَلَّفَهُم النَّبِي ﷺ) ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێی هێشتوون، یاخود (الَّذِينَ خَلَّفَهُم جُبْنُهُمْ وَبُخْلُهُم وَنِفَاقُهُم) واتە: ئەوانەی کە ترسنۆکیی‌و چرووکیی‌و دەغەڵییەکەیان بەجێی هێشتوون، واتە: ئەو سیفەتە خراپانەیان بوونە هۆکاری ئەو هەڵوێستە خراپەیان.

هەمیشە هەموو هەڵسوکەوتێك ڕیشەیەکی هەیە لە بیرو قەناعەتی ئینساندا، ئەگەر ئینسان بیرو قەناعەتی خراپی هەبوو، هەڵوێستو ڕەفتاری خراپیشی دەبێ، وە ئەگەر بیرو قەناعەتی باشی بوو، هەڵوێستو ڕەفتاری باشیشی دەبێ،

بۆیەش ئەو وشەیە ﴿ٱلْمُخَلَّفُونَ﴾ بەکارهێنراوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ئەوانە خۆیان خۆیان بەجێهێشتوە، بەڵام لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (فَرِحَ المُتَخَلِّفُونَ) واتە: ئەوانەی کە خۆیان بەجێهێشت، دڵخۆش بوون ، فەرموویەتی: (فَرِحَ المُخَلَّفُونَ) واتە: ئەوانەی کە بەجێهێڵران، کە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد. بەجێهێڵەر (مُخَلِّفْ) دوو ئەگەری هەن :

١- ئەگەر مەبەست پێی پێغەمبەری خوا ﷺو مسوڵمانان بێ، واتە: ئەوانەی کە پێغەمبەری خواو مسوڵمانانی ڕاستەقینە بەجێیان هێشتون، یانی: ئیهمالیان کردوون و، پشتگوێیان خستوون.

٢- ئەگەر مەبەست پێی سیفەتە خراپەکانی خۆشیان بێ، واتە: ئەوانەی کە سیفەتە خراپەکانیان: ترسنۆکیی و چرووکیی و نیفاق، وا لە دڵ و دەروونیاندا جێگیر بوو بوو، ئیرادەی ئازادی لێ زەوت کردبوون، بێئەوەی کە خۆیان بیانەوێ، ئەو سیفەتە خراپانە وایان لێکردن، کە بەجێبمێنن.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u> ؛ وشەی: ﴿بِمَقْعَدِهِمْ﴾، وشەی (مَقْعَد: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ، أي قعودهم) واتە: دڵخۆش بوون بە دانیشتنەکەیان، یاخود (مَقْعَد: اسْم مَكَانٍ) ناوی شوێنە، واتە دڵخۆش بوون بە شوێنی دانیشتنەکەیان، کە مەدینەیە. یان ماڵەکانی خۆیانن.

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u> ؛ کە دەفەرموێ: ﴿خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ ئەویش دوو واتای هەن:

١- (خِلَٰفَ ) واتە: (خَلْفَ رَسُولِ اللهِ) واتە: لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ. لە دوای پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دانیشتن و بەجێمان.

٢- یان بە مانای (مُخَالَفَة لِرَسُولِ اللهِ) واتە: وەك سەرپێچیی کردنیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بۆیەش ئەو وشەیە بەکارهاتوە، کە خوای قسەلەجێ

دەیتوانی بفەرموێ: (خَلْفَ رَسول الله) بەلاّم بۆیە فەرموویەتی: (خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ ) تاکو وێڕای مانای دوای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەش بگەیەنێ، کە ئەوانە سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، کە بەجێیمان.

هەڵوەستەی چوارەم : ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، مەبەستەکەی ئاوایە: (وَكَرهُوا أنْ يُقَاتِلُوا) واتە: حەزیان نەکرد کە بجەنگن، بەلاّم بۆچی خوای زاناو شارەزا ئاوا تەفصیلی داوەتیو روونی کردۆتەوە؟ ﴿ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، وەك زانایان دەڵێن: ئەوە بۆ بێزراندنو ناشیرین کردنیانە (للتَّشْنِيعِ عَلَيْهِم)، چونکە ئەگەر فەرمووبای: حەزیان نەکرد بجەنگن، ئەوە زۆر عەیبو عارو کەمو کوڕییەکەیان وەدەرنەدەکەوت، بەلاّم ئێستا کە دەفەرموێ: حەزیان نەکرد بە سامانو گیانیان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، ئنجا کەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێو حەزیش نەکات سامانەکەیو گیانەکەی لەڕێی خوادا بەخت بکات، تاکو خوا لێی ڕازی بێت، وە بەندایەتیی خۆی بۆ خوا ئیسپات بکات، ئەوە شتێکی زۆر ناشیرینو ناقۆلاّو دزێوی کردوە.

هەڵوەستەی پێنجەم ، کە دەفەرموێ ﴿ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلْحَرِّ ﴾. یانی : ئەوانە سەرباری ئەوەی کە خۆیان نەچوون، وە دڵخۆشیش بوون بە دانیشتنەکەیان، ویستیان خەڵکیش سارد بکەنەوە، ﴿ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلْحَرِّ ﴾، واتە: وە گوتیان: بەو گەرمایە مەچنە جەنگ.

وشەی (لَا تَنفِرُواْ ) دەڵێ: (نَفَرَ: أي ذَهَبَ لِلقِتَال)، (نَفَرَ) واتە: ڕۆیشت بۆ جەنگ، ئەگەرنا وشەی (نَفْر) لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە ئینسان لە شوێنێك دوور بکەوێتەوەو، بچێت بۆ شوێنێکی دی، جا بەهۆی تەماعێکەوە، بەهۆی ترسێکەوە، بەهۆی قەناعەتێکەوە، کە بۆی دروست دەبێ، لە شوێنێك کۆچ

بکاتو، بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دی، بەڵام وشەی: (نَفَر) یان (تَنْفِروا) یان (إنْفِرُوا) وەك زاراوەیەکی باوو عورفیی، بۆ جەنگ کردن لە پێناوی خواداو، دەرچوون لە پێناوی خوادا بەکاردێ.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ﴾، وە گوتیان: بە گەرمایە مەچوون بۆ جەنگ، دەرمەچن بۆ جەنگو جیهاد، ویستیان خەڵکیش سارد بکەنەوە.

وشەی (نَفیر)یش (النَّفِیرُ: الجَیْشُ الغَازِي) بریتیە لە سوپایەکی جەنگاوەر. بۆیە پەندێکی عەرەبی هەیە دەڵێ:

(لا هو فِي العِیرِ وَلاَ فِي النَّفِیر)

(عیر) واتە: کاروان، (نفیر)یش واتە: سوپا.

کاتی خۆی لە جەنگی بەدردا، هەم سوپای قورەیشییەکان هەبوو، بە سەرکردایەتیی (أبو جهل)، وە هەم کاروانێکی بازرگانیی لە شام دەگەڕایەوە بە سەرپەرشتیی: ئەبو سوفیان بۆ مەککە، ئنجا کە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی چوون ڕێ بەو کاروانە بگرن، ئەوە (عیر) بوو، (نفیر)یش ئەو سوپا هەزار کەسییە بوو، کە لە مەککەوە بە فەرماندەیی ئەبو جەهلەوە هات بۆ بەرەنگاربوونەوەی مسوڵمانان، بۆ دەربازکردنی کاروانەکەیان، ئنجا عەرەب ئەگەر بیانەوێ بڵێن: فلانکەس نە لەوێیەو نە لەوێیە، واتە: هیچ کارە نیەو، هیچی لەباراندا نیە. دەڵێن: (لا هو فِي العِیرِ وَلاَ فِي النَّفِیر) نە لە کاروانێیەو نە لە سوپایە، واتە: هیچ شتێکی لە دەست نایە، کەواتە: (نفیر) بە مانای سوپایەکی جەنگاوەر دێ. وە (نَفْر)یش واتە: ڕۆیشتن بۆ جەنگ.

<u>هەڵوەستەی شەشەم</u> : خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ﴾، واتە: پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ گەرمایەکەی توندترو، بەهێزترە ئەگەر تێگەیشتنی وردیان هەبێ.

چونكه (فقه) تایبەتترە لە (عِلْم)، (عِلْم) ئەوەیە تۆ ئەو شتە بزانی، (العِلْمُ: هُوَ إِدْرَاكُ شَيءٍ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْهِ) واتە: بریتییە لەوەی کە تۆ شتێك بزانی، وەك خۆی چۆنە، خۆی لە واقیعدا چۆنە، بیزانی، بەڵام (فقه)[1] بریتییە لەوەی کە تۆ شتێك بزانی، کە نەزانراوە، بەهۆی شتێکی زانراوەوە، کە ئەوەش زانیارییەکی تایبەتە، خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانە تێگەیشتنێکی وردو زانیارییەکی تایبەتیان هەبووایە، دەبوو زانیبایان: کە ئاگری دۆزەخ گەرمترە لە گەرمای هاوین، کە دیارە جەنگی تەبووك لە کەشی هاویندا بووە، لە ساڵی نۆیەمی کۆچیی دا.

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوە کە ئاگری دۆزەخ چەند گەرمترە، نەك هەر لە گەرمای هاوین، بەڵکو لە ئاگری دنیاش، دەفەرموێ: ﴿نَارُ بَنِي آدَمَ الَّتِي تُوقِدُونَ، جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً، قَالَ: فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا﴾، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٠٠٣٣)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم}.

واتە: ئاگری ئادەم زادەکان (وەچەی ئادەم)، کە دایدەگیرسێنن، {شتی پێ دەسووتێنن، یان شتی لەسەر ئامادە دەکەن}، بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، گوتیان: {واتە: هاوەڵەکان کە لەو کۆڕەدا دانیشتبوون} ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر بە قەدەر ئاگری دنیاش گەرم بووایە، ئاگری دۆزەخ بەس بوو، {بۆ سزادانی ئەوانەی کە سزا دەدرێن} فەرمووی: ئاگری دۆزەخ بە شەستو نۆ جار بەهێزترە لە ئاگری دنیا. واتە: حەفتا هێندەی ئاگری دنیا گەرمە، کە دەشگونجێت ئەو حەفتایە وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، مەبەست پێی زۆریی بێ، مەبەست ئەوەبێ کە زۆر زۆر گەرمە، ئەگەرنا مەرج نیە تەنیا حەفتا بێ، وە مەرج نیە بگاتە حەفتا، وەك ئێستا بە پێی زانیاریی گەردوونناسیی‌و زانیاریی فیزیا، دەرکەوتوە، کە هەندێك لە ئەستێرەکان نەك بە حەفتا جار، بەڵکو بە ملیۆنان جار، ئەو گەرمییەی کە لە نێویاندایە، زیاترە لە ئاگری دنیا.

---

١) هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: (الفقه: هو معرفة مُرادِ المتكلِّم) یانی: (الفقه) بریتییە لە زانینی مەبەستی قسەبێژ، کە من ئەم رایەم زۆر بەدڵە.

کەواتە: ئەو مونافیق و دەغەڵ و دڵ نەخۆشانەی کە بەجێمان لە جەنگی تەبووك، سێ خەسڵەتی خراپیان پێکەوە کۆکردبوونەوە:

یەکەمیان: دڵ خۆش بوون و شادمان بوون بەوەی کە لەو جەنگەدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێماون، ئەوەشە سیفەتێکی خراپیان بوو، کە لەجیاتی ئەوەی دڵ نارەحەت بن، کە بەجێماون لە جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە شەرعییە، وە بە تایبەت لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، کە زۆر جەختی کردبۆوە لەسەر ئەوەی، هەموویان خۆیان ئامادە بکەن، ئەوان دڵ خۆشبوون!.

دووەمیان: پێشیان ناخۆش بوو، کە بە ماڵ و گیان لە رێی خوادا فیداکاریی بکەن و تێبکۆشن.

سێیەمیان: وە خەڵکیشیان سارد دەکردەوەو دەشیان ترساندن، وە دەیانگوت: بەو گەرمایە مەچن بۆ جەنگ و جیهاد.

هەڵوەستەی حەوتەم : ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾، بڵێ ئاگری دۆزەخ گەرماییەکەی توندترو بەهێزترە ئەگەر تێگەیشتنی وردیان هەبووایە، یاخود: ئەگەر لە مەبەستی فەرمایشتی خوا حاڵی بوونایە، ئەمە دەرخستنی نەزانیی و نەفامیی ئەوانە، واتە ئەوانە ئەهلی فیقهـو تێگەیشتن نین، بۆیە خەڵك بەو بیانووانە سارد دەکەنەوە، کە: کەشی هاوین گەرمەو، بەو گەرمایە مەچن بۆ جەنگ! نازانن: کە کەسێك بێ فەرمانیی خوا بکات، دۆزەخ چاوەڕێی دەکات و، ئاگری دۆزەخیش زۆر گەرمترە لە گەرمای هاوین و، بەڵکو لە ئاگری دنیاش، وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە.

مەسەلەی دووەم: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾﴾.

واتە: با کەمێك پێبکەنن، وە زۆر بگریەن، لە سزای ئەوەدا کە دەیانکرد.

دەربارەی مانـای ئـەم ئایـەتـە موبارەکـە، ئـەمە گێڕراوەتـەوە: ﴿عَنْ أَبِي رَزِينٍ: قَـالَ يَـقُولُ اللهُ تَبَـارَكَ وَتَعَالَـى: الدُّنِيـا قَلِيـلٌ، فَلْيَضْحَكُوا فِيهـا مَـا شـاءُوا، فَإِذَا صَارُوا إِلَـى الآخِرَةِ، بَكَوا بُكَاءً لا يَنقَطِعُ، فَذَلِكَ الكَثِيـرُ﴾ {جامع البيـان للطبـري، بـرقم: (١٦٩٦٦)}.

وە هـەر هـەمان قسـە لـە عەبـدوڵڵای كـوڕی عـەبباسـیش خـوا لێـیـان ڕازی بـێ، گێڕراوەتەوە، {ئەویش بە شێوەیەكی دیكەو بە ژمارە: (١٦٨٧٤)(طبري) هێناویەتی}، واتە: ئەبو ڕەزیـن دەڵێ: خوای پاكو بەرز كە دەفەرموێ: با كەمێك پـێبكـەنن و زۆر بگریـەن، دەڵـێ خـوای پایـە بـەرزو بـەرز دەفـەرموێ: دنیـا كەمـە، بـا كـەمێك تێیـدا پێبكەنن، ئەوەندەی ئارەزوویانە، با پێبكەنن لە ژیانی دنیادا، ئنجا هەر كاتـێ چوون بەرەو ڕۆژی دوایی، لەوێ بەشێوەك دەگریەن، كە گریانەكەیان هەر نابڕێتەوە، ئەوەش گـریـانی زۆرە.

پێغـەمبـەری خـوا ﷺ لـە فـەرموودەیـەكـدا دەفـەرموێ: ﴿لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُـمْ قَلِيـلاً وَلَبَكَيْتُـمْ كَثِيرًا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، بـرقم: (١٢٦٨١)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦٨٦٤)، وَمُسْلِمٌ، بـرقم: (٢٣٥٩)، وَالنَّسَائِيُّ فِي الكُبْرَى، بـرقم: (١١١٥٤)، وَابْنُ مَاجَـهْ، برقم: (٤١٩١)}.

واتە: ئەگەر ئەوەی كە من دەیزانم، ئێوە زانیباتان، كەم پێدەكەنین و زۆر دەگریان.

یـانی: زۆر دەگریان لـە شـەرمی خـوا، لـە هـەیبـەتی خـوا، لـە ترسی خـوا، لـە ترسـی لێپـرسینەوەی دادگەرانەی خوای بەرزی مەزن، نەك لە ترسی ئەوەی كە خوا زوڵـمتان لـێ بكـات !.

لێرەدا (جمال الدين القـاسمي) لە تەفسیرەكەی خۆی (محاسن التـأويل)دا چەند مەسـەلەیەكی ڕەوانبـێـژیی هێنـاون بە نـاوی (لطـائف) لـە كاتـی تەفسـیركردنی ئـەم ئایەتەدا[1]:

١) (سِـرُّ إِخْـرَاجِ حالِـهِم الدنيـوي والأخـروي علـى صِـيغَةِ الأَمـر، هـو تحتُّـمُ وقـوع الـمخبَر بهِ، فَإِنَّ أَمْر الآمر الـمُطَاع، مِمًّا لا يكـاد يَتَخَلَّف عَنْهُ الـمأْمُور بهِ).

---

١) ج ٨ ، ص ٢٨١.

واتـە: نهێـنیی ئـەوە کـە خـوا ﷻ حـاڵی دنیـایی‌و حـاڵی دواڕۆژییـانی بـە شـێوەی فەرمان هێناوە، ( فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلٗا وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرٗا ) با کەم پێبکەنن، وە زۆر بگریەن. ئەمە ئەوە دەگەیەنـێ کە ئەوەی هەواڵی پێدراوە، هـەر دێتە دی، {واتـە: ئـەو کـەم پێکەنینـەی دنیـایان ئـەوە دیـارە، زۆر گـریـانەکـەشیـان لە دواڕۆژدا هـەر دێتــە دی. چونکە کـە خـوای بەرز فـەرمانێك بە شتێك دەکات، کـە دیـارە لـێرەدا مەبەسـت ئـەمری تەکوینییـە، ئەمری تـەکوینیی خـوای باڵادەستیش، هـەرگیز دوا نلکەوێ}. کەسێك کە گوێڕایـەڵیی بۆ بکـرێ، کـاتێك فـەرمان دەکـات، فەرمانەکەی، مەگـەر چۆن، ئەگەرنا، ئەوەی کە فەرمانی پێ کراوە، هەر دێتە دیو دوانـاکەوێ، {هەڵبەتە هـەر فـەرمانبـەریی بۆکراوێکی دەسـتـڕۆیشـتوو، هەر کەسێك بێ، هـەر وایـە، بـەڵام ئەگەر خوا ﷻ بێ، ئەوە بەتەئکید هەر دواناکەوێ‌و، هەر شتێ خوا ﷻ بیفەرموێ. وەك فـەرمانی تەکوینیی خۆی، جـێبەجێ دەبـێ}.

٢) کــە دەفــەرموێ ؛ (جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ) (الجَمْعُ بَـيْنَ صِـيْغَتَي الـمَاضِي والـمُسْـتَقْبَل فِـي قولـه: (جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ) دِلاَلــة عَلَــى الإِسْــتمرَار التَجَدّدي مَا دَامـوا فِي الدُنـيـا).

با کەم پێبکەنن، وە زۆر بگریەن، واتە: لە دواڕۆژدا زۆر بگریەن لە سزای ئـەوەدا. کە وەدەستیـان دەهێـنا، کە هـەم صیغەی ماضی بەکارهێنـاوە (بِمَا كَانُواْ) وە هـەم صیغـەی مضارعیشی بەکارهێنـاوە (يَكۡسِبُونَ ) تاکـو ئـەوە بگـەیـەنـێ کـە ئـەو حاڵـەتەیان لە دنیـادا بەردەوام دەبێ، وە تازە دەبێتەوە، تـاکو لـە ژیـانی دنیـادا بـن. {واتە: تاکو لـە ژیانی دنیـادا بـن، ئـەوەی کـە ئەنجامـی دەدەن لـە کـردەوەی خـراپ. دەبێتە هۆی گریانی زۆری ڕۆژی دواییان لە دۆزەخدا، مادام لێی پەشێمان نەبنەوەو دەست لە خراپەکەیـان هەڵنەگرن‌و نەگەڕێنەوە بۆ لای خـوا}.

٣) کــە دەفــەرموێ: (جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ) دەڵــێ: {(جَـزَاء) مَفْعُـولٌ لَـهُ الثـانِي، أَي: لِيَبْكُـوا جَـزَاءاً، أَو مَصْـدَر حُذِفَ نـاصِبُهُ، أَي يُـجْزَونَ بِمَـا ذكـر مِن البكـاء الـكَـثِير، جَزَاءاً}.

وشەی (جزاء) لە زمانی عەرەبییدا کە (منصوب)ە، بە چی (منصوب) بووە؟

دوو ئەگەری هەن:

١/ یان (مفعول لە)ی دووەمە.

٢/ یاخود چاوگ (مصدر)ەو، ئەوەی (منصوب)ی کردوە فرتێنراوە.

واتە: سزایان دەدرێتەوە بەوەی کە باسکرا لە گریانی زۆر، بەو سزادانەوە[١].

هەڵبەتە کەمتر وایە ئاماژە بە لایەنی ڕەوانبێژیی عەرەبیی بکەین، چونکە تەفسیرەکە بە زمانی کوردییە، وە خوشکانو برایانی کورد زمانیش کەمتر وایە پێویستییان بەو وردەکارییانەی ڕەوانبێژیی زمانی عەرەبیی هەبێ، ئەگەرنا زۆر مانای پەنهانو شێرراوەو، زۆر حیکمەتو شتی قووڵ قووڵ، لە ڕەوانبێژیی عەرەبیدا هەن، کە قورئانی مەزن گرتوونیە خۆی، بەڵام ئێمە بە ئەندازەی ئەوەی یارمەتیمان بدات بۆ ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستەکە، ئاماژەی پێ دەکەین، ئەوی دیکە کە زیاتر پەیوەندیی بە خەڵکی شارەزاو پسپۆڕەوە هەیە لەو بوارەدا، ئێمە لێی دەگەڕێینو، لە تەفسیرە عەرەبیەکاندا بەدەست دەکەوێ.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر خوا ﷻ تۆی گێڕایەوە بۆ لای ئەوان، وە جارێکی دیکە داوای مۆڵەتیان لێکردی، کە لەگەڵت بێنەدەر بۆ جەنگو جیهاد، پێیان بڵێ: هەرگیز لەگەڵ من جارێکی دیکە نایەن بۆ جەنگو جیهاد، وە هەرگیز جەنگی هیچ دوژمنێك لەگەڵ مندا ناکەن، چونکە ئێوە یەکەم جار ڕازی بوون کە دابنیشن، ئێستاش لەگەڵ دانیشتوواندا

١) لە حاڵەتی یەکەم دا: (یبکوا)، (مفعول)ی یەکەمی (و)ی (جمع)ی سەر (یبکوا) یە، وە (مفعول)ی دووەمی (جزاءً)ە.

دابنیشن، {ئێوە شایستەیی ئەوەتان نیە لەگەڵ جەنگاوەراندا بێن بۆ جەنگ، بەڵکو لەگەڵ دانیشتوواندا: پەککەوتەو نەخۆش‌و منداڵ‌و ئافرەت‌و ئەوانەدا، دابنیشن}.

لەبەردەم ئەم ئایەتەشدا پێنج هەڵوەستە دەکەین:

هەڵوەستەی یەکەم : پێویستە ئەوە بزانرێ کە (رَجَعَ) هەم بە (لازم) بەکاردەهێنرێ، واتە: پێویستی بە بەرکار (مفعول به) ناکات، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا ﴿٨٦﴾ ﴾طه.

واتە: موسى (عليه السلام) گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی بە تووڕەیی‌و خەفەتبارییەوە، کاتێك کە لە گفتوگۆکردن لە خزمەت خوادا گەڕایەوەو لەوحەکانی تەوراتی پێبوون، کە تەوراتیان تێدا نووسرابۆوە، تەماشای کرد خەڵکەکە دەستیان کردوە بە گۆڵك پەرستیی، وەك خوای پەنهانزان هەواڵی پێدابوو.

هەروەها کە خوای پەروەردگار دەربارەی برایەکانی یوسوف، کە دەگەڕێنەوە بۆ لای یەعقووبی بابیان، دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ ﴿٦٣﴾ ﴾یوسف. واتە: کاتێك گەڕانەوە بۆ لای بابیان.

وشەی (رَجَعَ) لەم دوو شوێنەدا حاڵەتی (لازم)ی وەرگرتوە، کە پێویستی بە (مفعول به) نەکردوە، وە لەو حاڵەتەدا: وشەی (رَجَعَ) چاوگەکەی بریتیە لە (رُجُوع) (رَجَعَ، يَرْجِعُ، رُجُوعاً)، (گەڕایەوە، دەگەڕێتەوە، گەڕانەوە).

بەڵام وشەی (رَجَعَ) بە (مُتَعَدِّي)ش بەکاردەهێندرێ، واتە: پێویستی بە بەرکار (مفعول به) بێ، وەك ئەو ئایەتەی کە تەفسیری دەکەین: ﴿ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ ﴾، واتە: ئەگەر خوا تۆی گێڕایەوە، لێرەدا وشەی (رَجَعَ) بە مانای: (أَرْجَعَكَ، أَعَادَكَ) دێ، یانی: خوا تۆی گێڕایەوە.

هەروەها خوا کە بە مووسا (عليه السلام) دەفەرموێ: ﴿ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: تۆمان گێڕایەوە بۆ لای دایکت، بۆ ئەوەی دڵی ئارام بێ‌و دڵتەنگ نەبێ.

لێرەش دا وشەی: (رَجَعَ) (رَجَعَ، يَرْجِعُ، رَجْعَاً) کە لێرەدا لە واتای: (أَرْجَعَ، يُرجِعُ، إِرْجَاعَاً) دایە، ئەوەندە هەیە بە (ثلاثي)دا هاتوە: (رَجَعَ، يَرْجِعُ، رَجْعَاً)، واتە: گێڕایەوە، دەیگێڕێتەوە، گێڕانەوە.

هەڵوەستەی دووەم : کە دەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ﴾، یانی: ئەگەر مۆڵەتی دەرچوونیان لێوەرگرتی.

وشەی (خُرُوج) واتە: هاتنەدەر، بەڵام بەپێی سیاق دەزانین، وە بە زۆریی لە بەکارهێنانی قورئاندا، بە مانای چوونەدەر بۆ جەنگو، ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن بەکاردەهێنرێ:

﴿فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ﴾، واتە: مۆڵەتیان لە تۆ وەرگرت کە دەربچن، واتە: بێن بۆ جەنگ وجیهاد.

هەڵوەستەی سێیەم : کە دەفەرموێ: ﴿فَقُل لَّن تَخْرُجُواْ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُواْ مَعِىَ عَدُوًّا﴾، پێیان بڵێ: هەرگیز جارێکی دیکە لەگەڵ من نایەنە دەر (بۆ دەرەوەی مەدینە)، بۆ ئەوەی کە جەنگ لە دژی هیچ دوژمنێك بکەن، یانی: مادام بۆ جەنگی تەبووك نەهاتن، بۆ هەر جەنگێکی دیکە کە ڕوودەدات، ئێوە هەرگیز شایستەیی ئەوەتان نیە کە لەگەڵمدا بێن، نەك هەر بۆ دەرەوەی مەدینە نایەن بۆ جەنگ، بەڵکو بۆ هیچ جەنگێك بەشداریی ناکەن لەگەڵ مندا، واتە: بە موتڵەقیی نابێ بەشداریی هیچ جەنگێك بکەن، لە نێوەوەو دەرەوەی مەدینەش، ئەمە ئاوا تەفسیر کراوە: (أَي: لَنْ يَكُونَ لَكُمْ شَرَفُ الصُّحْبَةِ مَعِيَ إِلى الجِهادِ خَارِجَ المَدِينَةِ، وَلَنْ تقاتلوا مَعِي عَدواً بِأَيِ حالٍ مِنَ الأَحْوَال لا خَارِجَ المَدِينَةِ وَلاَ دَاخِلَها).

واتە: ئێوە نابێ شەرەفی هاوەڵێتیی منتان پێ ببڕێ، بۆ جەنگو جیهاد، جا چ لە نێوەوەی مەدینەدا بێ، یان لە دەرەوەی مەدینە، وە لە هیچ حاڵێکدا نابێ بەرەنگاری هیچ دوژمنێك بکەن لەگەڵ ئێمەدا.

کە ئەوەش سزادانێك بووە.

هەڵوەستەی چوارەم : دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾،
واتە: ئێوە یەکەمجار ڕازیبوون بە دانیشتن.

واتە: ئەو یەکەم جارەی کە زۆر گرنگ بوو، کە ڕۆیشتن بوو بۆ جەنگی تەبووك بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕۆمەکان، ئەو جارە ئیسلام زۆر پێویستی پێتان بوو. وە پێغەمبەر صەلاتو سەلامی خوای لەسەر، زۆر جەختی لێتان کردەوە!

ئنجا مادام ئەو جارە نەهاتن، لە سزای ئەوەدا، جەنگی دیکە کە بێنە پێشێ. کە واپێدەچێ: سەرکەوتن زیاتر تێیاندا چاوەڕوانکراو بێ، وە دەستکەوتی زیاتر تێیاندا چاوەڕوانکراو بێ، نابێ بێن، بۆیە خوای دادگەر بەوە سزای دان.

ئینسانی ئیماندار نابێ بەدوای شتی سووكو ئاسان دا بگەرێ، نابێ تەنیا چاوی لە دەستکەوت بێ، یاخود بەس ئەو شتانەی کە خۆی پێی خۆشن بیانکات. بەڵکو ئینسانی ئیماندار دەبێ بیستنو فەرمانبەریی هەبێ بۆ فەرماندەی خۆی. لەو حاڵانەدا کە پێی خۆشن، وە لەو حاڵانەش دا کە پێی ناخۆشن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ والطاعة فِيما أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ؛ فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٦٢٧٨)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦٧٢٥)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٨٣٩). وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٢٦٢٦)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (١٧٠٧)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٤٢٠٦). وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٢٨٦٤)}.

واتە: ئینسانی بڕوادار لەسەری پێویستە گوێ بگرێو فەرمانبەرییش بکات. لە حاڵێك دا کە پێی خۆشەو، لەو حاڵەش دا کە پێی ناخۆشە، مادام فەرمانی پێ نەکرێ بە سەرپێچیی، وە ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچیی، نە گوێ گرتن هەیە، نە فەرمانبەریی.

دیارە لە ناشەرعییدا بە قسەی کەس ناکرێ، بەڵام مادام ناشەرعیی نەبێ. با پێشت ناخۆش بێ، دەبێ فەرمانەکە جێبەجێ بکەی، چونکە ئەگەر تەنیا ئەو شتانە جێبەجێ بکەی، کە بۆخۆت پێت خۆشن، ئەوە هەر بە قسەی خۆتت کردووە!

بۆیە خوای كارزان دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾، بۆیە بەوە سزا دەدرێن، كە بێ بەش بكرێن لە بەشداریی كردن لە جەنگو جیهاد، چ لە نێو مەدینە، چ لە دەرەوەی مەدینە، چونكە ئێوە یەكەم جار ڕازی بوون دابنیشن، ﴿فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ﴾، ئێستاش لەگەڵ بەجێماواندا، لەگەڵ دواكەوتوواندا، دابنیشن.

دەربارەی وشەی (مرة)، دەڵێ: (مَرَّة: اسْتُعْمِلَتْ ظَرْفاً مِنَ المَرِّ وَالمُرورِ، وَأَصْلُها الفِعْلة).

وشەی (مَرّة) لە (مَرّ)و (مرُور) وەرگیراوە (مَرَّ، يَمُرُّ، مُروراً وَ مَرَّةً) كە مەبەست پێی یەك جارە، واتە: یەك جار كە شتێك ئەنجام دەدرێ.

<u>هەڵوەستەی پێنجەم</u> : كە دەفەرموێ: ﴿فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ﴾، ئەمە دوو واتای هەن :

١/ (مَعَ الَّذِينَ تَخَلَّفُوا عَنِ النَّفيرِ)، دابنیشن لەگەڵ ئەوانەی كە بەجێمان لە جەنگو جیهاد.

٢/ (مَعَ الخَالِفِين: أي مَعَ الأَشْرَارِ وَالفَاسِدِين) لەگەڵ خراپەكارانو حاڵ تێكچووان دا.

چونكە وشەی (خَلْفَ) وەك چۆن بە مانای بەجێمان دێ، (خَلَفَ، يَخْلُفُ).

دیسان (خَلَف) بە مانای تێكچوونیش دێ، تێكچوونی حاڵی ئاسایی شتێك، بۆیە بە بۆنی زاری ڕۆژووەوان گوتراوە: (خُلُوف)، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: ﴿لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، بِرقم: (١٧٩٥)، وَمُسْلِمٌ، بِرقم: (١١٥١)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٢٢١٧)، وَابْنُ حِبَّانَ (٣٤٢٣)} .

واتە: بۆنی گۆڕراوی زاری ڕۆژووەوان لەلای خوا، خۆشترە لە بۆنی میسك.

کەواتە: (خَالِف) کەسێکە حاڵی تێکچووبێ، حاڵی ئیمانی تێکچووبێ، حاڵی مەعنەویی تێکچووبێ، واتە: لەگەڵ تێکچووان و خراپەکاراندا دابنیشن.

مەسەلەی چوارەم: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

واتە: لەمەودوا هەرگیز نوێژ لەسەر هیچ کامێکیان نەکەی، کە دەمرێ، وە لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوانە بە خواو پێغەمبەرەکەی بێبڕوا بوون، وە بە لادەرییش مردن.

کەواتە شایستەی ئەوە نین نوێژیان لەسەر بکەی، یاخود بەشداریی بە خاك سپاردنیان بکەی.

(محمد رشيد رضا) لە تەفسیرەکەی خۆی (تفسير القرآن الحكيم)دا ئاوا تەفسیری ئەم ئایەتەی کردوە، دەڵێ: (أي: لاَ تُصَلِّ أَيُّها الرَّسول بَعْدَ الآن عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ مِنْ هَؤُلاءِ المُنَافِقِينَ، الَّذِين عَرَّفْنَاكَ شأنَهُمْ: صَلاَةَ الجَنَازَةِ أَبَداً مَا حَيِيتَ، وَلاَ تَقِفْ عَلَى قَبْرِهِ عِنْدَ الدَّفْنِ لِلْدُّعَاءِ لَهُ بالتَّثْبِيتِ، كَمَا تَقُومُ عَلَى قُبُور المُؤمِنِين عِنْدَ دَفْنِهِم، وَيَلْزَم هَذَا النَّهِيُ عَدَم تَشْيِيع جَنَائِزِهِم)(١).

واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ لەمەودا لەسەر هیچ کام لەو مونافیقانەی کە حاڵ و باڵی ئەوانمان بە تۆ ناساند، نوێژی جەنازە مەکە، هەتا لە ژیانداى، وە لەسەر گۆڕەکەشی ڕامەوەستە لە کاتی بە خاك سپاردنیدا، تاکو دوعای بۆ بکەی، خوا زمانی بۆ ڕاست بکات، وەك چۆن لەسەر گۆڕی بڕواداران لە کاتی بە خاك سپاردنیاندا، ڕادەوەستی و دوعایان بۆ دەکەی، لەسەر گۆڕی ئەو مونافیق و دەغەڵانە مەوەستە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەشداریی بە خاك سپاردنیان نەکات.

لەوبارەوە کە سوننەتە دوای ناشتنی مرۆڤی مسوڵمان مسوڵمانان، لەسەر گۆڕەکەی بوەستن و دوعای بۆ بکەن، ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ عُثْمَان بن عَفَّان رَضِي

---

١) ج ١٠، ص (٥٠٨ ، ٥٠٩).

اللهُ عَنْـهُ، قَـالَ: كـانَ النبـيُّ ﷺ إِذَا فُـرِغَ مِـن دَفْـنِ المَيِّـتِ وَقَـفَ عَلَيْـهِ، وَقَـالَ: اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ، فَإِنَّهُ الآنَ يُسأَلُ﴾، {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، برقم: (٣٢٢١)، وَالبَيْهَقِيّ فِي الكُبْرَى، برقم: (٦٨٥٦) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي} .

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێ (سێیەم جێنشینی پێغەمبەر ﷺ بوو)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا کاتێك کە بە خاك سپاردنی مردوو تەواو دەبوو، لەسەر گۆڕەکە دەوەستاو دەیفەرموو: داوای لێبوردن بۆ برایەکەتان بکەن {ئەگەر پیاو بووایە، دیارە ئەگەر ئافرەت بووایە دەیگوت (لأُخْتِكُمْ)} وە داوای بۆ بکەن کە دامەزراو بێ، (وەڵامەکان باش بداتەوە)، چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ.

دیارە هەر کەسێك کە دەمرێو گیان دەسپێرێ، یەکسەر لێپرسینەوەیەکی سەرەتایی لەگەڵدا دەکرێت، بۆیە گوتراوە: (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيامَتُهُ) واتە: هەر کەسێك مرد، قیامەتی وی هاتوە، واتە: قیامەتی بچووکی، قیامەتی گەورەش ئەوەیە کە دوایی هەموویان پێکەوە هەڵدەستنەوەو، لێیان دەپرسرێتەوە.

هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لەوە کە دەفەرموێ ﴿وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾﴾.

یانی: سەردانی گۆڕەکەشی مەکە، بەڵام ئەوە پێناچێ ڕاست بێت، چونکە سەردانی گۆڕستان بە گشتیی دەکرێ.

ئنجا ئەگەر گریمان سەردانی گۆڕی بابایەکی کافر دروستیش نەبێ، ئەم ئایەتە نایگەیەنێ، دەبێ لە شوێنی دیکە بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە.

## ئیشکالێک لە نێوان ئەم ئایەتەو چەند ڕیوایەتێک دا

ئێمە کاتی خۆی لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا، بەسەرهاتێکمان لە عومەری کوڕی خەتتابەوە خوا لێی ڕازی بێ هێنا، کە ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی لێی گێڕا بۆوە، کە کاتێک کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول بە خاك سپێردراوە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی نوێژی لەسەر بکات، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: منیش هەڵسام بە پرتاو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ چۆن نوێژی لەسەر دەکەی؟ کە ئاوای گوتوەو، ئاوای کردوەو، ئاواو ئاوا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: لاچۆ عومەر! دوایی کە زۆر جەختم لێی کردەوە، فەرمووی: لاچۆ، من سەرپشك کراوم لە نێوان ئەوەدا کە نوێژیان لەسەر بکەم، یان لەسەر نەکەم.

ئنجا ئەو بەسەرهاتە، لەگەڵ ئەم ئایەتانەو سیاقی ئایەتەکان دا تێکدەگیرێ. هەڵبەتە هەر شتێك لەگەڵ فەرمایشتی خوادا تێکبگیرێ، دەبێ ڕەفز بکرێ:

دیارە (ابن الحجر) لە (فتح الباري)دا، هەروەها (محمد رشید رضا) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (تفسیر القرآن الحکیم)[1] دا ئەو مەسەلەیەیان باسکردوە، بەڵام ئەوان بە تەفصیلتر هێناویانەو ئێمە بە کورتیی‌و پوختیی باسی دەکەین‌و. پێنج بەڵگان، لەسەر ئەوە کە ناگونجێ، ئەو ڕیوایەتەو هاووێنەکانی ڕاست بن. دەخەینە ڕوو:

١- سیاقی قورئان زۆر بە ڕوون‌و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنێ، کە سوورەتی تەوبە دوای جەنگی تەبووك، کە لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا بووە، هاتۆتە خوار، وە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی لە ساڵی نۆیەمی کۆچییدا مردوە، واتە: ساڵێك دوای ئەوەی جەنگی تەبووك بووەو، سوورەتی تەوبە هاتۆتە خوارێ، مردوە، کەواتە: ناگونجێ ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ ﴾. بەهۆی نوێژکردنی پێغەمبەرەوە ﷺ لەسەر جەنازەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی

---

١) ج ١٠، ص (٥١٠ ، ٥١١).

هاتبێتە خوار، چونکە ئەم سوورەتە ساڵێك پێش ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بمرێت، هاتۆتە خوار.

٢ـ قسەکەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، کە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: {يا رَسولَ اللهِ! تُصَلِّي عَلَيْهِ، وَقَدْ نَهاكَ رَبُّكَ أَنْ تُصلِّي عَلَيْه؟!} (أَخْرَجَهُ البُخارِيّ، برقم: (٤٣٩٣)).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن نوێژی لەسەر دەکەی، لە حاڵێك دا کە پەروەردگارت لێی قەدەغە کردووی، نوێژی لەسەر بکەی؟! (واتە: نوێژ لەسەر مونافیقەکان بکەی)، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو ڕێگریی لێکردنەی خوای کاربەجێ، پێش مردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بووە!، کەچی دوایی کە دەڵێ: (فَصَلَّى رَسول الله ﷺ فأنزل الله)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد، ئنجا خوا ئەوەی ناردە خوارێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾، ئەمە بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ کە لەدوای مردنی (عبدالله بن أُبَي)و دوای ئەوەی کە نوێژی لەسەر کردوە، هاتۆتە خوار، ئنجا ئەم دووەش تێکدەگیرێن، لەلایەکەوە دەڵێ: پەروەردگارت ڕێی لێ گرتووی، کە نوێژی لەسەر بکەی، کەواتە: دەبێ سوورەتەکە هاتبێتە خوار، کەچی دواییش دەڵێ: نوێژی لەسەر کردو، دوایی خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار، ئنجا ئەو قسانەش بە ڕوونیی دیارە کە پێچەوانەی یەکدیین.

٣ـ لە دەقەکەدا گوایە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ اللهَ خَيَّرَنِي)، واتە: خوا منی سەرپشك کردوە، {لە نێوان ئەوەدا کە داوای لێبوردن بۆ مونافیقەکان بکەم، یان بۆیان نەکەم؟ وە نوێژیان لەسەر بکەم، یان لەسەریان نەکەم؟}، ئەوەش لەگەڵ دوایی ئایەتەکەدا تێکدەگیرێ، کە خوا بە ڕوون و ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿ ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ التوبة.

واتە ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی، خوا لێیان نابووریٚ، کەواتە: ئایا سەرپشککرانی پێغەمبەر ﷺ لە کوێ دایە؟! ئەوە نیە خوا بە روونیی دەفەرموێ: ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی. {کە پێشتر باسمان کرد، حەفتا جار، یانی: هەرچەندە زۆریش داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی} ، خوا هەر لێیان نابووریٚ، کەواتە: کوا سەرپشك کردنەکە، لە کوێدایە؟ بە دڵنیایی هیچ سەرپشك کردنی تێدانیە، بەڵکو قەدەغەکرانی تێدایە.

٤- تێکگیران هەیە لە نێوان ئەو گێڕدراوەیە کە دەفەرموێ: ﴿فَلَوْ عَلِمْتُ أَنِّي لَو زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ، غُفِرَ لَهُ، لَزِدْتُ عَلَيْهَا﴾، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ برقم: (١٣٠٠)} .

وە ئەو ڕیوایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَسأَزِيدُ عَلَى السَّبْعِين﴾،{أَخْرَجَهُ البُخَارِيَ (٨٥/٦)، ومسلم (١١٦/٧) و(١٢٠/٨)} .

چونکە: ڕیوایەتی یەکەمیان دەفەرموێ: (ئەگەر زانیبام کە لە حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەم، خوا لێی دەبووریٚ، لێم زیاد دەکرد.

واتە: حەفتا جارم زیاتر دەکرد، دیارە پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی، کە ئەگەر لە حەفتا جاریش زیاتر داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکات، خوا هەر لێیان نابووریٚ بۆیە لە حەفتا زیادی نەکردوە.

ڕیوایەتی دووەم دەفەرموێ: (من لە حەفتا جاریش زیاتر داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا دەکەم)، بە ئاشکراش دیارە ئەو دوو قسەیە، تێکگیرانێکی زۆر ڕوونو بێ پێچو پەنایان لەنێوان دایە، وە ناشگونجێ پێغەمبەر ﷺ دوو قسەی پێچەوانەی یەکدی بکات.

٥- دیسان تێکگیران هەیە لە نێوان ڕیوایەتێکدا، کە لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، کە گوایە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول {واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول کە سەرۆکی مونافیقەکان بوود کوڕێکی بووە بە ناوی عەبدوڵلا بە ناوی خۆی کردوە} کاتێك کە بابی دەمریٚ دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە داوای لێ دەکات کە کراسەکەی خۆی بداتێو بیکاتە کفنی بابی.

ڕیوایەتێکی دیکەش هەیە لەو فەرموودەیەدا کە جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەیگێڕێتەوە، دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی دوای ئەوەی کە بە خاك سپێردرابوو، کوڕەکەی هات، داوای لێکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی خۆی بداتێ بیکاتە کفنی بابی، ئەویش فەرمانی کرد، لە گۆڕەکەی دەری بێنن، ئنجا لە گۆڕەکەی دەریان هێنایەوە، ئەویش کراسەکەی خۆی کردە کفنیو، لەبەری کرد.

هەڵبەتە ئەو دووەش دیسان تێکدەگیرێن، لەلایەکەوە دەڵێ: کوڕەکەی هات داوای کرد، کە کراسەکەی بداتێو بیکاتە کفنی، بەڵام لە ڕیوایەتەکەی دی دا دەڵێ: دوای ئەوەی بە خاکیان سپارد بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد: دەریان هێنایەوەو، کراسەکەی کردە کفنی.

کەواتە: لە ڕاستییدا ئێمە هەموو ئەو ڕیوایەتانەی کە لە نێوان خۆیاندا ناکۆکن، یان لەگەڵ قورئاندا ناکۆکن:

١) عەقڵو مەنتیق.

٢) پابەندییمان بە قورئان.

٣) پابەندییمان بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ قسەو هەڵوێستی پێچەوانەی یەکدی نیە.

هەموو ئەوانە ناچارمان دەکەن، کە ڕەفزیان بکەین، وە بڵێین: ئەوانە ڕاست نین لە ڕووی مەتنو نێوەرۆکیانەوە، با لە ڕووی سەنەدو زنجیرەی ڕاوییەکانیشەوە، بە ڕاست دابنرێن!.

زانایانی فەرموودەناس وەك چۆن زانیارییەکیان داناوە، بە ناوی (علم الجرح والتعديل) زانیاریی ڕووشاندنو بە دادگەردانانی ڕاوییەکان، بەهەمان شێوەش، وەك چۆن عیلمی ڕیوایەتیان، هەیە (علم الدِّراية)یشیان هەیە، کە زۆرێك لە فەرمووده ناسانو زانایانی قووڵ، هەر دەقێك بەناوی سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ، مادام لەگەڵ سوننەتی صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ تێکبگیرێت، یان لەگەڵ قورئاندا تێکبگیرێ، یان لەگەڵ عەقڵو مەنتیقو واقیع دا، تێکبگیرێت ڕەفزیان کردوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ﴾.

واتە: ئەوانە بێبڕوابوون بە خواو پێغەمبەرەکەی، وە بە لادەرانەش مردنو بە لاڕێیانە مردن، ئەمەش پاساودانەوەو بەڵگە هێنانەوەیە کە بۆچی نابێ نوێژیان لەسەر بکات؟ لەبەرئەوەی بێبڕوان بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بە لادەریو لاڕێییش مردوون.

لێرەدا وشەی (فاسقون) بە مانای (فسق)ی گەورەیە، واتە: دەرچوون لە ڕێگا بە یەك جارەکیی: لە ڕێبازی خواو، لە حوکمی عەقڵو حوکمی فیترەت دەرچوون. وە لە ڕێبازی شەریعەت دەرچوون، بۆیە شایستەی ئەوە نین کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژیان لەسەر بکاتو، بۆیان لە خوا بپاڕێتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾.

ئەم ئایەتە کە هەمان شێوە، لە ئایەتی ژمارە (٥٥)یشدا هاتوە، بەڵام لەگەڵ چوار جیاوازیی بچووك دا:

ئایەتەکەی ژمارە (٥٥) ئاوایە: ﴿ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

بەڵام ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾.

کەواتە: چوار جیاوازیی لە نێوان ئەم دوو ئایەتەدا هەن، دیارە ئەو چوار جیاوازییەش سیاقی هەردوو ئایەتەکە خواستوویانن، واتە: دووبارە بوونەوەیەك نیە. جاری وایە خوای پەروەردگار مەبەستێك نەك لە شوێنێك، بەڵکو لە دە شوێندا دەیهێنێ، وە جاری وایە بە هەمان وشە دووبارەی دەکاتەوە، جاری واشە بە تۆزێك جیاوازییەوە، بەپێی ئەو سیاقو شوێنەی کە دەیخوازێ:

چوار جیاوازییەکە :

١/ لە ئایەتی (٥٥)دا کە پێشتر تەفسیرمان کرد، دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تُعۡجِبۡكَ ﴾، (ف)ی لەسەرە، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە پێشتر باسکرا، لە سزای ئەوەدا، با سامانو منداڵەکانیان سەرسامت نەکەن.

بەڵام لە ئایەتی ژمارە (٨٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُعۡجِبۡكَ ﴾، کە دیارە (و) بۆ (عطف)ەو، (ف)یان بۆ (تعقیب)، یان (جزاء)ە.

واتە: وێڕای ئەوەی کە باسکرا: با سامانو منداڵەکانیان سەرسامت نەکەن، یان: با لە سزای ئەو ڕەفتارو هەڵوێستانەیان دا، سامانو منداڵیان سەرسامت نەکات.

٢/ لە ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡ ﴾، نە سامانەکانیان، وە نە منداڵەکانیشیان، با تۆ سەرسام نەکات، هەرچەندە زۆربن.

بەڵام لە ئایەتی ژمارە (٨٥)دا دەفەرموێ: ﴿ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَأَوۡلَٰدُهُمۡ ﴾، لێرەدا (لا)یەکەی لەگەڵدا نیە، ئایەتی (٥٥) واتە: با نە سامانەکانیان بەتایبەت تۆ سەرسام بکات، وە نە با منداڵەکانیان سەرسامت بکات، واتە: هەر کامێکیان با تۆ سەرسام نەکات، بەڵام ئایەتەکەی (٨٥) کە (لا)یەکەی تێدانیە، واتە: با کۆی سامانو منداڵەکانیان، تۆ سەرسام نەکات.

٣/ لە ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، واتە: بێگومان خوا تەنیا دەیەوێ کە سزایان بدات، بەو ماڵو سامانو منداڵانەیان، لە ژیانی دنیادا.

بەڵام لە ئایەتی (٨٥)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلدُّنۡيَا ﴾

لەوێ دەفەرموێ: ﴿ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا ﴾، لێرە دەفەرموێ: ﴿ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا ﴾، لەوێ (ل)ی (علة)ی لەسەرە، لێرەش بە (أن)ی (ناصبة) هێناویەتی، کە مانایان لێک نیزیکە، بەڵام (ل) لە ئایەتی (٥٥)دا یانی: خوای کارزان بۆیە ئەو سەروەتو سامانو ماڵو منداڵەی پێداون، کە ببێتە مایەی ئازارو مەینەتیان لە دنیادا.

بەڵام (أن) لە ئایەتەکەی (٨٥)دا: یانی خوا دەیەوێ ئەو ماڵو سامانە، وە ئەو منداڵو وەچە زۆرە، بکاتە هۆکاری ئازارو مەینەتییان.

٤/ لە ئایەتی (٥٥)دا، دەفەرموێ: ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، بەڵام لە ئایەتی (٨٥)دا، دەفەرموێ: ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا﴾، واتە: ژیانی لێ قرتێنراوە، کە دەگوترێ: ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، لە ئایەتی ژمارە (٥٥)دا، کەواتە: پێویستی نەکردوە، لە ئایەتی (٨٥)دا، وشەی ﴿ٱلۡحَيَوٰةِ﴾، بێنێ و، هەر: ﴿ٱلدُّنۡيَا﴾ی هێناوە، چونکە لەوێدا زانراوە کە مەبەست لە ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا﴾، ژیانی دنیایە.

ڕستەی دواییشیان هی هەردووکیان وەك یەکە، ﴿وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾. واتە: ڕووحەکانیان دەربچن، لە حاڵێکدا کە بێبڕوان.

هەڵبەتە ئەمەش کە لەو دوو ئایەتەدا، لەو دوو سوورەتەدا، ئەو مەبەستە دووبارە بۆتەوە، بەڵام بەو چوار جیاوازییەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو حاڵەتە زۆرە واتە: سەرسام بوون بە ماڵ و سامان و قەرەباڵغی دەوری ئەهلی کوفر، وە ئەهلی نیفاق، حاڵەتێکە کە هەیە لە نێو مسوڵمانانداو، وە مسوڵمانان ئەگەر لە خۆیان وریا نەبن، بەهۆی سەرسام بوونیانەوە، بەو ماڵە حەرام و سەروەت و سامانە کەڵەکە کراوە، بە شێوازی ناشەرعییانەو بە گەندەڵیی و جەورو زوڵم و ستەم، وە بە قەرەباڵغی دەوری ئەهلی کوفرو نیفاق سەرسام دەبن، کە ئەو سەرسام بوونە، شتێکی بێجێیە، چونکە تۆ بە شتێك سەرسام بووی، کە بێ نێوەڕۆك و بێ بنەمایە، وەك خوای بێنیاز لە شوێنی دیکەشدا ئەو حەقیقەتە باس دەکات.

بۆ وێنە:

١ - لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾.

واتە: چاوت مەبڕە ئەوەی کە کۆمەڵێك لەوانەمان پێ بەهرەمەند کردوە، وە خەفەتیان لێ مەخۆ {کە سەروەت و سامانی زۆریان بە دەستەوە هەیە، هیچ نیە، هەر شتێکی زۆرو بۆرە}.

٢ - هەروەها لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾.

دیارە لە هەردوو ئایەتەکەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، وە لەدوای ئەویشەوە، هەر کەسێك کە بە شوێن پێغەمبەر ﷺدا دەڕواتو، قورئان دەخوێنێ.

واتە: وە چاوی خۆت مەبڕە ئەوەی کە کۆمەڵێك لەوانەمان پێ بەهرەمەند کردوە، لە ژیانی دنیادا، تاکو تاقییان بکەینەوە، لەو بەهرەمەند کردنەدا، وە ڕۆزیی پەروەردگارت چاکترەو زیاتریش دەمێنێتەوە.

کەواتە: دەبێ مسوڵمان ئاگای لە خۆی بێ، نەکەوێتە ژێر کاریگەریی سەروەتو سامانی دەستی ئەهلی کوفرو نیفاق، وە قەرەباڵغی دەوروبەریان، وە دڵنیابێ، کە ئەوە جێی ئەوە نیە، پێی سەرسام بێ، وە بە شتێکی گەورەو گرنگی بزانێ، وە دڵنیاش بێ، کە ئەوە نە لە دنیاشدا دادیان دەدات، وە نە لە دواڕۆژیشدا، بەڵکو لە دنیادا مایەی سەرئێشەو سزاو ناڕەحەتییە، چونکە ئەوانەی کە سەروەتو سامانی زۆر وەسەریەك دەنێن، وە ئەوانەی کە خەڵكو قەرەباڵغی زۆریان بە دەورەوە هەیە، چ وەك وەچەو منداڵو کوڕو کچی خۆیان، چ وەك خزمو خەڵکیان، کە لە خۆیان ئاڵاندوە، بە پارەی حەرام، وە چ خەڵکی دیکەی کە بە پارەی حەرام بە دەوری خۆیانەوە شەتەکیان داون: خەفەتیان لێ دەخۆنو مایەی سەرئێشەن، وە زۆر جار ئەو پەندە کوردییەیان بەسەردا دەچەسپێ: {هەتا گندۆر گندۆر بوون، خزم زۆر بوون، گندۆر هاتنە بڕانێ، خزم هاتنە قڕانێ} ، ئەوانە تاکو پارەو سامانو شتی حەرامیان زۆر بەدەستەوەیە، خەڵکیان زۆر بە دەورەوەو قەرەباڵغییان هەیە، بەڵام هەر کات ئەوان لات کەوتن ، بەجێیان دێڵن، وە دەچن بۆ شوێنێکی دیکە، کە ئەو سەروەتو سامانە حەرامەی لێیە.

کەواتە: شتی ئاواو حاڵەتی ئاوا، شایستەی ئەوە نیە، کە ئینسان پێی سەرسام بێو، خۆزگەی پێ بخوازێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

لەو دوو ئایەتەدا باسی حاڵەتێکی دیکەی موونافیقو دەغەڵەکان دەکات، واتە: وە هەر کاتێك سوورەتێك دابەزی، کە تێیدا هاتبوو (فەرمان کرابوو) کە خەڵك کە بڕوا بێنن بە خوا، وە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ﷺ تێبکۆشنو لە خزمەتیدا بن، ﴿ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ ﴾، دەست ڕۆیشتووەکانیان {خاوەن ئیمکانییەتەکانیان} داوای مۆڵەتیان لێ کردی، ﴿ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴾، وە گوتیان: لێمانگەڕێ با لەگەڵ دانیشتوواندا دابنیشین، {ئەوانەی کە دادەنیشن لە ماڵ نایەن بۆ جەنگ. لێمانگەڕێ با لەگەڵ وان بین}، ﴿ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ ﴾، ڕازیبوون کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماودا بن، ئافرەتانێك کە لەسەر ماڵو حاڵ بەجێدەهێڵرێنو پیاوەکە دەچێ بۆ دەرو دەشت، یاخود بۆ کارو کەسابەت، یان بۆ جەنگ دەچێ.

(خالفة) کۆیەکەی (خوالف)ە، (خالفة)ش ئەو ئافرەتەیە کە لە ماڵ بەجێدەمێنێ. سەرپەرشتی ماڵو حاڵ دەکات، دوای ئەوەی کە مێردەکەی دەچێتە دەر، جا چ بۆ جەنگ بچێ، چ بۆ کارو کەسابەت بچێ، واتە: ڕازیبوون وەك ژنان ڕەفتار بکەن!

ئێمە لە کوردەواریی خۆمان دا دەڵێین: (پیاوێکی سەر ژنانییە)، واتە: عادەتی ژنان ڕەچاو دەکات، وەك ژنان دەکات، ئنجا ئەگەر ژن عادەتی خۆیان ڕەچاو بکەن، ئەوە لەگەڵ سروشتی خۆیاندا ڕاستیان کردوە، بەڵام پیاوێك عادەتی ژنان ڕەچاو بکات. بەتایبەتی لە ڕۆژانی ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاریی لەگەڵ ئەهلی کوفرو لەگەڵ دوژمناندا، ئەوە نەقوستانییەکی گەورەیە، بۆ ئافرەتەکە، لەگەڵ سروشتی خۆیدا ڕاستی کردوە، چونکە خوای کارزان سروشتی ئافرەتی بەلای نەرمو ناسکیی و

ئاشتیی‌و سەلامەتییدا شكاندۆتەوە، ئافرەت زیاتر مەیلی ئەوەی هەیە، بەڵام سروشتی پیاو، جۆرێكی دیكەیەو لە كاتی پێویستدا گیانی ڕووبەڕووبوونەوەو فیداكاریی‌و بەرەنگاربوونەوەی هەیە.

بۆیە خوا كە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ ﴾، واتە: هەر كاتێك سوورەتێك هاتە خوار، كە فەرمانی دەكرد بەوە كە بڕوا بە خوا بێنن، وە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ تێبكۆشن‌و بچن بۆ جەنگ، ئا ئەوە هەڵوێستیانە: ﴿ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ ﴾، ئەوانەی خاوەن ئیمكانیەتن، داوای مۆڵەتت لێ دەكەن، ئەمە وەك ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی (محمد) وایە كە خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٌۖ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ مُّحۡكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوۡلٌ مَّعۡرُوفٌۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرًا لَّهُمۡ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی بڕوادارن، بە ئاوات دەخوازن‌و دەڵێن: خۆزگە سوورەتێك دابەزیبایە، ئنجا كاتێك سوورەتێكی موحكەم، (واتە: مانا ڕۆشن‌و بێ پێچ‌و پەنا) كە فەرمانی تێداكرابوو بە جەنگ، دابەزی، ئەوانەی كە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانبینی تەماشات دەكەن، وەك كەسێك كە لە حاڵەتی سەرەمەرگدا بێ‌و، بێهۆشیی مەرگی بەسەردا بێت، هێندە دەترسێن، ﴿ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوۡلٌ مَّعۡرُوفٌۚ ﴾، بۆ وان وا باشتربوو: فەرمانبەریی بكەن‌و قسەی باش بكەن، ئەوە بۆوان باشتر بوو، لەوەی كە هێندە بكەونە حاڵەتی ترس‌و لەرزەوە، {لە كاتێكدا باسی جەنگ‌و جیهاد دێتە پێش} .

كە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ ﴾، یانی: خاوەن سەروەتەكان، خاوەن ئیمكانییەت‌و دەست ڕۆیشتووەكان.

(ٱلطَّوۡلِ): (الطَّول: من مادة الطُّولِ، ضِدُّ القِصرِ) وشەی (ٱلطَّوۡلِ) لە (طُول)ەوە هاتوە، واتە: درێژیی، (قِصَر) واتە: کورتیی، لێرەدا یانی: (أُولُوا القُدْرَةِ عَلَى الجِهادِ بِأَمْوَالِهِم وَأَنْفُسِهِم)، واتە: ئەوانەی کە خاوەن دەسەڵاتن بۆ جەنگو جیهاد، هەم بە سامانیان، هەم بە جەستەیان، ﴿أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ﴾، هەردووکیان دەگرێتەوە، واتە: هەم سەروەتو سامانیان هەیە، وە هەم جەستەشیان ساغو سەلامەتو بەهێزە.

دەڵێ (الطَّوْلُ: الغِناء وَالثَّرْوَة وَالفَضْل وَالمِنَّة)، (طَوْل) یانی: سەروەتو سامانو بەخششو چاکە لەگەڵ خەڵك کردن.

﴿وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾، وە پێت دەڵێن: لێمانگەڕێ با لەگەڵ دانیشتواندا بین، یانی: لێمانگەڕێ با لەگەڵ ئەوانەدا بین کە لە ماڵی خۆیاندا دانیشتوون، کە کێن ئەوانەی لە ماڵی خۆیاندا دانیشتوون؟

کاتی جەنگو جیهاد دێتە پێش، ئەوانەی کە پیری پەککەوتەن، یان نەخۆشن. یان کەمئەندامن، یان منداڵن، یان بێهێزن، یان ئەو کاتە دەسەڵاتێکی ماددیی ئەو تۆیان نەبووە، کە چەكو هۆکارەکانی جەنگ: وڵاخی سوارییو ئەو پێداویستییانەی جەنگیان پێ دەکرێ، دابینیان بکەن، ئەوانە دانیشتوون، بەڵام کەسێك کە نە لە جەستەیدا کەموکوڕیی هەبێ، وە سەروەتو سامانیشی هەبێ، داوای مۆڵەت بکات، ئەوە هەڵوێستێکی زۆر خراپە، بۆیە خوا لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ: ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ﴾، ڕازیبوون کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماودا بن، دەڵێ (خوالف) کۆی (خالِفة)یە، ژنێك کە لە ماڵ بەجێدەمێنێ، لەسەر ماڵو منداڵانو سەرپەرشتییان دەکات.

وە دەشگونجێ: وشەی: (خوالف) بە مانای (مَنْ لاَ خَيْرَ فِيهِ مِنْ أَهْل الفَسادِ) ئەوانەی کە هیچ خێرێکیان پێوە نیە، چونکە پێشتر باسمان کرد، وشەی (خَلَفَ. يَخْلُفُ) وەك چۆن بە مانای بەجێمان دێ، بە مانای خراپبوونیش دێ، کەسانێك کە ڕازیبوون وەك کەسانی خراپ بن، کەسانێك کە باری مەعنەوییان تێکچووەو لایەنی ڕەوشتییان تەواو نیە، ڕازیبوون وەك ئەوان بن، کە لە ماڵ دادەنیشنو بەجێ دەمێنن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾، وە مۆریان بەسەر دڵەوە نرا، ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾، بۆیە تێناگەن.

وشەی (طُبِعَ: الطَّبْعُ وَالخَتْم عَلَى القُلُوب، عِبَارَةٌ عَن عَدم قَبُولِها لِشَيءٍ جَدِيدٍ مِنَ العِلْم وَالمَوْعِظَة، غَيْرَ مَا اسْتَقَرَّ فِيها وَاسْتَحْوَذَ عَلَيْها).

واتە: مۆر بەسەر دڵەوە نران، وە دڵ مۆر کران، مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەو دڵە جارێکی دیکە هیچ زانیاریی‌و ئامۆژگارییەکی تازە وەرناگرێ، جگە لەوەی کە تێیدا جێگیر بووەو، جگە لەو قەناعەتانەی کە کۆنتڕۆڵیان کردوە، ئەو دڵە هیچی دیکە وەرناگرێ.

ئنجا ئایا بۆچی مۆریان بەسەر دڵەوە نراوەو، دڵیان داخراوە؟ بێگومان بەهۆی ئەو ڕەفتارو هەڵوێستانەی پێشوویانەوە، کە باسکران .

﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ سەرەنجام وایان لێهاتوە کە تێناگەن، یانی: بەهۆی ئەوەوە تێناگەن کە دڵو عەقڵیان مۆرکراوەو داخراوە، ئەو جۆرە تێگەیشتنە تێناگەن، کە مایەی پەند لێوەرگرتنیان بێ، ئەگەرنا وەختێك ئایەتەکانیان بۆ خوێنراوەتەوە، مانا ڕووکەش‌و ڕواڵەتەکەیان زانیوە، بەڵام ئەو تێگەیشتنە کە سوودیان پێ بگەیەنێ، وە پەندی لێ وەربگرن، وە حاڵیان بگۆڕێ، ئەو جۆرە تێگەیشتنەیان نابێ، واتە: تێگەیشتنێك وایان لێبکات‌و ئایەتەکان کاریان تێبکات.

یاخود ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾، (أَيْ: لايَفْهَمُونَ أَن الإِيمان وَالطَّاعَةَ وَالجِهاد سَبَبُ عِزِّ الدُّنيا وَفَوزِ الأُخْرَى).

واتە: نازانن کە ئیمان {بە خواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ}، وە فەرمانبەریی {بۆ خوا، وە لە نێو فەرمانبەریی بۆ خوادا}، جەنگ‌و جیهاد (لە کاتی خۆیدا) هۆکاری عیززەتمەندیی دنیایەو سەرفرازیی ڕۆژی دواییە، واتە: ئەو حەقیقەتە نازانن.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ ﴾.

خوای پەروەردگار لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا، دوای ئەوەی باسی هەڵوێستی دڵنەخۆش و دەغەڵ و مونافیقەکان دەکات، لە بەرانبەر جەنگ و جیهاددا، ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، وە ئەوانەی کە لە خزمەتی دابوون، واتە: بە ئیمان و ئیلتیزامەوە دەنا مونافیقەکانیش هەر لە خزمەتی دابوون، وەك شارنشینیی و هاووڵاتیی، بەڵام لە خزمەتی دانەبوون، وەك بڕواو قەناعەت پێ بوون و، شوێن کەوتن و فەرمانبەریی بۆ کردن:

دەفەرموێ: ﴿ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ﴾، بەڵام پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی کە لەگەڵیدان، ﴿ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴾، بە سامان و گیانیان تێکۆشاون لە ڕێی خواداو لە خزمەتیدا، ﴿ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، وە ئەوانە هەرچی خێرو چاکەو نیعمەت هەیە، لە دواڕۆژدا لە گرەوی ئەواندایە، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن.

ئنجا باسی سەرفرازییەکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، خوا چەند باغ و بێستانێکی بۆ ئامادەکردوون، کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾. ئا ئەوە بردنەوەو بەمراد گەیشتن و بە کامەرانیی گەیشتنی مەزنە.

ئێستاش با تەماشایەکی وردتری ئەم دوو ئایەتە موبارەکە بکەین، لە پێنج هەڵوەستەی خێرادا:

هەڵوەستەی یەکەم: کە دەفەرمویٚ: ﴿ لَـٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَـٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنیٚ، کە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، وە ئەوانەی کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوون، ئەوەیە کە بە سامان‌و گیانیان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، سەرو ماڵیان لەسەر دەست دابنێن لە پێناوی خوادا، ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ، ئیدی هەر کەسێك وانەبیٚ، نە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دایە، وە نە شوێن ڕێبازەکەشی کەوتوە، وە نە بە ئەهلی ئیمانیش لە قەڵەم دەدریٚ، کەواتە: هەر کەسێك تێنەکۆشیٚ بە سەرو ماڵی، هەر کەسێك گیان‌و سامانی فیدا نەکات، لە پێناوی خوادا، ئەوە بێگانەیە بە پێغەمبەر ﷺ وە لێی دوورە، وە لە خزمەت ئەویشدا نیە، یانی: لە خزمەتدا بوون‌و لەگەڵدا بوونی ڕاستەقینە، با بە ڕواڵەت‌و شوێنی جوگرافیی‌و وەك شارنشینیش، هەر لە هەمان شوێن‌و شاردا دابنیشیٚ، کە پێغەمبەری خوای ﷺ تێدایە !

هەڵوەستەی دووەم: ئنجا لێرەدا پێویستە ئەوەش بزانریٚ، کە چەمکی ئەم ئایەتە، تەنیا کورت هەڵنەهاتوە لەسەر هاوەڵانی بەڕێز، خوا لێیان ڕازیی بیٚ، چونکە: ﴿ لَـٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ﴾، بەڵام پێغەمبەر ﷺ‌و ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێناوە، ئەم تەعبیرە: ئێستاو پێش ئێستاو دوای ئێستاش، هەر کەسێك لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بیٚ، واتە: هەمان ئیمان‌و عەقیدەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵیگرتوە، کە ئەویش هەڵیگریٚ‌و، هەمان عیبادەت، هەمان ڕەوشت، هەمان شێوەی فەرمانبەریی، هەمان پابەندیی بە وەحیی خواوە، کە پێغەمبەر ﷺ بوویەتی، ئێستاش هەر کەس لە ئوممەتەکەی بیبیٚ، ئەوە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دایە.

وە هەرکەسێك ئێستاش سامان‌و گیانی لە پێناوی خوادا بەخت بکات‌و، فیداکاریی بکات، مانای وایە ئەو موژدەیە دەیگرێتەوە، بەڵام هەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ لە ڕووی کات (زمن)ەوە، وە لە شوێنێك کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا ژیاوە، لە ڕووی شوێن (مکان)ەوە، ئەوانەی کە لەوێدا بوون لە مەدینەدا بوون، وە لەوکاتەدا لە خزمەتیدا ژیاون، مادام لەسەر هەمان ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ

نەبوون، وە بە شێوەی پێغەمبەر فیداکارییان نەکردبێ، دیارە ئەوانە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوور بوون و، ئێستاش و دوای ئێستاش هەر وایە.

هەڵوەستەی سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡخَيۡرَٰتُ﴾، (الخيرات) کۆی (خَيْرة)یە.

(طبري) دەڵێ: (الخَيْرَة مِنْ كُلّ شَيء: الفَاضِلةُ، وَخَيْرَاتُ الآخِرَة: نِساؤُها وَجَناتُها وَنَعِيمُها، خَيْرَة وخَيِّرَة مِثْل: هَيْن وَهَيِّن)[1].

دەڵێ (خيرة) لە هەر شتێك یانی: هەرە باش، ئنجا چاکەکانی دواڕۆژ بریتین لە ئافرەتەکانی (واتە: حۆرییەکان) وە باغەکان، وە نازو نیعمەتەکەی، وە (خيرة) هەم دەگونجێت بە (خَيْرة) بگوترێ، بەبێ شەددە، وە بە (خَيِّرة)ش بگوترێ، وە وەك (هَيْن) وە (هَيِّن) دیارە هەردوو قیرائەتەکانیشی هاتوون.

هەروەها (مختار الصحاح)یش هەمان شتی دووبارە کردۆتەوە: دەڵێ: (الخَيْرَاتُ: جَمْعُ الخَيْرَة، وَهي الفَاضِلة مِنْ كُلّ شَيء)[2] هەر شتێك هەرە باشەکەی، پێی دەگوترێ (خيرة).

کەواتە: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡخَيۡرَٰتُ﴾، مادام (الخيرات) ئەلیف و لامی لەسەرە. واتە: هەرچی چاکەیە لە گرەوی ئەو جۆرە کەسانە دایە، هەرچی نازو نیعمەتە لە دواڕۆژدا لەسەر ئەوان تاپۆ دەکرێ، بۆ ئەوان قۆرخ دەکرێ.

هەڵوەستەی چوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، واتە: وە هەر ئەوانەشن سەرفراز.

دەڵێ: (الفَلاح: الفَوْزُ وَالبَقَاءُ وَالنَّجَاةُ، وَهُوَ اسْمٌ، والمَصْدَرُ: الإِفْلاحُ، وَفَلَحَ الأَرْضَ شَقَهَا وَالفَلاَّح: الأَكَّار)[3].

---

١) ص ١٨٢.
٢) جامع البيان ج١٠، ص٢٨١.
٣) مختار الصحاح، ص ٤٤٤.

وشەی (فلاح) واتە: بردنەوەو مانەوەو دەربازبوون، وە وشەی (فلاح) ناوەو، چاوگەکەی بریتیە لە (إفلاح) یانی: (أَفْلَحَ، يُفْلِحُ، إِفْلاَحاً) وە (فَلَحَ الأَرْضَ) واتە: ئەرزەکەی دڕی، شەقی کرد، وە (الفلاّح: الأَكّار) جوتیار، لەبەرئەوەی زەوی شەق دەکات.

هەڵوەستەی پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ ﴾، لێرەدا پرسیارێك دەكرێ: هەندێك لەوانەی کە لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای قورئان دەکەن، وە ئیددیعای ئەوە دەکەن، کە دەبێ ئێمە بە شێوەی تازە لە قورئان تێبگەین[1]، وە لە دەقەکانی شەریعەت تێبگەین، کە زۆربەی ئەوانە کارتێکراون بە هەندێ نووسەرو خەڵکی ڕۆژئاوایی، ئەوانەی زانیارییەکیان داهێناوە بە ناوی زانیاریی (تأویل) (هیرمینوطیقیا)، واتە: زانیاریی تێگەیشتن لە دەقەکان، و، ماناکردنو تەئویلکردنی دەقەکان، وە لە ژێر کاریگەریی ئەوەدا ئەوان ئەو زانیارییەیان داهێناوە، کە تەماشای کیتابی موقەددەسی خۆیانیان کردوە، بە هەردوو بەشی پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ (العهد القديم والعهد الجديد) کە (پەیمانی کۆن) تەوراتو کۆمەڵە کتێبێکی دیکەیە، وە (پەیمانی نوێ) کە چوار ئینجیلەکانو کۆمەڵە کتێبو نامەیەکی دیکەن، تەماشایان کردوە: زۆر شتیان تێدایە کە لەگەڵ عەقڵو مەنتیقو، لەگەڵ زانیارییو، لەگەڵ واقیعدا تێکدەگیرێ، بۆیە خۆیان ناچار بینیوە، زانیارییەك دابێنن، بۆ تێگەیشتنی ئەو دەقانە، یان ڕەخنە لێگرتن، یان پینەو پەڕۆ بۆ کردنیان، کە بێگومان وەحییان کەم تێدا ماوەتەوە.

ئنجا ئەوانە ئەو میتۆد (منهج)و شێوازەیان داهێناوە بۆ ئەوەی خەڵکی خۆیان لە هەڵەو ئەفسانەکانی کتێبەکانیان، دەرباز بکەن، کەچی هەندێك لە نووسەرانی مسوڵمان، بێئەوەی شارەزایی قووڵیان لە شەریعەتدا هەبێ، هەڵساون ئەو شێوازو میتۆدەی ئەوان دایانناوە، بۆ لێتێگەیشتنی کتێبی خۆیان، یەکسەر هێناویانە بەکاری دێنن بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، چونکە بەنسبەت سوننەتەوە، حاڵەتەکەی جیایە،

---

١) ئەو قسەیەش لە خودی خۆی دا ڕاستو هەقە، بەڵام ئەوان مەبەستی خراپو ناهەقیان پێی هەیە، (كلمة حق يراد بها الباطل).

قورئان ئێمە دڵنیایین هەمووی لە خواوە بە تەواوتور بە ئێمە گەیشتوە، بەڵام سوننەت دڵنیانین کە هەمووی کردەوەو فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ یان نا؟

دیارە زانایانی فەرموودەناس سوننەتیشیان پۆلێن کردوە، بۆ موتەواتیرو صەحیحو حەسەنو لاوازو هەڵبەستراو، بەڵام هەر چۆن بێ، سوننەت لە هەردووک بواری (روایة)و (درایة)دا، جێی قسە تێداکردنی هەیەو، بەردەوام زاناو پسپۆڕان مشتومڕیان لەبارەیەوە بووە.

ئنجا ئەوانە لێرەدا پرسیارێك دەورووژێنن، دەڵێن: لەبەرئەوەی کاتی خۆی قورئان لە نێو گەلی عەرەبدا هاتۆتە خوار، وە گەلی عەرەبیش بیابانشین بوون. وە لە رووی جوگرافییەوە لە شوێنێك بوون، زۆر حەزیان بە سەوزاییو رووبارو ئاوو باغو دارستان کردوە، بۆیە لە قورئاندا زۆر باسی بەهەشت کراوە، کە پاداشتی دوارۆژی ئیماندارانە، بە جۆرێك باسکراوە، کە ئەوانە بجوولێنێ: ئەگەر بێتو ئیمان بێنن، ژیانێکیان دەستدەکەوێ لە دوارۆژدا، پێچەوانەی ئەو ژیانەی ئێستایان بێ، باغو بێستانو، گوڵو گوڵزار بێ، میوەی زۆرو رووبارو کانیو سەرچاوەی زۆر. کۆشكو تەلارو ... هتد !!

بەڵام بە دڵنیایی ئەوە ڕاست نیە، بەڵکو هەموو مرۆڤێك بە سروشت حەز لە سەوزایی دەکات، حەز لە جۆگەو کانیو کانیاو سەرچاوەو میوەو دارو درەختو گوڵو گوڵزار دەکات، وە حەز بەو ناز نیعمەتانە دەکات، کە خوای بەخشەر باسی کردوون، واتە: ئەوانە: داخوازیی سروشتی قووڵو ڕۆچوون لە دڵی هەموو مرۆڤێکدا، وە تایبەت نین بە کەسێکەوە، کە لە بیابان دابێ.

بەڵێ: ڕەنگە بابایەکی بیابانشین، زیاتر دڵی بەو شتانە خۆشبێ، بەڵام هەر کەسێکی دیکەش هەروایە، لە ئەورووپا بێ، یان لە ئاسیا، لە چیاو چۆڵ بێ . یان لە بیابان، ئەدی بۆچی ڕۆژئاواییەکان وڵاتەکانی خۆیانیان پڕ کردوون لە دارو درەخت، پڕیان کردوون لە گوڵو گوڵزار؟!.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەڤدە ئایەتان پێك هاتوە، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٩٠ تا ١٠٦)، تەوەری سەرەکیی ئەو حەڤدە ئایەتە، هەڵوێستی ئەرێنیی و نەرێنیی چەند توێژێکی ئەوسای کۆمەڵگای ئیسلامییە، لە بەرانبەر چوون و نەچوونیاندا بۆ جەنگی تەبووك، بە تایبەت عەرەبە خێڵەکیی و بیابانشینەکان.

سەرەتا باسی عەرەبە خێڵەکییەکان دەکات، کە ڕاستگۆیانە هاتوونە لای پێغەمبەری خواو مۆڵەتیان لێوەرگرتوە، پاشان باسی ئەوانەیان دەکات کە درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا کردوە.

دوایی ڕوونی دەکاتەوە کە کەسانی بێهێزو نەخۆش و تەنگدەست، گلەییان لێناکرێ، هەروەها ئەوانەی هاتوون، داوای وڵاخی سوارییان کردوە، نەشبووە سوار بکرێن و، بە چاوی پڕ فرمێسکەوە گەڕانەوە!

ئنجا دێتە سەر باسی مۆڵەت وەرگرە دەستڕۆیشتووەکان، کە ڕازیبوون لەگەڵ ژن و منداڵ دا بمێننەوە.

وە باسی هەڵوێستی پاساوو بیانوو هێنانەوەیان دەکات و، ئامۆژگاریی پێغەمبەریش ﷺ دەکات کە پێیان بڵێ: بڕواتان پێ ناکەین و، خوا هەواڵی ڕاستەقینەی ئێوەی پێداوین.

پاشان دوو جاری دیکە باسی سوێند خواردنی بە درۆیان دەکات، بۆ خۆپەڕاندنەوەو ڕازیکردنی مسوڵمانان.

دوایی بە تایبەت باسی عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان دەکات، سەرەتا باسی خراپەکانیان دەکات، کە کوفرو نیفاقێکی بێرەزاو سەختیان هەیە، پاشانیش باسی کەسانێکی باشیان دەکات، کە ئەهلی ئیمانن و بەخشەرن لە پێناوی خوادا.

ئنجا ئاماژەیەکی کورت بە پێشکەوتووە یەکەمەکان دەکات، لە کۆچکەرو پشتیوانان و شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەیان.

پاشان باسی مونافیقەکانی نێو عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان و کەسانیکی دانیشتووی مەدینە دەکات، کە زۆر کارامەن لە نیفاق و دووڕوویی داو، بەس خوا دەیانناسێ.

ئنجا خوا باسی جۆرێکی دیکەیان دەکات، کە بریتین لە تۆبەکاران و دانپێداهێنەران بە گوناهەکانیاندا، کە ئەوانە چاکەو خراپەیان پێکەوە تێکەڵ کردوون، وە خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە ئەوانە زەکاتیان لێ وەربگرێ، یان چاکەو بەخشینێکی تایبەتیان لێ وەربگرێ، وەك کەفارەت.

وە پاشان باسی ئەوە دەکات، کە بەس خوا تۆبە قبووڵ دەکات و صەدەقە وەردەگرێ.

وە فەرمانیش بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە پێیان بڵێ: کردەوەی باش بکەن، خواو پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران دەیبینن.

وە لە کۆتایی دا باسی کەسانێك دەکات کە بڕیار لەبارەیانەوە نەدراوە، جارێ دواخراون، کە مەبەست (كعب بن مالك)و دوو هاوەڵەکەینی[1].

---

[1] واتە: (مرارة بن الربيع و هلال بن أمية) .

﴿ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ
سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى
ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ
مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ
أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ
ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ
وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا
يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ
لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ
تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾
سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ
رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ
لِتَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ ۖ فَإِن تَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا
وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾
وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ
وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ
وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَـٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ۚ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ

﴿٩٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ
رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ ۖ وَمِنْ
أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ
يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا
وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً
تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾
أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ
ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ
إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ
ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{وە پۆزش هێنەرەوان لە عەرەبە خێڵەکییەکان هاتن، کە مۆڵەت (ی نەچوونە جەنگ) یان بدرێ‌و، ئەوانەش کە درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا کرد، دانیشتن (نەهاتن مۆڵەت وەربگرن) بە زوویی ئازارێکی بە ئێش تووشی ئەوانەیان دەبێ کە بێبڕوان ﴿٩٠﴾ هیچ سەغڵەتییەك (ی گوناهباریی) نە لەسەر بێهێزەکان‌و نە لەسەر نەخۆشەکان‌و، نە لەسەر ئەوانەشە کە هیچ شك نابەن خەرجی بکەن، ئەگەر دڵسۆزیی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بنوێنن، چاکەکاران ڕێ (ی گلەیی) یان ناچێتە سەر، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە ﴿٩١﴾ هەروەها هیچ سەغڵەتیی (گوناهبار بوون)یش لەسەر ئەو کەسانە نیە، کە کاتێك هاتنە لات، سواریان بکەی (وڵاخیان بۆ دابین بکەی) تۆش گوتت: هیچ (باربەرێك) شك نابەم، ئێوەی سوار بکەم، بە چاوی پڕ فرمێسکەوە پشتیان هەڵکرد، لە خەفەتی ئەوەی کە (سامانێك) شك نابەن، خەرجی بکەن ﴿٩٢﴾ بەڵکو ڕێ (ی گلەیی) بەس دەچێتەوە سەر ئەوانەی، کە لە حاڵێکدا دەوڵەمەندیشن، مۆڵەتت لێ وەردەگرن (کە نەیەنە جەنگ) ئەوەیان پەسند کرد، کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێهێڵراو دابن، وە خوا دڵی مۆر کردوون، بۆیە نازانن ﴿٩٣﴾ هەر کات گەڕانەوە بۆ لایان، پۆزشتان بۆ دێننەوە، بڵێ: پۆزش مەهێننەوە، هەرگیز بە ڕاستتان دانانێین، بێگومان خوا لە هەواڵەکانی ئێوەی ئاگادار کردووینەوە، وە لەمەودوا خوا کردەوەکانتان دەبینێ، هەروەها پێغەمبەرەکەیشی، دوایی دەگێڕرێنەوە بۆ لای (خوای) زانای پەنهان‌و بینراو، ئنجا هەواڵی ئەوەتان دەداتێ، کە دەتانکرد ﴿٩٤﴾ لەمەودوا کە گەڕانەوە (لە جەنگی تەبووك) بۆ لایان (ئەی مسوڵمانینە!) سوێندتان بۆ دەخۆن، تاکو وازیان لێ بێنن، دەجا لێیانگەڕێن، بێگومان ئەو (مونافیق)انە پیسن، وە لە سزای ئەوەدا کە دەیانکرد، جێی حەوانەوەیان دۆزەخە، ﴿٩٥﴾ سوێندتان بۆ دەخۆن، تاکو لێیان ڕازی بن، ئنجا ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن، بەدڵنیایی خوا لە کۆمەڵی لادەران ڕازی نابێ ﴿٩٦﴾ عەرەبە خێڵەکییەکان لە بێبڕوایی‌و دەغەڵیی‌دا (لە خەڵکی دیکە) توندترن، وە شایستەترن کە سنوورەکانی ئەو (بەرنامەی)ە کە خوا دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەی، نەیزانن، وە خوا زانای کارزانە ﴿٩٧﴾ وە

کەسانێك لە عەرەبە خێڵەکییەکان هەن، کە ئەو (سامان)ەی (بۆ جەنگ و جیهاد) خەرجی دەکەن، بە تاڵانکران (و بە ناهەق سامان لێ ستێنران)ی دادەنێن، وە هەمیشە چاوەڕێی بەڵایانتان بۆ دەکەن، بەڵای خراپ بەسەر خۆیان بێ، وە خوا بیسەری زانایە ﴿٩٨﴾ وە کەسانێکی دیکە (جیاواز لەوانی پێشێ) لە عەرەبە خێڵەکییەکان هەن، کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیەو، ئەو (سامان)ەی خەرجی دەکەن بە هۆکارەکانی لە خوا وەنیزیك کەوتن و پاڕانەوەکانی پێغەمبەری دادەنێن، ئاگاداربن مایەی نیزیك کەوتنەوەیانە (لە خوا) لەمەودوا خوا دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە ﴿٩٩﴾ وە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانانو، ئەوانەی بە چاکیی شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازی یەو ئەوانیش لێی ڕازین، وە چەندان باغی بۆ ئامادە کردوون، کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بۆ هەتا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، ئا ئەوە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزنە ﴿١٠٠﴾ وە لە عەرەبە خێڵەکییەکانی دەوروبەرتان، کەسانی مونافیق هەن، وە لە خەڵکی مەدینەش کەسانێك هەن، کە مەشقیان لەسەر دەغەڵیی کردوە، تۆ نایانزانی، ئێمە دەیانزانین، لەمەودوا دووجار سزایان دەدەین، پاشانیش بۆ ئازارو سزایەکی مەزن دەگێڕرێنەوە ﴿١٠١﴾ وە کەسانێکی دیکە هەن (لە عەرەبە خێڵەکییەکان) دانیان بە گوناهەکانیاندا ناوە، کردەوەیەکی چاك و یەکی دیکەی خراپیان تێکەڵ کردوون، ڕەنگە خوا بگەڕێتەوە سەریان (تۆبەیان لێوەربگرێ) بەدڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە ﴿١٠٢﴾ لە سامانەکانیان صەدەقە (ماڵ بەخشین)ێك وەربگرە، کە بەهۆیەوە پاکیان بکەیەوەو چاکیان بکەی (گەشەیان پێبدەی)، وە بۆیان بپاڕێوە، بە دڵنیایی، پاڕانەوەی تۆ مایەی ئارامییە بۆیان، وە خوا بیسەری زانایە ﴿١٠٣﴾ ئایا نازانن کە بەس خوا تۆبە لە بەندەکانی وەردەگرێ و، هەر ئەو ماڵ بەخشینەکان وەردەگرێ، (ئایا نازانن) کە بەس خوا زۆر تۆبە وەرگری بە بەزەییە؟ ﴿١٠٤﴾ وە پێیان بڵێ: کردەوە (ی باش) بکەن، لەمەودوا خواو پێغەمبەرەکەی و بڕواداران، کردەوەکانتان دەبینن، وە پاشان دەگێڕرێنەوە بۆ لای (خوای) زانای پەنهان و ئاشکرا، ئنجا لەبارەی ئەوەوە کە دەتانکرد، هەواڵتان پێدەدات، ﴿١٠٥﴾ وە کەسانێکی دیکە بۆ بڕیارو فەرمانی خوا (لەبارەوە درانیان) دواخراون، ئنجا یان سزایان دەدات، وە یان دەگەڕێتەوە سەریان (تۆبەیان لێوەردەگرێ) وە خوا زانای کارزانە ﴿١٠٦﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلۡمُعَذِّرُونَ ): (أي المُعْتَذِرُونَ الّذِينَ لَهُمْ عُذْرٌ حَقِيقِي، وَقُرِيءَ: المُعْذِرُون: الّذِي لَهُ عُذْرٌ لَكِن قَدْ يَكُونُ المُعَذِّرُ، عَلَى جِهة المُفَعِّلِ، مثل: المُمَرِّضُ وَالمُقَصِّرُ، أي الّذي يَعْتَذِرُ بغَيْرِ عُذْرٍ).

وشەی (مُعَذِّرُون) دوو واتای هەن:

یەكەم: (المُعْتَذِرُونَ) ئەوانەی كە پۆزشیان هێناوەتەوە، پۆزش هێنەرەوان، داوای لێبوردنكەران، ئەوانەی كە بەڵگەیەكی ڕاستەقینەیان هەبووە.

دووەم: هەروەها خوێنراویشەتەوە (المُعْذِرُون) ئەویش هەر بە مانای كەسێكە كە پاساوی هەیە، وە دەشگونجێ(مُعَذِّر) لەسەر كێشی (مُفَعِّل)، وەك (مُمَرِّضُ) و (مُقَصِّرُ) واتە: كەسێك كە خۆی نەخۆش دەكات، یان كەمتەرخەمیی دەكات، واتە: كەسێك كە پاساو دێنێتەوە، بێئەوەی كە پاساوی هەبێ، كەواتە: (مُعَذِّر) هەردوو واتاكەی هەن، یانی: عوزر هێنەرەوەی ڕاستگۆ، یان هی درۆزن.

(ٱلۡأَعۡرَابِ ): (جَمْعُ العَرَبِ فِي الأَصْلِ، وَصَارَ اسْمَاً لِسُكّانِ البَادِيةِ).

وشەی (أَعْرَاب) لە ڕیشەدا كۆی (عَرَب)ە، بەڵام ئێستا بە عەرەبان ناگوترێ: (أَعْرَاب)، هەر دەگوترێ: عەرەب، وە وشەی (أَعْرَاب) كراوە بە ناو بۆ ئەو كەسانەی كە بیابانەنشینن، بە تاكەكەشی دەگوترێ: (أَعْرَابِيّ)، وەك چۆن عەرەب واتە: كۆی عەرەبەكان، بە تاكیشی دەگوترێ: (عَرَبِيّ).

(كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ): (لَمْ يَصْدُقُوا مَعَهُمَا).

واتە: لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ڕاستیان نەكردوە، درۆیان كردوە لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ، دیارە (كَذَبُوا) جیایە لە (كَذَّبُوا)، (كَذَبُوا) واتە: درۆیان كردوە، بەڵام (كَذَّبُوا) واتە: بە درۆیان زانیوە.

(حَرَجٌ ): (أَصْلُ الحَرَجِ وَالحِرَاجِ، مُجْتَمَعُ الشَّيْئَيْنِ، وَتُصُوِّرَ مِنْهُ ضِيقُ مَا بَيْنَهُمَا، فَقِيلَ للضِّيق، حَرَج، وَلِلإِثْمِ: حَرَج).

وشەی (حَرَج)و(حِرَاج) لە ڕیشەدا بە دوو شت دەگوترێ کە پێکەوە کۆدەکرێنەوە، ئنجا لەوەوە ئەوە وێنا کراوەو فامراوەتەوە، کە دوو شت دەگەنە یەك تەنگەبەرییان لە نێواندا دەبێ، بۆیە بە شتی تەنگ گوتراوە: (حَرَج)، وە بە گوناهیش گوتراوە (حَرَج) لەبەرئەوەی ئینسان تووشی سەغڵەتیی‌و تەنگەتاویی دەکات.

(نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ): واتە: دڵسۆزییان بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا نواندوە، (النُّصْحُ: تَحَرِّي فِعْلٍ أَوْ قَوْلٍ فِيهِ صَلَاحُ صَاحِبِهِ، وَنَصَحْتُ لَهُ الودَّ: أَخْلَصْتُهُ، وَنَاصِحُ العَسَلِ خَالِصُهُ).

(نُصْح) بریتیە لەوە کە تۆ هەر قسەیەك، هەر کردەوەیەك کە ئەو کەسەی قسەکە، یان کردەوەکەی ئاڕاستە دەکەی، بۆ ئەو چۆن چاکە، ئاوا بکەی، وە دەگوترێ: (وَنَصَحْتُ لَهُ الوُدَّ) واتە: خۆشەویستییەکی ساغم بۆی هەیە، وە دەگوترێ: (نَاصِحُ العَسَلِ) واتە: هەنگوینێکی پاڵفتەی بێ کەڕەشان‌و بێ مێش.

(لِتَحۡمِلَهُمۡ ): واتە: بۆ ئەوەی وڵاخیان بۆ ئامادە بکەی، تا سواری بن، (حَمَلْتُ حَمْلاً ،حَمَلَهُ يَحْمِلُهُ، وَحَمَلَهُ عَلَيْهِ...).

(حَمَلْتُ حَمْلاً) واتە: بارەکەم هەڵگرت، (حَمَلَهُ يَحْمِلُهُ) واتە: هەڵیگرت، هەڵیدەگرێ، وە (حَمَلَهُ عَلَيْهِ) سواری کرد، یاخود بارەکەی خستە سەر، کە لێرەدا (لِتَحْمِلَهُمْ عَلَيْهِ) واتە: بۆ ئەوەی سواری وڵاخیان بکەی.

(تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ): واتە: چاویان پڕ دەبێ لە فرمێسك، (فَاضَ المَاءُ: إِذَا سَالَ مُنْصَبًّا)، ئاوەکە ڕژا بە هەڵڕژان.

(وَأَفَاضَ إِنَاءَهُ: مَلأَهُ حَتَّى أَسَالَهُ، وَأَفَضْتُه أَسَالتُه)، کە دەگوترێ: (أَفَاضَ إِنَاءَهُ) واتە: دەفرەکەی خۆی پڕ کرد، یانی: پڕی کرد تاکو لێی ڕژا، وە ڕژاندم.

(إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ): (سَبيل اللَّوم: طَرِيق العِتَاب).

وشەی (سبیل) بە مانای ڕێباز دێ، بە مانای ڕێگا دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای ڕێی گلەیی، بەکارهێنراوە، کە دەفەرموێ: (إِنَّما السبیل) واتە: ڕێگای گلەییو سەرزەنشت، تەنیا ڕووی لەو جۆرە کەسانەیە، کە بە ناهەق پۆزش دێننەوەو، بە ناهەق داوای مۆڵەت دەکەن.

(إِنَّهُمْ رِجْسٌ): (الرِّجْسُ: الشيءُ القَذِر، رَجلٌ رِجْسٌ، ورِجَالٌ أرجاسٌ).

(رجس) واتە: شتێکی پیس، (رَجلٌ رِجْسٌ، ورِجَالٌ أَرْجَاسٌ) واتە: پیاوێکی پیس، وە پیاوانێکی پیس، دیارە (رجس) واتە: پیسی، کە لێرەدا ئەوە زێدەڕۆیی کردنە لە کەسێکدا کە پیسی تێدایە، کە مەبەست پێی پیسی مەعنەوییە.

(وَأَجْدَرُ): واتە: شایستەترن، (الجَدِيرُ: المُنْتَهَى لانْتِهاءِ الأَمْرِ إِلَيْهِ انْتِهاء الشيء إلى الجِدَارِ).

(جَدیر) بریتیە لەوە کە کۆتایی شتێك لەلای ئەو بێ، وەك چۆن شتێك دەگاتە بن دیوارەکەی، یانی: کۆتایی دێ، دەگوترێ: (جَدُرَ بكَذَا، وَمَا أَجْدَرَهُ بكَذَا، وَأَجْدِرْ بهِ)، شایستەی ئەوەیە، زۆر شایستەی ئەوەیە، هەمووی بە مانای شایستەی ئەوەیە.

(مَغْرَمًا): (الغُرْمُ: مَا يَنوبُ الإِنْسانَ فِي مَالِهِ مِنْ ضَرَرٍ لغَيْرِ جنايةٍ مِنْهُ أَوْ خِيانَةٍ مِنْهُ).

(غُرم) بریتیە لە زیانێکی ماڵیی کە بە مرۆڤ دەکەوێ، بێئەوەی تاوانێکی کردبێ، یان ناپاکییەکی کردبێ، دەگوترێ: (غُرِمَ غُرْمًا وَمَغْرَمًا) واتە: زیانی لێکەوت، یان تاڵان کرا، وە (أُغْرِمَ غَرَامَةً) واتە: پێیان بژارد، {لە کوردیی دا (تاوان)ی پێ دەڵێن}، واتە: تاوانیان لێ وەرگرت، لە بەرانبەر ئەوەدا، جا جاری وایە تاوانێکی کردوە، جاری واش هەیە بە ناهەق لێی وەردەگیرێ، ئەو کاتە پێی دەگوترێ: (مَغْرَم).

(الدَّوَآئِرَ): (الدَّوْرَةُ وَالدَّائِرَةُ فِي المَكروهِ).

وشەی (دورة) و (دائرة) بۆ بەڵاو گرفتاریی بەکاردەهێنرێ، (دوائر) کۆیەکەیەتی.

(دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ ): (أي يُحِيطُ بِهِمُ السوءُ إحاطةَ الدَّائِرَةِ بِمَنْ فِيها، فَلاَ سَبيلَ لَهُمْ إلى الإِنْفِكاكِ مِنْهُ بِوَجْهٍ).

واتە: بەڵاو ناخۆشیی‌و خراپە، وا دەورەیان دەدا، وەك چۆن بازنەیەك دەورەی ئەو شتە دەدات، كە لە نێو بازنەكە دایە، وە هیچ ڕێگای دەرچوونیان نیە لە بازنەی ئەو خراپەیە.

(قُرُبَٰتٍ ): (جَمْعُ قُرْبَة، تَقَرَّبَ إِلى اللهِ بِشَيءٍ: طَلَبَ بِهِ القُرْبَةَ عِنْدَهُ).

واتە: (قُرُبَات) كۆی (قُرْبَة)یە، واتە: نیزیكی، دەگوترێ: (تَقَرَّبَ إِلى اللهِ بِشَيءٍ)، واتە: لە خواوە نیزیك كەوت بەهۆی شتێكەوە، یانی: نیزیكی لای خوای خواست.

(وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ) واتە: پاڕانەوەكانی پێغەمبەر ﷺ(الصَّلاَةُ: الدُّعَاءُ، وَالصَلاَةُ مِنَ اللهِ تَعَالَى الرَّحْمَة)، وە دوعا كە لەلای خوای بێ وێنەوە بێ یانی: خودی ڕەحمەت نواندنەكە، بەڵام ئەگەر پێغەمبەر ﷺ صەڵاتمان لێ بدات، واتە: داوای ڕەحمەتمان بۆ لە خوا دەكات، بەڵام ئەگەر خوا صەڵاتمان لێ بدات، واتە: خوا ڕەحمەمان پێ بكات، چونكە خوا داوای ڕەحم لە كێ بكات؟! خۆی خاوەنی هەموو شتێكە.

(وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ ): پێشكەوتووە یەكەمەكان، دەگوترێ: (سابَقَهُ فَسَبَقَهُ، من باب ضرب).

واتە: پێشبڕكەی لەگەڵدا كردو پێشیكەوتەوە، واتە: (سابق) واتە: پێشكەوتوو، (الأولون) واتە: یەكەمەكان.

(ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ): (الهِجْرَةُ وَالمُهاجَرَةُ مِنْ أَرْضٍ إِلى أَرْض: تَرْكُ الأُوْلَى للثانية).

(هِجْرَة) و (مُهاجَرَة) ئەوەیە كە لە زەوییەكەوە بۆ زەوییەكی دی بچێ، واز لە زەوی یەكەمیان بێنێ، بەرەو هی دووەمیان بچێ، واتە: هی دووەمیان بەسەر یەكەمیان دا هەڵبژێرێ.

(وَٱلۡأَنصَارِ): (جَمْعُ نَصِير، نَصَرَهُ عَلَى عَدُوِّهِ، والإسمُ: النُّصورَة، جَمْعُ ناصر: نَصْر، مِثْلُ صاحِب، وَصَحْب).

واتە: نیزیکە ئەگەر تەڵاقتان بدات، پەروەردگاری هاوسەرانی چاکتر لە ئێوەی بە نسیب بکات.

{چونکە ئەگەر واجیبوونی گەیاندبایە، دەبوو پێغەمبەر ﷺ هاوسەرەکانی تەڵاق دابایە، ئەوانەی کە دڵی پێغەمبەریان هێشاندبوو، کە لە سوورەتی (التحریم)دا بەسەرهاتەکەیان باسکراوە} .

(يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ ): (تابَ اللهُ عَلَيْهِ: وَفَّقَهُ لها).

وشەی (تابَ) واتە: گەڕایەوە (رَجَعَ)، (تابَ إلى الله) واتە: گەڕایەوە لای خوا، بەڵام (تابَ اللهُ عَلَيْهِ) واتە: خوا گەڕانەوەکەی لێوەرگرت، یاخود یارمەتیدا کە بگەڕێتەوە، یاخود خوا گەڕایەوە سەری بە ڕەحمەتی خۆی، هەموویان دەگەیەنێ.

(صَدَقَةً ): (الصَّدَقَةُ: مَا تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى الفُقَرَاء، مَا يُخْرِجُهُ الإنْسانُ مِنْ مَالِهِ عَلَى وَجْه القُرْبَةِ كالزَّكاة).

(صدقة)یان بە دوو شێوە مانا کردوە:

١- هەر ماڵێکە کە تۆ دەیدەی بە هەژاران.

٢- یاخود هەر ماڵێکە کە تۆ بە شێوەی لە خوا نیزیک بوونەوە دەیبەخشی.

واتە: بە کەسانی شایستەی خۆی، وەك زەکات.

(تُطَهِّرُهُمۡ ): (تُنَزِّهُهُمْ) واتە: بەو ماڵە کە لێیان وەردەگری، پاکیان دەکەیەوە، لە چی پاکیان دەکاتەوە؟ لە سیفەتی چرووکییو، لەو گوناهو هەڵانەی لە ڕابردوودا کردوویانن .

(وَتُزَكِّيهِم بِهَا ): واتە: چاکیان دەکەی پێی، مادام (تُطَهِّرُهُم) لەگەڵ (تُزَكِّيهم)دا هاتوە، دەنا وشەی (تزکیة) مانای پاك بوونو چاك بوون دەگەیەنێ، بەڵام مادام هەردووکیان لە یەك سیاقدا هاتوون، (تُطَهِّرُهُم) واتە: پاکیان دەکاتەوە لە سیفەتی خراپ، وە (تُزَكِّيهم) واتە: چاکیان دەکەیو دەیانڕازێنیەوە، بە سیفەتی چاك.

واتە: (تُطَهِّرُهُم) بژارکران (تخلیة) لە سیفەتی خراپ دەگەیەنێ، وە (تُزَكِّيهِم) ڕازاندنەوە (تحلیة) بە سیفەتی جوان دەگەیەنێ.

(وَصَلِّ عَلَيْهِمْ): (ادْعُ لَهُمْ) واتە: دووعایان بۆ بکەو بۆیان لە خوا بپاڕێوە.

(سَكَنٌ لَّهُمْ): واتە: دەبێتە مایەی ئارامییو دڵ ئۆخژنیان، (السَّكِينَةُ: الوَدَاعُ وَالوِقَارُ، السَّكَنُ مَا سَكَنْتَ إِلَيْهِ، وَسَكَنَ: هَدَأَ، واستَأْنَسَ بِهِ وَاسْتَرَاحَ إِلَيْهِ).

وشەی (سَكِينَة) بە مانای ئارامییو هێمنیی دێ، وە (سَكَن) هەر شتێکە کە پێی ئاسوودەبیو، مەیلی بەلادا بکەی، ئارامییت پێی بێ.

(مُرْجَوْنَ): (مُؤَخَّرُون) خوێنراویشەتەوە: (مُرْجَؤُون) (أَرجَأَ) واتە: (أخَّر) یانی: دوای خست، کەواتە: (مرجون) واتە: دواخراونو، جارێ بڕیاریان لەبارەوە نەدراوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ : ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ ... ﴿٩٢﴾﴾.

لەوبارەوە ئەم گێڕراوەیە هاتوە:

﴿عَن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَمْرٍو السُّلَمِيُّ وَحُجْرِ بْنُ حُجْرٍ قَالا: أَتَيْنَا الْعِرْبَاضَ بْنَ سارِيةَ، وَهُوَ مِمَّنْ نَزَلَ فِيهِ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾﴾، فَسَلَّمْنَا وَقُلْنَا: أَتَيْنَاكَ زَائِرِينَ وَعَائِدِينَ وَمُقْتَبِسِينَ، فَقَالَ عِرْبَاضٌ: صَلَّى بِنا رَسولُ اللهِ ﷺ الصُّبْحَ ذَاتَ يَومٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنا، فَوَعَظَنا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، ذَرَفَتْ مِنْها الْعُيُونُ وَوَجِلَتْ مِنْها الْقُلُوبُ، فَقَالَ قَائِلٌ: يا رَسولَ اللهِ! كَانَ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنا؟ فَقَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَة، وَإِنْ كَانَ عَبْدًا حَبَشِيًا، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلافًا كَثِيرًا فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، فَتَمَسَّكُوا بِها وَعَضوا عَلَيْها بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَة بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَة﴾. {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، بِرقم: (١٧١٨٤)، وَأَبُو دَاوُدَ، بِرقم: (٤٦٠٧)، وَالتِّرمِذِيُّ، بِرقم: (٢٦٧٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ، بِرقم: (٤٢)، وَالحَاكِمُ، بِرقم: (٣٢٩)، وَقَالَ: صَحِيحٌ لَيْسَ لَهُ عِلة، وَالبَيْهَقِيُّ، بِرقم: (٢٠١٢٥)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضًا: ابْنُ حِبَّانَ، بِرقم: (٥)، وَالدَّارِمِيُّ، بِرقم: (٩٥)، وَقَالاَ فِي الإِسْتِيعَاب ج٢، ص٣٢١ قُلْنَا: وَهَذَا إِسْنَاد صَحِيح رِجَالُهُ ثِقَاتٌ، وَصَحَّحَهُ كُلّ مِنْ ابْنُ حَجَر وَالأَلْبَانِي فِي (الصحيحة). بِرقم: (٩٣٧)}.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەمرِی سولەمیی‌و حوجری کوڕی حوجر هەردووکیان دەڵێن: چووینە لای عیرباضی کوڕی ساریە، کە لەو کەسانە بوو ئەم ئایەتەی دەربارە هاتە خوار: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ قُلۡتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَيۡهِ تَوَلَّواْ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾﴾، سڵاومان لێکردو پێمان گوت: هاتووین هەم سەردانت بکەین‌و، هەم هەواڵت بپرسین کە نەخۆشیی‌و، هەم سوودو زانیارییت لێوەربگیرن، عیرباضیش گوتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین، دوایی سڵاوی نوێژەکەی دایەوەو ڕووی تێکردین‌و ئامۆژگارییەکی زۆر کاریگەری کردین، کە چاوەکان فرمێسکیان لێهات، وە دڵەکان لەرزین‌و ڕاچڵەکین، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئەم ئامۆژگارییەت وەك ئامۆژگاریی کەسێکە، کە ماڵئاواییمان لێ بکات، یان ماڵئاوایی لە کەسێك بکات، کۆتا وەصیەتو ئامۆژگارییمان بە چی دەکەی؟ بە چی ڕامان دەسپێری؟

ئەویش فەرمووی: ئامۆژگارییتان دەکەم، بە پارێزکردن لە خوا، وە بیستن‌و فەرمانبەریی بۆ (بەرپرسانی خۆتان) ئەگەر ئەو بەرپرسە کۆیلەیەکی حەبەشەییش بێ، چونکە هەر کەسێك لە ئێوە دوای من، ژیانی بەردەوام بێ، جیاوازیی زۆر دەبینێ، ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی زۆر دەبینێ، بەڵام ئێوە ڕێبازی من بگرن، وە ڕێبازی جێنشینە ڕێنماییکراوە سەرڕاستەکان بگرن، دەستی پێوە بگرن، وە ددانانی لەسەر ڕۆگرن، (واتە: ئەگەر بە دەستیش بۆتان نەگیرا، بە ددانان بیگرن‌و هەر بەری مەدەن)، وە خۆتان لە شتە پەیداکراوەکان دوور بگرن، چونکە هەموو پەیداکراوێك داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، دەفەرموێ: ﴿سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾﴾.

لەوبارەوە ئەم گێڕراوەیە هاتوە:

﴿عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ تَبُوكَ، وَاللهِ مَا أَنْعَمَ اللهُ عَلَيَّ مِنْ نِعْمَةٍ بَعْدَ إِذْ هَدَانِي، أَعْظَمَ مِنْ صِدْقِي رَسولَ اللهِ ﷺ، أَنْ لَا أَكُونَ كَذَبْتُهُ فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا حِينَ أُنْزِلَ الْوَحْيُ: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ ... ﴿٩٥﴾ ﴾﴾، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٦٧٣)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەڵێ: گوێم لە کەعبی کوڕی مالیك بوو (واتە: گوێی لە بابی بوو) کاتێك کە لە جەنگی تەبووك دواکەوت، بێئەوەی پاساوێکی ڕاستەقینەی بەدەستەوە بێ، گوتی: سوێند بە خوا لە دوای ئەوەی خوا هیدایەتی داوم و ڕێنمایی کردووم و خستوومیەتە سەر ڕێی ئیسلام، هیچ چاکەیەکی لەگەڵدا نەکردووم، لەلام مەزنتر بێ، لەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕاستم کرد. وە درۆم لەگەڵ نەکرد، تاکو منیش بفەوتێم لەگەڵ ئەوانەدا کە فەوتان، بەهۆی ئەوەوە کە درۆیان کرد لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، کاتێك وەحی لەبارەیانەوە هاتە خوارێ و فەرمووی: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾.

یانی: کە گەڕانەوە بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن بە درۆ، بۆئەوەی ڕوویان لێوەرگێڕن و پشتیان تێبکەن، ئێوەش ئیهمالیان بکەن و پشت گوێیان بخەن، {چونکە سوێندەکەیان بە درۆیە}، ئەوانە پیسن وە جێی حەوانەوەیان دۆزخە، بەهۆی کردەوەکانیانەوە.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾.

لەوبارەوە ئەم گێڕراوەیە هاتوە:

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ... ﴾، قَالَ كَانُوا عَشْرَةَ رَهْطٍ، تَخَلَّفُوا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَلَمَّا حَضَرَ رُجُوعُ النَّبِيِّ ﷺ، أَوْثَقَ سَبْعَةٌ مِنْهُمْ أَنْفُسَهُم بسواري الْمَسْجِدِ، فَكَانَ مَمَرُّ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا رَجَعَ فِي الْمَسْجِدِ عَلَيْهِم، لَمَّا

رَآهُمْ قَالَ: (مَنْ هَؤُلاَءِ الموثِقُونَ أَنْفُسَهُمْ بِالسوارِي؟ قَالُوا: هَذَا أَبُو لُبَابَةَ وَأَصْحَابٌ لَهُ، تَخَلَّفُوا عَنْكَ، يَا رَسُولَ اللهِ، حَتَّى تُطْلِقَهُمْ، وَتُعْذِرَهُمْ، فَقَالَ النَّبِيَّ ﷺ: وَأَنَا أُقْسِمُ بِاللهِ لا أُطْلِقُهُم وَلاَ أَعْذِرُهُمْ، حَتَّى يَكُونَ اللهُ هُوَ الَّذي يُطْلِقُهُمْ، رَغِبُوا عَنِّي وَتَخَلَّفُوا عَنِ الغَزْوِ مَعَ المُسْلِمِينَ! فَلَما بَلَغَهُمْ ذَلِكَ قَالُوا: وَنَحْنُ لاَ نُطْلِقُ أَنْفُسَنَا حَتَّى يَكُونَ اللهُ الَّذِي يُطْلِقُنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾، و(عَسَى) مِنَ اللهِ وَاجِبٌ" أنه هو التواب الرحيم، فَلَما نَزَلَتْ، أَرْسَلَ إِلَيْهِم النَّبِيُّ ﷺ فَأَطْلَقَهُمْ وَعَذَرَهُمْ، فَجَاؤا بأموالهم فقالوا: يَا رَسُولَ اللهِ! هَذِهِ أَمْوَالُنا فَتَصَدَّقْ بِهَا عَنَّا وَاسْتَغْفِرْ لَنا، قَالَ: مَا أُمِرْتُ أَنْ آخِذَ أَمْوَالَكُم، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾، فَأَخَذَ مِنْهُمْ الصَّدَقَة، وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرِي، ج١١، ص١٠، وَابْنُ أَبِي حاتم فِي تَفْسيره، برقم: (١٨٧٥)، وَالبَيْهَقِي فِي دلائل النبوة، ج ٥، ص٢٧١ و ٢٧٢، قالا مؤلفا الإستيعاب ج٢، ص٣٢٥: قلنا وهذا إسنادٌ حسن، رجال صدوقون}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾، گوتوویەتی: ئەوانە (١٠) کەس بوون لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبووك دواکەوتن، ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە، حەوت لەو دە (١٠)کەسانە خۆیان بە کۆڵەگەکانی مزگەوتەوە بەستەوە، کە ئەو کۆڵەگانەی مزگەوتیش شوێنی پێدا ڕەتبوونی پێغەمبەر ﷺ بوون، کاتێك لە مزگەوت دەگەڕایەوە بە لایاندا تێپەڕی، بینینی، فەرمووی: ئەوانە کێن، کە خۆیان بە کۆڵەگەکانی مزگەوتەوە بەستۆتەوە؟ گوتیان: ئەوە ئەبو لوبابەو هەندێك لە هاوەڵەکانی، کە لە تۆ بەجێماون، ئەی پێغەمبەری خوا! خۆیان

بەستۆتەوە، تاوەکو بەدەستی خۆت بەریانبدەی، وە لێیان ببووری، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: منیش سوێند بە خوا دەخۆم، بەریان نادەم، وە پاساویشیان قبوول ناکەم، تاکو خوای بەرز بەریان نەدات (واتە: فەرمان دەکات بەریان بدەن) چونکە ئەوانە ئامادە نەبوون لەگەڵ من بێن، وە لە جەنگ لەگەڵ مسوڵمانان لە دژی ئەهلی کوفر، بەجێمان، کاتێك ئەوەیان پێگەیشت ئەوانیش گوتیان: ئێمەش سوێند بە خوا دەخۆین، تاکو خوای بەرز بەرمان نەدات، خۆمان ناکەینەوە، ئیدی لەوبارەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾، وە وشەی (عسی) {یانی: ڕەنگە، لەوانەیە، نیزیکە} بەڵام ئەگەر خوا ئەو وشەیەی بەکاربێنێ. یانی: لەسەر خۆی پێویستی دەکات، وە بێگومان هەر خوا تۆبە وەرگری بە بەزەییە.

ئنجا کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا وە بەریاندان، وە پاساوەکەشیانی قبوول کرد.

ئەوانیش چوون ماڵو سامانەکانی خۆیان هێنا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئەوە ماڵو سامانەکەمانە، تۆ بیکە بە خێر، بیدە بە خەڵك وەك کەفارەت. وە داوای لێبوردنیشمان بۆ لە خوا بکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: من فەرمانم پێ نەکراوە کە ماڵو سامانەکانتان لێوەربگرم، بەڵام دوایی خوا ﷻ ئەو ئایەتەی دیکەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾.

واتە: لە ماڵو سامانەکانیان صەدەقەیەك وەربگرە، پاکیان بکەوەو بیانڕازێنەوە بەو هۆیەوە، وە دوعاشیان بۆ بکە، بێگومان دوعای تۆ مایەی ئارامییە بۆ ئەوان. {واتە: داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکە}، ئیدی پێغەمبەر ﷺ صەدەقەو هاوکارییەکی بۆ مسوڵمانان لێوەرگرتن، وە داوای لێبوردنیشی بۆ لە خوا کردن. {واتە: فەرمانی خوای پەروەردگاری لەبارەی ئەوانەوە، جێبەجێ کرد}.

# مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە پێشتر گوتمان: تەوەری سەرەکیی ئەو (١٧) ئایەتە بریتییە لە دیاریکردنی هەڵوێستی ئەرێنیی، یان نەرێنیی، هەندێ لە توێژەکانی ئەوسای کۆمەڵگای ئیسلامیی، لە بەرانبەر چوونو نەچوونیاندا، بۆ جەنگی تەبووك، کە دیارە جەنگی تەبووك هەرچەندە کوشتاری تێدا ڕوونەداوە، بەڵام ناوی لێنراوە (غزوة)، جەنگ، لەبەرئەوەی کە زۆر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی گەورەو گرنگ بووە، یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی بووە، لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆمی نەصرانییدا ئەویش دوای ئەوەی کە جموجۆڵیان هەبووە، وە بەتەمابوون هێرش بێنن بۆ سەر مەدینە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە جیاتی ئەوەی چاوەڕێ بکات، کەی ڕۆم بە سوپاو هێزێکی زۆرەوە هێرش دێنێو، بکەوێتە حاڵەتی بەرگریی لەخۆکردن، بڕیاری هێرشکردنی داوە چونکە گوتراوە: (الهجوم أحسن وسيلة للدفاع) زۆرجار هێرش بردن باشترین شێوازی بەرگریی لەخۆکردنە، ئنجا جەنگی تەبووكو چوونو نەچوون بۆیو، خۆ ئامادەکردنو خۆ ئامادەنەکردنو، هەڵوێست لە بەرانبەریدا، بۆتە بێژینگێکی زۆر چاك، بۆ لێك جیاکردنەوەی دەغڵی ساغو، سەرکۆتەڵو سەر کوێزرێ، کە لە کۆمەڵگای ئیسلامیی ئەو کاتەدا هەبووە، واتە: مسوڵمانانی ڕاستو فیداکار، وە کەسانێك کە هەر خۆیان لەبن پەردەی ئیسلامدا شاردۆتەوە، لەبەر بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان، بێژینگێکی باش بووە بۆیان، چاك لە مەحەك دراون.

ئنجا لەم چەند ئایەتەدا، خوا باسی کۆمەڵێك هەڵوێستی هەندێك لەو توێژانەی کۆمەڵگای ئیسلامیی ئەوسا دەکات.

سەرەتا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٩٠ ﴾.

واتە: ئەوانەی کە پۆزشیان هێنایەوە لە عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان، هاتن بۆئەوەی مۆڵەت بدرێن، دیارە ئەمە کاتێك بووە بەرلەوەی کە پێغەمبەر ﷺ و سوپایەکەی بەرێ بکەون بەرەو رۆم، ئەوانە هاتوون بەڵگەو پاساو بێننەوە کە بۆیان ناکرێ، بچن بۆ جەنگ، بە پێی سیاقی ئایەتەکەش وا دەردەکەوێ ئەوانە راستگۆ بووبن، چونکە خوا بەراوردی پێ کردوون لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە درۆیان کردود. کەواتە: ئەوانە راستیان کردوە، لە مەسەلە گرنگەکانیش دا زیاتر تیشك دەخەینە سەر چەمكو واتای ئەم وشەیە: (المعذِّرون)، کە ئەگەر بەو واتایە لێکی بدەینەود راستگۆ بوون (المعذِّرون) لە ئەسڵدا (المعتذرون) بووە، (ت) لە (ع)دا دەغم کراوەو دوایی حەرەکەکەی گواستراوەتەوە بۆ (ذ)، بۆتە (المعذرون)، ئەگەرنا لە ئەسڵد (المعتذرون) بووە، واتە: پۆزش هێنەرەوان.

ئنجا ئایا کە عەرەبە بیابان نشینەکان هاتوون؟ {بۆ لای پێغەمبەر ﷺ} بۆچی هاتوون ؟

﴿لِيُؤْذَنَ لَهُمْ﴾، تاکو مۆڵەتیان بدرێ، واتە: مۆڵەتیان بدرێ کە نەیەن بۆ جەنگو جیهاد لەبەرئەوەی بارودۆخیان لەبار نەبووەو بەڵگەو پاساوێکیان هەبووە، لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا، دەڵێ: ئەوانە هەندێك تیرەو هۆز بوون، هەندێك تیرەو هۆزی دیکە دوژمنیان بوون، بەتەمابوون بەسەرماڵو منداڵەکەیاندا بدەن، هاتبوونە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ مۆڵەت وەرگرتن، ئەویش واقیعەکەی زانیوە، بۆیە مۆڵەتی داون کە نەیەن، ئەوان بەو شێوەیە راستگۆیانە هاتوون پۆزشیان هێناوەتەوە.

﴿وَقَعَدَ الَّذِينَ كَذَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾، بەڵام ئەوانەی کە درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا ﷺ کرد، دانیشتن، واتە: دانیشتنو نەهاتن پۆزشو پاساو بێننەود تەنانەت بە درۆش، یانی: لە ماڵی خۆیان دانیشتنو، نەچوون بۆ جەنگی تەبووکیان وەك حاڵەتێکی ئاسایی تەماشا کرد، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جەختی کردبووەوە کە دەبێ هەموو لایەك ئامادەبن، لەبەرئەوەی یەکەم بەرەنگاربوونەوە بوو لەگەڵ دەوڵەتی رۆمدا، کە دەوڵەتی رۆمی ئەوکاتە وەك دەوڵەتی ئەمریکای ئێستە وابووە، هەر وەك چۆن دەوڵەتی فارس، وەك چینو هیندو ئەو دەوڵەتە زلهێزانەی رۆژهەلاتی ئێستا، وابووە.

ئنجا دەفەرموێ: ئەوانەی كە درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ كردو دانیشتن، وە نەهاتن بۆ پۆزش هێنانەوەو پاساو هێنانەوە: ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، بێگومان لەمەودوا ئەوانەیان كە بێ بڕوان، ئازارێكی بە ئێشیان تووش دێ، یان: بەڵایەكیان تووش دێ، كە ئازارێكی بە ئێشی تێدایە، كە واپێدەچێ مەبەست پێی دواڕۆژ بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی دنیا بێ، كە هەر لە دنیادا خوای دادگەر تووشی بەڵایەكیان بكات، وەك سزادانێك.

ئنجا خوا ﷻ باسی چەند توێژێكی دیكە دەكات لە مسوڵمانان، كە بۆیان نەكراوە بەشداریی ئەو جەنگەی تەبووك بكەن، بەڵام لۆمەو سەرزەنشت، ڕووی تێ نەكردوون، لەبەرئەوەی خاوەن عوزرو پاساوی ڕاستەقینە بوون: ﴿لَّيۡسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرۡضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٩١﴾.

واتە: بێ هێزەكان {ئەوانەی كە لەڕووی جەستەییەوە بێ هێزن‌و توانای جەنگ كردنیان نیە} وە نەخۆشەكان، وە ئەوانەی كە توانایان نیە ماڵ خەرج بكەن، ڕێی گلەییان ناچێتە سەر، {یاخود گوناهیان ناگاتێ‌و، سەغڵەت ناكرێن‌و، تووشی سەغڵەتیی نابنەوە، بەهۆی ئەوەوە كە گوناهبار بووبن كە نەچوون بۆ جەنگی تەبووك} ، بەڵام بە مەرجێك: ﴿إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، ئەگەر دڵسۆزییان نواندبێ بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ.

مادام كە بەشداریی جەنگەكەیان پێ نەكراوە، ئنجا لەبەر نەخۆشیی بێ، لەبەر بێ هێزی جەستەیی بێ، لەبەر كەم ئیمكانیەتیی ماددیی بێ، باشە ئەوە بەشدارییان نەكرد، بەڵام دەگونجێ ئینسان بەشداریی كارێكی خێر نەكاو، دڵسۆزیشی بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ، قسەی باش بكاتو، خەڵك هانبداتو، دوعای خێر بكاتو، دڵسۆزیی بنوێنێ‌و مشوور بخوات، ﴿مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖ﴾، چاكەكاران ڕێی گلەییان ناچێتە سەر، واتە: ناگونجێ سەرزەنشتو سەركۆنە بكرێن، مادام

چاکە کاربن، با لە هەڵوێستێکیش بەجێ بمێنن، کە لە توانایاندا نیە، ئەو هەڵوێستە بنوێنن، مادام لە هەڵوێستەکانی دیکەیانداو لە ژیانی دیکەیاندا، چاکە کاربن، گلەییان لێ ناکرێ‌و گوناهبار نابن، ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، وە خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

ئنجا باسی پۆلێکی دیکەو کۆمەڵێکی دیکە دەکات، کە ئەوانیش بە هەمان شێوە گلەییان ناچێتە سەر، خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾﴾، هەروەها ڕێی گلەیی‌و سەرزەنشت، {یان ڕێی گوناهبار بوون} ناچێتە سەر ئەو کەسانەش، کە لە کاتێکدا هاتن بۆ لات، تاکو سواریان بکەی، {واتە: بارەبەریان بۆ دابین بکەی، ولاخیان بۆ دابین بکەی، کە خۆیان‌و کەلوپەلیانی سوار بکەن بۆ ئەو ڕێیە دوورە} تۆش پێت گوتن: هیچ شتێك شك نابەم {واتە: هیچ بارەبەرێك شك نابەم، کە ئێوەی بخەمە سەرێ}، کە ئەو کاتە بارەبەر: هەر حوشترو ئێسترو گوێدرێژ بوون، ﴿تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ﴾، پشتیان کردەوەو، ڕۆیشتن بە چاوی پڕ فرمێسکەوە، چاویان فرمێسکی لێ دەڕژا، ﴿حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ﴾، لە خەفەتباریی ئەوەی کە ناتوانن خۆیان ببەخشن‌و ماڵ خەرج بکەن، {وە بارەبەری پێ بکڕن‌و، هۆکارەکان‌و پێداویستییەکانی جەنگی پێ بکڕن. وە پێغەمبەری خواش ﷺ کە سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی بووە، خەزێنەکەی ئەوەندەی تێدا نەبووە، کە پێداویستییەکانی ئەوانە دابین بکات، لە خەفەتی ئەوە، بە چاوی پڕ فرمێسکەوە ڕۆیشتن}.

ئنجا دێتە سەر باسی کۆمەڵێکی دیکە، کە ئەوان گلەییان لێ دەکرێ‌و گوناهبارن. دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ﴾، بێگومان ڕێی گلەیی‌و سەرزەنشت‌و ڕێی گوناهباریی‌و تەنیا دەچێتە سەر ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ وەردەگرن، لە حاڵێکدا کە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتوون، (وە لەش ساغیشن). هەرچەندە لێرەدا باسی نەکردوە، بەڵام دیارە ئەگەر لەش ساغ نەبان‌و، کوێرو شەل‌و

نەخۆش‌و بێهێزبان، لێرەو لە شوێنی دیکەش خوای میهرەبان فەرموویەتی: ئەوانە گوناهیان ناگاتێ. کەواتە: دیارە لەش ساغیش بوون، وە دەستڕۆیشتووش بوون، ﴿ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ ﴾، {مۆڵەتیان لە تۆ وەرگرت کە نەیەن بۆ جەنگی تەبووك}، ئەوەیان پەسند کرد کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماودا بن.

(خوالف) کۆی (خالفة)یە، ئافرەتێکە کە لەسەر ماڵ‌و منداڵ بەجێ دەمێنێ، کاتێك کە پیاوەکەی دەچێ بۆ دەرێ، بۆ جەنگ دەچێ، یان بۆ کارو کەسابەت دەچێ، ئافرەتەکە لە ماڵێ بەجێ دەمێنێ، یانی: ڕازیبوون کە لەگەڵ پیرەژنان‌و ژن‌و منداڵدا بەجێ بمێنن، ﴿ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾، وە خوا مۆری بەسەر دڵیانەوە نان، بۆیە نازانن.

یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا کە خوا مۆری بەسەر دڵەوە ناون، نازانن، چی نازانن؟ نازانن:

١) کە بەجێ مانەکەیان مایەی عەیبداریی‌و گوناهبارییە.

٢) وە نازانن کە جەنگ‌و جیهاد مایەی عیززەتی دنیاو دوارۆژە.

٣) وە نازانن کە بەو بڕو بیانوو پاساوە بێ جێیانەی کە دەیانهێننەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیقناع نابێ، وە مسوڵمانانی تێگەیشتوو کڵاویان ناچێتە سەر، وە دەزانن کە هەر مەبەستیان خۆ بەجێ هێشتن بووە.

ئنجا خوای پەروەردگار لەسەر شیکردنەوەی حاڵ‌و هەڵوێستی ئەوانە، بەردەوام دەبێ‌و دەفەرموێ: ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ ﴾، دیارە ئەمە هەواڵ پێدانی خوای پەروەردگارە بە نادیار، وە ئەوە لە جۆری ئیعجازی هەواڵدان بە نادیارە (إعجاز الانباء بالغيب) وەك لە مەوسووعەی (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) باسمان کردوە، کە لە قورئاندا کۆمەڵێ هەواڵی نادیار هەن، خوای پەنهانزان

هەواڵی بە مسوڵمانان داوە، کە ئەو شتە وا دەبێ، ئەو شتە وا دەقەومێ، دوایش وا دەرچووە، کە تەنیا خواش ﷻ داهاتوو دەزانێ، ئنجا ﷺ هەواڵی پێ دەدات: ئەو شتە بەو شێوەیە دەبێ، وە واش دەردەچێ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە خوا ناردوویەتی، لێرە دەفەرموێ: ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ﴾، هەر کاتێك گەڕانەوە بۆ لایان، پۆزشتان بۆ دێننەوە، پاساوتان بۆ دێننەوە، ﴿ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا ﴾. تۆ پێیان بفەرموو: پۆزش مەهێننەوە، ﴿ لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ ﴾ چونکە بڕواتان پێ ناکەین، (لن نصدِّقكم) بە ڕاستتان دانانێین، لەبەرچی بە ڕاستتان دانانێین؟

﴿ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ﴾، بێگومان خوا لە هەواڵەکانی ئێوەی ئاگادار کردووینەوە، واتە: خوای زاناو شارەزا لە هەموو شتێکی ئێوەی ئاگادار کردووینەوە. کە ئێوە ڕاست ناکەن، وە مەبەستتان خۆ بەجێ هێشتن بوو، کەواتە: پێویست بە پۆزش هێنانەوە ناکات، چونکە بڕواتان پێ ناکەین.

﴿ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ﴾، وە ئەگەر لەمەو دوا کردەوەی باش بکەن ـ ئەوە لەو کردەوە باشە، کە چوونە بۆ جەنگی تەبووك، بەجێمان ـ بەڵام ئەگەر لەمەودوا کردەوەی باش ئەنجام بدەن، خوا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەکەتان دەبینن، کەواتە: هەوڵبدەن لە داهاتوودا قەرەبووی بکەنەوەو تێی هەڵهێننەوە، ئەگەرنا لەو هەڵوێستەدا دۆڕاندتانو، ئەوەتان لەدەست چوو، وە پۆزش هێنانەوەی بە درۆش دادتان نادات.

﴿ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ﴾، وە دوایی دەیگێڕرێنەوە بۆ لای زانای پەنهانو ئاشکرا، (کە خوایە ﷻ).

﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەواڵتان پێ دەدات بەوەی کە دەتانکرد، یانی: ئەوەی لە دنیادا دەتانکرد.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾

لەمەودوا کە دەگەڕێنەوە بۆ لایان، سوێندتان بە خوا بۆ دەخۆن، تاکو وازیان لێبێنن‌و، گلەییان لێ نەکەن، ﴿ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ ﴾، ئێوەش پشتیان تێ بکەن‌و لا ملیان تێ بکەن، یانی: پشت گوێیان بخەن، ﴿ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ﴾، ئەوانە پیسن، واتە: لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهۆی ئەو هەڵوێستانەیانەوە ناخی خۆیان‌و ڕووحی خۆیان پیس کردوە، ﴿ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ﴾، وە جێی تێدا حەوانەوەشیان دۆزەخە، ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، لە سزای ئەوەدا کە وەدەستیان دەهێنا.

جارێکی دیکەش دووبارەی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾، سوێندتان بۆ دەخۆن تاکو لێیان ڕازیبن.

هی پێشێ فەرمووی: سوێندتان بۆ دەخۆن تاکو وازیان لێ بێنن، گلەییان لێ نەکەن، وا دیارە هەر بەوەندە واز ناهێنن، بەڵکو هێندەتان سوێند بۆ دەخۆن، دەیانەوێ ڕازیشتان بکەن، نەك هەر ئەوەندە گلەییان لێ نەکەن، بەڵکو ڕازیشتان بکەن.

﴿ فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازیبن، بێگومان خوا لە کۆمەڵی لادەران‌و لاڕێیان ڕازی نابێ.

ئنجا دێتە سەر باسی کۆمەڵێکی دیکەو توێژێکی دیکەی ئەو کاتەی کۆمەڵگای ئیسلامیی، کە ئەوانیش عەرەبە خێڵەکییەکان‌و بیابانشینەکان بوون، دیارە ئەوەی پێشێش هەر زۆربەی ئەوان بوون، بەڵام لێرەدا خوای زاناو توانا زیاتر تیشکیان دەخاتە سەر، کە ئەو عەرەبە خێڵەکییانە چۆنن ؟ هەڵبەتە لێرەدا باسی ئەوانەیان دەکات کە خراپەکارو دەغەڵ‌و بێبڕوان، هی چاکیشیان هەن، وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا ﴾، عەرەبە خێڵەکییان کوفرێك‌و نیفاقێکی زۆر سەختیان هەیە، واتە: کوفرو نیفاقی ئەوان بەهێزترە توندترە، لە هی خەڵکی دیکە، یاخود.کوفرو

نیفاقێکی زۆر بێ ڕەزاو خەستو خۆڵیان هەیە، ﴿وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ﴾، وە شایستەترن بەوەی کە سنوورەکانی ئەوەی خوا دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ نەیزانن، ئەوانە زۆر شایستەی ئەوەن‌و، لێیان دەوەشێتەوە کە سنوورەکانی ئەوەی خوا بۆ سەر پێغەمبەری خۆی دایبەزاندوە، نەیزانن، واتە: حەڵاڵ‌و حەرام نەزانن‌و، لێکیان جیانەکەنەوەو شارەزا نەبن، چونکە دوورە دەستن. ئنجا وێڕای ئەوەی کە دوورە دەستن‌و، لە نیزیك پێغەمبەری خواو ﷺ مسوڵمانانەوە نین، ئەهلی کوفرو نیفاقیشن، ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾﴾، وە خوا زانای کارزانە.

ئنجا هەر لەسەر باسی ئەوان بەردەوام دەبێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ الْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾﴾،وە لە عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان، کەسانێك هەن، ئەوەی خەرجی دەکەن بە ناچاریی، یاخود لە شەرمی ڕووان‌و، بۆ خۆ بە مسوڵمان پێ نیشاندان، بە مەغرەمی دادەنێن.

(مغرم)یش بریتیە لەوەی کە ماڵێکت لێ بستێنرێ بەناهەق، ئەو ماڵەی کە خەرجی دەکەن، پێیان وایە تالانکراون‌و بەزۆر لێیان ستێنراوە، ﴿وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ﴾، وە هەمیشە چاوەڕێی بەڵایانتان بۆ دەکەن، واتە: چاوەڕێ دەکەن بەڵاتان بەسەر بێ‌و تووشی گرفتاریی و ناڕەحەتیی ببن.

(دوائر) کۆی (دائرة)یە، (دائرة) بریتیە لە بەڵایەکی خراپ کە بەسەر ئینسان دێ‌و دەوری ئینسان دەداو لێی قوتارو دەرباز نابێ، ﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، بەڵای خراپ بۆسەر ئەوان بێ، وە خوا بیسەری زانایە.

یاخود بەڵای خراپ بەسەر ئەوان هات، هەر ئەو هەڵوێستەی کە ئەوان تێیدان بەڵایەکی خراپە، یەخەی گرتوون.

دەشگونجێ کە خوا دەفەرموێ: ﴿ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ﴾، تووكو دوعا بێ، دیارە کە تووكو دوعایەکیش خوای بیکات، یەکسەر دێتە دی، چونکە خوای تواناو زاڵ، داوا لە غەیری خۆی ناکات، ئەو شتەی بۆ بکات.

دوعا بریتیە لەوەی کە کەسێك لە خوارەوە، داوا لە کەسێك لە زاتێك بکات کە لە مەقامێکی بەرزدایە، ئەو شتەی بۆ ئەنجام بدات، بەڵام خوا کاتێك دوعا دەکات، واتە: ئەو شتەیان بەسەر هاتو، یان ئەو شتەیان بەسەر بێت، کە بەسەریشیان دێت.

ئنجا دێتە سەر باسی جۆرێکی دیکە لە عەرەبە خێڵەکییە بیاباننشینەکان، کە ئەوان هەڵوێستیان باشە، وە ئەهلی ئیمانن، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ﴾، وە لە عەرەبە خێڵەکییەکان کەسانێك هەن، کە بڕوا دێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ﴿ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ﴾، وە ئەوەش کە خەرجی دەکەن لە ماڵو سامان، بە مایەی لە خواوە نزیککەوتنەوە وە بە هۆکاری دوعاکردنی پێغەمبەری ﷺ دەزانن.

واتە: ئەو ماڵەی کە خەرجی دەکەن، ئومێدی ئەوەیان پێیە، لە خوایان نیزیك بکاتەوە، وە ببێتە هۆی ئەوە کە پێغەمبەری خواش ﷺ دوعایان بۆ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کەسێك کە ماڵێکی دەبەخشی، دوعای خێری بۆ دەکردو، بۆی دەپاڕایەوەو، دەستخۆشیی لێدەکرد، ﴿ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ﴾، ئاگاداربن! ئەو ماڵ خەرج کردنە، مادام بە ئیمانەوە بێ مایەی نیزیکییە بۆ ئەوان، مایەی نیزیکییانە لە خوا ﷻ، ﴿ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ﴾، لەمەودا خوا دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾ ﴾، بێگومان خوا لێبووردەی بە بەزەییە.

ئنجا دێتە سەر باسو، پێناسەی کۆمەڵێکی دیکە لە مسوڵمانانی ئەوسای مەدینە، کە دیارە باشترین کۆمەڵی مسوڵمانان بوون، سەر تۆپیان بوونو لە هەمووانیان باشتر بوون، دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ

وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾.

واتە: وە پێشکەوتووە یەکەمەکان، لە کۆچکەرانو لە پشتیوانان، وە ئەوانەش کە بە چاکیی شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییەو، ئەوانیش لە خوا ڕازیین، وە چەند باغێکی بۆ ئامادە کردوون کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، کە بە هەمیشەییو تا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە، ئا ئەوە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزنە.

لێرەدا خوا ﷻ هەر بە بۆنەی ئەوەوە، کە کۆمەڵگای مەدینە پۆلێن دەکات، بەو بۆنەوە باسی باشترین کۆمەڵ، یان توێژی کۆمەڵگای ئەوسای مسوڵمانان دەکات، کە بریتین لە پێشکەوتووە یەکەمەکان، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باس دەکەینو. ڕای زانایان دێنینەوە، کە ئەوە کێو کێ دەگرێتەوە؟

خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: کە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەرانو لە پشتیوانان، دەزانین کۆچکەران ئەوانەن کە لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، وە پشتیوانانیش ئەوانەن کە لە مەدینە بوونو پشتیوانییان کرد لە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵە کۆچکەرەکانی، بەڵام ئایا ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾، تا کوێو کێو کێ دەگرێتەوە؟ دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ﴾، ئەوانەش کە بە چاکیی شوێنیان کەوتوون، واتە: هەر لە هاوەڵانی بەڕێز، دیارە کۆچکەرەکانو پشتیوانەکان ئەوە دیارن، ئنجا ئەوانەش کە دوایی مسوڵمان بوونو هاتوونە نێو ئیسلامەوەو، بە چاکیی شوێنی کۆچکەرانو پشتیوانان کەوتوون، ئەوانیش دەگرێتەوە. بەڵکو من ڕام وایە کە ڕای هەندێ لە توێژەرەوانی قورئانیش وایە، کە هەتا کۆتایی دنیا: هەموو ئەوانەی کە بە چاکیی شوێن پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵە کۆچکەرەکانیو. هاوەڵە پشتیوانەکانی دەکەون لە ئیمانو عەقیدەیاندا، لە عیبادەتیاندا، لە هەڵسوکەوتو ئاکارو ڕەوشتیاندا، لە دینداریياندا، لە دنیا دارییاندا، لە فیداکارییاندا، لە تێکۆشانیان دا بە سەروماڵیان، لە پابەندییان بە شەریعەتدا، مادام وەك وان مسوڵمانیەتییو دینداریی بکەن، ئەوە وەبەر ئەو موژدەیە دەکەون، کە خوای بەخشندە دەفەرموێ:

هەموویان پێکەوە: ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ ﴾، خوا لە هەموویان ڕازییەو، ئەوانیش لە خوا ڕازیین، واتە: هەم لە دنیاشدا، ئەهلی ئیمان لە خوا ڕازیین‌و، گلەییان لە خوا نیە، ئینسانی ئیماندار لە هەموو شتێکی خوای پەروەردگار ڕازییە، کە بەڵای ناخۆشیشی بەسەر بێ، لەو ڕووەوە کە تەقدیری خوایە، ناڕەزایی بەرانبەر بە خوا دەرنابڕێ، بەڵێ شتی خۆشی پێ خۆشەو، شتی ناخۆشی پێ ناخۆشە، نیعمەتێکی دێتە سەر ڕێ، لەززەتی لێ دەکاو لە قەلبی خۆش دێ، ناخۆشییەکی دێتە ڕێ، هەست بە ئازار دەکات‌و لە قەلبی ناخۆش دێ، بەڵام گلەیی لە خوا ناکات، چونکە دەزانێ چی لەلایەن خوای کارزانەوە بەسەری بێ، با ئەویش پێی ناخۆش بێ، بەڵام مادام لەسەر جادەی شەریعەت بێ، ئەو هەر قازانجیەتی‌و، مامەڵە لەگەڵ خوادا، زیانی تێدا نیەو هەمووی هەر قازانجە، ئنجا خۆشی بێ، یان ناخۆشیی.

ئنجا باسی توێژێکی دیکە دەکات لە کۆمەڵگای مەدینەی ئەو کاتە، هەم خەڵکی مسوڵمان، هەم ئەو خەڵکانەی کە لەگەڵ مسوڵماناندا بوون، دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ ﴾.

واتە: وە لەو عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینانەی دەوروبەرتان، کەسانێك هەن دەغەڵ‌و مونافیقن، ﴿ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ ﴾، هەروەها لە خەڵکی مەدینەش کەسانێکی دەغەڵ‌و مونافیق هەن، کە: ﴿ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ ﴾، واتە: زۆر مەشقیان کردوە لەسەر نیفاق.

(مَرَدُوا) یانی: (مَرَنُوا، دَرِبُوا) زۆر مەشق‌و ڕاهێنانیان کردوە، وە زۆر بە وردەکاریی و لێزانیی نیفاقەکەیان دەکەن، ﴿ لَا تَعۡلَمُهُمۡ ﴾، بۆیە تۆ نایانزانی، ﴿ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡ ﴾، ئێمە دەیانزانین.

ئەوەندە بە لێزانیی‌و بە کارامەیی‌و بە پەنهانکاریی لە حاڵەتی نیفاق دان، کە هیچ کەس هەستیان پێ ناکات، کە ئەوانە مونافیق بن‌و لە دڵی خۆیاندا کافر بن، وە هەر

کەسێك بیانبینێ بە مسوڵمانیان لێ حاڵی دەبێ، تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ. بەڵام خوا دەیانزانێ.

﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾، لەمەودوا دوو جاران سزایان دەدەین، دواییش دەگێڕدرێنەوە بۆ سزایەك و ئازارێكی مەزن.

کەواتە: مەبەست لە: ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ﴾، سزای دنیایە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ﴾، پاشان دەگێڕدرێنەوە بۆ ئازارێكی مەزن، ئازارێكی مەزن تەنیا لە قیامەتە، لە دنیادا لە قەدەر دنیا ئازار هەیە، بەڵام لە دوارۆژدا، ئازاری مەزن هەیە. کە نابڕێتەوە، وە ئازارێکە کە وەك خوای کارزان دەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾﴾ الفجر، واتە: هیچ کەسێك وەك خوا {ئەوانەی کە شایستەی سزادان بن} سزا نادات، وە هیچ کەسێك وەك وی کەلەبچەو زنجیر پێچیان ناکات.

ئنجا ئایا مەبەست لەو دوو جار سزادانە چییە؟ وا پێدەچێ مەبەست ئەوەبێ جار لەدوای جار، کە ئەو سزایەش مەبەست پێی دەرکەوتنی ئەو نهێنییانەیانە، دەرکەوتنی عەیب و عاریانە، دەرکەوتنی ئەوەیە کە درۆیان کردووە، پاساوی بە درۆیان هێناوەتەوە وە کاتێ قسەیەك دەکەن لە کۆڕێکدا، دوایی لێیان ئاشکرا دەبێ، عەیبدار دەبن و دەکەونە سەر زارو زمانی خەڵکی و دەبنە بنێشتە شینکەی سەر زاریان، ئەوە هەمووی سزاو ئازارێکی یەك لە دوای یەك و پەیتا پەیتا بووە، وە هەندێکیش گوتوویانە: واتە: پێش چوونە جەنگ، هاتوون پاساوی بە درۆیان هێناوەتەوەو لە دەروونی خۆیاند ئازارچێژ (مُعَذَّب) بوون، کە درۆیان کردووە، دوای گەڕانەوەشیان لە جەنگی تەبووك دووبارە جارێکی دیکە هاتوون و، پۆزشیان هێناوەتەوەو، دیسان ناچار بوون درۆ بکەن و پۆزشی بە درۆو بڕو بیانوو بێننەوە، دیسان تووشی ئازارێکی دەروونیی بوون، بە هەرحاڵ وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێ ئەوە بێ جار لە دوای جار، خوای پەروەردگار هۆکاری سزاو ئازاریان بۆ دەڕەخسێنێ.

ئنجا دێتە سەر باسی کۆمەڵێکی دیکەیان‌و، دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٠٢ ﴾.

وە کەسانێکی دیکە لە خەڵکی مەدینە هەن، یان لە عەرەبە خێڵەکییەکان، یان ئەوانەی لە دەوروبەری مەدینە دانیان بە گوناهەکانی خۆیاندا هێناوە، ﴿ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ﴾، کردەوەیەکی باش‌و، یەکی دیکەی خراپیان تێکەڵ کردوون، واتە ئەوایان کردوە، کە هەموو کردەوەکانیان باشبن، وە نە هەمووشیان خراپبن، ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، نیزیکە خوا بگەڕێتەوە سەریان، واتە: تەوبەیان لێ وەربگرێ‌و گەڕانەوەکەیان لێ وەربگرێ‌و لێیان ببوورێت، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

ئنجا ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا بکات، کە هەرچەندە هەڵەیان کردوەو کەم‌و کووڕییان هەبووەو، بەجێماون لە جەنگی تەبووک، یاخود لەمیانەی جەنگەکەشدا هەڵەو کەم‌و کووڕییەکیان بووە، وەك لە دەرسەکانی پێشوودا باسمان کرد، بەڵام دوایی گەڕاونەوەو پەشێمان بوونەوە، ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەکات چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، دەفەرموێ: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٠٣ ﴾، لە سامانەکانیان صەدەقەیەك بەخشینێك وەربگرە، بەڵکو پاکیان بکەیەوە بەهۆی ئەو ماڵ لێ وەرگرتنەوە، وە چاکیان بکەی، وە بۆشیان (لە خوا) بپاڕێوەو، بێگومان پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەوان مایەی ئارامییە، وە خوا بیسەری زانایە.

هەرکەسێك بەڕاستی ئیماندار بێ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەپاڕێتەوەو دوعای چاکی بۆ دەکات، هەست بە ئارامیی‌و ئۆخژن دەکات، دەزانێت دوعای پێغەمبەر ﷺ لەلای خوا وەردەگیرێ، وە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای بۆ لە خوا دەکات، خوای بەخشەر پێی دەدات، بۆیە هەست بە ئارامیی‌و ئۆخژن دەکات، یاخود لە ڕووی

مەعنەوییەوە، دوعای پێغەمبەر ﷺ دەبێتە هۆی ئارام بوونی ئینسانو، ئۆخژنی دڵو دەروونی، وە خوا بیسەری زانایە، پاڕانەوەکان دەبیستێت، وە نهێنییەکانیش دەزانێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ ﴾، ئایا نەیاندەزانی کە تەنیا خوا. گەڕانەوە لە بەندەکانی وەردەگرێ، وە بەس خوا خێرو ماڵ بەخشینەکان وەردەگرێ. وە ئایا نەیاندەزانی کە هەر خوا زۆر تەوبە وەرگری میهرەبانو بە بەزەیی یە؟

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، وە تۆ بفەرموو: کار بکەن، کردەوەی باش بکەن، لە مەودوا خواو پێغەمبەر ﷺ وە بڕوادارانیش کارەکەتان دەبینن، لە دنیادا خوا کارەکەتان دەبینێو بە چاوی مەرحەمەت تەماشای دەکات، وە پێغەمبەر ﷺ بە چاوی شادمانییو ڕازیبوون، تەماشای دەکات، وە بڕوادارانیش بە چاوی پەسندییو دڵ پێ خۆشبوون، تەماشای کردەوە باشەکەتان دەکەن، ﴿ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، وە دوایش، {لە ڕۆژی دوایی دا} دەگێڕرێنەوە بۆ لای زانای پەنهانو ئاشکرا، ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەواڵتان پێ دەدات بەوەی کە ئەنجامتان دەدا لە دنیادا، هەمووی وردو درشتتان پێ ڕادەگەیەنێ، وە پاداشتیشتان دەداتەوە لەسەر چاکەکانتان.

لە کۆتایی دا خوای پەروەردگار باسی کۆمەڵێکی دیکە دەکات، کە ئەو کۆمەڵەیان سێ نەفەریان دیارن (کەعبی کوڕی مالیکو مەڕارەی کوڕی ڕەبیعو هیلالی کوڕی ئومەیە) ڕەنگە هی دیکەش بووبن، بەڵام ئەو سێیانە زۆر دیارن، کە دواتر بەسەرهاتەکەیان باس دەکەین بە تەفصیل.

دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ ﴾، وە هەندێکی دیکەیان هەن. دواخراون بۆ فەرمانی خوا، {واتە: بۆ بڕیاری خوا لەبارەوە دانیانەوە، دواخراون}

﴿إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۗ﴾، یان ئەوەتا سزایان دەدات، یان ئەوەتا تەوبەیان لێ وەردەگرێ‌و لێیان دەبوورێ، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ١٠٦﴾، وە خوا زانای کاربەجێیە.

واتە، لەبارەی ئەوانەوە خوای کاربەجێ بڕیارو حوکمی خۆی دواخستوە، تا کاتێکی دیاریی نەکراو، کە بریتی بوو لە پەنجا شەوو ڕۆژ، وەك دوایی بەسەرهاتەکەیان باس دەکەین، وە خوای میهرەبان یارمەتیدان تەوبەیەکی زۆر چاك‌و باش بکەن‌و، تەوبەکەی لێ وەرگرتن، وە بەسەرهاتەکەشیانی خستە نێو قورئانی مەزنەوە.

# چەند مەسـەلەیەکی گرنـگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٠﴾ ﴾.

وە پۆزش هێنەرەوان لە عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان هاتن، بۆ ئەوەی مۆڵەتیان بدرێ، وە ئەوانەش کە درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا کرد، دانیشتن. ئەوانەیان کە بێبڕوان، لەمەودوا تووشی ئازارێکی بەئێش دەبن، {واتە: لە دوارۆژدا}.

(ٱلۡمُعَذِّرُونَ ) دوو واتای هەن:

١ـ دەگونجێ (ٱلۡمُعَذِّرُونَ ) لە ئەسڵدا (المعتذرون) بووبێ، واتە: ئەوانەی کە خاوەن پاساوی ڕاستەقینەن.

٢ـ دەشگونجێ (ٱلۡمُعَذِّرُونَ ) واتە: کەسانێك کە پاساویان نیە، بەڵام وا پێشان دەدەن کە پاساویان هەیە، واتە: ڕاستیان نەکردوە.

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (المُعْذِرون) دیارە ئەگەر (المُعْذِرون) بێ، گوتراوە: (قَدْ أَعْذَرَ مَنْ أَنْذَرَ) هەر کەسێك بەرانبەرەکەی ئاگادار بکاتەوە، ئەوە پاساوی بە دەستەوە هەیە.

کەواتە ئەگەر (المُعْذِرون) بێ، یەك واتای هەیە، واتە: ئەوانەی خاوەن عوزرن.

وە خاوەنی (مختار الصحاح) ، لەبارەی ئەم وشەیەوە دەڵێ: (فالمُعَذِّرُ قد يكون محقاً وقد يكون غير محقٍ، فالمحق هو فِي معنى (المُعتذر) لأن له عذراً، ولكن

التاء قُلِبَت ذالاً وأُدْغِمَتْ فِي الذال ونُقِلَتْ حَرَكَتُها إلى العَيْنِ كَمَا قُرِئَ يَخِصِّمون، وأما الذي ليس بمحق، فهو المُعَذِّرُ على جهة المُفَعِّل، كالمُمَرِّض والمُقَصِّر، يَعْتَذِرُ بغَيْرِ عُذْرٍ، وَقَرَأَ ابْنُ عَبَّاس {وجاء المُعْذِرون} (من أعذر) أي الذي له عذر)[1].

واتە: (ٱلْمُعَذِّرُونَ ) دەگونجێ کە هەقی بەدەستەوە بێ، وە دەشگونجێ هەقی بەدەستەوە نەبێ،{واتە: دەگونجێ پۆزش هێنانەوەکەی ڕاست بێ، وە دەشگونجێ کە لە پۆزش هێنانەوەکەیدا ناڕاست بێ} ، ئەوەی کە لە پۆزش هێنانەوەکەیدا ڕاستە، ئەوەیە کە (مُعَذِّر) بە مانای (مُعْتَذِر)، واتە: پۆزش هێنەرەوە، کە پۆزشێکی هەیە، بەڵگەو پاساوێکی هەیە، کە لە ڕیشەدا (معتذر) بووە، بەڵام دوایی (ت)ەکە بووە بە (ذ)، واتە: (المعتذر) بووە بە (المُعَذِّر) کە بووە بە دوو (ذال)، وە (ذ)ی یەکەم لە (ذ)ی دووەم دا دەغم کراوە، دواییش حەرەکەکەی نەقڵ کراوە بۆ (عین)، واتە: (معذذر) بووە، بەڵام (فتحة)ی (ذ)ەکە نەقڵ کراوە بۆ (ع)ەکەو، بۆتە (المُعَذِّر) وەك چۆن (يَخِصِّمُون) لە سوورەتی (یس)دا لە ئەسڵدا (يَخْتَصِمُون)ە، (ت)ەکە لە (ص)ەکەدا دەغم کراوەو بۆتە (يَخِصِّمُون)، واتە: ئەوانەی کە ناکۆکن، دووبەرەکێ دەکەن، یان مشتومڕ دەکەن.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە (ٱلْمُعَذِّرُونَ ) ئەوانە بێ کە خاوەن پۆزشی ڕاستەقینە نین، ئەوە وشەی (مُعَذِّر) لەسەر شێوەی (مُفَعِّل) هاتوە، وەك (مُمَرِّض) وە (مُقَصِّر)، (مُمَرِّض) ئەو کەسەیە کە خۆی نەخۆش دەکات، (مُقَصِّر) کەسێکە کەم تەرخەمە، (يَعْتَذِرُ بغَيْرِ عُذْرٍ) بەبێ ئەوەی عوزرو پۆزشێکی هەبێ، خۆی وا پیشان دەدات کە عوزری هەیە.

(ابن عباس)یش خوێندویەتەوە: (وجاء المُعْذِرون)، ئنجا ئەگەر (مُعْذِرون) بێ، باسمان کرد، یانی: خاوەن عوزرەکان.

کەواتە: خوا ﷻ لە ڕستەی یەکەمی ئەم ئایەتەدا، باسی دوو جۆرە کەسیان دەکات:

---

١) ص ٣٧١.

١) پۆزش هێنەرەوەی ڕاستگۆ، پۆزشیان هێناوەتەوە کە مۆڵەت بدرێن و نەچن بۆ جەنگی تەبووک، ﴿ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ ﴾، پۆزش هێنەرەوە عەرەبە خێڵەکییەکان هاتن کە مۆڵەت بدرێن، واتە: مۆڵەت بدرێن کە نەچن بۆ جەنگی تەبووک، دەشگونجێ کە مەبەست پێی ئەوە بێ ﴿ ٱلْمُعَذِّرُونَ ﴾، واتە: پۆزش هێنەرەوە درۆزنەکان، ئەگەر بە شێوەی دووەم مانا بکرێ.

٢) درۆ لەگەڵ خواو پێغەمبەرکەرانی دانیشتوو ﴿ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ ئەوانەی درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ کردو دانیشتن، یانی: هەر نەهاتن پۆزشیش بێننەوە، بەڵکو دانیشتن وەزعەکەیان ئیهمال کرد.

کەواتە: دەگونجێ لە یەك کاتدا: ﴿ ٱلْمُعَذِّرُونَ ﴾، هەم مەبەست پێی ئەوانە بێ، کە بە ڕاست، پۆزشیان هێناوەتەوەو خاوەن عوزر بوون، وە هەم ئەوانەش کە بە درۆ پۆزشیان هێناوەتەوە، چونکە لە یەك کاتدا هەردووکیان بوون، هەم کەسانێك هەبوون لە عەرەبە بیابانشینەکان خاوەنی بەڵگەو پاساوی ڕاستەقینە بوون و پۆزشیان هێناوەتەوە، وە هەم کەسانێکیش هەبوون کە بەدرۆ پۆزشیان هێناوەتەوە. بەرانبەرەکەشیان ئەوانەن کە ئەسڵەن هەر پۆزشیشیان نەهێناوەتەوە، بەڵکو درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ کردوە، وە لە ماڵێ دانیشتوون و، پۆزش هێنانەوەشیان پشت گوێ خستوە.

کەواتە ئەوەی ئەم ئایەتە دەلالەتی لەسەر دەکات، سێ جۆرە کەسن:

یەکەم: خاوەن عوزری ڕاست.

دووەم : خاوەن عوزری ناڕاست.

سێیەم: عوزر نەهێنەرەوەی درۆزن.

چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، ئەوانەی درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ کردو دانیشتن، واتە: نەهاتن بۆ پۆزش هێنانەوە، نە بەڕاست و نە بە درۆ.

﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، ئەوانـەیان کـە بێبـڕوان، ئازارێکی بەئێشیـان تووش دەبێ، چونکە هەندێکیـان دوایی بڕوا دێـنن، بۆیـە خـوای کارزان (مِنْ)ی خستۆتە سەر، واتە: ئـەوانەیـان کـە بێبـڕوان، لـە نێـو ئـەوانەدا کـە دانیشتوونو درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ کردوە، مادام ئەوانەیان کە لەسەر بێبـڕوایی دەمێننـەوە، لەمەودوا تووشی ئـازارو سـزایـەکی بە ئێش دەبن، کە مەبەست پێی سزای ڕۆژی دواییە.

وشـەی: ﴿ٱلْأَعْرَابِ﴾، عەرەبەکان هەرچەنـدە صیغەی کۆیەو، دەبێ کۆی (عـرب) بێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی کۆی عـەرەب نیـە، بـەڵکو نـاوی جینسـەو تاکەکەی بریتیە لـە: (أعرابي).

(ٱلْأَعْرَابِ) واتـە: عـەرەبە خێڵەکییەکان، بیابانـنشینەکان.

بەڵام (الأعرابي) واتە عەرەبێکی خێڵەکیی، بیابانـنشین، بەڵام صیغەکەی بەشێوەی کۆ هاتوە، ئەدی صیغەی کۆی (عرب) چییە؟ هەر بریتیـە لـە (عـرب)، وە تاکەکەی بریتیە لە (عربي)، بەڵام کە گوتت: (عرب) واتە: جینسی عەرەب، کۆی عەرەب، ئەگەر بتـەوێ بڵێی یـەك دانە لـە عەرەبە شارنشینەکـان، دەڵـێی: (عربي)، بـەڵام بـۆ یـەك بیـابانـنشینی خێڵەکیی دەڵێی: (أعرابي).

**مەسـەلەی دووەم**: کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾﴾.

لێـرەدا خـوا ﷻ باسی چوار جۆرە کـەس دەکات، کە سـەغڵـەتییان لەسـەر نیـە، وە سـەرزەنشت نـاکرێـن، وە تووشی گونـاح نەبوون، بە هـۆی نەچوونیـانەوە بۆ جـەنگی

تەبووك، ئەو چوار جۆرە کەسەش: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ ﴾.

واتە: هەرکام لەو سێیانە حەرەجیان نەچۆتە سەر {دوایی باسی دەکەین، (حرج) یانی چی؟} ئەو سێیانەش کێن پێش ئەوەی بگەینە چوارەم ؟!

یەکەمیان: ﴿ ٱلضُّعَفَآءِ ﴾، بێهێزەکان، (الضُّعَفَاءُ: جَمْعُ ضَعِيف وَهُوَ الذِي بِه الضعْف، وهو وَهْنُ القُوَّةِ البَدَنِيَّة مِنْ غَيْرِ مَرَض).

(ضُعَفَاء) کۆی (ضَعِيف)ە، واتە: بێهێزو لاواز، ئەویش کەسێکە کە بێهێزیی و لاوازیی لە جەستەیدا هەیە، بێ ئەوەی کە نەخۆش بێ، هەندێ کەس هەیە لە کوردەواریی خۆماندا پێی دەڵێن: بێ دارو بار، لاواز، بێ هێزو پێز، کە توانای جەنگی نیەو، ڕەنگە هەر نەتوانێ چەك بەکار بێنێو، بگرە هەڵیشی بگرێ.

دووەمیان: ﴿ ٱلْمَرْضَىٰ ﴾، نەخۆشەکان، (المَرْضَى: جَمْعُ مَرِيض، وَالمَرَضُ تَغَيّر النِّظَام المعْتَادِ بالبَدَنِ بسَبَبِ اخْتِلَالٍ، يطرأ في بعض أجزاء المزاج، ومن المرض: المُزمنُ كالعمى والزَّمَانَة).

(مَرْضَى) کۆی (مَرِيض)ە واتە: نەخۆش، (مَرْضَى) واتە: نەخۆشەکان. نەخۆشیش بریتیە لە تێکچوونی سیستەمی ئاسایی جەستە، بە هۆی کەمو کوڕییەکەوە کە لە سروشتیدا پەیدا دەبێ، وە لە جۆری نەخۆشیی، نەخۆشیی درێژ خایەن هەیە، وەك کوێریی، وە نەخۆشیی ئیفلیجیی، {نەخۆشێك کە ئینسان لەسەر جێیەو ڕاست نابێتەوە، یاخود کەسێك زۆر چووبێتە تەمەنەوە}.

سێیەمیان: ﴿ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەش سەغڵەتییان لەسەر نیە، کە توانایان نیە خەرج بکەن، کە چەکی پێ بکڕنو، پێداویستییەکانی جەنگی پێ بکڕن، وە وڵاخو بارەبەری پێ بکڕنو، کەسێك ماڵو سامانی نەبوو. وە دەوڵەتی ئیسلامییش نەیتوانی ئەو جۆرە کەسانە پڕ چەك بکاتو، پێداویستییەکانی جەنگیان بۆ دابین بکات، هەڵبەتە بەبێ چەکیش شەڕ ناکرێ.

وە بەبێ ولاخو بارهبەر ئەو رێیە دوورە نابڕدرێ، بۆیە ئەوانەش دیسان گوناهیان لەسەر نیە.

هەر کامێك لەوانە (حَرَج)یان لەسەر نیە، (حَرَج) یانی چی؟

(الحَرَجُ: الضَّيْق وَالإِثْمُ) هەم بە مانای تەنگیی و سەغڵەتیی دێ، هەم بە مانای گوناح دێ.

ئنجا لەبەر ئەوەی ئینسان ئەگەر گوناهبار بوو، دوایی سزا دەدرێو عەیبدار دەبێ، وە هەست بە شەرمەزاریی دەکات لە بەرانبەر خواو خەڵکدا، وە بەوەش مانای وایە سەغڵەت دەبێ، بۆیە ناو لە گوناح نراوە: (حَرَج).

یاخود: ئەوانە سەغڵەتیی ڕوویان تێناکات، کە سەرزەنشتو سەرکۆنە بکرێنو بە گوناهبار دابنرێن.

بەڵام بە مەرجێك: ﴿إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، ئەگەر دڵسۆز بن بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، (نَصَحُوا۟) لە (نصح)ەوە هاتووە، (النُّصْحُ: العَمَلُ النافِعُ لِلْمَنْصُوحِ)، هەر کردەوەیەك کە بۆ ئەو کەسەی تۆ (نصح)ەکەی ئاراستە دەکەی، باش بێ، واتە: دڵسۆزیی نواندنو بە تەنگەوە بوون، بە خەمەوە بوون.

کەواتە: ﴿إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، یانی: دڵسۆزبوون بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بە تەنگەوە بوون، وە چی جێگای ڕەزامەندیی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بوو، وایان کرد، بەڵێ نەچوون بۆ جەنگ، بەڵام دوایی کە لەوێ ماونەوە، چی بزانن خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆشە، وا دەکەن، دوعا دەکەن، قسەی خێر دەکەن، مسوڵمانان هاندەدەن، ئنجا ئاگاداری بارودۆخ دەبن، وە ئەگەر کەسێك قسەیەکی خراپی کرد، لە دەمی دەدەنەوە، ئەوەش هەمووی دڵسۆزیی نواندنە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾، چاکەکاران ڕێی گلەییان ناچێتە سەر، یاخود ڕێی گوناهبار بوون، ڕوویان تێناکا.

دەربارەی وشەی (سَبِيلٍ) (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی (التحرير والتنوير)دا دەڵێ: (السَّبِيلُ: حَقِيقَتُهُ الطريق، وَعُدِّيَ بحَرْف (عَلَى)

المُفِيدِ لِمَعْنَى الإِسْتِعْلاَءِ، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ لِمَعْنَى السُّلْطَانِ وَالمؤَاخَذَةِ بالتبعة شُبِّه السُّلْطَانُ وَالمؤاخَذَةُ بالطريقِ، لأَنَّ السُّلْطَةُ يَتَوَصَّلُ بِها مَنْ هِيَ لَهُ إِلى تَنْفِيذ المؤاخَذَةِ فِي الغَيْرِ)(١).

واتە: وشەی ﴿سَبِيلٍ﴾، یانی: ڕێگا، ئنجا وشەی (سَبِيلٍ) تەعەدای پێکراوە بۆ (مفعول) بە (على) چونکە وشەی (على) مانای بەرزیی دەگەیەنێ. لێرەشدا خوازراوەتەوە بۆ دەستەڵاتو لێپرسینەوە، وە دەستەڵاتو لێپرسینەوە تەشبیە کراوە بە ڕێگا، چونکە بەهۆی دەستەڵاتەوە، مرۆڤ لێپرسینەوەو سزادان لە بەرانبەرەکەی دا جێبەجێ دەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، وە بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە، بۆ کێ؟

بۆ کەسانێك کە خاوەنی عوزرن، وە کەسانێك کە بەڵگەو پاساویان هەبووەو ڕاستگۆ بوون، وە دڵسۆزو چاکەکاریش بوون، واتە: سێ سیفەتیان تێدابوون، ئا ئەوانە خوا لەگەڵیاندا لێبوردەی میهرەبانە:

**یەکەم :** یان بێهێزن، یان نەخۆشن، یان بێ ئیمکانیەتن.

**دووەم :** دڵسۆزیشن بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ.

**سێیەم :** چاکەکاریشن، واتە ئەگەر نەیانتوانی بێ ئەو چاکەیە بکەن، ـ کە چوونە بۆ جەنگ ـ بەڵام لە هەموو شتەکانی دیکەی ژیانیاندا چاکەکارن.

کەسانێك خاوەنی ئەو سێ سیفەتە بن، ئەوە خوا لەگەڵیان لێبوردەی میهرەبانە.

چوارەمیان : ئنجا دێتە سەر باسی جۆری چوارەمی ئەوانەی کە خوای لێبوردە گلەییان لێ ناکاتو سزایان نادات، لەوانەی کە بەجێماون لە جەنگی تەبووك، دەفەرموێ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ

---

١) ص ٣٧١.

أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾.

هەروەها ڕێی گلەیی ناچێتە سەر ئەوانەش کە کاتێك هاتن بۆلات بۆ ئەوەی سواریان بکەی، {واتە: بارەبەریان بۆ دابین بکەی، وڵاخیان بۆ دابین بکەی}، تۆش گوتت: وڵاخێكو بارەبەرێك شك نابەم بیخەمە ژێر ئێوە، کە خۆتانو کەلوپەلتانی بخەنە سەری، ﴿تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ ﴾، ڕۆیشتنو پشتیان هەڵکرد، وە چاویان فرمێسکی لێ دەڕژا، ﴿حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ ﴾ لە ئەنجامی دڵتەنگیی دا لەسەرئەوە توانای دارایی یان نیە، وە دەوڵەتی ئیسلامییش نیەتی پێداویستییەکانی جەنگیان بۆ دابین بکات، وە سەرەنجام بەجێ دەمێنن لەو جەنگەی کە زۆر پێیان خۆشبوو بچن، بەڵام نە توانای زاتییان هەبوو، کە خۆیان پێداویستییەکانی جەنگ دابین بکەن، وە نە کۆمەڵگاو دەوڵەتیش ئەو توانایەی هەبوو کە پێداویستییان بۆ دابین بکات، سەرەنجام بە ناچاریی بەجێمان، وە هیچیان بە دەستەوە نەما، ئەوە نەبێ لە خەفەتان بگریەن، وە نارەحەتییو خەمو ناسۆری خۆیان لە ڕێی فرمێسکەکانیانەوە بڕێژن.

وشەی (حَمْل) کە دەفەرموێ: ﴿لِتَحْمِلَهُمْ ﴾، (الحَمْلُ يُطْلَقُ عَلَى إِعْطَاءِ مَا يُحْمَلُ عَلَيْهِ، أَي: إِذَا أَتَوْكَ لِتُعْطِيهُمْ الحمُولَة أي مَا يَرْكَبُونَهُ وَيَحْمِلُون عَلَيْهِ سِلاحَهُم وَمُؤَنَهُمْ مِنَ الإِبْل).

(حَمْل) بەکاردەهێنرێ بۆ شتێك ببەخشرێو باری بخرێتە سەرپشت، (واتە: بارەبەر) یانی: کاتێك کە هاتن بۆ لات بۆ ئەوەی تۆ بارەبەریان پێ ببەخشی وڵاخێك کە باری لێ بار بکەن، خۆشیان سواری بنو چەكو کەلوپەلو پێداویستییەکانیشیانی بخەنە سەری.

کە دەفەرموێ: ﴿تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ ﴾، (الفَيْضُ وَالفَيَضانُ: خُرُوجُ المَاءِ وَنَحْوُهُ مِنْ قَرارِهِ وَوِعَائِهِ).

(فَيْضُ وفَيَضان) بریتیە لە دەرچوونی ئاو، یاخود هەر شتێك كە وەك ئاو بێ، واتە: ماددەیەكی شل بێ، لە شوێنی خۆیەوە كە لێی دێ، یان لەو دەفرەود كە تێیكراوە، لێی بڕژێ، دەگوترێ: (فَاضَ الوَادِي، وَفَاضَ الإناء وَفَاضَتِ العَيْن) شیوەكە پڕ بوو لە ئاوو لێی ڕژا، وە قاپەكە (دەفرەكە) لێی ڕژا، وە چاو لێی ڕژا، چاو چی لێ ڕژا؟ دیارە فرمێسكی لێ ڕژا.

كە دەفەرموێ: ﴿ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴾، وشەی ﴿ حَزَنًا ﴾، دەڵێ: (مَفْعُولٌ لأَجْلِهِ) واتە: (يَحْزَنُونَ حَزَناً)، ﴿ أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴾؟ لە خەفەتی ئەوەی كە شك نابەنو، ئەومیان بەدەستەوە نیە كە بیبەخشنو خەرجی بكەن، وە پێداویستییەكانی چوون بۆ جەنگی تەبووكی پێ دابین بكەن، لە ئەنجامی ئەوەدا هیچیان بەدەستەوە نەما ئەوە نەبێ كە بگریەنو، فرمێسكیان لە چاو بێتە خوار.

ئاوا لێرەدا خوای كاربەجێ چەند دادگەرانەو میهرەبانانە: ئەوانەی كە نەخۆشن، ئەوانەی كە بێهێزن، ئەوانەی كە تەنگ دەستن، وە ئەوانەی كە بارەبەرو هۆكاری سەفەرەكەیان بۆ دابین نەبووە، نە بۆ خۆیان، نە لەلایەن دەوڵەتەوە، خوای بەخشندە دەفەرموێ: ئەوانە خوا لەگەڵیان میهرەبانە، لەگەڵیان لێبوردەیە، وە ئەوانە هیچ كەس بۆی نیە گلەیان لێبكات، ﴿ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ﴾، ئەوانە چاكەكارو دڵسۆزنو، نەك لەلای خوا گوناهبار نین، بەڵكو خەڵكی مسوڵمانیش نابێ گلەییو سەرزەنشتیان ئاڕاستە بكەن، چونكە خاوەنی عوزری ڕاستەقینەو بەڵگەو پاساوی ڕاستەقینەن، وە بە ئەنقەست خۆیان لەو جەنگە بەجێ نەهێشتوە.

**مەسەلەی سێیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

پێشێ خوا باسی چوار جۆرە کەسی کرد، لە خەڵکی مەدینەو عەرەبە بیابان نشینەکان، وە جگە لە وانیش، کە خوای دادگەر لۆمەو سەرزەنشتیان ناکات، وە هیچ کەسێك بۆی نیە ڕەخنەیان لێ بگرێ، وە گوناهبار نین، وە ئەوانە هیچ سەغڵەتییەك ڕوویان تێناکات، کە بریتی بوون:

١- بێهێزو لاوازەکان.

٢- نەخۆشەکان.

٣- کەم دەرامەتو بێ ئیمکانیەتەکان.

٤- ئەوانە کە نەیانتوانیوە وڵاخو وەسیلەی ئەو سەفەرە دوورە دابین بکەن، وە زۆریش خەفەتیان پێ خواردوە.

بەڵام دیارە بەو مەرجە کە دڵسۆزیی بنوێنن بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، وە چاکەکاریش بن، ئەوانە خوا فەرموویەتی: ڕێی گلەییان ناچێتە سەر، ئەدی بابزانین ڕێی گلەیی دەچێتە سەر کێ؟

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ﴾ ڕێ، واتە: ڕێی ڕەخنە لێگیران، ڕێی گلەیی لێکران، ڕێی سەرزەنشتو سەرکۆنە، ڕێی گوناهبار بوون، تەنیا دەچێتە سەر ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ وەردەگرن، لە حاڵەتێکدا کە دەوڵەمەندیشن.

کە دەفەرموێ: دەوڵەمەندن نەیفەرمووە : ساغیشن، چونکە دیارە ساغ بوون، واتە: تەندروست بوون، توانای جەستەییان هەبووەو، توانای ماددییو ماڵو سامانیشیان هەبووە، ئەدی بۆچی مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتوە، نەچن بۆ جەنگی تەبووك؟ ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ ﴾، ڕازیبوون کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماو لە ماڵدا دابنیش، یانی: لەگەڵ ژنو منداڵ دا دابنیشن، ﴿وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾، وە خوا مۆری بەسەر دڵەکانیانەوە ناوە، ﴿فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بۆیە {لە ئەنجامی ئەو مۆر بەسەر دڵنرانەوەدا} نازانن، یانی: کە مۆریان بەسەر دڵەوە نراوە، لەلایەن

خوای کارزان‌و دادگەرەوە، ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی کە نەزانن، چی نەزانن؟ نەزانن کە بەجێمان لە جەنگی تەبوك‌و لە پێغەمبەر ﷺ، چ تاوانێکی گەورەیە ! چ عەیبدارییەکی گەورەی لای خەڵکەو، چ گوناهبارییەکی گەورەیە لەلای خواوە ! چ شەرمەزارییەکی قیامەتە، وە نەزانن کە ئەگەر هاتباو مسوڵمانان هەموویان وەك ئەوانیان کردبایە، هەموویان دەبوون بە پۆڕی خوراو، ئەگەر خەڵك هەموو وەك ئەوانی کردبایەو بە برو بیانووی بێجێ، لەگەڵ ژن‌و منداڵدا مابانەوەو، دوژمن هەڵیکوتابایە سەریان‌و ڕۆمەکان بەسەریانداداban، کەسیان لێی سەلامەت نەدەبوو! وە نازانن کە هەمیشە پابەندیی بە شەریعەتەوە، بەختەوەریی دنیاو سەربەرزیی دوارۆژی تێدایە! وە نازانن کە فەرمانبەریی بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، هەمیشە سەلامەتیی تێدایە ! سەلامەتیی لە عەیبداریی دنیا، وە لە گوناهباریی قیامەت!

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ﴾، (أي: سَبِيلُ المُؤَخَذَةِ هِيَ عَلَى المُستأْذِنِينَ الأَغْنِياء فَحَسْب) ڕێگای لێپرسینەوە، ڕێگای گوناهبار بوون‌و ڕەخنە لێگیران‌و سەرزەنشت کران، تەنیا لە مۆڵەت وەرگرانی دەوڵەمەندە.

وشەی (سبیل)، دەڵێ: الألف واللام للعهد والمعهود هو (سبيل) المنفي في قوله: ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾، واتە: ئەلیف‌و لامی سەر (السبیل) (أل)ی (عهد)ە، کە وەك (کە)ی کوردیی وایە، کە دەڵێی کتێبێکم خوێندەوە (قرأت کتاباً) دوایی کەسە دوێنراوەکە، ئەگەر بڵێ: کتێبەکەم بۆ بێنە، (جئني بالکتاب) ئەو (أل)ە، سەر (الکتاب) لە شوێنی (کە)ی کوردییە، کتێبێکم خوێندەوە. (کتێبەکەم) واتە: دەزانین کامەیە، کە دەڵێ: کتێبەکەم بۆ بێنە.

لێرەش ئەو (أل) بۆ (عهد)ە، ئەویش ئەو ڕێیەی کە زانراوە، کە بریتیە لەو ڕێ (سبیل)ەی کە نەفی کراوە، لە قسەی خوای بەرزدا کە دەفەرموێ: ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾، چاکەکاران ڕێیان ناچێتە سەر، یانی: ڕێی گلەیی‌و لێپرسرانەوە، ڕێی سەرزەنشت کران، ڕێی گوناهبارکران، ڕێی سەغلەتکرانیان. ناچێتە سەر.

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ﴾، واتە: ڕێی سەغڵەت کران و گوناهبار کران و سەرزەنشت کران دەچێتە سەر کێ؟

﴿عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ﴾ تەنیا دەچێتە سەر مۆڵەت وەرگرانی دەوڵەمەند، (أي إِنَّمَا السَّبيل المَنْفِي عَنِ المُحْسِنِين، مُثبَّتٌ للّذِينَ يَستأْذِنُونَكَ) ئەو ڕێیەی کە نەفی کراوە لە چاکەکاران، ئەو ڕێی سەرزەنشت و گلەییە، چەسپێنراوە بۆ ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ وەردەگرن و دەوڵەمەندیشن.

واتە: ئەوانە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە کە نەیەن، بۆ جەنگ، ئنجا ئەمە وەك ئەو قسەیەی خوای بەرز وایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾﴾الشوری.

واتە: وە هەر کەسێك تۆڵەی بکاتەوە، دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە، ئا ئەوانە ڕێیان ناچێتە سەر، واتە: ڕێی گلەیی ڕێی سەرزەنشت کران، ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾﴾الشوری.

واتە: بێگومان ڕێ، {ئەو ڕێیەی کە دەزانین کامەیە، ڕێی گلەیی} تەنیا دەچێتە سەر ئەوانەی کە ستەم لە خەڵك دەکەن، وە لە زەویدا دەستدرێژیی دەکەن بە ناهەق، ئا ئەوانە سزایەکی بە ئێشیان هەیە.

هەروەها لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (٣٤)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾.

ئەگەر ئافرەتان فەرمانبەرییان بۆ کردن و گوێڕایەڵییان کردن {لە سنووری شەرعدا} لێیان لە بیانوو مەبن، ڕێی بیانوویان بۆ مەدۆزنەوە، لە ڕێی بیانوو پێ گرتن و، ناڕەحەت کردن و، سەغڵەت کردنیان، مەخەفتێن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ﴾، پێشتر باسمان کرد (خوالف) کۆی (خالفة)یە واتە ئافرەتێکی بەجێماو، دەشگونجێ بە ئینسانی خراپو خراپەکارو بێ کەڵك بگوترێ : (خالف) یان (خالفة)، دیارە بۆ پیاو دەگوترێ (خالف)و بۆ ئافرەت کە دەگوترێ: (خالفة)، ئنجا (خالف) بە (خالفین) کۆدەکرێتەوە، وە (خالفة) بە (خوالف) کۆدەکرێتەوە.

ئنجا وەك چۆن (خالف) و (خالفة) بە پیاوو ئافرەتی بەجێماو دەگوترێ هەروەها بە پیاوو ئافرەتی بێ کەڵكو بێ سوودو خراپەکارییش دەگوترێ.

خوا دەفەرموێ: ئەوانە ڕازیبوون کە لەگەڵ ئافرەتانی بەجێماوو بێ کەڵکد بن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ناجوامێرییە بۆ پیاوان، عادەتی ژنان ڕەچاو بکەن بۆیە لە کوردەواریی خۆماندا بە پیاوێك کە لاسایی ژنان بکاتەوە: دەڵێن (پیاوێکی سەر ژنانیی)یە، پیاو ئەگەر وەك ئافرەت بکات، نوقسانیە، هەروەك چۆن ئافرەتیش لاسایی پیاو بکاتەوە، دیسان نوقسانیە بۆخۆی، چونکە دیارە ژنایەتیی خۆی بە کەم دەزانێ، بۆیە دەیەوێ حاڵە سروشتییەکەی خۆی بگۆڕێ، بۆ حاڵێکی ناسروشتییو چاو لە پیاوان بکات! هەر بۆیەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَعَنَ اللهُ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ﴾، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٣٠٦٠)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٥٥٤٦)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٠٩٧)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٧٤٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (١٩٠٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ، برقم: (١١٥٠٢)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا نەفرینی کردوە لە پیاوانێك کە خۆیان وەك ژنان لێدەکەن، وە لە ژنانێك کە خۆیان وەك پیاوان لێدەکەن.

بۆچی؟ چونکە خوای کاربەجێ سروشتێکی تایبەتی بە هەر کام لە پیاوانو ئافرەتان داوە، بەهۆی ئەو سروشتەی خۆیانەوە، کۆمەڵێك ئەرك ئەنجام دەدەن، کە ئەو ئەرکانە بۆ کۆمەڵگا پێویستن: ئافرەت بەهۆی سروشتەکەی خۆیەوە کە سروشتی ئافرەتانەیە، دەتوانێ ئەرکی دایکایەتییو منداڵ بەخێو کردنو، ئەرکی

ماڵداریی کردن، ئەنجام بدات، ئەو نەرمو ناسکییەیی لە ڕووحو جەستەی ئافرەتدا هەیە، لە دەنگیدا، لە سروشتیدا هەیە، ئەرکەکانی ئەومیان پێویستە، وە ئەو زبریی‌و سەختییەی کە لە ڕووحی پیاودا هەیە، لە جەستەی دا، لە دەنگی زڕی دا، ئەرکەکانی ئەویان پێویستە، بەو هۆیەوە پیاو زیاتر دەتوانێ تەحەممولی سەختیی‌و ناڕەحەتییەکان بکات، بەڵام ژیان وەك چۆن پێویستیی بە تەحەممولی سەختیی‌و ناڕەحەتییان دەکات، پێویستیی بە نەرم و ناسکییش‌و بە نەرمو نیانییش دەکات، پێویستی بە ڕەحم‌و عاتیفەش دەکات، کەواتە: هەر کامێك لە پیاوان‌و ئافرەتان دەبێ پارێزگاریی بکەن لە سروشتی خۆیان.

لێرەدا خوا ﷻ وەك تانە لێدان دەفەرموێ: ڕازیبوون کە وەك ئافرەتانی بەجێماو بن‌و لەگەڵ ئەواندا بن، هەڵبەتە زۆرجاران ئافرەتانیش چوون بۆ جەنگ، بەڵام لە پشتی سوپاوە خزمەتیان کردوەو ڕۆڵیان بینیوە، بریندارایان گواستووتەوە، ئاویان بۆ برینداران بردوە، جەنازەیان گواستوتەوە، وەك لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتوە بەڵام ئافرەتان نەچوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کردەیی، مەگەر بەدەگمەن، یانی: چەکیان بەکارنەهێناوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە سروشتی پیاوان زیاتر بۆ جەنگ دەشێ، ئێستاش لە هەموو دنیادا هەروایە، زۆربەی سوپایەکان لە پیاوان پێکدێن.

ئنجا ئەگەر ئافرەتێك لەگەڵ سروشتی خۆیدا ڕاست بکات، بۆ ئەو فەزیلەتە، بەڵام پیاوێك پێچەوانەی سروشتی خۆی بجووڵێتەوەو، خۆی بخاتە سەر سروشتی ئافرەتان، ئەوە نوقسانییە، هەروەك ئافرەتێکیش کە لاسایی پیاو بکاتەوە، بۆی نوقسانییە.

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، وە خوا مۆری بەسەر دڵەکانیانەوە ناوە، بۆیە نازانن، لە ئایەتەکەی پێشتر دەفەرموێ: ﴿وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾، مۆر بەسەر دڵیانەوە نراوەو نافامن، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: نازانن.

کاتی خۆی باسمان کرد: کە چەمکی وشەی (فقه)و (علم)، لە یەك جیان.

(علم) ئەوەیە کە تۆ شتێك بزانی، (العِلْمُ: إِدْرَاكُ شَيءٍ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْهِ) زانیاری بریتیە لە زانینی شتێك بەو شێوەیە کە لە واقیعدا لەسەریەتی.

بەڵام (فقـه) بریتیـە لـە پـەیـبـردن بە شتێکی نەزانراو، بەهۆی شتێکی زانـراوەوە واتـە: (فقـە) تایبەتتـره لـە (عـلم)، دەشـگونجێ بڵـێین: (الفقـە: هـو إدراك مـراد المتكلم)، (فقه) بریتیـە لـە پـەیـبـردن بە مەبەستی ئـەو کـەسـە کە قسەکە دەکات یاخود ئەو کەسـەی کە قسەکەی گوتوە یاخود ئەو کەسـەی کە شتـەکەی نووسـیوە کە ئـەمـەیـانم پـێ لە ڕاستییـەوە نیزیکتـرە.

یانـی: (عـلم) بریتیـە لـە زانینی ڕواڵەتی قسەکە، بەڵام (فقـە) بریتیـە لـە زانینی ئـەو مەبەسـتـەی کـە ئـەو ویستوویـەتی، جاری وایـە قسـەیـەك دەگـرێ، ڕواڵەتـەکـەی پـێ مەبەست نیـە، بەڵکو مەبەسـتـەکـەی تێدا شێردراوەتـەوە یـاخود، دەبـێ لـە پشتی وشـەکانەوە، مەبەسـتـەکە دەرك بکـرێ.

<u>مەسـەلـەی چـوارەم:</u> کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿يَعۡتَذِرُونَ إِلَيۡكُمۡ إِذَا رَجَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡۚ قُل لَّا تَعۡتَذِرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكُمۡ قَدۡ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنۡ أَخۡبَارِكُمۡۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٤﴾﴾.

ئـەمـە وەك پێشتـر گوتمان: هـەواڵدانە بە شتێکی نـادیـار، کـە دەفـەرموێ: هـەر کاتێك گەڕانەوە بۆ لایان، پۆزشتان بۆ دێـننەوە، ئەم تـەعبیـرەش لێیوەردەگیـرێ کـە بەردەوام ئـەوە عادەتیـانە: ﴿يَعۡتَذِرُونَ إِلَيۡكُمۡ إِذَا رَجَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡۚ﴾، هەر کاتێك ئێـوە گەڕانەوە بۆ لایان، عوزرتان بۆ دێـننەوە، واتـە: ئەوە یەکەم جارو دوا جاریشـیان نابێ، هـەمیشە کـاتێك کە لـە هـەڵوێـستێکی جوامێرانـە بـەجێ دەمێـنن، دوایـی کـە دەچنـەوە بۆ لایان، پۆزش دێننەوەو داوای لێبوردن دەکەن‌و، دەیانەوێ کارەکانیـان بە پینـەو پـەڕۆیـان چـاك بکـەن، بەڵام وەك پێشینـان دەڵێن: {ئـەوەی لـە سـووری تێـی دۆڕاند، لە لابا بۆ تێهـەڵنـایەتەوە}، بابـای جوتیار کە خـەرمانی سـوور کـردوە کـاتی خۆی، دوای ئەوەی گێرە کراوەو، بۆتە کاو کۆتەڵ‌و لەگەڵ دەغڵەکەدا شەن کراوە، کە شەن دەکرێ‌و بە (سێلکە) یـان بە (شـەن)، کـاو دەغڵەکە پێکەوە هـەڵـدەدرێ، ئنجـا ئەگەر بای بـێ، با کـایەکە بەولادا دەبات‌و، دەغڵەکە لـە شوێـنی خـۆی دەمێنێتـەوە.

ئنجا جاری وایە کە کابرا نەزانێ شەن بکات، یان بایەکەی زۆر بەقوەت بێ، جۆیەکە، یان گەنمەکە لەگەڵ کایەکەدا دەڕوات، ئنجا ئەومیە دەڵێن: (ئەوە لە سوور تێی دۆڕاندوە) تۆ کە لە سووری جۆخینێ تێت دۆڕاندو، دەغڵەکە بەدەم باوە چوو، زەرەرت کرد، دوایی هەرچەندە بێی لە (لابا)یەکە (کاو کۆتەڵە)کە دووبارە لە بێژینگ بدەیەوە، قەرەبووی ناکەیەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ﴾، هەرکات گەڕانەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە سووڕەتی (توبة) دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لە جەنگی تەبووك هاتۆتە خوار، ئەمە زۆر زۆر ڕۆشنە، کە ئەم سووڕەتی (توبة) کاتێك هاتۆتە خوار، کە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان گەڕاونەوە بۆ مەدینەو، لە مەدینە هاتۆتە خوار، دوای جەنگی تەبووك، چونکە دەفەرموێ: ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ﴾، یانی: جارێ هەر بەڕێوە بوون، خوا هەواڵی پێداون، وەك هەواڵ پێدان بە نادیار کە ئەوەش ئیعجازێکی دیکەی قورئانە، چونکە هەر بەڕێوە بوون، خوا فەرموویەتی: هەر کاتێك گەڕانەوە بۆ لایان، بۆ لای ئەو خەڵکە: بێ پاساو بەجێماوە لە مەدینە، وەك عادەتی هەمیشەیی یان عوزرو پۆزشتان بۆ دێننەوە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ ﴾، پێیان بڵێ: پۆزش و بڕو بیانوو مەهێننەوە، بڕواتان پێ ناکەین، بۆچی؟

﴿ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ﴾، بێگومان خوا لە هەواڵەکانی ئێوە ئاگاداری کردووینەوە، واتە: نەك هەر هەواڵی ئەو ڕەفتارەتان، بەڵکو چی دیکەشتان کردوە لە مەدینەدا، چ کەین و بەینێکتان بووە، هەموو هەواڵەکانی ئێوە خوای شارەزا ئێمەی لێ ئاگادار کردۆتەوە، کەواتە: بڕواتان پێ ناکەین، چونکە دەزانین ڕاست ناکەن.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، وە لە مەودوا خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کردەوەی ئێوە دەبینن.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کردەوەکانی پێشێتان کە بەجێمان بوو لە جەنگی تەبووك بەبێ بەڵگەو پاساو، بێ ئەوەی عوزرێکی راستەقینەتان هەبێ، ئەو کردەوەیەتان خوا ئێمەی لێ ئاگادار کردۆتەوە، وە کردەوە خراپەکانی دیکەشتان خوا ئێمەی لێی ئاگادار کردۆتەوە، ئنجا لەمەودوا ئەگەر بتانەوێ قەرەبووی ئەوەی رابردوو بکەنەوەو، کردەوەی باش ئەنجام بدەن، کردەوە باشەکەتان خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیبینن لە دنیادا، وە دوایی لە دوارۆژیشدا دەگێڕرێنەوە بۆ لای زانای پەنهان و ئاشکرا کە خوایە ﷻ، کەواتە: ئەوەی رابرد رۆیی، بەڵام لەمەودوا کاری باش بکەن، وە دڵنیا بن کە خوا ﷻ کارەکەتان دەبینێ و ئاگادارە وە پێغەمبەرەکەشی ﷺ دەیبینێ، یان خوا ئاگاداری دەکاتەوە، وە وەك لە ئایەتی دیکە هاتوە، بڕوادارانیش دەیبینن، کەواتە ئەوەی رۆیوە لێیگەرێن پەندی لێوەربگرن، وە پێویستیش ناکات بڕو بیانو بهێننەوە بە پینەو پەرۆ درۆ دەلەسە، خۆتان بپەرێننەوە، وەك من پەندێکم داناوە لەوبارەوە دەڵێم: (دان بە هەڵەی خۆ داهێنان، مەسرەفی زۆر کەمە)، کەسێك هەڵەیەکی کرد ئەگەر دانی پێدا بێنێ و بڵێ: هەڵەم کرد، خەرجییەکەی زۆر کەم دەبێ، نەك بێنێ ئەو هەڵەیەی بە دە هەڵەی دیکە پینەو پەرۆ بکات، بە درۆو دەلەسەو بە بڕو بیانوو هێنانەوە، پۆزش هێنانەوەو بیانووی بێجێ، مەسرەفێکی زۆری دەوێ، وە ڕەنگە هیچ سوودێکی نەبێ، بۆیە لە هەمووی باشتر ئەوەیە کەسێك کە هەڵەیەك و کەموو کوڕییەك دەکات، بڵێ هەڵەم کرد، ئنجا لەگەڵ خوادا کردی، یان لەگەڵ خەڵك دا.

کە دەفەرموێ: ﴿ عَـٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ﴾، (عالم) واتە: زانا، (الغَيْب مَا غَابَ عَنْ عِلْمِ الناس)، هەر شتێك کە لە زانیاریی خەڵك پەنهان بێ، واتە ئەوەی کە خەڵك نایزانێ.

(الشَّهادَة: المُشاهَدَ، الأَكْوَانُ الظَّاهِرَة، مَجْمُوع مَا يُدْرَك بالحِسّ).

(شهادة) بریتیە لە بینراو، وە دیاردە سروشتیەکان، وە هەموو ئەوەی کە بە هەستەوەرەکان هەستی پێ دەکرێ و پەی پێ دەبردرێ.

کەواتە: ﴿ عَـٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ﴾، واتە: زانای پەنهان و ئاشکرا، چ ئەوەی کە خەڵك هەستی پێ دەکات، چ ئەوەی کە خەڵك هەستی پێ ناکات، خوا هەمووی دەزانێ.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەواڵتان پێدەدات بەوەی کە دەتانکرد، ئەمە هاندانیانە بۆ فەرمبووکردنەوە، واتە: هەرچی بیکەن لەمەودوا، خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانن، وە خوا هەواڵتان پێ دەدات، واتە: پاداشتتان دەداتەوەو کردەوەکەتان بۆ دەپارێزێت، وە دێتەوە ڕێتانو بەرچاوتان.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ ۖ فَإِن تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾.

لەم دوو ئایەتەدا خوای تاكو پاك، دیسان وەك هەواڵ پێدان بە نادیار، هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺو ئیمانداران دەدات هەر بەڕێوە، لە کاتێك دا کە لە جەنگی تەبووك دەگەڕێنەوەو، بەڕێوەن بەرەو مەدینە، خوا دەفەرموێ: لەمەودوا، (واتە: کە گەڕانەوە) ئەوانە سوێندتان بۆ دەخۆن بە خوا، وە هەر کاتێك گەڕانەوە بۆلایان بۆئەوەی ڕوویان لێ وەرگێڕن، یانی سەرزەنشتیان نەکەنو، سەرکۆنەیان نەکەن، ﴿ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ ﴾، واتە: تاکو ڕوویان لێ وەرگێڕن، ﴿ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ ﴾، ئێوەش ڕوویان لێ وەرگێڕنو ڕوویان مەدەنێ، پشت گوێیان بخەن ﴿ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ﴾، ئەوانە پیسن، واتە: بەهۆی ئەو هەڵوێستە خراپانەیانەوە، ناخی خۆیانو ڕووحی خۆیان پیس کردوە، لە ڕووی مەعنەوییەوە، ئەگەرنا وەك پێشتر باسمان کرد: مرۆڤ پاکە، وە بە زیندوویيو بە مردوویی مرۆڤ ڕێز لێگیراوەو پاکە، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە، ئینسان بەهۆی گوناهو تاوانو کوفرو نیفاقەوە، ناخی خۆیو ڕووحی خۆی پیس دەکات ﴿ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، وە جێگای تێدا پشوودانیان، دۆزەخە بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد.

(مأوى): ئەو شوێنەیە کە ئینسان پەنای پێ دەبات، یاخود تێیدا پشوو دەدات و ئیسراحەت دەکات، ئنجا جێی پشوودان و پەنا پێ بردنی ئەوان، دۆزەخە بەهۆی ئەوەوە کە ئەنجامیان دەدا.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ ﴾، بۆچی سوێندتان بۆ بە خوا دەخۆن کاتێك کە گەڕانەوە بۆ لایان؟

﴿ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ ﴾، ئەمە هۆکاری سوێند بۆ خواردنەکەیانە، (عِلةُ الحَلِفِ باللّه) کە ڕوویان لێ وەرگێڕن و، پشتیان تێبکەن و، گوێیان نەدەنێ و، وازیان لێبێنن.

﴿ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ ﴾، واتە: پشتگوێیان بخەن، وە ئیهمالیان بکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ﴾، ئەوەش (تَعْليلٌ لِلأَمْرِ بالإعرَاض) بۆچی پشتگوێیان بخەن و، وازیان لێ بێنن؟

چونکە پیسن، کە لێرەدا مەبەست تەشبیھ کردنیانە بە شتی پیسەوە لە سووکیی و لە کەمیی دا، وە مەبەستیش لە پیسیی، پیسیی مەعنەوییە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، یانی: ئەگەر هەر لەسەر حاڵەتی کوفرو نیفاقی خۆیان بمێننەوە، شوێنی ئیسراحەت تێدا کردن و پشوودانیان لە دواڕۆژدا، دۆزەخ دەبێ.

ئنجا دووبارە دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ ﴾، سوێندتان بۆ دەخۆن تاکو لێیان ڕازی بن .

لێرە دووبارەی نەکردۆتەوە، سوێند بە چی دەخۆن؟ چونکە لە ئایەتی پێشوودا دەفەرموێ: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ ﴾، تەماشا بکەن لە قورئاندا وشەو پیتێکی زیادیشی تێدا نیە، لە ئایەتی پێشێدا فەرمووی: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ ﴾. ئنجا پێویست ناکات لێرە بفەرموێ: (یحلفون باللّه لکم)، چونکە سوێند هەر بە خوا دەخورێ، عادەتی مسوڵمانان وایە، تەنیا سوێند بەخوا دەخۆن، بەڵێ

ئەوانەش مونافیق بوون، بەڵام دیارە خۆیان بە مسوڵمان پیشانداوە، بۆیە عادەتی مسوڵمانانیان ڕەچاو کردوە.

ئنجا بۆچی سوێندتان بۆ دەخۆن؟

﴿لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ﴾، تاکو لێیان ڕازی بن، بەڵام هی پێشێ ﴿لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡ﴾، بۆئەوەی ڕوویان لێ وەرگێڕن‌و وازیان لێ بێنن‌و سرزەنشتیان نەکەن، بەڵام ئەمەیان ئامانجەکەیان بەرزتر کردۆتەوە، هەر بەوەندە وازناهێنن کە پشتیان تێبکەن‌و ڕوویان لێ وەرگێڕن، بەڵکو، تاکو لێیان ڕازی بن، واتە: جاری یەکەم سوێندتان بۆ دەخۆن، تاکو وازیان لێ بێنن، ئنجا کە وازتان لێ هێنان، دووبارە دێنەوە سوێندتان بۆ دەخۆن، بۆئەوەی دڵنیابن‌و لێشیان ڕازی بن‌و، بزانن کە لێشتان لە دڵ نەگرتوون، وە عوزر هێنانەوە درۆینەکەیانتان، بە ڕاست زانیوە!

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾.

ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازیبن، لەبەرئەوەی کە نایانناسن، ئەوە خوا لە کۆمەڵی لادەران ڕازی نابێ .

جاری وایە کەسێك خزمێکی مونافیقی بۆ [redacted] دێ، سەد سوێندی بۆ دەخوات ئەویش قەناعەتی دێ کە ڕاست دەکات‌و لێی ڕازی دەبێ‌و گلەیی لێ ناکات، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ﴾، ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ بێگومان خوا لە کۆمەڵی لادەران‌و لاڕێیان ڕازی نابێ.

لێرەدا دەڵێ: (وُضِعَ الظَّاهِرُ مَوضِعَ المُضْمَر للدلالَة عَلَى ذَمِّهِم وَتَعْلِيل عَدَمِ الرِّضَى عَنْهُمْ).

ئنجا ئایا بۆچی خوا نەیفەرمووە: (فإن الله لا يرضى عنهم) بێگومان خوا لێیان ڕازی نابێ، کە ئەگەر واشیفەرمووبایە ڕاست بووو کورتتریش بوو؟!.

دەڵێین: بۆیە خوا ﷻ لە جێی ئەوە کە ڕاناو بەکاربێنێ: (فإن الله لا یرضی عنهم) ناوی ئاشکرایانی بەکارهێناوە، یانی: نازناویان، یاخود پێناسەی ئاشکرایان:

یەکەم : بۆ ئەوەی بەوە سەرزەنشتیان بکاتو سەرکۆنەیان بکات، کە ئەو سیفەتەیان تێدایە.

دووەم : بۆئەوەی خوا ﷻ هۆکاری ئەوە بخاتە ڕوو کە بۆچی لێیان ڕازی نیە؟

یانی: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾.

لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (لا یرضی عنهم) ئەوە دوو ئامانجی پێکاون:

یەکەم : دەریخستوە کە ئەوانە کۆمەڵێکی لادەرو لاڕێن.

دووەم : هۆکاری ڕازی نەبوونی خوا لێیان ئەوەیە کە ئەوانە لادەرو لاڕێن.

هەردوو ئامانجەکەی بەو تەعبیرە پێکاون، واتە ڕستەکە بەو شێوەیەی لێدێتەوە: (فإن ترضوا عنهم، فإن الله لا یرضی عنهم، لأن الله لا یرضی عن القوم الفاسقین) ئەوە هەمووی لەوەدا، کە لە ئایەتە موبارەکەکە دایە، کورت کرایەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾﴾.

لێرەدا خوای بەرزی مەزن باسی عەرەبە بیابانشینە کافرو مونافیقەکان دەکات. سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا﴾، عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکان، لە کوفرو نیفاقدا زۆر ڕۆچووترنو توندترنو سەختترن.

یانی: کوفرێك کە لەواندا هەیە، نیفاقێك لەواندا هەیە، زۆر بێ ڕەزاترە زۆر سەختو خەستو خۆلتـرە، ﴿وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾، وە شایستەترن بۆئەوەی سنوورەکانی ئەوەی کە خوا دایبەزاندوەتە سەر پێغەمبەر ﷺ نەیزانن‌و نەشارەزابن بێ ئاگابن.

کە دەفەرموێ: ﴿أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾، دیارە هەردووکیان ﴿أَشَدُّ﴾، لەگەڵ ﴿وَأَجْدَرُ﴾، هەردووکیان (إسم تفضیل)ن، دەڵێ: (إسْمَا تَفْضِيل، وَلَمْ يُذْكر مَعَهُمَا مَا يَدلّ عَلَى مُفَضَّلٍ عَلَيْهِ وَالظَّاهِرُ هُوَ أَهْلُ الحضَرِ).

کە دەفەرموێ: ﴿أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا﴾، کوفرەکەیان‌و نیفاقەکەیان توندترە لە هی کێ؟

وە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾، شایستەترن بەوەی کە سنوورەکانی ئەوەی خوا دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، نەیزانن، لێرەدا ئەوەی کە بەسەریدا هەڵبژێردراون، واتە: (مُفَضَّل علیه)ەکە دیار نیە، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی خەڵکی شار نشین بێ، یانی: عەرەبە خێڵەکییەکان کوفرو نیفاقەکەیان لە هی شارنشینەکان توندترە، وە شایستتریشن بەوەی بێئاگاو نەشارەزا بن لە شەریعەتی خواو لە حەڵاڵ‌و حەرامی خواو، لەو سنوورانەی کە خوا دایبەزاندوونە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەویش لەبەرچی؟

دەڵێ: (وَذَلِكَ لأَنَّ غِلَظ القُلُوبِ وجلافَة الطَّبْعِ تَزِيدُ النُّفُوس السيئة وَحْشَة وَنُفُورَاً) لەبەرئەوەی کە دڵ ڕەقیی، وە سروشت زبریی، نەفسە خراپەکان زیاتر خراپ دەکات، وە زیاتر وایان لێدەکات کە لە چاکە بسڵەمنەوە.

بەڵام ئەو ئایەتە دەلوێ مانایەکی دیکەشی هەبێ، وەك (محمد الطاهر بن عاشور) گوتوویەتی: {يَجُوزُ أَنْ يَكُون أَشَدَّ وَأَجْدَرُ مَسْلُوبَي المُفَاضَلَة، مُسْتَعْمَلِينِ لِقُوَّة الوَصْفَينِ فِي المَوصُوفِينِ بِهِمَا عَلَى طَرِيقَة قَوْله تَعَالى: ﴿ قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ

إِلَىَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ ﴿٣٣﴾ ﴾ يوسف، فالـمَعْنى: أنَّ كُفْـرَهُمْ شَـدِيدٌ الـتَّمَكُّنِ مِـن أنْفُسِهِم وَنِفَاقَهُم كَذَلِكَ) [(١)].

واتـە: دەگونجێ ﴿ أَشَدُّ ﴾، و ﴿ وَأَجۡدَرُ ﴾، مەبەست پێیان (مُفاضَلَة)ە نەبێ. یانی: مەبەست پێیان ئـەوە نەبـێ، هەڵبژێردرێـن بەسـەر شتێکی دیکـەدا، بەڵکو بـەکارهێنراون بـۆ گەیانـدنی ئەوەیـە کـە ئـەو وەسفەی لـە مەوصوفەکەیاندایە زۆر بـەهێزە، وەك چـۆن خـوای بـەرز لەسـەر زمـانی یوسـف دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ ﴾، گـوتی: پـەروەردگارم ! زینـدان بەلامـەوە خۆشەویسـترە لەوەی کە منی بۆ بانگ دەکەن، بێگومان ئەوەی کە بۆی بانگ دەکەن. کە بریتیە لە زیناکردن، لەگەڵ زیندانییکردن، هیچیان خۆشەویست نین، بەڵام لێرەد مەبەست ئەوەیە کە هەرچۆن بێ، لە زینداندا بمێنمەوە، لە لام هەڵبژێردراوترە، دەنا هیچیان هەڵبژێردراو نین، لێرەشدا مەبەست ئەوەیـە، کە کوفرو نیفاقێ کە لـە دڵـی عەرەبە خێڵەکییە بیابانشینەکاندا هەیە، وە نەشارەزاییان بە سنوورەکانی شەریعەتی خوا، زۆر لە دەروونیاندا ڕۆچوویەو، بۆتە سیفەتێکی بنـەڕەتییو کاریگەر تێیاندا.

وشـەی ﴿ وَأَجۡدَرُ ﴾، دەڵێ (الأحق والجدارة : الأولويـة) واتـە: شایسـتـەترو خـاوەن مافتـرو لـە پێشتـر بوون.

(الحدود: المقاديـر والفواصل بين الأشيـاء).

(حدود) کۆی (حد)ە، واتە: سنوور، کە مەبەست پێی ئەندازەکانو نێوانانەکانن کە لە نێوان شتـەکاندا دادەنرێـن.

واتـە: ئەوان شایستـەترن لە خـەڵکی شارنشین، بەوەی نەشـارەزاترین لـە حـەڵاڵو حەڕامی خـواو، لـە ئـەمرو نەهییـەکانی خـواو، لـەو سنوورو نێوانو سێوانـانەی کـە حەڵاڵو حـەڕامو، چاکـەو خراپـەکان، لێك جیـادەکـەنەوە، کە خـوای پـەروەردگـار بـۆ پێغەمبەری خۆی دایبەزاندوون، ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، وە خـوا زانای کـارزانـە.

---

١) التحرير والتنوير، ج ١١، ص ١٢.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا ﴾، وە لە عەرەبە خێڵەکیە بیاباننشینەکان کەسانێك هەن، ئەو ماڵەی خەرجی دەکەن بۆ جەنگو جیهاد، یاخود وەك زەکات دەیبەخشن، پێیان وایە بە زۆر لێیان ستێنراوە دەڵێ (المَغْرَمُ: مَا يُؤْخَذ مِنَ المَالِ قَهْراً وَظُلْماً) هەر ئەندازەیەك كە لە ماڵ بەزۆر لێت بستێنرێو بە ستەمو بە ناچاریی، پێی دەگوترێ: (مَغْرَم)، بە كوردیی دەڵێن: تاوان، یان پێی دەڵێن: خاوە، ماڵێك كە لێت دەستێنرێ بە ناچاریی، وە تۆ بە نا بەدڵیی دەیدەی، وەك چۆن ئیشێكت كە بەزۆر پێ دەكرێ، پێی دەگوترێ: (بێگار)، ماڵێكیش كە بە زۆر لێت دەستێنرێ، پێی دەگوترێ: خاوە، یان تاوان.

دەفەرموێ : لە عەرەبە خێڵەكییەكان كەسانێك هەن، ئەوەی كە خەرجی دەكەن لە ماڵو سامان ـ بە حیساب لە ڕێی خوادا خەرجی دەكەن ـ پێیان وایە كە بە زۆر لێیان ستێنراوە، وەك خاوەو تاوان.

وشەی ﴿يَتَّخِذُ ﴾، واتە: (يَعُدُّ وَيَجْعَلُ) وای تەماشا دەكات، وای دەژمێرێ، (لأن اتَّخَذَ من أخوات جعل، وجعل يُطْلَقُ بمعنى التغيير من حالة إلى حالة).

وشەی (اتخذ) لە دەستە خوشكەكانی (جَعل)ـە، (جَعل، صَارَ، كَانَ، أصبح...)، ئنجا (جَعل) بریتیە لە گۆڕینی شتێك لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێك.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ﴾، (التَرَبُّصُ: الإِنْتِظَارُ) چاوەڕێ كردن، بەڵام چاوەڕێ كردنی ئەوە كە بەرانبەرەكەت شتێكی بۆ بێتە پێش، (دَوَائِر جَمْعُ دائِرَة، وَهِيَ تَغَيير حَالَةٍ مِنَ الإِسْتِقَامَةِ إلى الإختلال).

(دائرة) بریتیە لەوە كە حاڵی ئینسان لە ڕێكییەوە بگۆڕێ بۆ تێكچوون، كۆی (دائرة)، (دَوَائِر)ـە.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ﴾، واتە: چاوەڕێی تێكچوونتان لێ دەكەن، چاوەڕێی بەڵایانتان بۆ دەكەن، چاوەڕێی نەهامەتییتان بۆ دەكەن، ﴿ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ﴾، بەڵای خراپیان بەسەربێ، ئەمە تووكو دوعایەو، دوعاش

لەلایەن خواوە، بەرانبەر بە دروستكراوەكانی، هێنانە دی ئەو شتەیە، كە داوا دەكرێ چونكە خوا ﷻ داوا لە كێ بكات، بۆ ئەو شتە بكە؟ یان لە كێ بپاڕێتەوە؟

كەواتە: دوعای خوا، كە دەفەرموێ: (قاتلهم الله) خوا بیانكوژێ، یان خو لەعنەتیان لێ بكات، یانی: لەعنەتیان لێبوو، وە كوژران و لەبەین چوون.

لێرەش كە دەفەرموێ: ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾، بەڵای خراپ لەسەر وان، یانی بەڵای خراپ بە كردەوە دەچێتە سەر ئەوان، چونكە تووك و دوعای خوا ﷻ هێنانەدی (تكوین)ە، تێكەڵ لەگەڵ بە كەم تەماشاكردن و بە سووك دانان، چونكە هیچ شتێك نیە، بڕیاری خوا بگێڕێتەوەو بەرپەچ بداتەوە.

ئنجا وشەی: ﴿دَآئِرَةُ﴾، بە مانای بەڵای خراپ دێ و، ﴿ٱلسَّوۡءِ﴾یش هەر بە مانای خراپە دێ، بۆیە شارەزایان گوتوویانە: (وإضافة الدائرة إلى السوء، من الإضافة إلى الوصفِ اللازم كقولهم: عِشاءُ الآخِرَة، إذْ الدائرة لا تَكُون إلاَّ في السوء)، پاڵدانی (دائرة) بۆ لای ﴿ٱلسَّوۡءِ﴾، لە پاڵ وێدانی وەسفێكی پێویستە بۆ شتێك، وەك كە دەگوترێ: (عشاء الآخرة)، واتە: نوێژی خەوتنان (الآخرة) واتە {كۆتایی، كە دیارە نوێژی خەوتنان لە كۆتایی شەودایە)، ﴿دَآئِرَةُ﴾ش، تەنیا لە شتی خراپدا دەبێ، كەواتە: ﴿دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾، واتە: بەڵای خراپ.

وە وشەی: (سوء)، چاوگەو وشەی (سوء) ناوە، دیارە بە هەردوو قیرائەتەكە خوێنراوەتەوە: (عَلَيهم دائرة السُّوء)، وە ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾، كە ئەگەر بە (چاوگ) دابنرێ، ئەو كاتە دەڵێین: بەڵای خراپەیان بەسەر دێ، بەڵام ئەگەر بە (ناو) بێ، یانی: بەڵای خراپیان دێتە سەرێ.

<u>مەسەلەی حەوتەم</u>: كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٩٩﴾.

باسی جۆریکی دیکە لە عەرەبە بیاباننشینە خێڵەکییەکان دەکات، کە ئەم جۆرەیان خەڵکێکی باشن، دەفەرموێ: لە عەرەبە بیاباننشینە خێڵەکییەکان، کەسانێك هەن، کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، وە ئەوەش کە خەرجی دەکەن، ئەو سامانەی کە خەرجی دەکەن، {ئنجا بۆ جەنگو جیهادە، زەکات دانە، هەرچی هەیە} ، وەك هۆکاری نیزیك خستنەوە بۆ لای خوا، تەماشای دەکەنو بەکاری دێنن، ﴿ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ﴾، وە بە هۆکاری دوعای پێغەمبەر ﷺ ی دادەنێن، ﴿ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡ ﴾، ئاگاداربن ! بۆیان دەبێتە مایەی نیزیکی لە خوا.

کەواتە: ئەو عەرەبە خێڵەکییە بیاباننشینانە کە جۆرێکی دیکەن، خوای زاناو شارەزا، سێ سیفەتی باشیان تێدا باس دەکات:

<u>یەکەم</u>: ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی.

<u>دووەم</u> : سامان خەرج کردن لە ڕێی خوادا.

<u>سێیەم</u> : نیەتی چاك، یانی: ماڵەکەیان کە دەبەخشن، نەك هەر بە خاوەو تاڵانو تاوانی دانانێن، بەڵکو بە مایەی نیزیکی بەرەو خوا، وە دوعای پێغەمبەر ﷺ ی دادەنێن.

(قُرُبَات: جَمْعُ قُربة، وَهِيَ تُطْلَق بمَعْنَى المَصْدَر أي القربان، وهو المراد هنا أي: يتخذون ما ينفقون عند الله، التقرُّبَ إليه، وجمع قربات باعْتِبَارِ تَعَدّدِ الإِنْفَاق وَصَلَوَات: دُعَاء، وَجَمْعُهَا لأن كُلَّ إنْفَاق سَبَب لدعاء).

(قُرُبات) کۆی (قُربة)یە، (قُرْبة) بە مانای چاوگ بەکاردێ، (قربان) واتە: نیزیکیی، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە، واتە: ئەوەی کە خەرجی دەکەنو ماڵە کە دەیبەخشن، مەبەستیان پێی ئەوەیە لە خوایان نیزیك بخاتەوە، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ قُرُبَٰتٍ ﴾ چونکە ماڵ بەخشینەکان جۆراو جۆرنو جیاجیان، ئەوانیش هەر ماڵ بەخشینێکیان بە هۆکارێکی لە خوا ومنیزیك خستنەوە دادەنێن.

وشەی ﴿ صَلَوَٰتٌ ﴾یش بە مانای پاڕانەوە دێ، ﴿ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ﴾، ئەویش بۆیە بە کۆی هێناوە، چونکە هەر ماڵێك دەیانبەخشی، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەکردو دەپاڕایەوە، بۆ ئەو کەسە کە ماڵەکەی دەبەخشی.

وشەی (أَلَآ ) دەڵێ: (حرف الإستفتاح للإهتمام ليعيها السامع، والتأكيد لتحقيق مضمونها، وَتَنْكِير: (قُرْبَة) لِعَدَمِ الدَّاعِي إِلى التَّعْرِيف، ولأَنّ التنْكِير قَدْ يُفِيدُ التَّعْظِيمَ).

(أَلَآ ) پێی دەگوترێ: (حرف الإستفتاح)، واتە: کردنەوە، یان وریا کردنەوە، کە بۆ گرنگیی پێدانە، بۆئەوەی بابای بیسەر چاك تێی بگات، وە جەخت کردنەوەکەش. داکۆکیی کردنە لەسەر ئەو نێوەڕۆکەی دێتە دی، {﴿ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ﴾، ئاگاداربن : بێگومان ئەو ماڵ بەخشینە مایەی نیزیکیانە لە خوا}.

ئنجا وشەی (قربة) بۆیە بە (نكرة) هاتوە، چونکە پێویست بە ناساندنی ناکاتو پێشتر زانراوە، وە کە بە نەزانراو هاتوە لێرەدا {لە زمانی عەرەبیدا} مانای مەزن بوون دەگەیەنێت، {واتە: لە خوا ونیزیك خستنێکی زۆر گەورەیە}.

کە دەفەرموێ: ﴿ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ﴾، بێگومان خوا دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، واتە: بەهۆی ئەو ئیمانو، ماڵ بەخشینو ئەو نیەتە چاکەیانەوە. خوا دەیانخاتە شوێنێکەوە کە بەرجەستەکەری بەزەییەکەیەتی، کە بەهەشتە، یاخود هەر لە دنیادا خوای بە بەزەیی دەیانخاتە ژێر سایەی بەزەییو لوتفو کەرەمی خۆیەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

کە گوتمان (صلاة) واتە: پاڕانەوە، لەوبارەوە فەرموودەیەك دێنین: ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أُوتِيَ بِالصَّدَقَةِ، قَالَ: أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلانٍ ، فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: (أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى)﴾، {رَوَاهُ أَحْمَد، (١٩١٣٤)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٤١٦٦)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٠٧٨)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو. ئەگەر ماڵ بەخشینێکیان دێنایە لای، {زەکات بووایە، هەر جۆرە ماڵ خەرج کردنو ماڵ بەخشینێك بووایە لە ڕێی خوادا}، دەیفەرموو: ئەی خوایە! چاکە بکە لەگەڵ فلان بنەماڵەو کەسوکاری فلان دا، دەڵێ: بابیشم {کە ناوی ئەبی ئەوفا بووە} ماڵ بەخشینەکەی هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ﴿أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى﴾، خوایە ! چاکە بکە لەگەڵ بنەماڵەی ئەبی ئەوفادا.

لێرەدا (صَلِّ)، واتە: خوایە! چاکەی بۆ بکە، لێت دەپاڕێمەوە، چونکە مادام (صلاة) بە مانای دوعا بێ، کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردوە لە خوا ﷻ، کە چاکە بکاتو ڕەحمەتی خۆی بڕێژێ، بەسەر ئەبی ئەوفادا.

دەربارەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾ ﴾، ئەم فەرموودەیە دێنین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ جَفَا، وَمَنْ تَبِعَ الصَّيْدَ غَفَلَ، وَمَنْ أَتَى السُّلْطَانَ افْتُتِنَ»، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٣٣٦٢)، وَأَبُو دَاوُد، برقم: (٢٨٥٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٢٥٦)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٤٣٠٩)، وَالبَيْهَقِيُّ، برقم: (٢٠٠٤٠)}.

واتە: هەر کەسێك لە بیابان لە دەشتو چۆڵەوانیی نیشتەجێ بێ، حاڵەتێکی دوورکەوتنەوە لە خەڵكو زبریی بۆ پەیدا دەبێ، وە هەر کەسێك ڕاوێ بکاتو بەدوای نێچیردا بگەڕێ، بێ ئاگا دەبێ، {چونکە کاتێکی زۆری دەچێ، وە زۆر نایپەڕژێتە سەر ئەوەی زانیاریی‌و شارەزایی وەدەست بێنێ}، وە هەر کەسێکیش بچێتە لای حوکمڕان تووشی تاقیکردنەوە دەبێ، {واتە: تووشی بەلاّ دێ، تووشی لادان دەبێ}، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە، کە حوکمڕان چونکە ئەو دەسەڵاتی هەیەو تەماعی لەدەستدا هەیە، ئنجا مادام ئەو کەسەش دەچێ بۆ لای، دیارە تەماعی لە دەسەڵاتو سامانەکەیدا هەیە، وە سەرەنجام ئەویش دەسەڵاتو سامانەکەی بێ بەرانبەر نادات، دیارە مەبەست حوکمڕانی نادادگەرە، کەواتە: سەرەنجام تووشی ئەوە دێ کە دینەکەی بێهێز بێ، یاخود دینەکەی بدۆڕێنێ.

<u>مەسەلەی هەشتەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

ئایا مەبەست پێی کێیە ؟ کە دەفەرموێ: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەرانو پشتیوانانو، ئەوانەی بە چاکیی شوێنیان کەوتوون؟

زانایان چوار ڕایان هەن لەوبارەوە:

١) هەندێكیان گوتوویانە: (مَنْ صلّى القبلتين) هەر كەسێك بۆ دوو ڕووگەكان نوێژی كردبێ، هەم ڕووی كردبێتە (بيت المقدس) كە ماوەی شازدە حەڤدە مانگ پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی كە چووە مەدینە، لە نوێژەكانیدا ڕووی كردۆتە (بيت المقدس)، دوایی خوا فەرمانی پێكردوە كە ڕوو وەرسووڕێنێتەوە بۆ (بيت الحرام) بۆ كەعبە، ئنجا بەشێك لە زانایان گوتوویانە: هەر كەسێك كە فریای ئەوە كەوتبێ، ڕوو لە هەردوو ڕووگەكان بكات، ئەوە وەبەر حوكمی ئەو ئایەتە دەكەوێ: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾.

٢) وە هەندێ گوتوویانە: (مَنْ شَهِدَ بَدْرًا) هەر كەسێك ئامادەی جەنگی بەدر بووبێ. ئەوە دەچێتە ڕیزی: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾.

٣) هەندێك گوتوویانە: ئەوانەن كە پێش كۆچكردن بۆ مەدینە مسوڵمان بووبن. واتە: چ لە كۆچكەران، وە چ لە پشتیوانان، پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان كۆچ بكەن بۆ مەدینەو نیشتەجێ بووبن، مسوڵمان بووبن، وەبەر حوكمی ئەو ئایەتە دەكەون.

٤) هەندێكیش گوتوویانە: (مَنْ أَدْرَكَ بَيْعَةَ الرضوان) هەر كەسێك كە فریای پەیمانی ژێر درەختی (رضوان) كەوتبێ، كە لە ساڵی شەشەمی كۆچیی لە كاتی صوڵحی حودەیبیەدا، ڕوویداوە، كە خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨﴾الفتح، كە بە پێی ئەم ڕایە ماوەكەیان زیاتر درێژ كردۆتەوە. واتە: هەر كەسێك فریای ئەوە كەوتبێ، دەكەوێتە نێو بازنەی پێشكەوتووە یەكەمەكان لە كۆچكەرانو لە پشتیوانان.

کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٖ ﴾، دیـارە هـەندێکیان وایـان لێکداوەتەوە، کە مەبەست چینی شوێنکەوتووان (جیل التابعین)ە، بەڵام وەك (أبو زید) گوتوویەتی: (هُوَ مَنْ بَقِيَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلَامِ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَاعَةَ) هەر کەسێك لە ئەهلی ئیسلام بە ڕاستیی بە دوای کۆچکەران‌و پشتیوانـان کـەوتبـێ‌و بە ڕێی واندا ڕۆیشتبێ، ئەو موژدەیە دەیگرێتەوە، هەڵبەتە موژدەکەش زۆر خۆشە، کاتێ دەفەرموێ: ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ ﴾، هەم بۆ پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران‌و پشتیوانان‌و، هەم بۆ ئەوانەش کە چاك شوێنیان کەوتوون، خوا لە هەموویان ڕازییەو، ئەوانیش لە خۆی ڕازی دەکات.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ ﴾، خوا لەوان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازیین، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ: ئەوان لە دنیادا خوا لێیان ڕازیبوو، کە کارێکیان کردوە خوا لێیان ڕازیبێ، وە لە قیامەتێش ئەوان لە خوا ڕازی دەبن.

بەڵام من پێم وایە کە ئەوە بۆ هەردووکیەتی بۆ دنیاو بۆ قیامەتیشە، هەم لە دنیاش دا خوا لەوان ڕازییە، وە لە دواڕۆژیشدا، لێیان ڕازییە، وە لە دنیاشدا ئەوان لە خوا ڕازین، وە لە قیامەتێش خوای پەروەردگار بە جۆرێك پاداشتیان دەداتەوە کە ڕازییان بکات‌و خۆشنوودیان بکات.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، وە چەند باخێکی بۆ ئامادە کردوون کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی‌و، هەتا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە، ئا ئەوە سەرکەوتن‌و بردنەوەی مەزنە.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ بە لوتف‌و کەرەمی خۆی، کە بە چاکیی شوێن پێشکەوتووە یەکەمەکان دەکەون، لە کۆچکەران‌و پشتیوانان، وە بەڕێی واندا دەڕۆن‌و ڕێزیان لێ دەگرن، وە خۆشیان دەوێن‌و، دوعای خێریان بۆ دەکەن، وە خوا بمانپارێزێ لەوەی کە کینەو بوغزمان بچێتە دڵ بەرانبەر بە کەسانێك کە خوا دەفەرموێ: لێیان ڕازی بووم، وە ئەوانیش لە خۆم ڕازی دەکەم، ئنجا ئەگەر مرۆڤ

لە جیلێك ڕازی نەبێ، لە هاوەڵانێکی پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبێ، کە خوا ئەو هەموو ستایشەیان دەکات، وە خوا دەفەرموێ: لێیان ڕازییم.

دەبێ الله کێ ڕازی بێ؟!

ئێمە ئەگەر بە تەرازووی خوا هەڵسەنگێنین، دەبێ هەر کەسێك خوا لێی ڕازی بێ، تۆش لێی ڕازی بی، وە هەر کەسێك لە خوا ڕازی بێ، تۆش دەبێ لێی ڕازی بی‌و. دەبێ ستایشی بکەی‌و خۆشتبوێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ ﴾.

وە لەو عەرەبە بیابانشینانەی لە دەورتانن، کەسانێکی مونافیق هەن، هەروەها لە خەڵکی مەدینەش کەسانێك هەن، کە زۆر مەشقیان کردوە لەسەر نیفاق، تۆ نایانزانی، ئێمە دەیانزانین.

وشەی ﴿ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ ﴾، دەڵێ: (مَرَدَ عَلَى الأمرِ: مَرَنَ عَلَيْهِ وَدَرَبَ بِهِ وحذق فيهِ، ومهرَ، ومنه : الشيطان المارد، أي: فِي الشيطنة) واتە: بەو کارەوە ڕاهات، مەشقی لەسەر کرد، بە کارامەیی‌و بە وردەکاریی ئەنجامیدا، مەهارەتی تێدا پەیدا کرد، بۆیە دەگوترێ: (الشيطان المارد) واتە: شەیتانێك زۆر ڕاهاتوەو مەشقی کردوە لەسەر شەیتانەت‌و خراپەکاریی‌و خەڵك فریودان.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ﴾، تۆ نایانزانی، ئێمە دەیانزانین. کەواتە: پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوەی کە خوا پێی نەگوتبێ، نەیزانیوە، نادیارو پەنهان، تەنیا خوا زانیویەتی‌و دەیزانێ.

وەك خوای زانای ئاشکراو پەنهان دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾النمل.

واتە: بەڵێ: پەنهانێك كە لە ئاسمانەكانو زەویدا هەیە، جگە لە خوا كەس نایزانێ، وە ناشزانن كەی زیندوو دەكرێنەوە، وە پێغەمبەر ﷺ كە جاری وایە هەندێ شتی پەنهانی زانیوە، ئەوە خوا ﷻ ئاگاداری كردۆتەوە، هەر شتێك كە خوا ئەوی لێ ئاگادار كردبێتەوە، زانیویەتی، بەڵام هەر شتێك خوا لێی ئاگادار نەكردبێتەوە، نەیزانیوە، بە دەقی ئایەت لە سوورەتی (الأعراف)دا، لە ئایەتی ژمارە (١٨٨)دا دەفەرموێ: ﴿...وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ ...﴿١٨٨﴾﴾ الأعراف.

واتە: وە ئەگەر من نادیارم زانیبایە، پەنهانم زانیبایە، هەر چاكەم زیاد دەكردو هیچ خراپەیەكم تووش نەدەبوو، كەواتە: پێغەمبەری خواش ﷺ نادیارو پەنهانی نەزانیوە، تەنیا خوا دەیزانێ.

كە دەفەرموێ: ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾، لەمەودوا دوو جاران سزایان دەدەین، وە دواییش دەگێڕدرێنەوە بۆ ئازارێكو سزایەكی مەزن.

ڕای ڕاستتر وایە كە لێرەدا دووجار سزادان، یانی: جار لە دوای جار، گوتراوە: (العَدَدُ مُسْتَعْمَلٌ لمجَرَّد قَصْد التَّكرير المُفِيد للتأكِيد، كَقَوْلِهِ تَعَالى: ﴿ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ ﴿٤﴾﴾ الملك).

واتە: ژمارە تەنیا بۆ گەیاندنی مەبەستی دووبارە كردنەوەیە، كە مەبەست پێی جەختكردنەوەیە، بەكارهێنراوە، وەك فەرموودەی خوای بەرز: ئنجا دووجار چاو بگێڕە واتە: جار لە دوای جار، توێژەرەوانی قورئان هەموویان وایان لێكداوەتەوە، جار لە دوای جار، نەك تەنیا دوو جاران، بەڵكو یانی: جار لە دوای جار تەماشای ئاسمانەكانو دروستكراوەكانی خوا بكە، ﴿يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾، چاوت بە دەركراویی، یاخود بە ماندوێتیی بێ ئەوەی هیچی دەستگیربێ، دەگەڕێتەوە بۆ لات، واتە: هیچ كەمو كوڕییەك، هیچ كەلێنێك، هیچ ناتەواوییەك، لە دروستكراوی خوادا نابینی.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ ﴾، (أي: انْظُرْ وَتَأَمَّلْ تَأَمُّلا مُتَكَرِّراً)، واتە: تەماشا بکەو تێوە ڕامێنە، تێوە ڕامانێکی دووبارە بووەوە، ئەوە وەك قسەی عەرەبە کە دەڵێ: (لبيك اللهم وسعديك)، دەڵێ: (فاسم التثنية نائب منابَ إعادة اللفظ).

(لبيك) یانی: (تلبية بعد تلبية) (وسعديك) یانی: (إسعاداً بعد إسعاد) خوایە ! لە خزمەتدام جار لە دوای جار، (وسعديك) واتە: خوایە ! هەرچی تۆ ڕازی بکات، من بۆی ئامادەم، جار لە دوای جار.

واتە: لێرەدا ناوی (تثنية) لەجێی دووبارە کردنەوەی بێژەکە دانراوە، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: جار لەدوای جار، فەرموویەتی: ( كَرَّتَيۡنِ )، وە لەوێش دەفەرموێ: (مَّرَّتَيۡنِ ) کە ئەو مانایەم پێ ڕاستترە، لەوەی بێنین خۆمان ماندوو بکەین: دەبێ ئەو دووجارە کە خوا دەفەرموێ: لەمەودوا دووجاران سزایان دەدەین هەر لە دنیادا. دەبێ دووجارەکە کامە بن؟

هەندێکیان گوتوویانە: جارێك پێش بەڕێکەوتنی پێغەمبەر ﷺو سوپایەکەی بوو بۆ جەنگی تەبووك، کە هاتوون پاساوی درۆیان هێناوەتەوە، وە جارێك دوای ئەوەی گەڕاونەوە، دووبارە هاتوون پۆزشیان هێناوەتەوە بە درۆ، تووشی ئازارو مەینەتییەکی دەروونیی بوون.

بەڵام من پێم وایە پێویست بەو تەکەللوفە ناکات، واتە: لەمەودوا جار لە دوای جار، سزاو ئازاریان دەدەین، چونکە ئەوانە هەر لەو هەڵوێستەدا نەبووە، بەڵکو هەتا لەسەر حاڵەتی نیفاق بوون، هەمیشە ناچاربوون بۆ پەردە پۆشکردنی کوفرەکەیان، وە بۆ ئەوە کە خۆیان بە مسوڵمان پیشاندەن، دەبوو هەر بێن سوێندی بەدرۆ بخۆن، وە کە نهێنییەکانیان ئاشکرا دەبوون، دەکەوتنە سەر زارو زمانی مسوڵمانانو، ڕەخنەیان لێ دەگرتنو سەرزەنشتیان دەکردن، ئەوانیش دەبوو درۆ بکەنو سوێندی بە درۆ بخۆن، ئەوەش ئازارو ناڕەحەتییەکی زۆر بووە کە جار لە دوای جار تووشی بوون.

مەسەلەی دەیەم: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾.

وە کەسانێکی دیکەیان هەن، دانیان بە گوناهەکانی خۆیاندا هێناوە، کردەوەیەکی چاكو یەکێکی خراپیان تێکەڵ کردوە، نیزیکە خوا بگەڕێتەوە سەریان، (واتە: تەوبەیان لێ وەربگرێ)، بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە.

دەڵێ (الإعتـرافُ: إفْتِعَالٌ مِنْ عَرَفَ، وَهُوَ لِلْمُبَالَغَةِ فِي المَعْرِفَةِ، وَلِذَلِكَ صَارَ بِمَعْنَى الإقْرَارِ بالشيء وَتَرْكِ إنْكَارِهِ).

وشەی (إعْتِرَاف)، (إفْتِعَال)ە لە زانین، ئەویش بۆ زێدەڕۆیی کردنە لە زانیندا، (الإعتِرَاف) واتە: شتێك زۆر بزانی، بۆیە وشەی (إعتراف) وەك مانای دان پێداهێنان لێهاتوە (إقرار)ی لێهاتوە، کە ئینسان دان بە شتێکدا بینێو نکوولیی لێ نەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ﴾، واتە: چاکەو خراپەکانیان تێکەڵ کردوون، یانی، کردەوە باشەکانی خۆیانیان، لەگەڵ کردەوەی خراپ دا تێکەڵ کردوە، کردەوە باشەکانیان: ئیمان بووە، نوێژ بووە، تاعەت بووە، بەخشینو چاکە بووە.

کردەوە خراپەکەیان چی بووە؟

بەجێمانیان بووە لە جەنگی تەبووك، بێ ئەوەی کە هیچ نوقسانییەکیان هەبێ، بەدەنیان ساغ بووە، ماڵو سامانیان هەبووەو، توانایان هەبووە، هیچ عوزرێکیان نەبووە، بەڵام بەجێماون، واتە: ئەو کردەوە باشانەی کە پێشێ کردوویانن، لەگەڵ ئەو هەڵوێستە خراپەیاندا، تێکەڵیان کردوە.

هەروەها کردەوەیەکی دیکەی خراپیان ئەوە بووە، کە ئامادە نەبوون ماڵ خەرج بکەن، بۆ ئامادە کردنی ئەو سوپایەی کە پێغەمبەر ﷺ بە ڕێی خستوە بەرەو جەنگی ڕۆم.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ﴾، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا بآخَرَ سَيِّئًا)، بەکارهێنانی (و): (عَلَى اعْتِبَار استِوَائِهِمَا

فِي وُقُوعِ فِعْلِ الخَلْطِ عَلَيْهِمَا)، بەو ئیعتیبارەی کە وەك یەك بوون، کردەوە خراپ و چاکەکان، واتە: هەردووکیان لەگەڵ یەکدی تێکەڵ بوونو ئاوێتە بوون.

کە دەفەرموێ: ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، (عَسَى) دەڵێ: (فِعْلُ رَجَاءٍ) بۆ نیزیکییە، بەڵام عادەتی خوای کارزان وایە کە ئەگەر فەرمووی: ڕەنگە ئەو شتە بکەم، دەیکات، وەك عەرەب دەڵێن: (إِنَّ الكَرِيمَ إِذَا أَطْمَعَ أَعْطَى)، واتە: بابای بەخشندەو سەخیی، کاتێك کە کەسێکی ئومێدەوار کرد، پێی دەدات، وە خوای میهرەبانیش کە دەفەرموێ: ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، مانای وایە ئومێدەواریان دەکات: {نیزیکە خوا تەوبەیان لێ وەربگرێ، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە}.

کەواتە: خوا تەماعی وەبەرناونو ئومێدی وەبەرناون، بۆیە ئەم (عَسَى)یە مانای پێویست بوون دەگەیەنێ، چونکە خوا ﷻ خاوەنی ئەوپەڕی بەخشندەییو کەرەمو سەخاوەتەو، کاتێك کە بەندەکانی خۆی ئومێدەوار دەکات، دیارە دوایی دەستخەڕۆیان ناکات، بەڵکو ئومێدەکەیان بۆ دێنێتە دی.

<u>مەسەلەی یازدەیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٠٣ ﴾.

لێرەدا خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانێکدا، کە لە جەنگی تەبووك دواکەوتوون، بەڵام دوایی دانیان بە هەڵەی خۆیاندا هێناوە، کە وەك سڕینەوەی ئەو گوناحو هەڵەیەیان، ئاوا پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی دەکات، کە بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، دەفەرموێ: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ ﴾، لە ماڵو سامانەکەیان سەدەقەیەك وەربگرە. {﴿ صَدَقَةٗ ﴾ش، دەگونجێ مەبەست پێی زەکات بێ، وە دەشگونجێ مەبەستی پێ لە ماڵ بەخشینێکی تایبەت بەوانەوە بێ}.

﴿ تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴾، تاکو بەهۆی ئەو صەدەقەو ماڵو سامانەوە کە لێیان وەردەگریو لە پێناوی خوادا دەیبەخشن، پاکیان بکەیەوە ﴿ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴾، وە بشیانڕازێنیەوەو چاکیان بکەی.

پێشتریش باسمان کردوە: کە وشەی (تَزکیة) ئەگەر بە تەنیا بێ، هەم پاکیی دەگەیەنێ، هەم گەشەکردن دەگەیەنێ، وە هەم چاکبوونیش دەگەیەنێت یانی: (الطهارةُ والنموُ والصَّلاح) وەك فەرهەنگەکانی زمان باسیان کردوە، بەڵام لێرەدا مادام: (تطهیر وتزکیة) پێکەوە هاتوون، ئەوە وشەی (تُطهِّرهم بها) مانای پاککردنەوەی گەیاندوە، وە (تزکیهم بها)ش مانای چاکبوونو گەشەکردن دەگەیەنێ.

چونکە بۆ ئەوەی دووبارە نەبێ، لێرەدا مەبەست لە (تزکیة) ئەو مانایەیە، کە لە وشەی (تطهیر)دا نەهاتوە، ئەوەش بنچینەیەکی قورئانییە: کە ئەو وشانەی بە یەکەوە دێن، ماناکانیان دابەش دەبن، بەڵام ئەگەر هەرکامێکیان لە سیاقێکدا بە تەنیا هات، ماناکان لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە.

کەواتە: بە زاراوی ئەهلی تەزکیەو ئەهلی تەصەووف: بەهۆی ئەو ماڵو سامانەوە کە تۆ لێیان وەردەگری، هەم بژار (تَخلیة)یان دەکەی، هەم ڕازاوە (تَحلیة)یان دەکەی، بژاریان دەکەی لە سیفەتی خراپ، وە دەشیان ڕازێنیەوە بە سیفەتی باش.

واشپێدەچێ حیکمەتی ئەو ماڵو سامان وەرگرتنەش لەوانە، ئەوەبێ کە یەکێك لە هاندەرەکانیان کە ئەو جەنگەیان نەکردوە، یاخود یەکێك لەو پەرچانەی کە هاتۆتە ڕێیان، خۆشەویستییان بووە، بۆ ماڵو سامانیان، بۆیە وەك کەفارەتو سڕینەوەی ئەو هەڵوێستە خراپەیان، یان ئەو ماڵو سامانەی کە وای لێکردن نەچن بۆ جەنگی تەبووكو، لەو چاکە مەزنەو لەو ئەرکە شەرعییە دوا بکەون، بەشێکی لە ڕێی خوادا ببەخشن.

وە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ﴾، وە دوعاشیان بۆ بکە، بۆیان بپاڕێوە ﴿ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴾، بێگومان پاڕانەوەی تۆ بۆ وان، مایەی ئارامییە.

دەڵێ: (السَّكَنُ: مَا يُسْكَنُ إِلَيهِ ويُطْمَأَنُّ إلَيهِ وَيُرْتَاحُ به).

(سَكَن) هەر شتێکە کە بەهۆی ئەوەوە، ئینسان ئۆخژن‌و، ئارامیی بۆ بێ، وە پێی ئاسوودە بێ.

دیارە کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ بۆیان پاڕاوەتەوە، ئەوانە هەستیان بە ئاسوودەیی‌و دڵ ئارامیی کردوەو، زانیویانە کە پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ داوای لە خوای پەروەردگار، ڕەت نابێتەوە، ئنجا ئەویش کە داوای بۆ کردوون، کە ئەو چاکەیان لێ قبووڵ بکات، یان لەو گوناهەیان بیانبەخشێ، چاوپۆشییان لێ بکات، دوعای پێغەمبەر ﷺ دیارە ڕەت نابێتەوە، ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، وە خوا بیسەری زانایە، خوا بیسەرە کە ئەوان چی دەڵێن؟ تۆ چ دوعایەکیان بۆ دەکەی؟ وە زاناشەو لەسەر بناغەی زانیاریی بێسنووری خۆی، مامەڵە لەگەڵ شتەکان‌و لەگەڵ شەخصەکاندا دەکات.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾﴾.

دیارە ئەم هەمزە(أ)یەی سەر، ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟﴾ پێی دەگوترێ: هەمزەی پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانە (هَمزةُ الإستفهام الإنكاري) پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەش، ئەوەیە کە چاوەڕێی وەڵام ناکەی لە بەرانبەر، ئەگەر من گوتم: ئەمە مێز نیە؟! ئەمە دەفتەر نیە؟! یانی: ئەمە مێزەو، ئەمەش دەفتەرە، واتە: پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە، چاوەڕێی وەڵام ناکەی لە بەرانبەر، چونکە وەڵامەکە لەنێو خۆیدایە، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئایا نەیاندەزانی کە هەر خوا گەڕانەوە (توبة) لە بەندەکانی وەردەگرێ ﴿وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ﴾، وە هەر خوا بەخشین‌و چاکەکان وەردەگرێ؟ ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾، وە هەر خوا زۆر تەوبە وەرگری میهرەبانە؟ واتە: دیارە ئەو سێ ڕاستییەیان نەزانیون، بۆیە تووشی ئەو سەرپێچیی‌و کەمتەرخەمییە بوون، کە دواکەوتنە لە جەنگی تەبووك، یان هەر کەموکوڕییەکی دیکە کە ڕوویان تێدەکات، چونکە کە ئینسان وەك پێویست خوای

خۆی نەناسی، وەك پێویستیش نایپەرستێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ﴿وَاللهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ للهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ﴾، {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (٥٠٦٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٤٠١) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}.

واتە: بە خوا من لە هەمووتان لە خوا ترسترم، وە لە هەمووشتان زیاتر پارێزی لێ دەکەم.

کەواتە: با ئەو سێ ڕاستییە کە تا ئێستا وەك پێویست نەیانزانیون، دەرکیان بکەن‌و بیانزانن، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە تووشی ئەو جۆرە هەڵوێستانە نەبن، چونکە هەمیشە هەڵسوکەوت، ڕیشەو بناغەکەی بریتیە لە جۆری تێگەیشتنی ئینسان، هەموو تەصەڕروفێك ڕیشەکەی تەصەووڕێکە، ئەگەر ئینسان تەصەووڕو بۆچوونەکانی ڕاست بن، مەزەندەی ئەوەی لێ دەکرێ کە هەڵسوکەوت‌و ڕەفتارەکانیشی بە پێی تێگەیشتن‌و بۆچوونەکانی بن، کە ئەگەر ئەوان ڕاست بن، هەڵسوکەوتەکانیشی ڕاست دەبن، هەروەها بە پێچەوانەوەش، هەر ڕاستە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، خوا ﷻ پێشتر فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَـٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

واتە: دەبوو بزانن کە سیفەتی تەوبە وەرگرتن، وە سیفەتی میهرەبانیی‌و بەزەیی نواندن بەرانبەر بە دروستکراوەکان، دوو سیفەتی چەسپاون بۆ خوای بێوێنە، نەك تەنیا ئەوەندەیێ تەوبە وەربگیرێ بە شێوەیەکی کاتیی، بەڵکو تەوبە وەرگرتن، وە لێخۆشبوون لە بەندەکان، وە میهرەبانیی‌و بەزەیی نواندنی خوا، بەرانبەر بەندەکانی، دوو سیفەتی ڕیشەدارو چەسپاون بۆ خوای پەروەردگار.

__مەسەلەی سێزدەیەم__: کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾.

وە پێیـان بڵـێ: کـار(ی چـاك) بکـەن، لـەمەو دوا خـوا کـارەکـەتـان دەبینـێ، وە پێغـەمبـەرەکەی ﷺ، وە بڕوادارانیش، وە پاشـان دەگێڕرێنەوە بۆ لای زانـای پەنهـانو ئـاشکـرا، ئنجا هـەواڵتـان پێدەدا بەوەی کە دەتانکرد.

واتـە: دوای ئەوەی کە دەگەڕێـنەوە بۆ لای خـواو، دوای ئەوە ئەو ئەندازەیە لە مـاڵی خۆتان دەبەخشن، وەك کەفارەتی گوناحو هەڵەکەتان، ئنجا پێیان بڵێ: کار بکەن، واتە کردەوەی باش بکەن ﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ ﴾ بڵـێ: کـردەوە بکەن، چ کردەوەیەك بکەن؟!

بە سیاق دەزانین کەسانێك کە تەوبەیان کردوەو گەڕاونەوە بۆ لای خوا دیارە کاتـێ کە فـەرمانیان پێ دەکرێ، کـردەوە بکـەن، واتـە: کـردەوەی بـاش بکـەن، ئەگـەرنـا لـە شوێـنی دیکەش خوای کاربەجێ ئـەم وشـەیەی فـەرمووە : ﴿ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞ ... ﴿١٣٥﴾ ﴾ الأنعـــام ، ﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾ هـود ، بـەڵام مەبەسـت پێـی ئـەوەیـە کـە چی لـە تواناتاندا هەیە، بیکەن لە خراپەو دژایەتیی کردن، چ شتێك لـە دەستتان دێ، بیکـەن. ئێمەش چیمـان لـە توانـادایـە دەیکەین.

بەڵام ئـەوە بەپێـی سیـاق دەزانرێ، کـە لێـرەدا مەبەسـت ئـەوەیـە کـردەوەی بـاش ئـەنجام بدەن.

کە دەفەرموێ: خـوا کـردەوەکـەتـان دەبینـێ، هـەروەهـا پێغـەمبـەرەکـەی ﷺ، وە بڕوادارانیش، ئەمە دیـارە هـاندانی ئەو کەسـانەیـە بۆ کردەوەی باش، کە ئـەو کـردەوە باشـانە، هـەم خـوا ﷻ دەیانبـینـێو دەیانزانێ، پاشـان پـاداشـتیشـتـان دەداتـەوە، وە هەم پێغـەمبـەریش ﷺ وەك مشورخۆرو بەرپرس، وە هـەم بڕوادارانیشو کۆمەڵگاش.

کەواتە: کردەوەی باش ئەنجام بدەن، چونکە هـەم خوا خۆی، وەك تـاکـە پەرسـتـراو دەیبینـێ، هـەم پێغـەمبـەر ﷺ وەك فـەرماندەو بەرپرسو سـەرۆکـتـان دەیـبینێ، وە هـەم کۆمەڵگاش پێی ئاگادار دەبێو دەیـبینێ، ئـەوە لـە دنیـادا، ﴿ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، وە لـە دواڕۆژیشـدا دەگێـڕڕێـنەوە بـۆ لای زانـای پـەنهـانو

ئاشکرا، چونکە ئینسان کە کردەوەی باش دەکات، جاری وایە بە پەنهانیی دەیکات، وە جاری وایە بە ئاشکرا دەیکات، بەڵام کە تۆ گێڕرایەوە بۆ لای خوایەك، کە پێش ئاشکرا بە پەنهان دەزانێ، بەڵکو ئاشکراو پەنهان بۆ وی وەك یەکن، مانای وایە لەبەرئەوەی لەبەرچاوی خەڵك نیە، کە بە پەنامەکییو پەنهانیی کردەوەی باشت لێ هەڵدەگەوێو دەیکەی، با دڵت لێی سارد نەبێ، کردەوەکەت بە زایە ناچێ، هەم خوا لە دنیادا دەیبینێ، وە هەم لە دوارۆژیشدا خوای زاناو شارەزا هەرچی پەنهانو نادیار بووە، لەگەڵ شتە ئاشکراو زانراوەکان دا، وەك یەك دەیانزانێو، پاداشتتان دەداتەوە، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، ئنجا هەواڵتان پێدەدا بەوەی کە ئێوە پێشتر لە دنیادا ئەنجامتان دەدا، واتە: هەواڵتان پێدەدا کە: ئەو چاکەیەتان کردووەو ئەوەش پاداشتەکەیەتی.

**مەسەلەی چواردەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾﴾.

لێرەش دا باسی کۆمەڵێکی دیکە دەکات، لەوانەی کە لە جەنگی تەبووك، دواکەوتبوون، دەفەرموێ: وە کەسانێکی دیکە دواخراون بۆ فەرمانی خوا، یان سزایان دەدات، یاخود لێیان خۆشدەبێو تەوبەیان لێ وەردەگرێ، وە خوا زانای کارزانە.

کە لێرەدا مەبەست لەو کۆمەڵە، ئەو سێ کەسەن، کە بڕیاریان لەبارەوە نەدراوە، وە جارێ خوا ﷻ هیچ بڕیارێکی بۆ نەداون کە: ئایا تەوبەکەیان لێ وەردەگرێ، پەشێمان بوونەوەکەیان لێ وەردەگرێ، پۆزشەکەیان لێ وەردەگرێ، یاخود وەری ناگرێ؟!

خوای کارزان کارو حاڵەتی ئەوانی بە هەڵواسراویی بەجێهێشتبوو، وەك سزایەکی دنیایی لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆیان، وەك سەرپەرشتیاری کۆمەڵگاو سەرۆکی دەوڵەت، هەروەها لە لایەن خوای پەروەردگاریشەوە، هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕێی کردوە: کەی خوا فەرمانی پێ دەکات کە: ئایا لەسەر ئەو سزادانە بەردەوام بێ، یاخود تەوبەیان لێ قبووڵ کراوەو، ئەو ئازارو ئەشکەنجە دەروونییە کۆتایی پێ هات، کە دوایی ڕووداوەکەیان بە تەواویی باس دەکەین، ئەو سێ نەفەرەش ئەم

سێیانە بوون: (کەعبی کوڕی مالیك)و (هیلالی کوڕی ئومەییە)و (مەرارەی کوڕی رەبیع) کە هەرسێکیشیان کاتی خۆی لە جەنگی بەدردا بەشدار بوو بوون خوا لێیان رازی بێ.

دیارە وشەی (مُرجَونَ) خوێنراویشتەوە: (مُرجَئونَ) وە (مُرجَونَ) و (مُرجَئون) هەردووکیان بە مانای (مؤخَّرون) دواخراون، دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، وە خوا زانای کارزانە، زانایە بە هەموو شتەکان، وە کارزانیشە بە پێی حیکمەتی بێسنووری خۆی، مامەڵە لەگەڵ شتەکان و لەگەڵ شەخسەکان دا دەکات.

کاتێ کە دەگەینە ئایەتەکانی ژمارە (١١٨و ١١٩) لەوێ باسی ئەو سێ کەسە کراوە کە خوای میهرەبان تەوبەیان لێ وەردەگرێ کە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١١٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩﴾.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار ئایەت پێك دێ، كە بریتین لە ئایەتەكانی: ١٠٧ تا ١١٠) لەو چوار ئایەتەدا، خوای زاناو شارەزا باسی ڕووداوێكی گرنگ دەكات، كە لە گەرمەی جەنگی تەبووكدا ڕوویداوە، ئەویش دروستكردنی مزگەوتێك بووە، لەلایەن كۆمەڵێك لە دەغەڵەكانەوە، بە سەرپەرشتیی (أبو عامر الراهب)، كە پێغەمبەر ﷺ ناوی لێ ناوە (الفاسق)، بە مەبەستی پیلانگێڕان دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان‌و، كردنی ئەو مزگەوتە بە مۆڵگەیەك بۆ خۆیان، كە تێیدا كۆببنەوەو پیلانی تێدا بگێڕن، بەڵام دوایی خوا پەردەی لەسەر پیلانەكەیان هەڵماڵی‌و، مزگەوتەكەش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا، پاش گەڕانەوەی لە جەنگی تەبووك، سووتێنراو دواتر كرا بە زبڵدان.

لە ئایەتی یەكەمدا، پێناسەی بنیاتنەرانی مزگەوتەكەو، ئامانجیان لە دروستكردنی دەكات، كە دژایەتیی ئیسلام‌و مسوڵمانان‌و هاوكاریی كردنی ئەهلی كوفرە، وە ناویش لە مزگەوتەكە دەنێ (مَسْجِداً ضِرَاراً) واتە: مزگەوتێكی زیانگەیەنەر.

وە لە ئایەتی دووەمدا، لە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغە دەكات، كە نوێژی تێدا بكات‌و ڕەوایەتیی پێ بدات.

وە لە ئایەتی سێیەمدا، بەراوردێك لە نێوان ئەو بەناو مزگەوتەو، مزگەوتێكدا دەكات كە هەر لە سەرەتاوە، لەسەر بناغەی (تَقْوَى) و (رِضْوان اللّه) بنیات نراوە.

لە ئایەتی چوارەمیشدا، ڕایدەگەیەنێ كە ئەو مزگەوتە بوو بە مایەی گومان‌و دوو دڵیی بۆ بنیات نەرانی.

﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا
لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ ۖ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ
لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ
أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾
أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ
بُنْيَانَهُ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ
الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَّا أَن تَقَطَّعَ
قُلُوبُهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{وە ئەوانــەی (لــەو دەغەڵانــە) کــە مزگــەوتێکیان دروســتکردوە، بــە مەبەســتی زیانگەیاندن (بە مسوڵمانان)و (بە هاندەری) بێبـڕوایی‌و (پەیداکردنی) پـەرتەوازەیی لە نێوان بڕواداران داو، وەك ڕوانگـەو شوێـنی چاودێریی لێوە کردن، بۆ ڤازانجی کەسـانێك کە پێشتـر جـەنگیان دژی خـواو پێغەمبەرەکـەی کـردوە، (بـە سـزای خۆیـان دەگـەن لـە دواڕۆژدا)، وە بە جـەختکـردنەوە، سوێند دەخۆن کە (بە دروستکـردنی ئـەو مزگەوتە) تـەنیا مەبەستمان چاکە بـووە، وە خـوا شـایەدیی دەدات، کـە ئـەوانە بـە مسۆگـەریی درۆزنن ﴿١٠٧﴾ هـەرگیز (بۆ نوێـژو پەرستـش) تێیـدا بـە پێـوە مەوەستــە، بـە دڵنیـایی مزگـەوتێك کە لە یـەکەم ڕۆژەوە لەسـەر بنـاغـەی پارێزکاریی بنیـاتـنراوە، شایستــەترە کە (بۆ خـواپـەرستیی) تێیـدا بوەستی، پیاوانێکی تێدان، کـە حەزدەکـەن خـۆیـان پـاك ڕابگـرن، وە خـوا خـۆ پـاکـکەرەوانی خۆشـدەوێـن ﴿١٠٨﴾ ئـایـا (کـاری) کەسێك کـە بنـاغـەی خانووەکەی، لـەسـەر پـارێز لـە خـوا کـردن‌و ڕەزامەندیی خـوا (داوا کـردن) دامەزرانـدوە باشترە، یـان (کـاری) کەسێك کە بنـاغـەی خانووەکـەی لـەســەر لێـواری کەندەڵانێکـی بـن هەڵۆڵـی نیزیـك بــە ڕووخـان، دانـاوە، کـە سـەرەنجام لەگەڵـی دەڕمێتـە نێـو ئـاگری دۆزەخەوە؟ وە خـوا کۆمەڵـی سـتـەمکاران ناخاتـە سـەر ڕێـی ڕاســت ﴿١٠٩﴾ بـەردەوام ئــەو خانووەی دروستیـان کـردبوو، مایەی دوو دڵـییە لە دڵـیاندا، هـەتـا دڵـەکانیـان پچـڕ پچـڕ دەبن (بەهـۆی مردنەوە)، وە خـوا زانـای کـارزانـە ﴿١١٠﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ضِرَارًا ): واتە: زیانگەیاندن، (ضَارَّهُ مُضَارَّةً وَضِرَاراً: ضَرَّهُ وَضَاقَهُ وَضَايَقَهُ وَخَالَفَهُ).

وشەی: (ضَارَّهُ مُضَارَّةً وَضِرَاراً) واتە: زیانی پێگەیاند، وە ستەمی لێکرد، وە سەغڵەتی کردو، دژایەتیی کرد.

(وَإِرْصَادًا ): دەگوترێ: (أَرْصَدَهُ لِكَذَا: أَعَدَّهُ لَهُ، وَفِي الحَدِيث: {إِلاَّ أَنْ أَرْصُدَهُ فِي دَيْنٍ يَكُونُ عَلَيَّ(١)} وَرَصَدَهُ يَرْصُدُهُ رَصْداً وَرَصَداً: قَعَدَ لَهُ عَلَى الطَرِيقِ يَرْقُبُهُ).

(أَرْصَدَهُ لِكَذَا) واتە: بۆی ئامادە کرد، بۆی هەڵگرت، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە لە باسی ماڵ بەخشیندا، فەرموویەتی: {إِلاَّ أَنْ أَرْصُدَهُ فِي دَيْنٍ يَكُونُ عَلَيَّ} واتە: ئەو ماڵە هەمووی بە ئێوە دەبەخشم، مەگەر هەندێکی هەڵبگرم بۆ قەرزێك کە لەسەرمە، بیدەمەوە، بەڵام (رَصَدَهُ يَرْصُدُهُ رَصْداً وَرَصَداً) هەمووی واتە: لەسەر ڕێگا بۆی دانیشت، چاوەڕێی دەکرد.

(بُنْيَـٰنَهُۥ ): (بَنَى الشيءِ يَبْنِيهِ بَنْياً وَبَنَاءً وَبُنْيَاناً: أَقَامَ جِدَارَهُ وَنَحْوَهُ).

(بَنْياً وَبَنَاءً وَبُنْيَاناً) واتە: ئەو شتەی بیناکرد، دیوارەکەی ڕاست کردەوە (بَنَاءْ وبُنْيَان) هەر شوێنێکە کە ئینسان تێیدا نیشتەجێ بێ.

(شَفَا): بە مانای قەراغ دێ، (شَفَا البِئْرِ وَالنَّهْرِ وَغَيْرِهِمَا: طَرَفُهُ، وَيُضْرَبُ بِهِ الْمَثَلُ فِي القُرْبِ مِنَ الْهَلَاكِ، وَأَشْفَى فُلاَنٌ عَلَى الْهَلاكِ: أَي حَصَلَ عَلَى شَفَاهُ).

بۆ بیرو بۆ ڕووبار دەگوترێ: (شَفَا) واتە: قەراغەکەیان، وە وێنەی پێ دەهێنرێتەوە بۆ نزیك کەوتنەوە لە لەنێوچوون، (أَشْفَى عَلَى الشيءِ: أَشْرَفَ عَلَيْهِ). کەسێك کە بچێتە سەر سوێو، قەراغی شتێك، پێی دەگوترێ: (أَشْفَى عَلَيْهِ).

---

١) أخرجه أحمد، برقم: (٩٨١٦) تعليق، شعيب الأرنؤوط : صحيح وهذا إسناد حسن.

(جُرُفٍ ): (الجُرفُ: مَا تَجَرَّفَتْهُ السّيُولُ وَأَكَلَتْهُ مِنَ الأَرْضِ)، (جُرُفْ) كە لافاو دێ لە کەنەدەلانێك دەدات، بنەکەی هەڵدەکەنێت و دەیکۆڵێ، واتە: شوێنێکی بن هەڵکۆڵ، شوێنێکی بنکۆڵ کراو، کە بنەکەی ڕۆیشتبێ و سەرەکەی مابێتەوە.

(هَارٍ ): دەگوترێ: (هارَ البناءُ وَنَحْوُهُ يَهُورُ هَوْراً وَهُؤوراً: تَهَدَّمَ فَهُوَ هائِرٌ).

(هارَ البناءُ) واتە: بیناکە ڕووخا، (يَهُورُ هَوْراً وَهُؤوراً: تَهَدَّمَ) واتە: ڕووخاو ڕمایە سەر یەك، (فَهُوَ هائِرٌ) واتە: شوێنێکی بنکۆڵ کراو، کە خەریکی ڕووخان بێ.

(رِيبَةً ): (الرَّيْبُ: الشَّك، والإِسْمُ: الرِّيبَةُ وَهِيَ التُّهْمَةُ وَالشَّكُّ: رَابَنِي وَاسْتَرَبْتُ بِهِ، وَأَرَابَ الرَّجُلُ: صَارَ ذَارِيبَةٍ فَهُوَ مُرِيبٌ).

وشەی (ريب) بە مانای گومان دێ، وە چاوگەو ناوەکەی بریتیە لە (رِيبَة)، واتە: گومان و دوو دڵیی، دەڵێ: هەم بە تۆمەت و هەم بە گومان دەگوترێ: رَابَنِي وَاسْتَرَبْتُ بِهِ) واتە: منی خستە گومانەوە، وە تێیدا کەوتمە دوو دڵیی، (وَأَرَابَ الرَّجُلُ) واتە: ئەو ئینسانە کەوتە دوو دڵیی و گومانەوەو، دوو دڵە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایـەتـەکـان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾.

لەوبارەوە ئەم گێڕراوەیە هەیە :

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قوله: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا ﴾، هُمْ أُنَاسٌ مِن الأَنْصَارِ بَنُوا مَسْجِداً، فَقَالَ لَهُمْ أَبُو عَامِرِ الرَّاهِبُ: ابْنُوا مَسْجِدكم، وَاسْتَعِدُّوا بِمَا اسْتَطَعْتُم مِنْ قُوَّةٍ وَسِلاحٍ، وَقَالَ لَهُمْ: إِنَّهُ ذَاهِبٌ إِلى قَيْصَرِ الرُّوم، فَآتٍ بِجُنُود مِنَ الرُّومِ لإِخْرَاجِ مُحَمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ، فَلَما فَرَغُوا مِنْ مَسْجِدِهِم، أَتَوا رسول الله ﷺ قَالُوا: قَدْ فَرَغْنَا مِن بناء مسجدنا ، فَنُحِبُّ أَنْ تَصَلِّيَ فِيهِ، وَتَدْعُو لَنَا بِالبَرَكَة، فَأَنْزَلَ اللهُ فِيهِ: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾، إلى قوله: ﴿ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾﴾، {أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ: ج١١، ص١٨ و ١٩، وَابْنُ أَبِي حَاتم، ج٦. ص ١٨٧٨و ١٨٧٩، وَابْنُ المُنْذِرِ كَمَا فِي (الدر المنثور) ج٤، ص٢٨٤، وَالبَيْهَقِي فِي (دلائِل النبوّة)، ج ٥، ص٢٦٢ و ٢٦٣، قَالا في الإستيعَاب ج ٢، ٣٢٩، قُلْنَا: هَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: ئەم ئایەتە لەبارەی کەسانێکەوە لە پشتیوانەکان هاتە خوارێ، کە مزگەوتێکیان دروست کرد، ئەبو عامری ڕاهیب پێی گوتن: مزگەوتەکەتان دروست بکەن‌و هەرچی لە توانا‌تاندا هەیە خۆتان ئامادە بکەن، لە هێزو لە چەك، من دەچم بۆ لای قەیسەر (پادشا)ی ڕۆم، وە لەوێوە هەندێ لە سوپای ڕۆم دێنم، وە موحەممەدو هاوەڵانی دەردەکەم، لە کاتێکدا کە

مزگەوتەکەیان تەواو کرد، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئێمە لە دروستکردنی مزگەوتەکەمان بووینەوە، حەز دەکەین بێی نوێژی تێدا بکەی، وە بەرەکەت و پێزمان بۆ داوا بکەی {لە خوای بەرزو مەزن}، خوای پەنهانزان لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾، هەتا دەگاتە ﴿لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾، هەرگیز لەو مزگەوتەدا ڕامەوەستە، بۆ ئەوەی نوێژی تێدا بکەی، تاکو دەگاتە ئەو شوێنەی دەفەرموێ: خوا کەسانی ستەمکار ناخاتە سەر ڕێی ڕاست.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ﴾، لەوبارەوەش ئەم دوو دەقە دێنین:

أ/ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي أَهْلِ قُبَاءَ ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ﴾، قَالَ كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ، فَنَزَلَتْ فِيهِمْ هَذِهِ الآيَةُ﴾، {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد، برقم: (٤٤)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣١٠٠)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: ٣٥٧) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي}.

واتە: ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هێناویەتی کە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی خەڵکی مزگەوتی قوباء هاتوونە خوار، کە دەفەرموێ: پیاوانێکی تێدان، حەز دەکەن، خۆیان پاك بکەنەوە، کە عادەتیان وابوو کە بە ئاو تارەتیان دەگرت و خۆیان پاك دەکردەوە.

ب/ ﴿عَنْ عُوَيْمِ بْنِ سَاعِدَةَ الأَنْصَارِيِّ أَنَّهُ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَاهُمْ فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ ، فَقَالَ : إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، قَدْ أَحْسَنَ عَلَيْكُمُ الثَّنَاءَ فِي الطُّهُورِ، فِي قِصَّةِ مَسْجِدِكُمْ، فَمَا هَذَا الطُّهُورُ الَّذِي تَطَّهَّرُونَ بِهِ ؟! قَالُوا: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! مَا نَعْلَمُ شَيْئاً، إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ لَنَا جِيرَانٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَكَانُوا يَغْسِلُونَ أَدْبَارَهُمْ مِنَ الْغَائِطِ ، فَغَسَلْنَا كَمَا غَسَلُوا﴾،{أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٥٥٢٤) تَعْلِيق شُعَيْب الأَرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ لِغَيْرِهِ، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير)، برقم:

(٣٤٨)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً ابْنُ خُزَيْمَةَ، برقم: (٨٣)، وَالطَّبَرَانِي فِي (الصغير)، برقم: (٨٢٨)، قَالَ مُؤَلِّفَا الإِسْتِيْعَاب ج٢، ص٣٣٤: حسن}.

واتە: عوەیمی کوڕی ساعیدەی ئەنصارییی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردوون لە مزگەوتی قوباء، وە فەرموویەتی: خوای بەرز زۆر باش ستایشی ئێوەی کردوەو مەدحی کردوون لە خۆ پاککردنەوەتاندا، لە باسی ئەو مزگەوتەتاندا، ئایا ئەو خۆ پاککردنەوەیەی ئێوە چۆنە؟ گوتیان: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا! هیچ نازانین جگە لەوە نەبێ کە هەندێ دراوسێی جوولەکەمان هەبوون، کاتێك کە دەچوونە سەر پێشاو، بە ئاو تارەتیان دەگردو خۆیان پاك دەکردەوە، ئێمەش وەك وان خۆمان دەشۆردەوە دوای تارەت گرتن. وەك چۆن ئەوان خۆیان دەشۆرد، لەوبارەوە ئەمە هاتۆتە خوار.

دیارە ئێمە دوایی زیاتر قسە دەکەین، دەربارەی چەمكو واتای ئەم ئایەتە موبارەکانە، کە زۆر فراوانترە لەو چەمكو واتایانەی کە هۆی هاتنە خوارەوەکان دەیگەیەنن.

## بەرچاو ڕوونییەك دەربارەی ئەم چوار ئایەتە بەسەرهاتی (مسجدُ الضِّرار)

دیارە پێشتر باسمان کرد، کە ئەو چوار ئایەتە دەربارەی بەسەرهاتێك کە لە گەرمەی جەنگی تەبووکدا ڕوویداوە، هاتوونە خوار، ئنجا من سەرەتا لە چەند خاڵێکی کورتو پوختدا، ئەو بەسەرهاتە دێنم، پێش ئەوەی بێمە سەر مانای گشتی ئایەتەکان، بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕۆشن بێ، ئەم چوار ئایەتە لە چ کەش و بارودۆخێکدا هاتوونە خوار، وە بەسەرهاتی دروستکردنی ئەو مزگەوتە چۆن بووە؟

(إبن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆی لە (المصباح المنیر في تهذیب تفسیر إبن الكثير)دا کە دیارە تەفسیری (إبن کثیر)ە، بەڵام لە لایەن چەند زانایەکەوە پوختە کراوەتەوە، لە لاپەڕە (٥٩١ و ٥٩٢) باسی بەسەرهاتی ئەو مزگەوتە دەکات.

کە بە (مسجد الضرار) مزگەوتی زیانگەیاندن ناوی دەرکردوە، من قسەکانی ئەوم لە حەوت خاڵدا کورت کردوونەوە:

١- بەرلەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بچێ بۆ مەدینە، پیاوێك لە خەزرەجییەکان هەبوو، پێی دەگوترا: (أبو عامر الراهب)، وە لە سەردەمی نەفامییدا، پێش ئیسلام، بوو بە نەصرانیی، وە شارەزای خاوەن کتێبان بوو، بەتایبەت کتێبی نەصرانییەکان، وە لە سەردەمی نەفامییدا، هەم خاوەنی پەرستن بوو، وە لە نێو خەزرەجییەکانیشدا رێزو حورمەتێکی زۆری لێ دەنرا.

٢ - کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەو (أبو عامر)ە، دەستی کرد بە دژایەتییکردنی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا، وە پاشان لە مەدینەدا نەمایەوەو رای کرد بۆ لای کافرەکانی مەککە {هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی قورەیش}، کە لەوێ پشتگیریی دەکردن بۆ جەنگ کردن لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە دیارە لە جەنگەکاندا بەشداریی کردوە، بە تایبەت لە جەنگی ئوحوددا، پیلانێکی خراپی گێڕا بوو، ئەویش ئەوە بوو کە چەند خەندەقێکی هەڵقەندبوون، لە نێوانی سوپای ئیسلام‌و سوپای کوفردا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە نێو یەکێك لەو خەندەقانە، ئەوە بوو کە بریندار بوو، تووشی ئەزیەت بوو.

٣ - وە پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی ئەو (أبو عامر الراهب)ە، رابکات بۆ مەککە بانگی کردبوو، وە قورئانی بەسەردا خوێندبۆوەو، ئیسلامی تێگەیاند، بەڵام رازی نەبوو مسوڵمان بێ‌و، لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵگەڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ تووکی لێکرد، دوعای خراپی لێکرد، تووکەکەشی ئەوە بوو کە: لە دوور وڵاتیی‌و بە دەرکراویی بمرێ، وە ئەو دوعایەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێ قبووڵ بوو.

٤ - (أبو عامر الراهب) چوو بۆ لای هیرەقلی رۆم، دیارە دوای ئەوەی مەککە گیرا، وە کە کەسێك نەما لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا بچێ کەی‌و بەینیان لەگەڵدا بکات، بۆ دژایەتیی پێغەمبەر ﷺ، چوو بۆ لای هیرەقل، پادشای رۆم، داوای یارمەتی لێکرد لە دژی پێغەمبەر ﷺ، هیرەقلیش بەڵێنی پێداو دڵخۆشی کرد، وە (أبو عامر الراهب) لای هیرەقل مایەوە، {ماوەیەك دیارە لەلای هیرەقل ماوەتەوە} وە نامەشی نووسی بۆ کۆمەڵێك لە خەڵکەکەی خۆی لە پشتیوانەکان،

ئەوانەی کە خزمو قەومی بوون، لەوانەی کە ئەهلی نیفاقو دوو دڵیی بوون. نامەی بۆ نووسین کە ئەوە هیرەقل بەڵێنی پێداوم، دیارە بەڵێنی پێداوە پشتگیریی و هاوکاریی بکات بۆ دژایەتییکردنی پێغەمبەر ﷺ.

- (أبو عامر الراهب) فەرمانی کرد بە خەڵکەکەی خۆی لە هۆزی خەزرەج، وە لە پشتیوانەکان، ئەوانەی کە ئەهلی نیفاقو دەغەڵیی و دوو دڵیی بوون کە مۆڵگەیەکی بۆ دروست بکەن، پەناگەیەکی بۆ دروست بکەن، دوایی کە هاتەوە لەو شوێنەدا بیانبینێ، ئیدی ئەوانیش دەستیان کرد بە دروستکردنی مزگەوتێك ئنجا ئەگەر هاتباو خانوویکی دیکەیان دروست کردبایە! خەڵك دەیپرسێ ئەو خانوە چییە؟! بەڵام هەڵساون مزگەوتێکیان دروست کردوە، تاکو کە گوتیان: ئەوە چییە؟! بڵێن: مزگەوتە ! کە مزگەوتەکەش مۆڵگەیەك بووە، پەناگەیەك بووە بۆ هاتنەوەی (أبو عامر الراهب) هەر کات سوپای ڕۆمی لەگەڵ خۆی دا هێنا، بەڵام وایان لە مسوڵمانان حاڵی کرد، کە ئەوە مزگەوتە، بۆ خوا پەرستیی دروستی دەکەن، وە ڕەنگە خەڵکێکی سادەو نەزانیش چووبێ بۆ ئەو مزگەوتەو نوێژیشی تێدا کردبێ، چونکە مزگەوتە، نەیانزانیوە بۆچی دروست کراوەو، ئەوانەی لە پشتیەوەن کێن؟! ئەو مزگەوتەش دیارە لە نیزیك مزگەوتی (قوباء) بوو، ئیدی مزگەوتەکەیان دروست کردو مەحکەمیان کرد، وە لێی بوونەوە، لە دروستکردنی. بەرلەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچێ بۆ جەنگی تەبووك.

٦- ئنجا چوون بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو، داوایان لێکرد کە بچێ بۆ لایان، وە لەو مزگەوتەیاندا نوێژ بکات، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: (إِنا عَلَى سَفَرٍ وَلَـكِن إِذَا رَجَعْنَا إِنْ شَاءَ اللهُ) ئێمە ئێستا بەرەو سەفەرین، بەڵام کە گەڕاینەوە، ئەگەر خوا حەز بکات، دێین نوێژی تێدا دەکەین.

٧- کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە تەبووکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، وە تەنیا ڕۆژێك یان هەندێك لە ڕۆژێکی مابوو بگاتەوە، جبریل دابەزی بۆ لای، وە ئەو ئایەتانەی بۆ ناردنە خوار، وە پێغەمبەریش ﷺ دوای ئەوەی کە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە هەواڵی پێدرا، کە ئەو مزگەوتە بە چ مەبەستێك دروست کراوە ؟ کەسانێکی نارد: ئەو مزگەوتەیان سووتاندو ڕووخاند.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ﴾، هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا کە باسی دەغەڵو دڵ نەخۆشەکانو، ئەوانەی کە لە جەنگی تەبووك دواکەوتوون، لە عەرەبە خێڵەکییەکان، لە خەڵکی مەدینە، لە مسوڵمانانی باش کە شەیتان زەفەری پێ بردوون، دەکات، هەر لەو سیاقەدا دەفەرموێ: وە ئەوانەی کە مزگەوتێکی زیانگەیاندنیان دروست کرد، وە بە مەبەستی بێبڕوایی و پەرتەوازەیی خستنە نێوان بڕواداران، وە بە مەبەستی ئامادەسازیی بۆ کەسێك کە پێشتر دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوای کردوە، {کە مەبەست پێی ئەبو عامیری ڕاهیبە، یان مەبەست پێی ڕۆمەکانن، ﴿ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، وە زۆر بە جەختکردنەوە سوێند دەخۆن کە هەر چاکەمان مەبەست بووە، بەڵکو مەبەستمان پێ ئامانجی هەرە چاك بووە.

چونکە (حسنی) (مؤنث)ی (أحسن)ە، (أحسن) واتە: هەرە چاك (حسنی)ش، واتە: هەرە چاك، بەڵام بە باری مێینەدا، دیارە نێرینەو مێینەی مەجازیی ﴿ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾، وە خوا شایەدیی دەدا کە ئەوانە بە تەئکید درۆزنن، واتە: ڕاست ناکەن، مەبەستیان چاکە نەبووە، بەڵکو مەبەستیان ئەو چوار ئامانجە بووە، کە خوای پەنهانبین باسی کردون:

١/ زیان گەیاندن.

٢/ کوفر تێدا کردن.

٣/ پەرتەوازەیی خستنە نێوان ئیمانداران.

٤/ ئامادەسازیی و زەمینەسازیی بۆ دوژمنانی ئیسلام، کە پێشتر دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانانیان کردوە.

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾ هەرگیز تێیدا ڕامەوەستە، واتە: هەرگیز نوێژی تێدا مەکە، تێیدا مەوەستە بۆ نوێژ کردن، یانی: ڕەوایەتیی پێ مەدە، چونکە ئەوە مزگەوت نیەو بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە جێگای خواپەرستیی بێ، بەڵکو بە مەبەستی ئەوە دروست کراوە، کە جێی دژایەتییکردنی خواپەرستانی ڕاستەقینە بێ، کە مسوڵمانانن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ﴾، بە دڵنیایی مزگەوتێك کە لە یەکەمین ڕۆژەوە لە ڕۆژی بنیاتنرانیەوە لەسەر پارێزکاریی بنیاتنرابێ، شایستەترە کە تۆ تێیدا بوەستی، {واتە: نوێژی تێید بکەی} لە بەناو مزگەوتێکی لەوجۆرە.

ئنجا ئایا ئەهلی ئەو مزگەوتەش چۆنن؟ ئەگەر ئەهلی مزگەوتی زیانداڵ ضِرَار کەسانێك بوون کە ئاوا پیلانیان گێڕاوە، ئایا ئەهلی ئەو مزگەوتە چۆنن؟ ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾، پیاوانێکی تێدان کە حەز دەکەن خۆیان پاك بکەنەوە، وە بێگومان خوا خۆ پاککەرەوانی خۆش دەوێن.

لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، کە هەر باسی ئەوە کراوە کە خۆ پاککردنەوە، یانی: تارەت گرتنو خۆ پاککردنەوە بە ئاو، بەڵام لە ڕاستییدا چەمکی ئایەتەکە زۆر فراوانترە، یانی: پیاوانێکی تێدان، کە دەیانەوێ: ئاشکراو پەنهانی خۆیان دڵو دەروونی خۆیان، هۆشو عەقڵی خۆیان، ڕەوشتی خۆیان، هەڵسوکەوتەکانی خۆیان لە ناشەرعیی بژار بکەن، ﴿ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴾، وە خوا خۆ پاککەرەوانی خۆشدەوێن، واتە: ئەوانەی ژەنگو چڵكو چەپەرو خڵتەو خاڵی دەروونیی، پێشی ڕواڵەتیی، بە خۆیانەوە ناهێڵن.

بۆیە زۆرجار هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان ئەگەر ئینسان وریا نەبێ، چەمكو واتای ڕاستەقینەی ئایەتەکان بچووك دەکاتەوە، من تەماشای هەموو تەفسیرەکانم کرد، ئەوەی کە من ئێستا ئاماژەم پێدا، ئاماژەیان پێ نەداوە، هەموویان هەر گوتوویانە: مەبەست پێی تارەتگرتنەو خۆ پاککردنەوەیە!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾، خوای پەروەردگار بە پرسیارکردنی نکوولیی لێکەرانە دەپرسێ: ئایا کەسێك کە بناغەی خانووەکەی خۆی دامەزراندوە، لەسەر پارێز لە خوا کردنو ڕەزامەندیی خوا داواکردن، ئەو کەسە باشترە، یان کەسێك کە بناغەی خانووەکەی خۆی لەسەر قەراغی کەندەڵانێکی بن هەڵۆڵی خەریکی ڕووخان بنیاتناوە، وە لەگەڵیشیدا دەڕمێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، ئایا کامیان باشترە؟

﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، وە خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاست، نەك ڕێنماییان ناکات، خوا ڕێنمایی هەموو کەسی کردوە، بەڵام لێرەدا ﴿لَا يَهْدِى ﴾، واتە: نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست.

ئنجا لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾، بەردەوام ئەو خانووەی کە بنیاتیان نا، مایەی گومانە لە دڵو دەروونیاندا، مایەی گومانو دوو دڵییو دەغەڵییە لە دڵو دەروونیاندا، هەتا ئەو کاتەی دڵەکانیان پارچە پارچە دەبن، دڵی ئینسان کەی پارچە پارچە دەبێ؟ دوای ئەوەی کە دەمرێ، واتە: تاکو دەمرن، ئەو گومانو دوو دڵییو نیفاقو دەغەڵییە، لە دڵو دەروونیاندا، هەر دەمێنێتەوە، بەهۆی ئەو هەڵوێستو کردەوەیانەوە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە کردەوەی خراپ، دەبێتە هۆی ئەوە کە سیفەتی خراپ لە ئینساندا پەیدا بێ، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، وە خوا زانای کارزانە.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ﴾.

کە خوێنراویشتەوە (الّذین) بەبێ (و): (الذین اتخذوا مسجداً ضِرَاراً) ئنجا ئەگەر (و)ەکەی لەگەڵدا بێ، ئەوە (عطف)ە،{دەگێڕێتەوە} بۆ سەر ئەوەی پێشوو. واتە: ئەو دەغەڵو مونافیقانەی ئاوایان کردو، ئەوانەشیان کە مزگەوتێکیان دروست کرد بە مەبەستی زیان گەیاندن، ئنجا دروستکردنی ئەو مزگەوتە، خوای بێنیاز لێرەدا چوار ئامانجی خراپی لێ دەرخستوون:

**یەکەم**: ﴿ضِرَارًا﴾، واتە: زیانگەیاندن، زیانگەیاندن بە کێ؟ وە بە چی؟ لە سیاقەکەیەوە دیارە، زیانگەیاندن بە مسوڵمانانو بە ئیسلام.

**دووەم**: ﴿وَكُفْرًا﴾، وە بۆ بێبڕوایی تێدا کردن، بۆ کوفر تێدا کردن، هەڵبەتە ئەوانە هەر کافر بوون، بەڵام یانی: بۆئەوەی زیاتر کوفری تێدا بکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە جاری وایە کردەوەی مرۆڤیش کوفرە، نەك تەنیا قەناعەتی نێو دڵو دەربڕینی زمانی کوفر بێ، بەڵکو جاری وایە کردەوەی ئینسانیش کوفرە، هەروەك جاری وایە کردەوەی ئینسانیش ئیمانە، وەك پێشتریش باسمان کردوە، کە هەم کوفرو هەم ئیمانیش، پەیوەندییان بە عەقڵەوەو، بە دڵەوەو. بە زمانەوە، وە بە کردەوەی ئەندامەکانیشەوە هەیە.

**سێیەم**: ﴿وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، وە پەرتەوازەیی خستنە نێوان ئیمانداران، زۆربەیان ئاوایان لێکداوەتەوە: لەبەرئەوەی ئەو مزگەوتەی کە دروستیان کردوە، لە تەنیشت مزگەوتی قوباء بووە، بۆئەوەی کە خەڵکەکە

موونافەسـەی نوێژکـەرەکانی مزگـەوتی قوبـاء بکـەن، وە بێنـە ئـەو مزگەوتـەی خۆیانەوە، بەڵام پێم وایە چەمكو واتـایـەکەی فراوانتـرە! پەرتـەوازەیی خسـتنە نێوان بـڕواداران یانـی: وەختێـك کەسێـك مزگەوتێـك دروسـت دەکـاتو لـەوێدا پیلان دەگێڕێ، وە دوایی هەوڵدەدا دەستی ڕۆمەکان بگرێو، دەست کێشییان بکات بۆ نێو کۆمەڵگای ئیسلامیی بۆ دژایەتییکردنی دەوڵـەتی ئیسـلامیی، ئـەوە لـە ڕاستییدا پـەرتـەوازەیی گـەورە خسـتنە نێـوان ئیمـاندارانە، ئـەوە مـانـاو چەمکە ڕاستـەقینەکەیـەتـی، نـەك هـەر ئەوەنـدە کـە: مزگەوتێـك دروسـت دەکـەن، کـە دوایـی موونافـەسـەی ئـەو مزگەوتەی دیکەی پـێ دەکەن!

چوارەم: ﴿ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ ﴾، واتە: وە ئامادە سـازیی بۆ کەسانێك کە پێشتـر دژایەتیی خـواو پێغەمبـەری خـوایان ﷺ کردوە، دەگوترێ (أرصَدَهُ لِكَذا : أعَدَّهُ) واتـە: بۆی ئامادە کرد، بەڵام ئەگەر (رَصَـد) بووایـە (رَصَـدَهُ يَرصُدُهُ رَصَداً وَرَصَداً: رَقَبَهُ يَرقُبُـهُ)، واتـە: چاودێریی کرد، چاودێـریی دەکات.

بەڵام لێرە خوا نەیفەرمووە: (وَرَصَداً لِمَنْ حارَبَ اللهَ وَرَسولَه) بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ وَإِرۡصَادٗا ﴾.

(إرْصَـاد) واتـە: ئامادەسازییو ئامـادەکردنو زەمینـەخۆشـ کـردن، مۆڵـگە دروست کردن بە بەرژەوەندیی کەسێك کە پێشتـر دژایەتیی خواو پێغـەمبەری خـوای کـردوە، کە مەبەست پێی ئـەبو عامیـری ڕاهیبـە، وە غەیری ئـەویش کە دەگونجێ مەبەسـت پێی ڕۆمەکان بێ، وە مـەبەسـت پێی هـەموو ئەو دەغـەڵو موونافیقـە دڵ نەخۆشـانەن، کە ئەو کاتە کە لە بەرانبەر مسوڵمانان لە سـەنگەردا بوونو لە بۆسـەدا بـوون.

ئنجـا لـێرەدا ئـەمە ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ کـە لـە بـەرگی ئیسـلامدا دژایـەتیی ئیسلام کـردن، یـەکێکە لـە شێـوازەکانی دژایـەتیی کردنی مسـوڵمـانـان، کە دەتـوانین بڵێین: سەرجەم ئەوانەی بۆ ئامانجی ناحەزانی ئیسلام بەکاردەهێـنرێن، ئەو حوکمـە دەیانگرێتەوە، چ لە بن پەردەی ئیسـلامدا بن، چ لە بن پەردەیەکی دیکەدا بن، هـەموو ئەوانەی کە بۆ دژایـەتیی ئیسـلامو مسـوڵمانان بەکاردەهێـنرێن: ئنجا مەلایـەك بـێ، بانگخوازێك بێ، ڕیشدارێك بێ، بێ ڕیشێك بێ، نووسەرێك بێ، ناوێکی ئیسلامیی لەسەر

بێ، ناوی غەیری ئیسلامیی لەسەر بێ، وە دامەزراوەیەکی فەرمیی بێ، ڕێکخراوێکی نافەرمیی‌و ناحکوومیی بێ، کە ئێستا لە پانایی‌و درێژایی جیهانی ئیسلامییدا. ئەوانە هەن، کەسانێك کە کەمین‌و بەمینیان لەگەڵ ڕژێمە عەلمانییەکاندایە، لەگەڵ ڕژێمە خۆ سەپێنەکاندایە، لەگەڵ ئەو ڕژێمانە دایە، کە دەیانەوێ بە ئاگرو ئاسن حوکمی مسوڵمانان بکەن‌و، خۆیان بەسەریاندا بسەپێنن، حوکمی بنەماڵەیی‌و میراتیی بکەن، حوکمی دیکتاتۆریی بکەن.

ئا ئەوانە دەزانن ئەگەر ڕاستەوخۆ دژایەتیی ئیسلام بکەن، خەڵك لێیان ڕادەپەڕێ، بۆیە دێنن لە بەرگی ئیسلامداو لە بن پەردەی ئیسلامدا، دژایەتیی ئیسلام دەکەن، یانی: لە مزگەوتەوە دژایەتیی ئەهلی مزگەوت دەکەن! بە ناوێکی ئیسلامییەوەو بە سیمایەکی ئیسلامییەوەو، لە ژێر ناوونیشانی ئیسلامییدا: وەزارەتی ئەوقاف، یەکێتی زانایان، ئەزهەر، لێژنەی فەتوای فڵان، فڵان بانگخواز، فڵان کەناڵی ڕاگەیاندنە، ...هتد، هەموو ئەوانە، دەبێ تەماشا بکرێ: ئەگەر دژایەتیی مسوڵمانان‌و تەوژمی ئیسلامیی دەکەن، کە دەیەوێ ئیسلام حاکم بێ‌و، ئیسلام باڵادەست بێ، وە دژایەتیی تەوژمی ئیسلامیی‌و، دژایەتیی مسوڵمانانیان کرد. دژایەتیی ئەو ئیسلامەی کرد کە بۆ چەسپاندنی خوا بەیەکگرتن (توحید) دەکات بە مانای فراوان‌و گشتگیری وشەی (توحید)، وە دژایەتیی ئەو ئیسلامەی کرد، کە دژی بەرژەوەندیی حوکمڕانە خۆسەپێنەکانە، دژایەتیی ئەو ئیسلامەی کرد، کە دەیەوێ خەڵك سەرچاوەی دەسەڵات بێ، نەك بنەماڵەیەك، نەك کەسێك، نەك حیزبێك، کە بە زۆرو بە ئاگرو ئاسن خۆی بەسەر خەڵك‌و میللەتدا دەسەپێنێ. وە دژایەتیی ئەو تەوژمە ئیسلامییەی کرد، کە دەیەوێ خێرو بێری وڵات، بۆ هەموو خەڵك بێ، نەك قۆرخکاریی‌و گەندەڵیی تێدا بکرێ، وە دژایەتیی ئەو تەوژمە ئیسلامییەی کرد، کە دەیەوێ ئیسلام سێبەرو سایەی خەڵك بێ، شەریعەت سێبەری سایەی خەڵك‌و وڵات بێ: ئەوە هەموو ئەوانە دەچنە نێو بازنەی ئەوەوە.

کە خوای کاربەزان ناوی لێناوە: ﴿مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا﴾، مزگەوتێکی زیانگەیەنەر.

کەواتە: دەگونجێ مزگەوتیش زیان بگەیەنێ بە ئیسلام، کە لە ڕاستییدا ئیسلام بە نێوەڕۆکی ڕاستەقینە، بە شتی نێوەڕۆکدار خزمەت دەکرێ، نەك بە توێکڵێکی جوان، نەك بەوە کە تەنیا ڕواڵەتێکی جوانی هەبێ، بەڵام نێوەڕۆکێکی وێرانی هەبێ.

ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێران، دوور كوژی نیزیك خەسار، دەگونجێ كە زەبری زۆر گورچك بڕ لە ئیسلامو مسوڵمانان بدەن !

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، وە زۆر بە جەخت كردنەوە سوێندیش دەخۆن، كە ئێمە هەر مەبەستمان پێی ئامانجی هەرە چاك بووە، واتە: نەك هەر مەبەستمان چاكە، بەڵكو مەبەستمان باشترین ئامانج بووە، مەبەستمان هەرە چاك بووە، دیارە ئەویش ئەوەیە كە هاتوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ كە ئەوە مزگەوتەكەیان دروستكردوە، وە گوتوویانە: ئێمە بۆ شەوی سەرماو، بۆ ئەو كەسانەمان كە نەخۆشنو، كەسانێك كە بێهێزن، ئەوانەمان كە ناگەینە مزگەوتی (قوباء)، ئەو مزگەوتەمان لە نیزیك ماڵەكانی خۆمانەوە دروستكردوە.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾، وە خوا شایەدیی دەدات، كە ئەوانە درۆزنن، بە جەخت كردنەوە خوا شایەدیی دەدات، كە ئەوانە درۆزنن، مەبەستیان چاكە نەبووە، بەڵكو مەبەستیان ئەوە بووە، كە خوای زاناو شارەزا ڕوونی كردۆتەوە.

<u>مەسەلەی دووەم</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ﴾.

هەرگیز لەو مزگەوتەدا ڕامەوەستە، واتە: بە پێوە مەوەستە كە مەبەست پێی نوێژ تێدا كردنو خواپەرستیی تێدا ئەنجام دانە، دەفەرموێ: مزگەوتێك كە لە یەكەم ڕۆژەوە، لەسەر پارێزكاریی بنیاتنراوە، شایستەترە كە تۆ تێیدا بوەستی بۆ طاعەت.

لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ﴾ ئایا ئەوە چ مزگەوتێكە؟

هەندێك گوتوویانە: مەبەست : مزگەوتی (قوباء)ە.

هەندێك گوتوویانە: مەبەست: مزگەوتی پێغەمبەرە ﷺ.

واشپێدەچێ ئەوە ڕاستتر بێ، واتە: مەبەست: مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بێ. بە پێی ئەم دەقە: ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: اخْتَلَفَ رَجُلَانِ مِنْ بَنِي خُدْرَةَ (وفي لفظ) تَمَارَيْتُ أَنَا وَرَجُلٌ مِنْ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى، فَقَالَ الْخُدْرِيُّ: هُوَ مَسْجِدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ الْعَمْرِيُّ: هُوَ مَسْجِدُ قُبَاءٍ، فَأَتَيَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَسَأَلَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: هُوَ هَذَا الْمَسْجِدُ لِمَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: فِي ذَاكَ خَيْرٌ كَثِيرٌ يَعْنِي مَسْجِدَ قُبَاءَ﴾، {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، بِرقم: (١١١٩٤)، وَمُسْلِمٌ، بِرقم: (١٣٩٨)، وَالتِّرمِذِيُّ، بِرقم: (٣٠٩٩)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (١٦٢٦)، وَأَبِي يَعْلَى، برقم: (٩٨٥)}.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی دەڵێ: دوو پیاو لە بەنی خودرە (دیارە هۆزێك بوون) {وە لە بێژەیەکی دیکەدا، دەڵێ: منو پیاوێك لە بەنی عەمری بەنی عەوف}. لەبارەی ئەو مزگەوتەوە کە لەسەر پارێزکاریی بنیاتنراوە بووە مشتومڕمان کامیانە ؟ کابرای خودریی گوتی: مەبەست: مزگەوتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، کابرای عەمرییش گوتی: نەخێر، مەبەست: مزگەوتی قوبائە، چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە پرسیاریان لێکرد، فەرمووی: ئەم مزگەوتەیە، واتە: مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ، وە فەرمووی: مزگەوتی قوبائیش خێرێکی زۆری تێدایە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ ﴾، یانی: لە ڕۆژی دامەزراندنو بنیاترانیەوە. وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە، بەرچاو ڕۆشنکەرەوەو ئیلهام بەخشی هاوەڵان بووە خوا لێیان ڕازی بێ، کە سەرەتای مێژووی کۆچیی بەو کاتە دابنێن کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، چونکە هەر ئەو کاتەش ئەو مزگەوتەشی دروست کردوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ﴾ شایستەترە کە تۆ تێیدا بوەستی. کەواتە: مزگەوتێك کە بە نیەتێکی ساغو سافو لەسەر تەقوا بنیات نراوە، دوور لە ئیعتیباری دیکە، وا باشترە ئینسان خوا پەرستیی تێدا ئەنجام بدات.

كە دەفەرموێ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا﴾، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا باسمان كرد دەڵێن: مەبەست: خۆ پاك ڕاگرتنی جەستەیی یە، خۆ پاك ڕاگرتنی بەرهەستە، بەڵام بە ڕاستی ئایەتەكە ماناكەی زۆر گشتگیرە، هەم بۆ پاكیی مەعنەویی، وە هەم بۆ پاكیی جەستەیی، وە پاكیی مەعنەویی: لە ڕووی فیكریی، لە ڕووی عەقیدەیی، لە ڕووی ڕەوشتیی، لە ڕووی عیبادەت، لە هەموو ڕووەكانەوە.

كە دەشفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾، بێگومان خوا خۆ پاككەرەوانی خۆشدەوێن، واتە: خۆ پاككەرەوان ئەوانەی كە جەستەی خۆیان پاك ڕادەگرن، مێشكو عەقڵی خۆیان پاك ڕادەگرن، لە بیروبۆچوونی پووچو ئەفسانەیی، دڵی خۆیان پاك ڕادەگرن، وە ڕەوشتی خۆیان پاك ڕادەگرن، وە ماڵو خێزانی خۆیان پاك ڕادەگرن، هەمووی دەگرێتەوە.

كەواتە: بەهۆی پاكییەوە، خوای بەرز مرۆڤی خۆشدەوێ، دیارە پاكییش، وەك گوتم: پاكییەكی گشتگیر، كە هەموو ڕەهەندەكانی ژیانو هەموو لایەنەكانی بگرێتەوە، وە دەرو دەروونی مرۆڤ بگرێتەوە.

مەسەلەی سێیەم: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

كورتەی ماناو مەبەستی ئەو ئایەتە موبارەكە ئەوەیە: ئایا كەسێك كە خانووەكەی خۆی، {بناغەی كارەكەی خۆی} لەسەر پارێزكردن لە خوا، وە داواكردنی ڕەزامەندیی خوا، بنیاتناوە باشترە ؟ یاخود كەسێك كە بناغەی كاری خۆی، بناغەی خانووی خۆی، لەسەر قەراغی كەندەڵانێكی بن هەڵۆڵی هەڵواسراو، كە خەریكە بڕووخێ، بنیات ناوە، كە لە ئانو سات دایە بڕمێتە نێو دۆزەخ، كامیان باشترە ؟ وە خوا كۆمەڵی ستەمكاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاست.

با سەرنج لە چەند وشەیەكی ئەم ئایەتە موبارەكە بدەین:

١) کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ ﴾ خوێنراویشەتەوە: (أُفَمَنْ أُسِّسَ) ئەگەر بخوێنرێتەوە: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ ﴾، دیارە ئەو کاتە (بُنْیان) دەبێتە (مَفعول)، بەڵام ئەگەر (أُسِّسَ)ە بێ، ئەو کاتە دەخوێنرێتەوە (بُنیانُهُ) بە (البناء للمجهـــول)، ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ ﴾.

ئایا کەسێك بناغەی کاری خۆی دامەزراندوە، لەسەر پارێز لە خوا کردن و ڕەزامەندیی خوا داوا کردن باشترە! ئەگەر ئەوەی دیکەش بخوێنرێتەوە: ئایا کارێك کە بناغەکەی لەسەر پارێز لە خوا کردن و، ڕەزامەندیی خوا داوا کردن دامەزرێنراوە، باشترە؟ ﴿ أَمْ مَّنْ أَسَّسَ ﴾ دووبارە ئەویش دەخوێنرێتەوەش: (أَمْ مَنْ أُسِّسَ) یاخود کارێك کە بناغەکەی دامەزرێنراوە، لەسەر قەراغی کەندەڵانێکی هەڵواسراوی خەریکی ڕووخان، (بُنْیان) واتە: (بناء) خانوو. (أَسَّسَ)، یان (أُسِّسَ) یانی: (وَضْعُ الأساس) واتە: دامەزراندن.

٢) کە دەفەرموێ: ﴿ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ ﴾، (تَقْوَى) وەك چوارچێوەی کارەکە، (رِضوان)یش وەك هاندەری ئەو کارە، دیارە ئینسانی مسوڵمان لە هەموو کارێکیدا دەبێ هەوڵبدات لە چوارچێوەی شەرعدا، کارەکەی خۆی ئەنجام بدات، وە بە هاندەری ڕازیکردنی خوای پەروەردگار، یانی: لە کارەکەیدا خۆی بپارێزێ لە ناشەرعیی وە هاندەرو پاڵنەری ئەوەبێ کە خوا ﷻ لێی ڕازی بێ، کارێك کە ئەوە بناغەکەی بێ، بە تەئکید بێگومان باشترە، لە کارێك کە مەبەست پێی خوا نەبێ، وە مەبەست پێ هێنانە دی بەرژەوەندییەکی دنیایی بێ، ئنجا ئەو کارە مزگەوت دروستکردن بێ، قوتابخانە دروستکردن بێ، حیزب دروستکردن بێ، کتێب نووسین بێ، هەر شتێك بێ، وەك ئەوە وایە، کەسێك بێنێ خانووەکەی خۆی لەسەر کەنارو قەراغی کەندەڵانێك کە ڕووبارو لافاو لێی داوەو بن هەڵۆڵی کردوەو بنەکەی بردوەو سەرەکەی ماوەتەوە، وە سەرەکەشی خەریکی ڕووخانە، خۆی لەسەر ئەو قەراغە دابنێ، کە بە تەئکید دوایی دەڕووخێ.

دیارە هەر کارێکیش پەیوەست بێ بە خواوە، بە تەئکید لە دنیاشدا بەرەکەتی دەبێ، وە لە دوارۆژیشدا پاداشتی دەبێ، بەڵام کارێک کە پەیوەست نەبێ بە خواوە، وەك ئەوە وایە کە لەسەر قەراغی کەندەڵانی هەڵواسراوی بن هەڵۆڵ دامەزرێنرابێ.

وشەی ﴿شَفَا﴾ پێشتریش باسمان کرد، ﴿شَفَا﴾، یانی: (حرف) قەراغ، کەنار، لێوار، ﴿جُرُفٍ﴾ (مَا جَرَفَ السَّيْلُ أَصلَهُ، وَأَشرَفَ أَعْلاَهُ، فَإِن تصَدَّعَ أَعْلاَهُ، هُوَ الهارُ) ئەمە (فتح القدير)ی (الشوكاني) لە (شَمْسُ العُلُوم)[1] ەوە هێناویەتی، دەڵێ ﴿جُرُفٍ﴾ ئەوەیە کە لافاو یاخود ڕووبار بنەکەی بردبێ، وە بن هەڵۆڵی کردبێ، وە لای سەرەوەشی خەریکی ڕووخان بێ، ئنجا ئەگەر تیکی تێ بووبێ {درزی بردبێ‌و، قڵیشی تێ بوو بێ} ئەوە پێی دەگوترێ: (هار، هائر) واتە: کە خەریکە بڕووخێ، ئەگەرنا هەر پێی دەگوترێ: (جُرُف).

٣) کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ (أي لا يَجْعَلُهُم عَلَى الصِّرَاطِ المُسْتَقِيم، لا أَنَّهُ لا يَدُلُّهم عَلَيْهِ)، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان هەر دەڵێن: واتە: هیدایەتیان نادات، ڕێنماییان ناکات، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە: نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست، بۆچی؟ چو کە خوا ﷻ هیدایەتی خۆی بۆ هەموو کەس ناردوە، وەك لە سووڕەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَـٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَـٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾﴾.

واتە: وە هەرچی ئەمووده ڕێنماییمان کرد بوون، خوا ڕێنمایی هەموو خەڵکی کردوە، بەڵام ﴿فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾، کوێرییان هەڵبژارد، بەسەر ڕێ بینین‌و پێش پێی خۆ بینیندا.

---

١) لنشوان بن سعيد الحميري (٤٦٧–٥٣٨)، فتح القدير، ج ٢، ص ٤٤٨.

کەواتـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، مەبەست ئەوە نیە کە خوا ڕێنماییان ناکاتو ڕێیان پێشان نادات !، بەڵکو یانی: نایانخاتـە سەر ڕێی ڕاست.

ئنجا ئەگەر کەسێك هیدایەتی خوا قبوولْ بکات، وەختێ خوا ڕێیەکەی پێشان دەدا، قبوولّی بکات، خوای بەخشەریش لە بەرانبەر ئەوەدا چاکەی دەداتەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾﴾ محمد.

واتە: وە ئەوانەی هیدایەت وەردەگرن (إهتدوا) هیدایەت وەردەگرن، ڕێنمایی خوا وەردەگرن، بەرنامەی خوا قبوولْ دەکەن، خوا لە بەرانبەر ئەوەدا، چاکەیان دەداتەوە، بەوە کە هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، واتە: دەیانخاتە سەر ڕێی ڕاست. زیاتر دڵیان دەچەسپێنێ، وە پارێزیشیان پێ دەبەخشێ.

بەڵام ئەوانەی کە هیدایەتی خوا ڕەفز دەکەن، ﴿فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾﴾ فصلت، ئەوانە هەورە تریشقە، یاخود چریکەی ئازاری ڕیسواکەر گرتنی، بەهۆی ئەوەوە، کە لایان دەدا، واتە: لە ئەنجامی لادانی خۆیاندا، خۆیان وا لێکرد کە شایستەی ئەوە نەبن، خوای پەروەردگار بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست.

<u>مەسەلەی چوارەمو کۆتایی</u>: کە دەفەرموێ: ﴿لَا يَزَالُ بُنْيَٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ﴾.

ئەو خانووەی کە بنیاتیان نا، کە مزگەوتەکە بوو، بەڵام ناوی لێنانێ مزگەوت، هەر دەفەرموێ: (بُنْیان) ئەو خانوو بینایەی کە دایانمەزراند، بەردەوام هۆی دوو دڵیو گومانو نیفاقو دەغەڵییە لە دڵیاندا ﴿إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ﴾، مەگەر دڵیان پارچە پارچە ببێ.

ئەمەش بە چەند شێوەیەك خوێنراوەتەوە:

١)﴿ تَقَطَّعَ ﴾، دیارە لە ڕیشەدا (تَتَقَطَّعَ) یە.

٢) خوێنراویشەتەوە (تُقَطَّعَ).

٣) خوێنراویشەتەوە: (تَقْطَعَ) (أي أَنْتَ یا محمد).

واتە: سێ (قِراءَة)ی هاتوون:

١/ (تَقَطَّعَ)، واتە: تاکو دڵیان پارچە پارچە دەبێ.

٢/ (تُقَطَّعَ)، واتە: پارە پارە دەکرێ.

٣/ (تَقْطَعَ) واتە: تاکو تۆ دڵیان پارچە پارچە دەکەی.

واتە: تا ئەو کاتەی کە دەمرن، دیارە ئینسان کە مرد هەموو ئەندامەکانی لێك هەڵدەوەشێن‌و، پارچە پارچە دەبن، واتە: تاکو دەمرن ئەو نیفاق‌و دەغەڵییە بەهۆی ئەو کردەوەیانەوە لە دڵیاندا دەمێنێتەوە.

وە هەندێك گوتوویانە: ﴿ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ ﴾، واتە: تا ئەو کاتەی کە لە ئەنجامی پەشێمان بوونەوەو تەوبەی چاك کردندا، دڵی خۆیان پارچە پارچە کردوە، لە ترسی خوای بەرزو مەزن، ئەوکاتە خوا لێیان خۆش دەبێ، بەڵام ئەوەی یەکەمیان زیاتر دەچێتە عەقڵەوە.

ئنجا دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، خوا زانای کارزانە، واتە: خوا زانای کارزانە، کە بەو شێوەی پێکردن لە ئەنجامی ئەو کردەوەیاندا.

لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستییە بزانرێ کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کردەوەی خراپ دەبێتە هۆی پەیدابوونی خەسڵەت‌و سیفەتی خراپ لە ئینساندا، وەك خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ لَا يَزَالُ بُنْيَٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ ﴾، بەردەوام ئەو خانووەی کە دروستیان کرد، مایەی گومان‌و دوو دڵیی‌و نیفاقە، لە دڵ‌و دەروونیاندا.

کەواتە: بە کردەوەی خراپ، ئینسان جاری وایە زیاتر بەرەو کوفر دەچێ، وە هەر کردەوەو هەڵوێستێکی خراپ، بەرهەمی سیفەتێکی خراپە لە ئینساندا، یانی: سیفەتی خراپی مرۆڤە، کە وای لێدەکات کردەوەی خراپ ئەنجام بدات، وە جاری واش هەیە کردەوەی خراپیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە سیفەتی خراپ لە دڵو دەروونی ئینسان دا پەیدا بێ، یاخود ئەو سیفەتە خراپەی کە لە دڵیدا هەیە، کە کوفرە، نیفاقە، فیسقە، هەرچی هەیە، قووڵتر ببێتەوەو تۆختر ببێتەوە.

لە ڕاستییدا هەم دڵو، هەم ئەندامەکان، هەم کردەوەی دڵ، هەم کردەوەی ئەندامەکان پەیوەندییەکی دوو سەرەیان لە نێواندا هەیە: هەر کامێکیان کاریگەریی بۆ سەر ئەوی دیکەیان هەیە، ئینسان تاکو دڵی باشتر بێ، کردەوەشی باشتر دەبێ‌و، تاکو کردەوەی باشتر بێ، دڵیشی باشتر دەبێ، وە بە پێچەوانەشەوە تاکو دڵو دەروونی خراپتر بێ، کردەوەی خراپتر ئەنجام دەدات، وە هەتا کردەوەی خراپتر ئەنجام بدات، دڵو دەروونیشی خراپتر دەبێ‌و، وێرانتر دەبێ.

(عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە تەفسیرەکەی خۆی (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)[1] لەم چوار ئایەتەدا کە ڕابردن، دە (١٠) خاڵی وەرگرتوون، ئەو ناوی لێناون (عَشْرُ فَوَائِد) دە سوود، دە پەندو عیبرەت، کە منیش وەك خۆی لێم وەرگرتوون‌و سەرژمێریان دەکەم یەکسەر بە کوردیی دەیانهێنم :

١/ ئەو مزگەوتەی کە لە نیزیك مزگەوتێکی دیکەوە دروست دەکرێ، بە مەبەستی زیان پێگەیاندنی، وەك مونافەسەو پێشبڕکە، شتێکی قەدەغەیە، وە پێویستیشە تێکبدرێ، مادام مەبەستی زیانگەیاندن بە مزگەوتە ئەصڵییەکەی یەکەم بێ.

٢/ جاری وایە کردەوەیەکی باش، بەهۆی نیەت‌و مەبەستێکی خراپەوە، دەبێتە کردەوەیەکی خراپ‌و، قەدەغە کراو، مزگەوت دروستکردن کردەوەیەکی باشە. بەڵام ئەگەر مزگەوتەکە بۆ مەبەستێکی خراپ دروست بکەی، ئەو کاتە ئەو نیەتە خراپە، ئەو کردەوە بە ڕواڵەت باشە، خراپ دەکات.

---

١) ص ٣٥٦.

٣/ هەر شتێك كە ببێتە مایەی پەرتەوازەیی مسوڵمانان، بە گوناهو سەرپێچیی لە قەڵەم دەدرێ، وە هەر شتێك ببێتە هۆی تەبایی‌و یەكریزیی مسوڵمانان، ئەوە بە طاعەت‌و فەرمانبەریی بۆ خوا دادەنرێ.

٤/ دەبێ نوێژكردن لەو شوێنانەدا، كە جێگای گوناهو تاوان‌و سەرپێچیین، قەدەغە بكرێ، نابێ نوێژ لە شوێنێكدا بكرێ كە جێگای گوناهە، بەڵكو دەبێ دووریی لەو شوێنانە بكرێ.

٥/ گوناهو سەرپێچیی كاریگەریی نەرێنیی هەیە بۆ سەر شوێنەكان، بە پێچەوانەشەوە: طاعەت‌و چاكە، كاریگەریی ئەرێنیی هەیە بۆ سەر شوێنەكان، ئەو ئامانجە خراپانەی لەو مزگەوتە خراپەدا ـ كە خوا ناوی لێنا (مَسجِداً ضِرَاراً) ـ ئەنجام دەدران، شوێنەكەشی شووم‌و خراپ كرد، وە مزگەوتی (قوباء)یش كە كەسانێكی تێدا هەبوون لە خۆ پاك ڕاگرتن، دەخەفتان، بوو بەهۆی ئەوەی ئەو مزگەوتە ببێتە شوێنێكی وا كە خوا ستایشی بكات‌و مەدحی بكات.

٦/ ئەو چوار ئامانجە خراپەی، كە دروستكەرانی مزگەوتی (ضِرَار) لەبەرچاویان گرتبوون، وە پاڵنەرو هاندەریان بوون بۆ دروستكردنی مزگەوتەكەیان، لەوە چوار بنچینەی گرنگ وەردەگیرێن :

أ) هەر كردەوەیەك زیانی بۆ مسوڵمانێك تێدا هەبێ، قەدەغەیە.

ب) هەروەها هەر كردەوەیەك سەرپێچیی فەرمانەكانی خوای پەروەردگار بێ، قەدەغەیەو حەرامە.

ج) هەروەها هەر كردەوەیەك ببێتە هۆی پەرتەوازەیی دووبەرەكیی نێوان بڕواداران، قەدەغەیەو حەرامە.

د) هەروەها هەر كردەوەیەك هاوكاریی كەسانێكی تێدا بێ، كە دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەكەن، ئەویش قەدەغەیە.

٧/ ئەو كردەوانەى كە لە سەرپێچیی و لادان لە فەرمانی خوا پەیدا دەبن، دەبنە هۆی دوورخستنەوەی ئەنجام دەرانیان لە خوای بەخشندە، هەروەك چۆن بەردەوامبوونی ئینسان، لەسەر گوناهان، دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر لە خوا دوور بكەوێتەوە، تاكو ئەو گوناحە لا دەبات، وە لێی پەشیمان دەبێتەوە بە هەمان شێوەش: هەر هەڵوێستێكی خراپو هەر شوێنەوارێكی خراپ، كە لە سەرپێچیی خوای پەروەردگارەوە پەیدا بووە، دەبێتە هۆی دوورخستنەوەی خاوەنەكەی بە بەردەوامیی.

٨/ هەر كام لە مزگەوتی قوباء، وە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، بە پلەی یەكەم شایستەی ئەو مەدحو ستایشەیە .

ئنجا ئەو (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) ڕای وایە، كە ئەو مەدحو ستایشە مەبەست پێی مزگەوتی قوباء بووە، بەڵام گوتوویەتی: مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ شایستەتریشە بەو مەدحو ستایشە، بەڵام وەك باسمان كرد: واپێدەچێ مەبەست پێی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بێ.

٩/ هەر كردەوەیەك لەسەر خوا پێ مەبەست بوونو، شوێنكەوتنی شەریعەت بنیات نرابێ، ئەو ئەو كردەوەیە لەسەر پارێز لە خوا، دامەزراوە وە گەیەنەرە بە بەهەشتەكانی خوا.

١٠/ هەر كردەوەیەك دامەزرێنرابێ لەسەر مەبەستێكی خراپ، وە لەسەر داهێنانو لادان لە شەریعەت، وە لەسەر گومڕایی، ئەوە بریتیە لەو كارەی كە لەسەر قەراغی كەندەڵانێكی هەڵواسراوی بن هەڵۆڵ، بنیات نراوە، واتە: وەك خانوویەك وایە كە لەسەر كەندەڵانێكی بن هەڵۆڵی خەریكی ڕووخان، دانراوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دوو ئایەت پێکدێ، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (١١١و١١٢)، لە ئایەتی یەکەمیاندا، خوا ڕایدەگەیەنێ کە گیانو سامانی لە بڕواداران کڕیوەو، لە بەرانبەردا بەهەشتیان دەداتێ، کە لە پێناوی خوادا دەجەنگنو دەکوژنو دەکوژرێن، وە ڕاشیدەگەیەنێ کە خوا ئەو بەڵێنەی بە بڕواداران داوە، لە هەرسێك کتێبی تەوراتو ئینجیلو قورئاندا، کە بەهەشتیان بداتێ، وە دەیهێنێتە دی.

وە لە ئایەتی دووەمیاندا خوا ﷻ بە نۆ سیفەت وەسفو پێناسەی ئەو بڕوادارە فیداکارانە دەکات، کە بریتین لە:

١) گەڕانەوە بۆ لای خوا .

٢) خواپەرستیی .

٣) ستایش کردنی خوا .

٤) سیاحەت کردنو گەڕان .

٥) ڕکووع بردن .

٦) کڕنووش بردن .

٧) فەرمان بە پەسند کردن .

٨) ڕێ لە ناپەسند گرتن .

٩) پاراستنی سنوورەکانی خوا .

وە لە کۆتایی دا دەفەرموێ: موژدەی خۆشیی دنیاو دواڕۆژ، لە گرەوی ئەو جۆرە بڕوادارانە دایە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ
يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ
وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ
ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ
ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٢﴾﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{بێگومان خوا گیانو سامانیانی لە بڕواداران کڕیوە کە بەهەشتیان (لەلایەن خواوە) هەبێ، لە ڕێی خوادا دەجەنگن، دەکوژنو دەکوژرێن (ئەمە) بەڵێنێکە (خوا) لەسەر خۆی پێویست کردوە، لە تەوراتو ئینجیلو قورئاندا، وە ئایا کێ لە خوا بە پەیمانی وەفادارترە؟! دەجا بەو سەودایەتان کە کردووتانە، دڵخۆش بن، وە هەر ئەوەشە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزن ﴿١١١﴾ (ئەو بڕوادارانەش بریتین لە: بۆ لای خوا) گەڕاوانی، خواپەرستانی، ستایشکارانی، سیاحەتکارانی، ڕکووعبەرانی، کڕنووشبەرانی، فەرمان بە پەسندکاران و، ڕێ لە ناپەسند گرانو، پارێزەرانی سنوورەکانی (ئاینی) خوا، وە موژدە بە بڕوادادان بدە (کە سەرفرازی دنیاو دواڕۆژن) ﴿١١٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ): (أَوْفَى: إِذَا تَمَّمَ العَهْد وَلَمْ يَنقُضْ حِفْظَهُ).

واته: (أَوفى) ئەگەر پەیمانەكەی بردبێتە سەرو، پاراستنی هەڵنەوەشاندبێتەوە .

(بِبَيْعِكُمُ): (بَاعَ الشيءَ يَبِيعُهُ بَيْعاً وَمَبِيْعاً: شَرَاهُ، وَبَاعَهُ أَيْضاً: اشْتَرَاهُ وبَايَعَهُ مِنَ البَيْعِ وَالبَيْعَةِ جَمِيْعاً).

(بَاعَ الشيءَ يَبِيعُهُ بَيْعاً وَمَبِيْعاً) واته: شتەكەی فرۆشت دەیفرۆشێ، فرۆشتن، هەروەها (بَاعَهُ) بە مانای (كڕی)شی دێ، بەڵام (بَايَعَهُ) هەم دەگونجێ بە مانای فرۆشتن بێ، وە هەم دەگونجێ بە مانای پەیمان بەستن بێ، هەردووكیان دەگرێتەوە.

(ٱلْفَوْزُ): (النَّجَاةُ وَالفَوْزُ بالخَيْر)، دەربازبوونو، بە مراد گەیشتنو، وەدەستهێنانی چاكە.

(ٱلتَّـٰٓئِبُونَ): (التَّوْبَةُ: الرُّجُوعُ مِنَ الذَّنْبِ، تَابَ اللهُ عَلَيْهِ: وَفَّقَهُ لَها).

(توبة) بریتیە لە گەڕانەوە لە گوناح، وە دەگوترێ: (تَابَ اللهُ عَلَيْهِ) واته: خوا یارمەتی دا كە بگەڕێتەوە بۆ لای، یاخود گەڕانەوەكەی لێ قبووڵ كرد.

(ٱلْعَـٰبِدُونَ): (العِبَادَةُ: الطَّاعَةُ)، {هەڵبەتە ئەو وشانە ئێمە زۆر بە كورتیی مانایان دەكەین} .

(عبادة) بە مانای فەرمانبەریی كردن دێ، وە بە مانای ملكەچیی بۆ خوا دێ، لە ناخەوە.

(ٱلْحَـٰمِدُونَ): (الحَمْدُ: ضِدّ الذَّم، وَالحَمْدُ أَعَمُّ مِنَ الشُّكر).

(حمد) بە كوردیی بە ستایش مانا دەكرێو، پێچەوانەی سەرزەنشت (ذمّ)ە، وە ستایش گشتییترە لە سوپاس، چونكە سوپاس كردن، وەك لە سەرەتای

سوورەتی ئەنعامدا، بە وردیی باسی هەر کام لە: (مدح) و (حمد) و (شکر)مان کردوە.

(شکر) ئەوەیە کە تۆ لە بەرانبەر کەسێکدا کە چاکەی لەگەڵ کردووی، سوپاسی بکەی.

بەڵام کە (حمد)ی دەکەی، مەرج نیە چاکەیەك لەوەوە بۆ تۆ هاتبێ، بەڵکو ئەو زاتە هەر لە خودی خۆیدا خاوەنی سیفەتی باش بێ، ئەوە (حمد)ە.

(مدح)یش مەرج نیە ئەو شتەی کە تۆ پێی هەڵدەڵێی، خاوەنی ئیختیارو ئیرادەیەك بێ، یاخود چاکەی لەگەڵ تۆدا کردبێ، مرۆڤ مەدحی خواردن دەکات، مەدحی شتێکی جوان دەکات، یان مەدحی بۆنێکی خۆش دەکات.

بەڵام (حمد) دەبێ زاتێك بێ خاوەنی ویستو ئازادیی بێ، ئنجا چ چ کەی لەگەڵ تۆدا کردبێ، چ لە خودی خۆیدا شایستەی ئەوەبێ، ستایش بکرێ، لەبەر سیفەتە پەسندەکانی، بۆیە (حمد) فراوانترە لە (شکر)، وە(مدح)یش لە ڕوویێکی دیکەوە، لە (حمد) و (شُکر) فراوانترە.

(ٱلسَّٰٓئِحُونَ): (ساحَ الماءُ: جَرَى عَلَى وَجْهِ الأَرْضَ، وَساح فِي الأَرْضِ: ذَهَبَ)، ئاو کە بە زەویدا دەڕوات، دەگوترێ: (ساحَ المَاءُ)، واتە: ئاوەکە ڕۆیشت، ڕژا.

کەواتە: (سائح) کەسێکە بە زەویدا دەڕوات.

(ٱلرَّٰكِعُونَ): ڕکووع بەران، (الرُّكُوعُ: الإِنْحِناءُ، رَكَعَ الشَّيْخُ: انْحَنَى مِنَ الكِبَرِ).

(رکُوع) بریتیە لە چەمینەوە، وە دەگوترێ: (رَكَعَ الشَّيْخُ) پیاوە بە تەمەنەکە ڕکووعی برد، واتە: لە ئەنجامی کەوتنە تەمەنەوە، پشتی چەمیوەتەوە.

(ٱلسَّٰجِدُونَ): کڕنووش بەران، (سَجَدَ: خَضَعَ، وَمِنْهُ سجود الصَّلاَةِ: وَهُوَ وَضْعُ الجَبْهَةِ عَلَى الأَرْضِ).

(سَجَدَ) واتە: ملکەچ بوو، وە هەروەها (سَجَدَ) بە مانای کڕنووش بردنی نوێژە، چونکە بریتیە لەوەی کە نێوچەوانی خۆت بخەیە سەر زەوی.

(بِٱلْمَعْـرُوفِ ): (المَعْرُوفُ: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بالعَقْلِ أَوِ الشَّرْعِ حُسْنُهُ).

(معروف) بریتیە لە ناو بۆ هەر کردەوەیەك، کە بە عەقڵ، یان بە شەرع چاکییەکەی بزانرێ.

(ٱلْمُنڪَرِ ): (ضِدّ المَعْرُوفِ).

(مُنْكر) پێچەوانەی (مَعْرُوف)ە، (اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْـرَفُ بالعَقْلِ أَوِ الشَّرْعِ سوءُهُ)، ناوە بۆ هەر کردەوەیەك کە بە عەقڵ، یان بە شەرع خراپییەکەی بزانرێ.

(لِحُدُودِ ٱللَّهِ): (الحدود): (جَمْعُ الحَدّ، وهو الحاجِزُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ الذِي يَمْنَعُ اخْتِلَاطَ أَحَدِهِمَا بالآخَر).

(حدود) کۆی (حدّ)، (حد) واتە: سنوور، نێوان، بریتیە لەو نێوانەی کە دەکەوێتە نێوان دوو شتانەوەو، ناهێڵێ کە یەکێکیان تێکەڵ بە وی دیکەیان ببێ.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەكـــان

دیـاره ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـە، پێناسـەی بڕوادارانـی ڕاسـتەقینە بـە چاکتـرین سیفەتیان کـە فیداکارییـە، وە سـەنگی مەحـەکی مسوڵـمانەتییە، دەکـەن، دوای ئـەوەی خوا ﷻ باسی مونـافیقو دڵنەخۆشو کەمتـەرخـەمەکانی کـرد، ئنجا باسی بـڕوادارانی فیداکارو ڕەسەنو ڕاستەقینە دەکات، بۆئەوەی مسوڵمانان، ئەگەر بیانەوێ کەسانێك بکەنە سەرمەشق، ئەو بڕوادارانە بکەنە سەرمەشق کە سەرو ماڵی خۆیان بە خوا فرۆشتوە، وە لە پێناوی خـوادا فیداکارن، وە ئەو کەسانەش ڕازاوەن بەو نۆ سیفەتە، کە باس دەکـرێن. وە لە ئەنجامی خۆ ڕازانەوەیان بەو نۆ سیفـەتەدا، توانیـویانە کە ئـەو مامەڵـەیـە لەگەڵ خوادا، ڕاست بەرنە سەر، وە سەرو ماڵی خۆیان لـە پێنـاوی خـوادا فـیدا بکەن.

خـــوای پـــەروەردگار سـەرەتـــا دەفــــەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ﴾، واتـە: بە دڵنیـایی خوا گیـانو سامانی لـە بڕواداران کـڕیوە کە بەهـەشتیـان هـەبێ.

واتـە: ئەگەر دەتەوێ بزانـی: داخۆ لـە کوێی ئیمانی؟ تـا چ ڕاددەیـەك ئیمـانت هەیـە؟ تەماشا بکە داخـۆ، گیانو سامانەکەی خۆت، چۆن تەماشا دەکەی؟ ئەگەر بە هی خوای دەزانی، وە لە هەر شـوێنێك دا ئایینی خـوا، پێویستی بە گیـانەکەتو سـامانەکەت بـوو، ئـامادە بووی بیبـەخشیو بەختـی بکەی، ئـەوە تۆ ڕاست دەکەی، کە ئیمـانداری، چـونکە خوا دەفـەرموێ: ئیمـانداران لـە بەرانبەر خـوادا، خـاوەنی گیــانو سـامانی خۆیـان نـین، بەڵکو داویانە بە خوا، کە لـە بەرانبەردا، ڕەزامەندیی خـواو بەهـەشـتی خـوا وەردەگـرن، بەڵێ، بە ئـەندازەی ئـەوە کە دڵت لەبەر سامانەکەت دەبێتـەوە لـە ڕێـی خـوادا، دڵـت لـەبـەر ڕووحەکەت دەبێتـەوە، کە بیبەخشی، بە ئـەندازەی ئـەوە بـڕواداری.

چـونکە خـوا دەفـەرموێ: هەرچـی بڕواداربـێ، خـوا گیانـەکانو سـامانەکانیانی لـێ کـڕیون، وە بەهەشتی لە بەرانبەردا بۆ داناون، ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ

﴿وَيُقْتَلُونَ﴾، لە ڕێی خوادا دەجەنگن دەكوژن‌و دەكوژرێن، ﴿وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ﴾، {خوا بەهەشت دەدا بە بڕوادارانی فیداكار}، بەڵێنێكە كە لەسەر خۆی پێویستی كردوە، لە تەوڕات‌و ئینجیل‌و قورئاندا، واتە: هیچ گومانتان تێیدا نەبێ، ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ﴾، وە ئایا كێ لە خوا وەفادارترە بە پەیمانی خۆی‌و، بە بەڵێنی خۆیەوە ؟ بێگومان هیچ كەس، ﴿فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ﴾، كەواتە: دڵخۆش بن بەو سەودایەی، كە ئەنجامتان داوە یان بەو بەڵێنەی بە خواتان داوە، هەردووكیان دەگونجێن، ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾، ئەوەش بە مراد گەیشتن‌و سەركەوتنی مەزنە.

ئنجا خوا ﷻ بە نۆ سیفەت ئەو بڕوادارانە كە گیان‌و سامانی لێ كڕیون، وە فیداكاریی لە ڕێی خوادا دەكەن، وە بەهەشتی بۆ داناون، وە شایستەی گەیشتنن بە بەهەشتی خواو، ڕەزامەندیی خوا، پێناسەیان دەكات، بۆئەوەی هەر كەسێك ڕاست بۆوە، نەڵێ: لەوانم، هەمیشە وەك من زۆرجار گوتوومە: دەبێ ئایەتەكانی قورئان بكەینە ئاوێنەو خۆمانیان تێدا ببینین، خۆت لە ئایەتەكانی خوادا ببینە، ئایا ئەو سیفەتانەی كە خوا بۆ بڕوادارانیان باس دەكات، چەندیان لە تۆدا هەن ؟ وە بە چ ئەندازەیەك لە تۆدا هەن؟

دەفەرموێ: ﴿التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدُونَ الْآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللَّهِ﴾. خوای پەروەردگار هەموو ئەو سیفەتانەی بە (إسم الفاعل) هێناون:

(التائب) واتە: كەسێك كە زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، (تائب) یانی (راجع) كەسێك كە دەگەڕێتەوە لە گوناهان، یان لە كەمتەرخەمیی‌و ساردو سڕیی، وەك من لە كتێبی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا باسم كردوە، كە مەرج نیە تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، تەنیا لە كوفرو نیفاق‌و شیركەوە بێ، بۆ ئیمان‌و ئیسلام‌و خوا بە یەكگرتن، بەڵكو جاری وایە

تۆ لە گوناهبارییەوە، دەگەڕێیەوە بۆ طاعەت، لە طاعەتێکی کەمترەوە، دەگەڕێیەوە بۆ طاعەتێکی چاکتر، وە جاری وایە لە بێئاگاییەوە، دەگەڕێیەوە بۆ هۆشیاریی.

﴿ٱلْعَـٰبِدُونَ﴾، خوا پەرستان ئەوانەی کە لە هەموو مەیدانەکانی خوا پەرستییدا، ئەسپی خۆیان تاو دەدەن.

﴿ٱلْحَـٰمِدُونَ﴾، ستایش بۆ خوا کەران، واتە: بە خوا پەرستییەکەیان لەخۆبایی نابن، لە کەوڵی خۆیان دەرناچن، بەڵکو ستایشی خوا دەکەن، لەسەر ئەوە کە خوا دەپەرستن.

﴿ٱلسَّـٰٓئِحُونَ﴾، واتە: ئەوانەی گەشتو گەڕان دەکەن:

١/ دەڕۆن تەماشای دیاردە سروشتییەکان دەکەن .

٢/ تەماشای شوێنەواری پێشینان دەکەن .

٣/ دەگەڕێن بۆ ئەوەی دەستی خوا ببینن، لە دروستکراوەکانیدا.

٤/ دەگەڕێن بۆ ئەوەی رزقی حەڵاڵ پەیدا بکەن .

٥/ هەروەها دەگەڕێن بۆ ئەوەی زانیاریی پێویست وەدەست بێنن .

٦/ دەگەڕێن لە پێناوی خوادا جەنگ دەکەن، لە ماڵی خۆیاندا دانانیشن، ئەگەر پێویستی کرد دەڕۆن .

٧/ هەروەها دەگەڕێن بۆئەوەی خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکەن، بانگەواز دەکەن، ئەو سیاحەت کردنو گەشتو گەڕانە، دەگونجێ زۆر ئامانجی گەورە گەورەی پێ بهێنرێنە دی.

﴿ٱلرَّٰكِعُونَ﴾، واتە: ئەوانەی کە زۆر بۆ خوا دەچەمێنەوە، ڕکووع دەبەن.

﴿ٱلسَّـٰجِدُونَ﴾، ئەوانەی زۆر بۆ خوا کڕنووش دەبەن، ئنجا ئەگەر کڕنووش بردن لە نوێژو لە غەیری نوێژیشدا هەبێ، وەك سەجدەی قورئان خوێندنو سەجدەی شوکر، ڕکووع تەنیا لە نوێژدا هەیە، کەواتە: هەمیشە کە باسی (ركوع) دەکرێ.

واتە: نوێژکردن، چونکە ئێمە ڕکووعی بە تەنیامان نیە بە تەنیا وەك عیبادەتێك ئەنجام بدرێ، بەڵام (سَجدة)مان هەیە بە تەنیا، سەجدەی قورئان خوێندن، سەجدەی شوکر، وێڕای سەجدەی نوێژ، بەڵام ڕکووع تەنیا ڕکووعی نوێژمان هەیە .

﴿ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾، فەرمانکەران بە شتی پەسند، وە قەدەغەکەرانی شتی ناپەسند، دیارە پێشتریش باسمان کردوە، (معروف) هەر شتێکە کە بە عەقڵو شەرع بزانرێ، ئەو شتە باشە، وە هەر شتێکیش بە عەقڵ بزانرێ باشە، شەرعیش بە باشی دەزانێ، وە هەر شتێکیش شەرع بە باشی دانابێ، عەقڵی سەلیمیش بە باشی دەزانێ.

(منکر)یش هەر شتێکە کە عەقڵو شەرع بە پەسندی دەزانن، هەر شتێك کە عەقڵ ناپەسندی بکات، شەرعیش ناپەسندی دەکات، وە هەر شتێکیش کە شەرع ناپەسەندی بکات، عەقڵیش بە تەئکید بە ناپەسندی دەزانێ .

ئنجا ئەوانە فەرمان دەکەن بە هەرچی شتی پەسندە، چ پەیوەندیی بە لایەنی فیکرو عەقیدەو جیهان بینییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی عیبادەتەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ڕەوشتو ئاکارەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ئابووریی‌و سیاسییەوە هەبێ .

هەروەها ڕێگریش دەکەن لە هەرچی شتی ناپەسندە، لە هەموو بوارەکانی دینداریی‌و دنیاداریی دا .

﴿وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ﴾، وە پارێزەران بۆ سنوورەکانی خوا، سنوورەکانی خوا، حەڵاڵو حەرامی خوا، ئەمرو نەهی خوا، هەم لە خودی خۆیاندا دەیانپارێزن، سنوورەکانی خوا ناشکێننو نابەزێنن، وە هەم لە دەوروبەریشیاندا، وا دەکەن، هەوڵدەدەن کە سنوورەکانی خوا نەبەزێننو نەشکێنن .

﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، وە موژدە بدە بە بڕواداران، موژدەی چییان پێ بدات ؟ موژدەیان پێ بدات کە ئەگەر خاوەنی ئەو سیفەتانە بن، ئەوە لەو کەسانەن کە خوا گیانو سامانی لێ کڕیون، وە لەو کەسانەش دەبن، کە دەتوانن فیداکاریی بکەن، لە پێناوی خوای پەروەردگاردا.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾.

بێگومان خوا گیانو سامانیانی لە بڕواداران کڕیوە، کە بەهەشتیان هەبێ.

وەك پێشتریش باسم کرد: ئەم ڕاستییە پڕ بە پێستی پێناسەی بڕوادارانە، بڕوادارانی ڕاستەقینە لە بەرانبەر خوادا، نابێ خۆیان بە خاوەنی خۆشیانو ماڵو سامانیشیان بزانن، چونکە هەر کەسێك ڕاست بکات لە ئیمانیدا لە بەرانبەر خواو بەرنامەکەی دا خۆی بە خاوەنی گیانو سامانی نازانێ، چونکە خوا بە (أل) ئەلیفو لامی جینس هێناویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خوا لە هەموو بڕواداران کڕیویەتی، چی لێ کڕیون؟

﴿أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم﴾، گیانیانو سامانیان، کەواتە: هەر کەسێك بڕوادار بێ، خۆی بە خاوەنی ڕووحەکەی خۆی نازانێ، وە خۆشی بە خاوەنی ماڵو سامانەکەشی نازانێ، لە بەرانبەر خوادا، چونکە خوا دوایی دەفەرموێ: ﴿بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾، نرخو بەهای ئەو گیانو سامانانەیان، ئەوەیە کە بەهەشتیان هەبێت.

ئنجا ئایا چۆن دەزانین کە مەبەست پێی ئەوەیە کە نابێ خۆت بە خاوەنی گیانو سامانی خۆت بزانی؟ چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، لە ڕێی خوادا دەجەنگن، ﴿فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ﴾، دەکوژن {کەسانێك کە شایستەی کوژران بن، لەسەر خوا ئامادەن خەڵك بکوژن}، وە دەکوژرێن {خۆشیان بە کوشتر

دەدەن} ، کەواتە: کەسێك کە ئامادەیە خۆی بخاتە وەزعێکەوە، کە بکوژێ یان بکوژرێ، مانای وایە سەرو ماڵی خۆی فیدا دەکات.

ئنجا هەر کەسێك خاوەنی ئیمانی ڕاستەقینە بێ، دەبێ ئەو ئامادەییەی هەبێ، وە هەر کەسێك ئەو ئامادەییەی نەبوو، مانای وایە ئەو ئیمانەی نیە کە خوا داوای کردوە!

کەواتە: ئەوە پێوەرێکی زۆر گەورەو گرنگە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتوە: ﴿مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بالغَزْوِ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنَ النِّفَاقِ (وفي رواية) مَاتَ مِيْتَةً جَاهِلِيةً﴾،{أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٨٨٥٢)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٩١٠)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٢٥٠٢)} .

واتە: هەر کەسێك بمرێو جەنگی نەکردبێ لە پێناوی خوادا، وە بە تەماش نەبێ بیکات، {نەیکردوە، ئەوە نەیکردوە، بەلاّم لە دڵیشیدا نەبێ کە بیکاتو، ئامادەییشی نەبێ بۆ کردنی} ، ئەوە لەسەر بەشێك لە نیفاق مردوە، لە ڕیوایەتەکەی دیکەدا دەفەرموێ: بە مردنێکی نەفامانە مردوە .

چونکە ئەگەر بڕواداری ڕاستەقینە بووایە، ئەوە بێگومان خۆی بە خاوەنی سەرو ماڵی نەدەزانی لە پێناوی خوادا، وە کاتێك جەنگ دەهات، دەیکرد، وە ئەگەر جەنگی نەهاتە پێش، دەڵێ: هەر کاتێك جەنگ بێتە پێشو دینی خوا پێویستی بە سەرو ماڵی من بێ، دەیبەخشم، بەلاّم ئەگەر جەنگیشی نەکردبێ، وە ئەو ئامادەییەشی نەبێ، ئەوە نیشانەیەکی پرسیاری گەورە لەسەر ئیمانەکەی هەیە.

<u>مەسەلەی دووەم</u> : دەفەرموێ : ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَ﴾ .

کەواتە: ئەمە ئیلتیزامی بڕوادارانە، بەرانبەر بە خوا: لە پێناوی خوادا دەجەنگن، دەکوژنو دەکوژرێن.

یانی: بڕواداران دەبێ هەمیشە ئەو ئامادەییەیان هەبێ، کە خەڵك بکوژن لە پێناوی خوادا، وە بشکوژرێن لە پێناوی خوادا، بەلاّم نەك: بە شێوەی: {شەلم کوێرم کەس نابوێرم} وەك ئەوەی هەندێك لەو گرووپو ڕێکخراوانە دەیکەن کە ئیسلامیان

ناشیرین کردوەو، مسوڵمانانیان ناشیرین کردوە: خوێنی بە ناهەق دەرێژن، وە بەرلەوەی دەستیان بە خوێنی خەڵکی نامسوڵمان سوور بێ، دەستیان بە خوێنی خەڵکی مسوڵمان سوورە، بەڵکو دەستیان بە خوێنی کەسانێك سوورە کە ڕەنگە لە پێش ئەواندا جەنگو جیهادیان کردبێ، لە دژی ڕژێمێکی دیکتاتۆری خۆ سەپێن. ئەوە چەندی بە چەند؟!

لە ڕاستییدا ئەوە ناچێتە ئەو تەرازووەوە کە خوای کاربەجێ داینـاوە، وە جەنگی وا لە پێناوی خوادا نیەو لە پێناوی خۆ دایە ! بەڵکو ڕەنگە لە پێناوی خەڵکێکدا بێ کە ئەو کەسەی خۆی بە کوشت دەدا، هەر نەزانێ خوێنەکەی دەچێتە گیرفانی کێوەو، ئاو بە ئاشی کێ دا دەکات! بەڵام دینداریی بە بەرچاو ڕوونیی دەکرێ، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ يوسف.

واتە: بڵێ: ئا ئەوە ڕێبازی منە، لەبەر ڕۆشنایدا خۆمو ئەوانەی شوێنم کەوتوون. (خەڵك) بۆ لای خوا بانگ دەکەین، وە پاکیی بۆ خوا، وە من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

واتە: پاکیی بۆ خوا کە بە نەزانییو بە بەرچاو لێڵییو بە نەفامیی، دینداریی بۆ بکرێ، وە من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم، کە بە لاسایی کردنەوەی کوێرانە، بە دوا دەکەون، وەك مەڕ سەر لە دوو یەك دەنێن، کە بە داخەوە هەندێ کەس لەو گرووپە پەرگیرانە، دەچێ خۆی بەکوشت دەدا، نازانێ بۆ چییەو، سەرەنجام چۆنە! خوێنەکەی دەچێتە گیرفانی کێ؟ یان ئەو خەڵکەی کە دەیکوژێ، ئایا ڕەوایە بیکوژێو، خوێنی بڕێژێ؟

کەواتە: با لێمان تێکنەچێ: بەڵێ فیداکارییو ئامادە بوون بۆ جەنگ کردن لە پێناوی خوادا، وە خەڵك کوشتن لەسەر خوا، وە خۆ بە کوشت دان، ئەوە لە کاتی خۆی دا، پێوەری مسوڵمانەتییە، پێوەری ئیمانە، بەڵام ئەوە هەمووی لە ڕێیەکی شەرعییەوە، وە بە هەلومەرجی خۆی دا، وە بە بەرچاو ڕوونانە، وە بەو

شێوەیە کە شەرع دیاریی کردوە، چونکە خوای تاك و پاك بە نەزانیی و نەفامیی ناپەرسترێ، وە ئێمە وەك چۆن دەبێ خوا بپەرستین، دەبێ بە بەرچاو ڕوونانەو شەرعییانەش خوا بپەرسترێ، دەبێ هەر خوا بپەرستین، بەڵام بەس بەو شێوەیەش بێ کە خۆی بڕیاری داوە.

ئنجا ئەو خوا پەرستییە، چ لە نوێژو ڕۆژوو عیبادەتو خوا پەرستیدا بەرجەستە ببێ، چ لە جەنگو جیهاددا، چ لە ماڵ بەخشیندا، چ لە کاری سیاسیدا، ئەو طاعەتو فەرمانبەرییە بۆ خوا، دەبێ بەس بۆ خوا بێو ئیخلاصی تێدا بێ، وە دەبێ شوێنکەوتنی شەریعەتیشی تێدا بێ، جاری وایە مرۆڤ بە حیساب نیەتەکەی بۆ خوایە، بەڵام مادام لە ڕێیەکی شەرعییەوەو لە هەلومەرجی خۆیدا نەبووە، هەلومەرجە شەرعییەکە نەڕەخسا بوو، لەسەری قەرزدار دەبێتەوە، چونکە ئیخلاص شەفاعەت بۆ نەپێکان ناکات.

یانی: ئینسان هەرچەندە بە دڵسۆزیی بە دڵساغیی کارێك بۆ خوا بکات، بە لای خۆیەوە، بەڵام مادام لە کارەکەیدا، شوێن سنوورەکانی شەرع نەکەوێ، وە لە شیرازەی شەرع بچێتە دەرێ، ئەوە هەر لەبەرئەوەی کە ئیخلاصی هەیە، ئیخلاصەکەی شەفاعەت ناکات، بۆ لادانەکەی، چونکە دەبێ هەم خوا بپەرستی بە ساغیی، وە هەم بەو شێوەیەش بیپەرستی، کە خوا دیاریی کردوە.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ﴾.

واتە: (ئەمە) بەڵێنێکە لەسەر خۆی پێویستی کردوە، لە تەوراتو ئینجیلو قورئان دا.

کاتی خۆی (أشاعرة) و (معتزلة) مشتومڕی زۆریان بووە: ئایا خوا هیچی لەسەر واجبە، یان لەسەری واجب نیە؟! کە ڕای هاوسەنگ ئەوەیە: بە تەئکید هیچ شتێك لە لایەن بەندەکانەوە، لەسەر خوا پێویست نیە، بەڵام ئەگەر خوای بەخشەر بۆخۆی، بە کەرەمی خۆی، ئەو شتە لەسەر خۆی پێویست بکات، وە بەرزیی مەقامی خوا، وە سیفەتە بەرزەکانی خوا، ئەوە بخوازن کە شتێك لەسەر خۆی پێویست بکات، ئەوە

لەسەر خۆی پێویست کردوە، بەڵام خۆی پێویستی کردوە، نەك بەندەکانی لەسەریان پێویست کردبێ، ئەوەش هەردووك رایەکان پێکدەگەیەنێ، لەلایەکەوە خوا شتی لەسەر پێویستە، بەڵام خۆی لەسەر خۆی پێویست کردوە، وە لە لایەکی دیکەشەوە هیچ کەس هەقێکی نیە لەسەر خوای بەرزو مەزن، بلێ: خوایە! ئەوەت لەسەر پێویستە دەبێ بۆم بکەی، چونکە خوا بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: خوا پرسیاری لێ ناکرێ، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ.

پاشان خوا فەرموویەتی : ﴿ لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَـٰمَكُم ۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَـٰنِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الحجرات، واتە: هەر خوا چاکەو منەتی بەسەر خەڵکەوە هەیە، بەڵام خوای پەروەردگار لە ڕووی سیفەت بەرزیی خۆیەوە. لە ڕووی حیکمەتو میهرەبانیی بێسنووری خۆیەوە، لە ڕووی ئەوەوە، ئەگەر ئەو ﷻ بەڵێنێکی دا، دێتە دی،و، ناگونجێ قسەی خوای بێوێنە ناڕاست دەرچێ، لەو ڕووەوە دەتوانین بڵێین: خوا شتی لەسەر پێویستە، کە بەهۆی سیفەتە بەرزەکانییەوە. شتەکانی لەسەر خۆی پێویست کردوون.

ئنجا کە دەفەرموێ: خوا بەهەشت دەدات بە بڕواداران، لە بەرانبەر ئەوەدا کە فیداکاریی دەکەن لە پێناوی خوادا، ئەمە لە تەوراتو لە ئینجیلو لە قورئاندا بەیان کراوە، ئەوە لە قورئاندا، دەزانین، ئەدی لە تەوراتو ئینجیلدا لە کوێدا هاتوە؟!

دەڵێین: لە {پەیمانی کۆن} لە (سفر)ی (التثنية) لە (إصحاح)ی (٢٠)دا باسی ئەو مەسەلەیە کراوە[١]، هەروەها لە {پەیمانی نوێ}دا لە ئینجیلی (لۆقا) لە (إصحاح)ی (١٨)دا باسی ئەو مەسەلەیە کراوە[٢].

---

١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس. العهد القديم، سفر التثنية، الإصحاح : ٢٠، ص (٣٩٢، ٣٩٣) .

٢) هەمان سەرچاوە، ص : (٢١٣٤- ٢١٣٧)

کەواتە: مەسەلەی فیداکاریی‌و، سەرو ماڵ بەخشین لە ڕێی خوادا، شتێکی ڕیشەییە لە ئایینی خوادا، لە هەموو بەرنامەکانی خوادا، لەو ئایینە گشتییەدا کە خوا بە هەموو پێغەمبەراندا ﷺ ناردوویەتی.

مەسەلەی چوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ﴾.

واتە: کێ وەفادارترە بە پەیمانی خۆی لە خوا، دڵخۆش بن بەو سەودایەی کە ئەنجامتان داوە، {یان: بەو پەیمانەی کە بەستووتانە} ئەوەش سەرکەوتن‌و بە مراد گەیشتنی مەزنە .

دەگوترێ: (وَفَى بعَهْدِهِ: أتَمَّهُ، وَأوْفَى بعَهْدِهِ) یانی: هەردووکیان بە یەك واتان، یانی: پەیمان‌و بەڵێنەکەی تەواو کردو بردیە سەر، بەڵام دەشونجێ: (أَوْفَى) (صِيغَةُ التَّفْضِيل) بێ، کە لێرەدا﴿ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ ﴾، واتە: کێ وەفادارترەو، پابەندترە بە پەیمانەکەی خۆیەوە لە خوا ﷻ .

کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ ﴾، دەڵێ: (الإسْتِبْشَارُ : إظْهَارُ السُّرورِ، والبشَارَةُ: إظْهارُ السُرورِ وَظُهُورُهُ يَكُونُ فِي بَشْرَةِ الوَجْهِ).

(إسْتِبْشَارُ) بریتییە لە دەرخستنی دڵخۆشیی، وە (بِشارَة) بریتییە لە دەرخستنی خۆشحاڵیی، ئەویش دیارە لەسەر پێستی دەم‌و چاو دەردەکەوێ، بۆیە گوتراوە: (الإسْتِبْشَارُ).

﴿ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ ﴾، واتە: دڵخۆشیی خۆتان‌و، شادمانیی خۆتان دەربخەن ﴿ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦ ﴾، بەو سەودایەی کە کردووتانە، بەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ خوادا کردووتانە، وەك من زۆرجاران گوتوومەو دەڵێم: مامەڵە لەگەڵ خوادا زەرەری تێدا نییە، لە خۆشییدا بێ، یان لە ناخۆشییدا بێ، لەبەر هەوراز بێ، یان لە نشێو بێ، ساغ بێ، یان نەخۆش بێ، هەژار بێ، یان دەوڵەمەند بێ، سەربکەوێ، یان ژێربکەوێ، مامەڵە لەگەڵ خوا زیانی تێدا نییە، بە مەرجێك لەسەر جادەی شەریعەت بێ، وە

بە مەرجێك دڵت لەگەڵ خوا ڕاست بێ، دڵت بۆ خوا یەكلا كردبێتەوە، وە لە جادەی شەریعەت لانەدەی، ئیدی هەرچی بێتە ڕێت، لەسەر جادەی شەریعەت، ئەوە تۆ هەر قازانجتە.

وشەی (بَيْع): (البَيْعُ فِي الإِصْطِلاحِ: مُبَادَلَةُ مَالٍ مُتَقَوَّمٍ بِمَالٍ مُتَقَوَّمٍ، وَجَمْعُهُ بُيُوع).

(بَيْع) لە زاراوەی زانایانو شەرعزاناندا، بریتیە لە گۆڕینەوەی ماڵێكی نرخێنراو بە ماڵێكی دیكە كە نرخەكەیەتی، كۆیەكەشی (بیوع)ە.

وە هەندێكیان گوتوویانە: (البَيْعُ: إِعْطَاءُ المُثْمَنِ وَأَخْذُ الثَّمَنِ، وَالشِّرَاءُ: إِعْطَاءُ الثَّمَنِ، وَأَخْذُ المُثْمَنِ، وَيُقَالُ لِلْبَيْعِ : الشِّرَاءُ، وَالشِّرَاءُ كَذَلِكَ بِحَسَبِ تَصَوُّرِ كل مِنَ الثَّمَنِ والمُثْمَنِ).

یانی: فرۆشتن بریتیە لەوە كە تۆ نرخ لەسەر دانراو بدەی، وە نرخەكە وەربگری. (شِراء)یش واتە: كڕین، بریتیە لەوە: كە تۆ نرخەكە بدەیو نرخ لەسەر دانراو وەربگری، وە جاری واش هەیە وشەی (شِراء) بۆ (بیع) بەكاردێ، جاری واش هەیە. وشەی (بیع)یش بۆ (شراء) بەكاردێ، بە پێی ئەوە كە سەرنج دەدرێتە نرخ، یاخود نرخ لەسەر دانراو، ئەوەی كە نرخ لەسەر دانراو وەردەگرێ، پێی دەگوترێ: كڕیار. وە ئەوەی كە نرخەكە وەردەگرێ، پێی دەگوترێ: فرۆشیار.

<u>مەسەلەی پێنجەمو كۆتایی</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ﴾.

واتە: ئەو بڕوادارانەی خاوەنی ئەو نۆ سیفەتەن، ئا ئەوانەن كە خوای بێنیاز گیانو سامانی لێ كڕیون، كە لە بەرانبەردا بەهەشتیان بداتێ، بەهەشتیان بكات بە موڵك، چونكە فەرموویەتی: ﴿بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ﴾التوبة، كە دەگونجا بگوترێ: (إِنَّ اللهَ اشْتَرَى مِنَ المُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بالجَنَّة).

واتـە: خـوا بە بەهەشـت، گیـانو سـامانی لـە بڕواداران کـڕیوە، بـەڵام فەرموویـەتی: ﴿بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾، واتە: بەهەشتیان دەداتێ، وەك موڵكی خۆیان، نـەك وەك نرخێك، بەڵكو وەك شتێكی تـایبـەت بەوان، شایسـتـە بەوان.

ئنجـا خـوا دەفـەرموێ: ئـەوانەی کـە ئـامـادەن، وە شایسـتـەی ئـەوەن کـە خـوای پـەروەردگار ئـەو سـەوداو مامەڵـەیان لەگەڵـدا بکـات، وە ئامـادەی ئـەو فیداکارییـەن، ئەوانەن کە خاوەنی ئەو نۆ سـیفەتەن:

١/ ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ﴾، گەڕاوان، واتـە: ئـەوانەی بـۆ لای خـوا دەگەڕێنـەوە، لـە چـی دەگەڕێنـەوە؟ هـەر کەسـە بـە پێـی خـۆی، هەیـە لـە کـوفرو شیـرك‌و نیفاقـەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئیمانو تـەوحید.

وە هـەیە لە گوناهو تاوانەوە دەگەڕێتـەوە بۆ طاعەتو فەرمانبەریی.

وە هـەیە لە طاعەتێکی کەمتـرەوە دەگەڕێتـەوە بۆ طاعەتێکی باشـتـر.

وە هـەیە لە بێئاگاییو غەفڵەتەوە، دەگەڕێتـەوە بۆ هۆشـیارییو بێـداریی.

٢/ ﴿ٱلْعَٰبِدُونَ﴾، خـوا پەرستان واتە: ئەوانەی کە بە هـەموو شێـوەکـانو لـە هـەموو بوارەکانی پـەرستندا، خـوا دەپـەرسـتن، وە بەندایـەتیی خـۆیـان بـۆ خـوا بەرجـەسـتـە دەکەن، لـە ژیانی تاکـییو خێزانیـیو کۆمـەڵایەتییاندا.

٣/ ﴿ٱلْحَٰمِدُونَ﴾، سـتایشکەران، ئەوانەی کە هەمیشە سـتـایشی خوا دەکـەن، واتـە: بەو خـوا پـەرستـییو طاعەتو فـەرمانبەرییـەی کـە ئـەنجـامی دەدەن، نــەك لـەخـۆبـایی نابن، وە لـە کەوڵـی خـۆیـان دەرناچـن، بەڵکو هـەمیشـە سـتـایشــی خـوا دەکەن، دەزانن کە خـوا یارمەتی داون، خـوا ئـەو چاکەیـەی لـەگـەڵـدا کـردوون، کـە هەڵیبژاردوون بۆ ئـەوەی بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

٤/ ﴿ٱلسَّٰٓئِحُونَ﴾، گەشتکاران، ئەوانەی سیاحەت دەکەنو، دەگەڕێن گەشتکاران، کە لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی گەشتکردنی فیکریی بێ، واتە: بیـر لە مەلەکووتی خوا دەکەنەوە، لە موڵکی فـراوانی خـوا، وە دەگـونجێ مەبەسـت پێـی گەشـتـکردنی

جەستەیی بێ، ئەوانەی کە دەگەڕێن بە زەویدا، شوێنەوارەکان دەبینن، وە دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان دەبینن.

لەوبارەوشەوە ئەم دەقە هاتووە: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلا قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! ائْذَنْ لِي فِي السِّيَاحَةِ؟ فَقَالَ: (إِنَّ سِيَاحَةَ أُمَّتِي الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ)﴾، {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، بِرقم: (٢٠٨٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ، بِرقم: (٧٧٦٠)، وَالدَّيْلَمِيّ، برقم: (٧٧٧)، وَالبَيْهَقِيّ فِي (شعَب الإيمان)، برقم: (٢٤٢٦)، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني في (صحيح جامع الصَغير)، برقم: (٢٠٩٣)}.

واتە: ئەبو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواست، کە گەشتو گەڕان بکات، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: گەڕانو گەشتی ئۆممەتی من، بریتیە لە تێکۆشان لە ڕێی خوادا.

واتە: گرنگترین گەشتو گەڕانی ئۆممەتی من بریتیە لەوە کە بۆ بەرگریی کردن لە ئایینی خواو، لە پیرۆزییەکانی مسوڵمانانو لە حورمەتەکانی مسوڵمانان. مسوڵمانان لە ماڵ بچنە دەرو گەشت بکەن، هەرچەندە وشەی (جهاد) دەشگونجێ چەمکەکەی فراوانتر بێ، چونکە (الجهاد في سَبيل الله) تێکۆشان لە ڕێی خوادا، جیایە لە جەنگ لە ڕێی خوادا (القِتالُ في سَبيل الله) هەرچەندە (جهاد) هەندێ جار بە مانای (قِتال) دێ، بەڵام جاری واش هەیە، چەمكو واتاکەی گشتییترە ئنجا ئەو کاتە: بانگەواز کردن لە پێناوی خوادا، گەڕان بە دوای زانیارییدا، گەڕان بۆ صوڵحو صەلاحەتی خەڵك، وە گەڕان بۆ هەر مەبەستێك کە ئینسان زیاتر لە خوا نیزیك بێتەوە، زیاتر لە ئایینو بەرنامەی خوا شارەزا بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

٥/ ﴿ٱلرَّٰكِعُونَ﴾، ڕکووع بەران.

٦/ ﴿ٱلسَّٰجِدُونَ﴾، کڕنووش بەران، بێگومان ڕکووعو سەجدە کە بە یەکەوە دێن، مەبەست پێیان نوێژە، واتە: ئەوانەی کە زۆر بۆ خوا دەچەمێنەوەو ڕکووع دەبەن، وە ئەوانەی زۆر بۆ خوا کڕنووش دەبەنو سەر دەخەنە سەر زەوی، یانی: نوێژکەری باشن.

٧/ ﴿ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾، فەرمانکەران بە شتە پەسندەکان، شتە پەسندەکان وەك پێشتریش باسمان کردوە، واتە: بە هەموو جۆرەکانیانەوەو، لە هەموو بوارەکاندا: لە بواری فیکریی‌و عەقیدەییدا، لە بواری عیبادەتدا، لە بواری ڕەوشت‌و ئاکاردا، لە بواری هەڵسوکەوتی خێزانییدا، لە بواری هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتییدا، لە بواری جەنگ‌و جیهاددا، لە بواری سیاسییدا، لە هەموو بوارەکاندا، هەرچی شتی پەسندە، ئەوانە فەرمانی پێ دەکەن، لە خۆشیاندا دەیهێننە دی، وە فەرمانیشی پێ دەکەن کە لە دەوروبەریشیاندا بهێنرێتە دی،

٨/ ﴿وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾، وە ڕێگران لە شتی ناپەسند، ناپەسندیش دیسان لە هەموو بوارەکاندا: لە بواری عەقیدەیی دا، لە بواری فیکریی دا، لە بواری ڕاگەیاندن دا، لە بواری خواپەرستیی دا، لە بواری ڕەوشت‌و ئاکاری شەخصیی دا، لە بواری هەڵسوکەوتی خێزانیی دا، لە بواری کۆمەڵایەتیی دا، لە بواری جەنگ‌و جیهاددا، لە بواری سیاسیی دا، لە بواری پەیوەندییەکان دا، لە هەموو بوارەکاندا، هەرچی شتی ناپەسندە لە خۆیانی دوور دەخەنەوە، وە خۆیانی لێ بژار دەکەن، وە هەوڵدەدەن دەوروبەری خۆیانی لێ بژار بکەن .

٩/ ﴿وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ﴾، وە پارێزەران بۆ سنوورەکانی خوا، کە ئەمەش ئەوانی پێشێ هەموویان دەگرێتە خۆی، وە جیا لەوانەش دەگرێتەوە، بەڵی بڕواداراني ڕاستەقینە، ئەوانەن کە سنوورەکانی خوا دەپارێزن :

١) سنوورەکانی حەڵاڵ‌و حەرام .

٢) چاکەو خراپە .

٣) ئەو سنوورانەی کە پەیوەندییان بە دینداریی شەخصییەوە هەیە.

٤) وە ئەوانەی کە بە هەڵسوکەوتی خێزانییەوە پەیوەستن .

٥) بە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتییەوە پەیوەستن .

٦) لە بواری سیاسیی دا .

٧) لە بواری کۆمەڵایەتیی دا.

٨) لە بواری جەنگ و جیهاددا، سنوورەکانی خوا دەپارێزن، لە هەموو مەیدانەکاندا.

وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ اللَّهَ حَدَّ حُدُودًا فَلا تَعتدُوها، وَفَرَضَ فَرَائِضَ فَلا تُضَيِّعُوها، وَحَرَّمَ مَحَارِمَ فَلا تَنتَهِكُوها، وَسَكَتَ عَن أَشياءَ رَحمةً بِكُمْ مِن غَيرِ نِسيانٍ، فَلاَ تَسأَلُوا عَنها﴾، {أَخْرَجَهُ الحاكِمُ، برقم: (٧١١٤)، وَالدَّارَقُطْنِيُّ، برقم: (١٠٤)، وَصَحَّحَهُ ابْنُ كَثير فِي تفسيره، المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص (١٦٧)}.

واتە: بێگومان خوا چەند سنوورێکی دیاریی کردوون، مەیانبەزێنن، وە چەند شتێکی فەرز کردوون، مەیانفەوتێنن، وە چەند شتێکی قەدەغە کردوون، توخنیان مەکەون، وە لە هەندێ شت بێدەنگ بووە، لە رووی بەزەیی پێداهاتنەوەتانەوە، بێئەوەی کە لە بیری چووبێ، لێیان مەپرسن.

لە کۆتایی دا دەفەرمویٚ: ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، وە موژدە بدە بە بڕواداران، بڕواداران کامانەن کە موژدەیان پێ دەدریٚ؟ واتە: ئەو بڕوادارانەی کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، موژدەیان پێبدە، ئەوانەی خوا گیان و سامانی لێ کڕیون، وە بەهەشتیان لە بەرانبەردا پێ دەبەخشێ.

یاخود موژدە بدە بەو بڕوادارانەی کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، کە سەرفرازی دنیاو دواڕۆژن، بەختەوەرن، بە مراد دەگەن، لە عەیبداریی لای خەڵک و، گوناهباریی لای خوا، لە شەرمەزاریی دنیا، وە لە روو ڕەشیی دواڕۆژ، سەلامەت و پارێزراو دەبن.

وەك لە ئایەتەکەی پێشێدا فەرمووی: ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، وە ئەوە بە مراد گەیشتن و بە ئاکام گەیشتن و بە ئامانج گەیشتنی مەزنە، لێرەش دەفەرمویٚ: موژدەیان پێ بدەو دڵیان خۆش بکە، یانی: بڕوادارانێك کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، موژدەیان پێ بدە، کە سەرفرازی دنیاو دواڕۆژن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان لـە چوار ئـایـەت پێکدێ، کە بریتین لـە ئـایـەتـەکانی: (١١٣ تـا ١١٦)، تەوەری سەرەکیی ئەم چوار ئایەتە، بریتیە لە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺو بڕوادارانی شوێنکەوتووی، کە موو بە موو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەگرنە بەر، کە بۆیان نیە داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بۆ هاوبەش دانەرانێك، کە دەزانن دۆزەخیین، هەرچەندە خزمو نیزیکیشیان بن.

پاشان خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ، کە داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیم بۆ بابی (کە ناوی ئازەر) بوو، بەهۆی بەڵێنێکەوە بوو، کە پێیدابوو، بەڵام پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت، کە دوژمنی خوایە، حاشای لێکرد.

دوایی خوای میهرەبان ڕایدەگەیەنێ، کە ناگونجێ کۆمەڵێك پاش هیدایەتدرانیان، گومڕا بکات لە سزای لادانیاندا، تاکو ئەوەی کە پێویستە پارێزی لێ بکەن، بۆیان ڕوون نەکاتەوە.

وە لە کۆتایی دا ڕایدەگەیەنێ، کە خوا خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییەو، دەژیەنێو دەمرێنێو، جگە لەویش بڕواداران سەرپەرشتیارو سەرخەرێکیان نیە.

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ
أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ
ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ
عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا
بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ
ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن
وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بۆیان نیە داوای لێبوردن (لە خوا) بۆ هاوبەش دانەران بکەن، هەرچەندە خزمیش بن، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت، کە هاوەڵانی کڵپەی ئاگری دۆزەخن ﴿١١٣﴾ وە (لە خوا) داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیمیش بۆ بابی (ئازەر) تەنیا پاش بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، بەڵام دوای ئەوەی بۆی ڕوون بووەوە کە دوژمنی خوایە، حاشای لێکرد، بە دڵنیایی ئیبراهیم زۆر بە پەرۆش و هێدیی بوو ﴿١١٤﴾ وە ناگونجێ خوا کۆمەڵێك کە ڕێنمایی کردوون، گومڕا بکات، (لێیانگەڕێ سەرگەردان بن)، بەڵکو (ئاگاداریان دەبێ)، تاکو ئەوەی پێویستە پارێزی لێ بکەن، بۆیان ڕوون دەکاتەوە، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە ﴿١١٥﴾ مسۆگەر موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە، دەژیەنێ و دەمریەنێ، وە جگە لەویش هیچ دۆست و پشتیوانێکتان نیە ﴿١١٦﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَصۡحَٰبُ ): كۆی (صاحب)ە، (الصَّاحِبُ: الـمُلاَزِمُ إِنْسَاناً كَانَ أَوْ حَيْوَاناً أَوْ مَكَاناً أَوْ زَمَاناً).

(صاحب) هەر شتێكە كە پەیوەست بێ، ئنجا بە مرۆڤەوە بێ، یان ئاژەڵ، یان شوێن، یان كات، هەروەها (صاحب) بە مانای خاوەن (مالك)یش دێ.

(ٱلۡجَحِيمِ ): (الجَحْمَةُ : شِدَّة تَأَجُّجِ النَّار، وَمِنْهُ الجَحِيم).

(جَحْمَةُ) بریتیە لە كڵپە ساندنی بڵێسەی ئاگر، لەوێشەوە وشەی (جحیم) وەك ناو بۆ دۆزەخ بەكارهاتوە لەبەرئەوەی ئاگرەكەی كڵپەو بڵێسەی توندی هەیە.

(مَّوۡعِدَةٍ ): (وَعَدَ يَعِدُ وَعْداً، وَعِدَةً وَمَوْعِداً وَمَوْعِدَةً وَمَوْعُوداً: مَنَّاه بِهِ)، هەر كام لەو وشانە بە مانای بەڵێنە، گفتو بەڵێنێك كە كەسێك بە كەسێكی دەدات، كارێكی باشی بۆ بكات.

(تَبَرَّأَ مِنۡهُ ): واتە: حاشای لێكرد، دووریی لێكرد، (أَصْلُ البُرْءِ وَالبَرَاءَة وَالتَبَرِّي: التَقَصِّي مِمَّا يُكرهُ مُجَاوَرَتُهُ).

وشەی (بُرْء، بَرَاءَة، تَبَرِّي) هەر سێكیان بە مانای دووریی گرتنە لە هەر شتێك، كە ئینسان حەز لە نیزیكیی نەكات.

(لَأَوَّٰهٌ ): (الكَثِيرُ التَأَوُّه).

(أوَّاه) كەسێكە زۆر وشەی ئۆهـ بەكاردێنێ، دیارە ئەوە دەگونجێ لە ئەنجامی ئازارێك دا بێ، كە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (التوجّع) واتە: دەربڕینی ئازار، وە دەشگونجێ بەبێ نەخۆشیی بێ، لە پەرۆشییان بێ، بۆ وێنە: كەسێك پەرۆشی

کەسێکی بێ، یان سۆزو بەزەیی بۆ دەربڕێ، ئەم تەعبیرە بەکاربێنێ، لە زمانەکانی دیکەشدا هەیە.

هەروەها (أوَّاه) دەڵێ: (الدَعَّاءَ: الرَّحِيم الرَّقِيقُ القَلْب)، واتە: زۆر پاڕاوە لە خوا، زۆر دوعا کەر، وە بە کەسێك دەگوترێ کە بە بەزەیی بێ، زۆر دڵ نەرم بێ .

(حَلِيمٌ): واتە: هێدیی‌و مەند، دەڵێ: (حِلْمَ: تَأَنَّىَ وَسَكَنَ عِنْدَ غَضَبٍ أَوْ مَكْرُوهٍ مَعَ قُدْرَةٍ وَقُوَّةٍ، وَصَفَحَ).

(حَلُمَ) واتە: هێدیی‌و مەندیی بەکارهێنا، خۆی شلوێ نەکرد، لە کاتێکدا کە تووڕە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە توانای هەبوو، ئەو کەسە سزا بدات، کە خراپەکەی لێ بینیوە، بەڵام هێدیی‌و مەندیی لەگەڵ بەکارهێنا، هەروەها (حَلُمَ) بە مانای (صَفَحَ) هاتوە، واتە: چاوپۆشیی لێکرد، بە کورتیی: وشەی (حَلِيم) لە کوردیدا دەبێتەوە بە هێدیی‌و مەند.

(وَلِيّ ): (الوَلِيُّ: كُلُّ مَنْ وَلِيَ أَمْراً أَوْ قَامَ بِهِ، وَالنَّصِيرُ وَالمُحِبُّ وَالصَّدِيق).

وشەی (وَلِيّ) بە هەر کەسێك دەگوترێ: سەرپەرشتیی کارێك بکات، یاخود بە کارێك هەڵسێ، یان کارێك بە ئەستۆوە بگرێ، هەروەها وشەی (وَلِيّ) بە مانای یارمەتیدەرو خۆشەویستو نیزیکیش دێ.

(نَصِيرٍ ): (المُعِينُ وَالمُؤَيِّد وَالمُنَجِّي وَالمُخَلِّص).

وشەی (نَصِير) بە هاوکارو پشتگیرکەرو دەربازکەرو ڕزگارکەر، لێکدراوەتەوە.

# هۆی هـاتنە خـوارەوەی ئـایـەتـەکـان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾.

لەوبـارەوە ئەم گێـڕراوەیـە هـەیـە:

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانُوا يَسْتَغْفِرُونَ لَهُمْ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، فَلَمَا نَزَلَتْ أَمْسَكُوا، عَنِ الإِسْتِغْفَارِ لأَمْوَاتِهِم، وَلَمْ يُنْهَوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لأحياء، حَتَّى يَمُوتُوا، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾ ﴾التوبة، يَعْنِي: اسْتَغْفَرَ لَهُ مَا كَانَ حَيًّا، فَلَمَا مَاتَ أَمْسَكَ عَنِ الإِسْتِغْفَارِ﴾، {أَخْرَجَهُ البَغَوِي، ج١١، ص٣٣، وَالطَّحَاوِي فِي (مشكل الآثار)، برقم: (٢٤٨٣)، وَابْنُ أَبي حاتم فِي تَفْسِيرِهِ، قَالَ فِي الإستيعاب: قُلْنا هَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ، ج ٢، ص ٣٢٤٤}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: مسوڵمانان عادەتیان وابوو، داوای لێبوردنیان لە خوا دەکرد بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بەڵام کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار، وازیان لەوە هێنا کە داوای لێبوردن بکەن، بۆ ئەوانەیان کە مردوون {واتە: لەسەر کوفرو شیرك مردوون} بەڵام لێیان قەدەغە نەکرا، داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بۆ ئەوانەیان کە زیندوونو جارێ نەمردوون، {واپێدەچێ مەبەست پێی هیدایەتو ڕەحم پێکردن بێ} دوایی خوای بەرز ئەم ئایەتەی ناردە

خـوار کـە دەفـەرمووێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾ التوبـة.

واتە: ئیبـراهیم تاکو بابی زینـدوو بـوو، داوای لـێبـوردنی بۆ لە خوا دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی کە مرد، وازی لەوە هێـنا، کە داوای لـێبوردنی بۆ لە خـوا بکـات.

## مانای گشتی ئایەتەکان

پێشتر گوتمان: کە تەوەری سەرەکیی ئەم چوار ئایەتە، ئەوەیە کە خوا ﷻ ڕێنمایی ئیمانداران دەکات، کە دەبێ چۆن لەگەڵ بێبڕوایانداو، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا مامەڵە بکەن، کە ئایا داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا کەن، یان داوای هیدایەتیان بۆ لە خوا بکەن، یان نەکەن؟ لەوبارەوە خوا ﷻ ڕێنماییان دەکات، وە ئەوەی کە ناگونجێ لێیان قەدەغە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، پێغەمبەر ﷺ بۆی نیە، هەروەها ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە، کە داوای لێبوردن بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکەن، واتە: داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەن، کە لێرەدا بەم تەعبیرە هێناویەتی، نەگەرنا وێڕای ئەوەی: بۆیان نیە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەن، بۆشیان نیە داوای هیدایەتیشیان بۆ بکەن، بەڵکو داوای هیچ شتێکی چاکیان بۆ لە خوا بکەن، دوای ئەوەی کە لەسەر کوفر مردوون.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ ﴾، هەرچەندە ئەوانە لەگەڵیشیاندا خاوەنی نیزیکیی بن، واتە: هەرچەندە نیزیکایەتییشیان هەبێ، خزمایەتیان هەبێ، یان هەرجۆرە نیزیکییەکی دیکەی هاوەڵایەتییان بوو بێ، بۆ وێنە: دراوسێیەتییان هەبێ. بەڵام ئایا کەی بۆیان نیە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەن؟ ﴿ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆتەوە کە ئەوانە هاوەڵی دۆزەخن، واتە: دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆتەوە، کە ئەوانە دۆزەخیین، وە خوا بڕیاری داوە کە بیانباتە دۆزەخو، بیانکاتە هاوەڵی دۆزەخو، خاوەنی دۆزەخ، بۆیان نیە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەن، چونکە بە تەئکید ئەو داوای لێبوردنە، جێی خۆی ناگرێ. وە خوای کارزان ڕەحمەتو بەزەیی خۆی تایبەت کردوە بە ئەهلی ئیمانەوە، وە لە

بێبڕوایانی قەدەغە کردوە، ئنجا پێشینان گوتوویانە : (قسە بکە جێ بگرێ، ڕبە بپێوە سەربگرێ) قسەیەك کە جێ نەگرێ، نابێ بیکەی.

ئنجا ڕەنگە ئەو کاتە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، پرسیارێك لە دڵیاندا دروست بوو بێ، وە ئێستاش دەگونجێ پرسیارێك لە دڵاندا دروست بێ، دەربارەی هەڵوێستی ئیبڕاهیم (علیه السلام) بەرانبەر بە بابی ئازەر، کە دوای ئەوەی ئیبڕاهیم ڕێنمایی بابی دەکات‌و، ئامۆژگاریی دەکات، بابی پێی دەڵێ: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾﴾ مريم.

واتە: ئەگەر واز نەهێنی، بەردبارانت دەکەم، وە بڕۆ سەری خۆت هەڵبگرەو لێم دووربکەوە یانی: دەربکرد، ئیبڕاهیم (علیه السلام) لە وەڵامی دا دەڵێ : ﴿سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾﴾مريم.

واتە: سەلامەت لێ بێ، ئاشتیی‌و سەلامەتیی لەسەر تۆ بێ، داوای لێبوردنت بۆ لە خوا دەکەم، چونکە پەروەردگارم لەگەڵ من زۆر بە بەزەیی یە، وە پاڕانەوەو داوای من گیرا دەکات.

ئنجا ئەو پرسیارە دروست دەبێ، کە ئەوە نیە ئیبڕاهیمیش داوای لێبوردنی بۆ بابی کردوە لە خوای پەروەردگار، لە حاڵێکدا کە بابیشی کافر بووە؟

کەواتە: چی دەبێ، ئەگەر ئێمەش داوای لێبوردن لە خوا بکەین، بۆ ئەو خزمانەمان کە لەسەر کوفر مردوون؟!

بۆیە خوا ﷻ لەوبارەوە هەڵوێستی ئیبڕاهیم ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ : ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ﴾، وە داوای لێبوردن کردنی ئیبڕاهیم بۆ بابی، {واتە: داوای لێبوردن لە خوا کردنی ئیبڕاهیم بۆ بابی} تەنیا دوای بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، ئیبڕاهیم بەڵێنی بە بابی دا، گوتی: (سأستَغفِرُ لَكَ رَبِّي) لەمەودوا داوای لێبوردنت بۆ لە پەوەردگارم دەکەم.

ئنجا بۆئەوەی بەڵێنەکەی خۆی بێنێتە دی، داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کرد.

﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ﴾، بەڵام دوای ئەوەی بۆ ڕوون بۆوە، کە دوژمنی خوایە، وە هەر ئیمان ناهێنێ، یان خوا هەواڵی پێدا، کە ئەوە ئیمان ناهێنێ، ﴿تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾، حاشای لێکردو دووریی لێکرد، وە پەیوەندیی لەگەڵدا بچڕاند، ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ﴾، بێگومان ئیبراهیم زۆر بە سۆزو بەزەیی‌و پەرۆش بووە، وە هێدیی‌و مەندو لەسەرەخۆ بوو، واتە: زوو تووڕە نەبووە.

بەڵێ خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە هەڵوێستەکەی ئیبراهیم لەسەر بناغەی بەڵێنێك بووە، کە بە بابی داوە، ئنجا دیارە تا ئەو کاتە ئومێدو، هیوایەکی هەبووە، کە بابی ئیمان بێنێ، بۆیە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردوە، بەڵکو خوای بەخشەر هیدایەتی بدات، بەڵام دوای ئەوەی دڵنیاو مسۆگەر بوو، کە ئیمان ناهێنێ‌و دوژمنی خوایە. حاشای لێکرد.

کەواتە: ئێوەش ئەو خزمانەتان کە کافر بوون، هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، دوای ئەوەی کە لەسەر کوفر مردوون‌و بۆتان ڕوونبۆتەوە کە ئیمانیان نەهێناوە، یان لەسەر نیفاق مردوون بۆتان ڕوونبۆتەوە کە بەبێ ئیمانیی مردوون، یان ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدابن، کە فڵان کەس ئیمان ناهێنێ، دەبێ ئێوەش وەك ئیبراهیم (علیە السلام) چۆن بەرائەت‌و حاشای لە بابی کرد، ئێوەش حاشاو بەرائەت لەو نیزیك‌و خزمانەتان بکەن، کە بۆتان دەرکەوتوە دوژمنی خوان، وە بڕوا ناهێنن.

ئنجا ئیبراهیم (علیە السلام) لە ئەنجامی زێدە ڕەحم‌و بەزەیی‌و پەرۆشیی، وە لەبەرئەوەی زۆر هێدیی‌و مەندو لەسەرەخۆ بووە، بۆیە لەگەڵ ئەو هەڵوێستە ئەرێنیی‌و خراپەی بابیشیدا، هەر داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردوە.

پاشان خوا ﷻ ڕاستییەکی گرنگ دەخاتە ڕوو، بۆ ئەوەی کە بڕوادارانێك کە داوای لێبوردنیان بۆ خزمەکانیان لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، کردوەو، بۆیان پاڕاونەوەو، داوای ڕەحم‌و بەزەیی‌و لێبوردنی خوایان بۆ کردوون، پێیان وا نەبێ کە بە گومڕا لە قەڵەمی داون، وە بە گوناهو سەرپێچیی بۆی تۆمار کردوون، دەفەرموێ: ﴿وَمَا

كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ ﴾.

واتە: وە ناگونجێ خوا كۆمەڵێك كە ڕێنمایی كردوون‌و، خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، بڕیاری گومڕا بوونیان بۆ بدات، وە بە گومڕا بوو لە قەڵەمیان بدات، {لە ئەنجامی ئەوەدا كە هەڵەیەك دەكەن، گوناهێك دەكەن، كە جارێ نەیانزانیوە گوناهە} تاكو ئەوەیان بۆ ڕوون دەكاتەوە، كە دەبێ پارێزی لێ بكەن.

واتە: ئێوە مادام نەتانزانیبێ كە حەرامەو قەدەغەیە، داوای لێبوردن لە خوا بكەن، بۆ كەسانێكی بێبڕواو موشریك، لە خزمان‌و لە نیزیكانتان، ئەوەتان بە گومڕایی لەسەر حیساب نەكراوە، وە بە گوناهو سەرپێچیی، بۆتان حیساب نەكراوە.

چونكە جارێ خوای پەروەردگار بۆی ڕوون نەكردبوونەوە، كە دەبێ خۆیان لێ بپارێزن، وە خوا ﷻ كۆمەڵە خەڵكێك كە هیدایەتیان دەدات، دوایی هەتا ئەو شتانەیان بۆ ڕوون نەكاتەوە، كە دەبێ خۆیانیان لێ بپارێزن، ئەگەر خۆیان لە شتێك لەو شتانە نەپاراست، بۆیان بە گوناهو گومڕایی حیساب ناكات، ئەوە مانایەكی.

مانایەكی دیكەشی ئەوەیە: كە خوا كاتێك كۆمەڵێك هیدایەت دەدات، هەروا لێیان ناگەڕێ، تووشی سەرگەردانیی‌و گومڕایی ببن، بەڵكو هەموو ئەو شتانەی كە دەبێ خۆیانیان لێ بپارێزن، بۆیان ڕوون دەكاتەوە بۆیە خوای پەروەردگاریش ئەوەی بۆ ئێوە ڕوون كردەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە، هەموو شتێك دەزانێ.

لە كۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بێگومان خوا موڵكی ئاسمانەكان‌و زەوی هەیە، خاوەنی موڵكی ئاسمانەكان‌و زەوییە، ئاسمانەكان‌و زەوی، واتە: سەرەوەی دروستكراوەكان‌و، خوارەوەشیان، ئاسمانەكان سەرەوەیە، هەرچەندە بەرەو سەر دەڕوات، تاكو وجود كۆتایی پێ دێ، وە هەرچەندە بەرەو خوار دەچێ، هەمووی هی خوایە، ﴿يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾، دەژیەنێ‌و دەمرێنێ، دیارە ژیاندن‌و

مراندن، واتـە: ژیـان پێـدانو مـردن بەسـەردا هێنـان، زەقتـرین، وە بەرجەستەترین شێوەی تەصەڕووف كردنە لە موڵكدا، بۆیە خـوای باڵادەسـتو زاڵ لـە قورئانـدا، ئەو تەعبیرە زۆر بەكاردێنێ: هەر خوا دەژیەنێو دەمرێـنێ، ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾، وە ئێوە جگە لە خوا، هیچ سەرپەرشتیار مشوورخۆرێكتان نیە، هیچ دۆستو نیزیكێكتان نیە، هەروەها هیچ هاوكارو سـەرخەرو پشتیوانێكیشـتان نیە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

<u>مەسەلەی یەکەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١١٣ ﴾.

واتە: پێغەمبەر ﷺ، وە ئەوانەی کە بڕوادارن، بڕوایان هێناوە بۆیان نیە داوای لێبوردن لە خوا بۆ کەسانێك بکەن، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرن، هەرچەندە خزمو نیزیکیشیان بن، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوتوەو بۆیان ڕوونبۆتەوە، کە ئەوانەی هاوەڵو خاوەنی کڵپەو بڵێسەی ئاگری بەتینی دۆزەخن.

لەبەردەم ئەم ئایەتەدا سێ هەڵوەستە دەکەین:

<u>هەڵوەستەی یەکەم</u>: لەبەر دوو هۆکاران نابێ بڕواداران بۆ هاوبەش دانەرانو کافرانو مونافیقەکان بپاڕێنەوە:

أ/ بڕوادار نابێ داوایەك لە خوا بکات بێجێ بێو جێگا نەگرێ، بۆیە نابێ بڕوادار ئەو جۆرە پاڕانەوەیە ئاڕاستەی خوای دادگەری بکات، کە هەواڵی پێداوەو ڕینماگری: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ .... ٤٨ ﴾ النساء.

ب/ بڕوادار نابێ دۆستایەتیی دوژمنو ناحەزانی خوا بکات، کەسانی مونافیقو موشریكو کافریش دوژمنی خوان، کەسێك دوژمنی خوا بێ، چۆن دەبێ تۆ نیزیکی بکەویو، خۆشەویستییت لەگەڵی هەبێو، بە تەنگیەوە بێو، پەرۆشییت بۆی هەبێ، وە داوای بۆ لە خوا بکەی ؟!.

هەڵوەستەی دووەم: یەکێك بۆی هەیە بڵێ: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ ﴾، بۆچی وای فەرمووە؟!

ئەوە بۆ لابردنی ئەو ئیشکالو گومانەیە کە بەهۆی هەڵوێستەکەی ئیبراهیمەوە (علیه السلام) پەیدا دەبێ، کە خوای کاربزان لە سوورەتی (الشعراء)دا لێی گێڕاوەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، واتە: خوایە لە بابم ببوورە، بێگومان ئەو لە گومڕایانە.

وە لە سوورەتی (مریم)دا کە پێشتر باسمان کرد، ئیبراهیم (علیه السلام) بەڵێن بە بابی دەدات، دوای ئەوەی بابی دەریدەکات، کە داوای لێبوردنی بۆ بکات ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ ﴾، واتە: سەلام لە تۆ بێ ئەوە من دەڕۆم، بەڵام داوای لێبوردنیشت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴾، بێگومان پەروەردگارم بەرانبەر بە من زۆر بە ڕەحمو بەزەییو مشوورخۆرە ئنجا ئەو بەڵێنەی لە سوورەتی مەریەمدا خوای بێ وێنە لە ئیبراهیمەوە گێڕاویەتەوە، جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەی لە سوورەتی (الشعراء)دا خستۆتە ڕوو، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، لە سوورەتی (مریم)دا دەڵێ: داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، ئەوەتا لە سوورەتی (الشعراء)یشدا، ئەو بەڵێنەی کە داویەتی هێناویەتە دی، کە دەڵێ: وە ئەی خوایە! لە بابم ببوورە، بێگومان بابم لە گومڕایانە.

ئیشکالەکەش لێرەدا پەیدا دەبێ: ئەدی ئەوە نیە ئیبراهیمیش (علیه السلام) بۆ بابی پاڕاوەتەوە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئیبراهیم (علیه السلام) کە بۆی پاڕاوەتەوە لەبەرئەوە بووە کە بەڵێنی پێداوە، پاشان نەیزانیوە کە ئیمان ناهێنێ، بۆیە بۆی پاڕاوەتەوەو داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردوە، ئومێدی پێی هەبووە کە بڕوا بێنێ، بەڵام دوای ئەوەی دڵنیا بووە کە بڕوا ناهێنێ، حاشای لێکردوەو دووریی لێکردوە.

واتە: ئێوەش ئەی بڕواداریینە! ئەو خزمو نیزیکانەتان کە لەسەر کوفرو شیرك‌و نیفاق مردوون، یاخود دڵنیا کراونەوە، لەلایەن خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ئەوانە بڕوا ناهێنن، بۆیە ئێوەش دەبێ وەك ئیبراهیم بکەن، کە دوای ئەوەی دڵنیا بوو بابی بڕوا ناهێنێ، حاشای لێکردو دووریی لێکرد، ئێوەش حاشاو دووریی بکەن، لەو خزمو نیزیکانەتان، کە دەزانن لەسەر کوفر مردوون، یاخود بڕوا ناهێنن.

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u>: چۆنیان بۆ دەرکەوتوە کە هاوبەشدانەران هاوەڵی دۆزەخن؟

١/ ئەوانە خوا هەواڵی بە پێغەمبەر داوە ﷺ کە بە کافریی مردوون، یانی: مونافیقەکان‌و موشریکەکان‌و کافرەکان، وە هەر کەسێك بە کافریی مردبێ، دیارە خاوەنی دۆزەخەو هاوەڵی دۆزەخە.

٢/ هەر کەسێك بە ڕواڵەت لەسەر کوفرو شیرك مردبێ، واتە: با خوای پەنهانزانیش هەواڵی بە پێغەمبەر نەدابێ ﷺ، مادام کەسێك کە دەزانی لەسەر کوفرو شیرك، یان نیفاق مردوە، ئەوە دەزانی کە ئەوانە هاوەڵی دۆزەخن، واتە: یان دەبێ بە پێی ڕواڵەتی حاڵی، لەسەر کوفرو شیرك، یان نیفاق مردبێ‌و، تۆش بزانی، یان ئەوەتا لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ خوای پەروەردگار بە وەحی فەرموو بێ: کە فلان کەس لەسەر کوفرو شیرك، یان نیفاق مردوە، یاخود فلان کەس ئیمان ناهێنێ‌و لەسەر شیرك‌و کوفر یان نیفاق دەمرێ.

لەو دوو ڕێیەوە بۆیان دەردەکەوتوە کە ئەو کەسانە بێبڕوان، وە لەسەر کوفر مردوون، وە هاوەڵی دۆزەخن.

## چوار ڕیوایەت لەبارەی هاتنەخواری ئەم ئایەتەوە

لە تەفسیرەکاندا چوار ڕیوایەت باسکراون، بۆ هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە موبارەکە: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾:

١) یەکێك لە ڕیوایەتەکان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ (أبو طالب) پاڕاوەتەوە.

ئەبو طاڵیبی مامی کە: خوا لێی خۆش ببێ، ئەمە بوخاریی بە ژمارە (١٣٦٠)، وە موسلیم بە ژمارە (٢٤) هێناویانە، وە (الإستيعاب في بيان الأسباب)[1]، ئەو گێڕدراوەیەی هێناوە.

بەڵام بێگومان ناگونجێ ئەم ئایەتە هۆی هاتنە خوارەوەکەی ئەو بەسەرهاتە بێ. لەبەرئەوەی ئەبو طاڵیب لە مەککە مردوە، بەڵام سوورەتی تەوبە لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا هاتۆتە خوارێ، لە ساڵی نۆیەمدا کەواتە: چۆن دەگونجێ ئایەتێك کە لە ساڵی نۆیەمی کۆچییدا هاتۆتە خوارێ، هۆی هاتنە خوارەو کەی بەسەرهاتێك بێ، کە دە دوازدە ساڵ لەوەو پێش بووە !!.

٢) هەروەها ڕیوایەتێکی دیکە دەڵێ: ئەو ئایەتە بەهۆی ئەوەوە هاتۆتە خوارێ کە پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی (آمنة)ی دایکی کرد، وە داوای لێبوردنی بۆ لە خوای بەخشندە کرد.

ئەوەش (إبن أبي حاتم) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2]، وە (الطحاوي) لە (مشكل الآثار)دا بە ژمارە (٢٤٨٧)، وە (الحاكم) لە (المستدرك)دا[3] هێناویانە، بەڵام دیارە (الإستيعاب في بيان الأسباب) دەڵێ: (قُلنا وَهَذَا إِسْنَادٌ ضَعِيفٌ)[4]، کە

---

١) ج ٢، ص ٤٢.

٢) ج ٦، ص ١٩٩٣- ١٩٩٤.

٣) ج ٢، ص ٣٢٦.

٤) ج ٢، ص ٣٤٤.

گوایە پێغەمبەر ﷺ لە (أبواء) سەردانی گۆڕی دایکی کردوە، وە بۆی لە خوای لێبوردە پاڕاوەتەوە، بەو هۆیەوە ئەو ئایەتە هاتۆتە خوار، بەڵام وا دیارە کە لە ڕووی سەنەدەوە بێهێزە.

٣) ﴿عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يَسْتَغْفِرُ لأَبَوَيْهِ، وَهُمَا مُشْرِكَانِ، فَقُلْتُ: تَسْتَغْفِرُ لأَبَوَيْكَ وَهُمَا مُشْرِكَانِ! فَقَلَ: أَلَيْسَ قَدْ اسْتَغْفَرَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَهُوَ مُشْرِكٌ؟ قَالَ: فَذَكرتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَنَزَلَتْ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ ﴾﴾، {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٣١٠١)، وَالنَّسائِيُّ، برقم: (٢٠٣٦)، وَأَبُو يَعْلَى، برقم: (٣٣٥)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان) برقم (٩٣٧٨) وَحَسَّنَهُ الأَلْبَانِي}.

واتە: عەلی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پیاوێك بوو داوای لێبوردنی بۆ باب‌و دایکی دەکرد، کە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون (بۆیان لە خوا دەپاڕایەوە)، منیش پێم گوت: چۆن داوای لێبوردن لە خوا بۆ باب‌و دایکت دەکەی کە هاوبەش بۆ خوا دانەرن؟ {کە دەبێ بە موشریکیی‌و، بە کافرێتی مردبن، یاخود لەو کاتەدا لەسەر حاڵەتی شیرك بووبن}، ئەویش گوتی: ئەدی ئەوە نیە ئیبراهیمیش داوای لێبوردنی بۆ بابی کردوە، لە حاڵێکدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەریش بووە، دەڵێ: منیش ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئیدی لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ ﴾.

٤) ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانُوا يَسْتَغْفِرُونَ لَهُمْ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، فَلَمَا نَزَلَتْ، أَمْسَكُوا عَنِ الإِسْتِغْفَارِ لأَمْوَاتِهِم، وَلَمْ يُنْهَوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلأَحياءِ، حَتَّى يَمُوتُوا، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾التوبة، يَعْنِي: اسْتَغْفَرَ لَهُ مَا كَانَ حَيّاً، فَلَمَّا مَاتَ، أَمْسَكَ عَنِ الإِسْتِغْفَارِ﴾، {أَخْرَجَهُ البَغَوِي ج١١، ص٣٣، وَالطَّحَاوِي فِي (مشكل

الآثار)، برقم: (٢٤٨٣)، وَابْنُ أَبِي حاتم فِي تَفْسِيرِهِ، قَالَ فِي الإستيعاب: قُلْنا هَذا إِسْنادٌ حَسَنٌ، ج٢، ص٣٢٤٤}[1].

شایانی باسیشە بەنسبەت ئەو ڕیوایەتەوە کە لە (علي)یەوە گێڕدراوەتەوە. هەرچەندە (الألباني) بە (حسن) ی داناوە، بەڵام (إبن العربي) لە (العارضة)دا، وەك خاوەنی (التحرير والتنوير) هێناویەتی، بە زۆر بێهێزی داناوە .

{قَالَ ابْنُ العَرَبِي فِي (العَارِضَة): هُوَ أَضْعَفُ مَا رُوِيَ فِي هَذَا البَاب، وَأَمَّا مَا رُوِيَ فِي أَسْبَابِ النُّزُولِ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي اسْتِغْفَارِ النَّبِيِّ ﷺ لأَبِي طَالِب، أَوْ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِي سُؤَالِهِ رَبَّه أَنْ يَسْتَغْفِرَ لأُمِّهِ آمِنَة، حِينَ زَارَ قَبْرَهَا بالأَبْوَاء، فَهُمَا خَبَرَانِ وَاهِيانِ لأَنَّ هَذِهِ السورَةَ نَزَلَتْ بَعْدَ ذَلِكَ بِزَمَنٍ طويل}[2].

(ابْنُ العَرَبِي) کە خاوەنی (أحكام القرآن)ە، دەڵێ: ئەو ڕیوایەتەی کە لە (علي)یەوە هاتوە، خوا لێی ڕازی بێ، بێهێزترین شتە کە لەوبارەوە گێڕدرابێتەوە، وە ئەوەی کە لە هۆیەکانی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا هاتوە، گوایە ئەم ئایەتە دەربارەی داوای لێبوردکردنی پێغەمبەر ﷺ بووە بۆ ئەبو طاڵیبی مامی، یاخود لەبارەی دەربارەی داوای لێبوردن کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ دایکی ئامینە هاتۆتە خوار، کە سەردانی گۆڕەکەی کردوە لە (أبواء)، ئەو دوو هەواڵە، (واتە: ئەو دوو ڕیوایەتە) زۆر بێهێزن، چونکە ئەم سوورەتە دوای ئەوە بە ڕۆژگارێکی دوورو درێژ هاتۆتە خوار.

کەواتە: تەنیا ڕیوایەتەکەی ئیبنو عەبباسە، بگونجێ پشتی پێ ببەسترێ، لەگەڵ ئەوەی عەلی دا خوا لێی ڕازی بێ، بەڵام (ابْنُ العَرَبِي) ئەوەی عەلی بە (أضعَفُ شيء في هذا الباب) وصف کردوە، هەرچەندە (الإستيعاب في بيان الأسباب) سەنەدەکەی بە باش لە قەڵەم داوە.

هەڵبەتە دەبێ ئەوە بزانین کە دەگوترێ: هۆی هاتنە خواری ئەو ئایەتە، ئەو بەسەرهاتە بووە، ئەو ڕووداوە بووە، مانای وانیە کە چەمك و واتای ئەو

---

١) پێشتر مانامان کردوە .

٢) ج ١١، ص ٤٤.

ئایەتە موبارەکە کورت هەڵدێ لەو ڕووداوەدا، بەڵکو یانی: ئەو ئایەتە موبارەکە چەمكو واتایەکەی ئەو ڕووداوەش دەگرێتەوە، وە جیا لەو ڕووداوەش دەگرێتەوە، یان ئەو کەسە دەگرێتەوە کە ئایەتەکە دەربارەی هاتۆتە خوار، وە جگە لەویش دەگرێتەوە، بەڵام بە تەئکید ناگونجێ ئایەتێك لە سوورەتی (التوبة) دابێ، کە لە ساڵی نۆیەمی کۆچییدا هاتۆتە خوار، پەیوەندیی هەبێ بە بەسەرهاتێکەوە، کە دە، دوازدە (١٠- ١٢) ساڵ لەوەو پێش ڕووی داوە !!

بۆیە پێویستە لە هۆی هاتنە خوارەوەکاندا باش ورد بینەوەو، دیقەتی باش بکەین، بۆ ئەوەی هەندێك چەمكو واتا کە ئایەتەکان مەبەستیان نین، نەیانخەینە نێو مانای ئایەتە موبارەکەکانەوە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾.

بۆ زیاتر تێگەیشتنی چەمكو واتای ئەو ئایەتە، پێویستە پێشێ چەند وشەیەك مانا بکەین:

١- وشەی (مَّوْعِدَةٍ ) دەڵێ: (المَوْعِدَةُ: إسمٌ للوَعدِ) پێشتریش باسمان کرد.

(مَوْعِدَة) ناوە بۆ (وَعْد) واتە: گفتو بەڵێن .

٢- (تَبَرَّأَ مِنْهُ ) (التَبَرُّؤ: تَفَعُّلٌ مِن بَرِئَ مِنْ كَذَا، إذَا تَنَزَّهَ عَنْهُ، فالتَبَرُّؤُ مُبالَغَةٌ فِي البَرَاءَةِ).

وشەی (تَبَرّؤ، تَفَعُّل)ە، لە (بَرِئَ مِنْ كَذَا)وە هاتوە، (بَرِئَ مِنْ كَذا) واتە: حاشای لێکردو دووریی لێکرد، کاتێك کە مرۆڤ خۆی لە شتێك پاك دەگرێو دووریی لێ دەکات، ئنجا وشەی (تَبَرّؤ) زێدەڕۆیی کردنە لە بەرائەت، چونکە لەسەر کێشی (تَفَعُّلْ)ە، ولە: فشار لە خۆت بکەی کە زیاتر دووریی بگری، وە خۆت پاك بگری لەو شتە.

٣- وشەی (لَأَوَّٰهٌ) (الأَوَّاهُ: الَّذِي يُكْثِرُ قَولَ: أَوَّه، وَهُوَ التَّوَجُّعُ، وَهُوَ كِنايَةٌ عَنِ الرَّأْفة وَرِقَّةِ القَلبِ والتَضَرُّعِ، حِيْنَ يوصِفُ بِهِ، مَنْ لَيْسَ بِهِ وَجْعٌ).

وشەی (أَوَّاهُ) كەسێكە كە زۆر بڵێ (أَوَّهْ) یان (أُوَه) كە بریتیە لە دەربڕینی ئازار، ئەویش كینایەیە بۆ بەزەیی‌و پەرۆش‌و دڵ پێ سووتان، یاخود پاڕانەوەو كڕووزانەوە، وە كاتێك كەسێك پێی وەسف دەكرێ، كە ئازارێكی نەبێ، ئەوە ڕەحم‌و بەزەیی‌و شەفەقەت نواندن دەگەیەنێ، ئەگەر كەسێك ئازارێكی هەبێ‌و بڵێ: ئۆهـ ، دیارە تەعبیر دەكات لە ئازارەكەی خۆی، بۆیە لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (كَلِمَةُ تَوَجُّعٍ) وشەیەكە بۆ دەربڕینی ئازار بەكاردێ، بەڵام كەسێك ئازارێكی لە جەستەیدا نەبێ، كاتێك دەڵێ ئووهە، یا ئۆهـ، ئەوە مەبەستی ئەوەیە ڕەحم‌و بەزەیی‌و سۆز دەنوێنێ، بەرانبەر بە جگە لە خۆی.

٤- وشەی (حَلِيمٌ) (صَاحِبُ الحِلْمِ) كەسێك كە خاوەنی سیفەتی هێدیی‌و مەندییە، هێدیی‌و مەندیی پێچەوانەی زوو تووڕە بوونە، وەك چۆن (عَجَلَة) پێچەوانەی (تأَنّي)یە، (تأَنّي) واتە: بەكاوەخۆ، بە شێنەیی، وە (عَجَلَة)ش واتە: تاڵووكەكردن، پەلەپەل كردن.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ﴾، ئەوە دوو واتایان دەگەیەنێ:

یەكەم: (وعد ابراهیم هذه الموعدة أباه)، بەڵێنێك كە ئیبراهیم بە بابی دابوو، لە كوێ دیارە كە بەڵێنەكەی پێداوە؟

لە سوورەتی (مریم)دا دوای ئەوەی كە بابی پێی دەڵێ: ﴿يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا ﴿٤٦﴾﴾ مریم.

واتە: ئەی ئیبراهیم! ئەگەر دەست هەڵنەگری، واتە: لە یەكتاپەرستیی، یان لە بانگ كردنی من بۆ تەنیا خوا پەرستیی، بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا كردن‌و دەست هەڵگرتن لەو بت‌و صەنەمانە، ئەگەر واز لەوە نەهێنی، بەرد بارانت

دەکەم، ﴿وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا﴾، ئێستاش برۆ زۆر لێم دووربکەوە، وە ماوەیەکی زۆر برۆ، یانی: سەری خۆت هەڵگرەو برۆ، ئیبراهیم (علیه السلام) بە بەلاش نیە کە خوا لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ١١٤﴾التوبة، واتە: ئیبراهیم زۆر بە ڕەحمو سۆز بووە، زۆریش هێدیی‌و مەند بووە، لە وەڵامی ئەو قسە ڕەقانەی باببدا، دەڵێ چی؟!

﴿قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ٤٧﴾مریم، واتە: گوتی: سەلامەت لێ بێ، لەمەودوا داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، چونکە پەروەردگارم لەگەڵ من زۆر بە مشوورە، زۆر بە تەنگمەوەیە، بەزەیی پێمدا دێ.

یانی: ئومێد دەکەم کە دوعای منیش بۆ تۆ، داوای لێبوردن کردنی من بۆ تۆ، گیرا بکاتو، خوا لێت ببووری.

ئنجا ئایا لە کوێدا دیارە کە داوای لێبوردنی بۆ لە پەروەردگاری کردوە؟ لە سوورەتی (الشعراء) لە ئایەتی (٨٦)دا کە لە سیاقی چەند قسەیەکدا، دەڵێ:

﴿وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ٨٦﴾، واتە: وە لە بابیشم ببوورە بێگومان بابم لە گومڕایانە، لێی ببوورە، واتە: چاوپۆشیی لێ بکەو لێی ببوورە .

**دووەم** : واتای دووەمی ، ﴿إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ﴾: کە ئەومیانم تەنیا لە (التحریر والتنویر)ی (محمد الطاهر ابن عاشور)دا بینی، بەڵام ئەویش ڕێی تێدەچێ، دەڵێ: (وَعْدُ أَبِي إِبْرَاهِيمَ أَنْ يُؤْمِنَ) بەڵێنی بابی ئیبراهیم بوو، بە ئیبراهیم، کە بڕوا بێنێ، واتە: بابی ئیبراهیم کە (ئازەر)ە وەعدی بە ئیبراهیم دا، کە ئیمان بێنێ، بۆیە ئیبراهیم داوای لێبوردنی بۆ لە خوا دەکرد، چونکە بابی بەڵێنی پێدابوو، ئنجا ئومێدی وابوو کە بابی بڕوا بێنێ‌و لەگەڵ بەڵێنەکەی خۆیدا ڕاست بکات، بۆیە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کرد، بەڵام دوای ئەوەی کە زانی: بابی بەڵێنەکەی جێبەجێ ناکات، وە دوژمنی خوایە، حاشای لێکرد.

ئنجا (مُحَمَّد الطَّاهِر إبن عاشور) ئەوە بە بەڵگە دێنێتەوە دەڵێ: چونکە ئەگەر ئیبراهیم بەڵێنی بە بابی دابووایە، وەك چۆن خوا ﷻ لەسەر ئەوەی داوای لێبوردنی بۆ بابی کرد، ڕەخنەی لێگرت، ئەگەر بەڵێنیشی پێ دابووایە، لەسەر بەڵێن پێدانەکەشی، هەر ڕەخنەی لێدەگرت!

منیش دەڵێم: بەڕاستی مانای یەکەمیان زیاتر دەچێتە عەقڵەوە، وە زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەکان دا دەگونجێ، وە بەڵگەش هەیە لە قورئاندا، ئەوەتا لە سوورەتی (مریم)، ئایەتی (٤٧)دا دیارە کە ئیبراهیم بەڵێنی پێدەدا: ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ٤٧ ﴾ مریم، ئەوە بەڵێنەکەی دیارە، پاشان داوای لێبوردنەکەشی هەر دیارە، لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتی (٨٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ٨٦ ﴾، بەڵام هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە کە بابی ئیبراهیم بەڵێنی بە ئیبراهیم دابێ، ئەوەی کە دیارە لە قورئاندا هەر ئەوەیە کە بابی ئیبراهیم هەڕەشەی لە ئیبراهیم کردوە، کە بەرد بارانی بکات، ئەگەر نەڕوات، وە پاشان دەریکردوە، ئەدی کوا ئەو بەڵێنە لەکوێیە؟!

بۆیە با ڕواڵەتی ئایەتەکەش بیگەیەنێ، بەڵام هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەو ڕایە نیە، کە خاوەنی (التحرير والتنوير) هێناویەتی خوا پاداشتی بداتەوە، بۆیە هەر ئەوە ڕاستترە، بەڵکو هەر ئەوە ڕاستە، کە بڵێین: مەبەست لەو بەڵێن پێدانە، بەڵێن پێدانی ئیبراهیم بووە بە بابی (ئازەر)، کە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا بکات، بەڵام ئەو بەڵێنەی هەتا ئەو کاتە بردە سەر، تاکو دڵنیا بوو ئیمان ناهێنێ، دوای ئەوەی کە دڵنیا بوو، یەقینی بۆ پەیدا بوو، کە بڕوا ناهێنێ، بەرائەتی لێکرد، وە حاشای لێکردو دووریی لێکرد.

ئنجا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴾، بێگومان ئیبراهیم یەکجار بە ڕەحم و بەزەیی و میهرەبان بوو، وە زۆر هێدیی و مەند بوو، لێرەدا ئەوە جۆرێکە لە پۆزش هێنانەوە بۆ ئیبراهیم، کە بابی هەرچەندە کافرو موشریك و بت پەرست بووە، بەڵام داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردوە، لەبەرئەوەی زۆر بە

پەرۆش بووە، وە زۆر دڵنەرمو میهرەبان بووە، وە پاشان زۆر هێدیی‌و مەند بووە، ئەوە جۆرێکە لە عوزر هێنانەوەو پۆزش هێنانەوە بۆ ئیبراهیم (علیه السلام).

**مەسەلەی سێیەم**، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّى يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ ﴾.

وە ناگونجێ خوا کۆمەڵێك کە ڕێنمایی کردوون‌و خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، گومڕا بکات، یان بڕیاری گومڕابوونیان بۆ بدات، تاکو ئەوەی کە دەبێ پارێزی لێبکەن‌و خۆی لێ بپارێزن، بۆیان ڕوون نەکاتەوە، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئەمە وەك لە مانای گشتییەکەشدا، ئاماژەمان پێدا دوو مانای هەن:

**مانای یەکەم**: ناگونجێ خوا گومڕایی لەسەر کۆمەڵێك بنووسێ، وە بۆیان بڕیار بدات کە هیدایەتی داون، تاکو ئەوەی کە دەیەوێ خۆی لێ بپارێزن، بۆیان ڕوون نەکاتەوە، کەواتە: هاوەڵانێك کە لەوەو پێش بۆ خزمەکانیان پاڕاونەوە، یان بۆ دۆست‌و نیزیکانیان پاڕاونەوە، بەوە گومڕا نەبوون، با ئەو خزم‌و نیزیکانەیان لەسەر کوفرو شیرکیش مردبن، یان لەسەر نیفاق مردبن، یاخود لەوکاتەدا لەسەر کوفرو شیرك‌و نیفاق بوو بن، وە دڵنیاش بووبن کە ئیمان ناهێنن، مادام نەیانزانیبێ کە: ئەو جۆرە بۆ پاڕانەوەو داوای لێبووردن کردنە، قەدەغەیە، ئەوە حوکمی گومڕایی‌و سەرگەردانیی، حوکمی گوناهباریی، نایانگرێتەوە، چونکە نەیانزانیوە.

**مانای دووەم**: هەر کاتێك خوا کۆمەڵێکی ڕێنمایی کرد، خستنیە سەر ڕێی ڕاستی خۆی، وازیان لێ ناهێنێ، کە لە ڕووی هەڵسوکەوتەکانەوە، لە گومڕایی‌و نەفامییدا بن، بەڵکو ئەوەی پێویستە کە خۆیانی لێ بپارێزن، بۆیان ڕوون دەکاتەوە.

هەر بۆیەش خوا ﷻ هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕواداران خۆیانیان لێ بپارێزن، بۆی ڕوون کردوونەوە، کە یەکێك لە شتەکان ئەوەیە، نابێ داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بۆ کەسانێك کە دەزانن لەسەر کوفرو شیرك‌و نیفاق مردوون، یاخود لەسەری دەمێننەوە، تاکو دوا ساتی ژیانیان، وە بڕوا ناهێنن،

نابێ ئەو جۆرە داوایە لە خوای بەخشەر بکەن، کە لێیان خۆش بێو لێیان ببووریَ، چونکە ئەوە داوایەکە جێگا ناگرێ.

کە دەفەرمویَ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە، واتە: هەر بۆیەش هەموو شتێکتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، چونکە خوا هەموو شتێك دەزانیَ، بەلاَم ئێوە هەرچەندە زانا بن، وەك گوتراوە: (عَلِمْتَ شَيْئاً وَغَابَتْ عَنْكَ أَشْيَاءُ) شتێکت زانیوە، بەلاَم زۆر شتت لیَ پەنهان بوون.

ئنجا ئەم ئایەتە لێی وەردەگیریَ، کە مرۆڤ هەتا بەرچاوی ڕۆشن نەبێتەوە. لە ڕووی پاساکانی شەریعەتەوە، مادام لەو جۆرە بیَ، کە پۆزشدار (مَعْذور) بیَ بە نەزانیی (جَهْل)و لە جۆری (مَعْذور بالجَهْل) بیَ، واتە: شتێك نەزانێتو بەلاَم لە نەزانینەکەشیدا خاوەنی عوزر بیَو خاوەنی بەلْگە بیَ، بە گوناهبار لە قەلەم نادریَ، بەلاَم دیارە خاوەنی بەلْگەو پاساو بوون لە نەزانییو بیَ ئاگاییدا، هەموو کەس ناگرێتەوە، هەر کەسێك شتێکی نەزانی بگوتریَ : لێی بوردراوە ! بەلْکو دەبیَ کەمتەرخەم نەبیَ، لەوەدا کە نەزانو بیَ ئاگایە لە شتێك، ئنجا بە (مَعْذور بالجَهْل) دەربازی دەبیَ، چنو کە خوا ﷻ دەفەرمویَ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ...﴿٢٨٦﴾ ﴾البقـرة، واتە: بێگومان خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، جگە لەوەی لە توانایدا هەیە، کەسێك هەولْی دابیَ شتێك بزانیَ. بەلاَم هەر نەیتوانیبیَ زانیاریی لەبارەوە پەیدا بکات، کە ئەو شتە قەدەغەیە، وە بیکات، یاخود نەزانیَ پێویستەو بیچوێنیَ، ئەوە گوناهبار نابیَ.

<u>مەسەلەی چوارەمو کۆتایی</u>: کە دەفەرمویَ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿١١٦﴾ ﴾.

بێگومان خوا موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هەیە، دەژیەنیَو دەمرێنیَ، وە ئێوە جگە لەو هیچ سەرپەرشتیارو، وە هیچ یارمەتیدەرتان نین.

لەبەردەم ئەم ئایەتە بەپێزەش دا، سیَ هەلْوەستە دەکەین :

هەڵوەستەی یەکەم: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: خوا خاوەنی هەموو شتێکە.

کەواتە خوایەك کە خاوەنی هەموو شتێکە، موڵکایەتیی ڕەها تەنیا هی ئەوە، هەر ئەو خاوەنی ڕەهای هەموو بوونە، بە سەرو خواریەوە، ئێوەش بەندەی ڕاستی وی بن، پابەند بن بە ڕێنماییەکانی ئەوەوە، پابەند بن بە شەریعەتو بەرنامەی ئەوەوە.

هەڵوەستەی دووەم: کە دەفەرموێ: ﴿ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ﴾، واتە: دەژیەنێو دەمرێنێ.

لەبەرئەوەی ژیاندنو مراندن، زەقترین نیشانەی خاوەنداریێتیو دەسەڵاتداریێتی خوان، بۆیە خوا ﷻ ئەو دوو سیفەتەی خۆی هەم لێرەو هەم لە زۆر شوێنی دیکەش دا باس کردوون: پێشێ باسی خاوەنداریێتیی خۆی دەکات، ئنجا باسی حوکمڕانێتیی خۆی دەکات، کە لە ڕاستییدا گەورەترین جۆری دەسەڵاتو حوکمڕانێتیی وە بەرجەستەترینو، زەقترین نیشانەی حوکمڕانێتییو، دەسەڵاتداریێتیی خوا، لە بوونەوەردا، ئەوەیە کە دەژیەنێو دەمرێنێ، ژیان دەبەخشێ، وە ژیان وەردەگرێتەوە.

هەڵوەستەی سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، وە جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارو دۆستو مشوورخۆر، وە هیچ هاوکارو وەسەرخەرتان نین.

کەواتە: هەر خوا بکەنە مشوورخۆری خۆتان، وە با بەس خوا پەرستراوتان بێو، پشت پێ بەستراوتان بێ، وە هەر کات بەس ئەو بە هۆی ملکەچیی تەواوتان بۆ بەرنامەکەیو، گوێڕایەڵیی تەواوتان بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەنە تاکە پەرستراوی خۆتان، ئەو کاتەش خوا سەرپەرشتییتان دەکاتو، سەرتان دەخاتو، یارمەتییتان دەدات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسەمان لە سێ (٣) ئایەت پێکهاتوە، کە بریتین لە ئایەتەکانی: ١١٧و ١١٨و ١١٩)، تاکە تەوەری ئەم سێ ئایەتە، بریتیە لە تەوبە لێوەرگرتنو لێبوردنی خوا لە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی کۆچکەرو پشتیوانانی شوێنکەوتووی بەگشتی، کە لە کاتی سەغڵەتو دژواری جەنگی تەبووکدا لێی بەجێ نەماون، هەروەها بە تایبەت تەوبە لێوەرگرتن، لەو سێ هاوەڵەی کە بڕیار لەبارەیانەوە دواخرابوو، وە زۆر تووشی سەغڵەتیی و دڵتەنگیی بوو بوون، بۆ ماوەی پەنجا (٥٠) شەوو ڕۆژ، کە بریتی بوون لە: کەعبی کوڕی مالیکو، مەرارەی کوڕی ڕەبیعو، هیلالی کوڕی ئومەییە.

وە لە کۆتاییشدا خوا فەرمان بە بڕواداران دەکات، کە پارێز لە خوا بکەن، وە لەگەڵ ڕاستاندابن.

﴿ لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ
فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ
عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا
ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ
مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتـەکـان

{بە مسۆگەری خـوا (بە بـەزەیی خـۆی) گـەڕایـەوە سـەر پێغـەمبـەرو ئـەو کـۆچکەرو پشتیوانـانەی، کە لە کاتی سـەغڵەتییو دژوارییـدا، شوێنـی کەوتن، وە لێیان بورد، دوای ئەوەی خەریك بوو دڵی کۆمەڵێك لەوان لابدات، پاشان (خـوا) گەڕایەوە سەریان، (تۆبـەی لێ وەرگرتن)، بێگومان (خـوا) بەرانبەریان میهرەبانو بـەزەیی یـە ﴿١١٧﴾ هەروەهـا (خـوا گەڕایەوە سەر) ئـەو سێ کەسـەش کە (بۆ بڕیـاردان لـە بارەیانەوە) دواخـرابوون، هـەتـا کـاتێك کە زەمیـن بە فراوانیـی، لێیـان وە تـەنگ هـات، وە دەروونـی خـۆشیـانیـان لـێ وەتەنـگ هاتو لێ سـەغڵەت بوون، وە زانیان کە هیچ پەناگەیەك لە (سزای) خـوا، نیـە، مەگەر (بە گـەڕانـەوە) بۆ لای وی، پـاشـان (خـوا) گەڕایەوە سـەریان، (لێیـان بورد) تـاکو ئەوانیش بگـەڕێنەوە، بە دڵنیایی (خـوا) زۆر تەوبـە وەرگری بـە بـەزەیی یـە ﴿١١٨﴾ ئـەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو لەگـەڵ ڕاستاندا بن ﴿١١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( لَّقَد ): (قَدْ) (حَرْفٌ لا يَدْخُلُ إلاَّ عَلَى الأَفْعَالِ، وَهُوَ جَوَابٌ لِقَوْلِكَ: أَمَا تَفْعَلْ؟ وَزَعَمَ الخَلِيلُ أَن هَذَا لِمَن يَنتَظِرُ الخَبَر، يَقُولُ لَهُ: قَدْ مَاتَ فُلاَن، فَإِنْ لَم يَكُن يَنتظِر، قال: مَاتَ فُلان).

وشەی (قد) لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: تەنیا دەچێتە سەر کردارەکان، وە وەڵامیشە بۆ ئەو قسەیە کە دەڵێ: ئایا تۆ ئەو شتە ناکەی؟ وە خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدیی پێی وابووە، کە وشەی (قد) بەکاردەهێنرێ بۆ وەڵامی کەسێك کە چاوەڕێی وەڵامێك دەکات، تۆش پێی دەڵێی: ئاگاداربە فڵان کەس مرد (قَدْ مَاتَ فُلاَن)، بەڵام ئەگەر چاوەڕێ نەکات، پێی دەڵێی: (مَاتَ فُلان)، وە وشەی (قد)ی بۆ بەکارناهێنی، بەڵام زانایانی دیکە دەڵێن: وشەی (قد) بۆ جەختکردنەوەیە (قد للتحقيق)، واتە: بێگومان ئەو شتە ئاوایە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ﴾، واتە: بە مسۆگەریی خوا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر ﷺ، لە کۆچکەران و پشتیوانانێك کە لە کاتی سەغڵەتیی دا شوێنی کەوتبوون.

(تَّابَ ٱللَّهُ): واتە: (قَبِلَ تَوْبَتَهُمْ) یانی: خوا تەوبەکەی لێوەرگرتن، (التائِبُ: بَاذِلُ التَّوْبَةِ وَقَابِلُ التَّوْبَةِ).

وشەی (تائب) هەم بە کەسێك دەگوترێ، کە تەوبە دەکات، وە هەم بە کەسێك دەگوترێ، کە تەوبە وەردەگرێ، خوا ﷻ هەم خۆی، وە هەم بەندەی بە سیفەتی (تائب) وەسف کردوە. کەواتە: ئەگەر مەبەست بەندە بێ، واتە: کەسێك کە تەوبە دەکات، دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، وە ئەگەر مەبەست خوا بێ، واتە: کەسێك کە تەوبە وەردەگرێ.

(سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ ): واتە: کاتی سەغڵەتیی، (الساعَةُ: جُزْءٌ مِنْ أَجْزاءِ الزَّمانِ، العُسْرَةُ: تَعَسُّرُ وُجُودِ المالِ، وَيَوم عَسِير: يَتَصَعَّبُ فِيهِ الأَمْرُ).

(ساعة) بە بەشێك لە بەشەکانی کات دەگوترێ، (عُسْرَة) بریتیە لە تەنگ دەستیی، بەڵام من پێم وایە وشەی (عُسْرَة) کە لە (عُسْر)ەوە هاتوە کە لە بە مانای سەغڵەتیی دێ، واتە: کاتێ تەنگانەو سەغڵەتیی بە ڕەهایی، جا چ لە ڕووی ئەوەوە کە ئەو کاتە هاوین بووەو گەرما بووە، وە چ لەبەرئەوەی کە ماڵو سامانیان کەم بووەو ڕێگاکە دوور بووە، وە چ لەبەرئەوەی کە دوژمنەکە دوژمنێکی سامناك بووە، کە سوپای ڕۆم بووە، بۆیە دەرچوون بۆ جەنگی تەبووك خوای پەروەردگار بە (سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ )ی ناوناوە، لە هەموو ڕوویێکەوە، ڕۆژێکی دژوارو سەغڵەتو تەنگ بووە.

ئنجا کە دەگوترێ: (يَوم عَسِير) واتە: کابروبار تێیدا بە زەحمەتە.

(كَادَ ): (كادَ: مَوْضوعٌ لِمُقارَبَة الفِعْلِ، فُعِلَ أَوْ لَمْ يَفْعَل).

وشەی (كاد) دانراوە بۆ نیزیك بوونی ئەنجامدانی کارێك، ئنجا ئەنجام بدرێ، یان ئەنجام نەدرێ.

(يَزِيغُ ): واتە: لادەدات، (الزَّيْغُ: المَيْلُ، زَاغَتِ الشَّمْسُ: مَالَتْ).

(زيغ) بریتیە لە لادان، دەگوترێ: (زَاغَتِ الشَّمْسُ) واتە: خۆر لایدا.

(رَءُوفٌ ): (الرَّأْفة: أَشَدُّ الرَّحْمَةِ).

(رأفة) واتە: ئەوپەڕی بەزەیی، میهرەبانیی، بەڵام ڕاست ئەوەیە وەك دوایی باسی دەکەین، کە (رأفة) بریتیە لە بەزەیی پێداهاتنەوەو ئاگا لێبوون، لە مەترسییو ناخۆشیی، یانی: جۆرێك لە بەزەیی تایبەتە.

(رَّحِيمٌ ): (الرَّحْمَةُ: رِقَّةٌ تَقْتَضِي الإِحْسانَ إِلى المَرْحُومِ).

(رحمة) بریتیە لە نەرمیی‌و میهرەبانییەك، كە ئەوە دەخوازێ، چاكە لەگەڵ ئەو كەسەدا بكەی، كە ڕەحمی پێ دەكەی.

(خُلِّفُوا): (خَلَّفْتُهُ: تَرَكْتُهُ خَلْفِي...).

(خَلَّفْتُهُ) واتە: لە پشت خۆمەوە جێم هێشت.

كەواتە: (خُلِّفُوا) واتە: (أُجِّلوا)، یان (أُخِّروا) واتە: دواخرا بوون.

(بِمَا رَحُبَتْ): (الرُّحْبُ: سَعَةُ المَكانِ، وَرَحُبَتِ الدَّار: اتَّسَعَت).

(رُحْبْ) بریتیە لە شوێنێك كە فراوان بێ، فراوانیی شوێنێك، وە (رَحُبَتِ الدَّار) واتە: خانووەكە فراوان بوو، ماڵەكە فەڕاح بوو.

(وَظَنُّوا): (الظَنُّ: اسْمٌ لِمَا يَحْصُلُ عَنْ أَمَارَةٍ، وَمَتَى قَوِيت أَدّت إِلى العِلْمِ، وَمَتَى ضَعُفَت جِداً، لَمْ يَتَجَاوَزْ حَدَّ التَّوُّهم).

(ظن) ناوە بۆ هەر زانیارییەك كە بەهۆی نیشانەیەكەوە بۆت دەردەكەوێ. ئنجا ئەگەر نیشانەكانی بەهێزبن، دەتگەیەنێتە دڵنیایی، وە ئەگەر نیشانەكانی بێهێزبن، لە گومان‌و دوو دڵیی بەو لاوە ناچێ.

كەواتە: وشەی (ظن) بە پێی سیاقەكە تەماشای دەكرێ، جاری وایە بە مانای گومان دێ، وە جاری وایە بە یەقین‌و دڵنیایی‌و زانیاریی تەواو دێ.

(مَلْجَأَ): بە مانای پەناگە (ملاذ) دێ، (لَجَأَ إِلى كَذَا، إِلتَجَأَ ولاذَ بِهِ وَاعْتَصَمَ بِهِ).

(لَجَأَ إِلى كَذَا) واتە: پەنای پێبردو لەوێدا خۆی حەواندەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خواری ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾.

(إبن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (المصباح المُنير في تهذيب تفسير إبن كثير)[1]، هەروەها (طبري) لە (جامع البين)ەکەی خۆی دا[2]، گوتوویانە: (قَالَ مُجَاهِد وَغَيْرُ وَاحِد: نَزَلَتْ هَذِهِ الآية فِي غَزْوَة تبوك، وَذَلِكَ أَنَّهُمْ خَرَجُوا إِلَيْها فِي شِدَّةٍ مِنَ الأَمْرِ، فِي سَنَةٍ مُجدِبَةٍ، وَحَرّ شَدِيدٍ، وَعُسْرٍ مِنَ الزَّاد وَالمَاءِ).

واتە: موجاهیدو جگە لەویش گوتوویانە: ئەم ئایەتە دەربارەی جەنگی تەبووک هاتە خوار، چونکە لە کاتێکدا ئەوان دەرچوون بۆ جەنگی تەبووک، (واتە: پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەرێزی خوا لێیان ڕازی بێ) ومزعێکی زۆر سەغڵەتیی بوو، ساڵەکە ساڵێکی زۆر گرانییو قاتو قڕیی بوو بەرهەمو بەروبووم کەم بوو، وە کەشی ساڵ زۆر گەرم بوو (واپێدەچێ لە مانگی تەمووزدا بوو بێ) هەروەها زۆر تەنگ دەستیی بوو، لە ڕووی زادو زەخیرەوە، وە زۆر بێ ئاویی بوو، بۆیە خوا ناوی ناوە: ﴿ سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ ﴾.

٢) ئەم ئایەتەیان کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ ...﴿١١٨﴾ ﴾، وە خوا تەوبەی وەرگرت لەو سێیانەی دواخرابوون، واتە: بڕیار لەبارەیانەوە دواخرابوو،

١) ص ٥٩٤.

٢) ص ٥٤٠.

ئەوەش دیارە دەربارەی کەعبی کوڕی مالیكو مەڕارەی کوڕی ڕەبیعو هیلالی کوڕی ئومەییە، هاتۆتە خوار وەك بوخارییو موسلیم بەسەرهاتەکەیان هێناوە، هەروەها (إبن هشام)یش هەر دەقی ئەوەی کە لە صەحیحی بوخارییو موسلیمدا هاتوە. هێناویەتی لە (سيرة النبويّة)دا[1]، ئەو بەسەرهاتەی بە درێژی هێناوە، لە ژێر ناونیشانی: (أمر الثلاثة الّذين خُلّفوا وَ أمر مُعَذِرين في غَزوة تبوك) یانی: حاڵی ئەو سێیانەی کە دواخرابوون، وە حاڵی ئەوانەی کە هاتن داوای لێبوردنیان دەکردو پاساویان دەهێنایەوە، لە جەنگی تەبووك دا.

---

١) صحيح البخاري: ٤٦٧٧، وە (لسيرة النبوية) لابن هشام، ج ٤، ص ٣٠٣-٣٠٨.

# بەسەرهاتی کەعبی کوڕی مالیک و دوو هاوەڵەکەی

(إبن هشام) ئاوا دەیهێنێ:

{قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: فَذَكَرَ الزُّهْرِيُّ مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ أَبَاهُ عَبْدَ اللَّهِ، وَكَانَ قَائِدَ أَبِيهِ حِينَ أُصِيبَ بَصَرُهُ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَحَدِيثَ صَاحِبَيْهِ، قَالَ: مَا تَخَلَّفْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا قَطُّ، غَيْرَ أَنِّي كُنْتُ قَدْ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي غَزْوَةِ بَدْرٍ، وَكَانَتْ غَزْوَةً لَمْ يُعَاتِبِ اللَّهُ وَلا رَسُولُهُ أَحَدًا تَخَلَّفَ عَنْهَا، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إنَّمَا خَرَجَ يُرِيدُ عِيرَ قُرَيْشٍ، حَتَّى جَمَعَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ عَدُوِّهِ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ، وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْعَقَبَةَ، وَحِينَ تَوَاثَقْنَا عَلَى الإِسْلامِ، وَمَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ، وَإِنْ كَانَتْ غَزْوَةُ بَدْرٍ هِيَ أَذْكَرُ فِي النَّاسِ مِنْهَا. قَالَ: كَانَ مِنْ خَبَرِي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ أَنِّي لَمْ أَكُنْ قَطُّ أَقْوَى وَلا أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي تِلْكَ الْغَزْوَة، وو الله مَا اجْتَمَعَتْ لِي رَاحِلَتَانِ قَطُّ حَتَّى اجْتَمَعَتَا فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَلَّمَا يُرِيدُ غَزْوَةً يَغْزُوهَا إلاّ وَرَّى بِغَيْرِهَا، حَتَّى كَانَتْ تِلْكَ الْغَزْوَةُ، فَغَزَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا، وَاسْتَقْبَلَ غَزْوَ عَدُوٍّ كَثِيرٍ، فَجَلَّى لِلنَّاسِ أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا لِذَلِكَ أُهْبَتَهُ وَأَخْبَرَهُمْ خَبَرَهُ بِوَجْهِهِ الَّذِي يُرِيدُ، وَالْمُسْلِمُونَ مَنْ تَبِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَثِيرٌ، لَا يَجْمَعُهُمْ كِتَابٌ حَافِظٌ، يَعْنِي بِذَلِكَ الدِّيوَانَ، يَقُولُ: لا يَجْمَعُهُمْ دِيوَانٌ مَكْتُوبٌ.

قَالَ كَعْبٌ: فَقَلَّ رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَتَغَيَّبَ إلَّا ظَنَّ أَنَّهُ سَيَخْفَى لَهُ ذَلِكَ، مَا لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْيٌ مِنْ اللَّهِ، وَغَزَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تِلْكَ الْغَزْوَةِ حِينَ طَابَتْ الثِّمَارُ وَأُحِبَّتْ الظِّلَالُ، فَالنَّاسُ إلَيْهَا صُعْرٌ، فَتَجَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَتَجَهَّزَ الْمُسْلِمُونَ مَعَهُ، وَجَعَلْتُ أَغْدُو لِأَتَجَهَّزَ مَعَهُمْ، فَأَرْجِعُ وَلَمْ أَقْضِ حَاجَةً، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي، أَنَا قَادِرٌ عَلَى ذَلِكَ إذَا أَرَدْتُ،

فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِي حَتَّى شَمَّرَ النَّاسُ بِالْجِدِّ، فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَادِيًا، وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ، وَلَمْ أَقْضِ مِنْ جَهَازِي شَيْئًا، فَقُلْتُ: أَتَجَهَّزُ بَعْدَهُ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، ثُمَّ أَلْحَقُ بِهِمْ، فَغَدَوْتُ بَعْدَ أَنْ فَصَلُوا لِأَتَجَهَّزَ، فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا، ثُمَّ غَدَوْتُ فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِي حَتَّى أَسْرَعُوا، وَتَفَرَّطَ الْغَزْوُ، فَهَمَمْتُ أَنْ أَرْتَحِلَ، فَأُدْرِكَهُمْ، وَلَيْتَنِي فَعَلْتُ، فَلَمْ أَفْعَلْ، وَجَعَلْتُ إِذَا خَرَجْتُ فِي النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَطُفْتُ فِيهِمْ، يَحْزُنُنِي أَنِّي لَا أَرَى إِلَّا رَجُلًا مَغْمُوصًا عَلَيْهِ فِي النِّفَاقِ، أَوْ رَجُلًا مِمَّنْ عَذَرَ اللَّهُ مِنَ الضُّعَفَاءِ، وَلَمْ يَذْكُرْنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى بَلَغَ تَبُوكَ، فَقَالَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْقَوْمِ بِتَبُوكَ: مَا فَعَلَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حَبَسَهُ بُرْدَاهُ، وَالنَّظَرُ فِي عِطْفَيْهِ، فَقَالَ لَهُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: بِئْسَ مَا قُلْتَ! وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلِمْنَا مِنْهُ إِلَّا خَيْرًا، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. فَلَمَّا بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ تَوَجَّهَ قَافِلًا مِنْ تَبُوكَ، حَضَرَنِي بَثِّي، فَجَعَلْتُ أَتَذَكَّرُ الْكَذِبَ وَأَقُولُ: بِمَاذَا أَخْرُجُ مِنْ سَخْطَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَدًا وَأَسْتَعِينُ عَلَى ذَلِكَ كُلَّ ذِي رَأْيٍ مِنْ أَهْلِي، فَلَمَّا قِيلَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ أَظَلَّ قَادِمًا زَاحَ عَنِّي الْبَاطِلُ، وَعَرَفْتُ أَنِّي لَا أَنْجُو مِنْهُ إِلَّا بِالصِّدْقِ، فَأَجْمَعْتُ أَنْ أَصْدُقَهُ، وَصَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَكَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ، فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَعَلَ ذَلِكَ، جَاءَهُ الْمُخَلَّفُونَ، فَجَعَلُوا يَحْلِفُونَ لَهُ وَيَعْتَذِرُونَ، وَكَانُوا بِضْعَةً وَثَمَانِينَ رَجُلًا، فَيَقْبَلُ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَانِيَتَهُمْ وَأَيْمَانَهُمْ، وَيَسْتَغْفِرُ لَهُمْ، وَيَكِلُ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى. حَتَّى جِئْتُ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَتَبَسَّمَ تَبَسُّمَ الْمُغْضَبِ، ثُمَّ قَالَ لِي: تَعَالَهْ، فَجِئْتُ أَمْشِي، حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ لِي: مَا خَلَّفَكَ؟

أَلَمْ تَكُنْ ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، لَرَأَيْتُ أَنِّي سَأَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذْرٍ، وَلَقَدْ أُعْطِيتُ جَدَلًا، وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثْتُكَ الْيَوْمَ حَدِيثًا كَذِبًا لَتَرْضَيَنَّ عَنِّي، وَلَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يُسْخِطَكَ عَلَيَّ، وَلَئِنْ حَدَّثْتُكَ حَدِيثًا صِدْقًا تَجِدُ عَلَيَّ فِيهِ، إِنِّي لَأَرْجُو عُقْبَايَ مِنَ اللَّهِ فِيهِ، وَلَا وَاللَّهِ مَا كَانَ لِي عُذْرٌ، وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَقْوَى وَلَا أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ صَدَقْتَ فِيهِ، فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِيكَ. فَقُمْتُ، وَثَارَ مَعِي رِجَالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ، فَاتَّبَعُونِي فَقَالُوا لِي: وَاللَّهِ مَا عَلِمْنَاكَ كُنْتَ أَذْنَبْتَ ذَنْبًا قَبْلَ هَذَا، وَلَقَدْ عَجَزْتَ أَنْ لَا تَكُونَ اعْتَذَرْتَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمَا

اعْتَذَرَ بِهِ إِلَيْهِ الْمُخَلَّفُونَ، قَدْ كَانَ كَافِيكَ ذَنْبُكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللهِ ﷺ لَكَ فواللّهِ مَا زَالُوا بِي حَتَّى أَرَدْتُ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ، فَأُكَذِّبَ نَفْسِي، ثُمَّ قُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَقِيَ هَذَا أَحَدٌ غَيْرِي؟ قَالُوا: نَعَمْ، رَجُلَانِ قَالَا مِثْلَ مَقَالَتِكَ، وَقِيلَ لَهُمَا مِثْلَ مَا قِيلَ لَكَ، قُلْتُ: مَنْ هُمَا؟ قَالُوا: مُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعِ الْعَمْرِيُّ، مِنْ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَهِلَالُ بْنُ (أَبِي) أُمَيَّةَ الْوَاقِفِيُّ، فَذَكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ ، فِيهِمَا أُسْوَةٌ، فَصَمَتُّ حِينَ ذَكَرُوهُمَا لِي، وَنَهَى رَسُولُ اللّهِ ﷺ عَنْ كَلَامِنَا أَيُّهَا الثَّلَاثَةُ، مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ، فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ، وَتَغَيَّرُوا لَنَا، حَتَّى تَنَكَّرَتْ لِي نَفْسِي وَالْأَرْضُ، فَمَا هِيَ بِالْأَرْضِ الَّتِي كُنْتُ أَعْرِفُ، فَلَبِثْنَا عَلَى ذَلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، فَأَمَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَا، وَقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا، وَأَمَّا أَنَا فَكُنْتُ أَشَبَّ الْقَوْمِ وَأَجْلَدَهُمْ، فَكُنْتُ أَخْرُجُ، وَأَشْهَدُ الصَّلَوَاتِ مَعَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَطُوفُ بِالْأَسْوَاقِ، وَلَا يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ، وَآتِي رَسُولَ اللّهِ ﷺ، فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي، هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلَامِ عَلَيَّ أَمْ لَا؟ ثُمَّ أُصَلِّي قَرِيبًا مِنْهُ، فَأُسَارِقُهُ النَّظَرَ، فَإِذَا أَقْبَلْتُ عَلَى صَلَاتِي نَظَرَ إِلَيَّ، وَإِذَا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ أَعْرَضَ عَنِّي، حَتَّى إِذَا طَالَ ذَلِكَ عَلَيَّ مِنْ جَفْوَةِ الْمُسْلِمِينَ، مَشَيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ. وَهُوَ ابْنُ عَمِّي، وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ، فسلّمت عَلَيْهِ، فو الله مَا رَدَّ عَلَيَّ السَّلَامَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا قَتَادَةَ، أَنْشُدُكَ بِاللّه، هَلْ تَعْلَمُ أَنِّي أُحِبُّ اللّهَ وَرَسُولَهُ؟ فَسَكَتَ. فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ، فَسَكَتَ عَنِّي، فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ، فَسَكَتَ عَنِّي، فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ، فَقَالَ: اللّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَفَاضَتْ عَيْنَايَ، وَوَثَبْتُ فَتَسَوَّرْتُ الْحَائِطَ، ثُمَّ غَدَوْتُ إِلَى السُّوقِ، فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي بِالسُّوقِ، إِذَا نَبَطِيٌّ يَسْأَلُ عَنِّي مِنْ نَبَطِ الشَّامِ، مِمَّنْ قَدِمَ بِالطَّعَامِ يَبِيعُهُ بِالْمَدِينَةِ، يَقُولُ: مَنْ يَدُلُّ عَلَيَّ كَعْبَ ابْنَ مَالِكٍ؟ قَالَ: فَجَعَلَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ إِلَيَّ، حَتَّى جَاءَنِي، فَدَفَعَ إِلَيَّ كِتَابًا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ، وَكَتَبَ كِتَابًا فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَإِذَا فِيهِ: (أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنَا أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ، وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلَا مَضْيَعَةٍ، فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ). قَالَ: قُلْتُ حِينَ قَرَأْتُهَا: وَهَذَا مِنَ الْبَلَاءِ أَيْضًا، قَدْ بَلَغَ بِي مَا وَقَعْتُ فِيهِ أَنْ طَمِعَ فِيَّ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ. قَالَ: فَعَمَدْتُ بِهَا إِلَى تَنُّورٍ، فَسَجَرْتُهُ بِهَا. فَأَقَمْنَا عَلَى ذَلِكَ حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ لَيْلَةً مِنَ الْخَمْسِينَ إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللّهِ يَأْتِينِي، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ، قَالَ: قُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا؟ قَالَ: لَا، بَلْ اعْتَزِلْهَا وَلَا تَقْرَبْهَا، وَأَرْسَلَ إِلَيَّ صَاحِبِي بِمِثْلِ ذَلِكَ، فَقُلْتُ

لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكَ، فَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِي هَذَا الأَمْرِ مَا هُوَ قَاضٍ. قَالَ: وَجَاءَتْ امْرَأَةُ هِلالِ بْنِ أُمَيَّةَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هِلالَ بْنَ أُمَيَّةَ شَيْخٌ كَبِيرٌ ضَائِعٌ لا خَادِمَ لَهُ، أَفَتَكْرَهُ أَنْ أَخْدِمَهُ؟ قَالَ: لا، وَلَكِنْ لا يَقْرَبَنَّكِ، قَالَتْ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا بِهِ مِنْ حَرَكَةٍ إِلَيَّ، وَاللَّهِ مَا زَالَ يَبْكِي مُنْذُ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ إِلَى يَوْمِهِ هَذَا، وَلَقَدْ تَخَوَّفْتُ عَلَى بَصَرِهِ. قَالَ: فَقَالَ لِي بَعْضُ أَهْلِي: لَوْ اسْتَأْذَنْتَ رَسُولَ اللَّهِ لِامْرَأَتِكَ، فَقَدْ أَذِنَ لِامْرَأَةِ هِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ أَنْ تَخْدُمَهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لا أَسْتَأْذِنُهُ فِيهَا، مَا أَدْرِي مَا يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِي فِي ذَلِكَ إِذَا اسْتَأْذَنْتُهُ فِيهَا، وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ. قَالَ: فَلَبِثْنَا بَعْدَ ذَلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ، فَكَمُلَ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً، مِنْ حِينِ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلَامِنَا، ثُمَّ صَلَّيْتُ الصُّبْحَ، صُبْحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا، عَلَى الْحَالِ الَّتِي ذَكَرَ اللَّهُ مِنَّا، قَدْ ضَاقَتْ عَلَيْنَا الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ، وَضَاقَتْ عَلَيَّ نَفْسِي، وَقَدْ كُنْتُ ابْتَنَيْتُ خَيْمَةً فِي ظَهْرِ سَلْعٍ، فَكُنْتُ أَكُونُ فِيهَا إِذْ سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ أَوْفَى عَلَى ظَهْرِ سَلْعٍ يَقُولُ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا كَعْبُ بْنَ مَالِكٍ، أَبْشِرْ، قَالَ: فَخَرَرْتُ سَاجِدًا، وَعَرَفْتُ أَنْ قَدْ جَاءَ الْفَرَجُ.

(تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ):

قَالَ: وَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى الْفَجْرَ، فَذَهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا، وَذَهَبَ نَحْوَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ، وَرَكَضَ رَجُلٌ إِلَيَّ فَرَسًا، وَسَعَى سَاعٍ مِنْ أَسْلَمَ، حَتَّى أَوْفَى عَلَى الْجَبَلِ، فَكَانَ الصَّوْتُ أَسْرَعَ مِنْ الْفَرَسِ، فَلَمَّا جَاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي، نَزَعْتُ ثَوْبَيَّ، فَكَسَوْتُهما إِيَّاهُ بِشَارَةً، وَاللَّهِ مَا أَمْلِكُ يَوْمَئِذٍ غَيْرَهُمَا، وَاسْتَعَرْتُ ثَوْبَيْنِ فَلَبِسْتهما، ثُمَّ انْطَلَقْتُ أَتَيَمَّمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَتَلَقَّانِي النَّاسُ يُبَشِّرُونَنِي بِالتَّوْبَةِ، يَقُولُونَ: لِيَهْنِكَ تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ، حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ حَوْلَهُ النَّاسُ، فَقَامَ إِلَيَّ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، فحيّانى وهنّأني، وو الله مَا قَامَ إِلَيَّ رَجُلٌ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرُهُ. قَالَ: فَكَانَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ لَا يَنْسَاهَا لِطَلْحَةِ.

قَالَ كَعْبٌ: فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِي، وَوَجْهُهُ يَبْرُقُ مِنْ السُّرُورِ: أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ، قَالَ: قُلْتُ: أَمِنْ عِنْدَكَ يَا رَسُولَ أَمْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ؟ قَالَ: بَلْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَبْشَرَ كَأَنَّ وَجْهَهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ. قَالَ: وَكُنَّا نَعْرِفُ ذَلِكَ مِنْهُ.

قَالَ: فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي، صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي مُمْسِكٌ سَهْمِي الَّذِي بِخَيْبَرَ، وَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ نَجَّانِي بِالصِّدْقِ، وَإِنَّ مِنْ تَوْبَتِي إِلَى اللَّهِ أَنْ لا أُحَدِّثَ إِلاَّ صِدْقًا مَا حَيِيتُ، وَاللَّهِ مَا أَعْلَمُ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ أَبْلاهُ اللَّهُ فِي صِدْقِ الْحَدِيثِ مُنْذُ ذَكَرْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ أَفْضَلَ مِمَّا أَبْلانِي اللَّهُ، وَاللَّهِ مَا تَعَمَّدْتُ مِنْ كَذْبَةٍ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى يَوْمِي هَذَا، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِي اللَّهُ فِيمَا بَقِيَ. وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {لَقَدْ تابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهاجِرِينَ وَالأَنْصارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي ساعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ، ثُمَّ تابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُفٌ رَحِيمٌ، وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا ... إِلَى قَوْلِهِ: وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ} .

قَالَ كَعْب: فو الله مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ نِعْمَةً قَطُّ بَعْدَ أَنْ هَدَانِي لِلإِسْلامِ كَانَتْ أَعْظَمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ، أَنْ لا أَكُونَ كَذَبْتُهُ، فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا، فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ فِي الَّذِينَ كَذَّبُوهُ حِينَ أَنْزَلَ الْوَحْيَ شَرَّ مَا قَالَ لِأَحَدٍ، قَالَ: {سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انْقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ، فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ، إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْواهُمْ جَهَنَّمُ جَزاءً بِما كانُوا يَكْسِبُونَ. يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ، فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لا يَرْضى عَنِ الْقَوْمِ الْفاسِقِينَ} .

قَالَ: وَكُنَّا خُلِّفْنَا أَيُّهَا الثَّلاثَةُ عَنْ أَمْرِ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ قَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حِينَ حَلَفُوا لَهُ فَعَذَرَهُمْ، وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، وَأَرْجَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَمْرَنَا، حَتَّى قَضَى اللَّهُ فِيهِ مَا قَضَى، فَبِذَلِكَ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا} وَلَيْسَ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ مِنْ تَخْلِيفِنَا لِتَخَلُّفِنَا عَنْ الْغَزْوَةِ وَلَكِنْ لِتَخْلِيفِهِ إِيَّانَا} .

واتە: ئیبنو ئیسحاق گوتوویەتی:

{زوهری (موحەممەدی کوڕی موسلیم کوڕی شیهاب) لە عەبدورڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، خوا لێیان ڕازی بێ، هێناویەتی، گوتوویەتی: عەبدوڵڵای بابی، واتە: عەبدوڵڵا بۆ عەبدورڕەحمانی باس کردوە، کە عەبدوڵڵاش دەستکێشی بابی بووە، واتە: دەستکێشی کەعبی کوڕی مالیک بووە، دوای ئەوەی کە

چاوی نەماون، چاوی لەدەست داون، گوتوویەتی: گوێم لە بابم {کەعبی کوڕی مالیك} بوو کە بەسەرهاتی خۆی دەربارەی بەجێمانی لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبووکدا، دەگێڕایەوە، وە بەسەرهاتی دوو هاوەڵەکەی مەرارەی کوڕی ڕەبیعو هیلالی کوڕی ئومەییەی دەگێڕایەوە بەو شێوەیە گێڕایەوە:

کەعب دەڵێ: من لە هیچ جەنگێك لەو جەنگانەدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوونی هەرگیز لێی بەجێ نەماوم، لە هەموو جەنگەکاندا بەشدار بووم، تەنیا لە جەنگی بەدردا، بەجێمام ئەویش جەنگێك بوو، کە خوا سەرزەنشتی کەسی نەکرد، هەروەها پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کەسی نەکرد، کە بەجێمابوون، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەرچوو بۆ جەنگی بەدر، بەتەمای ڕێ گرتن بە کاروانی قوڕەیشییەکان بوو، هەتا بێئەوەی کە بیانەوێ، بەبێ مەوعید دانان، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی لەگەڵ دوژمنەکەیدا، (واتە: سوپای قوڕەیشییەکان بە فەرماندەیەتیی ئەبو جەهل) کۆی کردنەوە، کەعب دەڵێ: ئەگەرنا من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ کاتێك کە پەیمانمان لەگەڵ بەست لە عەقەبە (کە مەبەستی پێ پەیمانی عەقەبەی دووەمە)، لەوێ بە خزمەت پێغەمبەری خوا گەیشتم، (واتە: هەر لەو کاتەوە) کە حەزم نەدەکرد ئامادە بوونم لە پەیمانی عەقەبە، بیگۆڕمەوە بە ئامادە بوونم لە جەنگی بەدردا، (واتە: ئەوم پێ گرنگتر بوو، کە بەڕاستیی گرنگتریش بووە، چونکە سەرەتای ئەو گرێبەستە کۆمەڵایەتییە بووە، لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەكو، مسوڵمانانی مەدینە لەلایەکی دیکەوەدا بەستراوە) هەرچەندە جەنگی بەدر زیاتر لە نێو خەڵکدا باسکراوەو ناوو شۆرەتی زیاتر بووە.

دەڵێ: هەواڵی من لە کاتێك کە من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێمام لە جەنگی تەبووکدا، ئەوە بوو کە من هیچ کاتێك لەو کاتە، بەهێزتر نەبووم، وە هیچ کاتێك لەو کاتە، دەستڕۆیشتووتر نەبووم لە ڕوویماڵو سامانەوە، کاتێك کە لەو جەنگە بەجێمام (واتە: بەهۆی نەخۆشیی، یان بەهۆی تەنگ دەستیی بەجێنەمام) وە سوێند بە خوا هیچ کاتێکیش من دوو وڵاخی سوارییم نەبوون، دوو حوشتری سواریی‌و بارەبەر (هەم بۆ بار، هەم بۆ سواریی، لەو جەنگەدا خاوەنی دوو حوشتران بووم، کە دیارە حوشتری ئەو کاتە، لە جێی سەیارەی زۆر مۆدیل بەرزی ئەم ڕۆژگارەی ئێمە بووە، وەك چۆن یەکێ دەڵێ: ئێمە دوو سەیارەمان، هەن ئەویش دەڵێ: دوو

خوشترم هەبوون) وە پێغەمبەری خوا ﷺ کەمتر وابوو بچێ بۆ جەنگێك، مەگەر ئاماژەی دەکرد بە شوێنێکی دیکە، (نەك ئەو شوێنەی کە مەبەستە، بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن بیستی، وەك جۆرێك لە سەرلێشێواندن بێ بۆ دوژمن‌و، نەزانێ کە ڕاستەوخۆ بەرەو ئەوێ دەچێ، بۆ وێنە: ئەگەر بەرەو لای ڕاست چووبایە، قسەیەکی دەکرد، کە خەڵك وابزانێ بۆ لای چەپ دەچێ).

بەڵام بەنسبەت جەنگی تەبووکەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە ڕوونیی مەبەست‌و ئامانجەکەی خۆی بە هاوەڵانی گوت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کە گەرمایەکی زۆر بوو، وە سەفەرێکی دوور بوو، وە بەرەو ڕووی دوژمنێك دەچوو، کە ژمارەیان زۆر بوو، کە ڕۆمەکان بوون، بۆیە زۆر بە ڕوونیی بە خەڵکی فەرموو، تاکو خۆیانی بۆ ئامادە بکەن.

مسوڵمانانێکیش کە دوای پێغەمبەری خوا کەوتن ﷺ بۆ جەنگ، کە ژمارەیان زۆر بوو، هیچ لیستێك نەیدەگرتنەوە ((واتە: هێندە زۆر بوون، کە ژمارەیان تۆمار نەکراوە، کە بە پێی هەندێك ڕیوایەت دەڵێ: ژمارەی سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺ سی هەزار (٣٠٠٠٠) کەس بووە)).

کەعب دەڵێ: بۆیە ئەگەر هەر کەسێك دیارنەبووایەو ئامادە نەبووایە بۆ ئەو جەنگە، گومانی وابوو کە ئەو شتە دەشاردرێتەوەو پەنهان دەبێ، چونکە خەڵکێکی زۆر زۆر بوو (واتە: تێدا ون دەبوو)، بە مەرجێك ئەو کەسەی کە نەچووە، وەحی خوای پەنهانزانی دەربارە نەیەتە خوار، وە پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئەو جەنگەی کرد، کە میوە پێگەیشت بوون، وە سێبەر خۆشەویست بوو بوون، وە خەڵك حەزیان دەکرد بچنە بەر سێبەران.

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادە کرد، وە مسوڵمانانیش لەگەڵیدا خۆیان ئامادە کرد، منیش چوومەوە تاکو خۆم ئامادە بکەم‌و بۆ ئەو جەنگە بچم، ئیدی پێغەمبەر ﷺ‌و ئەوان خەریکی خۆ ئامادە کردن بوون، منیش هەر دەچوومەوە ماڵێ‌و ئیشەکەم بەدەستەوە نەدەهات، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: من لە توانامدا هەیە، هەرکاتێ ویستم خۆ ئامادە دەکەم، ئیدی هەر بەو شێوەیە کاتەکە درێژەی کێشا، هەتا خەڵك قۆڵیان هەڵماڵی‌و خەریکی بەڕێ کەوتن بوون، وە پێغەمبەر ﷺ

بەرێ كەوت، هەروەها مسوڵمانانیشی لەگەڵیدا، منیش جارێ هیچم نەكردوەو خۆم ئامادە نەكردوە، هەر دەمگوت: دوای پێغەمبەر ﷺ منیش بە ڕۆژێك دوو ڕۆژان خۆم ئامادە دەكەم، دوایی بە خزمەت پێغەمبەری خوا دەگەمەو پێیان دەگەمەوە.

ئنجا دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن هەر دەچووم خۆم ئامادە بكەم، دیسان چوومەوەو هیچم نەكرد، (واتە: خۆم ئامادە نەكردو بەرێ نەكەوتم) دوایی هەر چوومەوە هیچم نەكرد، بەو شێوەیە هەتا ئەوان ڕۆیشتن‌و بەرێ كەوتن‌و دوور كەوتنەوە.

ئنجا ویستم بەرێ بكەوم‌و وڵاخەكەم بێنم‌و باری لێ بنێم بۆ ئەوەی فریایان بكەوم، خۆزگە واشم كردبایە، بەڵام دیسان ئەوەشم نەكرد، وەك گوتراوە: (پێیەكی دەبردە پێشێ، پێیەكی دەهێنایە دوا).

ئنجا دوای ئەوەی ڕۆیشتن، كە چوومەدەر بۆ نێو خەڵكی‌و بە نێو خەڵكیدا گەڕام، ئەوە دڵتەنگی كردم، كە تەنیا پیاوێكم دەبینی كە تۆمەتبار كراوە، بەوەی مونافیقە، ئەهلی نیفاقە، وە تەنیا كەسانێكم دەبینی، كە خەڵكی بێهێزو بێ توانان، وە پۆزشیان هێناوەتەوەو خوای پەروەردگار عوزری قبوڵ كردوون.

دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ باسی منی نەكردبوو تاكو گەیشتبوونە تەبووك، لەوێ كە دادەنیشێ لە نێو كۆمەڵێكدا دەفەرموێ: كەعبی كوڕی مالیك چی كرد؟ پیاوێكیش لە بەنی سەلەمە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! بەرگ‌و پۆشاكە جوانەكەی خۆی‌و، تەماشاكردنی ئەملاو ئەولای شانی (واتە: ئەوە كە ماڵ‌و سامانی هەیەو فیزو كەشخەی لێداوە) ئەوە وایكردوە كە نەیەت، موعازی كوڕی جەبەلیش، دەڵێ: تۆ قسەیەكی خراپت كرد، بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە جگە لە چاكە لێمان نەزانیوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بێدەنگ بووە.

ئنجا كاتێك بیستم كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبووكەوە دەگەڕێتەوە، (واتە: بەرەو مەدینە) ئنجا خەم‌و خەفەتم زۆر هاتە دڵ، وە بیرم لەوە كردەوە: كە ئایا چۆن لە تووڕەیی پێغەمبەری ﷺ بچمە دەرێ، بەیانی كە دێتەوە؟ وە ڕاوێژم دەكرد بە هەموو ئەوانەی كە خاوەن عەقڵ‌و خاوەن بۆچوونی چاك بوون، لە خزم‌و كەسم كە چی بڵێم چاكە، درۆ بكەم، ڕاست بكەم؟ دەڵێ كاتێك كە گوتیان: ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ خەریكە بگاتەوە جێ، هەرچی باتڵ بوو، لە دڵمدا لاچوو، (واتە:

ئەوە کە پەنا ببەمە بەر درۆو دەلەسە)، وە زانیم کە من بە ڕاستگۆیی نەبێ دەرباز نابم‌و ڕزگارم نابێ، ئیدی بڕیارم دا کە ڕاستیی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بڵێم .

ئنجا پێغەمبەری خوا دەمەو بەیان گەیشتەوە مەدینە.

کاتێك کە گەیشتە مەدینە، عادەتی وابوو کە دەهاتەوە لە سەفەرێ، دەچووە مزگەوتێ، دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکردن، دوایی دادەنیشت لە نێو خەڵکیدا، کاتێك کە بەو شێوەیە چووە مزگەوت‌و دانیشت لە نێو خەڵکی، ئەوانەی کە بەجێمابوون، دەچوون بۆ خزمەتی‌و سوێندیان بۆ دەخواردو پۆزشیان بۆ دەهێنایەوە، کە ژمارەیان هەشتاو ئەوەندە پیاوە بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ وەك ڕواڵەتی خۆیان کە دەیانگوت: عوزرمان هەبوو، {یەك دەیگوت نەخۆش بووم، یەك دەیگوت: پارەم نەبوو، یەك دەیگوت: وڵاخم نەبوو، یەك دەیگوت: لە فلان عەشیرەتە ترساوم، بێنە سەر ماڵ‌و حاڵم} مامەڵەی لەگەڵدا کردن، وە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا دەکردن‌و نهێنییەکانیشی حەواڵەی خوای پەنهانزان کردن.

دەڵێ: ئنجا منیش چووم بۆ خزمەتی‌و سەلامم لێکردو پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی هاتێ، وەك زەردەخەنەی کەسێکی تووڕە، دوایی پێی فەرمووم: وەرە پێش، منیش چووم هەتا لە پێشی دانیشتم، پێی فەرمووم: چ شتێك تۆی بەجێهێشت، ئەدی وڵاخی بارەبەرت نەکڕیبوو؟ (واتە: وڵاخی بارو سوارییت نەبوو؟) منیش گوتم: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر لەلای غەیری تۆ دانیشتبام، لە خەڵکی دنیا دەمزانی چۆن خۆم لە تووڕەیی ئەو، بە پۆزش هێنانەوەیەك دەرباز دەکەم، وە بایی ئەوەندەش ڕەوانبێژیی‌و قسەزانییم هەیە، بەڵام بە خوا دەزانم ئەگەر ئەمڕۆ درۆت لەگەڵدا بکەم، بۆئەوەی لێم ڕازی بی، نیزیکە خوا ﷻ دوایی وابکات تۆم لێ تووڕە بی، وە ئەگەر ئێستا قسەیەکت بۆ بکەم کە ڕاست بێ، بەڵام دڵی تۆی پێ نیگەران بێ، ئومێدم وایە کە سەرەنجامم خێر بێ.

بە خوا من هیچ بیانوویێکم نەبوو، وە هەرگیز هیچ کاتێك لەمجارەم بەهێزتر نەبووم، وە لە رووی داراییەوە حاڵم باشتر نەبووە، کە لە تۆ بەجێماوم، (واتە: بەجێماوم‌و کەمتەرخەمییم کردوەو تەواو)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوەی کە گوتت ڕاستت کرد، دە هەڵسە تاکو خوا لەبارەی تۆوە بڕیار دەدا!

منیش هەڵسام، وە کۆمەڵێك لە پیاوانی بەنی سەلەمە، (واتە: لە هۆزمزکەی خۆی) بە دوام کەوتن‌و پێیان گوتم نەمانزانیـوە کە پێش ئەو گوناهە، کە تۆ گوناهت کردبێ، وە تۆ دەستـەپاچە بووی، کە پۆزش بۆ پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بێـنیـەوە، بەو شێوەیەی کە ئـەوانەی بـەجێـمابوون، پۆزشیـان بۆ هێـنایـەوە، بۆ گوناهـەکەشت ئەوەندە بـۆ تـۆ بەس بوو، کە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ داوای لـێبوردنت بۆ بکات !!

بە خوا هەر وا لەگەڵم خەریك بوون، هەتا نزیك بوو بگەڕێمەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو خۆم بە درۆ بخەمەوەو، بڵێم ئەی پێغـەمبـەری خـوا ! منـیش بـەهۆی ئـەو شـتەو ئەو شـتەوە بەجێماوم.

دوایی پێم گـوتن: ئایا جگە لە من، کەسی دیکە ئەو هـەڵوێسـتەی بووە؟!

گوتیان: بەڵێ دوو پیاوی دیکەش، هـەمان قسـەی تۆیان کـردوە، وە هـەمان شـت کـە بە تـۆ گـوتراوە، بەوانیـش گـوتراوە.

گوتم: ئـەو دوانـە کـێـن ؟!

گـوتیـان (مرارة ابن عـمرو من بنـي عمرو ابن عوف، و هلال إبن أُميـة الواقفي).

دوو پیاویان بۆ ناو بردم، کە دوو پیاوی چاك بوون، بۆ من شـایستە بوون کە بچـم تەماشایان بکەم‌و بیانکەمە سەرمەشق، بۆیە منیش بێدەنگ بووم، کاتێ ئەو دووانەیان بۆ باس کردم (واتە: لەسەر هەڵوێستەکەی خۆم کە ڕاسـتی گوتنە، بەردەوام بووم).

وە پێغـەمبەری خـوا ﷺ قەدەغـەی کـرد، کـە قسـە لەگـەڵ ئـەو سـێیاندانەماندا بکرێ، لە نێـو ئەو هـەموو خەڵـکەدا کە بـەجێمابوون، ئەوانـەی کە بـە درۆ عوزریـان هێنایەوە دەهاتن‌و دەچوون‌و خەڵك قسەی لەگەڵدا دەکردن‌و قسەیان لـێ دانەبڕیبوون، بەڵام ئەو سـێیەمان، پێغـەمبەر ﷺ فـەرمووی: نابـێ کـەس بیانـدوێنێ، بۆیـە خـەڵك دووریـان لـێ کردین، وە خەڵك لەگەڵمان گۆڕان، هەتا وام لێهات کە کەوڵی خـۆم لـێ وەتەنگ هات، وە زەوییم لـێ وەتـەنگ هات ئەو دنیاو زەوییـەی کـە پێشتـر دەمبینـی، ئـەوە نەبوو کە من دەمبینی.

ئنجـا بـەو شـێوەیـە پـەنجـا (٥٠)شـەو ماینـەوە. بـەڵام دوو هـاوەڵـەکەم (واتـە: هیلالـی کوڕی ئومەییـەو مەڕارەی کوڕی ڕەبیع) بە بێـهێزیی‌و سەر کزۆڵـەیی لـە ماڵی

خۆیاندا دانیشتن (ئەوان دیارە بە تەمەنتر بوون)، زۆر بە خەفەتبارییی دانیشتن‌و نەدەچوونە دەرێ، بەلام من چونکە لەوان گەنجتر بووم‌و، بەهێزتر بووم، دەچوومە دەرێ، وە نوێژەکانیشم لەگەڵ مسوڵمانان دا دەکردن، وە بە بازاڕانیشدا دەسووڕامەوە، بەلام کەس قسەی لەگەڵدا نەدەکردم، وە دەچوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی کە نوێژی دەکرد، لە دوای نوێژ دادەنیشت، منیش سلاوم لێ دەکرد، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئایا پێغەمبەر ﷺ لێوی جوولاندن، وەلامی سلاوەکەم بداتەوە، یان نا؟! (واتە: بە ئەسپایی وەلامی داوەتەوە) دوایی لە نیزیك پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم دەکرد، وە لە دەرفەتدا تەماشام دەکرد، کاتێك من دەچوومە نێو نوێژەکەمەوە، هەستم دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشام دەکات، بەلام تەماشای نێو چاوی نەدەکردم، وە کاتێك من ئاوڕم لە پێغەمبەر ﷺ دەدایەوە، ڕووی لێ وەردەگێڕام، ئیدی ئەو دووریی گرتنەی مسوڵمانان لە من، وە قسە نەکردنیان لەگەڵ من، درێژەی کێشا.

تاکو ڕۆژێك چوومە سەر دیواری باغێکی ئەبی قەتادە، کە کوڕە مامم بوو، وە نیزیکترین‌و خۆشەویسترین کەس بوو، لە لام، سلاوم لێکرد، بە خوا وەلامی سلاوەکەی نەدامەوە، گوتم: ئەی ئەبو قەتادە! خوات بە گژدا دەکەم، یان: بە خوا داوات لێ دەکەم، ئایا پێت وایە کە من خواو پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێن؟

بێ دەنگ بوو.

دووبارە پێم گوتەوە: ئایا پێت وایە کە من خواو پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێن؟

دیسان بێ دەنگ بوو.

بۆ جاری سێیەم، دیسان پێم گوتەوە.

ئەویش گوتی: خواو پێغەمبەکەی زاناترن، (ئایا خۆشت دەوێن، یان خۆشت ناوێن).

کە وایگوت، چاوەکانم فرمێسکیان پێدا هات، وە بازمدایە سەر دیوارەکەو هاتمەوە، دوایی هاتم بۆ بازاڕ، لە کاتێکدا من بە بازاڕدا دەڕۆیشتم، بە خەم‌و خەفەتەوە، بابایەکی نەبطیی، (نەبطیی ئەوانە بوون کە شتیان هێناوە لە شامەوە)، تەماشام کرد لە منی دەپرسی، دەیگوت: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پێ پیشان دەدات؟

خەڵكیش ئاماژەیان بۆ كرد بۆ لای من، هەتا هاتە لام، نامەیەكی پێدام لە پادشای غەسسانەوە، لە پارچە قوماشێكی ئاوریشمدا نامەیەكی نووسیبوو، ئەوەی تێدا نووسی بوو:

(أَمَّا بَعْدُ فَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاك، وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللهُ بِدَارِ هَوَانٍ، وَلا مَضْيَعَةٍ، فَالْحَقْ بِنا نُوَاسِيك).

(واتە: دوای ئەوە پێمان گەیشتوە كە هاوەڵەكەت دووریی لە تۆ كردوەو، ناتدوێنێ، خوا تۆی ناچار نەكردوە بە زەبوونیی بژی، وە تۆ بێكەس و بێ شوێن نیی، وەرە بۆ لای ئێمە، ئێمە دڵت دەدەینەوەو ئاگامان لە تۆ دەبێ).

كاتێك كە خوێندمەوە، گوتم: ئەوەش تاقیكردنەوەیەكی دیكەیە، ئایا من گەیشتوومە ڕاددەیەك كە پیاوێك لە ئەهلی شیرك تەماع لە من بكات؟! بۆیە یەكسەر نامەكەم بردو خستمە نێو تەندوورێ و، سووتاندم.

ئنجا بەو شێوە ماینەوە، تاكو چل شەو لە پەنجا شەوەكە ڕۆیشتن، دوای ئەوە كە چل شەو ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ نوێنەرێكی ناردە لام، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێدەكات: كە دووریی لە هاوسەرەكەت بكەی، دەڵێ: گوتم: ئایا تەڵاقی بدەم، یان چی لێ بكەم؟

گوتی: نا، تەڵاقی مەدە، بەڵام نیزیكی مەكەوە، هەروەها ناردی بۆ لای دوو هاوەڵەكەشم بە هەمان شێوە، منیش بە ژنەكەی خۆمم گوت: بچۆوە بۆ لای خزم و كەست، لە لایان بە، تاكو خوا دەربارەی من بڕیار دەدات.

وە خێزانی هیلالی كوڕی ئومەییەش چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هیلالی كوڕی ئومەییە، پیاوێكی بەتەمەنە، خزمەتكاری نیە، ئایا پێت ناخۆشە خزمەتی بكەم؟!

ئەویش فەرموو بووی: نەخێر، بەڵام با نیزیكت نەكەوێ، ئەویش گوتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هیچ جووڵەی نەماوە، (واتە: توانای نەماوە سەرجێیم لەگەڵدا بكات) بەڵام هەر دەگریەت، لەو كاتەوە ئەوە لێی ڕوویداوە، تا ئەمڕۆ، وە تەنانەت من مەترسیی ئەوەم لێی هەیە كە چاوەكانیشی لەسەردابنێ، هێندە دەگریەت.

ئنجا هەندێك لە خزمو كەسم بە منیان گوت: ئەگەر تۆش مۆڵەت وەربگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی خێزانەکەت لە لات بێ، چونکە مۆڵەتی داوە بۆ هیلالی کوڕی ئومەییە، تاکو خێزانەکەی خزمەتی بکات.

منیش گوتم: بە خوا داوای مۆڵەتی لێ ناکەم کە هاوسەرەکەم لەلام بێ، چونکە من نازانم پێغەمبەری خوا ﷺچی دەفەرموێ؟ لە کاتێکدا من پیاوێکی گەنجم، (یانی: ئەگەر داوای لێ بکەم خێزانم لەلام بێ، ڕەنگە مۆڵەتم نەدات).

ئیدی دە (١٠) شەوی دیکەش، بەو جۆرە ماینەوەو پەنجا شەو تەواو بوو، لەو کاتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مسوڵمانانی قەدەغە کردبوو، کە قسەمان لەگەڵدا بکەن.

دوایی ڕۆژێك نوێژی بەیانییم کرد، بەیانی شەوی پەنجایەمین، لەسەر پشتی خانووێك لە خانووەکانمان، بەو حاڵەی کە خوای بە بەزەیی باسی کردوە، کە دنیاو سەر زەمینمان لێ وەتەنگ هاتبوو، وە نەفسی خۆیشمو کەوڵی خۆشم لێ وەتەنگ هاتبوو، منیش چادرێکم هەڵدابوو لەسەر (سَلْع) (شوێنێکە لە نیزیك مەدینە) لەوێ دەمامەوە، کاتێك گوێم لێبوو بانگکەرێك بانگی دەکرد، زۆر بە دەنگی بەرز، دەیگوت: ئەی کەعبی کوڕی مالیك! موژدەت لێ بێ، منیش یەکسەر سەجدەم برد، زانیم ئەوە خوای میهرەبان دەرووی لێکردوومەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی ئاگادار کردبۆوە، کە ئەوە خوای باڵادەست، تۆبەی لێ قبووڵ کردووین، دوای ئەوەی نوێژی کردبوو، خەڵکی لێ ئاگادار کردبۆوە، ئیدی خەڵك دەهاتن موژدەیان پێ دەداین، منیش چەند کەسێکی موژدەدەر هاتن، موژدەیان پێ دەداین، وە چەند کەسێکی موژدەدەر، چوون بۆ لای دوو هاوەڵەکەم، وە پیاوێکیش بە سواری ئەسپ هات، کە موژدەم پێ بدات، یەکێکیش بە پیادە دەهات، لە هۆزی ئەسلەم، هەتا چووە سەر شاخێك (واتە: ئەوەی کە بە پیادە بوو) دیارە دەنگەکە خێراتر بوو لە ئەسپەکە، لەوێڕا بانگی کرد، دەنگەکە خێراتر بوو، ئنجا کاتێك ئەو کەسەی کە بە بانگ کردن موژدەی پێدام هات، ئەو پۆشاکەی کە لەبەرم دابوو، کە لەوکاتەدا هەر ئەو دوو پۆشاکەم هەبوون، واتە: سەرو خوار، ئەم دوو پۆشاکەم دانان، وە دوو بەرگی دیکەم بە ئەمانەت وەرگرتن، ئەم دوو پۆشاکەی خۆشم، وەك موژدانە دان، بەو کەسەی کە موژدەکەی پێدا بوومو بە دەنگی بەرز بانگی کردم.

دوایی ڕۆیشتم بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ، وە خەڵك پێم دەگەیشتنو موژدەی تەوبە لێ قبووڵ کرانیان پێ دەدام، دەیانگوت: دڵخۆشبە بەوەی خوا لێت خۆشبووە، هەتا چوومە نێو مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، وە خەڵکیش لە دەوری، دەڵێ: (طلحة)ی کوڕی (عبیدالله) هەڵسا، سڵاوی لێکردم، وە پیرۆزبایی لێکردم، بە خوا لە کۆچکەران هیچ پیاوێك هەڵنەستا جگە لەو، دەڵێ: کەعب هەرگیز ئەو هەڵوێستەی (طلحة)ی کوڕی (عبیدالله)ی لەبیر نەدەچوو، (کە لە نێو هەموو کۆچکەراندا ئەو هەڵساوە پیرۆزبایی لێکردوە)، کەعب دەڵێ: کاتێك سڵاوم لە پێغەمبەری خوا کرد، پێی فەرمووم: لە کاتێکدا کە ڕووی دەدرەوشایەوە، فەرمووی:

﴿أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ﴾.

واتە: موژدەت لێ بی بە باشترین ڕۆژت ، لەو ڕۆژەوە کە دایکت تۆی بووە.

دەڵێ: منیش گوتم: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لە لایەن تۆوەیە، یان لەلایەن خواوەیە، فەرمووی: بەڵکو ئەو لێبوردنە لەلایەن خواوەیە، پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێك کە دڵخۆش دەبوو، دەمو چاوی وەك پارچە مانگێك دەدرەوشانەوە، وە ئێمە ئەوەمان لێ دەزانی، (واتە: کە دڵخۆش دەبوو، دڵخۆشییەکەی لە دەموچاوی موبارەکی دەدرەوشایەوە).

کەعب دەڵێ: منیش لەبەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتمو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لە گەڕانەوەی من بۆ لای خوا، ئەوەیە کە لەماڵو سامانی خۆم هەرچی هەمە، دەیبەخشمە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەندێك لە ماڵەکەت بهێڵەوە، بۆ تۆ ئەوە باشترە.

گوتم: باشە ئەو بەشەی کە لە خەیبەر هەمە دەیهێڵمەوە، وە پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بێگومان خوا منی بەهۆی ڕاستگۆییەوە ڕزگار کرد، وە لە گەڕانەوەی من بۆ لای خوا، مەرج بێ کە لەمەودا هەتا دەژیم لە ڕاستی زیاتر نەڵێم.

(کەعب دەڵێ:) بە خوا هیچ کەسم پێ شك نایەت کە خوا بەهۆی ڕاستبێژییەوە تاقی کردبێتەوە لەوکاتەوە کە بە پێغەمبەری خوام گوتوە، باشتر لەوەی کە منی پێ تاقیکردۆتەوە، (واتە: لەوکاتەوە کە ئەوەم بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووە، پێچەوانەی ڕاستییم بە زاردا نەهاتوە)، بە خوا لەوکاتەوە کە ئەوەم گوتوە، تا ئەمڕۆ

(ئەو ڕۆژەی کە ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە) هەرگیز درۆیەکم بە زاردا نەهاتووە، وە ئومێدیشم وایە ئەوەندە ژیانەی کە ماوەمە، خوا بمپارێزێ لە درۆ کردن.

ئنجا خوای بەرز لەبارەی وانەوە ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾.

کەعب دەڵێ: بە خوا ! دوای ئەوەی خوا منی ڕێنمایی کرد بۆ ئیسلامو خستمیە سەر ڕێی ئیسلام، هیچ چاکەیەکی لەگەڵ نەکردووم، لەلام مەزنتربێ بەلای خۆمەوە، لەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕاستییم گوتو درۆم لەگەڵدا نەکرد، تاکو منیش بفەوتێم لەگەڵ ئەوانەدا کە فەوتان، بەهۆی درۆکردنیانەوە، چونکە خوای بەرز ئەوانەی کە درۆیان کردبوو، وەحی دەربارەیان نارده خوار، وە خراپترین شتی پێ فەرموون، کە خراپترین شتێك خوا بە کەسێکی فەرمووبێ، ئەوەیە، دوایی کەعب دەڵێ: وە ئێمە ئەو سێ کەسە کە بڕیار لەبارەمانەوە دواخرابوو، دوای ئەوەی ئەوانی دیکە چوون بۆ ئەوەی پاساو بێننەوەو، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێبوردنیان بۆ بکات، بەڵام بڕیاری لەبارەی ئێمەوە دواخست، هەتا خوا بەم شێوەیە بڕیاری دا.

ئنجا دەڵێ: مەبەست لە ئایەتەکە ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ ﴾، ئەوە نەبوو کە لە جەنگ دواخرابین، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خوا ئێمەی دواخستبوو، بڕیارمان لەبارەوە بدات، دوای ئەوەی کە ئەوانەی دیکە چوونە لای پێغەمبەر ﷺو داوایان لێکرد، کە داوای لێبوردنیان بۆ بکات، پێغەمبەریش ﷺ لێی قبووڵ کردبوون.

# مانـــای گـشـتی ئـایـەتـەکـان

خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾.

واتە: بە مسۆگەریی خوا تۆبەی قبووڵ کرد لە پێغەمبەر ﷺو لە کۆچبەرانو پشتیوانانێك کە شوێنی کەوتن، لەکاتی سەغڵەتیی و تەنگانەدا، دوای ئەوەی کە نیزیك بوو دڵی هەندێکیان لابدا، پاشان خوا گەڕایەوە سەریان، بێگومان (ئەو) زۆر میهرەبان بە بەزەییە بەرانبەریان .

دیارە ئێمە دوایی ئەوەی کە لە دەمی کەعبی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێ، ئەو بەسەرهاتەمان گێڕایەوە، ئێستا ماناو چەمکی ئەو ئایەتە موبارەکانە بۆ ئێمە، زۆر ڕۆشنە، گرنگ ئەوەیە لێرە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ﴾.

زانایان گوتوویانە: (قد) بۆ (تحقیق)ە، بۆ داکۆکیی کردنو جەخت کردنەوەیە، ﴿تَّابَ ٱللَّهُ﴾ (تابَ) بە مانای (رَجَعَ) واتە: گەڕایەوە، خوا گەڕایەوە سەر پێغەمبەر ﷺو سەر کۆچکەرو پشتیوانان، گەڕایەوە سەریان بە ڕەحمو، لێبوردنی خۆی، بە چاوپۆشیی خۆی.

دەشگونجێ: (تاب الله علیهم) واتە: داوای لێبوردنەکەی لێ وەرگرتن، وە گەڕانەوەکەی لێ وەرگرتن، چونکە ئەوانە لە کاتی سەغڵەتیی و لە کاتی دژوارو ناڕەحەتدا دوای پێغەمبەری خوا کەوتنو لێی بەجێ نەمان، کە نیزیك بوو هەندێکیان دڵیان لابدا،

{دڵ لادانەکەش ئەوە بوو بەجێ بمێنن و بێ فەرمانیی خوا بکەن} پاشان خوا گەڕایەوە سەریان، بێگومان ئەو زۆر لە بەرانبەریان میهرەبان و بە بەزەییە.

لێرەدا بەگشتی خوا ﷻ باسی لێبوردنی خۆی دەکات، وە باسی تۆبە وەرگرتنی خۆی دەکا بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ کۆچکەران و پشتیوانان، بە تایبەتییش: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ﴾ وە گەڕایەوە سەر ئەو سێیانەش کە دواخرابوون ﴿خُلِّفُواْ﴾ چونکە لە ئایەتەکەی پێشووتردا فەرمووی: ﴿وَءَاخَرُونَ مُرۡجَوۡنَ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ﴾، کەسانێکی دیکەش دواخراون بۆ فەرمانی خوا، دواخرانەکەش، واتە: بڕیار لەبارەیانەوە دوا خراوە، هیچیان بۆ بڕیار نەدراوە، کە ئایا خوای دادگەر زەم و سەرزەنشتیان دەکات، یاخود لێیان دەبووریێ؟، یان پێغەمبەر ﷺ عوزرەکەیان قبووڵ دەکات، یان قبووڵ ناکات؟ هیچیان لەبارەوە بڕیار نەدراوە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ﴾ واتە: کاتێك کە زەوی بەو فراوانییەی خۆی لێیان وەتەنگ هات، پێشینانی خۆشمان دەڵێن: (دنیای لێ وەتەنگ هات) یان دەڵێن (سەری دنیای لەخۆی بە پووشێ گرتوە)، یان دەڵێن: (پێی وایە لە ژێر درەختێك دایە یەك گەڵای پێوە نیە)، ئینسان کاتێك کە تووشی خەفەت و ناڕەحەتییەك دێ، هەست دەکات دنیای زۆر تەنگ بۆتەوە،﴿وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾، وە نەفسی خۆشیان و دەروونی خۆشیان لێ وەتەنگ هات، یەکێك بە یەکێ دەڵێ: لە کەوڵی خۆم دا وە تەنگ هاتووم ﴿وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ﴾، وە زانیان هیچ پەنایەك لە خوا نیە، مەگەر بۆ لای خوا، واتە: هیچ پەنایەك لە سزاو جەزرەبەی خوا نیە، خۆتی لێ پەنا بدەی، مەگەر بگەڕێیەوە بۆ لای خوا ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْ﴾، دوای خوا گەڕایەوە سەریان، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، هەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا پێشێ خوا، لوتفی لەگەڵ کردوە، ئنجا ئەو دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بێگومان هەر خوا زۆر تۆبە وەرگری بە

بەزەییە، یاخود خوا زۆر دەگەڕێتەوە سەر بەندەکەی بە وەرگرتنی گەڕانەوەکەی، وە زۆر بە بەزەییە.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن، وە لەگەڵ ڕاستاندا بن، پارێز لە خوا بکەن، بەوەی ئەرکەکانی سەرشانتان جێبەجێ بکەن و، خۆتان لە قەدەغەکراوەکان بپارێزن، یانی: فەرمانەکانی خوا بەجێ بێنن، قەدەغەکانی خوا مەشکێنن، بەوە خۆ لە سزای خوا دەپارێزرێ ﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، وە لەگەڵ ڕاستانیشدا بن، پەیوەندییتان لەگەڵ خوادا لەسەر بناغەی تەقوا بێ، پەیوەندییشتان لەگەڵ خەڵکدا، لەسەر بناغەی ڕاستیی و ساغیی بێ، وە هەوڵ بدەن لەگەڵ ڕاستان و ساغاندا بن، بۆ خۆشتان پێشتر خۆتان بەڕاستیی بڕازێننەوە، ئنجا دەتوانن لەگەڵ ڕاستاندا بن.

## چەند مەسـەلەیەكی گرنـگ

**مەسەلەی یەكەم**، كە دەفەرموێ: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ ﴾.

دەگوترێ (تاب الله علیهِ : أي غَفَرَ لَهُ) واتە: لێی بورد، (تابَ الله علیهِ: أي قَبِلَ تَوبَتَهُ) تەوبەكەی لێ قبووڵ كرد، بەڵام من پێم وایە ئەگەر بشگوترێ: (تابَ اللهُ علیهِ، أي: رَجَعَ إلَیهِ) خوا گەڕایەوە سەر بەندەكەی خۆی، هەر دەبێ، چونكە خوا دەگەڕێتەوە سەر بەندەكەی خۆی، بە لێبوردنو ڕەحمو بەزەییو بە بەخششی خۆی.

لەبەردەم ئەم ئایەتەدا شەش هەڵوەستە دەكەین :

**هەڵوەستەی یەكەم** : كە دەفەرموێ ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾ ئایا خوا چ تەوبەیەكی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە، لە چ گوناهێكی خۆش بووە؟ لە چی لێی بوردووەو چاوپۆشیی لێكردووە؟ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ گوناهی كردووە، كە بزانێ ئەوە گوناهەو بیكات؟ بە تەئكید نەخێر، ئەدی یانی چی: خوا تەوبەی لە پێغەمبەر قبووڵ كردو لێی بوردو چاوپۆشیی لێكرد؟ واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئیجتیهادی كردبێو لە بۆچوونێكدا نەیپێكابێ، خوای بەخشەر لەوەی لێیخۆشبووەو چاوپۆشیی لێكردووە، بۆ وێنە: كە مۆڵەتی هەندێك لە مونافیقو دڵنەخۆشەكانی دا، كە نەچن بۆ جەنگی تەبووك، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ ...﴿٤٣﴾ ﴾التوبة، خوا لێت ببوورێ، بۆچی مۆڵەتت دان؟!

﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾.

{نەدەبوو مۆڵەتت دابان} تاکو ئەوانەی ڕاست دەکەن بۆت ڕوون بووبانەوە، وە درۆزنەکانیشت ناسیبانایە.

ئاوا ئەگەر لە بۆچونێکی وادا، پێغەمبەری خوا نەیپێکابێ، خوای میهرەبان لەوە چاوپۆشیی لێکردوەو لێی بوردوە، ئەگەرنا بە تەئکید پێغەمبەر ﷺ هیچ کاتێك گوناحێکی نەکردوە، کە بزانێ گوناحەو بیکات، بەڵام جاری وا هەیە لە بۆچوونێکدا نەیپێکاوە، شایانی باسیشە ئێمە ئەگەر لە ئیجتیهادێك دا کە بواری تێدا هەبێ لە ڕووی شەرعەوە، ئەویش ئەوەیە کە لە بەرانبەریدا دەقێك نەبێ، ئەگەر بیپێکین، دوو پاداشتمان هەن‌و ئەگەر نەیپێکین پاداشتێکمان هەر هەیە، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:

﴿إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، بـرقم: (١٧٨٠٩)، والبُخَارِيُّ، بـرقم: (٦٩١٩)، وَمُسْلِم، برقم: (١٧١٦)}.

واتە: کەسێك کە دادوەریی دەکات، ئەگەر لە دادوەرییەکەیدا بیپێکێ، دوو پاداشتی هەن، {پاداشتی کۆشش کردنەکەی، وە پاداشتی پێکانەکەی}، بەڵام دادوەر ئەگەر لە دادوەرییەکەیدا نەیپێکێ، پاداشتێکی هەر هەیە.

پاداشتی ئەوە کە خۆی ماندوو کردوەو کۆششی کردوە، کەواتە: گوناهبار نیە.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ چونکە پایەی زۆر زۆر بەرزە، شتێك کە بۆ ئێمە باشیشە، بۆ پێغەمبەر ﷺ شایانی ئەوەیە کە ئاگادار بکرێتەوە، وە جارێکی دیکە زیاتر لە خۆی وریا بێ.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾.

با بزانین هەڵەو کەموکوڕیی کۆچکەران‌و پشتیوانان چی بووە؟ ئەوە بووە کە هەندێکیان بە قاڵبگرانیی خۆیان ساز کردوە، وە هەندێکیان پێیان ناخۆش بووە، وە هەندێکیان ڕەنگە کارتێکراو بووبن‌و کەوتبنە ژێر کاریگەریی قسەو قاڵی مونافیقەکان‌و، خوتخوتەیەکی خراپیان لە دڵدا دروست بووبێ.

هەڵوەستەی سێیەم : ئنجا دەفەموێ ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ﴾، ئەوانەی کە شوێنی کەوتن، واتە: شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتن و فەرمانبەرییان کرد، وە گوێڕایەڵییان کرد.

هەڵوەستەی چوارەم : کە دەفەرموێ ﴿فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾، ﴿سَاعَةِ﴾ دەڵێ (حِصَّةٌ مِن الزَمَن، أو جزءٌ مِن الزَمَن) بەشێکە لە کات، نەک سەعات ﴿سَاعَةِ﴾ی ئێستا، کە بە بیست و چوار (٢٤) سەعات شەوو ڕۆژێک پێک دێنن، بەڵکو ﴿سَاعَةِ﴾ لە بەکارهێنانی قورئانداو، لە زمانی عەرەبیدا، یانی بەشێک لە کات، کەم بێ یان زۆر بێ، وە یەکێک لە ناوەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی بریتییە لە ﴿سَاعَةِ﴾.

﴿ٱلْعُسْرَةِ﴾ دەڵێ (إسمٌ العُسرِ) ناوی سەغڵەتییە (زیدَت فیهِ التاءُ لِلمُبالَغَةُ لِلشِدَّةِ) ﴿ٱلْعُسْرَةِ﴾ لە ئەصڵدا ناوی (عُسْر) یانی سەغڵەتیی ئەو (ة)ی بۆ زیاد کراوە، وەک زێدە ڕۆیی کردن لە سەغڵەتییەکدا کە لەو ڕۆژەدا هاتوە.

هەڵوەستەی پێنجەم : کە دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ﴾، دەڵێ (کادَ: مِن أفعال المُقاربة)﴿مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ﴾ دوای ئەوەی کە نیزیک بوو ﴿يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ﴾ دڵی کۆمەڵێکیان لا بدا.

دیارە ﴿يَزِيغُ﴾ خوێنراویشتەوە (تَزِيغُ) هەردووک (قِراءَة)ەکەی هاتوون، خەریک بوو دڵیان لابدا، واتە: بێ فەرمانیی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن،

﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ دوایی خوا گەڕایەوە سەریان تەوبەی لێ قبوول کردن، یاخود لێیان بورد، بێگومان ئەو بەرانبەر بەوان میهرەبانەو بە بەزەییە.

■ ئەوەی چەمکی ﴿سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ﴾مان زیاتر بۆ ڕوون ببێتەوە، با گوێ لەم دەقە بگرین: ﴿عن ابن عباس، أنّه قال لعمر بن الخطاب : حدثنا من شأن ساعة العسرة، فقال : خرجنا مع رسول الله إلى تبوك في قيظ شديد، فنزلنا منزلاً، فأصابنا فيه عطش، حتى ظننا أن رقابنا ستنقطع، حتى إن الرجل لينحر بعيره فيعصر فرثه فيشربه، ويجعل ما بقي على كبده، فقال أبو بكر الصديق : يا رسول الله إن الله قد عوّدك في الدعاء خيراً، فادع لنا، فرفع يديه، فلم يرجعهما حتى قالت السماء، فأهطلت ثم سكبت، فملأوا ما معهم، ثم ذهبنا ننظر، فلم نَجِدْها جاوزت المعسكر﴾، {أخرجه إبن جرير، برقم: (١٠٤٤٣) وابن حبان، برقم: (١٣٨٣)، والحاكم، برقم: (٥٦٦) وغيرهم، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم}.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: بە عومەری کوڕی خەتتابم گوت، خوا لێیان ڕازی بێ، دەربارەی ﴿سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ﴾ قسەمان بۆ بکە، ئەو کاتە سەغڵەتیی و تەنگانەیە چی بوو؟

عومەریش گوتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین بەرەو تەبووك، لە کاتێکدا لە گەرمەی گەرمای ساڵدا، لە شوێنێك مەنزڵمان خست، بارگەو بنەمان خست، تینوایەتییەکی زۆرمان تووش بوو، هەتا پێمان وابوو کە ملمان لێدەبێتەوە لە گەرمان، هەتا پیاوی وا هەبوو حوشترەکەی خۆی سەردەبڕی، وە دوایی ئەو ئاوەی کە لە گەدەی دایە، دەیخواردەوە، وە ئەوەش کە دەمایەوە، وەك فێنکایەتی لەسەر زگی خۆی و لەسەر هەناوی خۆی دایدەنا، بۆ ئەوەی فێنك بێتەوە.

ئـەبو بەکـری صیددیقـیش چـووە خزمـەت پێغـەمبــەر ﷺ گـوتی: ئــەی پێغـەمبەری خوا! خوا تۆی وا ڕاهێناوە کە دوعات قبووڵ بکات، ئێستـاش بۆمـان بپاڕێوە، وەزعمان زۆر سـەغڵەتـە.

پێغـەمبـەر ﷺ دەستی بەرز کردنەوە، دەستـەکانی نەگـێڕانەوە بۆ لای خـوّی {یـانی: ئـاوا کـە دەسـتی بـەرز کردنـەوە، جارێ دەسـتی هـەر بـە سـەرێوە بـوون}، یەکسـەر هەور پەیدا بوون لە ئاسمانێو گرماندیان، دوایی بـاران دارژایـە خـوارێ، وە هەرچـی دەفـرو کونـدەو مەشـکەیان هـەبوو، پڕیـان کـرد، لـە ئـاو، دوایـی ڕۆیشـتین، تەماشـامان کـرد، لـە دەرەوەی بازنـەی شوێنــی ئـەو سوپایــەی کـە بارگەمـان لێ خستبوو، هیـچ شـوێنی دیکەی بـاران نـەبوو. {واتــە: ئـەو بارانــە تـایبـەت بۆ ئـەوانـی نـارد}.

<u>هەڵوەستەی شـەشـەم</u> : کـە دەفـەرموێ ﴿ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾، دەڵـێ: (الرأفـة: العنـايـة بالضعيفِ والعطفِ عليهِ، والرحمة أعَمُ و أوسَعُ).

(رأفـة) بریتیـە لـە ئـاگاداربوونو چاودێریی کردنی بێهێـزو لـەگـەڵ دا بەسۆزو پەرۆش بوونی، بـەڵام وشـەی ڕەحمەت مانایـەکەی فراوانتـرە لـە (رأفـة).

هـەندێکیش گوتوویـانە: (رحـمـة) بریـتیـە لە بـەزەیی نـوواندن بە کەسێـك دا بۆ هێنـانەدی قازانجو سوود، بەڵام (رأفـة) بریـتیـە لە بەزەیی نـواندن لەگـەڵـیدا بۆ لێدوورخستنـەوەی زیـانو خـراپـە.

<u>مەسـەلـەی دووەم</u>: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾.

دیـاره مەبەست لـەوە کە دەفـەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ﴾ یـانی (وَقَد تـابَ الله على الثـلاثـة الّذيـن خُلِفـوا) وە خوا تەوبەی وەرگرتو چاوپۆشیی کرد لەو سێیانەش کە

دوا خرابوون، واتە: بڕیار لەبارەیانەوە دوا خرابوو، یان دوا خرابوون لە ڕووی بڕیار لەبارەدرانەوە، (کەعبی کوڕی مالیك‌و هیلالی کوڕی ئومەیەو مەرارەی کوڕی ڕەبیع بوون).

کەواتە: (خُلِّفوا یعني: أُخِّروا، أُجِّلوا) وەك لە ئایەتی ژمارە (١٠٦) وەك خوا ﷻ لەبارەیانەوە فەرمووی: ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ... ﴿١٠٦﴾ ﴾، وە خوێنراویشەتەوە (وآخرون مُرجَئونَ) وە هەندێکی دیکە هەن دوا خراون، بۆ فەرمانی خوا، ئایا خوا لەبارەیانەوە چی دەفەرموێ؟!

جارێ هیچ بڕیارێك لەبارەیانەوە نەهاتوە، کە دیارە مەبەست پێی: ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزەن کە باسمان کردن﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ﴾، هەتا کاتێك کە زەوی بەو فراوانییەی لێیان وەتەنگ هات، وەك کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (دنیایان لێ وەتەنگ هات) یان (دنیای لێ بوو بە چەرمی چۆلەکە)، ﴿ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ ﴾، وە کەوڵی خۆشیان لێ وەتەنگ هات، لە دەروونی خۆشیاندا هەستیان بە سەغڵەتیی دەکرد، لە کەوڵی خۆشیاندا نەدەحەجمین ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ﴾، زانیان‌و دڵنیا بوون کە هیچ پەنایەك نیە لە خوا، مەگەر بۆ لای خوا، واتە: هیچ پەنایەك نیە لە سزای خوا، ئەگەر خوا بیەوێت سزات بدات، کە خۆتی تێبگری‌و خۆتی تێدا بشاریەوە، مەگەر پەنا بەریە بەر خوا ﴿ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ ﴾، دوایی خوا بەزەیی پێیاندا هات کە یارمەتییان بدات بۆئەوەی ئەوانیش بگەڕێنەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ بێگومان هەر خوا زۆر تۆبە وەرگری خاوەن بەزەییە.

لێرەدا بۆیە بە خێرایی بەسەری‌دا ڕۆیشتین، چونکە پێشتریش قسەمان لەبارەیەوە کردوو، لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیان دا لە زمانی کەعبی کوڕی مالیکەوە، خوا لێی ڕازی بێ.

**مەسەلەی سێیەمو کۆتایی**: کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩ ﴾.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو لەگەڵ ڕاستان دا بن.

پێغەمبەر ﷺ لەبارەی گرنگیی ڕاست بێژییەوە لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ:

﴿عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ، وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقًا، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ، وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّابًا﴾، {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٧١٨٨)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٦٦٨)} .

واتە: ڕاست بن، چونکە ڕاستیی ئینسان بەرەو چاکە دەبات، وە چاکەش ئینسان بەرەو بەهەشت دەبات، وە پیاوی وا هەیە بەردەوام ڕاستە، وە لە ڕاستیی دەخەفتیو لە ڕاست بێژیی دەگەڕێ، هەتا لە لای خوا دەنووسرێ: (صدِّیق) واتە: زۆر ڕاست، وە خۆتان لە درۆ بە دوور بگرن، چونکە درۆ ئینسان بەرەو گوناهـ و تاوان دەبات، گوناهـ و تاوانیش ئینسان بەرەو ئاگری دۆزەخ دەبا، وە پیاوی وا هەیە هەر درۆ دەکاتو لە درۆ کردنێ دەخەفتێ، تاکو لەلای خوا بە درۆزن دەنووسرێ.

لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، کە خوا ﷻ دوو شتی زۆر خۆش دەوێن :

یەکەم: پارێزکاریی (تقوی).

دووەم : ڕاستیی .

پارێزکار بوون، وەك پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، دەبێ ئینسان ئەهلی پارێز بێ، خۆی بپارێزێ لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە.

وە ڕاستیی، وەك مامەڵە لەگەڵ خەڵكی خوادا، ئینسان دەبێ لە پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، ئەهلی تەقوا بێ، وە لە پەیوەندیی لەگەڵ خەڵكدا ڕاستو ساغ بێ، واتە: دوور بێ لە درۆو لە فێڵو پێچو پێچو ژێر بەژێرو لە مخەننەتیی، خوای پەروەردگار بە لوتفو كەرەمی خۆی ئێمە لەو كەسانە بگێڕێ، كە ئەهلی تەقوان. وە لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە ڕاستو ساغن، هەم لەگەڵ خوادا، هەم لەگەڵ خەڵكی خوادا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار (٤) ئایەت پێکدێ: (١٢٠ تا ١٢٣)، لەم چوار ئایەتەدا، سێ بابەت باسکراون :

لە ئایەتی یەکەمو دووەمدا، باسی ئەوە کراوە کە خەڵکی شاری مەدینەو عەرەبە بیابانشینەکانی دەوروبەریان، بۆیان نیەو نابێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ، دوا بکەونو، خۆیان پێ لەو لەپێشتر بێ، لە ڕووی سەلامەتیو ئاسوودەییەوە، چونکە: هیچ تینوێتیو ماندوێتیو برسیەتییەکیان تووش نابێ، لە ڕێی خواداو، هیچ شوێنێك ناگرنو، هیچ زەبرێك لە دوژمن نادەن، مەگەر بەهۆیەوە، کردەوەیەکی باشیان بۆ دەنووسرێ، وە خواش پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات.

هەروەها هەر بەخشینێکی گەورەو گچکەیانو، هەر دۆڵو شیوێکیان بڕیبێ، بە پاداشت بۆیان دەنووسرێ، تاکو خوا بەپێی باشترین کردەوەیان پاداشتیان بداتەوە.

وە لە ئایەتی سێیەمدا، باسی بابەتێکی دیکە کراوە، کە بریتیە لەوەی ناگونجێ تێکڕای بڕواداران بڕۆن بۆ جەنگ، (یان: بۆ پەیداکردنی زانست) بەڵکو دەبێ لە خەڵکی هەر شوێنێك، کۆمەڵێکیان بچن، وە ئەوانی دیکە سەرگەرمی شارەزا بوون بن لە ئاییندا، (یان: کارو کەسابەت بن) پاشان کە جەنگاوەرەکان گەڕانەوە بۆ لایان، (یان: هەر کات فێرخوازەکان گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان، سەرگەرمی شارەزاکردنیان بن)، وریایان بکەنەوە، تاکو هۆشیارو چاو کراوەبنو تووشی هەڵەو پەڵە نەبن.

وە لە ئایەتی چوارەمدا، باسی بابەتێکی دیکەی بواری جەنگو ڕووبەڕووبوونەوە کراوە، ئەویش بریتیە لەوە کە بڕواداران، دەبێ لە دوژمنانی بێبڕوای نیزیکیانەوە دەست بە جەنگ بکەن، وە لەسەریشیان زبر بن، توندو تیژبن، چونکە دیارە شەڕ بە نەرمو نۆڵیی ناکرێ! وە بشزانن کە خوا لەگەڵ خۆپارێزان دایە، ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن، لەوەی بێ فەرمانیی خوا بکەن، وەك شەریعەتەکەی، وە ئەوانەش کە خۆ دەپارێزن لەوەی پێچەوانەی یاساکانی خوا (سنن الله) لە ژیانی بەشەردا ڕەفتار بکەن.

﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ
وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا
مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ
مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ
لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟
كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟
قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ
يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ
﴿١٢٣﴾ ﴾.

# مانای وشــه به وشـەی ئایەتــەکـان

{نـابـێ خـەڵکی مەدینەو عـەرەبە خێڵەکییەکانی دەوروبەریان (بۆ چوونە جـەنگ) لە پێغـەمبـەری خـوا بەجـێبمێـنن، وە نەدەبوو (لـە ڕووی سـەلامەتیی‌و ئـاسوودەییـەوە) خۆیـان بەسـەر ویدا هـەڵبژێرن، چونکە هیچ تینوێتییـەك، وە هیچ ماندووبوونێك، وە هیچ برسێتییـەکیان لـە ڕێی خـوادا تووش نـابـێ، وە نـاچنـە هیچ شـوێـنێك کە کـافـران پەسـت بکـات، وە هـیچ زیانێـك لـە دوژمـن نـادەن، مەگـەر بەهـۆیەوە کـردەوەیەکی باشیـان بۆ دەنووسرێ، بە دڵنیـایی خـوا پـاداشتی چاکەکاران زایـە نـاکـات ﴿١٢٠﴾ وە هـیچ بەخشینێکی گچکەو گـەورە نـاکەن، وە هیچ دۆڵـێك نـابڕن، مەگـەر بۆیـان دەنووسـرێ، تاکو خـوا پاداشتی باشتـرین کردەوەیان بداتەوە، کە ئـەنجامیـان داوە ﴿١٢١﴾ وە ناگونجـێ بڕواداران تێکڕا بچـن بۆ جەنگ، دەبووایە لـە هـەر خـەڵکێکیـان، کۆمەڵێکیـان بچـن بـۆ جەنگ، تاکو (کۆمەڵگا) لە ئاییندا شارەزابن، وە هەرکـاتێك کۆمەڵە (جەنگـاوەرە)کەیان گەڕانەوە بۆ لایان، ئاگـاداریان بکەنەوە، (وە شارەزایان بکەن لـە ئـاییـنـدا) بەڵـکو وریـابن (لە هـەڵەو پەڵـە پـارێزراوبن) ﴿١٢٢﴾ ئـەی ئـەوانەی بڕواتان هێـناوە! دژی ئـەو کـافرانــەی لێتـانەوە نیزیکن (وە ئیعلانی دوژمنـایەتییان کـردوە) بجـەنگن، وە بـا زبـرییتــان پێـوە ببینن، وە بزانن کە خـوا لەگـەڵ پارێزکـارانـدایـە ﴿١٢٣﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(وَلَا يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ): (أَي لا يَضِنُوا بأَنفُسِهِم عَمَّا يُصِيبُ نَفْسَه، أَو لا يَخْتَاروا إِبْقَاءَ أَنْفُسِهِم عَلَى نَفْسِهِ فِي الشَّدَائِد)، واتە: نەدەبوو چرووکیی‌و ڕژدیی بە نەفسی خۆیان بکەن، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تووشی پێغەمبەر ﷺ دێ، بە واتایەکی دی: نەدەبووایە سەلامەتیی خۆیان هەڵبژێرن لە سەغڵەتیی‌و لە تەنگانەندا، بەسەر سەلامەتیی پێغەمبەری خوادا ﷺ، واتە: نەدەبوو خۆیان پێ لە پێشتر بێ لەو، بەڵکو دەبوو خۆیان بکەنە بەلاگێڕی.

(ظَمَأٌ ): واتە: تینوێتیی، (العَطَشُ، فَهُوَ ظَمْآنُ: ظَمِيءَ يَظْمَأُ)، (ظَمْآن) واتە: تینوو، دەگوترێ: (ظَمِيءَ، يَظْمَأُ، ظَمْآن) تینووی بوو، تینووی دەبێ، تینوو.

(نَصَبٌ ): (النُّصْبُ والنَّصَبُ: التَّعْبُ أَنْصَبَنِي كَذَا: أَتْعَبَنِي وَأَزْعَجَنِي).

(نُصب) لەگەڵ (نَصَب) هەردووکیان بە مانای ماندووبوون دێن، دەگوترێ: (أَنْصَبَنِي كَذَا) واتە: ئەو شتە ماندووی کردمو بێزاری کردم.

(مَخْمَصَةٌ ): (مَجَاعَة تُورِثُ خَمْصَ البَطْنِ اي ضُمورَهُ، رجلٌ خَامِصٌ أَي ضَامِرٌ، وَأَخْمَصُ القَدَمِ: بَاطِنُها).

(مخمصة) برسیتییەکە کە سکی ئینسان بە پشتیەوە بنووسێنێتەوە، پیاوێك کە ورگی نەبێ، یان ورگی شێردراوە بێ، پێی دەگوترێ: (رجلٌ خَامِصٌ)، وە ژێری پێ، پێی دەگوترێ: (أَخْمَص)، لەبەرئەوەی کە شێردراوەیەو، بە پێ وە نووساوەتەوە.

(يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا ): (يَطَئُونَ) یانی: (يَدُوسونَ)، (لا يَطَئُونَ) واتە: پێی لێ نانێن، پێی ناخەنە سەرێ .

(وَطِئْنا العَدُوّ: غَزَوْناهُمْ، المَوْطِئُ وَالمَوْطَأُ: مَوْضِعُ القَدَمِ)، دەگوترێ: (وَطِئْنا العَدُوّ) واتە: هێرشمان کردە سەر دوژمن، وە (مَوْطِئُ ومَوْطَأُ) هەردووکیان بە شوێن پێ دەگوترێن، ئەو شوێنەی مرۆڤ پێی لێ دەنێ.

(يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا): واتە: هیچ زەبرێك لە دوژمن نادەن، یاخود هیچ سوودێك لە دوژمن نابینن، مەگەر بۆیان دەنووسرێ، (نالَ الشيءَ: حَصَلَ عَلَيْهِ)، (نالَ الشيءَ) واتە: ئەو شتەی پەیدا کرد.

(وَادِيًا): (الوَادِي: كُلّ مُنْفَرِجٍ بَيْنَ الجِبَالِ وَالتِّلالِ وَالآكامِ، سُمّي بِذَلِكَ لِسيلانِهِ).

(وادي) هەر دابڕاوییەکە لە نێوان چیاکانو گردەکانو تەپۆلکەکاندا، لەبەرئەوەش وای پێ گوتراوە: چونکە ئاوی پێدا دێ.

(لِيَنفِرُوا): (نَفَرَ الناس إلى العَدُوّ: أَسْرَعُوا فِي الخُرُوجِ لِقِتالِهِ، نَفْراً: قِتالاً).

وشەی (نَفْر) بریتیە لەوەی کە ئینسان لە ڕووی نارەحەت کرانەوە، لە شوێنێکەوە بچێ بۆ شوێنێکی دی، ئنجا دەگوترێ: (نَفَرَ الناس إلى العَدُوّ) خەڵك بەرەو دوژمن (نَفْر)یان کرد، واتە: خێراییان کرد، لەوەدا کە بچن بۆ جەنگ لەگەڵدا کردنی، وە وشەی (نَفْر) بە مانای (قِتال) جەنگ دێ.

(كَآفَّةً): (أي: جميعاً) واتە: تێکڕا، هەموویان.

(فِرْقَةٍ): (أي الطائفة من الناس)، (فرقة) لێرەدا (راغب الأصفهاني) ئاوای لێکداوەتەوە: کۆمەڵێك لە خەڵك.

(طَآئِفَةٌ): واتە: دەستەیەك لە خەڵك، بەڵام بە پێی ئایەتەکە، (فرقة) واتە: خەڵکی ناوچەیەك، (طائفة) واتە: کۆمەڵێك لەو خەڵکە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: نەدەبوو بڕواداران هەموویان بچن بۆ جەنگ، دەبووایە لە هەر فرقة)یەك

(طائفة)یەك بچن، کەواتە: مەبەست لە (فرقة) کۆمەڵە خەڵکێکی زۆرە، (طائفة)ش کۆمەڵە خەڵکێکی کەمترە.

(لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ): بۆ ئەوەی لە ئایینـدا شارەزابـن، (الفِقْهُ: الفَهْمُ والفِطْنَة).

(فِقْه) بریتیە لە تێگەیشتنو ورد تێگەیشتن، هەندێکیش گوتوویـانە: (فِقـه) بریتیە لەوە کە تـۆ لـە زانیـارییـەکی زانـراوەوە بـڕۆی بـۆ زانیـارییـەکی نـەزانراو، هەنـدێکیش گوتوویانـە: (الفِقْـهُ: فَهْمُ مُـرَاد الـمُتَكَلِّم) بریتیـە لـە تێگەیشـتنی مەبەستی قسەکەر، کە هەر کامێك لەوانـە جوانن، لە ڕاستییدا (فقه) جیایـە لـە (علم)، (فقه) بریتیـە لـە زانیارییەکی تایبەت، (علم) بریتیـە لـەوە کـە تـۆ شـتێك وەك خۆی بزانـی.

(وَلِيُنذِرُوا۟ ): واتــە: بـۆ ئــەوەی خـەڵکەکەیــان وریــا بکەنــەوەو، ئاگــادار بکەنــەوەو، بیانتـرسێنن.

(قَوْمَهُمْ ): (الجَمَاعَـةُ مِنَ النـاسِ تَجْمَعهُم جَـامِعَـةٌ يَقُـومُونَ لَهـا).

(قـوم) هـەر کۆمەڵێکە لـە خـەڵك کە شتێك کۆیـان بکاتـەوە، یـان بۆ ئـەو شتـە هەڵسابنە سـەر پـێ.

(يَلُونَكُم ): واتـە: لێتانەوە نیـزیکن، (وَلاَهُ يَلِيـهِ وَلْيـاً: دَنـا مِنْـهُ وَقَـرُبَ).

(وَلاَهُ يَلِيـهِ وَلْيـاً) واتـە: لێی نیـزیك بـوو، (دَنَـى، يَدْنُـو، دنُـوّاً).

(غِلْظَةً ): زبـریی، تـوندو تیـژیـی، (الغِلْـظَةُ: خِلاَفُ الـرِّقَةِ).

(غِلْظَـة) پێچـەوانەی نـەرمو نـاسکییــە، دەگــوترێ: (اشْـتَدّ الشـيء وَصَعُـبَ: إذَا غَلَـظَ)، هەر شـتێك کە پتەوو قـاییم بـێ، دەگوترێ: (اشْـتَدّ وَصَـعُـبَ).

## مانـای گـشـتی ئـایـەتـەکـان

دیارە ئێمە پێشتـر گـوتمان: ئـەم چـوار ئایەتـە موبارەکـە، سـێ تـەوەری سـەرەکیی دەگرنە خۆیان، خـوا ﷻ دوای ئـەوەی لـەم سـوورەتـە موبـارەکەدا، زۆر باسـی مونـافیـق و دەغەڵ و دڵنەخۆشـەکانی کرد، وە باسی مسوڵمانانێکی کەمتـەرخـەمیشی کرد، کە بەبێ پاساوو بیانوو، لـە جـەنگی تـەبووك بەجێماون، وە باسی ساردو سڕیی و کەمتەرخـەمیی هەندێکیـانی کـرد، کە بەڵێ چوون بۆ جەنـگ، بەڵام بە قالب گرانیی چـوون، وەك لـە ئایەتـەکانی پێشـێ دا باسـمان کـرد: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ...﴿٣٨﴾ ﴾التوبة.

واتـە: ئـەی ئـەوانەی بڕواتـان هێنـاوە ! بۆچی ئـەگەر پێتـان گـوترا: لـە ڕێـی خـوادا بچن بـۆ جـەنگ، {بەرگـریی لـە خۆتـان و ئـایینـەکەتـان و نیشتیمـانـەکەتـان و وڵات و بەرژەوەندییـەکانتـان بکەن} ، بۆچـی خۆتـان بـە زەوییـەوە نووسـاند، بۆچـی خۆتـان قـالب گـران کـرد، بە زەحمـەت هـەڵسان، ئنجا دوای ئـەوەی خـوای دادگـەر بەگشتی لە ئایەتەکانی ئەم سوورەتەدا، باسی ئەو بابەتەی کرد، ئنجا لە کۆتایی ئەم بابەتە گشتییە خـاوەن پـەل و پۆیـەدا، دەفـەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِأَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ وَمَنۡ حَوۡلَهُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ ﴾، نابێ خەڵکی مەدینە، دانیشتوانی مەدینە، وە ئەوانەی کە لە دەوریانن، لە عـەرەبە خێڵەکییە بیابانـنشینەکان، بەجێ بمێنن لـە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ، لە کوێ و لە چی دا، نـابێ لێی بەجێ بمێنن؟ واتـە: لە جەنـگ و جیهاد، وە ئەوە بـە پێـی سیـاقی ئـایـەتـەکە، زۆر ڕوون و ئـاشکرایـە، چـونکە وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە: قورئان وشـەیەك و پیـتێکی زیادی تێدانیە، لێرەدا دوای ئـەوەی خوای پەروەردگار لـەو هـەموو ئـەو ئـایـەتـانەدا، باسـی جـەنگ و خـۆ ئـامادەکـردن بـۆ جـەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە لـەگەڵ ئـەهلی کوفر، بە تـایبـەت لـەگەڵ ڕۆمەکاندا دەکات، کە زۆربـەی ئایەتـەکانـی سـوورەتـەکە لەوبـارەوەیە، پێویست ناکات دووبارە بفـەرموێ:

(أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنْ رَسول الله فِي القِتَالِ أَوْ فِي الحَرْبِ)، چونکە دیارە مەبەست پێی ئەوەیە کە: نابێ خەڵکی شاری مەدینەو، ئەو عەرەبە بیابانیشینانەی کە لە دەوریانن، لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بمێنن، لە کاتێکدا کە دەچێ بۆ جەنگ، ﴿وَلَا يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ﴾، وە نابێ نەفسی خۆشیان پێ زیاتر بێ، لە نەفسی پێغەمبەر ﷺ، نابێ سەلامەتیی‌و ئاسوودەیی خۆیان هەڵبژێرن بەسەر ئاسوودەیی پێغەمبەری خوادا ﷺ، بە پێچەوانەوە: دەبێ خۆیان بەلاگێڕی بکەن، دەبێ قەڵغانی سەری بن، دەبێ لە پێش ویەوە بن، دەبێ لە تەنیشتیەوە بن، یان لە پێشیەوە بن، نەك لێی بەجێ بمێنن.

ئنجا خوا ﷻ باس دەکات کە بەو چوونە جەنگە لە پێناوی خوادا، ئەو فیداکارییە لە پێناوی خوادا، چەند جۆرە پاداشت بۆ ئینسان دەنووسێ، دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ﴾، ئەوەش لەبەرئەوەی ئەوان هیچ تینوێتییەکیان تووش نابێ، وە هیچ ماندوو بوونێکیان تووش نابێ، وەهیچ برسی بوونێکیان لە ڕێی خوادا تووش نابێ، وە ناچنە هیچ سەرزەمینێکەوە {واتە: پێیان ناچێتە هیچ سەرزەمینێکەوە} کە کافرەکان پەستو تووڕە بکات، وە هیچ زیانێك بە دوژمن ناگەیەننو، هیچ زەبرێك لە دوژمن نادەن، مەگەر بە هەر کامێك لەوانە: ، بە تینوێتیی، بە ماندوێتیی، بە برسیەتیی، بە چوونە سەرزەمینی دوژمن، وە بە زەبر لێدانو زیان پێگەیاندنی، بە هەر کامێك لەم پێنج کردەوانە: کردەوەیەکی باشیان بۆ دەنووسرێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ١٢٠﴾، بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات، کەواتە: مەسەلە هەر ئەوە نیە، کە لە ڕێی خوادا بکوژرێنو شەهید بنو بریندار بن، بەڵکو کە: برسیی دەبن، ماندوو دەبن، تینوو دەبن، خەفەت دەخۆن، هەر ناڕەحەتییەك دەبینن، هەموویان بۆ دەنووسرێ.

﴿وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً﴾، هەروەها هەر ماڵ خەرج کردنێکی بچووك، یان گەورە ناکەن، هیچ ماڵێك خەرج ناکەن، کەم بێ، یان زۆر، ﴿وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾﴾ وە هیچ دۆڵو شیوێك نابڕن، مەگەر بۆیان دەنووسرێ، واتە: پاداشتەکەیان بۆ دەنووسرێ، بۆئەوەی خوا بە باشترین کردەوە کە ئەنجامی دەدەن لە پێناوی خوادا، کە جەنگو جیهادە، پاداشتیان بداتەوە.

لە ئایەتەکەی پێشێ دا فەرمووی: ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ﴾، مەگەر بە هەر کام لەو پێنجانە، کردەوەی باشیان بۆ دەنووسرێ، بەڵام لێرەدا فەرمووی: ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ﴾، بۆیان دەنووسرێ، چونکە ئەوانەی پێشێ هەندێکیان مرۆڤ لە دەستەڵاتی خۆی دا نیەو خۆی نایهێنێتە دی: تینووی دەبێ، برسیی دەبێ، ماندوو دەبێ، دەچێتە شوێنێك، زیانێك بە دوژمن دەگەیەنێ، بەڵام ئەمەیان ماڵەکەی خۆیان، کە دەیبەخشن، وە شیوو دۆڵەکەیە، کە دەیبڕن، بۆیە پێویستی نەکردوە بفەرموێ: (بِهِ)، چونکە خودی کردەوەکەیە، بۆیان دەنووسرێ، نەك شتێکیان کردبێ، ئنجا بەهۆی کردەوەکەوە، پاداشتی چاکیان بۆ بنووسرێ.

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم کە بریتیە لەوەی، چونکە خوا ﷻ لە زۆر لە ئایەتەکاندا باسی ئەوەی کرد، کە بڕواداران دەبێ هەموویان بچن بۆ جەنگو، نابێ کەسیان بەجێبمێنێ، جگە لەوانەی: کە بێهێزن، نەخۆشن، یان توانای ماددییان نیە.

ئنجا نەوەك مسوڵمانان وا حاڵی بووبن، کە لە هەموو حاڵەتاندا هەر دەبێ وابێ، یان لەبەرئەوەی کە خوا فەرموویەتی: بە سووکیی‌و بە قورسیی بڕۆن، وە ئەوەندە سەرزەنشتی بە جێماوەکانی کردوە، نەوەك کەسێك وا حاڵی بێ، کە مەبەست ئەوەیە: مسوڵمانان هەر کاتێك جەنگێك هاتە پێش، دەبێ هەموویان بچن‌و، هەرچی ماڵ‌و بەرژەوەندیی هەیە هەمووی بەجێ بهێڵن‌و هەموویان بڕۆن.

هەڵبەتە لە کاتی دەرچوونی گشتییدا، ئەوە هەیە، کاتێك دوژمن بەسەر وڵاتدا دەدات، لە کاتێکدا کە پێویست دەکات مسوڵمانان هەموویان کۆببنەوەو بچنە جەنگەوە، بەڵام

لە حاڵەتی ئاسایی دا، وانیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً﴾، وە بڕواداران بۆیان نیە تێکڕا بڕۆن، هەموویان بڕۆن بۆ جەنگ، ئەدی دەبێ چی بکەن؟

﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ﴾، دەبێ خەڵکی هەر شوێنێك، کۆمەڵێکیان بچن، کۆمەڵێك کە ئەو ئەرکی جەنگو جیهادە بەوان ئەنجام دەدرێ، بەشی ئەوە دەکەن، ئەو ئەرکە بەجێبێنن، بۆ ئەوەی خەڵکەکەی دیکە لە ئایین دا شارەزابنو، سەرگەرمی شارەزایی لە قورئاندابن، وە سەرگەرمی فێربوونی زانستە شەرعییەکان بن.

﴿وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ﴾، وە ئەو کۆمەڵە خەڵکەیان کە چوون بۆ جەنگ، کە گەڕانەوە ئاگاداریان بکەنەوە، واتە: شارەزایان بکەن لە شەریعەتدا، ئەوەی کە بۆخۆیان بە شێنەیی لە ماڵێ فێری بوونو شارەزای بوون، ئەو خەڵکەی کە لە جەنگو جیهاد دێنەوە، شارەزایان بکەن، یان ئەگەر ئەوان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا ماونەوە، بەنسبەت ئەو کاتەوە، یان ئەوانەی کە لە ماڵو لە شاردا دەمێننەوە، ئەوانەیان کە چوون ئەم ئەرکە جیهادییە ئەنجام بدەن، ئەرکی جەنگو جیهادو بەرگریی کردن، لەبەرئەوەی ئەوان سەرقاڵی جەنگو جیهاد بوون، کاتێك کە دەگەڕێنەوە بۆ لایان، ئاگاداریان بکەنەوەو، بەرچاویان ڕۆشن بکەنەوەو، شارەزایان بکەن، ﴿لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾، بۆ ئەوەی کە هۆشیاربنو، بێداربن، وە لە ئەنجامی نەشارەزایی لە شەریعەتدا، تووشی هەڵەو پەڵە نەبن، تەنانەت بەرانبەر بە دوژمنانیشیان.

شایانی باسە ئەم ئایەتە مانای دیکەشی بۆ لێکدراوەتەوەو مشتومڕی زۆری لەبارەوە هەیە، بەڵام لە مەسەلە گرنگەکان باسی دەکەین.

ئنجا دێتە سەر بابەتی سێیەمو کۆتایی، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ

ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! لە دژی ئەو کافرانەی کە لێتانەوە نیزیکن، بجەنگن، وە با زبریی‌و توندو تیژییتان پێوە ببینن، وە بشزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکارانداپە.

دیارە ئەوە شتێکی مەنتیقییە، کە تۆ دوژمنێکی نیزیکت هەبێ، دەبێ لەوەوە دەست پێ بکەی، خۆ نابێ بچی لە دژی دوژمنێکی دوورتر، بجەنگی، چونکە دوایی ئەو دوژمنەی نیزیکە، ڕەنگە زەفەرت پێ بەرێ، واتە: ئەم ئایەتە زیاتر لە ڕووی تاکتیکی جەنگییەوە، مسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەو دوژمنەی زیانی لە تۆوە نیزیکترە، دەبێ پێشێ دەست بەو بکەی.

وە کە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً﴾، با زبریتان پێوە ببینن، واتە: توندو زبربن لەسەریان، خۆ نابێ نەرم‌و شل بن، نابێ بە ڕەحم‌و عەتف بن لەگەڵیان، دەبێ لە هەر مەیدانەدا بە پێی خۆی، ڕەفتار بکرێ، وەك گوتراوە: {کەس لە شەڕ شەکری نەبەخشیوەتەوە}، وە گوتراوە {شەڕ بە چەك‌و مامەڵە بە دراو}، ڕەنگە یەکێك بڵێ: تەماشا بکەن! ئیسلام فەرمان بە زبریی‌و توندوتیژیی دەکات ! بەڵێ چونکە شەڕ بە توندو تیژیی‌و بە زبریی دەکرێ، بە نەرم‌و شلیی ناکرێ، بەڵام لە هەڵسوکەوت مامەڵەی ئاسایی لەگەڵ نامسوڵمانان دا، دەبێ بە بەزەیی‌و سۆزو نەرم‌و نیان بن.

بەڵام لەو زبرییەشیانداو لە گەرمەی شەڕدا، خوا پێیان دەفەرموێ: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾، وە بزانن ﷻ خوا لەگەڵ پارێزکارانداپە، دەبێ زبریی‌و توندو تیژییەکەشت وا نەبێ کە پێچەوانەی فەرمانەکانی شەریعەت بێ، نابێ سنوورەکانی شەریعەت ببەزێنی‌و لێیان تێبپەڕێنی، چونکە خوا لەگەڵ ئەوانە دایە کە خۆیان دەپارێزن لە سنوورەکانی شەریعەت دەربچن، هەروەها خۆیان دەپارێزن لەوەی پێچەوانەی یاساکانی خوا، لە ژیانی مرۆڤدا بجووڵێنەوە، کە یەکێك لە یاساکانی خوا لە ژیانی بەشەردا، ئەوەیە کە تۆ ویستت جەنگ بکەی، دەبێ سەرەتا خۆتی بۆ ئامادە بکەی، مەشق بکەی، دەبێ چەکت هەبێ، دەبێ ئیمکانیەتت هەبێ، دەبێ نەخشەت هەبێ، دەبێ بەرنامەت هەبێ، کەی دەست پێ بکەی ؟ ئەو جەنگە بکەی، یان نەیکەی؟ دەبێ ئەو شتانە هەموویان بزانی، ئنجا بچیە نێو ئەو جەنگەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

مەسەلەی یەکەم: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ﴿١٢٠﴾ ﴾.

(جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئاوا ئەم ڕستە قورئانییەی مانا کردوە، دەڵێ: (أَي لا يَضِنُوا بِأَنْفُسِهِم عَمَّا يُصِيبُ نَفْسَهُ، أي لا يَخْتَارُوا إِبْقَاءَ أَنْفُسِهِم عَلَى نَفْسِهِ فِي الشَّدَائِد)، واتە: چرووکیی‌و ڕژدیی نەکەن بە پاراستنی نەفسی خۆیان‌و، بە دوور گرتنی نەفسی، خۆیان لەوەی تووشی پێغەمبەر ﷺ دێ، واتە: سەلامەتیی‌و ئاسوودەیی خۆیان هەڵنەبژێرن لە سەغڵەتییەکاندا، بەسەر هی پێغەمبەردا ﷺ.

وە (جار الله الزمخشري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2]، بە بۆچوونی من جوان تیشك دەخاتە سەر ئایەتەکەو تەفسیری دەکات، دەڵێ:

(أُمِرُوا بِأَنْ يَصْحَبُوهُ عَلَى البَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ، وَأَنْ يُكَابِدُوا مَعَهُ الأَهْوَالَ بِرَغْبَةٍ وَنِشَاطٍ، وَاغْتِبَاطٍ، وَأَنْ يُلْقُوا أَنْفُسَهُمْ فِي الشَّدَائِدِ مَا تَلْقَهُ نَفْسُهُ، عِلْماً بِأَنَّهَا أَعَزُّ نَفسٍ عِنْدَ اللهِ وَأَكرمُهَا عَلَيْهِ، فَإِذَا تَعَرَّضَتْ مَعَ كَرَامَتِهَا وَعِزَّتِهَا لِلْخَوْضِ فِي شِدَّةٍ وَهَوْلٍ، وَجَبَ عَلَى سَائِرِ الأَنْفُس أَنْ تَتَهَافَتَ فِيمَا تَعَرَّضَتْ لَهُ، وَلاَ يَكْتَرِثَ لَهَا أَصْحَابُهَا، وَلا يُقِيمُوا لَهَا وَزْناً، وَتَكُونُ أَخَفَّ شَيءٍ عَلَيْهِم وَأَهْوَنَهُ، فَضْلاً عَنْ أَنْ يَبعدوا بِأَنْفُسِهِم عَنْ مُتَابَعَتِهَا وَمُصَاحَبَتِهَا، وَيَضِنُوا بِهَا عَلَى مَا سَمَحَ بِنَفْسِهِ عَلَيْهِ)، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان ئەم عیبارەتەیان لە زەمەخشەریی خواستۆتەوە.

---

١) محاسن التأويل، ج ٨، ص ٣٥٥.

٢) الكشاف، ج ٢، ص ٣٠٦.

واتە: فەرمانیان پێکراوە کە لە کاتی سەغڵەتییو ناخۆشیی دا، لەگەڵی بنو، هاوەڵی بن، وە لەگەڵ ئەودا ئارەزوومەندانەو، بەڵکو زۆر بە چالاکییو خۆشحاڵییەوە رووبەرووی گرفتارییو نارەحەتییو سەختییەکان ببنەوە، وە ئەوەی کە نەفسی ئەو تووشی دێ، لە سەختییان، ئەوانیش نەفسی خۆیانی تێهاوێن، لە حاڵێکدا کە نەفسی پێغەمبەر ﷺ لەلای خوا بەرێزترینە، ئنجا ئەگەر نەفسی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو رێزەدا کە لە لای خوا هەیەتی، بچێتە نێو توندییو نارەحەتییانەوە، ئەوە لەسەر باقی نەفسەکانی بڕواداران کە خۆیان بە شوێنکەوتووی ئەو دەزانن، پێویستە، ئەوانیش ئەوەی کە ئەو خۆی خستۆتە نێو، بچنە نێوی، وە خاوەنەکانیان گوێ بە نەفسەکانی خۆیان نەدەن، وە هیچ سەنگێکیان بۆ دانەنێن، کە ببێتە مایەی ئەوەی خۆیان دووربگرن، لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ خۆی خستۆتە نێو، وە ئەو نەفسانە لەلای خاوەنەکانیان، سووکترو کەمتربن لەوەی کە لە شتێك بیانپارێزن، کە پێغەمبەر ﷺ خۆی لێ نەپاراستوە، نەك شوێنی پێغەمبەر ﷺ نەکەونو، لە خزمەتی دا نەبن، وە ئەوەی کە ئەو زۆر سەخاوەتمەندانە دەیبەخشێ لە تەحەممولکردنی نارەحەتییو گرفتارییو خۆ خستنە نێو سەختییەکانەوە ئەوان بێن چرووکیی پێ بکەن !.

<u>مەسەلەی دووەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾﴾.

واتە: بۆیە بڕواداران دەبێ لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دابن، {وە دوایی لە خزمەت هەر کەسێکدا بن کە بە رێی پێغەمبەردا ﷺ دەیانبات، چونکە ئەم ئایەتانە هەر بۆ رۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتوونە خوار، هەر کەسێکی دیکەش لە هەر رۆژگارێكو هەلومەرجێکدا هەمان ئەرکی پێغەمبەر ﷺ کە لە نێو هاوەڵانیدا بینیویەتی، هەر کەسێکیش کە بە رێی پێغەمبەر ﷺ بڕواتو هەمان ئەرك ئەنجام

بدات، مسوڵمانانێکیش کە لەو ڕۆژگارەدا هەن، هەمان ئەرك کە هاوەڵان لەسەر شانیان بووە بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ، کەوتۆتە سەر شانیان، وە دەبێ هاوەڵان چۆن لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دابوون، بڕوادارانیش ئاوا لە خزمەت هەر کەسێکدابن، کە هەمان ئەرکی پێغەمبەریان ﷺ لە نێودا ئەنجام دەدات}، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە هەرکام لەم پێنج شتانەیان بێنەڕێ :

١/ ﴿ظَمَأٌ﴾، تینوێتیی.

٢/ ﴿نَصَبٌ﴾، ماندوێتیی.

٣/ ﴿مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾، برسێتیی لە ڕێی خوادا .

٤/ ﴿يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ﴾، بچنە هەر شوێنێك کە کافران پەست بکات.

٥/ ﴿وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا﴾، وە هەر زیانێك لە دوژمن بدەن.

هیچ کامێك لەو پێنجانە نیە کە ئەنجامی بدەن ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ﴾، مەگەر بەهۆیەوە، کردەوەیەکی باشیان بۆ دەنووسرێ.

ئنجا خوای کاربەجێ هەمووشیانی بە نەزانراو نکرة) هێناوە: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢١﴾﴾.

واتە: هەر تینوێتییەك، کەم بێ یان زۆر بێ، وە هەر ماندوێتییەك، کەم بێ یان زۆر بێ، هەر برسێتییەك، کەم بێ، یان زۆر بێ، هەر شوێن پێیەك لەسەر زەمینی دوژمندا دابنێن‌و، هەر شوێنێك بگرن، کەم بێ، یان زۆر بێ، وە هەر زەفەرو زیانێك

بە دوژمن بگەیەنن، کەم بێ، یان زۆر بێ، بە هەر کامێك لەوانە، کردەوەیەکی باشیان بۆ پێ دەنووسرێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات، ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ، کە چاکەکار (محسن) لە زاراوی قورئان دا کەسێکە: لە ڕێی خوادا تینوو بێو، ماندووبێ، وە برسیی بێ، وە بڕوات لە سەر زەمینی خۆی دووربکەوێتەوە بۆ سەر زەمینی دوژمن، وە هەوڵبدات زەبر لە دوژمن بدات، هەر کەسێك ئەو سیفەتانەی هەبن، ئەوە چاکەکارە، هەر چەند چاکەکاریی (إحسان) هەر لەوانەشدا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵام بەو کردەوانەش مرۆڤی مسوڵمان دەبێتە چاکەکار، لەگەڵ ئەو کردەوانەی کە لە شوێنەکانی دیکەشدا باسکراون.

مەسەلەی سێیەم: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةٗ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةٗ وَلَا يَقۡطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمۡ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢١﴾.

وە هیچ ماڵ خەرج کردنێکی گچکە، یان گەورە ئەنجام نادەن، {گچکە واتە: کەم، گەورە واتە: زۆر} وە هیچ دۆڵێكو شیوێك نابڕن، مەگەر بۆیان دەنووسرێ، تاکو خوا پاداشتی باشترین کردەوەیان بداتەوە، کە ئەنجامیان داوە.

لێرەدا ئەگەر تەماشا بکەین، خوای کاربەجێ تۆزێك تەفصیلی داوەتێ، ئەوە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (إطناب) ئەوەیە کە شتێك بە ڕوونیی‌و وردیی باس بکەی‌و تەفصیلی بدەیە، چونکە خوا ﷻ کاربەجێیەو دەیەوێ ئەو جەنگاوەرانە تێبگەیەنێ: هەر کارێك کە دەیکەن لە پێناوی خوادا، خوا هەموویان بۆ تۆمار دەکات، هەمووشی دەبینێ، وە قەدری هەمووشی دەزانێ، بۆیە لێرەدا شێوازی درێژە پێدان‌و بە ڕوونیی‌و بە وردیی قسە کردن بەکاردێنێ، بۆ ئەوەی هەر کەسێك کە لە پێناوی خوادا ماندوو دەبێ، بزانێ کە هیچ شتێکی نیە بۆی تۆمار نەکرێ، لە: برسیەتیی، لە تینوێتیی، بێ خەویی، سەرمابوون، گەرمابوون، لە ماڵ بەخشیین، هەمووی دەنووسرێ.

وشەی (النفقة) دەڵێ: (نَفَقَ الشيء ينفُقُ نَفْقاً: نَفِدَ)، واتە: ئەو ماڵە تەواو بوو، خەرج کرا، وە دەگوترێ: (نَفَقَ الزَّادُ، ونَفَقَتِ الدَّرَاهِمُ، وَنَفَقَ اليَرْبُوعُ: خَرَجَ مِنْ نافَقَائِهِ: جُحْرِهِ).

(نَفَقَ الزَّادُ)، واتە: تێشووەکەو زادو زەخیرەکە تەواو بوو، (نَفَقَتِ الدَّرَاهِمُ) درهەمەکان تەواو بوون، (نَفَقَ اليَرْبُوعُ)، (يربوع) واتە: جرج، کە لە کونەکەی خۆی دەردەچێ، دەگوترێ: (نَفَقَ)، وە تونێل (نَفَقْ) ئەوەیە کە چیایەك کون بکرێ، دەرەو دیو بکرێ، کە بە زۆریی وایە جادەی لێ دروست دەکرێ، وە (نافِقَاء) بە کونی جرج دەگوترێ، کونی جرج دوو دیوی هەن، لەوێ تینی بۆبێ، لە لایەکەی دی دەردەچێ.

(نَفَقَتِ الدَّابَّةُ نُفُوقاً: مَاتَتْ) ئاژەڵێك کە مردار دەبێتەوە، ئەوەش پێی دەگوترێ: (نَفَقَتْ) دوای ئەوەی کە دەمرێ.

کەواتە: (الإنْفَاق) بریتیە لە (بَذْلُ المَالِ وَنَحْوَه فِي وَجْهٍ مِنْ وُجُوه الخَيْرِ)، ماڵو سامانی خۆت لە ڕووێك لە ڕووەکانی خێرو چاکەدا، ببەخشی.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا ﴾، (الوَادِي: المُنْفَرِج يَكُونُ بَيْنَ جِبَالٍ وَآكَامٍ، وتلال، فَيَكُونُ مَنْفَذاً لِسَيَلان المياه)، (وادي) کە بە (أودية) کۆ دەکرێتەوە، دۆڵ، دۆڵەکان، یان شیو، شیوەکان، هەر دابڕاوییەکە لە نێوان دوو شاخدا، یان دوو گرددا، یان دوو تەپۆلکەدا، کە بە زۆریی وایە ئاو بەو شوێنانەدا دێ.

کە تەماشای ڕووبارەکان بکەین، بە زۆریی بە دابڕاوییدا دێن.

﴿ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾، واتە: بۆ ئەوەی پاداشتی باشترین کردەوەیان بداتەوە، کەواتە: جەنگ لە پێناوی خوادا، لە کاتو شوێنی خۆیدا، باشترین کردەوەیە، هەر بۆیەش ئەوەندەی خوا ﷻ مەدحی تێکۆشەرانو جەنگاوەرانی ڕێی خوای کردوە، مەدحی هیچ کەسێکی هێندە نەکردوە، بۆیەش زانایان دەڵێن: لە خواپەرستییە شەخصییەکاندا، نوێژ لە هەموو خواپەرستییەکان گەورەترە وە لە خواپەرستییە هەرەوەزییەکاندا، جەنگو جیهاد لە هەموویان گەورەترە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، {انْتَصَبَ (أَحْسَن) عَلَى نَزْعِ الخَافض، أَي: عَنْ أَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلون، أَوْ بأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُون}.

(أحسن) بەوە (منصوب) بووە کە ئەوەی (مجرور ـ مخضوض ـ)ی کردوە، لێی لابراوە، بەو پێیە کە ئەصڵ ئاوا بووە (لِيجْزِيَهُمُ اللهُ بأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُون) یاخود (لِيجْزِيَهُمُ اللهُ عَن أَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُون)، ئەوەی کە (مجرور ـ مخضوض ـ)ی دەکات، کە (بـ) یان (علی)یە لابراوە، بووەتە: ﴿لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾.

کە دەفەرموێ: ﴿أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، واتە: بە پێی باشترین کردەوەیان کە جەنگو جیهادە، مانایەکی دیکەشی ئەوەیە: (لِيَجْزِيَهُمْ بكُلّ عَمَلٍ مِمَا ذُكِر أَحْسَنَ جَزَاءٍ عَلَى أَعْمَالِهِم الحَسَنَة، أَي فِي غَيْرِ الجِهَادِ بالمَالِ وَالنَّفْسِ).

واتە: بە هەر کام لەو کردەوانە، باشترین پاداشتیان دەداتەوە، جگە لەو سەرو ماڵ بەخشینەیان، واتە: سەرو ماڵ بەخشینەکە باشترین کردەوەیە، بەڵام بە هەر کام لەو کردەوانەی دیکەش، جیا لەو سەرو ماڵ بەخشینە، باشترین پاداشتیان دەداتەوە، چونکە لە جەنگو جیهاد دایە.

با لەوبارەوە ئەم دەقە بێنین:

﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِأَلْفِ دِينَارٍ فِي ثَوْبِهِ، حِينَ جَهَّزَ النَّبِيُّ ﷺ جَيْشَ الْعُسْرَةِ، قَالَ فَصَبَّهَا فِي حِجْرِ النَّبِيِّ ﷺ فَرأيت النَّبِيُّ ﷺ، يُقَلِّبُهَا بِيَدِهِ، وَيَقُولُ: مَا ضَرَّ ابْنَ عَفَّانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ الْيَومِ، يُرَدِّدُهَا مِرَاراً﴾، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٠٦٤٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٧٠١)، وحَسَّنَهُ كل من الألباني وشعيب الأرنؤوط}.

واتە: عەبدورڕەحمانی كوڕی سەمورە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: عوسمانی كوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێ، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ (لە جەنگی تەبووك) لە پۆشاكەكەیدا، (یان پارچە قوماشێك) هەزار دیناری زێڕی هێنا، بۆ ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ڕۆژە سەغڵەتییەكە (كە جەنگی تەبووك)ە پێی ئامادە بكات، ئنجا هەزار دینارە زێڕەكەی خستە كۆشی پێغەمبەرەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، دەستی تێوەردەداو پێی سەرسام بوو، وە فەرمووی: لەمەودوا كوڕی عەففان هەر كردەوەیەك بكات زیانی پێ ناگەیەنێ، چەند جارێك ئەوەی دووبارە كردەوە.

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری كردۆتەوە، كە كاتێك دێ عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، خەڵكێك بەهانەی پێ دەگرن، بۆخۆشی هەندێك خاڵی لاوازی دەبن، خەڵكێكیش لێی لە بەهانە دەبن‌و، بۆی لە بۆسەدا دەبن، بۆیە فەرموویەتی: ئێستاو لە كاتی ئەو سەغڵەتییە دژوارەو، ئەو تەنگ دەستییەدا، ئەو ماڵ بەخشینە گەورەیەی دەكات، دەبێتە قەرەبووی بۆ داهاتووی، ئەگەر كەم‌و كوڕییەكیشی ببێ، ئەو ماڵ بەخشینەی ئێستای شەفاعەتی هەڵەی داهاتووی بۆ دەكات.

هەڵبەتە عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، سێیەمین خەلیفەی سەر ڕاستی پێغەمبەر ﷺ بووە، بەڵێ كەم‌و كوڕیی هەبووە، وەك هەر مرۆڤێك، بەڵام بە تەئكید، بە تەئكید ئەوانەی شەهیدیان كرد، ستەمیان لێكرد، وە شایستەی ئەوە نەبوو، وە دەكرا كەم‌و كوڕییەكان بە شێوەی دیكە چارەسەر بكرێن، بەڵام دەستی پیسیشی تێدا هەبوو، وە ئەوانەش ستەمێكی گەورەیان لێكردو شەهیدیان كرد.

**مەسەلەی چوارەم:** كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ ١٢٢﴾.

وە نابێ بڕواداران تێكڕا هەموویان بچن بۆ جەنگ، دەبووایە لە هەر خەڵكێكی زۆر، كۆمەڵێكیان بچن بۆ جەنگ، بۆ ئەوەی دوایی خەڵكەكەیان كە گەڕانەوە بۆ

لایان (واتە: جەنگاوەرەکان کە لە جەنگ هاتنەوە) ئەوانەی کە ماونەوە لە شاردا، وە سەرگەرمی وەدەستهێنانی زانیاریی‌و تێگەیشتن لە ئایین بوون، ئەوان ئاگادار بکەنەوە، بۆ ئەوەی وریابن‌و لە هەڵەو پەڵە بە دووربن.

وەك پێشتریش باسمان کرد: لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەم سوورەتەدا خوای پەروەردگار زۆر باسی جەنگ‌و جیهادی کردوە، وە زۆریش سەرزەنشتی دانیشتووان‌و خۆ بەجێهێڵەران‌و بەجێماوانی کردوە، ڕەنگە کەسانێك خەیاڵ‌و گومانێکی وایان بۆ دروست بێ، کە مسوڵمانان کاتێك جەنگێکیان دێتە پێش، دەبێ هەموویان بچن بۆ جەنگ، بەبێ ئەوەی یەکێش لەسەر هەموویان کەوتبێ، کە ئەوە ڕاست نیە، چونکە تەنیا ئەگەر دەرچوونی گشتیی (النفير العام) بێ، ئەوە دیارە مسوڵمانان دەبێ هەموویان بچن، بۆیە لەم ئایەتەدا باسکراوە، کە نابێ مسوڵمانان هەموویان سەرگەرمی دەرچوون بن، دەبێ لە هەر کۆمەڵگایەك، کۆمەڵێك کەس بچن بۆ جەنگ‌و جیهاد.

بۆیە لەم ئایەتەدا هەم فەرمان بە جەنگ کردن کراوە، هەم فەرمان بە وەرگرتنی زانستیش کراوە، وە بە یەك پلەش هاتوون، وەك خوا لەم سوورەتی تەوبەدا فەرمووی: ﴿ مَا كَانَ لِأَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ وَمَنۡ حَوۡلَهُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ ﴿١٢٠﴾ ﴾، لێرەش فەرمووی: ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٍ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾. وەك چۆن دەفەرموێ: خەڵکی مەدینەو عەرەبە خێڵەکیی‌و بیابانشینەکانی دەوروبەریان نابێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بمێنن، کاتێك کە دەچێ بۆ جەنگ.

ئەوەی دیکەیان دەفەرموێ: بڕواداران نابێ بە تێکڕایی بچن بۆ جەنگ، دەبوایە لە هەر خەڵکێکی زۆر کۆمەڵێکیان بچن، وە ئەوانی دیکە لە ئایین دا شارەزا بن، وە هەر کاتێك کە جەنگاوەرەکان گەڕانەوە، شارەزیان بکەن‌و بەرچاویان ڕوون بکەنەوە، بۆ ئەوەی تووشی هەڵەو پەڵە نەبن.

هەڵبەتە لێرەدا دەربارەی مانای ئەم ئایەتە: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً﴾، توێژەروان بە سێ جۆر لێکیان داوەتەوە:

١) بە بۆچوونی زۆربەی توێژەروان، کە منیش ئەم رایەم پێ ڕاستە، دەڵێن: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە: کە هەموو مسوڵمانان نابێ بچن بۆ جەنگ، چونکە (نَفَرَ يَنْفِر نَفْراً) زیاتر بۆ دەرچوون بۆ جەنگ بەکارهاتوە لە زمانی عەرەبیی‌و لە بەکارهێنانی قورئانیشدا.

٢) بە شێکیش گوتوویانە: مەبەست لەم ئایەتە ڕێگرتنە لە مسوڵمانان بە تێکرایی دەربچن بۆ وەرگرتنی زانست، بەڵکو دەبێ لە هەر کۆمەڵێکی زۆر هەندێکیان بچن.

٣) هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە کە ئەو جەنگاوەرانەی دەچن بۆ جەنگ‌و جیهاد، پێویستە کە گەڕانەوە لای خەڵکەکەیان، ئەو تێگەیشتن‌و شارەزاییەی لە گەرمەی جەنگ‌و جیهاددا وەدەستیان هێناوە، خەڵک‌و کۆمەڵگاکەیانی لێ بەهرەمەند بکەن‌و بەرچاویان ڕوونبکەنەوە، کە ئەمە: (طبري) و (سید قطب) پەسندیان کردوە.

بەڵام لە ڕاستییدا ﴿لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً﴾، واتە: نابێ هەموویان تێکڕا بچن بۆ جەنگ، بە بەڵگەی چی؟

بە بەڵگەی ئەوەی خوا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ... ﴿٣٨﴾﴾ التوبة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆچی ئەگەر پێتان گوترا: لە ڕێی خوادا بچن بۆ جەنگ، بەرگریی لە خۆتان‌و ئایینەکەتان‌و نیشتیمانەکەتان‌و بەرژەوەندییەکانتان بکەن، خۆتان بە زەوییەوە نووساند، خۆتان قالب گران کرد، بە زەحمەت هەڵسان؟

هەروەها هەر لە هەمان سووڕەتدا دەفەرموێ: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا ... ﴿٤١﴾ ﴾التوبة، واتە: بڕۆن، دەربچن (بۆ جەنگ) بە سووکیی‌و بە قورسیی.

هەروەها دەگوترێ: (الإِسْتِنفَارُ: الحَثّ عَلَى القِتَالِ)، واتە: (إِسْتِنفَارُ) یانی هاندان بۆ جەنگ. بەڵێ وشەی (نَفَرَ، وَنَفَرَ، وَيَنْفِرُ) هەم لە قورئانو، هەم لە زمانی عەرەبییدا، بە مانای دەرچوون بۆ جەنگ‌و جیهادە.

کە دەفەرموێ: ﴿لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ﴾، واتە: بۆ ئەوەی ئەوانەی کە نەچوون بۆ جەنگ‌و جیهاد لە ئاییندا شارەزابن، (التَّفَقّه: تَكَلُّف الفَقَاهة وَهِيَ مُشْتَقّةٌ مِنْ: (فَقِهَ) إِذَا فَهِمَ مَا يَدِقّ فَهْمُهُ)، (تَفَقُّه) بریتییە لەوەوە کە ئینسان خۆی ماندوو بکات بۆ شارەزا بوون، (فَقِهَ)ەوە هاتوە، یانی: لە شتێك تێگەیشت کە پێویستی بە ڕامان‌و بیرلێکردنەوە هەبوو.

(فِقْه) لە (علم) تایبەتترە، هەر بۆیەش لە قورئاندا وشەی (فقه) بەکارهاتوە بۆ شتێك کە زانین‌و پەی پێبردنی پەنهانە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡ ﴿٤٤﴾ ﴾الإسراء، واتە: ئێوە لە خوا بە پاك گرتنی دروستکراوەکان، تێناگەن.

ئنجا (فَقِهَ) واتە: تێگەیشت، بەڵام (فَقُهَ) واتە: بوو بە بە (فقیه)، شارەزا بوو، لە شەرع داو زانست بۆی بوو بە مەلەکەیەك‌و حاڵەتێکی ڕۆچوو تێیدا[1].

وە وشەی (فِقْه) ئا وا پێناسە کراوە: (الفِقْهُ: العِلْمُ بالأَحْكام الشَّرْعِية العَمَلِية المُكْتَسِبَة مِنْ أَدِلّتِها التّفصيلية بالإِجْتِهاد).

واتە: (فقه) بریتییە لە زانیاریی پەیداکردن بە حوکمە شەرعییە کردەییەکان، کە لە بەڵگە تەفصیلییەکان وەردەگیرێن بەهۆی ئیجتیهادەوە.

١) التحرير والتنوير، ج ١١، ص ٦١.

كە دەفەرموێ: ﴿وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ﴾، (الإِنْذَارُ: الإِخْبَارِ بِمَا يتوقعُ مِنه الشرّ، وَإِخْبَارٌ فِيهِ تَخْوِيف).

(إنذار) هەواڵ پێدانێکە کە خراپەی لێ مەزەندە دەکرێ، هەروەها (إنذار) بە مانای ئاگادارکردنەوەو هەواڵێکە کە ترساندنی تێدابێ.

کە لێرەدا مەبەست پێی شارەزاکردنو فێرکردنی ئەو جەنگاوەرانەیە، وە بەرچاو ڕوونکردنەوەیانە، بۆ لێك جیاکردنەوەی هەقو باطڵو، حەڵاڵو حەرامو، چاكو خراپ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾، بەڵکو وریا بن، ئاگادار بن، بەرچاوڕوون بن، (الحَذَرُ والحِذْرُ: التحرُّز)، (حَذَرُ، حِذْرُ) هەردووکیان بە مانای خۆپاراستنو وریا بوون، دێن، دەگوترێ: (حَذِرَهُ) لێی وریا بوو، خۆی لێ پاراست، (التحذير: التخويف)، (تحذير) واتە: ترساندنو، وریا کردنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ﴾، دوو بۆچوون هەیە:

١- (طبري) دەڵێ: بۆ ئەوەی جەنگاوەرەکان لە ئاییندا شارەزابن، ئەو موجاهیدانە کە دەچن بۆ جەنگو جیهاد، بەهۆی جەنگو جیهادەوە، لە ئایین شارەزا دەبن، (سید قطب)یش هەر ئەو مانایەی لە (طبري) وەرگرتوەو پەسندیشی کردوە.

٢- بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: واتە: تاکو ئەو خەڵکانەی کە ماونەوەو لە ماڵ دانیشتوو ون، لە ئاییندا شارەزابن .

لە ڕاستییدا ڕای زۆربەی زانایانیش ڕاستە، چونکە هەرچەندە ئینسان لە گەرمەی جەنگو جیهاددا: قایم دەبێ، پتەو دەبێ، بەرچاو ڕوون دەبێ، زۆر شت فێر دەبێ، بەڵام بەڕاستیی تێگەیشتن لە قورئانو سوننەتو شەریعەتو دیراسە کردنیان، زیاتر حاڵەتی ئاساییو ژیانی ئاسایی دەوێ، دانیشتنی سەر چۆکانی دەوێ، دانیشتن لەبەردەمی مامۆستای دەوێ، لێکۆڵینەوەی دەوێ، وردبوونەوەی دەوێ، ئەوەش لەگەڵ کەشو هەوای ڕووبەڕووبوونەوەو شەڕو تەقەو کوشتاردا، گونجاو نیە.

(محمد رشید رضا) لـه تـەفسیـری ئـەم ئایـەتـانەدا کـە باسـمان کـردن، بەسـەرهاتێکی خۆی دەگێڕێتـەوە[1]، دەڵێ:

(كُنْتُ أَطْلُبُ الْعِلْمَ فِي طَرابُلُسَ وَكَانَ حاكِمُها الْإِدَارِيُّ (الْمُتَصَرِّفُ) فِيها مُصْطَفَى بَاشا بَابَانِ مِنْ سَرَوَاتِ الْكردِ، وَكَانَ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالْفِقْهِ فِي مَذْهَبِ الشافِعِيةِ، وَقَدْ قَالَ لِي مَرَّةً فِي دَارِنا بِالْقَلَمُونِ: لِمَاذَا تَسْتَثْنِي الدَّوْلَةُ الْعُلَماءَ وَطُلاَّبَ الْعُلُومِ الدِّينِيةِ مِنْ الخِدْمَةِ الْعَسْكرِيةِ، وَهِيَ وَاجِبَةٌ شَرْعًا وَهُمْ أَوْلَى النَّاسِ بِالْقِيامِ بِهَذَا الْوَاجِبِ ؟).

واتـە: من فوتـابیی بووم لـه (طرابُلُسْ)، حاکمـە ئیداریـیەکەی کە (متصرف)ی پێ گوتراوە، (مُصْطَفَى پاشا بابان) بـوو لـە کەسایـەتییـە نـاودارەکـانی کـورد، وە کەسێکی زانـاو شارەزابوو، بە تـایبەت لـە مەزهـەبی شـافیعـی دا، دەڵـێ: جارێك لـە ماڵی خۆمان لـە (قلمون)، پێی گوتم: بۆچی دەوڵەت زانـایـان‌و فوتـابیـانی زانیـاریی شـەرعیی هەڵـدەاوێرێ، لـە خزمـەتی سـەربازیی، لـە حاڵـێك داکە بەپـێی شـەرع فـەرزەو، ئـەوانیش لـە پێشتـرین کەسـن، کـە ئـەو خزمەتـە بکەن‌و ئـەو ئـەرکە جێبـەجێ بکەن؟

منیش گوتم: ئـەوە بەڵگەکەی لـە قورئـاندا هـەیـە.

گوتی: کـوا ؟

منیش ئەو ئـایـەتـەم بۆ خوێـندەوە: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

دەڵێ: ئـەویش مەدحی کـردمو، پێی خۆشـبوو [redacted] من زانیم ئەو ئـایەتـە موبارەکە ئـەوە دەگەیـەنـێ، دیـارە ئـەویش دەبـێ مەبەستی پێی تـاقیکـردنەوەی ئـەو بـووبـێ، تـاکو بزانـێ، چ زانیـارییـەکی لـەوبارەوە، هـەیـە ؟!.

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج ١١، ص ٦٦.

## قسەیەك لەبارەی نەسخ كردنەوەی ئەم ئایەتە بۆ ئایەتەكانی دیكە

دەربارەی ئەم ئایەتە موبارەكە: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟﴾، مشتومڕێك لە نێوان زانایاندا هەیە، كە گوتوویانە: ئەم ئایەتە لابەر (ناسخ)ە بۆ ئایەتەكانی دیكە ! با تەماشا بكەین:

﴿أَخْرَجَ أَبُو دَاوُدَ فِي نَاسِخِهِ وَابْنُ أَبِي حَاتِم، وَابْنُ مَرْدَوَيه عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: نَسَخَ هَؤُلاءِ الآيَاتِ: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴿٤١﴾﴾التوبة، و ﴿إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٩﴾﴾التوبة، قَوْلُهُ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَافَّةً﴾، يَقُولُ: لِتَنْفِرْ طَائِفَةٌ، وَتَمْكُث طَائِفَةٌ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَالمَاكِثُونَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ هم الَّذِينَ يَتَفَقَّهُونَ فِي الدِّين ويُنْذِرُونَ إِخوانَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِم مِنَ الغَزْوِ، وَلَعَلَّهُمْ يَحْذَرُون مَا نَزَلَ مِنْ بَعْدِهِم مِنْ قَضَاءِ اللهِ فِي كِتَابِهِ وَحدُودِهِ﴾، {فتح القدير، ج٢، ص٦٠٤}.

واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: ئەم ئایەتانە نەسخ كراونەتەوە (بەم ئایەتەی ئێستا خەریكی توێژینەوەین): ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴿٤١﴾﴾ التوبة، ﴿إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٩﴾﴾ التوبة، ئەم دوو ئایەتە، ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟﴾، نەسخی كردوونەوە، ئایەتەكە دەفەرموێ: با كۆمەڵێك بچن بۆ جەنگ، وە ئەوانی دی با لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بمێننەوە، ئەوانەش كە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ ماونەتەوە، ئەوانەن كە لە ئایینـدا شارەزا دەبن، وە ئەو برایانەیان كە چوون بۆ جەنگ، دوای ئەوەی لە جەنگ دەگەڕێنەوە بۆ لایان، شارەزایان دەكەن، وریایان دەكەنەوەو فێریان دەكەن، لەوەی كە لە دوای وان هاتۆتە خوار، لە بڕیاری خوا، وە لە كتێبی خۆیو لە سنوورەكانی خوا .

ئنجا ئایا ئەمە ڕاستە ؟

نەخێر لە ڕاستییدا وانیە، ئنجا ئێمە با گوێ لە (محمد رشيد رضا) بگرین، کە لە تەفسیرەکەی دا قسەیەك دەکات، من بۆچوونەکەیم پێ جوانە، وەڵامی ئەو قسەیە دەداتەوە، دەڵێ:

(فَأَمَّا قَوْلُهُ فِي الرِّوَايَةِ الأُولَى بِأَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَسَخَتْ آيَاتِ النَّفِيرِ الْعَامِّ، فَهُوَ قَدْ يُوَافِقُ إِطْلاقَ السَّلَفِ فِي النَّسْخِ، وَمِنْهُ عِنْدَهُمْ تَخْصِيصُ الْعَامِّ، وَتَقْيِيدُ الْمُطْلَقِ، وَلا يَصِحُّ هُنَا النَّسْخُ الْمُصْطَلَحُ عَلَيْهِ فِي أُصُولِ الْفِقْهِ، لأَنَّ مَوْضِعَ النَّفِيرِ الْخَاصِّ، غَيْرُ مَوْضِعِ النَّفِيرِ الْعَامِّ، فَلاَ تَنَافِيَ بَيْنَ الأَحْكَامِ، وَبِهَذَا يَقُولُ جُمْهُورُ الْعُلَمَاءِ) [1].

واتە: قسەکەی کە لە ڕیوایەتی یەکەمدا هاتووە، دەڵێ: ئەم ئایەتە: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً﴾، ئایەتەکانی دەرچوونی گشتیی، نەسخ کردوونەوە، (عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، کە وادەڵێ) ئەوە بە پێی زاراوەی زانایانی پێشین وایگوتووە کە ئەوان وشەی نەسخیان بەکارهێناوە، بە مانای ئەوە کە حوکمێکی گشتی هەیە، دوایی حوکمێکی دیکە دێ، تایبەتی دەکات، وە حوکمێکی ڕەها هەیە، کوحمێکی دیکە دێ بەندداری دەکات، بەڵام لێرە وشەی نەسخ بەو چەمکەی کە دوایی زانایان لە (أصول الفقه)دا بەکاریان هێناوە، کە بریتیە لە: (إِزَالَةُ حُكْمٍ سابق بحُكْم لاحِق)، ئەمە لێرەدا بە کەڵك نایەت، {وە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش مەبەستی ئەوە نەبووە} چونکە دەرچوونی تایبەت، جیایە لە دەرچوونی گشتی، بۆیە ئەو حوکمانە تێکناگیرێن، تاکو بڵێین ئەمەیان ئەوی دیکەی لابردوە، وە ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە.

واتە: ئایەتەکانی پێشێ، کە گوایە نەسخ کراونەتەوە، باسی حاڵەتێك دەکەن، کە لەسەر مسوڵمانان پێویست بکات کە بە گشتیی دەربچن، ئنجا ئەوە هەر لە شوێنی خۆیەتی، هەر کاتێك لێقەومان بوو، هەر کاتێك حوکمڕانی مسوڵمانان، یان دەوڵەت بڕیاریدا خەڵك هەمووی دەربچێ، هەموو ئامادەبن بۆ جەنگ،

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج١١، ص٦٦ و ٦٧.

ئەوە بێگومان دەبێ هەموو ئامادەبن، بەڵام ئەم ئایەتە: مەبەست پێی حاڵەتی تایبەتە، لە حاڵەتی ئاسایی دا بۆ جەنگێکی تایبەت، ئەوە پێویست ناکات هەموو دەربچن، بەڵکو کۆمەڵێك دەردەچن، وە ئەوانەی دیکە دەمێننەوە.

بەڵام ئێستا لە کۆتایی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا دەڵێم :

پێم وایە ئەگەر ئەم ئایەتە بەمجۆرەش تەفسیر بکرێ، زۆر ڕێی تێدەچێ: وە بڕواداران نابێ هەموویان تێکڕا بچن بۆ وەرگرتنی زانستیی لەبارەی شەریعەتەوەو، لە ئایین دا شارەزابوون، بەڵکو دەبێ لە هەر خەڵکێکی زۆر بەشێکیان بچن، پاشان کە گەڕانەوە لای خەڵکەکەیان، بەو زانستو شارەزاییەی وەریان گرتووە خەڵکەکەیان وریا بکەنەوەو بەرچاوو ڕوون بکەن، بەڵکو لە ئەنجامی شارەزابوون لە ئایین دا، خۆیان بپارێزن لە هەڵەو پەڵەو لادانو تاوان.

واتە: وشەی (لِّيَنفِرُواْ) و (نفر) بە چوونە جەنگو جیهاد تەفسیر نەکرێ، بەڵکو بە چوون بۆ گەشتی پەیداکردنی زانستی شەرعیی، تەفسیر بکرێ، ئنجا ئەو ئایەتەش هەر کام لە : جەنگو جیهادو ، بەدوای زانست دا گەڕان (القتال والجهاد) و (طلب العلم) دەخرێنە دوو تای تەرازوویەکەوەو یەکسان دەکرێن، ئاشکراشە: وەك چۆن کۆمەڵگای مسوڵمان نابێ لە کۆمەڵێکی فیداکارو موجاهید خاڵی بێ، کە بەرگریی لێ بکەن لە بەرانبەر دوژمنانی دا، بە هەمان شێوەش، نابێ لە کۆمەڵێکی زانست خوازو شارەزا لە ئایین دا خاڵی بێ، کە سەرگەرمی بەرچاو ڕوونکردنەوەو شارەزاکردنو پەروەردەکردنی بن .

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! دژی ئەو کافرانەی لێتانەوە نیزیکن (وە ئیعلانی دوژمنایەتییان کردوە) بجەنگن.

وەك پێشتر باسمان کرد، شتێکی مەنتیقیی نیە تۆ بچی لەگەڵ کافرێکی دوورە دەستدا بجەنگی، ئەوەی لە نیزیکیشتەوەیە وازی لێبێنیو، دوایی ئەو بەسەر

ماڵو منداڵتدا بدات، یاخود لە پشتەوە لێت بدات، سەرەنجام بکەویە نێوان دوو بەرداشان !! ئەوە لە ڕووی تەکتیکی جەنگییەوە شتێکی ڕاست نیە.

﴿وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً﴾، وشەی (غليظ) بۆ هەر شتێك كە زبرو پتەوو ڕەقو توند بێ، بەكاردەهێنرێ، واتە: با زبریی‌و توندییتان پێوە ببینن، پێشینان گوتوویانە: (مامەڵە بە دراوو، شەڕ بە چەك)، بێگومان دوژمن ئەگەر زبریی‌و توندیی‌و پتەویت پێوە نەبینیی‌و، ئەگەر ئازاو بوێرو چاونەترس نەبی، لێت ناترسێ‌و تەماعت تێ دەكات، لە لایەن دڕندانییشەوە ئەو نێچیرانەی تووك نەرم‌و بێ زیان‌و فەقیرن، زیاتر پەلامار دەدرێن، بەڵام ئەگەر زبریی‌و دڕكێكی پێوە هەبێ، دیارە ئەو دڕندەیە حیسابێكی بۆ دەكات، پێشینانی خۆشمان گوتوویانە: (كەس لە شەڕ شەكری نەبەخشیوەتەوە).

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾، وە بزانن بێگومان خوا لەگەڵ پارێزكاران دایە.

ئەمە دوو شتی لێوەردەگیرێن :

یەكەم: مسوڵمانان دەبێ لە جەنگیشدا پابەندبن بە سنوورەكانی خواوەو، دەبێ لە جەنگیشدا پارێز بكەن‌و، دەبێ لەگەڵ دوژمنانیشیاندا ناشەرعیی نەكەن، نابێ بڵێن: لەبەرئەوەی جەنگەو ئەوەش دوژمنە، هەرچی لەگەڵی بكەی هەر دروستە ! وەك هەندێ گرووپی پەڕگیرو ئیسلام ناشیرینكەر لەم ڕۆژگاری ئێمەدا هەن، هەموو شتێك دەكەن‌و، كە پێیان وایە هەرچی بكەن، هەر جەنگ‌و جیهادە ! بەڵكو ئەگەر جەنگ كردنەكە ئەو جیهادەش بێ، كە خوا پێویستی كردوە لەسەر مسوڵمانان، لەو حاڵەتەش دا، نابێ بێ فەرمانیی خوای دادگەر بكەن، ج جای جەنگ‌و كوشتارەكە، لە جیاتی ئەوەی جیهاد بێ، چەتەیی بێ، وە لە جیاتی ئەوەی لە پێناوی خوادا بێ، لە پێناوی خۆدابێ، وە نەزانی جەنگ‌و كوشتارەكەت دەچێتە گیرفانی كێوە؟ ئەوە هەر ئیشەكە لە بنەڕەتدا ناشەرعییە !

ئنجا دیارە ئینسان كە كارەكەی ناشەرعیی بوو، شێوازەكەشی ناشەرعیی دەبێ، بە ئەزموون دەركەوتوە ئەگەر ئینسان نیەتی باش بێ، كارەكەشی باش دەبێ‌و،

بۆی لـە شێـوازی شەرعییـش دەخەفتـێ، بـەڵام وەختـێ کـارو ئـامانجـەکەی ناشـەرعیی بوو، ئەو کاتە گوێ ناداتـە شەرعیی بوونی هۆکارو ئـامرازەکان.

**دووەم:** خۆ پارێز (متقي) هەر ئەوە نیە خۆی لە ناشەرعیی بپارێزێ، بەڵکو دەبێ خۆی بپارێـزێ لـەوەش کە پێچەوانەی یـاساکانی خوا لـە ژیـانی بەشـەردا (سنن الله في حياة البشر) بجووڵێتەوە، کە یەکێك لـە یاساکانی خـوا لە ژیانی بەشەردا، بریتیە لـەوە کە ویستت جەنـگ بکەی، دەبێ نەخشـەت هەبێ، مەشقو ڕاهێنـانـت هەبێ بۆ جەنگاوەرەکان، دەبێ چەکت هەبێو، توانات هەبێ، دەبێ بارودۆخی خۆتو دوژمنەکەت بزانی، حیسابـی ورد بکەی، ئنجا بچیـە نێو ئـەو جـەنگـەوە، کەواتـە: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، وە بزانن بێگومان خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە، واتـە: لەگـەڵ ئەوانەدایـە کـە خـۆیان دەپارێـزن: سـنوورەکـانی خـوا ببەزێـنن، وە خۆیان لەوەش دەپارێزن کە یـاساکانی خـوا، پشتگوێ بخەن، ئـەگـەر کەسێك بڵـێ: ئـەوەتـا من نوێـژکەرو ڕۆژووگـری باشم، نـاشـەرعیی نـاکەم، بـەڵام یـاسـاکـانی خـوا لە ژیانی بەشەردا، پشتگوێ بخات، مانای وانیە خوای کاربەجێ لەگەڵیدایـە، بـەڵکو دەبێ خۆی بپارێزێ لە ناشەرعییو، لەوەش کە بێ یاسایی بکات، ئەو یاسایـەی خـوا لە گەردووندا دایـنـاوە، دەبێ ئـەوەش ڕەچاو بکەی، ئنجـا خـوا لەگەڵـت دا دەبیلای.

ئنجا ئەمە ئەوەش هەڵدەوەشـێنێتەوە کە هەندێك لە ئەهلی تەصەووفو، هەندێك لەوانەی کە زۆر باسی شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵحو پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوە دەکەن، پێیان وایە کە پێچەوانەی تەقوایە کە ئینسانی مسوڵمان جەسوور بێ، ئازابێ، لە بەرانبەر دوژمندا زبرو توند بێ، نەخێر، ئەوەتا خـوا دەفەرموێ: زبربنو، بشـزانن خـوا لەگەڵ پارێزکاراندایە، کەواتە: زبریی لە بەرانبەر دوژمندا، وە جەنـگ بە خـوێن بوون، وە ئـازایەتییو فیداکاریی، پێچەوانەی تـەقـوا نیـە، بەڵـکـو ئەگـەر پـارێزکارو خواپەرست بین، دەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی دوژمـنو بەرەنگاربوونەوەشـی، ئـازاو جـەسوورو چـاونـەترس بـین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمان لـە چـوار (٤) ئـایـەت پێكدێ، ئـایـەتـەكـانی: (١٢٤ تـا ١٢٧)، تـەوەری سـەرەكیی ئـەم چـوار ئـایـەتـە، بریتیـە لـە هـەڵوێسـتی دەغـەڵ‌و دڵنەخۆشـەكـان لـە بەرانبـەر قورئـانـدا.

سـەرەتـا باسی ئەوە دەكات كە هەر كات سووڕەتێك بێتە خوارێ، بەشێك لەو دەغەڵانە دەڵێـن: كامەتـان ئـەم سـووڕەتـە ئیمانی زیـاد كـرد؟! پـاشـان خـوا ﷻ ڕایدەگەیـەنێ كە بڕواداران ئیمانیان پێی زیاد دەبێ‌و دڵخۆشیش دەبن، بەڵام ئـەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، هـەر پیسییـان تێدا زیـاد دەكـات‌و، بە كـافرییش دەمـرن.

پـاشـان خـوای كـاربەجێ بە نكووڵیی كـردن‌و سـەرزەنشت كـردنەوە دەفـەرموێ: ئـایـا نـابینـن كە هـەموو سـاڵێك جـارێك، یـان دوو جـاران تووشی بـەڵاو گـرفتـاریی دەبـن، كەچی نـاگـەڕێنـەوەو پـەندیش وەرنـاگـرن؟

وە لـە كـۆتـایی دا، باسـی هـەڵوێستی ئـەو دەغـەڵانە دەكـات، كە لـە كـاتی دابـەزینی سـووڕەتێكی قورئـانـدا سـەغـڵەت دەبـن‌و، بە ئـاماژەی چـاو بە یـەكـدی دەڵێـن: ئـایـا هـیچ كـەس نـاتـانبینـێ؟ تـاكـو بـڕۆین، پـاشــان دەڕۆن، چـونكە خـوا بەهـۆی ئـەوەوە، كـە كـۆمەڵێكی نـا تێگـەیشتوون لـە فـەرمایشـتی خـوا، دڵـیانی لاداوە!

﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ١٢٤ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم
مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ١٢٥ أَوَلَا
يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا
هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ١٢٦ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ
يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ
١٢٧﴾

## مانــای وشــە بە وشـەی ئــایــەتــەکــان

{وە هـەر کـات سـوورەتێك دابـەزێـنرا، لەوان (دەغەڵان) کەسی وا هـەیـە (بە تەوسەوە) دەڵـێ: کامەتـان ئـەم سـوورەتە ئیمانی زیـاد کردن؟ هەڵبەتە ئـەوانەی بڕوایـان هێـناوە، ئیمانی بـۆ زیـاد کـردن، لـە حاڵێـکدا کە دڵخـۆش بـوون ﴿١٢٤﴾ بـەڵام ئـەوانـەی دڵـیـان نەخۆشیی (نیفـاق)ی تێدایـە (ئەو سـوورەتە) پیسیی زێدەی خسـتە گـەڵ پیسییـەکەیان، وە بە بێبـڕوایی مردن ﴿١٢٥﴾ ئـایا (ئـەو دەغـەڵانە) نـابینن کە هـەموو ساڵـێ جـارێك، یـان دوو جاران (بە بەڵاو گـرفتـاریی) تـاقی دەکرێـنەوە، پاشـان نە دەگـەڕێـنـەوە (بـۆ لای خـوا)، وە نە پـەندیش وەردەگـرن ﴿١٢٦﴾ وە هـەر کـات سـوورەتێـك دابـەزێـنرا، هەندێکیان تەماشـای هـەندێکیان دەکەن (بە ئـاماژە بە یەکدی دەڵـێـن): ئـایا هیچ کەس دەتانبینـێ (بۆ ئـەوەی ئـەو کۆڕە بەجـێ بهێڵـین ؟) پاشـان ڕۆیشتن، بەهـۆی ئـەوەوە کە ئـەوانە کۆمەڵێکن تێنـاگەن (لـە فـەرموودەی خـوا) خـوا دڵـیـانی لادا ﴿١٢٧﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يَسْتَبْشِرُونَ): واتە: دڵخۆش دەبن، (اسْتَبْشَرَ: إِذَا مَا رأى ما يُبَشِّرُهُ مِنَ الفَرَحِ، وبَشَّرتُهُ وَأَبْشَرْتُهُ وَبَشرتهُ: أَخْبَرْتُهُ بسارٍ بَسَطَ بَشْرَةَ وجهِهِ).

(إِسْتَبْشَارَه) ئەوەیە ئینسان شتێك ببینێ كە دڵی خۆش بكات، یان ڕووی گەش بكات، لە ئەنجامی شادمان بووندا، دەگوترێ: (بَشَّرتُهُ وَأَبْشَرْتُهُ وبَشرتهُ) واتە: هەواڵێكم پێدا كە ببووە هۆی ئەوەی دەم و چاوی پێی گەش بێ، ئینسان كە لە دڵیدا خۆشی هەبوو، دەم و چاویشی پێی گەش دەبێ.

(مَّرَضٌ): (المَرَضُ: الخُرُوجُ مِنَ الإعْتِدَالِ جِسْمَاً أو رُوحاً).

(مَرَض) بریتیە لە تێكچوونی حاڵەتی ئاسایی، ئینسان لە ڕووی جەستەیی یاخود لە ڕووی دەروونییەوە.

(رِجْسًا): (الرِّجْسُ: الشيءِ القَذِرُ، والفِعْلُ القَبيح، وَالحَرَامُ، والكُفْرُ، واللَّعْنَةُ، والعَذَابُ، وَرِجْسُ الشَّيْطَانِ: وَسوسَتَهُ).

وشەی (رِجْس) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای شتی پیس و بۆگەن دێ، وە بە مانای كردەوەی خراپ دێ، وە بە مانای شتی قەدەغە دێ، وە بە مانای كوفر دێ، وە بە مانای نەفرین دێ، وە بە مانای سزاش دێ.

(يُفْتَنُونَ): (الفتنة: البلاء، العَذَابُ، والإنحراف عَنِ الحَق).

وشەی (فتنة) یان بە مانای بەڵا دێ، یان بە مانای سزا دێ، یان بە مانای لادانە لە هەق.

(وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ): واتە: بیریان ناكەوێتەوەو پەند وەرناگرن.

(ٱنصَرَفُوا۟ ): (الصَّرْفُ: رَدُّ الشيءِ مِنْ حالة إلَى حالة، أَوْ إِبْدَاله بغَيْرِهِ، يُقَالُ: صَرَفْتُهُ فَانْصَرَفَ).

(صرف) بریتیە لەوە کەشتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك بگۆڕی، یان بیگۆڕی بە شتێکی دیکە، دەگوترێ: (صَرَفْتُهُ فَانْصَرَفَ) واتە: لامدا، وە ڕۆیشت.

(صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم ): واتە: خوا دڵیانی لادا.

# مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەکـان

دیارە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا ئەم دەرسەمان باسی هەڵوێست لە بەرانبەر قورئاندا دەکات، بە تایبەت هەڵوێستی دەغەڵو دڵنەخۆشەکان، وە ئاماژەیەکیش دەکات بە هەڵوێستی بڕواداران، کە ئایا ئەوانە چۆن مامەڵەیان کردووە لەگەڵ دابەزینی سووڕەتێکی قورئاندا ؟ ئنجا ئەو سووڕەتە، سووڕەتی تەوبە بووە، یان هەر سووڕەتێکی دیکە بووە، بۆ ئەوەی مسوڵمانان بەرچاو ڕوون بن‌و، ئنجا لە خۆیان وریابن. بە هۆی هەڵوێستی ئەو دەغەڵو موونافیقانەوە کە لە بەرانبەر قورئان‌و ئایەتەکانیدا هەیان بووە، خوای پەروەردگار سەرزەنشتی کردوون‌و مۆری نیفاقی بە نێوچەوانیانەوە ناوە، یاخود بە لای کەمەوە مۆری دڵنەخۆشیی بە نێوچەوانەوە ناون.

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗا﴾، وە هەر کاتێك سووڕەتێك دابەزێنرا، هەیانە {واتە: لەو دڵنەخۆشانە هەیە} دەڵێ: کامەتان ئەم سووڕەتە ئیمانی بۆ زیاد کردوە؟!

بە تەئکید لێرەدا مەبەستیان توان‌و پلارە، بە تەوسەوە وا دەڵێن: چونکە خوای تاك‌و پاك دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢﴾ الأنفال، واتە: کاتێك ئایەتەکانی (خوا)یان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، ئیمانیان پێی زیاد دەبێ، وە تەنیا پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن.

ئەوانەش بە توانجەوە گوتوویانە: کامەتان ئەم سووڕەتە ئیمانی بۆ زیاد کردوە؟!

هەڵبەتە تەنیا کەسێك ئیمانی بە قورئان زیاد دەکات، کە ئیمانی هەبێ، بەڵام کەسێك کە هەر ئیمانی نەبێ، ئیمانی چۆن زیاد دەبێ؟

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾﴾، بەلاّم ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، {ئەم سوورەتە} ئیمانیان زیاد دەکات‌و دڵخۆشیش دەبن.

بەڵێ ئەوەی ئیمانی هەبێ، ئەم قورئانە ئیمانی زیاد دەکات، بەلاّم کەسێك ئیمانی نەبێ، مەگەر بە هۆی قورئانەوە ئیمانی بۆ پەیدابێ، ئەگەرنا زیاد نابێ، چونکە دەبێ ئیمان هەبێ، ئنجا چاوەڕێی زیاد بوون بکرێ.

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَى رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾، بەلاّم ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، {واتە: نەخۆشیی نیفاق‌و دەغەڵیی تێدایە}، ئەو سوورەتە پیسیی دیکەی خستە گەڵ پیسییەکەیان، وە بە بێبڕواییش مردن، واتە: لە جیاتی ئەوەی ئیمان لە دڵیان دا هەبێ، پیسیی نیفاق لە دڵیاندا هەبوو، ئنجا ئەم سوورەتە بوو بە هۆی ئەوەی ئەو پیسیی نیفاقە زیاتر لە دڵیاندا زۆر ببێ، ئەوەش دوایی باسی دەکەین، چۆنە؟

بابایەکی میزاج تێکچوو، ئەگەر باشترین خواردن بخوات، ئەو خواردنە باشە هەر نەخۆشییەکەی زیاد دەکات، چونکە میزاجەکەی تەواو نیە، ئەگەرنا عەیب لە خواردنەکە نیە.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾﴾، ئایا نابینن، هەموو ساڵێك جارێك یان دوو جار، تاقی دەکرێنەوە، پاشان ناگەڕێنەوە، {واتە: ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا}، وە پەندیش وەرناگرن، واتە: نەك هەر ناگەڕێنەوە، بەڵکو پەندیش وەرناگرن.

وە لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ نَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ هَلْ يَرَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ ثُمَّ انْصَرَفُوا صَرَفَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ

لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾، وە کاتێك سوورەتێك دابەزێنرا، {هەندێکیان ڕوانیانە هەندێکیان بە ئاماژەی چاو بە یەکدی دەڵێن} کەس ناتانبینێ ؟ {واتە: ئەگەر کەس چاوی لێنیەو کەس ئاگادارنیە، با بڕۆین} ، دوایی ڕۆیشتن و کۆڕەکەیان بەجێهێشت، بەهۆی ئەوەوە کە ئەوانە کۆمەڵێکن بە وردی تێناگەن، {لە قورئان تێناگەن} .

بۆیەش خوا دڵی لاداون، چونکە بێگومان کەسانێك کە لە قورئان، لە فەرمایشتی خوا تێدەگەن، ئەوانە شایستەی ئەوەن کە خوای بەخشەر هیدایەتیان بدات، بەڵام کەسێك کە تێنەگات، وە نەیەوێ تێبگات، ئەوە خوای دادگەر، بە زۆر، ملی پێ وەرناسوورێنێ بەرەو ئایین و شەریعەتی خۆی !.

## چەند مەسـەلەیەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یـەکەم:** کە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾.

وە هەر کاتێك سوورەتێك دابەزێنرا، کەسی وا لەو دەغەڵانە هەیە دەڵێ: کامەتان ئەم سوورەتە ئیمانی زیاد کرد ؟!

لێرەدا وشەی (ما) کە لە دوای (إذا) زیاد کراوە، (تُفِيدُ التأكِيد لِمَضْمُون شَرْطِها، يَعْنِي: وَإِذْ تَحقَّق، إنْزَال الله تَعَالى عَلَى رَسولِهِ سورَةً مِنَ القُرآن...)، واتە: ئەو (ما)یە جەخت کردنەوەی نێوەڕۆکی ئەو مەرجە دەگەیەنێ، واتە: هەر کاتێك خوای بەرز، سوورەتێکی لە قورئاندا دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، لەوانە: هەیە دەڵێ: کامەتان ئەم سوورەتە ئیمانی زیاد کرد ؟!

بۆیە مونافیقو دەغەڵەکان وایانگوتوە، چونکە خوا فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾الأنفال، واتە: کاتێك ئایەتەکانی (خوا)یان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، ئیمانیان زیاد دەکات... .

ئنجا قسەکەی مونافیقو دڵنەخۆشەکان، دوو واتایان هەڵدەگرێ:

**یەك:** دەگونجێ بە توانجو تەوسەوە گوتبێتیان: کامەتان ئیمانی زیاد بوو؟ وەك: ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾الأنفال، ئەوە ڕاست نیە، کوا، کامەتان ئیمانی زیاد بووە ؟

**دوو:** دەشگونجێ مەبەست پرسیارکردنی جیددیی بووبێ.

بەلاّم مانای یەکەمیان زیاتر لەگەڵ سروشتی پیسی مونافیقو دڵنەخۆشەکان دا گونجاوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ بەلاّم ئەوانەی ئیمانیان هێناوە {ئەم سوورەتە} ئیمانیان زیاد دەکات، وە ئەوان دڵ خۆش دەبن.

کەسێك هەر ئیمانی نەبێ، چۆن ئیمانی زیاد دەبێ؟ دەبێ سەرەتا شتێك هەبێ، ئنجا شتێکی بخەیە سەر، بەلاّم ئەگەر هەر هیچ نەبێ، چی دەخەیە سەر؟ لە هیچی هیچ پەیدا نابێ.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾، ئەوە هەموو شێوازەکانی زیاد بوون دەگەیەنێ: هەم لە ڕووی دەروونییەوە، هەم لە ڕووی کردەییەوە، واتە: چ ئەو ئیمانەی کە دەچێتە نێو عەقڵو دڵەوە، وە چ ئەو ئیمانەش کە بە کردەوە تەعبیری لێ دەکرێ، ئنجا چ کردەوەی دڵ بێ، چ کردەوەی ئەندامەکان بێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾، دیارە زیادبوونی ئیمان لە دڵیاندا، دەبێتە هۆی دڵخۆشیو ئاسوودەییان، بەڵێ کاتێك سوورەتێك دادەبەزێ، بەهۆی ئەو سوورەتەوە، دڵیان خۆش دەبێو دەڵێن: سوورەتێکی دیکەش دابەزی، کە چەند ئەرکێکی دیکە دەخاتە سەرشانمانو، چەند فەرمانێکی دیکەمان پێدەکات، وە بەهۆی جێبەجێکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتەوە، زیاتر لە خوا نیزیك دەبینەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی دڵخۆشییان، وە سەرەنجام ئیمانیان زیاد دەکات.

(طبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا پرسیارێك دێنێتەوە، دەڵێ:

{فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ: أَوَ لَيْسَ (الإيمان)، فِي كَلاَمِ العَرَبِ، التصديق وَالإِقْرَارُ؟ قِيلَ: بَلَى! فَإِنْ قِيلَ: فَكَيْفَ زَادَتْهُم السورة تَصْدِيقًا وَإِقْرَارًا؟ قِيلَ: زَادَتْهُم إيماناً حِين نزلت، لأَنَّهُم قبل أن تنزل السورة، لم يَكُنْ لزمهم فرضُ الإِقْرَار بها وَالعَمَل بها بعَيْنِها، إلاّ فِي جملة إيمانهم بأَن كُلّ مَا جَاءَهُمْ بِهِ نَبِيّهم ﷺ مِنْ عِنْدِ الله،

فَحَقٌّ، فَلَما أَنْزَلَ اللهُ السورة، لزمهم فرض الإِقْرَار بأَنَّها بعينها مِنْ عِنْدِ الله، وَوَجَبَ عَلَيْهِم فَرْض الإِيمان بِمَا فِيها مِنْ أَحْكام الله وَحدوده وَفَرَائضِه، فَكانَ ذَلِكَ هُوَ الزيادَة الَّتِي زَادَتْهُم نزول السورة حِيْنَ نزلت من الإِيمان وَالتَّصْدِيق بها} (١).

واتە: ئەگەر یەکێك بپرسێ: ئایا ئیمان لە قسەی عەرەباندا بە مانای دانپێداهێنانو بە ڕاست زانین نیە؟ دەگوترێ: با، ئنجا ئەگەر بگوترێ: ئەدی چۆن ئەو سوورەتە دانپێداهێنانو بە ڕاست زانینی تێدا زیاد کردوون؟

لە وەڵامدا دەگوترێ: کاتێك ئەم سوورەتە دابەزیوە، پێش ئەم سوورەتە ئەوەی کە لەم سوورەتەدا هاتوە، لەسەریان پێویست نەبووە دانی پێدابهێننو بە ڕاستی بزانن، بۆ ئەوەی کردەوەی پێبکەن، تەنیا بە گشتی لەسەریان پێویست بووە، کە دان بە هەموو قورئانو ئیسلامدا بێنن، وە ئەوە کە هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خواوە بۆیان دێنێ، هەقە بەڵام کاتێك خوا ﷻ ئەم سوورەتەی دابەزاندوە، لەسەریان پێویست بووە کە دانی پێدا بێنن، وە بە ڕاستی بزانن، خودی ئەم سوورەتە بە ڕاست بزانن، کە لە خواوەیە، وە لەسەریشیان پێویست بووە، یاساکانی خواو، وە سنوورەکانیو فەرزەکانی بەڕاست بزانن، وە کردەوەشی پێ بکەن، ئەمەش ئەو زیادییەیە لە ئیمانیان، کە بەهۆی دابەزینی ئەم سوورەتەوە زیاد بووە.

دیارە هەڵوێستی دەغەڵەکانی ئەوکات، وە هی ئێستاش بەرانبەر قورئان، هەر وایە، ئێستاش کەسانێك کە بە دڵی نەخۆشو بە عەقڵی تاریکەوە، تەماشای قورئان دەکەن، دەڵێن: ئەو قورئانە کوا چی تێدایە؟ هیچی تێدا نابینین !

ئەمەش وەك ئەوە وایە کە زانایەك بە میکرۆسکۆب تەماشای دڵۆپە ئاوێك دەکات، دەڵێ: وەرن ئەو هەموو زیندەوەرانەو ئەو هەموو دروست کراوانە لە نێو ئەم دڵۆپە ئاوەدا هەن ! بەڵام کەسێکی دی کە بە چاوێکی ڕووت تەماشای دڵۆپە ئاوەکە دەکات، دەڵێ: کوا هیچی تێدا نیە.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەگەر بە دڵی پڕ لە ئیمانو بە چاوی ڕۆشن بۆوەوە تەماشای قورئان بکەین، پڕە لە نهێنییو حیکمەتو زانیاریی بە سوود، بەڵام ئەگەر دڵی بێ ئیمانو، بە چاوی کوێرەوە تەماشای بکەی، وەك چۆن بابابەکی کوێر تەماشای

١) جامع البيان، ج ٧، ص ٨٤.

ئاسمانێ بکات، ئەگەر خۆر لە نێوەڕاستی ئاسماندا بێ، نایبینێ، بابای دڵ تاریك و چاو کوێریش، هەرچەند تەماشای قورئان بکات، هیچ نابینێ.

هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بزانرێ: کە پەروەردەو بارهێنانی شوێنکەوتووانی ئاینەکان، لەسەر دەمارگیریی داخراویی، وەك ئەوەی کە جوولەکەو نەصرانییەکان و بوزاییەکان و هیندۆسییەکان و مارکسییەکان و مادديیەکان و سیکۆلارەکان، دەیکەن، کە هەر لە ڕێوە قەناعەتی پێش بیرکردنەوەیان هەیە، هەر لە ڕێوە تەڵقین کراون، کە ئیسلام نەفسانەیە، هەر لە ڕێوە تەڵقین کراون، کە موحەممەد ﷺ ئیسلامی بە شمشێر بڵاوکردۆتەوە ! وە ئیسلام دژی عەقڵە، دژی زانستە ! دژی مافی ئافرەتە ! دژی مافی کرێکارە ! لەگەڵ مافی مرۆڤدا ناگونجێ ! هەر لە ڕێوە بەو بیرو قەناعەتە هەڵانە تەڵقین کراون، پێش ئەوەی بیر بکەنەوە. ئەمەش کاریگەریی گەورەو سەرەکیی هەیە بۆ دووریی گرتنی ئەو کەسانە لە ئیسلام و قورئان، هەڵبەتە ئەوەش پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە، هەر بۆیە ئیسلام هەرگیز شوێنکەوتووانی خۆی بەو جۆرە پەروەردە نەکردوە، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە:

١) خوا لە سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨﴾.

واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، وە شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانەن کە خوا ڕێنمایی کردوون، وە ئەوانەشن خاوەن عەقڵان.

خاوەن عەقڵ ئەو کەسەیە کە بە عەقڵ و زانستی خەڵکی دیکە خۆی دەوڵەمەند بکات، با کافریش بێ.

٢) هەروەها لە سووڕەتی (سبأ)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُلِ ٱللَّهُۖ وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢٤﴾.

واتە: بڵێ: کێ لە ئاسمانەکانو زەوی ڕۆزییتان پێ دەدات؟ بڵێ: خوا، وە ئێمە یان ئێوە لەسەر ڕێنماییین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرا داین.

واتە: هەر لە ڕێوە نەیبڕیوەتەوە، بواری تێدا هێشتۆتەوە، کە دەگونجێ ئێمە بە هەڵەدا چووبین، وەرن با گفتوگۆ بکەین، وەك لە چەندان شوێن لە قورئاندا هاتوە: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾ البقرة، ﴿٦٤﴾ النمل﴾[1]. واتە: بڵێ: بەڵگەتان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن.

٣) هەروەها لە شوێنەواردا هاتوە، وەك (ترمذي) هێناویەتی: ﴿الحِكْمَةُ ضَالَةُ المُؤْمِنِ، حَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقَ بِهَا﴾، {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٦٨٧)، وَقَالَ: غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤١٦٩)}.

واتە: زانیاریی‌و کاربەجێیی شتێکە لە بڕوادار ون بووە لە هەر شوێنێك دۆزیەوە، لە هەموو کەس پێی شایستەترە.

هەڵبەتە مەسەلەی زیاد بوونی ئیمانیش، شتێکی ئاشکراو ڕوونە لە ئیسلام دا، هەرچەندە هەندێك لە زانایان بە تایبەتی حەنەفیی مەزهەبەکان گوتوویانە: ئیمان کەم‌و زیاد ناکات، کە ئەوە پێچەوانەی زۆر لە ئایەتەکانی قورئان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە پێچەوانەی عەقڵ‌و واقیع‌و مەنتیقیشە[2]، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (الأنفال)دا خوای زاناو شارەزا دەفەرمویێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾﴾.

واتە: وە کاتێك ئایەتەکانی (خوا)یان بەسەردا دەخوێنرێنەوە ئیمانیان پێی زیاد دەبێ.

---

١) هەروەها لە سوورەتی (الأنبیاء)یش لە ئایەتی (٢٤)دا هاتوە: ﴿... قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِي بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾﴾ الأنبیاء.

٢) لە هەر کام لە مەوسووعەی: (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی) بەرگی یەکەم‌و، کتێبی: (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی)و مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) (الكتاب الثاني: تعريف الإيمان)دا بە درێژیی لەوبارەوە دواوین.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾﴾.

واتە: ئەوانەی کە خەڵك پێیان گوتن: خەڵك (واتە: دوژمن) بۆتان کۆبوونەتەوە، لێیان بترسێن، بەڵام ئەوە ئیمانی بۆ زیاد کردنو گوتیان: ئێمە خوامان بەسەو، باشترین کارپێ سپێردراویش خوایە.

ئنجا زانایان دەڵێن: زانیاریی سێ جۆرە:

١) (علم الیقین) ئەوەیە کە تۆ شتێك زانیاریی تەواوت دەربارەی هەبێ، کە ئەو شتە وایە، بۆ وێنە: هەنگوین، بۆت باس بکەن هەنگوین، مێشەنگین دروستی دەکات، ئەوەندە بە تامەو زۆر شیرینەو ....هتد.

٢) (عین الیقین) ئەوەیە کە تۆ، شانە هەنگوینەکە ببینی بە چاوی خۆت.

٣) (حق الیقین) ئەوەیە کە تۆ، لە هەنگوینەکە بخۆیو لێی بیچێژی.

کەواتە: ئیمانیش، دەگونجێ ئیمانێکی عیلمیی بێ، وە دەگونجێ ئیمانێکی شهوودیی بێ، وە ئیمان هەر لە خودی خۆیدا پلە پلەیە، وە شوێنەوارەکانی ئیمانیش پلە پلەن، بۆ نموونە: ئیمانی جبریلو ئیمانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئیمانی خەڵکی دیکەدا، یەکسان نین، هەروەك ئەو کردەوانەش کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داون، وە ئەو طاعەتەش کە فریشتەکان ئەنجامی دەدەن، کە لاریو گوناهی تێدانیە، وەك کردەوەی خەڵکی دی نیە، کە خڵتەو خاڵو ژەنگو ژاری تێدایە.

کەواتە: هەم خودی ئیمان لە ڕووە تیۆرییەکەیەوە، وە هەم شوێنەوارەکانی ئیمانیش، پلە پلەن.

<u>**مەسەلەی دووەم**</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾.

بەڵام ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، پیسیی دیکەی خستە گەڵ پیسیی خۆیان، وە بە کافرییش مردن.

﴿ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾، ئەم ڕستەیە: دەگونجێ مەبەست پێی موونافیقەکان بێ، دەشگونجێ مەبەست جۆرێك لە موونافیقەکان بێ، کە مەرج نیە موونافیقی تەواو بن، چونکە لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرموێ: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾﴾.

واتە: ئەگەر موونافیقەکانو، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو، ئەوانەی پڕوپاگەندەی خراپ بڵاودەکەنەوە لە مەدینەدا، وازنەهێنن، ئەوە تۆیان لێ هاندەدەین، پاشان کەمێك نەبێ لەگەڵت لە مەینەدا نامێننەوە.

وەك دەبینین خوای زانا هەم بە باسی موونافیقانی کردوە، وە هەم باسی ئەوانەش کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، کەواتە: ئەوان لەوان جیان.

هەروەها لە سوورەتی (الأنفال)یش دا کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴿٤٩﴾﴾، واتە: کاتێك موونافیقەکانو، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە دەیانگوت، کەواتە: ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، لەگەڵ موونافیقەکان جیان، وابێدەچێ ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، ئەوانە بن کە گومانیان هەبووەو، موونافیقی تەواو نەبوون، بەڵام مسوڵمانی تەواویش نەبوون، دڵیان نەخۆشیی تێدا هەبووە، بەڵام دەکرێ ئەو نەخۆشییە چارەسەر بکرێو، حاڵەتی سەلامەتیو تەندروستییان بۆ بگەڕێتەوە، هەروەها دەشگونجێ ئەو نەخۆشییە زیاتر تۆخ بێتەوەو قووڵ بێتەوەو، ببنە موونافیقێکی تەواو عەیار.

دیارە وشەی نەخۆشیی (مرض) دەکرێ بە (نفاق)ێکی بەشی (جزئي) لێکبدرێتەوە، دەشگونجێ بە گومانو ئارەزوو (الشك والهوى) لێکبدرێتەوە، چونکە لە قورئاندا ئەوانە هەموویان هاتوون.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ ﴾، پیسی دیکەی بۆ خستەگەڵ پیسییەکەیان.

(رجس) پیسیی‌و بۆخەڵییە، بەڵام لێرەدا مەبەست کوفرە.

ئنجا لە بری ڕستەی ﴿ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ ﴾دا، بۆیە (زاد) بە (إلی) تەعەددای کردوە، چونکە (زاد) مانای خستنە پاڵ‌و خستنە گەڵ (ضم)ی خراوەتە نێو.

خوای شیفابەخش لە سوورەتی (الإِسْرَاء)دا باسی هەر کام لەو دوو شوێنەوارە دەکات: قورئان بۆ ئینسانی بڕودار دەبێ بە شیفاو ڕەحمەت، وە بۆ ئینسانی بێبڕوا دەبێ بە نەخۆشیی‌و زەحمەتی زیانباریی، دەفەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحۡمَةٌ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوەی لە قورئان دایدەبەزێنین، دەبێتە مایەی شیفاو ڕەحمەت بۆ بڕواداران، بەڵام ستەمکاران هەر زیانباریی پێ زیاد دەکەن.

هەروەها لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۚ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: ئەم قورئانە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ڕێنمایی‌و شیفایە، بەڵام ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن، لە گوێیەکانیان دا قورسایی هەیە، وە مایەی کوێرییشە بۆیان، {نە دەبیستن نە دەبینن}، ئا ئەوانە لە شوێنێکی دوورەوە بانگ دەکرێن.

واتە: وەك لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێن، هەر لێی تێنەگەن، ئاوا لەگەڵ قورئاندا مامەڵە دەکەن، کە لە ئەنجامی ئەو کوفرو بێبڕواییەی لە دڵ‌و دەروونیاندایە، ئاوایان لێ هاتوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ﴾، دیارە کەسێك حاڵی ئاوا بێ، بێگومان بە بێبڕوایی‌و بە کافرییش سەر دەنێتەوە.

(الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ:

{يقول تَعَالى ذكره: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾، نِفَاق وَشَك فِي دِينِ الله، فَإِنَّ السورَة الَّتِي انزلت: ﴿فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ﴾، وَذَلِكَ أَنَّهُمْ شَكُّوا فِي أَنَّها مِنْ عِنْدِ الله، فَلَمْ يُؤْمِنُوا بِها وَلَمْ يُصَدِّقُوا، فَكَانَ ذَلِكَ زِيادَة شَك حادِثة فِي تَنْزِيل الله، لزمهم الإيمان بهِ عَلَيْهِم، بَلْ ارْتَابُوا بذَلِكَ، فَكَانَ ذَلِكَ زِيادَة نَتْنٍ مِنْ أَفْعَالِهِم، إِلى مَا سَلَفَ مِنْهُمْ نظيره مِنَ النتن وَالنِّفَاق}[1].

واتە: خوای بەرز، ناوی بەرز بێ دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، واتە: نەخۆشیی نیفاق‌و گومان لە ئایینی خوادا، چونکە ئەو سوورەتەی کە دادەبەزێنرێ {پیسیی دەخاتە گەڵ پیسییەکەیان}، چونکە گومانیان هەیە کە ئەم سوورەتە لە خواوە بێ، وە دڵیان دامەزراو نیە پێی، وە بە ڕاستی نازانن، وە ئەگەر پێشتر گومانێکیان هەبوو، ئەم سوورەتەش گومانێکی دی خستوتە گەڵ ئەو گومانەی پێشێیان، کە گوایە خوا داینەبەزاندوە، کە پێویست بووە ئیمانی پێ بێنن، وە پێویست بووە کاری پێ بکەن، ئەوانیش نە بڕوایان پێ هێناوەو بە ڕاستیان زانیوە وە کاریشیان پێ نەکردوەو لێی کەوتوونە گومانەوە، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی پیسیی‌و بۆگەنیی دیکە بخاتە گەڵ ئەو کردەوە خراپ‌و پیس‌و بۆگەنانەی دیکە کە پێشتر هەیانبوون، بەهۆی نیفاقەوە.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾﴾.

---

١) جامع البيان، ج ٧، ص ٨٤.

ئایا نابینن، {واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینن، کە خوێنراویشەتەوە: (أولا ترون) ئایا ئەی دڵ نەخۆشەکان! نابینن، دەگونجێ وەك دواندن دواندبنی، بەشێوەی نادیار} کە هەموو ساڵێ جارێك، یان دوو جار تاقی دەکرێنەوە، {بەلایان بەسەر دێ}، پاشان ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وە پەندیش وەرناگرن.

(محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ:

{الفِتْنَةُ: اخْتِلاَلُ نِظَامِ الحالة المُعْتَادَةِ للناسِ وَاضْطرابُ أَمْرِهِمْ، مِثْلُ الأَمْرَاضِ المُنْتَشِرَة، وَالتقَاتل، وَاسْتِمْرَار الخَوْفِ} .

واتە: مەبەست لە (فِتْنَة) لێرەدا تێکچوونی حاڵەتی ئاسایی خەڵکە، وە پەیدابوونی پاشا گەردانییە، لە کاروباریاندا، وەك ئەو نەخۆشییانەی کە بڵاودەبنەوە، وەکو کوشتار لەنێوخۆداو بەردەوامبوونی ترس.

وە دەربارەی وشەی (یفتنون) دەڵێ:

{أَنَّ اللهَ يُسَلِّط عَلَيْهِم المَصَائِبَ وَالمَضَارَّ، تَنَالُ جَمَاعَتَهُمْ مِمَّا لا يُعْتَادُ تَكرر أَمْثَالِهِ فِي حَيَاةِ الأُمَمِ، بِحَيْثُ يَدُلّ تَكرر ذَلِكَ، عَلَى أَنَّهُ مُرَادٌ مِنْهُ إِيْقَاظُ اللهِ الناس إِلى سوءِ سِيرتهِم فِي جَانِبِ اللهِ تَعَالَى...}[1].

واتە: خوا بەڵاو زیانی وایان دەخاتە سەرێ، کە عادەت نیە ئەوانە دووبارە ببنەوە لە ژیانی کۆمەڵگاکاندا، بە شێوەیەك کە دووبارەبوونەوەی ئەوە، ئەوە دەگەیەنێ کە خوا ﷻ دەیەوێ خەڵك ئاگادار بکاتەوەو وریا بکاتەوە، کە کارو کردەوەی خراپیان هەیە، لە بەرانبەر خوای بەرزدا.

کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾، پاشان نە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، {کە باشتر وایە بگەڕێنەوە، ئنجا نەك هەر ناگەڕێنەوە} بگرە پەندیش وەرناگرن، واتە: دوای ئەوەی ئەو بەڵاو گرفتارییانەیان بەسەر دێ، دەبوو هاندەرو پاڵنەریان بێ و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بەڵام نەك هەر ناگەڕێنەوە، بەڵکو هەڵوەستەیەکیش ناکەن.

---

١) التحرير والتنوير، ج ١١، ص ٦٧.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ١٢٧ ﴾.

وە کاتێك کە سوورەتێك دادەبەزێنرێ، هەندێکیان تەماشای هەندێکیان کرد: کەس ناتانبینێ ؟ دوایی دەڕۆن، خوا دڵیان لادەدات، بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێکن تێناگەن .

لەبەردەم ئەم ئایەتەدا سێ هەڵوەستە دەکەین:

**هەڵوەستەی یەکەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە لەگەڵ دابەزینی هەر ئەندازەیەکی قورئان دا، هەر ئەوە هەڵوێستو ڕەفتاریان بووە.

**هەڵوەستەی دووەم** : ﴿ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ﴾. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ:

أ- کە لە کاتی دابەزێنرانی ئەم سوورەتەدا، ئەو دڵنەخۆشانە لە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەری خوا ﷺ دابوون، چونکە دەفەرموێ: لە کاتێکدا کە سوورەتەکە دادەبەزێنرێ، هەندێکیان تەماشای هەندێکیان کرد، کەواتە: ئەو تەماشاکردنەی هەندێکیان بۆ هەندێکیان، لە کاتی دابەزینی سوورەتەکە دابووە، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْ ﴾، واتە: دوایی لەو کۆڕو مەجلیسە هەڵسان، ئەمەش دیسان ئەوە دەگەیەنێ کە لە کاتی دابەزینی سوورەتەکەدا، لە کۆڕو مەجلیسەکەدا بوون.

ب - وە ئەم ئایەتە ئەوەش دەگەیەنێ، کە ئەم سوورەتە، زۆر نهێنیی مونافیقو دڵنەخۆشەکانی دەرخستوون، وە زۆر عەیبو کەموکوڕیی ئاشکرا کردوون.

ئنجا ئەوانەش کە تەماشای یەکدییان کردوە دەگونجێ بۆیە تەماشای یەکدییان کردبێ، کە ئەگەر کەس ناتانبینێ {بە ئاماژەی چاو} با هەڵسین، بۆ ئەوەی عەیبی زیاترمان دەرنەکەوێ، یان خەڵك هەستمان پێنەکات.

دەشگونجێ مەبەست ئەوە بووبێ کە تەماشای یەکدییان کردوە، پرسیاریان لە یەکدی کردبێ، وەك یەکدی سەرسوڕماندن، ئەها چەند شتێکی سەیر دەگوترێ ! گوێتان لەو قسەیە بێ .

ج- وە ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەوانە سەرسوڕمانو بێبڕواییەکەی خۆیان شاردۆتەوە، بۆ ئەوەی لێیان ئاشکرا نەبێ، وە ئیکتیفایان بەوەندە کردوە، کە بە ئاماژەی چاو تەماشای یەکدی بکەنو سەرسوڕمانی خۆیان دەربڕن .

هەڵوەستەی سێیەم : ﴿صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾، ئەم ڕستەیە: هەندێکیان بە دوعا لێکیان داوەتەوە، خوا دەفەرموێ: خوا دڵیان لابدات، بەهۆی ئەوەوە کە تێناگەن، بەڵام ڕاستتر وایە کە بڵێین: بەهۆی ئەوەوە کە تێناگەن خوا دڵی لاداون، واتە: ئەوە هەواڵە خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ، نەك تووك بێ لێیان کرابێ.

هەڵبەتە دوعاش کە خوا بیکات، یانی: ئەو شتە دەبێ بێتە دی، چونکە خوا داوا لە کێ دەکات؟!

بەڵام لێرە وەك دوعا ناچێ، بەڵکو ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۝٤﴾ المنافقون، بە مانای دوعایە، بەڵام لێرە خوا دەفەرموێ: ﴿صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێکن تێناگەن، خوا دڵی لاداون، واتە: بەهۆی تێنەگەیشتنو بیرنەکردنەوەیانەوە، خوا دڵی لاداون، ئەگەرنا خوای پەروەردگار بە تەئکید ستەم لە کەس ناکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دوو (٢) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٢٨و ١٢٩)ن، لەم دوو ئایەتەدا خوای کاربەجێ ڕوو دەکاتە مرۆڤایەتیی بە گشتیو، بڕواداران بە تایبەتیو پێیان ڕادەگەیەنێ کە پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردوون، کە بە نارەحەتییان دڵگران دەبێو، زۆر سوورو مکوڕە لەسەر هێنانەدی بەرژەوەندییانو، بەرانبەریان میهرەبانو بە بەزەییە.

پاشان ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺو پێی دەفەرموێ: ئەگەر ئەو خەڵکە پشتیان هەڵکردو لاملییان کرد، تۆ بێ منەتو بێ باک بە، بڵێ: خوام بەسە، جگە لەو هیچ پەرستراونین، پشتم هەر بەو بەستووە، هەر ئەویش خاوەنی بارەگای مەزنە.

﴿ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ
عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ١٢٩ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

{بە دڵنیایی (ئەی خەڵكینە!) ئەوە پێغەمبەرێكتان بۆ هات لە خۆتانە، هەر شتێك نارەحەتتان بكات، لەسەر دڵی قورس‌و زەحمەتە، لەسەر (خێرو خۆشییو بەرژەوەندیی بۆ دابین كردن)تان سوورە، بەرانبەر بە بڕواداران بە بەرۆشی بە بەزەیی یە ﴿١٢٨﴾ ئنجا (ئەی پێغەمبەر!) هەر كات پشتیان هەڵكرد (بێ باك بەو بڵێ :) خوام بەسە، جگە لەوی هیچ پەرستراوێك نیە، پشتم هەر بەو بەستوە، وە هەر ئەو خاوەنی بارەگای مەزنە ﴿١٢٩﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(عَزِيزٌ عَلَيْهِ ): (عَزَّ عَلَيَّ كَذَا: صَعُبَ، وَعَزَّهُ كَذَا: غَلَبَهُ، تَعَزَّزَ اللَّحْمُ: اشتدّ).

(عَزَّ عَلَيَّ كَذَا) واتە: ئەو شتە لەسەرم قورس بوو، (عَزَّهُ) واتە: بەسەریدا زاڵ بوو، (تَعَزَّزَ اللَّحْمُ) واتە: گۆشتەكە پتەوو چڕ بوو.

(مَا عَنِتُّمْ ): (العَنَتُ: الإثْمُ، والعَنَتُ: الوقوعُ في أمرٍ شاق).

(عَنَت) بە مانای گوناح دێ، یا بە مانای كەوتنە نێو كارێكی قورسو زەحمەتیش دێ، یانی: گرفتار بوون.

(حَرِيصٌ ): (الحِرْصُ: الجَشَعُ، حَرَصَ يَحْرِصُ، اشتدَّتْ رَغبَتُهُ فيهِ، حَرَصَ عَلَى الرَّجُلِ: أَشْفَقَ وَجَدَّ في نَفعِهِ).

(حِرْص) بریتیە لەوە كە ئینسان زۆر ئارەزووی شتێكی بێ، (حَرَصَ يَحْرِصُ)، وە هەروەها كەسێك زۆر مەبەستی شتێك بێ پەیدای بكاتو بەدوایەوە بێ، وە كەسێك كە بە تەنگ شتێكەوە بێ، یان بە تەنگ كەسێكەوە بێ سوودی پێ بگەیەنێ.

(رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ): (رَأَفَ بهِ يَرأفُهُ رَأْفة: رَحِمَهُ أَشَدَّ الرَّحمَةِ وَعَطَفَ عَلَيْهِ).

(رَأْفة) و (رَحْمَة) جیاوازییان ئەوەیە، (رَأْفة) ئەوپەڕی بەزەیی دەگرێتەوە، وەك دوایی زیاتر باسی دەكەین، كە دەگونجێ كەسێك بە تەنگ یەكێكەوە بێ، بۆئەوەی زیانی لێ دووربخاتەوە، وەك چۆن (رَحْمَة)یش ئەوەیە، كە سوودی پێ بگەیەنێ.

(تَوَلَّوْاْ ): (تَوَلَّى الشيءُ: أَدْبَرَ، تَوَلَّى فُلانٌ هارِبَاً).

(تَوَلَّى) واتە: پشتی هەڵكرد، پشتی تێكردو بەجێی هێشت، ڕۆیشت.

(حَسْبِيَ ٱللَّهُ): (حَسْبُ: يُسْتَعْمَلُ فِي مَعْنَى الكِفَايَةِ، حَسْبُنا اللهُ: كافِيْنا).

(حَسْب) مانای بەس بوون دەگەیەنێ، شتێك بەس بێ بۆ شتێك، (حَسْبُنا اللهُ) واتە: خوامان بەسە.

(ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ): (العَرْشُ فِي الأَصْلِ شَيءٌ مُسَقَّفٌ، وَجَمْعُهُ عُرُوش، وَكُنِي بِهِ عَنِ العِزِّ وَالسُّلْطَانِ وَالمَمْلَكَة، قِيلَ فُلان ثُلَّ عَرْشُهُ، وَعَرْشُ اللهِ مَا لا يَعْلَمُهُ البَشَرُ عَلَى الحَقِيقَةِ إلاَّ بالإسم).

وشەی (عَرْش) هەر شتێکە کە سەربانێکی هەبێ، کۆیەکەی (عُرُوش)ە، وە کینایەیە بۆ دەسەڵاتو دەسترۆیشتوویەتیو حوکمڕانێتیی، دەگوترێ: (فُلان ثُلَّ عَرْشُهُ)، واتە: دەسەڵاتەکەی کەلێنی تێبووە، یاخود دەسەڵاتی نابووت بووە، بەڵام عەرشی خوا، مرۆڤ وەك حەقیقەتی خۆی نایزانێ، بەڵکو هەر بە ناو دەیزانێ.

# مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەکـان

دیارە خوا ﷻ لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم سوورەتە زۆر جەختی تێدا کراوەتەوە، لەسەر زبریی و توونـدو تیـژیی، دژی دوژمنـانو نـاحەزانی ئیسـلام، چ کافـران چ مونافیقان، ئەم دوو ئایەتە کراون بە کۆتایی ئەم سوورەتە، تاکو دەرگای گەڕانەوە بۆ لای، کراوە بێ، وە ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا زبربە لەسەر کافرو مونافیقەکان، ئەوە لەبەر ناچارییەو، کاتی ڕووبەڕووبوونـەوە، ناچـاری دەکـات زبـریی و تونـدو تیژیـی بنوێنـێ، وە بـڕواداران ڕووبەڕووبوونەوەو زبریی و توندیی کافران، ناچاریان دەکەن توندو تیژیی بنوێنن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا بڕواداران، کە شوێنکەوتووی پێغەمبەری خاتەم ﷺی بە ڕەحمەت نێردراو بۆ هەموو جیهانییانن، لە نەرمو نیانیی و بەزەیی و چاکەکاریی دا، ژمارەی پێوانەیی (الرقم القیاسي) یان شکاندوە، بەڵام کاتێک ناچار بکرێنو شەڕیان پێ بفرۆشرێ، ئەوە کەس لە شەڕێ شەکری نەبەخشیوەتەوە، وە بێگومان شەڕ زمانی خۆی هەیە، بۆیە کاتێک بڕواداران ناچار دەکرێن شەڕ بکەنو، گێچەڵیان پێ دەکرێ، بە ناچاریی دەچنە سەنگەر لە دوژمنان، بۆ ئەوەی بەرگریی لە خۆیان بکەن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا پێغەمبەر ﷺ ئەوە ئەرکەکەیەتی، کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ﴾، لە خۆتان پێغەمبەرو ڕەوانەکراوێکتان بۆ هاتوە، ﴿عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ هەر شتێک ئێوە سەغڵەتو نارەحەت بکات، ئەو زۆر پێی دڵگران دەبێ، زۆریش سوورە لە سەرتان، واتە: سوورە لەسەر ئەوەی کە سوودتان پێبگەیەنێ، بە گشتی بە تەنگ هەموو لایەکتانەوەیە، کە زەرەرتان لێ دوور بخاتەوەو، سوودتان پێ بگەیەنێ، ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾، بەڵام لەگەڵ بڕواداران زۆر میهرەبانە، زۆر بە بەزەیی یە.

دوایی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، تۆ بەو بەرنامە رێكو راستەوە، بەو هەموو رەوشتە بەرزو خێرخوازییەوە كە چووی بۆ لایان، ئەگەر هەر پشتیان هەڵكردو پشتیان تێكردی، بڵێ: من خوام بەسە، لێیان بێ منەتو بێ باك بە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، پشتم هەر بەو بەستوە، وە ئەو خاوەنی بارەگای مەزنە، واتە: حوكمڕانیی رەهاو، دەستەڵاتداریی رەها، تەنیا هی خوایە، ئەو پشتو پەنای منە، ئەگەر بڕواشم پێ نەهێنن، لێتان بێ منەتم.

## چەند مەسـەلەیەكی گرنـگ

مەسەلەی یەكەم: كە دەفـەرموێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٢٨﴾.

زانایان گوتوویانە: ئایا دوێنراو لێرەدا كێیە؟

﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ﴾، ڕاناوی ئێوە (كُم) بۆ كێ دەچێتـەوە ؟!

پێغـەمبەرێك لە خۆتان، زۆربەی توێژەرەوان گوتوویانە: مەبەست گەلـی عـەرەبە، چونكە كە دەفـەرموێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ دەڵێـن: (أَي مِنَ العَرَب)، واتە: ئەی گەلـی عەرەب ! ئەوە لە خۆتان پێغەمبـەرێكتان بۆ هات.

بەڵام (الزَّجّاج) وە هـەندێك لـە زانـایـانی دیكەش گوتوویـانە، وە منیش پێم وایـە: كە نەخێر لێرەدا دوێنراو تەنیا گەلی عـەرەب نیـە، بەڵكو هـەموو بەشـەرە واتـە: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾، یانـی: ئەی مرۆڤایـەتیی ! ئـەی خەڵكینە ! ئەوە پێغـەمبـەرێكتـان لـە خـۆتان بۆ هـات، واتـە: مرۆڤە وەك خـۆتـان، كـە لـە ڕاسـتییدا ئـەو مانایـە چاكتـر لەگـەڵ جـەوی هـەموو سـوورەتەكەدا دەگونجێ، هەروەها لەگەڵ سیاقی ئایەتـەكاندا، وە لەگەڵ پەیامی گشتگیـری پێغـەمبـەردا ﷺ كە بۆ هـەموو مرۆڤایەتی هـاتوە.

دیارە (قد) بۆ دڵـنیایی‌و جەختكردنەوە (تحقیق)ە، وە (ل)یش بۆ داكۆكیی كردنـە، ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾، بە تەئكید، بێگومان، لە خۆتـان ڕەوانـەكراوێكتان بـۆ هـات، ئنجا ئـەو تەئكیـدە بۆچییە؟ واتـە: دڵـنیابن كـە ئـەوە ڕەوانەكراوی خوایە، بۆ لای ئێوە، نوێنـەری خوایە بۆ لای ئێوە، پەیام هەڵگری خوایـە بۆ لای ئێـوە.

ئنجا خوا بە چەند سیفەتێك وەسفی پێغەمبەری خاتەمی ﷺ كردوە:

١) ﴿جَآءَكُمۡ﴾، كە هاتوە، خوا ناردوویەتی، لەخۆوە نەهاتوە.

٢) ﴿رَسُولٌ﴾، واتە: رەوانەكراوەو پەیامێكی پێدا نێردراوە، دەبێ ئێوە پەیامەكەی لێ وەربگرن، چونكە پەیامەكە، پەیامی خوایە.

٣) ﴿مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ﴾، لە خۆتان، واتە: بەشەرە، مرۆڤە وەك خۆتان.

٤) ﴿عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ﴾، وە هەر شتێك كە ناڕەحەتكەرە بۆ ئێوە، لەسەر دڵی ئەو قورسە، پێی ناخۆشە.

٥) ﴿حَرِيصٌ عَلَيۡكُم﴾، وە زۆر سوورە لەسەرتان، واتە: زۆر ئارەزوومەندە كە سوودتان پێبگەیەنێ، وەك چۆن زۆر ناڕەحەتە، كە ئێوە تووشی سەغڵەتیی دەبن.

٦) ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، بەرانبەر بە بڕوادارانیش زۆر بە پەرۆشە، دەیەوێ زیانیان لێ دووربخاتەوە، وە زۆر بە بەزەیی یە، دەیەوێ بەهرەمەندیان بكات، بۆچی فەرموویەتی: ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾؟ چونكە بڕواداران ئەو بەرنامەیەی ئەویان وەرگرتوە، بۆیە لێرەدا تایبەتی دەكات بەوانەوە.

ئنجا (طبري) لێرەدا پرسیارێك دەكات، دەڵێ: ئەگەر كەسێك بڵێ:

(وَكَيْفَ يَجُوز أن يوصف ﷺ بأنه كان عزيزًا عليه عَنَتُ جميعهم، وهو يقتل كُفّارَهم، ويسبي ذراريَّهم، ويسلبهم أموالَهم؟ قيل: إن إسلامهم، لو كانوا أسلموا، كان أحبَّ إليه من إقامتهم على كفرهم وتكذيبهم إياه، حتى يستحقوا ذلك من الله. وإنما وصفه الله جل ثناؤه بأنه عزيزٌ عليه عنتهم، لأنه كان عزيزًا عليه أن يأتوا ما يُعنتهم، وذلك أن يضلُّوا، فيستوجبوا العنت من الله بالقتل والسبي)[1].

---

١) جامع البيان، ج ٧ ، ص ٨٩.

واتە: چۆن دەبێ پێغەمبەر ﷺ بەوە وەسف بکرێ، کە هەر شتێك ئەو خەڵکە پێی ناڕەحەت بێ، ئەویش لەسەر دڵی قورسە، لە حاڵێکدا کافرەکانی (لە جەنگ دا) کوشتوون، وە بە دیلی گرتوون، وە ماڵو سامانیانی کردۆتە غەنیمەتو دەستکەوت ؟!

دەگوترێ پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمانبوونیانی، ئەگەر مسوڵمان بووبانایە، پێخۆشتر بوو لە مانەوەیان لەسەر کوفرو بەدرۆدانانی، کە بەهۆیەوە شایستەی ئەو سزادانەی خوابن.

بۆیەش خوا ﷻ پێغەمبەری بەوە وەسف کردوە کە بەناڕەحەتییان ناڕەحەتە، چونکە پێی ناخۆش بووەو لەسەر دڵی قورس بووە، کارێك بکەن مایەی سەرئێشەو گرفتاریی یان بێ، ئەویش ئەوەیە کە گومڕابین، وە لە ئەنجامی ئەوەش دا، دووچاری ناڕەحەتیی ببنو لەلایەن خواوە: بە کوژرانو بە بەدیل گیران سزا بدرێن.

کەواتە: ئەی خەڵکینە! پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناڕەحەتییتان ناڕەحەتو دڵگران دەبێ، وە لەسەر خێرو چاکەتان سوورە، دەیەوێ هەر چاکەتان بە نسیب بێ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾.

ئەگەر پشتیان هەڵکرد، کە مەبەست پێی هەموو بەشەرە، ئەگەر ئەو خەڵکە پشتیان تێکردی، تۆ بڵێ: خوام بەسە، ئەگەر ئێوەش نەبن، خوا من دەپارێزێ، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، پشتم هەر بەو بەستوە، وە ئەو خاوەنی بەرەگای مەزنە، واتە: خوا کە خاوەنی هەموو کەونو کائیناتە، پشتم بەو قایمە، هەڵبەتە خوایەك ئاوا باڵادەست بێ، دەتوانێ منیش بپارێزێ، وە دەتوانێ منیش سەر بخات، وە ئەو ئامانجانەی منی بۆیان ناردوە، بیانهێنێتە دی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# سەرچاوەکان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد ، المكتبة التوفيقية ، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداء إسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقي ، إعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء ، بإشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرَالدِّين محمد بن عُمَر بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي ، حَقَّقَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثَهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية .

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثَهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف : الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني ، تحقيق : عبدالرزاق الْمَهدي ، دار الكتاب العربي ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) زاد المسير في علم التفسير : لابن الجوزي .

٨) روح المعاني : للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل ، تأليف : علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي ، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت .

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المَنان ، تأليف : العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي ، تحقيق : عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن ، تأليف : الشيخ حسنين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٣) صفوة التفاسير ، تأليف : العلامة محمد بن علي الصابوني ، مكتبة الهداية ، أربيل/ العراق ، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٤) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف : محمد رشيد رضا ، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٥) الأساس في التفسير ، تأليف : سعيد حوى ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٦) في ظِلال القُرآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٧) التفسير المُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والمَنْهَج ، تأليف : الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي ، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٨) التحرير والتنوير ، محمد الطاهر بن عاشور .

١٩) الميزان ، محمد حسين الطباطبائي .

٢٠) تفسير الشعراوي ، محمد متولّي الشعراوي .

٢١) تفسير نمونه ، ناصر مكارم شيرازي .

٢٢) الكاشف ، محمد جواد مغنية .

٢٣) التفسير التوحيدي ، د. حسن الترابي .

٢٤) مُفردات ألفاظ القُرآن ، تأليف : العلامة الراغب الأصفهاني ، تحقيق : صفوان عدنان داوودي ، دار القلم ، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٥) الإستيعاب في بيان الأسباب .

٢٦) أسباب النزول ، للنيسابوري .

٢٧) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعلَّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق المَهْدِي ، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسباب النزول) للنيسابوري .

٢٨) مختار الصِّحاح ، للرازي .

٢٩) المعجم الوسيط ، دار الدعوة ، الطبعة الثانية.

٣٠) المْوطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي .

٣١) المْسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل ، الناشر مؤسسة قرطبة ، القاهرة ، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها .

٣٢) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المْعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٣) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري ، حقوق أصولهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٤) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المْعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٥) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المْعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٦) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المْعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٣٧) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المْعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٣٨) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني ، تحقيق : مجدي بن مَنصور بن سي الشورى ، دار الكتب العلمية ، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٣٩) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري ، تحقيق : صالح اللحَّام ، دار ابن حزم ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٠) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني ، تحقيق ، حقوق أصولُهُ وخَرَّجَ أَحاديثه : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار الْمعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤١) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَرَاني ، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي ، مكتبة الأصالة والتُّراث ، الطبعة الأولى (١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٢) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي ، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ الفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلَّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارسَهُ : الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا ، دار المصطفى ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٣) مشكاة المصابيح، تأليف : محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، المكتب الإسلامي ، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٤) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل ، تأليف : محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي ، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٥) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير ، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني ، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ : عصام موسى هادي، دار الصديق ، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٦) السنن الكبرى تصنيف : الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي ، تحقيق : دكتور عبدالغفار سليمان البنداري ، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان ، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٧) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض ، الطبعة الأولى.

# نێوەڕۆك

| لاپەڕە | بابـــەت |
|---|---|
| ١٢٢ | ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی نەسـخەوە. |
| ١٣٠ | قسـەی کۆتایی دەربارەی ئایەتی ژمارە (٥)ی سـووڕەتی (توبة). |
| ١٥١ | سـەرنـجدانی پێنج تەعبیـرو وشـەی ئەم ئایەتە : (ئایەتی : ١٢) . |
| ١٥٤ | حوکـمی ڕەخنـە لە ئیسـلام گرتـنو تانە لێـدانی. |
| ١٦٠ | شـیکردنەوەی چەند وشـەیەك {لە ئایەتی: (١٦) دا}.. |
| ١٦٣ | **دەرســی دووەم :** ئایەتـەکانی (١٧- ٢٢) بـەراوردێك لـەنێوان هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرانو بڕواداران و سـیفەتەکانی هەر کامێکیـان دا. |
| ١٨٠ | چەنـد فەرموودەیەك لەبارەی مزگـەوتەوە. |
| ١٨٤ | کاروباره ئیدارییـەکانی قوڕەیش پێش ئیسـلام. |
| ١٩٢ | **دەرســی سێیـەم :** ئایەتەکانی (٢٣- ٢٧) باسی پێوەری ئیمانداریتیو خستنەڕووی چاکەی خـوا بەسەر مسـولّـمانانەوەو، سـەرخسـتنی بۆیان لە کاتە سـەختەکان دا . |
| ٢٠٧ | پێـوەرو تەرازووی مسـولّـمانەتیی لە ئایەتی ژمارە: (٢٤)دا. |
| ٢١٦ | شـەش کورتە هەڵوەسـتە، لەبەردەم ئایەتی ژمارە: (٢٦)دا. |
| ٢٢٠ | پوختـەیەك لەبارەی جەنگی حونەینەوە، لەبـەر ڕۆشـنـایی کتێبـی (السیـرة النبویـة)ی (ابـن هشـام)دا. |
| ٢٣٨ | **دەرســی چـوارەم :** ئایەتەکانی (٢٨- ٣٣) باسـی قەدەغەکردنی هاوبەش دانەران لە مزگەوتی حـەڕامو، جـەنگکردن دژی خـاوەن کتێبـە شەڕفرۆشـەکانو، باسـی پووچـیی ئایینـە گـۆڕاوەکـەیانو باسـی دژایەتیی هاوبەشـدانەران بۆ ئیسلامو مسـولّمانان. |
| ٢٥٩ | کورتـە باسـێك لەبارەی چـەمكو واتای پیسـیی (نـجاسة)ی کافرانەوە. |
| ٢٦٧ | لێکۆڵینـەوەیەك لەبـارەی واتای ئایـەتی (٢٩)و چـۆنیەتی مامەڵـەی قـەوارەی ئیسـلامیی لەگـەڵ نامسـولّـمانان دا. |
| ٢٩٧ | **دەرســی پێـنـجـەم :** ئایەتەکانی (٣٤- ٣٧) باسـی قەدەغەکـردنی پەژمـەندەکردنی زێـڕو زیوو سـزای حەڕامخـۆرانو، قەدەغەبوونی دەسـتکاریی کردنی مانگەکانی ساڵ بە پێی ئارەزوو. |
| ٣١٢ | شێوەکانی ماڵو سامانی خـەڵك بەناهـەق خواردن لەلایەن شـارەزایانی ئایینـەوە . |
| ٣١٨ | کورتـە باسـێك لەبارەی ماڵو سـامان کۆکردنەوە . |
| ٣٢٢ | ڕای بەنـدە لەبارەی کێشـەی نێوان (أبـوذر)و (معـاویة)وە . |